


جەنگیز چاندار

# شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا

کەشتێکی مێژوویی



و: زریان رۆژهەڵاتی

- جەنگیز چاندار
- شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا
- گەشتێکی مێژوویی (تورکیا-کوردەکان-ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست-خۆرئاوا)
- و: زریان ڕۆژهەڵاتی
- دیزاین: زریان ڕۆژهەڵاتی
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- چاپخانەی کارۆ
- چاپی دووەم - ٢٠١٥

# پێڕست

# جەنگیز چاندار

ساڵی ١٩٤٨ لە ئەنقەرە لە دایك بووە. خوێندنی سەرەتایی لە ئەنقەرە و ناوەندیشی لە تاڵاس- قەیسەری و تارسووس بووە. بەشی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنقەرە'ی تەواو کردووە و ژیانە ئەکادیمییەکەی کە وەك یاریدەر لە بەشی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا لە زانکۆی تەکنیکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەستپێکردووە، بەهۆی کودەتای سەربازی ١٢ی مارتی ١٩٧١ پچڕانی تێکەوتووە. لە ماوەی ساڵانی ١٩٦٩-١٩٧٠دا سەرۆکی کۆمەڵەی خوێندکارانی کۆلیژی زانستە سیاسییەکان بووە.

ئەو کاتەی کە بە ڕێوەبەری نوسینی گۆڤاری شۆڕشگێری چرووتلیتاریا ئایدنلك بوو سزای نۆ ساڵ زیندانی و دوو ساڵ و نیو ژیانی دوورخراوەیی بەسەردا سەپێنرا. لە کاتێکیشدا کە بە داوایەکی نزیکەی چل ساڵ زیندانیکردنەوە دادگایی دەکرا لە تورکیا هەڵهات و بەشداری لە ریزەکانی جوڵانەوەی فەلەستین'دا کرد. دوای نزیکەی دوو ساڵ مانەوە لە سوریا و لوبنان، دەربازی ئەورووپا بوو. پاشان بەر لێبوردن کەوت و گەڕایەوە بۆ تورکیا. لە ساڵی ١٩٧٦دا دەستی بە کاری رۆژنامەوانی کرد و لە چەندین دامودەزگای راگەیاندندا لە سەرووی هەمووشیانەوە رۆژنامەکانی سەباح و جمهورییەت'دا کاری کرد. چارەکی کۆتایی سەدەی بیستەمی بە زۆری لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، یەکێتی سۆڤییەت و ئەورووپای خۆرهەڵات و ئاسیای میانە و قەفقاسیا تێپەڕ کرد.

چەندین خەڵاتی جۆراوجۆری لەسەر هەمووشیانەوە خەڵاتی ئاشتی و دۆستایەتی عەبدی ئیپەکچی (١٩٨٧) وەرگرت. لە ماوەی ساڵانی ١٩٩٩-٢٠٠٠دا لە سەنتەری ویڵسن و ئەنیستیتۆی ئاشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە واشنتن کاری کرد. لە ماوەی ساڵانی ١٩٩٧-١٩٩٩ لە زانکۆی بیلگی ئیستانبوڵ و لە ساڵانی ٢٠٠٢-٢٠١٠یشدا لە زانکۆی کەلتووری ئیستانبوڵ وانەی وتەوە. چەندین کتێبی بە ناوەکانی فەلەستینی خۆڕاگر (١٩٧٦)، چەقبەستی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست (١٩٨٣)، دیدار لەگەڵ مێژوو (١٩٨٣)، حەوت رەنگی هەتاو (١٩٨٧)، شارەکانی من (١٩٩٩)، بە رووی سپی لە گوزەرگای کۆدەتای پۆست مۆدێرنی ٢٨ی شوبات تێپەڕ بووین (١٩٩٦-٢٠٠٠) (٢٠٠١) بڵاوکردۆتەوە. هەروەها لەنێو نوسەرانی کتێبەکانی "وەرچەرخانی تورکیا و سیاسەتی ئەمریکا" لەگەڵ "تورکیا و ئەمریکا: ئەو هاوپەیمانانەی کە پێویستیان بە یەکتر هەیە" کە لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٠ و ٢٠٠٣دا بە ئینگلیزی بڵاوکراونەتەوە جێی خۆی گرتووە. لە ساڵانی ١٩٨٠کان و ٢٠٠٠کاندا بە بەردەوامی لە گۆڤار و رۆژنامەکانی لوبنان سەبارەت بە تورکیا گۆشەی نوسیوە. راپۆرتێکی بە ناوی "دابەزین لە چیا - پ.ك.ك چۆن واز لە چەك دەهێنێت؟ دوور خستنەوەی توندوتیژی لە کێشەی کورد" ساڵی ٢٠١١ بە تورکی و ئینگلیزی لەلایەن وەقفی گفتوگۆ ئابوری و کۆمەڵایەتییەکان (تەسەڤ) بڵاوکراوەتەوە و هێشتا لە رۆژنامەی رادیکاڵ گۆشە دەنوسێت.

# سوپاس

ساڵ و نیوێك بەر لە بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە، نیازپاکترین و وردبینترین خوێنەری خۆم لە کیس دا. دایکم هەتا ڕۆژانی کۆتایی تەمەنی ٨٦ ساڵەی خۆی نوسینەکان منی بە چاوەکانی خۆیەوە دەنووساند و هەوڵی دەدا بیانخوێنێتەوە. لەبەر ئەوەی ئەگەر ئەو نەبایە من نەدەبووم، لە دەروونمەوە حەز دەکەم سەبارەت بەم کتێبە سوپاسی ئەو بکەم.

لەنێو خوێنەرەکانی دەورووبەری خۆمدا، دایکم زیاد لە ئەندازەی خۆی شوێنی باوکی بۆ من پڕ کردەوە کە ١٤ ساڵ لەمەوبەر لە دەستم دا بوو. بە ئەقڵمدا نەدەهات کە لەدوای دایکم، براکەم وردبینترین خوێنەرم بێت. هەرچەندە دکتۆراشی هەبێت بەڵام لە ئەندازیارێکی کیمیا چاوەڕواننەدەکرا بە شارەزایی لە ڕێزمان و زمانزانییەکی باش و لەوەش گرنگتر تێبینی بڕاوە، دێڕ بە دێڕی کتێبەکەم بخوێنێتەوە و دەسکاری پێویستی بکات. بۆیە سوپاسێك بۆ ڤۆڵکان چاندار ی برام قەرزارم.

بێ ئامانترین و بێ بەزەییترین ڕەخنەگریشم کە گەورەترین هەستی سوپاسگوزاری منی هەق کردبێت: تووبا چاندار ی هاوسەرمە. قووڵترین و واتادارترین پەیوەندییەکانی ژیانی ئەوەندە بەم کتێبەوە سەرقاڵ کرد کە وەك ئەوە وا بوو دەقە ڕەشنووسەکانی من لەگەڵ ئەو دەقەی کە لە ژێر دەسکارییەکانی ئەوەوە دەردەکەوتن، شتێکی جیاواز بێت. دەمزانی کە دەستی نوسین و قەڵەمی لە هی من باشترە. لەبەر ئەوەی کە لە نزیکەوە منی باشتر لە هەموو کەسێکی دیکە دەناسی، بە ڕەزای دڵی خۆم کتێبەکەم تەسلیمی ئەو کرد.

من بەرپرسیاری هەر کەموکوڕییەکی ئەم کتێبەم. هەموو ئەو شتانەش پێی زیاد کراون بەرهەمی دەست و قەڵەمی ئەون. بەهۆی ئەو یارمەتییە نائاساییەی کە بۆ کتێبەکە و بەشداربوونی ژیانم داویەتی، سوپاسێکی تایبەتی دەکەم.

بە بێ خانەیەکی پەخشی باش و نوسەرە باشەکانی، مومکین نییە کتێبێك بە باشی چاپ بکرێت. لەمبارەیەوە چانسم هەبوو. خانەی بڵاوکراوەکانی ئیلەتیشم دوو ساڵ لەمەوبەر داوای ئەم کتێبەی کردبوو. ئیلەتیشم بەردەوام بوو لە ئاراستەکردن و ورە پێدانی من بۆ نوسینی ئەم کتێبە، بۆیە ناتوانم سوپاسی نەکەم.

هەموو ئەو کەسە نادیارانەی کە وەكسەربازی ون، بۆ ئەم کتێبە کاریان کردووە، لەگەڵ  سوئات ئایسوو کە نەخشەسازی بەرگی کتێبەکەی کردووە و ئەحمەد ئینسەل و ئاسوومان ئۆکتای کە بۆ دوایین جارەکان کتێبەکەیان خوێندۆتەوە و بە ئاگادار کردنەوە و پێشنیارەکانی خۆیانەوە ناوەڕۆکەکەیان دەوڵەمەند کردووە، شایستەی سوپاسگوزارییین.

# پێشەکی چاپی کوردی

کتێبی شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا - گەشتێکی مێژوویی، وەك چۆن دەکرێت لە ناوەکەیەوە دیار بێت، گەشتێکی مێژوویی ناوچەکەمان و گەلانی ناوچەکەیە کە تا گەیشتن بەم ڕۆژانەی ئێستا ئەنجامیانداوە. ئەمە لە هەمانکاتدا گەشێکی چل ساڵەی منیشە کە هەموو گۆشە و کەنارێکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی تێدایە. هەرچەندە کتێبەکە بە تەواوەی وەها نالێت، بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە لە نێو ئەو گەشتە مێژووییانەی کە تێکەڵاوی یەکتری بوون، خەڵکی کورد لە هەموو پارچەکاندا، «ڕۆڵی بزوێنەر» بۆ گەشتی گەلانی ناوچەکە بەرەو ئایندە بگێڕێت. بەم هۆیەشەوە، ئەو کاتانەی کتێبەکەم بە مانگان لە سەرووی ریزی پڕفرۆشترین کتێبەکانی تورکیا بوو، لەو چاوپێکەوتنانەی کە لەگەڵمدا دەکران، چەندین جار بیرۆکەی سەرەکی کتێبەکەم وەك «ئەو شتەی بۆ کوردەکان باشە بۆ تورکیا،ش باشە» هێناوەتە سەرزمان و لە شاشەی تەلەفزیۆنەکانیشەوە باسی ئەوەم کردووە. بە هەمانشێوە، دەتوانین بڵێین ئەوەی بۆ کوردەکان باشە بۆ عەرەبەکان و گەلانی دیکەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش باشە...

لەم ڕووەشەوە، لەبەر ئەوەی وا هەستم کردووە کە کتێبەکە زیاتر لە هەموو شتێك« داستانی ئێمە» واتا گەلانی ناوچەکەیە، زیاتر لە وەرگێڕانی کتێبەکەم بۆ زمانە خۆرئاواییەکان، وەرگێڕانی بۆ زمانی گەلانی ناوچەکە واتا عەرەبی و کوردی لای من زۆر گرنگتر بوو. ئەمە ئەولەویەتی من بوو. بە سوپاسەوە، عەرەبییەکەی لە ساڵی ٢٠١٤دا بڵاوکرایەوە و ساڵێك دوای ئەوەش بە زمانی کوردی - سۆرانی چاپکرا. لێرەشدا بە هۆی هەوڵ و کۆششە بێ هاوتاکانی بۆ زیادکردنی ئەم کتێبە بە خەرمانەی زمانی کوردی - سۆرانی، سوپاسکردنی برای خۆشەویستم زریان ڕۆژهەڵاتی بە قەرزی سەرشانم دەزانم. نزیکەی هەموو ئەو کوردانەی کە بە کرمانجی قسە دەکەن، زمانی نوسینی کتێبەکەم کە تورکییە، تەنانەت لە زۆربەی تورکەکان باشتر دەزانن و بەوهۆیەشەوە وەرگێڕانی کتێبەکە بۆ زمانی کوردی، واتای وەرگێڕانی بۆ کوردی - سۆرانی دەدا.

لێرەدا نابێ مانایەکی وا لە قسەکانم دەربکرێت کە گرنگی بە کرمانجی نادەم. بە پێچەوانەوە ئەوەندە بایەخم پێداوە کە لەبەر ئەوەی زمانی دایکیی بەشێکی گەورەی خەڵکەکەمانە و هەروەها لەبەر یەکسانی و ئەو ڕێزەی کە بۆ خەڵکی کورد دایدەنێم، لە دوای تەمەنی شەست ساڵیمەوە خەریکی فێربوونی کوردی - کرمانجی بووم و ماوەی سێ ساڵ، زمانزانێکی زۆر گەنج و بەڕێز بە ناوی شەریف دەرینجە وانەی پێ وتووم. هەروەها لە نێو ریزی ئاهەنگی دەرچووانی وانەی کوردیی زانکۆی ئارتوکلوو لە ماردین'دا بەشدار بووم کە پ.د. قەدری یڵدرم گەورەترین زمانزانی کوردی لە تورکیا مامۆستای بوو. لەو ئاهەنگەدا بڕوانامەم دایە دەستی خوێندکاری یەکەم و وتەیەکی کورتم بە زمانی کوردی پێشکەشی ئامادەبووان کرد و ئەمەش

وەك یەكێك لە جوانترین یادەوەرییەكانی خۆم هەڵدەگرم.

وەك لە هەموو نوسینەكانم دەردەكەوێت، كوردەكان لە مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و مێژوویی كەسیی منیشدا رۆڵێكی تایبەت و نائاساییان هەیە و شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا،ش لە روانگەیەوە ئەو راستییە دەگێڕێتەوە. لایەنێكی دیكەی پەیوەندیدار بە وەرگێڕانی كتێبەكەم كە زۆر خۆشحاڵی كردم ئەوەبوو كە لە شاری سلێمانی چاپكرا و بڵاوكرایەوە. لە نێو هەموو كوردستان،دا سلێمانی شوێنێكی تایبەتە بۆ من، چونكە ناوەندی سیاسی دۆستی زۆر خۆشەویستم مام جەلال'ە و شارێكە كە ئەو وەك شوێنی ژیانی خۆی هەڵیبژاردووە.

بۆ كتێبی شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا – گەشتێكی مێژوویی، مام جەلال سەرچاوەیەكی سەرەكی ئیلهامی من بوو. كاتێ كتێبەكە بخوێنرێتەوە هۆكاری ئەمە بە ئاسانی دەردەكەوێت. ئەو كاتەی شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا بڵاوكرایەوە، دەمویست نوسخەیەكی ئیمزاكراوی كتێبەكە بۆ مام جەلال بنێرم كە نەخۆش كەوت و رەوانەی بەرلین كرا. بۆیە ئاگاداری كتێبەكەی من نەبوو. جگە لەوە منیش لەبەر ئەو زۆر نیگەران بووم و خەفەتم خوارد.

ئەو كاتەی باری تەندروستی مام جەلال بەرەو باشبوون دەڕۆیشت ئاگاداری یەك بووین بەڵام دیدار لە بەرلین بە نسیب نەبوو. لە نامەیەكمدا بۆی كە لە كوردستانی نوێ دا بڵاوكرایەوە ئارەزوومەندیی خۆم بۆ بینینی ئەو لە سلێمانی پێڕاگەیاندبوو.

مام جەلال لە هاوینی ٢٠١٤دا گەڕایەوە سلێمانی و منیش نوسخەیەكی عەرەبیی كتێبەكەم بە ئیمزای خۆم بۆ نارد. نزیكەی دوو هەفتە بەر لە نەورۆزی ٢٠١٥ هیواكەم هاتەدی و لە سلێمانی سەردانیم كرد. دیدارێكی گەرم و پڕ هەست بوو.

ئێستاش كتێبی شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا – گەشتێكی مێژوویی كە مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و كوردەكان و مێژووی كەسیی منیش لە خۆ دەگرێت، بۆ جاری دووەم لە شاری سلێمانی بە زمانی زكماكیی مام جەلال چاپ دەكرێت.

منیش بە خۆشحاڵییەكەوە كە ناتوانم گوزارشتی لێبكەم، كتێبی شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا – گەشتێكی مێژوویی پێشكەشی دۆستێكی زیاتر لە چل ساڵ، دۆستی زۆر گەورە و متمانەپێكراوی خۆم مام جەلال دەكەم!

جەنگیز چاندار - ئیستانبوڵ

مایسی ٢٠١٥

# بە بێ دانیشتن کتێب نانوسرێت

**وشەکان نەدراون بە مرۆڤ بۆ ئەوەی بیروبۆچوونەکانی بشارێتەوە.**

**ژۆسە ساراماگۆ**

کاتێك لە واشنتن'ەوە دەچووم بۆ فرۆکەخانەی دالاس، ژمارەیەکی رۆژنامەی واشنتن پۆست'م دەخوێندەوە کە تێیدا ناوی ژۆسە ساراماگۆ بەرچاوم کەوت. ساراماگۆ رۆماننوسی بە ناوبانگی پورتوغالی خەڵاتی نۆبیلی ئەدەبیاتی ساڵی ١٩٩٨ی بردۆتەوە. لە رێی رۆژنامەکەوە هەواڵی مردنی ساراماگۆ'م زانی و ژیاننامەکەیم خوێندەوە. لە رۆژنامەکەدا رستەی "لە ٥٠کانی تەمەنەوە بوو بە رۆماننوس: مێژوو، راستی و خەیاڵی تێکەڵ بە یەکتری کرد." نوسرابوو بۆ ئەوەی بە چەند وشەیەك باسی پوختەی ژیانی٨٧ ساڵەی ساراماگۆ بکات.

لەکاتی تێپەڕبوون بەسەر پردی کاف (k Bridge)دا، لەنێو سەوازییەکاندا چاوم بە رووباری پۆتۆماك (Potomac) کەوت کە ئاوە شینەکەی رەوان دەبوو. یەکسەر ئەوە هات بە مێشکمدا کە هێشتا کاتم بۆ نوسینی کتێب ماوە. وەکو ئەوە وابوو کە تا تەمەنی٨٧ ساڵی، ژیان و مانەوەی خۆم گەرەنتی کردبێت. کتێبێکم لە عەقڵدا بوو کە ساڵانێکی زۆر بە تەمابووم بینوسم. ئەمەش کتێبێك بوو کە ساڵانێك بوو دەمنوسی بەڵام نەمدەتوانی تەواوی بکەم و لەبەر ئەوەش کە نەمدەنوسی، کەتبوە دوای رۆژگار و لەگەڵ رووداوەکانی جیهاندا پەیتا پەیتا ناوەڕۆکەکەی دەگۆڕا. بۆیە بەردەوام ئەم کتێبەم دەنوسی و هەرچیشم دەکرد نەمدەتوانی تەواوی بکەم.

درێژەم بە خوێندنەوەی ژیاننامەکەی ساراماگۆ دا. چەند رستەیەك سەرنجی راکێشام سەبارەت بەوەی کە سەرەڕای ئەوەی وەك رۆماننوسێك ناوبانگی پەیدا کردووە بەڵام بەهۆی بۆچوونە سیاسییە توندەکانیشیەوە کاردانەوەی لە دژ پیشاندراوە. بۆچوونە سیاسییە توندەکانی چی بوون؟ لە نوسینەکەدا باسی ئەوە کرابوو کە جارێك وتویەتی:" داگیرکردنی کەرتی خۆرئاوا لەلایەن ئیسرائیل، وەك رووداوەکانی ئاشڤیتز (Auschwitz) و بوخنڤالد (Buchenwald)دەبینین."و ئەو رووداوەی ئیدانە کردووە.

لە دەروونەوە حەزم لە ساراماگۆ کرد. هەندێك لە رۆمانەکانی، ڤاتیکان'ی زۆر تووڕ کردووە. ئەمە بە ئەندازەیەك بووە کە کاتێ لە ساڵی١٩٩٨دا خەڵاتی نوبیلی وەرگرتوە، ڤاتیکان رایگەیاندووە کە ئەو خەڵاتەی لەبەر هۆکاری ئایدۆلۆژیکی پێدراوە. سەرەڕای ئەوەی کە تاقە کەسێکی پورتوغالی'یە کە خەڵاتی نوبیلی بردبێتەوە، حکومەتی ئەو وڵاتە پشتیوانی لێنەکردووە، بۆیە هەرچەندە ماڵەکەی لە لیزبۆن پارێزراوبووە،

ئەوێی جێهێشتوە و چوەتە دوورگەکانی قەناری لە کەنارە کراوەکانی ئەفریقا کە موڵکی ئیسپانیایە و تا مردن لەوێ ماوەتەوە. ئەو باروۆدخەم بیر کەوتەوە کە بۆ نوسەر ئۆرهان پاموك (٢٠٠٦) تاقە براوەی خەڵاتی نوبێلی تورکیا دروستکرابوو. ئۆرهان پاموك لەدوای بردنەوەی خەڵاتی نوبێل، بەهۆی ئەو کاردانەوە و دژایەتییانەی کە رووبەڕووی دەبوونەوە، وەك بڵێی لە ئیستانبوڵ ژیانێکی ژێرزەمینی دەستپێکردبێت دەژیا. بە لەبەرچاوگرتنی ژیانی ساراماگۆ کە پێشتر نەمناسیوە و تەنها یەك ڕۆژ دوای مردنی سەرگوزەشتەکەیم خوێندۆتەوە، بەسەرهاتی ئۆرهان پاموك کە بە باشی دەمناسی، شتێکی دەگمەن نەبو. بیرم لەوە کردەوە کە ئەو مرۆڤانەی شتی نائاسایی دەنوسن ئەزمونی هاوشێوەیان دەبێت.

بێ ئەملاولا ژۆسە ساراماگۆ نوسەرێکی نائاساییە. بۆچوونێکی هەیە کە یارمەتی منی داوە و پەیوەندی بە "نهێنی" نوسینی ئەم کتێبەوە هەیە. کاتێك دوایین دێڕی نوسینەکەی واشنتن پۆست'م دەربارەی ساراماگۆ خوێندەوە بە خۆمم وت:" تەواو، نهێنی نەنوسینی ئەم کتێبەم لەو هەمو ساڵەدا دۆزییەوە!"

ساراماگۆ لە ساڵی ١٩٩٩دا وتویەتی کە بڕوای بە "ئیلهام" نییە بۆ نوسین: "بڕوام بە ئیلهام نییە. نازانم چییە... یەکەم مەرجی نوسین ئەوەیە کە دەبێ بۆی دانیشی. دوای ئەوە دەتوانن بنوسن."

هەر ئەوەندەیە و بەس.

تا بۆی دانەنیشن ناتوانن بنوسن.

لە ساڵی ١٩٩١وە بە تەمای نوسینی ئەم کتێبە بووم. ڕۆڵێکی گرنگم هەبو لە شکاندنی یەکێك لە بەستەڵەکە گرنگەکانی مێژووی کۆماردا. وەك "راوێژکاری تایبەتی" تورگوت ئۆزال سەرکۆماری تورکیا، پەیوەندیم لەگەڵ سەرکردەکانی ئۆپۆزیسیۆنی کوردی عێراق، لە سەرووی هەموشیانەوە جەلال تاڵەبانی بەرقەرارکرد. ڕۆڵی گرنگم هەبوە لەوەی کە تورکیا لەگەڵ کوردەکان'ی عێراق'دا پەیوەندی دروستبکات و هەروەها دەوری گرنگیشم هەبوە لە دیاریکردنی ئەو سیاسەتانەی کە دواتر لەوبارەیەوە پێڕەو کراون. دواتر جەلال تاڵەبانی بوو بە یەکەم سەرکۆماری هەڵبژێردراوی مێژووی عێراق.

لە ساڵی ١٩٩٢دا ڕووداوی سەیرتر روویاندا. بەمجۆرەش کەرەستە و مادە بۆ کتێبەکەم لەسەر یەك کەڵەکە دەبوون. لە ١٩٩٣/٣/١٦دا پ.ك.ك یەکەم ئاگربەستی خۆی ڕاگەیاند. تەنها چەند خولەك دوای ڕاگەیاندنی ئەو ئاگربەستەی کە بە ڕووداوێکی "مێژوویی" ناودەبرا، بۆ یەکەمجار لە شوینی ڕاگەیاندنی ئاگربەستەکە لە قەزای بار ئەلیاسی دۆڵی بیقاعی لوبنان عەبدوڵا ئۆجالان'م بینی. دوو ڕۆژ دوای ئەوەش لە نیوەشەوێکدا لە کۆشکی چانقایا بە تەنها لەگەڵ تورگوت ئوزال سەرکۆماردا بووم. تێبینییەکانی خۆمم لەسەر ئۆجالان بۆ ئەو باس دەکرد و لەسەر پێویستییەکانی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تورکیا قسەمان دەکرد. مانگێك دواتریش لەکاتی گەڕانەوەی تورگوت ئوزال سەرکۆماری تورکیا لە سەفەرە درێژخایەنە یەك مانگییەکەی بۆ

کۆمارە تورکییەکان، دیسان ئەو باسەمان دەکرد. کاتێ لە ئەنقەرە لێك جیابووینەوە، سەرکۆمار پێی ڕاگەیاندم کە دوو ڕۆژ دواتر لە ئیستانبوڵ یەکدەگرینەوە و درێژە بە قسە و باسەکانمان دەدەین.

بەڵام ئەو ڕۆژی شەمەیە کە بەرواری١٩٩٣/٥/١٧ بوو، تورگوت ئۆزال نەیتوانی بێت بۆ ئیستانبوڵ. چونکە بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کۆچی دوایی کرد و لەو ڕۆژەش بە دواوە زۆر شت گۆڕا.

ساڵی١٩٩٣، هەر جۆرە هۆکارێك بۆ نوسینی ئەم کتێبە هەبوو. بەڵام هەرچیم دەکرد نەمدەتوانێ بۆی دانیشم. وەك ساراماگۆ وتویەتی:"بۆ ئەوەی کتێب بنوسی پێویستە بۆی دانیشی."

لەو ساڵەدا و دوای ئەوەش، گرنگی و بایەخێکی زۆرم بە کێشەی بۆسنا دا کە یەکێك بووە لە قۆناخە گرنگەکانی ژیانم. وەك ئەوەی خوێن و هەستی ڕۆمەلی بوونەکەم هاتبێتە جۆش، بە دوای کێشەی بۆسناوە کەوتبووم. پێویستبوو هەمو شتێك بۆ بۆسنا بکەم. خۆی لە خۆیدا لەدوایین کاتەکاندا زۆربەی قسە و باسەکانی من و تورگوت بەگ لەسەر بۆسنا بوون و زۆربەی کاتی خۆمان بۆ ئەو کێشەیە تەرخان دەکرد. شەو و ڕۆژ بیرم لە بۆسنا دەکردەوە. بە جۆرێك کە بەشێکی زۆری ساڵی ١٩٩٣-١٩٩٤م بە کێشەی بۆسناوە تێپەڕ کرد. تا ئەندازەیەك تەنها لە سەر بۆسنا و باڵکانەکان دەمخوێندەوە. لە تورکیاش بە میستەر بۆسنا ناوبانگم دەرکردبوو.

لە سایەی بۆسناشەوە بوو کە تایب ئەردۆغانم ناسی. لە ئیستانبوڵ شەوێکی تایبەت بۆ هاوکاری بۆسنا ڕێکخرابوو. منیش لەوێ وتارم هەبوو. لە کۆتایی وتارەکەمدا کتوپڕ قسەیەك هات بە دەممدا و وتم: " ئێمە بۆسناین، بۆسناش ئێمەیە!" ئەو ڕستەیەش بۆ ماوەیەك بوو بە دروشمێکی باو کە بەردەوام دەگوترایەوە. لەنێو چەپڵەڕێزانی جەماوەرە پڕجۆش و خرۆشەکەدا دەگەڕامەوە بۆ سەر مێزەکەم کە پیاوێکی گەنج لەوسەری مێزەکەوە هات و لەبەر قسەکانم پیرۆزبایی لێکردم. دوای ئەوەش چووە سەکۆکە بۆ ئەوەی قسە بکات. هێزی ڕەوانبێژییەکەی سەرنجی ڕاکێشام. پرسیاریم کرد و وتم: "ئەمە کێیە؟" وتیان:"ڕەجەب تایب ئەردۆغان سەرۆکی ڕێکخستنی پارێزگای ئیستانبوڵی پارتی ڕەفا." دواتر منیش لەبەر قسەکانیی پیرۆزباییم لێکرد و ماوەی کۆتایی شەوەکەم بە قسەکردن لەگەڵ ئەو تێپەڕکرد.

ساڵی ١٩٩٥ لەکاتی جەنگدا، ٥ جار چوومە بۆسنا و ئەوەش بوە ساڵی لوتکە لە قاڵبوونەوەم لەو کێشەیەدا. پێموابوو کە دەبێ کتێبێك بۆ بۆسنا بنوسم. بۆ نوسینی کتێبێکی وەهاش زانیاری و توانست و ئامادەگی زەینی پێویستم هەبوو.

بەڵام وەکوو هەمیشە مێژوو لە پێش من دەجوڵایەوە. بەر لەوەی من کتێبەکە بنوسم، بەشێوەیەکی کاتیش بێت کێشەی بۆسنا چارەسەر کرا و ئیدی کەمتر باسی لێوە دەکرا. لەو کاتانەدا پێشهاتەکانی تایبەت بە کێشەی کورد لە تورکیا، چوونە خوێناویترین قۆناخی خۆیانەوە. منیش دووبارە بە کێشەی کوردەوە

سەرقاڵ بووم.

با نوسینی کتێب لەبارەی بۆسنا لە جێی خۆی بمێنێ، دیسان کەڵکەڵەی نوسینی کتێبێك لەبارەی تورکیا کە باسی کوردەکان و عێراق'یشی تێدا بێت دای لە مێشکم. بەڵام ئەمجارەیان بوومە ئامانجی فێڵ و پیلانگێرییەك بە ناوی "یادداشت" کە لە فەرماندە یی گشتی سوپای تورك'ەوە سەرچاوەی گرتبو. لە قۆناخی ۲۸ی شوباتدا کە بە کودەتای پۆست مۆدێرن ناوبانگی دەرکردووە، لە تورکیا کودەتایەك روویدەدا کە منیش رۆڵم تێیدا هەبوو. لەبەر هەموو ئەمانەش هەلومەرجی دەرەکی زۆر نالەبار بوو بۆ نوسینی کتێبێك بەو ناوەڕۆکەی کە باسم کرد.

ساڵەکانی ۱۹۹۹-۲۰۰۰م لە ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی و دەزگایەکی بیرکردنەوە لە واشنتن تێپەڕکرد. بەردەوام قسە و باسم لە سەر عێراق دەکرد. لەگەڵ نەیارانی رژێمی عێراق و هەمو ئەو کەسایەتییە سیاسییانەی ئەمریکا کە گرنگیان بەعێراق دەدا، پەیوەندییەکانی خۆمم درێژە پێدا. ساڵی ۲۰۰۳ هیچ گومانم نەبوو لەوەی کە جەنگی عێراق روودەدات. لەبەر ئەوەی کە پشتی پەردەی رووداوەکانی تایبەت بە عێراق'م دەزانی و لە نزیکەوە لێی ئاگاداربووم، هەڵگیرسانی جەنگی عێراق یان بە واتایەکیتر داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمریکا، بۆ من رووداوێکی سەیر نەبوو.

بەهۆی دۆستایەتی و ئاشنایی چەندین ساڵەم لەگەڵ دامەزرێنەرانی عێراق'ی نوێ، لە ساڵی ۲۰۰۳وە چەندینجار چووەمەتە بەغدا و کوردستان'ی عێراق. لەگەڵ پێکهێنەرەکانی عێراق'ی نوێدا، لە نزیکەوە شایەتی بونیاتنانەوەی ئەم وڵاتە بووم.

ئیدی نوسینی کتێبەکە بووە پێویستییەك کە نەدەکرا دوابخرێت. ساڵی ۲۰۰٤ دەستم بە نوسین کرد. ئاداری ۲۰۰٥ گەیشتبوومە لاپەڕەی ۱٤۰ کە رۆژێك لە ئیستانبوڵ، دز ماڵەکەمی بڕی. کۆمپیوتەرەکەم و دیسکەکانی کۆپی یەدەگی کتێبەکەم لەگەڵ جانتاکانیاندا دزرابوون. بەوەش کتێبەکەم لە کیس چوو.

لە راگەیاندنەکانی تورکیا بەشێوەیەکی فراوان باسی رووداوی بڕینی ماڵەکەی من کرا. هەواڵەکان بە جۆرێك بڵاودەکرانەوە کە گوایە ئەو دزیکردنە بە مەبەستێکی سیاسی و بۆ چاڵ هەڵکەندن بۆ من ئەنجامدراوە. بەڵام من لە نیازپاکی خۆمەوە پێموابوو کە رووداوەکە تاوانێکی ئاساییە و مەبەستی سیاسی لە پشت نییە. تەنانەت لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن بانگەوازێکم بۆ دزەکە کرد و وتم:"دزی بەڕێز! کۆمپیوتەرەکەم شتێکی تێیدا نییە کە بە کەڵکی تۆ بێت. تکایە بۆم بێنەوە." بەڵام هیچ سوودی نەبوو. ئەو نەتەوەگەرایانەی کە دەیانزانی من لە کوردەکان نزیکم و لەبەر ئەوەش لێم تووڕە بوون، نامەی ئەلکترۆنی وەهایان بۆ دەناردم:" ئۆخەی! باش بوو. تۆ هەر بەردەوام بە لەبەرگریکردن لە کوردەکان. بەدڵنیایی ئەوەی دزییەکەی کردووە کوردە." لە راستیشدا دزەکە کورد دەرچوو. هەرزەکارێکی ۲۰ ساڵانی خەڵکی پەرواری بوو. لە

شوێن و ماوای خۆی لە باشووری خۆرهەڵات هەڵکرابوو و هاتبووە ئیستانبوڵ و لەوێش بۆ گوزەرانی خۆی تێکەڵی ڕێکخراوە تاوانکارییەکان ببوو. سەرەڕای ئەوەی کە ناو و ناوبانگی دەزانرا و هەمو ئەندامانی باندی دزییەکەی دەسگیرکران، ئەو هیچ کات نەگیرا و کۆمپیوتەر و کتێبەکەشم نەگەڕانەوە.

دەمگوت:" خۆی کتێبەکە زۆر باش دەرنەچووبوو. باشتر کە دزرا. جارێکی دیکە دەینوسمەوە." و بەوجۆرەش دڵی خۆم خۆش دەکرد. لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ تورکیا، عێراق و مەیدانی کوردی لە تورکیا و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و دنیا زۆر گۆڕاون. بە بەردەوامی کتێبەکە لە مێشکمدا دەگۆڕا و دەنوسرا بەڵام نەکەوتە سەر کاغەز. چونکە تا بۆی دانەنیشی ناتوانی بنوسی.

هاوسەرەکەم هەمو هیواکانی خۆی لەدەسدا لەبارەی ئەوەی کە من ئەم کتێبە بنوسم. ساڵانێك بوو کە ئەو دەیویست من ئەم کتێبە بنوسم و هانیدەدام. هیواکانی لە دەسدا چونکە هۆکاری نەنوسینی کتێبەکەی لەلای منەوە دەرخست. وتی: "تۆ دەژیت. ئەوەندە سەرقاڵی ژیانی کە کاتی نوسینت بۆ نامێنێتەوە." ڕاستی دەگوت. من لەبەر ژیان و لەبەر هاتوچۆ بۆ ئەملاوئەولا و لەبەر تێکەڵاوبوون بە ڕووداوەکان و بەهۆی پەیوەندیکردنی ڕاستەوخۆ بە کەسایەتییە مێژووسازەکانەوە دەرفەتی نوسینم نەبوو. لە ژیانێکی وەهاشدا مومکین نەبوو بتوانم کارێکی لەوجۆرە بکەم. بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە هەر ئەو شێوازە ژیانە دەرفەت و هەستێکی نوسینی بۆ کەسێکی وەك من دەخوڵقاند کە پیشەکەی نوسینە.

لەبەر ئەوە ژۆسە ساراماگۆ ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی مندا هەبوو. نهێنی "نوسینی" بۆ ئاشکرا کردم. دانیشتنی وەك یەکەم مەرجی نوسین دەستنیشانکرد. تا بۆی دانەنیشی ناتوانی بنوسی. منیش کاتێك توانیم ئەم کتێبە بنوسم کە بۆی دانیشتم و لە ساڵی ٢٠١٢شدا تەواوم کرد.

## چارەسەرکردنی کێشە گەورەکان لە چارەکردنی کێشە بچووکەکان ئاسانترە.

لاری پەیج (دامەزرێنەری گووگڵ)

کاتێ ئەمەم گوت لە نیگای رەجەب تایب ئەردۆغان سەرۆك وەزیردا کە لە بەشی تایبەتی فڕۆکە تایبەتەکەدا لە سەر مێزێك لەبەرامبەرم دانیشتبوو، درکم بەوە کرد کە واتا بە قسەکانم نادات.

رۆژی ۱۰/۲۸یە و لە لەندەن بەرەو تورکیا دەفڕین. لە گەڕانەوەی سەفەرێکی دوورودرێژ داین کە لە کوەیت'ەوە دەستپێکرد و دواتر گەیشتە یەمەن و لەبەریتانیا'ش کۆتاییپێهات. تەنها لەبەر ئەوەی لەسەر کێشەی کورد قسە لەگەڵ سەرۆك وەزیردا بکەم، داوام کردبوو بەشداری گەشتەکە بکەم. من بە عاکیف بەکی وتەبێژی سەرۆکایەتی وەزیرانم وت کە دەمەوێ بە تایبەتی لەگەڵ سەرۆك وەزیردا باسی کێشەی کورد بکەم. سەرۆك وەزیریش وتبوی:"با لە گەشتێکی دوورودرێژی دەرەکیدا قسە لەسەر ئەم بابەتە بکەین بۆ ئەوەی کاتمان هەبێت." گەشتی وڵاتانی کوەیت و یەمەن و بەریتانیا کە لە ماوەیەکی نزیکدا ئەنجامدەدرا، دەبووە کاتێکی زۆر گونجاو بۆ ئەوەی لەوبارەیەوە قسە بکەین.

جگە لەوە، دەمویست بە دەستی خۆم راپۆرتێکی عەدنان قاوەچی بەرێزترین و پاکترین سیاسەتمەداری مێژووی نزیکی تورکیا لەبارەی کێشەی کورد بە ئەردۆغان بدەم. عەدنان قاوەچی لە ۱۹۹۲/٥/۲٦دا راپۆرتێکی بە ناوی"کێشەی کورد چۆن چارەسەر ناکرێت؟ پێشنیاری پاکێتێکی چارەسەری" بۆ من نارد تا بە تورگوت ئوزال'ی بدەم. لە چەندین کتێبی جیاوازدا باس لەوە کراوە کە گوایە عەدنان قاوەچی لەسەر داوای تورگوت ئوزال ئەو راپۆرتەی ئامادە کردووە، بەڵام ئەمە راست نەبوو. تورگوت ئوزال هیچ کات ئەو راپۆرتەی نەخوێندەوە و هیچ کاتیش لێی ئاگادار نەبوو. تاقە هۆکاری ئەمەش شپرزەیی من بوو. وەك چۆن فەرامۆشم کردبوو کە راپۆرتەکەم لە کوێ داناوە، ئەوەشم لە بیر چوبوو کە عەدنان قاوەچی راپۆرتێکی وەهای نوسیوە. مانگی یەکی ساڵی ۱۹۹۳ لە شاری هۆستۆن'ی ئەمریکا لەگەڵ تورگوت ئوزال بووم کە هەواڵی مەرگی عەدنان قاوەچی'م پێگەیشت. ئەو بەهۆی رووداوێکی ترسناکی هاتوچۆوە گیانی لە دەست دابوو. سێ مانگ دوای ئەوەش تورگوت ئوزال مرد. بۆ ئەوەی راپۆرتەکەی قاوەچی بکەوێتەوە بیرم، پێویستبوو دواتر لە ساڵی ۲۰۰٤دا لەکاتی گواستنەوەی ماڵەکەمدا بە هەڵکەوت بیدۆزمەوە. ساڵێك دوای ئەوە، رەجەب تایب ئەردۆغان سەرۆك وەزیری تورکیا چووە دیاربەکر و جگە لەوەی کە لە قسەکانیدا ناوی "کێشەی کورد"ی هێنا، جەختی لەوەش کردەوە کە "پێویستە دەوڵەت داوای لێبوردن لە کوردەکان بکات."

لە دیاربەکر وتبوی:" وڵات و دەوڵەتێکی گەورەی وەك تورکیا لە خەرمانەی چەندین سەختی و نالەباری تێپەڕبووە. لەبەر ئەوەش شاردنەوەی هەڵەکانی رابردوو شایستەی دەوڵەتە گەورەکان نییە. دەوڵەتی گەورە

و میللەتی بەهێز، متمانەی ئەوەی بە خۆ هەیە کە لەگەڵ خۆی ڕووڕاست بێت و تاوانەکانی خۆی ئاشکرا بکات. من وەك سەرۆك وەزیری ئەو کادیرانەی کە بڕوایان بە متمانە بەخۆبوونی دەوڵەت و میللەت هەیە و درك بە ئاگایی مێژوویی و جوغرافیایی دەکەن، لە خزمەتی ئێوە دام."

کێشەی کورد، بێ ئەملاولا یەکەم کێشەی وڵات بوو. سەرۆك وەزیریش هەرچەندە لەبارەی چەمکی کێشەکەوە تۆزێك ناڕوون بوو، بەڵام بە جۆرێك قسەی کرد کە جارێکی دیکە هیواکانی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە زیندوو بکاتەوە:

"پێویست ناکات بۆ هەر کێشەیەك ناوێك دابنێین. کێشەکان هی هەموومانن. ئیلا ئەگەر دەڵێین با ناوی بهێنین، ئەوا کێشەی کورد'یش تەنها هی بەشێکی ئەم میللەتە نییە، بەڵکو کێشەی هەموومانە. لەبەر ئەمە، بەو کەسانەی کە دەڵێن کێشەی کورد چی لێدێت؟ دەڵێم وەك سەرۆك وەزیری وڵات، کێشەی کورد بەر لە هەموو کەسێك کێشەی منە. ئێمە دەوڵەتێکی گەورەین و لە ڕێگەی دیموکراسی زیاتر و مافی زیاتری هاوڵاتیبون و ڕەفا و ئاسوودەییەکی باشترەوە هەموو کێشەیەك چارەسەر دەکەین. بەم چەمك و تێگەیشتنەوە چارەسەری دەکەین."

سەرۆك وەزیر بەر لەوەی بچێتە دیاربەکر، لەگەڵ ژمارەیەك لە ڕۆژنامەنوس و ڕوناکبیراندا کۆببووەوە کە بەشێکی زۆریان ناوی ئەو کێشەیەیان هێنابوو و دواتریش ئەو قسانەی لە دیاربەکر هێنایە سەرزمان.

لەبەر ئەوەی جوڵانەوەی سیاسی کوردی ژێر کاریگەری پ.ك.ك'ی بە موخاتەب وەرنەگرتبو، هەروەها لەبەر ئەوەی کە پەیوەندی لەگەڵ سەرۆکایەتی شارەوانی دیاربەکر بەرقەرار نەکردبوو کە وەك قەڵای جوڵانەوەی سیاسی کورد وایە، سەرۆك وەزیر بە ناچاری لەبەردەم جەماوەرێکی کەمدا قسەکانی خۆی کردبوو. بەڵام سەرەڕای ئەمەش وتەکانی لەنێو گەلی کورد لە تورکیا و هەمو لایەنەکانی دیکەی وڵاتدا، هەیەجانێکی دروستکردبوو.

داخۆ دەکرا هیوا هەبێت بەوەی کە یەکەمین کێشەی مێژووی کۆماری تورکیا یاخود کێشەی کورد کە گیانی دەیان هەزار کەسی گرتووە و دیارنییە کە چەندی دیکەش دەکاتە قوربانی، چارەسەر بکرێت؟

دیارە هەوڵدانی بەرپرسانی دەوڵەت و حکومەتی تورکیا سەبارەت بە کێشەی کورد لە تایب ئەردۆغان'ەوە دەستی پێنەکردبوو، بەڵام تا ئەو ڕۆژە، هیچ سەرکردەیەك وەك ئەردۆغان بە ناوی دەوڵەتەوە جەختی لەوە نەکردبوو کە پێویستە ڕەخنە لە خۆ بگیرێت و هیچ یەکیشیان نەیگوتبوو کێشەی کورد" بەر لە هەموو کەس کێشەی منە."

بۆ کەسێکی وەك من کە بەشێکی زۆری تەمەنی خۆی لەگەڵ ئەم کێشەیە و ڕەهەندەکانیدا تێپەڕ کردووە و تەنانەت لە مێژووی نزیکدا لەوبارەیەوە ڕۆڵی گێڕاوە، وتەکانی ئەردۆغان لە دیاربەکر، بوونە هۆی ئەوەی

کە جۆش و خرۆشێکی تایبەتم هەبێ و جارێکی دیکە هیواکانم زیندوو ببنەوە. بەڵام لە ئەزموونەکانی خۆمەوە ئەوەشم دەزانی کە نائومێدییەکی زۆر شوێنی هیوا گەورە تێکشکێنراوەکان دەگرێتەوە.

رۆژانی کۆتایی تەمەنی تورگوت ئوزال لە مانگەکانی ئادار و نیسانی ساڵی١٩٩٣، قۆناخێك بوو کە زیاتر لەهەر کاتێکی دیکە لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد نزیك ببووینەوە. عەبدوڵا ئۆجالان سەرۆکی پ.ك.ك، لەبەرواری ١٦ی ئاداردا لە بارئەلیاسی دۆڵی بیقاعی لوبنان لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانی گەورەدا، بەشێوەیەکی یەکلایەنە و بۆ ماوەی یەك مانگ ئاگربەستی راگەیاند. لەدوای کۆنفرانسە رۆژنامەوانییەکە، نزیکەی چل خولەك لەگەڵ ئۆجالان دانیشتم. چونکە ئەگەری ئەوە هەبوو هەندێك قسەی هەبێت کە لە کۆنفرانسە رۆژنامەوانییەکەدا نەیگوتبێت و بیەوێت تورگوت ئوزال ئاگای لێی بێت. منیش تێبینییەکانی خۆمم بۆ تورگوت ئوزال باس دەکرد.

من پێشنیارم کردبوو لەگەڵ ئۆجالان دیدارم هەبێت. کاتێ ئەمەم بۆ ئوزال باسکرد، بە ئەرێنی یان نەرێنیێ هیچ شتێکی نەگوت کە لە سەری بکەوێت. تەنها وتی:" برۆ، کاتێ گەڕایتەوە قسە دەکەین، با بزانین چۆن دەبێ." سەرەڕای ئەوەی کە راستەوخۆ بۆ دیدار لەگەڵ ئۆجالان رانەسپێردرابووم، ئەو قسانەم وەك چرایەکی سەوزی سەرکۆمار بۆ داواکارییەکەم لێکدایەوە و ویستی خۆم بۆ دیدار لەگەڵ ئۆجالان بە جەلال تاڵەبانی سەرکردەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ی عێراق راگەیاند کە لە شام لەگەڵ ئۆجالان بوو و رۆڵێکی دیاریکەری هەبوو لەوەی کە سەرکردەی پ.ك.ك بڕیاری ئاگربەست رابگەیەنێت.

دوای تەواوبوونی کۆنفرانسە رۆژنامەوانییەکەی بارئەلیاس، لەگەڵ ئۆجالان یەکترمان بینی. دوای دیدارەکە چوومە بەیروت و یەکەم ئیش تەلەفۆنم بۆ تورگوت ئوزال کرد. ئەو تووڕە بوو لەوەی کە ئۆجالان لە لێدوانێکی تایبەتدا بۆ کامەران قەرەداخی لە رۆژنامەی ئەلحەیات کە بە زمانی عەرەبی لە لەندەن بڵاو دەبێتەوە، باسی "گەڕانەوەی بەمزووانەی بۆ تورکیا" کردبوو. پێمگوت رۆژی بەر لە راگەیاندنی ئاگربەستەکە ئەو لێدوانەی داوە و ئەوەش زیاتر گوزارشت لە ویستەکانی خۆی دەکات. هەروەها ئەوەشم وت کە"دوو بە دوو دیدارمان کردووە، هەندێك شتی گوت کە لە کۆنگرە رۆژنامەوانییەکەدا باسی نەکرد. کاتێ یەکترمان بینی بۆتان باس دەکەم." و باسی ئەوەشم بۆ کرد کە بە رای من نابێ زۆر لە سەر چاوپێکەوتنەکەی ئەلحەیات هەڵوەستە بکات.

ئۆزال وتی"باشە، تا تۆ دەگەڕێیتەوە من هیچ لێدوانێك نادەم. کەی دەگەڕێیتەوە؟"

رۆژی دواتر دەگەڕامەوە... رۆژی دوای گەڕانەوەم، یەکسەر ئۆزال بۆ بەربانگێکی تایبەت بە بەرپرسانی نوێنەرە بیانییەکان لە کۆشکی چانقایا دەعوەتی کردم. دوای بەربانگ دەچوومە شوێنی حەوانەوەی سەرکۆمار و تێبینییەکانی خۆمم لەبارەی سەرکردەی پ.ك.ك و ئەو رەهەندانەی کێشەکە بۆ ئەو باس دەکرد

کە لە کۆنفرانسە رۆژنامەوانییەکەدا باس نەکرا بوون. هەر بەوجۆرەشم کرد. کاتژمێر ٥ی بەرەبەیانی کاتێ لە کۆشك دەهاتمە دەرەوە، لەسەر پلیکانەکان کەسی لێ نەما بوو. وادیاربوو رۆژنامەنوسان و کامێرامانی تەلەفزیۆنەکان کە بە هیوابوون قسەیەك لە دەمم دەربێنن، هیوابڕاو ببوون، بۆیە ئەوێیان بە جێهێشتبوو. لەوانەیە تورگوت ئۆزال حیسابی ئەمەی کردبووبێ، بۆیە تا بەرەبەیان منی هێشتەوە و لە سەر سفرەی پارشێو گوێی لە قسە و تێبینییەکانم لەبارەی ئۆجالان گرت. چەند کاتژمێر دواتر، لە سەعات ١٠:٠٠دا دەستەی ئاسایشی نەتەوەیی کۆ دەبووەوە. تا ئەندازەیەك تاقە بابەتی قسەی کۆبوونەوەی دەستەکە گفتوگۆ بوو لەبارەی هەڵوێستیان بەرامبەر "ئاگربەستی تاکلایەنەی پ.ك.ك"کە تا ئەو رۆژە یەکەمجار بوو رابگەیەنرێت. ٤٨ کاتژمێر بۆ نەورۆز مابوو. ئۆجالان بەڵێنی دابوو کە ئەگەر ئۆپەراسیۆنەکان رابگیرێن، هیچ کێشەیەك روونەدات. لە نەورۆزی ساڵانی رابردوودا خەڵکێکی زۆر گیانیان لە دەست دابوو. باشووری رۆژهەڵاتی تورکیاش دیمەنی"راپەڕین"ی ناو خاکی فەلەستینی لە خۆ گرتبوو. دەرنەکەوتنی هیچ کێشەیەك لە نەورۆزدا، لەلایەك هێز و کۆنترۆڵی پ.ك.ك و ئۆجالانی لە سەر جەماوەری کورد دەردەخست، لەلایەکی دیکەش سەرەداوی جیدییەتی ئاگربەستەکەی بەدەستەوە دەدا.

کاتێ لە کۆشك دەهاتمە دەرەوە، خۆمم پێ نەگیرا و لە ئۆزالم پرسی کە لە کۆبوونەوەی دەستەی ئاسایشی نەتەوەییدا چ جۆرە بەیاننامەیەك بڵاو دەکرێتەوە؟ ئۆزال وتی:"ئەگەر دوای ئاگربەستی پ.ك.ك، یەکسەر بە بەیاننامەیەکی دەستەی ئاسایشی نەتەوەیی وەڵام بدرێتەوە، ئەمە واتای بە هاوشان لە قەڵەمدانی پ.ك.ك و دەوڵەت دەدات. من سەرۆکایەتی کۆبوونەوەکە دەکەم. دەڵێم پێویست ناکات بە پەلە کاردانەوە پیشانبدەین. سبەینێ جەژنە، لە ماوەی پشووی جەژندا هەر کەس لەبارەی ئاگربەستەکەی پ.ك.ك بیر بکاتەوە. با نەورۆز تێپەڕبێت، دوای ئەوە پێکەوە لە سەر ئەوەی کە چی بکەین قسە دەکەین و بڕیارێك دەدەین. کێشەکە لێرەدا ئەوەیە کە نابێ دەستپێشخەری بدەینە کەسی دیکە. دەبێ لە ماوەی یەك مانگی داهاتوودا دووبارە دەستپێشخەری بکەوێتەوە دەستی خۆمان."

چارەسەرکردنی کێشەی کورد، وەك هەموو کەسی دیکە بۆ تورگوت ئۆزالیش ئاسان نەبوو. بەرپرسانی باڵای دەوڵەت سەبارەت بە چارەسەری ئیرادەیەکی سیاسی هاوبەشیان نەبوو. ئیرادەی سیاسی لەلایەك بمێنێ، هەر دوو پارتی رێگای راست (DYP) و پارتی سۆسیالیستی خەڵك (SHP) یان بە واتایەکیتر هاوپەیمانیی سولەیمان دەمیرەل و ئەردال ئینەنۆ، بە گوێرەی سروشتی کێشەکە ئازایی و بوێری پێویستیان بۆ چارەسەری نەبوو. لەوەش گرنگتر ئەوە بوو کە سەرۆك وەزیران و سەرکۆمار یان بە واتایەك سولەیمان دەمیرەل و تورگوت ئۆزال لە کێشمەکێش و ناکۆکییەکی قووڵدا بوون. ئەوەی ئۆزال بیگوتایە سپییە، دەمیرەل دەگوت رەشە و دەیویست دەسەڵاتەکانی سەرکۆمار کەمبکاتەوە و تەنانەت ئەگەر بۆی بکرایە

لە پۆستەکەی لای دەبرد. تەنانەت دەنیز بایکاڵ سەرۆکی پارتی سۆسیالیستی خەڵك (SHP) و هاوبەشی حکومەتە ئیئتیلافییەکەی دەمیرەل، باسی ئەوەی کردبوو کە پێویستە"ئوزال بێ ئابڕوو بکرێت و ئەوسا لە کۆشك دەر بکرێت." واز لە ئیرادە و ئازایی حکومەت بێنە، هەر لە بنەڕەتدا گومان هەبوو لەوەی کە تەنها رۆژێکیش بیری لە "چارەسەرکردنی کێشەی کورد" کردبێتەوە. تا ئەندازەیەك ئەوە روون بوو کە ئەگەر پێشنیاری چارەسەر لەلایەن ئوزال'ەوە بکرێت، حکومەت دژی دەردەکەوێت. جگە لەو درزەی کە لەنێو دەسەڵاتی سیاسیدا هەبوو، شتێکی وەها دەبوو هۆی لاوازی دەسەڵاتی مەدەنی لەبەردەم سەبازەکاندا کە دەیان ساڵە خۆیان وەك خاوەنی کێشەکە دەبینی. هیچ نیشانەیەك نەبوو دیار بکات کە سەربازەکان تینووی چارەسەری کێشەی کوردن. هەندێکیان دژی ئاگربەستەکە بوون و پێیانوابوو ئەمە مانۆڕێکی تەکتیکی پ.ك.ك'یە بۆ ئەوەی خۆی بەهێز بکات.

هەلومەرجی ئاگربەست، ئەو بۆچوونانەی بەهێز دەکرد کە جگە لە رێکاری شەڕی چەکداری بۆ کێشەکە، بە دوای رێگە چارەی دیکەوە بوون. سەربازەکانیش زۆر لەمە دەترسان. تەنانەت ئەگەر لە نێوان کۆشك و حکومەتدا رێکەوتنێك بۆ چارەسەری سیاسی کێشەکە هەبێت و چارەسەرێکی سیاسی وەهاش پێویستی بەوە بێت کە هەندێك هەنگاوی بنەڕەتی و گرنگ بنرێت، پێویست ناکات فاڵگر بین تا بزانین سەربازەکان دژی ئەمە دەردەکەون. خۆی لە خۆیدا ئیرادەیەکی سیاسی وەهاش لە ئارادا نەبوو.

لەنێو بەرپرسانی دەوڵەتدا، زیاتر لە هەمووان تورگوت ئۆزال مێشکی خۆی بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد سەرقاڵ دەکرد. ئۆزال لە لوتکەی دەسەڵاتی دەوڵەتدا، دەوڵەتمەدارێکی تەنیا بوو. زۆر گوێی لە تێبینییەکانی من لە سەر ئۆجالان نەگرت و قسەکانمی بڕی و وتی:" دەزانی چی لە مێشکمدا هەیە؟..." دیاربوو چارەسەرێکی لە مێشکدا بوو. دواتر درێژەی پێدا و وتی:" پێویستە لێبوردنێك دەربکرێت. ئەمەش بە جۆرێك بێت کە ئەو کەسانەی سەر چیاکان کە تاوانەکانیان نەسەلمێنراوە بتوانن دەستبەجێ سوود لە مافە سیاسییەکانیان وەربگرن. ناتوانی ئەمە بۆ کادیرانی بە ڕێوەبەر، یانی بۆ ئاپۆ و چەند کەسێکی دیکە جێبەجێ بکەیت، بەڵام ئەوانیش دەتوانن ئاستەنگ بخەنە بەردەم لێبوردنێك کە ئەوان نەگرێتەوە. بۆیە پێویستە لێبوردنێکی قۆناخ بە قۆناخ بێت کە ئەگەر بە ڕێوەبەرەکانیش تاوانیان نەکردبێت، دوای پێنج ساڵ ئەوانیش بگرێتەوە و بتوانن سوود لەو مافە سیاسییانە وەربگرن."

منیش پرسیارم کرد" ئەمە یاسای پێویستە. لەم پەرلەمانەدا یاسایەکی وەها دەردەچێت؟"

بێ هیچ دوودڵییەك ئۆزال وتی:"دەرناچێت."

- "کەواتە؟"

- "با بزانین، پێویستە رێگایەکی بۆ بدۆزینەوە."

لەو بەینەدا، ئاگربەستەکە نەباش و نەخراپ ماوەی یەك مانگ درێژەی کێشا، بەڵام لەو ماوەیەدا هیچ پێشهاتێکی واتادار روونەدا. تورگوت ئۆزال گەشتێکی درێژی بۆ کۆمارە تورکییەکان دەستپێکرد کە دوای رووخانی یەکێتی سۆڤییەت سەربەخۆییان وەرگرتبو. باوکم کتوپڕ نەخۆش کەوت و نەمتوانی لەو گەشتەدا بەشدار بم. بەڵام مانەوەم لە ئیستانبوڵ دەرفەتێکی باشی بۆ رەخساندم تا پەیوەندییەکی تەلەفۆنی زۆرم لەگەڵ جەلال تاڵەبانی'دا هەبێت کە ئەو کاتانە لە شام بوو. مەراقی ئەوە دەکرا کە داخۆ ئۆجالان دوای تەواوبوونی ماوەکەی، ئاگربەستەکە درێژ دەکاتەوە یان نا؟

لە ١٩٩٣/٣/١٦دا گروپێکی رۆژنامەنوسان کە جەنجاڵتر بوون لەو گرووپەی لەکاتی راگەیاندنی ئاگربەستەکەدا ئامادە بوون، بەرەو لوبنان بە رێ کەوتبوون. ژمارەیەك لە پەرلەمانتارانی پارتی رەنجی گەل(HEP)، کە ئەحمەد تورك، خەتیب دیجلە و ئۆرهان دۆغان لە نێویاندا بوون، دەچوون بۆ ئەوەی ئۆجالان ببینن. ئەوان بەر لەوەی تورگوت ئۆزال گەشتی دەرەوە بکات، لەگەڵیدا دیداریان کردبوو. کەمال بورکای سەرۆکی پارتی سۆسیالیستی کوردستان'یش کە ساڵانێك لە دوورخراوەییدا لە سوید دەژیا و دژایەتی پارتی کرێکارانی کوردستان'ی دەکرد، چووبووە شام و چرووتتۆکۆڵێکی لەگەڵ پ.ك.ك ئیمزا کردبوو.

بە تەلەفۆن جەلال تاڵەبانی'م ئاگادار کردەوە لەو بارودۆخە نالەبارەکەی کە تورگوت ئۆزال تێی کەوتبوو. وتم بۆ ئەوەی سەرکۆمار مەیدانی مانۆڕی هەبێت، پێوستە ئاگربەستەکە درێژ بکرێتەوە."بەڵام، کەلتووری دەوڵەتی تورکیا مەرجدانان و دیاریکردنی وادەی لا پەسند نییە. ئەگەر ئاگربەستەکە درێژ دەکاتەوە، با بێ مەرج و بێ دیاریکردنی وادە بێت. چونکە ئەگەر وابێت، دەتوانێ دەستی سەرکۆمار لە دەستپێشخەری بۆ چارەسەریدا بەهێزتر بکات."

لە راستیدا هیچ زانیاری و ئەزموونێکم نەبوو لەسەر ئەوەی کەلتووری دەوڵەتداریی تورك حەز لە چی دەکا و حەز لە چی ناکات، بەڵام ئامانجەکەم بەدەستهێنانی کاتی زیاتر بوو بۆ ئەوەی تورگوت ئۆزال بتوانێت لە بەرامبەر سولەیمان دەمیرەل و سەربازەکاندا دەستپێشخەریی چارەسەریی بگرێتە دەست.

دوای ماوەیەکی کورت تاڵەبانی تەلەفۆنی کرد و وتی:"دەتوانی بە سەرکۆمار بڵێی بە دڵی ئەو دەبێت. مەرج و وادە دیاری ناکات." بەڵام لە درێژەدا وتی:"دیار نییە ئەو (ئۆجالان) چی دەکات، بە خاڵۆ بڵێ من کەفیلی نیم."

تاڵەبانی لەو کاتانەدا کە نەیدەویست راستەوخۆ ناوی تورگوت ئۆزال بهێنێت، بە"خاڵۆ" ناوی دەهێنا. لەوانەیە لە ناوەکەی خۆیەوە ئیلهامی گرتبێ کە لە رێز و خۆشەویستیدا ئاوەڵناوی "مام"یان بۆ زیادکردبوو. وشەی هاوواتای"مام" لە زمانی تورکیدا"ئامجا"یە. تاڵەبانی بۆ دەربڕینی رێز و خۆشەویستی خۆی بۆ تورگوت ئۆزال وشەی"خاڵۆ"ی هەڵبژاردبوو.

سەرەڕای ئەوەی تاڵەبانی نەبوو بە کەفیلی ئۆجالان، بەڵام بە ناوی ئەوەوە هەندێك قسەی بۆ کردم کە ئاماژەی بەڵێن دانیان تێدا بوو. بۆیە منیش بۆ پێدانی ئەو زانیارییانە بە تورگوت ئۆزال، بە ڕێ کەوتم. لە ئێوارە خوانێکدا لە عەشق ئاباد کە سەفەر موراد نیازۆف (تورکمانباشی) سەرۆکی دەوڵەتی تورکمانستان ڕێکیخستبوو، تورگوت ئۆزال'م بینی. وەك بڵێی گلەیی بکات وتی:" ئەمە تۆ لە کوێی؟" خۆم دانەواند و بە چپە پەیامەکەی ئۆجالان'م لە زاری تاڵەبانی'یەوە بۆ ئەو گێڕایەوە. وتی:" با ئەمشەو قسە بکەین، بەوانەی ئێمە بڵێ با دوای خواردن کۆبوونەوەیەك ڕێکبخەن."

جان پووڵاك یەکێك لە ڕاوێژکارەکانی تورگوت ئۆزال یان بە هەڵە لە قسەکانی سەرکۆمار تێگەیشت یان خۆی وای بە باش زانی، کۆبوونەوەکەی بە جۆرێك ڕێکخست کە هەموو ڕۆژنامەنوسان تێیدا بەشدار بن. بۆیە لە عەشق ئاباد نەمانتوانی قسە بکەین. کاتێ دەردەچووین ئۆزال لە بنا گوێمدا وتی"سبەینێ لە باکۆ قسە دەکەین." بەهۆی ترافیکی زۆری دیدارەکان، نەمانتوانی لەوێش بە یەك بگەین. تورگوت بەگ لە کۆشکێکدا میوانی ئەبولفەز ئەلچیبەی سەرکۆماری ئازەربایجان بوو. منیش لەگەڵ ئەندامانی دیکەی وەفدەکەدا لە هۆتێلی ئازەربایجان بووم. یانی لە باکۆ'ش نەمانتوانی قسە بکەین.

گەشتە درێژەکەی سەرکۆمار بۆ ئاسیای میانە و ئازەربایجان، بەیانیی ڕۆژی پێنج شەممە ١٩٩٥/٥/١٥ کۆتاییپێهات.

بەرەو تورکیا دەگەڕاینەوە. نیو کاتژمێر بوو کە فڕۆکەکەمان هەستابوو. حیکمەت چەتین وەزیری دەرەوە هاتە لام و وتی:" سەرکۆمار بانگت دەکا. منیش لێرە تۆزێك لەگەڵ هاوڕێیان قسە دەکەم." و لەوێ مایەوە. منیش چووم و لە شوێنەکەی حیکمەت چەتین لە تەنیشت تورگوت ئۆزال دانیشتم. ئۆزال وتی:"ئادەی بڵێ بزانم."...

ئەو زانیارییەی کە لە عەشق ئاباد بە چپەوە پێم گوتبو، بە وردەکارییەوە بۆم باس دەکردەوە کە پەڕییە ناو قسەکانم و وتی: "ئەم گێلانە کات بە فیڕۆ دەدەن."

-"کام گێلانە ئەفەندم؟"

دەمزانی کە ئۆزال لە شوێنی خۆیدا وشەی"گێل"ی بۆ بەشێك لەبەرێوەبەرانی پارتی دایکی نیشتمان بەکاردەهێنا کە لێی جیا ببوەوە.

وتی:"کورە حکومەت، سەیری فڵانە قسەی عیسمەت (عیسمەت سەزگین وەزیری ناوخۆ) بکە. کابرا ئاگربەستی ڕاگەیاندووە. مانگێکیان بە فیڕۆ دا. بە قسەی وەك وەرن تەسلیمی عەدالەتی تورك بن، کاتیان کوشت. ئەگەر بە کوردێك بڵێی وەرە تەسلیم ببە، زۆر خراپترە لەوەی کە جنێو بە دایکی بدەی. بەمجۆرە بانگەوازانەوە کاتی زۆریان بە فیڕۆ دا. دەزانی لە چی دەترسم؟ ئەگەر تیرۆر بگەڕێتەوە، دوو ئەوەندەی

جاران بەهێزتر دەبێت و لافاوی خوێن لاشە هەڵدەستێنێ..."

- بەنیازن چی بکەن؟

- لێکۆڵینەوەم لەو پلانی لێبوردنە قۆناخ بە قۆناخە کرد کە مانگی رابردوو بۆم باسکردی. دەرفەت هەیە کە بە بێ دەرخستنی یاسا و تەنها بە بڕیارنامەیەکی حکومەت، ئەو لێبوردنە بە جۆرێك کە رێگای دادگای باڵای لەبەردەم داخراو بێت دەربکرێت. بەڵام ئەگەر پێشنیاری چارەسەر لەلای منەوە بکرێت، لە سەداسەد سولەیمان (دەمیرەل) دژی دەردەکەوێت. نایەوێت شەرەفی چارەسەری بە من بدات. ماوەیەك رادەوەستم، دواتر بە هەر بەهایەك بێت پێشنیارەکەم بۆ چارەسەر ئاشکرا دەکەم. ئەمە دوایین قەرزی منە کە دەبێ بە خەڵکەکەمی بدەمەوە. دوایین ئەرکمە. تا ئەو کاتەی ئەم کێشەیە چارە نەکرێت، هیچ شتێك روونادات. وەك سەرکۆمار، چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە قەرزێکە و لە ملی مندایە.

پرسیارێکم لە تورگوت ئۆزال کرد و وتم:"سولەیمان بەگ لە سەربازەکان دەترسێت؟" ئەگەر وەڵامەکەی بەڵێ بایە قسەکانی دواترم لە مێشکی خۆمدا ریز کردبوو کە وتی:

"ترس چییە، دەیکات بە خۆیا. سەیرکە! ترس کێشە نییە، ئەمە شتێکی مرۆییە. کێشەی ئەو ترسەکە نییە، بەڵکو دەرخستنی ترسەکەیە. لەبەر ئەوەش سەربازەکان وەك چۆن پشیلە یاری بە مشك دەکات، ئاوا یاری پێ دەکەن...

ترسێکی هاوشێوەی لە ناکۆکییەکانی ئازەربایجان – ئەرمەنستان'یشدا پیشاندا. کاتی کەلبەجەر داگیرکرا، من وتم ئەگەر لە نزیك سنورەکانی ئەرمەنستان مانۆڕێك بکرێت و بە هەڵە چەند گوللە تۆپێك بکەونە ناو خاکی ئەرمەنستان'ەوە..، قیامەتی بەرپا کرد. منی وەك سەرکۆمار خستە بارێکی تەنگانەوە. بەرگە و قورساییەکمان نەما. لە ئازەربایجان روخساری سەرکۆمارێکم لێ دەرکەوت کە ناکۆکی لەگەڵ سەرۆك وەزیرەکەیدا هەیە. لە روسیا دەترسێت. سوپای سوور نەماوە بەڵام ئەو هەر لێی دەترسێت. لە هەموو شتێك دەترسێت."

- هۆی پرسیارەکەم سەبارەت بە سولەیمان بەگ شتێکیترە. با سەرەتا بپرسم کە بەینتان لەگەڵ سەربازەکاندا چۆنە؟ دواتر شتێك لە مێشکمدایە کە پێتان دەڵێم...

- دۆغان گویرەش(فەرماندەی گشتی سوپا) دەیەوێت ماوەی فەرماندەییەکەی بۆ درێژبکرێتەوە. بۆ ئەوەش ئیمزای من پێویستە. دەتوانم بڵێم بەینم لەگەڵ ئەودا باشە. بۆچی پرسیارت کرد؟

- چونکە ئەگەر سولەیمان بەگ لە سەربازەکان دەترسێ و ئێوە چی بڵێن بە پێچەوانەتان قسە بکات، ئەو کاتە ئێوەش کارێك بکەن کە دۆغان گویرەش پلانی چارەسەرەکەتان قبوڵ بکات و دواتر وەك بۆچوونی سوپا بۆ سولەیمان دەمیرەل'ی ببات. من سەربازەکانی خۆمان هیچ ناناسم، بەڵام لە ئەزموونی پورتوغال'ەوە

دەزانم کە سەرەڕای ئەوەی لە دەرەوە باسی ناکەن، بەڵام سەربازەکان زیاتر لە هەموو کەسێك دەیەوێ ئەم جەنگە کۆتایی پێبێت. لە پورتوغال، ئەو سەربازانەی کە لە ئانگۆلا و مۆزەمبیق شەڕیان دەکرد، هەنگاوەکانی کۆتاییهێنان بە رژێمی سالازاریان دەستپێکردبوو. هەر ئەوان جەنگی داگیرکەریشیان کۆتایی پێ هێنابوو...

لەبارەی ئەو قسە و باسانەی ئەنقەرە، سەبارەت بەوەی کە سەربازەکان زیاتر لە سیاسەتمەدارە مەدنییەکان دەیانەوێ ئەم جەنگە کۆتایی پێبێت، تورگوت ئۆزال وتی:"هیچ گومانت نەبێ!" و ئەو باسانەی پشتڕاستکردەوە. تۆزێکی دیکە لەسەر ئەوە قسەمان کرد کە چۆن دەکرێت لە جیاتی دەرەکردنی یاسا، لە رێی بڕیارنامەیەکی حکومەتەوە لێبوردنێکی قۆناخ بە قۆناخ بۆ ئەندامانی پ.ك.ك دەربکرێت کە دوای پێنج ساڵ عەبدوڵا ئۆجالان'یش بگرێتەوە و هەموو مافە سیاسییەکانیشیان پارێزراو بێت. دوو رۆژ دواتر ئۆجالان بە بێ مەرج و بێ دیاریکردنی وادە ئاگربەستی درێژ دەکردەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کات گرنگ بوو. ئەو هەنگاوانەی کەی و چۆن دەنران؟

سەرکۆمار وتی:"بوەستە بزانم...کاتی چووینەوە بۆ ئەنقەرە با لەگەڵ سولەیمان'دا قسەیەك بکەم..."

فڕۆکەکە لە ئەنقەرە دەنیشتەوە کە حیکمەت چەتین وەزیری دەرەوە گەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی. خوافیزیم لە ئۆزال کرد و هەستام. وتی:" شەممە دێم بۆ ئیستانبوڵ، دوانیوەڕۆکەی وەرە بۆ حەربیە با لەوێ یەکتر ببینین."

لە چوارچێوەی هەوڵەکانمان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، بۆ رۆژی شەممە١٩٩٣/٥/١٧ دیدارمان دانا. ئەو کاتە نەمدەزانی کە ئەمە دوایین قسەکانمان لەسەر ئەو بابەتە بوو. لەبەر ئەوەی فڕۆکەکە ئێمەی دەبرد بۆ ئیستانبوڵ، من دانەبەزیم. لە پەنجەرەوە سەیری خوارەوەم کرد، فەرشی سووریان بۆ سەرکۆمار راخستبوو. تورگوت ئۆزال بە چاودێری کردنی گاردی شەرەف بە رێ کەوت. ئەو کاتە نەمدەزانی ئەمە دوایین جارە کە دەیبینم.

رۆژی شەممە ١٩٩٣/٥/١٧، بەو هەواڵەی کە عەبدوڵا ئۆجالان لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانیدا لە قەزای بارئەلیاسی دۆڵی بیقاعی لوبنان بەبێ مەرج و بێ دەستنیشانکردنی هیچ وادەیەك ئاگربەستی درێژکردۆتەوە لە خەو هەستاین. لە بەیانیی هەمان رۆژدا، بەو هەواڵەی کە تورگوت ئۆزال سەرکۆمار جەلتەی دڵ لێیداوە و براوە بۆ نەخۆشخانە، هەموو تورکیا تووشی شۆك بوو. دوانیوەڕۆش، ئەو کاتەی کە بڕیاربوو لە حەربیە یەکتر ببینین، هەواڵی مردنی هات.

یەکسەر چووم بۆ ئەنقەرە. بەرەو ئێوارە کاتێ گەیشتمە کۆشکی چانقایا، پێیانگوتم سەرکۆمار ئەم بەیانییە بەر لە قاوەتی بەهۆی راوەستانی دڵەوە گیانی لە دەستداوە و ئەو کاتەش کە براوە بۆ نەخۆشخانە، کۆچی دوایی کردووە. چەند رۆژ دواتر، سەمرا ئۆزال[٤] هاوسەری ئان و ساتی مەرگی ئۆزال'ی بۆ گێڕامەوە. تورگوت

ئۆزال، چەند سائێك دوای ئەوەی کە سەمرا خان بۆ ئامادەکردنی قاوەتی بەجێی هێشتووە، کەوتبووە عەرز و گیانی لە دەسدابوو.

دەنگۆی نەبوونی جیهاز و کەرەستەی پێویست لە کۆشکی چانقایا و درەنگ هاتنی دکتۆر کە لەنێو خەڵك و رۆژنامەکاندا بڵاو دەبووەوە، راست نەبوو. سەمرا خان وتی جیهاز و کەرەستەی پێویست هەبوون و دکتۆریش لەکاتی خۆیدا هاتبوو، بەڵام "کار لە کار ترازا بوو، هیچ لە دەست نەدەهات." کاتی مەرگ هاتبوو، بۆیە هیچ نەدەکرا. رۆحی تورگوت بەگ هەر لەو ساتەدا دەرچووبوو.

سێ رۆژ دواتر لەبەردەم تەرمەکەی تورگوت ئۆزال کە لە تابووتێکدا لە پێش پەرلەمان دانرابوو، رێزی خۆم دەربڕی و چوومە ناو بینای پەرلەمان. لەبەردەم ئاسانسۆرەکەدا گرووپێك پەرلەمانتاری (HEP) پارتی رەنجی گەل'م بینی کە لەلای ئۆجالان گەڕابوونەوە. خۆشحاڵ بووم کە ئەوانم بینی. لەو دەفتەرەدا کە لە کۆشك بۆ تورگوت ئۆزال کرابووەوە، جوانترین رستەکان لەلایەن ئەوانەوە نوسرابوون. خەتیب دیجلە، هەر کە منی بینی یەکسەر وتی:" باش بوو کە ئێوەمان بینی. بە نیازبووین تەلەفۆنتان بۆ بکەین. کاتێ هەواڵی مەرگیمان پێگەیشت لەلای بووین. عەبدوڵا بەگ پێیوابوو ئەم رووداوە تیرۆرە. پێی گوتین لە جەنگیز بەگ بپرسن، ئەو باشتر لەهەر کەسێك دەزانێت. تورگوت ئۆزال تیرۆر کراوە؟"

خۆم کرد بە نابەڵەد و وتم:"کام عەبدوڵا بەگ؟"

- عەبدوڵا ئۆجالان!

- تا ئەو جێگەیەی من بزانم شتی وا روونەداوە. دەڵێن جەڵتەی دڵ لێیداوە و یەکسەر گیانی لە دەسداوە. بەداخەوە نەتوانراوە هیچ بکرێت...

- بەڵام ئۆجالان دەڵێت کە...

- من ئەوەی دەیزانم دەیڵێم. لەوانەیە پرسیاری سەرەکی ئەوەش بێت کە تورگوت بەگ چۆن توانی تا ئێستا بژی. دەزانن کە نەشتەرگەریی by-pass بۆ دڵی کرابوو. جگە لەوەش شێرپەنجەی چرووتستاتی گرت و دواتریش فشار و زەختی ئەم چەند مانگەی دواییش بە سەریدا هات. کار و گەشتی زۆریشی دەکرد. دوای ماوەیەکی زۆر، کاتێ لە تورکمانستان بینم، رەنگی سپی هەڵگەڕا بوو. هەر کە گەیشتین و نەگەیشتنە عەشق ئاباد هەندێك لە هاوڕێیان وتیان دەیبینن، تورگوت بەگ چەنێ شەکەت و ئەوگارە! بە راستیش بەوجۆرە بوو...

- بەڵام عەبدوڵا ئۆجالان...

تورگوت ئۆزال تۆزێك لەولاتر لە تابووتەکەیدا بوو، درێژکردنەوەی گفتوگۆکە بێ مانا بوو.

قسەکانی من بۆ پەرلەمانتارانی پارتی رەنجی گەل گرنگ نەبوون، بۆ ئەوان قەناعەتەکەی عەبدوڵا ئۆجالان پڕ بایەختر بوو.

دیاربوو کە قەناعەتی کوژرانی تورگوت ئۆزال، ئەویش لەکاتێکدا کە دەیویست کێشەی کورد چارەسەر بکات، تایبەتمەندییەکی کردەیی هەبوو. مرۆڤەکان زۆر جار زیاتر لەوەی بڕوا بە راستییەکان بکەن، قەناعەت بەو شتانە دەکەن کە خۆیان دەیانەوێت. دەزانرا کە تورگوت ئۆزال هەوڵ بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد دەدات. هەروەها ئەو قەناعەتەش باو بوو کە هەندێك هێز هەن کە نایانەوێت ئەو کێشەیە چارەسەر بکرێت. بۆیە ئەو بۆچوونەی کە پێیوابوو لەوانەیە ئەو هێزانەی چارەسەرییان ناوێت تورگوت ئۆزال‌یان لەناو بردووە، بۆ زۆر کەس بە روونکردنەوەیەکی وتادار دەهاتە پێش چاوە.

هەرچەندە ئیدیعای کوژرانی تورگوت ئۆزال لە سەرەتاکاندا زۆر بڵاونەبووەوە و کاریگەرییان نەبوو، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات و لەگەڵ دووبارەکردنەوەی ئەو قسەیە لەلایەن هەندێك لە ئەندامانی خێزانی ئۆزال، ئەو ئیدیعایانە بەهێزتر بوون. ساڵانێك دوای مەرگەکەی، بەرگری کردن لەوەی کە مەرگی ئۆزال رووداوێکی ئاسایی بووە، بە شتێکی ناجیددی دەهاتە بەرچاو. بەڵام د.جەنگیز ئاسڵان دکتۆری تورگوت ئۆزال بە منی وت کە لەم ماوەیەی دواییدا تەندروستیی تورگوت بەگ زۆر باش نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا پێدەچێ لە رووی سیاسییەوە بیرکردنەوە لەوەی کە لەوانەیە ئۆزال بە مەرگی خۆی نەمردبێت و کوژرابێت، بە کەڵکی هەندێ کەس دەهات. پێویستبوو مێژوو بەمجۆرە بینوسێت:

تورگوت ئۆزال نەمردووە، لەکاتێکدا کە دەیویست کێشەی کورد چارەسەر بکات کوژرا.

لەوانەیە هیچ کات راستی رووداوەکـە نەزانرێت، بەڵام هێشتا چلەی نەچووبوو کە لە ١٩٩٣/٥/٢٤دا، لە کەمینێکدا ٣٣سەربازی بێ چەك لە سەر جادەی بینگول کوژران و بەوەش ئاگربەست کۆتاییپێهات. ئەو شتەی کە تورگوت ئۆزال زۆر لێی دەترسا و لەنێو دوایین وتەکانیدا بە منی گوتبوو روویدا. تیرۆر دوو ئەوەندەی جاران زیادی کردبوو.

لەدوای کۆتاییهاتنی ئاگربەستەکە لە مایسی١٩٩٣ تا کاتی گیرانی ئۆجالان لە کینیا و هێنانی بۆ تورکیا لە ساڵی ١٩٩٩، لە تورکیا بە تایبەتی لە ناوچەی باشووری خۆرهەڵاتدا لافاوی خوێن جەستەی دەبرد. نزیکەی چل هەزار مرۆڤ و هەزارن قوربانیی رووداوی بکوژ نادیار، لە ئەنجامی پێکدادانەکان لەسەر کێشەی کورد گیانیان لە دەسدا. لەگەڵ دەزگای هێزە چەکدارەکاندا کە دەزگایەکی خاوەن رێز بوو، گومان کەوتە سەر زۆربەی دەزگاکانی تورکیا. دەوڵەت مافیا و چەتەی

دروستکرد و لە ساڵانی ١٩٩٠کاندا "جەنگی چەپەڵ" مۆری خۆیان لە تورکیا دا.

ئەمە ئەو راستییە بوو کە لەدوای ساڵی ١٩٩٩وە لە ساڵانی کۆتایی سەدەی بیستەمەوە بۆ مێژووی نوێی تورکیا بە جێ مابوو.

دە ساڵ پاش کزبوونەوەی هیواکانی چارەسەربوونی کێشەی کورد لەدوای تورگوت ئۆزال، ئەمجارەیان بەهۆی تایب ئەردۆغان'ەوە هیواکان زیندوو بوونەوە. باسکردنی کێشەکە لەلایەن ئەردۆغان لە مانگی ئابی ساڵی ٢٠٠٥دا لە دیاربەکر، چاوەڕوانییەکانی لە ناوبراو زیاتر کرد. بەڵام وەك کەسێك کە دەمزانی چۆن چاوەڕوانییەکان دەتوانن تێکشکانی گەورەی خەیاڵەکانیان لێبکەوتەوە کە ئەندازەکەی لە ئەندازەی چاوەڕوانییەکانیش گەورەتر بێت و بەوەش بگۆڕێت بە حەمامی خوێن و توندوتیژی، دوای ئەوەی کە پاش قسەکانی ١٢ی ئابی٢٠٠٥ی دیاربەکر هیچ جوڵەیەکم نەبینی، نیگەران بووم و داوای بینینی تایبەتیی تایب ئەردۆغان'م کرد.

لەکاتی گەڕانەوەدا لە لەندەن، لە بەشی تایبەتیی فڕۆکەکەدا بە بەرچاوی عاکیف بەکی و مستەفا کارائالی ئۆغڵو بە ڕێوەبەری رۆژنامەی یەنی شەفەق'ەوە لەگەڵ ئەردۆغان قسەم دەکرد.

سەرەتا راپۆرتەکەی عەدنان قاوەچی'م پێدا." دیارە رەحمەتی چەندە کەسێکی پاك و بەڕێز بوو. ئەویش وەك ئێوە خەڵکی قەرەدەنیز'ە. جگە لەوە سیاسەتمەدارێکی داهێنەر بوو. ئەمەی بۆ تورگوت بەگ ئامادە کردبوو. مادام کە ئێوەش سیاسەتمەدارن، لەوانەیە سوود لە زمان و نزیکایەتییەکەی وەربگرن. بە ئەرکی خۆمم زانی ئەمەتان پێ بدەم." بە وتەی دوایین قسەکانتان لە دیاربەکر چوومە ناو قسەکانم و هۆکاری بە پێویست زانینی ئەم دیدارەم بۆ روونکردەوە.

"قسەکانتان لە دیاربەکر و ئەو لاپەڕەیەی کە هەڵتان داوەتەوە زۆر گرنگە. ئێمە لەم دنیایەدا زۆر کۆنین. تەمەنمان بەم کێشەیەوە تێپەڕ کرد. بە واتایەك دەتوانین بڵێین بە خێرهاتن بۆ نێومان. بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە ساڵانێکە تێکەڵ بەم کێشەیە بووین، لایەنێکی هەیە کە لێی دەترسین. بەهۆی قسەکانتان لە دیاربەکر، بە جۆرێك ئاستی هیوا و چاوەڕانییەکان بەرز بوونەتەوە کە ئەگەر شتێك بە دوایدا نەیەت، ئەو هیوا و چاوەڕوانیانە دەبنە تێکشانێکی گەورەی خەیاڵەکان و ئەوەش وەك بوومڕانگ دەسووڕێتەوە و بریندارتان دەکات. ئەمەش هەم بۆ تورکیا و بۆ ئێوەش زۆر خراپ دەبێت. ویستم ئەم نیگەرانییە بە ئێوە بگەیەنم و پێتان بڵێم کە بەر لەوەی کات بە فیڕۆ بچێت، هەنگاوێك بنرێت و هەندێك شت بکرێن. ئەم بابەتە بۆ کاتێکی فراوان نابێت. بە تایبەت دوای ئەو قسانەی لە دیاربەکر کران... مادام ئەوەتان کرد پێویستە بە بێ لە کیس چوونی کات، بەردەوامەکەیشی بێت. چونکە ئەو قسانەتان هەندێك دینامیکی خستە جوڵە. سروشتی ئەم کێشەیە بەمجۆرەیە..."

تایب ئەردۆغان زۆر بە وردی گوێی دەگرت و بە دڵێکی کراوەوە دەستی بە قسە کرد و وتی:" لەوێ هەڵەیەکمان کرد. لەو کاردانەوانەی کە پیشاندران، بۆم دەرکەوت کە ناوهێنانی کێشەی کورد لەلایەن منەوە بێزاری دروستکردووە. دەبوایە شتێکی دیکەم بدۆزیبایەتەوە. چووزانم، وەك کێشە ئابوری و کۆمەڵاتییەکانی هاوڵاتییە بە رەگەز کوردەکان'م..."

خۆم پێ نەگیرا و قسەکەیم بڕی و وتم:" بەڕێز سەرۆك وەزیر! کێشەی کورد رێك ئەمەیە."

تایب ئەردۆغان بە نیگایەکی پڕ لە پرسیارەوە سەیری کردم و وتی:"چۆن؟" وتم:" کێشەی کورد پێناسەی زۆری هەیە. بەڵام سادەترین گوزارشتێك کە ناوەڕۆکی کێشەکە روونەکاتەوە بریتییە لە ناونەهێنانی کێشەکە. نەبوونی توانای گوتنی کێشەی کورد." نەمتوانی راوەستم، قسەکانم درێژەپێدا و وتم:" کاتێ وتمان کێشە ئابوری و کۆمەڵایەتییەکانی هاوڵاتییە بە رەگەز کوردەکانمان، باسی کێشە هاوبەشەکانی ´هاوڵاتیان لە تەکیرداغ، دەنیزلی، چانکری و گیرەسوون'یش دەکەین. وەك کێشەی کتێبی قۆتابخانەکان، گرفتی بنکەکانی تەندروستی. چووزانم، وەك کێشەی ئاوەڕۆ کە لەوانەیە لەهەریەك لەو شوێنانە هەبێت... رەگەزەکانیان چی دەبێ با ببێت، بۆ هاوڵاتیانی هەر چوار لای ئەم وڵاتە، ئەم کێشانە وەك یەکن. بەڵام کێشەی کورد، کێشەیەکی تایبەتە کە لە کوردبوونی هەندێك لە مرۆڤەکانەوە سەرچاوەی گرتووە. گرفتەکە لەوەدایە کە ناتوانرێت بەمە بگوترێت کێشەی کورد. ئێوە لە دیاربەکر واتان گوت و ئەوەش کارێکی دروست بوو..."

نیگەران ببووم لەوەی کە سەرۆك وەزیر لە وتنی کێشەی کورد پەشیمان بوەتەوە. دەترسام بگەڕێینەوە بۆ خانەی یەکەم. لەوەش زیاتر کەوتبوومە بارودۆخێکی سەیرەوە کە لە جیاتی ئەوەی قسە لەسەر ئەوە بکەم دوای دیاربەکر چی دەکرێت، هەوڵمدەدا باسی ئەوەی بۆ بکەم کە ئەوەی لە دیاربەکر کردوویەتی هەڵە نەبووە و کارێکی دروست بووە.

لەگەڵ ئەمەشدا تایب ئەردۆغان لەسەر دەستەواژەی "کێشە ئابوری و کۆمەڵایەتییەکانی هاوڵاتییە بە رەگەزە کوردەکانمان"پێداگری نەدەکرد، بەڵام ناکرێ بڵێم کە قسەکانی منیشی قبوڵ دەکرد. لەوانەیە ئەو بیری لە جەماوەری حزبەکەی، دەستەکانی دەنگدەرە نەتەوەگەراکان و تێگەیشتنی ناوچە جیاوازەکان کردبێتەوە. ئەو سیاسەتمەدار بوو، مێشکی بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی ئێمە کاری دەکرد. ئەو دەیتوانی هەندێك حیساب بکات کە هەرگیز بە عەقڵی ئێمەدا نەیەت. جگە لەوە، بە شێوەی ئاسایی لە رووی ئیمکان و کەرەستەکانی بەردەستیشەوە جیاوازیمان هەبوو. بۆ ئەوەی رێگایەکی ناوەڕاست بدۆزێتەوە وتی:"یەعنی، پێویستە شتێکی جیاواز بدۆزرێتەوە."

دوای ئەو گفتوگۆیەمان بەمجۆرە بیرم کردەوە: ئەگەر پرس کە چارەسەرکردنی کێشەی کورد بێت،

نابێ بە ئەندازەی تورگوت ئۆزال پشت بە تایب ئەردۆغان ببەسترێت. نابێ بێ ئومێد بین بەڵام پێویستە زیاتر وریا بین.

بۆ زیندووبوونەوەی هیوا و چاوەڕوانییەکانمان، پێویستبوو چوار ساڵی دیکە چاوەڕێ بین. لە کۆتایی مانگی٧ و سەرەتای مانگی ٨ی ساڵی ٢٠٠٩دا کرانەوەی کوردی دەستپێکرد. "کرانەوەی کوردی" بە ناونیشانی خۆی...

هەر لە یەکەم ساتەکانی دەستپێکردنی ئەم کرانەوەیەدا، پارتی گەلی کۆماری و پارتی بزوتنەوەی نەتەوەگەرا، دوو پارتی ئۆپۆزیسۆن کە دوو شکڵی جیاوازی نەتەوەگەرایی دەوڵەتیان وەرگرتووە، زیاتر لەو ئەندازەیەی کە چاوەڕوانی دەکرا کاردانەوەیان پیشاندا و ناڕەزاییان دەربڕی. وەك چۆن بە تورگوت ئۆزال‌ی‌ش کرا بوو، تایب ئەردۆغان بە "دابەشکردنی وڵات" تۆمەتبار دەکرا و هەڕەشەی ئەوەی لێ دەکرا کە بە تۆمەتی"خیانەت بە نیشتمان" رەوانەی "دادگای باڵا - دیوانی باڵا" دەکرێت.

هەر لە سەرەتاکانی "کرانەوەی کوردی"دا سەرۆك وەزیر یەکسەر زمانەکەی گۆڕی و ناوەکەی کرد بە"کرانەوەی دیموکراتی" و بەوەش گفتوگۆکەی ٢٠٠٥/١٠/٢٨ی رێگای لەندەن-ئەنقەرە‌ی خۆمانم بیرکەوتەوە. تایب ئەردۆغان هەنگاوی بۆ دواوە دەنا و دەستی بە پاشەکشە کردبوو. وادیاربوو ئەمەش دیسان کات بە فیڕۆدانێکی ناپێویستبوو کە گران تەواو دەبوو.

تەمەنی"کرانەوەی دیموکراتی"ش لەسەر زاری ئەردۆغان زۆر نەبوو. لەکاتێکدا کە بە تەواوی وازی لە"کرانەوەی کوردی" هێنابوو، دەستەواژەی"چرووتژەی برایەتی و یەکێتی و پێکەوەبوونی نەتەوەیی" بەکار هێنا. ئەم فۆرمولەی پەسند کردبوو. کێ لەبەر چی، ناڕەزایی لەسەر"برایەتی" و" یەکێتی و پێکەوەبوونی نەتەوەیی" دەردەبڕی؟

لەو کاتانەداکە ناوی"چرووتژەی برایەتی و یەکێتی و پێکەوەبوونی نەتەوەیی"لە دەستپێشخەرییەکە نرا، لە دڵی خۆمدا وتم:"لە ماوەی کورتخایەندا کێشەی کورد چارەسەر ناکرێت."

خۆی گومان هەبوو لەسەر ئەوەی کە چرووتژەیەك بۆ چارەسەری لە ئارادا بێت. چونکە چرووتژەی چارەسەری پێویستی بە پلانێکی فراوانی چارەسەری و کاتێکی دیاریکراو بۆ جێبەجێکردنی هەبوو. هەموو ئەمانەش، واتای هەبوونی دیدگایەکی فراوان، ئیرادەی سیاسی و لەوەش گرنگتر واتای ئازایی سیاسی دەدا. لە تورکیا بەشێك لە رەگەزە پێویستەکان بۆ چارەسەریی هەبوون، بەڵام بەشێکی زۆریان نەبوون.

بە ڕێوەبەرانی تورکیا، نەیاندەتوانی بە کێشەی کورد بڵێن کێشەی کورد و بۆ ئەوەی کە ئەوەش نەڵێن دەیان پاساویان دەهێنایەوە. رۆژی ٢٠٠٨/١٠/١٧، ئیلکەر باشبوغ فەرماندەی گشتی سوپا،

بە مەرجی نهێنی مانەوەی قسەکان، بانگی کردم بۆ ئەوەی تەنها لەسەر ئەم پرسیە قسە بکەین. دوو کاتژمێر و نیو پێکەوە قسەمان کرد. لەو ماوەیەدا تەنها یەك جاریش وشەی"کورد"ی نەهێنایە سەرزمان و زۆر بە وریاییەوە خۆی لە وتنی ئەو وشەیە دەپاراست. ژەنراڵ باشبوغ لە قسەکانیدا بۆ دەسەڵاتی کوردستان،ی عێراق، دەستەواژەی"بەڕێوەبردنی لۆکاڵیی لە باکووری عێراق" و بۆ کوردەکان٬ی تورکیا٬ش دەستەواژەی" هاوڵاتیانی ناوچەکە"ی بەکاردەهێنا.

بەڕێوەبردنی لۆکاڵیی - ناوچەیی لە زمانی تورکیدا بۆ ئاماژەدان بە شارەوانییەکان بەکار دەبرێت. چەند جارێك ویستم بڵێم مەسعود بارزانی سەرۆکی شارەوانی هەولێر نییە. راستە، کوردەکان٬ی تورکیا٬ش" هاوڵاتی"ئێمەن بەڵام بۆچی بە شوناسەکەی خۆیانەوە باسیان ناکرێت؟

خۆی لە خۆیدا کێشەی کورد لە نکۆڵیکردن لەم شوناسەوە سەرچاوەی گرتبوو. هەرچەندە باس لەوە دەکرا کە ئیدی نکۆڵیکردن لەم شوناسە نەماوە، بەڵام هەتا دە ساڵی یەکەمی ٢٠٠٠کانیش گوتنی "کورد" بە روونی و بە راشکاوی و بەکارهێنانی ئاوەڵناوی نەرم لەگەڵ ئەم وشەیەدا، کێشە بوو.

کێشەی کورد بە هەموو رەهەندەکانیەوە، ئەمە بوو: کێشەیەك کە ناوی لێ نانرێت یان لەبەر ئەوەی کە ناوەکەی دەوترێت کێشەیە.

کێشەی کورد...

٢

# قسەکردن لەسەر کێشەی کورد لە بارەگای فەرماندەیی گشتی سوپا

■ ■ ■



**دروستکردنی دەرەفەتی شکست نەخواردن لە دەستی خۆمان دایە. بەڵام شکستدانی دوژمن تەنها بەو دەرفەتانە دەکرێت کە ئەو دەیان ڕەخسێنێت.**

سون تزوو (ژەنراڵ و ستراتیژیستی سەربازی چین-٤٠٠پ.ز)

**نهێنی هەموو سەرکەوتنەکان، پێشبینی کردنی ئەو شتەیە کە چاوەڕوان ناکرێت.**

مارکووس ئاورەلیوس

ژەنراڵ ئیلکەر باشبوغ فەرماندەی گشتی سوپا لەبەر دەرگای ژوورەکەی خۆیدا بە پێوە پێشوازی لێکردم. دەبوایە رێك کاتژمێر ١٥:٠٠ی دوانیوەڕۆ بێت و تەنانەت چەند چرکەیەکیش کەم و زیادی نەبێ و بە گوێرەی کاتی دیاریکراوی دیدارەکەمان بێت. لەبەر ئەوەی کە دوو خولەك پێشتر هاتبوومە شوێنی دیدارەکەمان، تۆزێك لە شوێنێکی بچووك و تایبەتی تەنیشت ژووری رەسمی فەرماندەی گشتی سوپا چاوەڕێ مامەوە.

لە ساڵی ١٩٩٢دا دوای هێرشێکی خوێناوی پ.ك.ك لە قەزای چوقورجا بۆ سەر بنکەیەکی سەربازی لە سنور، لەگەڵ تورگوت ئۆزال سەرکۆماردا سەردانێکی ئەوێمان کرد و دوایی هاتینە وان بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ ئەنقەرە. بەڵام من تۆزێك درەنگ کەوتم و نەگەیشتمە فڕۆکەی رێگا ئاسمانییەکانی تورك، چونکە فڕینەکانیان بە بەرنامە بوو. لەو رووداوەوە بۆم دەرکەوت کە سەربازەکان بە ئەندازەیەکی زۆر، لە پرسی کاتدا ورد و هەستیارن.

ئەو کۆپتەرەی کە ئێمەی لە هێڵی سنوری هەککاری - باکووری عێراق دەهێنا بۆ وان، دواکەوت. سەرکۆمار بەرەو لای فڕۆکەی تایبەتی خۆی رۆیشت و منیش لەگەڵ گرووپێك رۆژنامەنوسدا بەرەو لای فڕۆکەیەکی دیکە چووم. بەڵام فڕۆکەکە فڕی بوو. فڕۆکەیەکی سەربازیش کە فەرماندەکانی سوپای دەبردەوە بۆ ئەنقەرە، هێشتا لە پیستەکەدا بوو. بۆ ئەوەی بزانین لە فڕۆکەی ژەنراڵەکاندا جێگا هەیە یان نا و ئەگەر جێگاش هەیە سوارمان دەکەن یان نا، لەبەر تەمەن و پلە و پایەی زیاتر، لەنێو هاوکارانمدا ئەرکی پرسیارکردن کەوتە سەرشانی من. سواریان کردین. تۆزێك دوای فڕینی فڕۆکەکە، دیسان لەبەر تەمەن و پلە و پایەی زیاتر، دەعوەت کرام بۆ ئەوەی لەگەڵ محێدین فیسوون ئوغلۆ فەرماندەی هێزی وشکانی و ژەنراڵ ئەشرەف بتلیسی فەرماندەی گشتی ژەندرمە لە بەشی پێشەوە دانیشم. ئەو بەشەی کە بۆ فەرماندەکانی سوپا تەرخان کرابوو، بە جۆرێك دیزاین کرابوو کە دوو سەعاتی گەورەی خڕ لە تەنیشت یەك دانرابوون. یەکێکیان کاتی فڕینی پیشاندەدا و ئەوی دیکەشیان بە چرکە کاتی نیشتنەوەی بە گوێرەی کاتی شوێنی مەبەست دەردەخست. ژەنراڵ فیسوون ئوغلۆ بە لەفزێکی بەخۆنازینەوە وتی:" دەتوانن سەعاتەکەی دەستتان رێك بکەن. سەیری کاتی نیشتنەوە بکە، چرکەیەکیش هەڵەی تێدا نییە." بە راستی چرکەیەکیش هەڵەی نەبوو. لەو ماوەیەی کە لە وان'ەوە بۆ ئەنقەرە دەهاتین، قسەکانم لەگەڵ ژەنراڵ فیسوون ئوغلۆ

بەو چەند رستەیەوە سنوردار مانەوە. لە رێگا، زیاتر لەگەڵ ژەنرال ئەشرەف بتلیسی قسەم کرد کە چەند مانگ دوای ئەو گەشتەمان بەشێوەیەکی گوماناوی لە رووداوێکی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەدا گیانی لە دەسدا. لەگەڵ ژەنراڵ ئەشرەف بتلیسی، لەسەر کێشەی کورد کە تێکەڵاوی پرسی پ.ك.ك بووە و هەروەها لەسەر رێگاکانی بەرەنگاربوونەوەی پە.ك.ك قسەمان کرد. هەتا ئەو کاتەی کە تایەکانی فڕۆکەکە وەك بڵێی چرکەکانی سەعاتی نیشتنەوە پشتڕاست بکەنەوە لە عەرزیان دا، ئێمە لەسەر ئەو بابەتانە قسەمان کرد.

دوای تێپەڕبوونی شانزە ساڵ، بۆ قسەکردن لەسەر هەمان پرس، ئەمجارەیان لەلایەن ژەنراڵ ئیلکەر باشبوغ فەرماندەی گشتی سوپا بانگهێشت کرابووم. لەوەش زیاتر تا ئەو جێگایەی کە بیستبوومەوە، فەرماندەی نوێی سوپا کە لە بوارە سیاسی - سەربازییەکاندا بە"شاهین" یان توندڕەو ناودەبرا و حەزی لە من نەدەکرد.

لە رای گشتیدا قەناعەتێکی وا هەبوو کە هێزە چەکدارەکانی تورك حەساسییەتیان بە من هەیە و لەبەرامبەرمدا زۆر هەستناکن. دیارە لای کەس شاراوە نەبوو کە هۆکاری ئەمەش بۆ بیر و بۆچوون و هەڵوێستەکانم لەبەرامبەر پرسی کورد دەگەڕایەوە. جگە لەوە، لە ساڵی ١٩٩٨دا، لەو رووداوەدا کە بە "درەیفووسی تورکیا" لە قەڵەمی دەدەم، من لە ئامانجەکانی پیلانە چەپەڵەکەی فەرماندەیی گشتی سوپا دا بووم. ئیدیعای ئەوە کرابوو کە گوایە ئێمە پارەمان لە پ.ك.ك وەرگرتووە. ئەمە بوختانێکی سووك و هیچ و پووچ بوو. دواتر لە ساڵی ٢٠٠٠دا دەرکەوت کە ئەمە "ئۆپەراسیۆنێکی دەروونی" بووە بە ناوی "یادداشت" کە لە بینای فەرماندەی گشتی سوپا ئامادە کرابوو. بەهۆی ئەو هەلومەرجە دەروونییەی کە قازانی جادووگەری دروستیکردبوو، ئاکن بیرداڵ سەرۆکی کۆمەڵەی مافی مرۆڤ کە وەك من کرابووە ئامانجی ئەو پیلانە، لەلایەن چەتەیەکی میلیشیایی - فاشیستی کە وابەستەی هەندێك لە ئەندامانی سوپا بوون، کەوتە بەر هێرشی چەکداری و بریندار کرا. سیانزە گوللەیان لە جەستەی دەرهێنا و سەرەڕای ئەوەی کە جەستەی وەك جاران نەما، بەڵام بە موعجیزەیەك لە ژیاندا مایەوە.

من شانسی زیاترم هەبوو. ئاکن بیرداڵ وەك پاراتۆنەر (paratoner: ئاسنێکی خڕ کە کارەبا لە خۆی کۆدەکاتەوە) هەموو ئەو گوللەیانەی بۆ خۆی راکێشابوو کە بڕیاربوو لە جەستەی من بدرێن. لەگەڵ ئەوەشدا، لەلایەك لەبەر ئەوەی لە وڵاتی خۆمدا، بەهێزترین دەزگا بە بێشەرمانە هێرشی کردۆتە سەرم و لەلایەکی دیکەوە لەبەر بێدەنگی و ملکەچیی بێزارکەری هاوپیشەکانی خۆم نیگەران بووم. بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت بڵاوکردنەوەی نوسینەکانم راگیرابوو. دوای ئەوەش کە بەشێوەیەکی سنوردار دەستم بە نوسین کردەوە، جێبەجێکردنی چرووتژەیەك کەوتە مێشکەم کە ماوەیەکی درێژبوو بیرم لێ دەکردەوە: بۆ ماوەیەك رۆیشتن بۆ ئەمریکا و کارکردن لە ناوەندە فیکرییەکاندا لە واشنتن. چاودێریکردنی دنیا و وڵاتەکەم لە دەرەوە.

هەر وەهام کرد. سەرەڕای ئەوەی کە جاربەجار هاتوچۆم دەکرد، ماوەی یەك ساڵ و نیو لە وڵاتەکەم دوورکەوتمەوە. ئەو کاتەی گەڕامەوە، پیلانەکەی فەرماندەیی گشتی سوپا لە دژی من ئاشکرا ببوو. لەو کاتانەدا کە تاجی سەرکەوتنم دەکردە سەر، بەهۆی جیاوازەوە و لەبەر ئەوەی کە بەینیان لەگەڵ فەرماندەیی گشتی سوپا خۆش بمێنێتەوە، بە ڕێوەبەرانی ئەو رۆژنامەیەی ئیشم تێدا دەکرد، منیان لەسەر بەردی قوربانیکردن دانا. لەو رۆژنامەیەدا پانزە ساڵ ئیشم کردبوو، بە نیازیش بووم هەتا خانەنشینی لەوێ بمێنمەوە، بەڵام ئیشەکەی ئەوێم لە دەسدا.

لە روانگەیەکەوە، دوای رابردوویەکی وەها بانگهێشت کردنم لەلایەن ئیلکەر باشبوغ فەرماندەی گشتی سوپا بۆ قسەکردن لەسەر"کێشەی کورد" یان بە واتایەکی دروستتر، بۆ قسەکردن لەسەر نزیکبوونەوەی تورکیا - کوردستان'ی عێراق کە گەورەترین ئایدیالی ژیانم بووە، شتێکی دوور لە راستی دەهاتە بەرچاو. بە گوێرەی هەندێك لە هاوڕێ نزیکەکانیشم کە ئاگایان لە دیدارەکە هەبوو، ئەم رووداوە وەك شۆڕشێك وابوو.

هەڵبەت لە سەرەتادا بۆ من و بۆ میدیای تورك'یش هەروا بوو... کاتێ کە دیدارەکەم لەگەڵ ژەنراڵ باشبوغ زانرا، زۆر دوام کەوتن. بەڵام رێك لەو رۆژانەدا گەشتێکی ئەفغانستان'م کرد و لەوێشەوە چووم بۆ ئەمریکا بۆ ئەوەی سەیری هەڵبژاردنی سەرۆك ئۆباما بکەم و بەوجۆرەش بۆ ماوەیەکی درێژ شوێنەپێی خۆم ونکرد. وەك چۆن پێشبینیم کردبوو، دوای ماوەیەك گۆڕانکارییە سەیر و خێراکانی تورکیا، مەراق و سەرنجی رای گشتی لەسەر دیدارەکە لابردبوو.

دواتر لە ۲۰۱۰/۸/۱۰دا لە رێی چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەی تەرەف لەگەڵ جەواد ئوینەش راوێژکاری پێشووی میت'ەوە زانیم کە دیدارەکەی من لەگەڵ ژەنراڵ ئیلکەر باشبوغ فەرماندەی گشتی سوپا لە ۲۰۰۸/۱۰/۱۷، پەیوەندی بە نزیکایەتییەکی جیاوازی هێزە چەکدارەکانی تورکیا بۆ بە وتەی خۆیان"پرسی تیرۆر"ەوە هەبوو:

"۱- قۆناخێك لەدوای گیرانی ئۆجالان لە ساڵی ۱۹۹۹، لە کۆنترۆڵی سوپادا بەرەو پێش دەچوو. بەڵام میت و ئاسایش لەوەدا رۆڵی یەکلاکەرەوەیان نەبوو. ۲- لە ساڵی ۲۰۰٦ەوە کە سیاسەتی مەدەنی هاتە پێشەوە، جاربەجار لەگەڵ ئۆجالان دانوستان کرابوو. ۳- لەوانەیە بەر لە چرووتژەی کراونەوەی دیموکراتی، لە ساڵی ۲۰۰۸ەوە هەندێك دیدار ئەنجام درابێت. قۆناخی ساڵی ۲۰۰۸، قۆناخێکە کە تێیدا هێزە چەکدارەکانی تورکیا قبوڵی کردووە کە تیرۆر تەنها لە رێگەی چەکەوە چارەسەر ناکرێت. یانی لە دەرەوەی کۆنسێپتی سەربازی و ئەمنی، پێویستە لە رووی ئابوری، سیاسی، دەروونی، دیپلۆماتی و...تاد، چارەسەر بۆ ئەم کێشەیەبدۆزرێتەوە..."

وادەردەکەوت کە هێزە چەکدارەکانی تورکیا تازە لە ۲۰۰۸دا، ئەویش بەشێوەیەکی شەرمنانە گەیشتبووە

ئەو خاڵەی کە ئێمە ساڵانێك بەرگریمان لێ دەکرد.

وەکو پیاوێك کە دە ساڵ پێشتر، لەلایەن فەرماندەیی گشتی سوپاوە وەك ئامرازێکی "جەنگی دەروونی" بوختانی پارە وەرگرتنم لە پ.ك.ك، درابووە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بۆ ئەوەی بڵاو بکرێتەوە، ئەمجارەیان بۆ گفتوگۆکردن لەبارەی" چۆن دەتوانین ئەم کێشەیە چارەسەر بکەین؟"و بۆ وەرگرتنی بیروڕاکانم، وەك "میوانی بەڕێزی" خۆیان واتەنی"سەرۆکی یەکەم" پێم دەنایە ناو بینای فەرماندەیی گشتی سوپا.

کاتژمێر ۱٥:۰۰ی دوانیوەڕۆی هەینی ۲۰۰۸/۱۰/۱۷ بە بێ ملکەچی و بە ئاسوودەیی و متمانەبەخۆیی هەڵوێستە سیاسییەکەمەوە لەبەرامبەر فەرماندەی گشتی سوپای تورکیا دەرکەوتم. لەبەردەم دەرگای ژوورەکەیدا، بەپێوە، بەڕێزەوە پێشوازی لێ کردم. یەکسەر هەستم بەوە کرد کە ژەنراڵ ئیلکەر باشبوغ بە باڵابەرزەکەیەوە، سەرەڕای ئەوەی کە تەمەنی زۆرە، جەستەیەکی وەرزشکارانە و لەسەر خۆی هەیە.

لە کەش و هەوایەکی دوور لە گرژیدا تەوقەمان کرد. لەنێو ژوورە درێژ و پانەکەیدا بە دەست ئاماژەی بەشوێنی دانیشتن کرد. منیش لەو سەری قەنەفەکە دانیشتم و ئەو لەسەر کورسییەکدا لەبەرامبەرم دانیشت. درکم بەوە دەکرد لە ژوورێکدام کە لای زۆر کەس لە ژووری سەرکۆمار و سەرۆك وەزیری کۆماری تورکیا'ش گرنگترە. لانیکەم هەتا درێژەکێشانی ڕژێمی سەرپەرشتی سەربازی لە مانگی ۱۰ی ۲۰۰۸یشدا بەوجۆرە بوو. هەرچەندە لە سەردەمی ئیلکەر باشبوغ'دا دەستوەردانی سەربازی لە سیاسەت رووی لە کەمبوونەوە کردبوو، بەڵام تا ئەو کاتە و لە مانگی ۱۰ی ۲۰۰۸یشدا هەرکەسێك لەوێ بوایە، مومکین نەبوو کە هەست نەکات ئەو ژوورە گرنگترین و پڕ نهێنیترین ژووری بڕیاردانە لە کۆماری تورکیا، بە تایبەت ئەگەر کێشەی کورد بابەتی قسە بێت.

بەر لەوەی بچینە سەر باسەکە، لەگەڵ ژەنراڵ ئیلکەر باشبوغ'دا بۆ خۆ ئامادەکردن، پرسیاری تەمەن و ساڵی تەواوکردنی خوێندنی باڵا و چ ساڵێکمان لە کوێ تێپەڕ کردووە، لە یەکتری کرد. ئەو وای دەزانی هاوتەمەنین و منیش پێموابوو ئەو چەند ساڵێك لە من گەورەترە. قسەکەی من دەرچوو. ئەوەشمان زانی کە لە یەك کاتدا، پێکەوە لە هەندێك شوێنی نزیك ژیاوین. خاڵە هاوبەشەکانی ژیانی گەنجێتیمان زانی. تا ئەو کاتەی کە هاتینە سەر باسە سەرەکییەکەمان، هەردووکمان وەك ئەوەی بمانەوێ خاڵی هاوبەشی زیاتر لە سەردەمی گەنجیماندا بدۆزینەوە قسەمان دەکرد.

لەکاتێکدا کە چاوەڕوانیم لێ نەدەکرد، ژەنراڵ ئیلکەر باشبوغ ڕاستەوخۆ بە ڕاستی و سادەیی وتی:" لەبارەی پ.ك.ك'وە هەڵەمان کرد. وتمان لە ناویان دەبین و دایان دەپلۆسێنین و بەوجۆرەش چاوەڕوانییەکی نابەجێمان لەنێو خەڵکدا دروستکرد. بەڵام ڕێکخراوی وەها بە تەواوی لەناو ناچن. گرنگ ئەوەیە پ.ك.ك دابەزێنینە ئاستێك کە بتوانین پەسندی بکەین."

- چۆن؟

- بۆ نموونە وەك DHKC (و: بەرەی شۆڕشگێڕی ڕزگاری گەل). ئەم ڕێکخراوە هێشتا ماوە؟ بەڵێ ماوە. کاری تیرۆریستی دەکات؟ بەڵێ دەیکات، بەڵام DHKC ئیدی ڕێکخراوێك نییە کە وەك هەڕەشە باسی لێ بکرێت.

جار بەجار ئەم ڕاستییەی لە گفتوگۆ دوو کاتژمێر و نیوییەکەماندا دووپات دەکردەوە. بۆچوونێکی سەرنجڕاکێشی باس کرد و وتی:"لە بنەڕەتدا پ.ك.ك جوڵانەوەی گوندییەکانە."هێزی خۆی لە ناوچە گوندنشینەکان و چالاکییەکانی لەو ناوچانە بەدەستهێناوە. پێشتر موحسین قزڵکایا'ی هاوڕێم کە خەڵکی هەکارییە و یەکێکە لە گرنگترین نوێنەرانی کەلتووری کوردی لە تورکیا، ئەو بۆچوونەی بۆ من باسکردبوو. لە مەراسمێکدا کە بۆ یادکردنەوەی محەمەد ئوزون لە پاش مەرگی کۆ ببووینەوە، موحسین بۆ پ.ك.ك وتی:"وزەیەکی گەورەی هەیە. ئەم وزەیەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە پ.ك.ك نەفرەت و کینەی سەدانساڵەی گوندییە کوردەکان'ی لەبەرامبەر میر و ئاغا و بەگەکانیان خستۆتە جووڵە کە زوڵمیان لێکردوون. وزەی ئەم گوندییانە کە پ.ك.ك نوێنەرایەتییان دەکات، زیاتر لە دەوڵەتی تورك لە دژی دەسەڵاتدارەکانی خۆیانە و لەسەر یەك کەڵەکە بووە."

لە ڕاستیشدا یەکەم جوڵانەوەی چەکداری پ.ك.ك لە دژی سەرکردەکانی خێڵی بوجاق لە سیوەرەك بوو. وابەستەیە خێڵەکییەکان ستوونی سەرەکی کۆمەڵگای کوردی'یە و پ.ك.ك ئەوەی کردۆتە ئامانج. بۆیە لەم ڕوانگەیەوە دەتوانرێت وەك جوڵانەوەیەکی"مۆدێرنیست" سەیر بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا وتەکەی فەرماندەی گشتی سوپای تورك سەبارەت بەوەی کە"پ.ك.ك لە بنەڕەتدا جوڵانەوەی گوندییەکانە."دروست بوو.

نیگەرانی ئیلکەر باشبوغ هەر لەم خاڵەوە دەستی پێدەکرد: پەلکێشانی پ.ك.ك لە ناوچە گوندنشینەکانەوە بۆ شارەکان. بە ڕای فەرماندەی گشتی سوپا" ئەگەر شتێکی وەها ڕووبدات، دەبێتە مەترسییەك کە لەوانەیە تورکیا کۆتایی پێ بهێنێت."زانیم کە مەبەستەکەی چییە و دەستەواژەی پێکدادانی ناو کۆمەڵگا (Inter-communal)م بە زمانی ئینگلیزی هێنایە سەرزمان و وتم دیارە مەبەستتان ئەمەیە. ئەویش پشتڕاستی کردەوە.

سەرەڕای هەموو شتێك "کێشەی کورد" بۆ پێکدادانی کورد - تورك نەگۆڕا بوو. بەڵام ئەگەری هەبوو کە ئەوە ڕووبدات و درز بکەوێتە ناو پێکهاتەی کۆمەڵگا و مەترسییەکی گەورە ڕووی تێبکات. ژەنراڵ ئیلکەر باشبوغ لە ڕێی ئەم تێبینییانەی خۆیەوە هاتە سەر گرنگی ڕێگرتن لەوەی کە پ.ك.ك ببێتە ڕێکخراوێکی شاری. بۆ ئەوەی واتا بەمە بدات و پشتگیری بۆ قسەکانی دابین بکات، کتوپڕ وتی:"بە ڕای ئێوە پ.ك.ك

سەرکەوتوو بووە؟"

بە گاڵتەوە وتم:"کەس ئاگای لە قسەکانمان نییە؟ بە مەرجی تۆمار نەکردنی قسەکانم، بە رای من بەڵێ."
باشبوغ وتی:" بە رای منیش سەرکەوتووە." بەڵام ئەو بە ئامارەوە شتێکی دیکەی باس دەکرد.

-"ماوەی نزیکەی بیست و پێنج ساڵە، دەوری چل هەزار مرۆڤ کوژراون. بە شێوەی رێژەیی پێنج هەزار کەسیان سەرباز، پۆلیس و پاسەوانەکانی گوند بوون کە شەهید بوون. پێنج هەزار کەسیان هاوڵاتی مەدەنی بوون و سی هەزار کەسی دیکەش لەلایەنی بەرامبەر بوون کە بەشێکیان کوژراون، یان تەسلیم بوون و سەنگەریان گواستۆتەوە یا خود دەسگیرکراون. ئەمە واتای چییە؟ ساڵانە هەزار کەس لە ناو دەبەیت و بێ کاریگەرییان دەکەیت. بەپێی جەنگە ناسراوەکان، لە شەڕێکی وەهادا، ئەمە بۆ سوپایەکی مونەزەم سەرکەوتنێکی گەورەیە. سەرکەوتنی هێزە چەکدارەکانی تورك بۆ ئەوە دەشێت کە لە ئەکادیمییە سەربازییەکاندا وەکو دەرس بخوێنرێت. لەو کاتەدا کە پ.ك.ك گەیشتوەتە لوتکە، ژمارەی ئەندامەکانی لەسەر چیا ٦٥٠٠ کەس بوون. ئێستاش هەر ئەوەندەیە. سەرەڕای ئەم سەرکەوتنە سەربازییە هێشتا پ.ك.ك کەم تا زۆر دەتوانێت هێزە چەکدارییەکەی وەك خۆی بهێڵێتەوە..."

- مەبەستتان لە ٦٥٠٠کەس ئەوانەن کە تەنها لە قەندیل'ن؟

- بە گشتی، لە ناوخۆ و لە دەرەوە.

ئەو ئامارەی کە فەرماندەی گشتی سوپای تورك لەبارەی ئەندامانی پ.ك.ك لە ساڵی ٢٠٠٨دا بە منی دا، دوو ساڵ دواتر لە ٢٠١٠/١١/١٠دا لەلایەن موراد قەرەیڵان کەسی ژمارە یەکی پ.ك.ك لە چیای قەندیل پشتڕاست کرایەوە.

لە بەرواری ٢٠١٠/١١/١٠دا لە کۆتاییەکانی دیدارێکی درێژی شەش کاتژمێر و نیویدا، بە سوود وەرگرتن لە کەشی لەباری دیدارەکە یەکسەر بە موراد قەرەیڵان'م گوت:"ئەگەر شتێکی نهێنی نییە دەتوانی پێم بڵێی ژمارەی هێزە چەکدارەکانی پ.ك.ك چەند کەسن؟" بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامەکەی بم، وتم:"کێشەی ئەوەم نییە کە نهێنییەکی ئێوە بزانم، ئەوەم پرسی چونکە دەمەوەی پرسیارێکی دیکە بکەم. ئەگەر وەڵامەکەی گرفت درست دەکات هیچ کێشەیەك نییە من هەر دەتوانم پرسیارەکەی خۆم بکەم."

موراد قەرەیڵان لەسەر ئەم پرسیارە کتوپڕ و بوێرانە تۆزێك راوەستا و بە پێکەنینەوە رووی کردە بۆزان تەکین و ڕووناهی سەرحەد کە لە تەنیشتی دانیشتبوون و وتی:"نهێنییە؟"

دیارە قسەی کۆتایی هەر هی خۆی بوو. بۆیە هەردوو جێگرەکەی هیچ جوڵەیەکان بە دەم و چاویان نەکرد. دوای تۆزێك راوەستان موراد قەرەیڵان وتی:"نزیکەی ٧هەزار کەس."

- ئەمە تەنها ئەوانەن کە لەسەر چیان؟ هێزەکانی ناو چیاکانی ناوخۆی تورکیا'ش دەگرێتەوە؟

- لە ناوخۆ و دەرەوە. بەگشتی ئەوەندەیە. ئەو کەسانەی کە لە بواری تەندروستیدا کاردەکەن، لەگەڵ چێشت لێنەر و شۆفێر و..تاد، بە گشتی حەوت هەزار کەسن. بەڵام وەك هێزی جەنگاوەر با بڵێین ٤٥٠٠ کەسن. ئەو ژمارەیەی کە موراد قەرەیڵان لەسەر ئەندامانی حزبەکەی بە منی دا، لەو ژمارەیەی کە ئیلکەر باشبوغ لە ژوورەکەی خۆیدا لە ئەنقەرە بە منی دا، زۆر جیاواز نەبوو.

دوای نزیکەی دوو مانگ لە تەواوبوونی وادەی سەرۆکایەتییەکەی لە فەرماندەیی گشتی سوپا، ئیلکەر باشبوغ لە کەناڵێکی تەلەفزیۆنیدا لە وەڵامی پرسیاری "بۆچی تورکیا ماوەی بیست و شەش ساڵە نەیتوانیوە رێکخراوی تیرۆریستی پ.ك.ك لە ناوبەرێت؟"دا ئەم وەڵامەی دایەوە:

"لە رووی ئەمنییەوە لە ساڵی ١٩٨٤ەوە تا ٢٠١٠، بیست و شەش ساڵ تێپەڕ بوو. چی روویدا؟ هەندێك جار پێویستمان بە ژمارە و ئامارەکانیش هەیە. لە بیست و شەش ساڵدا، سی هەزار تیرۆریست لە ناو دەبەن و بێ کاریگەریان دەکەن، جگە لەوە دە هەزار بریندار و خۆ بەدەستەوەدەریش هەیە کە بە گشتی چل هەزار کەس دەکەن. ژمارەی کادیرانی سەر شاخی رێکخراو بەپێی ساڵەکان دەگۆڕێت. بەشێوەی رێژەیی دەڵێین شەش هەزار کەسن و لە بەرزترین ئاستیشدا گەیشتوەتە دە هەزار کەس. ئێستاش نزیکەی چوار هەزار کەس دەبن. ئەگەر بەشێوەی رێژەیی بڵێین شەش هەزار کەسن و سی هەزار کەس دابەشی شەش هەزار کەس بکەین دەکاتە پێنج. ئەگەر لە رووی بیرکارییەوە سەیری بکەین، هێزە ئەمنییەکان تا ئێستا پێنج کەڕەت رێکخراوی تیرۆریستی پ.ك.ك'یان لەناو بردووە. ئەمە خاڵێکی حاشا هەڵنەگرە."

باشبوغ لە هەمان چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنیدا باسی خاڵێکی دیکەیشی کردبوو کە لە دیدارەکەماندا بە منی نەگوتبو:" کەوابوو ئەو پرسیارە هەیە کە بۆچی تا رۆژی ئەمڕۆ بەردەوامە؟ با سەیری ئەو رووداوانە بکەین کە لە ١٩٨٤ەوە تا ئێستا روویانداوە. جەنگەکانی یەکەم و دووەمی عێراق، هەڵەبجە... پ.ك.ك رێکخراوێکە کە چانسی هەیە. خەریکە دەگاتە خاڵێك کە نابووت بێت و لە ناوبچێت کە هەلومەرج بە قازانجی ئەو دەگۆڕێت. ئەمە یەکەم خاڵی گرنگە. خاڵی گرنگی دووەمیش ئەوەیە کە هەر کاتێك لە تورکیا رووداوە تیرۆریستییەکان کەم بوونەوە یان هەر روویان نەدا..، ئێمە بە هەڵە لە بارودۆخەکە تێدەگەین. وەك ئەوەی کە رێکخراوی تیرۆریستی لەناو چووبێت یان کۆتاییپێهاتبێت... لە راستیدا کادیرانی سەر شاخی رێکخراوەکە وەك خۆیان بوون، بەڵکو ژمارەی چالاکییەکانیان کەمیی کردبوو. لەوانەیە لێرەدا بە هەڵە تێگەیشتبێتین. ئەگەر بە دروستی تێبگەیشتبایەین، دەمانتوانی لەو قۆناخەدا رێوشوێنی گونجاو بگرینە بەر. ئەمەش خاڵێکی گرنگە.(میللییەت،٢٠١٠/٧/٦)"

لەبەرامبەر قسەکانی ژەنراڵ ئیلکەر باشبوغ سەبارەت بە سەرکەوتنی هێز چەکدارەکان بە سەر پ.ك.ك دا، تا ئەندازەیەك یەکسانبوونی ژمارەی چەکدارانی پ.ك.ك لە ساڵی ٢٠٠٨دا لەگەڵ ژمارەی ئەو چەکدارەکانی

ئەو ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٩٠ەکاندا کە زۆرترین ژمارە بووە، کێشەیەکە کە دەبوو ڕوونبکرێتەوە. باشبوغ'یش دەیویست باسی ئەمە بکات."داوام کرد ڕاپرسییەك بکرێت. وادەردەکەوێت کە بەشێك لە ئەندامانی سەر چیای ئەم ڕێکخراوە، لە شارەکانەوە ڕۆیشتوون. بزانم دەزانن کام شار لە ریزی پێشەوەدایە؟"

تۆزێك ڕاوەستام و لە خۆمەوە وتم:" تونجەلی؟" ژەنراڵ باشبوغ وتی: " باسی شار دەکەم ئەفەندم!" و بەمجۆرە بەردەوام بوو:"٢٠٪ لە ئیستانبوڵ و ٣٧٪یان لە ناوەندی شاری دیاربەکر'ەوە دەچن. بەواتایەکی دیکە، نزیکەی نیوەی ئەو کەسانەی کە تازە بەشداری ئەو ڕێکخراوە دەبن، لە ناو شارەکانی ئیستانبوڵ و دیاربەکر'ەوە دەچن. بەپێی ئەنجامێکی ڕاپرسییەکە، ئەوانەی لە ئیستانبوڵ'ەوە دەچن، لەو شارە لە دایك نەبوون، بەڵکو ئەوانەن کە لەکاتی کۆچی بنەماڵەکانیاندا بۆ ئیستانبوڵ تەمەنیان ٣-٤ساڵ بووە..."

قسەکەیم بڕی و وتم:" یانی ئەو کەسانەن کە نەمانتوانیوە لە ڕووی نەتەوەییەوە بیانتوێنینەوە!" ژەنراڵ ئیلکەر باشبوغ بە ناچاوانێکی جیدییەوە کە بۆ گاڵتەکردن نەرمییەکی تێدا بەدی نەدەکرا، وتی:" ئەو دەستەواژەیە بەکار ناهێنین ئەفەندم! ئێمە ئینتەگرەیشتنی پێ دەڵێین. کتێبەکەی مەتین هەپەرتان خوێندۆتەوە..."

درێژەی پێدا:" بۆ ئەوەی ڕێگایەك هەبێت تا ئەو کادێرانە لە ناوەندی شارەکانەوە بچنە سەر چیا، پێویستە هەندێك کەس لەنێو شارەکاندا هەبن کە ئەوە ڕێکبخەن. پ.ك.ك لەنێو شارەکاندا ڕێکخستنی هەیە. لێرەشدا ڕۆڵی هەواڵگری زەق دەبێتەوە. بۆ ئەوەی ڕێگا لە بەشداربوونی تازە بۆ ناو ریزەکانی ئەو ڕێکخراوە بگیرێت، پێویستە لە ڕێی هەواڵگرییەوە ڕێکخستنی شارەکان ئاشکرا بکرێن و گورزی گورجکبڕیان لێ بدرێت."

سەرەڕای ئەوەی کە ئیلکەر باشبوغ فەرماندەی گشتی سوپا، لە قسەکانیدا بە وریاییەوە جەختی لەوە دەکرد کە ئەم کێشەیە تەنها بە "ڕێوشوێنی سەربازی" چارەسەر ناکرێت و باسی ڕەهەندە دەروونی، سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوری و کەلتوورییەکانی ئەم کێشەیەی دەکرد و بەردەوام لە وتەکانیدا هەندێك کتێبی بە نموونە دەهێنایەوە. بەڵام دواجار قسەکانی دەهاتەوە سەر "ڕەهەندی ئەمنی" کێشەکە. کاتێك گوێم لێدەگرت، لە دڵی خۆمدا دەمگوت من لەگەڵ سەربازێکدا قسە دەکەم و ئەم جۆرە وتانەش بۆ سەربازێك ئاسایین و بەوجۆرە قەناعەتم بە خۆم دەکرد.

لە دەرفەتێکدا باسەکەم بردە سەر "شوناسی کەلتووری" و پرسی "زمانی دایك."

- ئیدی زمانی کوردی ئازادە. بە کوردی قسە دەکەن. ئەمە کێشە نییە.

- کوردەکان هەموو کاتێك بە کوردی قسەیان کردووە. سەدان ساڵە لە ماڵەکانیاندا، لەنێو خۆیاندا بە کوردی قسە دەکەن، بەڵام ئەمە هێشتا هەر کێشەیە...

- دەکرێت وەك مافێکی تاك بێت، بەڵام نابێ وەك مافێکی گشتی هەبێت.

- ئەو کاتەی فەرماندەی هێزە وشکانییەکان بوون، بە وردی گوێم لە وتارێکتان گرت و خوێندمەوە. لەوێشدا ئەم جیاکارییەتان کردبوو بەڵام ئەو کاتانە زۆر لێی تێنەگەیشتبووم. ئێوە چۆن لە مافی تاك و مافی گشتی تێدەگەن؟

- زمانی رەسمیی تورکییە!

- لەمبارەیەوە هیچ گرفتێك نییە. تورکی زمانی رەسمییە، بەڵام دیسان دەکرێت زمانی دایك مافێکی گشتی بێت...

ژەنراڵ باشبوغ ئەم باسەی درێژە پێ نەدا و چووینە سەر باسێکی دیکە.

لەو بەینەدا باسی گرنگیی پەخشی تەلەفزیۆنە کوردییەکەی دەوڵەتی کرد و وەك ئەوەی کە لە ژوورەکەدا ئامێری گوێگرتن هەبێت، چەمایەوە و لە بنا گوێی مندا بە دەنگێکی نزمەوە وتی:"ئەفەندم! من پێشنیاری پەخشی کوردییTRTم بۆ حکومەت کرد. لە جیاتی ئەوەی گوێ لە Roj TV بگرن، با گوێ لە من بگرن!"

بۆ فەرماندەیەکی گشتی سوپای تورك، لایەنگری کردن لە پەخشی تەلەفزیۆنی کوردی دەوڵەت لە بەرامبەر تەلەفزیۆنی پ.ك.ك رەفتارێکی زۆر چاوەڕوان کراو نەبوو. بەڵام ئەگەر ئەم هەنگاوە زووتر بنرایە، ئەنجامی کاریگەرتری لێنەدەکەوتەوە؟

لەگەڵ پشتیوانی کردن لە قسەکانی، بە ژێر لێوەوە وتم:" کەم تا زۆر." ئیلکەر باشبوغ رۆژی٢٠١٠/٨/٢٧ لە مەراسیمێکی پێشوازی کردندا بە بۆنەی تەواوبوونی وادەی فەرماندەییەکەی و دەستبەکاربوونی فەرماندەی نوێی سوپا، وتارێکی پێشکەش کرد کە ناوەڕۆکەکەی رەخنەگرتن بوو لەوەی، لەو قۆناخانەدا کە پێکدادانی چەکداری لە تورکیا کەمبووەتەوە یان راوەستاوە، رێوشوێنی پێویست نەگیراوەتە بەر. لە وەڵامی پرسیاری رۆژنامەنوسێکیشدا کە وتی:"تەلەفزیۆنی کوردی؟" باشبوغ وتی: "بۆ نمونە. ئەو شتەی کە ئێستا سێ - چوار کاریگەری هەیە، ئەگەر ئەو کاتانە ئەنجام بدرایە کاریگەرییەکەی بیست ئەوەندە دەبوو." لەوانەیە ئەویش دەیزانی یان درکی بەوە کردبێت کە هەندێك لەو هەنگاوانەی کە خۆی گرنگیی تایبەتی پێ دەدان، کەم تا زۆر کاریگەرییان هەیە.

نزیکەی دوو مانگ و نیو دوای دیالۆگەکەی من و ئیلکەر باشبوغ، تەلەفزیۆنی دەوڵەت کە ژمارەکەی بە زمانی کوردی جێ کەوتووە و بە تەرەتە شەش ناسراوە، لە بەرواری ٢٠٠٩/١/١دا دەستی بە پەخش کرد.

هەر لەو کاتەی کە فەرماندەی هێزە وشکانییەکان بوو، لە چەند وتارێکدا سەرەداوی هەڵوێست و نزیکایەتی شەخسیی فەرماندەی گشتی سوپا لەبارەی کێشەی کورد دەرکەوتبو. وەکوو کەسێك کە بە وردی گوێم لە قسەکانی گرتبوو، منیش دەمزانی کێشەکە تەنها کێشەی ئەمنی و تیرۆر نییە.

بە گوێرەی ئیلکەر باشبوغ، کێشەی کورد لەگەڵ رەهەندی تیرۆر و ئەمنی، رەهەندی ئابوری، بە وتەی خۆی رەهەندی دەروونی - کۆمەڵایەتی و رەهەندی پڕوپاگەندەی شەڕ و رەهەندی دەرەکی و نێودەوڵەتیشی هەبوو. ئەو لایەنەش پەیوەندی بە کوردەکان'ی دەرەوەی تورکیا بە تایبەتی کوردەکان'ی باکووری عێراق'ەوە هەبوو.

هەرچەندە ئیلکەر باشبوغ بە وریاییەوە خۆی لە ناوهێنانی دەپاراست و بە"بەڕێوەبردنی خۆجێیی" باسی دەکرد، بەڵام لە باکووری عێراق'دا قەوارەیەکی نیمچە سەربەخۆی کوردی دامەزرابوو کە لە دەستووری عێراق'یشدا بە حکومەتی هەرێمی کوردستان ناوی هێنرابوو.

بۆ ئەوەی لە یەکەم دیدارمدا لەگەڵ ژەنراڵ باشبوغ، ناخۆشی دروست نەکەم، هیچ وشەی کوردستان'م بەکارنەهێنا. لە میدیای نوسراو و بینراوی تورکی دا، بۆ یەکەمجار و بە بەردەوامی من وشەی کوردستان'م بەکارهێنا و بەکاریشم دەهێنا، بەڵام کاتێ لە ژووره رەسمییەکەیدا لەگەڵ ژەنراڵ ئیلکەر باشبوغ قسەم دەکرد لە جیاتی کوردستان، دەستەواژەکانی باکووری عێراق و بەڕێوەبردنی کوردی'م بەکاردەهێنا. تەنها بۆ یەك جاریش نەمبینی کە فەرماندەی سوپا واز لە بەکارهێنانی دەستەواژەی"بەڕێوەبردنی خۆجێیی"بهێنێت. بەڕێوەبردنی خۆجێیی، دەستەواژەیەك بوو کە لە تورکیا بۆ ئاماژەدان بە شارەوانییەکان بەکار دەهات و مومکین نەبوو ئیلکەر باشبوغ هەست بەمە نەکات. کاتێ ئیلکەر باشبوغ خۆی لە بەکارهێنانی وشەی کورد دەدزییەوە، تێبینی ئەوەم کرد کە بە ئەنقەست دەستەواژەی باکووری عێراق'یش بەکارناهێنێت. وادیاربوو کە هەستناکی سەربازەکان لە بەرامبەر بەکارهێنانی هەندێك دەستەواژە بە ئەندازەی هەستناکییەکەیان بەرامبەر وشەی"کوردستان" بوو. ئەوان لە جیاتی باکووری عێراق، دەستەواژەی "بەشی باکووری عێراق"یان بەکار دەبرد. ئەمەش تەنها لەبەر ئەوە بوو کە وەك بەشێکی جیاواز لە حکومەتی ناوەندی بەغدا، خوێندنەوە بۆ کوردەکان'ی عێراق نەکرێت. سەبازەکان لە جیاتی باکووری عێراق، دەستەواژەی بەشی باکووری عێراق'یان بە کار دەبرد و ئەم زمانە سەربازییەش هەتا حکومەتەکەی تایب ئەردۆغان تەشەنەی کردبوو کە هەرکەس وایدەزانی لە دۆسییەی کورد'دا جیاواز لە سەربازەکان بیردەکاتەوە. لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٩دا عەلی باباجان وەزیری دەرەوە لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا، بەردەوام دەستەواژەی بەشی باکووری عێراق'ی دەهێنایە سەرزمان. ئەوەم بیرهێنایەوە کە ئەمە زمانی سەربازەکانە و ئەویش وەك ئەوەی قبوڵی بێت بزەیەکی لێدا، بەڵام وازی لە بەکارهێنانی دەستەواژەکە نەهێنا.

(ماوەیەك دواتر لە شوباتی ساڵی ٢٠١١دا لە شوێنی حەوانەوەی لە وەزیرییەی بەغدا، لەکاتی قسەکردن لەگەڵ موراد ئویزچەلیك کۆنەدۆستی خۆم و باڵیۆزی تورکیا لە عێراق، دەمزانی کە هەستناکی

سەربازەکان بەرامبەر بەکارهێنانی وشە و ئاوەڵناوەکان تا چ ئەندازەیەك رۆیشتووە. باسی دیدارەکەی خۆم و باشبوغ'م بۆ ئویزچەلیك دەکرد کە بە پێکەونینەوە وتی: ئێستا ناڵێن بەشی باکووری عێراق، بەڵکو دەڵێن باکووری عێراق. وادیارە بۆ ئەوەی ئاماژەیەك نەبێت بۆ کوردستان، دەستەواژەی بەشی باکووری عێراقیان لابردووە و لە جیاتی ئەوەدا باکووری عێراق'یان داناوە کە بۆ ئەوان گرنگتر بوو! سەربازەکان وزەی خۆیان بەمجۆرە شتانەوە خەرج دەکرد.)

شتێکی سەرسوورهێنەر نەبوو کە ئیلکەر باشبوغ فەرماندەی گشتی سوپا، جگە لەوەی خۆی لە بەکارهێنانی دەستەواژەی کوردستان بدزێتەوە، تەنانەت دەستەواژەی باکووری عێراق'یش نەهێنێتە سەرزمان و لە جیاتی ئەوانەدا "بەڕێوەبردنی خۆجێیی لە باکووری عێراق" بهێنێتە سەرزمان. بەڵام هۆکاری بانگهێشتکردنی من بۆ شوێنە رەسمییەکەی خۆی رێك پەیوەندی بەم بابەتەوە هەبوو. یانی بۆ قسەکردن لەسەر کوردەکان'ی عێراق بوو. ئەو پێیوابوو کە دەبێ تورکیا هاوکارییەکی ستراتیژی لەگەڵ کوردەکان'ی عێراق هەبێت و دەیویست لەوبارەیە لەگەڵ من قسە بکات. ئەوەی منی تووشی سەرسووڕمان کرد ئەوە بوو کە بەرەو لای من چەمایەوە و بە نزمی وتی:"ئەفەندم! ئێمە دەڵێین حکومەتی ناوەندی لە بەغدا، بەڵام با خۆمان نەخەڵەتێنین، ئەگەر لەگەڵ بەڕێوەبردنی خۆجێیی لە باکوور و لەگەڵ بارزانی هاوکاری نەکەین، ئەم کێشەیە بە ئاسانی چارەسەر ناکرێت." مەبەستی لەو کێشەیەش تێکۆشانی دژی پ.ك.ك یان بە "زمانی رەسمی تورکی" دژایەتیکردنی تیرۆر بوو.

بۆچوونەکانی فەرماندەی گشتی سوپا لەبارەی هاوکاری تورکیا و کوردەکان'ی عێراق تەنها لەوەوە سەرچاوەیان نەدەگرت کە لە کردەوەدا ئەو هاوکارییە دەتوانێت لە رووی ئەمنییەوە بۆ رووبەڕووبونەوەی تیرۆر سوودی بۆ تورکیا هەبێت. بەڵکو ئەو پێیوابوو کە کوردەکان'ی عێراق'یش لە هاوکاری ستراتیژیدا لەگەڵ تورکیا سوود و بەرژەوەندییەکان هەیە. دەیویست لەوبارەیەوە راستەوخۆ بۆچوونەکانی بۆ من باس بکات و گوێ لە قسەکانی منیش بگرێت.

کاتێ بۆچونەکانی خۆی بۆ من باس دەکرد، فاکتەری کاتی لەبەرچاو دەگرت. باشبوغ دەیزانی کە ئۆباما سوورە لەسەر کشانەوەی هێزەکانی وڵاتەکەی لە عێراق. خۆی لە خۆیدا بە گوێرەی رێککەوتننامەی SOFA لە نێوان بەڕێوەبردنی جۆرج بوش و حکومەتی عێراق، خشتەیەکی زەمەنی بۆ کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا دیاری کرابوو. کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا، ئەو ئەگەرەی زیاد دەکرد کە هێزەکانی عێراق روو لە هەندێك مەیدانی جیاوازی راکێشەر بکەن.

ئێران لەگەڵ شیعەکانی عێراق و دنیای عەرەبی لەگەڵ سوننەکانی عێراق پەیوەندی سروشتییان هەبوو. لە بارودۆخێکی وەهاشدا کوردەکان بەرژەوەندییەکی گەورەتریان لەوە نەبوو کە لە تورکیا نزیك

بنەوە و بە روویدا بکرێنەوە. بەوەش دەرفەتێکی مێژوویی بۆ پەیوەندییەکانی تورکیا و بەڕێوەبردنی کوردیی عێراق ( هەرچەندە زۆر وریا بوو کە بە هیچ شێوەیەك بەوجۆرە ناوی نەهێنێت.) رەخسا بوو.

ئەوەی کە باسم کرد بۆچوونی باشبوغ بوو. راستی دەگوت. پێشتر پێموانەبوو کە بتوانم ئەو راستییە، بەشێوەیەکی ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا لە زاری فەرماندەی گشتی سوپاوە ببیستم. هەرچەندە خۆی دەدزییەوە لەوەی کە ناو و ئاوەڵناوەکان لە شوێنی خۆیدا وەك خۆیان بەکاربهێنێت، بەڵام نزیکایەتی و هەڵوێستەکانی باشبوغ کە رەزامەندەیی فەرماندەیی گشتی سوپای لە پشت بوو، گرنگ و سەرنجڕاکێش بوون و دەیانتوانی ئەنجامی یەکلاکەرەوە لەبارەی داهاتووی تورکیا بەدی بهێنن.

لە مێشکی خۆمدا وتم پێویستە لەم کاتەدا گرنگی بەوە نەدەم کە ئەو، دەستەواژە و وشەکان وەك من و بەپێی زانیارییەکانی من بەکارناهێنێت. بەشێکی زۆری تەمەنی خۆم بۆ قسەکردن و نوسین و چالاکی لەبارەی ئەم راستییە و چارەسەری سیاسییانەی کێشەی کورد و یەکگرتنی تورکیا و کوردەکان'ی عێراق تەرخان کردبوو، لەبەر ئەوەش چەندین لایەنی جۆراوجۆر کە یەکێکیان فەرماندەیی گشتی سوپا بوو، شمشێرەکانیان لە من هەڵکێشابوو. ئێستاش وا دەردەکەوت کە فەرماندەیی گشتی سوپاش ئەو راستییەی قبوڵ کردووە. بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لەگەڵ سەرکردەی ئەو دەزگایەی کە وەك گەورەترین ئاستەنگ لەبەردەم چارەسەری کێشەی کورد و پەیوەندییەکانی تورکیا و کوردەکان'ی عێراق دەهاتە بەرچاو، بە یەك گەیشتبووین و وەك ئەوە وابوو کە لەسەر چەندین خاڵی هاوبەش رێکەوتبین.

لە سەرەتای قسەکاندا ئیلکەر باشبوغ وتی:"بەر لە هەموو شتێك با پێتان بڵێم کە چۆن سەرنجم چووەتە سەر ئەم کێشەیە." پەیوەندی راستەوخۆی ناوبراو لەگەڵ کێشەی کورد، لەو کاتەوە دروستبووە کە لە دیاربەکر فەرماندەی دەستەی سوپای ئاسایش بووە و سیانزە پارێزگای باشووری خۆرهەڵاتی لەو بوارەدا لە ژێر دەستدا بووە. پلانی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی لە باکووری عێراق داناوە و چووەتە ناو خاکی کوردستان'ی عێراق. لەگەڵ ئەرکە پیشەییەکەیدا لەبارەی ئەم کێشەیەوە دەستی بە خوێندنەوە کردووە. خۆی بە "کاریگەرترین - دەسەڵاتدارترین کەسی ناو ئەوانەی کە لە دڵەوە دەیانەوێ ئەم کێشەیە چارەسەربکرێت" دەزانێت. کاتی ویستی خۆی بۆ"چارەسەر" دووبارە دەکردەوە، سەیری نێوچاوانیم کرد بۆ ئەوەی بزانم لە دڵەوە قسە دەکات یان نا. نیشانەیەکی بەدنیازی لە نێوچاوانی دەرنەکەوت.

ژەنراڵ باشبوغ لەکاتی قسەکەیدا وتی" بزانن من چۆن هاتمە نێو ئەم دنیایە؟" سەرەتاکەی دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ١٩٩٢. ئەگەر منیش بە وتەی:"سەیرکەن! بەر لە هەموو شتێك با پێتان بڵێم کە چۆن سەرنجم چووەتە سەر ئەم کێشەیە." بچمە ناو باسەکەم، داخۆ چۆن و لە کوێوە دەستم پێ دەکرد؟

**جگە لە تێپەڕکردنی ڕۆژانی ئاسایی، مرۆڤ دەتوانێ بەرگەی هەموو شتێک بگرێت. ئەگەر ژیانێکی مەترسیدارت هەبێ، دروست دەژیت.**

**گۆتە**

گەڕەکی ئەلئەزەبەقیە لە ساڵانی ١٩٧٠کاندا، یەکێك لە گەڕەکە باشەکانی شام بوو. شەقامی بەغدای شام'یش، هەرچەندە لە شەقامە هاوناوەکەی خۆی لە بەشی ئەنادۆڵی ئیستانبوڵ نەدەچوو، بەڵام یەکێك لە شارێکانی پایتەختی سوریا بوو.

نوسینگەی ڕێکخراوی بەرەی دیموکراتیکی فەلەستین لە شام و هەروەها لە ساڵی ١٩٧١دا ناوەندی ڕێکخراوی رزگاری فەلەستین کە چەند ساڵێك دوای ئەو بەرواره هێز و ناوبانگێکی لە سیاسەتی جیهانیدا پەیدا دەکرد، لە ئەلئەزبەقیە بوون.

ڕۆژی کۆتایی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧١، لەکاتێکدا کە بەهۆی کودەتای سەربازییەوە، لە تورکیا داواکراو بووین، وڵاتمان بە جێهێشت. بەشێك لەو تاوانبارانەی کە لە تورکیا هەڵهاتبوون، بەرەو وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوا رۆیشتبوون. لەکاتی خوێندنی ئامادەییدا لە تراسووس، قاوەچییەکی بە رەچەڵەك کوردی خەڵکی ئورفا'م ناسیبو. بەهۆی ماریفەت و توانایی و پەیوەندییەکانی خزمە قاچاخچییەکانی ئەوەوە لە قەزای ئاکچا قەڵەی ئورفا، منیش ڕێگەی سوریا'م گرتبووەبەر. یەکێك لە هاوڕێکانمان کە دواتر دەبووە یەکێك لە بەناوبانگترین ڕۆژنامەنووسەکانی تورکیا، پێناسی ساختەی بۆ دروستکردم و بەوەش لە ئەنقەرە'وە گەیشتمە ئەو قەزا بچووکەی سەر سنوری سوریا و لەوێ لەگەڵ دەستەیەك لە قاچاخچییەکاندا کە چاوەڕوانیی ئێمەیان دەکرد، یەکمان گرت. لەگەڵ قاچاخچییە کوردەکان'دا کە بەهۆی کارەکەیانەوە هەموو شەوێك هاتوچۆی هەردولای سنوریان دەکرد، لە دەشتی حەڕان کەوانەیەکی گەورەمان پێوا و گەیشتینە لای بنکەی سەربازی لەسەر سنور. قاچاخچییەکان پێشتر لەگەڵ فەرماندەی بنکە سەربازییەکەدا ڕێکەوتبوون و بەرتیلێکی زۆریان پێدا بۆ ئەوەی لە سنورەکە تێپەڕ بین. دوای ئەوەش لە گوندێکی نزیك قەزای تەل ئەبیەز لەبەرامبەر قەزای ئاکچا قەڵە راوەستاین.

لە گوندەکەدا چووینە ماڵێك کە هەموو شەوێك قاچاخچییەکانی کاڵا لەهەردوولا وەك بارەگای خۆیان بەکاریان دەهێنا. لەو کاتەدا یەکسەر تێگەیشتم کە لاپەڕەیەکی نوێ لە ژیانم دەستی پێکردووە کە دیار نییە تاکەی دەخایەنێت و چۆن بە کۆتایی دەگات.

لە ماڵەکەدا زۆر نەماینەوە. تاقە تەکسیی گوندەکەیان جۆر کرد و دوای مامەڵەیەکی کورت، لە نیوەشەودا بە ڕێ کەوتین. لەو تاریکییەی شەودا تەنها لە ڕەقە بۆ ماوەیەکی کورت پشوومان دا و دوای ئەوەش

بەرەبەیانی زوو گەیشتینە حەلەب. ناوەندی بەرەی دیموکراتیکی فەلەستین'مان دۆزییەوە. تا کاتی ئامادەبوونی پێناسە کاتییە فەلەستین'ییەکەمان کە بۆ بازگەکانی نێوان حەلەب - شام پێویستبوون، چاوەڕێ بووین و دوانیوەڕۆ دیسان بە ڕێ کەوتینەوە و ئێوارەی هەمان ڕۆژ گەیشتینە شام.

ئامانجەکەمان ئەوە نەبوو کە پەنا ببەینە سوریا یان بە ویستی خۆمان لەوێ بە دوورخراوەیی بژین. دەمانویست بەشداری تێکۆشانی رزگاری فەلەستین بکەین. بەرگریی فەلەستین (ئەو کاتە ناوەکەی وەها بوو) کە لە تەنیشت ئێمەوە لەکاتی جەنگی ١٩٦٧ی عەرەب - ئیسرائیل دەستی پێکردبوو، بۆ ئێمەی جیلی ٦٨ی چەپی تورك ئەفسانەیەك بوو کە وەك موگناتیس بەرەو خۆی رای دەکێشاین. ئێمە بە ئامانجی پەیوەندی کردن بە رێکخراوە فەلەستینییەکان و ئەنجامدانی مەشقی سەربازی و دواتر گەڕانەوە بۆ تورکیا بۆ دامەزراندنی یەکەمین دەستە سەربازییەکانی فراکسیۆنی چەپی خۆمان، رێگای سوریا'مان گرتبووەبەر. کاتێ گەیشتینە شام، ئەو پەیوەندییانەی کە دەمانویست بەرقەرار بوون. زانیمان کە رەوانەی کەمپێکی مەشقی سەربازیمان دەکەن لە شوێنێکی بەرز لە نزیك مەعلولە کە ئویرگویوپ - گویرەمەی بە بیرمان دەهێنایەوە و دەکەوتە ٧٠-٨٠ کیلۆمەتریی باکووری خۆرئاوای شام و مەسیحییە ئارامی زمانەکان لەو ناوچەیە دەژیان. بۆ یەکەمجار لەوێ دەمزانی کە زمانێك بە ناوی ئارامی هەیە و ئەوەش ئەو زمانەیە کە حەزرەتی عیسا قسەی پێ کردووە. ساڵانێکی زۆر دواتریش زانیم کە ئارامی زمانی دایکیی هاوڵاتیانی ئێمەی کەمینەی سوریانی و کەمینەی سوریانی عێراق'ە کە ریشەکەیان لە خاکی هەککاری دایە.

لە رۆژە سەرەتاییەکانی تەمووزی ساڵی ١٩٧١دا، کاتێ کە چاوەڕوانیی رەوانە کردنمان بووین بۆ مەعلولە، بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ژیانی نوێ و ناسینی ئەو شوێنەی کە تێیدا بووین و هەروەها بۆ کوشتنی کات، بە سەر قادرمەکانی جادەی بەغدا دەسووڕاینەوە. لە خوار نوسینگەی رێکخراوی رزگاری فەلەسیتن، لەسەر بینایەکدا تابلۆی دکتۆرێکی ددان بە ناوی زەرکەیا سەرنجی راکێشام. لە پێناسی هەمیشەیی ئەندامبوون لە رێکخراوی رزگاری فەلەستین'دا ناوی خۆم بە زەکەریا ئیحسان نوسی. ئیحسان ناوی باوکم بوو، منیش لەبەر ئەوەی کە ئیدی لە دنیای عەرەب' دا بووم و هەروەها بۆ رێ ون کردن لە یەکە ئەمنییەکانی تورك، ناوی ئیحسان'م بۆ خۆم هەڵبژاردبوو.

بەرەی دیموکراتیکی فەلەستین پارتیزانیترین رێکخراوی چەپی ناو رێکخراوی رزگاری فەلەستین بوو. هەروەها یەکەم شوێنی پەیوەندی ئەو گرووپەش بوو کە لەگەڵ مندا هاتبوون. ئەرکی بەرقەرارکردنی پەیوەندی دەرەکیی فراکسیۆنە چەپەکەمان لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، کە بەهۆی کودەتای سەربازی ١٢ی مارتەوە دەستی بەکاری ژێرزەمینی کردبوو، بە من سپێردرابوو. ئەمەم بە ئەبوو محەمەد بەرپرسی پەیوەندییە دەرەکییەکانی بەرەی دیموکراتیك لە شام راگەیاند کە دەیتوانی بە ئینگلیزییەکی دەست و پێ شکاو قسە

بکات. ئەو بەرپرسەی بەرەی دیموکراتیك، یارمەتیی دام تا لەگەڵ زۆربەی ئەو ڕێکخراوانەدا کە خۆیان پەیوەندییان هەبوو، پەیوەندی بەرقەرار بکەم و ڕێکخراوە کوردییەکان'یشی خستە پێشی هەموویانەوە. لەوانەیە ئەمەش لەبەر ئەوە بووبێت کە لە تورکیا'وە هاتبووین. نزیکم بووەوە و وتی:" هاوڕێ زەکەریا! دەمەوێ تۆ بە ڕێکخراوێکی کوردی بناسێنم. ئەوان دێن بۆ ئێرە و دەتانبەن بۆ شوێنێك. دوای دیدارەکەش دەتانهێننەوە. ئەمە بۆ ئێوە گونجاوە؟"و بەوجۆرەش یەکەم هەنگاوی نا. لە سەرەتای ساڵانی ۱۹۷۰کاندا، بۆ شۆڕشگێڕێکی ڕۆمانتیکی وەك من کە لە تەمەنی ۲۲ ساڵیدا بە ناچاری وڵاتەکەی خۆی بەجێهێشتبوو، چی لەو پێشنیارە سەرسووڕهێنەرتر دەبوو؟

لەو قۆناخەی کە یەکەم پەیوەندی من لەگەڵ کێشەی کورد دروست دەبوو، پ.ك.ك کە مۆری خۆی لەسەر بەشێکی گرنگی ژیانمان داوە، هێشتا دانەمەزرابوو. جگە لەوە هیچ ئاماژەیەکیش بۆ ئەگەری دەرکەوتنی لە ئارادا نەبوو. لەگەڵ عەبدوڵا ئۆجالان سەربە یەك جیل بووین، تەنانەت وابزانم هاوتەمەنیش بووین، بەڵام ئەو کاتانە ئۆجالان لەوێ نەبوو. نەك هەر لە دەرەوەی سیاسەت بوو، بەڵکو لە هیچ مەیدانێکی تێکۆشانی سیاسی کوردی'شدا نەبوو. ئێمەمانان ئەومان نەدەناسی. ساڵانێکی دواتر لە ریپۆرتاژەکانییەوە کە باسی چۆنییەتی سەرنجڕاکێشانی بۆ سیاسەت دەکات، زانیم کە ئەو ئێمەی دەناسی.

وەك یەکێك لە سەرکردەکانی بزووتنەوەی لاوانی جیلی ٦٨، درکم بە جوڵانەوەی کورد دەکرد کە لە نیوەی دووەمی ساڵانی ۱۹٦۰ەکانەوە چەکەرەی کردبوو و لە سەرەتاکانی ۱۹۷۰کانیشدا هەرچی دەچوو زیاتر لە پێکهاتەی سیاسەتی تورکیا جێی خۆی دەگرت. جگە لەوەش جوڵانەوەی کوردی سەرنجی رادەکێشام. بەشێکی زۆری کادیرانی دامەزرێنەری ئۆجاخە شۆڕشگێڕی کەلتوورییەکانی خۆرهەڵات DDKO، کە یەکێك بوو لە یەکەمین ڕێکخراوە کوردییەکان و شوێنە دەستی خۆی لە مێژووی جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد داناوە، ئەو هاوڕێیانەمان بوون کە خەڵکی باشووری خۆرهەڵات و خۆرهەڵات بوون و لەنێو چالاکییەکانی لاوان یان لەنێو ڕێکخراوە چەپەکاندا دەماننناسین و لە نزیکەوە لێیان ئاگادار بووین. هەرچەندە بە جۆرێك لە جۆرەکان پێمان ناخۆش بوو کە ئەوان لە ئێمە جیاببنەوە و خەریکی کارەکانی خۆیان لە DDKO بن، بەڵام وەکو چەپی تورك زیاتر لە هەمو بەشەکانی کۆمەڵگا، پرسی کورد ببوو بە یەکێك لەو بابەتانەی کە بێ ئەملاوئەولا سەرنجی رادەکێشاین. لە ساڵی ۱۹۷۰دا، لە ڕێگەی ئەو خۆپێشاندانە جەماوەرییانەوە کە DDKO ڕێکی دەخستن، شوناسی کوردی خۆی دەردەخستە مەیدان. ئەو هەواڵانەمان دەبیست کە باشووری خۆرهەڵات لە ناوەندی شارۆچکەکان و لە گوندەکاندا، خەڵك بە دەستەجەمعی ئەشکەنجە دەکرێن. بەهۆی هەڵوێستی چەپەوە کە لایەنگری لە خەڵکی ستەمدیدە دەکرد، ئێمەش پشتیوانیمان لە خەڵکی کورد دەکرد. لەلایەکی دیکەشەوە وەك مۆدەی ڕۆژ، باسی چارەسەریی کێشەی کورد'مان دەکرد.

لەوەشدا پرەنسیپەکەی لنین سەبارەت بە مافی نەتەوەکان بۆ دیاریکردنی چارەنووس رێ نیشاندەرمان بوو. جگە لەوەش هەوڵمان دەدا کە سوود لە کتێبی "کێشەی نەتەوەیی" ستالین وەربگرین.

ئایا لە تورکیا کوردەکان'یش مافی دیاریکردنی چارەی خۆیان هەبوو؟ نەدەکرا بیر لە نەبوونی ئەو مافە بکرێتەوە. باشە ئەمە، لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم مافەدا مافی جیابوونەوەیشی لە خۆ دەگرت کە وەك پرەنسیپێکی حاشاهەڵنەگری لنین سەیر دەکرا؟

لە ساڵەکانی ١٩٧٠کاندا، کاتێك لە کۆبوونەوە بێ کۆتاییەکانی چەپەکاندا باسی کێشەی کورد دەکرا، بە گەرموگوڕی باسی مافی دیاریکردنی چارەنووسی کوردەکان'یش دەکرا کە تێیدا بەشێوەیەکی رەها بیر لە مافی جیابوونەوەش دەکرا. هەلومەرجی توندی سیاسی، بیری چەپیشی دەمارگیرتر کردبوو. لەبەر ئەوەش هەرچەندە لە دڵەوە نەماندەویست رووبدەن، بەڵام تەنها لەبەر ئەوەی کە "پرەنسیپی لنین"ن بەرگریمان لە چەندین شتی وەك مافی چارەی خۆنوسینی کوردەکان دەکرد کە مافی جیابوونەوەیشی تێیدا بوو. بۆیە زۆر جار قاڵبە زەینییەکان و دنیای دەروونمان لەگەڵ ئەو وشانەدا کە دەممان دەردەکەوتن لە ناکۆکیدا بوون.

بەهۆی ئەو گۆڕانکارییەی کە کودەتای سەربازیی ساڵی ١٩٧١ لە کەشی سیاسیدا دروستی کردبوو، تاوانبار کرابووم و بە گشتی سزای نۆ ساڵ زیندان و دوو ساڵ و نیو دوورخستنەوەم بۆ دەرچووبوو. دەمزانی شتی دیکەش بەدوایدا دێت، بۆیە کاتی بە دوامدا دەگەڕان، خۆم شاردەوە. ساڵانی دوورخراوەیی کە هەرچی دەچوو لە قاچاخبوون و جێهێشتنی وڵات نزیك دەبوونەوە، دەستیان پێکردبوو. لە ماوەیەکی کورتی نێوان قۆناخی پاش کودەتا سەربازییەکەی ١٩٧١/٣/١٢ هەتا دەستپێکردنی ساڵانی قاچاخبوون و دوورخراوەییم، لە تەمەنمدا بۆ یەکەمجار، لە باشوور و باشووری خۆرهەڵاتی تورکیا سەردانی ناوچە کوردییەکان'م کرد. لەگەڵ هاتنی ١٢ی مارت، لە ١١ پارێزگای وڵاتدا بەڕێوەبردنی باری نائاسایی راگەیەنرا. لە بەرواری ١٩٧١/٥/٢٥یشەوە سەرەتاکانی خۆشاردنەوەو چالاکیی ژێرزەمینی من دەستیان پێکرد. لە ماوەی نێوان ئەو دوو بەروارەشدا، فراکسیۆنە چەپەکەمان بۆ ئەوەی بڕیاربدات کە چی بکات، بۆ یەکەمجار ئامادەکارییەکانی ئەنجامدانی کۆنفرانسێکی گشتی لە ئاستی هەموو وڵاتدا دەست پێکردبوو. ئەرکی من ئەوە بوو کە هەتا وان بڕۆم و لە گەڕانەوەشدا سەردانی دیاربەکر، گازی عەنتاب و مەڵاتیە بکەم و هەندێك لە کەسانی پەیوەندیدار بە فراکسیۆنەکەمان رازی بکەم تا سەردانی ئەنقەرە بکەن.

لە سەرەتاکانی ١٩٧٠کاندا، لە رووی فیزیکییەوە ناوچەکانی باشوور و باشووری خۆرهەڵات لە ناوەند زۆر دوور بوون. لە سێیەم مانگی ساڵی ١٩٧١دا لە تەمەنمدا بۆ یەکەمجار لە ئەنقەرەوە بە پاس بەرەو وان بە ڕێ کەوتم. دەبوو لە مەڵاتییە پاسەکە بگۆڕم و سواری پاسی ئەلازیغ بم و لەوێش سواری پاسی

بینگول بم و لەوێوە بچمە موش و دوای ئەوەش بە پاس بۆ تاتوان بچم. بە واتایەکی دیکە لە سەرەوە تا خوارەوە بەشێکی زۆری ناوچە کوردییەکان'م دەپێوا و لەبارەی جوغرافیای خۆرهەڵاتەوە بیرۆکەیەکم لا گەڵاڵە دەبوو. هەتا مەڵاتییە شارەزا بووم، چونکە پێشتر هاتبووم. بەڵام لەوێ بەدواوە بۆ من جێگەی مەراق و سەرنجڕاکێش بوو. لە مەڵاتییە هەتا ئەلازیغ شتێکی نائاسایی نەبوو. لەنێو سەرنشینەکانی پاسی ئەنقەرە - مەڵاتییە و مەڵاتییە - ئەلازیغ دا، هەستم بەوە نەدەکرد کە کەسێکی غەریبە بم. بەڵام لەو کاتەی لە ئەلازیغ سواری پاسی بینگول و موش بووم، تووشی شۆکێکی کەلتووری بووم کە هەتا ئەو کاتە لە هیچ شوێنێکی تورکیا بە سەرمدا نەهاتبوو. ماوەیەکی کورت لەدوای رێ کەوتنی پاسەکەی ئەلازیغ، خۆم وەك "گرینگۆ"یەك هەست دەکرد کە رێگا ناوخۆییەکانی مەکسیکا'ی گرتۆتەبەر. لە رووی رواڵەت و جەستە و پۆشاکەوە لە سەرنشینەکانی دیکە نەدەچووم و تەنانەت یەك وشە لە قسەکانیشیان تێنەدەگەیشتم. سەرنشینەکان بە جۆرێکی تایبەت سەیریان دەکردم کە دەری دەخست من لە ئەوان نیم، بەڵام نیگاکەیان پڕ بوو لە میوانپەروەری. لەلایەکی دیکەشەوە لە جامی پاسەکەوە سەیری سروشت و خاکێکم دەکرد لە هیچ شوێنێکی دیکەی تورکیا نەدەچوو. لەبەر ئەوەی زۆر حەزم لە نەخشە دەکرد، ناو و مێژوو هەر بستە خاکێکم دەزانی کە پێی دەگەیشتین. چێژم لەوە وەردەگرت کە زانیارییە کتێبییەکانم لەگەڵ ئەزموونی بینینم یەك دەگرنەوە.

گەشتێکی فەرامۆش نەکراو بوو. نزیکەی رۆژ و نیوێك دوای ئەوەی لە ئەنقەرە بە رێ کەوتم، نیوە شەو گەیشتمە وان. دواتر لە شوێنێکی دیکەوە بەرەوە دیاربەکر رۆیشتبووم و لەوێشەوە چووبوومە ئورفا و عەنتاب و لەوێشەوە لە رێی پازارجك'ەوە گەڕابوومەوە بۆ مەڵاتییە. یەکەم پەیوەندی من لەگەڵ مرۆڤی کورد و ژیانی کۆمەڵایەتی و خاکەکەی، بەهۆی ئەو گەشتەوە دروستبوو. لە سیلڤان هەندێك شایەتحاڵی بە تەمەن باسی ئەوەیان بۆ کردم کە چۆن لەدوای کۆبوونەوەکانیDDKO لە سیوەرەك، سەربازەکان خەڵکیان لە مەیدانەکانی گوند و شارۆچکەکاندا کۆکردۆتەوە و سووکایەتییان بە پیاوان کردووە. ئەمە یەکەمجار بوو کە شتی وەها ببیستم.

دوای ئەوەی لە نیوە شەودا گەیشتمە وان، خەریکبوو بەو هیلاکی و ماندوویییە خەوم لێبکەوێت کە خاوەن ماڵ بە جۆش و خرۆشەوە لە دەرگای دا. خاوەن ماڵ جەمیل فەزڵی هاوڕێم بوو کە لەو کاتانەدا وەك ماکینیست لە رێگا وشکانییەکانی تورکیا کاری دەکرد. لەو نیوە شەوەدا کتێبێکی بە نرخی تایبەت بە مێژووی کۆنی کوردی بە ناوی "شەرەفنامە" دەخوێندەوە کە لە سەدەی ١٤دا نوسرابوو. ناتوانم ئەوە فەرامۆش بکەم کە جەمیل فەزڵی بە حیسابی خۆی لەنێو کتێبەکەدا سەرەداوێکی لە سەر کوردبوونی من دۆزیبووەوە و بۆ گەیاندنی ئەم هەواڵە و خۆشحاڵییەکەی خۆی، خەوی منی زڕاندبوو. شەرەف خان نووسەری شەرەفنامە لە کتێبەکەیدا، ناوی

باپیرەی باوکی منی وەك سەدری ئەعزەم چاندارلی خەیرەدین پاشا لەنێو کوردە ناودارەکانی ئەو سەردەمە دانابوو. چاندارلی قەرە خەلیل باپیرەی باوکم، قازاسکەر (باڵاترین پۆستی دەوڵەتی عوسمانی بووە لەنێو چینی زانستیدا)ی ئۆرهان گازی دووەمین پادشای عوسمانییەکان و دواتریش سەدری ئەعزەمی موڕادی یەکەم بووە. جەمیل فەزلی، کاتێ ئەو بەشەی کتێبەکەی خوێندبووەوە، بە بێ گوێدانە شەکەتیی من ویستبووی پیرۆزبایی ئەو زانیارییەم لێ بکات. بەڵام من لە منالییەوە زانیاریم لە سەر شوناس و پشتی خۆم هەبوو. لە سەری باوکەوە سەر بە بنەماڵەی چاندارلییەکان بووم کە یەکێك لە بنەماڵە دامەزرێنەرەکانی دەوڵەتی عوسمانلی بووە و لە سەدەکانی ١٤ و ١٥دا لەکاتی سوڵتان موڕادی یەکەمەوە هەتا بایەزیدی دووەم پێنج سەدری ئەعزەمی تێدا هەڵکەوتووە. لەکاتی منداڵیدا بەردەوام سەردانی ماڵی گەورەکانی بنەماڵەکەمان دەکرد لە ئیزنیك و لەوێش کاتێ چاوم بە مزگەوت و مەزاری چاندارلییەکان دەکەوت، هەستم بەوە دەکرد کە ڕیشەیەکی مێژوویی قووڵمان هەیە. گەورەکانمان لە سەری باوکمەوە، کەسانی زۆر دیندار بوون. لە سەری دایکیشمەوە لە بنەماڵەیەکی موبادیلی (و: بەو بنەماڵە تورکانە دەوترێت کە لە یۆنانەوە هێنراون بۆ تورکیا) سەلانیکی بووم کە بە حەوت پشت خەڵکی ئەوێ بوون. باپیرەم لە گەڕەکەکەی خۆیانەوە لە سەلانیك ئاتاتورك ی دەناسی و بە "مستەفا ئابی" یان "گازی" ناوی دەهێنا. لەو تەمەنەدا ئەو لایەنەی بنەماڵەکەم و هاوشاری بوونی ئاتاتورك، شانازییەکی زۆری پێ دەبەخشیم. بە پێچەوانەی خزمەکانی سەری باوکم، هەموو خزمەکانی سەری دایکم لە گەڕەکی نیشانتاشی ئیستانبوڵ نیشتەجێ بوون. ئەوان وەك باپیرە و داپیرەم کەسانێکی شاری بوون کە دەیانتوانی بە چەند زمان قسە بکەن و پابەندی داب و نەریتە دینییەکان نەبوون. دەمزانی کە ڕەفعەت پاشا (بەلە) فەرماندەی ئەو هێزەی کە لە تێکۆشانی نەتەوەییدا ئیستانبوڵ ی ڕزگار کرد، خزمی دایکی دایکم بووە. هەروەها لە تەمەنی منالییەوە ئەوەشم دەزانی کە دایکی باوکیشم کە دووڕەگەیەکی ڤارنا - فلیبەیی بووە، نەوەی خوشکی مارشاڵ فەوزی چەکماك بووە. هەموو ئەمانەش جگە لەوەی بوونە هۆی ئەوەی خۆم وەك کەسێکی سەر بە جیلی نوێی دەستە بژێری کۆمار هەست بکەم، وایانکرد کە مەراقێکی گەورەم بۆ مێژوو و سیاسەت هەبێت. من کەسێکی خەڵکی ڕوومەلی بووم کە لە ئەنقەرە ی پایتەختی کۆمار دادەنیشتم و باپیرەکانیشم کە لە دامەزرێنەرانی دەوڵەتی عوسمانی بوون لە ئیزنیك نێژرابوون و خزمە گەورەکانی دایکیشیم لە ئیستانبوڵ نێشتەجێ بوون. هیچ کاتێکیش هەستی پابەندبوونم بە ڕوومەلی (باڵکانەکان) کە ڕیشەم دەگەیشتەوە ئەوێ، کەم نەبووەوە. لە بنەماڵەکەماندا هیچ کەسێك، تەنانەت خزمێکیش نەبوو کە ڕیشەکەی بۆ خۆرهەڵات بگەڕێتەوە.

ساڵانێك دواتر ئەوەم دەزانی کە چاندارلی قەرە خەلیل باپیرە گەورەی سەری باوکم، لەگەڵ شێخ ئەدەبالی خەزووری عوسمان گازی دامەزرێنەری ئیمپراتۆریای عوسمانی دا هاوەڵزاوا بوون و یەکێك لە زانا بەناوبانگەکانی

دنیای ئیسلامی لەو سەردەمەدا بە ناوی شێخ تاجەدینی کوردی خەزووریان بووە. ساڵی ١٩٩١ لەکاتی سەردانەکەیدا بۆ تورکیا ئەم زانیارییەم بۆ جەلال تاڵەبانی باسکرد، ئەو خۆشحاڵییەی کە لە رووی جەمیل فەزلی لە وان دەرکەوتبوو، لە روخساری تاڵەبانی'شدا دەرکەوت و خوێنی بۆ من کوڵا بوو. گوتی:"خۆی دیاربوو کە تۆ بە جۆرێك پەیوەندیت بە کورد'ەوە هەیە." هەرچی گوتم کە ٦٠٠ ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە و جگە لە زەواجی چاندارلی خەیرەدین پاشا لەگەڵ کچی شێخ تاجەدینی کوردی هیچ پەیوەندییەکم نییە و لە سەری باوك و دایکیشمەوە کە هەر دوکیان بە حەوت پشت خەڵکی سەلانیکن، منیش خەڵکی روومەلیم، هیچ سوودێکی نەبوو. ئەم قسانە دینارێکی نەدەکرد. تاڵەبانی بەو پەیوەندییە گوماناوییە لاوازەی من کە دەگەڕایەوە بۆ ٦٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا، پەیوەندی خوێنی منی لەگەڵ کوردەکان بەرقەرار کرد و بەوەش زۆر کەیف خۆش بوو.

لە راستیدا جگە لەو خۆشییەی کە هاوڕێکانم دەیاننواند، هیچ پەیوەندییەکی کورد بوونم نەبوو. پەیوەندی خوێنیم لەگەڵ کوردەکان نەبوو، بەڵام ساڵی ١٩٧١ لەکاتی ژیانی دوورخراوەییدا لە شام، لەنێو چەپەکانی تورکدا، لەبارەی کێشەی کورد و کوردەکان و مێژوو و جوغرافیاکەیانەوە زۆرترین زانیاریم هەبوو. جگە لەوەش لەبارەی ئەو کێشەیەوە بە هەسترین کەس بووم. هەر لە رۆژانی سەرەتایی ژیانی دووخراوەییمەوە لە شام زانیم کە ئەو کاتەی لە تورکیا بووم چەنێ زانیاریم لەسەر ئەم کێشەیە کەم و سنوردار بووە. دیداری من لەگەڵ کوردەکان'ی سوریا لە شام لە رێگەی بەرەی دیموکراتیکی فەلەستین، لە پەیوەندی و سەرنجی زیاتر لە چل ساڵی مندا بە کێشەی کورد'ەوە خاڵێکی وەرچەرخان بوو.

شەوێکی گەرمی تەمووزی ساڵی ١٩٧١، لە نوسینگەی بەرەی دیموکراتیکی فەلەستین سێ کورد'م بینی و لەوێوە بەرەو گەڕەکی کوردەکان (الاکراد) بە رێ کەوتین. یەکێك لەوانە خزمی ئەو کەسەی خاوەن ماڵ بوو کە ئێمە بۆ لای دەچووین. لە ماوەی دواتردا چەندینجار ئەو دووانەکەی دیکەم دەبینی کە یەکێکیانم بە هاوڕێ عەبدولحەمید دەناسی ئەوی دیکەش بە پارێزەر عەزیز.[١]

هاوشێوەی بەهێزترین و گەورەترین رێکخراوی فەلەستینی"فەتح" کە دواتر تێیدا دەبووم بە ئەندام، لە نێوە بەرەی دیموکراتیکی فەلەستین'یشدا، مرۆڤەکان یەکتریان بە برا (اخ) بانگ نەدەکرد و لە جیاتی ئەوەدا وشەی هاوڕێ (رفیق) یان بەکاردەهێنا. عەبدولحەمید و عەزیز'یشیان وەك"هاوڕێ کوردەکان'ی سوریا" بە من ناساندبوو. زانیم کە هاوڕێ عەبدولحەمید سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردی سوریا'یە و لە شاری قامشلۆ دەژی کە لە نزیك نوسەیبین لە سنوری تورکیا دایە. پارێزەر عەزیز'یش لە شاری حەلەب نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردی سوریا بوو. هەردوکیشیان بۆ ماوەی چەند رۆژێك هاتبوون بۆ شام. پارتی دیموکراتی کوردی سوریا پێگەیەکی نیمچە

١ - عەبدولحەمید دەرویش لە ساڵی ١٩٥٧دا یەکێك لە ئەندامانی دامەزرێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان - سوریا بوو. لەو حزبەوە دوانزە رێکخراوی جیاوازی کوردی دروستبوون. عەبدولحەمید دەرویش ساڵی ٢٠١٢ سەرۆکی پارتی پێشکەوتنخوازی دیموکراتی کوردەکانی سوریا و بەرپرسی پەیوەندییە دەرەکییەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردی بوو کە بەشی کوردی ئۆپۆزیسیۆنی سوریای پێك دەهێنا. عەزیز داود'یش سەرۆکی پارتی یەکسانی دیموکراتی بوو کە لە ئەنجومەنی نیشتمانی کوردی'دایە.

ڕەسمی هەبوو. بەڕێوەبردنی بەعسی لە سوریا کە خۆی بە نەتەوەگەرای عەرەبی و سۆسیالیست دەزانی، لە ناوەڕۆکدا ڕژێمێکی پۆلیسی بوو کە هاوشێوەی تورکیا نکۆڵی لە هەبوونی کوردەکان لە وڵاتەکەیدا دەکرد. پارتی دیموکراتی کوردی سوریا'ی بە یاسایی لە قەڵەم نەدەدا، لەگەڵ ئەوەشدا سەرەڕای ئەوەی کە دەیزانی کێ کێیە، کەسی نەدەگرت و هەوڵی نابووتکردنی نەدەدان.

لەو ساڵانەدا ئەو حزبە لە شاری قامشلۆ کە زۆربەی دانیشتوانی کورد'ن بەهێزترین ڕێکخراو بوو. لە شام و حەلەب کە دوو ناوەندی گەورەی نیشتەجێبوونی کوردەکان بوون، بە جۆرێك کە سیستەمی گشتی تێك نەدات، چاوپۆشی لە کاروچالاکییەکانی ئەو ڕێکخراوە دەکرا.

کوردەکان (الاکراد) یەکێك بوو لەو دوو گەڕەکەی کە لە لاپاڵە رووتەکانی شام لە چیای قەیسونی بۆردا بونیاتنرا بوون. لە میتۆلۆژیای ئیسلامیدا، بە هەر هۆکارێك بێت چیای قەیسون وەك ئەو شوێنە دەزانرێت کە تێیدا قابیل، هابیلی برای خۆی کوشتوە، یانی یەکەم جینایەتی مرۆڤایەتی لەوێ ڕوویداوە. نازانم ئەوە چەندە ڕاستە، بەڵام ئەمە ڕاستییەکە کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا، دوای شکستهێنانی عوسمانییەکان لە باڵکان، کۆچەرەکان لە چیای قەیسون لە گەڕەکی موهاجرین و کوردەکانیش لە گەڕەکی ئەلئەکراد نیشتەجێبوون.

هەرچەندە ناوی موهاجرین بەکاردەهات، بەڵام لە سەر هیچ نەخشەیەکی شام و لەسەر هیچ پاسێکدا وشەی ئەلئەکراد بەدی نەدەکرا. ناوی "ڕەسمی" گەڕەکەکە روکنەدین بوو، بەڵام لە کۆڵاندا لە کەسێکت بپرسیبایە کە چۆن بچم بۆ روکنەدین، نەیدەزانی. بەڵام ئەلئەکراد'ت لەهەرکەسێك بپرسیبایە دەیزانی. هەڵوێستی ڕەسمی سوریا لەبارەی کورد و کێشەی کورد لە هەندێك لایەنەوە تورکیا'ی بیر دەهێنایەوە.

کاتێك لە دەشتی شام'ەوە سەیری چیای قەیسون'م دەکرد کە ئەلئەکرادی لێیە، دەمتوانی بڵێم لەگەڵ ئاڵتنداغ و قەڵای دەوروبەری ئەنقەرە لە یەك دەچن. کەم تا زۆر بەرزاییەکەیان وەك یەکە و ڕەنگەکەیشیان وەکو یەك بۆرە. جگە لەوە هاوشێوەی ئاڵتنداغ'ی ئەنقەرە کە کەلاوەنشینی و خانووی تەنەکەیی داپۆشیوە، ئەوێش روخساری گەڕەکی هەژارنشین یان لانیکەم گەڕەکێکی سادەی شام'ی لە خۆی پیشان دەدا. دیمەنی چیای قەیسون و ئەلئەکراد بۆ کەسێکی وەك من کە بەر لە ژیانی دوورخراوەیی لە ئەنقەرە ژیابوو، دیمەنێکی ئاشنا بوو.

کاتێ لەگەڵ هاوڕێ عەبدولحەمید و هاوڕێ عەزیز سواری ئۆتۆمبیلێك بووین، دەمزانی بۆ گەڕەکی ئەلئەکراد دەچین. لە ڕێگایەکی پڕ لە پێچ و کۆڵانی تەسکەوە گەیشتینە ئەلئەکراد. تێنەدەگەیشتم لەوەی کە بۆچی پێویستە بۆ دیدارێك سەردانی ئەم شوێنە بکەین، بەڵام وەك ئەوە وابوو کە پێویستە دیداری نێوان قاچاخێکی سیاسی تورکیا کە وڵاتەکەی جێهێشتووە لەگەڵ سەرکردەی حزبێکی نایاسایی گرووپێکی ئەتنیکی سوریا بە نهێنی ئەنجامبدرێت.

کاتێك خاوەن ماڵە بەتەمەنەکەیان پێناساندم، وامزانی ناوەکەیم بە هەڵە بیستووە. لە شوێنی دانیشتندا چاوم بڕییە چاوی. زۆری پێنەچوو کە تێگەیشتم ئەوەی بیستوومە دروست بووە. لە ڕۆژانی چالاکییە سیاسییەکانمەوە لە تورکیا ناوی جگەرخوێن شاعیری گەورەی کورد'م بیستبوو کە بە"نازم حیکمەت"ی کورد بانگ دەکرا. جگەرخوێن لەبەرامبەردا دانیشتبوو، منیش میوانی جگەرخوێن بووم.

دواتر چەندینجار سەردانی ماڵی جگەرخوێن'م دەکرد. تەنانەت ئەو کاتانەش کە لە بەیروت'ی پایتەختی لوبنان دەژیام و جاربەجار سەردانی شام'م دەکرد، دیسان هەندێك شەو بە میوانی لە ماڵی ئەو دەمامەوە. لەگەڵ جگەرخوێن دا باسی مێژووی تێکۆشانی سیاسی کورد لە تورکیا و کوردەکان'ی عێراق و بارودۆخی گشتی کوردەکان'ی ناوچەکەمان دەکرد و چێژم لەو قسە و باسانە وەردەگرت و پێموابوو شتی زۆری لێ فێر دەبم. ئەو کاتەی جگەرخوێن'م ناسی، لە تەمەنی حەفتا ساڵی دابوو. ئەو بۆ کەسێکی شۆڕشگێری ڕۆمانتیکی ٢٢-٢٣ ساڵەی وەك من پیاوێکی زانا و دانامە بوو. زۆر شت هەبوو کە دەبوو لەبارەیەوە لێی بپرسم و گوێی لێبگرم.

ماڵەکەی جگەرخوێن لە ئەلئەکراد، یەکێك بوو لەو شوێنە دەگمەنانەی کە تا ئەو جێگایەی دەکرا هەستی خۆش و گەرمی خانەوادەی پێ دەبەخشیم کە بەردەوام حەسرەتیم دەکێشا. لەگەڵ کچێکی بچکۆلانەی ئەو ماڵە بە ناوی میدیا کە نەوەی جگەرخوێن بوو، گاڵتە و یاریم دەکرد. ئاگام لەو ئیدیعایە هەبوو کە دەیگوت مادەکان باوباپیرەی کوردەکان بوون. لەوە دەچێ ناونانی نەوەی جگەرخوێن بە میدیا، ئاماژە بە هەبوونی وشیارییەکی نەتەوەیی بەهێز لەو ماڵەدا بووبێت. لەنێو دنیای سوریا - عەرەبی'دا زۆر مومکین نەبوو کەسێك ناوی میدیا لە کچەکەی بنێت. باوکی میدیا، کوڕەکەی جگەرخوێن لە گردەکانی گۆلان (جۆلان)، لەبەرەی جەنگدا سەرباز بوو. هەندێك جار کە بە مۆڵەت دەگەڕایەوە بۆ ماڵ، یەکترمان دەبینی. لەگەڵ ئەودا لەبارەی پێکهاتەی سوپای سوریا، کوردبوون لەنێو سوپای سوریا، جەنگ لەگەڵ ئیسرائیل و سەربازی کردن لە گردەکانی گۆلان، بە گەرمی گفتوگۆمان دەکرد. لەبەر ئەوەی کە ماوەیەك لە بنکەیەکی گەریلایی فەلەستین'دا لە گۆلان مابوومەوە، شارەزای ناوچەکە و نەخشەکەی بووم. لەبەر ئەوەی خاڵی هاوبەشمان هەبوو، قسە و باسەکانمان بە ئاسانی بەرەو پێش دەچوون.

جگەرخوێن وەك مێژوویەکی زیندووی پڕبەها بوو. کاتێك من لە تەمەنی ناسینی ئەودا بووم، ئەو لە ساڵی ١٩٢٥دا بەشداری لە ڕاپەڕینەکەی شیخ سەعید'دا کردبوو کە شکڵی بە پێکهاتەی ڕژێمی تورکیا داوە و تا ئەمڕۆ هێناویەتی. ئەو ڕاپەڕینە کە لەدوای ڕاگەیاندنی کۆمارەوە گەورەترین ڕاپەڕینی کوردەکان بووە، لە زەینی ئێمەی تورك'دا، چالاکییەکی دینی - کۆنەپەرستانە بوو کە بە پشتیوانی ئینگلیزەکان ئەنجام درابوو. وەها فێریان کردبووین کە ئامانجی ئینگلیزەکان، لاوازکردن و دابەشکردنی کۆماری تازەپێگەیشتووی ئەو

هێزانە بوو کە لە جەنگی رزگای نەتەوەییدا نەیانتوانیبو شکستیان بدەن.

تۆ وەرە سەیری ئەو راستییە بکە جگەرخوێن هیچ پەیوەندییەکی بە بیرە ئاینییەکانەوە نەبوو. تەنانەت لەو کاتانەدا خۆی بە چەپ دەزانی. هەر بەو شوناسە چەپەیشەوە، لەنێو ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری خۆیبوون'دا جێی گرتبو[٢]. ناو ئەسڵییەکەی شێخموس بوو. لە دەورووبەری میدیات لە دایکبووە و لەوێش گەورە بووە. دواتر لەبەر بەشداریکردن لە راپەڕینەکەی شێخ سەعید و ئەنجامدانی چالاکیی ژێرزەمینی بۆ خۆیبون، دەرفەتی نەماوە لە تورکیا بمێنێتەوە و بۆ سوریا هەڵهاتووە. لە ساڵی ١٩٣٠وە نزیکەی ٤٠ ساڵ پێی نەنایەوە خاکی تورکیا و بەشداری لە جوڵانەوە کوردییەکانی سوریا و عێراق'دا کرد. جگە لە شاعیر بوونەکەی، جگەرخوێن مێژووی زیندووی جوڵانەوەی کوردی بوو کە بە چەند وڵاتێکدا بڵاو ببووەوە.

جگەرخوێن هەمان گەشبینی چەپەکانی سەدەی بیستەمی هەبوو. بەر لەوەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست جێ بهێڵم و بچمە ئەورووپا، لە ساڵی ١٩٧٣دا لە بەیروت'ەوە چوومە شام و ویستم ماڵئاوایی لەویش بکەم. لەکاتی ماڵئاواییدا بە گەشبینییەکی ناچارییەوە وتم پێویستە هیوابڕوا نەبێت و لەوانەیە رۆژێك بگەڕێینەوە بۆ تورکیا و هیوادارم لەوێ بتبینمەوە. وەك ئەوەی قورسایی کاتی ماڵئاوایی نەکەوتبێتە سەرشانی، وتی سەرەڕای ئەوەی کە تەمەنم زۆرە بەڵام لەوانەیە نەك تەنها لە ئەنقەرە و ئیستانبوڵ، بەڵکو لە تاران و بەغدا'ش یەکتر ببینین. دڵنیا بوو لەوەی کە دەتوانێت سەردانی عێراق'ی ژێر دەسەڵاتی بەعس و ئێران'ی ژێردەستی رژێمی شا و تورکیا'ی ژێر دەسەڵاتی سەربازەکان بکات و بچێتە هەموو ئەو وڵاتانەی کوردی لێیە. بە واتایەك دڵنیابوو لەوەی کە ئەو شوێنانە دەبنە جێگایەك کە تێیدا کوردەکان بە مافەکانی خۆیان بگەن. لەوانەیە کاتێك کە دەیگوت من بەم تەمەنەوە ئەو رۆژانە دەبینم، دەیویست من گەشبین بکات...

لەکاتی رۆیشتندا دوو بەرگی دیوانەکەی خۆی بە دیاری پێدام. بەو هیوایەی کە رۆژێك بتوانم دیوانەکەی بە کوردی بخوێنمەوە، لەوەش گرنگتر بەو هەستەی کە ئیمتیازێکی گەورەم دەسکەوتووە کە چەندین کورد لە جیهاندا ئارەزوویانە پێی بگەن، دیارییەکەی ئەوم بە شانازییەکی زۆرەوە وەرگرت. دوای ئەوە ئیتر جگەرخوێن'م نەبینییەوە و هەواڵیشیم نەزانی. دواتر زانیم کە شەش ساڵ پاش دوایین دیدارمان، لە سوید نیشتەجێ بووە و لە تەمەنی ٨١ ساڵیدا لە ستۆکهۆڵم گیانی لە دەسداوە.

بیرم دێتەوە کاتێ لەگەڵ ئەودا قسەم دەکرد، زیاتر لە فێربوونی شتی تازە، مێشکم تێکەڵ و پێکەڵ دەبوو. پرسیار و وەڵامەکانی ناو زەینم زیاتر دەبوون. لە سەرووی هەموو ئەو پرسیارانەشەوە، قسە و رەخنەکانی جگەرخوێن و پارێزەر عەزیز و هاورێ عەبدولحەمید لەبارەی مەلا مستەفای بارزانی دەهاتن. ئەو کاتانەی دەچووم بۆ حەلەب لە ماڵی پارێزەر عەزیز دەمامەوە و لە بەیروت'یشدا کە بەشێکی زۆری

٢ - رێکخراوێکی سەربەخۆخوازە کە لە ساڵی ١٩٢٧دا لەلایەن ژمارەیەك رۆشنبیری کورد لە بەیروت دامەزراوە. یەکەم سەرۆکی ئەو رێکخراوە جەلادەت عالی بەدرخان بووە و کەسانی وەك کامران بەدرخان، ئەکرەم و قەدری جەمیل پاشا لە دەستەی دامەزرێنەرانی رێکخراوەکە بوون. خۆیبون راپەڕینی چیای ئاگری دەستپێکرد بەڵام لە ساڵی ١٩٣٠دا سەرکوت کرا و ئیحسان نوری پاشا فەرماندەی راپەڕینەکەش پەنای بۆ ئێران برد.

ماوەی دوورخراوەییم لەوێ بەسەر بردووە، زوو زوو هاوڕێ عەبدولحەمید'م دەبینی. سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردی سوریا و جگەرخوێن شاعیری گەورەی کورد، مەلا مستەفای بارزانی'یان بە لە ناوبردنی پارتی دیموکراتی کوردستان،ی تورکیا تۆمەتبار دەکرد. لەو کاتانەدا مەلا مستەفای بارزانی، لەبەر راپەڕینەکەی لە دژی دەسەڵاتی نەتەوەگەرای عەرەبی بەغدا لە عێراق، خاوەن کەسایەتییەکی ئەفسانەیی بوو کە وەك بەهێزترین رەمزی نەتەوەیی کوردی لێهاتبوو. رۆژێك بیرم لەوە نەکردبووەوە کە هیچ کوردێك یان رێکخراوێکی کوردی و بگرە سەرکردەکانی رێکخراوێك کە ناوی پارتی دیموکراتی کوردستان،ی هەڵگرتووە، بەو شێوەیە رخنە لە بارزانی بگرن. جگە لەوە رخنەکان پەیوەندییان بە پارتی دیموکراتی کوردستان،ی تورکیا'وە هەبوون. پارتی دیموکراتی کوردی سوریا خۆی بە برا - رێکخراوی پارتی دیموکراتی کوردستان،ی تورکیا لە قەڵەم دەدا.

بە گوێرەی ئەو شتانەی کە بۆ من باسکراون، سەعید ئەلچی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان'ی تورکیا دوای ئەوەی لە دەست رژێمی ١٢ی مارت هەڵهاتوە و پەنای بردۆتە کوردستان'ی عێراق، لەوێ لەلایەن کوردێکی دیکەی تورکیا بە ناوی د. سەعید کرمزی تۆپراك کە ناوە نهێنییەکەی د.شوان بووە، کوژراوە. مەلا مستەفای بارزانی'ش لەسەر ئەوە، د. شوانی دەستگیر کردووە و فەرمانی کوشتنی داوە.

دواتر دەمزانی کە ئەم رووداوە لە مێژووی جوڵانەوەی کوردی تورکیا بە"رووداوی دو سەعید"ەکە ناوبانگی دەرکردووە و تا ئێستا وردەکارییەکانی بە روونی دەرنەکەوتوون. بەڵام بۆچوونی کەسایەتییە کوردەکان'ی سوریا لەبارەی ئەو رووداوەوە بەمجۆرە بوو: لە راستیدا خودی مەلا مستەفای بارزانی لە پشت روداوی کوشتنی سەعید ئەلچی'وە بووە، دوای لە ناوبردنی سەعید ئەلچی، بارزانی تاوانەکەی خستۆتە ئەستۆی د.سەعید کرمزی تۆپراك و ئەویشی لەناو بردووە. ئامانجەکەیشی لەم کارە ئەوە بووە کە جوڵانەوەی کوردی لە تورکیا بێ سەرۆك بهێڵێتەوە و بەوجۆرە لە تورکیا کە زۆرترین ژمارەی کوردەکان'ی لێیە، رێگا لە دەرکەوتنی رکابەری خۆی بگرێت.

ئەم روونکردنەوەیە قەناعەتی بە من نەکرد و مێشکم تێکەڵ و پێکەڵتر بوو. لەنێو دوو سەعید'ەکەدا، هەرچەندە سەعید ئەلچی'م نەدەناسی بەڵام دەمزانی کێیە. ئەندامی پارتی کرێکارانی تورکیا TIP بوو. لە کۆبوونەوەکانی TIPدا یەکترمان بینیبوو، بەڵام نەمدەزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان'ی تورکیا'یشە. دواتریش دەمزانی کە د. سەعید کرمزی تۆپراك کوردێکی عەلەوی خەڵکی دەرسیم بووە و هەتا دەرکەوتنی پ.ك.ك، کاریگەرترین کەسایەتی سیاسی کورد بووە و بەر لە هەموو کەسێك بیرۆکەی شەڕی چەکداری هێناوەتە سەرزمان. تا بەر لە دەرکەوتنی پ.ك.ك، کاریگەرترین رێکخراوی کوردی DDKO بوو کە پێشتر بە "شوانچییەکان" دەناسران. لەدوای مردنی د.سەعید کرمزی تۆپراك رێکخراویDDKO

دەرکەوت و ئەویان وەك سەرۆکی مەعنەوی خۆیان دەستنیشانکرد.

سەرکردەکانی کوردی سوریا لەبارەی مێژووی ناڕوونی جوڵانەوەی کوردی تورکیا و پەیوەندی نێوان کوردەکان'ی تورکیا - عێراق - سوریا روونکردنەوەی قەناعەت پێ هێنەریان لا نەبوو. ئەو سوودەی کە ئەوان بۆ منیان هەبوو، زیاتر لە رەهەندی تیۆری کێشەی کورد، تێگەیشتن لە رووی کردەیی کێشەکە بوو. هاوڕێ عەبدولحەمید، برازایەکی هەبوو کە لە پشت هۆتێلی ستراند کە لە یەکێك لە کۆڵانەکانی شەقامی ناوەندی حەمرای بەیروت کرابووەوە، دەژیا. کاتێ سەردانی بەیروت'ی دەکرد لەوێ دەمایەوە. ئەو پیاوە گەنجەیان وەك نوێنەری پارتی دیموکراتی کورد لە بەیروت بە من ناساندبوو. من لە کەمپێکی پەنابەرانی فەلەستین بە ناوی بورج ئەلباراجنی لە نزیك فڕۆکەخانەی بەیروت دەمامەوە. کاتێ سەردانی ناو شارم دەکرد، هەندێك جار دەچوومە لای ئەو پیاوە و بەوجۆرەش دەمزانی هاوڕێ عەبدولحەمید کەی سەردانی بەیروت دەکات.

لە چارەکی یەکەمی ساڵی ١٩٧٣دا کاتێك پلانم دانابوو بۆ ئەوەی لە لوبنان نەمێنێم و بڕۆم بۆ ئەورووپا و سەرقاڵی رێکخستنی کارەکانم بووم، جارێکی دیکە لە بەیروت هاوڕێ عەبدولحەمید'م بینی و ئەویش کتوپڕ پێی گوتم کە ئایا دەمەوێ جەلال تاڵەبانی ببینم یان نا. جەلال تاڵەبانی لە بەیروت بوو. باسی منیان بۆ کردبوو، ئەویش وتبوی ئەگەر دەیەوێ دیدارم لەگەڵ بکات، دەتوانین سەر لە بەیانی رۆژی یەکشەممە پێکەوە قاوەتی بکەین.

دەبێ دان بەوەدا بنێم کە لە بەرامبەر ئەو پێشنیارەدا کەوتمە جۆش و خرۆش. جەلال تاڵەبانی لەدوای مەلا مستەفای بارزانی کەسی دووەمی راپەڕینی کوردەکان لە عێراق بوو. بە کەسێکی خاوەن بیری چەپ و تەنانەت مائۆئیستی دەناسرا. جگە لەوەی کە لەدوای مەلا مستەفای بارزانی کەسی دووەم بوو، پێشتریش لە تورکیا بەهۆی هەواڵی جەنگی بچووکی ناوخۆیی کوردەکان'ەوە لە ١٩٦٤ و ١٩٦٦دا کە لەبەر دژایەتیکردنی مەلا مستەفا دەرکەوتبو، لە رێی راگەیاندنی تورکی'یەوە ناوی جەلال تاڵەبانی'م بیستبوو. پێشنیاری ئاشنابوون بە کەسێکی ناسراوی جیهانی و قاوەتی کردن لەگەڵیدا، جۆش و خرۆشێکی لە دەروونمدا دروستکردبوو.

نزیکەی دوو ساڵ بەر لەو بەروارە کە پێم نابووە ناو ئەو خاکە، لە لوتکەی شۆڕشگێڕیی رۆمانتیزمدا دەژیام. من ئەندامێکی جوڵانەوەی چەپی تورکی بووم کە سەرەڕای ئەوەی چالاکییەکانی بە شێوەی ژێرزەمینی ئەنجام دەدا، هیچ کات وازی لە گەشبینی نەدەهێنا. شانازیم بە پێگەی خۆمەوە دەکرد. بەڵام ئەو کاتەی پێشنیاری بینینی تاڵەبانی'م بۆ کرا، ئەندامێکی پێشووی رێکخراوی چەپ بووم کە جوڵانەوەکەی سەرکوت کرابوو و خۆیشی لە دەرەوەی وڵات بە تەنها مابووە و لە چالاکییە رێکخراوەییەکان دەرکەوتبوو. من تاکێك بووم کە تەقەلام بۆ ژیانێکی نوێ دەدا و نوێنەرایەتی هیچ لایەنێکی سیاسیم نەدەکرد.

لە رۆژێکی یەکشەممەی سەرەتاکانی نیسانی ۱۹۷۳دا، لەوماڵەی کە دەمایەوە هاوڕێ عەبدولحەمید'م بینی. دوای تۆزێك رێکردن، چووینە ئەوبەری شەقامی حەمرا و لەوێشەوە چووینە کۆڵانی رووئەسادات کە زۆر شارەزای بووین. لە دەرگایەکمان دا. کەسێك باڵا مامناوەندی بەشێوەیەکی زیادەڕوانە پێشوازییەکی گەرمی لێ کردین. بە زمانی ئینگلیزی پرسیاری لێکردم کە حەزم لێیە هێلکەکە چۆن بێت:" ئۆملێت، سوورۆکراو، تیکەڵکراو؟" لەکاتێکدا کە بە عەرەبییەکەی خۆم قسەم دەکرد کە زۆر پێشم خستبوو، ئەو هەر بە ئینگلیزی قسەی لەگەڵ من دەکرد.

کاتێ پێم نایە ناو ژوورەکە، چاوم بە کەسێکی باڵابەرزی کەڵەگەت، سمێڵ رەش و بە هەیبەت کەوت کە بە بێدەنگی دانیشتبوو. لە دڵی خۆمدا وتم، هەڵۆی سەر شاخەکان و فەرماندە ئەفسانییەکەی پێشمەرگە پێویستە وەها بێت. لای خۆمەوە وتم جەلال تاڵەبانی ناوبانگەکەی هەق کردووە. بە پێچەوانەی ئەو سەرکردەیەی کە زۆر سەنگینانە لەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو، کابرای لاواز هەر وازی نەدەهێنا و هێشتا پرسیاری ئەوەی لێدەکردم کە حەز دەکەم هێلکەکەم چۆن بێت. دەمویست یەکسەر لەگەڵ ئەو سەرکردەیەی کە لە سەر کورسییەکە دانیشتبوو، ئاشنا بم. بۆ دوورخستنەوەی خزمەتکارەکەش لە خۆم، جۆری هێلکەکەم پێگوت و ئەویش یەکسەر بەرەو مەتبەخ رۆیشت.

دەستم بۆ لای سەرکردەی سەر کوسییەکە درێژکردەوە و بە عەرەبی قسەم لەگەڵدا کرد. دەتگوت لەگەڵ ئەودا قسە ناکەم. نەك هەر زەحمەتی تەوقەکردنی لەگەڵ مندا نەکێشا، بەڵکو وەڵامیشی نەدامەوە. بەلا چاوێکەوە سەیری هاوڕێ عەبدولحەمید'م کرد و لە دڵی خۆمدا وتم نەکا بە بێ ئەوەی بزانم نەریتێکی کوردەکان'م پێشێل کردبێت. وتم ناکرێ چاوەڕوانی ئەوە بکرێت کە سەرکردەیەکی گەورە و گرانی پێشمەرگە یەکسەر لەگەڵ کەسێکی غەریبەدا دۆستانە رەفتار بکات و بەوجۆرەش لە مێشکی خۆمدا هۆکاری کەمتەرخەمی و هەڵنەسانی سەرکردەکەی پێشمەرگەم، دەهۆنییەوە.

هێلکەکەم هات و دەعوەتی سفرەکەیان کردین. بەڵام سەرکردەکەی سەر کورسییەکە هەر لە جێی خۆی نەجووڵا و نەهات. ئەگەر لەگەڵ جەلال تاڵەبانی قاوەتیمان دەکرد، بۆچی نەدەهاتە سەر سفرە؟

دواجار تێگەیشتم ئەو کەسە خاکییەی کە لەسەر سفرە بەردەوام بە ئینگلیزی قسەی دەکرد و بە دەستی خۆی قاوەتی بۆ دانام، جەلال تاڵەبانی'یە.

باشە ئەی ئەو کەسەی لەسەر کورسییەکە دانیشتبوو کێ بوو؟

پاسەوانی جەلال تاڵەبانی بوو کە عەرەبی و ئینگلیزی نەدەزانی و تەنها لە زمانی کوردی تێدەگەیشت.

ساڵانێك دواتر، ئەو یەکەم دیدارەمان دەبووە بیرەوەرییەك کە تێیدا تاڵەبانی لە خوانە گەورەکاندا بە قاقاوە بۆ میوانەکانی دەگێڕایەوە.

ئەو رۆژە، قسەکانمان لەگەڵ جەلال تاڵەبانی زیاتر لەبارەی جوڵانەوە شۆڕشگێڕییەکانی وڵاتە جیاوازەکان و دروستکردنی پەیوەندی نێوان شۆڕشگێڕەکان بوو. لە روانگەی منەوە بارودۆخەکە زۆر سەیر بوو. وەك ئەوە وابوو کە بە تەنها نوێنەرایەتی جوڵانەوەی شۆڕشگێڕی تورکیا دەکەم کە بەشێکی زۆری کادیرەکانی لە زیندان بوون و جوڵانەوەکە سەرکوت کرابوو. هەر کاتێ قسەم دەکرد، نەمدەزانی باسی خۆم دەکەم یان باسی جوڵانەوەی شۆڕشگێڕی تورکیا دەکەم کە لەو کاتانەدا بە تەواوی دیار نەبوو کە چۆن ناوبنرێت. ئەگەر بەشێوەیەکی سادە و خاکییانە بڵێم گوتایە جگە لە خۆم نوێنەرایەتی هیچی دیکە ناکەم، ئەوسا قسەکانم لەگەڵ تاڵەبانی هیچ مانایەکیان نەدەما. ئەوەم نەکرد و قسە و باسەکانمان هەتا نیوەڕۆ بەردەوام بوو. تاڵەبانی پێشنیاری کرد کە نانی نیوەڕۆ لە دەرەوە بخۆین. بەپێی رۆیشتینە گەڕەکی راوشە کە وەك نووکی سێگۆشەیەك بەیروت ی بە دەریای سپی دەبەستەوە و زنجیرەیەك رێستۆرانتی باشی تێدابوو.

هەرکاتێ دەچوومە راوشە لەبەر پارەکەی گیرفانم، یان بە واتایەکی دروستتر لەبەر بێ پارەیی نەمدەوێرا بچمە ناو هەندێك رێستۆرانت. پێکەوە چووینە یەکێك لەو رێستۆرانتانە بە ناوی یڵدلەز. بیستبووم کە خاوەنەکەی خەڵکی ئانتاکیا یە و لەبەر ئەوەش ناوەکەی یڵدزلەرە، بۆیە هەر کاتێ ئەو رێستۆرانتەم دەبینی کە رووی کردبووە دەریای سپی، مەراق دای دەگرتم. دواتر کە لە نزیکەوە دەمزانی تاڵەبانی پیاوی ژێستە، زانیم کە لەبەر ئەوەی تورك بووم، منی بردۆتە رێستۆرانتێکی باش کە ناوەکەی تورکی بێت بۆ ئەوەی ژێستێکی خۆش دەرهەق بە من بکات.

لەو نیوەڕۆیەدا بۆ یەکەمجار تاڵەبانی وەك کەسێکی قسە خۆش کە حەزی لە نوکتە و گاڵتەیە و چێژێکی نائاسایی لە مانەوە لەسەر سفرەی خواردن وەردەگرێت، لەبەرامبەرمدا دەرکەوت و ساڵانی دواتریش چەندینجار ئەمەم دەبینی. بابەتەکەمان لە قسەکانی نێو ماڵەکەی لایدابوو. تاڵەبانی بە زمانی گاڵتەپێکردن باسی مەلا مستەفای بارزانی دەکرد کە لەو کاتانەدا سەرکردەی جوڵانەوەی کوردەکان بوو لە عێراق و تەنانەت بە یەکەم کەسایەتی نەتەوەیی کورد لە جیهانیش لە قەڵەم دەدرا.

باسەکانی خۆی بە کۆمەڵێك بیرەوەرییەوە بە زیندوویی دەهێشتەوە و نمونەی وەهای لەسەر نەزانیی مەلا مستەفا دەهێنایەوە کە جێی بڕوا نەبوون. ناتوانم بڵێم کە لەو یەکەم نان خواردنی نیوەڕۆیەمدا لەگەڵ تاڵەبانی، نەکەوتمە ژێر کاریگەری کەسایەتییەکەی، بەڵام هەستم بەوە کرد کە شتی زۆر لەسەر پێکهاتەی جوڵانەوەی کوردی و تایبەتمەندییە دڕۆینەکانی سیستەمی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست فێربووم. چونکە تاڵەبانی سیفەتێکی رەسمیی هەبوو. ئەو لە بەیروت، نوێنەری مەلا مستەفای بارزانی یان بە واتایەکی دیکە نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان بوو.

ساڵانێك دواتر دەمزانی کە لەو کاتانەدا کە یەکەم جار تاڵەبانی م بینی، ئەو خەریکی دروستکردنی

پەیوندیەکی نزیك بوو لەگەڵ بەرگری فەلەستینی بە تایبەتی بەرەی گەلی فەلەستینی جۆرج حەبەش کە خۆی بە مارکسیست لە قەڵەم دەدا. لەوانەیە بۆ تاڵەبانی نزیکیی ئایدۆلۆژی - چەپ لە نزیکیی ئەتنیکی گرنگتر بووبێت. خۆی لە خۆیدا ئەو کاتانەی کە ئێمە یەکترمان ناسی، لەنێو جوڵانەوە کۆمۆنیستییەکانی جیهاندا جیاوازییەکی زۆر لەسەر پێگەی سۆڤییەت - چین هەبوو و بۆچوونەکانی تاڵەبانی زیاتر لە بۆچوونەکانی ماتۆ زێدۆنگ سەرۆکی چین نزیك بوون. خاڵە هاوبەشەکانمان لەو رۆژەدا، بوونە هۆکارێك بۆ ئەوەی کە دواتر تاڵەبانی لەهەر دیدارێکدا بە"تونچە" بانگم بکات. تونچە لە زمانی چینیدا واتای هاوڕێ دەدات و تاڵەبانی هیچ کات ئەوەی فەرامۆش نەدەکرد کە بڵێت پەیوەندییەکانی ئێمە وەك دوو مائۆئیست بۆ ساڵی ١٩٧٣ دەگەڕێتەوە. دیدارەکەمان لە گەڕەکی حەمرای بەیروت لە ساڵی ١٩٧٣، بەردەوام وەك پشتیوانەیەك بۆ قووڵبوون و بەردەوامبوونی پەیوەندییەکانمان بوو.

بە تێپەڕبوونی کات، هەرچی زیاترم لەبارەی مێژووی جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد و پشتی پەردەی رووداوەکانیەوە دەبیست و کارم لەسەری دەکرد، زیاتر ریشە و قوڵایی ناکۆکییەکانی بارزانی - تاڵەبانی'م بۆ دەردەکەوت. هەرچەندە ئاگام لە ناکۆکییەکانی نێوانیان هەبوو، بەڵام ئەگەر بە وردی تایبەتمەندی ناکۆکییەکانی نێوانیانم بزانیبایە، لەو رۆژەی بەیروتدا لە قسەکانی تاڵەبانی لەسەر مەلا مستەفای بارزانی سەرم سووڕ نەدەما.

جەلال تاڵەبانی ساڵی١٩٣٣ لەدایکبوە و سەر بە بنەماڵەیەکی گەورەیە لە دامەزرێنەرانی تەکیەی قادری کە لە کەرکوك بە تەکیەی تاڵەبانی ناسراوە و ریشەکەیان بۆ سێسەد ساڵ بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە. ئەو بنەماڵەیە چەندین کەسایەتی گەورەی ئەدەبی و دینی لێ هەڵکەوتوە. ژیانی سیاسیی تاڵەبانی هەر لە تەمەنی ١٤-١٥ ساڵییەوە بەر لە کۆتاییهاتنی ١٩٤٠ەکان دەستپێکردوە و بەشێوەیەکی سەرسوورهێنەر نزیکەی حەفتا ساڵی پڕ لە هەڵبەز و دابەزی خایاندووە. مانەوەی لە مەیدانی خز و بێڕەحمی سیاسەت لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و تۆمارکردنی ناوی وەك یەکەم سەرکۆماری هەڵبژێردراوی عێراق لە مێژوودا، موعجیزەیە. لەوەش زیاتر چۆنییەتی ئەنجامدانی ئەو کارە وەك سەرکردەی گەلێك کە لەسەر نەخشەی سیاسی سڕاوەتەوە، تەنها بە توانایی و جووڵەی تاڵەبانی روون دەکرێتەوە. ئەو ناوناتۆرانەی کە زۆرێك لە دوژمنان و تەنانەت هاوپەیمانەکانیشی پێی دەڵێن، دەکرێت وەك "فورمۆلی سیحراوی" مانەوەی خۆی و ئەو سەرکەوتنانەی کە بۆ خۆی و کوردەکان بە دەستی هێناون، لە قەڵەم بدرێن.

تاڵەبانی لە تەمەنی منداڵیدا لە ساڵی ١٩٤٧، یانی ساڵێك دوای دامەزرانی پارتی دیموکراتی کوردستان،ی عێراق بەشداری ئەو حزبە بووە. پارتی دیموکراتی کوردستان'ی عێراق ساڵی ١٩٤٦ وەك لقی عێراق'ی پارتی دیموکراتی کوردستان'ی ئێران کە لە ساڵی ١٩٤٥دا دامەزراوە، بونیاتنراوە. پارتی، رێکخراوێکی

سەربەخۆ نەبوو، بەڵکو بەشێکی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. ئیبراهیم ئەحمەد خەزووری جەلال تاڵەبانی لە سلێمانی کە ناوەندی کەلتوری - سیاسی کوردی'یە، نوێنەرایەتی ئەو حزبەی دەکرد.

لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی لە سەر خاکی ئێران، کۆماری کورد'یی مەهاباد دامەزرابوو. ئەو کۆمارە کوردی'یە کە لە ١٩٤٦/١/٢٢دا لە مەیدانی چوارچرای مەهاباد لەلایەن قازی محەمەد'ەوە راگەیەنرا، وەك یەکەم دەوڵەتی مۆدێرن و سەربەخۆی کوردی لە مێژوودا تۆمارکرا. هێزی سەربازی کۆماری کورد'یی مەهاباد لەو چەند هەزار هێزە کوردییەی عێراق پێك دەهات کە دوای سەرکوتکرانی راپەڕینی کوردستان'ی عێراق لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی بۆ کوردستان'ی ئێران رۆیشتبوون. مەلا مستەفای بارزانی لە کۆماری کوردی'ی مەهاباد'دا پلەی ژەنراڵی پێدرا و وەك فەرماندەی هێزە چەکدارەکان دەستنیشانکرا. پارتی دیموکراتی کوردستان'ی ئێران'یش کە لە ساڵی ١٩٤٥ دامەزرابوو، لە رووی سیاسییەوە بڕبڕەی پشتی ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیەی پێك دەهێنا. کۆماری کورد'یی مەهاباد لە سایەی یەکێتی سۆڤییەت دامەزرابوو کە دوای جەنگ هێزەکانی لە خاکی ئێران هێشتەوە. لەدوای کشانەوەی هێزەکانی یەکێتی سۆڤییەت، کۆماری ئازەربایجان رووخا کە هاوکات لەگەڵ کۆماری کورد'یی مەهاباد دامەزرابوو. ماوەیەکی کورت لەدوای رووخانی ئەو کۆمارە، لە ١٩٤٦/١٢/١٧دا کۆماری کورد'یی مەهاباد'یش کۆتاییپێهات. بەهۆی نیگەرانیی لە ئەگەری هاتنی هێزەکانی شای ئێران بۆ کوردستان و بۆ رێگرتن لە قەتڵوعام، قازی محەمەد بڕیاری تەسلیمبوونی وەرگرتبوو. لەدوای ئەوەش ژەنراڵ بارزانی و هێزەکانی بەرەو عێراق گەڕاونەتەوە. کاتێ کە نەیانتوانیوە لەوێ بمێننەوە، چوونەتە هەککاری لە تورکیا و لەوێشەوە دووبارە بۆ ئێران رۆیشتوون. لە هێڵی سنوریی ئێران و تورکیا'وە بەرەو باکوور رۆیشتوون و رووباری ئاراس'یان لە سنوری ئێران و یەکێتی سۆڤییەت تێپەڕکردووە و پەنایان بۆ خاکی یەکێتی سۆڤییەت بردووە. قازی محەمەد و هەندێك لەلایەنگرەکانیشی لە مانگی مارتی ١٩٤٧دا لە مەهاباد لە سێدارە دران. مەلا مستەفای بارزانی بەشێکی زۆری تەمەنی دوورخراوەیی خۆی لە ئوزبەکستان لە یەکێتی سۆڤییەت بردە سەر و دیار نەما.

ژیانی سیاسی جەلال تاڵەبانی'ش رێك لەم قۆناخەدا دەستپێکرد. ماوەیەکی کورت لەدوای ئەندامبوون لە پارتی دیموکراتی کوردستان'ی عێراق، سەرۆکایەتی لقی گەنجانی ئەو حزبەی گرتە دەست. دوابەدوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە کۆیە سانجاق و هەولێر، بۆ خوێندن لە کۆلێژی یاسا، خۆی لە بەغدا گرتەوە. لە ساڵی ١٩٥٥دا بەشداری لە کۆنگرەی لاوانی وارشۆ کرد کە پێگەیەکی تایبەتی لە تۆماری جوڵانەوە کۆمۆنیستییەکانی جیهاندا هەیە. لە ساڵی ١٩٥٨دا سەردانی روسیا و چین'ی کرد و لەگەڵ سەرکردەکانی چین ئاشنا بوو. ئەو کاتەی لە مۆسکۆ بوو، لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی کە یانزە

ساڵ بە دوورخراوەیی لە یەکێتی سۆڤییەت بوو دیداری کرد.

دیداری بارزانی – جەلال تاڵەبانی لە مۆسکۆ لەدوای جێهێشتنی کوردستان، یەکەم پەیوەندی بارزانی لەگەڵ جوڵانەوەی کوردی بوو. لەو کاتانەدا بارزانی لە تەمەنی ٥٥ ساڵی و تاڵەبانی‌ش لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا بوو. لەو ساڵەدا بە کودەتایەکی خوێناوی، دەسەڵاتی پادشایی لە عێراق کۆتاییپێهات. عەبدولکەریم قاسم کە دەسەڵاتی گرتبووە دەست، ڕێگەی بە بارزانی دا بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە، بەڵام مانگی هەنگوینی کورد - عەرەب لە عێراق زۆری نەخایاند و لە ساڵی ١٩٦١دا، ڕاپەڕینی چەکداریی کوردەکان بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی دەستی پێکردەوە.

لەدوای ئەوەش جەلال تاڵەبانی هاتە باکوور و لە ماوەیەکی کورتدا سەرقاڵی ڕێکخستنی هێزەکانی پێشمەرگەی کورد بوو. لە جەنگدا وەك فەرماندەیەکی ئەفسانەیی دەرکەوت. ساڵانێك دواتر لەو بەرواره، زۆرجار لەو جەنگاوەرانەی کە لە ژێر فەرمانی ئەودا جەنگابوون، ئەوەم بیست کە بەشداری کردنی تاڵەبانی لە جەنگ، لە ریزی پێشەوەی ئەو یەکانەی هێزی پێشمەرگە کە خۆی فەرماندەیی دەکردن، بووەتە هۆی ئەوەی لای هاوڕێ جەنگاوەرەکانی خۆشەویست بێت. بەڵام زیاتر لە رۆڵی سەربازیی ناوبراو، دەرکەوتنی وەك یەکەم دیپلۆماتی جوڵانەوەی کوردی، بووەتە هۆی بەرزبوونەوەی پێگەی جەلال تاڵەبانی لە جوڵانەوەی کوردی. وەك نوێنەری جوڵانەوەی کوردی، لە ساڵی ١٩٦٣دا سەردانی قاهیرە‌ی کرد و لەگەڵ جەمال عەبدولناسر سەرۆکی میسر دیداری کرد و پشتیوانی ناوابراوی وەك تاقە کەسایەتی سیاسی گرنگی دنیای عەرەب لەو قۆناخەدا، بۆ داواکانی کورد بەدەستهێنا. ئەمەش نمونەیەکی سەرنجڕاکێش بوو سەبارەت بەوەی کە هاوشێوەی لاوازییەکانی، سەرکەوتنەکانیشی بارێکی سیاسی بۆ تاڵەبانی دروستکردووە. بەرزبوونەوەی خێرای پێگەی تاڵەبانی لە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان، لەگەڵ بەدەستهێنانی سەرکەوتنی سەربازی و ئەو کاریگەری و قورساییەی کە وەك"وتەبێژی کوردەکان" لەلای جەمال عەبدولناسر بەدەستیهێنا، بوونە هۆی پەرەسەندنی خێرای ناکۆکییەکانی مەلا مستەفای بارزانی لەگەڵ تاڵەبانی کە پێشتر وتبوی وەك کوڕی خۆم خۆشم دەوێت.

لە ساڵانی ١٩٤٠ەکانەوە لە نێوان مەلا مستەفای بارزانی و ئیبراهیم ئەحمەد‌دا دو ڕێبازی جیاواز لە جوڵانەوەی کوردی‌دا خۆی دەرخستوە. مەلا مستەفای بارزانی نوێنەرایەتی پێکهاتەی نەریتخواز و پارێزگاری دەکرد و پشتیوانی کۆمەڵایەتیشی لە خێڵەکان و بەگە موڵکدارەکانی کورد بەدەست دەهێنا. ئیبراهیم ئەحمەد‌یش ڕۆشنبیرێکی گرنگ و چەپێکی شارنشین بوو. لەنێو کەسانی هاوشێوەی خۆیدا جەماوەری هەبوو کە شاریی و خوێندەوار و ئەو ڕۆشنبیرانە بوون کە بە تازەیی لە کۆمەڵگەی کوردی‌دا هەڵکەوتبوون. جەلال تاڵەبانی، هەر لەو کاتانەی کە پێی ناوەتە سیاسەتی کوردی لە ئیبراهیم ئەحمەد

نزیك بووە و ئەو نزیكبوونەش ئەوی بە زاوای ئیبراهیم ئەحمەد كردووە.

لە ماوەی ساڵانی درێژی ١٩٤٧-١٩٥٨دا كە مەلا مستەفای بارزانی لە یەكێتی سۆڤییەت ژیاوە و پەیوەندی لەگەڵ جوڵانەوەی كوردی نەماوە، سیاسییەكانی كوردەكان‌ی عێراق لەنێو پارتی دیموكراتی كوردستان و پارتی كۆمۆنیستی عێراق‌دا جێی خۆیان گرتووە. ئیبراهیم ئەحمەد سكرتێری گشتی پارتی دیموكراتی كوردستان بوو و مەلا مستەفای بە "پارێزگار، دواكەوتوو، دەرەبەگ" دەزانی. لەدوای راپەڕینی ساڵی ١٩٦١یش، سەرەڕای ئەوەی كە بارزانی ببووە سەرۆكی ئەو حزبە، درزی نێوان بارزانی - پارتی دیموكراتی كوردستان هەر گەورەتر بوو و ئەوەش مۆری خۆی لە جوڵانەوەی كوردی عێراق دا. ئەو پێكدادان و مشتومڕەی لایەن و گرووپەكان كە رەنگدانەوەی پارچەبوونی ناوخۆیی كوردەكان وەك كۆمەڵگایەكی نەتەوەیی و دابەشبونیان بەسەر چەند وڵاتێكی دیكەدا بوو، هیچ كات لەنێو پارتیدا كەم نەبوونەوە و بەردەوام بوون. لەبەر پێشكەوتنی سەرسووڕهێنەری تاڵەبانی لەنێو جوڵانەوەی كوردی و لەبەر هەبوونی باڵی ئیبراهیم ئەحمەد - جەلال تاڵەبانی لە بەڕێوەبەرایەتی پارتی دیموكراتی كوردستان، ناوی جەلال تاڵەبانی لەنێو ناواندا دیاربوو. هەرچەندە بۆ ئەوانەی لە دەرەوە سەیری راپەڕینەكەی ساڵی ١٩٦١یان لە باكووری عێراق بە سەرۆكایەتی بارزانی دەكرد، وادیار دەبوو كە یەكڕیزییەك لە ئارادایە بەڵام لە راستیدا ناكۆكییەكانی بارازانی لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد - جەلال تاڵەبانی نەسڕابوونەوە. راپەڕینی ساڵی ١٩٦١، پاش لابردنی دەسەڵاتی عەبدولكەریم قاسم بەهۆی كودەتایەكی هاوبەشی ناسری - بەعسییەكان، لە ساڵی ١٩٦٣دا راوەستا و لەوە بەدواوە ناكۆكییەكان ئاشكرا بوون.

لە سایەی راپەڕینەكەوە، مەلا مستەفای بارزانی ناوی خۆی وەك سەركردەی حاشا هەڵنەگری نەتەوەیی، لەنێو هەمو كوردانی ناوچەكەدا بڵاو كردبووەوە. ئیدی گەیشتبووە پێگەیەك كە لە ناو پێكهاتەی رێكخستنی پارتی دیموكراتی كوردستاندا بە سەرۆكایەتی ئیبراهیم ئەحمەد - جەلال تاڵەبانی جێگای نەدەبووەوە. ئەو هێزەی كە بە دەستی هێنابوو، ئازادیی جوڵە و رەفتاری لێكەوتەوە و بەوهۆیەشەوە بە بێ پرس و را بە سەرۆكایەتی پارتی، لەگەڵ بەڕێوەبردنی بەغدا رێكەوت و بەمەش پەردەكانی نێوان ئەو لەگەڵ گرووپی ئیبراهیم ئەحمەد - تاڵەبانی رووخان. بارزانی كۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموكراتی خۆی دروستكرد و شەڕی چەكداری نێوان دوو لایەنەكەی پارتی بردەوە و گرووپی ئیبراهیم ئەحمەد - جەلال تاڵەبانی پەنایان بۆ ئێران برد.

پاش ئەوەی كە ئێران لەبەر بەرژەوەندییەكانی خۆی لە دژی حكومەتی ناوەندی بەغدا خۆی لە بارزانی نزیك كردەوە، لە ساڵی ١٩٦٥دا بە رواڵەت ناكۆكییەكانی نێوان ئیبراهیم ئەحمەد - تاڵەبانی لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی چارەسەركران و بەو مەرجەی كە لە ژێر چاودێری دابن و لەو شوێنەی كە

بارزانی دەستنیشانی دەکات بهێننەوە، ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی گەڕانەوە و لە کوردستان،ی عێراق جێگیر بوون.

ساڵێك دواتر، پێکدادانەکان گەورەتر بوون و هاوسەنگییەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتی پەیوەندیی نێوان هێزە نێودەوڵەتی و ناوچەییەکان، وەك خۆی لەسەر جوڵانەوەی کوردی رەنگیان دایەوە. کاتێك شای ئێران کە لەلایەن ئەمریکا و ئیسرائیل پشتیوانی لێ دەکرا، پەیوەندی نزیکی لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی،ی "راسترەو-پارێزگار" بەرقەرارکرد،دووانەی ئیبراهیم ئەحمەد-جەلال تاڵەبانی "چەپ"یش لەگەڵ بەڕێوەبردنی بەغدا کە لەلایەن یەکێتی سۆڤییەت،ەوە پشتیوانی لێ دەکرا و خۆی بە "سۆسیالیست" دەزانی، پەیوەندییان بەرقەرار کرد. ساڵی ١٩٦٣ هاوسەنگییەکان گۆڕان. لە ساڵی ١٩٦٦دا شەڕی چەکداری لە نێوان هێزەکانی بارزانی و تاڵەبانی روویدا و تاڵەبانی کە لە رووی هێزی سەربازییەوە لە بارزانی لاوازتر بوو، شکستی خوارد و بۆ بەغدا پاشەکشەی کرد. ئەم رووداوەش کارتێکی دایە دەستی بارزانی تاوەکو تاڵەبانی بە "خاین" و "جاشی ٦٦" و بە زمانی سووکایەتی، لایەنگرەکانیشی بە "جەلالی" ناوببات.

کێشمەکێشی نێوان هێڵی بارزانی - تاران لەگەڵ تاڵەبانی - بەغدا هەتا ساڵی ١٩٧٠ درێژەی کێشا. رێکەوتنی مێژوویی نێوان بارزانی و سەدام لە ساڵی ١٩٧٠، گەڕانەوەی تاڵەبانی بۆ ناو خاکی کوردستان،ی عێراق و جوڵانەوەی کوردی بە سەرۆکایەتی بارزانی لێکەوتەوە. ئەمەش ئەو قۆناخە بوو کە من تێیدا جەلال تاڵەبانی،م ناسی. بە رواڵەت ماوەی سێ ساڵ بوو کە تاڵەبانی و بارزانی رێکەوتبوون و جەلال تاڵەبانی لە بەیروت بە رەسمی نوێنەرایەتی بارزانی دەکرد. بەڵام ساڵانێکی زۆر دواتر لە کەسانی نزیکییەوە ئەوەم زانی کە هۆکاری راستەقینەی هاتنی بۆ بەیروت، دوورکەوتنەوە بووە لە کۆنترۆڵی مەلا مستەفای بارزانی و جگە لەوەش بەوجۆرە ویستویەتی لە ئەگەری هەوڵێکی کوشتن لەلایەن بارزانی،یەوە رزگاری ببێت.

سەرنەگرتنی رێکەوتننامەی ساڵی١٩٧٠ی نێوان بارزانی و سەدام بە تایبەتی لەبەر پرسی کەرکوك، بووە هۆی ئەوەی کە جارێکی دیکە لە ساڵی ١٩٧٤دا کوردەکان بە سەرۆکایەتی بارزانی راپەڕینی چەکداری بکەن. هێڵی ئەمریکا – ئێران – بارزانی جارێکی دیکە بە توندی دروستکرایەوە. لە روانگەیەکەوە راپەڕینی کوردەکان، وەکو جەنگی نێوان ئێران و عێراق وەك دوو ناوەندی هێزی کەنداو و دوو ئەندامی گرنگی رێکخراوی ئۆپێك سەیر دەکرا کە بەهۆی جەنگی ١٩٧٣ی عەرەب - ئیسرائیل لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا گرنگی زۆری پەیدا کردبوو. رێك لەم خاڵەشدا جەزائیر وەك ئەندامێکی دیکەی رێکخراوی ئۆپێك و سەرۆکی بزووتنەوەی وڵاتانی جیهانی سێیەم و بێلایەن بۆ ناوبژیوانی

لە مەیدانەکەدا دەرکەوت و لە رێگەی رێکەوتننامەیەکەوە کە هێنری کسینجەر مامۆستای سیاسەتی دەرەوە پەسندی کردبوو، کێشەی شەتولعەرەب لە نێوان ئێران و عێراق لە جەزائیر چارەسەرکرا. عێراق لە بەرامبەر پێدانی ئیمتیاز بە ئێران لەبارەی شەتولعەرەب، تەنها یەك شتی لە ئێران دەویست: ئێران واز لە پشتیوانی کردنی راپەڕینی کورد لە باکووری عێراق بهێنێت.

ئەو پشتیوانییە راگیرا و کاتێك کە ئێران سنورەکانی خۆی لەگەڵ کوردستان‌ی عێراق داخست، رێگا بۆ یەکێك لە خەمناکترین کارەساتەکانی مێژووی کورد کرایەوە و راپەڕینی کورد‌ی شکستی هێنا و جوڵانەوەی سیاسی کورد سەرکوتکرا. بەوجۆرەش ژیانی سیاسی مەلا مستەفای بارزانی کە نزیکەی نیو سەدە تاقە سەرکردەی حاشاهەڵنەگری جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد بوو، بەشێوەیەکی کارەساتبار کۆتاییپێهات.

جوڵانەوەی سیاسی سەرکوتکراوی کورد کە پارچە پارچە ببوو، دوو رێکخراوی جیاوازی لێکەوتەوە. جەلال تاڵەبانی سەرۆکایەتی یەکێکیانی کرد کە ئیدی پێیوابوو ناکرێ تاوانەکانی مەلا مستەفای بارزانی بە کۆڵ بکێشن و لە شکستەکەی شۆڕش رەواییان بۆ خۆیان پەیدا کرد. ئەو دیکەشیان بە سەرۆکایەتی دوو کوڕی مەلا مستەفا بە ناوەکانی ئیدریس و مەسعود، دوای ساڵانێکی زۆری پڕ لە هەڵبەز و دابەز دووبارە بە ناوی پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزرا. دوای مەرگی لە ناکاوی ئیدریس بارزانی برای باوکیی مەسعود بارزانی کە سێ ساڵ لەو گەورەتر بوو، مەسعود بارزانی بوو بە تاقە سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان.

ماوەیەکی زۆر کورت لەدوای نسکۆی شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٥، جەلال تاڵەبانی لە شام یەکێتی نیشتمانی کوردستان‌ی دامەزراند. تاڵەبانی لە نیوەکانی ١٩٧٠کانەوە لە بەیروت چووبووە شام و لەوێ دەژیا. لەو رۆژەشەوە تا ئێستا لەگەڵ دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، لە دنیا کەس نەماوە کە ناوی جەلال تاڵەبانی نەبیستبێت.

تا هەژدە ساڵ دوای ئەو دیدارەی لە بەیروت کردمان، هیچ کات جەلال تاڵەبانی‌م نەبینییەوە. لەو هەژدە ساڵەشدا بە هیچ شێوەیەك پەیوەندیمان نەبوو. بەڵام ئەو دیدارەمان لە بەیروت، هەژدە ساڵ دواتر بووە هۆی شکاندنی گەورەترین تابۆکان لە وڵاتی تورکیا کە تێیدا زیاتر لەهەر شوێنێکی دیکە مافی کوردەکان پێشێل دەکرا.

لە ساڵی ١٩٩١دا من پەیوەندی نێوان جەلال تاڵەبانی و تورگوت ئۆزال سەرکۆماری تورکیا‌م دروستکرد. ئەو پەیوەندییەش بەستەڵەکێکی حەفتا و هەشت ساڵەی مێژووی کۆماری تورکیا‌ی شکاند...

**ناتوانین بەو شێوازی بیرکردنەوەیەی کە لە کاتی دروستبوونی کێشەکاندا هەمانبووە، کێشەکان چارەسەر بکەین.**

**ئەلبێرت ئەنیشتاین**

لە ژیانمدا هیچ نەچووبوومە ژووری سەرکۆماری تورکیا لە کۆشکی چانقایا. ئەو رۆژە یەکەم جارم بوو. لە ١٩٩١/٢/٦دا کاتژمێر ١٢:٠٠ تورگوت ئۆزال چاوەڕوانی منی دەکرد.

دوو رۆژ بەر لەوە لە نیوەشەودا تەلەفۆنم بۆ کردبوو و پێم گوتبو کە بە نیازم سەردانی سەرکردەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بکەم و لەبەر ئەوەش پێویستم بەوەیە دیداری لەگەڵ بکەم. بە وردی گوێی لێم گرتبوو و پێی گوتبووم کە لە ماوەیەکی نزیکدا بەرواری دیدارەکە دەستنیشان دەکات و ئاگادارم دەکاتەوە. لە راستیشدا تەنها نیوکاتژمێر دوای قسەکانم لەگەڵ سەرکۆمار، لە کۆشکەوە تەلەفۆنێکم بۆ هات و پێیانگوتم دوو رۆژ دواتر لە کۆشکی چانقایا لە ئەنقەرە، کاتژمێر ١٢:٠٠ سەرکۆمار چاوەڕوانی تۆ دەکات.

کاتی گەیشتمە ئەوێ بێخەبەر بووم لەوەی کە گەیشتوومەتە یەکێك لە گرنگترین وێستگەکانی چارەنووسم. نەك تەنها ئەوە، بەڵکو کەمتەرخەمیش بووم. رێك سەعات ١٢:٠٠ لە دەروازەی کۆشك چوومە ژوورەوە.

هیچ کات ئەوەم بە مێشکدا نەهاتبوو کە ئەو دیدارەم لە کۆشکی چانقایا، رێگای بوونم بە راوێژکاری تایبەتی تورگوت ئۆزال سەرکۆماری تورکیا خۆش دەکات. بۆ ئۆزال'ی سەرکۆماری تورکیا، ئەو پۆستە بۆ کەسێك کە پاشخانێکی سیاسی وەك منی هەبوو، شتێك نەبوو کە بیریشی لێبکاتەوە.

من و لاوانی مارکسی وەك من لە نیوەی دووەمی ١٩٦٠کان و سەرەتاکانی ١٩٧٠کاندا، لە نێوان ساڵانی ١٩٦٧-١٩٧١دا، ناوی تورگوت ئۆزال'مان وەك بیرۆکراتێك بیستبوو کە پۆستی راوێژکاری دەزگای پلاندانانی دەوڵەتی هەبوو. وەك چۆن میدیای نارازی لە حکومەتی پارتی عەدالەت بە سەرۆکایەتی سولەیمان دەمیرەل، تورگوت و کورکوت ئۆزال'مان بە "برا نەعل لە پێ"کان (تاقونیالی کارداشلەر) ناودەبرد، لای ئێمەش تورگوت ئۆزال یەکێك لە "برا نەعل لە پێ"کان بوو[٣]. دەستەواژەی "تاقونیالی کارداشلەر" بۆ ئەوە بەکاردەهات کە بە زمانی سووکایەتی و گاڵتەپێکردن، ئاماژە بە ئیسلامی بوونی تورگوت ئۆزال و کورکوت ئۆزال'ی برای بکرێت. چەپەکانی تورکیا لە ساڵانی ١٩٧٠کاندا، خۆیان لە ئیسلامییەکان دوور دەخستەوە و تەنانەت دژایەتیشیان دەکردن.

دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٧١ لە بانکی جیهانی گەڕایەوە، تورگوت ئۆزال لە رێی کارەکانی لەگەڵ دوو بنەماڵەی بە ناوبانگ و کاپیتالیستی گەورەی وڵات ناوبانگی دەرکردەوە. سەرەتا وەك رێکخەری گشتی

٣ - وەرگێڕ: تاقونیا لە زمانی تورکیدا بە جۆرە نەعلێکی دارین دەگوترێت کە جاران خەڵکی لە مزگەوت بۆ دەستنوێژ گرتن لە پێیان دەکرد.

حزڵدینگی سابانجی و دواتریش لە نیوەی ١٩٧٠کاندا وەك سەرۆکی MESS (و: سەندیکای پیشەسازانی کەلوپەلی مەدەنی) کاری کرد.

جگە لە شوناسە ئیسلامییەکەی، شوناسی بەرچاوترین نوێنەری کاپیتالیستەکانیشی بۆ زیاد کرابوو. دوای ئەوەش لە حکومەتێکی سولەیمان دەمیرەل‌دا وەك راوێژکاریDPT (و:رێکخراوی پلاندانی دەوڵەت) و راوێژکاری سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران، لە بەرزترین شوێنی بیرۆکراسیی حکومەتدا جێی گرت. لە ساڵی ١٩٧٧یشدا لە ئیزمیر وەك نوێنەری حزبەکەی نەجمەدین ئەربەکان (پارتی سەلامەتیی میللیی) خۆی بۆ ئەندامێتی پەرلەمان کاندید کرد. لەبەر ئەوەش لەدوای کودەتاکەی ساڵی ١٩٨٠، پێگەی خۆی لەنێو حکومەت لە دەست نەدا و جگە لەوەش بوو بە جێگری سەرۆك وەزیر بۆ کاروباری ئابوری. هەموو ئەمانەش وایانکرد کە هیچ هۆیەك نەبێت تا هەست بە نزیکی خۆم لە تورگوت ئۆزال بکەم.

یەکەم جار لە ساڵی ١٩٨٣دا، کاتێ کە مۆڵەتی دامەزراندنی پارتی دایکی نیشتمان درا بە تورگوت ئۆزال و ئەویش وەك سیاسەتمەدارێکی تازە بۆ پەیداکردنی پشتگیری، رۆژنامە بە رۆژنامە دەگەڕا، لەگەڵی ئاشنا بووم. دەزانم لەبەر ئەوەی دەرگای زەینم بە رووی ئۆزال داخستبوو، هیچ کاریگەرییەکی لەسەرم دانەنابوو. دووەم جار لە بەربانگێکدا کە حزبەکەی رێکیخستبوو، بینیم. هات و لەسەر مێزەکەی ئێمە دانیشت بەڵام دواتر زیاتر لەو، ئەوەم بیر دەهاتەوە کە لەوێ چاوم بە مەسعود یڵماز کەوتووە. لە زانکۆ، مەسعود یڵماز پۆلێك لەدوای منەوە بوو. دواتریش هاوڕێی کاتی سەربازیم بوو. کاتێ ئەوم لەوێ بینی، زۆر سەرم سووڕما. بە بیرم دێت کاتێ لێم پرسی "لێرە چی دەکەی؟" و ئەویش لە وەڵامدا وتی "من یەکێك لە دامەزرێنەرانی ئەم حزبەم"، زۆرتر سەرم سووڕما. لەو شەوەدا، بە بۆچوونی خۆم هیچ هۆیەك نەمابوو، تا حزبەکەی ئۆزال (پارتی دایکی نیشتمان) بە جیدی وەربگرم. تەنانەت ئەو کاتەش کە لە ساڵی ١٩٨٣دا پارتی دایکی نیشتمان سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەستهێنا و هەڵبژاردنی بردەوە و لەدوای ئەوەش کە تورگوت ئۆزال یەك لەدوای یەك چەندین ریفۆرمی بنچینەیی دەکرد کە سیمای تورکیا‌یان دەگۆڕی، دیسان هەر سەرنجی رانەکێشام.

بەشێکی گرنگی تەمەنم، لە ئێران تێپەڕ دەکرد کە لە ساڵی ١٩٧٩دا شۆڕشی ئیسلامی تێدا کرابوو و دوای ئەوەش سەرقاڵی جەنگ بوو لەگەڵ عێراق. هەروەها لەبەر ئەوەی کە ناوەندی جوڵانەوەی رزگاریخوازی فەلەستین بوو، بەشێکی تەمەنیشم لە لوبنان و جوغرافیای خۆرهەڵاتی ناوەڕاست گوزەراند. ئێران - عێراق لەلایەك و پێکدادانی فەلەستین - ئیسرائیل و شەڕی ناوخۆیی لوبنان لەلایەکی دیکەوە، هەموو وەزی زەینی و کاتی منیان گرتبوو. تورگوت ئۆزال‌م وەك درێژکراوەی هێڵی عەرەبستانی سعودی لە تورکیا دەبینی و کاتم نەبوو تا بە ئۆزال‌ەوە بە کوشتی بدەم.

سەرەڕای هەموو ئەو پێشداوەرییانە، ئۆزال وردە وردە ئەو روخسارەی دەسڕییەوە کە لە مێشکی مندا

سەبارەت بەو وێنا کرابوو. دەوڵەمەدارێکی دیکە نەبوو کە بتوانێ لە جەنگی ئێران - عێراق'دا، لە یەك ئاستدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەر دوولا بپارێزێ. جگە لەوە هەوڵی گەشە پێدانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێران دەدا کە لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا وەك وڵاتێکی دەخەزار و نەخۆش سەیر دەکرا کە پێویستبوو دوورە پەرێزی لێبکرێت. ئەو، شێوازی سەفەرکردنی لەگەڵ دەیان کەسی سەرمایەدار و خاوەنکار بە ئایرباسی گەورە داهێنا و سیاسەتی بە ئابوری بەستەوە و زوو زوو سەردانی دەرەوەی دەکرد. ئێران'یش یەکێك بوو لەو وڵاتانانەی کە زۆرجار سەردانی دەکرد. ئەو شتانەی کە ئەو دەیکردن، لەگەڵ ئەو روخسارەدا نەدەگونجان کە من وەك "درێژکراوەی هێڵی ئەمریکا - عەرەبستانی سعودی" لە مێشکی خۆمدا وێنام کردبوو.

بە تەواوی وەڵامی ئەوەم دەست نەدەکەوت کە تورگوت ئۆزال چییە. لە گەشتێکدا بۆ سێیەم جار ئۆزال'م بینی و ماوەی یەك سەعات بە یەکەوە قسەمان کرد. تەکانێکی گەورە لە مێشکمدا سەبارەت بەو دروستبوو. ئەوەش لە گەشتێکدا بوو کە لە بەرواری ١٩٨٧/٧/١٥دا بۆ یەکەمجار لەگەڵ سەرۆك وەزیرێکی کۆماری تورکیا سەردانی سوریا'م دەکرد. لە سەردانەکەی ئۆزال بۆ سوریا، منیش وەك نوێنەری رۆژنامەی جمهوریيەت کە زیاتر لە هەمووان دژایەتی ئۆزال'مان دەکرد بەشداریم کردبوو. بە گشتی یان حەسەن جەمال سەرنوسەری رۆژنامەی جمهوریيەت یان یاڵچین دۆغان نوێنەری رۆژنامەکە لە ئەنقەرە بەشداری سەردانەکانی ئۆزال'یان بۆ دەرەوەی وڵات دەکرد. بەڵام بەو پێیەی کە شوێنی سەردانەکەی ئەمجارە سوریا و بابەتەکەیشی پ.ك.ك و عەبدوڵا ئۆجالان بوو، وایان بە باش زانیبوو کە من بەشداری بکەم. لەبەر کاری رۆژنامەوانی، بە جەم دوونا دیپلۆمات و راوێژکاری سیاسەتی دەرەوەی تورگوت ئۆزال'م گوت کە دەمەوێ بەر لە سەردانەکەی بۆ سوریا چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ سەرۆك وەزیردا بکەم تا لە رۆژنامە بڵاوی بکەمەوە. جەم دوونا هاوڕێی کاتی قوتابخانەم بوو. تورگوت ئۆزال لە وەڵامدا وتبوی دەتوانێ لەگەڵ گوینەش تانەر'ی راوێژکاری کە سەر بە پارتی دایکی نیشتمان بوو بە دڵی خۆم چاوپێکەوتن بکەم. منیش وتبووم" گوینەش تانەر سەرۆك وەزیر نییە." و رەتم کردبووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا جەم هەر لە هەوڵدا بوو بۆ ئەوەی بتوانێ دیدارێکم بۆ رێکبخات. شەوێك بەر لە سەردانەکە لەگەڵ جەم دوونا و گوینەش تانەر و گوینەری جڤائوغلو لە ئێوارە خوانێکدا بە یەك گەیشتین. گوینەری جڤائوغلو زوو هەستا. هەتا نیوەشەویش هێشتا دەرفەتی ئەوە مابوو کە چاوپێکەوتنی تایبەت لەگەڵ ئۆزال بکەم. چاوەڕوانی کۆتاییهاتنی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران بووین. بۆ رێگرتن لە چالاکییەکانی پ.ك.ك کە روویان لە زیادی کردبوو، بۆ یەکەمجار"پارێزگاری باری نائاسایی" بە مەرکەزییەتی دیاربەکر دادەنرا و ئەو پۆستە بە خەیری کۆزاکچی ئۆغلو دەسپێردرا. قەناعەتی باو وابوو کە چالاکییەکانی پ.ك.ك گەیشتوونەتە ئاستێك کە

تەحەمول ناکرێن. سەردانەکەی تورگوت ئۆزال'یش بۆ شام لەسەر پرسی پ.ك.ك بوو. کادیرەکانی پ.ك.ك بە چاودێری سوریا لە دۆڵی بیقاعی لوبنان مەشقیان دەکرد کە لە ژێر دەسەڵاتی سوریا بوو. هەروەها عەبدوڵا ئۆجالان سەرۆکی پ.ك.ك لە شام دەمایەوە.

بەرەو نیوە شەو هەواڵم بۆ هات کە ئۆزال وتوویەتی "تازە درەنگە، پێویستە خۆمان بۆ سبەینێ حازر بکەین. دەکرێ لە کاتێکی دیکەدا ئەو چاوپێکەوتنە بکرێت" و لەبەر ئەوەش داوای لێبووردنی لە من کردبوو. هەتا هاتنی هەواڵەکە، من دەمم کردبووەوە و لەسەر سوریا و پێکهاتەی رژێمەکەی و شێوازی سیاسەتی ئەو وڵاتە قسەم کردبوو. جەم دوونا پێی گوتبووم "ئەمانە بۆ سەرۆك وەزیر باس بکە"، بەڵام قەد پرسیاری ئەوەشم نەکرد کە چۆن و لە کوێ بۆی باس بکەم.

رۆژی دواتر، یانی لە ١٩٨٧/٧/١٥دا کاتێ فڕۆکەکەی تورگوت ئۆزال و وەفدی یاوەری فڕی، هەیەجان و جۆش و خرۆش رۆژنامەنوسانی ناو فڕۆکەکەی داگرت. هیرام عەباس جێگری راوێژکاری میت کە تا ئەو کاتە وەك دەزگایەکی پڕنهێنی و تۆقێنەر لە سیاسەتی ناوخۆی تورکیا ناوبانگی هەبوو، لەگەڵ ئێمەدا وەك ئەندامێکی رەسمی وەفدەکە لەنێو فڕۆکەکەدا بوو. ناوەکەیشی لە نامیلکەیەکی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیراندا نوسرابوو کە ناوی هەموو ئەندامانی وەفدەکە و هۆتێل و تەنانەت ژمارەی ژووری مانەوەیشیان لە شام تێدا نوسرابوو. تورگوت ئۆزال شتێکی ناباوی لە سیاسەتی تورکی'دا کرد و لە جیاتی ژەنراڵ نەجدەد ئویزوتۆروون کە هەرکەس چاوەڕوان بوو ببێتە فەرماندەی گشتی سوپا، بە پاساوی"ویستی دەسەڵاتی مەدەنی" ژەنراڵێکی دیکەی بە ناوی نەجیب تۆروومتای کردە فەرماندەی گشتی سوپا کە پلەکەی کەمتر بوو. هەروەها دەنگۆی ئەوەش هەبوو کە هیرام عەباس بە نیازە دەزگای میت کە تا ئەو کاتە لە کۆنترۆڵی سوپادا بوو، مەدەنی بکاتەوە لە ژێر دەستی سەربازەکان دەری بهێنێ. لەبەر ئەوەش دەرکەوتنی هیرام عەباس لە پێش چاوی هەمووان و بەشداری کردنی لەو سەردانەدا بەشێوەیەکی رەسمی، وەك سووربوونی ئۆزال لەسەر سیاسەتی مەدەنی کردنی تورکیا لێك درایەوە. هەموو رۆژنامەنوسەکان دەیانویست بزانین کە لەنێو ئەوانەی لە پێشەوە دانیشتوون کامیان هیرام عەباس'ە و چپەچپیان دەکرد.

لەو کاتانەدا جەم دوونا هەستا و بە دەست ئاماژەی بۆ کردم کە بچمە پێشەوە. هێشتا گڵۆپی ئاگادارکردنەوەی بەستنی قایش نەکوژابووە و فڕۆکەکە تازە هەستابوو. بڕوام نەکرد، بەڵام دیسان ریکۆردەرەکەم هەڵگرت و لە بەینی رۆژنامەنوسەکانەوە چوومە پێشەوە. سەرۆك وەزیر لەلای چەپی بەشی پێشەوەی فڕۆکەکەدا لە شوێنێکی دوو نەفەریدا دانیشتبوو. میزێکیش لە بەردەمیدا دانرا بوو. تەنیشت سەرۆك وەزیر چۆڵ بوو. ئاماژەی بۆ کردم تا لەلای دانیشم. هەر کە دانیشتم، یەکسەر وتم:"بەڕێز سەرۆك وەزیر! مادام بڵاوی دەکەمەوە، خۆ کێشە نیە ریکۆردەرەکەم بەکار بهێنم؟" تورگوت ئۆزال وتی:"من

دەپرسم ئێوە قسە دەکەن. دەمەوێ پرسیاری سوریا'تان لێ بکەم." سەرم سووڕما. دواتر تێگەیشتم کە لەوانەیە جەم دوونا قسەکانی دوێنێ شەوی منی لەبارەی سوریا بۆ سەرۆك وەزیر گێڕابێتەوە و تورگوت ئۆزال'یش ئەوانەی بەلاوە سەرنجڕاکێش بووبێت.

وەحید خەلەف ئوغلو وەزیری دەرەوە لە دەستە راستی بەرامبەر من دانیشتبوو. هیرام عەباس جێگری راوێژکاری میت'یش لە دوو ریزی دواوە دانیشتبوو. بە دەست ئاماژەم بەوان کرد و وتم:"ئێوە سەرۆك وەزیرن. لە وەزارەتی دەرەوە وە بگرە تا میت، بەرپرسانی دامودەزگا گرنگەکانی دەوڵەت لێرەن. بۆچوونە سادە و خاکییەکانی رۆژنامەنوسێکی وەك من دەتوانێ چ گرنگییەکی بۆ ئێوە هەبێت؟" و بەوجۆرەش ویستم سەرسووڕمانەکەم بکەمە نارەزایی، بەڵام تورگوت ئۆزال کاردانەوەیەکی پیشاندا کە من چاوەڕوانیم نەدەکرد:" شارەزایی شارەزاییە. ئێوە باش ئاگاداری ئەو ناوچەیەن. جگە لەوە، تۆ لە کوێوە دەزانی کە دامودەزگاکانی دەوڵەت زانیاری دروست بە من دەدەن؟"

ئەگەر من وەك نوێنەری رۆژنامەیەك کە دژایەتییەکی بێ ئامانی تورگوت ئۆزال'ی دەکرد ئەو قسانەم بڵاو بکردایەتەوە، چەندین هەفتە سەرۆك وەزیر تووشی بەڵایەکی گەورە دەبوو. منی نەدەناسی، کەوابوو بۆچی دەیتوانی وەها قسە بکات؟

ساڵانێکی دواتر کە لە نزیکەوە تورگوت ئۆزال'م ناسی توانیم وەڵامی ئەو پرسیارە بدۆزمەوە. ئەو کەسێك بوو کە چی بە مێشکدا دەهات یەکسەر دەیهێنایە سەرزمان و لەبەر ئەوەش هەندێك جار دەبووە هۆی ئەوەی وەك کەسێك کە نابەجێ قسە دەکات سەیر بکرێت. بەڵام لەوانەیە هەر ئەو تایبەتمەندییەش بووبێت کە سیفەتی رەوای "تابۆ شکێن"ی بۆ ئۆزال دروست کردبێت. شتێکی دەگوت کە کەس چاوەڕوانی نەدەکرد و ئەوەی لە مێشکیدا بوو یەکسەر دەیهێنایە سەرزمان.

لە ساڵانی دواتردا کە زیاتر ناسیم، زانیم گرنگترین تایبەتمەندی تورگوت ئۆزال ئەوەیە کە متمانەیەکی زۆری بە خۆی هەیە.

لەدوای کاردانەوە سەیرەکەی چووە سەر پرسیاری یەکەم و وتی:"پیاوی دووەمی سوریا کێیە؟ عەبدولحەلیم خەدام؟ خەدام سوننە نیە؟"

جارێکی دیکە سەرم سووڕما. یەکەم جار بوو رووبەڕووی دەوڵەتمەدار و سیاسەتمەدارێکی تورك ببمەوە کە بە "کۆد"ەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست قسە بکات و درك بەو"کۆد"انە بکات. یەکسەر وەڵامم دایەوە:

"لە سوریا پیاوی دووەم نیە. تەنانەت پیاوی سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەمیش نیە. دەکرێت لە ریزی حەوتەمدا باسی چەند کەسێك بکرێت. بەڵی، عەبدولحەلیم خەدام جێگری سەرکۆمار سوننەیە بەڵام ئەمە ئەوەندە گرنگ نیە. لەنێو رژێمدا کێشەی نەبوونی سوننەی پلەدار نیە. مستەفا تەلاس وەزیری

بەرگری و حیکمەت شەهابی فەرماندەی گشتی سوپاش سوننەن. بەڵام هەموو ئەمانە کاراکتێری عەلەوی - نەسیری ڕژێم ناگۆڕن. لە سوریا دامودەزگا هەواڵگرییەکان گرنگن و نەسیرییەکان ئەوانە بە ڕێوە دەبەن. جگە لەوە خەدام خەڵکی بانیاس'ە. لە سوننەکانی کەنارە. دەستە بژێری ڕژێم خەڵکی لازقیە'یە. تیۆری دەمارگیری (عەسەبیەت)ی ئیبنی خەلدوون دەزانن. مرۆڤ بە چەمکەکانی زانستی سیاسەتی خۆرئاوا'وە لە وڵاتێکی وەك سوریا تێناگات. ئیبنی خەلدوون میتۆدێکی باشترمان پێشکەش دەکات. بە ڕێوەبەرانی وڵات لە عەسەبییەتی کەرتی کەنارین. ئەمەش لە کاتێکدایە کە شام و حەلەب ناوەندە گرنگەکانی سیاسەت و کەلتوور و بازرگانی ئەو وڵاتەن. عەسەبیەتی سوننەی شام و حەلەب یان بە واتایەکی دیکە بورژوازی بازرگانی، لە میکانیزمەکانی بڕیاردانی ئەو وڵاتەدا بەشدار نیە و کێشەکە لەمە دایە..."

وەك ناوی خۆی دڵنیا بووم لەوەی کە تورگوت ئۆزال ئاگای لە ئیبنی خەلدوون نیە. بۆ کاریگەری دانان لەسەر ئەو باسی ئیبنی خەلدوون و تیۆری عەسەبیەتم کردبوو. کەوتە ژێر کاریگەری قسەکانم و بە تایبەتی سەرنجی چووە سەر ئەوەی کە" بورژوازی بازرگانی سوریا" خەڵکی شام و حەلەب'ن و یەکێك لە ئەندامانی وەفدەکەی یاوەری بانگ کرد و وتی:"پەیامێك بۆ بازرگانە سوننەکانی شام و حەلەب بخەنە نێو دەقی ئەو قسانەی کە لە شام دەیکەم." قسەکانمان هەر لە سەرەتاوە ڕوویەکی کردەیی بە خۆوە گرت و چوارچێوەی چاوپێکەوتنی سەرۆك وەزیر-ڕۆژنامەنوسێکی تێپەڕ کرد. ئەوەندە ئاسوودە ببووم کە ڕێگەم بە خۆم دا تا قسەیەکی ڕوودارانە بکەم و بڵێم:"لەکاتی دیدار لەگەڵ حافز ئەسەد قەد باسی ئەوە مەکەن کە ئاپۆ تەسلیم بکاتەوە!" لە پشت چاویلکە زلەکەیەوە دیاربوو کە لەبەر ئەو قسەیەی من چاوەکانی دەرپەڕیون وتی:" بۆچی؟"

- چونکە ئێوە سەرۆك وەزیری کۆماری تورکیا'ن. ئەمەش لەلای سوریا هاوشانی پێگەی پادشا یان وەزیری ئەعزەمی عوسمانلی'یەکانە. بە بەراورد لەگەڵ ئێوە، سەرۆکی سوریا وەك بەگی بەگان یان والی شام وایە. فەرمانڕەوایەکی عوسمانی هەرگیز داوایەك لە والی یان بەگێکی بەگان ناکات کە جێبەجێ نەکرێت. حافز ئەسەد ئاپۆ تەسلیم ناکاتەوە. چونکە ئەو ڕژێمە ڕژێمی کەمینەیەکە. بەرقەرار کردنی پەیوەندی لەگەڵ کەمینەکانی دیکە و بەکارهێنانیان وەك کارتێك، بە مەرجی سەرەکی بەردەوام بوون و مانەوەی خۆی دەزانێت. تەسلیم کردنی "کارتی ئاپۆ" بە ئێوە پێچەوانەی لۆژیکی هەبوون و سیاسەتەکانیەتی. ئەگەر ئێوە بتوانن کارێك بکەن کە کارتی ئاپۆ یان پ.ك.ك لەسەر مێز لابات و بیخاتە گیرفانی، ئەوا سەرکەوتنێکی گەورەی دیپلۆماتی بە دەست دەهێنن. بەڵام داوای ڕادەستکردنەوەی مەکەن، چونکە ئەوە ناکات. وەك سەرۆك وەزیرێکی تورکیا'ش نابێ داوای شتێك بکەن کە ناتاندەنێ."

تورگوت ئۆزال وەڵامی ئەم قسانەی منی نەدایەوە. بەڵام دوای ماوەیەك لە گەشتێکی دەرەوەدا تورگوت

ئۆزال بە هاوڕێیەکمی وتبوو" قسەکانی ئەو کوڕە لە ڕێگا، لە شام ڕاست دەرچوون."

حافز ئەسەد لە پاییزی ١٩٩٨دا لەبەر گوشاری سیاسی - سەربازی تورکیا وازی لە کارتی پ.ك.ك هێنا و عەبدوڵا ئۆجالان'ی لە سوریا دەرکرد. هەندێك کەس بە لەبەر چاوگرتنی ئەنجامەکان دەیانگوت پێویستە زووتر ئەمەمان بکردایە، بەڵام ئەمە مومکین نەبوو.

ساڵی ١٩٩٩ نزیکەی دە ساڵ بەسەر کۆتاییهاتنی جەنگی سارد تێپەڕ ببوو، کاریگەرییەکانی ئەوەش بەرچاو دەکەوتن. حافز ئەسەد چەتری یەکێتی سۆڤییەتی لە کیس چوو بوو، هەروەها لە دنیای تاك جەمسەریدا کە تێیدا ئەمریکا لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا وەك هێزی سوپەر دەرکەوتبوو، لە بەرامبەر ئیسرائیل'دا هەستی بە لاوازی دەکرد. جگە لەوە لە جەنگی کەنداودا لە ساڵی ١٩٩١، بەشداری لە هاوپەیمانی نێودەوڵەتی بە پێشەنگایەتی ئەمریکا کرد کە لە دژی داگیرکردنی کوەیت لەلایەن سەدام پێك هێنرابوو. هەلومەرجەکان بەشێوەی بنەڕەتی گۆڕابوون و "کارتی پ.ك.ك" گرنگییەکەی جارانی بۆ حافز ئەسەد نەمابوو. ئیدی لەوە دەرچوو بوو کە پشکێکی بەسوود بێت و تەنانەت دەکرێ بگوترێ کە وەك بارێکی قورسیشی لێهاتبوو. وازهێنانی حافز ئەسەد لە عەبدوڵا ئۆجالان لە ساڵی ١٩٩٨دا، ئەنجامی خوێندنەوەیەکی دروستی دنیای دوای جەنگی سارد بوو. سەدام حسێن ئەمەی نەخوێندەوە و بەڵایەکی بەسەر خۆی و عێراق'دا هێنا، بەڵام حافز ئەسەد ئەو کارەی کرد و بەوەش خۆی و سوریای پاراست.

حافز ئەسەد لە ساڵی ١٩٨٧دا نەیدەتوانی واز لە ئۆجالان و پ.ك.ك بهێنێت. هەرواش بوو، وازی لێ نەهێنان... و تەنانەت لە یەکەم سەردانی تورگوت ئۆزال بۆ سوریا، ڕەتیکردبووەوە کە عەبدوڵا ئۆجالان لە سوریا بێت و وەك ئەوەی یەکەمجار بێت کە ناوی ئۆجالان بیستبێت ڕەفتاری کردبوو.

کاتی نانی نیوەڕۆ لە شوێنی نانخواردنی هۆتێلی مەریدیەن کە دواتر ناوەکەی گۆڕا بۆ دەدەمان، چاومان بە یڵدرم ئاکبولوت وەزیری دەرەوە، سەفەت ئاریکان بەدیوك بە ڕێوەبەری گشتی ئاسایش، هیرام عەباس جێگری راوێژکاری میت و سولماز ئوینایدن لە وەزارەتی دەرەوە کەوت. سەرمان سووڕما. باشە پێویست نەبوو ئەوان لەو کاتەدا لەگەڵ هاوتا سوری'یەکانیان لە کۆبوونەوەدا بن؟ تومەزە کۆبوونەوەکە زۆر زوو تەواو بووە.

چوومە لای یڵدرم ئاکبولوت وەزیری دەرەوە و دانیشتم. ئەویش بە دەست ئاماژەی بۆ هیرام عەباس جێگری راوێژکاری میت کرد و وتی:"با ئەو بۆتان بگێڕێتەوە." لەبارەی یەکێك لە پڕنهێنیترین بابەتەکانی سەردانەکە کە بواری ئەمنی بوو، هیچ قسە نەکرابوو. بە وتەی هیرام عەباس کاتێ ناوی عەبدوڵا ئۆجالان براوە، سوری'یەکان بە پاساوی ئەوەیکە باس کردن لەو بابەتە واتای پشتڕاست کردنی مانەوەی ئۆجالان لە سوریا بە ڕەزامەندی حکومەتی دیمەشق دەدات، قسەیان لەسەر بابەتەکە ڕەتکردبووەوە و بگرە کەوتبوونە

هێرشی بەرامبەر و گلەییان لە چالاکییەکانی براموسڵمانەکان (اخوان المسلمين) لە سنورەکانی تورکیا کردبوو.

هیرام عەباس وتی:"لەدوای ئەوە، دۆسییەیەکمان دەرهێنا کە ئەدرێسی شوێنەکانی مانەوەی ئۆجالان'ی تێدا بوو. وتمان دوایی سەیری بکەن. بەڵام تەنانەت دەستیشیان پێوە نەدا." بەوجۆرەش باسی ئەو گرێکوێرەیەی بۆ کردین کە ئەو رۆژە بەو هۆیەوە لە شام دروست ببوو.

لەکاتی نانخواردنی نیوەڕۆدا، هیرام عەباس پێی وتم ژەنراڵ غازی کەنعان[4] فەرماندەی هێزەکانی سوریا لە لوبنان دۆستی ئەوە و باسی ئەوەشی کرد کە لە ماوەی رابردوودا لە تورکیا پێکەوە بوون. من نەمدەزانی کە یەکە ئەمنییەکانی تورکیا - سوریا بەو ئەندازەیە لە یەك نزیکن. هیرام عەباس'یش سەیری سووڕمابوو لەوەی کە من بە شەخسی ژەنراڵ کەنعان'م نەدەناسی. هەڵبەت من لە دووره زۆر بە بە باشی غازی کەنعان'م دەناسی. "چۆن دەبێ وەك پسپۆڕێکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست چاوم بە غازی کەنعان نەکەوتبێ؟" جگە لە پەیوەندییە نزیکەکانی تورکیا لەگەڵ یەکە ئەمنییەکانی سوریا، پەیوەندییەکانی تورکیا'م لەگەڵ دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل (مۆساد) بە بیر هیرام عەباس هێنایەوە و وتم تورکیا لەم ناوچەیەدا پێگەیەکی سەیری هەیە. بەڵام هیرام عەباس جارێکی دیکە منی تووشی سەرسووڕمان کرد و وتی:" ئیسرائیلییەکان لە بواری هەواڵگریدا زۆر موشکیلەن، هیچت پێنادەن."بەڵام ئێمەمانان بە پێچەوانەوە بیرمان دەکردەوە.

ئەوە یەکەم و دوایین دیدارم لەگەڵ هیرام عەباس بوو. ئەو کاندیدەی کە تورگوت ئۆزال بۆ مەدەنی کردنی میت داینابوو، لە ساڵی ۱۹۹۰دا لە رووداوێکدا کە تا ئێستا روون نەکراوەتەوە، لە ئیستانبوڵ تیرۆر کرا.

لەبارەی هەڵوێستی بەرپرسانی سوریا لە سەر پ.ك.ك، دواتر خۆم شاهیدی ئەو وەزعە دەبووم کە هیرام عەباس بە بەرچاوی یڵدرم ئاکبوڵوت و بەرپرسانی دیکەی تورك'ەوە بە زمانی گاڵتە بۆ ئێمەی رۆژنامەنوسی دەگێڕایەوە. لە مانگی یەکەمی ساڵی ۱۹۹۳دا بەشداری سەردانێکی سولەیمان دەمیرەل سەرۆك وەزیر'م بۆ شام کرد. دیداری نێوان دەمیرەل و حافز ئەسەد زۆری خایاندبوو. ئەسەد بە دەمیرەل'ی وتبوو کە هەتا ئێوارەخوانێك لەسەر شەرەفی تۆ نەدەم نابێ بڕۆنەوە و هەموو ئەو کەسانەش کە لەگەڵتاندا هاتوون دەعوەتن. ئێمەش کە لەنێو فڕۆکەکەدا چاوەڕوانی هاتنی سەرۆك وەزیر بووین تا بگەڕێینەوە بۆ تورکیا، بە پەلەپەل دابەزین. ئێمەیان بۆ کۆشکێکی گەورە و جوان و نوێی سەرۆکایەتی لە مەزە برد.

ماوەی چارەکە سەدەیەك بوو کە لە وێنەکانییەوە بە باشی حافز ئەسەدم دەناسی. بە خۆشییەکەوە کە پێشتر لە روومەتیدا نەمبینیبوو، تەوقەی لەگەڵ هەمووماندا کرد. چەند مێز لەولای شوێنی دانیشتنی حافز ئەسەد و سولەیمان دەمیرەل، لەگەڵ حەسەن جەمال لەسەر مێزێك دانیشتین کە چەند وەزیرێکی سوری لێبوو.

٤-غازی کەنعان (۱۹٤۲-۲۰۰٥)، لە نێوان ساڵانی۱۹۸۲-۲۰۰۲دا «پیاوی بەهێزی سوریا» لە لوبنان و بەرپرسی دەزگای هەواڵگری بوو. ۲۰۰۲ لە لوبنان پاشەکشەی کرد. لە ساڵی ۲۰۰٥دا کاتێ وەزیری ناوخۆ بوو، لەدوای تیرۆری رەفیق حەریری، ناکۆکی کەوتە نێوان ئەو لەگەڵ بەشار ئەسەد. هەرچەندە دەگوترێت خۆی کوشتوە بەڵام قەناعەتی باو وایە کە لەلایەن رژێمەوە کوژراوە.

سولەیمان دەمیرەل لە فرسەتێکدا کاغەزێکی لە گیرفانی دەرهێنا و پیشانی حافز ئەسەد'ی دا. سەرسووڕماوییەکم لە روخساری ئەسەد بەدی کرد. نزیکەی سی چرکەی نەخایاند کە سەری هەڵبڕی و سەرۆك وەزیرەکەی بانگ کرد و کاغەزەکەی بۆ ئەویش خوێندەوە. لە روومەتیدا وا دیاربوو کە بە سەرۆك وەزیرەکەی فەرمان دەدات کاری پێویست ئەنجامبدەن. هەرواش بوو. ئەو شەوە لەکاتی گەڕانەوەماندا بۆ تورکیا، لە فڕۆکەدا سولەیمان دەمیرەل پێی وتین ئەو کاغەزە بەڵگەیەك بوو کە ئەدرێسی شوێنەکانی مانەوەی ئۆجالان'ی تێدا بوو.

لە مانگی شوباتی ساڵی ٢٠١٠دا شۆفێری باڵیۆزخانەی تورکیا لە شام کە ئەو کاتانەی پێشتریش لەوێ بوو، لەکاتی گەڕاندنی مندا شوێنی مانەوەی ئۆجالان'ی پیشاندام. منیش خۆم پێ رانەگیرا و پێکەنیم. پێکەنینم بەوە دەهات کە شوێنی مانەوەی ئۆجالان تەنها پێنج تا دە خولەك بە پێ لە شوێنی مانەوەی وەفدە رەسمییەکانی تورك'ەوە دوور بوو. هەڵبەت یەکە ئەمنییەکانی تورکیا و سوریا دەیانزانی ئۆجالان لە کوێ دەمێنێتەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك دانوستان لەسەر ئەو بابەتە نەدەکرا.

تورگوت ئۆزال وەك یەکەم سەرۆك وەزیرێکی تورکیا کە سەردانی شام'ی کردبێت، درکی بەوە کردبوو کە داواکاری تورکیا بۆ رادەستکردنی ئۆجالان و وازهێنانی سوریا لە پشتیوانی کردنی پ.ك.ك ئەنجامێکی ئەوتۆی لێ ناکەوێتەوە، بۆیە زیاتر ویستبووی بە رێگایەکی ناڕاستەوخۆ پەیامێك بداتە سەرانی سوریا و سەرنجیان رابکێشێتە سەر پێگەی ستراتیژی و ئابووری تورکیا کە رووی لە گەشەکردن بوو.

پێویستبوو پەیوەندییەکانی تورکیا-سوریا لە روانگەیەوە هەڵبسەنگێنرێت کە تورگوت ئۆزال دەستنیشانی کردبوو. هەروەها لەو چوارچێوەیەشدا بیر لە پەیوەندییەکانی سوریا لەگەڵ پ.ك.ك بکرایەتەوە. ئۆزال بە رێککەوتننامەیەك لەسەر ئاو لە سوریا گەڕایەوە کە سوری'یەکان لێی رازی بوون و مومکین بوو لە داهاتوودا دەرگای هاوکاری زیاتر لەگەڵ سوریا بکاتەوە.

لەبارەی پ.ك.ك و ئۆجالان'یشەوە هەرچی دەڕۆیشتین، بە جانتایەکی بەتاڵ دەگەڕاینەوە.

نزیکەی نیوڕۆی ١٩٨٧/٧/١٥ لەکاتی نیشتنەوەی فڕۆکەکە لە شام، لەلای تورگوت ئۆزال هەستام. جەم دوونا زۆری پێ خۆشبوو کە قسە و باسەکانم لەلای سەرۆك وەزیر "باش"بوون. منیش خۆشحاڵ بووم. لەو گفتوگۆیەی نێوان ئەنقەرە - شام، یەکەم جار بوو رووبەڕووی سیاسییەکی تورك ببمەوە کە مومکین بوو لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی من لەبارەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بێت کە ساڵانێکی زۆری تەمەنی خۆمم بۆیان تەرخان کردبوو. لەوێ توانای درك پێکردنی تورگوت ئۆزال و سەرەداوەکانی دیدگاکەیم بۆ دەرکەوت کە ساڵانی دواتر زۆر باسی دەکرا.

ئەو پەیوەندییەی کە من لە سەردانەکەی سوریا لەگەڵ تورگوت ئۆزال بەرقەرارم کردبوو، دواتر لە

ساڵی ١٩٨٨دا لە سەردانەکەیدا بۆ داڤۆس‌ی سویسرا درێژەی کێشا کە بۆ دیدارە مێژووییەکەی لەگەڵ ئاندریاس پاپاندریۆ سەرۆك وەزیری یۆنان ئەنجامی دابوو. هەروەها لە چارەکی یەکەمی هەمان ساڵیشدا لە سەردانەکانی بۆ بەغدا و تاران کە بە یەك مانگ بەینیان هەبوو، لەگەڵ سەردانەکەی بۆ ئەسینا کە ماوەیەکی کەم بەر لە هەوڵی تیرۆرکردنی ئەنجامیدابوو، پەیوەندییەکەم لەگەڵ ئۆزال درێژەی کێشا و لەو قۆناخەدا تا ئەندازەیەك بەشداری هەموو گەشتە گرنگەکانی ئۆزال‌م کرد. بەڵام لە نیوەی ساڵی ١٩٨٨وە هەتا ١٩٩٠/٨/٢ کە قەیرانی کەنداو بەهۆی داگیرکردنی کوەیت لەلایەن سەدام دەرکەوت، ڕێگامان بەر یەك نەکەوت.

دەرکەوتنی قەیرانی کەنداو، تورکیا‌ی لەسەر ڕێگایەکی یەکتربڕ دانابوو. لەلایەك عێراق‌ی دراوسێ کە لەو کاتەدا شەریکی دووەمی بازرگانی بوو هەبوو، لەلایەکی دیکەش ئەمریکا هەبوو کە لە ناتۆ هاوپەیمانی بوو. عیسمەت ئینەنۆ لە جەنگی دووەمی جیهانیدا توانی بێلایەنی بپارێزێت و بەوەش بنەمای سیاسەتی دەرەوەی تورکیا‌ی داڕشت و دوای ئەوەش تورکیا دەیان ساڵ ڕەوتێکی ناچالاکی گرتەبەر، بۆیە هەرکەس چاوەڕوانی دەکرد کە لە قەیرانی کەنداو‌یشدا سیاسەتی بێلایەنی پێڕەو بکات. هەموو دامودەزگاکانی وڵاتیش بەوجۆرە شکڵیان گرتبوو. کەس حیسابی ئەوەی نەکردبوو کە تورکیا سەرکۆمارێکی وەك تورگوت ئۆزال‌ی هەیە کە ئامادەیە بۆ گۆڕینی ئەو وەزعە و دەیەوێ ئەو سیاسەتە بگۆڕێت.

ئەو کاتە یلدرم ئاکبولوت سەرۆك وەزیر بوو. هەموو کەس ڕێك بوو لەسەر ئەوەی پۆستەکەی کاتییە و بۆ خۆیشی لە رووی سیاسییەوە کەسێکی لاوازە. لەدوای سەردەمی فرە حزبییەوە لە تورکیا، نمونەی ئەوەش کەم بینرابوو کە سەرکۆمارەکان سەرۆك وەزیرەکان تێپەڕ بکەن و هەوساری پرس گرنگەکانی سیاسەتی دەرەوە دەست خۆیان بخەن. شتێکی دەگمەن روویدا و لەگەڵ قەیرانی کەنداودا، تورگوت ئۆزال دەرکەوتە مەیدان و لە سیاسەتی دەرەوەدا ئەمریکییەکان واتەنی Single-handed بە تەنها تورکیا‌ی بە ڕێیەکدا برد کە بە لای هەندێك کەسەوە مەترسیدار بوو.

هەر لە ڕۆژانی یەکەمەوە، بوومە یەکێك لەو کەسانەی بە گەرمی پشتیوانی لەگەڵ سیاسەتی تورگوت ئۆزال لە قەیرانی کەنداو‌دا دەکرد. هەر روونکردنەوە، هەر هەنگاوێك و هەر هەڵوێستێکی سیاسی ئۆزال، جۆش و خرۆشی لە مندا دروست دەکرد. لەگەڵ ئەمەشدا سیاسەتی ئۆزال لە قەیرانی عێراق، لە تورکیا لایەنگری نەبوو. لەنێو دەوڵەت و رای گشتیدا بە گومانەوە سەیر دەکرا و تەنانەت کاردانەوەی لە دژ پیشان دەدرا.

لەکاتی داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراق، لە مانگی ئابدا ئۆزال لەکاتی کردنەوەی هۆتێل شیراتۆن‌ی ئەنتالیا جەم دوونای بینیوە کە لەو کاتەدا باڵیۆزی تورکیا لە نەتەوەیەکگرتووەکان بوو. کاتی جەم حاڵ و

ئەحواڵی لێ پرسیبوو، وتبووی:" زۆر بێزارم جەم! کەس تێناگات کە من دەمەوێ چی بکەم، تەنها یەك کەس نەبێت. رۆژنامەنوسێکە. ئەڵێی فیکری من دەخوێنێتەوە. تەنانەت رەخنە لەو شتانە دەگرێت کە من لە مێشکی خۆمدا وام داناوە هەفتەی داهاتوو بیانکەم و رەخنە لەوە دەگرێت کە بۆ چی ئەو هەنگاوانەم نەناوە. ئەمەش لەکاتێکدایە کە هیچ پەیوەندییەکیشمان نییە. تا ئێستا نەمبینیوە. سەرم سوورماوە لەوەی کە چۆن دەتوانی ئاوەها من بخوێنێتەوە و ئەو شتانە بنوسێت."

جەم پێی وتبوو:"کێیە؟"

-"جەنگیز چاندار، لە رۆژنامەی گوینەش دەنوسێت. تەنانەت نازانم چی دەکات."

جەم وەڵامی دابووەوە و پێی وتبوو:"دەیناسن. هاوڕێی منە. لە ڕێی شام بە ئێوەم ناساندبوو."

ئۆزال'یش وتبووی:"ئاااا ئەوە؟ لە کوێیە؟"

دواتر جەم پێی وتبوو من لەبەر کێشەیەکی ئەمنی و مەترسییەکی سەر ژیانم بە ناچاری لە ئەمریکا دەمێنمەوە.

لە راستیشدا دەرکەوتنی قەیرانی کەنداو هاوکات بوو لەگەڵ ئەو قۆناخەی کە دووجار هەڕەشەی کوشتنم لێکرا. تەلەفۆن بۆ ئاسایشی ئیستانبوڵ کرابوو کە گوایە من دەکوژرێم و لەسەر ئەوەش ئاسایش داوای لێ کردم رێوشوێنی پاراستنی خۆم بگرمەبەر. نەمدەزانی چ جۆرە رێوشوێنێك بگرمەبەر. یەکەم شتێك کە بە مێشکمدا هات ئەوە بوو شوێنی ژیانی ئاسایی خۆم جێ بهێڵم. لەبەر ئەوەش بۆ قوبرس رۆیشتم. ئەسیل نادر، خاوەنی ئەو رۆژنامەیەی کە من کارم تێدا دەکرد و بۆخۆی لە لەندەن دەژیا، پێی وتم:"برۆ بۆ قوبرس، لەوێ چاوەڕێم کە با یەك ببینین." پەیوەندییەکی باشم لەگەڵ رەووف دەنکتاش هەبوو کە ئەو کاتانە سەرۆکایەتی قوبرسی دەکرد، بۆیە ئەوێم بە جێگایەکی ئەمن بۆ خۆم زانی. ئەسیل نادر نەهات بۆ قوبرس، بەڵام بە تەلەفۆن پێی وتم:" من پیاوێکی خاوەنکارم، تواناای درکپێکردنم بەهێزە. بەمزووانە شەڕ دەردەکەوێت و ئەمریکا یەکێك لەلایەنەکانی ئەو جەنگە دەبێت. لەم رۆژانەی جەنگدا برۆ بۆ ئەمریکا و لەوێ پەیامنێری بکە." منیش لە قوبرس گەڕامەوە بۆ تورکیا و بە بێ لە کیس دانی کات بەرەو واشنتن بە رێ کەوتم.

لە سەرەتای ئەیلوولی ١٩٩٠دا تورگوت ئۆزال سەردانی واشنتن'ی کرد و لەکاتی دەرکەوتنی قەیرانەکەشەوە ئەوە یەکەمجار بوو کە سەرکردەی وڵاتێکی هاوپەیمانی ئەمریکا لە ناوچەکە سەردانی واشنتن بکات. لایەنی ئەمریکی زۆر گرنگی بە سەردانەکە دەدا. لەو کاتانەدا واشنتن لەنێو بژارەکانی قورسایی خستنە سەر گەمارۆکانی سەر عێراق و هێرشی سەربازیدا مابووەوە. چاوەڕوان دەکرا سەردانەکەی تورگوت ئۆزال کاریگەری گەورە لەسەر راڕاییەکەی ئەمریکا دابنێت. لایەنی ئەمریکی بە ئەندازەیەك کە لایەنی تورکی

درکی پێ نەدەکرد گرنگی بەو سەردانە دەدا.

کاتێك هاتە هۆتێل مەدیسۆن لە واشنتن، گرووپێك ڕۆژنامەنوس کە لە هۆڵی پێشوازییەکەدا چاوەڕوانیی هاتنەکەیمان دەکرد، بە ریز وەستا بووین. ئۆزال و هاوڕێیانی هاتن و کاتێ لە دەرگای هۆتێلەکە هاتە ژوورەوە، دوای نزیکەی دوو ساڵ منی بینی و کتوپڕ گەڕایەوە و لەکاتی تەوقەکردندا وتی:"سوپاسی پشتگیرییەکەت دەکەم." بە بیرم دێت کە منیش لە وەڵامدا هەندێك شتی بێ مانام هێنایە سەرزمان. دواتریش لە ڕێی جەم دوونا'وە دەمزانی کە پشتی پەردەی ئەو سوپاسەی تورگوت ئۆزال چی بوو.

لە واشنتن'ەوە ڕۆیشت بۆ نیۆیۆرك. بڕیاربوو ئۆزال بەشداری لە کۆبوونەوەیەکی نەتەوە یەکگرتووەکان بکات. لە هۆتێلێکی نزیك شوێنی مانەوەی ئەو دەمامەوە و جاربەجار سەردانی هۆتێلی Peninsulaم دەکرد کە ئەو لەوێ جێگیر ببوو. لە یەکێك لەو ڕۆژانەدا لە لابی هۆتێلەکەدا نوزهەت قاندەمیر باڵیۆزی تورکیا لە ئەمریکا وەك بڵێی سەرزەنشتم بکات وتی:"ئەوە تۆ لە کوێی؟ لە بەیانییەوە سەرۆك کۆمار بە دوای تۆدا دەگەڕێت. دەیەوێ بتبینێ."

ئەو زۆر سەرقاڵ بوو، بۆچی بە دوای مندا دەگەڕا؟ ئەو ڕۆژە لەگەڵ سەرۆکی چەند وڵاتێکی وەك بولغاریا و ڕۆمانیا کۆدەبووەوە. دیدارەکەی منیان خستە بەینی ئەو دیدارانە و بە پەلەپەل منیان بۆ ژوورەکەی برد.

لەگەڵ سەرکۆماری تورکیا بە تەنها بووم. کاتێ ملقێ لە چاکەمان خواردەوە، پرسیاری هەڕەشەکەی سەر ژیانمی لێ کردم. وتی جەم دوونا باسی بۆ کردووم."دەزانی کێ لە پشت ئەم ڕووداوەوەیە؟"

- بەڵێ

دەمتوانی تەنها بە سەرۆکی دەوڵەت بڵێم کە گومانم لە دەوڵەتە.

بە نیگایەکی پڕ لە مەراقەوە وتی:"بۆچی؟"

-"چونکە: ١- ئێوە سەرکۆمارێکی تایبەتن. ٢- ڕووداوێکی تیرۆرکردنتان بە سەردا تێپەڕبووە، لە حاڵی من تێدەگەن. ئەگەر وانەبێ بە هەر بەرپرسێکی دیکەی دەوڵەت بڵێم کە گومانم لە دەوڵەتە، خۆم تووشی کێشە دەکەم. بەڵام لە دەروونمدا متمانەیەك هەیە بەوەی کە دەتوانم بە ئێوە بڵێم."

ماوەیەك باسی"دەوڵەتی پشتی پەردە"مان کرد و وتی کاتێ گەڕامەوە بۆ تورکیا بە تایبەتی سۆراخی ئەو کێشەیە دەگرم و ئاماژەی بەوە کرد کە لە پەیوەندیدا دەبین. سەرکۆماری گەورە و گرانی تورکیا لەنێو ئەو هەموو ئیش و کارەدا کاتی بۆ من تەرخان دەکرد و خۆی بە کێشە ئەمنی منەوە سەرقاڵ دەکرد. دەروونم پڕ ببوو. هەستم بەوە کرد کە حەزم لەو تورگوت ئۆزال'ەیە کە ماوەی چەند ساڵێکە ڕێز لە کارەکانی دەگرم.

لە مانگی ١٠ی ١٩٩٠دا دوای یەك مانگ لە واشنتۆن'ەوە گەڕامەوە بۆ تورکیا. گەرمتر لە جاران درێژەم بە نوسینەکانم دەدا بۆ پشتیوانی کردن لە سیاسەتەکانی تورگوت ئۆزال سەبارەت بە عێراق. لەو بەینەشدا

لە هەندێك نیوە شەودا تورگوت ئۆزال تەلەفۆنی بۆ دەکردم. لەبەر ئەوەی را نەهاتبووین لە نیوەشەواندا لە کۆشکی چانقایاوە تەلەفۆن بۆ ماڵمان بکرێت، یەکەم جار کچە پانزە ساڵانەکەم وتی:" کەسێك کە دەڵێ من سەرکۆمارم داوای تۆ دەکات." و تەلەفۆنەکەی دا بە دەستی منەوە. لە تەلەفۆندا بە درێژی باسی ئەو نوسینەمان دەکرد کە ئەو رۆژە نوسیبوم و قسەمان لە سەر هەواڵەکانی ناو کەناڵەکانی راگەیاندن دەکرد.

تورگوت ئۆزال دەیزانی جەنگ روودەدات و جگە لەوەش پێیوابوو بۆ لابردنی سەدام حسێن لەسەر پۆستەکەی پێویستە شەڕ بکرێت. ئۆزال، سەدام'ی بە هەڕەشەیەك بۆ داهاتووی تورکیا و ناوچەکە دەزانی و لەبەر ئەوەش هەر لە سەرەتاوە بەر لە دەرکەوتنی قەیرانی کەنداو بەهۆی داگیرکردنی کوەیت و بەر لە ئەمریکییەکان'یش دەیزانی کە سەدام مەترسی بۆ سیستەمی نێودەوڵەتی دروست دەکات. لە مانگی یەکەمی ساڵی ۱۹۹۰دا کاتی سەردانی واشنتن'ی کردبوو، جۆرج بوش پرسیاری لیبیا'ی لێکرد بوو کە ئەو کاتە لە رۆژەڤی یەکەمی ئەمریکا'دا بوو. ئۆزال بە ئەنقەست وەڵامی پرسیارەکەی بوش'ی نەدابووەوە و قسەی هێنابووە سەر عێراق و وتبووی:"سەدام حسێن پیاوێکی زۆر مەترسیدارە." دانوستانی بوش - ئۆزال دزەی کردبووە ناو کەناڵەکانی راگەیاندن و لە رۆژنامەی گوینەش'دا بڵاو کرابووەوە. لەبەر ئەوەش ئۆزال بە تۆمەتی"ئاشکراکردنی نهێنییەکانی دەوڵەت" سکاڵای لەسەر ئولوچ گویرکان سەرنوسەری گوینەش تۆمار کردبوو. بەڵام لە هەمانکاتدا بەهۆی بڵاونەکردنەوەی ئەو بەشەی کە پەیوەندی بە سەدام'ەوە هەبوو، تەلەفۆنی بۆ ئولوچ کردبوو تا سوپاسی بکات. سەرەڕای ئەوەی لە رۆژنامەی گوینەش کارم دەکرد، ماوەیەکی زۆر دواتر زانیم کە هەندێك سەرچاوەی وەزارەتی دەرەوە زانیاری دانوستانەکانی بوش – ئۆزال'یان بە رۆژنامەکە داوە.

قورسایی و کاریگەری ئۆزال لەسەر بڕیاربەدەستانی ئەمریکا پشتی بەوە دەبەست کە بەر لەوەی ئەمریکا رووبەڕوی داگیرکردنی کوەیت لەلایەن سەدام حسێن بێتەوە، ئەو پشبینی وەهای کردبوو کە راست دەرچوو بوو. جەیمس بەیکەر کە ئەو کاتە وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو لە کتێبی Politics of Diplomasiدا چەندینجار باسی سووربوونی تورگوت ئۆزال'ی کردووە لەسەر ئەوەی کە پێویستە سەدام حسێن لەسەر کار لابرێت.

"لە دواکاتەکانی ئەو رۆژەدا ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری ٦٦١ی بۆ گەمارۆی قورسی ئابوری لەسەر عێراق پەسند کرد. لە بڕیارەکەدا جەخت لەوە کرابووەوە کە پێویستە گەمارۆیەکی قورس و کاریگەر بخرێتە سەر هەر جۆرە پەیوەندییەکی بازرگانی لەگەڵ حکومەتی سەدام و ئەو حکومەتە کارتۆنیەی لە کوەیت پێکی هێنابوو. جگە لە پەراوێزخستنی عێراق لە رووی دیپلۆماتی، ئەمە یەکەم هەنگاوی ستراتیژێکمان بوو بۆ ئەوەی عێراق لە رووی ئابوریشەوە ملکەچ بکرێت. یەکێك لە هۆکارەکانی داگیرکردنی

کوەیت لەلایەن سەدام، پڕکردنی خەزێنە چۆڵەکەی بە پارەی زۆر و زەبەنی داهاتی نەوتی کوەیت بوو. بۆ ڕێگرتن لە دەوڵەمەندبوونی سەدام و هەروەها بۆ دەرخستنی کاریگەری گەمارۆکان، پێویستبوو ئەو بۆڕییە نەوتییە دابخرێت کە لە عێراق دەهات و دوای تێپەڕکردنی تورکیا بە دەریای سپی دەگەیشت. سێ ڕۆژ دوای بڕیارەکەی نەتەوەیەکگرتووەکان، وەك یەکەم وڵاتێك کە دوای دەرکەوتنی قەیرانەکە سەردانم کردبێت بەرەو تورکیا بە ڕێ کەوتم تا لەگەڵ تورگوت ئۆزال سەرکۆماری ئەو وڵاتە دانوستان بکەم.

لەو ساڵانەی کە لە خەزێنە بووم، تورگوت ئۆزال'م دەناسی. وەك ئابوریناسێکی بە توانا، لە بانکی جیهانی و سندوقی نێودەوڵەتی دراوادا نوێنەری تورکیا بوو. بە ئینگلیزییەکی ڕەوان قسەی دەکرد و بەو پێکەنینەی کە یەکسەر ڕوومەتی دەگرتەوە، ڕوخسارێکی دۆستانەی هەبوو. بڕیارە بڕاو بەهێزەکانی زیاتر لە بیرۆکراسیەتی دەوڵەت، پشتیان بە توانای درك و تێگەیشتنی دەبەست. ڕۆژێك بەر لەوەی کە من بچم و پێی بڵێم، خۆی هێڵی بۆری نەوتەکەی داخستبوو. ئەمەش ڕەفتارێك بوو کە ڕێك لەگەڵ کەسایەتی ئۆزال'دا دەگونجا. پێی گوتم کە لە وڵاتەکەیدا حەز لە بڕیارەکەی ناکەن، بەڵام شتی ڕاست کە پێویستە بکرێت هەر ئەمەیە و ڕێگا نادات تەنانەت"یەك دڵۆپ" نەوتی عێراق ڕەوانەی دەرەوە بکرێت. جگە لەوە وتی سەدام شێتە و ئەگەر جەنگی ناوخۆیی دەرکەوێت سۆپای عێراق شەڕ ناکات. سوپای عێراق'یشی بە سوپایەکی پووچەڵ و فش لە قەڵەمدا... لە کۆتاییەکانی دیدارەکەدا، ئۆزال وەك هەمیشە دووپاتی کردەوە کە سەدام مەترسیدارترین دیکتاتۆری جیهانە و وتی: هیچ نەبێ پێویستە، موشەکە سکۆدەکانی سەدام و دامەزراوە کیمیاوییەکانی لەناو ببرێن و ئەگەر پێویستیش بکات بە زۆری چەك لە کوەیت دەربکرێت. بەڵام تەنها هەڕەشە کردن بەس نیە بۆ ئەوەی بتوانی ڕووبەڕووی سەدام ببیتەوە، ئۆزال هاتە سەر خاڵی هەستیار و وتی: لە سەدام ڕزگارمان دەبێت؟ منیش وتم: بەڕێز سەرکۆمار! یاساکانمان ڕێگامان پێنادەن کە چالاکییەك بە ئامانجی کوشتنی بەرپرسانی وڵاتانی بیانی ئەنجام بدەین. پێویستە تەرکیز بخەینە سەر ئەوەی کە لە ڕێی سزا ئابوری و سیاسییەکانەوە بیخنکێنین. ئەم قسانەی من کاریگەرییان لەسەر ئۆزال دانەنا. لەبەرامبەردا وتی: پێویستە کۆتایی پێ بهێنین. هەتا سەدام حسێن بمێنێ هەموو دەوڵەتێك لە مەترسیدا دەبێت. بەردەوام هەڕەشەیەکمان لەسەر دەبێت. تکایە بە سەرۆك بوش بڵێن پێویستە سەدام حسێن بڕوات."

ماوەیەکی کورت لەدوای ئەو دیدارە، کاتێك لە واشنتن تورگوت ئۆزال'م بینی، هەوڵی دەدا قورسایی خۆی بخاتە سەر ڕازی کردنی بەڕێوەبردنی ئەمریکا بۆ ئەوەی لە دژی عێراق شەڕ بکات. ئەمریکا لەو کاتانەدا لە بەینی بژارەی جەنگ و گەمارۆدانی عێراق'دا مابووەوە. دوو بۆچوونی جیاواز هەبوو سەبارەت بەوەی کە لە نێوان وەفدەکاندا باسی چی دەکرێت. من سەبارەت بەو دانوستانەی کە لە کۆشکی سپی دەکرا و لەلایەن ئەمریکا زۆر مەراقی ئەنجام و ناوەڕۆکەکەی دەکرا، زانیاریم لە مۆرتۆن ئابرامۆڤیتز باڵیۆزی ئەمریکا

لە عێراق وەرگرت کە بەشداری لە کۆبوونەوەکەی کۆشکی سپی کردبوو. لەلایەنی ئەمریکی پلەبەرزترین بەرپرسانی ئەو وڵاتە کە بریتی بوون لە سەرۆك بوش، ژەنراڵ برەنت سکۆکرۆفت سەردەستەی راوێژکارانی ئاسایشی نەتەوەیی، جەیمس بەیکەر وەزیری دەرەوە، دیك چێنی وەزیری بەرگری و مۆرتۆن ئابرامۆڤیتز باڵیۆزی گەورە پێکهاتبوو. لە بەرامبەردا لایەنی تورکی زۆر لاواز بوو. جگە لەوە، لەو رۆژەدا فەزیحەیەکی گەورەش روویدابوو کە کەناڵەکانی راگەیاندن باسیان نەکردبوو.

جگە لە ئابرامۆڤیتز، دواتر لە زاری خودی تورگوت ئۆزال و قایا تۆپەری وتەبێژی سەرۆکایەتی کۆمار'ەوە کە بەشداری لە کۆبوونەوەکەدا کردبوو باسی ئەو رووداوەم بۆ کرا. ئۆزال بۆ ئەوەی لەبەردەم لایەنی ئەمریکی'دا پۆز لێ بدات، وتبوی:" لێرە من لەگەڵ دوو پسپۆڕدا بەرامبەر بە ئێوە دانیشتووم. قایا تۆپەری وتەبێژم پێشتر باڵیۆزی تورکیا لە کوەیت بووە. نوزهەت قاندەمیر باڵیۆزمان لە ئەمریکا کە پێشتر لە بەغدا کاری کردووە. ئێمە لە دەستی یەکەمەوە زۆر بە باشی عێراق و کوەیت دەناسین." دوای ئەوەش قسەی بۆ نوزهەت قاندەمیر جێهێشتووە تا باسی عێراق بکات. نوزهەت قاندەمیر'یش بە جۆرێك قسەی کردووە کە تورگوت ئۆزال و ئەمریکییەکان'ی سەر مێزەکە تووشی سەرسووڕمان بن و باسی هێز و و توانستەکانی سوپای عێراق و ئاستی بەرزی جەماوەری سەدام حسێن'ی کردووە.

نوزهەت قاندەمیر لەو رۆژەدا لەبەر چاوی تورگوت ئۆزال کەوتبوو. جارێك لە شوێنێکدا کە منیشی لێ بووم تورگوت ئۆزال وتی:" پێویست بەوە ناکات پەیوەندی دیپلۆماتی عێراق و ئەمریکا بەرقەرار ببێتەوە. عێراق لە واشنتن باڵیۆزێکی هەیە و ئێمەش پارەکەی دەدەین." و بەوجۆرەش بە تانە و تەشەرەوە باسی نوزهەت قاندەمیر'ی کردبوو.

گەورەکردنی عێراق و بەرنگاربوونەوەی نیازی ئەمریکییەکان، قاڵبی رەفتارێك نەبوو کە تەنها تایبەت بە نوزهەت قاندەمیر بێت. رەفتارەکەی قاندەمیر رەنگدانەوەی تێگەیشتن و رەفتاری زۆرینەی سیستەمی دەوڵەتی تورك بۆ پرسەکە بوو. ئۆزال باسی ئەوەی بۆ کردم کە کاتێ عێراق لە ١٩٩٠/٨/٢دا کوەیت'ی داگیرکرد و ئەویش جڵەوی رووداوەکەی گرتۆتە دەست و داوای کۆبوونەوەی خێرای ئەنجومەنی وەزیرانی کردووە و باسی ئەگەری دەرکەوتنی جەنگی کردووە، زمانی زۆربەی وەزیرەکان لە گۆ کەوتووە." پرۆفیسۆر عەلی بۆزەر وەزیری دەرەوە توایەوە. ئەو پرۆفیسۆرە گەورە و گرانە کە زۆر بەڕێز بوو، سەرەڕای ئەوەی کە وەزیری دەرەوە بوو، کاتێ گوێی لەمە بوو رەنگی زەرد هەڵگەڕا. رێك وەك ئەوە وابوو کە لەبەر چاومدا بتوێتەوە." بارودۆخی سەربازەکانیش لە بیرۆکراسیەتی مەدەنی جیاوازتر نەبوو. تورگوت ئۆزال بە زمانی گاڵتە پێکردنەوە باسی ئەوەی بۆ کردبووم کە جارێك بەهۆی پۆستەکەیەوە پێویستبووە بچێتە مەراسیمێکی سەربازی لە سانجاقێکی شرناخ، بەڵام فەرماندە باڵاکانی سوپا سەرنجیان راکێشاوەتە سەر ئەوەی کە

شڕناخ نزیك سنورەكانی عێراق'ە و لەوانەیە بەشداری كردنی ئەو لەو مەراسیمەدا لەلایەن سەدام'ەوە وەك هەوڵێكی ورووژاندن لە قەڵەم بدرێت، بۆیە باشتروایە بەشداری تێدا نەكات. سەربازەكان تەنانەت دژی ئەوەش دەركەوتبوون كە یەكەیەكی سەربازی توركی بەشێوەیەكی سەمبولیك بەشداری لە هێزێكی هاوپەیمانەكاندا بكات كە لە عەرەبستان بۆ دژایەتیكردنی داگیركردنی كوەیت لەلایەن سەدام پێك دەهێنرا.

بەهۆی ئەو ناڕەزاییە توندەی لەنێو دەوڵەتدا هەبوو، چاوەڕوانیی كردنەوەی بەرەی دووەم لە توركیا لە حاڵەتی رووودانی جەنگ لە خەیاڵ دەچوو. لە بواری دیپلۆماسیشدا، دیپلۆماتەكانی توركیا زیاتر لە بەرگریكردن لەو هاوپەیمانییەی كە ئەمریكا پێشەنگایەتی دەكرد، زیاتر دەیانویست پشتگیری لە حكومەتەكەی سەدام بكەن. بەهۆی ئەو پەیوەندییانەی كە لەگەڵ سەرۆكی ئەمریكا بە ئەندازەیەك پێشی خستبوو كە تا ئەندازەیەك رۆژانە بە تەلەفۆن پێكەوە قسەیان دەكرد، تورگوت ئۆزال دڵنیا بوو لەوەی كە هەرچەندە ئەمریكا بۆ ماوەیەك لە نێوان بژارەی جەنگ و گەمارۆدانی عێراق'دا دێت و دەچێت بەڵام دواجار هەر شەڕ دەبێت. لە نیوەشەوێكی مانگی یەكەمی ساڵی١٩٩١دا لەگەڵ ئۆزال بە تەلەفۆن قسەمان دەكرد، زۆر توورە ببوو لە محەمەد عەلی بیراند كە ئەو شەوە وەك ئەوەی شتی زۆر بزانێت لە تەلەفزیۆندا وتبوی:"بەهیچ كلۆجێك شەڕ نابێت. ئەوانەی بەرنامەی سەفەریان بۆ عێراق هەیە با بەگوێرەی ئەمە بجوڵێنەوە. بڕۆن."

-" ئەو كابرایە چۆن دەزانێ شەڕ نابێ؟"

-" لەوانەیە لە فەرەنسییەكان'ەوە شتێكی زانیبێ."

فەرەنسا و روسیا لەو كاتانەدا هەموو هەوڵێكی خۆیان دەخستە گەڕ بۆ ئەوەی شەڕ نەكرێت. پێی وتم:" مادام وایە با ئەو بڕوا بە فەرەنسییەكان بكات. تۆ لە هێڵی نوسینەكانت لا مەدە. لە رێگای راست دای. لە سەداسەد شەڕ دەبێت."

چەند رۆژ دوای ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنیەمان لە ١٩٩١/١/١٧دا شەڕ دەركەوت. نزیكەی سێ هەفتە دوای دەركەوتنی شەڕ و هەژانی دەسەڵاتی سەدام لە بەغدا، لە رۆژی ٦ی شوباتدا، بۆ یەكەمجار لە تەمەنمدا پێم نایە ژووری سەرۆك كۆمار لە كۆشكی چانقایا. ئەو كاتانە ئیدی لەبارەی عێراق و داهاتووی توركیا، تێگەیشتنێكی هاوبەش و متمانە لە نێوان من و ئۆزال'دا دروست ببوو.

كاتی زانیبووی من بە نیازم سەردانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بكەم و دەمەوێ لەوبارەیەوە بیروبۆچوونەكانی بزانم، ئەمەی وەك هەل و دەرفەتێك زانیبوو. پەیوەندی كردن لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق، راستەوخۆ واتای هەوڵدان بۆ رووخاندنی سەدام حسێن و خۆ ئامادەكردن بۆ عێراق'ی دوای ئەوی دەدا.

ویستی منیش بۆ دیدار لەگەڵ تورگوت ئۆزال لەمبارەیەوە، لەلایەك پەیوەندی بەوریایی رۆژنامەوانیم و لەلایەکی دیکەش پەیوەندی بە درك و پێشبینییەکانم هەبوو کە دواتر راست دەردەچوون. ئەسیل نادر خاوەنی رۆژنامەی گوینەش کە ئەو کاتانە کارم تێدا دەکرد، بەهۆی رووخانی بۆرسەی لەندەن رووی لە هەڵشکان و داکشانی کردبوو. بۆ ئەوەی بتوانێ ماوەیەکی دیکە رۆژنامەکە بژێنێ و موچەکان بدات، پێویستبوو تیراژەکەی بەرز بکاتەوە. رۆژێك بە دەنیز سۆما بە رێوەبەری نوسینی رۆژنامەکەم وت ئەگەر زنجیرە نوسینێك بە ناوی "ئامانجەکانی سەدام " کە ریکلامی باشی بۆ کرابێت بڵاو بکەینەوە، لەوانەیە بتوانین تیراژی رۆژنامەکە بەرز بکەینەوە. ئەوەشم وت کە:" هەرچۆنێك بێت لە کۆتایی ئەم جەنگەدا سەدام دەیدۆڕێنێ. پێویستە لە جیاتی ئەو هەواڵانەی کە خەڵك هەموو رۆژێك لە تەلەفزیۆن سەیریان دەکات، لەبارەی داهاتووی عێراق هەواڵیان پێ بدرێت. ئەوانەی کە شوێنی سەدام دەگرنەوە عەرەب٘ە ناڕازییەکانن لەگەڵ سەرکردە کوردەکان٘ی وەك مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی کە بۆ تورکیا زیاتر جێگەی سەرنجن..."

دوو رۆژ دواتر، لە یەکەم یەکشەمەی مانگی شوبات٘دا ئۆلۆچ گویرکان سەرنوسەری رۆژنامەکە تەلەفۆنی بۆ کردم و بە ئوسلوبی کۆنی خۆیەوە وتی:" رەیس! لەسەر ئەو قسانەی کە رۆژی پێشتر بە دەنیز٘ت وتوون جیدیت؟ ئەم کارە ئەکەی؟"

-"ئۆلۆچ! بۆ ئەوەی ئەم کارە بکەیت پێویستە سەردانی لەندەن، شام و تاران بکەیت و بە دوای کەسدا بگەڕێیت. ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لەو شوێنانەن. بەشێکی زۆری ئەوانەش خۆیان شاردۆتەوە. رۆژنامە بەم حاڵە پەرێشانەی خۆیەوە کە رووی لە ئیفلاسە کەی دەتوانێ پارەی ئەو سەفەرانەی من بدات تا بیکەم..."

ئۆلۆچ گویرکان لە قوتابخانەی ناوەندی و ئامادەیی و ساڵانی زانکۆشدا هاوڕێم(دژبەرێکی بێ ئامانی تورگوت ئۆزال بوو. لە ساڵانی١٩٩٠کاندا بوو بە پەرلەمانتار و پۆستی جێگری سەرۆکی پەرلەمانی وەرگرت) بوو وتی:" تەواو، من ئەو پارەیە پەیدا دەکەم." و تەلەفۆنەکەی داخست. رۆژی دواتر کارەکە جیدی ببوو. ئۆلۆچ پارەی پێویستی بۆ ئەو چرووتژەیەی من پەیدا کردبوو کە وەك دواهیوای رزگارکردنی رۆژنامەکە بوو. وەك یەکەم ئیش تەلەفۆنم بۆ هاوڕێیەکی لوبنانی٘م کرد کە لە رۆژنامەی ئەلحەیاتی چاپی لەندەن کاری دەکرد. ساڵانێکی پێشتر لە تاران و بە تایبەتی لەکاتی گەمارۆی ئیسرائیل٘دا رۆژانێکی سەختمان بە یەکەوە تێپەڕ کردبوو. پەیوەندییەکی تایبەتیمان هەبوو. وتم:" ئەگەر بێم بۆ ئەوێ، دەتوانێ لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق٘دا دیدارم بۆ رێکبخەی؟"

-" وەرە، چارەسەری ئەکەین."

-"ئەی سەرکردە کوردەکان؟ تاڵەبانی و بارزانی؟"

-" بۆ ئەوان نازانم، من بە سەرکردەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عەرەب'یت پێ دەناسێنم. دەتوانی لە ڕێی ئەوانەوە شوێن پێی ئەوانیش پەیدا بکەی."

ئەم سەرداوەش بەس بوو بۆ ئەوەی بەرەو لەندەن بە ڕێ کەوم. شەو لە ماڵەوە تەلەفۆنیشم بۆ تورگوت ئۆزال سەرکۆمار کرد. هۆکاری تەلەفۆنەکەیشم بۆ سەرکۆمار ئەوە بوو کە دەمزانی ئەو چاوەڕوانیی رووخاندنی سەدام حسێن دەکات و پێشبینی ئەوەشم دەکرد کە لە ئەنجامی ئەوەدا گۆڕانکاریی جیدی لە سیاسەتی تورکیا بەرامبەر بە کورد رووبدات. لەو رۆژانەدا ئەو هەواڵەش بڵاو دەبووەوە کە هەوڵی لابردنی قەدەخەی قسەکردن بە زمانی کوردی دەدات. لەوانە بوو سەرکۆمارێکی تورك کە بەشێوەیەکی جیاواز بیری لە کوردەکان دەکردەوە، بیروبۆچوونی سەرنجڕاکێشی لەبارەی عێراق'یش هەبێت. ئەمەش دەیتوانی ببێتە هۆی ئەوەی کە دیدارەکانم لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بە کوردەکان'یشەوە سودبەخش بن.

لە وتەیەکی تورگوت ئۆزال لە ۱۹۹۱/۱/۹ لەسەر شاشەی تی ئاڕ تی کە لە بەرنامەشدا نەبوو، وردەکارییەك سەرنجی راکێشام و بووە هۆی ئەوەی کە ئەم پێشبینییەم بەهێزتر بێت. لەدوای دەرکەوتنی قەیرانی کەنداو بەهۆی داگیرکردنی کوەیت لەلایەن سەدام حسێن، لە بەرواری ۸/۲ ی هەمان ساڵ، بۆ یەکەم جار جەیمس بەیکەر وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و تارق عەزیز هاوتا عێراقی'یەکەی لە جنێڤ یەکتریان دەبینی. لە رێگایەکدا کە هەنگاوبەهەنگاو لە جەنگ نزیك دەبووەوە، ئەمە یەکەم پەیوەندی عێراق و ئەمریکا و دواهیوای رێگرتن لە جەنگیش بوو. سەرنجی هەموو دنیا چووبووە سەر دیداری بەیکەر - عەزیز. لەو دیدارە ئەنجامێك دەرنەکەوت کە رێ لە شەڕ بگرێت و تورگوت ئۆزال'یش لەسەر شاشەی تی ئاڕ تی دەرکەوت.

بەشێوەیەك قسەی دەکرد کە ئیدی ناکرێ رێگا لە شەڕ بگیرێت و وەك سەرۆکی وڵاتێکی دراوسێ بۆ جاری دوایی هۆشداری بە سەدام حسێن دا. لە بەشێکی قسەکانیدا لە سەرەتا، گوێم لە دەستەواژەی" گەلانی عێراق" بوو. لەبەر خۆمەوە وتم زمانی خەڵەتاوە. دەستەواژەی "گەلان" دەستەواژەیەك بوو کە چەپەکان لە دەیەکانی ۱۹٦۰ و ۱۹۷۰کاندا بەکاریان دەهێنا و لە پاشخانی ئایدۆلۆژی ئۆزال'دا جێگای نەدەبووەوە. لەوەش زیاتر دەستەواژەی"گەلانی عێراق" واتای ئەوەی دەدا کە لە عێراق جگە لە شوناسی عەرەبی، پێکهاتەی دیکەش هەن کە ئەمەش بەر لە هەموو کەسێك واتای"گەلی کورد"ی دەدا. کەس نەیدەتوانی بیر لەوە بکاتەوە کە سەرکۆماری دەوڵەتێك کە لەکاتی دامەزراندنی کۆمار'ەوە تا ئێستا سیاسەتی نکۆڵی کردن لە کوردی گرتۆتەبەر، ئێستا ئاماژ بە"گەلی

کورد" دەکات. لەبەر ئەوەش دیسان وتم زمانی خەڵەتاوە. بەڵام لە بەشێکی دیکەی قسەکانیدا ئۆزال جارێکی دیکە دەستەواژەی"گەلانی عێراق"ی بەکارهێنا. ئیتر نەدەکرا پاساوی خەڵەتاندنی زمانی بۆ بهێنمەوە. هەستم بەوە کرد کە ئۆزال تەسەورێکی بۆ عێراق ی دوای سەدام هەیە کە کوردەکان یشی تێدایە. بەر لەوەی بکەومە رێگای دۆزینەوەی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی، ویستم تورگوت ئۆزال ببینم و لە زمانی خۆیەوە بزانم تەسەوری سەبارەت بە ئایندە و کوردەکان چییە. ئەگەر ئەوەم بکردایە بە ئامادەییەکی زیاترەوە بۆ دیداری سەرکردە کوردەکان دەچووم.

بەم هەستەوە پێم نایە کۆشکی چانقایا. کاتێ لە دەرگای کۆشك چوومە ژوورەوە، لە یەکەم دەرگای لای چەپەوە، باڵیۆز قایا تۆپەری هاتە لام و وتی:"شتێکی زۆر گرنگت پێ دەڵێم پێویستە لە سەداسەد بە سەرکۆماری بڵێی."بەڵام دواتر بێ ئەوەی هیچم پێ بڵێت منیان بۆ ژووری سەرکۆمار برد. تورگوت ئۆزال لە پشت مێزە سەرەکییەکەی خۆی کە رووبەڕووی دەرگاکە بوو دانەنیشتبوو. لە پشت مێزێکی بچووك لەلای چەپی دەرگاکەوە دانیشتبوو و چاوەڕوانی منی دەکرد. قایا تۆپەری کە وتەبێژی بوو، بە شێوەی ئاسایی لە دیدارەکانی ئۆزال لەگەڵ رۆژنامەنوسان ئامادە دەبوو. لەگەڵ من هاتە ژوورەوە، بەڵام ئۆزال پێی گوت کە دەمەوێ بە تەنها لەگەڵ چەنگیز قسە بکەم. شەرمم کرد لەوەی کە قایا تۆپەری ژوورەکەی جێهێشت و چووە دەرەوە. نەمتوانی سەیری ناوچاوانی قایا تۆپەری بکەم کە دواتر پەیوەندییەکی برا - کاك لە نێوانماندا دروست دەبوو. سەرم داخست. تورگوت ئۆزال بێ ئەوەی سەرەتا و دەروازەیەك بۆ قسەکانی دروستبکات، یەکسەر چووە سەر باسەکە. وتی:" لە عێراق چەنێ تورکمان هەیە؟" وتم:"لە عێراق بە رەسمی هەبوونی تورکمانەکان قبوڵ ناکرێت. لە سەرژمێرییەکاندا وەك تورکمان باسیان ناکرێت. لەبەر ئەوەش ژمارەی جۆراوجۆر لەوبارەیەوە دەگوترێت کە پەیوەندییان بە یەکەوە نیە. باشتروایە لە ئۆجاخی تورکەکان بپرسن، ئەو ژمارەیەی کە ئەوان پێتان دەڵێت بیکەن بە سێ بەشەوە."

تورگوت ئۆزال بە سەرسوڕمانەوە وتی:" بۆچی؟"

- بۆ هەر بابەتێ کەسانێك هەن کە پێیەوە سەرقاڵن و گرنگی پێدەدەن. ئەوانیش زۆرگرنگی بە کۆمەڵگا تورکییەکان ی دەرەوەی تورکیا دەدەن. بەڵام لەوانەیە ژمارەکان زۆر گەورە بکەنەوە. وا بیرم کردەوە کە لەوانەیە یەك لەسەر سێی ئەو ژمارەیە دروست بێت کە ئەوان دەیڵێن.

تورگوت ئۆزال قسە و باسەکانی لەسەر تورکمانەکان ی عێراق زۆر درێژ نەکردەوە و دیسان بە خێرایی هاتە سەر باسە سەرەکییەکەمان." ئایا تورکمانەکان بەسن بۆ ئەوەی نفوزی ئێمە لە عێراق زیاد بکات؟" وەك بڵێی وەڵامەکەی بۆ خۆی هەڵگرتبێ درێژەی بە قسەکانی دا و وتی:" شیعەکان

ئێران و سوننەکان'یش وڵاتانی عەرەب'یان هەیە. یان بە پێچەوانەوە. ئایا کارتی تورکمان بەسە بۆ ئەوەی کە لە پێکهاتەی عێراق'ی داهاتوودا نفوزی ئێمە وەك تورکیا بگەیەنێتە ناوەند؟"

-"نەخێر ئەفەندم."

-" بە بێ کوردەکان ناکرێت وانیە؟"

-"ناکرێت!"

کاتێ ئەم قسانەمان دەکرد، دەستی نا بە دوگمەیەکدا و حسێن ئاکسۆی بانگ کرد کە وەك بە ڕێوەبەری غەیرە ڕەسمی قەڵەمەکەی بوو. داوای لێکرد لە کتێبخانەکەیدا نەخشەیەکی عێراق و لە چەکمەجەی مێزی شوێنی حەوانەوەیشیدا بەڵگەیەکی بۆ بهێنێت.

نەخشەکەی لەسەر مێزەکەی ڕاخست و لەسەر چاویلکەکەیەوە بە وردی تەماشای شوێنی نیشتەجێبوونی کورد و تورکمانەکان'ی کرد. دواتر چەندینجار لەسەر ئەو مێزە دادەنیشتین و پێکەوە سەیری نەخشەمان دەکرد. جارێکیان پەنجەی ئاماژە و پەنجەی بەرزە لوتەی دەستی چەپی خستە سەر سنوری عێراق و عەرەبستان لە باشووری ئەو وڵاتە و وتی:" ئەگەر بتوانین نفوزی تورکیا هەتا ئێرە پەرە پێ بدەین، دەبینە یەکێك لە گرنگترین وڵاتانی جیهان."

سەرم داخستە سەر نەخشەکە و وتم مەبەستتان چییە. بە شێوەیەك کە سەرزەنشتم بکات وتی:" نابینی؟" دواتر ئەوەی بۆ ڕوونکردمەوە کە باسی مەیدانێکی جیۆپۆلیتیکی دەکات کە تێیدا تورکیا بتوانێت بەسەر کەناڵی سوێز و کەنداو'دا زاڵ بێت. ڕزگاربوون لە سەدام و بونیاتنانی عێراق'ی دوای سەدام، بۆ تورگوت ئۆزال وەك دەرفەتێکی گرنگ بوو بۆ ئەوەی تورکیا ببێتە ئەکتەرێکی نێودەوڵەتی و داهاتووەکەیشی گەرەنتی بکات.

بە پێچەوانەی ئەو ڕەخنە ناڕەوایانەی‌کە زیاتر لەکاتی جەنگی کەنداو و قۆناخەکانی دواتریشدا بەهۆی هەوڵدان بۆ پەرەپێدانی نفوزی تورکیا، تورگوت ئۆزال هەرگیز ئامانجی فراوانخوازی سەربازی نەبوو. بە ڕای ئۆزال، دەبوایە تورکیا "نفوزی سیاسی" لەسەر ئەو ڕژێمە سیاسییە نوێیە هەبوایە کە لە بەغدا پێك دەهێنرا و بۆ ئەمەش پێویستبوو خاوەنی "کارتی کورد" بێت."کارتی تورکمان" کارتێك بوو کە تورکیا دەیتوانی بە ئاسانی کەڵکی لێ وەربگرێت، بەڵام بەس نەبوو. "کارتی کورد"یش بۆ عێراق'ی دوای سەدام شتێك بوو کە بێ ئەوە هیچ نەدەکرا.

تورگوت ئۆزال سەبارەت بە ئەنجامەکانی جەنگی هاوپەیمانی نێودەوڵەتی بە پێشەنگایەتی ئەمریکا و تەنانەت بەشداری وڵاتێکی وەك سوریا لە دژی عێراق، پێشبینی سەرنجڕاکێشی هەبوو. بە گوێرەی ئەو، ڕژێمێك بە مەرکەزییەتی بەغدا هەرگیز ناتوانێ خۆی لە بەرامبەر ئەو جەنگەدا

رابگرێت و لەگەڵ رووخانی رژێمەکەی سەدام حسێن، جارێکی دیکە ئەو رژێمە ناوەندییەی بەغدا بونیاد نەدەنرایەوە کە ساڵی ١٩٢١ بە پشتی دەستە بژێریەکی عەرەبی سوننە دامەزرابوو. لە مێشکی ئۆزال'دا ئێران بەهێزترین کاندید بوو بۆ ئەوەی بتوانێ بۆشایی دوای جەنگ لە عێراق پڕ بکاتەوە. چونکە پەیوەندییەکی مێژوویی و کەلتووری و سروشتی لەگەڵ شیعەکان هەبوو کە زۆرینەی ژمارەی دانیشتوانی عێراق'یان پێکدەهێنا. تەنها بیری لێ نەدەکردەوە، بەڵکو نیگەرانیش بوو.

لە پاشخانە فیکرییەکەی ئۆزال'دا درك و شعورێکی گەورەی مێژوویی شاراوە بوو. ئەو دەیزانی عێراق بۆ ماوەی سەدان ساڵ ناوەندی ململانێ و کێشمەکێشی عوسمانلی - سەفەوی بووە. ئاگاداربوو لەوەی کە رکابەریی تورکیا و ئێران بە تایبەتی لەسەر عێراق، جگە لەوەی کە رەهەندی ناکۆکی شیعە - سوننە'ی هەیە، یاسایەکی جیۆپۆلیتیکیشە.

تورکیا کە لەکاتی دامەزراندنی کۆمار'ەوە هەتا ئەو کاتە پشتی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کردبوو، دەیتوانی چی بکات بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییە حەتمییە بەهێزەی دەسەڵات پڕ بکاتەوە کە لە عێراق دروست دەبوو؟ دەیتوانی چی بکات بۆ ئەوەی لەسەر داهاتووی عێراق خاوەن نفوز و کاریگەری بێت و دەیتوانێ چ ئامڕازێك بۆ ئەو مەبەستە بەکاربێنێت؟ کوردەکان'ی عێراق رێك لەم خاڵەوە لە هاوسەنگییەکەی ناو زەینی ئـۆزال'دا جێیان دەگرت. تورکیا تەنها لە رێی تورکمانەکان'ەوە کە زەینییەتی"دەوڵەت - نەتەوەی تورك" وەك"برا ئەتنییەکان" سەیری دەکردن، نەیدەتوانی لە هاوسەنگییەکانی عێراق'دا جێی خۆی بکاتەوە. بەهۆی کەمیی ژمارە و دابەشبوونی جوگرافی و هەروەها لەبەر ئەوەی کە توانایەکی سیاسی ئەوتۆیان نەبوو، تورکمانەکان نەیاندەتوانی ببنە ئامرازێکی گونجاو بۆ ئەوەی تورکیا ئامانجەکانی بەدی بهێنێت. بۆیە پێویستبوو کوردەکان لەو هاوسەنگییەدا جێ بگرن. بەڵام بۆ تورکیا'یەك کە لەکاتی دامەزراندنی کۆمارەوە لە سەر بنەمای نکۆڵی کردن لە کورد گەشەی بە خۆی دابوو مومکین نەبوو بە بێ گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی، یان تەنانەت شۆڕشێك لە سیاسەتەکانیدا، بتوانێ کارتی کوردی دەست خۆی بخات. کرانەوە بە رووی کوردەکان'ی عێراق تورکیا'ی ناچار دەکرد رووبەڕووی کێشەی کوردی خۆی بێتەوە و بۆچوونی رەسمی باو سەبارەت بە کوردەکان'ی خۆی بگۆڕێت. بۆچوونەکانی تورگوت ئۆزال بە ئەندازەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەری تێڕوانینی دوای رووخانی یەکێتی سۆڤییەت'دا بوون. دوای رووخانی یەکێتی سۆڤییەت، لە قەفقاسیا هەتا ئاسیای میانە، ژمارەیەك دەوڵەت بە شوناسی تورکی دەرکەوتن و بە گوزارشتێکی جیۆپۆلیتیکیانەش لە باڵکانەکان'دا کە"هارتلاند"ی عوسمانلی بوو، رژێمە سیاسییەکان گۆڕان و لە روانگەی ئۆزال'یشەوە ئەم رووداوە چانسێك بوو بۆ ئەوەی تورکیا بتوانێت پێگەی خۆی لە سیستەمی

نێودەوڵەتیدا بەرز بکاتەوە. ئەو دەیگوت:" لە ماوەی سەدان ساڵدا ئەمە یەکەم جارە دەرگاکانی نیاز بەوجۆرە بە رووی تورکیا کراونەتەوە." دەرکەوتنی قەیرانی کەنداو بەهۆی داگیرکردنی کوەیت لەلایەن سەدام حسێن، دەرفەتێکی رەخساند بۆ ئەوەی تورکیا لە "دەرگاکانی نیاز" بچێتە ژوورەوە.

کشانەوەی یەکێتی سۆڤییەت لە مەیدانەکە، گۆڕانی سیستەمی نێودەوڵەتی لە دووجەمسەرییەوە بۆ تاك جەمسەری لێکەوتەوە کە تێیدا ئەمریکا تاکە جەمسەر بوو. ئەمریکا وەك تاقە دەوڵەتێکی سوپەر مابووەوە. ئەم روخسارەی سیستەمی نێودەوڵەتی لە مێژووی جیهاندا شتێکی دەگمەن بوو کە من بە حاڵەتێکی"نائاسایی"لە قەڵەمم دەدا و تورگوت ئۆزال'یش بە دەستەواژەیەکی ئەندازیارییەوە بە" باری ناجێگیری هاوسەنگی"ناوی دەبرد. ئۆزال لەو روانگەیەوە، دەیویست قەیرانی کەنداو کە بە داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراق دەرکەوتبوو، بکاتە دەرفەتێك بۆ ئەوەی تورکیا لە "سیاسەتی بێلایەنی" رزگار بکات کە وەك میراتی جەنگی دووەمی جیهانی بۆی مابووەوە. ئەو دەیویست لە رێی دژایەتیکردنی شەڕەنگێزییەکانی سەدام حسێن و جێگرتن لە ریزی ئەمریکا و تەنانەت بەشداری چالاك لەو هاوپەیمانە نێودەوڵەتییەی کە پێکهاتبوو، لەو دەسەڵاتە نێودەوڵەتییەی کە دوای جەنگی سارد پێك دەهات شوێنێك بۆ تورکیا گەرەنتی بکات.

لەبەر ئەوەی کە خاوەن ئەو بیروبۆچوونانەش بوو، کاتێ قەیرانی کەنداو لە مانگی ئابی ساڵ ۱۹۹۰دا دەرکەوت، ئۆزال دەیزانی پێویستە چی بکات. هەوسارەکەی لە دەستی حکومەت وەرگرت کە لەبەرامبەر قەیرانەکەدا سەری لێ شێوا بوو. بە پێچەوانەی ئەو پرەنسیپەی سیاسەتی دەرەوە کە تورکیا لەکاتی دەرکەوتنی قەیرانە نێودەوڵەتییەکاندا خۆی بپارێزێ و خۆی دووربگرێت و لەسەر ئەوەش رای گشتی راهێنرابوو، تورگوت ئۆزال لە دژی عێراق دەرکەوت. بەو هەڵوێستەشەوە لە چاو زۆرێ لە وڵاتاندا لە ریزی پێشەوەدا جێی خۆی کردەوە. جۆرج بوش سەرۆکی ئەمریکا'ی رازی کرد تا کار بۆ دەرکردنی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بکات و بۆ داخستنی هێڵی بۆری نەوتی کەرکوك – یومورتاڵك، عەرەبستانی سعودی ناچارکرد تا جوڵە بکات. بڕیاری داخستنی هێڵی بۆری نەوتی کەرکوك - یومورتاڵك یەکێك بوو لەو رووداوە دراماتیکانەی کە ئاراستەی قەیرانی کەنداو'یان دەستنیشانکرد.

تورگوت ئۆزال پێیوابوو پەیوەندییەکی راستەوانە لە بەینی ئاسایشی تورکیا و ئەو دەسەڵاتە نێودەوڵەتییەدا هەیە کە دادەمەزرێت. بە رای ئەو، پێگەی تورکیا لە سیستەمی سیاسی نێودەوڵەتیدا، گرنگترین گەرەنتی بۆ وڵات دەستەبەر دەکرد. لایەنە هاوتەریب و هەماهەنگەکانی ئەم بیرۆکە ستراتیژییەی ئۆزال لە ناوچەکەدا، کوردەکان'ی عێراق بوون. ئەگەر پەیوەندی تورکیا و کوردەکان'ی

عێراق وەك گۆشت و نینۆكی لێ نەهاتبایە، تورکیا نەیدەتوانی لەسەر عێراق نفوزی هەبێ و هەروەها نەیدەتوانی نفوزی خۆی هەتا کەنداو پەرە پێ بدات. هاوکات لەگەڵ ئەم بۆچوونەیدا، ئۆزال پێیوابوو کە تا لە ناوخۆی وڵاتدا کێشەی کورد چارەسەر نەکات، تورکیا ناتوانێت لە داهاتوودا پێگەی"ناوەندی هێز" پەیدا بکات.

بیستنی ئەو بۆچوونانەی ئۆزال لە زمانی خۆیەوە، بووە هۆی ئەوەی کە بزانم لە نێوان بۆچوونەکانی من کە بە ئەزموونی خۆم پێی گەیشتووم، لەگەڵ بیرکردنەوەکانی ئەودا بە ئەندازەیەکی سەیر خاڵی هاوبەش هەیە. کاتێك لە ١٩٩١/٢/٦دا بۆ یەکەم جار پێم دەنایە ناو کۆشکی چانقایا، نەمدەزانی لە رێگای دروستکردنی مێژوودا هەنگاو دەنێم. بەڵام دوای ئەوەی کە پاش سێ کاتژمێر قسە و باسی دووقۆڵی لەگەڵ تورگوت ئۆزال لە کۆشکی چانقایا دەرکەوتم، هەستم بەوە دەکرد کە ئەو سێ کاتژمێرە کاریگەری خۆی لەسەر مێژووی نزیکی تورکیا دادەنێت.

بە خاڵ و فاریزەکانیشەوە لەگەڵ ئەو هەڵوێستەدا بووم کە تورگوت ئۆزال لەبەرامبەر قەیرانی کەنداو‌دا نواندی. هەردووکمان بەشێوەیەکی زۆر جیاواز پێگەیەنرا بووین. ئایدۆلۆژیا و ئەزموونی زۆر جیاوازمان هەبوو و سەر بە دوو جیلی جیاواز بووین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ١٩٩٠-١٩٩١دا لەسەر "یەکتربڕی عێراق و کوردەکان" بە یەك گەیشتین و تا کاتی مەرگی لە ساڵی ١٩٩٣دا بە بێ دابڕان پێکەوە ماینەوە.

**بڵاوکردنەوەی هەواڵی کوردی لە TRT، barودۆخەکە زۆر ئاڵۆز دەکات. ئەگەر مافی کەلتووری و تەنانەت مافە سیاسییەکانیش بدرێت، دیسان هیچ ناگۆڕدرێت. داوای شتی زیاتر دەکەن. پەروەردەی کوردی، رادیۆ و تەلەفزیۆنی کوردی، حزبی کوردی و..تاد، هیچ یەک لەمانە ناکرێن. جەنگیز (چاندار) ئەم شتانەی خستۆتە مێشکی تورگوت ئۆزال.**

مەسعود یلماز، سەرۆک وەزیر (١٩٩٧،١٩٩٦،١٩٩١)، حەسەن جەمال، کوردەکان، ل.٣٠٩

تورگوت ئۆزال لەنێو ئەو بەڵگانەدا کە داوای کردبوو بیهێنن بۆ ژووری سەرۆکایەتییەکەی، ئەوەی کە ویستی دۆزییەوە و رادەستی منی کرد و وتی:"ئەمە بخوێنەوە بزانم." وتارێکی J.B.Kelly بوو بە ناوی با قسە لە سەر تورکیا بکەین (Lets Talk Turkey)، کە لە ١٧ی ئەیلوول دا لە ژمارەی ١٩٩٠ی گۆڤاری National Review گرنگترین گۆڤاری راست - پارێزگارەکانی ئەمریکا بڵاوکرابووەوە. هاکی ئویجال هاوڕێی کاتی زانکۆم و سەرنوسەری رۆژنامەی تەرجومان کە ماوەیەك لە دەنگی ئەمریکا و رۆژنامەی حورییەت یشدا کاری کردووە، گۆڤارەکە و وتارەکەی بۆ تورگوت ئۆزال ناردبوو. ئەو کاتەی تورگوت ئۆزال گۆڤاری National Reviewی بۆ درێژکردمەوە تا وتارەکە بخوێنمەوە، هیچ زانیارییەکەم لەسەر گۆڤارەکە نەبوو. لە ماوەیەکی کەمدا وتارەکەم خوێندەوە. باسی ئەوەی دەکرد کە ئەگەر قەیرانی کەنداو بگاتە جەنگ و رژێمی سەدام حسێن بڕوخێ و عێراق دابەش بێت، ئەو کاتە حکومەتی تورکیا لە رووی یاساییەوە مافی بەسەر ویلایەتی موسڵ دەبێت و ئەگەر تورکیا ش داواکارییەکی وەها بکات، پێویستە ئەمریکا پشتگیری لەو داوایەی هاوپەیمانەکەی بکات. ئەو، بە پشتبەستن بە بەڵگەنامەیەکی ساڵی ١٩٢٥ی کۆمەڵەی گەلان باسی هەقی تورکیا ی بەسەر ویلایەتی موسڵ دەکرد. بەڵگەنامەکەش راپۆرتێکی کۆمەڵەی گەلان لە سەر ویلایەتی موسڵ بوو کە وەك تاقە ماددەیەك کە لە لۆزان بڕیاری لەسەر نەدرابوو، مابووەوە و مایەی ناکۆکی تورکیا و بەریتانیا بوو. لە راپۆرتەکەدا چەندین هۆکار ریزکرابوون بۆ ئەوەی ویلایەتی موسڵ بخرێتە سەر دەوڵەتی عێراق، بەڵام باسی ئەوەش کرابوو کە ئەگەر عێراق هەندێك لە مەرجەکان کە تایبەت بوون بە مافەکانی کورد جێبەجێ نەکات، ئەوسا گەڕانەوەی ویلایەتی موسڵ بۆ سەر تورکیا مومکین دەبێت.

J.B.Kelly لە وتارەکەیدا باسی ئەوەی دەکرد کە عێراق لەدوای سەربەخۆیی لە ١٩٣٢ هەتا ئێستا، پابەندی مەرجەکانی راپۆرتەکەی ١٩٢٥ی کۆمەڵەی گەلان نەبووە و ئەگەر رژێمەکەی سەدام حسێن بڕوخێ و عێراق دابەش بێت، تورکیا دەتوانێ داوای هەق بکات.

ئەو هەقەی تورکیا بەسەر باکووری عێراق و کوردەکان ەوە کە لە ١٧ی ئەیلوول دا لە ژمارەی ١٩٩٠ی گۆڤاری National Reviewدا باسی کرابوو، جارێکی دیکە لە زاری جەلال تاڵەبانی یەوە بەر گوێم کەوت. لەدوای جەنگ، لەکاتێکدا کە پێکهاتە و داهاتووی عێراق بە نارِوونی مابوونەوە، جەلال تاڵەبانی هەوڵیدەدا

هەقی تورکیا بەسەر کوردەکان ی عێراق وەبیر بهێنێتەوە.

تاڵەبانی لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ۱۹۹۱دا بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەی سۆسیالیست ئینتەرناسیۆناڵ هاتبووە ئیستانبوڵ و دەیویست چاوی بە تورگوت ئۆزال بکەوێت. ئۆزال داواکەی رەتکردبووەوە و داوای لە کایا تۆپەری، حسێن چەلەم لە وەزارەتی دەرەوە و من کردبوو کە دیداری لەگەڵ بکەین. من باسی ئەوەم کردبوو کە لای حسێن چەلەم وەك دیپلۆماتێکی پابەندی هێڵی نەریتی وەزارەتی دەرەوە، ناکرێت بە ئاسانی قسە لەگەڵ تاڵەبانی بکرێت و نارەزاییم پیشاندابوو، بەڵام تورگوت ئۆزال لەبەر حیسابەکانی خۆی پێداگری لە پێویستی ئامادەبوونی حسێن چەلەم لە دیدارەکەدا کردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا چەلەم ئێوارەخوانی لەگەڵ وەلید جونبەلات، سەرکردەی دورزیی لوبنان بە لاوە سەرنجڕاکێشتر بوو. لە راستیدا رەتکردنەوەی داواکەی سەرکۆمار لەلایەن چەلەم لە شەوی بەر لە کرانەوەی کۆبوونەوەی سۆسیالیست ئینتەرناسیۆناڵ لە قازانجی من بوو. بەو ئۆتۆمبیلەی کە خۆم لێم دەخوڕی، تاڵەبانی و بەرهەم ساڵح و سەرچڵ قەزاز'م لە هۆتێلی هیلتۆن هەڵگرت و رۆیشتینە ژوورەکەی قایا تۆپەری لە هۆتێلی The Marmara و نەمهێشت رۆژنامەنوسان ئاگایان لێ بێت.

لە روانگەی چەلەم'ەوە تاڵەبانی گرنگ نەبوو، بەڵام راگەیاندنی تورکی وازی لە کەسایەتییە نێودەوڵەتییەکانی بەشداربووی کۆبوونەوەکە وەك شیمۆن پرێز و ویلی برەندت و بروونۆ کرەیسکی هێنابوو و بە دوای تاڵەبانی'دا دەگەڕان. کۆبوونەوەکەمان لەگەڵ وەفدی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ژوورەکەی قایا تۆپەری لە هۆتێل، زیاتر لە دوو کاتژمێری خایاند. جەلال تاڵەبانی باسی پێویستی و گرنگیی دیداری خۆی لەگەڵ تورگوت ئۆزال بۆ وتەبێژی سەرکۆمار دەکرد. لە بەشێکی کۆبوونەوەکەدا هەم جەلال تاڵەبانی و هەم بەرهەم ساڵح راپۆرتەکەی ۱۹۲۵ی کۆمەڵەی گەلان'یان لە جانتاکانیان دەرهێنا و باسی هەقی تورکیا'یان لە باکووری عێراق کرد. قایا تۆپەری زۆر سەری سووڕمابوو. بۆ یەکەمجار کەوتمە قسە و وتم:"سەرکۆمار ئەو بەڵگەیەی لایە. ئاگای لێیە."

تاڵەبانی بە ئاماژە کردن بەو راپۆرتەی کۆمەڵەی گەلان کە باسی هەقی تورکیا'ی بەسەر باکووری عێراق کردبوو، وتی:" ئەگەر پشتگیری ئێمە بکەن، هەڵوێست و پێگەی ئێمەش لەگەڵ هی ئێوەدا هەماهەنگ و گونجاو دەبێت."

ئەم دیدارە، سێ مانگ دوای هاتنێکی نهێنی جەلال تاڵەبانی بۆ ئەنقەرە لەکاتی جەنگی کەنداودا، ئەمجارەیان لە سەردانێکی ئاشکرایدا بۆ ئیستانبوڵ، لە نیوەشەوی ۱۹۹۱/٦/۹دا لە هۆتێلی The Marmara ئەنجامدرا. لە یەکەم سەردانیدا چاوی بە سەرکۆمار نەکەوتبوو، لە جاری دووەمیشدا تەلەفۆنی دەکرد و فشاری دەخستە سەرم بۆ ئەوەی دیدارەکە سەربگرێت.

چەندین ڕۆژ بەر لەوەی تاڵەبانی بێتە ئیستانبوڵ، تەلەفۆنم بۆ تورگوت ئۆزال کرد تا پێی بڵێم کە ئەو سەرکردەیەی کورد دەیەوێ دیداری لەگەڵ بکات. ئەویش پێی گوتم دوو ڕۆژ دواتر دێمە ئیستانبوڵ و کاتژمێر ١٢:٠٠ لە هۆتێلی چراخان چاوەڕوانیت دەکەم. لەو کاتەی کە ئەو وتبووی چوومە هۆتێلەکە بەڵام ئەو دیدارەکەی منی فەرامۆش کردبوو، لەگەڵ روشدی ساراچ ئوغلو سەرۆکی بانکی ناوەندی دیداری دەکرد.

وتی:"لە بیرم چووە، ببورە. ئێستا چی بکەین؟"

دەمتوانی چی بڵێم. هەر دوو دەستم بەرز کردەوە و سەری خۆم گرت.

پرسیارێکی چاوەڕوان نەکراوی لێکردم و وتی:" دەزانی نوێژ بکەی؟"

-"بەڵی، دەزانم ئەفەندم."

-"دەستنوێژت هەیە؟"

-"نا."

-"برۆ ژوورەکەی تەنیشت و بڵێ لەگەڵ سەرکۆمار دەچم بۆ نوێژی هەینی، با مووسا (بە ڕێوەبەری پاسەوانەکانی) خاولیت بداتێ. دەستنوێژەکەت بگرە و پێنج خولەك دواتر لە خوارەوە لەبەر دەرگای هۆتێلەکەدا بە. لە ڕێگا لەکاتی هاتن و ڕۆیشتندا قسە دەکەین و بەوجۆرەش کێشەی دیدارەکەمان چارەسەر دەکەین.

بە قسەی ئەوم کرد. لەلای چەپی کوشنی دواوەی ئۆتۆمبیلێك کە ئاڵای سەرۆکایەتی کۆماری پێوە بوو دانیشتم. ئەوە یەکەمجار بوو کە سواری ئۆتۆمبیلی سەرکۆمار بم. کاروانی ئۆتۆمبیلەکان لە پارکی یلدزەوە دەرکەوت و گەیشتە یەنی لەوەنت و لە پرسگەی ئەکادیمیای سەربازی چووە ژوورەوە. دەرگاکان کرانەوەو دوو ژەنراڵ تەحیەیان بۆ فەرماندەی دەستووری (سەرکۆمار) لێدا. ئەویش بە هەمانشێوە سڵاوی لێکردن. منیش نەمدەزانی چی بکەم و لەخۆمەوە هەندێك جوڵەی بێ مانام بە دەستم کرد. چووینە ناو ئۆتۆمبیلێکی دیکە کە ئاڵای سەرۆکایەتی کۆماری پێوە نەبوو. تێنەدەگەیشتم کە چی ڕوودەدات. وتم:"لە ئاکادیمییە سەربازییەکاندا مزگەوت هەیە؟ نوێژی هەینی لێرە دەکەین؟" ئۆزال وتی:"کورە نا، بۆ بازادان بەسەر هاوپیشەکانی تۆدا هاتینە ئێرە، ئەوان لە پرسگە مانەوە. ئێرە دەرگایەکی دیکەی چوونە دەرەوەی هەیە. لەوێوە دەچینە پردی دووەم تا بۆ نوێژ بچینە بەیکۆز. ڕێگاکەم بە ئەنقەست درێژکردەوە تا لە هاتوچۆدا کاتی قسەکردنمان هەبێت."

دواتر وتی:"دەتویست چیم پێ بڵێی؟" هەر وتم" تاڵەبانی تەلەفۆنی کرد..." یەکسەر قسەکەی پێ بڕیم و بە دەستی چەپی باڵی ڕاستی منی گوشی و وتی:"دواتر لەسەر ئەوە قسە دەکەین."

-"پێویست بە قسە و باسی درێژ ناکات، بەم نزیکانە بۆ کۆبوونەوەی سۆسیالیست ئینتەرناسیۆناڵ دێتە ئیستانبوڵ..." و دەمویست درێژە بە قسەکانم بدەم کە توندتر باڵی راستی منی گوشی و بە پەنجەی ئاماژەی دەستی راستی ئاماژەی بە یاوەرە سەربازییەکەی کرد کە لە کوشنی پێشەوەی ئۆتۆمبیلەکە دانیشتبوو. وتی" دواتر قسەی لەسەر دەکەین." و نەیهێشت قسە بکەم.

لە کوشنی پێشەوە رێك لەبەردەم سەرکۆمار'دا، یاوەرە سەربازییەکەی دانیشتبوو کە پلەی رائیدی هەبوو. کۆلۆنێل ئاسلان گوینەر، سەردەستەی یاوەرەکانی لە هۆتێل مابووەوە. سەرم سوورما. سەرکۆماری تورکیا کە لەکاتی جەنگی کەنداو ببووە دەوڵەمەدارێکی نێودەوڵەتی و بە ئەندازەیەك لە سەرۆکی ئەمریکا نزیك بوو کە بە ناوی بچووکەوە بانگی یەکتریان دەکرد، لەگەڵ ئەوەی کە سیفەتی "فەرماندەی گەورە"ی هەیە، دەترسا لەوەی کە لە تەنیشت یاوەرەکەیدا کە پلەی رائیدی هەیە، بکەوێتە ناو قسە و باسێك کە تێیدا ناوی سەرکردەیەکی کورد دەهێنرێت. تورگوت ئۆزال کەسێکی زۆر بەهێز بوو، بەڵام کاتێ بابەتەکە پەیوەندی بە "پرسی کورد"ەوە هەبوو، تەنانەت ئەویش لەبەر هەڵوێست و پێگەی سوپا نەیدەتوانی بە ئاسانی خۆی لە باسێکی زۆر سادەش بدات.

لە رێگای نێوان چراخان – بەیکۆز - چراخان دا نەمتوانی پێی بڵێم جەلال تاڵەبانی دەیەوێ بتبینێت. رۆژی ٦/٩، جەلال تاڵەبانی هاتە ئیستانبوڵ و ئەو کاتە بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ سەرکۆمار کرد، بەڵام خۆی لە دیدار لەگەڵ تاڵەبانی دزییەوە و وتی:"مادام دێت بۆ سۆسیالیست ئینتەرناسیۆناڵ، ئەرداڵ (ئینەنۆ) بەگ خاوەن ماڵە، با جارێ ئەو دیداری لەگەڵ بکات تا بزانین چۆن دەبێت." ئەرداڵ ئینەنۆ جێگری سەرۆك وەزیر بوو. بەو پێیەی کە تورگوت ئۆزال سەرکۆمار بۆ کەناڵەکانی راگەیاندنی ئاشکرا کردبوو، لەبەر سەردانی پێشووی تاڵەبانی کە بە نهێنی ئەنجامدرابوو، کێشەی نێوان سەرکۆمار و سولەیمان دەمیرەل سەرۆك وەزیر دادگایی کرابوو. دەمیرەل، تورگوت ئۆزال'ی بە "خیانەت بە نیشتمان" تۆمەتبار کردبوو، تورگوت ئۆزال'یش لە دادگا سکاڵای سوکایەتی پێکردنی(حەقارەت) لەسەر ئەو تۆمار کردبوو. ئۆزال چاوەڕوانی دیداری ئینەنۆ - تاڵەبانی بوو، تا دوای ئەوە خۆی لەگەڵ تاڵەبانی دیدار بکات و بەوجۆرەش بە حیسابی خۆی حکومەتی بێ چەك دەکرد تا لەسەر دیدارەکە هێرش نەکاتە سەری.

حیسابەکەی رێك دەرچوو. بەیانی رۆژی دوشەمە ٦/١٠ بەر لە دەستپێکردنی کۆبوونەوەی سۆسیالیست ئینتەرناسیۆناڵ، ئەرداڵ ئینەنۆ لەگەڵ تاڵەبانی'دا پێکەوە قاوەتییان کرد. نزیکەی نیوەڕۆی هەمان رۆژ لە ئامێری ئاگادارکردنەوەکەمەوە پەیامێکم پێگەیشت سەبارەت بەوەی کە سەرکۆمار دەیەوێ تەلەفۆنی بۆ بکەم. تەلەفۆنم کرد. تورگوت ئۆزال پێی گوتم رۆژی پێنج شەممە لە کۆشکی چانقایا'ی ئەنقەرە لەگەڵ جەلال تاڵەبانی و وەفدی کوردی هاوڕێی دیدار دەکات. بەمجۆرەش یەکێك لە گەورەترین تابۆکانی مێژووی

کۆماری دەشکاند. ئەمەش تەنها لە ڕێی بت شکێنێکەوە لە کۆشکی چانقایا کە پۆستی سەرۆکی کۆماری هەبێت مومکین دەبوو.

ئەحمەد کورتجەبە ئالپتەموچین کە لەنێو وەزەیرەکانی دەرەوەی تورکیا بە لاوازترینیان ناوبانگی دەکردووە، لە قسەی ئۆزال دەرنەدەچوو. بەڵام دەیویست نەهێڵێ دیدارەکە سەربگرێت و پێداگری کردبوو لەوەی کە لە جیاتی سەرکۆمار ئەو دیداریان لەگەڵ بکات. ئۆزال فەرمانی دابوو ئالپتەموچین بۆ خۆیشی دیداریان لەگەڵ بکات و هەموویان پێکەوە بێن بۆ کۆشك و بەوجۆرەش ژێستێکی- gesture گەورە و پڕ مانای بەرامبەر بە موخاتەبەکەی کرد و بەوەش بۆ یەکەمجار سەرکردەیەکی کورد لەگەڵ سەرکۆمارێکی تورکیا دیداری دەکرد.

ئەو دیدارەی کە تێیدا لە مێژوودا بۆ یەکەمجار سەرکۆمارێکی تورکیا لەگەڵ سەرکردەیەکی کورد دیداری کرد، ڕۆژی هەینی ١٩٩١/٦/١٤ لە کۆشکی چانقایا ئەنجامدرا. جەلال تاڵەبانی و بەرهەم ساڵح و سەرچڵ قەزاز، کاتژمێر ٨:٠٠ی بەیانی ڕۆژی هەینی لە ئیستانبوڵ بە فڕۆکە هاتن بۆ ئەنقەرە. بە پاسەوانیی ئەمنیی تایبەتەوە لە هۆتێل هیلتۆن جێگیر بوون و چاوەڕانی کاتی دیدار لەگەڵ تورگوت ئۆزال مانەوە. کاتی نیوەڕۆ، بیست خولەك مێنێ بۆ یەك، چوونە لای ئەحمەد کورتجەبە ئالپتەموچین وەزیری دەرەوە و لەوێشەوە بەرەو کۆشکی چانقایا بە ڕێ کەوتن.

بەیانی ئەو ڕۆژە منیش بە فڕۆکەیەکی دیکە چووبوومە ئەنقەرە و لە هۆتێل هیلتۆن جێگیر ببووم. ئەو کاتانە نوسینگەی ڕۆژنامەی سەباح کە تێیدا کارم دەکرد لەبەرامبەر هۆتێل هیلتۆن بوو. کاتێ لەوێ بووم تاڵەبانی تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی پێویستە بەر لەوەی بچمە کۆشکی چانقایا یەکتر ببینین. لە لابییەکەی هیلتۆن یەکمان بینی. بێ ئۆقرە بوو. وەك منداڵ پڕ جۆش و خرۆش بوو. بەردەوام بە عەرەبی دەیگوت ڕۆژێکی مێژووییە. خۆمم پێڕانەگیرا، وتم "مام جەلال! لە تەمەنتدا ئەمە یەکەمجار نییە کە سەرۆکی دەوڵەت یان کەسێکی مێژوویی ببینی، لە مائۆ بگرە تا جەمال عەبدولناسر، لە چە گیڤارا بگرە تا حافز ئەسەد و ڕەفسەنجانی، لەگەڵ هەموویاندا بوویت، ماوەیەکی کەم بەر لە ئێستا لەگەڵ سەدام حسێن لە بەغدا لەسەر مێزی دانوستان دانیشتووی، ئەوە چیتە بۆ وا بێ ئۆقرەی؟"

تاڵەبانی وتی:" ئەمە لە هیچ شتێکی دیکە و لە هیچیان ناچێت. ئەوەی کورد نەبێت، بە ئاسانی لە گرنگی دیداری کەسێکی وەك من لەگەڵ سەرکۆمارێکی تورکیا تێناگات!"

پرسیاری لێکردم کە چۆن لەگەڵ تورگوت ئۆزال'دا قسە بکات. منیش وەك پێشنیار هەندێك شتم بە مێشکدا هات کە یەکسەر بۆم ریز کرد:" تورگوت بەگ دوو تایبەتمەندی بنەڕەتیی هەیە: لە قسەی دوور ودرێژ حەز ناکات و مێشکی زۆر کردارییە و زوو کار دەکات. قسەکان بە وتەی چرووتتۆکۆلییەوە زۆر درێژ

مەکەرەوە، بچوو سەر بابەتی سەرەکی و بە سادەیی قسەکەت بکە. وەك ئەوەی لەگەڵ شەریکێکی کاسبیدا قسە دەکەی، لەسەر شتی هاوبەش و دیاریکراو قسە بکە. جگە لەوە، زۆر زیرەکە و فریو ناخوات، لەگەڵیدا روون و دروست بە. هەر ئەوەندە بەسە. ئەگەر ئەمانە بکەیت دیدارەکە بەشێوەیەکی باش بەرەو پێش دەڕوات."

بەرەو ئێوارە کاتێ لە کۆشك گەڕانەوە، پێیان لە عەرز بڕابوو. هەر سێکیان زۆر خۆشحاڵ بوون. دەیانگوت:"لاپەڕەیەکی نوێ کرایەوە!"

لە پەیوەندییەکانی کوردەکان و تورکیا، لاپەڕەیەکی نوێ کرابووەوە. یەکەم کاریان ئەوە بوو کە زانیاری بە باکووری عێراق بدەن. لەو کاتانەدا د. موزەفەر ئارسڵان سکرتێری گشتی پارتی میللی تورکمان'ی عێراق تەلەفۆنی کرد. دەیویست ئێوارەخوانێکی پیرۆزبایی بۆ جەلال تاڵەبانی و هاوڕێکانی لە ئەنقەرە رێکبخات. بڕیاروابوو کاتژمێر ۲۱:۰۰ من و جەلال تاڵەبانی و هاوڕێکانی لە ریستۆرانتی یەحیا کە ریستۆرانتی باش و بە ناوبانگی گازی عوسمان پاشای ئەنقەرە'یە، لەگەڵ د. موزەفەر یەکبگرینەوە.

ئەو کاتەی کە دەعوەتەکەی د. موزفەر'یان قبوڵ کرد، تەلگرافێکی مەسعود بارزانی هات کە ئەو کاتانە بۆ دانوستان لەگەڵ سەدام لە بەغدا بوو. تاڵەبانی زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی کە تەلگرافی مەسعود بارزانی پێگەیشتووە. بەر لەوەی تاڵەبانی بێت بۆ تورکیا، مەسعود بارزانی نامەیەکی بۆ ناردووە و تێیدا وەك "بەرەی کوردستان،ی" پشتگیری دیدارە چاوەڕوان کراوەکەی تاڵەبانی لەگەڵ تورگوت ئۆزال کردبوو. تاڵەبانی ئێستا دەیتوانی بڵێت کە مەسعود بارزانی لەسەر قسەکەی خۆی بۆ پشتگیری کردن لە دیدارەکە ماوەتەوە.

لەکاتی خواردنی ئێوارەدا تاڵەبانی زۆر کەیف خۆش بوو. ئەمەش ئەوەندە دیاربوو کە بەبێ وەستان نوکتەی لەسەر کورد و عەرەب دەگوت و قاقای پێکەنینەکانی بە دوای یەکدا دەهاتن. لەو بەینەدا د. موزەفەر چەمایەوە و وتی" کۆماری تورکیا باوکایەتی خۆیی پیشاندا، وەك سەردەمی عوسمانییەکان'ە!"

تورگوت ئۆزال پێی گوتبوو لە نێوان کوردەکان'ی عێراق و قوبرس و تراکیا'ی خۆرئاوا و تورکەکان'ی بولغاریا هیچ فەرق و جیاوازییەك ناکات. ناوەڕۆکی ئەم پەیامە بەس بوو بۆ ئەوەی کە تاڵەبانی لە خۆشیدا نەزانێ چی بکات. ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە تەنها رۆژێك بەر لەو کاتە کە دیدارەکەی لەگەڵ تورگوت ئۆزال دیار ببوو، تاڵەبانی لەبەر بێ ئۆقرەیی دکتۆرێ بانگ کردبوو. تاڵەبانی هەتا ئێوارە ئەو وتانەی دووبارە دەرکردەوە کە دەیویست بە تورگوت ئۆزال'ی بڵێت.

ئێوارەیەك بەر لەوەی بێت بۆ ئەنقەرە، لەبەر پیرۆزبایی کردنی رۆژی لە دایکبوونی هێرۆ خان هاوسەری جەلال تاڵەبانی، لە سارییەر'ی ئیستانبوڵ لە ریستۆرانتێکی ماسیدا بە ناوی ئورجان پێکەوە بووین. لەسەر مێزێکی حەفدە کەسی دانیشتبووین. دوو پەرلەمانتاری بەریتانی هاتبوون، یەکیان Galli Ann Clwyd

ئەندامی کابینەی سێبەری  پارتی کرێکاران بوو کە بەردەوام پشتیوانێکی سەرسەختی کوردەکان‌ی عێراق بوو. جگە لەوان، کۆسرەت رەسووڵ فەرماندەی هێزەکانی پێشمەرگەی تاڵەبانی (ساڵی ٢٠٠٦ بوو بە جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان) و هەندێك بەرپرسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان وەك ئەحمەد بامەڕنی لەوێ بوون. توبا‌ی هاوسەرم وەك ئاماژەیەك بە ئاستی پەیوەندییەکانی تورکیا و کوردەکان، وەك دیاری زیوێکی سەردەمی عوسمانییەکانی بە هێرۆ دا و وتی:" بەو هیوایەی کە لەمەودوا کورد و تورکەکان وەك سەردەمی عوسمانییەکان پێکەوە برایانە بژین."... لە خوانەکەدا ماسی مورەکەب، ئەختەپوت، شاماسی و ماسی پان‌یان هێنا. لەسەر مێزەکە، ئەو کوردانەی لە ئەورووپا هاتبوون شەرابیان دەخواردەوە و ئەوانەش کە لە عێراق هاتبوون عارەقیان هەڵبژارد. تاڵەبانی نەیخواردەوە. لەلایەکەوە گاڵتەی لەگەڵ ئەو گارسۆنانەدا دەکرد کە بە کوردی قسەیان لەگەڵ دەکرد و لەلایەکی دیکەش جگەرەیەکی چرووتی دادەگیرساند. وتم:"کێشانی جگەرەی چرووت لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نیشانەیەکی جیاوازی بوون بە سەرکردەی سیاسییە. ئەمە لە فەلەستینییەکان‌ەوە دەستپێکرد، فاروق قەدوومی چرووتی لە دەم دانەدەگرت. لەوانەیە تۆش لەوانەوە فێری ئەم عادەتە بووبیت." تاڵەبانی یەکسەر وتی نا." راستەوخۆ لە چە گیڤارا‌وە فێر بووم. ئەو کاتەی لە قاهیرە یەکترمان ناسی، ئەو فێری کردم."

ماوەیەك ئاگای لە خۆی نەما و رۆیشت و چاوی بڕییە ئاوەکانی گەرووی ئیستانبوڵ. رێك لەبەرامبەریدا دادەنیشتم. وتم:"مام جەلال ئێمەت جێهێشت. لێرە نیت، بۆ کوێ رۆیشتی؟" وتی:"دەزانی بیر لە چی دەکەمەوە؟ ئەگەر ١٠٠کم لە سەرووی ئەو شوێنەی کە پەیدا بووم لە دایك بوایەم، دەبووم بە کوردێکی تورکیا. ئەگەر وا بوایە، لەوانەیە تەمەنم بە کارێکی بێ تامی وەك جەنگ لە شاخەکانی کوردستان یان سەفەرکردن بۆ بەغدا بۆ دانوستان لەگەڵ دیکتاتۆرێك بە ناوی سەدام تێپەڕ نەدەبوو، بەڵام لەوانەیە وەك کوردێکی بێ ناونیشان لە ئیستانبوڵ زووزوو سەیری ئەم گەرووەم بکردایە. داخۆ کەمیان باشترە؟ چارەنوسی مرۆڤ زۆر سەیرە. بیر لەمە دەکەمەوە..."

شەوێك دوای ئەوە، لە ١٩٩١/٦/١٤دا کاتێك لەدوای ئێوارەخوانی پیرۆزبایی دیداری تاڵەبانی لەگەڵ تورگوت ئۆزال لە ئەنقەرە و "کرانەوەی لاپەڕەیەکی مێژوویی نوێ" لە ریستۆرانتی یەحیا بەرەو هۆتێلی هیلتۆن دەگەڕاینەوە، بەهۆی نزیکبوونەوەی وادەی کۆنگرەی پارتی دایکی نیشتمان ANAP، لایەنگرانی یلدرم ئاکبولوت (ئەو کاتانە سەرۆك وەزیر و سکرتێری گشتی ANAPبوو) هۆتێلەکەیان پڕ کردبوو. جەلال تاڵەبانی لە کادیلاکەکە دابەزی و دانەبەزی یەکسەر دروشمی تێکەڵاوی کوردی - تورکی‌یان بۆ وتەوە. "میللییەت، ئازادی" ئەو ئەندامانەی کۆنگرەی ANAP کە هاتبوونە بەردەم تاڵەبانی زۆربەیان خەڵکی باشوور و باشووری خۆرهەڵات بوون. باوەشیان بە تاڵەبانی‌دا دەکرد و ماچیان دەکرد. هەندێکیان بە

گاڵتەوە دەیانگوت" با تاڵەبانی لە دیاربەکر خۆی کاندید بکات." تاڵەبانی‌ش بە پێکەنینەوە وتی:" نا." دەستی بۆ د. موزەفەر کە لە تەنیشتیدا بوو، درێژ کردەوە و وتی:" لەگەڵ دکتۆردا پێکەوە لە کەرکوك خۆمان کاندید دەکەین."

جەلال تاڵەبانی پانزە ساڵ دوای یەکەم دیداری لەگەڵ تورگوت ئۆزال سەرکۆماری تورکیا، بوو بە یەکەم سەرکۆماری هەڵبژێردراوی مێژووی عێراق (ئەگەر مێژووی پێنج هەزار ساڵەی میزۆپۆتامیا‌یشی پێ زیاد بکرێت) و د. موزەفەر ئارسلان‌ی وەك راوێژکاری خۆی بۆ کاروباری تورکمانەکان دەستنیشانکرد. هەڵبەتە لە ١٩٩١/٦/١٤دا هیچ کام لە ئێمە، نە تاڵەبانی و نە د.موزەفەر و نە ئێمە، کەسمان ئەوەمان بە بیر نەدەهات کە رەوتی مێژوو بەوجۆرە پێش دەکەوێت. سێ مانگ بەر لەو کاتە هەواڵی هاتنی نهێنی تاڵەبانی بۆ تورکیا وەك بۆمبێك دەنگی دابووەوە، بەڵام لەو سەردانەیدا بۆ کوێ دەچوو، لەشکرێکی رۆژنامەنوس بە دوایەوە بوون و لە کۆڵانەکانی تورکیا چەپڵەیان بۆ لێدەدا.

تورگوت ئۆزال بە پشتبەستن بە پێشبینییە وردەکانی خۆی لەبارەی داهاتووی عێراق، سوور بوو لەسەر بەرقەرارکردنی پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان‌ی عێراق و تەنانەت سیاسەتی خۆ نزیککردنەوە لەگەڵیان پێڕەو بکات. هەنگاوێکی لەو جۆرەش، بەشێوەیەکی سروشتی لەگەڵ بنەماکانی دامەزراندنی کۆماردا ناکۆك بوو. تورکیا لەگەڵ راگەیاندنی کۆمار‌دا، وەك "دەوڵەتی نەتەوەیی تورك"دامەزرابوو. بەو حاڵەی خۆیشیەوە لە"دەوڵەتی نەتەوەیی تورك"دا جێگەی کوردەکان نەدەبووەوە. کوردەکان لەسەرەوەی ئامانجەکانی سیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەیی تورك‌دا بوون و لە ساڵی ١٩٢٠کانەوە بۆ ماوەی دەیان ساڵ، نکۆڵی لە هەبونیان کرابوو. بەرقەرارکردنی پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان‌ی عێراق، ئەویش لە ئاستی کۆشکی چانقایا، یەکێك لە گەورەترین تابۆکانی رژێمی کۆماری دەشکاند. تورگوت ئۆزال چۆن دەیتوانی ئەمە بکات؟

لەدوای شیکردنەوەکەی لەسەر داهاتووی عێراق، تورگوت ئۆزال بۆ خۆی ئەو نیگەرانییەی هێنایە سەرزمان و وتی:"دەمەوێ ئەم هەنگاوە بنێم، بەڵام نازانم چۆن بۆ ناوخۆ باسی بکەم؟ کێشە لێرەدایە."

من یەکێك بووم لەو کەسانەی کە پێموابوو دیواری چین لە نێوان تورکیا و پێگەی خەڵکی"باکووری عێراق"دا نیە کە لەو دیو سنورەکانەوەن. ئەوەم دەزانی کە سنوری عێراق - تورکیا، سنورێك نیە کە تورك و عەرەب لێك جیا کاتەوە، بەڵکو سنورێکە کە کوردەکان‌ی دابەشکردووە. ئەو راستییەشم دەزانی کە هەر جۆرە نزیکایەتییەك لەگەڵ کوردەکان‌ی عێراق، بە شێوەی راستەوخۆ بە کێشەی کورد لە ناوخۆی تورکیا دەبەسترێتەوە. ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە لە ناو وڵاتێکدا کە دەیان ساڵ بوو درێژەی بە گوتاری نکۆڵی کردن لە کوردەکان دەدا، تەنانەت خۆ دەپارێزرا لەوەی کە بە کوردەکان‌ی عێراق‌یش کورد بگوترێت. بە شێوەیەك کە سوکایەتی تێدابوو، تەنها بە "پێشمەرگەکان" ناوزەد دەکران. هەرچەندە وشەی "پێشمەرگە"

واتای فیدایی دەدات و لە زمانی کوردی دا وشەیەکی قورس و پڕ لە ڕێزە کە بۆ ناونانی ئەو هێزە چەکدارانە بەکارهاتووە کە ساڵانێکی دوورودرێژ لە عێراق دژی حکومەتی بەغدا جەنگاون، بەڵام لە تورکیا وشەی "پێشمەرگەکان" زیاتر بۆ ناونانی ئەو کەسانە بەکاردەبرێت کە دوای کیمیابارانی هەڵەبجە لە ١٩٨٨ پەنایان بۆ تورکیا هێنا و جلوبەرگی کوردەوارییان لەبەر دابوو. بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیەش لە تورکیا، هەم نیگایەکی بچووك بینینی کوردەکان ی لەلایەن تورکەکان ەوە تێدایە و هەم بۆ ئەوە بوو کە وشەی کورد بەکار نەهێنرێت. بەو پێیەی کە لای ئێمە"پێشمەرگەکان" نەبوون، دەبوو تەنانەت وشەی کورد بۆ ئەوانەی عێراق یش بەکارنەهێنرێت و وادیاربوو کە بەکار نەهێنانەکەیشی ڕۆڵێکی ئاسانکارانەی لە تورکیا دەگێڕا.

کاتێکی زۆر بوو ئەو زانیاری و تێبینییانەم لا هەبوو کە زۆر لەملاولا باسم نەدەکردن، بەڵام ئەو کاتەی کە تورگوت ئۆزال باسی نیگەرانییەکەی خۆی کرد، وەك تیشکێك بە خێرایی بە مێشکمدا تێپەڕ بوون و بە هێز وەرگرتن لەو قسە سووری و نیازپاکییەی کە سەرکۆمار هەر لە سەرەتای قسەکانمانەوە تا ئەو کاتە هەیبوو، رستەیەکی زۆر سادەم لێ پرسی:" ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزینەوە، بە ئاسانی دەتوانین ئەو نیگەرانییە چارەسەر بکەین: لە تورکیا کورد هەیە یان نا؟" ئۆزال وەك ئەو کەسانەی کە هۆشیان لەسەر خۆیان نیە، لە کاردانەوەیەکدا وتی:" یەعنی چی هەیە یان نا، بە دڵنیاییەوە هەیە."

وتم:" هەرکەس دەزانێ هەیە، پرسیارەکە ئەوە نیە. ئایا وەك سیاسەتی دەوڵەت، لەمەودوا هەبونی کوردەکان قبوڵ دەکرێت یان نا؟ ئەگەر قبوڵ بکرێت، ئەو کێشە و گرفتانەی کە باستان کرد بە ئاسانی چارەسەر دەکرێن."

گوزراشتێکی مناڵانە لەسەر ڕوومەتی ئۆزال دەرکەوت و وتی:"چۆن؟"

بەمجۆرەش باسی "چۆن"ییەکەم بۆ کرد:

" ئەگەر دان بەوەدا بنێین کە بەشێك لە هاوڵاتییەکانی تورکیا کوردن، ئەو کاتە دەبێ ئەوەش قبوڵ دەکەین کە کوردەکان ی عێراق یش هاونەژادی کوردەکان ی خۆمانن. جگە لەوە، حەفتا ساڵ بەر لە ئێستا سنوری عێراق - تورکیا نەبووە. بەو پێیەش دەستەواژەیەك بە ناوی کوردەکان ی تورکیا - کوردەکان ی عێراق یش نەبوو. ئەو کوردانەی کە ئێستا لە دوو دیوی سنورەکانەوەن، هاوڵاتی یەك دەوڵەت بوون. کوردەکان ی عێراق، حەفتا ساڵ بەر لە ئێستا هاوڵاتی ئێمە بوون. بۆچی ئێمە گرنگی بە تورکەکان ی تراکیا ی خۆرئاوا و بولغاریا دەدەین؟ یەکەمیان هاوڵاتی یۆنان و دووەمیشیان هاوڵاتی بولغاریا ن. ئێمە داوای خاك لەو دوو وڵاتە ناکەین، بەڵام گرنگی بە تورکەکان ی ئەو وڵاتانە دەدەین. سەلامەتی ئەوان دەکەینە پرس بۆ خۆمان. لە سەرەتای ئەم سەدەیدا باوباپیران و دایە گەورەی زۆربەمان لەو خاکانە لە چوارچێوەی شوناسی عوسمانلی دا ژیاون. هەرچەندە سنورەکان ئێمەیان لەوانەی ئەوێ جیا کردبێتەوە، بەڵام ئەوانەی لەوێن

هاونەژادی هاوڵاتییەکانی ئێمەن. بە دڵنیاییەوە گرنگییان پێ دەدەین. بۆچی ئێمە گرنگی بە تورکەکان'ی قوربرس دەدەین؟ لەبەر ئەوە نیە کە هاونەژادمانن؟ ئەگەر ئێمە هەبونی هاوڵاتییە کوردەکان'مان قبوڵ بکەین، پێویستە ئەوەش قبوڵ بکەین کە کوردەکان'ی عێراق'یش بۆ ئێمە، وەك تورکەکان'ی تراکیا'ی خۆرئاوا و بولغاریا و قوبرس وان."

تورگوت ئۆزال زۆر بە وردی گوێی لێ دەگرتم. وتی:"ئادەی بیڵێرەوە." تا ناوەڕاستی دووبارەکردنەوەی قسەکانم هاتبووم کە قسەکەی پێ بڕیم و بە ئاماژەی دەست کە بە جۆرێك متمانەبەخۆبوونی ئەوی پیشاندەدا، وتی:" تەواوە. من دەتوانم ئەمە بەکار بێنم."

لە راستیشدا دوو هەفتە دواتر، کاتی لە تەلەفزیۆنەوە سەیری قسەکانی تورگوت ئۆزال'م لە دیاربەکر دەکرد، گوێم لێ بوو کە وتی:" کوردەکان'ی عێراق هاونەژادی هاوڵاتییەکانی ئێمەن، بەدڵنیاییەوە گرنگیان پێ دەدەین." ئۆزال زوو زوو ئەمەی بەکارهێنا و وەك ئەوەی قسەی ئەو بێت بە ناوی ئەویشەوە تۆمارکرا.

چەند مانگ دوای ئەو قسە و باسانەمان، ئۆزال گازندەی لەو کەسانە دەکرد کە رەخنەیان لە سیاسەتەکەی دەگرت و وتی:" تێناگەن کورە! ئەم کوردانەی عێراق هاونەژادی هاوڵاتییەکانی ئێمەن. ئەگەر ئێمە گرنگییان پێنەدەین، کێ گرنگییان پێ بدات..."قسەکەیم پێ بڕی و وتم:" ئەفەندم! من ئەو قسەیەم بە ئێوە گوتبو." بە ژێستێکی ئۆتۆریتەرانەوە وەڵامی دایەوە و وتی:" ئێستا گوێ بگرە. باسی شتێکت بۆ دەکەم..." یەکسەر تێگەیشتم کە دەیەوێ بڵێت مافی خاوەنداری دەستەواژەی"هاونەژادی هاوڵاتییەکانمان" هی ئەوە و پێویستە فەرامۆشی کەم کە ئەو قسەیە هی من بووە. ئەو سەرکۆمار بوو. کاتی ئەو باسی دەستەواژەیەکی وەها بکات، دەبێتە شتێکی باو. من ئەگەر لەو رێگایانەدا خۆیشم بسوتاندایە و تا بەیانی باسی ئەوەم بکردایە کە"کوردەکان'ی عێراق هاونەژادی هاوڵاتییەکانی ئێمەن" چ ئەنجامێکی لێ دەکەوتەوە؟

هەق بەو بوو.

منیش دوای ئەوە جارێکی دیکە پێداگریم لە خاوەندارێتی ئەو دەستەواژەیە نەکرد. لە بەروارێکی دواتریشدا، دیسان لە سەر پرسیەکی خاوەنداری، کێشەیەك لە بەینماندا دروستبو، بەڵام وەك جارەکەی پێشوو دیسان ئەو مافی خاوەندارییەکەی برد.

لەکاتی رۆیشتنیدا بۆ کۆشکی چانقایا، دەسەڵاتی رەهای تورگوت ئۆزال سنوردار بوو. بەڵام هەتا هەڵبژاردنی ١٩٩١/١٠/٦ وەك "بەهێزترین"ی تورکیا مایەوە. لە هەڵبژاردنەکاندا، نەك تەنها حزبەکەی (دایکی نیشتمان) بوو بە ئۆپۆزیسۆن، بەڵکو سولەیمان دەمیرەل کە وەك دوژمنێکی بێ ئامانی سیاسی ئەوی لێهاتبوو، لەگەڵ ئەردال ئینەنۆ هاوپەیمانییەکی دروستکرد و لەسەر کورسی سەرۆك وەزیران دانیشت. رۆژانی سەخت و نالەباری ئۆزال دەستیان پێکردبوو. شەش رۆژ لەدوای هەڵبژاردن لە ١٠/١٢دا منی بۆ

کۆشك بانگ کرد. ئەمجارەیان بۆ ژووره رەسمییەکەی نەبوو، بەڵکو بۆ شوێنی حەوانەوەی لە نهۆمی سەرەوە بوو. سەمرا'ی هاوسەری بۆ ئیستانبوڵ چوو بوو. منیش بۆ یەکەمجار لە دوانیوەڕۆی ئەو رۆژەدا دەچوومە شوێنی حەوانەوەی ئۆزال. لەوێ بە تەنها بووین. تیشێرتێکی لەبەردابوو. پێشوازی لێ کردم و وتی با پێکەوە سەیری یاری تۆپی پێ بکەین. بڕیاربوو یاری فەنەرباخچە - ترابزۆن سپۆر بکرێت. (فەنەرباخچە ئەو یارییەی بە ٤-١ بردەوە) لەلایەکەوە سەیری تەلەفزیۆنمان دەکرد و لەلایەکی دیکەش قسەمان دەکرد. زۆرتر باسی تۆپی پێ و سیاسەتمان دەکرد.

کاتێ پشووی خولی یەکەمی یارییەکە دەستی پێکرد، کتوپڕ پرسیارێکی کرد کە ئەو کاتە بە مێشکی مرۆڤدا نەدەهات و وتی:" چی دەڵێی، ئەم کێشەیە چۆن چارەسەر دەکرێت؟"

منیش وتم:" کام کێشە؟"

-"کێشەی کورد!"

لە ١٥خولەکی پشووی یاری فەنەرباخچە - ترابزۆن سپۆر'دا چارەسەری گرنگترین کێشەی تورکیا'مان دەدۆزییەوە کە بە دەیان ساڵ چارەسەر نەکرابوو؟!

بەڵام سەرکۆمار بەهۆی "فاکتەری دەمیرەل'ی سەرۆك وەزیر"ەوە رۆژانێکی سەختی تێپەڕ دەکرد و لە حاڵێکدا نەبوو گاڵتەی لەگەڵ بکرێت.

دوای راوەستانێکی کورت وتم:" هەرچی بڵێم فایدەی نییە."

-"بۆچی؟"

-"چونکە هاوسەنگییە سیاسییەکانی تورکیا رێگا بە جێبەجێکردنی ئەو شتانە نادەن کە لە مێشکی مندان. دیارە، سوپا و ئەوان."

-"چی لە مێشکت دایە؟"

-"بۆ نمونە دەکرێت لە کەناڵێکی TRT وە رۆژانە چەند کاتژمێرێك پەخشی کوردی هەبێت. ئەگەر گورانی کوردی بڵاو بکرێتەوە و لەکاتی هەواڵیشدا، وەك ئایتاچ کاردووز (یەکێك لە پێشکەشکارە بەناوبانگەکانی ئەو کاتەی تی ئاڕ تی بوو) پێشکەشکارێك بە زمانی کوردی هەواڵەکان بخوێنێتەوە، ئەمە واتای چی دەدات؟ ئەو کاتە هاوڵاتییە کوردەکان'ی ئەم وڵاتە دەڵێن، دەوڵەت هەبوون و شوناسی من قبوڵ دەکات و رێزم لێ دەگرێت. بۆیە لە رادیۆ و تەلەفزیۆنی دەوڵەتدا هەمو رۆژێك لە هەندێك کاتژمێری دیاریکراودا بە زمانی دایکی من پەخش دەکات. دیارە ئەمە کێشەی پ.ك.ك کۆتایی پێ ناهێنێت. تەنها لەبەر ئەوەی کە دەوڵەت پەخشی کوردی دەستپێکردووە، یەکسەر تیرۆر کۆتایی نایەت و پ.ك.ك لە ناو ناچێت. بەڵام ئەو پەردەیە لادەچێت کە هاوڵاتییە کوردەکان'مان پارتی کرێکارانی کوردستان'ی پێ دادەپۆشن. لەوانەیە ئاستی کێشەکە

کەم بێتەوە..."

تورگوت ئۆزال نەیهێشت قسەکەم درێژە پێ بدەم و وتی:" سەیر کە! ئەو قسانەی کە ئێستا بۆ منت کرد، لە هیچ شوێنێك تەنانەت بە ڕێی ئاماژەیشەوە باسیان مەکە و لە هیچ نوسینێکیشدا ئاماژەیان پێ مەکە. ئەو قسانەی کردت فەرامۆشیان بکە."

سەرم سووڕمابوو. پرسیارێکی سادەم لێکرد و وتم:"بۆچی؟"

-"لەبەر ئەو هۆیانەی کە تۆزێك بەر لە ئێستا بە منت گوت. لەبەر هاوسەنگییەکانی سیاسەتی ناوخۆی تورکیا. سوپا و..."

لەو بەینەشدا یارییەکە دەستی پێکردەوە و چاومان بڕییە تەلەفزیۆنەکە و ئیدی باسی ئەو کێشەیەمان نەکرد.

نزیکەی ساڵ و نیوێك تێپەڕ بوو. ئۆزال لە نیسانی ١٩٩٢دا لەبەر شێرپەنجەی چرووتستات بەرەو ئەمریکا دەچوو. بەر لەوەی لە ئیستانبوڵ سواری فڕۆکە بێت وتی:"چی دەبێ ئەگەر لە کەناڵێکی TRTدا، بۆنمونە لە GAP دا رۆژانە چەند کاتژمێرێك پەخشی کوردی هەبێت؟" و بەوجۆرەش ئاگری لە پلێتەی بۆمبێك بەردا و لە رۆژەڤی تورکیا داینا و خۆیشی بەرەو ئەمریکا بە ڕێ کەوت.

کێ دەچووە سەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان، دەیگوت ئەم لێدوانەی سەرکۆمار وڵات دابەش دەکات و تەنانەت هەندێك کەس گومانیان دەخستە سەر باری عەقڵیی سەرکۆمار و رەخنەی توندیان لێ دەگرت. مەسعود یڵماز سەرۆکی نوێی پارتەکەی ئۆزال (پارتی دایکی نیشتمان)یش چوو بووە ریزی ئەو کەسانەی کە سەرکۆماریان تۆمەتبار دەکرد.

لێدوانەکەی ئەوەندە دەنگی دابووەوە کە چەند رۆژ دواتر، من و چەند رۆژنامەنوسێکی دیکە بە دوایدا بەرەو نیۆیۆرك رۆیشتین. دەمانویست بەر لەوەی لە واشنتن دەست بە دانوستانە سیاسییەکانی بکات و بەر لەوەی لە نەخۆشخانەی هۆستن نەشتەرگەری بۆ بکرێت، لە نیۆیۆرك ببینین و لێدوانی لێ وەربگرین.

لەگەڵ خوالێخۆشبوو د. پاڵچن ئویزەر نوێنەری ئەنقەرە'ی ئەو کاتەی رۆژنامەی تورکیە و فەهمی کوروو نوسەری رۆژنامەی زەمان، لە هۆتێلی The Plazaی نیۆیۆرك کە سەرکۆمار'یش لەوێ بوو، ژوورمان گرت. لە میوانییەکدا کە لەسەر شەرەفی ئەو لە خانەی تورك لەبەرامبەر بینای نەتەوەیەکگرتووەکان رێکخرا بوو، بینیمان. کاتی منی بینی بە گاڵتەوە وتی:"لە کوێوە دەرکەوتن؟"

وتم:" بەر لەوەی لە تورکیا دەرکەون، بومبێکتان دانا. تورکیا زۆر ئاڵۆز بووە، پێویستە قسە بکەین."

داوای کرد سامی کۆهن کە ریش سپی رۆژنامەنوسانی بواری سیاسەتی دەرەوە بوو، لە خۆمان بەرین و لە هۆتێل سەردانی ژوورەکەی بکەین.

دیدارێکی خۆش بوو. پاڵچن ئویزەر زۆر حەزی لە سەرکۆمار دەکرد و ئۆزال'یش ئەوی خۆش دەویست. د. پاڵچن ئویزەر پشتیوانی ئۆزال'ی دەکرد، بەڵام ئەو نوێنەری رۆژنامەیەکی رۆژانە بوو کە رووی دەمی لە نەتەوەگەراکان دەکرد. لەلایەکەوە دەیویست ئۆزال بپارێزێ و لەلایەکی دیکەشەوە دەیویست هەستیاریی خوێنەرانی رۆژنامەکەی پیشانبدات. وتی:" بەڕێز سەرکۆمارم! هەندێك دۆستی بە رەچەڵەك کورد'مان هەیە کە ئێوەیان زۆر خۆش دەوێت. دوایین لێدوانی ئێوە ئەوانی زۆر دڵگران کردووە. دەڵێن ئێمە کوردبوونی خۆمان فەرامۆش کردبوو، بەڵام سەرکۆمار'ەکەمان ئەو لێدوانەی داوە، ئێستا نازانین چی بکەین. چۆن وەڵامی ئەوان دەدەنەوە؟"

ئۆزال وتی:"پاڵچن! بە جیدی ئەو پرسیارە دەکەی؟ بەو دۆستانەت بڵێ تەلەفزیۆن ئامێرێکی هەیە بەناوی کۆنترۆڵ. ئەگەر دەیانەوێ کوردبوونی خۆیان نەکەوێتەوە بیریان، کاتێ کەناڵێکیان بینی کە پەخشی کوردی دەکات با بچنە سەر کەناڵێکی دیکە، یان تەلەفزیۆنەکەیان خامۆش بکەن. خۆ ئێمە ناڵێین ئەو کەسانەی سەیری پەخشی کوردی ناکەن سزا دەدرێن. ئەگەر ئەمە کێشە بێت، چارەسەرەکەی ئاسانە."

تورگوت ئۆزال توانایەکی تایبەتی لە سادەکردنی کێشە ئاڵۆزەکان و وەڵامی قەناعەتپێکەردا هەبوو. لە ژووری هۆتێلەکەدا هەر چوارمان لە تەنیشت یەکدا بەرامبەری راوەستا بووین. دوای وەڵامدانەوەی پرسیارەکەی پاڵچن ئویزەر رووی کردە من و لە رواڵەتدا وەك ئەوەی کە سەرزەنشتم بکات بەڵام بۆ رابواردن، وتی:" چییە، بۆ وا سەیرم دەکەی؟ دەزانم چی لە مێشکت دایە." منیش وتم:" ئەفەندم! من هیچم نەگوتوە." بەڵام ئەو بە پێکەنینەوە دووبارە وتی:" من دەزانم چی لە مێشکی تۆدایە."

کاتێ لە ژوورەکە دەردەکەوتین، قۆڵی راکێشام و بە چپە پێی وتم:" چەند مانگ بەر لە ئێستا کاتی تۆ ئەم باسەت بۆ من کرد، من پێم گوتی لە هیچ شوێنێك تەنانەت بە رێی ئاماژەشەوە باسی مەکە، لە بیرتە؟ من لەبەر پاراستنی تۆ ئەوەم گوت. جگە لەوە من سەرکۆمارم ئەگەر باسی ئەو شتانە بکەم، هیچ نابێ بەڵام ئەگەر تۆ باست بکردایە، شت رووی دەدا. هەموو شتێکیش کاتی خۆی هەیە. گرنگە کە بزانی کەی چی دەڵێی. تەوقیت گرنگە."

لە راستیدا دەبڕینی بیرۆکەی پەخشی کوردیی تەلەفزیۆنی دەوڵەت لەلایەن ئۆزال'ەوە، تەنها لەبەر ئەوە نەبوو کە لە مانگی ١٠ی ساڵی ١٩٩١دا لە وەڵامی پرسیارێکی ئەودا من پێم گوتبو و ئەویش وەك سەرکۆمار باسی کردبوو. بەڵکو هۆکارەکەی بۆ بیرکردنەوە قووڵەکانی تورگوت ئۆزال دەگەڕایەوە. لە هاوینی ١٩٩٢دا لە گوندی ئۆکلوك لە نزیك مارماریس، لە پشوویەکی هاوینەدا باسی ئەو هۆکارانەی بۆ کردبووم.

ئەو پێیوابوو پارتی دایکی نیشتمان کە بۆ خۆی دایمەزراندبوو، تەنانەت بۆ خۆی ناو و ئارمەکەیشی دەستنیشانکردبوو، لە ژێر دەسەڵاتی مەسعود یڵماز'دا لە ئامانجەکەی خۆی لایداوە و زۆریش لەمە نیگەران

بوو. لە نزیکایەتی مەسعود یڵماز بەرامبەر بە کێشەی کورد زۆر دڵگران بوو. ئەو بەشەی دیدارەکەمان کە من تۆمارم کردبوو، بەمجۆرەیە:

"بیرۆکەیANAP خاوەنداریکردن لەو مرۆڤانەیە کە لە باشووری خۆرهەڵات'دان. نابێ تیرۆر تێکەڵاوی ئەمانە بکرێت. تەنانەت دەکرێت کەسانێکیش هەبن کە بە بێئەوەی خۆیان تێکەڵ بە تیرۆر بکەن، بیرۆکەی جیاخوازانەیان هەبێت. ڕەوتی نەتەوەگەرایی گەشە دەکات. بۆ ئەمەش پێویستە هەلومەرجی گفتوگۆی ئازاد بڕەخسێندرێت. ئەگەر بیرۆکەی ژەهراوی لە GAP TV دا هەیە، پێویستە بە ئاشکرا قسەی لەسەر بکرێت. من دژی بیرۆکەی فیدراسیۆنم. نەمگوتوە با قسە لەسەر فیدراسیۆن بکرێت. ئەگەر فیدراڵی هەبێت هیچ یەك لەو سەرمایەگوزاری و وەبەرهێنانانە ناکرێن کە ئێستا لە باشووری خۆرهەڵات دەکرێن. کەسانێك لە ئیدل'ەوە هاتوون و لە بورسا نیشتەجێن، هەروەها کەسانێك لە قارس و وان و ماردین هاتوون و لە ئانتالیا و مارماریس نیشتەجێ بوون. پرسیار لەوان دەکەم: دەتانەوێ بگەڕێنەوە، دەڵێن نا ئێرە خۆشە. ئەی ئەگەر سبەی فیدراڵی هەبێت؟ هەندێك دەڵێن ئەگەر لەGAP TVدا پەخشی کوردی هەبێت، سبەی دو سبەی داوای پەروەردە بە زمانی کوردی'ش دەکەن. قەیدی چییە، لەوانەیە. ئەگەر خوێندکاریان دەسکەوێت، ئەوەش دەکرێت.

ئەوەی تیرۆر بە خێو دەکات، بیرۆکەیە. ئەوانەی پشتیوانی تیرۆر دەکەن، لەنێو هاوڵاتیانی ئێمەوە دەردەکەون. با ئەوە قبوڵ بکەین کە بە پێدانی پارە ناکرێت. لێرەدا بیرۆکە و فیکر هەیە. کەواتە لە ناوەڕۆکی پرسەکەدا پێکدادنێکی فیکری هەیە. بە چەك ناتوانی دژی فیکر دەرکەویت. ناچاری ئەو مافە ئەتنییانە بدەیت کە لە دنیای ئەمڕۆدا باون و دەدرێن."

سەرکۆمار لە ڕێی شێوازی سادەی بیرکردنەوە و زمانی خۆیەوە دەیگوت کێشەی کورد بە تەنها کێشەیەکی ئەمنی نیە و لە ڕێی وتنی"بە پێدانی پارە ناکرێت" دژی ئەو چەمکەش دەردەکەوت کە پێیانوابوو کێشەی کورد پرسیەکی ئابوریە و بە کێشەی "ئیش و ئاش" ناویان دەبرد. لەوەش زیاتر ئەوەی دەگوت کە پرسی تیرۆر بە ڕێی سەربازییەوە چارەسەر ناکرێت و درکی بە ئایدۆلۆژیای نەتەوەگەرایی پشت ڕووداوەکە کردبوو. ئەو دەیویست پەخشی کوردی لە کەناڵیGAP ی TRT بکاتە شوێنێك بۆ "تێکۆشانی فیکری."

تورگوت ئۆزال لە نزیکەوە گرنگی بە تەکنەلۆژیا دەدا و ئاگای لە پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەکان هەبوو. بۆیە پێیوابوو کە ئەگەر لە بەروارەکانی دواتردا پەخشی کوردی دەستپێبکات، ئەوا لە ڕووی سیاسییەوە ئەنجامێکی ئەوتۆی لێناکەوێتەوە. لەو بارەیەشەوە هەق بەو بوو. زۆری پێنەچوو تەنانەت لە دووردەسترین شوێنەکانیشدا کوردەکان لە ڕێی دانانی ئانتێنێکەوە توانیان سەیری MED TV و دواتریش ROJ TVی پ.ك.ك بکەن. لە نیوەکانی ساڵانی نەوەدەکانەوە، چەندین کەناڵی کوردی لە کوردستان'ی عێراق دەستیان

بە پەخش کرد. پێشتریش پەخشی کوردی دەنگی ئەمریکا و رادیۆی کوردی لە ئێریڤان'ی پایتەختی ئەرمەنستان'یش هەبوون.

لە دیدارەکەی مانگی ١٠ی ٢٠٠٨مدا لەگەڵ ژەنراڵ ئیلکەر باشبوغ، ناوبراو لە بەشێکی دیدارەکەدا پێی گوتم کە بیرۆکەی پەخشی کوردی تەلەفزیۆنی TRT هی ئەوە و ئەو حکومەتی هانداوە پەخشی کوردی دەستپێبکات." من حکومەت هاندەدەم کە پەخشی تەلەفزیۆنی کوردی دەستپێبکات. لە جیاتی ئەوەی هاوڵاتیان سەیری ROJ TV بکەن یا گوێ لە من بگرن." لەو دیدارە کە زۆر بە کەمیی قسەکانی ئیلکەر باشبوغ'م دەبڕی، وەك ئینگلیزەکان دەڵێن(too little, too late) منیش وتم:" شتێکی کەمە، بەڵام هەبوونی لە نەبوونی باشترە."

شەرەفی خاوەنداری بیرۆکەی پەخشی تەلەفزیۆنی کوردی'م هەبوو کە تورگوت ئۆزال هێنایە سەرزمان و بەوەش تیری رەخنەکانی رووبەڕووی خۆی کردەوە و شانزە ساڵ دواتریش بە تەئخیرەوە تازە فەرماندەی گشتی سوپای تورکیا دەیویست ئەو شەرەفە بۆ خۆی بەرێت. کاتی زۆر بە فیرۆ درابوو. لەو بەینەشدا بە تایبەتی بەهۆی رووداوەکانی عێراق'ەوە هەلومەرجی کێشەی کورد گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتبوو. لەبەر ئەوەش کاریگەری پەخشی TRT بە کوردی، بە ئەندازەی ئەو کاریگەرییە ئیحتمالییە نەدەبوو ئەگەر لە سەرەتای نەوەدەکانەوە دەستی پێبکردایە. بۆیە ئەو بڕیارەی کە لە ١٩٩١-١٩٩٢دا بڕیارێکی زۆر رادیکاڵ بوو، لە ٢٠٠٨-٢٠٠٩دا بوو بە بڕیارێك کە (too little, too late) بەهایەکی زۆری نەبوو.

ئەو پەخشی کوردییەی تەلەفزیۆنی دەوڵەت کە تورگوت ئۆزال لە نیسانی ١٩٩٢دا باسی کرد، لە ٢٠٠٩/١/١دا کرا. هەندێك لە پەرلەمانتارەکانی پارتی داد و گەشەپێدان کە ئەو کارەی کرد، لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا کە باسی ئەو بابەتە دەکرا، پێیانگوتم :" ئەگەر ساڵانێك بەر لە ئێستا ئەمەیان بکرایە، رێ لە کوژرانی هەزاران مرۆڤ دەگیرا."

لە ماوەی سێ مانگی نێوان سەردانە نهێنییەکەی تاڵەبانی لە ٩-١٠ی مارت هەتا سەردانەکەی ٩ی حوزەیران'ی بۆ ئیستانبوڵ، هەندێك پێشهاتی نائاسایی روویاندا کە تا ساڵانێکی دواتریش کاریگەرییەکانیان هەر بەردەوام بوون. ئەو کاتەی تاڵەبانی بە نهێنی هاتە ئەنقەرە، راپەڕینی شیعەکان'ی عێراق لە بەسرە دەستیپێکردبوو. دواتریش ناوەندە شیعییەکان'ی وەك نەجەف، کەربەلا و ناسریە'ی لە باشووری بەغدا گرتەوە. دوابەدوای ئەوەش راپەڕینی کورد دەستیپێکرد و هەموو شارەکانی باکووری عێراق، لە سەرووی هەموشیانەوە کەرکوك رزگارکران و دەست کوردەکان کەوتن. سەدام حسێن کە لە بەغدا دەستی بە کورسیی دەسەڵاتەوە گرتبوو، لە پێش چاوی هێزەکانی ئەمریکا لە وڵاتەکەی، بە توندی هەردوو راپەڕینەکەی سەرکوت کرد و کارەساتێکی گەورەی پەنابەریی روویدا. یەك ملیۆن کورد بە برینەکانی قەتڵوعامی هەڵەبجە

لە ساڵی ١٩٨٨و زامەکانی پرۆسە بەردەوامەکانی ئەنفال'ەوە، سەرەڕای هەلومەرجی نالەبار و بێ ئامانی زستان پەنایان بۆ ئێران و تورکیا برد. دیمەنی ٥٠٠هەزار پەنابەری کورد لە ڕێی شاشەی CNNوە لەنێو هەموو ماڵەکانی دنیا پیشاندرا.

لەگەڵ ئەوەشدا حکومەتی تورکیا نەیدەتوانی ئەو سەدان هەزار کورد'ە بگرێتە خۆی کە روویان کردبووە وڵاتەکەی. بە هەمان شێوە نەیدەتوانی وەك دراوسێیەك لەگەڵ سەدام حسێن رەفتار بکات کە وەك دوژمنی لێهاتبوو. تورگوت ئۆزال بە ئەمریکاییەکان'ی راگەیاند کە ئەگەر چارەیەك نەدۆزنەوە، تورکیا دەچێتە باکووری عێراق و بۆ گەڕانەوەی کوردەکان بۆ سەر ماڵ و حاڵی خۆیان کار دەکات. جۆن مێجر سەرۆك وەزیری بەریتانیا پێشنیاری دامەزراندنی ناوچە ئارام/ پارێزراوەکانی(Safe Havens) کرد. لە دوای ئەوەش ئەمریکاییەکان کەوتنە جوڵە و ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە هێڵی هاوتەریبی ٣٦ لە باکووری عێراق، ناوچەی دژەفڕینی بۆ رژێمی سەدام راگەیاند و جموجوڵی سەربازیشی لەو هێڵە قەدەخە کرد. هێزی وشکانی هاوپەیمانی نێودەوڵەتی لە سێگۆشەی زاخۆ -دهۆك - ئامێدیە لە باکووری عێراق جێگیرکران و لە بنکەی سەربازی ئینجەرلیك'ەوە بە بەردەوامی دەست بە چاودێریکردنی مەیدانی ئاسمانی باکووری عێراق کرا.

لە سەرەتاکانی ئەو کارەدا کە هەژمونی سەدامی لە باکووری عێراق سنوردار دەکرد و بە(Operetion Provide Comfort) دەناسرا، تابلۆیەکی سەیر و سەمەرە دەرکەوت. هێزەکانی سەدام هێشتا لە سلێمانی و هەولێر دوو شارەی گەورەی کوردی مابوونەوە و موسڵ کە زۆربەی دانیشتوانەکەی عەرەبی سوننە بوون، لەبەر ئەوەی لە سەر هێڵی ٣٦بوو بە ناوچەی دژە فڕین لە قەڵەم دەدرا. هەتا ئەو کاتەی کە سەدام لە مانگی ١٩٩١/١٠دا بۆ گەمارۆ خستنە سەر باکووری عێراق هێزەکانی کشاندەوە، ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو. لەو کاتەشەوە کوردەکان حوکمی هەولێر و سلێمانی'یان کرد و بە تەواوی لە ژێر دەسەڵاتی سەدام دەرکەوتن.

لە نیسانی ١٩٩١دا رووداوی سەرسووڕهێنەری وەها روویاندەدا و بارودۆخی کوردەکان'ی عێراق پڕ لە نائومێدی بوو. ملیۆنان کەس گەیشتبوونە سنووری برسێتی و کێشەی ئەمنی لە ئاستێکی بەرزدا بوو. لە کۆتاییەکانی نیساندا، دیمەنی باوەشکردنی جەلال تاڵەبانی و سەدام حسێن بە یەکتریدا لە هەموو تەلەفزیۆنەکانی دنیا بڵاوکرایەوە. بڵاوبوونەوەی دیمەنی باوشکردن و یەکتر ماچکردنی سەدام و ئەو سەرکردەیەی کورد کە چەند هەفتە لەوەوبەر لە شارە رزگارکراوەکانی کوردستان،ی عێراق گوتاری ئەوەی دەدا کە بەرەو بەغدا پێشڕەوی دەکەن و سەدام راو دەنێین، شۆکێکی گەورەی دروستکرد.

تورگوت ئۆزال شێت ببوو. شەوی٢٠ی نیسان لە پشووی جەژندا، بێئەوەی کەس بزانێت لە ماڵی

هاوڕییەکم بووم لە قوبرس، بەڵام تورگوت ئۆزال پەیدای کردبووم و لە نیوەشەودا تەلەفۆنی بۆ کردم. دەیگوت:"ئەوە چی دەکات!" تاڵەبانی نزیکەی مانگێك لەوەوپێش هاتبووە تورکیا بەڵام هێشتا چاوی بە تورگوت ئۆزال نەکەوتبو. دیدارەکەی لەگەڵ سەدام وەك ئەوە وابوو کە دینامیت بخاتە ژێر پەیوەندییەکانی تورکیا و کوردەکان ی عێراق کە خەریکبوو چەکەرەی دەکرد. وتم:"با بزانم چی بووە." و تەلەفۆنم بۆ کامەران قەرەداخی کرد لە رۆژنامەی ئەلحەیاتی چاپی لەندەن کە هەموو شتێکی لەبارەی کوردەکان ی عێراق دەزانی و بۆ خۆیشی بە ئەسڵ خەڵکی ئەوێ بوو. ئەویش زانیاری زۆری نەبوو، بەڵام وتی تا سبەینی زانیاری وردت پێ دەگەیەنم. بە پەلە لە دوورگەوە بەرەو ئەنقەرە بە ڕێ کەوتم. کارمەندانی رێگا ئاسمانییەکانی تورك مانیان گرتبوو، بۆیە هەتا ئەنقەرە ئۆتۆمبیلم لێخوڕی. لە ٢٢ی نیساندا گەیشتمە کۆشك. کامەران پێی گوتبوم کە کوردەکان لەبەر ئەو گوشارەی کە لە سەریانە بە ناچاری لەگەڵ سەدام دانوستانیان کردووە، بەڵام تا ئەو جێگایەی کە زانیویەتی جەلال تاڵەبانی تەکتیکی"تێپەڕکردنی کات"پێڕەو دەکات و هێشتا هیوای بە گەشەپێدانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا هەیە. ئەو زانیارییانەم بە تورگوت ئۆزال دا.

بەڵام هەرچی بێت، شتێکی چاوەڕوان نەکراو روویدابوو. کوردەکان ی عێراق دەستیان بە دانوستان لەگەڵ سەدام کردبوو.

لە دیداری قایا تۆپەری و من لەگەڵ جەلال تاڵەبانی لە هۆتێلی The marmara لە شەوی ٩ی حوزەیران کە وەك ڕاهێنانێك بۆ دیداری تاڵەبانی و ئۆزال وابوو، تاڵەبانی بە قسەکردن لەسەر دانوستان لەگەڵ سەدام دەستی بە قسە کرد. ئەو کاتانە نۆرەی مەسعود بارزانی بوو کە دانوستان لەگەڵ دیکتاتۆری عێراق بکات، بۆیە سەردانی بەغدا ی کردبوو.

تاڵەبانی باسی ئەوەی کرد کە سەدام لە ساڵی ١٩٨٨ دا ١٨٢ هەزار مناڵی کوردی وەك ئەسیری جەنگ گرتووە و دواتر باسی هەلومەرجی نالەباری ژیانی لە باکووری عێراق کرد و بۆ جەختکردن لە دوورنەکەوتنەوە لە ئامانجی سەرەکی وتی:"سەدام و دیموکراسی بە هیچ جۆرێك ناگونجێن. ئێمە جوڵانەوەیەکی جیاخواز نین و بۆ پەیداکردنی پشتگیری بۆ کوردستان ی ئۆتۆنۆم، دەتوانین لەگەڵ هەر حکومەتێك دانوستان بکەین. ئەمجارەیان لەگەڵ سەدام لەسەر دیموکراسیی فرەحزبی دانوستانمان کرد. یەکەمجار کە چووم بۆ بەغدا، بۆ هەموو شتێك کە من دەمگوت دەیانگوت باشە. سەبارەت بە دەستووری نوێ وتیان دواتر و لەسەر گەڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردی وتیان ئەوە نابێت، چونکە ڕێگا بۆ سەربەخۆیی خۆش دەکات. بە پاساوی کێشەی ئەمنییەوە، بە گەڕانەوەی هێڵی شەنگال (سنجار) -خانەقین - مەندەلی[5] رازی نەبوون. بە نهێنی داوای شتی مەترسیدارمان لێ دەکەن. سەدام بۆ داژیەتیکردنی ئێران کە بە

٥ - هێشتا لەسەر ئەو ناوچانە، لە نێوان بەڕێوەبردنی کوردستان و بەغدا ناکۆکی هەیە و کوردەکان لە بەر هەبوونی زۆرینەی کوردی لەو ناچانە داوای گەڕانەوەیانە بۆ سەر خاکی هەرێمی کوردستان دەکەن.

"دوژمنی ئەزەلی" ناوی دەبات و دژایەتیکردنی تورکیا کە وەك "دوژمنی مێژوویی" سەیری دەکات و بۆ دژایەتیکردنی سوریا کە بە" دوژمنی ناوچەیی" لە قەڵەمی دەدات، داوای هاوکاری لە ئێمە دەکات. ماوەی دوو ساڵە پارمەتی پ.ك.ك دەدەن. ئەبو زیاد (تارق عەزیز) سبەینێ دێت بۆ ئەنقەرە و دەڵێت "با لە دژی کوردەکان هاوکاری یەکتر بکەین." ئێمەی کورد وەك کارت بەکار دەهێنن. بەڵام ئێمە دەست لە کاروباری ناوخۆیی وڵاتانی دراوسێ وەرنادەین. کاتێ لە بەغدا دانوستانم دەکرد، بە تارق عەزیز'م وت هەمان ئەو دیموکراسییەم پێ بدە کە لە تورکیا هەیە تا منیش واز لە داوای ئۆتۆنۆمی بهێنم..." تاڵەبانی لە باسێکەوە دەچووە سەر باسێکی دیکە و وتی:" باسی پارتی کرێکارانی کوردستان'م بۆ خەیری کۆزاکچی ئۆغلو (والی باری نائاسایی دياربەکر) کرد. لەدوایین دیدارمدا لەگەڵ ئاپۆ لە شام، وتم ئەگەر من لە جێگەی تۆ بایەم لەگەڵ حکومەتی تورکیا دانوستانم دەکرد. ئاپۆ رەخنەی لە دانوستانی ئێمە لەگەڵ سەدام گرت. پێمگوت سوود لە ئەزموونی ئێمە وەربگرە. تورگوت ئۆزال دانی بە هەبوون و زمانی کوردی'دا ناوە، ئەمە یەکەم سەرکۆمارێکی تورکیا'یە کە بەمجۆرە رەفتار بکات. پ.ك.ك دابەش بووە. چوار ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و سەدان کادیر جیا بوونەتەوە. وادیاربوو کە قسەکانم چوونەتە عەقڵی ئاپۆ بەڵام ئەو کەسێکی متمانەپێکراو نییە، دواتر پەشیمان دەبێتەوە. چۆنییەتی پێشکەوتنی بارودۆخەکە لەگەڵ پ.ك.ك، تۆزێکیش پەیوەندی بە ئێوەوە هەیە. تەنها بە ئیدانەکردنی ئەوانەوە ناگەینە شوێنێك، پێویستە قۆناخی دیموکراتیزەکردن لە تورکیا لە جوڵەدا بێت."

لەدوای پێدانی ئەو زانیارییانە دووبارە هاتەوە سەر باسی دانوستانەکانی بەغدا و وتی لەسەر تورکمانەکان لەگەڵ تارق عەزیز وەزیری دەرەوە و عیزەت دووری ئیبراهیم جێگری سەرۆکی دەستەی شۆڕش قسەی کردووە." باسی کێشەی کەمە نەتەوەکانمان کرد. تارق عەزیز وتی: کێ؟

ئێمەش وتمان: تورکمان و ئاسورییەکان.

تارق عەزیز وتی نابێ، لە عێراق تەنها کورد و عەرەب هەن. ئاسورییەکان عەرەبن، عەرەبی مەسیحی. تورکمانەکان'یش میوانن، دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ تورکیا."

تاڵەبانی وتی هیوام بەوە نییە کە دانوستانەکانی بەغدا رێکەوتنێکی لێ بکەوێتەوە و باسی ئەو کێشە و نالەبارییانەی کرد کە ئەوانی ناچارکردووە تا لەگەڵ بەغدا دانوستان بکەن:

"لە کوردستان کێشەی زۆرمان هەیە و دۆستی راستەقینەمان نییە. بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە خاکی کوردستان، حەوت رۆژ لە شام و سێ رۆژ لە قامشلۆ چاوەڕوانیم کرد هەتا بەلەمێك پەیدا بکەین بۆ ئەوەی لە رووباری دیجلەوە تێپەڕ بم! داوای دەوا و دەرمان لە ئێران دەکەین، دوای چەند ساڵ چاوەڕوانی شتی خراپمان بۆ دەنێرن. چەك و تەقەمەنیمان نیە. هەمو لایەك وێران بووە. خۆراك لە بازاڕی رەش دەست دەکەوێت. ئێران رێگا لە

هاتنی مادەی خۆراکی دەگرێت و تاقە ڕێگا لە تورکیا دایە. بارزانی ش هەمان کێشەی هەیە. جگە لەوە متمانەی بە ئێرانییەکان نیە. لەوە دەترسێ کە سەدام بڕوخێنن و لە جیاتی ئەوەدا ڕژێمێکی شیعی بهێننە سەر دەسەڵات. جگە لەوە، ئەگەر داوای دانوستانی سەدام ڕەتبکاتەوە و دوای ئەوەش ڕژێم دەست بە جەنگ بکاتەوە، نیگەرانە لەوەی کە دەبێ چی بکەین. سوریا ش خوازیاری گۆڕینی ڕژێمەکەیە بە دەسەڵاتێك کە لایەنگری خۆی بێت. لە هەلومەرجی نائۆمێدی و ناچاریدا ماوینەتەوە. لەبەر ئەوەی کە پشتیوانییەکی نێودەوڵەتیمان نیە، بیرمان لەوە کردەوە کە بە جۆرێك دەرگای سازش لەگەڵ سەدام بکەینەوە. جێگرتنەوەی سەدام لەلایەن هێڵی ئێران - سوریا، شتێك نیە کە کوردەکان خوازیاری بن. لەبەردەم عێراق دا دوو ڕێگا هەیە: یەکەمیان دیکتاتۆرییە، لەمەشدا کورد و شیعەکان پەراوێز دەخرێن. دووەمیشیان دیموکراسییەکی فرە حزبییە. لەوانەیە قۆناخی گوزەر لەمەیاندا گرفتی زۆر بێت، بەڵام هیچ ڕێگایەکی دیکە نیە."

تاڵەبانی قسەکانی خۆی بە" ئەگەر پشتوانیمان بکەن، هەڵوێست و پێگەی ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا گونجاو دەبێت." کۆتایی پێهێنا. لەدوای ئەوەش قایا تۆپەری وتی:" دەبوایە بەر لەوەی لەگەڵ سەدام دانوستان بکەن، ئێمەتان ئاگادار بکردایەتەوە، پێویستبوو پەیوەندیتان لەگەڵ ئێمە بگرتایە."

تاڵەبانی لەبەرامبەردا وتی:" ببورن، بەڵام ئەگەر هێڵێکی پەیوەندی هەمیشەییمان هەبوایە، ئەمە مومکین دەبوو. دەمانەوێ گوێ لە پێشنیارەکانی ئێوەش بگرین. لەکاتێکدا کە وەزارەتی دەرەوەی وڵاتانی ئەمریکا و بەریتانیا پێشنیارمان بۆ دەکەن، بۆچی گوێ لە پێشنیاری ئێوە نەگرین. ئێوە برا و دراوسێی ئێمەن."

ئەم هەڵوێستە دواتر لە کۆشکیش دووبارە کرایەوە و ڕێگای بۆ کرانەوەی نوێنەرایەتی هەمیشەیی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان لە ئەنقەرە کردەوە.

لە درێژەی کۆبوونەوەکەدا، تاڵەبانی لەسەر ئەو ئامێرە بێتەل و ڕادیۆییانەی کە لە ڕژێمی عێراق ەوە دەستیان کەوتبوو، زانیاری دا و قایا تۆپەری باسی ئەو مەترسییانەی کرد کە تورگوت ئۆزال لە پەیوەندی کردن لەگەڵ ئەواندا لە پێش چاوی گرتووە. تاڵەبانی وەك هەرجارێك کە کەیف خۆش دەبێت، بەو ڕەزامەندییەی کە لە ڕەوتی کۆبوونەوەکە هەیبوو، دەستی کرد بە گوتنی نوکتە و قسەی خۆش و بەوەش کۆبوونەکە هەتا نیوەشەوی خایاند.

جەلال تاڵەبانی دواتر پەیامێکی بۆ تورگوت ئۆزال سەرکۆمار نارد و وتی:"ئەگەر سەدام یان هەر کەسێکی دیکەش سەرۆکی عێراق بێت، چارەسەرێك بەسەر حکومەتی بەغدا بسەپێنن کە مافەکانی گەلی باکووری عێراق ی تێدا ڕەچاو کرابێت."

لە ڕێی دەستەواژەی"گەلی باکووری عێراق"ەوە بە یەکەوە ئاماژەی بە کورد و تورکمانەکان کرد و دووبارە ئەوەی بیر هێنایەوە کە لە دانوستانەکانیدا لە بەغدا لەگەڵ سەدام و بەرپرسانی دیکەی عێراق، لەسەر

تورکمانەکان توشی مشتومڕ بووە و کەرکوکی وەك "شارێکی کوردستان،ی کە هی کورد و تورکمانەکان بێت" پێناسە کرد.

جگە لە پەیامەکەی بۆ کۆشك، پێشنیارەکانیشی بۆ سەرکۆمار ریز کرد و وتی:" هاوکاری تەواو لە رێی هەر میکانیزمێکەوە کە لە داهاتوودا دروست دەکرێت. پێویستە ئەم هاوکاری تەواوە، لایەنی سیاسی، سەربازی، ئابوری و بازرگانی لە خۆ بگرێت. لەو نێوەشدا رێگایەك بۆ گەیشتنی کۆمەك و یارمەتیی مرۆیی لە وڵاتانی خۆرئاواوە بە ئێمە بکرێتەوە. جگە لەوە، لە رووی چەك و راهێنانی سەربازیشەوە هاوکاریمان بکرێت. پێویستمان بە هێزێك هەیە کە باش راهێنرا بێت. پێویستە تورکمانەکان'یش هێزی چەکداریان هەبێت و لەو کۆمیتەیەدا کە بۆ دیاریکردنی داهاتووی عێراق دەستنیشان دەکرێت، بە مافی ڤیتۆوە بەشدار بن." هەروەها وتی بۆیە ئەو پێشنیارانەی کردووە، تا بە دەستی بەتاڵ نەگەڕێتەوە. چونکە ئەگەر بە دەستبەتاڵی لە تورکیا بگەڕێتەوە، ئەگەری ئەوە هەیە کە مەسعود بارزانی کە لەگەڵ ئەودا بە نۆرە لەگەڵ سەدام دانوستانیان دەکرد، لەگەڵ رژێمی بەغدا رێکەوتنێك ئیمزا بکات. هەروەها وتی مەسعود بارزانی پێیوتوە کە "ئەگەر تورکیا رێگایەکمان بۆ بکاتەوە، ئێمەش ناچینە بەغدا." مەبەستەکەی خۆیشی لەو رێگایە بە"زاخۆ – خابوور - ئیسکەندەروون" روونکردەوە.

جەنگی کەنداو کۆتاییپێهاتبوو. هەرچەندە سەدام هێزێکی زۆری لە دەسدابوو و لاوازببوو، بەڵام هێشتا لە بەغدا دەسەڵاتی بە دەستەوە بوو. کوردەکان'یش بە دەست هەلومەرجی قورس و نالەباری ئابورییەوە دەیاننالاند. بەرهەم ساڵح پێشنیاری کرد کە بۆ جێبەجێکردنی ئەو داواکارییانەی کە تاڵەبانی باسی کردن، کۆمیتەیەکی کار(Working Committee) پێك بهێنرێت. بەر لەوەی لە ژوورەکە بچینە دەرەوە، تاڵەبانی وتی: با بەشێوەیەکی دۆستانە ئاگادارتان بکەمەوە، ئەگەر بە دەستی بەتاڵ بگەڕێمەوە، بارزانی لەگەڵ سەدام رێك دەکەوێت."

دیارە هەستی بەوە کردبوو کە ئەمە لەوانەیە گەورەترین کارتێك بێت کە تورگوت ئۆزال بخاتە جوڵەوە.

دوای ئەوەی کە تاڵەبانی و بەرهەم ساڵح و سەرچڵ قەزاز رۆیشتن، من و قایا تۆپەری لە ژوورەکەدا بە تەنها ماینەوە. قایا ئابی (و: ئابی واتای براگەورە - کاك دەگەیەنێت) وتی:"بە رای من دیدارێکی مێژوویی بوو. بە رای تۆش وا نیە؟ بزانە باسی چی کرا. پێویستە لە سەداسەد سەرکۆماری لێ ئاگادار بکەینەوە." دواتر دەستی بۆ تەلەفۆنەکەی برد. زۆر لە نیوەشەو لایدا بوو. وتم:"ئابی(هەر بە قایا ئابی بانگم دەکرد) تەلەفۆن کردن لەم کاتەدا گونجاوە؟" ئەویش لە وەڵامدا وتی:" ئەم دیدارە زۆر گرنگ بوو. کات گرنگ نییە، پێویستە لە سەداسەد ئاگاداری بکەینەوە."

بە شێوەی ئاسایی تورگوت ئۆزال لەو کاتانەدا بە خەبەر بوو، بەڵام هەر جۆرێك بێت ئەو شەوە خەوتبوو.

جارێکی دیکە بە قایا تۆپەری'م گوت کە ئەو بەڵگەیەی کۆمەڵەی گەلان کە تاڵەبانی باسی لێ کرد، لای تورگوت بەگ (کاتێ باسی ئەومان دەکرد هەر بەوجۆرە ناومان دەهێنا) هەیە و ئاگای لە ناوەڕۆکی بەڵگەکەش هەیە. بەو پێیەی کە تورگوت ئۆزال ئاگای لەو بەڵگەیە هەبوو و پێیوابوو کە لەوانەیە جەنگی کەنداو بە رووخانی سەدام و دابەشکردنی عێراق کۆتایی پێبێت، ئایا تورکیا بیری لەوە دەکردەوە کە دوای هەقی مێژوویی خۆی بەسەر ویلایەتی موسڵ بکەوێت؟

لە یەکەم دیدارماندا ئۆزال باسی بۆچوونەکانی خۆی بۆ کردم کە پێچەوانەی ئەو قەناعەتە باوە بوو کە لە ئارادا بوو. سەرکۆمار هیچ حیسابێکی فراوانخوازانەی نەبوو. ئەو پێیوابوو کە نەوت بەڵایە و دەیگوت:" سەیرکە! هەمو وڵاتانی بەرهەمهێنەری نەوت توشی بەڵا بوون. ئەو وڵاتانەش کە نەوت بەکار دەهێنن هەموویان وڵاتی دەوڵەمەندن. بۆ گەشەکردن و پێشکەوتن، پێویست بە خاوەندارێی سەرچاوەی نەوتی نیە. بگرە نەبوونی ئەو سەرچاوانە باشتریشە. کێشەی ئێمە پەیوەندی بە سەرچاوە نەوتییەکانی کەرکوك'ەوە نیە. کێشە لەوێدا نیە."

(لە گفتوگۆکەماندا لە شوێنی حەوانەوەی هاوینانەی سەرۆکایەتی کۆمار لە گوندی ئۆکلوك لە هاوینی ۱۹۹۲دا، سەرکۆمار پێی گوتم بیرۆکەی فراوانکردنی خاکم نیە. ئەگەر خاکەکەت فراوان بکەیت کێشەکانیشت زۆرتر دەکەیت. نەوتیش وەك جاران گرنگیی نەماوە. منیش وشە بە وشەی ئەو قسانەم لە دەفتەری یادداشتەکانمدا نوسیوەتەوە.)

تورگوت ئۆزال پێیوابوو کە دوای جەنگ، سەدام لەسەر پێ نامێنێتەوە. جگە لەو وادانانە، بۆچوونێکی وردیشی لەبارەی داهاتووی عێراق هەبوو. ئەو دەیگوت:"عێراق لەلایەن ناوەندێکی زۆر بەهێزەوە دامەزراوە. رژێمی بەهێزی ئەو وڵاتەش، رژێمێکی ناوەندگەرای دیکتاتۆریی کەمینەیە. ئەم جەنگە، عێراق و پێکهاتەکەی کە لەسەر ناوەندگەرایی بەغدا بونیاتنراوە، تێك دەشکێنێت. لە ئەنجامی ئەوەشدا عێراقێکی نوێ دروست دەبێت. عێراق'ی نوێ دەتوانێت بە دوو شێوە بێت: عێراق'ی نوێ وەك جاران، پێکهاتەیەکی توندی بە مەرکەزییەتی بەغدا نابێت. ئەو بەشانەی کە عێراقیان پێکهێناوە، ناوەندی نوێ دروستدەکەن. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە کورد و شیعەکان لە ناوەندا قورسایی پەیدا بکەن. سەرەڕای ئەوەی کە لەوانەیە یەکپارچەیی عێراق'یش بپارێزرێت، بەڵام پێکهاتەی نوێ لە چوارچێوەی ناوەندی بەغدا کە بە گوێرەی جاران لاوازتر بووە، لەوانەیە پێکهاتەیەکی فیدراڵی بێت. عێراق، لە هەموو رووییەکەوە بە تایبەتی لە رووی ئەمنییەوە پەیوەندی بە ئێمە یانی بە تورکیا هەیە. عێراق'ی تازە لە نزیکەوە پەیوەندی بە تورکیا دەبێت. پێویستە ئێمەش لە بونیاتنانەوەی عێراق'دا هەبین. دەبێ لەسەر ئەو مێزە بین کە لە سەری قسە لەبارەی بونیاتنانەوەی عێراق دەکرێت. لەبەر ئەمەش داوام کرد کە لە هاوپەیمانی نێودەوڵەتیدا رۆڵێکی کارامان هەبێت. لە ناوەندی داهاتوودا کورد و شیعەکان دەبن و لەبەر ئەوەی کە شیعەکان بە شێوەی سروشتی لە ژێر کاریگەری ئێران'دا دەبن، پێویستە ئێمە لە بنەڕەتدابە کارتی

کورد٘ەوە لە بونیاتنانەوەی عێراق٘دا ڕۆڵمان هەبێت.

ئەگەر لە کۆتایی ئەم جەنگەدا، ڕووخان و دابەشبوونی عێراق حەتمی بێت، ئەوکاتە پێویستە داوای هەقی مێژوویی خۆمان لەسەر موسڵ بکەین. هاوشێوەی ئەوەی لە یاسای فیزیادا هەیە، لە سیاسەتیشدا بۆشایی نامێنێتەوە و پڕ دەکرێتەوە. ئەگەر ئێمە ئەو بۆشاییە پڕ نەکەینەوە کە لە ئەنجامی ڕووخانی ڕژێم و دابەشبوونی عێراق، لە باکووری عێراق دێتە ئاراوە، ئەوا کەسێکی دیکە لەوانەیە هێزێك کە دوژمن یان ڕکابەری تورکیا بێت ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە. بۆ ئەوەی کە نەهێڵین ئەمە ڕووبدات یان لانیکەم ڕێگەی لێ بگرین، پێویستە لەبارەی داهاتووی عێراق٘ەوە خاوەن قسە و چالاك بین."

سەرکۆمار پێی باشتر بوو سیناریۆی یەکەم ڕووبدات، بەڵام دەبوایە بۆ ئەوەی دووەمیش ئامادەگی هەبێت. تورگوت ئۆزال لە شیکردنەوەکەیدا باسی ئەوەشی کرد کە ئەگەر تورکیا ئەو بۆشاییە جیۆپۆلیتیکییە پڕ نەکاتەوە کە لە عێراق دروستدەبێت، بە ئەگەری زۆر ئێران پڕی دەکاتەوە. لەبەر هەموو ئەو هۆیانەی کە باسمکرد، تورگوت ئۆزال پێیوابوو کە دەبێ پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان٘ی عێراق بەرقەرار بکرێت. جارێکی دیکە لەوە تێگەیشتم کە بۆچی، کاتێ زانی بە نیازم لەگەڵ سەرکردەکانی کوردەکان٘ی عێراق دیدار بکەم، بەشێوەیەکی خێرا و نائاسایی منی بانگهێشتی کۆشکی سەرۆکایەتی کرد.

بە وردی و بە سەرنجێکی تەواوەوە، بێ ئەوەی وشەیەك تێپەڕێنم، گوێم لە قسەکانی سەرکۆمار دەگرت. پێموابوو کە سەرکۆمار ئەم قسانەی لەبارەی ئایندەی تورکیا و عێراق بە ڕاشکاوانە بۆ کەس باس نەکردووە. ئەو شتانەی کە بە منی گوت، لە هیچ کوێ و لە زمانی هیچ کەسێکەوە نەمبیستبوون.

**تاڵەبانی قەد ئۆزال‌ی جێ نەدەهێشت. تاڵەبانی لە رێی چ کەسێکەوە دەستی بە ئۆزال گەیشتبوو؟ هەندێک "راوێژکاری مژدەبەخش و بانگخواز"، رۆژنامەنوسەکان. لە راستیدا ئێوەش دەزانن کە ئەم راوێژکارە مژدەبەخشانە کێن: کەسانێکن وەک جەنگیز چاندار.**

جەم ئەرسەڤەر، رائیدی خانەنشین، دامەزرێنەریJITEM دەزگای هەواڵگری و شەڕی دژە تیرۆری جەندرمە، سۆنەر پاڵچن، دانپێدانانەکانی رائید ئەرسەڤەر، ل.٦٦،٩٨

لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٩١دا، دوای دیدار لەگەڵ تورگوت ئۆزال لە کۆشکی چانقایا، وەك یەکەم ئیش، بە تایبەتی بۆ دۆزینەوەی جەلال تاڵەبانی بەرەو لەندەن دەرۆیشتم. لەبارەی بەقەرارکردنی پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان‌دا، پەیامێکی سەرکۆماری تورکیا‌م بۆ سەرکردەیەکی کورد دەبرد کە تەمەنی لە شاخەکاندا تێپەڕ کردووە. دەبوایە بۆ ئەم "پرۆژە"یە قەناعەتم بەو بکردایە.

لەگەڵ تورگوت ئۆزال‌دا رێککەوتین کە چی بە تاڵەبانی بڵێم و چ پەیامێکی پێ بگەیەنم. گفتوگۆ سێ کاتژمێرییەکەمان کۆتاییپێهاتبوو. خەریکبوو هەستم کە چاوم بە تابلۆیەك کەوت لە سەر ئەو مێزە گردەی کە لە تەنیشت دەرگای ژوورە رەسمییەکەیدا لە سەری دانیشتبووین. تابلۆیەکی تایبەتی ئایڤازۆفسکی بوو کە جۆش و خرۆش و شەپۆلەکانی دەریای رەشی کێشابوو. نازانم لەبەر چی بوو کە لە ماوەی گفتوگۆکەماندا چاوم دەبڕییە تابلۆکە و سەرنجی رادەکێشام. وتم:"دەزانن کێ ئەم تابلۆیەی کێشاوە؟" هەموو کەس وایدەزانی کە باری رۆشنبیری و زانیارییەکانی تورگوت ئۆزال لەوبارەیەوە زۆر نین، بەڵام منی تووشی سەرسووڕمان کرد و وتی:" ئایڤازۆفسکی." قسەیەکی نابەجێم کرد و وتم:"دەڵێن زۆربەی تابلۆکانی ئایڤازۆفسکی ساختە دەکرێن، داخۆ ئەمەش ساختەیە یان ئەسڵییە؟" ئۆزال شانی هەڵتەکاند و وتی نازانم. لە ژووری رەسمی سەرۆك دەوڵەتەکانی جیهاندا، زیاتر نیشانە و سمیبولە نەتەوەییەکانی تایبەت بە وڵاتەکانی خۆیان هەن، بەڵام من تێنەگەیشتم کە بۆچی لە ژوورەکەی ئۆزال‌دا تابلۆیەکی ئایڤازۆفسکی دانراوە کە بە رەچەڵەك ئەرمەنی بووە. تێنەگەیشتم کە ئایڤازۆفسکی چ واتایەکی بۆ دەوڵەت - نەتەوەی تورك هەیە. لەو کاتەی کە خەریکی دیدارێك بووم کە یەکێك لە گەورەترین تابۆکانی کۆماری تورکیا‌ی دەشکاند، تورگوت ئۆزال پێشنیارێکی کرد و وتی:"کاتێ تاڵەبانی‌ت بینی، یەکسەر قسە مەکە و باسی ئەم شتانە مەکە وتمان. واز بێنە با سەرەتا ئەو قسەکانی بکا، دواتر تۆ قسەکانت بکە." لە مێشکی خۆمدا وتم تورگوت ئۆزال دەیەوێت من وەك دانوستانکارێکی تەکتیکیی دەوڵەتی تورکیا رەفتار بکەم. ئەو ئەرکەی کە تورگوت ئۆزال خستبوویە سەرشانم تا لەکاتی بینینی تاڵەبانی جێبەجێی بکەم، زۆر زیاتر لە چوارچێوەی کاری رۆژنامەوانیم بوو. بە زمانێکی زۆر سادە و روون ئەو پەیامەی پێگوتم کە دەبوو بیگەیەنمە تاڵەبانی:"بەوان بڵێ متمانە بە تورکیا بکەن. پێیان بڵێ ئەگەر، لەگەڵ ئێمە بن و لە داهاتوودا بەشێوەیەکی هەماهەنگ لەگەڵ ئێمەدا بجوڵێنەوە. تورکیا هیچ کات

خیانەتیان لێ ناکات. ئێمە هیچ کات ئەو شتانە ناکەین کە ئێران لەبەرامبەر ئەوان کردوویەتی. با ئەوەشیان لە بیر نەچێت کە زۆربەی خەڵکی ئێمە و خەڵکی ئەوانیش سوننە مەزهەبن و ئەمەش پەیوەندییەکی گرنگە کە لە نێوانماندا هەیە. جگە لەوە سەرەڕای ئەوەی کە تا ئێستا تورکیا ئەوانی بە رەسمی نەناسیوە بەڵام دوای بەرقەرارکردنی پەیوەندییەکی رەسمی، تورکیا لە هەموو شوێنێك رۆڵی پارێزەری ئەوان دەگێڕێت. هەروەها ئەوشیان بیر نەچێت کە تورکیا وڵاتێکی ئەورووپی‌یە و ئەندامی ناتۆیە. تورکیا وڵاتێکی گرنگە کە لە دامودەزگا ئەورووپییەکان‌دا نوێنەرایەتی هەیە و لەو دامودەزگایانەدا بەرگرییان لێ دەکات. وەکو وتم تورکیا وەکو ئێران‌یان لێ ناکات، قەد نایانفرۆشێت."

بێگومان ئەو پەیوەندییەی کە ئۆزال دەیویست لەگەڵ سەرکردە کوردەکان‌دا دروستی بکات، رەهەندێکی ئەمنی هەبوو. لەلایەکەوە حیسابی ئەوەی دەکرد کە بەهۆی "کارتی کورد"ەوە لە عێراق‌ی دوای سەدام خاوەن نفوز و کاریگەری بێت و لەلایەکی دیکەشەوە بە مەرجی هەبوونی ئەو پەیوەندییەش، دەیویست کوردستان‌ی عێراق یان بە وتەی ئەو کەسانەی کە سوێندیان خواردووە وشەی کورد و کوردستان بە زمانیاندا نەیەت، باکووری عێراق وەك "هینتەرلاندی ئەمنی" تورکیای لێ بێت. بە گوزارشتێکی دیکە مەرجی ئەو پەیوەندییە ئەوە بوو کە کوردەکان‌ی عێراق پشتیوانی لە پ.ك.ك نەکەن و تەنانەت لەگەڵ تورکیا هاوکار بن بۆ ئەوەی ئەو رێکخراوە لەناو ببەن. ئەگەر سەرکردەکانی کوردەکان‌ی عێراق ئەم داواکارییەی تورکیا‌یان جێبەجێ بکردایە، بە شێوەی رەسمی پەیوەندییان لەگەڵ دەگیرا و لە ئاستی نێودەوڵەتیشدا تورکیا بەرگری لەوان دەکرد.

کاتێ لە قسەکانماندا هاتینە سەر پرسی پ.ك.ك، بە پێویستم زانی جارێکی دیکە "کێشەی کورد" لە تورکیا بە بیری ئۆزال بهێنمەوە. وتم:" هەتا ئەو کاتەی شتێك بۆ باشکردنی بارودۆخی کوردەکان‌ی تورکیا نەکرێت و باس لە شوناس و مافەکانی کوردەکان لە تورکیا نەکرێت، ئەگەر هەموو ئەمانەش بۆ تاڵەبانی باسبکەم، لەوانەیە وا بیر بکاتەوە کە وەك خێڵێکی پاسەوان مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین. لەوانەیە نەیانەوێت دیمەنی هێزێکی یەدەگ بۆ دژایەتیکردنی کوردەکان‌ی تورکیا لە خۆیان پیشانبدەن. ئەگەر باسی بارودۆخی کوردەکان‌ی تورکیا هاتە پێشەوە، پێویستە چی بڵێم؟"

تورگوت ئۆزال وتی:" شتێك دەبێ. بارودۆخی کوردەکان لە تورکیا بەم وەزعەی ئێستا نامێنێتەوە. دەگۆڕێت. بەڵام پێویستە واقعبین بن. ئەمە کاری قۆناخێکە. هەنگاو بە هەنگاو دەبێت، بەڵام هەر دەبێت. با وەها بیر بکەنەوە کە ئەمە لە قۆناخێکدا دەکرێت و لەو ماوەیەدا چارەسەر دەکرێت." تورگوت ئۆزال وتی ئەوەش بیری تاڵەبانی بهێنەوە کە ساڵی ١٩٨٨ لەکاتی قەتلوعامەکەی هەڵەبجەدا، بەهۆی هەوڵ دەستپێشخەرییەکانی ئەوەوە رێگا دراوە کە بنەماڵەی پێشمەرگەکانی کوردەکان‌ی عێراق بێنە تورکیا و لەوێ

نیشتەجێ بن." ئەمە وەك بیری لێ دەکرێتەوە کارێکی ئاسان نەبوو. سوپا زۆر بە توندی دژی دەوەستایەوە. ئاسان نەبوو بۆ من کە بڵێم ئەمە پرسیەکی مرۆییە و لە دژی بۆچوونەکەی ئەوان بوەستمەوە. ئەم کارانە هەروا بە ئاسانی ناکرێن."

لە روانگەی ئەوەوە لە راستیدا ئەو رووداوە کە تابۆکانی تورکیا بە نیسبەت کوردەکان ی عێراق شکاندووە، رێگەدان بوو بەوەی کە پێشمەرگەکانی کورد لە ساڵی ١٩٨٨ بێنە ناو تورکیا و لەوێ نیشتەجێ بن. دەیویست ئەم رووداوە وەك وەرچەرخانێکی مێژوویی بۆ تاڵەبانی باس بکەم و بڵێم کە تەنانەت لە "کرانەوە"ش گرنگترە.

وتم لە رووداوەکان ئاگادارت دەکەمەوە و ماڵئاواییم لێکرد. لەبەر دەرگای کۆشك دا قایا تۆپەری رایگرتم. وتی:"بەر لەوەی بچیتە ژوورەوە دەمویست پێت بڵێم کە باسی پێویستی بەرقەرارکردنی پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان ی عێراق بکە. رۆژنامەنوسێکی رۆژنامەی واشنتن پۆست بە ناوی جاناتان راندڵ وتی بۆ بینینی مەسعود بارزانی دەچم. پێویستە ئەم کەناڵانە بەکار بهێنرێن. دەمویست باسی ئەمە بۆ ئۆزال بکەی."

-"خەمت نەبێ کاکە، تەنها باسی ئەم پرسیەمان کرد."قایا تۆپەری ئاسوودە ببوو، وتی:" ئاااا، زۆر باش بووە. منیش باسی ئەوەم بۆ دەکردی." دوای ئەوەش پرسیاری نەکرد کە باسی چیمان کردووە.

ئیدی هەر چییەکم دەکرد، دەبوو تاڵەبانی بدۆزمەوە. زۆری پێنەچوو کە زانیم دوو کەسی دیکەی وەك من لە رێگا و کەناڵی جۆراجۆرەوە هەوڵی نزیککردنەوەی کوردەکان ی عێراق و تورکیا لە یەکتری دەدەن. یەکێکیان جاناتان راندڵ بوو کە قایا تۆپەری باسی دەکرد. جاناتان راندڵ لە سەرووی هەموو ئەو رۆژنامەنوسە ئەمریکی یانەوە دەهات کە زۆر بە باشی چاودێری پرسی کورد و کوردەکان یان دەکرد. لە رۆژنامەی واشنتن پۆست کاری دەکرد. تا ئەندازەیەك بست بە بستی جوغرافیای کوردی گەڕا بوو. راندڵ لە کتێبی(After Such Knlowdege, What Forgiveness – My Encounters With Kurdistan, Farrar, Straus ve Giroux, New York, ١٩٩٧) کە بەڵگەیەکی مێژوویی گرنگە، بەمجۆرە باسی رۆڵی بە هەڵکەوتی خۆی لە دروستکردنی پەیوەندی نێوان تورکیا و کوردەکان ی عێراق دەکات:

"ساڵی ١٩٩١ بەشێوەیەکی کتوپڕ بەشداری بڕیارەبت شکێنەکەی ئۆزال بووم. ئۆزال بەوە ناوبانگی دەرکردبوو کە دوابەدوای یەك بۆ ماوەی ١٥ خولەك لەگەڵ رۆژنامەنوسان چاوپێکەوتن دەکات. رۆژنامەنوسانی ریز دەکرد و لە دیدارەکانیدا زیاتر لە پێدانی زانیاری بەهێز، وتەی یەك رستەیی بەکار دەهێنا کە راگەیاندنی تورك زۆر حەزیان لێی دەکرد. لە چاوپێکەوتنێکی بێزارکەری وەهادا، هەر جۆرێك بێت توانیم پرسیارێکی لێ بکەم. وتم بۆچی بەردەوام دەڵێیت تورکیا دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی لە باکووری عێراق قبوڵ ناکات. بە تازەیی لە شام گەڕابوومەوە و تاڵەبانی و سەرکردەکانی دیکەی کورد، لەوێ بە توورەییەوە ئەمەیان

ڕەتدەکردەوە و دەیانگوت کە بۆ عێراقێکی دیموکرات و کوردستانێکی ئۆتۆنۆم کار دەکەن. ئەو پرسیارەم لە ئۆزال کرد کە ئەگەر کوردەکان ی عێراق، لەدوای سەدام ڕەزامەندی حکومەتی بەغدا بۆ ئۆتۆنۆمی بەدەست بهێنن و سنورەکانی خۆیان بە توندی بپارێزن، بۆچی تورکیا دژی دەردەکەوێت؟ ئۆزال، وەڵامێکی ناڕوونی لەسەر فیدرالیزم و کوردەکان ی عێراق پێدام و کاتەکەم تەواو بوو، بۆیە منیش بە نائومێدی چاوپێکەوتنەکەم تەواو کرد. ڕۆژی دواتر قایا تۆپەری وتەبێژی ئۆزال و بەرپرسی پێشووی ڕاگەیاندنی وەزارەتی دەرەوە تەلەفۆنی بۆ کردم و جۆرە ئیعترافێکی کرد کە هەموو ڕۆژنامەنوسێك پێی خۆشە و وتی:" پرسیارەکانتان لە وەڵامەکانی سەرکۆمار سەرنجڕاکێشتر بوون. پێتانوایە کە دەبێ لەگەڵ کوردەکان ی عێراق دیدارمان هەبێت؟" وتم من دیپلۆمات نیم و ڕۆژنامەنوسم. بەوجۆرەش ناڕەزاییم لە پرسیارەکەی پیشاندا. من درکم بەوە دەکرد کە تەنانەت دۆستێکی کۆن و کەسێکی عاقڵی وەکو قایا تۆپەری، بێبەری نیە لەو گومانانەی کە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست سەبارەت بە کاری بیانییەکان هەن. ئەوان پییانوایە ڕۆژنامەنوسە بیانییەکان بۆ شوێنی دیکە کار دەکەن. بە بێئەوەی خۆم بخەمە ژێر بەرپرسیارییەوە وتم دیدارێکی وەها هیچ زیانێکی نیە و بە پێچەوانەوە لەوانەیە باشیش بێت. ئەو کاتەی کە دەمویست لە ئەورووپا وە بچم بۆ تاران، لە ماوەی گۆڕینی فڕۆکەدا سەبارەت بە قسەکانی قایا تۆپەری پەیامێکم بۆ تێلی - سکرتێری نوێنەری کوردەکان لە لەندەن دانا. بارزانی قبوڵی کردبوو کە هەفتەیەك دوای ئەوە لە چیاکانی رایان دیدارم لەگەڵ بکات. هۆکاری ڕاستەقینەی ئەمەش ئەوە بوو کە پیشانبدات سنورەکانی نێوان عێراق و تورکیا یان بە باشی کۆنترۆڵ کردووە، هەروەها دەیویست ئەوەش دەرخات کە مێژوویەکی هەیە کە تا ڕاپەڕینەکەی باوکی لە ساڵی ١٩٦١ درێژ دەبێتەوە. دەکرێ موناقشە بکرێت لەسەر ئەوەی کە ئایا ئۆزال دوای لێدوانێکی کورتی بارزانی لە واشنتن پۆست کەوتۆتە جوڵە یان نا، بەڵام لەدوای ئەوەی کە ئۆزال لە ڕۆژی ١١ی مارت دا ڕایگەیاند کە دیداری لەگەڵ کوردەکان ئەنجامداوە، ئیدی ڕۆژنامە تورکییەکان کە بە بڵاوکردنەوەی ئەو شتانەی کەمتر ڕاست دەردەچن ناوبانگیان دەرکردووە، دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ئەو دەنگۆیانەی کە گوایە ئۆزال لە ڕێی ڕۆژنامەنوسێکی ئەمریکی سەر بە سی ئای ئەی ئەو کارەی کردووە.(دیارە دەبێ خۆم بە کەسێکی بەخت باش بزانم کە ناویان نەهێنام) ئۆزال لە ڕێی دوو ڕۆژنامەنوسەوە کەوتە جووڵە بۆ ئەوەی دوو هەفتە دواتر و هەفتەیەك بەر لەوەی ئۆپەراسیۆنی زەمینی لە دژی عێراق دەستپێبکات، لە ئەنقەرە بە نهێنی چاوی بە سەرکردەکانی کورد بکەوێت."(ل٩١-٩٠)

جاناتان ڕانداڵ لە بەشی پێشووی کتێبەکەیدا بە مجۆرە باسی دیدارەکەی خۆی لەگەڵ مەسعود بارزانی دەکات کە لە سنوری نێوان عێراق و ئێران، لە بڕیارگەی بارزانی لە چیای ڕایان کە زۆر لە قەندیل دوور نیە، ئەنجامی داوە:

" دیدارەکەم لەگەڵ بارزانی لە چیایەکی پڕ لە بەفر، لەنێو سەنگەرێکی خۆ پاراستن لە بۆمب، زیاتر پەیوەندی بە ئیش و کارەوە هەبوو. بارزانی ئەم دیدارەی بۆ ئەوە بەکار هێنا تا نیگەرانییەکانی تورکیا سەبارەت بەوەی کە لەوانەیە کوردەکان لە جیاتی دووبارەکردنەوەی دروشمە نەرتییەکانی ئۆتۆنۆمی باسی سەربەخۆیی بکەن. بارزانی وتی کوردەکان درك بەوە دەکەن کە لەکاتێکدا بەشێکی گەورەی دنیا بۆ پاراستنی سنورەکانی کوەیت کەوتووەتە جوڵە، ڕێگا بە دامەزراندنی کوردستان،ی سەربەخۆ لە ئێران، عێراق یان تورکیا نادرێت."(ل٣٩)

ئەو کاتەی کە لێدوانەکەی بارزانی لە واشنتن پۆست بڵاو کرایەوە، من بێ خەبەر لەوەی کە جاناتان ڕاندڵ بەر لەوەی بارزانی ببینێت چاوی بە تورگوت ئۆزال کەوتوە، ڕێگەی لەندەنم گرتبووە بەر.

ئامانجەکەم دۆزینەوەی جەلال تاڵەبانی بوو.

بە بێ تێپەڕبوونی کات، لە ڕێی هاوڕێکەم لە ڕۆژنامەی ئەلحەیات لەگەڵ کەسانێك لە ئۆپۆزیسیۆنی عەرەبی عێراق دیدارم کرد و سۆراخی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی'م گرت. بەڵام هیوام نەبوو لە ڕێی ئەوانە بتوانم شتێك بکەم. خۆی، بارزانی لە چیایەك لە سنوری ئێران - عێراق لە بڕیارگەکەی خۆی بوو، کەسیش نەیدەزانی تاڵەبانی لە کوێیە. ئێوارەی یەکشەممەیەك لە یەکێك لە گەڕەکە کەنارییەکانی باشووری لەندەن، سەردانی محەمەد بەحرەلعلوم زانای ئایینی شیعەم کرد. محەمەد بەحرەلعلوم ساڵی ٢٠٠٣، دوای ڕووخانی سەدام بوو بە یەکێك لە ئەندامانی مەجلیسی حوکم کە بیست کەس بوون و وەك کەسایەتییەکی بەڕێزی شیعە دەرکەوت. کاتێك دەچووم بۆ بینینی، زیاتر لە خۆی ناوەکەی سەرنجی ڕاکێشام. بەحرەلعلوم، واتای دەریای زانستەکان دەدات. لەوانەیە ئەو ناوە بۆ جەختکردن لە زۆر بوونی زانیارییەکانی ناوبراو لەبارەی ئیلاهیات بوو بێت. کاتی گەیشتمە لای محەمەد بەحرەلعلوم، بینم کە وەرگێڕێکی باشی ئینگلیزی لەگەڵ دایە. من دەمویست بە عەرەبی قسە بکەم، بەڵام وەرگێڕەکەی تەداخولی دەکرد و پێداگری لە درێژەدانی قسەکان بە زمانی ئینگلیزی دەکرد. وەختێك محەمەد بەحرەلعلوم ڕۆیشت بۆ نوێژکردن، چاوپێکەوتنەکەمان ڕاگرت. لەگەڵ وەرگێڕەکەیدا بە تەنها ماینەوە و ناوەکەیم لێ پرسی: ئەحمەد چەلەبی!

ئەحمەد چەلەبی پرسیاری لێکردم کە لە کوێوە فێری زمانی عەرەبی بووم. منیش لە وەڵامدا وتم ساڵانێك لە بەیروت ژیاوم و لەوێ فێر بووم. قسە و باسێکی گەرممان لەسەر بەیروت کرد. ئەویش لەوێ ژیا بوو. ئەوەندە دۆست و ناسیاوی هاوبەش و خاڵی هاوبەشمان دۆزییەوە کە زۆری پێنەچوو لەگەڵ ئەحمەد چەلەبی وەك دۆست و ئەحبابمان لێ هات. هێزم لەو دۆستایەتییە وەرگرت کە لە نێوانماندا دروست ببوو. وتم دەبێ جەلال تاڵەبانی بدۆزمەوە. هەندێك شت هەیە کە پێویستە بۆی باسبکەم. ئەحمەد چەلەبی وتی جەلال تاڵەبانی لە پاریس'ە و دواتر خۆی باسی منی بۆ دەکات و وەڵامەکەیشیم لە هۆتێل بۆ دادەنێت.

وتم:" زۆر گرنگە. لە ماوەیەکی کورتدا چاوەڕوانیی وەڵامی ئێوە دەکەم. پەیامی تورگوت ئۆزال سەرکۆمارم بۆ هێناوە. پێویستە قسەی لەگەڵ بکەم. تورگوت ئۆزال چاوەڕوانی ئەنجامی دیداری من و ئەوە..."

ئەحمەد چەلەبی زەق زەق سەیری نێوچاوانی منی دەکرد. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵە هاوبەشانەی بەیروت کە تۆزێك لەوەوبەر باسمان کردبوو، هیچ هۆیەك نەبوو بۆ ئەوەی من درۆی لەگەڵ بکەم. لەو کاتەشدا زەنگی تەلەفۆن لێیدا و ئەحمەد چەلەبی لەگەڵ بەردەنگەکەیدا بە گەرمی کەوتە قسە. لەبەر ئەوەی عەرەبیم دەزانی، زۆری پێنەچوو تا بزانم کە ئەوەی لەوسەری هێڵی تەلەفۆنەکەیە، جەلال تاڵەبانی'یە. لەوەش گرنگتر تاڵەبانی لە پاریس نەبوو، بەڵکو هاتبوو بۆ لەندەن. لە قسەکانی ئەحمەد چەلەبی لەگەڵ جەلال تاڵەبانی تێگەیشتم کە دیدارەکەمیان بۆ رۆژی دواتر رێکخستوە. رۆژی دواتر، یانی لە ١٩٩١/٢/١٨، کاتژمێر ١٠:٠٠ی سەر لە بەیانی لە ماڵە جوان و گەورەکەی ئەحمەد چەلەبی لە مایفایری گەڕەکی میوتەنای لەندەن، چاوم بە جەلال تاڵەبانی دەکەوت. ماڵەکەی ئەحمەد چەلەبی کۆڵانێك لە سەرووی کۆڵانی ئادلفۆرد'ەوە بوو کە ناوەندی کۆمپانیای Polly Peckی ئەسیل نادر'یش لەوێ بوو کە لەو رۆژانەشدا لە تورکیا زۆر باسی لێوە دەکرا. لەبەر ئەوەش دۆزینەوەی ماڵەکەی ئاسان بوو. بەو هەستەی کە لەبەر ئەوەی نوێنەرایەتی سەرکۆماری تورکیا دەکەم، پێویستە من چاوەڕوانی هاتنی کەس نەبم بەڵکو خەڵك چاوەڕوانی هاتنی من بێت، لە جیاتی کاتژمێر ١٠:٠٠ی رێك، پێنج خولەك دواتر لە دەرگای ماڵەکەی ئەحمەد چەلەبی'م دا.

ئەحمەد چەلەبی دەرگاکەی کردەوە، بەڵام تاڵەبانی لەوێ نەبوو. چەند خولەك دواتر هات. لە ساڵی ١٩٧٣وە دوای هەژدە ساڵ، یەکەم جار بوو کە یەکمان دەبینی. منی نەناسی. بەشێوەیەکی رەسمی تەوقەمان کرد. دوو کەسی دیکەی لەگەڵ بوو. یەکیان د. عەبدوللەتیف رەشید، یەکێك لە بەرپرسانی ی.ن.ك و لە کەسایەتییە گرنگەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بوو. دکتۆرای ئەندازیاری هەبوو. دواتر زانیم کە عەبدوللەتیف رەشید هاوزاوای تاڵەبانی'یە. لە حکومەتەکانی دوای رووخانی سەدام'دا بوو بە وەزیری ئاو لە عێراق و بۆ ماوەیەکی زۆر لەو پۆستەدا مایەوە. ئەو کەسەی دیکەش کە هاوڕێی تاڵەبانی دەکرد، وەك موحسین دزەیی بە من ناسێنرا. هەر لە یەکەم ساتەکانەوە وەك دەوڵەتمەدارێکی خاوەن ئەزموون و کەسێکی رەسەن دەهاتە پێش چاو. خۆی هەرواش دەرچوو. موحسین دەزیی لە ساڵەکانی ١٩٦٠کاندا باڵیۆزی عێراق بووە لە پراگ و لە ساڵی ١٩٧٠شدا دوای رێککەوتنی کوردەکان و رژێمی بەغدا، بوەتە وەزیر. کەسێکی نزیکی بارزانیی باوك بووە. تەنانەت ئەو کاتانەش کە بارزانی لە واشنتن دوایین هەناسەکانی خۆی لە نەخۆشخانە هەڵکێشاوە، موحسین دزەیی یەکێك بووە لەو کەسە کەمانەی کە لای بوون. یەکسەر ئەم زانیارییانەیان پێدام. موحسین دزەیی بە ئەندازەیەك کە بتوانێ گفتوگۆیەکی کورتی پێ بکات، دەیتوانی بە تورکی قسە بکات. کاتێك نوێنەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان لە تورکیا کرایەوە، سەفین دزەیی کوڕی ئەو پۆستەی وەرگرت.

هێشتا شوێنی خۆمان بە قسە و باسەکانمان خۆش نەکردبوو کە تاڵەبانی وتی لەبەر ئەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەرەی کوردستان،ی'یان پێکهێناوە و هەروەها لەبەر ئەوەی کە مەسعود بارزانی لێرە نیە، بە گونجاوی زانیوە تا خەبەر بە موحسین دزەیی یاری وەفاداری مەلا مستەفای بارزانی بدات بۆ ئەوەی ئامادە بێت تا کۆبوونەوەکە لە پارتی دیموکراتی کوردستان شاراوە نەبێت. ئەم روونکردنەوەیە و ئاگادار کردنەوەی موحسین دزەیی لە شەوی بەر لە دیدارەکە و ئامادەبوونی ناوبراو لە دیدارەکەدا، نیشانەی گرنگی کۆبوونەوەکە بوون. بەوجۆرەش لایەنی تاڵەبانی و پارتی دیموکراتی کوردستان هەستناکی خۆیان بەرامبەر ئەو پەیامە نیشاندەدا کە لەلایەن سەرکۆماری تورکیا دەهات.

کاتێ زانیم تاڵەبانی منی نەناسیوەتەوە، بۆ ئارام کردنی باری گفتوگۆکە (لەوانەیە بۆ ئاسوودەکردنی خۆم بوو بێت) یادگەی تاڵەبانی'م بۆ هەژدە ساڵ لەوەوبەر بردەوە. باسی نیسانی ١٩٧٣ی بەیروت'م بۆ کرد. بیری کەوتەوە. چارەنووس لە پێگەی جیاواز و لەسەر پرسی جیاواز بە یەکی گەیاند بووین. بەڵام گفتوگۆکەمان وەك ئەوەی هەژدە ساڵ لەوەوبەر، بەشێوەیەکی دۆستانە و شۆڕشگێڕانە و گەرم دەستی پێنەکرد. ئەو کورد و منیش تورك بووم. دەستمان بە دیالۆگێکی سەخت کرد. د. عەبدوللەتیف رەشید و موحسن دزەیی و ئەحمەد چەلەبی کە لە کۆبوونەوەکەدا ئامادە بوون، تا ئەندازەیەك هیچ قسەیان نەکرد. تورگوت ئۆزال پێی گوتبووم کارێك بکە با سەرەتا تاڵەبانی قسە بکات، دوایی تۆ قسەکانت بکە. پێویست نەبوو من هیچ هەوڵێك بۆ ئەمە بدەم، تاڵەبانی بە رەخنەگرتن لە سیاسەتەکانی پێشووی تورکیا دەستی بە قسە کرد. دوای گوێگرتن لە رەخنەکانی، منیش ئەو شتانەم گوت کە تورگوت ئۆزال دەیویست تاڵەبانی بیانزانێت.

تاڵەبانی لە سەرەتای قسەکانیدا وتی:"تورکیا هەمووو کات لە بەردەم ئێمەدا رێگر بووە. ساڵی ١٩٨٥ خەریکبوو وەك یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگەڵ حکومەتی عێراق رێککەوین کە سەدام بە پاساوی ئەوەی تورکەکان نایانەوێت، دانوستانەکانی راگرت. ساڵی ١٩٨٨ لە واشنتن خەریکبوو لەگەڵ پنتاگۆن پەیوەندی بگرم، کەنعان ئەڤرەن هات و رێ لەو پەیوەندییەم گیرا. ساڵی ١٩٩٠یش هەمان شت دووبارە بووەوە."

دوای ئەوەی کە ویستی بە جۆرێك رەخنەکانی بگەیەنێت، قسەکانی نەرم کرد و وتی:"دیارە ئێستا باسی هەنگاوی باش بۆ داهاتوو دەکرێت و کوردەکان'یش بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لەمە دەکەن. ئەگەر رێگرییەکانی پێشووی تورکیا بە بیری خۆمان بهێنینەوە، گرنگی ئەو شتانەی کە ئێستا دەیانبیستین بەرچاو دەکەوێت. بە تایبەتی چاوپێکەوتنەکەی ئەلحەیات."

من ئاگام لەوە نەبوو کە ٤٨کاتژمێر بەر لەوەی من و تاڵەبانی یەك ببینین، تورگوت ئۆزال لە حەربییەی ئیستانبوڵ لە ماڵی سوپا چاوپێکەوتنی لەگەڵ کامەران قەرەداخی ئەنجامداوە کە کەسێکی بە رەچەڵەك کوردی عێراق'ە و چاوپێکەوتنەکەش لە رۆژنامەی ئەلحەیات بڵاوکراوەتەوە. لەبەر ئەوەش بە بێئەوەی بزانم

تاڵەبانی بۆچی بە باشی باسی چاوپێکەوتنەکەی ئەلحەیات'ی کرد، لە گوێگرتن بەردەوام بووم. تاڵەبانی دوای خوێندنەوەی ئەو چاوپێکەوتنە هاتبوو بۆ بنینی من.

لە درێژەی قسەکانیدا تاڵەبانی وتی:"ئێمە داوای جیابوونەوە لە عێراق ناکەین. لایەنگری لە عێراقێکی فیدراڵ یان دیموکراتیك دەکەین کە ئۆتۆنۆمی بۆ ئێمە دابینبکات. دیموکراسی دەرمانی دەردی ئەو رژێمەیە کە ئێستا لە عێراق هەیە. پێگەی دیموکراتیانەی تورکیا زۆر گرنگە، تورکیا دەتوانێت وەك هاوپەیمانێك متمانە بە کوردەکان'ی عێراق بکات. ئێمە زیان لە بەرژەوەندییەکانی نادەین." هەروەها بۆ ئاماژەدان بە پێویستیی بەرقەرارکردنی پەیوەندی لەگەڵ تورکیا نمونەی ئێران و سوریا'ی هێنایەوە:"ماوەیەکی درێژە پەیوەندیمان لەگەڵ ئێران و سوریا هەیە. هەرچەندە کوردەکان سەرکوت دەکەن، بەڵام ئێمە دەستمان لە کاروباری ناوخۆیی ئەوان وەرنەداوە. ئەو رۆڵەی کە لەوانەیە تورکیا لە دیموکراتیزەکردنی عێراق'دا بیگێڕێت، لەلایەن کورد و عەرەب پشتیوانی لێ دەکرێت."

بە بێئەوەی ناوی بهێنێت، قسەکانی هێنایە سەر پرسی کورد لە تورکیا و وتی:"ئێمە درك بەو ئاستەنگانە دەکەین کە لەبەردەم دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگەی تورك'دا هەن. دەزانین هەندێك شت هەن کە پێویستە هەنگاو بە هەنگاو بکرێن. بەڵام کات چاوەڕوانیی ئێمە ناکات و بە خێرایی دەڕوات. سەیر کەن رووداوەکانی ئەورووپای خۆرهەڵات چەنێ خێرا بوون. لەبەر ئەوە پێویستە تورکیا بە خێرایی هەندێك هەنگاو بنێت. ئەگەر وا نەبێت ناتوانین بۆ نزیکبوونەوە لە تورکیا پشتیوانی جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد بە دەستبهێنین. رەفتارەکانی تورکیا لەبەرامبەر کوردەکان'ی خۆی وەك نمونەیەك پیشانی ئێمە دەدەن."دواتر بۆ ئەوەی تێزەکەی خۆی بەهێز بکات، باسی رەفسەنجانی سەرکۆماری پێشووی ئێران'ی کرد و وتی:"رەفسەنجانی پێی وتم ئەگەر لەگەڵ کوردەکان'ی خۆتدا رەفتاری خراپ بکەیت، چۆن دەتوانی کوردەکان'ی عێراق و تورکیا بپارێزی[٦]."

جگە لەوانە، تاڵەبانی باسی ئەوەشی کرد کە پەیوەندی ئۆزال لەگەڵ ئەواندا شتێکی تازە نیە و دوو ساڵ بەر لەو کاتە، نوێنەری خۆی بۆ لای بارزانی و ئەو ناردووە.[٧]

دواتر باسی مێژووی کرد و وتی:"هەتا دامەزراندنی کۆماری تورکیا، تەنها کورد و تورکەکان پێکەوە بوون.

٦- ساڵانێك لەدوای ئەو دیدارە، لە ٢٠١٠دا موراد قەرەیڵان پێی گوتم کە ئاگای لە پەیوەندییەکانی ئۆزال و تاڵەبانی بووە. ئەو کاتانە قەرەیڵان لە هۆڵەندا بووە. تاڵەبانی تەلەفۆنی بۆ کردووە و وتوویەتی نامەیەك بۆ عەبدوڵا ئۆجالان دەنێرم، بەڵام پێویستە زۆر بە خێرایی وەڵامم بداتەوە. لەسەر ئەوەش قەرەیڵان تەلەفۆنی بۆ ئۆجالان لە شام کردووە و پێی گوتووە نامەیەکی تاڵەبانی هەیە کە پێویستە بیگەیەنرێتە دەستت. لەدوای ئەوەش بە بێ ئەوەی بکرێتەوە نامەکە دەگەیەنرێتە دەستی قەرەیڵان. بەڵام لەبەر کەم بوونی کات، ئۆجالان بە قەرەیڵان'ی گوتووە کە نامەکەم بە تەلەفۆن بۆ بخوێنەوە. لەبەر ئەوەی نامەکە بە پیتی عەرەبی نوسرابوو، وەرگێڕیان هێناوە و نامەکەیان بۆ ئۆجالان خوێندۆتەوە. لە نامەکەدا تاڵەبانی پرسیاری بۆچوونی ئۆجالان'ی کردووە لەسەر ئەوەی کە بە دەعوەتی تورگوت ئۆزال سەردانی تورکیا بکات. عەبدوڵا ئۆجالان'یش لە وەڵامدا وتوویەتی بە مەرجێك لەسەر حیسابی مامەڵەکردن لەسەر مافەکانی کورد نەبێت، پێویستە بە ئەرێنی وەڵامی بانگهێشتەکەی ئۆزال بداتەوە. کاتێك موراد قەرەیڵان دوای نزیکەی بیست ساڵ باسی ئەو زانیارییەی بۆ کردم، سەرم سووڕ نەما. بە پێچەوانەوە پێکەنیم و بە قەرەیڵان'م گوت: مام جەلالە نێتر! وەك هەموو ئیشەکانی دیکەی، ئەو کارەشی دوو لایەنە ئیدارە کردووە...

٧ - ئەو رووداوەی کە ئەو باسی دەکرد، دیدارێکی خۆی و محەمەد عەلی بیراند بوو. دواتر محەمەد عەلی بیراند خۆی بۆ منی باس کرد. بە گوێرەی وتەکانی بیراند، ئەو کاتانەی لە بروکسەل ژیاوە و کاری کردووە، دیداری لەگەڵ تاڵەبانی کردووە، بەڵام ئۆزال ئاگای لەوە نەبووە. بەڵکو هەمووی لە ئەنجامی گرنگیپێدانی خودی بیراند بە پرسی کورد بووە. لەو چوارچێوەیەدا، بیراند لەگەڵ جەلال تاڵەبانی و عەبدوڕەحمان قاسملو سەرکردەی حیزبی دیموکراتی کوردستان'ی ئێران دیداری کردبوو.

لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، تورکەکان لەگەڵ ئەو کەسانەی عەرەب کە دوای شەریف حسێن کەوتبوون و لەگەڵ روس و ئینگلیزەکان یشدا شەڕیان کرد. کوردەکان هەموو کات لەگەڵ تورکەکان دا بوون."

دواتر دیسان گەڕایەوە سەر پرسی پ.ك.ك و وتی تورکیا لەگەڵ عێراق لە دژی کوردەکان ی عێراق هەڵوێستی وەرگرتووە:" هاوکاری تورکیا - عێراق بۆ دژایەتیکردنی ئێمە بوو. دەزانین گوشارەکانی سوپا لەمەدا کاریگەری هەبووە." سەبارەت بە پرسی پ.ك.ك، چوارچێوەیەکی بۆ ڕەوایی پێدان بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەو ڕێکخراوە باسکرد:" هاوکاری نێوان تورکیا و عێراق، ئێمەی بەرەو لای پ.ك.ك پاڵنا. یانی ئەمە پرسی کار و کاردانەوەیە. جگە لەوە خۆ پەیوەندی ئێمە و پ.ك.ك، هەموو کات باش نەبووە. سێ چوار مانگ بەر لە ئێستا، بە پاساوی ئەوەی کە گوایە ئێمە هاوکاری تورکیا مان کردووە، پ.ك.ك هێرشی بۆ سەر من و بارزانی کرد. ئێمەی بە سیخوڕی کردن بۆ تورکیا، ئەمریکا و فەرەنسا تۆمەتبار کرد. بەڵام ئێمە نامانەوێ شەڕ و ئاژاوەیان لەگەڵ بکەین. لە ئەورووپا سەدان هەزار کورد هەن. بۆیە نامەوێ لەگەڵ پ.ك.ك شەڕ بکەین. عەبدولا ئۆجالان بە منی گوت ئەگەر بارودۆخەکە ئاسایی بێتەوە واز لە بیرۆکەی سەربەخۆیی کوردستان دەهێنن. کاریگەرییەکمان لەسەریان هەیە کە دەتوانین بە ئاراستەیەکی میانەڕەوانەیان بەرین."بەمجۆرەش تاڵەبانی ئاماژەی بەوە کرد کە ئەگەر شتێك لە تورکیا"وەربگرن" دەتوانن بە تایبەتی سەبارەت بە پرسی پ.ك.ك شتێك"بدەن."

لەم خاڵەدا موحسین دزەیی هاتە نێو باسەکە و وتی ئەگەری بەرقەرارکردنی پەیوەندی نێوان کوردەکان ی عێراق و تورکیا، کاریگەری لەسەر ڕازی کردنی پ.ك.ك دەبێت. دووبارە تاڵەبانی دەستی بە قسە کرد و باسی ئۆزال ی کرد و بە کەسێکی" عاقڵ و مەنتقی" ناوی برد و وتی:" لە سایەی ئابوریدا، زۆر باشتر لە سەربازە کۆنەپارێزەکان پرسەکان دەبینێت."

دوای ئەوەی کە گوێی لە قسەکانی من و پەیامەکەی ئۆزال گرت، یەکسەر وازی لەو حاڵەتی جیدی و ڕەسمییە دانوستانکارانەی هێنا کە لە ماوەی دیدارەکەدا دەینواند. بزەیەکی لێدا و وتی:" زۆر خۆشحاڵم لەوەی کە لەگەڵ بەڕێز سەرکۆمار بە یەك زمان قسە دەکەین. بە تایبەتی ئەو شتانەی کە ئێوە باسی دەکەن و ئەوانەش کە ئێمە بیستومانن یەکدەگرنەوە. ئێستا ئاسوودەتر بووم. دەتوانین متمانە بە تورگوت ئۆزال بکەین."

"ئەوانەی کە بیستوومانە" واتای چی دەدا؟ وەك ئەوە وابوو کە وشە بە وشەی ئەو شتانەی بیستبێت کە من بۆم باسکرد. بەر لە من، کێ ئەمانەی بۆ باسکردبوو؟

کامەران قەرەداخی پەیامنێری ڕۆژنامەی ئەلحەیات. نیوەشەو تەلەفۆنی بۆ تاڵەبانی کردوە و باسی وردەکارییەکانی دیدارەکەی دوو شەو بەر لەو کاتەی خۆی لەگەڵ تورگوت ئۆزال بۆ کردبوو. چاوپێکەوتنەکەی

ئۆزال، رۆژێك بەر لە دیدارەکەی  من و تاڵەبانی لە رۆژنامەی ئەلحەیات بڵاوکرابووەوە و کامەران هەمان رۆژ گەڕابووەوە بۆ لەندەن و وردەکاری چاوپێکەوتنەکە و تێبینییەکانی خۆی بە وردی بۆ تاڵەبانی باس کردبوو. دیداری تاڵەبانی لەگەڵ من، لە روانگەی ئەوەوە پشتڕاست کردنەوەی ئەو شتانە بوو کە رۆژێك بەر لەوە بیستبووی.

منیش ئەو کەسە بووم کە تێبینییەکانی خۆمم لەسەر تاڵەبانی بۆ ئۆزال دەگێڕایەوە. کاتێ لە ماڵەکەی ئەحمەد چەلەبی دەردەکەوتم، تاڵەبانی هەتا بەر دەرگا هات و گەڕایەوە بۆ نزیکایەتییەکەی ساڵانێك بەر لە ئێستای نێوانمان و قۆڵی راکێشام و پێی وتم:" داواکارییەکەم لە بەڕێز سەرکۆمار هەیە. ئەگەر زوو پێی بڵێی و وەڵامەکەیم بدەیتەوە خۆشحاڵ دەبم. با وەفدێکی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق کە من و مەسعودیشی تێدا بێت بانگهێشتی تورکیا بکات. جگە لەوە با بە نهێنی من و مەسعود دەعوەت بکات." هەورەها وتی دەکرێت ناوی ئەو وەفدە عێراقی‌یەی کە لە حەفدە رێکخراو پێکدین، لیژنەی کاری هاوبەش بێت.

چاوەڕوانی پێشنیارێکی وەها نەبووم. دەرگای حەوشەکەم پاڵنا کە بەرەو کۆڵان دەکرایەوە و رووم کردە تاڵەبانی و وتم:" ئۆزال دەسەڵاتی قسەکردن لەسەر ئەم بابەتەی بە من نەداوە، بەڵام داواکارییەکەی پێ دەگەیەنم. پرسیارێکیشم هەیە، بۆچی بانگهێشتی یەکەم ئاشکرا بێت و ئەمەی دووەم شاراوە بێت؟"

تاڵەبانی پێکەنی و وتی:" هاوسەنگییە ناوخۆییەکانی تورکیا بۆ ئەمە گونجاو نین. بۆ ئەوەی بەڕێز سەرکۆمار تووشی ئیحراجی نەکەین وتم و من و مەسعود بارزانی لە ژێر پەردەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بانگهێشت بکات. بیرم لەو کردەوە و ویستم پارێزراو بێت بۆیە ئەو پێشنیارەم کرد. گرنگ ئەوەیە پەیوەندی لەگەڵ ئێمە هەبێت. ئەگەر بە ئاشکراش دەعوەتمان دەکات دەیخەینە سەر سەرمان. بەوەش زۆر زیاتر خۆشحاڵ دەبین." دواتر وتی لە سەر رێگای سەفەر بۆ ئەمریکا‌یە و بەرنامەی گەشتەکەی بۆ باسکردم کە کەی لە کوێ دەبێت و وتی:" کات زۆر کەمە. ئەگەر بانگهێشتی تورکیا‌م پێ بگات، هەموو شتێك رادەگرم و دێم. دەتوانی لە ماوەیەکی کەمدا وەڵامم بدەیتەوە؟" و بەوجۆرەش گوشاری خستە سەرم.

وتم هەر کاتێ گەڕامەوە بۆ تورکیا، لە ماوەیەکی کورتدا ئەو زانیارییانە دەگەیەنمە ئۆزال و لە ماڵەکەی ئەحمەد چەلەبی دەرکەوتم.

حیسابی ئەوەم نەکردبوو کە دیدارەکەمان بگاتە ئەم ئاستە. بە جۆش و خرۆش و هەیەجانێکەوە کە پێی لە عەرز بڕیبووم، گەڕامەوە بۆ هۆتێلی Cumberland کە لە تەنیشتی ماربێل ئارچ‌دا بوو. تەلەفۆنم بۆ کۆشکی چانقایا کرد و پەیامی"دیدارێکی زۆر گرنگ ئەنجامدرا"م بۆ سەرکۆمار دانا و وتم کە پێویستە بە خێرایی یەك ببینین. دەمتوانی یەکسەر گەشتەکەی لەندەن کۆتایی پێبهێنم و بگەڕێمەوە. رۆژی دووشەممە بوو. لە چانقایا هەواڵم بۆ هات کە سەرکۆمار لە کۆتایی هەفتەدا سەردانی ئیستانبوڵ دەکات و پێویست

ناکات من بچم بۆ ئەنقەرە و رۆژی شەممە لە ئیستانبوڵ چاوی پێم دەکەوێت.

دوانیوەڕۆی ئەو رۆژە بەو هەستەی کە لاپەڕەیەکی مێژوویی نوێ لە نێوان تورکیا و کوردەکان'ی عێراق هەڵدەدرێتەوە، سەردانی ئۆفیسەکەی هۆشیار زێباری'م کرد کە لە Kinghtsbridge بوو. هۆشیار زێباری نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان'ی عێراق بوو. لەو کاتانەدا نوێنەرایەتی حزبێکی دەکرد کە لە یەك کاتدا رکابەر و هاوپەیمانی حزبەکەی تاڵەبانی بوو. هەرچەندە موحسین دزەیی لە دیدارەکەی من و تاڵەبانی ئامادە بوو، بەڵام هۆشیار زێباری پۆستی رەسمی هەبوو. مادام کە بۆ کرانەوەی کۆماری تورکیا بە رووی کوردەکان'ی عێراق سەردانی لەندەن'م کردبوو، دەبوو بە بێ جیاوازی لە نێوان هەر دوو گرووپی سەرەکی کورد، لەگەڵ هۆشیار زێباری'شدا دیدارم بکردایە.

هۆشیار زێباری هەموو وردەکارییەکانی دیدارەکەی چەند کاتژمێر بەر لەوەی دەزانی. زۆر بە گەرمی رەفتاری کرد و وتی:"زۆر ئاماژەی پۆزەتیڤ دەگەن." و دواتر ئاماژەکانی ریز کرد:" لەلایەکەوە بڵاوبوونەوەی چاوپێکەوتنەکەی جاناتان راندڵ لەگەڵ مەسعود بارزانی، لەلایەکی دیکەوە بڵاوبونەوەی چاوپێکەوتن و وتەکانی تورگوت ئۆزاڵ لەگەڵ کامەران قەرەداخی لە رۆژنامەی ئەلحەیات و ئەو شتانەی کە ئەمڕۆ ئێوە لە دیدارەکەتاندا لەگەڵ تاڵەبانی و دزەیی سەبارەت بە بیروبۆچوونەکانی تورگوت ئۆزاڵ باستان کردووە."

هۆشیار دەقی چاوپێکەوتنەکەی رانداڵ لەگەڵ مەسعود بارزانی پێدام کە لە گۆشەیەکی دووردەستی خاکی ئێران ئەنجام درابوو. خوێندمەوە. ئیدی کاتی ئەوە هاتبوو کامەران قەرەداخی بدۆزمەوە و بیناسم کە لە یەك هێڵدا دەجووڵاینەوە. لە نوسینگەکەی هۆشیار زێباری دەرکەوتم و سەردانی رۆژنامەی ئەلحەیات'م کرد. کارمەان قەرەداخی لەوێ بوو. دۆستایەتی چەندین ساڵەمان لەو رۆژەوە دەستی پێکرد. کامەران کەسێکی باڵا کورت و خۆش روومەت بوو کە لە یەکەم دیداردا وەك کەسێك دەهاتە پێش چاو کە دەمێکە دەیناسی. وابزانم نزیکەی دە ساڵ لە من گەورەتر بوو. باوکی لە ساڵەکانی ١٩٥٠کاندا والی کەرکوك بووە و ئەویش خۆی بە کەرکوکی دەزانی. لە تەمەنی گەنجێتیدا بەشداری پارتی کۆمۆنیستی عێراق'ی کردووە کە لەو ساڵانەدا ئەدرێسی سیاسی زۆرێك لە کوردەکان بووە. دواتر چووەتە مۆسکۆ و لەوێ زانکۆی تەواو کردووە و لەگەڵ کچێکی روس بە ناوی ئۆڵگا ژیانی هاوسەرییان پێکهێناوە. هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی خۆی لەگەڵ وڵاتەکەیدا نەپچڕاندووە و پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ جوڵانەوەی نەتەوەی کورد'دا هەبوو. لەکاتی راپەڕینەکەی ساڵی ١٩٧٤دا ئەویش رێگای چیاکانی گرتۆتەبەر و "رادیۆی ئازادی" بەڕێوە بردووە کە دەنگی راپەڕین بووە. لەدوای گەورەترین کارەساتی جوڵانەوەی کوردی و شکستهێنانی راپەڕین، کامەران قەرەداخی وەك دەیان هەزار کوردی دیکە، بە ناچاری رێگای شوێنی دیکەی گرتۆتەبەر و لە بەریتانیا نیشتەجێ بووە. بە تێپەڕبوونی کات، لە رۆژنامەی ئەلحەیات وەك رۆژنامەنوسێکی پسپۆڕ

لە کاروباری کورد ناوبانگی دەرکردووە. دواتریش بوەتە هاوڵاتی بەریتانیا. سەرێکی بنەماڵەی کارمەان قەرەداخی دەگەڕێتەوە بۆ عەشیرەتی مللی لە تورکیا. لەبەر ئەوە و لەبەر ئەو رۆژانەش کە لە کەرکوك ژیاوە، کەمێك تورکی دەزانی.

ئەو لایەنەی کامەران قەرەداخی کە زیاتر لە هەموو شتێك کاریگەری لەسەر من دانا، ئەوە بوو کە بە یەك مەسافە لە بارزانی و تاڵەبانی نزیك دەبووەوە. وەك کەسێکی سەربەخۆ مابووەوە و زۆر بە باشی ئاگای لە مێژووی جوڵانەوەی کوردی ـهەبوو. لە هەمانکاتیشدا دەیتوانی بەشێوەیەکی رەخنەگرانە و شیکارانە سەیری هەموو شتێك و هەموو کەسێك بکات و لە هەمووشی گرنگتر ئەوە بوو کە بە راستگۆیی و دادپەروەرانە رەفتاری دەکرد. لەدوای رووخانی سەدام لە ساڵی ٢٠٠٣، کامەران گەڕایەوە بۆ عێراق و هەریەك لە تاڵەبانی و بارزانی کە بە باشی ئاگایان لەم تایبەتمەندییانەی کامەران هەبوو، پێشنیاریان پێکرد کە لەگەڵیان کار بکات. بارزانی داوای لێکرد لە هەولێر ببێتە راوێژکاری و تاڵەبانی پێی گوت لە بەغدا پۆستی سکرتێری گشتی سەرکۆمار وەربگرێت. دیارە پێگەی سکرتێری گشتی سەرکۆمار لە عێراق هاوشێوەی پۆستە هاوتاکەی لە تورکیا نیە و کەسێك لەوێ ئەو پۆستەی هەبێت، دەسی زۆر دەچێت. کامەران لە جیاتی هەولێر، پۆستەکەی بەغدا'ی قبوڵ کرد و بەهۆی تێبینییە وردەکانی کە لە رێی رۆژنامەوانییەوە دەستی خستبوون و هەروەها لەبەر خوێنساردی و لە کیس نەدانی لایەنی شیکارانە و رەخنەگرانەی خۆی، ساڵانێك لە ناوەندی رووداوەکانی عێراق'دا مایەوە. بەهۆی ئەو متمانەیەی کە لە ماوەی ساڵانێکدا لە بەینمان دروست ببوو، لەدوای ٢٠٠٣وە بۆ تێگەیشتن لە رووداوەکانی بەغدا و جوڵانەوەی کوردی، زۆر جار پشتم بە کامەران قەرەداخی دەبەست و ئەویش هیچ کات منی بە هەڵەدا نەبرد. کامەران قەرەداخی لە شوباتی ١٩٩١دا داستانی پەیوەندییەکانی ئۆزال و تاڵەبانی بۆ باسکردم، بەڵام دواتر لە ١٩٩٦/٣/٢٨دا بەشێوەیەکی ورد ئەوەی لە رۆژنامەی Turkish Daily Newsدا گێڕایەوە کە ئیلنور چەڤیك هاوڕێی کاتی سەربازیم دەری دەکرد. با لێرە بە دواوە باقی قسەکان بۆ کامەران قەرەداخی جێ بهێڵم:

"لە رۆژی ١٩٩١/٣/١١، خوالێخۆشبوو تورگوت ئۆزال سەرکۆماری تورکیا لە رێگای مۆسکۆ دا بوو. لە فڕۆکەکەی سەرکۆمار'دا بەشێك لە رۆژنامەنوسە پلەبەرزەکان کە لەو گەشتەدا یاوەری ئۆزال بوون، موناقشەیان لەسەر هەواڵێك دەکرد کە لەو رۆژەدا لە رۆژنامەی حورییەت بڵاوکرابووەوە. بە گوێرەی هەواڵەکە، ئەنقەرە ئامادەکاری بۆ گۆڕینی سیاسەتی خۆی لەبەرامبەر کوردەکان'ی عێراق دەکرد و تەنانەت ئەگەری ئەوەش هەبوو رێگا بدرێت جەلال تاڵەبانی کە یەکێکە لە دوو سەرکردە بە ناوبانگەکەی کورد لەوێ، سەردانی تورکیا بکات.

لە ناکاو سەرکۆمار دەرکەوت. بەرەو بەشی دواوەی فڕۆکەکە دەڕۆیشت کە حەسەن جەمال پرسیاری

دروستی و نادروستی هەواڵەکەی تاڵەبانی لێکرد. ئۆزال لە وەڵامدا وتی تاڵەبانی هات و ڕۆیشت و ئێوەش خەبەرەکەتان لە کیس چووو. بەوجۆرەش ڕۆژنامەنوسانی تووشی سەرسووڕمان کرد. جگە لە ئۆزال، لەنێو ئەو کەسانەی کە لە فڕۆکەکەدا بوون، تەنها دوو کەس هەبوون کە ئاگایان لە ڕووداوەکە هەبوو. یەکیان قایا تۆپەری وتەبێژی ئۆزال و ئەوی دیکەشیان جەنگیز چاندار گۆشەنوسی ڕۆژنامەی گوینەش.

ئۆزال بە ڕۆژنامەنوسانی وت کە بەریتانی و فەرەنسییەکان لەگەڵ کوردەکان ی عێراق دانوستان دەکەن، ئەی تورکەکان بۆ نەتوانن ئەو کارە بکەن. خۆی دەبوایە تورکەکان بەر لەوان ئەو کارەیان بکردایە، چونکە ئەو مرۆڤانە (کوردەکان) لە ناوچەکەی ئێمەدان و ئێمەش کێشەمان لەگەڵیان هەیە.

لە راستیشدا تاڵەبانی لەگەڵ موحسین دزەیی کە وەك نوێنەری مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان ی عێراق دەستنیشانکرابوو، وەك میوانی دەوڵەت سەردانی تورکیا یان کردبوو. موحسین دزەیی لە ڕۆژی ٣/٨دا بە بەڵگەیەکی سەفەری بەریتانی چووبووە فڕۆکەخانەی ئاتاتورك لە ئیستانبوڵ و لەوێ لەلایەن پیاوەکانی سەرکۆمارەوە پێشوازی لێکرابوو. دواتریش هەر لەو ڕۆژەدا بۆ ئەنقەرە یان بردبوو. تاڵەبانی لە شام وە چووبوو بۆ ئەوێ و برابوو بۆ ئەو شوێنە سەربازییەی کە دزەیی لێ بوو.(لەوانەیە تاڵەبانی و دزەیی، کامەران قەرەداخی یان بە هەڵەدا بردبێت، چونکە ئەو دوو کەسایەتییە سیاسییەی کورد لە ئەنقەرە پاڵاس کە وەك میوانخانەی وەزارەتی دەرەوە بەکار دەهات، جێگیر کرابوون.) ڕۆژی ٩ و ١٠ی مانگی ئادار، وەفدێك بە سەرۆکایەتی وەزیری دەوڵەتی کۆماری تورکیا و توگای ئویزچەری ڕاوێژکاری وەزارەتی دەرەوە ئەرکدار کرابوون تا لەگەڵ نوێنەرانی کورد دانوستان بکەن. لە سەر هەموو بەشەکانی دانوستانەکەش زانیاری بە ئۆزال درابوو.

دانوستانەکان دوانیوەڕۆی ١٠ی مانگ کۆتاییان هات و سەرکۆمار، تاڵەبانی و دزەیی لە ئەنجامەکانی ڕازی بوون. هەر دوو سەکردەکەی کورد ناچار بوون لە کۆبوونەوەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق کە هەمان ڕۆژ لە بەیروت دەستی پێ دەکرد ئامادە بن. ئەو ڕۆژە فڕۆکەیەك نەبوو کە بەرەو شام بفڕێت، بۆیە ئەو دوو کەسەیان بە فڕۆکە بردبوو بۆ ئەدەنە و لەوێشەوە بە ئۆتۆمبیلی ڕەسمی ڕەوانەی سنوری سوریا کرابوون. بەو هۆیەشەوە توانییان بۆ ئێوارە لە بەیروت بن. هەموو ئەمانەش بە نهێنی کراون و جگە لەو کەسانەی کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەبووە کەس ئاگای لێ نەبووە.

ئەمەش کۆتایی داستانێك بوو کە سێ هەفتە لەوەوبەر بە بەشداری سەرکۆمارێك و وتەبێژەکەی و دوو ڕۆژنامەنوس دەستپێکردبوو. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە تا ئەو ڕۆژە دانوستانەکانی لایەنی کوردی لەگەڵ هێزە ناوچەییەکاندا ئاستی دەزگا هەواڵگرییەکانی تێپەڕ نەکردبوو، ئەو کۆبوونەوەیەی لایەنی کوردی لەگەڵ سەرکردایەتی هێزێکی ناوچەییدا شتێکی دەگمەن بوو کە تا ئەو کاتە نەکرابوو.

هەموو ئەمانە چۆن کران؟

وەڵامەکەی ئەو کەسانە نائومێد دەکات کە زۆر حەزیان لە تیۆرەکانی فێڵ و گەمەیە. بە دڵنیاییەوە باسی ئەمە دەکەم، چونکە خۆم یەکێك بووم لەو دوو رۆژنامەنوسەی کە رۆڵمان لە رووداوەکەدا هەبووە. بیرۆکەی پەیوەندی گرتنی سەرکۆمارێکی تورکیا لەگەڵ کوردەکان‌ی عێراق، ئەویش لەکاتێکدا کە هێشتا تورکیا هەبوونی کوردەکان‌ی خۆی بە رەسمی نەناسێ، لە١٦/٢/١٩٩١ لە چاوپێکەوتنێکمدا لەگەڵ تورگوت ئۆزال سەرکۆماری تورکیا کە بۆ رۆژنامەی ئەلحەیات ئەنجامم دەدا، هەروا لە خۆیەوە دەرکەوت.

رۆژی١٧/١/١٩٩١ هێزە هاوپەیمانەکان بە پێشەنگایەتی ئەمریکا هێرشی ئاسمانییان لە دژی عێراق دەستپێکردبوو. رۆژی دواتر چوومە ئەنقەرە و لەوێشەوە بەرەو دیاربەکر فڕیم. لە باشووری خۆرهەڵات لەسەر سنوری تورکیا - عێراق، بۆ ماوەی یەك مانگ چاودێری رووداوەکانم بۆ رۆژنامەکەم کرد. بەر لەوەی بگەڕێمەوە بۆ ئەنقەرە، لە دیاربەکر فاکسێکم بۆ قایا تۆپەری بەڕێوەبەری گشتی راگەیاندنی سەرکۆماری تورکیا نارد و داوام لێکرد چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ تورگوت ئۆزال بۆ رێکبخات. لە ئەنقەرە پێیانگوتم کاتژمێر ١٢:٠٠ی رۆژی ١٦ی شوبات، قایا تۆپەری لە ماڵی سوپا لە حەربییەی ئیستانبوڵ چاوەڕوانی من دەکات. ئەوێ، شوێنی حەوانەوەی ئۆزال لە ئیستانبوڵ بوو.

من لە هۆتێل هیلتۆن دەمامەوە. لە رۆژ و کاتی دیدارەکەدا، لە قادرەمەکانی بینایەکی بەرامبەر هۆتێل هیلتۆن سەرکەوتم و چوومە نهۆمی ٢١ و سەردانی ئۆفیسەکەی قایا تۆپەری‌م کرد. تۆزێ قسەمان کرد و دوای ئەوەش پێی وتم کاتژمێر ٤:٠٠ی دوانیوەڕۆ بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرکۆمار سەردانی ئێرە بکە. ئەوەشی پێگوتم کە ژمارەیەکی زۆر لە رۆژنامەنوسان دەیانەوێ سەرکۆمار ببینن بۆیە بۆ چاوپێکەوتنەکە تەنها بیست خولەکم هەیە.

لەکاتی خۆیدا گەڕامەوە بۆ حەربییە و چوومە نهۆمی ٢١، بەڵام هێشتا پەنجا خولەك مابوو هەتا نۆرەی من بگات و چوار کەسی دیکەش لەدوای منەوە نۆرەیان گرتبوو. کاتێ چووینە ژوورەکەی سەرکۆمار، ئەوەم بیر خۆم هێنایەوە کە ماوەکەم لە بیست خولەکیش کەمترە. لەلایەن قایا تۆپەری کە ئۆزال‌ی لە هاتنی من ئاگادار کردبووەوە پێشوازیم لێکرا. ئۆزال لە تەلەفزیۆنەوە تەماشای یاری تۆپی پێی دەکرد. سەیری منی کرد و ئاماژەی بە کورسییەکەی تەنیشتی کرد و بە زمانێکی گەرم و دۆستانە و بە تورکی پێی وەتم: وەرە لام دانیشە. تەوقەمان کرد و قایا تۆپەری لەبەرامبەرمان دانیشت. بە تورکی وتم: تۆزێك تورکی دەزانم. دواتر بە ئینگلیزی درێژەم پێدا و وتم بەڵام بەشی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنێك ناکات.

دەفتەری یادداشت و ئامێری تۆمارکردنەکەم ئامادە دەکرد، بەڵام ئۆزال هەر خەریکی تەماشاکردنی یاری بوو. کات تێپەڕ دەبوو، منیش تەنها بیست خولەکم هەبوو. نیگەران ببووم. ئۆزال بە کۆنترۆڵەکەی دەستی

ئاماژەی بە مەیدانی یارییەکە کرد کە لە تەلەفزیۆن پیشانی دەدا و وتی: سەیری ئەو مەیدانە بکە چەنێ سەوزە. ئەوە چیمەنی سروشتییە. کاتێ بووم بە سەرۆك وەزیر، فەرمانمدا هەموو مەیدانەکانی یاری تۆپی پێ بە چیمەنی راستەقینە سەوز بکەن. بەو قسانە ئاسوودە ببووم کە ئۆزال جارێکی دیکە منی ئاگادار کردەوە و وتی: دەمزانی تۆ کوردی. ئامێری تۆمارکردنەکەت مەکەرەوە. من دەمەوێ لەبارەی کوردەکان'ی عێراق پرسیارت لێ بکەم، چاوم لە تۆپەری بوو کە خۆی بۆ یادداشت وەرگرتن حازر دەکرد. لە دڵی خۆمدا وتم کێ لەگەڵ کێ چاوپێکەوتن دەکات؟

دوای ئەوەش سەرکۆماری تورکیا، لەبارەی کوردەکان'ی عێراق نزیکەی ٦٠ خولەك چاوپێکەوتنی لەگەڵ من کرد. لە ماوەیەکی کورتدا پرسیار و وەڵامەکان وەك قسە و باسێکی دۆستانەی لێهات. بەردەوام ئەوەی دووبارە دەکردەوە کە پێویستە تورکیا وەك دوژمنی کوردەکان سەیر نەکرێت. ئاماژەی بە نەخشەیەکی عێراق کرد کە لەسەر مێزەکەی تۆپەری راخرابوو، وتی: بە پێچەوانەوە، بە شێوەی سروشتی تورکیا لە عێراق پشتیوانیی کورد و تورکمانەکان دەکات.

دواتر لەسەر کوردەکان'ی تورکیا قسەی کرد. من وتم هەتا دەوڵەتی تورك نکۆڵی لە شوناس و مافە رەواکانی کوردەکان بکات، کێشەی کورد بەردەوام دەبێت. کوردەکان'ی تورکیا تەنانەت ناتوانن فێری زمانەکەی خۆیشیان بن. ئۆزال قسەکەی پێ بڕیم و وتی: ئەی وەزعی کوردەکان'ی عێراق چۆنە؟ لە وەڵامدا وتم سەرەڕای هەموو وەحشیگەرییەکانی، رژێمی عێراق قەد نکۆڵی لە شوناسی کوردی نەکردووە. بە پێچەوانەوە تەنانەت لە هەولێر زانکۆیەکی دەوڵەت هەیە کە بە کوردی تێیدا دەخوێنرێت. دەوڵەت خانەی چاپ و پەخشی کوردی و رادیۆ و تەلەفزیۆنی کوردی هەیە. ئۆزال وەك کەسێکی سەرسووڕماو دەهاتە بەرچاو. دوای تۆزێك راوەستان وتی: دەکرێ هەموو ئەمانەش لە تورکیا هەبن. پرسیاری پەیوەندی کوردەکان'ی عێراق و پ.ك.ك'ی کرد. کاتێ لەمبارەیەوە قسەمان دەکرد، ئۆزال وتی پێویستە تورکیا وەك دوژمنی کوردەکان سەیر نەکرێت و سەرکردەکانی کوردەکان'ی عێراق دەتوانن متمانە بەو بکەن. لەو خاڵەوە ئیلهامێکم بۆ هات و ئەم قسانەم لە دەم دەرکەوت: بەڕێز سەرکۆمار! بۆچی لەگەڵ سەرکردەکانی کوردەکان'ی عێراق پەیوەندی راستەوخۆ بەرقەرار ناکەن؟ دڵنیام لە هەموو شتێك زیاتر حەز لەمە دەکەن.

یەکسەر درکم بەوە کرد کە لەوانەیە ئەم قسانە وا پیشانبدات کە من بە ناوی سەرکردەکانی کوردی عێراق'ەوە قسە دەکەم. لە راستیدا ئەوان هەر ئاگایان لە دیدارەکەی من و ئۆزال نەبوو. ئەی ئەگەر ئۆزال بڵێ باشە و بارزانی و تاڵەبانی بڵێن نابێ؟!

ئۆزال سەرەتا سەیری منی کرد و دواتر تەماشای تۆپەری کرد و دواتریش دیسان سەیری منی کردەوە. ئاسوودە ببووم لەوەی کە یەکسەر وەڵامی پێشنیارەکەمی نەدابووەوە. دواتر وتی: گرنگترین شت ئەوەیە

کوردەکان‌ی عێراق بزانن تورکیا دوژمنیان نیە. ئەوەش کە زیاتر ئاسوودەی کردم ئەوە بوو کە ئۆزال رازی بوو چاوپێکەتنێکم لەگەڵ بکات بۆ ئەوەی بڵاوی بکەمەوە.

لێی جیابوومەوە و چاوەڕوانی ئاسانسۆرەکەم دەکرد کە قایا تۆپەری دەستی گوشیم و وتی: وەك برای خۆی رەفتاری لەگەڵ کردی.

ئەو کاتانە نەمدەزانی قۆناخێکی مێژوویی هەیە کە ئۆزال سوورە لەسەر ئەوەی بیبڕێ. دواتر ئۆزال و من و جەنگیز چاندار، پێکەوە بۆ بەرقەرارکردنی پەیوەندی نێوان تورکیا و کوردەکان‌ی عێراق کارمان کرد. دوای چاوپێکەوتنەکەی ئۆزال، گەڕامەوە بۆ هۆتێل و چیرۆکەکەی خۆم نوسی و بۆ رۆژنامەی ئەلحەیات فاکسم کرد. لەدوای ئەوەش یەکسەر تەلەفۆنم بۆ تاڵەبانی کرد کە ئەو کاتانە لە لەندەن بوو. باسی پێشکەوتن و رووداوەکانی عێراق‌مان کرد و دواتر باسی چاوپێکەوتنەکەی خۆم و ئۆزال‌م بۆکرد.

-:بە ئۆزال‌م گوت پێویستە لەگەڵ ئێوەدا پەیوەندی بگرێت. شتێکی باشم گوتوە؟ تاڵەبانی وتی: تۆ جیدیت؟ چی گوت؟ لە وەڵامدا پێمگوت کە ئۆزال هیچی نەگوتوە بەڵام تێبینی ئەوەم کرد کە ئەگەر کوردەکان لەوبارەیەوە هەنگاوێك بنێن، لەوانەیە ئۆزال بە خێرایی وەڵام بداتەوە. تاڵەبانی یەکسەر ئەوەی بە فرسەت زانی و وتی تۆ دەتوانی بە ناوی من و بارزانی داوای دیدارێکی رەسمی لە ئۆزال بکەیت؟

رۆژی١٧ی شوبات‌ی١٩٩١، جارێکی دیکە چوومەوە بۆ حەربییەی ئیستانبوڵ. پێیانگوتم قایا تۆپەری لەوێ نیە. لەبەر ئەوە یادداشتێکم بۆ قایا تۆپەری نوسی و تێیدا باسی پێشنیارەکەی تاڵەبانی‌م بۆ کرد و ژمارە تەلەفۆنەکەی خۆیشم دانا بۆ ئەوەی بتوانێ لەگەڵما پەیوەندی بگرێت و هەر لەو رۆژەشدا گەڕامەوە بۆ لەندەن.

هەفتەیەك دواتر، لە سەرۆکایەتی کۆماری تورکیا‌وە تەلەفۆنێکم بۆ هات. قایا تۆپەری بوو. پێی گوتم: تکایە بە تاڵەبانی و بارزانی بڵێ، سەرکۆمار قبوڵی کردووە کە دیداریان لەگەڵ بکات.

پەیوەندییەکان لە حوزەیرانی ١٩٩١دا، کاتێك کە سەرکۆمار بە شێوەی ئاشکرا لە کۆشکی چانقایا دیداری لەگەڵ تاڵەبانی کرد، گەیشتنە لوتکە. بە رەسمی رێگا بە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان درا کە نوسینگەی خۆیان لە ئەنقەرە بکەنەوە. ئەو دوو سەرکردەیەش بە بەردەوامی لەگەڵ سەرکۆمار و بەرپرسانی باڵای تورکیا درێژەیان بە دانوستانەکانیان دا. لەدوای مەرگە ناوەختەکەی ئۆزال لە نیسانی ١٩٩٣دا، پەیوەندی تورکیا و کوردەکان‌ی عێراق رووی لە نوشست کرد..."

ئەو شتانەی کە کامەران پێنج ساڵ دواتر سەبارەت بەو قۆناخە مێژووییە باسی کردبوون، تا ئەندازەیەك لە جێی خۆیدا بوون. ١٩٩١/٢/١٨، دوای دیدار لەگەڵ جەلال تاڵەبانی و موحسین دزەیی گەڕامەوە بۆ تورکیا و چاوەڕوانی بینینی ئۆزال مامەوە. لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی هەڕەشەیەکی نادیارەوە کە لەسەر

ژیانم هەبوو، لە جیاتی ئەوەی بڕۆمەوە بۆ ماڵەکەی خۆم، لە هۆتێلێکدا مامەوە کە کەم کەس ئاگای لێ بوو. بەپێی ئیمکانە تەکنەلۆژییەکانی ئەو سەردەمە، ئامێرێکی هەرە پێشکەوتووی ئاگادارکردنەوەیان پێدابووم. ڕۆژی ٢٣ی شوبات، لە ئامێری ئاگادارکردنەکەوە پەیامم بۆ هات کە تورگوت ئۆزال کاتژمێر ١٩:٠٠ لە ماڵی سوپا لە حەربییە چاوەڕوانیم دەکات. لە نهۆمی سەرەوەی ماڵی سوپا کە سویتێکی تایبەت بە حەوانەوەی خێزانی ئۆزال و قایا تۆپەری بوو، ئۆزال وەك هەموو جارێك تەماشای CNN,Iی دەکرد. کاتێ من چووم، ڕۆیشتینە ژووری کارەکەی و ئەمجارەیان قایا تۆپەری لە لامان مایەوە. لە لەندەن کامەران باسی ڕۆڵی قایا تۆپەری بۆ من کردبوو. ئیتر دەمزانی کە پێویست نیە ئەو شتانە لە تۆپەری بشاردرێنەوە کە من بۆ ئۆزال باسیان دەکەم.

دوای سەرەتایەك، باسی هەر دوو پێشنیارەکەی تاڵەبانی'م بۆ کرد کە لەبەر دەرگای ماڵەکەی ئەحمەد چەلەبی لە لەندەن پێی گوتبوم. تاڵەبانی داوای لە ئۆزال کردبوو یان لەنێو وەفدێکی عێراقی'دا بانگهێشتی خۆی و مەسعود بارزانی بکات، یان بە نهێنی هەردووکیان دەعوەتی تورکیا بکات.

دواتر ئەوەشم پێ زیاد کرد کە تاڵەبانی بەرنامەی سەفەری هەیە. بۆیە لە ماوەیەکی کورتدا چاوەڕوانی وەڵام دەکات تا بەرنامەکانی سەفەرەکەی بە گوێرەی ئەوە ڕێکبخات.

سەرکۆمار دوای تۆزێك راوەستان رووی کردە قایا تۆپەری و وتی:"لەگەڵ تیۆمان قسە بکە، لە ماوەی چەند ڕۆژدا بڕۆن. دەکرێ دیدرەکە لە باڵیۆزخانەی تورکیا لە پاریس بێت، چی دەڵێی؟"

بە پێویستم زانی قسە بکەم. وتم:" پێشنیارەکەی ئەوان بۆ ئەوەیە کە دەعوەتی تورکیا بکرێن. کە وابێ نەك باڵیۆزخانەی پاریس و نەهی لەندەن و هی هیچ شوێنێکی دیکەش نابێت. جگە لەوە ئەم هەواڵە دزە دەکات و وەزارەتی دەرەوەی ئێمەش بە گەرمی پێشوازی لە شتێکی وەها ناکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ بیر لە شوێنێکی وەك باڵیۆزخانەی تورکیا لە سوید بکرێتەوە."

تورگوت ئۆزال بە قایا تۆپەری وت:" ئیتر سەیرکەن بزانن، با لەم هەفتەیەدا ئەو کارە بکرێ و ببڕێتەوە."

جارێکی دیکە لەسەر ئەو بابەتە قسەی نەکرد. سەمرا ئۆزال لە ژوورەوە دەیگوت خواردن حازرە. پرسیاری لێکردم:"خواردنت خواردووە؟" چاوەڕوانی وەڵامەکەم نەما و منی بۆ مێزی خواردن برد. بولەنت ئاکارجالی یەکێك لە وەزیرەکانی ANAP لە حکومەتیش لەسەر سفرەی خواردن بوو. دوای خواردن ئۆزال هاتە بەر تەلەفزیۆن بۆ ئەوەی سەیری چاوپێکەوتنە تایبەتەکەی لە CNN,International بکەین. دوای ماوەیەکی دیکە جۆرج بوش سەرۆکی ئەمریکا تەلەفۆنی کرد. تورگوت ئۆزال وتیHi George و چەند خولەکێك قسەی لەگەڵ کرد. یەکەمجار بوو شاهیدی قسەی تەلەفۆنی ئەو دوو سەرکردەیە بم. دوای قسەکان خۆم پێ ڕانەگیرا و سەرم نایە سەری ئۆزال و وتم:"ماشەڵا! ئەوە چ دۆستایەتییەکە؟ بە جۆرج بانگی دەکەن..."

وەك ئەوەی لە دنیای ئۆزال'دا ئەمە شتێكی ئاسایی بێت، شانی هەڵتەكاند و وتی:" ئەویش بە تورگوت بانگی من دەكات..."

بە كۆنترۆڵەكەی دەستی كەناڵەكانی دەگۆڕی و بەردەوام سەیری CNN,International ی دەكرد و وتی:" چییان لێ هات ئەمانە؟" خۆمم پێ رانەگیرا و وتم "كێ چی لێهات؟"

ئۆزال زۆر بە ئاسانی نهێنییەكی دركاند كە خەڵكێكی زۆر كەم دەیانزانی:" پێویستبوو شەڕی وشكانی و زەمینی دەستپێبكات، هێشتا هەواڵەكەی نەهات بۆ ئەوە..."

-"شەڕی زەمینی لەم كاتانەدا دەست پێدەكات؟ پێیانگوتوون؟"

-" جۆرج وتی!"

لە راستیشدا ئەو جەنگە زەمینییەی كە سەدام بە"دایكی شەڕەكان" ناوی دەبرد و دەیگوت لە حاڵەتی روودانیدا خاكی عێراق دەكەینە گۆڕستانی هێزە هاوپەیمانەكان، چەند كاتژمێر دوای ئەو دیالۆگەمان روویدا. لەگەڵ قایا تۆپەری، ئۆزال'مان لای تەلەفزیۆنەكە جێهێشت و دەركەوتین. بە قایا تۆپەری'م وت:" كاكە! ئەو تیۆمان'ەی كە تورگوت بەگ باسی دەكرد كێیە؟"

-"تیۆمان كۆمان."

تیۆمان كۆمان راوێژكاری میت، یەكێك لە فەرماندەكانی سوپا بوو كە بە توندڕەوی لە دژی كوردەكان و لایەنە ئیسلامییەكان ناوبانگی دەركردبوو. لەو كاتەدا تێگەیشتم كە لە راستیدا دەوڵەتی تورك خەریكی دامەزراندنی میكانیزمێكە بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ كوردەكان'ی عێراق و كارەكەی منیش كۆتاییپێهاتووە. ئەو شتەی كە من و سەرۆكی دەوڵەت كارمان بۆی دەكرد، دەوڵەت بۆ خۆی خەریكی ئەنجامدانی بوو.

هەر بە راستیش، جگە لەو پەیوەندییەی كە لە بەینی ئیستانبوڵ و لەندەن لە نێوان من و كامەران قەرەداخی مایەوە، من لە مەوزوعەكە دەركەوتم. نەمدەزانی قایا تۆپەری و تیۆمان كۆمان چ كاتێك لە كوێ لەگەڵ تاڵەبانی یەكتر دەبینن و پرسیاریشم نەكرد. چەند رۆژ دواتر سەبارەت بە بابەتێكی دیكە تەلەفۆنم بۆ قایا تۆپەری كرد و دوای تەواوبوونی قسەكانمان، وام دانا كە لە ماوەی چەند رۆژدا سەفەر دەكات، بۆیە وتم:"سەفەرێكی خۆش." ئەویش لە وەڵامدا وتی:" سەفەری چی؟ من بۆ هیچ كوێ ناچم."

-"ئەی قەرار نەبوو لە شوێنێكی ئەورووپا تاڵەبانی ببینن..."

-" بڕیارەكە گۆڕا. ئێمە ناچین ئەو دێت."

وادانانێكم بۆ بەرواری هاتنەكەی تاڵەبانی هەبوو. تەسەورم نەدەكرد كە بتوانم لە توركیا دیدارێكی لەگەڵ بكەم. دیاربوو كە دەوڵەت زۆر بە نهێنی دیدارەكەی رێك دەخست. تاڵەبانی لەدوای سەردانە نهێنییەكەی بۆ توركیا، ناچاربوو رۆژی ١٠ی مارت بەشداری لە كۆبوونەوەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لە بەیروت بكات.

دەمتوانی لەوێ ببینم و گوێم لە تێبینییەکانی لەبارەی تورکیا بێت.

جەنگی زەمینی، بە دەرکردنی هێزەکانی عێراق لە کوەیت و ڕێ خۆشکردن بۆ هێزی هاوپەیمانەکان تا بەرەو بەغدا پێشڕەوی بکەن سەد کاتژمێری خایاندبوو. دوای ئەوەش ئاگربەست ڕاگەیەنرابوو. هەرچەندە ئەژنۆی سەدام شکابوو، بەڵام هێشتا لە بەغدا ئەو حوکمی دەکرد. سەرۆك بوش لە ١٩٩١/٢/١٥دا داوای لە خەڵکی عێراق کرد کە دژی سەدام ڕاپەڕن و شیعەکان بە قسەیان کرد. تەخیمن دەکرا کە شیعەکان ٦٠٪ی ژمارەی دانیشتوانی عێراق پێکبهێنن و شارەکانی باشووری عێراق، وەکو بەسرە کە زۆرینەی دانیشتوانەکەیان شیعە بوون یەك لەدوای یەك دەکەوتن. لە باکووریش ئەگەری ڕاپەڕینی کورد لە ئان و سات'دا بوو.

سەردانی بەیروت'م کرد. هۆتێلی بریستۆن کە بڕیاربوو کۆبونەوەکەی تێدا بکرێت لە ئەندامانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق جمەی دەهات و پیاوانی ئایینی شیعە کە زۆربەیان جەمەدانی ڕەش و سپی و عەبای درێژیان لەبەردا بوو، زیاتر لە هەمووان بەرچاو دەکەوتن. جاربەجار لەبارەی ڕاپەڕینی شیعەکان زانیاری دەدرا و بە گوێرەی کەش و هەوای ئەوێ بوایە، سەدام یان لە ماوەیەکی نزیکدا دەڕووخا یان دەیان رووخاند و هەڵدەهات. منیش لەلایەکەوە بە دوای د. موزەفەر ئارسڵان سکرتێری گشتی پارتی نەتەوەیی تورکمانی عێراق دەگەڕام کە بۆ یەکەمجار ناویم بیستبوو، لەلایەکی دیکەشەوە پرسیارم دەکرد تا بزانم تاڵەبانی کەی دەگات. کامەران قەردەاخی لەوێ بوو. ئەو پێی گوتم تاڵەبانی و موحسین دزەیی پێکەوە سەردانی ئەنقەرە'یان کردووە.

سەردانەکەی تاڵەبانی بۆ بەیروت دواکەوت و منیش ناچاربووم بگەڕێمەوە بۆ تورکیا، چونکە ڕۆژی ١١ی مارت ئۆزال سەردانی مۆسکۆی دەکرد کە ماوەیەکی درێژ بوو بەلایەوە گرنگ بوو. لەو سەردانەشدا لەگەڵ گۆرباچۆڤ دیداری دەکرد کە لە سەفەرەکانی پێشوویدا نەیتوانیبو ببینێ. منیش بەشداریم لەو گەشتەدا دەکرد.

ڕۆژی ١١ی مارت ئەرتوغروڵ ئویزکویك لە ستونەکەی خۆی لە ڕۆژنامەی حوڕییەت، باسی ئەوەی کردبوو کە لەوانەیە لە ڕۆژانی داهاتوودا تاڵەبانی سەردانی تورکیا بکات. ئەو ڕۆژەی کە ستونەکە بڵاوکرایەوە، تاڵەبانی سەردانی ئەنقەرە'ی کردبوو و تەنانەت ڕێگای بەیروت'یشی گرتبووە بەر. بەڵام ئەرتوغروڵ ئویزکویك لە کوێ ئاگای لە"ئەگەری" سەردانی تالەبانی هەبوو؟

ئایرباسی هەڵگری سەرکۆمار و وەفدە جەنجاڵەکەی یاوەری، بە ئاسمانی یەکێتی سۆڤییەت'ەوە بوو کە بەرەو بەشی پێشەوەی فڕۆکەکە ڕۆیشتم. پرسیاری سەرچاوەی دزەپێکردنی هەواڵەکەم لە قایا تۆپەری دەکرد. هاوکات لەگەڵ ڕۆیشتنی من، ئۆزال لەولاوە بەرەو شوێنەکەی من بۆ قسەکردن لەگەڵ ڕۆژنامەنوسان دەهات. بە پێکەنینەوە دەستمان بۆ یەك بەرزکردەوە. ڕۆیشتمە پێشەوە و پرسیارەکەم لە قایا تۆپەری کرد.

سوێندی خوارد و وتی هەواڵەکە لەلای منەوە دزەی نەکردووە. تاڵەبانی لەگەڵ موحسین دەزیی هاتبوو. لە میوانخانەی دەوڵەت یانی لە ئەنقەرە پالاس، لەگەڵ توگای ئویزچەری راوێژکاری وەزارەتی دەرەوە و جەنگ دوئاتەپە سەرۆکی بە ڕێوەبەرایەتی هەواڵگری وەزارەتی دەرەوە کۆببوونەوە. جگە لەم دو کەسە، هیچ کەسێکی دیکە دیداری لەگەڵ نەکردبوون.

ئاماژەم بە گوینەش تانەر وەزیری دەوڵەت کرد کە لەوبەرەوە دانیشتوبوو. وتم:" گوینەش دۆستایەتی لەگەڵ ئەرتوغروڵ هەیە و زانیاری زۆری پێدەدات. تورگوت بەگ قسەیەکی لەم دەرنەچووبێ و باسی ئەو سەردانە نهێنییەی بۆ گوینەش تانەر کردبێ؟" تۆپەری بە بێ هیچ دوودڵییەك وتی:"لەوانەیە."

خەریکبوو لە مۆسکۆ دەنیشتینەوە. دەگەڕامەوە بۆ شوێنەکەی خۆم کە ئۆزال لەولاوە دەگەڕایەوە بۆ شوێنەکەی خۆی. دیسان بە پێکنینەوە سڵاومان لە یەك کرد. کاتێ گەڕامەوە شوێنەکەی خۆم، هیچ شتێك وەك خۆی نەمابوو." تاڵەبانی بە نهێنی سەردانی تورکیای کردووە و رۆیشتووە." ئەم هەواڵە وەك بۆمبێکی خەبەری لەنێو رۆژنامەنوساندا لە بەشی دواوەی فڕۆکەکە کەوتبوو. هەرکەس پەیتا پەیتا یادداشتی وەردەگرت و لە یەك یەکتردا گفتوگۆیان دەکرد. لە شوێنەکەی خۆم لە تەنیشت ئولوچ گویرکان دانیشتم. بە کەمتەرخەمییەوە وتم:" کێ ئەمەی وت؟ لە کوێوە ئەم شتانە دەهێنن؟"

-"ئۆزال وتی."

-"چۆن ئۆزال وتی؟ کەی وتی؟"

-"تۆزێك بەر لە ئێستا. حەسەن جەمال وتی نوسینەکەی ئەرتوغروڵ ئویزکویك راستە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی هات و رۆیشت و ئێوەش ئاگاتان لێ نەبوو. خەبەرەکەتان لە کیس چوو. ئێوە چ جۆرە رۆژنامەنوسێکن و بەوجۆرەش گاڵتەی خۆی کرد."

لە راستیشدا هاتبوو و رۆیشتبووە.

کاتێ فڕۆکەکە لە مۆسکۆ نیشتەوە، دەردی هەموو رڕۆژنامەنوسەکان ئەوە بوو کە یەکسەر بگەنە هۆتێلی روسیا و ئەم بۆمبە خەبەرییە ئەمدیوئەودیو بکەن و رەوانەی رۆژنامەکانیان بکەن. ئەو سەردانەی کە تورگوت ئۆزال گرنگییەکی زۆری پێدەدا و رۆژانێك بوو چاوەڕوانی دەکرا تا بۆ یەکێتی سۆڤییەت ئەنجامبدرێت، بەهۆی هەواڵی"تاڵەبانی سەردانی تورکیای کرد" نرخە خەبەرییەکەی خۆی لە دەسدابوو.

رۆژنامەنوسانی یاوەری تورگوت ئۆزال لە سەفەرەکەی مۆسکۆ، بۆ رووماڵکردنی دیدارەکەی گۆرباچۆڤ - ئۆزال نەهاتن. لەکاتێکدا کە زۆر کەس مەراقی بینینی ناوەوەی کۆشکی کرملینی دەکرد، رۆژنامەنوسانی تورك ئەو دەرفەتەیان بەکارنەهێنا تا ئەودیو دیوارەکانی کرملین ببینن کە ساڵانێك لە جیهاندا مەرکەزی کۆمۆنیزم بوو. هەموویان لە هۆتێلی روسیا خەریکی گەیاندنی هەواڵەکەی تاڵەبانی بە رۆژنامەکەیان بوون.

تورگوت ئۆزال، ڕێك لەبەرامبەر میخائیل گۆرباچۆڤ'دا بە پێکەنینەوە لەبەردەم کامێراکاندا وەستابوو. بەڵام کاتی لە رۆژنامەنوسانی راگەیاندنی نوسراوی تورکی کە لە فڕۆکەکەدا لەگەڵی بوون کەسی نەبینی، بە نیگایەکی پڕ لە پرسیارەوە سەیری ئەملاولای دەکرد. قایا تۆپەری بەرپرسی راگەیاندن بۆ سەرزەنشت کردن، بە دەنگێکی تێکەڵ بە سەرسووڕمان و تووڕەیی رووی کردە من و وتی:"کوره ئەمانە لە کوێن؟" ئاماژەم بە سەرکۆمار کرد و وتم:" بەو بڵێ. لە سایەی ئەو نەهاتوون. هەواڵ دەنوسن." لە گوزارشتی روخساری قایا تۆپەری تێگەیشتم کە لە مەبەستەکەم تێنەگەیشتووە.

لەو بەینەشدا لەنێو فڕۆکەکەدا تیروپشك بۆ دیاریکردنی ناوی دوو رۆژنامەنوسی تورك کرابوو تا بەشداری لە ئێوارەخوانێکی کۆشکی کرملین بکەن کە لەسەر شەرەفی تورگوت ئۆزال رێکدەخرا. من و خوالێخۆشبوو موعەمەر یاشار تیروپشکەکەمان بردبووەوە. ئێوارەخوانەکە لە یەکێك لە بەشە مێژوویيەکانی هۆڵی دیمەنەکانی کۆشکی کرملین بوو. لە رابردووشدا قەیسەرەکانی روسیا، خواردنە رەسمییەکانی خۆیان لەو هۆڵەدا خواردووە و بەو پێیەی کە بە من گوترابوو، یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی ئەو هۆڵە ئەوەبوو کە شوێنەدەست و بەرهەمەکانی ئاندرەی رووبلەڤ هونەرمەندی گەورەی رەمز و نەخشی سەردەمی چاخەکانی ناوەڕاستی پێوە بوو. لە سایەی فیلمی"ئاندرەی رووبلەڤ"ی ئاندرەی تراکۆفسکی ناوی ئەو هونەرمەندە نەمرەم دەزانی و لەبەر ئەوەی کە لە هۆڵێکدا لەگەڵ گۆرباچۆڤ و ئۆزال لە ئێوارەخوانێکدا بووم و جگە لەوەش لەبەر ئەوەی لەگەڵ یەڤگینی پریماکۆڤ رۆژنامەنوسی پسپۆڕی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و یەکێك لە ئەکتەرە سەرەکییەکانی دەستنیشانکردنی سیاسەتی یەکێتی سۆڤییەت لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی عێراق، پێکەوە لەسەر مێزێك دانیشتبووین، لە هەیەجان و جۆش و خرۆشدا بووم. پریماکۆڤ، جگە لەوەی کە یەکێك لە گرنگترین سیخوڕەکانی KGBبوو، لەدوای رووخانی یەکێتی سۆڤییەت لە سەردەمی بۆریس یێلتیسن'دا بۆ ماوەیەك پۆستی سەرۆك وەزیرانی هەبووە. بۆ ئەوەی بتوانین بچینە ناو هۆڵی خواردنەکە، پێویستبوو چەند کاتژمێرێك زووتر ئاسایشی کۆشکمان لەوە ئاگادار بکردایەتەوە کە بە چ ئۆتۆمبیلێك سەردانی کۆشك دەکەین. لەگەڵ ئەوەشدا موعەمەر یاشار سووربوو لەسەر ئەوەی کە بەشداری ئێوارەخوانەکەی کۆشك نەکات.

مومکین نەبوو، بتوانین قەناعەتی پێبکەین. دەیگوت:" جەنگیز گیان! من ساڵانێکە رۆژنامەنوسم. ئەم هەواڵەی تاڵەبانی زۆر گرنگە. زۆر زۆر گرنگە. خەریکم بیر دەکەمەوە بزانم لە ماوەی تەمەنی رۆژنامەوانیمدا هەواڵی لەمە گرنگتر هەبووە یان نا. بەڵام هیچ نادۆزمەوە. پێویستە دانیشم و بنوسم."

ئەو شەوە لە هۆڵی دیمەنەکاندا، لەگەڵ پریماکۆڤ دیالۆگێکی کورتمان لەسەر عێراق هەبوو. لای من وەك کەسێکی کەمتەرخەم و بێ تام و ناشیرین دەرکەوت. هاوشێوەی ئەو سیخوڕانەی KGB بوو کە

لە ساڵانی جەنگی سارد لە فیلمە ئەمریکییەکان'دا پیشان دەدران. ناتوانم بەرهەمی فڵچەکانی ئاندرەی رووبلەڤ و ئێوارەخوانەکەی شەوی ١٩٩٠/٣/١١ لە ژێر هەیوان و رەنگی زەردی چڵکنی دیوارەکانی کرملین فەرامۆش بکەم. زۆربەی ئەو بەرپرسانەی روسیا کە لەو ئێوارەخوانەدا لەگەڵمان بوون، چەند مانگ دواتر لە دژی گۆرباچۆڤ کودەتایان دەکرد و کۆتاییان بە یەکێتی سۆڤییەت دەهێنا. دواتر لەبەر ئەوەی کە لەو شەوەدا هەوڵم نەدا زیاتر بیانناسم، زۆر لە خۆم تووڕە بووم.

بەر لە ئێوارەخوانەکەی هۆڵی دیمەنەکانی کرملین، لە شوێنی حەوانەوەی سەرکۆمار لە باڵیۆزخانەی تورکیا، مەراسیمێکی پێشوازیکردن لە تورگوت ئۆزال رێکخرابوو. کاتی گەیشتینە ئەوێ، ئۆزال چاوی بە وەفدێکی گاگاوز دەکەوت. قایا تۆپەری کاتێ منی بینی، دیسان پرسیاری ئەوەی لێکردم کە بۆچی رۆژنامەنوسەکان بۆ دیدارەکەی کرملین نەهاتبوون. زانیم کە تۆپەری ئاگای لەو لێدوانە نەبوو کە کاتێك من و ئەو لە فڕۆکەکەدا قسەمان کردبوو، تورگوت ئۆزال بۆ رۆژنامەنوسانی دابوو. کاتێ رووداوەکەم بۆ گێڕایەوە، تووشی سەرسووڕمان بوو لەوەی کە "نهێنییە گەورەکە" لەلایەن خودی سەرکۆمارەوە ئاشکرا کراوە. لەو کاتانەدا ئۆزال لە دیدارەکەی لەگەڵ گاگاوزەکان دەرکەوت و لە قادرمەکانەوە بەرەو شوێنی مەراسیمی پێشوازی کردنەکە دەرۆیشت. قایا تۆپەری لەلایەکەوە دەیگوت:" ئەم تورگوت بەگە چی کرد؟" و لەلایەکی دیکەشەوە دەیگوت:" لێی بپرسە، ئێستا چی دەکەین؟" و دەیویست من لەگەڵ سەرکۆمار قسە بکەم. لە قادرمەکان چوومە لای سەرکۆمار و وتم:" بۆچی هاتنەکەی تاڵەبانی'تان ئاشکرا کرد ئەفەندم؟"

وەڵامەکەی تورگوت لەسەر ئەوە بوو کە بابەتێکی وەها ئیدی پێویستی بە شاردنەوە و دەنگۆ و واتەوات نیە:" بۆچی نەیڵێم؟ بە جۆرێك هەر دزەی دەکرد. یەکێك هەواڵەکەی بە ئیلنور، بە دەیلی نیوزی و ئەوان دەدا. جگە لەوە بۆچی ئاساییە ئینگلیزەکان و فەرەنسییەکان لەگەڵ ئەو پیاوانەدا (کوردەکان) دیدار بکەن، بۆچی ناکرێ ئێمە دیداریان لەگەڵ بکەین. با هەموو کەس رابێت. با رابێن."

لەو رۆژانە بە دواوە تورکیا لە پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان'ی عێراق و بە گشتی لەبارەی کێشەی کوردەوە رێگای زۆری بڕی. بەڵام وادیاربوو کە منیش لەو رۆژانەوە خۆم تووشی بەڵا کرد و لەگەڵ سوپا تووشی کێشە بووم.

لەکاتی گەڕانەوەمدا لە لەندەن و رۆژێك بەر لەو دیدارەی من و ئۆزال لە ماڵی سوپا کە رێگەی بۆ هاتنی تاڵەبانی بۆ تورکیا خۆشکرد، ئەرتوغروڵ ئویزکویك لە حورییەت بابەتێکی بە ناوی"پردی نێوان ئۆزال و تاڵەبانی" بڵاوکردەوە. لە بابەتەکەدا ناوی منی نەهێنابوو بەڵام جۆرێك تاریفی کردبوو کە هەرکەس بیخوێندایەتەوە بە ئاسانی دەیزانی باسی من دەکات. لە بابەتەکەدا شتی خراپ نەنوسرابوو، بەڵام هەفتەیەك دواتر تیگەیشتم کە هەندێك لە زانیارییەکانی بابەتەکە بۆ هەندێك لایەن وەك "فیشەکی ئاماژە" بووە. گۆڤارە

هەفتانەییەکەی دۆغو پەرینچەك بە نوسینی" لە گەریلایی فەلەستین تا سیخوڕی کردن بۆ میت و سی ئای ئەی و مۆساد" وێنەی منی کردبووە بەرگی ژمارەیەك و بە کۆمەڵێك زانیاری نادروست و درۆینەوە چیرۆکی ژیانی منی گێڕابووەوە. ڕێك دەقێکی"کوشتنی کەسایەتی" بوو. هەوڵی تیرۆرکردنی هەندێك لەو کەسانە درابوو کە چیرۆکی ژیانیان لەو گۆڤارەدا بەوجۆرە بڵاوکرابووەوە. مەحمەد ئەیمور یەکێك لەبەرپرسانی پێشووی میت کە پێشتر کرابووە ئامانجی ئەو گۆڤارە، دۆغو پەرینچەك و هاوکارەکانی بە"ساختەکار و درۆزن" ناودەبرد و ڕەشنووسی بیرەوەرییەکانی کە دواتر وەك بڵاوکراوەکانی مللییەت(بیرەوەرییەکانی ئەندامێکی میت'١٩٩١) چاپکرا، لەلای ئولوچ گویرکان بوو. ئەیمور بەو هیوایەی کە چوارچێوەی کتێبەکەی لە ڕۆژنامەی گوینەش بڵاوبکرێتەوە، ڕەشنوسەکەی بە ئولوچ دابوو. ئولوچ لە ڕێگای مۆسکۆ کتێبەکەی دەخوێندەوە. لە ڕێگای نوسینەکانی ئەو کەسە بە ئەزمونەی هەواڵگری کە بەرپرسێکی دژە تیرۆر بوو، تێگەیشتم ئەو شتانەی دۆغو پەرینچەك و هاوکارەکانی لە دژی من نوسیبوویان، ڕێك دژە زانیاری هەواڵگری بوون. لەو کاتانەدا کە هەواڵی هاتن و ڕۆیشتنی تاڵەبانی بۆ تورکیا لە ریزی پێشەوەی باسەکاندا جێی خۆی گرتبوو، لە گۆڤارەکەی دۆغو پەرینچەك'ەوە تۆپی گڕداریان تێدەگرتم.

هۆکاری ئەو هێرشە لەناکاوە چی بوو کە پڕ بوو لە درۆ و دەلەسە؟ لە ساڵی ١٩٧١ەوە پەیوەندیم لەگەڵ پەرینچەك و دەوروبەرەکەی نەبوو. لەو بەروارەشدا، یانی لە ساڵی ١٩٩١دا هیچ هۆکارێکی مەنتیقی نەبوو تا ئەوان هێرش بۆ من بکەن.

بۆ کەسێکی وەك من کە ساڵانێکی تەمەنی لەنێو ڕووداوەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە ناسینی بەشێکی گرنگی ئەکتەرە سیاسییەکانی ناوچەکە تێپەڕ کردووە، وەڵامی ئەم پرسیارانە سەخت نەبوو. زۆر مێشکی خۆم بەوە نەئێشاند کە بۆچی"دەوڵەتی پشتی پەردە"ی تورکیا شمشێری لە من هەڵکێشاوە. لە ڕێگەی دروستکردنی پەیوەندی ڕاستەوخۆی سەرکردەکانی کوردەکان'ی عێراق و سەرکۆماری تورکیا، هەتا کۆتایی دەستی خۆم خستبووە ناو ئاگردانەوە. بەهۆی"فیشەکە ئامازەکانی" ئەرتوغروڵ ئویزکویك، هەندێك لایەن دەستیان بە جموجۆڵ کردبوو. لە ڕێگەی هێرشی توند و "کوشتنی کەسایەتی" منەوە، دەیانویست چرووتژەی نزیکبوونەوەی تورکیا و کوردەکان'ی عێراق بە شتێکی خراپ و کەم بایەخ نیشانبدەن.

مادام بابەتەکە پەیوەندی بە کوردەکان'ەوە هەبوو، هەروەها تابۆکانی کۆماری تورکیا'ی تێکدەشکاند و "هێڵە سوورەکانی" دەبەزاند، پێویستبوو باجەکەیشی بدرێت.

جاربەجار ویستیان چەند جار زیاتر باجی ئەوە بە من بدەن. لەدوای ئەو ڕۆڵەی کە تایبەت بە پەیوەندی ئۆزال - تاڵەبانی یان بەو واتایەی کە لە تورکیا باوە، بەهۆی ئەو ڕۆڵەی کە لە بونیاتنانی پەیوەندی تورکیا و کوردەکان'ی عێراق'دا گێڕام، قەد ئۆپەراسیۆنەکانی" کوشتنی کەسایەتی"من کەمیان نەکرد. هەندێك جار

هەڕەشەی کوشتنیشم لێکرا و ئەمنی شەخسیم نەما. پێشتر رووبەڕووی شتێکی وەها نەبووبوومەوە. بەو پێیەی کە تا ئێستا ماوم، لەلایەن هێزێکی ئیلاهییەوە پارێزراوم. شانسم هەبوو، چونکە هەزاران کەس کە راستەخۆ و ناڕاستەوخۆ لایەنی کێشەی کورد بوون، ئەوەندەی من شانسیان نەبوو.

**دەزانم دوو کەڕەت دوو چوار ئەکا، بەڵام ئەگەر ڕێگایەک بدۆزمەوە کە دوو کەڕەت دوو بکاتە پێنج، چێژێکی زۆر وەردەگرم.**

**بێرۆن**

هاتنی جەلال تاڵەبانی بۆ تورکیا، ڕێگای کوردەکان ی بۆ ئەمریکا ش کردەوە. ئەمریکا لەبەر کاردانەوەی تورکیا، هەموو کاتێك خۆی لە کوردەکان دوور دەگرت.

لە تورکیا ساڵانێکی زۆر قەناعەتی باو ئەوە بوو کە ئەمریکا" کارتی کورد"ی خستۆتە دەستی خۆی. بەڵام حەقیقەت ڕێك پێچەوانەی ئەوە بوو. تورکیا لەبەردەم گەشەکردنی پەیوەندییەکانی ئەمریکا لەگەڵ کوردەکان ئاستەنگ بوو. هەرکاتێك ئەمریکا بە ناچاری لە نێوان تورکیا و کوردەکان دا یەکیانی هەڵبژاردایە، بێ ئەملاولا پشتی هاوپەیمانەکەی خۆی لە ناتۆ دەگرت.

یەکێك لەو کەسانەی کە بە باشی ئاگای لەمە بوو، پیتەرگالبرایت بوو کە ساڵانێکی زۆر هەوڵی بەرقەرارکردنی پەیوەندی نێوان کوردەکان و ئەمریکا ی داوە. ناوبراو"پسپۆڕی ژمارەیەکی پرسی کورد"ە لە ئەمریکا و ماوەیەکی زۆریش سەردەستەی ڕاوێژکارانی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆنگرێسی ئەمریکا بووە. لەگەڵ ئەوەی کوڕی جۆن کنێت گالبرایت ئابوریناسی بەناوبانگی جیهانییە، بەهۆی ئەوەی کە لە ئۆکسفۆرد و هاروارد خوێندوویەتی و هاوپۆلی بێنەزیر بۆتۆ بووە، لە واشنتن خاوەن نفوز و کاریگەری زۆرە و تۆڕێکی فراوانی پەیوەندی نێودەوڵەتیشی هەیە.

هەتا ساڵی١٩٩٣، پیتەرگالبرایت بۆ ماوەی چواردە ساڵ ڕاوێژکاری لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆنگریس بووە و لەوبەینەشدا سەرنج و مەراقی بۆ کێشەی کورد و عێراق ڕۆیشتووە و لەبەر ئەوەش ڕۆڵێکی هاوشێوەی بەرپرسە کونجکۆڵەکانی بەریتانیا ی لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەم پەیدا کردبوو. چەندینجار بە نهێنی سنورەکانی عێراق سوریا ی تێپەڕ کردووە و لەگەڵ سەرکردەکانی کورد پەیوەندی نزیکی بەرقەرار کردووە.

گالبرایت، دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردەکان ی عێراق ی کردبووە ئامانج و وازی لێ نەدەهێنا. تەنانەت جارێك لە قسە و باسێکماندا بە ئیلهام وەرگرتن لە(Lawrence Of Arabia) پێمگوت دەتەوێت وەك(Galbraith Of Kurdistan) ناوت لە مێژوو تۆمار بکرێت و ئەویش هیچ نارەزاییەکی پیشاننەدا.

لە نێوان ساڵانی ١٩٩٣-١٩٩، گالبرایت یەکەم باڵیۆزی ئەمریکا لە کرواتیا بوو. لەگەڵ ریچارد هۆلبرووك لە ڕێککەوتننامەی دایتۆن کە کۆتایی بە جەنگی بۆسنا هێنا، ڕۆڵی بەرچاوی گێڕا. لەدوای جەنگی ٢٠٠٣ی عێراق، ئەزموون و توانستەکانی خۆی لە خزمەتی کوردەکان ی عێراق بەکارهێنا. شوێنەدەستی ئەو لەسەر

هەموو ئەو ماددانەی دەستوری عێراق'ی فیدراڵ کە لە قازانجی کوردەکان'دایە دیاربوو. جارێك پێی گوتم کە چەسپاندنی ئەو مادەیەی کە باس لەوە دەکات " لەکاتی ناکۆکی نێوان حکومەتی ناوەندی و حکومەتی هەرێمی کوردستان سەبارەت بە لێکدانەوەی یاسایەك، دەستووری هەرێم بە بنەما وەردەگیرێت." لەکاتی ئامادەکردنی دەستووردا بەهۆی" بەشداری من لە تیۆری فیدراڵی"دا بووە.

چەندینجار لە زاری پیتەر گالبرایت باسی ئەوەم بیستووە کە تورکیا چۆن رێی لە پەیوەندی ئەمریکا و کوردەکان گرتووە.

سامانتا پاوەر لە کتێبی(A Problem From Hell: America and the Age of Genocide-Basic Books)(٢٠٠٢)دا کە خەڵاتی پۆلیتزەری وەرگرتووە، بە وردی باسی کار و چالاکییەکانی پیتەرگالبرایت لە کوردستان'ی عێراق دەکات.

جەلال تاڵەبانی، یەکەم جار لە ساڵی١٩٨٨دا بەهۆی پەیوەندی لەگەڵ پیتەر گالبرایت پێی ناوەتە خاکی ئەمریکا. گالبرایت، دیدارێکی لەگەڵ لاری پۆپ بەرپرسی فەرمانگەی ئێران - عێراق لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ تاڵەبانی رێکخستبوو. بەڵام ئەوە هاوکات بووە لەگەڵ سەردانێکی کەنعان ئەڤرەن سەرکۆماری تورکیا کە لەو کاتانەدا بۆ ئەمریکا ئەنجامی دابوو. سامانتا پاوەر لە کتێبەکەی خۆیدا لە زاری پیتەر گالبرایت بەمجۆرە باسی ئەو ئاستەنگییە دەکات کە تورکیا لەبەردەم پەیوەندی تاڵەبانی- ئەمریکا و ئەمریکا - کوردەکان'ی عێراق دروستی کردبوو:

"دیداری تاڵەبانی و پۆپ لە فۆگی بۆتوم لە بینای وەزارەتی دەرەوە کە وەك قەڵایەك وابوو، ماوەی یەك کاتژمێری خایاند. یەکەم کاردانەوە لە دژی ئەمە لەلایەن عێراقییەکان'ەوە نەهات، بەڵکو کەنعان ئەڤرەن سەرکۆماری تورکیا کە ئەو کاتە بۆ دانوستان لەگەڵ وەزیری دەرەوە (شوڵتز) لە واشنتن بوو، نارەزایی بەرامبەر ئەو دیدارە دەربڕی. کەنعان ئەڤرەن لە ترسی ئەوەی کە هەر جۆرە رەفتارێك کە ورە بە کوردەکان'ی عێراق بدات، لەوانەیە دە ملیۆن کوردی تورکیا'ش هانبدات، شێت ببوو. شوڵتز ئاگای لە دیداری تاڵەبانی- پۆپ نەبوو، بۆیە خۆی واتەنی دەیویست بزانێ ئەو فیکرە جوانە لە کێ وە دەرچووە. وەك چاوەڕوان دەکرا، عێراقییەکان'یش تووڕە بوون. تارق عەزیز بە بیانوی ئەوەی کە ئەمریکا دەست لە کاروباری ناوخۆی عێراق وەردەدات، دیدارێکی خۆی لەگەڵ شوڵتز هەڵوەشاندەوە کە ماوەیەکی درێژ بەرنامەی بۆ دانرابوو... وەزارەتی دەرەوەش بۆ دڵدانەوەی عێراق، لە روونکردنەوەیەکدا رایگەیاند ئەمریکا دەست لە کاروباری ناوخۆیی هیچ یەك لەو وڵاتانە وەرنادات کە کەمینەی کورد تێیاندا دەژین. دوای ئەوەش پۆپ، کە لەگەڵ تاڵەبانی دیداری کردبوو، فلچەی خوارد (و: رەخنەی لێگیرا، سەرزەنشت کرا)..."(ل١٩٩)

بەوجۆرەش دەرگاکانی ئەمریکا بەرووی کوردەکان'ی عێراق'داخران. دوای ئەوەش رێگەیان نەدا کوردەکان

بچنە ناو هیچ یەك لە بیناکانی دەسەڵاتی جێبەجێکردنی ئەمریکا. جەنگی کەنداو لە ساڵی ١٩٩١یش نەبووە هۆی ئەوەی کە ئەمریکا ئەو سیاسەتەی خۆی بگۆڕێ. ئەمە بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی تورگوت ئۆزال دەرگای تورکیا'ی بە رووی تاڵەبانی'دا کردەوە...

هەر لەو بارەیەوە، پیتەر گالبرایت بەسەرهاتێکی سەیری بۆ گێڕاوەمەتەوە کە لە ساڵی ٢٠٠٦دا لە کتێبی"کۆتایی عێراق"یشدا باسی کردووە. ئەو بەسەرهاتەی کە ئەو باسی دەکرد، لەکاتی سەردانەکەی تاڵەبانی بۆ واشنتن لەدوای دیدارەکەی من و ئەو لە لەندەن، روویدابوو. گالبرایت وەها دەڵێت:

" لە ١٩٩١/٢/٢٧دا لەگەڵ سیناتۆر پێل، لە هۆڵی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی کۆنگرێس سەرۆکایەتی کۆبوونەوەیەکی راوێژکاریمان سەبارەت بە کوردەکان کرد. جەلال تاڵەبانی، هۆشیار زێباری وتەبێژی سیاسەتی دەرەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان، سامی عەبدوڕحمان سەرۆکی پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان کە بە دەنگی نزم قسەی دەکرد و لە کەسێکی ئاریستۆکرات دەچوو، کەنداڵ نەزان سەرۆکی ئەنیستیتۆی کورد لە پاریس و دانیال میتران کەسایەتی بەناوبانگی جیهانی لایەنگری کورد کە هاوسەری سەرکۆماری فەرەنسا بوو، لەو کەسانەبوون کە وتاریان هەبوو. لەکاتی خواردنی نیوەڕۆدا لەگەڵ سیناتۆرەکانی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوە، سەرکردەکانی کورد جەختیان لە هەستی لایەنگری کردن لە ئەمریکا لەنێو کوردەکان کرد و باسی ئەگەری راپەڕینیان کرد...جەلال تاڵەبانی پێی وتم راپەڕینێك دەستپێدەکات و بە نیازم بگەڕێمەوە بۆ کوردستان.

ئەم هەواڵە زۆر گرنگ بوو. وا بیرم کردەوە کە پێویستە یەکسەر بەڕێوەبردنی ئەمریکا'ی لێ ئاگادار بکەمەوە. ریچار هاس رێکخەری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە دەستەی ئاسایشی نەتەوەیی لە ئۆکسفۆرد هاوپۆلم بوو، بە دوای ئەودا گەڕام. نەمتوانی پێی بگەم، بەڵام لە ١ی مارت'دا لەگەڵ ساندی چالز'ی جێگری قسەم کرد. بە تووڕەییەوە منی تۆمەتبار کرد بەوەی کە لە قۆناخێکی هەستناکدا ئیشەکان تێکدەدەم. بە سەرسووڕماوی پرسیارم لێکرد: بەڵام ئایا ئێمە نامانەوێ لەم رژێمە رزگارمان بێت؟

ساندی بە عینادییەوە وەڵامی دایەوە و وتی: سیاسەتی ئێمە ئەوەیە لە سەدام رزگارمان بێت نەك رژێم.

تەنانەت لە هەوڵەکانیشم بۆ رێکخستنی دیداری نێوان تاڵەبانی و ریچارد سچیفەر، جێگری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری مافی مرۆڤ شکستم هێنا... سچیفەر قبوڵی کردبوو کە لەگەڵ تاڵەبانی دیدار بکات. بەڵام کاتێ کوردەکان هاتبوون، لە بینای وەزارەتی دەرەوە دەریان کردبوون و ئەوانیش بە ناچاری لە کافەیەك لە کۆڵانی بەرامبەر، لە جیاتی جێگری وەزیر لەگەڵ دوو کارمەندی ئاست نزمی وەزارەت قاوەیان خواردبووەوە...

شەوی ١ی مارت، تاڵەبانی پرسیاری لێکردم کە ئایا مانەوەم لە واشنتن هیچ سوودێکی هەیە یان نا. ئۆزال

سەرکۆماری تورکیا ئەوی بانگهێشتی تورکیا کردبوو. هەستناکییەکانی تورکیا هۆکاری سەرەکی ساردوسڕیی لایەنە رەسمییەکانی ئەمریکا بەرامبەر بە تاڵەبانی بوون. پێویستبوو سەردانی ئەنقەرە بکات. ئەمانەم پێگوت..."(ل٤٦)

بەوجۆرە منیش ئەوەم زانی کە تورگوت ئۆزال بۆ تاڵەبانی، کلیلی کردنەوەی دەرگاکانی واشنتن بووە. دوای ئەوەی کە سەرەتا تاڵەبانی سەردانی تورکیا'ی کرد و دواتریش مەسعود بارزانی سەردانی ئەنقەرە'ی کرد، ئەمریکاییەکان گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە "ڤیتۆی تورکیا" لە سەر ئەوان نەماوە، بۆیە دەرگا رەسمییەکانی واشنتن'یان سەرەتا بۆ تاڵەبانی و دواتریش بۆ مەسعود بارزانی کردەوە.

یەکەم دیدارم لەگەڵ مەسعود بارزانی، دەگەڕێتەوە بۆ نۆزدە ساڵ دوای یەکەم دیدارم لەگەڵ جەلال تاڵەبانی کە لە مێژووی کورد'دا لانیکەم بە ئەندازەی ئەو کاریگەری هەبووە. ئەو دیدارەش ئێوارەی ١٩٩٢/٨/٣٠ لە ئەنقەرە ئەنجامدرا.

دوای سەردانە نهێنییەکەی جەلال تاڵەبانی بۆ ئەنقەرە لە مارتی ١٩٩١ و پاش دیداری تاڵەبانی و ئۆزال لە کۆشکی چانقایا لە حوزەیرانی١٩٩١، رێگەی ئەو سەرکردەکەیتری کورد، یانی مەسعود بارزانی بۆ کۆشکی چانقایا کرایەوە. زیاتر لە تاڵەبانی میوانداری بارزانی کرا و چەند جارێك دەعوەتی تورکیا کرا. بەڵام هیچ نەمبینی تا ئەو کاتەی یەکەم دیداری هاوبەشیان لەگەڵ ئۆزال لە چانقایا لە رێکەوتی ١٩٩٢/٨/٣٠ ئەنجامدرا...

مەسعود بارزانی دوای دیدار لەگەڵ حافز ئەسەد، راستەوخۆ لە شام دەهات بۆ ئەنقەرە و جەلال تاڵەبانی لە ئەورووپا'وە سەردانی ئەنقەرە'ی دەکرد و دواتر هەردووکیان پێکەوە لەگەڵ تورگوت ئۆزال سەرکۆماری تورکیا دیداریان دەکرد. ئەو پێشنیارەی کە تاڵەبانی ساڵێك لەوەو پێش لە لەندەن بە منی گوتبوو، بۆ یەکەمجار جێبەجێ دەکرا. گرنگییەکی زۆر بەو سەردانە دەدرا و لەبەر ئەوەش دوو هەفتە بەر لە دیدارەکە، بۆ قسەکردن لە سەر ئامادەکارییەکان، لە گوندی ئۆکلوك لە نزیك مارماریس سەردانی شوێنی حەوانەوەی تورگوت ئۆزال'م کردبوو.

بەر لەوەی بکەومە رێ، د.موزەفەر ئارسڵان سەرۆکی پارتی نەتەوەیی تورکمانی عێراق تەلەفۆنی بۆ کردبووم و پێی وتبووم کە پێویستە لەگەڵ سەرکۆمار دیداری هەبێت بەڵام رێگایەك نیە کە خۆی پێ بگەیەنێت. تورگوت ئۆزال کە لە مێژووی کۆماری تورکیا زیاتر لەهەر سەرکۆمارێکی دیکە گرنگی بە پرسی تورکمان دەدا، پێشتر بە د. موزەفەر ئارسڵان'ی راگەیاندبوو فەرمانی بە ئویزدەم سانبەرك راوێژکاری وەزارەتی دەرەوە داوە تا بە پرسی تورکمانەکان'ەوە سەرقاڵ بێت و دەتوانێ دیدارە رۆژانەییەکان لەگەڵ ئەو ئەنجامبدات. بە وتەی د. موفەر ئارسڵان، ئویزدەم سانبەرك لە یەکەم دیداریاندا بە گەرمی پێشیوازی لە

فەرمانەکەی ئۆزال کردووە و بە نیازپاکییەوە وتویەتی:" دکتۆر! بەس کێشەم ئەوەیە کە ئایا دەتوانی سەرەتا تۆزێ باسی پرسی تورکمان'م بۆ بکەی؟" وادیاربوو کە وەزارەتی دەرەوەی تورکیا، لەکاتی دەستپێکردنی جەنگی کەنداو هەتا کۆتاییەکەی لە ساڵی١٩٩١، لە عێراق کێشەیەکی بە ناوی "کێشەی تورکمان" نەبووە.

ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە سەرکۆمار بڕوای بەوە هەبوو کە پێویستە بە ئەندازەی کارتی کوردی، تورکیا کارتی تورکمان'یشی لە دەستدا بێت. لەگەڵ د. موزەفەر ئارسلان، جگە لە پەیوەندییەکانی تایبەت بە پێگەکەم وەك راوێژکاری تورگوت ئۆزال، پەیوەندییەکی گەرمی مرۆییانەشم هەبوو. لەبەر ئەوەش هەرکاتێ سەرکردەکانی کورد بە هەر هۆیەکەوە سەردانی ئەنقەرەیان بکردایە، کارێکم دەکرد تا ئۆزال چاوی بە د. ئارسلان'یش بکەوێت. ئەمە تا ئەندازەیەك وەك نەریتێکی لێ هاتبوو. بە پشتبەستن بەوە پێمگوت:" من بۆ مارماریس دەچم، وەرە با پێکەوە بچین." کاتێ د. موزەفەر ئارسلان وتی من دیدارم لەگەڵ سەرکۆمار نیە، وتم:"سەرکۆمار کاتی بزانێ تۆ لەوێی دیدار لەگەڵ تۆ رەتناکاتەوە." بە واتایەك سەرکۆمار'مان تووشی ئەمری واقیع دەکرد و بۆ ئەوەش پلانێکمان دانا. پلانەکەش سەری گرت. کاتێ گەیشتمە لای تورگوت بەگ، لە بەشێك لە قسەکانمدا وتم د. موزەفەر ئارسلان یش لێرەیە. ئەویش لە وەڵامدا وتی"دەزانم، تۆزێك بەر لە ئێستا تەلەفۆنی کرد."

-"کەی دەیبینن؟"

-"پێمگوت لە ئەنقەرە لەگەڵ قایا (تۆپەری) دیدار بکات."

تورگوت ئۆزال لە جووڵەی ڕوومەتمەوە درکی بە سەرسووڕماوی و نارەزایی من کرد و وتی:"ئەوە چییە؟ نارەزاییەکت هەیە؟ چییە؟" لە وەڵامدا منیش وتم:" ئەفەندم! هەفتەیەکی دیکە بە یەکەوە لەگەڵ بارزانی و تاڵەبانی دیدار دەکەن. ئێستاش سەرکردەی تورکمان لە ئەنقەرە'وە هاتووە بۆ مارماریس و ئێوە دیداری لەگەڵ ناکەن و حەواڵەی وتەبێژەکەی خۆتانی دەکەن. ئەمەش بە جۆرێك لە جۆرەکان دزە دەکاتە ناو کەناڵەکانی راگەیاندن. هیچ نەبێ کەسانێکی وەك جێگرەکان و ئەندامانی بەڕێوەبەرایەتی حزبەکەی ئاگایان لەوەیە کە ئەو سەردانی مارماریس'ی کردووە. لە زمانی یەکێکیانەوە دەردەچێت و دوایی لە راگەیاندنەکانیشدا وەك سەرکۆمارێك کە باوەش بۆ کوردەکان دەکاتەوە و تورکمانەکان دووردەخاتەوە پیشاندەدرێن. چ پێویست بەمە دەکات؟ مادام د. موزەفەر ئارسلان سەردانی ئێرەی کردووە، ئەگەر بەر لەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەنقەرە بیدۆزنەوە و..."

تورگوت ئۆزال دوای دوو چرکە راوەستان، کەسێکی لە قەڵەمی تایبەتی خۆی بانگ کرد و وتی:" یەکسەر د. موزەفەر ئارسلان بدۆزنەوە و پێی بڵێن دوای یەك کاتژمێری دیکە چاوەڕوانی دەکەم."

یەك کاتژمێر دواتر، کاتێ من لە شوێنی حەوانەوەی ئۆزال لە گوندی ئۆکلوك دەردەکەوتم، د. موزەفەر

ئارسڵان دەهاتە ژوورەوە. سەیری یەکمان کرد و وەك ئەوەی کە بە هەڵکەوت یەکترمان بینیبێت تەوقەمان کرد.

ئەو رووداوە لە ماوەی دوو ساڵ کارکردن و پەیوەندییەکی پڕ لە متمانەی بێ کۆتایی لەگەڵ تورگوت بەگ، یەکەم کارێکی شێتانە بوو کە بێ ئاگای ئەو کردم. دووەم و دوایین کاری هاوشێوەی ئەو کارە، بەردەوامی ئەوە بوو.

شەوەی ٣٠ی حوزەیران، کاتێ دەچووم بۆ ماڵی سەرچڵ قەزاز نوێنەری تاڵەبانی لە گەڕەکی ئایرانجی سەروو لە ئەنقەرە کە بارزانی و تاڵەبانی لەوێ بوون، تورگوت ئۆزال لە ماڵی سوپا بەشداری مەراسیمی پێشوازی جەژنی ٣٠ی حوزیرەانی کردبوو. تاڵەبانی و بارزانی چاوەڕوانی کاتی دیدارەکەیان بوون. هێشتا رۆژ و کاتی دیدارەکە دیاری نەکرابوو، بەڵام من بەهۆی ئەو دیدارەی کە لە مارماریس لەگەڵ ئۆزال کردبووی، بە بێ ئاگای سەرکۆمار لە خۆمەوە وتم:" سەرکۆمار سەرەتای هەفتە لەگەڵ د. موزەفەر ئارسڵان دا دەتانبینێت." بڕوام بەوە هەبوو کە پێویستە حەمەن تورکمانەکان‌یش بخرێنە ناو رەسمەکە و بە لای منەوە کارتی کورد - تورکمان بۆ دژایەتیکردنی رژێمی دیکتاتۆری بەعس زۆر گرنگ بوو. لەوانەیە لەبەر ئەوەی کە دەمزانی تورگوت ئۆزالیش وەك من بیر دەکاتەوە، بۆیە رێگەم بە خۆم دابوو کە کارێکی رووداارنەی وەها بکەم.

بارزانی و تاڵەبانی سەریان لەم پێشنیارە سوورما. ماوەی پێنج تا دە خولەك لە بەینی خۆیاندا بە کوردی موناقشەیەکی گەرمیان کرد. تاڵەبانی دوای کۆتاییهاتنی راوێژەکەی لەگەڵ بارزانی رووی کردە من و دژە پێشنیارەکەی خۆی باسکرد:

" دیارە ئێمە ناتوانین هیچ مەرجێك دانێین سەبارەت بەوەی کە بەڕێز سەرکۆمار چۆن لەگەڵ ئێمە دیدار دەکات. ئەوە بڕیاری خۆیانە و دیدار لەگەڵ ئەو لەهەر هەلومەرجێکدا بۆ ئێمە مایەی شانازییە. بەڵام لەگەڵ کاك مەسعود لەسەر ئەوە قسەمان کرد کە ئەگەر لەگەڵ ئێمە وەك دوو سەرکردەی کورد و سەرکردەیەکی تورکمان دیدار بکات، ئەمە وا لێك دەدرێتەوە کە تورکیا چاوی لە باکووری عێراق بڕیوە و بەشێوەیەکی جیاواز لە هەموو عێراق خوێندنەوە بۆ باکووری عێراق دەکات. کاك مەسعود تازە لە شام هاتووە. ئەو پێیوایە بە ئەگەری زۆر سوریا بەمجۆرە سەیری رووداوەکە دەکات. داخۆ ناکرێت لە جیاتی ئەوەی سێقۆڵی چاوی بە ئێمە بکەوێت، ئێمە دووانی دیدارێکی تایبەتمان هەبێت و دواتریش دیدارێك لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بکات کە د. موزەفەر ئارسڵان‌یشی تێدا بێت؟"

کەوتبوومە ناو چاڵێکەوە کە بێ ئاگای تورگوت ئۆزال هەڵمکەندبوو. لەکاتێکدا من بە دوای فێڵێکەوە بووم تا تورگوت ئۆزال بە یەکەوە چاوی بە سەرکردەکانی کورد و تورکمان بکەوێت، هەردوو سەرکردەکەی

کورد بە ئیشێکی چاوەڕوانەنەکراوی وەك دیداری تورگوت ئۆزال و ئۆپۆزیسیۆنی عێراق، دژەپێشنیاری خۆیان کرد. بەڵام ئەمە پێشنیارێك بوو کە لەگەڵ نیاز و بۆچوونەکانی مندا یەکی دەگرتەوە. من لایەنگری ئەوە بووم کە تورکیا لەگەڵ هەموو ئۆپۆزیسیۆنی عێراق'دا پەیوەندی تایبەتی هەبێ و کارتەکانی بۆ رووخاندنی سەدام بەکار بهێنێت. لەدوای رووخاندنی سەدام، بونیاتنانی عێراقێکی دۆست کە پەیوەندی پتەوی لەگەڵ تورکیا هەبێت خەونی من بوو. لەبەر ئەوەش جێبەجێ بوونی دژەپێشنیارەکەی بارزانی و تاڵەبانی، لایەنێکی سەرنجڕاکێشی بۆ من تێدابوو. دوای گوێگرتن لە پێشنیاری سەرکردەکانی کورد وتم: "دەبێ پرس بە سەرکۆمار بکەم." و دواتر حیسابی ئەوەم کرد کە تورگوت ئۆزال لە مەراسیمەکە دەرکەوتووە، بۆیە لەو شوقەیەی کە هەر لەبەر دەرگاکەیەوە رێوشوێنی توندی ئەمنی گیرابووە بەر، دەرکەوتم تا لەگەڵ کۆشك پەیوەندی بگرم.

هەموو شتێکم لەبارەی کارە شێتانەکەی خۆم، بە پێشنیارە هاوبەشەکەی تاڵەبانی و بارزانی'یشەوە بۆ تورگوت ئۆزال گێڕایەوە. تورگوت بەگ زۆر بیری نەکردەوە و وتی رۆژی چوارشەممە ٢ی ئەیلوول لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق کۆدەبێتەوە. لە دەرەوەی ئەو کۆبوونەوەیە، بە جیا لەگەڵ سەرکردە کوردەکان'یش کۆدەبووەوە. سەبارەت بە د.موزەفەر ئارسڵان'یش، بەر لەوەی لەگەڵ سەرکردەکانی کورد کۆبێتەوە لەگەڵ ئەو دیداری دەکرد و هەواڵی دیدارەکان لە سەرووی هەموشیانەوە دیدار لەگەڵ وەفدی تورکمان دەدرا بەTRT، هەتا بەشێوەیەکی زۆر بڵاوبکرێتەوە و رای گشتی لێ ئاگادار بکرێتەوە.

توانستی بڕیار وەرگرتنی خێرا و کردەیی بوونی تورگوت ئۆزال، بارودۆخێکی ئاڵۆزی گۆڕی بۆ لاپەڕەیەکی نوێ کە قەد خەیاڵم نەدەکرد. تورکیا بەرەو ئەوە دەڕۆیشت روخساری دەوڵەتێك لە خۆی پیشانبدا کە پەیوەندی تایبەتی لەگەڵ تورکمان و کورد هەیە و پشتیوانی لە ئۆپۆزیسیۆنی عێراق دەکات. پێویستبوو هەموو سیاسەتی دەرەکی بە گوێرەی ئەم بارودۆخە تازەیە رێکبخرێت.

بۆ ئەوەی بڕیارەکانی تورگوت بەگ'یان بۆ باسبکەم، لە نیوەشەودا دووبارە گەڕامەوە بۆ ئەو ماڵەی کە تاڵەبانی و بارزانی لەوێ بوون. بەو بڕیارەی تورگوت ئۆزال خۆشحاڵ بوون و دەستیان بۆ تەلەفۆن برد و پەیوەندییان لەگەڵ هەندێك کەس لە قاهیرە و لەندەن گرت و دەستیان بە ئامادەکردنی وەفدی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق کرد. رۆژی شەممە بوو. پێویستبوو کەسایەتییەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهان، ئامادەکاری سەفەرەکەی خۆیان تەواو بکەن و بەر لەکاتی دیدارەکە لە ئەنقەرە ئامادە بن.

ئیدی کاتی ئەوە هاتبوو کە د. موزەفەر ئارسڵان'یش لە رووداوەکان ئاگادار بکەمەوە. پەیوەندیم لەگەڵ گرت و وتم پێویستە بە خێرایی دەستەی بە ڕێوەبەری پارتی نەتەوەیی تورکمانی عێراق کۆبکاتەوە و لە

سەر نەخشە داواكاری روون و بەرچاو پێشكەشی ئۆزال بكەن.

بە پێچەوانەی كوردەكان، توركمانەكان یان ئەزموونی سیاسییان نەبوو یان زۆر كەم تەجرووبە بوون. لەلایەكی دیكەشەوە، هاوشێوەی كوردەكان چرووتژەیەكی سیاسییان نەبوو كە كاری لەسەر كرابێت. وەكو زۆربەی توركەكانی دەرەوە، بە گشتی دەیانویست پشت بە بەرێوەبەرانی توركیا ببەستن. بۆیە مێشكی خۆم بەوەشەوە سەرقاڵ دەكرد كە توركمانەكان'ی عێراق داوای چی بكەن و لەوبارەیەوە چی پێشكەشی توركگوت ئۆزال بكەن.

ناوەند و سیمبولی توركمانەكان'ی عێراق، شاری كەركوك بوو. پێموابوو لەهەر باسێك كە كەركوك'ی تێدا نەبێت، ناكرێت بەشێوەیەكی واتادار توركمانەكان جێگیر بكرێت. كەركوك لە سەرووی هێڵی ٣٦بوو كە دەسەڵاتی رژێمی سەدام و حكومەتی بەغدا'ی سنوردار دەكرد و رێگەی لێ دەگرت لە ناوچەكانی ژێر ئەو هێڵەدا هێز كۆبكاتەوە. بۆ دوورخستنەوەی كەركووك لە كین و تووڕەیی سەدام، پێویستبوو بڕیار و رێكخستنێكی نێودەوڵەتی بكرێت و ئەمەش سنورداركردنەوەی سەدام لە سەرووی هێڵی٣٤ەوە بوو كە بەرگری نێودەوڵەتیشی بۆ توركمانەكان دابیندەكرد. بەشداری كۆبوونەوەی بەڕێوەبەرایەتی پارتی نەتەوەیی توركمانی عێراق'م كرد و پێمگوتن كە پێشنیارەكان سەبارەت بە هێڵی ٣٤ پێشكەشی توركگوت ئۆزال بكەن. جگە لەوە پێمگوتن كە با داواكاری مەنتیقیتان هەبێ و ئێوەش وەك كوردەكان بە پلانێكی پڕ لە وردەكارییەوە بچنە كۆشك و لەسەر نەخشەیەك بە وردی شوێنی نیشتەجێبوونی توركمانەكان دەستنیشانبكەن و ئەوەش بۆ توركگوت ئۆزال ببەن.

ئاگام لە سوودەكانی قسەی روون و دیاریكراو لەگەڵ توركگوت ئۆزال هەبوو. ئەگەر توركگوت ئۆزال بابەتی روون و دیاریكراوی لەبەردەست بوایە، كەرەستەی پێویستی بۆ قەناعەتپێكردنی جۆرج بوش پەیدا دەكرد كە كاریگەری زۆری لە سەری هەبوو.

لە نێوان كۆشك، سەركردەكانی كورد و پارتی نەتەوەیی توركمانی عێراق'دا بەردەوام لە هاتوچۆدا بووم. بەدەستهێنانی پشتیوانی سەركۆماری توركیا و كاركردن لەگەڵ ئەودا، بە تەواوی منی لەو بۆچوونە دوورخستبووەوە كە لەوانەیە گرنگترین دامودەزگاكانی دەوڵەت لە توركیا دژی ئەم شتانە بن. نەك تەنها دامودەزگاكانی دەوڵەت لە توركیا بەڵكو لەوەش خافڵ ببووم كە لەوانەیە سەرنجی دەزگای هەواڵگری عێراق كە بڕبڕەی پشتی رژێمەكەی سەدام بوو، بۆ سەر خۆم راكێشم و بە ئاگر یاریم دەكرد.

رۆژی چوارشەممە٢/٩/١٩٩٢، توركگوت ئۆزال لە كۆشكی چانقایا لەگەڵ وەفدێكی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق'دا كۆبووەوە كە جگە لە جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی و د. موزەفەر ئارسڵان، كەسایەتییە نارازییەكانی عەرەبی (شیعە-سوننە) وەك محەمەد بەحرەلعلوم، شێخ سامی عازارا، ئەیاد عەلاوی، محەمەد ئالوسی،

هانی ئەلفەکیکی تێدا بوون.

لە هەموو بەشێکی مەیدانی سیاسی تورکیا و لەنێو راگەیاندنی تورك‌یشدا ئەو کەسانەی کە دەستیان لەگەڵ دامودەزگاکانی دەوڵەت تێکەڵاو بوو، بەشێوەیەکی شێتانە و بە توندی رەخنەیان لە دیداری تورگوت ئۆزال لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق دەگرت و دژایەتی سیاسەتی نوێ و خودی تورگوت ئۆزال یان دەکرد. رۆژنامەی حورییەت لە ۱۹۹۲/۹/۳دا بە مانشێتی"کۆبوونەوەی لوتکەی رووخاندنی سەدام لە چانقایا" و وێنەیەکی گەورەوە هەواڵی دیدارەکەی بڵاوکردەوە. لە خوار مانشێتەکەیشەوە، بە ناونیشانی" ئەو دوو بابەتە گرنگەی کە باسیان لێوە دەکرێت" دوو بۆکس دانرابوون:

"۱-پلانی هێڵی هاوتەریبی ۳٤

گۆڕینی هێڵی ۳٦ بە هێڵی ۳٤، بە جۆرێك کە کەرکوك بگرێتەوە. بۆ ئەوەی ئەم ناوچەیە تەنها کوردەکان نەگرێتەوە و هەموو لایەنەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بە تورکمان و عەرەبی شیعە و سوننە'ش بگرێتەوە.

۲-حکومەت کاتی

دامەزراندنی پەرلەمان و حکومەتێکی کاتی لە باکووری عێراق، بە جۆرێك کە هەموو ئەو گرووپانەی ئۆپۆزیسیۆن بگرێتەوە کە لە عێراق دژی سەدام تێدەکۆشن."

هەمان رۆژ لە تەنیشت مانشێتی رۆژنامەکەدا، نوسینێکی ئەتوغرول ئویزکویك بە ناوی" ئەو رێگایەی کە لە ڤیەنا'وە گەیشتە ئەنقەرە" بڵاوکرایەوە. پێشتر لەبارەی کۆبوونەوە چاوەڕوان کراوەکەی تورگوت ئۆزال و ئۆپۆزیسیۆنی عێراق و کورتەی مێژوویی گرووپەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق هەندێك زانیاریم بە ئویزکویك دابوو. دەمزانی ئەرتورغروڵ ئویزکویك سەرنوسەری رۆژنامەی حورییەت حەز دەکات بەر لە هەموو کەسێك هەموو شتێك بزانێ و ئەوەش وەك سەرکەوتنێکی رۆژنامەوانی بۆ خۆی تۆمار بکات و حیسابی ئەو ئاڵۆزییەشم کردبوو کە بەهۆی دیدارەکەوە دەرکەوت، بۆیە ئەو زانیارییانەم پێدابوو. ئەرتوغروڵ ئویزکویك بە پشتبەستن بەو زانیارییانەی کە من پێم دابوو، وەك ئەوەی کە ئاگای لە زۆر شت بێت، بابەتێکی جێی سەرنجی نوسی. بە بێئەوەی ناوم بهێنێت، زانیارییەکانی تایبەت بە هۆکارەکانی پشتی کۆبوونەوەکەی باسکردبوو، هەروەها لەسەر گرنگی دیدارەکەش ئەم دێڕانەی نوسیبوو:

"داخۆ یەکەم جار واشنتن چرای سەوزی بۆ ئەم کۆبوونەوەیە هەڵکردووە؟ چونکە بە گوێرەی ئەو هەواڵانەی کە دەگەن، ئەو دوو سەرکردەیەی کورد کە سەردانی ئەنقەرە'یان کردووە، لە واشنتن پێیان گوتراوە پێویستە هەر کارێك کە دەیکەن بە ئاگاداری تورکیا بێت. ئەنجامدانی کۆبوونەوەکەی دوێنێ لە ئەنقەرە، ئەویش پاش ئەو پەیامەی کە بە سەرکردە کوردەکان دراوە، واتای زیاتر دەبەخشێ."

بەستنەوەی هەر رووداوێکی تایبەت بە پرسی‌کورد لە تورکیا بە ئەمریکا و جێگیرکردنی پ.ك.ك لەنێو

تابلۆی ڕووداوەکەدا، لە تورکیا شتێکی باوە. لەم دێڕانەی بەشی کۆتایی نوسینەکەیدا، دەردەکەوێت کە ئەرتوغرول ئویزکویك'یش بە هەمانشێوە بیری کردۆتەوە:

"هەردوو سەرکردەی کورد لە دیدارەکانیاندا لە ئەنقەرە هەموو کات پەیامێك وەردەگرن. سولەیمان دەمیرەل سەرۆك وەزیری تورکیا، پێیان دەڵێت: لە ڕووی ئەمنییەوە هاوکاریمان بکەن، ئێمەش بە هەموو جۆرێك پشتگیریتان دەکەین. چەتین(حیکمەت چەتین وەزیری دەرەوە)یش لە ڕوویەکی نیگەتیڤەوە هەمان پەیامیان بەشێوەیەکی دیکە پێدەدات: هەرجۆرە یارمەتییەکی مادی و مرۆییتان پێدەدەین، بەڵام ئەگەر پرسی پ.ك.ك بەردەوام بێت بەردەوام بوونی ئەو هاوکارییانە زەحمەت دەبێت.

تاڵەبانی و بارزانی دوای وەرگرتنی ئەو پەیامە لە حکومەت، دوێنی بەیانی کتوپڕ لەگەڵ پەرلەمانتارانی پارتی ڕەنجی گەل کۆبوونەتەوە. چاوەڕوان دەکرێت لەو دیدارەدا پەرلەمانتارەکان ئامۆژگاری بکەن تا خۆیان لە پ.ك.ك دووربگرن..."

لەسەر کۆبوونەوەکەی چانقایا، دوو ڕۆژ دواتر قیامەت بەرپا بوو. ڕۆژنامەی حورییەت لە ١٩٩٢/٩/٤دا لە مانشێتەکەی خۆیدا ڕستەی" کۆبوونەوەکەی چانقایا قیامەتی بەرپا کرد" و لە ژێر ئەوەشدا ڕستەی" کۆبوونەوەکەی ئۆزال لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بۆ دانانی پلانی ڕووخاندنی سەدام، کاردانەوەی توندی سەرکردەی پارتەکان و وەزیری دەرەوەی لێکەوتەوە."

سەرۆك وەزیر سولەیمان دەمیرەل، تووڕە ببوو. لەسەر ئۆزال گوتی:" چەند جار سنوری دەسەڵاتەکانیمان بە بیری هێنایەوە... هەموو کەس دەزانێت کە بە گوێرەی دەستوری تورکیا دەسەڵاتەکانی چانقایا، دەسەڵاتەکانی حکومەت و پەرلەمان چین." توندترین کاردانەوە لەلایەن بولەنت ئەجەوید سەرۆکی پارتی شۆڕشگێڕی سۆسیالیست هات کە لەو کاتانەدا خۆی وەك ڕۆژنامەوان دەردەخست و لەکاتی جەنگی کەنداو'دا پشتگیری لە سەدام حسێن دەکرد. ئەجەوید بە ئاماژە کردن بە ئەمریکا، تورگوت ئۆزال'ی "بە بوون بە ئامرازی فێڵەکانی دابەشکردنی تورکیا" تۆمەتبار کرد. ئەو گوتی:" ئۆزال، یان هێشتا تێنەگەیشتووە لەوەی کە دوای دابەشکردنی عێراق بۆ سێ بەش، نۆرەی دابەشکردنی تورکیا'ش دێت، یان بە زانابوونەوە لەو پیلانەدا بەشدارە." بۆ یەکەم جار باسی ئەوەشی کرد کە پێویستە ئۆزال لەسەر کارەکەی لابدرێت و وتی:" من لە سەرەتادا لایەنگری ئەوە نەبووم. بۆیە پێشنیارم کرد کە سەبارەت بە سنوری دەسەڵاتەکانی هۆشداری پێ بدرێت ئەگەر دیسان سەرپێچی کرد، ئەو کات بە دوای ڕێگایەك بۆ لەسەر کار لابردنی بگەڕێین. بەڵام ئێستا کاتی خۆیەتی. تورکیا ئیدی ناتوانی لەمە زیاتر تەحەمولی ئەمری واقیعەکانی ئۆزال بکات."

کاردانەوەی ئەرداڵ ئینەنۆ جێگری سەرۆك وەزیر'یش تەنها ڕستەی:"من ئەو شتانەی کە بەڕێز ئۆزال

دەیانکات بە راستیان نازانم."بوو.

حوڕییەت لە هەمان رۆژدا بە ناونیشانی" عێراق، دڵی شکاوە" لێدوانی باڵیۆزی عێراق ی لە ئەنقەرە بڵاوکردەوە. رەفیفی دەرهام ئەلتکریتی باڵیۆزی ئەو کاتەی عێراق لە تورکیا کە دواتر لە جەنگی ٢٠٠٣دا کرایە بەرپرسی دەزگای هەواڵگری سەدام، لە لێدوانەکەیدا وتبووی:" خەڵکی ئێمە بارزانی و تاڵەبانی دەناسن، بەڵام ئەوانی دیکە ئەگەر بە کۆڵانێکدا بڕۆن کەس سەلامیان لێ ناکات. ئەمانە فەرمان لە واشنتن و لەندەن وەردەگرن. هیچ رابردوویەك و داهاتوویەکیشیان نیە. نیگەرانین لەوەی کە دۆستەکانمان گرنگیان پێداون و دیداریان لەگەڵ کردوون." و بەوجۆرەش لەگەڵ ئەوەی کە نیگەرانی خۆی لە دیداری ئۆزال و ئۆپۆزیسیۆنی عێراق پیشاندا، لایەنە نارازییەکانی عێراق یشی بە بچووك و کەم بەها وەسفکرد. ١٥ ساڵ دوای ئەو قسانەی باڵیۆزی عێراق لە تورکیا کە دەیگوت " ئەمانە هیچ داهاتوویەکیان نیە"، یەکێك لەو کەسانە بوو بە سەرکۆماری عێراق و یەکێکی دیکەشیان بوو بە سەرۆك وەزیر و یەکێکی تریان دوای رووخانی سەدام بوو بە ئەندامی مەجلیسی حوکم و کەسێکیشیان پۆستی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان ی وەرگرت.

تێبنییەکەی ئەو باڵیۆزەی سەدام کە کاری هەواڵگری دەکرد، راست دەرنەچوو.

حوڕییەت لە رۆژی ١٩٩٢/٩/٤دا لەگەڵ بڵاوکردنەوەی مانشێتی" کۆبوونەوەکەی چانقایا قیامەتی بەرپا کرد"، هەواڵێکی بە ناونیشانی"ئەمریکا مەمنونە" دانابوو کە سەرچاوەکەی لە واشنتن بوو. لە هەواڵەکەدا وەها دەگوترا:

"دیداری سەرکۆمار تورگوت ئۆزال لەگەڵ نوێنەرانی گرووپە نەیارەکانی سەدام حسێن لە عێراق، بەڕێوەبردنی ئەمریکا ی مەمنون کرد. بەڵام بەڕێوەبردنی ئەمریکا لەم قۆناخەی ئێستا پشتگیری ئەو پێشنیارە ناکات کە هێڵی هاوتەریبی ٣٦ بەرەو باشوور بۆ هێڵی ٣٤ دابەزێت. سەرچاوەیەکی بەرپرسی ئەمریکی رایگەیاند کە هەندێك بۆچوون لەوبارەیەوە باسکراون، بەڵام وەك حکومەت پشتگیری ناکەین...

حکومەتی ئەمریکا بە گەرمی پێشوازی لە ئامادەکارییەکانی راگەیاندنی حکومەتی کاتی لە باکووری عێراق دەکات. لەگەڵ ئەمەشدا، تا ئێستا ئەمریکا سەبارەت بە هەڵکردنی چرای سەوزی خۆی بۆ ئەم کارە هیچ شتێکی بە تورکیا رانەگەیاندووە. بەڵام ئەگەر ئەنقەرە پشتیوانی لەمە بکات، ئەمریکا بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لێ دەکات. لە هەمانکاتدا واشنتن سەرنج رادەکێشێتە سەر پشتیوانی هەندێك لە وڵاتانی ناوچەکە بە تایبەت عەرەبستانی سعودی لەم پلانە و لەم بڕیارەدا کە مەترسی گەورەی لە هەناودایە، تۆپەکە لە مەیدانی تورکیا جێ دەهێڵێت."

سەرۆك کۆمار تورگوت ئۆزال، لە ئەنقەرە تەنها بوو. تا ئەندازەیەك هەمو دامودەزگاکانی دەوڵەت و حکومەت بە تووڕەییەوە دژی ئەو کارەی ئۆزاڵ راوەستابوون. ئۆکتای ئەکشی کە دیارترین دەنگی

لایەنگرانی پاراستنی وەزعی مەوجود بوو، سەرەتا لە رۆژی ١٩٩٢/٩/٤دا لە بابەتی" ئەوەندەش زۆر نیە؟" و رۆژی دواتریش لە بابەتی"گرێکوێرە"دا بوو بە وەرگێڕی هەستی کاربەدەستانی حکومەت - دەوڵەت و تۆپی رەخنەکانی ئاراستەی تورگوت ئۆزال کرد. لە بابەتی یەکەمدا وەهای نوسیبو:

"پێشتر شتی وەهامان نەبینیوە. نەك هەر ئەوە، تەنانەت نەمانبیستوە و نەمانخوێندۆتەوە. ئایا بە راستی نمونەی ئەو شتەی کە رۆژێك بەر لە ئێستا بەڕێز سەرکۆمار کردوویەتی و هەموو لایەنەکانی ئۆپۆزیسیۆنی وڵاتێکی دراوسێی کۆکردۆتەوە، لە حاڵەتێکی غەیری جەنگ و ئاژاوەدا بینراوە؟"

لەنێو ئەو هەموو هات و هەرایەدا، دەنگی ئۆزال لەنێو بابەتەکەی رۆژی ١٩٩٢/٩/٤ی ئەرتوغروڵ ئویزکویك‌دا بیسترا. ئۆیزکویك لە بابەتەکەیدا کە بە ناونیشانی:"ئۆزاڵ: بۆچی دیدار نەکەم؟" بڵاوی کردبووەوە وەهای نوسیبو:

" ئەو کۆبوونەوەیەی کە دوێنێ لە کۆشك سازکرا، گفتوگۆیەکی سەیر دەستپێدەکات کە دوو رەهەندی هەیە: یەکەمیان ئەوەیە کە ئایا سەرکۆمارێك بە دەسەڵاتی سنوردارەوە دەتوانێت کۆبوونەوەیەکی وەها رێکبخات؟

دوەمیشیان ئەوەیە کە ئایا پێویستە تورکیا دیدارێکی وەها لەگەڵ نوێنەرانی ئەو گرووپانەی لە کێشمەکێشی ناوخۆیی عێراق‌دا رۆڵیان هەیە رێکبخات.

سەرکۆمار تورگوت ئۆزال لە وەڵامی پرسیاری دووەمدا، بێ هیچ دوودڵییەك دەڵێت: بۆچی دیدار نەکەم؟ سوریا، عەرەبستانی سعودی و ئەمریکا لەگەڵ ئەم گرووپانەدا دیدار دەکەن. ئێمە بۆچی نەیانبینین؟

سەرکۆمار پاساوێکی دیکەیشی بۆ ئەم دیدارە هەیە: وەزارەتی دەرەوە تەنها لەگەڵ سەرکردە کوردەکان‌دا دیدار دەکات، پێویستە ئەو دیدارانە فراوانتر بکرێن.

ئۆزال لە درێژەدا دەڵێت:

ئیدی چ پێویست دەکات ئێمە سەدامچێتی بکەین؟بە تەواوی دەرکەوتووە کە ئەو کابرایە یارمەتی پ.ك.ك دەدات. تورکیا چ بەرژەوەندییەکی لەگەڵ سەدام هەیە؟ ئیدی دۆستایەتی لەگەڵ سەدام دەکرێت؟

ئەم وتانەی سەرکۆمار، دەریدەخەن گرفتی قووڵی نێوان ئەو لەگەڵ سەدام کە لەکاتی جەنگی کەنداو‌ەوە پەیدا بووە، تا ئێستا وەك خۆی ماوەتەوە."

وەها بوو. جگە لە تورگوت ئۆزال، هیچ کەس لە ئەنقەرە کێشەی لەگەڵ سەدام نەبوو. دوای تەواوبوونی جەنگی کەنداو، لە دەرەوەی تورگوت ئۆزال، بۆ باقی ئەنقەرە هیچ هۆکارێك نەمابوو تا لە پەیوەندی لەگەڵ عێراق‌دا بۆ بارودۆخێکی نزیك لە وەزعی مەوجود نەگەڕێتەوە. لەوەش زیاتر، ئەو بەشەی ئەنقەرە بەهۆی دروستبوونی بەڕێوەبردنی کوردی لە سایەی سنوردارکردنی دەسەڵاتی سەدام بەهۆی هێڵی ٣٦ لە باکوور،

ترس دایگرتبوون و سەدام'یان وەك هاوپەیمانی سروشتی خۆیان سەیر دەکرد.

دیدگای تورگوت ئۆزال و ئەنقەرە سەبارەت بە عێراق و کوردەکان، وەك دو سەری مەقەست لە یەك جیا بوون. سەرەڕای هەموو شتێك، تورگوت ئۆزال درێژەی بە لایەنگریی خۆی لە رووخانی سەدام و بونیاتنانی عێراقێکی بێ سەدام دەدا. بەهۆی ئەم دیدگایەشەوە، دەرفەتی دیداری لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بەکارهێنا. ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە دەوڵەتی تورك، لە سنورە باشوورییەکانی خۆیدا عێراق'ی سەدام'ی لە بژارەکانی دیکە پێ باشتر بوو.

لە راستیدا ئۆپۆزیسیۆنی عێراق، پێشتر داوای بەرقەرارکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەنقەرە و وەزارەتی دەرەوە کردبوو، بەڵام ئەنجامێکی دەست نەکەتبوو. دوو مانگ بەر لە دیداری ئۆپۆزیسیۆن لەگەڵ ئۆزال لە چانقایا، دوای کۆبوونەوەی مێژوویی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لە حوزەیرانی ١٩٩٢ لە ڤییەنا و بڕیاری دەزگامەندکردنی ئۆپۆزیسیۆن، ئەو داواکارییە پێشکەشکرابوو.

بەهۆی ئەوەی کە ئەنقەرە نەیدەتوانی ئەوە ببینێ کە بارودۆخی عێراق بە شێوەی ئاسایی بەردەوام نابێت و هەروەها لەبەر ئەوەی کە درکی بە کاریگەرییەکانی کۆتاییهاتنی جەنگی سارد لەسەر هەموو ناوچەکە و عێراق نەدەکرد و وازی لە رەفتاری ئاسایی خۆی نەدەهێنا، ئەو سیاسەتەی کە تورگوت ئۆزال دەیویست پێڕەوی بکات، تووشی گرفتی گەورە ببوو. لەدوای مەرگی ئۆزال لە ساڵی ١٩٩٣، ئەنقەرە لە گەورەترین نەیاری رێبازی ئاسایی دەوڵەت رزگاری بوو. لە ساڵەکانی دیکەی نەوەدەکانیشدا رێبازەکەی خۆی سەقامگیرتر کرد. هەر ئەو رێبازە، دواتر لەکاتی مسۆگەر بوونی جەنگی ٢٠٠٣ی عێراق'یش خۆی نواندەوە و یەکێك لە هۆکارە بنەڕەتییەکانی دەرکەوتنی ناکۆکی لە پەیوەندییەکانی تورك – ئەمریکا بوو.

هیچ کات بۆچوونم سەبارەت بە گونجاوی سیاسی و دروستبوونی رۆڵم لەو قۆناخەی کە گەیشتە دیداری ئۆزال و ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لە کۆشکی چانقایا نەگۆڕا. لەگەڵ ئەمەشدا لەبەر ئەوەی کە لە ریزی ئەو کەسانەدا بووم کە رۆڵمان هەبوو لەوەی کێشەمان بۆ سەرکۆمارێك دروستکردووە کە ناکۆکی لەگەڵ حکومەتدا هەیە و قسە لەبارەی لەسەر کار لابردنی دەکرێت، نیگەران بووم. دەمزانی بەشێکی گرنگ لەو کەسانەی کە بە دەوری سەرکۆمار'ەوەن بەوجۆرە سەیری پەیوەندییەکانی من لەگەڵ ئۆزال دەکەن. هەرچەندە تورگوت ئۆزال سەرکۆمار بوو، بەڵام هەستناکی دەوڵەتی تورك بەرامبەر بە کوردەکان لەناو نەچووبوو.

تورگوت ئۆزال، لە بواری ریسکی سیاسی و پێشبینی کردنی رووداوەکـان، تا ئەندازەیەك لە هەموو بەرپرسانی دەوڵەت زۆر لە پێشتر بوو. راستە کە لە رێی دیدارەکەی لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق، مشتومڕەکانی سەبارەت بە خۆی زیندووکردەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە بڕوای بە دروستیی هەنگاوەکەی

خۆی هەبوو پاشەکشەی نەکرد. مێژووش دواتر ئەوەی بە هەق دەردەخست.

ساڵانێك دواتر، فەرەیدوون سینرلی ئوغڵو راوێژکاری وەزارەتی دەرەوە، لە کۆبوونەوەیەکی پێدانی زانیاری بە رۆژنامەنوساندا، لە رێی رستەی" نامانەوێ ئەو هەڵانە دووبارە بکەینەوە کە پێشتر لە پرسی پەیوەندی لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق'دا کردوومانە." پاساوی بۆ پێدانی هاوکاری بە ئۆپۆزیسیۆنی سوریا و دانانی ناوەندی ئەو گرووپانە لە ئیستانبوڵ دەهێنایەوە.

دیدارەکەی ئۆزال لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لە چانقایا، لە ئەیلوولی ١٩٩٢وە هەتا دە ساڵی دواتر کە لە ٢٠٠٣دا ئۆپۆزیسیۆن جێگەی رژێمەکەی سەدام'ی گرتەوە، یەکەم و دوایین دیداری ئاست بەرزی دەوڵەتی تورکیا لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بوو. دوای ئەو دیدارە، هەتا ٢٤ کاتژمێر بەر لە جەنگی ٢٠٠٣، دیدارێکی دیکە سازنەکرا. تورکیا بۆ ساڵانێکی درێژ لە"هاوسەنگی عێراق"دا جێگەی نەگرت. لەدوای تورگوت ئۆزال، رێبازێکی دژی ئەو پێرەو کرا.

تورکیا لە قۆناخی دوای تورگوت ئۆزال، سەبارەت بە کێشەی کورد لە ناوخۆشدا وازی لە نزیکایەتی و هەڵوێستەکانی ئۆزال هێنا. ساڵانی دوای ئۆزال، ساڵانێك بوون کە تێیدا تورکیا باجی گەورەی لەبارەی کێشەی کورد دا. بەهۆی دەعوەت کردنی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بۆ کۆشکی چانقایا، تورگوت ئۆزال لەبەرەیەکی فراواندا لە عێراق'ەوە هەتا دوژمنە خوێنەخوارەکانی لە تورکیا، رووبەڕووی هێرشی نەیارانی بووەوە. بەڵام ئەوەی کە لە راستیدا بەهۆی دیداری ئۆپۆزیسیۆنی عێراق و ئۆزال لە کۆشك تووشی بەڵا بوو، من بووم. نزیك بوونم لە ئۆزال، واتای پارێزراو بوونمی نەدەدا.

زانیارییەکی هەواڵگری کە دەگوترا سەرچاوەکەی "زۆر بڕواپێکراوە"، سەبارەت بەوەی کە تیمێکی کوشتن لە عێراق'ەوە هاتوونەتە ناو تورکیا و چەك لە ناوخۆ دابین دەکەن و لە نزیکترین کاتدا بەرنامەی کوشتنی منیان پێیە، دەست بەڕێوەبەرانی رۆژنامەی سەباح کەوتبوو. زەفەر موتڵو سەرنوسەری رۆژنامەکە دەیگوت کە پێویستە من بە زووترین کات لە تورکیا دەرچم. هۆکاری پیشەیی پێویستیشم هەبوو بۆ ئەوەی بتوانم بۆ واشنتن لە ئەمریکا بڕۆم: لە ماوەیەکی نزیکدا هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە ئەمریکا دەکرا و منیش دەمتوانی چاودێری بکەم.

لە واشنتن تەلەفۆنم بۆ ئۆزال کرد و لە رێی ئەو قسانەی کە سەبارەت بە خۆم بیستبووم، سەرنجیم راکێشایە سەر ئەوەی کە پێویستە رێوشوێنە ئەمنییەکانی پاراستنی خۆی زیاتر بکات. دوای ماوەیەکی کورت، هەندێك بەڵگەی بەرچاوم دەسکەوت سەبارەت بەوەی کە سەرچاوەی ئەو هەڕەشەیە زیاتر لە بەغدا بۆ ئەنقەرە، هەواڵگری سەربازی یان هێزی تایبەت یان ژێتەم دەگەڕایەوە کە ئێمە زۆر جار بە یەك واتا ناوەکانیانمان بەکار دەهێنان.

چەند ساڵ دواتریش ئەوەم دەزانی کە لەگەڵ ژرێمی سەدام لە عێراق تووشی گرفت بووم. پەیامنێرێکی ڕۆژنامەی سەباح کە عەرەبی دەزانی لەگەڵ وەفدێکی ڕۆژنامەنوساندا سەردانی بەغدا'ی کردبوو. لە گەڕانەوەیدا بە ترس و شڵەژانەوە پێی گوتم:" کاکە!سەردانی بەغدا نەکەی. تارق عەزیز کاتێ زانیویەتی لە ڕۆژنامەی سەباح کاردەکەم پێی وتووم بەو جەنگیز چاندار'ە بڵێن..." و هەڕەشەکانی تارق عەزیز وەزیری دەرەوەی عێراق'ی بۆ گێڕامەوە.

نەمدەزانی کە لەبەر ئەوەی تارق عەزیز ناوەکەم دەزانێت چ جۆرە هەستێکم هەیە: هەستێکی سوکی نارسیزمی یان نیگەرانی لە شارەزایی بەعسی عێراق لە کوشتنی نەیارەکانی لە دەرەوەی سنور کە لە ڕۆژانی بەیروت'ەوە دەمزانی؟ وادیارە بوو لە نێوان ئەو دوو هەستەدا مابوومەوە کە هیچ پەیوەندییەکیان بە یەکەوە نەبوو.

مومکین نەبوو تارق عەزیز لە کۆبوونەوەی ساڵی ١٩٨٧ی وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی موسڵمان لە عەممان منی بیر بکەوێتەوە. لەوێ بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵ یەکدا لەسەر قەنەفەیەك دانیشتین و چاوپێکەوتنێکی کورتم ئەنجامدا. بەڵام تارق عەزیز کە لەو کاتەدا جگەرەیەکی ئەستوری چرووت(Puro) ی لە دەمدابوو، تەنەزوولی نەدەکرد سەیری ناوچاوم بکات و دووکەڵی جگەرەکەی بە سەرمدا دەکرد، لەو کاتانەدا مەراقی ناوی منی نەدەکرد تا سەرهەڵبڕێ و لێم بپرسێ.

تورگوت ئۆزال لە ئابی ١٩٩٠دا، هەر لە ڕۆژانی سەرەتایی قەیرانی کەنداودا بە جەیمس بەیکەر وەزیری دەرەوەی ئەمریکای وتبوو:" پێویستە ئەو (سەدام) لە ناوبەرین. ئەگەر بمێنێتەوە هەموو دەوڵەتێك لە مەترسیدا دەبێت. بەردەوام لە ژێر هەڕەشەدا دەبین. دوو ساڵ دوای جەنگ، تورگوت ئۆزال ژیانی لە دەسدا و لە مەیدانی مێژو کشابووەوە، بەڵام ڕژێمە دیکتاتۆرییەکەی سەدام لە بەغدا هێشتا لەسەر کار مابوو. هەتا ئەو لەسەر کار بمایە، وەك بۆچوونەکەی تورگوت ئۆزال، لەگەڵ ئەوەی کە هەموو دەوڵەتێك لە ژێر هەڕەشەدا دەبوو، منیش بە بەردەوامی لە مەترسیدا دەبووم. لەوەش زیاتر، لەدوای تورگوت ئۆزال بەردەوام بوونی پەیوەندییەکانم لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق، ئەو هەڕەشە بەردەوامەی لەسەر من زیاتر دەکرد و نەمدەتوانی خۆمی لێ بشارمەوە. خۆی لە خۆیدا ئەوەی کە تارق عەزیز لە بەغدا منی دەناسی، ئاماژەیەك بۆ بەردەوامی و جیدی بوونی ئەو مەترسییە بوو. پەیوەندی منیش لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بۆ زۆر بەر لە دەزگامەندبوونی ئەو ئۆپۆزیسیۆنە و بۆ ڕۆژانی بەیروت دەگەڕێتەوە.

**لە دڵمەوە سڵاوێک بۆ بەیروت**
**ماچ بۆ دەریا و خانووەکان**
**بۆ ئەو تاشەبەردەی لە ڕوومەتی دەریاوانی پیر دەچێت**
**ئەو... کە لە ڕۆحی خەڵکەوە، لە شەراب**
**لە عارەقی ئەوەوە... لە نانێک و لە یاسەمینەکانەوە دروستکراوە**
**بۆچی تام و چێژەکەی وەک تامی ئاگر و دووکەڵی لێهات؟**

**فەیرۆز "بۆ بەیروت"**

بەیروت تەنها پایتەختی لوبنان نەبوو، بەڵکو ناوەندی ڕۆشنبیری دنیای عەرەب'یش بوو. لە ڕووی نوسین و مۆسیقاوە، شوێنی قاهیرە'ی جارانی گرتبووەوە. ڕێنسانسی کەلتووری عەرەب لە ڕێی ئاهەنگ و بەستەکانی براکانی ڕەحبانی و حەنجەرەی سیحراوی فەیرۆز'ەوە دەنگی خۆی دەردەخست. بەڵام لە دنیای نوسیندا، زۆر زیاتر خۆی بەرجەستە دەکرد. ئاڤی شاڵیم یەکێك لە پرۆفیسۆرەکانی زانکۆی ئۆکسفۆرد، بەیروت بە"پایتەختی نوسین و ڕۆشنگەری عەرەب" ناودەبات و سەمیر قەسیر[8] لە کتێبی مێژووی بەیروت'دا، ئەو ئەنجامانە بیردەهێنێتەوە کە بەهۆی جێگیربوونی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین (ر.ر.ف) لە شارەکەدا بەدی هاتوون و بە نمونەوە باسی ئەوە دەکات کە ر.ر.ف ڕۆشنبیران و جەنگاوەرانی لە فەلەستین، تونس، فاس، سودان، عێراق و میسر، بەرەو خۆی ڕاکێشاوە و ئەمەش دروستکردنی دەیان ناوەندی لێکۆڵینەوە و خانەی چاپ و پەخشی لێکەوتۆتەوە.

لەدوای ئەوەی کە فەلەستینییەکان لە جەنگ ناوخۆیی ساڵی ١٩٧١دا لە ئوردن شکستیان هێنا و سەرکردە و کادێرەکانی ر.ر.ف پەنایان بۆ بەیروت برد و لەوێ نیشتەجێ بوون، ئەو شارە بەشێوەیەکی نائاسایی جووڵەی تێکەوت. منیش هاوکات لەگەڵ ر.ر.ف پێم نایە ناو خاکی بەیروت. ڕۆژانی جەنگی ناوخۆیی ئوردن، لەگەڵ قۆناخی مەشق و ڕاهێنانی من و گرووپێك هاوڕێی تورك'م لە یەکێك لە کەمپەکانی جولانەوەی فەلەستین لە نزیك شام هاوکات بوون. ماوەیەکی کورت لە یەکێك لە بنکەکانی فەلەستین لە گردەکانی جۆلان ماینەوە، بەڵام دوای پاشەکشەی هێز و دامودەزگای فەلەستینییەکان لە ئوردن، ئێمەشیان بۆ لوبنان گواستەوە. بەسەرهاتی ئەو ڕۆژانەم لە بابەتێکدا بە ناوی"تورکێك لەبەرگریی فەلەستین دا" لە ژمارەی زستانی ٢٠٠٠ی Journal Of Palestine Studies دا بڵاوکردۆتەوە. ئەو بەشەی کە لەوێدا بە زمانی ئینگلیزی لەبارەی گەیشتنم بە بەیروت نوسیبووم بەمجۆرەیە:

"تەنانەت بەر لە شکستەکەی ر.ر.ف لە ئوردن، ڕژێمی سوریا نەیدەهێشت جەنگاوەرانی فەلەستین'ی لە هێڵی پێکدادانی گردەکانی گۆلان'ەوە (لەدژی ئیسرائیل) ئۆپەراسیۆن ئەنجام بدەن. بەڵام ئیدی لەوێ

٨ -ڕۆشنبیرێکی لوبنانی'یە کە باوکی فەلەستینی و دایکیشی خەڵکی سوریا'یە. ساڵی ٢٠٠٥دا لە ڕووداوێکی تیرۆریستیدا کە وا مەزەندە دەکرێت هەواڵگری سوریا لە پشتی بووبێت، گیانی لەدەسدا.

ڕێگەیان بە مانەوەی بنکەی گەریلا و دامودەزگای فەلەستینییەکان'یش نەدەدا. لەبەر ئەوەش شەوێکی پاییزی ١٩٧١، سواری ئۆتۆمبیلی بارهەڵگری گەورەیان کردین و ڕەوانەی لوبنان کراین. هێشتا جۆش و خرۆشی ئەو کاتەم لە یادە کە لە سەر سنوری چیای ئەنتی لوبنان، ڕووباری بەرادە'مان تێپەڕکرد و بەسەر چیای لوبنان سەرکەوتین. کاتێك لە نەهرەلبارید و بیحەمدوون و عالەی'یەوە بەرەو کەناری دەریا شۆڕ دەبووینەوە، دیمەنی بەیروت وەك سێگۆشەیەکی بریقەدار کە دەچێتە ناو دەریا، پەیدا بوو. هەموو دەریای سپی دیاربوو. لە جوانی چیای لوبنان و گوندەکانی نێو دارەکانی سنەوبەر و بەڕووی ئەو چیایە مەست و سەرخۆش ببووم، بەڵام زیاتر حەیرانی بەیروت مامەوە.

بەر لەوەی ڕەوانەی بنکەیەکی گەریلای فەلەستینی لە باشووری لوبنان بکرێین، ماوەی هەفتەیەك لە ماڵی بەرپرسێکی بەرەی دیموکراتی ماینەوە کە لە ئەنقەرە خوێندبووی و بە زمانی تورکی قسەی دەکرد. لەو ماوەیەدا بە کۆڵانەکانی شاردا گەڕاین. چاومان لە گلۆپە شیرییەکانی جادەی حەمرای خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و کافەی ژێر قادرمەکان و ریستۆرانە جوانەکان و ویترینی جوانی دوکانەکانی هەڵنەدەگرت. نەمدەتوانی ئەم شارە کۆنەی عوسمانی لەگەڵ شارەکانی تورکیا بەراورد نەکەم و گەیشتمە ئەو بڕیارەی کە لوبنان زۆر پێشکەوتووتر و ئەورووپا'ییترە. بەڵام بەیروت، تەنانەت زیاتر لە شام شتی عەرەبی هەبوو. ئەندازیاری بینا کۆنەکانی عوسمانی- عەرەب لە گەڕەکە کۆنەکان و ئەو فێسانە کە عەرەبە سوننە کۆنەکان لە سەریان دەکرد و کڵاوەزماڵی پیرمێردە درووزییەکان، ئەو لایەنەی بەیروت'یان دەردەخست. بەیروت وەك پەلکەزێڕینەی کەلتوور، بیروبڕوا، ئایدۆلۆژیا و شێوازە جۆراوجۆرەکانی ژیان بوو. کاتێ بیرم لێدەکردەوە، درکم بەوە دەکرد کە باری فرەڕەنگیی (بەیروت) منی رادەکێشا کە تەنانەت ئیستانبوڵ'ی ئەو کاتانەش کە ژمارەی غەیرەموسڵمانەکانی کەم بوون و ڕووی لە کەمبوونەی زیاتر دەکرد، لەوە بێبەش بوو."

بەیروت، خۆرئاواییترین شوێنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دەروازەی هاتنی خۆرئاوا بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو. یەکێك لە "بەندەرەکانی خۆرهەڵات" بوو کە ئەمین مەعلووف باسیان دەکات. لەوانەیە لە قۆناخێکدا تەنها حەیفادەیتوانی رکابەری بکات. بەڵام دوای ئەوەی کەوتە ژێر دەستی ئیسرائیل، حەیفاله پەراوێزدا مایەوە و ئاوارە و سەرکردەی سیاسی و ڕۆشنبیرانی فەلەستین روویان لە بەیروت کرد و لەوێ نیشتەجێ بوون. بەوجۆرەش بەیروت بوو بە شارێکی بێ رکابەر کە نەریتی خۆرهەڵات'ی لە خۆیدا کۆدەکردەوە. لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا، مۆسیقا و شیعر و ئەدەبیات، سیاسەت و فێڵ و تەلەکەبازی و پێکدادان، هیدۆنیزم'ی (فەلسەفەی چێژ وەرگرتن لە خۆشییەکانی دنیا) کەناری دەریای سپی کە لە وڵاتانی خۆیاندا دەرنەدەکەوت و لە سەرمایەی وڵاتانی کەنداوەوە هێزی دەگرت، هەتا ژیانی پڕ زەحمەت و بە دیسپلینی کەمپی پەنابەرانی فەلەستینی، هەموو شتێك لە بەیروت هەبوو.

بەیروت لە ١٩٧١-١٩٨٢ وەك پایتەختی ر.ر.ف بوو..، دەکرێت بگوترێت کە لەو ساڵانەشدا وەك نمونەی شارێکی خۆرهەڵاتی، سەرەڕای ئەوەی کە روخساری خۆرئاواییانەشی هەبوو، وەك پایتەختی جیهانی سێیەمی لێهاتبوو. لەو ساڵانەدا بەهۆی جەنگی ناوخۆیی، ماڵکاولی و لافاوی خوێن بەیروت'ی گرتەوە. ساڵی١٩٨٢، دوای سێ مانگ گەمارۆی ئیسرائیل و بۆردومانی هەمەلایەنە، ر.ر.ف ئەوێی جێهێشت و شارەکەش بە هەندێك بیرەوەری فەرامۆش نەکراوەوە لەسەر شوناسەکەی مایەوە. لە هەموو ئەم قۆناخانەشدا لەگەڵیدا بووم و لە ناویدا ژیام. لەبەر ئەوەی هەموو شتێکی لە خۆدەگرت و لە پایتەختی چەند هێزێکی جیاواز دەچوو، وەك ئەوە وابوو کە هیچ کەس خاوەنی نیە. لەبەر ئەوەش هەرکەسێك دەیتوانی لە بەیروت شوێنی خۆی بکاتەوە و بەشێوەیەکی ناکۆك لەگەڵ باری لاوازی ئەمنی ئەو شارەدا، مەیدانێکی فراوانی ئازادی بۆ خۆی دەستەبەر بکات. ئەم شوناسەی بەیروت وایکردبوو کە وەك شوێنی بە یەك گەیشتنی هەموو رەوتە فیکرییەکانی دنیای عەرەب و لە واتایەکی فراوانیشدا هەموو جیهانی سێیەم و شوێنی هەموو نەیارەکانی رژێمە ئۆتۆکراتەکانی عەرەبی لێ بێت.

لەوێ لەگەڵ ئەبوئەمەل ئاشنا بووم کە دواتر دنیا بە ناوی راستەقینەی خۆی کە عادل عەبدولمەهدی بوو، دەمناسی. ناوبراو لەدوای هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٦، بوو بە یەکەم شیعەی هەڵبژێردراو بۆ پۆستی جێگری سەرکۆماری عێراق و یەکەم دۆستی عێراق'ی من بوو کە لە کۆتایی١٩٧٠کان و لە سەرەتاکانی ١٩٨٠کاندا، جاربەجار لە بەیروت لە ماڵی دەمامەوە. بە واتایەکی دیکە، یادگاری "قۆناخی دووەمی من لە بەیروت" بوو. دوو قۆناخی ژیانم لە بەیروت هەیە. هەردوکیشیان لە شکڵدان بە کەسایەتی و جیهانبینی مندا گرنگیان هەیە، بەڵام لە روانگەی خۆمەوە قۆناخی دووەمم لە بەیروت گرنگی زیاتری هەیە. یەکەمیان ئەو قۆناخەیە کە ئەندامی ر.ر.ف بووم و ساڵانێك دواتر لە تورکیا، ئەو سەردەمەی گەریلایەتی منیان لە فەلەستین، بۆ لەکەدارکردنم بەکاردەهێنا و ئاماژەیان بەوە دەدا کە"تیرۆریست"بووم. ئەم قۆناخە لەو کاتەوە دەستیپێکرد کە لە تورکیا کودەتای١٢ی مارت کرا و بەوهۆیەشەوە منیش خۆم شاردەوە و دواجاریش لە حوزەیرانی ١٩٧١دا بە نهێنی دەربازی سوریا بووم. لە نیسانی ١٩٧٣دا، ئەبو خالید'ی هاوڕێم کە ئەو کاتانە لە رێکخراوی فەتح'دا کە گرنکترین رێکخراوی ر.ر.ف بوو، بەرپرسی مێزی ئێران - تورکیا بوو، پاسپۆرتێکی ساختەی تورکی پێدام کە خۆی زۆر ناشییانە دروستیکردبوو. بەو پاسپۆرتە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'م جێهێشت و بەوجۆرەش قۆناخی یەکەمی ژیانم لە بەیروت کۆتاییهات.

ئەو کاتەی لە تورکیا دەرچووم و بەشداری ریزەکانی جوڵانەوەی رزگاریخوازی فەلەستین'م کرد، بەهۆی دوو نوسینەوە کە وەختێ بەڕێوەبەری نوسینی گۆڤاری شۆڕشی چرووتلیتاری ئایدنلك بووم بڵاوم کردبوونەوە، بە تاوانی"پڕوپاگەندە بۆ کۆمۆنیزم"، بەپێی مادەی بە ناوبانگی ژمارە ١٤٢ی یاسای سزای تورك،

بە نۆ ساڵ زیندان حوکم درابووم. سەبارەت بەو کاتانەش کە سەرۆکایەتی کۆمەڵەی خوێندکارانی کۆلیژی زانستە سیاسییەکانم دەکرد، بە تۆمەتی وەك" هاندان و وروژاندنی خەڵك بۆ راپەڕین"، "پێشێلکردنی یاسای کۆبوونەوە و خۆپیشاندان" زنجیرەیەك سکاڵام لەسەر هەبوو. بەڵام لە هەموویان گرنگتر ئەگەری تۆمارکرانی سکاڵایەك لەسەر من بە تۆمەتی "دامەزراندنی رێکخراوی نهێنی" بوو، چونکە هەستم بەوە دەکرد کە لە ماوەیەکی نزیکدا "رێکخراوە نهێنییەکەی" ئێمەش وەك ئەوانی دیکە ئاشکرا دەبێت. ئەگەر بە تۆمەتی" دامەزراندنی رێکخراوی نهێنی" سکاڵام لەسەر تۆمار بکرایە، رزگار نەدەبووم. دەستمان لە هەموو شتێك شۆردبوو. بە گوێرەی تێگەیشتنە ئایدۆلۆژییەکانی ئەو کاتانەمان (٢٢ ساڵم بوو) فاشیزم بۆ تورکیا هاتبوو، ئەو فاشیزمەش کە لەلایەن" ئەمپریالیزمی ئەمریکا"وە پشتیوانی لێدەکرا، جگە لە تێکۆشانێکی چەکداری درێژخایەن کە لە ناوچە کەناری و گوندەکانەوە دەستپێبکات و وردە وردە شارو شارۆچکەکان گەمارۆ بدات، بە هیچ رێگایەکی دیکە نەدەڕووخا.

دوای کودەتای سەربازی ١٢ی مارت، لەبەر ئەوەی کە بەپێی یاسا تاوانبار بووم و لەنێو رێکخراوەکەماندا زیاتر لە هەمووان گرنگیم بە سیاسەتی دەرەوە دەدا و هەروەها لەبەر ئەوەی رێکخراوەکەشمان بۆ دەستپێکردنی شەڕی چەکداری و بەڕێوەبردنی ئەو شەڕە و راهێنان و فێرکردنی کەسانی دیکە پێویستی بە کادیر هەبوو، لەنێو ئەو سێ کەسەدا هەڵبژێردرام کە بۆ بەشداریکردن لە تێکۆشانی رزگاریخوازی فەلەستین رەوانە دەکران. لەلایەکەوە نوێنەرایەتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ی رێکخراوە نهێنییەکەمان دەکرد کە بە"پارتی شۆڕشگێڕی کرێکاری گوندی تورکیا" ناومان نابوو. لەلایەکی دیکەش مەشقی گەریلاییمان دەکرد و دواتر دەگەڕاینەوە بۆ تورکیا تا یەکەم کادێرەکانی گەریلا رابهێنین.

لەدوای جەنگی شەش رۆژە و گەورەی عەرەب - ئیسرائیل کە تا رۆژی ئەمڕۆش کاریگەرییەکانی بەردەوامە، تێکۆشانی چەکداری رزگاریخوازی فەلەستین دەستپێکرد. بنکەکانی گەریلای فەلەستین وەك دەنکەکانی تەزبیح لە کەناری رووباری ئوردن (شەریعە) لە بەشی ئوردن دامەزرابوون. لەو ساڵانەشدا کە هاوکات لەگەڵ دەرکەوتنی رووداوە خوێندکارییەکان بە تایبەت رووداوەکانی ١٩٦٨ی ئەورووپا، لە تورکیا ش ئەو رووداوانە دەرکەوتن، بۆ گەنجانی زانکۆی تورکیا بنکەکانی گەریلای فەلەستین ناوەندی راکێشەر بوو. ئەو قۆناخە، قۆناخێك بوو کە بڵاوکراوەی مارکسیستی و چەپ لە تورکیا بەشێوەیەکی فراوان بڵاو دەکرانەوە و لە ئاستی دنیاشدا ئەفسانەی چە گیڤارا و جەنگی سەیری ڤێتنام لە دژی ئەمریکا دەرکەوتبوون.

"گەشتەکانی فەلەستین" یان بە واتایەکی دیکە رۆیشتنی گەنجان بۆ ئوردن و ئەنجامدانی مەشق و راهێنان لە بنکەکانی گەریلای فەلەستین و بۆ ماوەیەك مانەوە لەوێ، لەنێو ئەو گەنجانەدا کە خۆیان بە شۆڕشگێڕ و چەپ دەزانی بڵاو ببووەوە. لە ساڵی ١٩٦٩دا گرووپێك گەنجی خەڵکی عەنتاب (زیاتر خەڵکی

نزیپ بوون) پێشەنگایەتی ئەمەیان کرد و لە زانکۆکانی ئەنقەرە و ئیستانبوڵ پەیوەندییان بە گەنجانەوە دەکرد و یەکەم گرووپەکانیان بۆ ئەو کارە ڕێکخست.

لە ساڵی ١٩٧٠، بە تایبەت لە مانگەکانی هاویندا ڕۆیشتنەکان بۆ ناو گەریلای فەلەستین زیادیان کردبوو. بۆ زۆرێك لە خوێندکارانی چەپ - شۆڕشگێڕ، ئەو کارە وەك"پشووی هاوینە"ی لێهاتبوو. لە ساڵی ١٩٧٠، دەنیز گەزمیش کە "سیمبولی نەمری" لاوانی ئەو قۆناخەبوو، لەنێو ئەو گەنجانەدا بوو کە بۆ ناو گەریلای فەلەستین ڕۆیشتبوون. دەنیز، دوای گەڕانەوە هاتە ئیستانبوڵ و ئەو کاتانەی کە من سەرۆکایەتی کۆمەڵەی خوێندکاری کۆلێژی زانستە سیاسییەکان'م دەکرد، لە کانتینی زانکۆ لە شوێنی حەوانەوەی خوێندکاران (داخلی) دەمایەوە. تا ئەندازەیەك هەموو کاتی ڕۆژی خۆی بە جلوبەرگی گەریلای فەلەستین'ی لەوێ تێپەڕ دەکرد. ئەمە جۆرێکی خۆشاردنەوە بوو کە پۆلیس'یش ئاگای لێ بوو. لەو کاتانەدا بەهۆی (یاسای) پارێزراوبوونی حەرەمی زانکۆکان، هێزە ئەمنییەکان نەیاندەتوانی بچنە ناو زانکۆ. بۆیە سەرەڕای ئەوەی کە پۆلیس دەیزانی دەنیز گەزمیش لەوێیە، نەیدەتوانی بیگرێ. خۆشاردنەوەکەی دەنیز گەزمیش لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان شتێکی زۆر شاراوە نەبوو. ڕۆژێك بە بۆنەی مەرگی هۆشی مین سەرکۆماری ڤێتنام لە هۆڵی زانکۆ مەراسمێکی یادکردنەوەم ڕێکخست و دوای وتاری کردنەوەی مەراسیمەکە کە خۆم پێشکەشم کرد، دەنیز گەزمیش بە جلوبەرگی گەریلای فەلەستین (بە بێئەوەی گوێ بداتە ئەو هۆشدارییەی کە سەبارەت بە گۆڕینی جلەکانی پێم دابوو) وتاری پێشکەش کرد و ڕۆژی دواتریش وێنەکانی لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکرانەوە و بەوجۆرە بۆ ڕای گشتیش ئاشکرابوو کە ئەو لە کوێیە و چۆن خۆی دەشارێتەوە.

جوڵانەوەی فەلەستین ڕۆڵێکی تایبەتی هەبوو لەوەی کە لە سەرەتاکانی ١٩٧٠کاندا ویستی شەڕی چەکداری لەنێو گەنجانی ئاگرین و پڕجۆش و خرۆشی تورکیا زیاتر بجووڵێنێت. ئەو ڕەوتە سیاسی- ئایدۆلۆژییەی کە منیشی تێدابوو، سەرەڕای ئەوەی کە هەموو کات دەیویست خۆی لە بیرۆکەی شەڕی چەکداری بە دوور بگرێت، لەبەر دینامیزمە ناوخۆییەکانی جوڵانەوەی چەپ و لاوان و رکابەرییەکانی و هەروەها بەهۆی کەوتنە ژێر کاریگەری کێشمەکێشی حزبی و دابەشبوونەکان و لە ناوچوونی دەرفەتی کاری یاسایی لەدوای کودەتای ١٢ی مارت، ئیدی پەنای بۆ بیرۆکەی شەڕی چەکداری برد. تێکۆشانی رزگارخوازی فەلەستین کە لە پەنای ئێمەدا دەکرا، ئیدی وەك دەرگایەکی لێهاتبوو کە ئێمەش لێمان دەدا. چەندین ڕێکخراوی فەلەستین'ی هەبوون. لەگەڵ کامیان پەیوەندیمان دەگرت؟ پێویستبوو لەگەڵ کامیان پەیوەندی بەرقەرار بکەین؟

ئەرکی لێکۆڵینەوە لەمە بە من سپێردرا. قاڵبە فیکرییەکانی ئەو کاتەم، منیان بەرەو لای بەرەی دیموکراتی ئاراستە کرد. ئەو کاتە ڕێکخراوی فەتح بە سەرۆکایەتی یاسر عەرەفات کە گەورەترین ڕێکخراوی

فەلەستین‌ی بوو، لای من ڕێکخراوێك بوو کە دەماری"ئیسلامگەرایی" و "ڕاست"ی تێدا بوو. بەرەی گەلی جۆرج حەبەش، سەرەڕای ئەوەی کە ئیدیعای مارکسیست بوونی دەکرد، لە جوڵانەوەی نەتەوەگەرایی عەرەب‌ەوە دەرکەوتبوو. جگە لەوەش هەندێك چالاکی وەك ڕفاندنی فڕۆکە و شتی لەو بابەتەیان دەکرد کە گرووپەکەی ئێمە بە"تیرۆری تاکەکەسی" ناوی دەبرد و ڕەتیدەکردەوە. سایقە وەك ڕێکخراوێکی چەپ دیاربوو، بەڵام وابەستەی ڕژێمی سوریا بوو. بەرەی دیموکراتی باڵی چەپەکانی بەرەی گەل بوون کە لەو ڕێکخراوە جیابببوونەوە و لەسەر مەدالیا - ڕۆژێتەکەی خۆیان ئەستێرەی سووریان دانابوو. لە سەر ئارم و لۆگۆکانی خۆیشان جێی چەکوشیان کردبووەوە. لە ڕواڵەتدا ئەوان زۆر لە ئایدۆلۆژیا و بۆچوونەکانی ئێمەوە نزیك بوون.

وەك یەکێك لە سەرکردەکانی جوڵانەوەی لاوانی تورکیا، چەندین گەنجی فەلەستین‌یم دەناسی کە لە زانکۆکانی ئەنقەرە دەیانخوێند. دۆزینەوەی نوێنەرانی بەرەی دیموکراتی لەنێو ئەوانەدا کارێکی سەخت نەبوو. لەگەڵ بەرەی دیموکراتی‌دا پەیوەندیم گرت و لەبەر ئەوەی کە بە نیازبووین بچینە سوریا، یەکێك لەو خوێندکارە فەلەستین‌ییانەی سەر بە بەرەی دیموکراتی‌م ڕەوانەی حەلەب و شام کرد، تا ناوەندەکانی بەرەی دیموکراتی لەوێ ئاگادار بکاتەوە. لە کۆتایی حوزەیرانی ١٩٧١دا، لەنێو گرووپی چەند قاچاخچییەکدا لە دەشتی حەڕانەوە دەربازی سوریا بووم. بە واتایەك، بۆ ئەوەی خاکی تورکیا جێبهێڵم و بەشداری لە جوڵانەوەی فەلەستین بکەم، چەند مانگ ئامادەکاری ئایدۆلۆژی و لۆجستیم کردبوو.

"قۆناخی یەکەمی بەیروت" دەستپێکردبوو. دەکرێت ئەو قۆناخەی کە خۆم بە "قۆناخی یەکەمی بەیروت" ناوم ناوە بکرێتە دوو بەشەوە. بەشی یەکەم لە تەمووزی ١٩٧١ تا حوزەیرانی ١٩٧٢دەگرێتەوە. لەو کاتانەدا مەشقی گەریلاییم لە مەعلوولە‌ی سوریا بینی و ماوەیەك لە گردەکانی گۆلان مامەوە و دواتر لە شاری سوور لە باشووری لوبنان و پاشتریش لە شوێنێکی خوار ئەوێ لە نزیك سنوری ئیسرائیل لە کەمپی ڕاشدیە‌ی پەنابەرانی فەلەستین مامەوە. دواتر چوومە شاری ترابلوس لە باکووری لوبنان و ماوەیەکیش لە خاڵێکی باکووریتری لوبنان لە ئایتا ئەلفوقهار لە نزیك نەهرەلبارید و دۆڵی بیقاع، لە بنکەیەکی گەریلای فەلەستین مامەوە. بەشی دووەمیش بەر لە حوزەیرانی ١٩٧٢ تا نیسانی ١٩٧٣ کە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست‌م بەجێهێشت، دەگرێتەوە و لەم بەشدا نزیکەی ساڵێکم لە بەیروت و بورج ئەلباراجنی گەورەترین کەمپی پەنابەرانی فەلەستین لە بەیروت تێپەڕ کردووە.

بورج ئەلباراجنی زۆر لە فڕۆکەخانەی بەیروت نزیك بوو. ئەم شوێنە بەسەر ڕێگەی فڕۆکەخانەوە کۆنترۆڵی هەبوو. لە بەشی خۆرئاوی ڕێگەی فڕۆکەخانەوە هەندێك گردی لم هەبوون کە وەك قەلخانی بەرگری بوون. لەوبەری ڕێگاکەیشەوە ڕێگایەکی ناو دارستان هەبوو کە دەگەیشتە دوو کەمپی دیکەی

پەنابەرانی فەلەستینی بە ناوەکانی شاتیلا و سەبرا کە دواتر بەهۆی قەتڵوعامێکەوە ناویان دەبران. ئەمەش لە روانگەی جەنگەکانی ناو شارەوە پێگەیەکی ستراتیژی هەبوو.

لە ساڵی ١٩٩٠دا بەهۆی ئەو گۆڕانکارییانەی کە کران، گردە لمینەکانی بەردەم بورج ئەلباراجنی لابران و دارستانەکەی بەرامبەریشی لەناوبرا. تەنانەت درەختێکیش نەما. ئەو مەیدانە فراوانە بەهۆی بینا و فراوانکردنی فڕۆکەخانەوە پڕ کرایەوە.

لە نیوەی یەکەمی ١٩٧٠کاندا کە من لەوێ بووم، بورج ئەلباراجنی لە رووی خۆرهەڵات'ەوە بە گەڕەکە شیعەنشینەکان واتا زاحیە دەگەیشت کە دواتر وەك ناوەندی حزبوڵای لێدەهات. زاحیە لە عەرەبی'دا بە واتای کەنارنشین و کەناری شار بەکاردێت. بورج ئەلباراجنی لە رووی باکووریشەوە دراوسێی گەڕەکی مەسیحی- مارۆنی نشینی حارەتەلحورەیك بوو کە لە سەردەمی جەنگی ناوخۆیی ١٩٧٥دا یەکێك لەو شوێنانە بوو کە خوێناویترین پێکدادانەکان لەوێ روویاندەدا.

لە کۆڵانە تەسك و پڕ پێچەکانی کەمپەکەدا کە ئاوەڕۆیان تێدابوو، دەبوو لەگەڵ جۆرە مشکێك کە بە کاردۆن ناسرابوون رێت بکردایە. لەو کەمپەدا کە خانووەکان لە تەنیشت یەکدا دروستکرابوون و باشترینەکانیان دوو نهۆمی بوون و لە کەلاوەکانی کەناری شارەکانی تورکیا دەچوون، بیست هەزار کەس دەژیان. ناوەندی رێکخراوە فەلەستینییەکان و تەنانەت جبەخانەکانیشیان لەنێو کەمپەکەدا بوون. چەند شوێنێکی هاتوچۆی کەمپەکە لەلایەن هێزی پۆلیسی فەلەستین سەر بە سوپای رزگاری فەلەستین کە وەك باڵی سەربازی ر.ر.ف بوو، کۆنترۆڵ دەکرا. لە پێشەوەی ئەو شوێنانەوە کە بە زۆر دوو کەس پێکەوە دەیانتوانی پێیاندا تێپەڕ بن، شوینی پۆلیسەکانی فەلەستین دروستکرابوون. گرووپی ئێمەی تورکەکان'یش کە بەهۆی گەڕانەوە بۆ تورکیا ژمارەمان رووی لە کەمیی کردبوو، بە پێناسی بەرەی دیموکراتییەوە لە جبەخانەیەکدا لە باشووری بورج ئەلباراجنی جێگیرکرابوو. لەسەر زەوی جێگەی خەوتنمان دادەخست و بیست و چوار کاتژمێر پاسەوانیمان دەکرد. ئەگەر لە هێرشێکی ئاسمانی ئیسرائیل'دا جبەخانەکەی ئێمە بەرکەوتایە، لەوانەیە سەدان کەس گیانی لە دەست بدایە.

بەشداریکردنمان لەبەرەی دیموکراتی دەسەگوڵی من بوو. بۆیە هەوڵدان بۆ پەیوەندی گرتن لەگەڵ بزوتنەوەی فەتح و وازهێنان لەبەرەی دیموکراتی بوو بە ئەرکی من. ئەو یەکەم مانگەی کە ئێمە مەشقی گەریلاییمان لەبەرەی دیموکراتی بینی، لەگەڵ یەکێك لە ناڵەبارترین قۆناخەکانی جوڵانەوەی فەلەستین هاوکات بوو. لە ئەیلوولی ١٩٧٠، عەممانی پایتەختی ئوردن لە گەرمەی شەڕی ئوردن – فەلەستین'دا بوو. دوایین کاتەکانی"ئەیلوولی رەش" بوو. ئەمجارەیان پێکدادانەکان لە عەجلوون و جەراش'ەوە لە باکووری عەممان دەرکەوت و هێزەکانی فەلەستین لە دوو لاوە لە ژێر گوشاری ئوردن و ئیسرائیل'دا بوون، دەربازی

سوریا دەبوون و لەوێشەوە بەرەو لوبنان دەڕۆیشتن.

جوڵانەوەی فەلەستین گورزێکی گەورەی سەربازی بەرکەوتبوو. لە گردەکانی جۆلانەوە ڕێگەیان بە گەریلاکانی فەلەستین نەدەدا کە هیچ جووڵەیەك لە دژی ئیسرائیل بکەن. سەرەڕای بەردەوام بوونی حاڵەتی جەنگ لە نێوان ئیسرائیل و سوریا، ئاگربەستێکی توند پێڕەو دەکرا و سوریا ڕێگەی نەدەدا ڕێکخراوەکانی فەلەسیتن ئەو ئاگربەستە تێکبدەن. ئەو یەکەم مانگەی کە لە بنکەی گەریلایی بەرەی دیموکراتی لە گردەکانی جۆلان تێپەڕمان کرد، زیاتر موناقشەکردن لەسەر"دروستبوونی ڕێبازی بەرەی دیموکراتی" و ناکۆکییەکانی لەگەڵ بزوتنەوەی راستگەرای فەتح بوو. کاریگەری شکستەکەی ئوردن لەسەر بەرەی دیموکراتی بەوجۆرە بوو. دوای ئەوەی چووینە لوبنان و پاش مانەوەیەکی کەم لەوێ و دواتر رۆیشتنمان بۆ کەمپی راشدیە لە باشووری لوبنان، چاومان کرایەوە و هەموو لایەکمان بینی...

بنکە گەریلاییەکەمان لە خوار کەمپێکی پەنابەرانەوە لە کەناری دەریای سپی بوو. لەوێ راستەوخۆ دەرفەتی ئەوەمان پەیداکرد کە گەلی فەلەستین و شێوازی ژیانەکەیان بناسین. فەرماندەکانی سەرووی خۆمان، زوو زوو پسوولەی کۆکردنەوەی یارمەتییان پێدەداین و رەوانەی کەمپی پەنابەرانیان دەکردین. زۆربەی ئەو ماڵانەی کە لە دەرگایانمان دەدا، یان یارمەتییان بە بزوتنەوەی فەتح دەدا یان بنەماڵەی شەهیدی فەتح دەردەچوون. مێشکمان تێکەڵ و پێکەڵ ببوو. چۆن دەبوو بزووتنەوەی "راست و دواکەوتووی" فەتح ئەوەندە لایەنگری لەنێو جەماوەر هەبێ و ریشەی داکوتابێ؟ چۆن دەبوو لە ریزی پێشەوە بێت؟ بەرەی دیموکراتییەکەی ئێمەش لە هەڵوسینی ئاڵا بەسەر دیوار و بڵاوکردنەوەی بەیاننامەدا دەستێکی باڵای هەبوو، بەڵام لە شەڕی چەکداریدا توانایەکی ئەوتۆی نەبوو.

بەهۆی ناکۆکییەکانی بزوتنەوەی فەتح و بەرەی دیموکراتی کە جاربەجار دەتەقینەوە، جاربەجار لەسەر بانی ماڵەکانی کەمپی راشدیە بە کلاشینکۆفەوە سەنگەرمان لە یەکتری گرت. بەڵام ڕێگە لە پێکدادان گیرا. کوشتنی فەلەستینی'یەك یان کوژران بە دەستی فەلەستینی'یەك و نیشانەگرتنی تفەنگی فەلەستینی'یەك بە رووی فەلەستینی'یەکی دیکەدا، شتێك نەبوو کە ئێمە قبوڵی بکەین. چالاکییەکیش دژی ئیسرائیل نەدەکرا کە لە بیست کیلۆمەتر لەو لامانەوە لە رووی دەریاوە دیاربوو. فەلەستینییەکان'یش بە تازەیی لە لوبنان و باشووری لوبنان نیشتەجێ دەبوون. بۆیە ئەو کاتانە لە رووی سەربازییەوە قۆناخێکی راوەستان بوو. ڕێکخراوێك بە ناوی"ئەیلوولی رەش" لە جیاتی ئەوەی دەنگی جوڵانەوەی فەلەستین بڵاو بکاتەوە و لە سنورەکانی لوبنان خۆی بگەیەنێتە ئیسرائیل و لەوێ چالاکی بکات، دەچوو لە قاهیرە هەوڵی تیرۆرکردنی سەرۆك وەزیری ئوردن'ی دەدا. زۆری پێنەچوو کە زانیمان" ئەیلوولی رەش" ناوێکە کە گرووپێك کادیری سەر بە فەتح بە کاری دەهێنن. یەکێك لەو چالاکییانەی گرووپی"ئەیلوولی رەش" کە دەنگی دایەوە، ئەو

هێرشە بوو کە لە ساڵی١٩٧٢ لە ئۆڵۆمپیادی مونیخ دژی وەرزشکارانی ئیسرائیل ئەنجامدرا.

لە باشووری لوبنان هەموو شتێك راوەستا بوو. لەنێو رێکخراوە فەلەستینییەکان'دا، دەمەقاڵە و مشتومڕی دوای شکستەکەی ئوردن بەردەوام بوو. لەو ماوەیەی کە لە راشدیە بووین، تەنها یەك جار رووبەڕووی ئیسرائیل بووینەوە. بەلەمێکی زۆدیاك کە پڕ بوو لە فیدایییەکانی فەلەستین، چووبووە کەنارە ئاوییەکانی ئیسرائیل و بەلەمە هێرشبەرەکانی ئەو وڵاتەش دوای کەوتبوون. لەو کاتانەدا هەواڵمان بۆ هات کە فیدایییەکان لە رێی کەمپی راشدیە'وە خۆیان دەگەیەننە وشکانی. ئێمەش بۆ پاراستنی ئەوان و هاتنیان بۆ وشکانی، سەنگەرمان گرت. راوەدوونانەکەی ناو دەریا ماوەیەکی خایاند. دوای ماوەیەك، کۆپتەرەکانی ئیسرائیل تەقاندنی فیشەکی رۆشنکەرەوەیان راگرت. دواتر دەرکەوت کە فیدایییەکان بەرلەوەی بگەنە وشکانی دەسگیرکراون. بەوجۆرەش ئەگەری پێکدادانی ئێمە و ئیسرائیل لە ئارادا نەما.

لەکاتێکدا کە فیشەکێکمان دژی ئیسرائیل نەتەقاندبوو، نەماندەویست لەنێو ئەگەری پێکدادانی ناوخۆیی فەلەستینییەکان'دا بمێنینەوە. بۆ ئەمەش، بە سیفەتی" نوێنەری سیاسی" جاربەجار سەردانی بەیروت'م دەکرد و لەوێش دەرفەتێکم بۆ رەخسا. لە ناوەندی شاردا کە دواتر بەهۆی جەنگی ناوخۆییەوە بە تەواوی خاپوور دەکرا، کتێبخانەی "خانەی ئیبنی سینا"'م بینی. کاتی چوومە ژوورەوە، وێنەی مارکس، ئەنگێڵس، لنین، ستالین و مائۆ'م بە هەڵواسراوی بینی و سەرم سووڕما. لەو کاتانەدا سیمبولی" پێنج سەر" کە تۆزێك لایەنی تەنزئامێزیشی تێدابوو، هی مائۆچییەکان بوو. بە تایبەتی وێنەکەی ستالین، کە جگە لە پارتەکانی چین و ئەلبانیا و پارتەکانی لایەنگری ئەو دوو وڵاتە سیمبولی هیچ لایەنێکی دیکە نەدەبوو.

دەتوانم بڵێم، ئەو کتێبخانەیەی کە بە هەڵکەوت سەردانیم کردبوو، رێگای ناسینی کەسانێکی بۆ کردمەوە کە کاریگەرییان لەسەر ژیانم داناوە. یەکێك لەبەرێوەبەرانی پارتی کۆمۆنیستی لوبنان کە حزبێکی مارکسی- لنینی بوو، کتێبخانەکەی ئیدارە دەکرد. یەکسەر پەیوەندیمان بەرقەرارکرد. ئەوانیش بە دوای ئێمەدا گەڕابوون. لە جێگەیەکەوە بیستبوویان کە "گرووپێك لە هاوڕێکانیان" لەلای بەرەی دیموکراتی دەمێننەوە. دوای ئەو یەکترناسین و پێشوازی کردنە، گەڕامەوە بۆ راشدیە و شاهین ئاڵپای'م لەگەڵ خۆم هێنا و گەڕامەوە بۆ بەیروت. لە ماڵی میشل نۆفڵ یەکترمان بینی. میشل ئەندامی پۆلیت بیرۆی حزب بوو. بە تازەیی لە کۆنگرەی حزبی رەنجی ئەلبانی لە تیران گەڕابووەوە. نەخشی ئەو ماڵەی کە ئەنوەر خۆجە حزبەکەی لەوێ دامەزراندبوو لەسەر دیواری ماڵەکەی میشل هەڵواسرابوو. شاهین، بۆ یەکەمجار مائۆچێتی هێنابووە ناو تورکیا و بۆ ماوەیەکیش یەکێك لە ئایدۆلۆگە سەرەکییەکانی بوو، بۆیە هەستمکرد کە پێویستە لەو دیدارەدا ئامادە بێت. ئەو میشل نۆفڵ'ەی کە لە پاییزی ساڵی ١٩٧١دا لە ماڵەکەیدا لە بەیروت یەکمان بینی، دواتر بە بێئەوەی خۆیشی بزانی، لە ژیانمدا زۆر یارمەتیدەرم بوو.

هاورێ لوبنانییەکان‌مان پرسیاری ئەوەیان لێکردین کە چ ئیشمان لای "بەرەی دیموکراتی" هەیە. ئەگەر جوڵانەوەی فەلەستینی بە ١٠٠ حیساب بکەین، ٧٥-٨٠ی فەتح بوو. بۆیە بە بێ تێگەیشتن لە فەتح مومکین نەبوو لەو جوڵانەوەیە تێبگەین. بە بێ جێگرتن لەنێو فەتح‌یشدا نەدەکرا هاوکارییەکی پڕواتای جوڵانەوەی فەلەستین بکرێت. بەدەر لەوەش، فەتح باڵێکی گەورە و کاریگەری چەپی هەبوو کە کادێرە کۆنەکانی حزبی کۆمۆنیستی ئوردن کە ساڵانێکی خۆیان لە زیندان بەسەر بردبوو، تێیدا ئەندام بوون. بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە کەرتی خۆرئاوا و قودسی خۆرهەڵات، هەتا جەنگی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧ لە ژێر دەسەڵاتی ئوردن بووە، لە بنەڕەتداپارتی کۆمۆنیستی ئوردن لە فەلەستینییەکان پێکدەهات و بەشێکی گەورەی کادیرەکانی لە بزووتنەوەی فەتح‌دا جێی خۆیان گرتبوو.

میشل نۆفڵ، لە بەرزترین ئاستدا دەستی بە دانوستان کرد بۆ ئەوەی ئێمە بەشداری فەتح بین. بۆ ئەمەش دیدار لەگەڵ ئەبو جیهاد (خەلیل ئەلوەزیر) کە لەدوای یاسر عەرەفات (ئەبوعەممار) بە کەسی دووەمی فەتح حیساب دەکرا، بەس بوو. تومەزە ئەبو جیهاد لەو کاتانەدا لە شام دەژیا و هەفتەی جارێك سەردانی نوسینگەیەکی فەتح لە کەمپی شاتیلا دەکرد و دیدارەکانی لەوێ ئەنجامدەدا.

چەند مانگێك لەو کەمپەدا ئەوەندە چاوەڕوانی ئەبو جیهادم کرد تا بێزار بووم. هەر چۆنێك بوو، نەماندەتوانی یەکتر ببینین. لەگەڵ ئەو پیاوەی کە لە "قۆناخی دووەمی بەیروت"مدا زیاتر لەهەر کەسێك دەمینی و پەیوەندییەکی تایبەت لە نێوانماندا بەرقەرار ببوو، لە"قۆناخی یەکەمدا" نەمتوانیبوو بە هیچ جۆرێك پەیوەندی بگرم.

لەدوای ئەوەش، میشل نۆفڵ منی ڕەوانەی لای کەسێك کرد کە پلەکەی لە ئەبو جیهاد کەمتر بوو. ئەویش ئەبوفادی یان مونیر شەفیق بوو کە وەك ئایدۆلۆگی باڵی چەپی فەتح ڕێزێکی تایبەتی لێدەگیرا. مونیر شەفیق لە ریزبەندی دەسەڵاتی فەتح‌دا ژمارەی دووەمی بەڕێوەبەرایەتی پلاندانانی فەتح بوو، بەڵام نفوزەکەی لە پۆستەکەی زیاتر بوو. پێشتر ئۆرتۆدۆکسی مەسیحی بوو، بەڵام لەدوای شۆڕشی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩، دینی ئیسلامی هێنا و مەزهەبی سوننەی قبوڵ کرد. وردە وردە بوو بە یەکێك لە بەناوبانگترین ئایدۆلۆگەکانی باڵی ئیسلامی فەتح و دنیای عەرەب. لە ساڵانی ٢٠٠٠کانیشدا لە بزووتنەوەی حەماس نزیك بووەوە.

کاتێك کە من و ئەو لە ساڵی ١٩٧٢دا یەکمان بینی، ئەو ئەندامێکی حزبی کۆمۆنیستی ئوردن بوو کە ساڵانێك لە زیندان مابووەوە و لەنێو فەتح و جوڵانەوەی رزگاریخوازی فەلەستین‌دا بیرمەندێکی خاوەن ڕێزی مارکسی بوو. بۆ بینینی ئەو، دەبوایە سەردانی نوسینگەکەیم بکردایە کە لە جادەی حەمرا شەقامە پڕ شان و شکۆکەی بەیروت‌دا بوو. لە لوبنان بەشێوەیەکی نایاسایی، لە کەمپی بورج ئەلباراجنی پەنابەرانی

فەلەستینی دەماینەوە. پێناسی بەرەی دیموکراتی کە ئێمە هەمانبوو، لای پۆلیسی لوبنان هیچ واتایەکی نەبوو. چونکە خۆی لە خۆیدا بەینی بەرپرسانی فەلەستینی و لوبنانی لەگەڵ یەکدا خراپ بوو، جا ئەگەر تورکێك'یان بە پێناسی فەلەستینی بگرتایە، رێی تێدەچوو کە رادەستی تورکیا'ی بکەنەوە. لەبەر ئەوەش ئەگەر زۆر پێویست نەبوایە لەو شوێنەی کە دژەیاین دەرنەدەکەوتین. لەبەر پێگە و پۆستەکەم، زیاتر لە هەمووان من لە کەمپەکە دەردەکەوتم. بەڵام جلوبەرگی پێویستیشمان نەبوو تا لە گەڕەکە باڵاشارییەکانی بەیروت'دا زۆر بەرچاو نەکەوین. پێڵاوی یەکێك لە هاوڕێکانی خۆمانم کە دوای ئازاد بوون لە زیندانی سەربازی ماماك لە ئەنقەرە هەڵهاتبوو بۆ لای ئێمە، وەرگرت. شتێکی زۆر گرنگ نەبوو، بەڵام لە جادە و کۆڵانە باڵاشارییەکانی بەیروت'دا، باشترین پێڵاوێکی بەردەست بوو کە بتوانم لە پێی کەم. پانتۆڵێکی مەخمەڵیشم لەبەر کرد کە تۆزێك کۆن ببوو. ئەوسا بۆ دیدار لەگەڵ مونیر شەفیق بە رێ کەوتم.

بەپێی هەلومەرجەکانی ژیانی ئێمە، مونیر شەفیق نوسینگەیەکی زۆر باش و رێك و پێکی هەبوو. زیاتر لە شۆڕشگێڕێکی فەلەستین'یش لە ئەسڵزادەیەکی ئینگلیز دەچوو. سەرەڕای ئەوەی کە باشترین و جوانترین جلوبەرگەکانی خۆمم لەبەر کردبوو، بەڵام لەبەرامبەر ئەودا هەستم بە کەمیی کرد. دەمزانی لە رواڵەتدا کەسێك نیم کە پێویستە گرنگیم پێ بدرێت. مونیر شەفیق منی ناردە لای ئەبو خالد'ی برای کە لە بزووتنەوەی فەتح'دا بەرپرسی مێزی ئێران - تورکیا بوو. بەوجۆرەش یەکێك لە خۆشەویسترین دۆستەکانم ناسی کە زیاترین کاریگەرییان لەسەر ژیانم داناوە.

لەبەر ئەوەی ناوی ئەبو خالد لە فەتح'دا زۆر بوو، ئەبو خالد'ەکەی کاری من بە ئەبوخالد جۆرج بانگ دەکرا. بە پێچەوانەی روخسار و رەفتاری ئاریستۆکراتانەی کاکی، زۆر بە گەرمی پێشوازی لە من کرد. لەگەڵ ئەوەی کە بەرپرسی مێزی ئێران - تورکیا بوو، پەیوەندی لەگەڵ شۆڕشگێڕانی ئێران هەبوو، بەڵام تا ئەو کاتە هیچ تورکێکی نەبینیبوو. من یەکەم کەس بووم.

کاتێك گوتم دەمانەوێ لە"بەرەی دیموکراتی" یەوە دەربازی فەتح ببین، وتی لەوانەبە. بەڵام داوای کرد کە سەرەتا بمانناسێ. لەو کاتانەدا پەیوەندیمان لەگەڵ رێکخراوەکەی خۆماندا پچڕابوو. ئەو هاوڕێیانەشمان کە سەرەتا پێکەوە بۆ فەلەستین هاتبووین، بۆ دۆزینەوەی هاوڕێ دابڕاوەکان لە حزبەکەی خۆمان، یان دۆزینەوەی ئەوانەی کە نارەزاییان لە حزب هەبوو، هەروەها بۆ یەکگرتن لەگەڵ ئیبراهیم کایپاقایا تا پێکەوە بەرەنگاری حزب ببنەوە، بۆ تورکیا گەڕابوونەوە. لەو ماوەیەشدا، دەنیز گەزمیش، یوسف ئاسڵان و حوسەین ئینان لە سێدارە درابوون و ماهیر چایان و هاوڕێکانیشیان کوژرابوون. باقی رێکخراوە چەپەکانی دیکەش، تەنانەت بەو حزبەی ئێمەشەوە کە دەمانویست دژایەتی بکەین، هەموویان لە ناوبرابوون و ئەندامەکانیان رەوانەی زیندان کرابوون.

دەمتوانی بە ناوی ڕێکخراوەوە باسی چی بۆ ئەبو خالد بکەم؟ لەوەش زیاتر پەیوەندیمان لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەشماندا نەمابوو کە بۆ تورکیا گەڕابوونەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە زیادەڕۆییەوە باسی خۆمان و ئایدیالەکانی خۆمانم کرد و باسی:"جەنگی دژی ئەمپریالیزمی ئەمریکا لە تورکیا"م کرد و داوای یارمەتی چەکم کرد.

ئەبو خالد جۆرج بە بزەیەکی شیرینەوە کە هەرگیز لە ڕوومەتی کەم نەدەبوو، وتی:" سەیرکە! بۆ دابینکردنی چەك، دەتوانین دابینی بکەین، بەڵام ئەگەر بە بێئەوەی بەکاریان بهێنن بیاندەن بە گرت، ئەو کاتە هەم بۆ خۆتان باش نابێت هەم چەکەکانیش لە کیس دەچن. ئەگەر بکرێت بەر لە هەموو شتێك، ئێوە ڕاپۆرتێکی ورد لەبارەی مێژووی جوڵانەوەی چەپی تورکیا، گرووپەکانی ئەو جوڵانەوەیە و هەڵوێستە ئایدۆلۆژییەکانیان و پێکهاتەی ڕێکخستنەکانیان بۆ من ئامادە بکەن. با پێشتر لەسەر ئەمانە قسە بکەین..."

گەڕامەوە بۆ کەمپی بورج ئەلباراجنی و قەڵەم و کاغەزم گرت بە دەستەوە و چەندین لاپەڕەم نووسی. هەستم بەوە دەکرد کە هەرچی دەنووسم، زیاتر لێپرسینەوە لە خۆم و لەوەش گرنگتر لێپرسینەوە لە جوڵانەوەی چەپی تورکیا دەکەم. لە ڕاستیدا ئەو لێپرسینەوەیە زۆر زووتر، هەر لە هەفتە سەرەتاییەکانی هاتنمان بۆ ناو جوڵانەوەی فەلەستین دەستیپێکردبوو. بەشێوەیەکی هاوکات لەگەڵ هیوابڕاو بوونمان لەبەرەی دیموکراتی، لە ڕێکخراوەکەی خۆیشمان لە تورکیا نائومێد ببووین.

چەند شتێك لەسەر یەك کەڵەکە ببوون: پەیوەندی ڕاستەخۆمان لەگەڵ خەڵکی فەلەستین سەرەتا لە ڕاشدیە لە باشوور و دواتر لە کەمپەکانی پەنابەران لە بەیروت سەبارەت بە جوڵانەوەی خەڵك و پەیوەندی خەڵك لە ڕێکخراو و تێکۆشانی چەکداری چاوکراوەی کردبووین. بەهۆی بینینی ئەزموونی فەلەستین، بۆمان دەرکەوت کە شێوازی ڕێکخستنی خۆمان لە تورکیا و پەیوەندییەکانمان لەگەڵ خەڵك زۆر پەرتەوازە و بڵاوە.

ئێمە لەنێو تێکۆشانێکی ڕزگاریدا دەژیان کە لە ئاستی جیهان جێی بایەخ و ڕێزگرتن بوو، لەبەر ئەوەش درکمان بە ئاستی ناشیبوونی ئەو فەرمانانە دەکرد کە لە تورکیا پێمان دەگەیشتن و هەروەها دەمانزانی کە ئەوانەی دەگیران یان بە دەستەوەدەدران، نەزانانە جوڵاونەتەوە.

چەند جارێك بە فەرمانی حزب، لە شام سەردانی باڵیۆزخانەی چینم کردبوو. حزبەکەمان ئاگاداری کردبوومەوە لەوەی کە پەیوەندی لەگەڵ حزبی کۆمۆنیستی چین بەرقەرار کردووە و فەرمانی دابوو کە من لەبارەی هەندێك هەنگاوی کرداری لەگەڵ باڵیۆزخانەی چین لە شام دیدار بکەم. بەڵام ئەو دیپلۆماتە چینییانەی لە شام بوون ئاگایان لەو شتانە نەبوو کە من باسم دەکردن. ئاشکرا بوو کە هەم ئێمە لە دنیای خەیاڵدا دەژیاین، هەم دەویسترا کە لە دنیایەکی پڕ لە درۆ و دەلەسەدا بمانژێنن. متمانەمان بە ناوەندی حزب لە تورکیا گرفتی تێکەوتبوو، تا کار گەیشتە ئەوەی کە هیچ متمانەمان پێی نەما و لەگەڵ هەندێك لە

هاوڕێکانمدا بڕیارماندا لە فراکسیۆنە چەپەکەی خۆمان جیاببینەوە و لە ریزەکانی جوڵانەوەی فەلەستین'دا جێی خۆمان بگرین.

هەر لەو کاتانەدا لە چین کە پارتەکەی ئێمە پشتی پێدەبەست، هەندێك رووداو روویاندا کە ئێمەیان تووشی سەرسووڕمان کرد. لین بیائۆ پیاوی دووەم لەدوای مائۆ هەوڵی کودەتای دابوو. دوابەدوای ئەوەش لەکاتی هەڵهاتن بۆ یەکێتی سۆڤییەت کە دوژمنی سەرەکی چین بوو، لە رێی مەغولستان فڕۆکەکەی خرابووە خواروو و کوژرابوو. کاتێ ئەم زانیارییانەمان بیست حەپەساین. ئەو شۆڕشە کەلتوورییەی کە بە مانگان بەرگریمان لێدەکرد، خەریکبوو لەبەرچاو دەکەوت. لەوەش زیاتر، وەك دەسکەوتێکی دیپلۆماسیی نوێی کسینجەر لە ئەمریکا، نیکسۆن سەرۆکی ئەو وڵاتە و هێنری کسینجەر وەزیری دەرەوە وەك میوانی مائۆ سەردانی بەیژینگ'یان کردبوو و نزیکبوونەوەی ئەمریکا و چین دەستیپێکردبوو. هەموو ئەو بنەما ئایدۆلۆژییانە لە ناو دەچوون کە ئێمەی لە رێکخراوە چەپەکانی دیکەی تورکیا جیا دەکردەوە.

یەك لەدوای یەك لە ناوچوونی رێکخراوە چەپەکانی تورکیا و گیرانی سەدان هاوڕێمان، یەکێکی دیکە لەو شتانە بوو. لەگەڵ کێدا و لە دژی کێ تێکۆشانمان دەکرد؟

لەکاتێکدا کە ئەم شتانە مێشکی منیان دەخوارد، پرسیارەکانی ئەبو خالد مێشکی منیان تێکەڵ و پێکەڵتر کرد. دەمزانی کە دەستپێکردنی شەری چەکداری بەو حاڵەی خۆمانەوە خەیاڵە، بەڵام تەنانەت ئیعترافی ئەوەم بۆ خۆیشم نەدەکرد. ئەو هەلومەرجەی کە تێیدا بوین، رێگەیان نەدەدا کە بیرکردنەوە و لۆژیکێکی جیاواز لەوە دەرکەوێت.

راپۆرتەکە بە دەست و خەتی خۆم نزیکەی سی لاپەڕە دەبوو. بە ئەبو خالد'م دا. پرسیاری تازە دەکرا و لەبەر ئەوەش چەندینجاری دیکە راپۆرتەکەم نوێ کردەوە. لەو ماوەیەشدا لەگەڵ ئەبوخالد وەك برامان لێهاتبوو. گۆڕا بووم. لەلایەکی دیکەشەوە ئاسۆی تورکیا بۆ من تاریك ببوو. هەموو ئەو ئەدرێس و شوێن و کەسانەی کە لە ئەگەری گەڕانەوەم بۆ تورکیا پەیوەندیم لەگەڵ دەگرتن، دەست پۆلیس کەوتبوون. ئیتر بڕیارمدا کە وەك جەنگاوەرێکی فەلەستینی بژیم. عەرەبی'یەکەشم زۆر باش ببوو. بە بێئەوەی پێویستم بە زمانێکی دیکە هەبێت، بە ئاسانی دەمتوانی لەگەڵ مرۆڤەکاندا پەیوەندی بگرم.

ژمارەی ئەندامانی گرووپەکەی تورکیا لە کەمپی بورج ئەلباراجنی زۆر کەمی کردبوو. ئەوانەش کە مابوون کەسانێکی تازە هاتوو بوون کە بە خەیاڵی تێکۆشانی چەکداری بەر بای درۆ و دەلەسە کەوتبوون و یان لە تورکیا بە قاچاخ هاتبوون یان لە ئەڵمانیا هاتبوون بۆ ئەوەی دەربازی تورکیا بن. وابەستەیی ئەوان بە دۆزی فەلەستین زۆر لاوازبوو. بەهۆی کەمبوونەوەی ژمارەکەشمانەوە، پێگەمان لە کەمپەکەدا لە گەریلا'وە بۆ پارامیلیتار یان جۆرێك لە میلیشیا دابەزیبو. رۆژەکانی خۆمان بە خوێندنەوەی کتێب، گفتوگۆکردن یان

خۆرەخنەکردنە بێکۆتاییەکان تێپەڕ دەکرد. وەك تاکێکمان لێهاتبوو کە پەیوەندی لەگەڵ ڕێکخراو پچڕاوە، بۆیە تاقە ڕێگەی بەردەممان ئەوە بوو کە ژیانی دوورخراوەیی لە ئەورووپا هەڵبژێرین. هیچ نەبێ لەوێ جەماوەرێکی فراوانی کرێکاری تورکی هەبوون.

کاری تازەمان بوو بەوەی کە بە دوای پاسپۆرتی ساختەدا بگەڕێین، تا خۆمان بە ئەورووپا بگەیەنین. ڕێك لەو کاتانەدا، لە سەرەتاکانی ١٩٧٣دا، بەڕێوەبەرانی ئەو ڕێکخراوەی خۆمان کە پەیوەندیمان لەگەڵ پچڕاندبوو، لە ئەڵمانیا هەوڵی بەقەرارکردنەوەی پەیوەندییان لەگەڵ ئێمە دا. لە دەرەوەی من و سێ کەسی دیکە، ئەوانەی کە لەگەڵمان بوون، بەهۆی وەرگرتنی بەڵێنی دابینکردنی پاسپۆرت و بردنیان بۆ ئەورووپا لە ئێمە جیا بوونەوە. ئەو هاوڕێیانەی کە لە ئێمە جیابوونەوە، بۆ ئەوەی چاوەڕوانی ڕۆیشتن بۆ ئەڵمانیا بکەن، چوون بۆ کەمپی نەهرەلبارید لە باکووری لوبنان کە ساڵێك لەوەوبەر ئێمە لەوێ مابووینەوە.

سێ کەس مابووینەوە. لە کەمپەکەدا خانوویەکی تەنەکەیی تاك پەنجەرەییمان بە کرێ گرت. یەکێکمان ژنەکەی خۆی لە تورکیاوە هێنا و دەربازی شوێنێکی دیکە بوو. بۆیە دواجار تەنها دوو کەس و خانووە تەنەکەیینە تاك پەنجەرەییەکەمان ماینەوە...

سێ کەس لەو هاوڕێیانەمان کە بۆ ئەوەی دەربازی ئەڵمانیا بن لە ئێمە جیاببوونەوە، بە ناوەکانی بۆرا گویزەن، ئەحمەد ئویزدەمیر و یوجەل ئویزبەك لە ڕۆژێکی شوباتدا (٢٠ی شوبات) کتوپڕ بۆ سەردانی من هاتن. وتیان ڕۆژی دواتر لە بەندەری بەیروت'ەوە بەرەو ئەڵمانیا دەچن و پاسپۆرتیان دروستکردووە. بۆ ئەوە هاتبوون کە هەندێك ئەدرێس و شوێنی پەیوەندیم پێ بڵێن تا ئەگەر منیش چوومە ئەورووپا لەوێ پەیوەندیمان هەبێت.

لەگەڵ ئەحمەد و یوجەل'دا خواحافیزیمان کرد. بەڵام پێداگریم کرد کە بۆرا شەو لای ئێمە لەخانووە تەنەکەییەکەمان بمێنێتەوە. چونکە ئیتر دیار ببوو کە بۆ ماوەیەکی درێژ یەکتر نابینینەوە. بەیانی ڕۆژی دواتر دەیتوانی بچێتە ترابلۆس و لەوێشەوە دەربازی نەهرەلبارید بێت. هەموو کاتژمێر و نیوێك ڕێگا بوو. ئەگەر بمابایەتەوە، لەبەر ئەو ساوارم دروستدەکرد. وتی لە بەیروت هەندێك ئیشی هەیە، ئەوانە تەواو دەکات و دەگەڕێتەوە. لە بازاڕی ناو بەیروت، شتی پێویستم بۆ "میوانداریکردنی" بۆرا کڕی و گەڕامەوە. بەڵام بۆرا نەهاتەوە. وتم دیارە پەشیمان بوەتەوە و گەڕاوەتەوە. بەیانی زوو لە رادیۆ، هەواڵی هێرشێکمان بۆ سەر کەمپی نەهرەلبارید بیست کە تێیدا باسی کوژرانی دەیان کەس و برینداربوونی دوو تورك دەکرا کە یەکیان دەسگیرکرابوو. ئەو کەسانەی کە گیانیان لە دەسدابوو، لە سەرووی هەموویانەوە بۆرا، کەسانێك بوون کە ساڵانێك بە یەکەوە بووین و بە مانگان لە کەمپی پەنابەرە فەلەستینییەکان'دا پارووی نانمان بە یەکەوە بەش دەکرد. خەفەتێکی زۆرم خوارد.

لەگەڵ تێپەڕکردنی شۆکی یەکەمدا، چوومە لای ئەبو خالد و ئەویش ئۆتۆمبیلێکی پێداین. لەگەڵ هاوڕێکەمدا کە لە خانووەکەی بورج ئەلباراجنی پێکەوە بووین، بۆ بەشداری کردنی مەراسیمی ئەسپاردەکردنی هاوڕێکەمان بەرەو کەمپی بەداوی و لەوێشەوە بۆ کەمپی نەهرەلبارید بە ڕێ کەوتین. هاوسەرە فەرەنسەییەکەی محەمەد ئەلهەمشەهری، نوێنەری فەتح لە فەرەنسا کە ماوەیەکی کەم بەر لەو کاتە لە فەرەنسا لەلایەن ئیسرائیل'ەوە تیرۆرکرابوو، لەگەڵ ئێمەدا بوو.

لە هێرشەکەی ئیسرائیل'دا دوو کەس بە بریندارى رزگاریان ببوو. لە گەڕانەوەماندا لە نەهرەلبارید، لە نەخۆشخانەی ترابلوس سەردانی هاوڕێ بریندارەکەمان کرد. ئەو تورکەی دیکە کە واماندەزانی بریندار بووە بە پێوە بوو. لەکاتی یەکەم تەقینەوەکاندا بەهۆی گوشاری دەنگەوە پەرەدەکانی گوێی خەساری دی بوو. پێشتر ئەومان نەدەناسی. لە کەمپی نەهرەلبارید بینیبوومان. لەگەڵ خۆمان هێنامان بۆ بەیروت تا تەداوی بکرێت. لە دەسچوونی بۆرا و هاوڕێکانی دیکەمان بە شێوەیە، بۆ ئێمە کارەساتێکی گەورە بوو. زیاتر لە هەموو کەسێکی دیکە من لەنێو جوڵانەوەی فەلەستین'دا مابوومەوە و لەهەر کەمپێك جیا دەبوومەوە، دوای ماوەیەك ئیسرائیل هێرشی بۆ دەکرد. واتایەکم بەوە نەدەدا کە بۆچی تا ئێستا زیندووم و دەمگوت مردن بە بناگوێمدا تێپەڕ بووە. ماوەیەك بەم بیروبۆچوونەوە لە کۆڵانەکانی بەیروتدا بە ئاوارەیی دەسووڕامەوە.

لەو کاتانەدا ئەبو خالد دوو پاسپۆرتی تورکی بۆ من و هاوڕێکەم لە کەمپی بورج ئەلباراجنی دۆزیبووەوە و سەرقاڵی تەزویر کردنیان بوو. فەتح بەشێکی بە ناوی "ئەیلوولی رەش" هەبوو کە بە ئاسانی ئەو کارانەی دەکرد، بەڵام ئەو بەشە لە ژێر کۆنترۆڵی ئەبو ئەیاد کەسی سێیەمی فەتح'دا بوو. ئەبو خالد نیگەران بوو لەوەی کە لەوانەبە لەبەرامبەر دروستکردنی پاسپۆرت دا داوامان لێبکەن کە لە ئەورووپا بە ناوی "ئەیلوولی رەش" چالاکی بکەین. بە هەستی پارێزگاری کردن لە ئێمە، دەستی بە کارێك کردبوو کە لە ژیانیدا نەیکردبوو. خەریکی ساختەکردنی پاسپۆرت بۆ ئێمە بوو. کاتی پاسپۆرتەکان ئامادە بوایەن، هەردووکمان لە یەك شوێنەوە بەڵام لە رۆژی جیاوازەوە، لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'ەوە بەرەو ئەورووپا بە ڕێ دەکەوتین.

کاتێ ئەبوخالد پاسپۆرتەکەی تەواوکرد و دای بە دەستمەوە، من لە ئەنجامەکەی رازی نەبووم. مۆری سەر پاسپۆرتەکە وەك ئەوە وابوو کە هاوار بکات من ساختەم. لەکاتێکدا کە زۆر بە دەست و پل نەبووم، تۆزێك کۆڵۆنیام کرد بەسەر مۆرەکەدا و ویستم چاکی بکەم، بەڵام ئەوەندەیتر بڵاو بووەوە. لەوەش زیاتر لەو گیرفانەی کە پاسپۆرتەکەی تێدا بوو، بۆن دەهات. ئەبو خالد وای دانابوو کە نەرمترین پۆلیسی ئەورووپا پۆلیسی ئیتالیا'یە، بۆیە بلیتی رۆمای بۆ بڕیبووم. وادانانەکەی راست دەرچوو. لە فرۆکەخانەی رۆما، لەگەڵ هەبوونی بۆنی کۆڵۆنیای گیرفانەکەی مندا، پاسپۆرتەکەم دا بە دوو پۆلیسی ئیتالی کە پێکەوە قسەیان دەکرد. تەنانەت سەیری ناوچاوی منیشیان نەکرد و یەکسەر مۆرەکەیان لێدا.

چەند رۆژ بەر لەوەی کە لە سایەی سەری ئەبوخالد و بە ئیمکانەکانی بزوتنەوەی فەتح بەیروت بەجێبهێڵم، لە شەوی ١٠ی نیسان'دا لە خانووە تاك پەنجەرەییەکەمان لە کەمپی بورج ئەلباراجنی، بە دەنگی تەقە و بۆردومان راچڵەکاین. کاتێ چووینە دەرەوە، بینیمان کە یوسف بە خۆشحاڵییەوە بەرەو لای ئێمە دێت و بە دەنگی بەرز دەڵێت:" هاتن، هاتن."

یوسف نۆزدە ساڵی بوو. گەنجێکی باڵابەرز و قۆز، وەك نەمام بوو. کوڕی یەکێك لە دراوسێکانمان لە کەمپی پەنابەرانی فەلەستینی بوو. زۆر حەزی لە ئێمە دەکرد. هاوڕێی نزیکمان بوو. رۆژێك یەکێك لەو کەسانەی کە هێرشەکەی ئۆلۆمپیادی مونیخ'یان ئەنجامدابوو، هێنا بۆ لای ئێمە و پێی ناساندین. ئەو پیاوە گەنجەی کە هیچ قسەی نەدەکرد و ناوەکەی ئاشکرا نەکرا، لە ئەنجامی رووداوێکی ئازایانەی رفاندنی فڕۆکەدا کە "ئەیلوولی رەش" ئەنجامی دابوو، لە زیندانەکانی ئەڵمانیا رزگارکرابوو و دوای ئەوەش رەوانەی لیبیا کرابوو. یوسف دەیگوت ئیلا دەبێ ئەم پیاوە بناسن. لەو رۆژە بەدواوە سەرەڕای ئەوەی کە گومانمان لەوە هەبوو کە یوسف ئەندامی "ئەیلوولی رەش" بێت، دۆستایەتی و پەیوەندییە باشەکانی نێوانمان درێژەی کێشا.

لەو شەوەدا لەگەڵ یوسف چەکمان هەڵگرت و لەسەر یەکێك لە گردە لمینەکانی کەمپەکە سەنگەرمان گرت کە بەسەر جادەی فڕۆکەخانەی بەیروت'دا زاڵ بوو. هێرشی ئیسرائیل بەرەو کەمپەکە دەستپێکردبوو. کلاشینکۆفێکی بەرەی دیموکراتی'م بەدەستەوە بوو، بەڵام پێناسی ئەندامی بزوتنەوەی فەتح لە گیرفانمدابوو. بەو حاڵەوە خۆم خستە ژێر فەرمانی سوپای رزگاری فەلەستین. لەو شوێنانەی کە بە لم داپۆشرابوون، بۆ رووبەڕووبونەوەی هێرشی ئیسرائیل لەلای دەریاوە سەنگەرمان گرت.

گوللەیتۆپ بەسەر سەرمانەوە گیڤەی دەهات و ئەو شوێنانەی دەلەرزاندەوە کە لەوێ دادەکەوت. بەهۆی ئەو فیشەکە رۆشنکەرەوانەیکە کۆپتەرەکانی ئیسرائیل بەسەر ئێمەدا دەیانتەقاند، دەمتوانی مەیدانێکی فراوان ببینم. لەو شوێنە پڕ لمەدا، فیدائییەکانی فەلەستین وەك لم بڵاوببوونەوە و جمەیان دەهات.

بۆرا گویزەن و ئەو هاوڕێیانەم بیرهاتەوە کە ماوەیەکی کەم لەوەوبەر لەکیسم دابوو. هەروەها پەندی"گۆزەی ئاو لە رێی کانیدا دەشکێ"م بیرکەوتەوە. ساتی چارەنووس بۆ منێك کە زیاتر لە هەمووان لەنێو جوڵانەوەی فەلەستین'دا مابوومەوە، هاتبوو. یوسف ماوەیەك خۆی وندەکرد و دوایی دەهاتەوە و هەردووکمانی بەدوای خۆیدا دەبرد و سەنگەرێك زیاتر دەچووینە پێشەوە. دواجار بە دەمدا لەسەر زەوی خۆمان درێژکرد. وتم:"چی بووە؟ بۆچی هاتینە ئێرە؟" لە خۆشیدا لە شوێنی خۆی رانەدەوەستا. وتی:"ئێرە سەنگەری پێشەوەیە. قەڵغانی خۆکوژی پێدەڵێن. لێرە کەس رزگاری نابێت. ئێوە خۆتان بیربکەنەوە. لێرەدا خوێنی تورك و فەلەستینی پێکەوە تێکەڵاو دەبێت. ئەگەر ئێمە لەم تەمەندا خۆمان فیدا بکەین، جیلەکانی

داهاتوو بیر لەوە دەکەنەوە کە هۆکارێك هەیە بۆ ئەوەی لەپێناو دۆزی فەلەستین‌دا خۆیان بەخت بکەن و بەوجۆرەش تێکۆشانەکەمان بەردەوام دەبێت..."

ئەوەندە لە دڵەوە ئەم قسانەی دەکرد کە نەدەکرا دژایەتی بکەیت. خەیاڵی ئەوەم کرد کە چۆن هەواڵی مەرگم بە دایك و باوکم دەگەیەنن. لای خۆم وتم:" ئەوان بیر لەوە دەکەنەوە کە من لە پێناو دۆزێکدا ژیانی خۆم بەخت کردووە و لەبەر ئەوەش شانازیم پێوە دەکەن." رۆمانتیزمی شۆڕشگێڕی وای دەکرد کە من بەوجۆرە بیر بکەمەوە. لە ساتێکدا روخساری دایکم لەکاتی وەرگرتنی هەواڵی مەرگی من، لە مێشکمدا نەخشی بەست. نەمتوانی خۆم لەبەرامبەر گریانەکانی دایکم رابگرم و پۆل پۆل فرمێسك لە چاوەکانم دەهاتنە خوارەوە.

هێرشەکەی ئیسرائیل زۆر نزیك ببووەوە. فەرمانی"سەرنەیزە-رم"ەکەت ببەستە، درا. لەبەر ئەوەی کاتێ فیشەکەکانمان تەواو دەبوو، پێویستبوو بە رمی سەر چەکەکان شەڕی تاك بە تاك بکەین و بەوجۆرەش کاتێکی زیاتر بۆ سەنگەرەکانی دواوە دابین بکەین. تۆ وەرە دیار ئەو دەستەپاچەییە هەمیشەییەی من! هەرچیم کرد نەمتوانی رمەکە ببەستم. ناچار وازم لێ هێنا.

کتوپڕ دەنگی سروودی"وەسیەتی شەهید" لە سەنگەرەکەی ئێمە"قەڵغانی خۆکوژی" بەرز بووەوە. هەموویم لەبەر بوو. تا ئەو جێگەیەی دەنگم دەرهات دەستم بە وتنی سروودەکە کرد. هەستم بەوە کرد کە بەهۆی واتا و هێزی سروودەکەوە، قورساییەکانی دوایین ساتەکانی ژیان، لەسەر شانم سووك بوون. بەسەر ئەو بارە دەروونییە پڕ لە رەشبینەدا زاڵ بووم کە بەهۆی نەبەستنی رمەکە لە مندا دروست ببوو.

سروودەکە کۆتاییهات و لەو کاتەشدا هێرشەکەی ئیسرائیل یەکسەر راوەستا. لەگەڵ یەکەم پرشنگەکانی هەتاوی بەرەبەیاندا زانیمان کە ئامانجی سەرەکی هێرشەکەی شەوی رابردوو ناوەندەکانی سەبرا و فەکهانی ر.ر.ف بووە کە یەك دوو کیلۆمەترێك لەو لای ئێمەوە بوون. ئەوەشمان زانی کە هێرشەکە بۆ ئەوە کراوە تا یاسر عەرەفات بکوژرێت و لە هێرشەکەدا سێ کەس لە سەرەکردەکانی فەلەستین بە ناوەکانی ئەبو یوسف نەجار و کەمال عەدوان کە لە دامەزرێنەرانی فەتح بوون لەگەڵ کەمال ناسر وتەبێژی ر.ر.ف کوژراون و هۆکاری هێرشەکەی ئیسرائیل بەرەو کەمپی ئەلباراجنی ئەوە بووە کە رێ لە جوڵەی فیداییەکانی فەلەستین بگرێت و نەهێڵێت ئەوان بۆ یارمەتیدانی شوێنەکانی دیکە بچن.

لەگەڵ ئەم زانیارییەدا، هێزەکانی فەلەستین بە تووڕەیی لە نەتوانی دەوڵەتی لوبنان لە رێگرتن لەو هێرشەی ئیسرائیل، بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك دەستیان بەسەر بەیروت‌دا گرت. منیش لەنێو ئەو چەکدارانەدا بووم کە رێگای فرۆکەخانەمان گرتبوو. بۆ ماوەی چەند سەعاتێك هەستی"دەسەڵاتداری شۆڕشگێڕ"م لەو شارەدا هەبوو کە ماوەی دوو ساڵ بوو بە شێوەی نایاسایی و قاچاخ تێیدا دەمامەوە.

دیسان لە ژیاندا مابوومەوە و داوا رۆمانتیکەکەی یوسف جێبەجێ نەبوو. ساڵانێك دواتر لە بەیروت بە دوای یوسف گەڕام و زانیم کە لە ئەمریکا ئەندازیاریی دەخوێنێ و لەگەڵ کچێکی یەهوودیدا زەواجی کردووە.

رۆژێك دوای هێرشەکەی ئیسرائیل، لە پڕشکۆترین مەراسیمێکی ئەسپاردەکردنی جەنازەدا کە بەیروت لە مێژووی خۆیدا بینیبووی، لەگەڵ ئەبوخالد لەدوای تابووتەکانی سێ سەرکردە فەلەستینییەکەوە رێم کرد. سێ ساڵ دواتر، ئەبوخالدیش لەو گۆڕستانەی شەهیدان دەنێژرا. لە ساڵی ١٩٧٦دا لەکاتی جەنگی ناوخۆیی لوبنان، ئەبو خالد تابوورەکانی خوێندکارانی پێکهێنابوو و لەکاتێکدا لە بەرزترین شوێنی لوبنان لە جەبەل سەنین شەڕی دەکرد، رۆکێتێك لێیدا و جوانەمەرگی کرد. هەر لەو ساڵەشدا یەکەم کتێبم بە ناوی"فەلەستینی خۆڕاگر" بڵاو بووەوە کە بەو پێشکەشم کردبوو.

ئەو، پلانی هەموو وردەکارییەکانی رۆیشتنی منی لە بەیروت بۆ ئەورووپا دانابوو.

بلێتی فرۆکەیەکی ئایرفرانسی شام - رۆما و بلێتی فرۆکەیەکی ئاتیلای رۆما – میلانۆی بۆ بڕیبووم. هەرکاتێ بگەیشتمایەتە میلانۆ، دەچوومە جنێف و لەوێش دەڕۆیشتمە لای هاوڕێکانم بولەنت تانۆر و یوجەل سایمان کە پێشتر پەیوەندیم لەگەڵ بەرقەرار کردبوون. مۆری دەرچوون لە لوبنان لە پاسپۆرتەکەم درابوو. دەبوایە کاتێ لە لوبنان دەردەچووم، پێناسی فەتح و بەڵگەی مۆڵەتم پیشانی بەرپرسانی لوبنانی لە سنوری سوریا - لوبنان بدایە. چونکە بەوجۆرە دەتوانرا لە لوبنانەوە دەربازی سوریا بیت. چەند کیلۆمەتر لەولاتریش پاسپۆرتە ساختە تورکییەکەی خۆمم کە مۆری دەرچوونی لە لوبنان لێدرابوو، پیشانی بەرپرسانی سوری دەدا. دوای ئەوەش یەکسەر بۆ فڕۆکەخانەی شام دەچووم. پلانەکە گرتی و رێك وەك خۆی جێبەجێ کرا. لەگەڵ ئەبو خالددا باوەشمان بە یەکدا کرد و بێئەوەی کە بزانم جارێکی دیکە نایبینمەوە لە رۆژێکی نیسانی ١٩٧٣دا لە یەك جیابووینەوە. "قۆناخی یەکەمی بەیروت"م" لەکاتی جیابوونەوەم لەو کۆتاییپێهات. بەوجۆرەش سەردەمی گەریلایی فەلەستین'م کە بە شانازییەوە لە هەموو ژیانمدا باسی دەکەم، بە بێ تەقاندنی گوللەیەك بەرەو"دوژمن"کۆتاییپێهات.

**مرۆڤ وەک تاکێک، بە تەنها ژیانی خۆی ناژی. ئاگایانە بێت یان نائاگایانە ژیانی کەسانی سەردەمی خۆیشی دەژی.**

**تۆماس مان، چیای سیحراوی، ١٩٢٤**

ئەگەر کەسێك هەبێت کە بە بێئەوەی بزانم رۆڵی لە ژیانمدا هەبووبێ و چل ساڵ نەمبینیبێت، ئەو کەسە جگە لە عەبدولحەمید دەروێش، کەسی دیکە نیە. یەکێکە لە کۆنترین سەرکردەکانی جوڵانەوەی کوردەکان لە سوریا. رۆژی ١٢ی نیسانی ٢٠١٢، وەك بەڕێوەبەری دانیشتنێکی کۆبوونەوەیەکی تایبەت بە"سیاسەتی دەرەوەی عێراق" کە لە هۆتێلێکی تەپەباشی ئیستانبوڵ سازدەکرا، دەمزانی چاوم بە عەبدولحەمید دەروێش دەکەوێ و ئەویش من ناناسێتەوە. ناوەکەیم لە لیستەکەدا بینیبوو. ئەویش ناوی منی لە لیستەکەدا بینیبوو، بەڵام ئەو هیچ کات ناوە راستەقینەکەی منی نەزانیبوو.

لەگەڵ ئەوەی کە ساڵانێکی زۆر تێپەڕ ببوو، هەر کە چوومە ناو هۆڵەکە یەکسەر ناسیمەوە. لەوانەیە تەمەنی خۆی لە هەشتا دابووبێت. بە عەرەبی بانگم کرد و رۆژانی ١٩٧٠کانی سوریا و لوبنان'م بیرهێنایەوە. بە تەواوی سەرم سپی کردبوو، مومکین نەبوو بمناسێتەوە. کاتێ ناوەکەی ئەو کاتانەی خۆمم بۆ باسکرد، هاواری کرد:"زەکەریا!"

باوەشمان بە یەکدا کرد. ئەو کەسانەی کە لە دەوروبەرمان بوون، بە تایبەتی عەلی دەباغ وتەبێژی حکومەتی عێراق و وەزیری دەوڵەتی ئەو وڵاتە و هاوڕێکانی، بە سەرسووڕماوییەوە سەیری ئەو دیدارە گەرم و گوڕەیان دەکرد. عەبدولحەمید دەروێش لای کردە لای ئەوان و وتی:"چل ساڵە هاوڕێمە. کاتی خۆی زۆر یارمەتیم داون."

راستی دەگوت. ئەو کاتانەی لە لوبنان دەژیام، پەیوەندیم لەگەڵ کوردەکان زیاتر گەشەی کرد. لە سەرووی هەموشیانەوە لەگەڵ عەبدولحەمید دەروێش کە بە"هاوڕێ عەبدولحەمید" بانگم دەکرد. عەبدولحەمید دەروێش بەدەر لەوەی کە لە ساڵ ١٩٧٣دا منی بە جەلال تاڵەبانی ناساند، لە سەر داوای من هاوکاری هاوڕێکانی ئێمەی دەکرد تا بەشێوەیەکی پارێزراو لە سوریاوە دەربازی تورکیا بن. ئەو دۆستە کوردانەی کە ئەو سەرۆکایەتی دەکردن، لە قامشلۆ بەهێز بوون. تەنها ئەوەندە بەس بوو کە هاوڕێکانمان خۆیانن بگەیەننە قامشلۆ کە لە سنوری سوریا - تورکیا دایە. کوردەکان گرفتی باقی رێگەکەیان، یانی دەربازبوون بۆ ناو تورکیا چارەسەر دەکرد.

بۆ رێکخستنی رێگاکانی تێپەڕبوون لە سنور، چەند جارێك سەردانی حەلەب'م کرد کە یەکێك لە شوێنەکانی پەیوەندی من و کوردەکان بوو. بەردەوام لە شام سەردانی ماڵی جگەرخوێن'م دەکرد و شەویش لەوێ

دەمامەوە. لەو رۆژانەدا هیچ باسێك لەم رێوشوێنەی ئەمنییانە نەبوون کە ئێستا لە فڕۆکەخانەکاندا هەن. ئەو هاوڕێیانەمان کە دەگەڕانەوە بۆ تورکیا، سەرەتا بە فڕۆکە دەچوونە شام و لەوێ بۆ ماوەی چەند رۆژ لە کەمپی یارموك کە هی پەنابەرە فەلەستینییەکان بوو، دەمانەوە و ئامادەکارییەکانی خۆیان تەواو دەکرد و دواتریش بە فڕۆکە بۆ قامشلۆ دەڕۆیشتن. لە قامشلۆ، کوردەکان'ی سوریا لە سەرووی هەمووشیانەوە هاوڕێ عەبدولحەمید و بە چەند ئۆتۆمبیلێك پێشوازییان لێدەکردن و لەکاتی گونجاودا لە رێی رووباری دیجلە دەربازی جزیرە'یان دەکردن.

کوردێکیتورکیا'ش هەبوو کە بەهۆی کوردەکان'ی سوریا ناسیبووم. بەرپرسیارێکی حزبی دیموکراتی کوردستان،ی تورکیا - باڵی سەعید ئەلچی بوو. دەیگوت تا بەر لە ١٢ی مارت لە باتمان سەرۆکی شارەوانی بووە. لەبەر ئەوەی کە ناوێکی دیکەی بەکار دەهێنا هیچ کات نەمزانی ناوە راستەقینەکەی چییە و هیچ کاتیش پرسیاری ناوەکەیم نەکرد.

زوو زوو، لە کەمپی ئەلباراجنی سەردانی خانووە تاك پەنجەرەییەکەمی دەکرد و تەنها لەسەر جوڵانەوەی کوردی تورکیا قسە و باسمان دەکرد. ئەو پێی گوتم کە حزبی تورکیا'ی نوێی د.یوسف عەزیز ئوغلو کە خەڵکی سیلوان بوو و لە کابینەی حکومەتەکەی پارتی گەلی کۆماری - پارتی عەدالەت'دا وەزیری تەندروستی بوو، باڵی یاسایی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە.

هەندێك جار پێکەوە، لە جادەی حەمرای بەیروت سەردانی ماڵی برازاکەی هاوڕێ عەبدوڵحەمید'مان دەکرد کە نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردی سوریا لە لوبنان بوو. ئەم پەیوەندییانە رێگایان بۆ ئاشنایی و دۆستایەتی من لەگەڵ جەلال تاڵەبانی لە بەیروت خۆش کرد.

کاتێ لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەرکەوتم و لە جنێف گیرسامەوە، یەکەم ئیشم سەردانی لۆزان'م کرد تا چاوم بە عیسمەت شەریف وانلی کەسایەتی ئەکادیمی و نوێنەری مەلا مستەفای بارزانی لە ئەورووپا بکەوێت. یەکێك لەو دوو بەرگەی دیوانەکەی جگەرخوێنم پێشکەشی وانلی کرد کە جگەرخوێن بە دیاری پێی دابووم.

پەیوەندییەکانم لەگەڵ عیسمەت شەریف وانلی درێژە پێنەدا و بۆ ماوەیەکی درێژ، ئەو، بووە دوایین کەسێکی ناو کوردەکان کە پەیوەندیم لەگەڵی بەقەرار کردبێت. ئەمەش بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی کە لە"قۆناخی دووەمی بەیروت"مدا بەشێوەیەکی جیاواز ئەو پەیوەندییانە گەشەیان کردەوە...

قۆناخی دووەمی بەیروتم، لەسەر بنەمای قۆناخی یەکەم لە نێوان ساڵانی ١٩٧١-١٩٧٣ بوو بەڵام زۆر جیاوازتر بوو. لەوەش گرنکتر ئەوەیە کە قۆناخی دووەم زیاتر کاریگەری لەسەر ژیانم داناوە.

قۆناخی دووەمی بەیروت'م پێنج ساڵ دوای قۆناخی یەکەم، لە ساڵی ١٩٧٨دا دەستپێکرد. دەکرێ ئەویش

بکرێتە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەم لە ۱۹۷۸-۱۹۸۲کە ئیسرائیل لوبنان'ی داگیرکرد و تا دوای گەمارۆدانی بەیروت لە پاش دەرچوونی هەموو هێزەچەکدارەکانی ر.ر.ف لە بەیروت و لوبنان درێژەی کێشا. بەشی دووەمیش لە ۱۹۸۲ تا کۆتاییەکانی ۱۹۸۰کان دەگرێتەوە کە تێیدا تا ئەندازەیەك هەموو ساڵێك سێ مانگ لە بەیروت ماومەتەوە. لەو رۆژەش بەدواوە بەشێوەیەکی نارێك بەڵام بەردەوام هاتوچۆی بەیروت'م کردووە. پەیوەندیم لەگەڵ ئەو شارەدا کە شکڵی بە ژیانم داوە، قەد نەپچڕا.

نەدەپچڕا، چونکە لە رۆژانی سەختدا ئەوەندە تێکەڵاو بووین کە ئیدی مومکین نەبوو پەیوەندییەکەمان بپچڕێت. پەیوەندی تایبەتم لەگەڵ بەیروت، لە ١٤ی حوزیران هەتا ۳۰ی ئابی ۱۹۸۰، لەو رۆژە سەختانەی هاوێندا کە گەمارۆ و بۆردومانی بەردەوامی ئیسرائیل لە ئارادابوو، هەمیشەیی بووەوە.

دوای جێهێشتنی بەیروت لە ۱۹۷۳، ژیانی دوورخراوەییم لە جنێف و پاریس و ئەمستردام درێژەپێدا و لە مانگی ۱۰ی ۱۹۷٤دا سوودم لە راگەیاندنی لێبوردن لە تورکیا وەرگرت بۆ وڵاتەکەی خۆم گەڕامەوە. دوای دوو ساڵ بێکاری، لە ۱۹۷٦دا دەستم بە کاری رۆژنامەوانی کرد. بۆ یەکەمجار لە رۆژنامەی وەتەن کارم کرد و دەسبەکاربوونی من وەك رۆژنامەنوس، هاوکات بوو لەگەڵ شەڕ و پێکدادانە بێ ئامانەکانی بەیروت کە لە جەنگی ناوخۆیی لوبنان روویاندا. تا ئەندازەیەك وەك ناو لەپی خۆم شارەزای لوبنان بووم و لە تورکیا زیاتر لە هەموو کەسێك ئەکتەرە سیاسییەکانی لوبنان'م دەناسی. نوسین و هەواڵەکانم لەسەر رەوتی رووداوەکانی جەنگی ناوخۆیی لوبنان لە رۆژنامەی وەتەن، بوونە جێگەی سەرنج و وەك"شارەزایەکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست"ناوم دەرکرد.

دوای گەڕانەوەم بۆ تورکیا بەهۆی لێبوردنەوە، یەکەم گەشتی دەرەوەی وڵاتم بۆ بەغدا بوو. چەند رۆژێك لە بەغدا مامەوە و دواتر دەربازی بەیروت بووم. ئیدی رۆژنامەنوس بووم و خاوەنی پاسپۆرتی یاسایی خۆم بووم. بەوجۆرەش لە جاری دووەمدا بەشێوەیەکی یاسایی پێم دەنایە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست.

لەبەر فێستیڤاڵی نێودەوڵەتی فیلمی فەلەستین سەردانی بەغدا'م کرد. لەو ساڵەدا بەهۆی کردنەوەی هێڵی بۆری نەوتی کەرکوك - یومورتالك، پەیوەندی نێوان تورکیا و عێراق زۆر باش بوو. لەوانەیە باڵیۆزخانەی عێراق لە ئەنقەرە، ئاگای لە گرنگیدانی من بە پرسی فەلەستین بووبێت بۆیە بانگهێشتی فێستیڤاڵی فیلمی فەلەستین لە بەغدا کرام. نوسینە بەردەوامەکانم لەسەر کێشەی فەلەستین و جەنگی ناوخۆیی لوبنان لە ماوەی دوو ساڵدا، رێگەیان بۆ یەکترناسینی من و عەبدولعەزیز عەبدولعەزیز نوێنەری فەتح کردەوە کە لە زانکۆی تەکنیکی ئەنقەرە خوێندکار بوو. تورکیا بە رەسمی دانی بە فەتح'دا نەدەنا و پەیوەندی نزیکی خۆی لەگەڵ ئیسرائیل درێژەپێدەدا. عەبدولعەزیز وەك نوێنەری نیمچە رەسمی فەتح بوو و لەبەر ئەو ئەرکەی، تا

دەیتوانی ماوەی خوێندکارییەکەی خۆی درێژ دەکردەوە. کاتێ کە زانی دەچمە بەغدا و لەوێشەوە دەڕۆم بۆ لوبنان، دیدارێکی لەگەڵ یاسر عەرەفات بۆ من رێکخست. لە بەغدا وە وەك میوانی ر.ر.ف و بزوتنەوەی فەتح دەچوومە بەیروت و لەگەڵ یاسر عەرەفات و سەرانی ئەو رێکخراوانەدا چاوپێکەوتنم دەکرد تا لە میدیای تورکیا بڵاوبکرێنەوە. بێگومان چاوپێکەوتن لەگەڵ یاسر عەرەفات بە سەرکەوتنێکی رۆژنامەوانی هەژمار دەکرا، بەڵام ئەوە خزمەتی ئامانجی پڕوپاگەندەکردنی فەلەستییەکان یشی لە تورکیا دەکرد کە زۆر پێویستیان پێی بوو.

لە تورکیا بە "تیرۆریست" زانینی فەلەستینییەکان هێشتا بە تەواوی نەسڕابووەوە. تورکیا سەرەڕای ئەوەی کە پەیوەندی لەگەڵ ر.ر.ف نەدەگرت، پەیوەندییە دیپلۆماتییەکانی خۆی لەگەڵ ئیسرائیل درێژە پێدەدا و ئەمەش لە رای گشتیدا کاریگەرییەکی ئەوتۆی بە قازانجی فەلەستینییەکان لێنەدەکەوتەوە. ئەو رۆژەی گەیشتمە بەغدا، یەکەکانی سوپای ئیسرائیل دەستیان بە داگیرکردنی باشووری لوبنان کرد. ئەمەش، یەکێك لە گرنگترین ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای ئیسرائیل بوو کە لە دەرەوەی سنور لە دژی گەریلاکانی فەلەستین ئەنجامی دەدا. فێستیڤاڵی نێودەوڵەتی فیلمەکانی فەلەستین، لەگەڵ رۆژانی پێکدادانی ئیسرائیل و فەلەستینییەکان لە لوبنان هاوکات بوو. بەڕێوەبردنی بەعس، لە رێستۆرانتەکانی کەناری دیجلە کە داستانەکانی هەزار و یەك شەویان بیری مرۆڤ دەهێنایەوە، میوانداری ئێمەیان دەکرد کە کەسانی وەك جینا لۆلۆبریجیدا و ڤانێسا رێدگرەیڤ یشمان تێدابوو. جگە لەوە، میوانەکانی فێستیڤاڵەکەیان برد بۆ لای سەدام حسێن جێگری سەرۆکی عێراق. بەڕێوەبەرانی بەعس، منیشیان لەگەڵ میوانە بیانییەکاندا برد بۆ رێپێوانێکی چەند کاتژمێری لە دژی ئیسرائیل کە تێیدا وێنە و پۆستەری گەورەی سەدام حسێن هەڵکرابوو. رێپێوانی ئەو جەماوەرە قەرەباڵغەی کە جینا لۆلۆبریجیدا ی تێدا بوو، لە مەیدانی تەحریر کە وەك ناوەندی بەغدا لە قەڵەم دەدرێت کۆتاییهات و لەوێ، میشل عەفلەق دامەزرێنەری پارتی بەعس کە پێگەیەکی دیاری لەنێو جوڵانەوەی نەتەوەگەرایی عەرەبی دا هەیە و لە ناکۆکی نێوان هەردو باڵی سوریا و عێراق ی حزبی بەعس دا پشتی باڵی عێراق ی گرتبوو، وتارێکی پێشکەش کرد. لەنێو ئەو رێپێوان و جەنجاڵییەی بەغدا، من هەر مێشکم لای بەیروت بوو. دوای پێنج ساڵ، کاتێك دەگەڕامەوە بۆ شارە خۆشەویستەکەم کە هەموو دنیا قسەی لەسەر دەکرد.

کاتێ گەیشتمە بەیروت، مەحمود لابادی وتەبێژی ر.ر.ف پێشوازی لێکردم و میوانداری کردم. عەبدولعەزیز، لە ئەنقەرە وە کارێکی کردبوو کە لە ئاستێکی بەرزدا پێشوازیم لێبکرێت. لەکاتێکدا کە چاوەڕوانی رۆژ و کاتی دیدارەکەم بووم لەگەڵ یاسر عەرەفات، بە دوای دۆزینەوەی هاوڕێ کۆنەکانم کەوتم. میشل نۆفڵ م دۆزییەوە.

بە شەوان باسی پێنج ساڵی رابردوو، رووداوە تراژدییەکانی جەنگی ناوخۆییم لە زمانی ئەو و هاوڕێکانی دیکەمەوە بیست. زۆر خۆشحاڵ بووم بەوەی کە بینیم. سەرەڕای ئەوەی لەو پێنج ساڵەدا هیچ پەیوەندییەکمان لەگەڵ یەکتریدا نەبوو لە وەرچەرخانێکی ئایدۆلۆژی هاوشێوەدا دەرباز بووین و لە رەوتێکی فیکریدا یەکمان گرتۆتەوە. جگە لەوە، میشل وەك من ببوو بە رۆژنامەنوس. لە یەکێك لە کاریگەرترین رۆژنامەکانی ئەوکاتەی لوبنان بە ناوی "ئەلنەهار"دا بەرپرسی بەشی هەواڵە دەرەکییەکان بوو. منیش ئەو کاتەی لە رۆژنامەی وەتەن بۆ یەکەمجار دەستم بە کاری رۆژنامەوانی کرد، هەر ئەو پۆستەم هەبوو.

هەموو هاوڕێ لوبنانییەکان٘م لە ماوەی ئەو پێنج ساڵە و جەنگی ناوخۆییدا، لەنێو بزوتنەوەی فەتح٘دا پۆستی سەربازییان وەرگرتبوو. لەنێو کەسە کۆنەکاندا کەسێکی گەورەمان لە دەسدابوو. ئەویش ئەبو خالد، خۆشەویسترین هاوڕێم بوو.

لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا کە تێپەڕ ببوو، بە تایبەتی لەدوای جەنگی ١٩٧٣ی عەرەب - ئیسرائیل (بە جەنگی رەمەزان، یەوم کەبیر، تشرینی یەکەم و چەند ناوێکی دیکەش ناوزەد دەکرێت) رێکخراوی ر.ر.ف لە ئاستی نێودەوڵەتیدا وەك دەوڵەتی فەلەستینی دەرکەوتبوو. ئەو رێکخراوە بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش خۆی دەزگامەند کردبوو. بەدەر لەوەش بەیروت٘ی وەك پایتەختی خۆی لێکردبوو. هاوڕێ فەلەستینی و لوبنانییەکان٘ی قۆناخی یەکەمی بەیروت٘م کەسانی نزیك لە ئەبو جیهاد بوون کە لەدوای عەرەفات ناوە گەورەکەی جوڵانەوەی فەلەستین، بە کەسی دووەم لە قەڵەم دەدرا. تا ئەندازەیەك هەموویان لە جەنگی بێ ئامانی ناوخۆیدا، لە ریزی تابوورەکانی خوێندکاراندا کە ئەبو خالد لەوێ گیانی لە دەسدابوو جێگەیان گرتبوو. ئەوان لەو تابوورانەدا کە بە جەنگاوەرترین یەکە سەربازییەکانی بزوتنەوەی فەتح لە قەڵەم دەدران، پۆستیان وەرگرتبوو. بۆیە بە شێوەی سروشتی لەگەڵ یاسر عەرەفات و ئەبوجیهاد کە بە کردەوە فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی فەلەستین بوو، پەیوەندییەکی تایبەتیان هەبوو.

مونیر شەفیق(ئەبو فادی) لەگەڵ د. مەحجوب کە خەڵکی میسر بوو، سەرۆکایەتی بەڕێوەبەرایەتی پلاندانانی بزووتنەوەی فەتح٘یان دەکرد کە وەك ناوەندێکی توێژینەوەی سیاسی بوو. ئەو بەڕێوەبەرایەتییەش وەك ناوەندێکی نزیك لە ئایدۆلۆژیا و بیرکردنەوەی هاوڕێ نزیکەکانی منی لێهاتبوو.

هەر لە سەرەتای قۆناخی دووەمی بەیروت٘مدا دەمویست بە خێرایی ئەو بۆشاییە پڕ بکەمەوە کە لە ئەنجامی پێنج ساڵ دووری و دابڕانم لە بەیروت دروست ببوو. دەمویست پابەندبوونی خۆم بە پرسی فەلەستینییەکان بەهێز بکەمەوە. شەوێك لە ناکاو فەلاح یەکێك لە نزیکترین هاوڕێکانی قۆناخی یەکەمی بەیروت٘م هات بۆ ماڵی میشل. ئەو نزیکییەش بە ئەندازەیەك بوو کە کاتێ بەهۆی چالاکییە سیاسییەکانیەوە، پۆلیسی لوبنان بە دوای فەلاح دەگەڕا، ئەو بۆ ماوەی مانگێك لە ماڵەکەی مندا لە بورج

ئەلباراجنی خۆی شاردبووەوە. ئەو کاتە بە نازناوی حوسام ئەوم دەناسی. کەسێکی قەلەو، کەڵەگەت و شیرین بوو. دوای ئەو هەموو کاتە، وەختێك ئەوم بە لاوازی و لە جلوبەرگی سەربازیدا بینی، زۆر سەرم سووڕما. ببوو بە یەکێك لە فەرماندەکانی فەتح لە باشووری لوبنان و لەنێو شەڕ و پێکدادانەکاندا دەرفەتێکی دۆزیبووەوە تا بۆ ئەنجامدانی چەند دیدار و کۆبوونەوەیەك سەردانی بەیروت بکات و رۆژی دواتریش بۆ سەر ئەرکەکەی خۆی دەگەڕایەوە. پێنج ساڵ بەر لەو کاتە، من جەنگاوەرێکی فەلەستین بووم و ئەویش لە ماڵەکەی مندا خۆی دەشاردەوە و هەستم بە نیگای پڕ لە حەیرانی ئەو لەسەر خۆم دەکرد. پێنج ساڵ دواتر لەو کاتەش، من رۆژنامەنوسێکی تورك بووم و وەك فەرماندەیەکی فەتح لەنێو جەنگدا سەیری ئەوم دەکرد. هەستم بەوە کرد کە گەڕاومەتەوە بۆ هێلانەکەی خۆم و ئەندامێکی ئاسایی ئەو ژینگەیەم کە دووبارە پێی گەیشتوومەتەوە.

هەندێك دۆستی تازەم پەیداکرد کە لە قۆناخی یەکەمی بەیروت'مدا نەمدەناسین. کەسێی وەك یەزید سائقە'م ناسی کە لە بەڕێوەبەرایەتی پلاندانانی ر.ر.ف کاری دەکرد و دواتریش ناوی خۆی وەك رۆشنبیرێکی بەناوبانگ و ئەندامی دەستەی زانستی زانکۆی ئۆکسفۆرد بە دنیا ناساند. هەروەها موئەیەن'م ناسی کە لە شوێنێکی ستراتیژی وەك قەڵای ئارنۆن لە نەباتیە لە باشووری لوبنان فەرماندەیی هێزەکانی فەتح'ی دەکرد. موئەیەن کەسێکی باڵابەرزی دوومەتری بوو کە لەنێو جەنگاوەرەکانی فەلەستین'دا بە قارەمانی و ئازایەتیی کاریزمایەکی بۆ خۆی پەیدابوو. جگە لەوان، عەباس'م ناسی کە لە ناوەندی نوسینگەی خۆرئاوای فەتح'دا بەشێوەیەکی گرێدراو بە ئەبوجیهاد، رێکخستن و ئۆپەراسیۆنە نهێنییەکانی فەتحی لە کەرتی خۆرئاوا بەڕێوەدەبرد. لەو رۆژانەدا بەدەر لەوان، کەسانی دیکەشم ناسی.

لەو سەردانەمدا بۆ یەکەمجار لەگەڵ یاسر عەرەفات دیدارم کرد و پەیوەندییەکانیشم لەگەڵ ئەو، هەتا کاتی مردنی درێژەی کێشا. چەندینجار لە بەیروت، ئەنقەرە، مۆسکۆ، تونس، جەزائیر، رەبات، کازانبلاکا، کوەیت، سینەگال - داکار و دواجاریش ماوەیەك بەر لە مردنی لە خاکەکانی فەلەستین، لە غەزە و موقەتا لە رامەڵا کە لە گەمارۆی ئیسرائیل'دا بوو، یەکترمان بینی.

لە یەکەم قۆناغی بەیروت'مدا تەنها دووجار عەرەفات'م بینیبوو. جارێك لە بەیروت، کاتێ لەبەردەم نوسینگەیەکی بزوتنەوەی رزگاری فەلەستین تێپەڕ دەبووم، لە دوورەوە ئۆتۆمبیلەکەیم بینی بوو کە راوەستابوو. رۆژێکیش کە بۆ سەردانی ئەبو خالد چووبووم و لە ژوورەکەیدا دانیشتبووم، دەرگای ژوورەکەی کراوە بوو. ویستم دەرگاکەی دابخەم، کە پێی وتم ئەبوعەمار لەنێو بیناکەدایە و کاتێك ئەو لێرە بێت هەمووومان دەرگاکان بە کراوەیی دەهێڵینەوە. پشتم کردە دەرگا کراوەکە و دانیشتم. لە پڕ دەنگی قاقای پێکەنینم لەنێو هۆڵەکەوە بیست. کاتێك ئاوڕم دایەوە و سەیرم کرد، کەسێکی کەچەڵ سەرنجی راکێشام

بەڵام زۆر لە عەرەفات نەدەچوو. مەراقم کرد و ویستم بزانم ئەو پیاوە کێیە کە بە ئاسوودەیی لەگەڵ کادیرە فەلەستینیەکان گاڵتە دەکات.

ئەبو خالد وتی:"جین جێنتە" و سەری سوورِما لەوەی کە یەکەمجارە ئەو ناوەم بیستوە. ئەوەش خەتای جەهالەتی من بوو. ئەو ناوەم لەنێو کەسایەتیە چەپە مارکسیستەکان و دواتر لینینستەکان و مائۆیستەکان‌دا نەبیستبوو کە لە رۆژانی زانکۆ شتم لەبارەیانەوە خوێندبووەوە. تۆزێك دواتر ئەبو خالد بە رێزێکەوە لە کورسیەکەی خۆی هەستا و رۆیشت. کە ئاورِم دایەوە و سەیرم کرد، سەرە کەچەڵەکەی یاسر عەرەفات‌م بینی بە بێئەوەی جامانەکەی پێوەبێت. ویستم لە جێگاکەی خۆم هەستم و برِۆم بۆ لای، بەڵام ئەو دوای هەواڵپرسین لە ئەبو خالد رۆیشت. منیش نەمتوانی بیناسم و تەوقەی لەگەڵدا بکەم.

لە ساڵی ١٩٧٨ لە سەرەتای قۆناغی دووەمی بەیروت‌مدا، ئەو وەکو یەکێك لە بەناوبانگترین کەسایەتییە سیاسیەکانی جیهانی لێهاتبوو. لەبەر ئەوەی هەتا ئەو رۆژە لەگەڵ کەسایەتیەکی بەناوبانگی جیهانی وەکو ئەودا دیدارم نەکردبوو، کاتێك بۆ دیداری دەرِۆیشتم لەبەر هەیەجان و جۆش و خرۆشی دەروونی، خەریك بوو دڵم راوەستێت. کاتێك منیان بردە ژوورەوە بە تەلەفۆن قسەی دەکرد. پێکەنی و بە ئاماژەی دەست داوای لێکردم کە دانیشم. زۆری پێنەچووو لەو بۆچوونە رزگارم بوو کە لەگەڵ کەسێکدام کەس ناتوانێت پێی بگات. عەرەفات زۆر بە زوویی منی بە ئاسایی بوونی دیدارەکەی من و خۆی راهێنا. لەدوای ئەوەش هەرجارێک و لەهەر دیدارێکدا (ژمارەی دیدارەکانم لە بیر نیە) کە عەرەفات‌م دەبینی، دیسان ئەو هەستی جۆش و خرۆشەم هەبوو، بەڵام هەموو جارێك ئەو بەشێوەیەکی گەرمتر لە جاران پێشوازی لە من دەکرد.

سێ دیداری دوایی من لەگەڵ عەرەفات لە خاکەکانی فەلەستین، لەدوای گەرِانەوەی ناوبراو لە قۆناغی ئاشتی ئۆسلۆ ئەنجامدران. دووانیان لە غەزە بوون و دوایین دیداریشمان لە رامەڵا ئەنجامدا.

لەکاتی سەردانەکەی سەرۆك وەزیر تانسۆ چیلەر بۆ ئیسرائیل بە کاروانی پاسەکانەوە لە دەرگای سنوری ئەرێتز‌ەوە کە لە کۆنترۆڵی ئیسرائیلیەکان‌دا بوو دەربازی غەزە ببووین. بەهۆی ئەو جەنجاڵیەی کە لە دەروازەی سنوری ئەرێتز‌دا هەبوو، بەشێکی زۆری ئەندامانی وەفدی هاورِێی تانسۆ چیلەر نەیانتوانیبوو دەربازی ناو غەزە بن.

ئەو کاتەی کە لەبەردەم شوێنی سەرۆکایەتی رێکخراوی رزگاری فەلەستین لە غەزە چاوەرِوانیمان دەکرد، زۆر خۆشحاڵ بووم بەوەی هاورِێ جەنگاوەرەکانی پێشووی خۆمم بینی کە لە رۆژانی بەیروت و تونس‌دا یەکترمان دەناسی. باوەشمان بە یەکتریدا کرد و پێکەوە قسەمان کرد.

گەرمترین باوەش بەیەکداکردنمان، لەگەڵ جیهاد ئەلگول بوو کە لەگەڵ کچی بنەماڵەیەکی دۆستدا زەماوەندی کردبوو کە لە رۆژانی کەمپی بورج ئەلباراجنی لە سەرەتای ١٩٧٠کاندا زوو زوو سەردانیانم

سوتا و رووخا و دوای ئەوەش وەکو کەلاوەی لێهات. هەرچەندە تانکەکانی ئیسرائیل لە مایسی ٢٠٠٢دا لە موقەتا و دەورووبەری کشابوونەوە، بەڵام هاتوچۆی رامەڵایان خستبووە ژێر کۆنترۆڵ و لە مەیدانێکی فراوانتردا درێژەیان بە گەمارۆکانی خۆیان دەدا.

رۆژی شەممە ٢٠٠٢/١١/٩، عەرەفات لە نهۆمی دوومی موقەتا لەگەڵ راوێژکارەکانی، یاسر عەبد رەبۆ و نەبیل ئەبو رودەینە پێشوازی لە ئێمە کرد. ئەوەندە بە گەرمی و بە تاسەوە باوەشمان بە یەکدا کرد کە وامزانی چەند خولەکێك بەوجۆرە ماوینەتەوە. کاتێك ئەو کەسایەتییە مێژووییەم لە باوەش دەکرد و سینگم بە سینگیەوە دەنووساند، هەستێکی زۆر سەیری وەك ئەوەی کە ئازاری پێدەگەیەنم لە دەروونمدا پەیدا بوو.

عەرەفات لە نهۆمی دووەمی موقەتا ئێمەی بۆ هۆڵی کۆبوونەوەکانی برد کە زۆرجار لە تەلەفزیۆندا بینیبووم و لەوێدا پێشوازی لە میوانەکانی دەکرد. لە چواردەوری مێزێکی درێژی لاکێشەییدا بە ریز دانیشتین. هەندێك رۆژانی رابردوومان بە بیرهێنایەوە و دواتر قسە و باس هاتە سەر هەڵبژاردنەکانی تورکیا کە تەنها شەش رۆژ بەر لەو کاتە کۆتاییپێهاتبوو. عەرەفات وتی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان و هاتنە سەرکاری داد و گەشەپێدان لە تورکیا وەك شۆڕشێك وایە. پرسیارم لێکرد کە رەجەب تایب ئەردۆغان سەرۆکی حیزبەکە دەناسێت یان نا. ئەوی نەدەناسی بەڵام عەبدوڵا گویل سەرۆك وەزیری دەناسی و وتی:" ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبێتم دووجار لەگەڵ وەفدی کۆنسەی ئەورووپا سەردانی ئێرەی کردووە. عەبدوڵا گویل'م بیردێتەوە."

ئەقڵی لای ئەگەری دەرکەوتنی شەڕ لە عێراق بوو. ئەگەری دەرکەوتنی جەنگ لە عێراق زۆر ئەوی نیگەران دەکرد و چەندینجار باسی نیگەرانییەکانی خۆی لەوبارەیەوە کرد. بەرلەوەی لە یەك جیاببینەوە، بەشێوەیەکی دۆستانە چەندین وێنەی جۆراوجۆرمان گرت. وامدەزانی لەو شوێنەی کە لە نهۆمی دووەمدا پێشوازی لە ئێمە کردبوو لێمان جیادەبێتەوە، بەڵام وای نەکرد. دەستی گرتم و پێکەوە هێواش هێواش لە قادرمەکانەوە چووینە خوارەوە. هەتا بەردەم کامێرای تەلەفزیۆنەکان کە لەبەر دەرگای موقەتا چاوەڕوانی ئەویان دەکرد، پێکەوە رۆیشتین. دواتر جارێکی دیکە باوەشمان بە یەکتردا کرد و ماڵئاواییمان لە یەك کرد. کاتێك بەرەو لای جێبەکەی سەر قونسوڵگەری دەڕۆیشتم، جارێکی دیکە لام کردە دواوە و بۆ جاری کۆتایی سەیری عەرەفات'م کرد. ئەو دەستی بە قسەکردن بۆ تەلەفزیۆن و کەناڵە نێودەوڵەتیەکان کردبوو.

نزیکەی دوو ساڵ دوای ئەو کاتەش بەگومانی ئەوەی کە لەلایەن ئیسرائیل'ەوە دەرمانخوارد کرابێت، لە موقەتا'وە برا بۆ پاریس و بەرەبەیانی ٢٠٠٤/١١/١١ کۆچی دوایی کرد. رۆژی ٢٠٠٤/١١/١٢، کاتێك عەرەفات لە حەوشەی موقەتا دەنێژرا، منیش لەنێو ئەو جەماوەرە زۆرو زەبەندەدا بووم کە بۆ ئەسپاردە کردنی هاتبوون.

جارێکی دیکە لە یەکەم مانگی ٢٠٠٧دا بۆ بینینی مەحمود عەباس کە شوێنی ئەوی گرتبووەوە سەردانی

موقەتا'م کرد، هەر ئەوکاتە هەستمکرد کە ناتوانێت شوێنی عەرەفات پڕبکاتەوە. لە قۆناغی دوای مەرگی عەرەفات'یش پەیوەندیەکانی من لەگەڵ جوڵانەوەی فەلەستین سستبوونەوە و لەنێو بیرەوەریە فەرامۆش نەکراوەکانی مێژووی کەسیی خۆمدا جێگەیان گرت.

بە ئەندازەی پەیوەندییە نزیکەکەم لەگەڵ یاسر عەرەفات، پەیوەندی نزیکم لەگەل ئەبو جیهاد یان خەلیل ئەلوەزیر، مۆری خۆی لە قۆناغی دووەمی بەیروت'م داوە.

هەر لەگەڵ دەستپێکردنی قۆناغی دووەمی بەیروت'مدا لە ساڵی ١٩٨٧، لەگەڵ ئەبو جیهاد یەکترمان ناسی. هەرجارێك سەردانی بەیروت'م دەکرد، ئەومم ئاگادار دەکردەوە و زۆرجار لە ماڵەکەیدا دەبوومە میوان و هەتا نیوە شەوان بە یەکەوە قسە و باسمان دەکرد.

ئەبو جیهاد دەستپێشخەری بۆ دامەزراندنی زۆر ناوەندی بیرکردنەوە و توێژینەوە کردبوو. داوایدەکرد من لەوانەدا بەشداری بکەم و لەو گۆڤارانەدا کە ئەو لە پشتیانەوە بوو هاوکارییان بکەم. وەك ئەندامێکی ئاسایی پێکهاتە و دامەزراوەکەی ژێر دەسەڵاتی خۆی لە بەیروت سەیری منی دەکرد.

من تاکە ڕۆژنامەنوسێکی تورك بووم کە لەکاتی گەمارۆی ئیسرائیل بۆ سەر بەیروت لەساڵی ١٩٨٢، لەشاری بەیروت بووم کە بەشێوەیەکی بەردەوام لە ڕێگەی دەریا و وشکانی و ئاسمانەوە بۆردومان دەکرا. (جگە لە من فۆتۆجۆرنالیستێك بەناوی جۆشقون ئاراڵ هەبوو. جۆشقون بۆ ڕاگەیاندنی فەرەنسا کاری دەکرد. لە سایەی چاونەترسیەکەی خۆیەوە چەندین وێنەی ئەو لەسەر بەرگی گرنگترین گۆڤارەکانی جیهان دانران و لەو قۆناغەشدا وەکو وێنەگر ناوبانگێکی جیهانی پەیدا کرد.)

لە مایسی ١٩٨٢دا لە ڕێگەی بەیروت'ەوە چوومە سودان و دواتریش دەربازی میسر بووم. بەر لەوەی لە قاهیرە بگەڕێمەوە بۆ ئیستانبول، سەردانی بەیروت'م کردەوە و لەوێ ئەبو جیهاد پێی گوتم کە بەمزووانە ئیسرائیل هێرشێکی بەرفراون دەکات و ئەم هێرشەش لەگەڵ هێرشەکانی پێشوودا زۆر جیاواز دەبێت و تەنها باشووری لوبنان داگیر ناکات، بەڵکو هەتا دامور لە ٢٠ کیلۆمەتری بەیروت درێژ دەبێتەوە.

لە قسەکانیدا ئەوەشی باسکرد کە ئامانجی ئیسرائیل ئەوەیە هەبوونی سەربازیی ر.ر.ف لە لوبنان بەتەواوەتی نەهێڵێت و ڕێگە نەدات ئەو ڕێکخراوە لە ڕووی سەربازییەوە لە لوبنان بمێنێتەوە.

پرسیارم لێکرد و وتم: "چاوەڕوانی دەکەن کەی ئەو هێرشە ڕوودەدات؟" ئەویش لە وەڵامدا وتی:" لەوانەیە دوو هەفتەی دیکە."

دوو هەفتە دواتر دیسان من لە بەیروت دەبووم. وەفدێکی لوبنانی کە بەناوبانگترین پیاوانی ئایینی شیعیی باشووری لوبنانی تێدابوو، بانگهێشتی تاران کرابوون. هاوڕێکانم وتبوویان ئەگەر تۆش بێیت دەتوانی لە وەفدەکەدا بەشدار بیت. سێیەمین ساڵی شۆڕشی ئیسلامی ئێران بوو. ئێران بەشێوەیەکی بەهێز

ساز دەکرا. هەموو کەسێك دەیویست بە پەلەپەل بگەڕێتەوە بۆ لوبنان. دەیانویست هەرچۆنێك بێت و هەرچییان کردبێت، کارێك بکەن کە زووتر بگەڕێنەوە بۆ لوبنان. منیش لەبەر ئەوەی پێشتر دەمزانی لەوانەیە رووداوێکی لەوجۆرە رووبدات و کتوپڕ لە رۆژەڤی جیهاندا جێی خۆی بگرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەیروت'م بەجێهێشتبوو، هەستم بە تاوانباری دەکرد و خەفەتم دەخوارد.

لە پیشەی رۆژنامەوانیدا پێویستە توانای درك کردن و پێشبینی کردن زۆر پێشکەوتوو بێت و بەر لە رووداوەکان، ئاماژەکانی کۆبکرێنەوە. لەگەڵ ئەوەیدا کە رۆژی پێشتر لە بەیروت ئەو بۆردوومانەم بە چاوی خۆم بینیبوو، چۆن دەبوو بەیروت بەجێبهێڵم و سەردانی تاران بکەم؟!

لە تاران پەیوەندیم لەگەڵ ئیستانبوڵ بەرقەرار کرد. هێزەکانی ئیسرائیل باشوری لوبنان'یان گرتبوو و نزیك دەروازەکانی بەیروت ببونەوە. هاوڕێکانم لە رۆژنامەی جمهورییەت بە هەستی پاراستنی منەوە داوایان لێدەکردم بگەڕێمەوە بۆ ئیستانبوڵ، منیش چاوم جگە لە گەڕانەوە بۆ بەیروت هیچ شتێکی دیکەی نەدەبینی.

وەفدی لوبنان پاسدارەکانی ئێران'یان رازی کرد کە لە ماوەی چەند رۆژدا هەر بەو جێت'ە کە ئێمەی هێنابوو بۆ تاران، بمانگەڕێننەوە بۆ شام. کاتێك لەنێو وەفدەکەی لوبنان'دا لە تاران گەڕاینەوە بۆ شام، سێ کەس لە هاوڕێیان (من و میشێل نۆفڵ و وەلید نۆئەیهود) لە فڕۆکەخانەی شام پارەیەکی زۆرماندا بە تەکسیەك کە بەپەلە بەرەو بەیروت بمانبات. کاتێك لە شام دەرباز بووین، هەرسێکمان چاومان بە تابلۆیەك کەوت کە بەشی باکووری رێگای حەلەب و تورکیا'ی نیشان دەدا و بەشی خۆرئاوا'یشی رێگای لوبنان و بەیروت'ی لەسەر نوسرابوو. هەردوو هاوڕێکەم پێداگریان کرد کە من بگەڕێمەوە بۆ تورکیا. وتیان:" تۆ بگەڕێوە. ئێمە ناچارین بگەڕێینەوە بۆ بەیروت چونکە بنەماڵەکانمان لەوێن. جگە لەوەش لەوانەیە ناچاربین بەیروت بەجێبهێڵین. با لە دەرەوە شوێنێکمان هەبێت بۆ ئەوەی رووی تێبکەین. با لێرە جیاببینەوە و تۆ بگەڕێوە بۆ وڵاتەکەی خۆت." منیش وتم نا. بە بێئەوەی هیچ دوودڵییەکم هەبێت وتم:" نا. با بڕۆین من دێم بۆ بەیروت، هەرچی دەبێت با ببێت."

هێشتا نیو کاتژمێر تێپەڕ نەببوو کە بەرەو سنوری لوبنان دەڕۆیشتین. دەروازەی سنوری ماسنا ببووە ئامانجی بۆردوومانی فڕۆکەکانی ئیسرائیل و وەك لاشەیەکی رەشی لێهاتبوو. دیارە نە فەرمانبەرانی پاسپۆرت نە فەرمانبەرانی گومرگ، کەس لەوێ نەمابوو. لە دیوی سوریا'ی سنورەکەشدا، ئەو ئەندامانەی دەزگا ئەمنی و هەواڵگرییەکان نەمابوون کە پێشتر هەموو کاتێك، ١٠٠ مەتر لەولای دەروازە سنورییەکەوە بەربەستیان دادەنا و ئەو کەسانەیان کۆنترۆڵ دەکرد کە هاتوچۆیان دەکرد. دەروازە سنورییە چۆڵەکان و ئەو تانکانەی سوریا کە بە سوتێنراوی لە کەناری رێگاکاندا بەجێ مابوون، بیرۆکەیەکی لەبارەی ئەو جەنگەوە دەدا

بەدەستەوە کە ماوەی چەند ڕۆژێك بوو دەستی پێکردبوو.

بە پانی دۆڵی بیقاع'مان تێپەڕ کرد و لە چیای لوبنان سەرکەوتین. دەمانویست بەرەو بەیروت شۆڕ ببینەوە کە لە بیحەمدوون لەلایەن ئاسایشی لوبنان'ەوە راوەستێنراین. هەواڵیان پێداین کە یەکەکانی سوپای ئیسرائیل تۆزێك بەر لە ئێستا تا نزیکەی ئالەی هاتوون. ئاگاداریان کردینەوە کە بۆ ئەوەی بتوانین لە ڕێگایەکی کورت و قەدبڕەوە بچینە ناو بەیروت، دەتوانین لە ڕێگای شوێنی نیشتەجێ بوونی مەسیحیەکان'ەوە بڕۆینە حازمیە و لەوێوە دەربازی ناو شار بین. وەلید دووروزی بوو، بۆیە دژی ئەوە بوو کە لە ڕێگەی حازمیە دەربازی بەیروت بین. ئەو ناهەقی نەبوو کە دەترسا لەوەی ئەگەر میلیشیا مەسیحیەکان لەسەر ڕێگا داوای پێناسی لێبکەن و بزانن دوورزییە، لەوانەیە بیکوژن. بنەماکانی شەڕی خوێناوی مارۆنی - دووروزی کە لە سەدەی نۆزدەیەمەوە لە چیای لوبنان دەستیپێکردبوو، لەو هەلومەرجەشدا هەر وەك خۆی مابوونەوە.

لە لۆفەکانی ڕێگا چیاییەکەوە ڕۆیشتین و ڕێگاکەمان زۆر درێژ کردەوە و بەرەو بەیروت ڕۆیشتین. مەترسی ئەوەشمان لەبەرچاو گرت کە زۆر لە نزیك یەکەکانی ئیسرائیل'ەوە دەرباز دەبین. وەکو ئەوە وابوو لەگەڵ چرکە ساتەکاندا کێبڕکێ دەکەین. لەکاتێکدا کە ئیسرائیل دەیویست خۆی بگەیەنێتە دەروازەکانی بەیروت، ئێمەش هەوڵمان دەدا دەربازی ناو شاری بەیروت بین. تاریکی داهات و گەیشتبووینە گەڕەکی شیا کە یەکێکە لە گەڕەکە شیعەنشینەکان. کاتێك گەیشتینە مەیدانی دوار خۆشحاڵ بووین لەوەی کە هاتووینەتە ناو بەیروت، بەڵام لەو کاتەدا دەنگی بۆمب و تەقەی دۆشکا مەیدانەکەی لەرزاندەوە. شوفێرەکەمان کۆنترۆڵی سوکانی ئۆتۆمبیلەکەی لەدەستدا و زۆر بە زەحمەت خۆی گرتەوە. کاتێك گەیشتەنە ماڵەکەی میشێل لە گەڕەکی پیشەسازی، لە رادیۆ هەواڵمان بیست کە سوپای ئیسرائیل ڕێگاکانی هاتوچۆی بۆ شاری بەیروت داخستووە. لە ژێر گەمارۆدا بووین و ڕێگای دەرچووغان نەبوو. ژیانێکمان دەستپێدەکرد کە لە ماوەی سێ مانگدا لە ڕێگای ئاسمانی و ڕێگای دەریایی و ڕێگای وشکانییەوە بۆردوومان دەکراین و لە شارێکدا دەژیاین کە زبڵ و خاشاکەکەی کۆ نەدەکرانەوە و زۆربەی کاتی خۆمان بە بێ کارەبا و بە تینوویی لە ژێر گەرمایەکی بێ ئامانی هاوین و شێی خنکێنەری ئەو شارەدا تێپەڕ دەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆشحاڵییەکی زۆر سەیرمان هەبوو. هەرچەندە ڕێگەی درەچووغان نەبوو، بەڵام لە بەیروت بووین. ساڵانێك دواتر هەمان هەستم لە بۆسنا'ش هەبوو.

ساڵی ١٩٩٥ لەکاتی شەڕدا، پێنج جار چوومە پایتەختی بۆسنا و هەرسك. جاری یەکەم وەفدەکەمان کە هاوسەرەکەی منیشی تێدا بوو، لەلایەن چەتەکانی کرواتیا بە بارمتە گیرا. دوای چەندین کاتژمێر کە پڕ بوو لە دەستبازی لەگەڵ مەرگ، پێویستبوو لە ژێر مەترسی تەقەی سەنگەری سربەکان'ەوە دەربازی بۆسنا بین. دوای تێپەڕکردنی ئەو مەترسیەش، بۆ ئەوەی بتوانین دەربازی بۆسنا بین، پێویستبوو لە تونێلێکی ٨٩٠

١٩٠٠کاندا لە دایك ببوون، ناچاربوون ئەو چارەنووسە بژین کە مێژوو بە بێ پرس بەوان بۆ کەسانی بەر لەوان داینابوو. کەس نەیدەتوانی خۆی لەمە بدزێتەوە.

باشە من بۆچی لێرە بووم؟ بۆچی سالآنێکە لێرە لەگەڵ ئەم بارگرژییەدا کە رۆحی مرۆڤ دەخنکێنێت لە جێژوان دام؟ لەوانەیە لەبەر شتێك بێت کە زۆر کەس نایزانێت و هەستی پێناکات یاخود شتێکە کە هەستی پێناکرێت و تەنها لەوێ مرۆڤ لێی تێدەگات.

لێرەدا کەوانەی ژیان و مەرگ ئەوەندە بچوك و بەرتەسکن کە هەر کاتێك پشت بە یەکێکیان دەبەستیت، ئەوەی دیکەشیان لێت نزیك دەبێتەوە. ئەو کاتەش کێشمەکێشەکانی ژیانی رۆژانە، کە مرۆڤەکان یەکتری لەسەر دەخۆن و ئەو ئازارانەی کە بە دەروونی مرۆڤەکان گەیەنراون، دەبەخشرێن.

لەکاتێکدا کە گوللەیەکی بێرەحم دەتەقێنرێت یان گوللە تۆپێکی بێ پەروا دەهاوێژرێت، مرۆڤ سەیری دواوەی خۆی دەکات و بە چاوێکی بەخشندەیی سەیری ژیانی خۆی و ئەو کەسانە دەکات کە هاتوونەتە نێو ژیانی. لەهەر ساتێکدا مەرگ بەشێوەیەکی شیرین و سەرنجڕاکێش ئەوەندە نزیکی مرۆڤەکانە کە هەرکەسێك کاتێك دەگەڕێتە دواوە و سەیری ژیانی خۆی دەکات، مومکین نییە کە نەڵێت: ئەی مرۆڤەکان ... سەرەڕای هەموو شتێك حەزم لە ئێوە کرد و حەزتان لێدەکەم چونکە مرۆڤەکان ژیانن.

نازانم لە مێژوودا شارێکی وا هەبووە یان نا. ئەم شارە ماسادا یەکی هاوچەرخە بەڵام پێدەچێت ماسادا لێرە زۆر ئاسانتر بووبێت. چونکە هەرچی بێت ئەو ئیرادەیەکی خۆکوشتنی بە کۆمەڵ نیشان دەدات. بەیروت کاتێك کە خۆی دەکوژێت دەژی و کاتێکیش کە دەژی خۆی دەکوژێت. تا ئێستا بینراوە کۆمەڵگایەك وردە وردە و بە هێواشی خۆی بکوژێت؟ بەیروت تەنیاترین شاری جیهانە. زۆر تەنیایە.

هەموو شارەکانی جیهان وەك سەیری شێتی گەڕەک بکەن، بە چاوێکی سووك و بە شێوەیەك کە قێزی لێبکەنەوە سەیری بەیروت دەکەن. بەیروت وەك شێتی گەڕەک، هەموو نەهامەتی و چەرمەسەری و خراپییەکانی گەڕەکی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە و سینگی بۆ هەموو بەڵا و لەعنەتەکانی سەرزەوی کردۆتەوە و سەلامەتی و تەندروستیەکەی خۆی بۆ ئەوانی دیکە بەجێهێشتوە تا شارەکانی دیکە ژیانی ئاسایی و ئاسوودەی خۆیان بکەن.

جیهان ئێرەی فەرامۆش کردووە و شارێکی چەتە بەناوی بەیروت چۆڵکراوە و بە تەنیا هێڵراوەتەوە. مرۆڤەکانی ئێرە ئەگەر بە یەکیشەوە بن دیسان تەنیان. شار تەنیایە و مرۆڤەکانیش تەنیان و ئەمانەش هەمووی تێکەڵاو بە یەکتری بوون. لە هیچ شارێکی دیکەی جیهاندا مرۆڤەکان و شار ئەوەندە پێکەوە ناژین. ئەم شارە لەبەر ئەوەی لە هیچ شوێنێکی دیکە ناچێت، وەکو ئەوە وایە کە لە جیهان دابڕا بێت. تەنیایی لە هیچ شوێنێکی دیکە بە ئەندازەی ئێرە هەستی پێناکرێت. ئەم شارە ئەوەندە هەستناکە کە

لەهەر شوێنێکی دیکەی جیهان، تەنانەت گەڵایەکیش بجوڵێت کاریگەری لەسەر ئێرە دادەنێت. مانەوە لێرە واتای هەبوونی دەرفەتێکە بۆ ئەوەی کە بتوانیت هەموو ڕووداوەکانی سەرزەوی بەشێوەیەکی فراوان سەیر بکەیت. ژیان لەم شارەدا ڕەنج و عەزابە. بەڵام دابڕان لەم شارە وەك ئەوە وایە کە لەبەرزاییەکەوە بکەویتە خوارەوە. بەیروت عەشقە."

کاتێك کە نوسینەکەم بە ڕستەی "بەیروت عەشقە" کۆتایی پێهێنا، ئەوکاتە سەردێڕەکەشیم دۆزییەوە. ڕۆژی دواتر ڕێگایەکم دۆزییەوە و بە تێلێکس ئەو نوسینەم بۆ ڕۆژنامەی جمهورییەت نارد. چەند ڕۆژێك دواتر لە بەیروت دەربازی عەممان بووم و لەوێ چاوم بە ئەبو جیهاد کەوت. دوای ئەوەش بۆ بینینی یاسر عەرەفات لە تونس، دەربازی قاهیرە بووم. لە ژوورە ئاسوودەکەی خۆمدا لە هۆتێلی شێفاردس لە قاهیرە کە لە ساڵانی جەنگدا وەك بارەگا و ناوەندی ئینگلیزەکان بەکاردەهات و لەسەر ڕووباری نیل بینا کرابوو پشووم دەدا، زەنگی تەلەفۆنەکەی حەسەن جەمال خەوی زڕاندم. بۆ ئەوە تەلەفۆنی کردبوو کە بۆچوونەکانی ئیلهان سەلجوق سەرنوسەری ڕۆژنامەی جمهورییەت و بەهێزترین کەسی ناو ڕۆژنامەکە لەبارەی وتارەکەی من "بەیروت عەشقە" بە من بڵێت و ویستبووی پیرۆزباییم لێبکات. حەسەن گوتی ئیلهان سەلجوق خۆی کە شارەزایەکی نوسینی وتارە پێی وتوم لە ژیانی خۆمدا ئەمە یەکەم جارە ئیرەیی بە نوسێنێك دەبەم کە ئەویش ئەو بابەتی"بەیروت عەشقە"یە. دوای داخستنی تەلەفۆنەکە سەرم نایە سەر سەرینەکە و لە مێشکی خۆمدا بیرم لە بەیروت کردەوە.

دووبارە ئەو خۆشحاڵییەم بیرکەوتەوە کە لە حوزەیرانی ١٩٨٢دا هەمبوو. چەند خولەك بەر لەوەی کە ئیسرائیل چواردەورمان بگرێت دەربازی ناو بەیروت بووین. ژیان لەنێو گەمارۆدا لە بەیروت واتای تێپەڕکردنی ڕۆژانێکی سەخت لەگەڵ یاسر عەرەفات و ئەبو جیهاد بوو. هەروەها واتای ئەوەی دەدا لەگەڵ هەردوو سەرکردە فەلەستینیەکەدا ڕۆژانێکی سەخت و تێکەڵ بەیەك بە ڕێ بکەیت. پێکەوە بوون لەو هەلومەرجەدا واتای هاوچارەنوسییەکی دەگمەنی دەدا کە هیچ کات فەرامۆش نەدەکرا. لەلایەکیتریشەوە، خۆشحاڵییەکەم لەوەی کە دەربازی بەیروتێك بووم کە لەلایەن ئیسرائیل'ەوە گەمارۆ دراوە، بێگومان پەیوەندی بە نەزانینی ئەم شتانەشەوە هەبوو.

لە شەوانی بەیروت'دا کە نیوەی چۆڵکرابوو، هەروەها بێ ئاو و بێ کارەبا و پەرێشان و چۆڵ ببوو، لەگەڵ میشێل هەرکاتێك بمانویستایە دەچووین بۆ بینینی ئەبو جیهاد و لەسەر بارودۆخەکە قسەمان دەکرد. دەرگای ماڵەکەی ئەو هەموو کات بە ڕووی ئێمەدا کراوە بوو. تەنانەت ئەو کاتانەش کە لەکاتی گەمارۆی ئیسرائیل بەرپرسیاری یەکەمی بەرگریکردن لە بەیروت بوو، هەر بەوجۆرە بوو. ئەبوجیهاد نزیکترین هاوڕێی عەرەفات بوو. پێکەوە فەتح'یان دامەزراندبوو. تەنانەت باس لەوەش دەکرێت کە ئەبوجیهاد زیاتر

لە من گەورەتر بوو بەڵام بە جیلێك لە قەڵەم دەدراین. کوڕی بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و بەناوبانگی شیعە'ی عێراق بوو. باوکی لە شۆڕشە خوێناوییەکەی ساڵی ١٩٥٨دا کە بەڕێوەبردنی پادشایی لە عێراق رووخا، پۆستی وەزاری وەرگرتبوو. خوێندنی ناوەندی لە کۆلێژی بەغدا تەواوکردبوو کە مەکتەبێکی تەبشیری ئەمریکایی بوو. منداڵی دەستە بژێرکانی ئەو کاتەی عێراق لەوێ دەیانخوێند کە بە زمانی ئینگلیزی وانەی تێدا دەوترایەوە. کەسانی وەکو ئەحمەد چەلەبی و ئەیاد عەلاوی لە کۆلێژی بەغدا هاوڕێی ئەبو ئەمەل بوون.

سەرەڕای ئەوەی کە باوکی لە حکومەتەکانی عێراق'دا پۆستی وەزیری هەبووە، بەڵام لەدوای لەدەست چوونی فەلەستین، ئەبو ئەمەل'یش وەکو زۆربەی گەنجەکانی دیکە کەوتبوە ژێر کاریگەری ئەو بیروبۆچوونە نەتەوەیی- شۆڕشگێڕانەی جیهانی عەرەبی و رووی لە بیرۆکەی بەعسچێتی کردبوو. وەکو یەکێك لە سەرکردەکانی جوڵانەوە خوێندکارییەکان بوو کە بە ئەنتی ئەمپریالیست و نەتەوەگەرا لە قەڵەمدەدران. توشی بەڵا ببوو و حوکمی زیندانی زۆری بۆ بڕابووەوە و لە زیندانەکانی عێراق'دا ئەشکەنجە درابوو. لە ساڵی ١٩٦٣دا کاتێك کە حوکمی ١٥ ساڵ زیندانیکردنی بەسەردا سەپێندرابوو، بەهۆی هاوپەیمانی ناسری و بەعسیەکان رژێمەکەی عەبدولکەریم قاسم رووخا و دوای ئەوەش دەرگای زیندانەکان کرابوونەوە و ئەبو ئەمەل'یش ئازادکرابوو.

لە ساڵانی دواتریشدا وازی لە بەعسچێتی هێنا و بوو بە ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی عێراق. جوڵانەوەی کۆمۆنیستی عێراق لە ساڵی ١٩٤٠ەکانەوە هەتا ١٩٧٠کان ببوو بە هێزێك کە ناوەندە رۆشنبیرییەکان عێراق'ی کۆنترۆڵ دەکرد. باشترین روناکبیر و شاعیر و نوسەر و هونەرمەندانی عێراق'ی لە دەوری خۆی کۆکردبووەوە و ئەبو ئەمەل'یشی بۆ لای خۆی راکێشابوو.

لە ساڵانی ١٩٦٠ەکاندا کێشمەکێش و جیابوونەوەی چین و یەکێتی سۆڤیەتی جاران لەنێو جوڵانەوەی کۆمۆنیستی جیهان، کاریگەری لەسەر عێراق و حیزبی کۆمۆنیستی عێراق'یش دانا و ئەو حیزبە بۆ دووبەشی لیژنە مەرکەزی و قیادەی مەرکەزی دابەش بوو.

قیادەی مەرکەزی بیروبۆچوونێکی مائۆیستی هەبوو و لایەنگری لە شێوازی بەرگری گەریلایی چە گیڤارا دەکرد و پێیوابوو کە دەسەڵات تەنها لە رێگەی تێکۆشان و شەڕی چەکدارییەوە ئاڵوگۆڕی پێدەکرێت و بەوجۆرەش رێبازێکی رادیکاڵ و توندڕەوانەی هەبوو. لەکاتی دابەشبوونەکەدا ئەبو ئەمەل لەنێو گروپی دووەمدابوو، واتە لەنێو قیادەی مەرکەزی حزبی کۆمۆنیستی عێراق'دا جێگەی خۆی گرتبوو. قیادەی مەرکەزی حیزبی کۆمۆنیستی عێراق لە باشووری خۆرهەڵات لە زەلکاوەکانی ئەلئەهوار لە شەتولعەرەب کە شوێنی بە یەك گەیشتنی هەردوو روباری دیجلە و فورات'ە، دەستی بە تێکۆشانێکی گەریلایی کرد و

بەوجۆرەش ناوی خۆی لە مێژووی عێراق'دا تۆمارکرد.

تێکۆشانی گەریلایی لە ناوچەی"عەرەبەکانی زەلکاو"دا کە ژمارەی هەموو دانیشتوانەکەی ٢٠٠ هەزار کەس دەبن و شیعە مەزهەبن و لە عێراق'دا بە ناوچەی مەعدان (کۆکراوەی معێدی) دەناسرێت و لە نزیك سنورەکانی ئێران دایە، لەدوای کوژرانی هەموو گەریلاکان سەرکوت کرا.

هەموو کاتێك ئەزموونی ئەلئەهوار لە گفتوگۆکانمدا لەگەڵ ئەبو ئەمەل یەکێك لە بابەتە گەرم و گوڕەکان بوو. وەك ئەوەی رۆمانێکی سەرنجراکێشی پۆلیسی بخوێنمەوە بە تامەزرۆییەوە گفتوگۆکانی تایبەت بەئەزمونی ئەلئەهوار و دواتر دەستگیرکرانی عەزیز ئەلحاجی سەرکردەی بەناوبانگی جوڵانەوەی کۆمۆنیستی عێراق و پاشان خۆ بەدەستەوەدانی لەدوای ئەشکەنجەدرانی و دواتر دەرکەوتنی لە تەلەفزیۆن و راگەیاندنی پابەندبوونی خۆی بە سەدام حسێن و بوونی بە یەکێك لە بیرۆکراتەکانی رژێمم لە زاری ئەبو ئەمەل بیست و بە بەردەوامی یاداشتم وەردەگرت. خۆیشم نازانم بۆچی لەکاتی قسەکردنی ئەبوئەمەل'دا یاداشتم وەردەگرت.

من وەك رۆژنامەنوسێك لە بەیروت بووم و هیچ کەسێك چاوەڕوانی ئەوەی لێ نەدەکردم کە لەوێ هەواڵێك سەبارەت بە عێراق ئامادە بکەم. لەوانەیە هێزێکی نادیار وایکردبێت کە قەڵەم و کاغەز بگرم بەدەستەوە و لەبەرامبەر ئەبو ئەمەل'دا بەوجۆرە دانیشم. چونکە رۆژێك دەهات کە چارەنووسم لەگەڵ عێراق'دا یەکی دەگرتەوە. دوای لەناوچوونی تێکۆشانی گەریلایی حیزبەکەی و سەنگەر گواستنەوەی سەرکردەی حیزبەکەی، ئەبو ئەمەل کە یەکێك لە بەڕێوەبەرانی حیزبەکەی، لە ساڵی ١٩٦٩دا بەرەو فەرەنسا هەڵهات و لەوێ لە زانکۆی پۆیتێرس بەشی ئابووری تەواوکرد. بەوجۆرەش قۆناغێکی ٣٤ ساڵەی دوورخراوەیی لە ژیانیدا هەتا ساڵی ٢٠٠٣ دەستپێکردبوو. هەتا ئەوکاتەی کە گەڕایەوە بۆ بەغدا، چەند ساڵێکیشی لە شام تێپەڕ کرد کە تێیدا لە جەلال تاڵەبانی نزیك دەبووەوە. پاشان لە شام دەربازی بەیروت دەبێت و ئەو کاتەش کە من ناسیم، ئەو ساڵانە بوون کە ئەو لە بەیروت دەمایەوە. لە نێوان مێژووی کەسیی ئەبو ئەمەل و بەسەرهاتەکانی جوڵانەوەی شۆڕشگێری عێراق و ئەوانەی خۆماندا خاڵی هاوبەشی زۆرم دەدۆزییەوە. کەسانی بەناوبانگی جیلی چەپ - شۆڕشگێڕی ئێمەش لە ساڵانی ١٩٦٠ەکاندا، ئەو کاتەی کە لەگەڵ مارکسیزم ئاشنا دەبوون، لە قۆناغەکانی یەکەمی گەنجێتی خۆیاندا کەسانێك بوون کە بە تۆخی لایەنگرییان لە مستەفا کەمال دەکرد و منداڵانی سەر بەچینی ناوەڕاست و باڵای کۆمەڵگا بوون. کەسانێکی وەکو منیان تێدا بوو کە لەو مەکتەبە ناوەندییانەدا خوێندبوویان کە زمانی ئینگلیزی یان فەرەنسییان فێری خوێندکاران دەکرد. قوتابخانەی ناوەندی تاڵاس ئەمریکان و دواناوەندی تراسوس ئەمەریکان کە من ماوەی حەوت ساڵ تەنانەت لە بەشە ناوخۆییەکەشیاندا دەمامەوە، قوتابخانەیەکی تەبشیری ئەمریکایی بوو.

زۆربەمان ڕێگایەکی جیاواز لە باوکەکانی خۆمانمان گرتبووەبەر و بە پێچەوانەی بیروبۆچوونە سیاسیەکانی ئەوان دەجوڵاینەوە.

لە ناوەڕاستی ١٩٦٠کاندا، هێشتا بە تەواوی لەگەڵ کەمالیزم گەردن ئازاییمان لێك نەکردبوو کە بەرەو لای سۆسیالیزم ڕۆیشتین. هێشتا لە تەمەنی بیستساڵاندا بووین کە پێمانوابوو لە ڕێگەی پەرلەمان و سیستەمێکی پەرلەمانتارییەوە ناتوانین سۆسیالیزم جێگیر بکەین و من و دەیان گەنجی زانکۆی وەك منیش بەمجۆرە لە پارتی کرێکارانی تورکیا دوور کەوتینەوە و چاومان بڕیبوە چە گیڤارا کە سەرسامی کردبووین.

بیروبۆچوونەکانی مائۆ سەبارەت بە تیۆرەکانی جەنگی درێژخایەنی گەل لای ئێمە رەواجی هەبوو. هەروەها لەژێر کاریگەری جەنگی ڤێتنام و تێکۆشانی فەلەستینیەکان'دا بووین. وەکو ئەوانەی کە لە ئەلئەهوار گیانیان لەدەستدابوو، جیلی ئێمەش کەسانێکی وەکو سینان جەنگیل و دەنیز گەزمیش'ی بەخت کردبوو. جوڵانەوەکەی ئێمەش هاوشێوەی جوڵانەوەی چەپی عێراق سەرکوت کرابوو.

گردبوونەوەی من و ئەبو ئەمەل لە دەوری ئەبو جیهاد لەنێو جوڵانەوەی فەلەستین، نەدەبوو شتێکی هەڵکەوت بێت. ئەمە یەکگرتنێك بوو کە لە چارەنووسدا هەبوو. لەیەك ناوچەی جوگرافیاییدا چاومان بە رووی جیهان کرابووەوە و سەر بە یەك جیل بووین. لەبەر ئەوەش رۆژێکی ساڵەکانی ١٩٧٠ لە بەیروت یەکترمان دەبینی. ناڕازییەکانی رژێمە عەرەبیەکان و شۆڕشگێڕەکانی جیهانی سێیەم کە لە ژێر چەتری رێکخراوی رزگاری فەلەستین لە بەیروت دەژیان، لە کۆتایی هاوینی ١٩٨٢دا لەگەل رێکخراوی رزگاری فەلەستین لوبنان'یان جێهێشت. ئەبو ئەمەل'یش یەکێك لەو کەسانە بوو کە بە کەشتی لە بەندەری بەیروت رێگای "دەریای سپی"یان گرتەبەر و رۆیشتن.

کاتی پێچوو هەتا توانیم ئەو کەسانە بدۆزمەوە کە رۆیشتبوون. ئەوەم زانیبو کە ئەبو ئەمەل دیسان گەڕاوەتەوە بۆ فەرەنسا و لە نزیك شەقامی ئەتینا دەژی. لە حوزەیرانی ١٩٨٤دا کاتێك بۆ تەماشاکردنی یاری پاڵەوانێتی تۆپی پێی ئەورووپا بۆ فەرەنسا رۆیشتبووم، رێم کەوتە شەقامی ئەتینا و دوای ٢ ساڵ دابڕان، لەگەڵ ئەبو ئەمەل یەکترمان بینی. لەدوای ئەو دیدارەشمان لە فەرەنسا، نزیکەی ٢٠ ساڵ یەکترمان نەبینییەوە.

تورکێك بەناوی راغب دوران کە لە بەیروت بەهۆی منەوە لە ماڵی ئەبو ئەمەل مابووەوە، رۆژێك هەواڵی ئەوی لێ پرسیم. راغب دوژمنێکی سەرسەختی جەنگی عێراق و ئەو سیستەمە بوو کە لەدوای جەنگ لە عێراق دامەزرابوو. وتی:"لە بەیروت لە ماڵی هاوڕێیەکی تۆ مابوومەوە، ئەبو ئەمەل. عێراق'ی بوو، پیاوێکی زۆر شیرین بوو، ئەوە چی لێهات؟ هیچ هەواڵێکی دەزانیت؟" منیش لە وەڵامدا وتم:"بەڵی ئاگام لێیەتی، ئێستا جێگری سەرکۆماری عێراق'ە." راغب ناوی عادل عەبدولمەهدی دەزانی بەڵام نەیدەزانی عادل

عەبدولمەهدی هەمان ئەبوئەمەل ‌ە.

عادل عەبدولمەهدی وەك یەكێك لەبەرپرسە باڵاكانی عێراق لە ساڵی ٢٠١٠دا پشتیوانی بەهێزی توركیا‌ی بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیری وڵاتەكەی بەدەستهێنا و چەندینجار سەردانی توركیا‌ی كرد. هەموو بەرپرسانی تورك، لەسەرووی هەمووشیانەوە رەجەب تایب ئەردۆغان هەرجارێك كە سەردانی بەغدا‌یان كردووە لەگەڵ ئەودا دیدار و كۆبوونەوەیان كردوووە. لەدوای فەرەنسا، بۆ یەكەمجار ئەبوئەمەل‌م لە بەغدا لە پێگە و پۆستە تازەكەی خۆیدا بینی، بەڵام وەك بڵێی ئەو بیست ساڵە نەچووبێتە بەینمانەوە، لەو شوێنەی كە مابووینەوە دەستمان پێكردەوە.

**پرسیاری بەغدا لە کەسی عاشق ناکرێت، ئاسۆکان تێدەپەڕێنێ و دەڕوات. ڕێبواری ڕێگای ئومێد شەکەت نابێت، لە ڕێگەی بەختی خۆیدا بە خێرایی دەڕوات.**

بەستەی ماهور، مونیر نورەدین سەلجوق، وتنی: وەجدی بینگول

**تۆ بڵێی خودا لە جیهاندا شارێکی دیکەی بە جوانی تۆ دروست کردبێت؟ بەغدا بەغدا!**

**گۆرانی هونەرمەندی بەناوبانگی عێراقی کازم ئەلساهیر**

ئەبو ئەمەل (عادل عەبدولمەهدی) وتی:" ئەگەر دەگەڕێیتەوە پێویستە هەر ئێستا بڕۆیت، ئەگینا دەبێ بمێنیتەوە و لێرە بخەویت. بەڵام ئەگەر دەڕۆی پێویستە ئێستا هەستی. هێشتا کاتژمێر دە و نیوی شەو بوو. لە ناوچەی سەوز کە بە پارێزراوترین شوێنی بەغدا لەقەڵەم دەدرا و ڕێگاکانی هاتوچۆی بە توندی کۆنترۆڵ دەکران و بەرپرسانی ئەمریکایی و عێراقی تێیدا نیشتەجێ بوون، دەمامەوە و میوانی سەرکۆماری عێراق بووم. ئەگەر ئەو شەوە لە ماڵی عادل عەبدولمەهدی جێگری سەرکۆمار نەخەوتایەم، دەگەڕامەوە بۆ میوانخانەی سەرکۆمار. دوو ئۆتۆمبێلی تایبەتی پاسەوانەکانی سەرکۆمار کە یەکیان پڕبوو لە پاسەوانی چەکدار، لەبەر دەرگا چاوەڕوانی من بوون.

لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٦دا بەغدا ئەوەندە شارێکی نائارام بوو کە تەنانەت لە هەندێك کاتژمێری شەو بەدواوە هاتوچۆ لە نێوان شوێنی حەوانەوەی سەرکۆمار و جێگەی مانەوەی جێگرەکەیدا کارێکی سەخت و مەترسیدار بوو. نزیکەی مانگێك دوای ئەو شەوەی‌لەگەڵ عادل عەبدولمەهدی یەکترمان بینی، شەڕی نێوان شیعە و سوننەکانی عێراق زیاتر پەرەی سەند و لافاوی خوێن لاشەی برد. لە ٢٣ی شوباتدا لە سامەڕا کە دەکەوێتە ١٢٥ کیلۆمەتری باکووری بەغدا، منارەی ئاڵتونی مزگەوتی ئیمامەین تەقێنرایەوە کە مەزاری ئیمامی دەیەم و ئیمامی یانزەیەمی شیعەکان لەوێ نێژراون. بەغدا زیاتر لەهەر شوێنێکی دیکە کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەو شەڕە خوێناوییەی کە لە نێوان شیعە و سوننەکانی عێراق دەرکەوتبوو. لەماوەی سێ ساڵی نێوان ٢٠٠٦ - ٢٠٠٩، بارودۆخەکە وای لێهاتبوو کە ئیدی سوننەکان نەیاندەتوانی لە گەڕەکە شیعەنشینەکانی بەغدا و شیعەکانیش نەیاندەتوانی لە گەڕەکە سوننەنشینەکانی ئەو شارەدا بمێننەوە. بەغدا زیاتر لەهەر کاتێکی دیکە بەش بەش و خوێناویتر ببوو.

ڕێگای بەغدا - موسڵ لە تەنیشت سامەڕاوە تێپەڕ دەبێت. لە یەکەم ڕۆژەکانی ساڵی ٢٠٠٤دا، کاتێك لەسەر پردی دیجلەوە بەرەو موسڵ ڕۆیشتبووم منارە ئاڵتونییەکەی مزگەوتەکەی سامەڕا سەرنجی ڕاکێشابووم. وەختێ هەواڵی تەقاندنەوەی ئەو منارەیەم پێگەیشت بڕوام نەکرد. تەنها مەزاری ئیمام عەلی ئەلهادی و ئیمام حەسەنی عەسکەری و نێرگز خاتونی دایکی ئیمام مەهدی دوانزەیەمین ئیمامی شیعەکان لەو شوێنە

نەبوو، بەڵکو خەڵکی بڕوایان وابوو کە دوایین جار ئیمامی مەهدی لەوێ بینراوە. پێموابوو وێرانکردنی شوێنێکی پیرۆزی وەها، دەتوانێت لە ماوەیەکی نزیکدا کاریگەری لەسەر بەغدا دابنێت و بەو هۆیەوە ئەو شارەش وێران بێت.

چەند هەفتە بەر لە تەقینەوەکەی سامەڕا کە بە"خاڵی وەرچەرخان" لە پێکدادانی شیعە و سوننەکان'ی عێراق لە قەڵەم دەدرا، لای جەلال تاڵەبانی'یەوە چووم بۆ سەردانی عادل عەبدولمەهدی و لە کاتژمێرێکی دیاریکراوی شەودا کە زۆر درەنگیش نەبوو، ناچارمابووم لەبەری رۆژهەڵاتی دیجلە'وە بگەڕێمەوە بۆ شوێنی خۆم. تێبینیەکانی ئەو شەوەی بەغدا هێشتا لە زەینمدا تازە بوو. ئەوکاتەی کە تاڵەبانی تەلەفۆنی بۆ عادل عەبدولمەهدی کرد و پێی گوت من لە بەغدا'م و تەلەفۆنەکەی دا بەدەستی منەوە، عادل ئەوەندە پێداگری کرد کە بۆ نانی ئێوارە بچم بۆ لای کە نەمتوانی قسەی بشکێنم و بەوجۆرەش دەرفەتی گفتوگۆیەکی دووروودرێژم لەگەڵ زاڵمای خەلیلزاد باڵیۆزی ئەمریکا لە کیس دا. خەلیلزاد ئەو شەوە میوانی تاڵەبانی بوو. ئەوانم بەجێهێشت و بەرەو لای دۆستە کۆنەکەی خۆم بە ڕێ کەوتم.

بەر لەوەی بە کاروانێکی ئۆتۆمبێل دەربچم کە تاڵەبانی بۆی تەرخان کردبووم، زاڵمای خەلیلزاد باڵیۆزە بەناو بانگەکەی ئەمریکا کە بە رەچەڵەك ئەفغانی بوو، پێی گوتم:"سڵاوم بە عادل عەبدولمەهدی بگەیەنە." کاروانی بچوکی ئۆتۆمبێلەکانمان کە لە دوو جێبی ٤×٤ پێکهاتبوو، لە شوێنی مانەوەی تاڵەبانی لەبەری خۆرهەڵاتی دیجلە (رەسافە) لە جادریەوە بەرەو بەری خۆرئاوا (کەرخ) بە ڕێ کەوت " بۆ ئەوەی بچینە ناوچەی سەوز." ئەملاولای ڕێگاکە بە گوێنی پڕ لە لم و بەربەستی جۆراوجۆر و ئۆتۆمبێلی زرێپۆش گیرابوو. کاتێك گەیشتینە (جسر المعلق) یان پردی هەڵواسراو کە یەکێکە لە پردە بەناوبانگەکانی بەغدا، ڕێگەمان لێ گیرا. لە بەغدا، لەسەر روباری دیجلە ١٣ پرد هەیە و هەر یەکێکیشیان چیرۆکێکی خۆی هەیە. ئەم پردەشیان کە ناوەکەی پردی هەڵواسراوە، چیرۆکێکی تایبەت بە خۆی هەیە.

پردی هەڵواسراو تا ئەندازەیەك تازەیە و لەساڵی ١٩٥٩دا دروستکراوە. لەکاتی داگیرکاری ئەمریکا'دا ڕێگای نێوان رەسافە و کەرخ بە رووی هاتوچۆی خەڵکدا داخرابوو، چونکە ئەمە نزیکترین ڕێگای قەدبڕی نێوان شوێنی حەوانەوەی بەشێك لەبەرێوەبەرانی عێراق'ی نوێ و بەشێکی دیکەی ئەو بەڕێوەبەرانە و ئەمریکییەکان لە ناوچەی سەوزدا بوو. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك سەرباز بە جلوبەرگی رۆبۆکۆپ کە لەسەر کڵاوەکانیان ئاڵای ئەمریکا نەخش کرابوو، گوێیان بەوە نەدەدا کە ئەمە کاروانی ئۆتۆمبێلەکانی سەرۆکایەتی کۆمارە و داوای پێناسیان لێکردین و پرسیاری زۆریان کرد. بەو کەسەی کە لەگەڵمدا بوو وتم:" ئەرکی سەرەکی ئەمانە پاسەوانی کردن لە باڵیۆزی ئەمریکا'یە با پێیان بڵێین کە ئێستا من لای ئەوەوە هاتووم و سڵاوی ئەو بۆ جێگری سەرکۆمار دەبەم." ئەویش لە وەڵامدا وتی:" ئەو قسانە دینارێك ناکەن. نا، زەحمەتە

لەگەڵ ئەمانەدا ڕێککەویت. هەر لە ئینگلیزی تێناگەن."

-" چۆن لە ئینگلیزی تێناگەن؟"

-"چونکە ئەمانە خەڵکی پیرۆن. ئەمریکاییەکان ئەم جۆرە کاروبارە ئەمنیانە رادەستی ئەو سەربازانە دەکەن کە بە پارە ئیشیان بۆ دەکەن و ناتوانن بە باشی بە ئینگلیزی قسە بکەن. وەکو ئەمانەی خەڵکی پیرۆ..."

سەرم سووڕنەما. چونکە پێشتریش کە جارێك بۆ چاودێریکردنی کۆبوونەوەیەك سەردانی کۆشکی کۆنگرەکانم کردبوو، گورکھا (و: گورکھاکان ناوی جەنگاوەرە کۆنەکانی نیپاڵ'ە) نیپالییەکان ڕێگەیان لێگرتم و منیش ناچار بووم هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر بدەم بۆ ئەوەی بچمە ژوورەوە. ئەو بەرپرسە ئەمنیە نیپالی و پیرۆییانەی کە نەیاندەتوانی بە زمانی ئینگلیزی قسە بکەن، یەکێك لە دیمەنە سەیروسەمەرەکانی داگیرکاریی ئەمریکا لە بەغدا بوو. ناشیرینترین دیمەنی داگیرکارییەکەش ئەو بلۆکە بەرزانە بوون کە بە ئەندازەی بینایەکی چەند نهۆمی دەبوون و بە مەبەستی ئەمنی لە شارەکەدا دانرابوون. ئەو مەیدانە فراوانەی کە کۆشکە گەورەکەی سەرۆکایەتی سەدام حسێن و شوێنی مەراسیمەکانی تێدا بوو و بەناچەی سەوز دەناسرا، بە دیوار و بلۆکی گەورە گەورە دەورەدرابوو. ئەوەندە پێچ و پەنای تێکەوتبوو کە مرۆڤ لەوێدا خۆی ون دەکرد. نەمزانیبو کە لە کوێوە و بە چ شێوەیەك گەیشتبووینە ماڵی عادل عەبدولمەهدی، بۆیە هەر کە دانیشتین نەمتوانی خۆم رابگرم و یەکسەر وتم:" ئێرە کوێیە؟ ئێمە لە کوێین؟" ئەویش لە وەڵامدا ویستی ئەوەم بۆ باسبکات کە لە شوێنێکداین لە ناوەڕاستی شار و دەستی بۆ دیوارەکەی پشت خۆی برد و وتی:" پردی کۆماری لێرەیە، ئێمە لەبەرامبەر باب شەرجی داین. دیجلە لە تەنیشتماندایە، هەر لە پشت بیناکەوەیە..."

ئانتۆنی شادید کە ئەو کاتانە وەك پەیامنێری واشنتن پۆست لە بەغدا کاری دەکرد، بە زمانێکی شیعری و بە باشترین شێوە دیمەنی بەغدای ژێر داگیرکاری ئەمریکای وێنا کردبوو. ئانتۆنی شادید کە ئەمریکاییەکی بە رەچەڵەك لوبنانیە، بەهۆی نوسینەکانی ساڵی ٢٠٠٤ - ٢٠١٠ی لەسەر بەغدا، گەورەترین خەڵاتی رۆژنامەوانی ئەمریکای کە خەڵاتی پۆلیتزەرە بۆ دووجار بردەوە. لەچاوی منیشدا ئەو لە ساڵانی ٢٠٠٠ەکاندا گەورەترین چاودێری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بوو. لە ساڵی ٢٠١١دا بە باشترین شێوە ڕووداوەکانی تایبەت بە شۆڕشی عەرەبی دەگێڕایەوە کە لە میسر و تونس دەستیپێکرد. لە ڕووداوەکان تێدەگەیشت و لەوبارەیەشەوە جێ پەنجەی خۆی لە مێژوودا بەجێهێشتووە.

لە ١٦ی شوباتی ٢٠١٢دا بەشێوەیەکی نهێنی دەربازی سوریا ببوو. لەکاتی گەڕانەوەشیدا بۆ تورکیا، لەسەر سنور بەهۆی تەنگەنەفەسی لە تەمەنی ٤٤ ساڵیدا گیانی لەدەستدا. بەمجۆرەش هەڵبەز و دابەزە بێ

کۆتاییەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، لە کاتێکی ناوەختدا یەکێکیتر لە خۆشەویسترین دۆستەکانی منی لە ئازیزەکانی خۆی جیاکردەوە. یەکێك لە بابەتە فەرامۆش نەکراوەکانی ئانتۆنی شادید کە لەبارەی بەغدا نوسیویەتی، بابەتێکە بەناوی"لە شارێك لە چیمەنتۆ". لە نوسینەکانی خۆیدا بەردەوام باسی ئەو بلۆك و بتۆنانەی دەکرد کە لە بەغدا هەبوون و لە مانگی ١١ی ٢٠٠٩دا بابەتێکی بەناوی شاری دیوارەکان نوسی کە بە دیدگا و بۆچوونێکی مێژووییەوە باسی ئەو بارودۆخەی نوێیەی "بەغدا"ی دەکرد کە من لە ساڵی ٢٠٠٦ەوە ئاگام لێی بوو:

"لە مێژووی ١٢٥٠ ساڵەی بەغدا، دانیشتوانی ئەو شارە ناوی زۆریان لە شارەکەیان ناوە. بۆ ئەبوجەعفەر مەنسور کە دامەزرێنەری شارەکە بوو ... بەغدا شاری ئاشتی (مدینه السلام) بوو، کە بە دیوارەکانی خۆیەوە بازنەیەکی رێکوپێکی دروستدەکرد. بەغدای سەدام حسێن شارێك بوو کە تێیدا شکۆ و گەورەیی شارەکە بەشێوەیەکی نارێك و سەیر پەرەی سەندبوو. وەك وەسیەتنامەی خۆ بە زل زانینی سەدام حسێن بوو. لەدوای روخانی رژێمەکەی سەدام، شارەکەش وەکو خەڵکەکەی بێ بەرگری مایەوە و بلۆك و داروبەردی بەسەریەکەوە نەما و وەکو شارێکی بێ دەر و دیواری لێهات. ئەو شارەی کە لەنێو تارێکیدا شاری فانۆس و چرا بوو، وەك شاری دێوەزمە و جنۆکەی لێهاتبوو. سێبەری ترس دایگرتبوو، وەك شارێکی چۆڵکراوی لێهاتبوو. لەدوای ئەوەش میعماری داگیرکاری وەکو پەردەیەك داپۆشت و بلۆك و بتۆنی گەورە گەورەی رەساسی دەرکەوتن. بەغدا ئێستا شاری ئەم دیوارە بەرز و بڵندانەیە."

ئەو بەغدایەی کە تایب ئەردۆغان لە یەکەم سەردانی خۆیدا بۆ ئەم شارە لە ١٠ی تەموزی ٢٠٠٨دا بینیبووی، ئەم بەغدایە بوو. ئەو شەوە لەنێو فڕۆکەکەدا لە رێی گەڕانەوە بۆ ئەنقەرە بە نیگەرانیەوە وتی:" چووینە بەغدا، بەڵام بێئەوەی بەغدا ببینین دەگەڕێینەوە." لە فڕۆکەخانەوە لەنێو ئەو بلۆك و بتۆنە بەرز و گەورانەدا چووبووە ناوچەی سەوز و لەوێشەوە دیسان بەهەمان شێوە لە رێی پردی هەڵواسراوەوە چووبوو بۆ لای جەلال تاڵەبانی و بەشداری لە ئێوارەخوانێکی ئەودا کردبوو. لە نیوە شەویشدا دیسان رێگای فڕۆکەخانەنی گرتبووەبەر.

ئەردۆغان لە سێیەم سەردانی خۆیدا بۆ بەغدا لە ٢٩ی مارتی ٢٠١٢دا توانیبووی لە کازمیە سەردانی مەزاری ئیمام موسای کازم بکات و لەبەرامبەر دیجلە'دا لە ئەعزەمیە سەردانی مەزاری ئیمامی گەورە ئەبو حەنیفە بکات. بەوەش دڵی خۆش ببوو کە بەغدای بینیوە. لە یەکەم سەردانی خۆیدا وتبووی:" چووینە بەغدا، بەڵام بەغدا'مان نەبینی" و بەوجۆرەش کاردانەوەی خۆی لەبەرامبەر داگیرکاری ئەمریکا پیشاندابوو.

لەو کاتانەدا ئەحمەد داود ئۆغڵو وەزیری دەرەوە، لە کۆبوونەوەیەکی داخراوی پێدانی زانیاری بە رۆژنامەنوساندا لە ئیستانبوڵ بە راشکاوی کاردانەوەی لە دژی داگیرکاری ئەمریکا پیشاندابوو. داودئۆغڵو

بە بێئەوەی راستەوخۆ بیڵێت، بە ئاماژەیەکی بەهێزەوە باسی لەوەکرد کە بەغدا بیلبیلەی چاوی شارستانی ئیسلامە و بووەتە ئامانجی هێرشێکی نارەوای "خۆرئاوایی و خاچپەرستەکان". هەندێك کەسی موسڵمان و لایەنی ئیسلامی پێیانوابوو لەدوای داگیرکارییەکەی هۆلاکۆی مەغۆل لەساڵی١٢٥٨دا کە تێیدا "سەردەمی زێرینی" شارستانی ئیسلام کۆتایی پێهێنرا و روباری دیجلە بە خوێن سوور و بە مورەکەبی کتێب رەش ببوو، داگیرکاری ئەمریکا گەورەترین کارەساتێك بووە کە بەسەر ئەو شارەدا هاتبێت.

هەموو کاتێك جیاوازی هەبوو لە نێوان ئەو بەغدا راستەقینەیەی سەردەمی ژیانی ئێمە لەگەڵ ئەو شتەی کەوا لە زەینی هەندێك کەسدا هەبوو سەبارەت بەوەی کە کاتی خۆی بەغدا نوێنەرایەتی "سەردەمی زێرینی شارستانی ئیسلامی کردووە". ئەمەش ناکۆکییەك بوو کە هیچ کات نەدەکرا چاوپۆشی لێبکرێت. وەکو کەسێك کە یەکەمجار لە ساڵی ١٩٧٨دا چووبێتمە بەغدا و دووەمجار لەساڵی ١٩٨٨دا پێم نابێتە خاکی ئەو شارە و لەگەڵ ٢٠٠٣شدا چەندینجار و بەمەراقێکی زۆرترەوە سەردانی هەموو شوێنێکی شارەکەم کردبێت و شتی زۆرم لەسەر مێژوو و ئێستای خوێندبێتەوە، زۆر بە باشی درك بەو ناکۆکییە دەکەم.

بەغدا لەنێوان سەدەی ٨ – ١٣، ئەو کاتەی کە پایتەختی عەباسی‌یەکان بوو هەتا ئەو کاتەی کە لەلایەن مەغولەکان‌ەوە وێرانکرا، تا ئەندازەیەك سەردەمێکی پێنج سەد ساڵەی پرشنگداری هەبووە کە دەکرێت لە روانگەی شارستانی ئیسلامیەوە لەگەڵ ئەندەلوس‌دا بەراورد بکرێت.

لەسایەی سەری بەغدا، بۆ ماوەی ٧٠٠ ساڵ زمانی عەرەبی ببوو بە زمانی زانست. بەغدا لە سەردەمی خەلیفە مەنسور، هارونە رەشید و مەئمون‌دا نەك تەنها بە ژمارەی دانیشتوانەکەیەوە کە نزیکەی یەك ملیۆن کەس دەبوو، ببوو بەگەورەترین شاری جیهان، بەڵکو بە دامەزراندنی"بیت الحکمە" خانەی حیکمەت لە هەموو بوارێکی زانستیشدا گەشەی کردبوو. ئەو کاتەی کە بەغدا پرشنگی دەدایەوە و هەموو دەوروبەری خۆی روناك دەکردەوە، هیچ رووناکییەك لە ئەورووپا بەدی نەدەکرا.

بەرهەم و دەقە کۆنەکانی یۆنان و فارسی و هیندی و بەرهەمەکانی سوقرات و ئەرستۆ و ئەفلاتۆن لە بەغدا وەرگێڕدرابوون و بیرمەندە موسڵمان و مەسیحی و یەهودییەکان‌یش گفتوگۆ و مشتومڕە فەلسەفیەکانی خۆیان لەوێ ئەنجام دەدا. ئیبنی سینا‌ی تاجیك و ئیبنی روشد‌ی ئەندەلوس و فارابی تورکی رێپیشاندەر و ئەلکیندی ماتماتیکزانی گەورە و خوارەزمی بە رەچەڵەك ئۆزبەك کە جەبری خستۆتە ناو زانست، لەگەڵ ئەلبیرونی کە فارسە و وەك لیۆناردۆ دافینشی ئیسلام لەقەڵەم دەدرێت، لەگەڵ ئەلتوسی کە کاریگەری لەسەر کۆپەرنیك و ئیبنی خەلدون داناوە، هەموویان بەرهەمی "سەردەمی زێرینی" بەغدا و "خانەی حیکمەت"ی ئەو شارە بوون.

دامەزرێنەرانی دوو رێبازی گەورەی فیقهی ئیسلامی حەنەفی و حەنبەلی، واتە ئەبو حەنیفە و ئیبنی

حەنبەلی لەبەغدا ژیاون و قوتابخانەکانی خۆیان لەو شارە کردۆتەوە. قوتابخانەکانی ئەلموستەنسریە کە شوێنی دەرکەوتنی نازمیەی نیزامولمولك بوون، بە ناوەندی زانستی سەدەکانی ناوەڕاست لەقەڵەم دەدران.

"چیرۆکەکانی هەزار و یەك شەو" کە شان و شکۆی سەردەمی هارونە ڕەشید دەردەخەن، هی بەغدا بوون. بەغدا بە هەموو تایبەتمەندییەکانی خۆیەوە زەینی مرۆڤی دەوروژاند و هەموو کاتێك شاری چیرۆك بووە. تا ئەندازەیەك لە هەموو قۆناغێکدا هەموو کەسێکی بە تەوسەوە بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە. منیشی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. لەساڵی ١٩٧٨دا کاتێك کە هیچ کەس بیری لەوە نەدەکردەوە ڕۆژێك دێت و بەڕێوەبردنی بەعس دەڕووخێت، من بۆ یەکەمجار سەردانی بەغدام کرد و ئەو جۆش و خرۆشەی کە ئەو کاتە هەمبوو، لە ٢٠٠٣شدا کاتێك کە دوای ڕووخانی سەدام سەردانی ئەو شارەم کردەوە دیسان هەمان هەست و جۆش و خرۆشم هەبوو. بەڵام لە ڕاستیدا ئەو "سەردەمە زێڕینە" بە ئەندازەی تەمەنی ئیمپراتۆریای عەباسی درێژەی نەکێشابوو. ئەو قۆناغە یەك لەسەر چواری تەمەنی دەسەڵاتداری عەباسی بوو. لە ڕاستیدا بەغدا بە بەردەوامی روخێنراوە و زیاتر لە جوانیەکانی، ناشیرینی و خراپیەکانی دیار کەوتوون.

خەیاڵی "سەردەمی زێڕینی" بەغدا کە بەردەوام وایکردووە ئەو شارە ببێتە یەکێك لە گرنگترین شارەکانی جیهان، جیهانێکی خەیاڵاوی بۆ مرۆڤ دروست دەکرد کە واقیعی ناشیرینی و خراپی شارەکە پیشان نەدات. پێدەچێت لەبەر ئەمەش بووە کە هەموو کاتێك بەغدا لەگەڵ سەرنجراکێشی خۆیدا فریودەریش بووە. دیارە ئەمەش بارودۆخێك نەبووە کە تەنها تایبەت بە ڕۆژگاری ئەمڕۆ بێت. ئیبنی جوبێر (١١٤٥– ١٢١٧) گەڕیدەیەکی خەڵکی ئەندەلوس بووە و نزیکەی ١٠٠ ساڵ بەر لە ئیبن بەتوتە بەناوبانگترین گەڕیدە و گەشتیارەکانی مێژووی ئیسلام ژیاوە. ئەو لە ساڵی ١١٨٤دا درکی بە ئاڵۆزییەکانی بەغدا کردووە:

"سەرەڕای ئەوەی کە ئەم شارە کۆنە هێشتا پایتەختی عەباسیەکانە، تایبەتمەندی خۆی لە دەستداوە و تەنها ناوبانگەکەی ماوەتەوە. ئەو بێبەختی و کارەساتانەی کە بەردەوام بەسەر ئەم شارەدا هاتوون، وایان لێکردووە کە بە بەراورد لەگەڵ بارودۆخی جارانیدا، تا ئەندازەیەك وەکو ئەوە وابێت کە بە تەواوەتی لە ناوچووە."

ئیبنی جوبێر ٧٤ ساڵ بەر لە ئەوەی کە هۆلاکۆ ڕوباری دیجلە بە خوێن و مورەکەب ڕەنگین بکات ئەم شتانەی نوسیوە.

لە ساڵی ٧٤٢وە کە شاری بەغدا دامەزراوە، هاتوچۆی ئەم و ئەو لەم شارە نەبڕاوەتەوە. لە ٩٤٥دا بوڤەی ئۆغڵلەرییەکان هاتن و دوابەدوای ئەوانیش، سەلجوقیەکان لە ساڵی ١٠٥٥دا ئەم شارەیان داگیرکرد و هۆلاکۆ و مەغۆلەکانیش لە ١٢٥٢دا و پاش ئەوانیش لە ١٣٤٠دا جەلائیریەکان هاتن و لە ساڵی ١٣٩٣-١٤٠١دا تەیمور و لە ١٤١١دا تورکمانە قەرەقۆینلوەکان و لە ١٤٦٩یشدا تورکمانە ئاق قۆینلوەکان ئەم شارەیان

داگیرکرد. لە ساڵی ١٥٠٨دا سەفەوییەکان و لە ١٥٣٤دا عوسمانیەکانی ژێر فەرماندەیی و دەسەڵاتی سوڵتان سلێمانی قانونی هاتنە ئەم شارە و لە ساڵی ١٦٢٣دا سەفەوییەکان جارێکی دیکە گەڕانەوە. لە ١٦٣٨دا جارێکی دیکە عوسمانیەکان لە ژێر دەسەڵاتی سوڵتان موڕادی چوارەمدا گەڕانەوە. لە ١٩١٧دا ئینگلیزەکان دەربازی ئەم شارەبوون و لە ساڵی ١٩٤١دا بۆ روخاندنی ئەو حکومەتەی کە لایەنگری لە ئەڵمانیا دەکرد، جارێکیتر سەربازەکانی بەریتانیا هاتنەوە ناو خاکی عێراق و لە ٢٠٠٣شدا ئەمریکاییەکان هاتن و لە ساڵی ٢٠١١شدا شوێنە دەستی خۆیان لە عێراق'دانا و لەو وڵاتە کشانەوە.

لە تەمووزی ٢٠٠٣دا بۆ گەیشتن بەو بەغدا'یەی کە لە سەدام رزگاری ببوو، لە سەڵاحەدین لە باکووری شاری هەولێر و لە چیاکانی کوردستان، بە ئۆتۆمبیل لە رێی کەرکوك بەرەو بەغدا بە رێ کەوتم. پانزە ساڵ و دوو جەنگ کەوتبوە نێوانمانەوە. پلەی گەرمی لە سێبەریشدا دەگەیشتە ٥٠ پلە. هەولێر، کەرکوك، دوزخورماتو و جەبەل حەمرین'م تێپەڕ کرد کە لە زەینی کوردەکان'دا وەکو سنوری نێوان کوردستان و عێراق'ی عەرەب بوو. گەیشتمە دارستانی خورمای دەشتاییەکانی میزۆپۆتامیای خواروو. بۆ یەکەمجار لە جادەیەکەوە لە رووی باکووری خۆرهەڵاتەوە لە تەنیشت قەزای خالس بەرەو بەغدا رۆیشتم. رۆژێك بەر لەوە لەگەرمایەکدا کە دەگەیشتە ٥٠ پلە، لە کەرکوك مابوومەوە کە لە هەموو تەمەنمدا یەکەمجاربوو ببینم

هەر لەمنداڵیمەوە کەرکوك وەك شارێکی تورکمانی لە زەینمدا جێی خۆی کردبووەوە. لەو قۆناغەدا لە نێوان کورد و عەرەب و تورکمانەکان'دا لەسەر ئەو شارە ناکۆکی هەبوو. بەهۆی ئەو ناکۆکییانەشەوە وا تەسەور دەکرا کە ئەم شارە نەوتیە دەتوانێت کۆتایی بە عێراق بهێنێت.

جەلال تاڵەبانی کە بنەماڵەکەی خەڵکی کەرکوك'ە، بە بێ هیچ بنەمایەکی مێژوویی ئەو شارەی وەك "قودسی کوردستان" ناوزەد کردبوو. ئەم پێناسەیەش لەلایەن میدیای نێودەوڵەتییەوە پێشوازی لێکرا و رەواجی پەیداکرد. بەهۆی ئیدیعای ماف و خاوەندارییی لەسەر کەرکوك، هەموو جۆرە سازش و دانوستانێکی نێوان کوردەکان و حکومەتی ناوەندی لە بەغدا شکستی هێنابوو، لە ئەنجامیشدا جەنگ درێژەی کێشابوو. هەموو ئەمانەش ببوونە هۆی ئەوەی کە مەراقم بۆ کەرکوك زیاتر بێت. کەرکوك وەکو یەکێك لە چڵکنترین و سیساوترین ئەو شارانە هاتە پێش چاوم کە لە ژیانمدا بینیومن. لە رووی جوانییەوە هەموو هیواکانم سەبارەت بە کەرکوك تێکشکان. شاری گۆرانییە فەرامۆش نەکراوەکانی وەك "وەك ئاڵتوون لەبەر چاو شیرن و خوازراوی... رۆژێکم بینی رۆژانێکم بینی، تۆم بینی خۆشحاڵ بووم، چەخماخەکەت لێدە چراکەم رۆشن نەکردووە" ئەمە بوو؟

کاتێك ئەو تێبینیانەی خۆم بۆ دکتۆر موزەفەر ئارسڵان سەرکردەی تورکمان و رۆڵە و عاشقی شارەکە

باسکرد، لە وەڵاممدا وتی:" بە راستی لەکاتی منداڵیماندا کەرکوك زۆر جوان بوو. لە سەردەمی سەدام وای لێهات." بەڵام من زۆر قەناعەتم بەو قسەیەی نەکرد.

ماوەیەك دواتر کاتێك نوسینێکی ناو کتێبی "ئەمریکا لە عێراق"ی جۆرج پەیکر'م خوێندەوە کە وەهای نوسیبو:" کەرکوك ئەو شارەی عێراق کە بە لای منەوە زۆر گرنگ بوو، لەکاتی هاویندا پشتگوێ خرابوو. زبڵ و خاشەکەکانی لەسەر یەك کۆببوونەوە و ترافیکەکەی جووڵەی تێدا نەبوو. وەکو هەر شارێکی دیکەی عێراق'یش لە گەرما داخ کرابوو. بەڵام هەر لەیەکەم گەشتمدا بۆ ئەو شارە بەهۆی نۆستالژیای رابردوو، هەروەها بەهۆی ئەو ئاڵۆزی و تێکەڵ و پێکەڵییەی کە ئاسەوار و جێ دەستی خۆی لەهەر کۆڵانێکی تەسکدا دەرخستبوو، ئەو شارەم بە شارێکی سیحراوی و گرنگ بینیبوو. شارەکە لە دڵی خۆیدا شتێکی شاراوەی هەبوو." (ل٣٣٧, farrar, straus and giroux, newwork, ٢٠٠٥). دوابەدوای خوێندنەوەی ئەو دێڕانەش بیرم لەوەکردەوە کە دەکرێت لە دیدگایەکی جیاوازەوە سەیری کەرکوك بکرێت.

کەرکوك بەهۆی رووباری خاسەوە کە بەتەواوی وشکبووە و وەك زبڵدانێکی گەورەی لێهاتووە، هەروەها بەهۆی قەڵای کەرکوك'ەوە کە لە مەیدانێکی فراوانی خۆرهەڵاتی روبارەکەدایە و سەردەمانێك شوێنی نیشتەجێ بوونی تورکمانەکان بووە و دواتریش لەکاتی سەدام لە ساڵی ١٩٩٢دا، بەهۆی پیسکردنی ژینگەوە وەك زبڵدانی لێهاتبوو، هەروەها بەهۆی سوتانی غازی میتان لە بابەگوڕگوڕ لە باکووری کەرکوك کە شوێنی دۆزینەوەی یەکەم بیری نەوت بووە لەو شارەدا، دەتوانرێت کەرکوك وەك شتێکی پڕ لە نهێنی و نۆستالژی سەیر بکرێت.

لە ١٢ی تەموزی ٢٠٠٣دا، دوای ئەوەی کە دووجار چوومە کەرکوك، بەرەو بەغدا بە ڕێ کەوتم و لە ماوەی سەعات و نیوێکدا گەیشتمە بەغدا و خۆشحاڵییەکی سەیرم هەبوو. یادداشتی یەکەم سەردانی خۆم بۆ بەغدا لەدوای پانزە ساڵ دابڕان و دوو جەنگی گەورە، بەمجۆرە تۆمار کردبوو:" هەرکە پێم نایە ناو بەغدا کەوتمە ژێر کاریگەری ئاهەنگ و ریتمی سەرسوڕهێنەری ژیانی شارەکە و بە هەستی ئازادییەوە کە لە دوو سەردانی پێشوومدا بۆ ئەو شارە هیچ هەستم پێنەکردبوو سەرخۆش ببووم. کاتێك کە دەمویست ئەو هەستەی خۆم بۆ ئەو کەسانە بگێڕمەوە کە زیاتر هەواڵی هێرشی خوێناوی و تیرۆری مەرگهێنەریان لە عێراق و بەغداوە پێدەگەیشت و دەیانزانی کە شارەکە زۆر گەرمە و خەڵکەکەیشی بیبەش لە خزمەتگوزاری ژیانی خۆیان دەگوزەرێنن و شارەکە هیچ شتێکی نییە کە مرۆڤ ئیرەیی پێیبات، بە سەرسوڕماوییەوە تەماشای منیان دەکرد. بەڵام خۆشحاڵی من زیاتر لەبەر ئەو ئازادییە بوو کە لە شارەکەدا هەبوو. ئەوەش هێزی ئازادییەك بوو کە گەرمای ٥٠ پلەیی سێبەرەکانیشی بێ کاریگەر دەهێشتەوە.

ئەو شارەی کە تێیدا ژیانم پارێزراو نەبوو و لەدوای کاتژمێر ١١ی شەوەوە هاتوچۆی تێدا قەدەغە دەکرا،

بۆ من لەو بەغدا'یەی کە لەساڵی ١٩٧٨دا بە بانگهێشتی رەسمی دەوڵەت سەردانیم کردبوو، هەروەها لەو بەغدا'یەی کە لە ساڵی ١٩٨٨دا لەگەڵ وەفدی سەرۆك وەزیری تورکیا سەردانیم کردبوو، ئازادتر بوو. تەنها هەستکردنم بەوەی کە پۆلیسی نهێنی دەوڵەت لە هیچ شوێنێکی شارەکەوە بەدوامەوە نییە بۆ من بەس بوو. خاڵێکی دیکە کە جۆش و خرۆشی لە مندا دروستدەکرد ئەوەبوو کە هێشتا ژیان لە بەغدا بەردەوام بوو. پۆستەخانەی ناوەندی کە بۆردومانی ئەمریکا خاپووری کردبوو، هەروەها دەوروبەری جادەی رەشید و مەیدانی تەحریر و ئەو شوێنانەی دەروبەری کە کاری تێدا دەکرا، پڕبوون لە خەڵك و جمەیان دەهات. بە بەردەوامی باریان لە کامیۆنەکان دادەگرت و ئەوەش سەرنجی راکێشام. دواتر زانیم کە زیاتر کەلوپەلی ناوماڵ و سەحنی سەتەلایتن. بەوجۆرەش توانای گیانگرتن و جوڵەی ئابووریم بە چاوەکانی خۆم بینی..."

چەند رۆژ دوای نوسینی ئەم یادداشتە، لە رۆژنامەی گاردیانی بەریتانی'دا تێبینیەکانی ماریۆ ڤارگاس لیۆسا نوسەری پیرۆیی'م لەبارەی بەغدا خوێندەوە. دەقی ئەسڵی نوسینەکە بە زمانی ئیسپانیایی لە رۆژنامەی ئەلپاس بڵاوکرابووەوە. ماریۆ ڤارگاس لیۆسا دە ساڵ بەر لەوەی کە خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیات وەربگرێت، لە ٢٠١٠دا سەرنجی منی راکێشابوو. لە رۆژی ١١ی ئەیلولی٢٠٠١دا هەر لە رۆژنامەی ئەلپاس دا نوسینێکی لەبارەی نیۆیۆرك بڵاوکردەوە، دوای خوێندنەوەی ئەو بابەتە، منیش لە ٢٠٠١/١٢/١٥دا بابەتێکی هاوشێوەم لە رۆژنامەی یەنی شەفەق'دا بڵاوکردەوە ودوای ئەوەش تێگەیشتم کە لەگەڵ ماریۆ ڤارگاس لەسەر یەك رەوت دەڕۆین.

"لەم شارە نێونەتەوەییەدا کە لە شاری فریشتەکان دەچێت، ئەگەر دەنکە لم و زیخێکی بچووك بیت، وەك ئەوەی کە جۆلیۆ کۆرتازێر بۆ پاریس نوسیویەتی (کەسێکی نەناسراو بیت لە شارێکدا کە هەموو شتێکی هەیە زۆر باشترە لەوەی کە کەسێکی بە ناوبانگ بیت لە شارێکدا کە هیچ شتێکی نییە.) شتێکە کە هەم مایەی خەمناکییە هەم جۆش و خرۆشێکیشی تێدایە."

جوانتر لەو دەستەواژە و رستانەی سەرەوە، گوزراشت لەو هەستانە ناکرێت کە نیۆیۆرك لە مرۆڤدا دەیانوروژێنێت. لە٥ی ئەیلولی ٢٠٠٥دا، کاتێك بە وردی تێبینیەکانی ئەو نوسەرەم سەبارەت بە بەغدا لە رۆژنامەی گاردیان خوێندەوە، لەدوای بابەتەکەی لەسەر نیۆیۆرك دیسان ئەوەی بیرهێناوەمەتەوە کە هەردووکمان لەیەك رەوتدا بەرەو پێش دەڕۆین:" عێراق وڵاتێکی جیهانە کە ئازادییەکی زۆری تێدایە، بەڵام کاتێك کە یاسا و سیستەم نەبێت ئازادی دەبێتە قەیران و لەبەر ئەوەش عێراق مەترسیدارترین وڵاتی دونیایە. گومرگی لێ نیە. پۆل برێمەر حاکمی حکومەتی کاتی هاوپەیمانەکان لە عێراق هەتا ٢٠٠٣/١٢/٣١ گومرگ و رسوماتی لەسەر هەموو ئەوشتانە هەڵگرتبوو کە هاوردەی عێراق دەکران. لە ئەنجامی ئەوەشدا لە عێراق جگە لە چەك، هەموو بەرهەم و کاڵایەك بە ئاسانی و بە بێئەوەی کە باجی هەبێت دەستدەکەوت... لەبەر

ئەمەش لە دوو شەقامی گەورەی کەرادەی ناوەوە و کەرادەی دەرەوە کە وەکو دووانەیەك ڕێگایەکی پێچاوپێچیان لە ناو بەغدا دروستکردووە، شتی جۆراوجۆری وەکو بەرهەمە پیشەسازییەکان و جلوبەرگ و شتومەکی جۆراوجۆر دەستدەکەوت. ئەو دوکانە بێشومارانەی کە لەوێ هەن، هێنراونەتە ناو کۆڵانەکاڵان و سەر قادرمەکانیش وەك بازاڕێکی گەورەیان لێهاتووە کە تێیدا سی دی ڤیدیۆیی کە بە نایاسایی کۆپی کراون دەفرۆشرێن. بەڵام بەغدایییەکان زیاتر شتێك دەکڕن کە ئەویش پێشتر زۆر مومکین نەبوو، ئەویش سەحنی سەتەلایت بوو کە بەوە دەیانتوانی پەخشی تەلەفزیۆنی هەر گۆشەیەکی دونیا سەیربکەن..."

تێبینیەکانی من سەبارەت بە ناوەندی شاری بەغدا، وەك ئەو تێبینیانە بوون کە ماریۆ ڤارگاس سەبارەت بە گەڕەکی کەڕادەی ئەو شارە باسی کردبوون. لایەنی سەرنجڕاکێشی پرسەکەش ئەوەبوو کە لە تەمووزی ٢٠٠٣دا لە هۆتێلی بورجلحەیات'ی کەرادە دەمامەوە. لەو قۆناغی گوزەرەدا پارتەکەی(پارتی دیموکراتی کوردستان'ی) مەسعود بارزانی هۆتێلەکانی بورجلحەیات و سیندباد'ی وەك بڕیارگەی خۆی لە پایتەختی عێراق بەکاردەهێنا. هۆشیار زێباری کە ماوەیەك دواتر دەبووە وەزیری دەرەوەی عێراق و ساڵانێك وەکو نوێنەری پلە یەکی عێراق لە دنیای دەرەوە ناوبانگی دەردەکرد، لە سیندباد دەژیا.

کەرادە یەکێك لەو شوێنانەی بەغدا بوو کە تێیدا ترافیك و هاتوچۆی ئۆتۆمبیل وەك عەزابی جەهەنەمی لێدەهات، بەڵام من لە بارێکی دەروونیدا بووم کە لە یادداشتەکەمدا لەو ترافیکە خراپەی بەغدا'ش ئەنجامی پۆزەتیڤم دەرخستبوو:

"ترافیك بە واتای وشە ئەشکەنجە بوو. بەڵام ئایا ئەمە ئەشکەنجەیەکی سەختتر لە ئەشکەنجەی تاران و قاهیرە و تەنانەت ئیستانبوڵی ساڵەکانی ١٩٨٠کان بوو؟ دوای شۆڕش لە تاران چاوم بەوە کەوت کە پۆلیسی هاتوچۆ ڕۆژی دوای شۆڕش هاتۆتە سەر کارەکەی خۆی و خەڵکیش لەدوای روخاندنی یەکێك لە سەرکوتکارترین رژێمەکانی دنیا ملکەچی پۆلیسەکانی هاتوچۆ دەبن. ئەو کاتانە لە ئێران چەند ناوەندی هێز هەبوون کە بە توندی لە تێکۆشان و ململانێی بەدەستهێنانی دەسەڵاتدا بوون. هێشتا دیارنەبوو کە دەسەڵات دەست کێ دەکەوێت و روونیش نەبوو کە ئایا ئەو پۆلیسانەی هاتوچۆ دەتوانن موچە وەربگرن یان نا. ئەوەم بیردێتەوە کە لای خۆم وتم ئەو هەستکردن بە بەرپرسیاری و دیسپلینە و هەروەها ئەو ملکەچ بوونەی خەڵکی ئێران کە لە دژی ستەمکاری ڕاپەڕیوە، نیشانەی هەبوونی کەلتورێکی زیندووی دەوڵەتێکی گەورەیە. لەدوای جەنگی ٢٠٠٣، لە پاش روخانی رژێمی بەعسی سەدام حسێن، شتی وا لە بەغدا لەئارادا نەبوو. دەسەڵاتی گشتی نەمابوو، ترافیك لەو گەرما دۆزەخیەدا وەکو ئەشکەنجە بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لایەنەی کەسایەتیم کە پێیوابوو دەبێ شۆڕشگێر لە هەموو هەلومەرجەکاندا گەشبین بێت کەوتە جوڵە و هۆگری و خۆشەویستیم بەرامبەر بە خەڵکی بەغدا زۆر زیاد بوو، چونکە لەو ترافیکەدا کە هەندێك

جار نیو سەعات خەڵك بەدوای یەكدا دەمانەوە كەس مشتومڕی نەدەكرد و هیچ كەسێك ئیدیعای ئەوەی نەدەكرد كە مافی بەسەر ئەوەی دیكەوە هەیە. كەسێكی ئاسایی دەهات و بەجۆرێك لە جۆرەكان كێشەی ترافیكەكەی چارەسەر دەكرد و دواتر كەسێكی دیكە ئەو كارەی دەكرد و خەڵكی بە سەبرەوە چاوەڕوانییان دەكرد و بەوجۆرەش كێشەی ترافیك چارەسەر دەكرا."

جێگەی سەرنجە كە ماریۆ ڤارگاس لیۆساش باسی دیمەنەكانی ترافیكی بەغدای دوای بەعسی كردووە و تێبینیەكانیشی لەگەڵ ئەوانەی مندا یەكیان دەگرتەوە:" لێخوڕینی ئۆتۆمبیل لە بەغدادێكدا كە لە هیچ گۆشەیەكیدا پۆلیسی هاتوچۆی لێ نیە و خزمەتگوزارییە گشتیەكان راگیراون، وەك عەزابی دۆزەخ وایە ... هەر شۆفێرێك بۆ هەر جێگایەك كە دەیویست دەڕۆیشت وە لەبەر ئەوەش پێكدادانی ئۆتۆمبیل زۆربوو. كێشەكانی ترافیك و راوەستان لە ترافیكدا مرۆڤیان شێت دەكرد، بەڵام هیچ نەبێت هەندێك شتی ئاسایی كۆمەڵگەی مەدەنیم بینی كە لەلایەن دەسەڵاتەوە فەرز نەكرابوون و خودی كۆمەڵگەی مەدەنی كە هایك بە دەزگا لە خوت و خۆڕاییەكان كان ناوی بردوون ئەوانەیان پێشدەخست. هەركاتێك كە ترافیك گیری دەخوارد و رادەوەستا، كەسانێكی خۆبەخش بە فیكە و بە گۆچانێكەوە دەهاتنە نێو مەیدانەكە و هەوڵی رێكخستنی ترافیكەكەیان دەدا و بەوجۆرەش كێشەكەیان چارەسەر دەكرد و خەڵكەكەش بەهۆی ئەوەی كە كەسێك فەرمانی پێداون تا ئەو كێشەیە چارەسەر بێت ئاسوودە بوون و گوێڕایەڵییان لە فەرمانەكانی ئەوانە دەكرد."

شوێنی نانخواردن و رێستۆرانتەكانیش وەك پێوەرێك بۆ بەردەوامبوونی ژیان و هەبوونی جوڵەی شارێك بەكاردەبرا و منیش ئەوەم وەكو پێوەرێك بەكاردەهێنا بۆ هەڵسەنگاندنی بەغدا و بەمجۆرە تێبینیەكانی خۆم لەوبارەیەوە نووسی:

"بەو هۆیەوە كە لای من رێستۆرانتەكان ئاماژەیەكی هەبوونی جوڵە و هێزی نێو شارێكن، زۆر خۆشحاڵ بووم كە بەغدام وەك شارێكی پڕ جووڵە و لەسەرخۆ بینی. هەروەها خۆشحاڵ بووم لەوەی كە بەغدا سەلامەتە بەڵام زۆر نیگەران بووم لەوەی كە بەهۆی دوو جەنگی ١٩٩١ و ٢٠٠٣ و بەهۆی ئەو دەیان تەن بۆمبەی كە فڕۆكە جەنگیەكانی ئەمریكا لەسەر ئەو شارە خستبویانە خوارەوە، هەروەها بەهۆی ئەو دوكەڵ و ئاگرەی كە شارەكەی گرتبووەوە، بەغدا وەكو بەرلینی دوای جەنگی جیهانی دووەم یاخود وەكو شاری دریسدن دیار بێت. هەڵبەت ئاسەوارەكانی جەنگ هەبوون، بەڵام لەوە كەمتربوون كە من پێشبینیم دەكرد. ناوەندەكانی حزبی بەعس و موخابەرات (دەزگای هەواڵگری) خاپوركرابوون. هەردوو لای روباری دیجلە زۆر تێك نەچووبوون، بەڵام وەك ددانێكی رزیوی شاریان لێهاتبوو كە سووتاوییەكەیان وەك خراپبوونی ددانەكان بەرچاو دەكەوت. دواتر زانیم كە ئەوە پەیوەندی بە بۆردومانی ئەمریكاییەكانەوە نییە، بەڵكو

پەیوەندی بەو تاڵان و فەرهودە هەبووە کە لەدوای روخانی رژێم دەستیپێکردووە. تاڵان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بوو. خودی بەغدادییەکان شاری بەغدایان تاڵان کردبوو. ئەمریکاییەکانیش کە نەیاندەزانی ئایا سوپایەکی داگیرکەرن یان سوپایەکی رزگارکەر، کاریان بەوە نەبوو کە بەغدادییەکان چۆن هەندێك لە بیناکانی شارەکەی خۆیان دەسوتێنن و تاڵانیان دەکەن.

لە نیسانی ٢٠٠٣دا کاتێك کە دوای ١٣ ساڵ پێم نایە خاکی بەغدا، تاڵانکاری کۆتاییپێهاتبوو. سەرەڕای ئەوەی کە بەغدا هەموو کاتێك بۆ من راکێشەر بووە و لەگەڵ ئەوەی کە روباری دیجلە وەکو مارێك بەنێو ئەو شارەدا پێچی خواردۆتەوە و جوانییەکی پێبەخشیوە، هۆکاری پێویستم نەبوو بۆ ئەوەی کە بەغدا بە شارێکی جوان ببینم. بە پێچەوانەوە بەغدا زیاتر لەهەرکاتێکی دیکە ناشیرین و سیساوتر بوو. هەڵبەت لە چاوی مندا شتێکی راکێشەری تێدا بوو. هەرجارێک کە دەڕۆیشتم بۆ ئەوێ خۆشحاڵ دەبووم، بەڵام ئەو خۆشیەی کە لە تەمووزی ٢٠٠٣دا هەمبوو، شتێکی جیاواز و نائاسایی بوو.

بە گوێرەی فوئاد عەجمی، پرۆفیسۆر، بیرمەند و نوسەری ئەمریکایی کە بە رەچەڵەك لوبنانی بوو، خۆشحاڵ بوون بە مانەوە لە بەغدا تەنها بە شتێکی وەکو ئازاییەکی گێلانە رووندەکرایەوە. فوئاد عەجمی بیلبیلەی چاوی نیوپارێزگارەکانی ئەمریکا بوو. راوێژکاریی بۆ دیك چێنی کردبوو کە سەبارەت بە عێراق توندڕەوترین جێگری سەرۆکی ئەو وڵاتە بوو. فوئاد عەجمی بە رەچەڵەك شیعەیە و چەند جارێك سەردانی عێراقی کردووە و وەك میوانی ئەحمەد چەلەبی لەوێ ماوەتەوە. دەرگاکانی ئایەتوڵا سیستانیش لە نەجەف بە رووی ئەودا کراوە بوون. لەدوای سەردانەکانی بۆ عێراق و بەغدا، کتێبێکی بەناوی "خەڵاتی بێگانە - ئەمریکاییەکان لە عێراق، عەرەبەکان و عێراقیەکان" بڵاوکردەوە کە بە یەکێك لە باشترین بەرهەمەکانی تایبەت بە عێراق لەدوای جەنگی ٢٠٠٣ لەقەڵەم دەدرێت.

ناوی فوئاد عەجمی لە ساڵی ١٩٩١ لەکاتی جەنگی عێراق دەرکەوتە پێش. لەو رۆژانە بە دواوە لایەنگرانی ئیسرائیل لە ئەمریکا و زایۆنیستەکانی ئەمریکا سەرسامی ئەو پیاوە بوون. عەجمی بوو بە یەکێك لەو کەسانەی کە دەستە بژێری سیاسی ئەمریکا سەبارەت بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست پرس و جۆیان پێ دەکردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رق و کینەی جەماوەرێکی زۆری لە دژی خۆیورووژاند کە زۆربەیان عەرەب بوون. لە سەرەتاکانی ١٩٩٠ەکانەوە فوئاد عەجمیم لە نزیکەوە دەناسی، زۆر ژیرە و دەسی نوسینی نائاساییە و کەسایەتیەکی ئاڵۆزی هەیە کە زۆر زەحمەتە لێی تێبگەیت.

کاتێك کە جەنگی ئەمریکا شیعەکانی عیراقی هێنایە سەر دەسەڵات، هەستی شیعەبوونی فوئاد عەجمی کە لە لوبنان سەرکوتکرابوو، دەرکەوتە پێشەوە. لە کتێبی "خەڵاتی بێگانە"دا کە تایبەتە بە عیراقی دوای ٢٠٠٣، لە رێی قەلەمە بەهێزەکەی خۆیەوە لە روانگەیەکی مێژووییەوە باس لە رووداوەکانی عێراق دەکات

و جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەمریکا عێراق'ی لەدەستی سەدام رزگار کردووە و وەکو خەڵات پێشکەشی شیعەکانی کردووە. فوئاد هەر لە پێشەکی کتێبەکەیدا پەسنی کتێبی "عێراق'ی ئەمریکا"ی حەسەن عەلەوی دەدات کە خۆی بە رۆشنبیر و دیپلۆماتێکی بەڕێزی عێراق'ی ناوی دەبات و جەخت لەسەر بیرۆکەی سەرەکی خەڵاتی بێگانە دەکاتەوە:

" هەروەك چۆن دەکرێت باس لە عێراقێکی سۆمەری، بابلی، عەباسی، عوسمانی یاخود باس لە عێراقێك بکرێت کە ئینگلیزەکان لە پشتیەوە بوون، دەکرێت باس لە عێراقی ئەمریکا'ش بکرێت. بەگوێرەی ئەو قۆناغی ئەمریکاییەکان زۆر کورت دەخایەنێت بەڵام کاریگەری زۆر گەورە بەجێدەهێڵێت. عێراق'ی ئینگلیزەکان سوننە بوو بەڵام عێراقی ئەمریکا شیعە دەبێت. لەکاتی دەسەڵاتداری ئینگلیزەکان'دا سوننەکان زیرەك بوون و توانیبوویان درك بە لۆژیکی هێز و شکست بکەن، بەوهۆیەشەوە نیشتمان و دەسەڵاتێکی پادشایی سیاسی و باڵیوزخانە و پێگەی رەسمییان پێدرا، لەبەرامبەر ئەمەشدا شیعەکان ئەفسانەی بەرگری لە دژی دەسەڵاتی ئینگلیزەکانیان دروستکرد و بەوجۆرەش عەرەبەکانی زەلکاو بە خۆیان و تفەنگە رزیوەکانیانەوە بە تەنها مانەوە.

عەلەوی باس لەوەدەکات کە ئەگەر عێراق هێزی ئەمریکا قبوڵ بکات و واز لە راپەڕین و توندوتیژی بهێنێت، لەوانەیە عاقیبەتی خێر بێت. هەروەها باس لەوەش دەکات کە شیعەکان لە سەردەمی ئەمریکا بەو ئەندازەیەی کە سوننەکان ملکەچی ئیرادەی ئینگلیزەکان بوون، ملکەچ نەبوون و بەشێوەیەکی فێڵبازانە نەجوڵاونەتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرەتا دەستپێکردووە و سیستەمی کۆن بە جۆرێك رووخاوە کە جارێکی دیکە بونیاد نەنرێتەوە."

لە ساڵی ٢٠٠٥دا لە ریستۆرانتێکی نیۆیۆرك کتێبەکەی بە من دا و باسی ناوەڕۆکەکەی کرد و وتی:" شیعەکان دوای ئەوەی کە سەدان ساڵ لە دنیای عەرەبی سوننەدا سەرکوت کران، خەریکە وردە وردە دێنە ناو مێژووی مۆدێرن." دوابەدوای ئەوەش تێبینییەکانی خۆی لەسەر بەغدا بۆ من باسکرد. رۆژەکانی ساڵانی ٢٠٠٦-٢٠٠٩ کە لە بەغدا شیعە و سوننەکان یەکتریان سەردەبڕی و لەو شوێنانەی کە پێکەوە دەژیان یەکتریان دەردەکرد، هێشتا نەگەیشتبوون.

فوئاد عەجمی هیچ کات وازی لە دۆستایەتی ئەحمەد چەلەبی نەهێنا و لە مانگی شوباتی ٢٠١٢دا لە ئیستانبوڵ، لە ماڵی کچەکەی ئەحمەد چەلەبی (تامارا چەلەبی) لە ئێوارەخوانێکدا پێکەوە یادی بەغدامان کردەوە و ئەویش بە گوزراشتێکی تایبەت بەخۆی کە بە ئەقڵی کەسدا نەهات وتی:" لەم ساڵانەی دواییدا هۆکاری مانەوەی کەسانی وەك ئێمە لە بەغدا تەنها یەك شتە، باش بیربکەرەوە: چاونەترسی و ئازایی و چێژی مانەوە لە شوێنێکدا کە هەر کەس بە ئاسانی ناوێرێت لەوێ بمێنێتەوە. ئەمە قارەمانی نیە تەنها

ڕوونکردنەوەیەکی هەیە، ئازاییەکی گێلانەیە."

بە ڕاستی وابوو؟ بۆ ساتێك وتم لەوانەیە ڕاست بکات. ئەو ڕونکردنەوەیە پێشتر بە مێشکی من دا نەهاتبوو. بۆ ماوەیەکی زۆر لە گەڕەکە جیاوازەکانی بەغدا ماومەتەوە و شەوانم لەوێ تێپەڕ کردووە... بۆ نمونە لە گەڕەکی مەسبەح ماومەتەوە کە زۆربەی دانیشتوانەکەی شیعە بوون و ماڵی دکتۆر موزەفەر ئارسلان یش لەوێ بوو. ئەو گەڕەکە لە ڕووی خۆرهەڵاتی ڕوباری دیجلە'دا بوو. لەبەرامبەر ئەو گەڕەکەشدا لە گەڕەکی وەزیریە ماومەتەوە کە شوێنی نیشتەجێبوونی سوننەکان بوو و میوانخانەی باڵیۆزخانەی تورکیا'ش لەوێ بوو. هەروەها لە ڕووی خۆرئاوای ڕووباری دیجلە لە قادسیە ماومەتەوە کە سەردەمێك شوێنی نیشتەجێ بوونی بەرپرسانی بەعس بووە. هەر لە بەشی خۆرئاوا'دا ئەو کاتەی لەگەڵ تایب ئەردۆغان'دا لە ساڵی ٢٠١٢ سەردانی عێراق'مان کرد، لە میوانخانەی دەوڵەت لە ناوچەی سەوز و لە ڕووی خۆرهەڵات'ەوە لە کەناری ڕووبارەکەدا لە جادریە ماومەتەوە. هەروەها لە کەرادە کە بە زۆری مەسیحییەکان لەوێ دەژین ماومەتەوە، جارێك لەوێ ڕۆکێتێك بەر نهۆمی سەرەوەی ئەو ژوورە کەوت کە تێیدا دەمامەوە... بۆ ماوەیەکی یەکسان لەهەردوو بەری ڕووباری دیجلە ماومەتەوە. لەگەڵ ئەوەی کە هیچ کاتێك ئەوەم بە ئەقڵدا نەهاتووە کە مانەوەم لە شارێك کە مەترسی زۆری لەسەر ژیانی مرۆڤ تێدایە بە قارەمانی لەقەڵەم بدرێت، هیچ کاتێکیش بیرم لەوە نەکردەوە کە ئەمە ئازاییەکی گێلانە بێت. لەدوای ساڵی ٢٠٠٦ەوە پێکهاتەی مرۆیی بەغدا ڕووی لە گۆڕان کردبوو. ئەنتۆنی شادید لە نوسینەکەی خۆیدا بە ناوی "شاری چیمەنتۆ" لە ١٢ی تەمووزی ٢٠٠٩دا سەرەداوەکانی ئەوە باس دەکات و وتەی هاوڵاتییەکی شاری بەغدا دەهێنێتەوە کە وتویەتی:"بەغدا بۆ من وەك و دێوەزمەیەك وایە" و دوای ئەوە دەڵێت:"لەو گفتوگۆ پڕ لە نائومێدییانەی لە بەغدا و قاهیرە و بەیروت'دا سەبارەت بە دنیای عەرەبی دەکرێن، ئەو هەستەی کە زیاتر لە هەموو شتێك دەردەکەوێتە پێش نۆستالژییە. ئەمەش ئاماژە بەوە دەکات کە تا ئەندازەیەك سینگ فراوانی و شێوازی ژیانێکی ئازاد و تێکەڵاوبوون لە کەلتورێکی متمانەپێکراودا لە ناوچووە..." بەڵام لەوانەیە هۆکاری زۆر لەبەردەستدا نەبن تا لە مێژووی نزیکی شارە گەورەکانی وەکو قاهیرە و بەیروت و بەغدا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'دا گوێت لە نۆستالژی بێت.

ئەنتۆنی شادید لەو هەستی نۆستالژیە دەکۆڵێتەوە و لە" شاری چیمەنتۆ"دا بەمجۆرە بەردەوام دەبێت:" نوسەری کتێبی سەلانیك شاری دێوەزمەکان، پرسیاری کردووە کە چۆن دەتوانین چیرۆکی خۆمان سەبارەت بە دنیایەك کە زۆر نۆستالژیك نایەتە پێش چاو و لە زۆر ڕووەوە نامانەوێت بگەڕێتەوە، باس بکەین. خاڵی چەقبەست لێرەدایە. بۆ کەسێکی وەك مازۆڤەر، نۆستالژی شتێك نەبوو کە تەنها هی عەرەبەکان بێت و ئاماژەی بەوە دەکرد کە ئەوە چەمکێکی جیهانیە کە چەندەی ئاماژە بە لەکیس چوون و لەدەستدان

دەدات، ئەوەندەش ئاماژە بە سەرنەکەوتوویی دەدات. ئەو دەڵێت هەموو کەس دەزانێت کە دامەزراندنی رژێمێکی دەوڵەت-نەتەوە کە سەقامگیر و سینگ فراوان بێت کارێکی ئاسان نیە.

نۆستالژی ئاوێنەی ئەو قەیرانەیە کە ئەمڕۆ تێیدا دەژین. لەدوای جەنگ لە عێراق'دا نە سەقامگیری هەیە و نە سینگ فراوانی، بەڵام مەیسون ئەلدەمەلۆجی لە پێوەرێکی گەورەدا بەرپرسیاری ئەمە ناخاتە ئەستۆی ئەمریکاییەکان کە بە ئەندازەیەکی زۆر هێزەکانیان لە پایتەخت کشاندۆتەوە، ئەو دەڵێت:هەموو کاتێك سوپا سوپایە، سوپاش واتای ئەو پیاوە گەنجانە دەدات کە چەکیان بەدەستەوەیە، مەیسون ئەلدەمەلۆجی کە هەم ئەندازیارە و هەم پەرلەمانتاریشە، سەر بە بنەماڵەیەکی بەناوبانگە و باس لەوە دەکات کە ناتوانی چاوەڕوانی نەرمی نواندنی سوپا لەبەرامبەر شارێك بکەیت. ناتوانی چاوەڕوانی ئەوە بکەیت کە سوپا لەبەرامبەر نیاز و پێداویستیەکانی خەڵکدا هەستناك بێت.

خۆی لە راستیدا بەر لە هاتنی ئەمریکاییەکان بەغدا خراپ ببوو. وەکو شارێکی لێهاتبوو کە تێیدا دیلەکان لە دواوەی پیکابەوە سوار دەکران و دەگەڕێنران بۆ ئەوەی سوکایەتیان پێبکرێت. ئەم شارە قۆناغی جەنگێکی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێران تێپەڕ کردبوو. بەهۆی جەنگی ساڵی ١٩٩١ کە لەبەر داگیرکردنی کوەیت لەلایەن عێراق'ەوە بەرپا بوو، چینی ناوەڕاستی بەغدا لەناوچوو و لەژێر کاریگەری ئەو گەمارۆیانەی کە خرابوونە سەر عێراق، چینی ناوەراستی بەغدا لەناوچوو. دەمەلۆجی باسی لەوەشکرد کە جیلی وا هەیە جگە لە جەنگ و مەیدان خوێندن بۆ یەکتری هیچی دیکە نازانێت و تۆ دەتوانیت بە ئاسانی ئەمە لەچاوی مرۆڤەکانەوە ببینیت. دەمەلۆجی باسی لەوەشکرد کە بەغدادیەکان رۆیشتون و کاتێك ئەو قسەیەی هێنایە سەرزمان مەبەستی ئەوە بوو کە سینگ فراوانی لە بەغدا نەماوە. پیاوانی توندڕەو لەگەڵ ئەو کۆچەرانەی کە لە کەنارەکانەوە هاتوون، شوێنی بەغدادییەکانیان گرتۆتەوە. لە سەردەمی لاوێتی دەمەلۆجی دا کاتێك کە سەرۆك خێڵێك سەردانی بەغدای دەکرد، عەگاڵەکەی سەری لادەبرد و چونکە شەرمی دەکرد وەکو بەغدادییەك رەفتاری دەکرد. بەڵام ئێستا ئەوانەی کە لە بەغدا دەژین وەکو گەورەی ئەو خێلانە دەژین کە لەکەنار و ناوچە پەراوێزییەکاندا دەژین. گۆرانیبێژی بەناوبانگی عێراق، کازم ئەلساهیر گۆرانیەکی بەناوبانگی لەبارەی عێراق هەیە. گۆرانیەکەش بەوجۆرەیە:تۆ بڵێی خودا لە جیهاندا شارێکی دیکەی بە جوانی تۆ دروست کردبێت؟ دواتر دەنگی خۆی زۆر بەرز دەکاتەوە و بەشێوەیەکی خەمناك هاواردەکات بەغدا! بەغدا!

بەراستی هیچ کاتێك بەغدا جوان بووە؟ دەمەلۆجی راوەستا و وتی: نا. پێموانیە بەغدا هیچ کاتێك شارێکی جوان بووبێت، بەڵام شارێکی پڕ جووڵە و مەدەنی بووە'

کاتێك ئەو دێڕانەم خوێندەوە هەستمکرد کە تێبینی و هەستەکانم سەبارەت بە بەغدا پشتڕاستکراونەتەوە.

منیش هیچ کاتێك بەغدام وەکو شارێکی جوان نەبینیبوو. مادام کە لەم شارەدا نۆستالژییەکیش نەبوو بۆ من، چی هەبوو کە منی ڕادەکێشا؟ لە یادداشتەکانمدا لە تەمووزی ٢٠٠٣، سەرەداوەکانی ئەو شتانە هەن کە منیان بەرەو بەغدا ڕادەکێشا:

"لە تەمووزی ٢٠٠٣دا لە بەغدا، من تەنها هەستی خۆشی و ئازادیم نەبوو بەڵکو خۆشی ژیانیشم هەبوو. ئەمەش خۆی لەخۆیدا شتێکی تەنزئامێز بوو. چونکە ئەو هەڕەشانەی کوشتن کە لە ساڵی ١٩٩٠ بەدواوە کەسانی نزیك لە خۆم و بنەماڵەکەمیان نیگەران دەکرد ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەو ڕژێمەوە هەبوو کە لەو شارەدا باڵا دەست بوو. ئیدی ڕژێمە خوێنەخوارەکەی من ڕووخابوو. دەروازەکانی بەغدا هەتا کۆتایی بە رووی مندا کرابوونەوە.... هەستی بردنەوەی شەڕی خوێن و توانای ڕۆیشتن بۆ شارێکی قەدەغەکراو لەهەر کاتێکدا کە بمەوێت، دەیتوانی بۆ ماوەیەك لەپێش چاوی من دا شاری بەغدا سەرنجڕاکێش بکات، بەڵام لە شارێکی وەکو بەغدا کە هەرچی دەچوو دیوارە چیمەنتۆکانی زیاتر بەرز دەبوونەوە و سینگ فراوانی و پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان ڕۆژبەڕۆژ پیس و چەپەڵتر دەبوون، چ شتێکی دیکە هەبوو کە دەیتوانی من بەلای خۆیدا بەرێت؟ وادیارە دەتوانم تەنها بە دوو وشە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە: جەلال تاڵەبانی.

ئەو کوردانەی کە لە دیدی مندا درێژکراوە و قوڵاییەکی ستراتیژی و سروشتی بوون بۆ تورکیا و یەکگرتنیان لەگەڵ تورکیا تا ئەندازەیەك بووە بە ئامانجێکی ژیانی من، لە کەسایەتی جەلال تاڵەبانی'دا گەیشتبوونە بەغدا. جەلال تاڵەبانی دۆست و هاوڕێی کۆنم کە لە ڕێگەی ئەوەوە هەوڵمدا بوو بەستەڵەکی نێوان کۆماری تورکیا و کوردەکان بتوێنمەوە، ببوو بە سەرکۆماری عێراق.

جەلال تاڵەبانی لە بەغدا بوو.

**ئێمە مێژووساز نین بەڵکو مێژوو ئێمە دروست دەکات.**

**مارتین لۆتەر کینگ**

جەلال تاڵەبانی هیچ کات لە ناوچەی سەوز نەمابوو کە کۆشکەکەی سەدام لەوێ بوو. ڕێورەسمە گەورەکان لە ناوچەی سەوز دەکران و بەڕێوەبردنی داگیرکاری ئەمریکاش بارەگای ناوەندی خۆی لەوێ دانابوو. ناوچەی سەوز لە خۆرئاوای ڕووباری دیجلە'وە بە ڕووی خەڵکدا داخرابوو، بەو هۆیەشەوە وەك ناوچەیەکی قەدەغەکراوی لێهاتبوو.

تاڵەبانی دەیگوت:" من سەرۆکی جەماوەرم چ ئیشم لە ناوچەی سەوز هەیە؟" و بە گاڵتەوە هۆکارێکی ئایدۆلۆژی دەخستەڕوو سەبارەت بەوەی کە بۆچی شوێنی مانەوەی خۆی لە خۆرهەڵات'ی ڕووباری دیجلە واتا لە جادریە دانابوو.

ریشەی ناوی جادریە دەگەڕێتەوە بۆ کاتی عوسمانلیەکان و بەو شوێنە وتراوە کە ئۆردوگای سەربازی لەوێ دانراوە. جادریە واتای چادرکەنت یان شاری چادر، چادرگە دەدات.

تاڵەبانی ڤێلاکەی بەرزان ئەلتکریتی یەکێك لە براکانی سەدام حسێنی بۆ شوێنی مانەوەی خۆی هەڵبژاردبوو. بەرزان دەزگا هەواڵگریەکانی ڕژێمی بەعسی بەڕێوەبرد بوو. تەنها بەکارهێنانی ناوەکەیشی بەس بوو بۆ ئەوەی کە لە عێراق'دا لەنێو خەڵکدا ترس و دڵەڕاوکێ دروست بکرێت. کێ چووزانێت کە لە هۆڵی ماڵەکەی بەرزان ئەلتکریتی'دا چەند بڕیاری زاڵمانە وەرگیراوە، بەڵام لەمە بەدواوە ئیتر جەلال تاڵەبانی ئەو شوێنەی وەك هۆڵی قبوڵکردن و پێشوازیکردن لە میوانەکانی سەرکۆمار بەکاردەهێنێت. لەگەڵ جەلال تاڵەبانی سەرکۆمار و وەزیرە عێراقیەکان لەسەر سفرەی خوانی نیوەڕۆ هەستاین و دەربازی هۆڵەکەی تەنیشت ژووری خواردن بووین. واتا چووینە ئەو شوێنەی کە سەرکۆماری عێراق لەوێ میوانەکانی قبوڵ دەکرد. کاتێك ڕۆیشتینە ناو هۆڵەکە، تاڵەبانی ئاماژەی بە کورسی دەستە چەپم کرد و خۆیشی بەرەو لای کورسیەکەی تەنیشتم ڕۆیشت. دوودڵ بووم لەوەی کە لەسەر ئەو کورسیە دانیشم کە ئەو بۆ دانیشتنی من ئاماژەی پێکردبوو، چونکە ئاڵای عێراق ڕێك لەدوای ئەو کورسیەوە دانرابوو. ئەو کورسییە کورسی سەرکۆمار بوو! کە بینی من ڕاوەستاوم، وتی:" دانیشە، دانیشە." و پێداگری کرد لەوەی کە من لەوێ دانیشم و بۆ خۆیشی لەسەر کورسیەکەی تەنیشتم دانیشت و جگەرە چروتەکەی داگیرساند و دانەیەکیشی بۆ من درێژ کردەوە. چایان هێنا و لەسەر تەپڵەکەکەی نێوانمان دایاننا. وتم:" مام جەلال! ئەمە کورسی سەرکۆماری عێراق'ە، ڕێگەم پێبدە با من بێمە سەر کورسییەکەیتر و لەسەر کورسییەکەی تۆ دانەنیشم." بەشێوەیەکی کەمتەرخەمانە دەستی جوڵاند و وتی:" درێژەی پێ مەدە. ئاسودە بە. دانیشە بۆ خۆت. تازە دانیشتی،

ئەم چروتەش داگیرسێنە." و شقارتەکەی بۆ درێژ کردمەوە. ساڵێك بوو وازم لە جگەرە هێنابوو، بەڵام ئەو لە٢٠٠٣دا لە بەغدا منی فێری چروت کێشان کرد. هەرجارێک کە لە بەغدا میوانی ئەو دەبووم لەنێو جۆرە جیاوازەکانی چروتەکانیدا چروتی دەردەهێنا و دەیگوت" وەرە با چروتی دوای قاوەتیەکەمان بکێشین." پاشان دەستمان دەکرد بەو گفتوگۆیانەمان کە کۆتاییان پێ نەدەهات.

هەندێك چروتی هەبوو کە پێویست لە هەندێك کاتژمێری دیاریکراوی رۆژدا بکێشرێن. منیش بۆ ئەوەی بە دەسبەتاڵی نەچم بۆ لای، هەرجارێک کە دەچووم بۆ عێراق جگەرەی چروتم بۆ دەبرد. تەنانەت جارێکیش فیدل کاسترۆ چەندین کارتۆن جگەرەی چروتی بۆ تاڵەبانی ناردبوو کە من بۆم بردبوو.

یەکێك لە هاوپیشەکانمان کە لەگەڵ پاتریك بارتەلەمێئۆس قەشەی گەورەی ئەرمەنەکان سەردانی هاڤانای کردبوو. لەوێ بە فیدل کاسترۆی وتبوو کە دەتوانێت چروت بگەیەنێتە تاڵەبانی و لەسەر ئەو قسەیەش، فیدل کاسترۆ چەند کارتۆن چروتی دابوو بەو هاوڕێیەمان کە بیگەیەنێتە دەستی تاڵەبانی و ئەویش چروتەکانی دا بە ئێمە تا بیبەین بۆ تاڵەبانی.

کاتێك لەبەردەم ئاڵای عێراق و لەسەر کورسی سەرۆکایەتی کۆمار جگەرەی چروتم دەکێشا، وتم:" پێویستە ئەم کاتە هەمیشەیی بکەینەوە." و مۆبایلەکەم دەرهێنا و وێنەیەکم گرت و بۆ هاوسەرەکەم نارد کە نیگەران بوو لەوەی کە من لە بەغدام و نەیدەتوانی بە هیچ شێوەیەك پەیوەندیم پێوە بکات. لەژێر ئەوەش کورتەنامەیەکم بۆ نارد کە بەمجۆرە بوو:" لەسەر کورسی سەرکۆماری عێراق لە بەغدا دانیشتووم و ئەوەش کە لە تەنیشتمدایە سەرکۆماری عێراق'ە، وەکو دەیبینی باسی بابەتە هەستیارەکان دەکەین و سەرقاڵم..."

بەدەر لە جەلال تاڵەبانی هیچ کەسێکی دیکە ئەوەندە جوامێر و بەخشندە نەبوو کە لە یەکەم مانگی ٢٠٠٦دا کورسی سەرۆك کۆمارییەکەی خۆی پێشکەش بەمن بکات. لە کۆتایی شوباتی٢٠١١دا ماوەی پێنج رۆژ لە وەزیرییە لە شوێنی حەوانەوەی موراد ئۆزچەلیك باڵیۆزی تورکیا لە عێراق مابوومەوە کە لەو کاتەی بە ڕێوەبەری نوسینگەی تایبەتی تۆرگوت ئۆزال بوو، هاوڕێم بوو. هەر کە پێم نایە بەغدا، لە وەزیرییەوە دەربازی جادریە بووم بۆ ئەوەی بگەمە لای جەلال تاڵەبانی تاوەکو نانی نیوەڕۆ لای ئەو بخۆم. لەنێو جیپێکی زرێپۆشدا بووم و جیپێکی زرێپۆشی دیکەش لەگەڵمان بوو کە پڕبوو لە هێزی تایبەت، چونکە پێویستبوو لەنێو بەغدا بەوجۆرە هاتوچۆ بکەیت. بەوجۆرەش چوومە لای تاڵەبانی.

کاتێکی دیکە نەبوو بۆ ئەوەی کە بتوانم تاڵەبانی ببینم، چونکە رۆژی دواتر بەرەو کوەیت بە ڕێ دەکەوت. کاتێ گەیشتم، بینیم لەبەردەم شوێنی مانەوەی خۆیدا لەسەر کورسییەك دانیشتووە و چاوەڕوانی من دەکات. چووینە ئەو هۆڵی خواردنەی کە لەوێ میوانە رەسمییەکانی خۆی قبوڵ دەکرد. دواتر لەو

هۆڵی دانیشتنەی کە ئاڵای عێراق ی تێدابوو، پرسیارم کرد:"چی لە کوەیت هەیە؟" ئەویش لە وەڵامدا وتی:" بۆ پیرۆزبایی رۆژی سەربەخۆیی کوەیت دەچم." دواتر لە وەڵامی پرسیارێکی گەوجانەی مندا کە وتم:" سەربەخۆیی کوەیت لە کێ؟" لە وەڵامدا بە پێکەنینەوە وتی:" لە عێراق. من وەك سەرکۆمارێکی کوردی عێراق پشتگیری لە سەربەخۆیی کوەیت لە عێراق دەکەم و پیرۆزبایی لێدەکەم." کاتێك لە شوێنی حەوانەوەی خۆی دەردەکەوت و دەڕۆیشت، پێداگری دەکرد لەوەی کە هەرچەندە کە خۆیشی لەوێ نەبێ بەڵام من لە شوێنی حەوانەوەی ئەو بمێنمەوە. منیش لە وەڵامدا ویستم سەربنێمە سەری و وتم:" مام جەلال منیش دەوڵەتێکم هەیە. لە شوێنی نوێنەرایەتی دەوڵەتەکەی خۆم دەمێنمەوە. نیگەرانی ئاسودەیی من لە بەغدا مەبە." ئاماژەی بە دوو قۆناغی هاوبەشی رابردووی هەردووکمان کرد کە جاربەجار پچڕانی تێکەوتبوو و وتی:" دەزانم. بەڵام لە بیرت نەچێت کە لێرەش دەوڵەتێکت هەیە و ئەم دەوڵەتەش ئامادەیە هەموو کاتێك پێشوازیت لێبکات."

وادیاربوو من دەمتوانی ئەم قسە مانادارانە تەنها لە سەرکۆمارێکی عێراق ەوە ببیستم کە کورد ە و دەیان ساڵ لە دژی بەڕێوەبردنی ناوەندی عێراق شەڕی کردووە و سەرکۆمارێکی دەگمەنە. هەموو جارێك بە زمانی چینی کە زۆرباش تەلەفوزی نەدەکرد، بە تونچە کە واتای هاوڕێ دەدات منی بانگ دەکرد و ساڵانێکیش بەوجۆرە منی بە کەسانی دەوروبەری خۆی دەناساند.

پۆستی سەرۆکایەتی عێراق بە تاڵەبانی یەك نەدرابوو کە بە رەچەڵەك کورد بێت بەڵکو بە کوردێك بە ناوی تاڵەبانی درابوو. سەرۆکایەتیکردنی کۆماری عێراق لەلایەن تاڵەبانی گرەنتی ئەوەبوو کە کوردەکان لەنێو سنورەکانی عێراق دا بمێننەوە و بەهەمان شێوەش فیدراڵیزمی عێراق جێگیر بکرێت کە نمونەی هەرە بەرچاوی ئەمەش بەڕێوەبردنی کوردی لە باکوور بوو. لەدوای جەنگی ٢٠٠٣ و رووخانی حکومەتەکەی سەدام، کوردەکان ی عێراق مانەوەی خۆیان لەنێو سنورەکانی عێراق و بەشداریکردنیان لە پێکهاتەی دەسەڵاتی عێراق دا مەرجدار کردبوو بەوەی کە پێویستە یان پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار یاخود سەرۆکی وەزیرانیان پێ بدرێت.

هاوسەنگی دەسەڵاتی عێراق لە ساڵی ١٩٢١ەوە (ئەگەر سەدەکانی سەردەمی عوسمانیش ئەژمار بکرێت، لە سەدەی شانزە بەملاوە) بۆ یەکەمجار بەشێوەیەکی بنەڕەتی گۆڕانی بەسەردا هاتبوو و لەسەر بنەمای میحوەرێکی کورد - شیعە دامەزرابوو. شیعەکان پۆستی سەرۆك وەزیرانیان هەڵبژارد کە بەهێزترین دەسەڵاتی جێبەجێکردن بوو، بۆیە پۆستی سەرۆکایەتی کۆماریش بۆ کوردەکان مابووەوە و جەلال تاڵەبانی ش سەرەڕای هەموو تایبەتمەندییە کەسایەتی و مێژووییەکانی خۆی، لە سایەی ئەوەدا و لە بنەڕەتدالەبەر ئەوەی کە کورد بوو ئەو پۆستەی وەرگرت.

وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری عێراق لەلایەن تاڵەبانی'یەوە لە هەموو روانگەیەکەوە بۆ تورکیا بێ کێشە نەبوو. پێچەوانەکەی هەرچی دەڵێن با بیڵێن، بە ڕێوەبەرانی تورکیا زۆر ئەوەیان پێ هەزم نەدەکرا کە کوردێك پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری عێراق بەدەست بهێنێت. تەنانەت کەسێکی وەکو ئەحمەد داودئۆغڵو وەزیری دەرەوەش کە رۆڵی لە نزیککردنەوەی هەولێر و ئەنقەرە'دا گێڕاوە و سەردانی هەولێر'ی کردووە و یەکەم نوێنەرایەتی دیپلۆماتی تورکیا'ی لە کوردستان'ی عێراق'دامەزراندووە، لەمە بەدەر نەبوو.

داودئۆغڵو لەدوای هەڵبژاردنەکانی مارتی ٢٠١٠ی عێراق، جەلال تاڵەبانی و نوری مالیکی بە کەسانی نزیك لە ئێران لە قەڵەم دابوو، بۆیە تەقەلای دابوو کە ئەیاد عەلاوی کەسایەتی عەلمانی شیعەی عێراق بکرێتە سەرۆك وەزیر و عەرەبێکی سوننە کە باشتروابوو تارق هاشمی بێت پۆستی سەرکۆمار وەربگرێت.

لیستی ئەلعیراقیە کە ئەیاد عەلاوی سەرۆکایەتی دەکرد و بە جیاوازییەکی زۆر کەمەوە هەڵبژاردنەکانی بردبووەوە، بەشێوەیەکی سەرەکی هاوپەیمانی گروپە جیاوازەکانی سوننەکان بوو. لە پێوەرێکی گەورەشدا تورکیا و تەنانەت خودی ئەحمەد داود ئۆغڵو ئەو لیستەی دروستکردبوو.

ئەحمەد داود ئۆغڵو هەوڵی بۆ بونیادنانی ئەو هاوسەنگییەی لە عێراق دەدا کە لە مێشکی خۆیدا دروستی کردبوو. ئەو پێیوابوو کوردەکان پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار چۆڵ دەکەن و بە سەرۆکایەتی پەرلەمان قایل دەبن. کاتێك ئەم سیاسەتەکەشی سەری نەگرت، هەوڵێکی نامومکینی دیکەی وەکو پێدانی پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار بە عەلاوی و سەرۆك وەزیرانیش بۆ عادل عەبدولمەهدی دەستپێکرد.

لەلایەکی دیکەشەوە ئەوان حیسابیان لەسەر ناکۆکیەکانی بارزانی- تاڵەبانی کردبوو، بەڵام کاتێك ئەوەش سەری نەگرت لەدوای ماوەیەکی درێژ لە تێپەڕبوون بەسەر قەیرانی پێکهێنانی حکومەتدا، دواجار لە مانگی تشرینی دووەمی ٢٠١٠دا گەڕانەوەیەك بۆ فۆرمۆلی پێشوو کرا بە جۆرێك کە تاڵەبانی سەرکۆمار بێت و مالیکی پۆستی سەرۆك وەزیران وەربگرێت.

من دوورنیگای ئەحمەد داود ئۆغڵو و سیاسەتەکانیم لە زۆر بواردا لەلا پەسەند بوو، بەڵام لە چەند روویەکی پراکتیکییەوە بە تایبەتی سەبارەت بە عێراق، پێچەوانەی ئەو بیرم دەکردەوە.

ئەو کاتەی کە داود ئۆغڵو یەکێك لە گەرموگوڕترین لایەنگرانی رووخانی رژێمی سەدام حسێن بوو لە تورکیا، پۆستی بەرپرسی راوێژکارەکانی سەرۆك وەزیرانی هەبوو. لەو وەختانەدا هەوڵیدەدا کە دەسەڵات لە تورکیا، رێگا لە دەستوەردانی دەرەکی لە عێراق بگرێت. کاتێکیش کە بوو بە وەزیری دەرەوە، دەورێکی گرنگی گێڕا لەوەی کە تورکیا بە گوێرەی بارودۆخی عێراق خۆی رێکبخاتەوە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سیاسەتی تورکیا لە ٢٠١٠ کە دژایەتی تاڵەبانی دەکرد، ماریفەتی ئەو بوو. ئەولەویەتە سیاسییەکانی داود ئۆغڵو لە عێراق، لەسەر بنەمای رکابەری تورکیا و ئێران دیاریکرابوون.

ئەو ململانێ و پێکدادانەی کە لە مێژوودا لە نێوان ئێران و تورکیا لە عێراق روویدابوو، هێشتا لەناو نەچووبوو، بەڵکو لە هەلومەرجێکی نوێدا و بە شێوازێکی نوێ درێژەی دەکێشا. ئەگەر لە روانگەی ململانێی رانەگەیەنراوی ئێران لەگەڵ تورکیا سەیری ئەولەویەتە سیاسییەکانی داود ئۆغلو سەبارەت بە عێراق بکرێت، ناکرێ رەخنەیەکی زۆری لێ بگیرێت. کێشەکە لێرەدا نەبوو، بەڵکو کێشەکە لەسەر چۆنیەتی و تەوقیتی ئەولەویەتەکانی بوو. من پێموابوو کە داود ئۆغلو سەرەڕای هەموو شتێك بە باشی لە تاڵەبانی و عێراق'ی دوای سەدام تێنەگەیشتووە و بەشێوەیەکی باش هەڵسەنگاندنی بۆ نەکردوون بۆیە تووشی هەڵە بووە.

لە روانگەی منەوە بەڕێوەبەرانی تورکیا کێشەیەکی هەمیشەییان هەبوو: تێگەیشتنی گشتی سەبارەت بە کوردەکان و ئەو نیگەرانییانەی کە بەهۆی کێشەی کورد'ەوە لە دەروونیاندا هەیە.

سەرەڕای ئەوەی کە داود ئۆغلو لە دەرەوەی دەستە بژێری نەریتی بە ڕێوەبەرانی تورکیا پێگەیشتبوو، بەڵام لەوانەیە ئەویش لە هەڵوێستی"تورك و ناوەندبوونی دەوڵەتی تورك" بەدوور نەبێت.

رۆژی ١ی مایسی ٢٠١٠ یەکەم ساڵرۆژی وەرگرتنی پۆستی وەزیری دەرەوە لەلایەن ئەحمەد داود ئۆغلووە بوو. ئەو رۆژە بۆ بەشداریکردن لە کۆنفراسێکدا سەبارەت بە "سیاسەتی دەرەوەی تورکیا" لە زانکۆی ئۆکسفۆرد دەرۆیشتین و لەو فڕۆکە بچوکە تایبەتەدا کە پێکەوە بەرەو ئۆکسفۆرد دەیبردین، بۆ باسکردنی کارنامەی یەکساڵی رابردووی خۆی و بیرکردنەوەیەك لەسەر ئەوەی کە لە رابردوودا کراوە، ژمارەیەکی کەم لەو کەسانەی کە بە وتەی خۆی" رۆژنامەنوس، نوسەر و بیرمەند" بوون بانگهێشت کرد تا پێکەوە گفتوگۆ بکەن و منیش یەکێك لەوانە بووم. لەو کاتەی کە فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی ئەنقەرەوە هەستا، هەتا ئەو ساتەی کە تایەی فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی "هەیسرۆ"ی لەندەن لە عەرزی دا، داود ئۆغلو بەشێوەیەکی ورد باسی لەو سیاسەتانە کرد کە جێبەجێیان دەکات و بەرنامەی بۆ دارێژاوە.

کاتێك باس هاتە سەر هەڵبژاردنی عێراق کە نزیکەی مانگ و نیوێك بەر لەو کاتە کۆتاییپێهاتبوو و قسە لەسەر هۆکارەکانی پێکنەهاتنی حکومەتی عێراق کرا، داود ئۆغلو وتی:" لیستی عێراقیە لە ماڵی من دامەزرا. ئێرانییەکان پابەندی ئەو بەڵێنە نەبوون کە بە ئێمەیان دابوو، لەبەر ئەوە منیش ئەیاد عەلاوی'م بانگکرد و هەر ئەو شەوە لەگەڵ مقاوەمەی سوننە'شدا لە عەمان لە رێی تەلەفۆنەوە پەیوەندیم بەرقەرار کرد. جگە لە ئێمە کەس نەیدەتوانی ئەو کەسانە لە دەوری یەك کۆبکاتەوە کە مومکین نەبوو لە دەوری یەك کۆببنەوە. لە عەلاوی'یەوە بگرە تا دەگاتە ئوسامە نوجەیفی و تارق هاشمی، هەموویانم لە لیستی ئەلعێراقیە'دا لە دەوری یەك کۆکردەوە. ئەو دەنگۆیانە ناڕاستن کە دەڵێن لیستی ئەلعێراقیە لیستی ئەمریکاییەکان بوو. لیستەکە لە ماڵی من دروستکرا، ئەمریکاییەکان دواتر لە پشتەوە پشتگیرییان لێدەکرد."

بۆ ساتێك رووی کردە من و وتی:" تاڵەبانی زۆر لەگەڵ ئێرانیەکان یاری دەکات. هەرچەندە خۆمان

دیداری لەگەڵ دەکەین، بەڵام ئێوەش ئەمەی پێ بڵێن کە ئێمە پشتگیری لە عەرەبێکی سوننە دەکەین تا پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار وەربگرێت."

کاتێك قسە دەهاتە سەر تاڵەبانی، وەك ئەوە وابوو کە من تاکە تورکێك بم کە لە تاڵەبانی بەرپرسیار بم. پرسیارم لێکرد و وتم:" بەڕێز وەزیر! ئەگەر پۆستی سەرۆك کۆمار بدرێتە عەرەبێکی سوننە ئەی کوردەکان چی دەکەن؟" داود ئۆغلۆ تەنها بۆ ساتێکیش رانەوەستا و وتی:" سەرۆکایەتی پەرلەمان‌یش بەوان دەدرێت."

-"ئاخر قبوڵی ناکەن!"

-" ئەی قبوڵی ناکەن چی دەکەن؟"

لەم کاردانەوەیەدا کە لەنێو وتەکانیدا شاراوە بوو، درکم بەوە کرد کە تەنانەت کەسێکی وەکو ئەحمەد داود ئۆغلۆ لەو دیدگا و تێگەیشتنە بەری و بەدوور نیە کە بەشێوەیەکی گشتی لەسەرەوە سەیری نەك تەنها کوردەکان‌ی عێراق، بەڵکو هەموو کوردەکان دەکات و بە چاوێکی کەمەوە دەیانبینێت. ئەمەش دیمەن و روخسارێکی ناسراوی تورکەکان بوو. داود ئۆغلۆ بە بێئەوەی هەناسە بدات قسەی دەکرد.

کاتێك گەڕامەوە بۆ تورکیا، پەیامێکم بۆ تاڵەبانی نارد کە تێکەڵاوێك بوو لە پەیام و هۆشداری و ناوەڕۆکەکەی بەمجۆرە بوو:" تورکیا لە شێوازی پەیوەندییەکانی تۆ لەگەڵ ئێران نیگەرانە. ئاگاداربە! خودی وەزیری دەرەوە ویستی کە تۆ لەو نیگەرانییەی ئەوان ئاگادار بیت. رەفتار و جوڵەکانی خۆت بە گوێرەی ئەوە رێکبخە. خۆت باشتر دەزانی کە چۆن ئەمە بکەیت."

لەدوای ماوەیەکی کورت، لە وەڵامدا پەیامێکی زۆر توندی تاڵەبانی گەیشت کە هیچ کات لەگەڵ شێوازی دیپلۆماسی ئەودا یەکی نەدەگرتەوە. ئەو سەرکردەیەی کورد کە پۆستەکەی وەك سەرۆکی کۆماری عێراق بە نادیاری مابووەوە، بە زمانێکی زۆر توند رەخنەی لە سیاسەتی تورکیا بەرامبەر بە هەڵبژاردنەکانی عێراق دەگرت. لە پەیامەکەیدا باسی لە هەوڵ و تەقەلاکانی خۆی بۆ نزیککردنەوەی عێراق - تورکیا و تورکیا - کوردەکان‌ی عێراق‌ی دەکرد و جەختی لەوە دەکردەوە کە سەرەڕای ئەمە تورکیا لە موسڵ پشتیوانی لە عەرەبە نەتەوەگەراکان دەکات کە دژایەتی کورد دەکەن و لە کەرکوك‌یش تورکمان و عەرەبە نەتەوەگەراکانی لەدەوری یەك کۆکردۆتەوە و بۆ ئەو مەبەستەش پارەیەکی زۆر خەرج دەکات. باسی ئەوەشی دەکرد کە لەکاتێکدا کە ئێران دژایەتی فیدراڵیزم لە عێراق ناکات، تورکیا لەدژی ئەمە رادەوەستێت.

پەیامەکەی تاڵەبانی‌م لەسەر کاغەزێك نوسی و لە زەرفێکدا بە ئەحمەد داود ئۆغلۆم دا کە دەچووە ناو هۆتێلی کۆنرادی ئیستانبوڵ بۆ ئەوەی کۆنفراسێکی رۆژنامەوانی بکات و وتم:"من تەنها نامەبەرم."

چەند مانگ تێپەڕ بوو. لە مانگی تشرینی دووەمی ٢٠١٠دا بەهۆی خۆڕاگری مەسعود بارزانی کە بە وتەی" لە ژیانمدا هیچ کات ئەوەندە لەژێر گوشاردا نەبووم" گوزارشتی لێدەکرد و سەرەڕای گوشارەکانی

ئەمریکا، جارێکی دیکە رێککەوتنێك کرا بۆ ئەوەی تاڵەبانی وەك سەرۆك کۆمار هەڵبژێردرێتەوە و بە فەرمانی ئەویش نوری مالیکی ببێتە سەرۆك وەزیری عێراق.

قەیرانی پێکنەهاتنی حکومەت لە عێراق کە پلەی پێوانەیی شکاندبوو، چارەسەرکرا و منیش ئاگاداری هەموو وردەکارییەکانی رێککەوتنی چارەسەرییەکەی بووم. سەرچاوەکەی من، هەندێك لەبەرپرسانی کورد لەلایەنی بارزانی بوون. هەموو ئەو سیاسەتانەی کە تورکیا چەندین مانگ پێڕەوی کردبوون و دەیویست جێبەجێ بکرێن، هیچیان سەریان نەگرت و پێچەوانەکەیان جێبەجێ کران.

من تەنانەت گومانێکی بچوکیشم لەوە نەبوو کە بەمجۆرە دەبێت. نزیکەی مانگێك دوای ئەو گفتوگۆیەمان لەگەڵ داود ئۆغلو لە رێگای ئۆکسفۆرد، رۆژی یەکشەممە ٦ی حوزەیرانی ٢٠١٠ لەگەڵ مەسعود بارزانی کە دوای ماوەیەك بە سیفەتی سەرۆکی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان،ی عێراق سەردانی تورکیا'ی کردبوو، لەکاتی نانخواردنی نیوەڕۆدا لە هۆتێلی سویس'ی ئیستانبوڵ یەکمان بینی. لەوکاتەدا هاشم هاشمی سەرۆکی پێشوی شارەوانی جزیرە و پەرلەمانتاری پێشوو لەگەڵ عەبدولسەلام وەرگێڕەکەی مەسعود بارزانی لەگەڵمان بوون.

مەسعود بارزانی باسی لەوەکرد کە دیدارەکەی لەگەڵ تایب ئەردۆغان لە ئەنقەرە زۆر باشتر و گەرمتر بووە لەوەی کە خۆی پێشبینی کردبوو. بۆ ماوەیەك لەسەر پ.ك.ك و ئۆجەلان قسەمان کرد، بەڵام باسەکەمان چوە سەر پێشهات و رووداوە ناوخۆییەکانی عێراق. لە دیدارە رەسمییەکانی ئەنقەرە'شدا باسی ئەم بابەتە کرابوو. تورکیا دەیویست ئەیاد عەلاوی پۆستی سەرۆکایەتی وەزیران وەربگرێت. بارزانی وتی:" عەلاوی دۆستی منە، بەڵام شیعەکان ئەو قبوڵ ناکەن."

سەبارەت بەوەی کە تورکیا دەیەوێت لە جێگەی تاڵەبانی سیاسەتمەدارێکی عەرەبی سوننە بە دیاریکراوی تارق ئەلهاشمی کە پەیوەندی لەگەڵ رێکخراوی براموسڵمانەکان (اخوان المسلیمن) هەیە ئەو پۆستە وەربگرێت، بارزانی وتی:" تارق هاشمی پۆستی سەرۆك کۆماری لەبەر ئەوە داواکردووە کە بڵێت عێراق وڵاتێکی عەرەبی'یە. لەبەر ئەوە مومکین نیە ئێمە رێگا بدەین ئەو پۆستە وەربگرێت. بەهیچ جۆرێك نابێ ئەوە رووبدات. تەنانەت ئەگەر مام جەلال'یش ئەو پۆستە وەرنەگرێت، دیسان ئێمە کوردێك کاندید دەکەین." وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار لەلایەن کوردێکەوە مەرجی سەرەکی مەسعود بارزانی بوو.

لە ساڵی ٢٠١٠دا لە عێراق گرنگترین یاریکەر و گرنگترین لایەنێك کە دەیتوانی دەسەڵات دیاری بکات، مەسعود بارزانی و لە رێگای ئەویشەوە کوردەکان بوون. هەر لە ساڵی ٢٠١٠وە دیاربوو ئەو دەستپێشخەرییانەی کە"هێڵەسوورەکان"ی بارزانی و بە واتایەکیتر کوردەکان لەبەرچاو ناگرن، چانسی سەرکەوتنیان نیە. خۆی لە خۆیدا لە تشرینی دووەمی ٢٠١٠شدا قسەکەی مەسعود بارزانی چووەسەر

و جارێکی دیکە جەلال تاڵەبانی وەك سەرۆك کۆمار هەڵبژێردرایەوە و نوری مالیکی وەك سەرۆك وەزیر دەستنیشانکرا. تورکیا ش لە ڕێگەی وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی پەرلەمان بۆ ئوسامە نوجەیفی توانی کاریگەری لەسەر هاوسەنگییەکە دابنێت، بەڵام هیچ یەك لە ئامانجە سەرەتاییەکانی خۆی لە هەموویان گرنگتر پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار و پۆستی سەرۆك وەزیرانی نەپێکا و سەرنەکەوت.

لەو ڕۆژانەدا لە کوردستان ی عێراق بووم و چەندین نوسینی ڕەخنەگرانەم لەسەر سیاسەتە بێ ئەنجامەکانی داود ئۆغلو سەبارەت بە عێراق نوسی. دوای ئەوەش لەبەرەبەیانی ٢٠١٠/١١/١١دا بۆ بینینی موراد قەرەیلان ڕێگای چیای قەندیل م گرتەبەر. هەر هەمان شەو، لەدوای گەڕانەوەم لە قەندیل لە ژوورەکەی خۆمدا لە هۆتێل سلێمانی پالاس لە شاری سلێمانی، لە تەلەفزیۆنی ناو ژوورەکەمەوە سەیری پەخشی ڕاستەوخۆی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمارم دەکرد کە دوای قەیرانێکی هەشت مانگی لە بەغدا ئەنجام دەدرا. جەلال تاڵەبانی تاکە کاندید بوو. کاتی دەنگدانەکە ئەو پەرلەمانتارانەی لیستی ئەلعێراقیە کە تورکیا پشتیوانی لێکردبوون دانیشتنەکەیان جێهێشت. لەگەڵ ئەوەشدا تاڵەبانی بە زۆرینەی دەنگ هەڵبژێردرایەوە و ڕێك لەو کاتەدا ئاسمانی شاری سلێمانی بە فیشەکی هەوایی ڕوونکرایەوە و دەنگ و فریادی خۆشی و هۆڕنی ئۆتۆمبیل لە کۆڵان و شەقامەکانی سلێمانی بەرزبوونەوە.

ڕۆژی دواتر چووم بۆ هەولێر و لەوێ د.فوئاد حسێن سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی کوردستان،ی عێراق کە دەستەڕاستی مەسعود بارزانی یە، وردەکاری دیداری چەند ڕۆژ لەوەوبەری داود ئۆغلو - بارزانی بۆ باسکردم کە لە هەولێر ئەنجامیان دابوو. هەورەها بە وردی باسی ئەو قۆناغەی کرد کە بە هەڵبژاردنەوەی تاڵەبانی کۆتاییپێهاتبوو. دوای گەڕانەوەم لە هەولێر دوو ڕۆژ لە تورکیا مامەوە و دەربازی برۆکسل بووم.

لە کۆنفرانسی کورد کە بە شێوەی ساڵانە لە پەرلەمانی ئەوروپا ڕێکدەخرا وتارێکم پێشکەش دەکرد. لەدوایین شەوی مانەوەم لە برۆکسەل، داود ئۆغلو تەلەفۆنی بۆ کردم. نیگەران بوو لەو نوسینانەی من کە سەبارەت بە هەڵەی سیاسەتەکانی ئەو لەبارەی عێراق نوسیبووم و وتی:" ئەگەر لە بری ئەوەی گوێ لە تاڵەبانی بگرن، لەگەڵ لایەنی بارزانی دیدارتان بکردایە زانیاری دروستتان دەست دەکەوت." و بەوجۆرە سەرزەنشتی کردم. منیش لە وەڵامدا وتم:" چەند مانگێکە نە تاڵەبانی م بینیوە و نە بە تەلەفۆنیش قسەم لەگەڵ کردووە. ئەو زانیاریانەش کە لە نوسینەکەمدا هاتوون و سەرەنجی ئێوەشی ڕاکێشاوە، ڕێك لەلایەنی بارزانی یەوە دەستم کەوتوون."

داود ئۆغلو وتی:" خۆ ئێوە لە سلێمانی یەوە دەتاننوسی؟"

-" بەڵێ. بەڵام ئەو کاتەی من لە سلێمانی بووم، تاڵەبانی لەوێ نەبوو. لە بەغدا بوو. جگە لەوە من لەبەر چاودێریکردنی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆماری عێراق لەوێ نەبووم و لەبەر هۆکارێکی زۆر جیاواز لەوێ

بووم. هاوکات بوونیشی لەگەڵ هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆماردا شتێکی زۆر ڕێکەوت بوو. جگە لەوە دووری هەولێر و سلێمانی لە یەکتر تەنها دوو کاتژمێرە. لە سلێمانی'وە چوومە هەولێر و لەوێش لەگەڵ لایەنی بارزانی دیدارم کرد."

بە بێئەوەی بچمە ناو وردەکارییەکان، پشتی پەردەی زانیاری و نوسینەکانی خۆمم بۆ باسکرد و دواتر پێمگوت دوو ڕۆژی دیکە بۆ بەشداریکردن لە لوتکەی ناتۆ، لەگەڵ عەبدوڵا گویل سەرۆك کۆمار و ئەو بەیەکەوە سەردانی لیزبۆن دەکەین و دەتوانین لەوێ بە وردی لەسەر ئەم شتانە قسە بکەین.

ڕۆژێك بەر لە سەردانەکەی لیزبۆن، ئاسلی ئایدن تاشباش لە ڕۆژنامەی میللییەت چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ جەلال تاڵەبانی ئەنجامدابوو کە ئەو کاتانە بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەی سۆسیالیست ئینتەرناسیۆنالیست لە پاریس بوو. قسەکانی تاڵەبانی کردبوو بە مانشێت. تاڵەبانی وتبووی:" تورکیا گرەوی لەسەر ئەسپی تۆپیو کردووە!" و بەوجۆرەش ڕەخنەیەکی زۆر توندی لە سیاسەتی چەند مانگی ڕابردووی تورکیا سەبارەت بە عێراق گرتبوو.

ڕۆژی دواتر لە ڕێگای لیزبۆن'دا عەبدوڵا گویل بۆ قسەکردن سەبارەت بە لوتکەی ناتۆ ڕۆژنامەنوسانی یاوەری خۆی بانگهێشت کرد تا بێنە بەشی پێشەوەی فڕۆکەکە و چاوپێکەوتنی لەگەڵ بکەن. لەدوای کۆتاییهاتنی چاوپێکەوتنەکە، کاتێك کە هەموو کەس تەنانەت وەجدی گونول وەزیری بەرگری'ش دەیانویست بچنەوە شوێنەکانی خۆیان، عەبدوڵا گویل ئاماژەی کرد کە من هەڵنەستم و لەوێ بمێنمەوە. لەو بەشەی فڕۆکەکە کە بۆ چاوپێکەوتن تەرخانکرابوو، لەگەڵ عەبدوڵا گویل سەرکۆمار و ئەحمەد داود ئۆغلۆ وەزیری دەرەوەدا بە تەنها مامەوە.

گویل یەکسەر باسی وتەکانی تاڵەبانی کرد کە لە ڕۆژنامەی میللییەت کرابوون بە مانشێت و نێوچاوی دا بەیەکدا و وتی:" ئەمە باسی چی دەکا؟ دەیەوێ چی بڵێ؟" وادیاربوو کە بۆ جارێکی دیکەش وەك تورکێکی بەرپرس لە تاڵەبانی لە قەڵەمدرابووم.

دەبوایە پاش ئەوەی کە تاڵەبانی پۆستی سەرۆك کۆماری عێراق'ی وەرگرت، وازی لە دەمەقاڵە و مشتومڕەکانی لەگەڵ تورکیا بهێنابایە. من لەبەر ئەوەی کە دەمزانی ئەو سەرکردەیەی کوردی عێراق، تورکیا وەك" هاوپەیمانی ستراتیژی" دەبینی و هەڵبەز و دابەزە تەکنیکیەکان ناتوانن ئەو دیدگایەی ئەو بگۆڕن. وتم ئەمە ڕەفتارێکە کە زۆر لەگەڵ نەرمی و زیرەکی دیپلۆماتی تاڵەبانی'دا ناگونجێت. بەڵام سەبارەت بە ئێوە خۆ کێشەیەك نییە و وەك گویلی برام باسی ئێوەی کردووە و جەختی لەوەکردۆتەوە کە لە داهاتوودا دیسان پێکەوە کاردەکەن. شتێکی گرنگ نییە" بەوجۆرەش ویستم بڵێم کە پەیوەندییەکانی تورکیا - عێراق ناکەونە ژێر کاریگەری ئەو لێدوانەی تاڵەبانی و لەوبارەیەوە بیروبۆچونەکانی خۆمم بۆ باسکرد. بەڵام

لە کۆتاییدا خۆمم پێ ڕانەگیرا و ئەوەشم پێ زیادکرد کە" ئەگەر ئەو لێدوانێکی بەوجۆرە دەدات، ئەمە مانای وایە کە زۆر ئازاری لە هەڵوێستی تورکیا چێشتووە." دەمزانی کە تاڵەبانی تەقەلایەکی زۆری داوە بۆ ڕێخۆشکردن لەبەردەم پەیوەندیەکانی تورکیا - کورد و لە هەمانکاتیشدا ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە نزیککردنەوەی عێراق - تورکیا لە یەکتری و لەبەر ئەوەش زۆر نیگەران بووە لەو هەڵوێستەی کە تورکیا لەدوای هەڵبژاردنەکان سەبارەت بەو وەری گرتبوو.

داود ئۆغلو دەستیکرد بە باسکردنی چۆنیەتی دامەزراندنی لیستی ئەلعێراقیە لەلایەن تورکیا هەتا قۆناغەکانی ئەو کاتە و لەوەش بەدواوە عەبدوڵا گویل ئیمەی جێهێشت و دەربازی شوێنەکەی خۆی بوو.

مرۆڤ دەیتوانی لەوە تێبگات کە نیگەرانی و ناڕەزایی تورکیا لەوەی کە مالیکی پۆستی سەرۆك وەزیران وەربگرێت لەبەر ئەوەیە کە ئێران لەنێو کاندیدە شیعەکان'دا ئەوی بە دڵ بووە، بەڵام هۆکاری ڕاستەقینەی ناڕەزایی تورکیا لەوەی کە تاڵەبانی ببێتەوە بە سەرکۆمار، لەبەر پەیوەندییەکانی ئەو سەرکردە کوردە لەگەڵ ئێران نەبوو. ئەمە شتێك نەبوو کە مرۆڤ بە ئاسانی بڕوای پێبکات. بە ڕای من هۆکاری ڕاستەقینەی ناڕەزایی دەوڵەتی تورکیا لەوەی کە تاڵەبانی ببێتەوە بە سەرکۆمار تەنها لەبەر ئەوەبوو کە ئەو کورد بوو![9]

تورکیا هەوڵیداوە بۆشایی سەرکردایەتی کردنی دنیای عەرەبی- سوننە پڕ بکاتەوە کە جەنگی عێراق لەلایەن میسر و عەرەبستانی سعودی چۆڵکرابوو. بۆیە سەرەڕای ئەو پەیوەندییەی کە بە تایبەتی لە ڕێی نێچیرڤان بارزانی لەگەڵ کوردستان'ی عێراق پێشی خستبوو، هەرچەندە بە ئاشکرا دژایەتی ئەوەی نەدەکرد کە کوردێك ببێتە سەرۆك کۆماری عێراق، بەڵام بوونی کوردێك بە سەرکۆمار لە ئەولەویاتەکانیدا نەبوو. لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم، بەڕێوەبردنی وڵاتانی عەرەبی کە ناوچەیەکی فراوانی جیۆپۆلەتیکی لە فاس تا کەنداوی لە خۆدەگرت، زیاتر لە دەستی دەستە بژێری عەرەبی سوننەدا بوو.

سەرەڕای جیاوازی دەستە بژێری سیاسی لەهەریەك لە وڵاتانی عەرەبی و سەرەڕای ئەوەی کە لەهەریەك لەو وڵاتانەدا ئەو نوخبانە ریشەی جۆراوجۆریان هەبووە، بەڵام سوننە بوونی دەستە بژێری بەڕێوەبەر، تا

---

٩- بەهۆی هەواڵێکەوە کە لە ٢٢ی ئەیلولی ٢٠١٢دا لە ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز بڵاوکرابووەوە، زانیم کە لە ڕاستیدا ئەو شتەی ئەحمەد داود ئۆغلو وەك سیاسەتی تورکیا بۆ من باسی دەکرد سیاسەتی ئەمریکا'ش بووە. لەو هەواڵەدا کە میشیل گۆردن ئامادەی کردبوو، باس لەوەکرابوو کە خودی سەرۆك باراك ئۆباما هەوڵیداوە تاڵەبانی ڕازی بکات واز لە پۆستەکەی بهێنێت و لەوبارەیەشەوە گوشاری لەسەر تاڵەبانی و مەسعود بارزانی داناوە. بە گوێرەی هەواڵەکە ئۆباما لە ١١/٤/ ٢٠١٠دا بە تەلەفۆن پەیوەندی بە تاڵەبانی کردووە و داوای لێکردووە بە قازانجی ئەیاد عەلاوی کە کەسایەتیەکی لائیکی (عەلمانی) شیعەیە و سەرۆکایەتی لیستێکی سوننە دەکات، واز لە پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار بهێنێت. ئەمریکییەکان کە پێیانوابووە مالیکی بەشێکی زۆر لە دەسەڵاتەکانی لە دەستی خۆیدا کۆکردۆتەوە، پشتگیریان لەوە کردووە کە لە جیاتی مالیکی، عادل عەبدولمەهدی پۆستی سەرۆك وەزیران وەربگرێت. دوای ئەوەی کە ئەم جۆرە دەستپێشخەرییانەش سەریان نەگرتووە، ئەمجارەیان جۆ بایدن جێگری سەرۆك هاتۆتە مەیدان و باسی لەوەکردووە کە مالیکی دەتوانێت پۆستەکەی خۆی وەربگرێتەوە، بەڵام پێویستە تاڵەبانی بە قازانجی ئەیاد عەلاوی واز بهێنێت و بە پۆستی وەزیری دەرەوە قایل بێت. کاتێك کە تاڵەبانی ئەمەی ڕەتکردۆتەوە، ئەمریکا ویستویەتی بە دەوری تاڵەبانی'دا بسوڕێتەوە و لە ڕێگەی مەسعود بارزانی'وە گوشار بخاتە سەری تا ئەو بڕیارە بدات. بۆ ئەو مەبەستەش ئۆباما نامەیەکی بۆ مەسعود بارزانی ناردووە. بەڵام مەسعود بارزانی لە بەرامبەر گوشارەکەی ئۆبامادا خۆی ڕاگرتووە و پێشنیارەکەی ئۆبامای ڕەتکردۆتەوە و باسی لەوەکردووە کە ناکرێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان عەرەبە شیعە و سوننەکان، کوردەکان فیدا بکرێن و بەمجۆرەش بە قسەی ئۆبامای نەکردووە.

مەسعود بارزانی ئەو گوشارانەشی لەو دوو هەفتەیەی مانگی ١١ی ٢٠١٠دا لەسەری بوون بە« گەورەترین گوشارێك کە لە ژیانمدا خراوەتە سەرم» لە قەڵەم دابوو. هۆشیار زێباری وەزیری دەرەوەی عێراق'یش لە ٢٦ی ئەیلولی ٢٠١٢دا لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ کریستینا ئامانپۆر پەیامنێری بەناوبانگی سی ئێن ئێن، هەواڵەکەی نیویۆرك تایمز'ی پشتڕاست کردەوە. ئەو زانیاریانەی ناو هەواڵەکەی نیویۆرك تایمز لە کتێبی «داستانی تێکۆشانی پشتی پەردەی عێراق، لە جۆرج بوش تا باراك ئۆباما» کە میشیل گۆردن و برنارد ئیترانیەر ژەنراڵی خانەنشین نوسیویانە، وەرگیراوە.

ئەندازەیەك جۆرێك لە خاڵی هاوبەشی بە ڕێوەبەرانی وڵاتانی عەرەبی بوو. بەدەر لە چەند وڵاتێك، لە باقی وڵاتانی دیکەی عەرەبی'دا زۆربەی دانیشتوان عەرەبی سوننە'ن. دیارترین نمونەی ئەو وڵاتە عەرەبییە جیاوازانە عێراق بوو کە سەرەڕای ئەوەی زۆربەی دانیشتوانەکەی عەرەبی سوننە نەبوون، بەڵام هەر لە یەکەم ڕۆژی دروستبوونیەوە بەڕێوەبردنی ئەو وڵاتە لە ژێر دەسەڵاتی ناوەندگەرای دەستە بژێری عەرەبی سوننە'دا بووە.

ڕژێمی سەدام دوایین بەڕێوەبردنی حوکمی عەرەبە سوننەکان بەسەر عێراق بوو. عێراق'ی سەدام بۆ سیستمی ناوچەیی نێودەوڵەتی و ژێرسیستمی باکووری ئەفریقا و خۆرهەڵاتی نزیك، خاڵی پەیوەندی لەگەڵ ئێرانی شیعی بوو. بە واتایەکیتر دیوارێکی ئەستوور بوو کە لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئێران لەنێو دنیای عەرەبی'دا چنرابوو.

بۆ ساڵانێکی درێژ، عێراق ئاوەڵناوی"دەروازەی خۆرهەڵاتی دنیای عەرەبی" بۆ خۆی بەکار دەهێنا. پشتگیریکردنی وڵاتانی عەرەبی و سیستمی نێودەوڵەتی لە عێراق لە جەنگی ١٩٨٠ لە دژی ئێران کە دوای شۆڕشی ئیسلامی لە١٩٧٩ بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئەو شۆڕشە بەرپا کرا، ئەم تایبەتمەندییە جیۆپۆلەتیکییەی عێراق زیاتر ڕوونده‌کاتەوە.

ڕوخاندنی سەدام لە جەنگی ٢٠٠٣دا، لە واتایەکدا تێکچوونی ئەو سیستمە ناوچەییەیە کە لەدوای جەنگی جیهانی بونیاد نرابوو. "دەروازەی خۆرهەڵاتی دنیای عەرەبی" بە ڕووی ئێران دا کرایەوە و "دیواری عەرەبی سوننە" لەبەرامبەر ئێران دا ڕووخابوو.

دەرکەوتنی سەدام و پێکهاتەی عەرەبی سوننە لە پێکهاتەی دەسەڵاتی عێراق، خواستە یان نەخواستە ڕۆڵی پێشەنگایەتی میسر و عەرەبستانی سعودی بۆ دنیای عەرەبی سوننە لە ناوچەکەدا لاواز کرد. هەرچەندە سنورەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم هێشتا لەسەر نەخشە ماونەتەوە، بەڵام مومکین نەبوو عێراق'ی تازە بە پێکهاتەی دەسەڵاتی کۆنەوە بە ڕێوەبرێت.

هەروەك چۆن لە مێژوودا لە خاکەکانی میزۆپۆتامیا کراوە، عێراق ببوو بە مەیدانی ململانێی دوو ناوەندی هێزی غەیرە عەرەبی ناوچەکە کە ئەوانیش ئێران و تورکیا بوون.

هەرچەندە شیعەکانی عێراق شوناسی تایبەتی خۆیشیان هەبێت، بەڵام بیانەوێت یان نەیانەوێت لە پێناسەی هێزە ناوچەیی و نێو دەوڵەتیەکاندا بە هێزێك لە مەنزومەی ئێران'دا لەقەڵەم دەدرێن.

لەدوای جەنگی ٢٠٠٣ نەك تەنها یەکێك لە ڕکابەرە سەرسەختەکانی ئێران لەناوچوو و لەو ڕووەشەوە سوودی لە بارە ئاسایشییەکەی ئەو بارودۆخە وەرگرت و جگە لەوەش لە ڕێگەی چەندین ڕێکخراو و کەسایەتی شیعە'وە نفوز و کاریگەری خۆی هەتا بەغدا پەرەپێدا. بەوجۆرەش ئێران لە بونیادنانەوەی

عێراق'ی نوێدا، بەشێوەیەکی بنەڕەتی لە ڕێگەی شیعەکانی عێراق'ەوە کاریگەری خۆی لەسەر هاوسەنگی دەسەڵاتی ئەو وڵاتە دانا و تێیدا بەشدار بوو.

هۆکاری سەرەکی دژایەتیکردنی تورکیا بۆ جەنگی ۲۰۰۳ کە هیچ کات بەشێوەیەکی ئاشکرا ڕانەگەیەنرا پشتی بە نیگەرانییەك بەستبوو: تورکیا نیگەران بوو لەوەی کە بەهۆی روخانی دەسەڵاتی ناوەندی لە بەغدا پێکهاتەیەکی ئەتنی کوردی لە باکووری عێراق'دادەمەزرێت و ئەمەش کاریگەری لەسەر کوردەکان'ی تورکیا دروستبکات. ئەمەش نیگەرانی نەریتی دەوڵەتی تورکیا بوو. تورکیا هەموو کات نیگەران بووە لەوەی کە هەرجۆرە ڕووداوێك کە دەستی کوردەکان'ی عێراق ئاوەڵاتر بکات، لەوانەبە کاریگەری لەسەر کوردەکان'ی تورکیا دابنێت. تاقە کەسێك کە توانیویەتی لەو نیگەرانیە نەریتیەی تورکیا دەرباز بێت، تۆرگۆت ئۆزال بوو. هەرچەندە تورکیا خۆی لە جەنگی ۲۰۰۳ بەدوور گرت، بەڵام نەیتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر خۆی لەبەرامبەر دینامیکە جیۆپۆلەتیکییەکانی عێراق ڕابگرێت و چەند ساڵ دوای جەنگ خۆی بەگوێرەی پارادیگمای عێراق'ی نوێ ڕێکخستەوە. لەلایەکەوە (بەبێئەوەی ناوی بهێنرێت) وەکو ناوەندێکی مێژوویی هێزی سوننەکان، هەوڵیدەدا بۆشایی دەسەڵاتی دوای جەنگ لە عێراق پڕبکاتەوە و لەلایەکی دیکەشەوە هەوڵی ڕێکخستنەوەی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ کوردەکان'ی عێراق دەدا.

ئەو بارودۆخەی کە تۆرگۆت ئۆزال لەساڵی ۱۹۹۱دا پێشبینی دەکرد، دوای ۱۲ ساڵی خۆی دەسەپاند. یەکێك لە گرنگترین ئاستەنگ و تەگەرەکانی بەردەم نزیکبوونەوە لەگەڵ کوردەکان'ی عێراق مانەوەی سەربازی پ.ك.ك لە چیای قەندیل و دەوروبەری بوو کە لەژێر کۆنترۆڵی هەولێر و دەسەڵاتی کوردی عێراق'دا بوو. کۆتاییهێنان بە مانەوەی سەربازی پ.ك.ك لە کوردستان،ی عێراق وەك پێشمەرجی هەر جۆرە کۆبوونەوە و نزیکبوونەوەیەك لەگەڵ کوردەکان'ی عێراق لە قەڵەم دەدرا و لەبەرئەوەی هیچ ئەنجامێکیش لەو بوارەوە دەستنەدەکەوت، ئەو نزیکبوونەوەیە ڕووینەدەدا.

هەرچی چوو بەهۆی بەرژەوەندی هاوبەشی ئابوری و وابەستەیی دوولایەنەی ئابوری بەیەکتر لەگەڵ کوردستان،ی عێراق'دا، بەدەستی ئەنقەست پێشمەرجی پ.ك.ك خرایە ڕیزی دووەم و سیاسەتێك پەیڕەو کرا کە تا ئەندازەیەك ئەو پێشمەرجەی پشتگوێ دەخست.

ئەولەویەتەکان گۆڕابوون و ڕێگا بۆ پەیوەندییەکانی ئەنقەرە- هەولێر خۆش کرابوو. لەم ڕوانگەیەوە سەردانێکی تاڵەبانی لە مانگی یەکی ۲۰۰۸دا، وەك یەکەم سەردانی ڕەسمی خۆی وەك سەرۆك کۆماری عێراق بۆ تورکیا، خاڵێکی وەرچەرخان بوو. پەیوەندییەکانی تورکیا و کوردەکان'ی عێراق لە ئاستێکی بەرزەوە دەستپێکرد و قۆناغی پەیوەندی و سەردانی ڕۆژانەی نێوان تورکیا و کوردستان'ی عێراق دەستپێکرد. لە دیدارە تایبەتەکاندا لەگەڵ کەسانی نزیك لە دەسەڵاتی پارتی دادوگەشەپێدان ئەوەم دەبیست کە لە ڕاستیدا

ئەوان هەر لە ساڵی ٢٠٠٢ەوە ویستبوویان لەگەڵ کوردەکان'ی عێراق پەیوەندی نزیك بەرقەرار بکەن، بەڵام ڕووبەڕووی نارەزاییەکی توندی سەربازەکان بوونەتەوە و قایلکردنی سەربازەکان بۆ ئەو کارەش کاتی زۆری خایاندووە.

یەکێك لەوانە عەلی باباجان بوو کە لە ساڵەکانی نێوان ٢٠٠٧ - ٢٠٠٩ وەزیری دەرەوە بوو و ئەوی دیکەشیان عەبدوڵا گویل بوو.

عەبدوڵا گویل دوای ئەوەی کە بوو بە سەرکۆمار، لە گفتوگۆیەکماندا باسی ئەوەی کرد کە پێویستە تورکیا لە کوردەکان'ی عێراق نزیك ببێتەوە و دەیگوت ئەمەش لەبەرژەوەندی تورکیا دایە و پێویستە بەبێ لە کیس دان و بە بێ فیڕۆدانی کات ئەو پەیوەندییانە بەرقەرار بکرێت و جەختی لەوەش کردەوە کە لەوبارەیەوە فەرمانی پێویستی داوە. ئەو دەوڵەمەندییەکانی ژێرزەوی کوردستان،ی عێراق'ی بەبیرهێنایەوە و وتی:"لە تەنیشت ئێمەدایە. لە چین و لە کۆریا'وە هەموو کەس هاتوون و لەوێ سەرمایەگوزاری دەکەن. ئێمەش تەنها لە دوورەوە سەیر دەکەین. ئەمە شتێکی گونجاوە؟" گرنگترین پاڵنەری ڕووکردنی تورکیا بەرەو کوردستان،ی عێراق فاکتەری ئابوری بوو. عەبدوڵا گویل دەیویست باسی ئەوە بکات کە گرنگترین فاکتەر ئەوەیە.

کاتێك گوێم لە وتەکانی عەبدوڵا گویل دەگرت، قسەکانی ئاشتی هەورامی وەزیری سەرچاوە سروشتیەکانی بەڕێوەبردنی کوردستان،ی عێراق'م بیرکەوتەوە.

مەحمەت سەپیل شەریکی کۆمپانیای جەنراڵ ئۆیل کە لە ناوچەی تەقتەق'ی نزیك کۆیە لە دوو بیری نەوتیدا رۆژانە بە ئەندازەی هەموو ئەو نەوتەی کە لە تورکیا بەرهەم دەهێنرێت نەوتی بەرهەم دەهێنا، جارێك لە سەفەرێکماندا بۆ هەولێر ئاشتی هەورامی بە من ناساندبوو. لەکاتی گەڕانەوەم لە هەولێر بۆ ئەنقەرە، ئاشتی هەورامی'م پرسیارباران کردبوو. ئاشتی هەورامی خەڵکی ئەو هەڵەبجە'یە بوو کە یەکێك لە دڵتەزێنترین کارەسات و کوشتارەکانی مێژوو لەوێ کرابوو. دوای ئەوەی کە ئەندازیاریی نەوتی لە زانکۆی بەغدا تەواو کردبوو، لەلایەن بەڕێوەبردنی بەعس'ەوە بۆ خوێندنی ماستەر رەوانەی بەریتانیا کرابوو، ئەمەش کارێك بوو کە بە ئاسانی بۆ هەر خوێندکارێکی کورد نەدەکرا.

ئاشتی لە بەریتانیا دژی بەڕێوەبردنی ڕژێمی بەعس بوو، بەڵام بە بێئەوەی خۆی زۆر تێکەڵاو بە سیاسەت بکات لە کەرتی نەوتدا کاری کردبوو. لە ساڵی ٢٠٠٣دا گەڕایەوە کوردستان'ی عێراق و لە حکومەتی هەولێر'دا وەك وەزیری نەوت دەستبەکاربوو.

ئاشتی لە ڕێگای هەولێر- ئەنقەرە، سەبارەت بە یەدەگی نەوت و غازی سروشتی کوردستان،ی عێراق زانیاری وردی پێدام. باسی لەوەکرد کە سەرچاوەکانی کوردستان کە هێشتا دەستیان لێنەدراوە بە ئەندازەیەکن

کە پێویستی بەیەدەگی نەوتی کەرکوك نابێت. باسی لەوەکرد کە ئەو کەسانەی زووتر لێرە سەرمایەگوزاری بکەن دەتوانن بۆ داهاتوو دەرفەتێکی ستراتیژی بخەنە دەستی خۆیان و سودی لێوەربگرن و وتی:" پەندێکی پێشینەی ئینگلیزەکان هەیە کە دەڵێت کێ زووتر هات، زووتر دادەنیشێت. ئەم ئیشانەش وەها بەڕێوەدەچن. ئێمە گەلێکی ٤-٥ ملیۆن کەسین و لەسەر دەریایەکی نەوت و غازی گەورەدا مەلە دەکەین. ئەمە بۆ ئێمە زۆر زۆرە و ناتوانین نەوت بخۆینەوە. ئەو نەوت و غازەش کە لەژێر زەویدا دەمێنێتەوە هیچ بەهایەکی نییە. ئێوەش وڵاتێکی گەورە و دراوسێ و گەلێکی بران، دیارە ئەولەویەت بە ئێوە دەدرێت. با پێکەوە دەریبهێنین و بەرهەمی بهێنین و پێکەوە بیپاڵێوین و پێکەوە بیفرۆشین."

لە فڕۆکەکەدا جگە لە مەحمەت سەپیل پسپۆڕەکانی کۆمپانیای نەوتی تورکیا TPAO ش لەگەڵمان بوون. لەو گەشتەدا سەبارەت بە نەوت و غاز زۆر شتم زانی کە دوای ماوەی کورت لە بیرم چوونەوە. بەو ئیلهامەی کە لە ئاشتی هەورامی وەرم گرتبوو، بە رای خۆم یەکێك لە گرنگترین نوسینەکانی نێو ژیانی خۆم بۆ رۆژنامەیەکی ئابوری بەناوی رێفرانس نوسی.

سەرەتای ساڵی ٢٠٠٧ بوو. ناونیشانێکی سەرنجراکێشم بۆ بابەتەکە دانا کە بەوجۆرە بوو:" با لە جیاتی سوپا بە کۆمپانیای نەوتەوە روو لە باکووری عێراق بکەین!" دیارە بە گفتوگۆیەك کەس نابێتە پسپۆڕ، بۆیە دوای ماوەیەکی کورت لەگەڕانەوەم لە هەولێر و لەوشتانەی کە لە ئاشتی‌یەوە فێربووم و لە نوسینەکەمدا بەکارم هێنابوون بەشێکی زۆریانم فەرامۆش کرد. بەڵام خەم نەبوو چونکە لە ئیستانبوڵ لەگەڵ ئاشتی هەورامی زوو زوو یەکترمان دەبینی. لە کۆنفراسێکی تایبەت بە تورکیا و باکووری عێراق کە ناوەندێکی لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە بەناوی ئەتلانتیك کۆنسیل لە ئیستانبوڵ رێکیخَستبوو، وتارێکم پێشکەش کرد و بە گەرمی جەختم لە پێویستی بەرقەرارکردنی پەیوەندی لەگەڵ بەڕێوەبردنی کوردی عێراق کرد و دوای وتارەکەشم یاداشتێکم دا بە ئاشتی هەورامی کە لەوپەڕی مێزەکەوە دانیشتبوو و نوسیبووم:" تکایە دەتوانی جارێکی دیکە ئەو ژمارانەم بۆ بنوسیتەوە؟"

لە تەواوی دنیا هیچ کەسێك لەمبارەیەوە بە ئەندازەی ئاشتی هەورامی شارەزا نەبوو. دواتر لە کاغەزێکدا وەڵامەکەی بۆ ناردمەوە و هیچ کاتێکێکیش ونم نەکرد. لە کاغەزەکەیدا وەهای نوسیبوو

| | |
|---|---|
| " رۆژانە | ٥٠٠ هەزار بەرمیل |
| بەکارهێنانی ساڵانەی غازی سروشتی | ٣٦ ملیار مەتری سێجا |
| یەدەگی نەوتی کوردستان‌ی عێراق | ٤٥ ملیار بەرمیل |
| یەدەکی غازی سروشتی | ٦ هەزار ملیار مەتری سێجا |
| بەرهەمهێنانی نەوتی کوردستان‌ی عێراق | |

| | |
|---|---|
| ٢٠٠٩ | ڕۆژانە ١٠٠ هەزار بەرمیل |
| ٢٠١٠ | ڕۆژانە ٣٠٠ هەزار |
| ٢٠١١ | ڕۆژانە ٥٠٠ هەزار |
| ٢٠١٢ | ڕۆژانە ٧٥٠ هەزار |
| ٢٠١٣ | ڕۆژانە یەك ملیۆن بەرمیل |

ژێرخانی پێویست بۆ هەناردەکردنی غازی سروشتی نیە، بەڵام دەکرێ دەرفەتێك دروستبکرێت بۆ ئەوەی کە ساڵانە ٦٠-٧٠ ملیار مەتری سێجا غازی سروشتی هەناردە بکرێت."

ئەو لایەنە ستراتیژیەی کە عەبدوڵا گویل لە پەیوەندی لەگەڵ کوردستان ی عێراق دا درکی پێکردبوو، بە ئاسانی لەو ژمارانەوە دەردەکەوت.

ئاشتی هەورامی لە ٢١ی ئەیلولی ٢٠١١ لە پەرلەمانی هەرێمی کوردستان ئەوەی بۆ رای گشتی ئاشکرا کرد کە لیسانسی کارکردنی بە چەندین کۆمپانیای بیانی داوە کە لە ٤٢ کێڵگەی نەوتدا کار بکەن و وتی:" لەسایەی ئەو گرێبەستانەی کە حکومەتی هەرێمی کوردستان کردوویەتی، ئیدی دەزانین کە ئەم ناوچەیە ٤٥ ملیار بەرمیل یەدەگی نەوتی هەیە و نزیکەی ٣-٦ تریلیۆن مەتری سێجا یەدەگی غازی سروشتی هەیە." ئەو روونکردنەوەیەی ئاشتی هەورامی پشتڕاستکردنەوەی زانیارییەکانی ناو ئەو یاداشتە بوون کە چەند ساڵ لەوەوپێش بە منی دابوو.

سیاسەتی تورکیا بەرامبەر بە عێراق و کوردستان ی عێراق لەکاتێکدا دە ساڵی یەکەمی دووهەزارەکانی تەواو دەکرد، بەهۆی تێگەیشتن لەو داتا و زانیاریانەوە، وردە وردە ئەولەویەتی ستراتیژی و ئابووریان بۆدانرابوو. سەرەڕای هەموو هەڵبەز و دابەز و درەنگ کەوتنەکان، پەیوەندی تورکیا و کوردەکان ی عێراق لەو چوارچێوەیدا شکڵی دەگرت کە من خەیاڵم کردبوو. ئەمەش یەکێك لە ئەنجامە باشەکانی جەنگی ٢٠٠٣ بوو. چاوەڕوانی من سەبارەت بە جەنگی ٢٠٠٣ تەنها رووخانی رژێمی سەدام حسێن نەبوو، بەڵکو بیرم لەوەدەکردەوە کە لەگەڵ ئەوەشدا لاپەڕەیەکی نوێ و باش بۆ کوردەکان لە مێژوودا هەڵدەدرێتەوە. لە روانگەی منەوە ئەوەی بۆ کوردەکان باش بوو بۆ تورکەکان یش باش بوو.

**پیلانگێڕی، جگە لە ڕێککەوتنێکی نهێنی نێوان چەند کەسێک سەبارەت بەو سیاسەتانەی کە ناوێرن لەبەردەم خەڵکدا ئاشکرای بکەن هیچ شتێکی دیکە نییە.**

**مارک تواین**

**حکومەتەکانی ئەمڕۆ تەنها لەگەڵ حکومەتەکانی دیکە، ئیمپراتۆریا و پادشایی و وەزیرەکانی دیکەدا سەروکاریان نییە، بەڵکو ناچارن لە هەمانکاتدا لەگەڵ ئەو کۆمەڵە نهێنیانەش دەست و پەنجە نەرم بکەن کە لە هەموو شوێنێک سیخوڕی بێشەرم و بێعاریان هەیە و لە دوایین کاتەکاندا پلانی حکومەتەکان تێک دەدەن.**

**بنجامین دیسرایلی سەرۆک وەزیری بەریتانیا ١٨٧٦**

لە ساڵی ٢٠٠٣دا تورکیا لەکاتێکدا خۆی لە جەنگ پاراستبوو، دەیویست سیاسەتێکی دژە کورد و لایەنگرانە لە تورکمانەکان پەیڕەو بکات کە بەهیچ جۆرێك مومکین نەبوو لە عێراق پیادە بکرێت. ئەمە، بە تایبەتی دیدگای سوپا بوو کە لەدوای مەرگی تۆرگوت ئۆزال لە ناوەندی بڕیاردانی تورکیا سەبارەت بە کێشەی کورد باڵا دەست ببوو. سوپا لە ڕوانگەیەکی ئەمنییەوە سەیری عێراق و پرسی کوردی دەکرد. ئەو یەکەیەی کە لە کردەوەدا سیاسەتی کۆکردنەوەی تورکمانەکان و سیاسەتی دژە کوردی سوپای جێبەجێ دەکرد، بە هێزە تایبەتەکان ناوزەد کرابوو.

ماوەیەکی کورت لەدوای مەرگی تۆرگوت ئۆزال دۆسیەی تورکمان لە دەست دەزگای هەواڵگری نەتەوەیی (میت) دابوو، بەڵام پاش ماوەیەکی دیکە ڕادەستی هێزە تایبەتەکان کرا. جێبەجێکردنی سیاسەتێکی دژە کوردی لەو شێوەیە لە هەلومەرجەکانی عێراق ی نوێدا نامومکین بوو. ئەو سیاسەتە نالەوانەبەی تورکیا بووە هۆی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ئەمریکا کە جێ پێی خۆی لە عێراق قایم کردبوو.

دەستگیرکردنی ئەفسەرەکانی هێزە تایبەتەکانی تورکیا لە سلێمانی لە دوانیوەڕۆی هەینی ٤ی تەموزی ٢٠٠٣دا کە هاوکات بوو لەگەڵ ساڵیادی ڕۆژی سەربەخۆیی ئەمریکا، لوتکەی ڕووبەڕووبوونەوەی تورکیا و ئەمریکا لە عێراق بوو. هێزەکانی ئەمریکا لەو ڕۆژەدا توورەکەیان کردە سەر ئەو ئەفسەرانە و سەرەتا ڕەوانەی کەرکوك یان کردن و دواتر بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە بەغداد دەستبەسەریان کردن.

ئەو ڕوداوە، لە تورکیا توورەیی و ناڕەزاییەکی گەورەی وروژاند و ئەو هەستی دژە ئەمریکاییەی کە خۆی لە خۆیدا لە رای گشتیدا هەبوو گەیاندیە ئاستێکی زۆر بەرز. پەیوەندییەکانی تورکیا و ئەمریکا ش تا ئەندازەیەك بۆ ئاستێکی زۆر نزم دابەزیبوو.

من و ئیلنور چەڤیك بۆ یەکەمجار ئەو ئەفسەرە تورکانەمان بینی کە لەدوای دەستگیرکردن و توورەکە کردنە سەریان لە سلێمانی لەلایەن هێزەکانی ئەمریکا وە ئازادکرابوون. لەو ناوەندەی کە لە سلێمانی لەلایەن هێزە ئەمریکاییەکان ەوە دەستگیرکرابوون و توورەکە کرابووە سەریان، من و ئیلنور چەڤیك نزیکەی

سێ کاتژمێر قسەمان لەگەڵ ئەندامانی هێزە تایبەتەکاندا کرد و لەوەشەوە بۆمان دەرکەوت کە ئەمانە بە چ روانگەیەکەوە لە ٢٠٠٣دا لە کوردستان ی عێراق جوڵاونەتەوە.

لەدوای جەنگ، لە٧ی تەموزی ٢٠٠٣دا بۆ یەکەم جار پێمان نایە خاکی کوردستان ی عێراق و لە رێگای زاخۆ و دهۆك چووینە موسڵ و لەوێشەوە دەربازی هەولێر بووین. لە هەولێر یشەوە چووینە سەڵاحەدین و لەوێش لە میوانخانەی پارتی دیموکراتی کوردستان کە لە هەلومەرجەکانی جەنگدا میوانداریيەکی پێشبینی نەکراو و پڕ لە ئاسوودەیيان پێشکەشدەکرد، شەومان بەسەر برد. دوو رۆژ دواتر لە ٩ی تەموزدا، بەیانی زوو چووینە کۆیە و لەوێشەوە لە چیای هەیبەت سوڵتان و دوکان ەوە رێگای سلێمانی مان گرتەبەر.

بۆ یەکەم جار لەدوای رووخانی سەدام، لە سلێمانی لەگەڵ بەرهەم ساڵح دۆستی کۆنمان کە سەرۆك وەزیری حکومەتی کوردی لە سلێمانی بوو دیدارمان دەکرد. کاتێك لە میوانخانەکەوە تەلەفۆنمان بۆ بەرهەم کردبوو، پێیگوتبووین:"یەکسەر وەرن."

لەوکاتانەدا لە هەولێر حکومەتێکی کوردی سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان و لە سلێمانی ش حکومەتێکی دیکە سەر بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەبوون. ئەم دوو بەڕێوەبردنیە دواتر لە ساڵی ٢٠٠٦دا یەکیان گرت و بە مەرکەزیەتی هەولێر یەك بەڕێوەبردنی کوردییان پێکهێنا. کاتێك دەچووم بۆ سلێمانی، لە خۆشی ئەوە دابووم کە دەتوانم بەشێکی گرنگ لە خاکەکانی کوردستان ببینم و بەمجۆرەش مەراقێکی چەند ساڵەی خۆم تێر دەکەم. لە سلێمانی چووین بۆ تاکە هۆتێلێکی رێکوپێکی ئەو شارە بەناوی سلێمانی پاڵاس کە بەرهەم ساڵح ئاراستەی ئەوێی کردبووین. لە پێشوازییەکە وتمان بۆلای سەرۆك وەزیر بەرهەم ساڵح هاتووین. کارمەندی پێشوازی هۆتێلەکە کە وەکو ئەندامێکی نوسینگەی پەیوەندیەکانی بەرهەم کاری دەکرد، پێی وتین:"دکتۆر بەرهەم لە کۆبوونەوەیەکدایە، لێرە دانیشن کاتێك تەواو بوو ئاگاداری دەکەینەوە. چاوەڕوانیی ئێوەی دەکرد. ئەو خۆی فەرمانی دا کە ئەمەتان پێ بڵێم." کاتێك ئەو زانیارییەمان وەرگرت، پرسیارمان کرد کە کۆبوونەوەکە چەندە دەخایەنێت؟ دیار نەبوو، لەوانەیە یەك دوو کاتژمێری دیکەی بخایاندایە. بە ئیلنور م گوت:" لە جیاتی ئەوەی بێ هیچ ئیشێك لێرە دانیشین، با تەلەفۆنێك بکەین بۆ ئەفسەرەکانی خۆمان و سەردانێکیان بکەین و دڵنەواییان بکەین."

ئەو تورکیا یەی کە دوو رۆژ لەوەو پێش جێمان هێشتبوو، رۆژانێك بوو قسەوباسی لەسەر ئەوان دەکرد و بەوانەوە شەو و رۆژی دەکردەوە. کاتێك لە خابور ەوە دەبازی کوردستان ی عێراق ببووین، ئەوەمان زانیبوو کە ئەفسەرەکانی هێزی تایبەت ئازادکراون. پێموابوو ئەگەر بە بێ بینینی ئەوان لە سلێمانی بگەڕێمەوە، لە پیشەی رۆژنامەوانیمدا کارێکی نارەوا دەکەم. بەڵام ئەوانمان لەکوێ دەدۆزییەوە؟ لە میدیاکانی خۆماندا ئەوەم خوێندبووەوە کە ئەو شوێنەی سەربازەکانی ئەمریکا لەوێ ئەفسەرە تورکەکانی هێزی تایبەتیان

دەستگیر کردووە، لە نزیك رادیۆی بەرەی تورکمانی'دا بووە.

ئەگەر ئێزگەی رادیۆی بەرەی تورکمانی'مان بدۆزیبایەتەوە دەمانتوانی ئەوانیش پەیدا بکەین. دۆزیمانەوە. تەنها ١٠-١٥ خولەك دوای ئەوەی کە هاتینە سلێمانی، لەبەرامبەر نوێنەری بەرەی تورکمانی عێراق لە سلێمانی دانیشتبووین. پرسیاری ئەفسەرەکانمان لێکرد. لە هەمان بینادا بوون. بەڵام دەبوایە لە کۆڵانی ئەودیوەوە بچوباینە ژوورەوە. چووینە دەرەوە و سوڕاینەوە و لەخەیاڵی خۆماندا بیرمان لەوە کردەوە کە دەکرێت بەسەردادانەکە و دەستگیرکردنەکە چۆن بووبێت. کاتێك لە دەرگای پشتی ئەو بینایەی کە هێزی تایبەت و رادیۆی بەرەی تورکمانی بە هاوبەشی بەکاریان دەهێنا، چووینە ژوورەوە چەند کەسێکمان بینی کە بە فانیلەی سەربازی رەنگی خاکی و پانتۆڵی کابۆی شینەوە دانیشتبوون.

لەنێو یەکێك لەوانەدا کەسێك کە بە "رائید ئایدن" بانگیان دەکرد و یەکسەر دەتزانی ئەو فەرماندەیانە وتی:" بەخێرهاتن جەنگیز بەگ" باوەشمان بە یەکدا کرد و وتم:" بە سەلامەتی بێت." دوای ئەوەش لە دەوری ئەو قۆری و کتریەی کە ئاوەکەی دەکوڵا دانیشتین و قسەوباسێکی دوورودرێژمان دەستپێکرد. سەبارەت بە وردەکارییەکانی رووداوەکە زۆر قسەمان نەکرد. رائید ئایدن چەند جارێك ویستی رووداوەکەمان بۆبگێڕێتەوە، بەڵام چەند کەسێك لە هاوڕێکانی کە وادیاربوو تازە لە تورکیا هاتبوون و ئەوانیش هەمان پلەی ئەویان هەبوو، قسەکەیان پێ دەبڕی و نەیاندەهێشت درێژەی پێبدات. بۆیە زیاتر باسی رووداو و پێشهاتە سیاسیە گشتیەکان و سیاسەتی تورکیامان لەبارەی عێراق کرد.

"بین باشی ئایدن" رەخنەی لە سیاسەتی دەوڵەت سەبارەت بە عێراق دەگرت، بەڵام وەکو پێشبینی دەکەن رەخنەکانی ئەو زۆر جیاواز بوون. ئەو ئەفسەرەی هێزی تایبەت لەنێو قسەکانی خۆیدا باسی لەوەکرد کە بست بە بستی باکووری عێراق و باشوری خۆرهەڵاتی تورکیا دەزانێ و ساڵانێك لەو ناوچانەدا شەڕی کردووە و دەیگوت:" تورکیا زۆر روو بە کوردەکان دەدات و تورکمانەکان'ی پشتگوێ خستووە." خۆ ئەگەر من پرسیارێکی بێمانای وەکو" یەعنی رەخنە لە دەوڵەت دەگرن؟"م لێ نەکردبایە، لەوانەیە بە وردی بیروبۆچوونەکانی خۆی باس بکردایە. بەڵام کاتێك من ئەو پرسیارەم کرد یەکسەر خۆی کۆکردەوە و وتی:" حەدم نیە رەخنە لەبەرێوەبەرانی دەوڵەت بگرم." و بابەتەکەی گۆڕی.

من زانیاریم لەسەر کەسێك هەبوو بە ناوی ئالبای(کۆلۆنێل) شەفیق کە ناوە نهێنیەکەی "ئۆزدەمیر" بوو و ئەو زانیاریەی من لەبارەی ناوبراو، رۆڵی هەبوو لەوەی کە قسەوباسەکەمان لەگەڵ "بین باشی ئایدن"دا گەرم و گوڕتر بێت. لەنێو ئەو کەسانەی کە لە تورکیا سەبارەت بە بابەتەکانی عێراق و کوردەکان و تورکمان و باکووری عێراق و... تاد، دەنوسن زۆر زەحمەتە رۆشنبیرێك پەیدا بکەی کە ئۆزدەمیر بناسێت. ئاگاداربوون لە "ئۆزدەمیر" مانای ئەوەبوو کە ئاگات لە مێژووی باکووری عێراق لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم هەیە.

کاتێك "بین باشی ئایدن" زانی من ئاگام لە "ئۆزدەمیر" هەیە و دەزانم چی کردووە ئاسوودە بوو. کاتێك ئەویش ئاسوودە بوو، قسەوباسەکانمان گەرمتر بوو. "بین باشی ئایدن" کە دیاربوو ناوێکی نهێنیە و ناوی راستەقینەی خۆی نیە دەیویست، ئەو تێبینیە بدات کە کەسێکی وەکو "ئۆزدەمیر"ی بۆ خۆی بە نمونە وەرگرتووە.

"ئۆزدەمیر" ناوی نهێنی کەسێك بووە بە ناوی ئالبای شەفیق، کە لە سالانی تێکۆشانی نەتەوەیی تورکیا وەك نوێنەری قوای میللیە(هێزە نەتەوەییەکان) لە خاکەکانی باکووری عێراق لە رەواندوز بڕیارگەی خۆی داناوە و لەدوای دەرکەوتنی کێشەی موسڵ هەوڵیداوە کوردەکان لە دژی بەریتانیەکان هانبدات. "ئۆزدەمیر" بەهۆی کارەکانی خۆیەوە بۆ ئەوەی کە ویلایەتی موسڵ بخرێتەوە سەر تورکیا تووڕەیی و بێزاری ئینگلیزەکان ی وروژاندبوو.

زۆر زەحمەت نەبوو کە درك بەوە بکەم "بین باشی ئایدن" رۆڵێکی وەکو رۆڵی "ئۆزدەمیر"ی بۆخۆی بە گونجاو زانیوە. "ئۆزدەمیر" هەوڵیدابوو کوردەکان ی موسڵ لە دژی بەریتانیا بوروژێنێت و بەوەش کارێك بکات کە تورکیا لەو کێشەیەدا بیباتەوە. لەوانەیە کەسێکی وەکو "بین باشی ئایدن" هەشتا ساڵ دوای "ئۆزدەمیر" لە هەلومەرجێکی جیاوازدا ویستبێتی لە رێگەی تورکمانەکان ەوە کاری کوردەکان و ئەمریکا کە هەموو کەس پێیوابوو پشتگیری لە کوردەکان دەکات تێکبدات. لەگەڵ ئەمەشدا خۆی دەپاراست لەوەی کە ئەمریکاییەکان بکاتە ئامانجی قسە و رەخنەکانی و تاوانی دەستگیرکرانی لەلایەن ئەمریکیەکان ەوە دەخستە ئەستۆی تاڵەبانی.

ئەو دەستەواژانەی کە بۆ باسکردن و پێناسەکردنی تاڵەبانی بەکاری دەهێنان، بەشێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش هاوشێوەی ئەو دەستەواژانەبوون کە یەکێك لە دامەزرێنەرانی ژیتەم (دەزگای هەواڵگری ژەندرمەی تورکیا) بەنازناوی "جەم ئەرسەڤەر" کە لە ساڵی ۱۹۹۳دا بەشێوەیەکی رازدار و پڕ لەنهێنی کوژرا، بۆ تاڵەبانی بەکاری دەهێنا.

کاتێك "بین باشی ئایدن" باسی تاڵەبانی دەکرد بەشێوەیەکی ئاشکرا خۆی تووڕە دەکرد و دەیگوت:" ئەوە ناتوانێت هەروا بەبێ هیچ حیساب و کیتابێك سیخوڕی بۆ بەریتانیا بکات، هەڵبەت رۆژێك باجی ئەو کارەی دەدات." دیارە من و بیروبۆچوونەکانی منی لەبارەی ئەو رووداوە نەدەزانی و ئاگای لە رابردووی من و تاڵەبانی نەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا دەیگوت:" ئێوە باش دەزانن تاڵەبانی پیاوی ئینگلیزەکان ە." و کاتێکیش ئەم قسەیەی دەکرد وا خۆی دەردەخست کە ئەو قسانەی کە دەیکات هەمووی "پشت بە زانیاری روونی هەواڵگری" دەبەستن. لەکۆتایی دیالۆگێکی زۆر سەیردا زانیم کە بیروبۆچوونەکانی "بین باشی ئایدن" سەبارەت بە کوردەکان بۆنی رەگەزپەرستییان لێ دێت.

پرسیاری ئەوەی لێکردبووم کە "شاری سلێمانی بەلاتەوە چۆنە؟" لە وەڵامدا وتم:" هەمووی کاتژمێرێك نابێت کە هاتووم. بەڵام خۆی دوو رۆژ بەر لە ئێستا پێم ناوەتە خاکی باکووری عێراق. لە خابورەوە هاتینە دهۆك و لەوێشەوە چووینە موسڵ و لەوێشەوە دەربازی هەولێر و دواتر بەرەو سلێمانی بە رێ کەوتم، لەنێو ئەو شارە کوردییانەی کە من بینیم، بە تێبینیەکی سەرەتایی و قەبەوە دەتوانم بڵێم کە لەنێو هەموویاندا ئەوەی کە شارێکی رێکوپێك بێت، شاری سلێمانی‌یە."

بین باشی ئایدن وتی:" ئەوەش هەمووی لە سایەی سەری ئێمەوەیە. وەرن با شتێکتان پیشان بدەم." و دوای ئەوەش منی هەستاندە سەرپێ بەیەکەوە بەرەو توالێتەکە رۆیشتین. وتی:" فەرموون، ئێمە ئەمەمان بۆ ئێرە هێناوە بەڵام ئایا دەکرا ئەمە بەم مرۆڤانە بکرێت؟ لە راستیدا ئێمە خراپەمان بەم مرۆڤانە کرد. ئەمان خۆیان دابونەریت و کەلتورێکی خۆیان هەبوو، چ پێویستی دەکرد ئێمە ئەو شتانە پێشکەشی ئەم مرۆڤانە بکەین؟"

بەلۆعەیەکی توالێتە غەربیەکەی پیشانی مندا کە بۆ خۆ پاککردنەوە بەکاردەهات و وتی:" ئەم مرۆڤانەی ئێرە، سەدان ساڵ بە بەرد خۆیان پاك کردۆتەوە، ئێمە بە چ هەقێکەوە دەستمان لە دابونەریتی ئەواندا وەرداوە؟" و بە رستەیەکی تەنزئامێزەوە ویستی ئەوە بڵێت هێزی تایبەتی تورکیا رۆڵی بە مەدەنی کردنی کوردەکان‌ی عێراق دەگێرێت.

گەورەترین نارەزایی "بین باشی ئایدن" سەبارەت بە سیاسەتی دەوڵەت لە باکووری عێراق ئەوەبوو کە " ئەو وزەیەی بۆ کوردەکان خەرجی دەکەین، پێویستبوو بۆ تورکمانەکان‌ی خەرج بکەین." و بەوجۆرەش باسی لە بیروبۆچوونەکانی خۆی دەکرد.

بەر لەوەی کە خواحافیزی لە "بین باشی ئایدن" بکەین، قسەیەکیتریشی لە دەم دەرچوو. کێ دەزانێت لەوانەیە لە دەمیشی دەرنەچووبێت بەڵکو ویستبێتی پەیامێك بدات. ویستم تۆزێك لەبارەی شێوازی دەستگیرکردنەکەیان لەلایەن ئەمریکییەکان‌ەوە کە شێوەیەکی سوکایەتی پێکردنی تێدا بوو دڵنەوایی بدەم و وتم:" هەڵبەتە ئەو شتەی کە بەسەرتاندا هاتووە زۆر ناخۆشە، بەڵام ئاسوودەبن کە هیچ شتێك لە خوت و خۆرایی نیە و هەموو شتێك لە کیس نەچووە. ئێمە ٤٨ کاتژمێر بەر لە ئێستا لە تورکیا بووین، دەستگیرکرانی ئێوە لە تورکیا نارەزایی و توورەیەکی زۆری ورووژاندووە. بەو ئەندازەیەی کە هەڵبژاردەی تورکیا لە ساڵی ٢٠٠٢ کاتێك لە یاری جامی جیهانیدا بە پلەی سێیەم گەرایەوە بۆ تورکیا، توورە بوو، بە هەمان ئەندازەش توورەیە لەوەی کە ئێوە بەوجۆرە دەستگیرکراون." دواتر "بین باشی ئایدن" وتی:" دەزانین. سوپاسی کاك دۆغو پەرینچەك دەکەین. یاخوا سەلامەت بێت. دەزانین چی بۆ ئێمە کردووە."

سەرم سورما لەوەی کە " بین باشی ئایدن" بە "کاك" باسی دۆغو پەرینچەك‌ی کرد و ویستی کە ئەو

خۆپیشاندانی پشتگیری کردنانەی کە لە تورکیا سەبارەت بەوان ڕێکخرابوو و بە کار و بەرهەمی دەستی دۆغو پەرینچەك'ی بزانێت. بەڵام ئەمەم بۆ ئەو باس نەکرد.

لەو کاتەدا بە خێرایی لە زەینمدا بیرم لەوە کردەوە کە دۆغو پەرینچەك لەگەڵ هێزی تایبەت و یەکە سەربازییەکانی وەکو ژیتەم و دەزگا هەواڵگرییەکاندا پەیوەندی تایبەتی هەیە. چەند ساڵ دوابەدوای ئەوەش کە لە دۆسیەیەکی وەکو دۆسیەی ئەرگەنەکۆن'دا دۆغو پەرینچەك'م لە ریزی گرنگترین تاوانبارەکاندا دەبینی، بەهۆی ئەو شتانەی کە لە یادگەمدا مابوونەوە، هیچ سەرم سووڕنەما.

کاتێك لە سلێمانی یەکێك لە پاڵەوانە سەرەکییەکانی ڕووداوی "توورەکەکەی سلێمانی" بەوجۆرە بە سوپاسەوە باسی" کاك دۆغو پەرینچەك'ی خۆی" دەکرد، قسەیەکی ئەبو خالد بە ڕێوەبەری فەتح و هاوڕێی نزیکم بیرکەوتەوە کە لە ساڵی ١٩٧٣ لەکاتی جیابوونەوەم لە بەیروت پێی گوتبووم. ئەبو خالد لەکاتێکدا کە خواحافیزیمان لەیەك دەکرد بەو هەستەی کە لەوانەیە جارێکی دیکە یەکتر نەبینینەوە (خۆی لەخۆیدا ساڵی ١٩٧٦دا لە جەنگی ناوخۆیی لوبنان شەهید بوو) داوای لە من کرد کە بەڵێنێکی پێبدەم:

" ئەگەر رۆژێك هات و گەڕایتەوە بۆ تورکیا، بەهیچ جۆرێك لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەت کە لە زیندان دەردەکـەون یەکنەگریتەوە و جارێکیتر دوای زیندووکردنەوەی پەیوەندییەکانی حیزبەکەی جارانت نەکەوی."

پێمگوتبوو:"من نیازێکی وام نیە و تازە ئیتر دەفتەری ئەو حیزبەم داخستووە، بەڵام بۆچی هەستت بەوە کرد کە پێویستە ئەم قسەیە بە من بڵێی؟" لە وەڵامدا وتی:" چونکە قسەیان کرد. ئەگەر سەرکردەی ڕێکخراوێکی نهێنی قسەبکات و خۆی بەدەستەوە بدات ئیتر ئەو ڕێکخراوە کۆتاییپێهاتووە. نازانیت ئایا ئیش بۆ پۆلیس دەکات یان نا." نارەزاییەکەم پیشان نەدا بەڵام وتم:" من ئەشکەنجەم نەبینیوە و نازانم ئەگەر ئەشکەنجەشم بدیبایە چیم دەکرد، ناتوانم بڵێم کە ئەوان لەمن بەهێزترن، لەوانەیە ئێستاش لەگەڵ ئەواندا یەك بیروبۆچوونمان نەبێت، بەڵام پێموایە لەمبارەیەوە ناهەقی بەرامبەر بەوان دەکرێت." ئەبوخالد خۆی جدی تر کرد و وتی:" سەیرکە. من نالێم ئەگەر تۆ بوایەی قسەت نەدەکرد. باسی شتێکی دیکە دەکەم. ئەمەشت وەکو بە ڕێوەبەری ڕێکخراوی فەتح بۆ باس دەکەم کە هەموو دنیا دەیناسێ و دەزانێ چییە. لەنێو ئێمەش کەسانێك هەبوون کە لەژێر ئەشکەنجەی ئیسرائیل'دا قسەیان کردووە، بەڵام ئەو کەسانە لە کادیرانی سەرۆکایەتی و سەرکردایەتی ڕێکخراوەکە نەبوون. لە دنیادا کەس نازانێت کە ڕێکخراوەکەی ئێوە چییە و ڕێکخراوەکەتان ناناسرێت. ئەشکەنجە چییە؟ بریتیە لە شکانی بەرگری جەستەیی و خۆبەدەستەوەدان. ئەنجامەکەی چییە؟ ئەنجامەکەی ئەوەیە تا ئەوکاتەی ئەوشتانەی کە لات پیرۆز بووە و ئەو شتانەی کە سوێندت خواردووە کە ئەگەر بشمری قسەی لەسەر ناکەی باسیان دەکەی، هاوڕێکانی

خۆت بەدەستەوە دەدەی، ئایا روخانێکی لەمە گەورەتر هەیە؟ بەڵام هەنگاوێکی دوای ئەمەش ئەوەیە کە پۆلیس پێشنیارێك دەکات و دەڵێت پێویستە ئیش بۆ ئێمە بکەی. تەنها ئەمەش نییە، ئەگەر بڵێی ئەمە ناکەم ئەو کاتە ڤۆڵتاژی کارەباکە بەرز دەکەنەوە و هەموو شتێك تەواو دەبێت. تۆش بە تەواوی رووخاوی و خۆت داوە بەدەستەوە. ئەنجامی کاری یەکەم ئەوەیە کە لە رێگەی داوانامەیەکەوە دەردەکەوێت کە چۆن هاورێکانت بەدەستەوە داوە. ئەنجامی دووەمیش ئەوەیە کە هاوکاری کردنت لەگەڵ پۆلیس هەرگیز نازانرێت و بە نهێنی دەمێنێتەوە. لەبەر ئەوەیە دەڵێم کە ئەگەر سەرکردایەتیی رێکخراوێکی نهێنی خۆی دابێت بەدەستەوە، ئیدی ئەو رێکخراوە لەناوچووە و ناکرێت لەگەڵ ئەو رێکخراوەدا کار بکەی. چونکە تۆ نازانی لە راستیدا ئەو رێکخراوە بەدەست کێیە و کێ بە رێوەی دەبات."

نزیکەی بیست ساڵ دوای ئەو هۆشدارییەی ئەبو خالد، کاتێك کە پەیوەندی نێوان ئۆزاڵ - تاڵەبانی'م دروستدەکرد، دۆغو پەرینچەك و کەسانی دەوروبەری لە خوت و خۆڕایی و بە بێئەوەی کە لە بەرنامەدا هەبێت، بەشێوەیەکی بەردەوام هەوڵی تیرۆرکردنی کەسایەتی منیان دەدا. درۆ و بوختانی دۆغو پەرینچەك و کەسانی دەوروبەری کە بە بێ حەیاییەوە بۆ من هەڵیاندەواسی گەیشتبووە ئەو ئاستەی کە تەنانەت کوژرانی حەوت هەشت تورك لە پێکدادانێکی ئیسرائیل لە شوباتی ١٩٧٣دا بخەنە ئەستۆی من و بە درۆ ئەوە بڵاوبکەنەوە کە من ئەو کارەم کردووە.

شارەزایی پەیداکردنیان لە بڵاوکردنەوەی دژە زانیاری و ئەنجامدانی ئەوە وەکو پیشەیەك بۆخۆیان، دەریدەخست کە ئەو جۆرە کەسانە چۆن تێکەڵاوی چالاکییە نهێنی و چەپەڵەکانی هەواڵگری بوون و هەروەها هۆشدارییەکەی ئەبوخالد'یشی بۆ من پشتڕاستکردەوە. قسەکەی ئەو راست دەرچوو.

بۆرا گویزەن و ئەو تورکانەی دیکە کە لە هێرشەکەی ئیسرائیل'دا کوژرابوون، لە ئەنجامی مامەڵەیەکی پیس و نهێنی دۆغو پەرینچەك'دا لەو کەمپە جێگیر کرابوون.

مەلەك ئولوگای لە کتێبێکدا بەناوی "دوو ژن لە سەردەمێکدا" کە لەگەڵ ئۆیا بایدار نوسیویانە، باسی لایەنە شاراوە و ئازاردەرەکانی ئەو رووداوە دەکات و نزیکەی چل ساڵ دوای ئەوە راستیەکانی ئەو رووداوەی لەو کتێبەدا دەرخستووە (خانەی بڵاوکردنەوەی جان، ئیستانبوڵ، ٢٠١١):

" هیچ یەك لە پیاوەکانم نەدەناسی. یەکێك لەوان بە ئینگلیزی قسەی دەکرد و منیش وتەکانیم وەردەگێڕایەوە. ئەو پێشنیارانەی کە دەکران زۆر روون بوون. هاورێکانی ئێمە لە کەمپەکەدا مەشقی سەربازییان دەبینی و لە رووی سەربازییەوە رادەهێنران، لەبەرامبەر ئەوەشدا لە ئەڵمانیا بەشداری چالاکییە تیرۆریستیەکانیان دەکرد. تێگەیشتبووم کە ئێمە لەگەڵ گروپی ئەیلولی رەش'دا سەروکارمان هەیە... پێمگوت ئێمە بەشداری پلانێکی لەو شێوەیە ناکەین و لە نێوخۆماندا بە تورکی دەستمان بە قسە کرد... وادیاربوو

كە بۆرا دەچووە ئەو كەمپە تازەیە و منیش لە بەیروت دەمامەوە. ڕێگاكانمان لە یەك جیادەبووەوە... ئەو كەمپەی كە بۆی دەڕۆیشتن كەمپی نەهرەلبارید لە كەناری دەریا لە نزیك شاری ترابلوس شام'دا بوو. ئەبوخالد كە دۆستێكمان بوو لەنێو ئەلفەتح، پێی گوتبووم ئەو كەمپە شوێنی ڕێكخراوەكانی هاوشێوەی ئەیلولی رەش'ە و لەژێر كاریگەری ئەوانەدایە، بۆیە شوێنێكی جێگەی متمانە نیە... بۆیە زۆر دژی ئەوەبوو كە بۆرا و هاوڕێكانی دیكە بچن بۆ كەمپی نەهرەلبارید. بەگوێرەی ئەو، ئەو كەمپە شوێنێكی جێی متمانە نەبوو هەموو كاتێكیش ئەگەری ئەوە بوو كە هێرش بكرێتە سەری..." ( ل٢٤٣-٢٤٥)

من مەلەك ئۆڵوگای و بۆرا گویزەن'م بە ئەبو خالد ناساندبوو. لەكاتێكدا كە من لە هەموو تەمەنی خۆمدا سوپاسگوزاری شەهیدی فەتح و هاوڕێی قارەمانی فەلەستین'یم ئەبوخالد دەكەم، "بین باشی ئایدن" كە لە هێزی تایبەت لە شاری سلێمانی لە كوردستان،ی عێراق كاری دەكرد، سوپاسگوزاری" كاك دۆغو پەرینچەك'ی" خۆی بوو.

جێی سەرنجە كە ڕێك یەك ساڵ دوای ئەو گفتوگۆیەم لەگەڵ "بین باشی ئایدن" لە سلێمانی، لە ١٨ی تەموزی ٢٠٠٤دا بووم بە وێنەی سەر بەرگی گۆڤاری ئایدنلك كە هی دۆغو پەرینچەك بوو. لەسەر وێنەكەم لەبەرگی گۆڤارەكەدا نوسرابوو:"دوایین فێڵێك بەرەو ٣٠ی ئاب، چاندار ڕێخۆشكەر بووە بۆ ئۆپەراسیۆنەكەی سی ئای ئەی" داستانێكی بێ مانای وەك ئەوەی كە گوایە من بۆ خزمەتكردن بە سی ئای ئەی هەوڵدەدەم بۆ ئەوەی كە لە ٣٠ ئابدا كە دامەزراندن و پلەبەرزكردنەوەی ناو هێزە چەكدارەكانی توركیا دەكرێت، ئەفسەر و فەرماندە نەتەوەگەرا كەمالیستەكان خانەنشین بكرێن، باسكردبوو. لەو ٣٠ی ئاب'ەدا بەشێك لە فەرماندەكانی سوپا كە دواتر ناوەكانیان لە ریزی تۆمەتبارەكانی دۆسیەی ئەرگەنەكۆن'دا بوون وەك ژەنڕاڵ شەنەر ئەرئویگور كە فەرماندەی گشتی جەندرمە بوو، یان خانەنشینكران یان ڕێگا لە پلەبەرزكرانەوەكانیان گیرا.

ئەو بەڵگە و زانیاریانەی كە لە نێوان ساڵانەكانی ٢٠٠٧-٢٠١٠دا ئاشكرابوون، بوونە هۆی ئەوەی كە ئیدیعاكان سەبارەت بەوەی كە ئەو كەسانە لە ساڵی ٢٠٠٤دا پلانی كودەتایان داڕشتووە بڵاوبێتەوە.

لە ساڵی ٢٠٠٤دا ڕێگا بۆ دانوستانەكان لەسەر ئەندامێتی هەمیشەیی توركیا لە یەكێتی ئەورووپا دەكرایەوە و كەسانێكیش لە هەوڵ و تەقەلایەكی زۆردا بوون تا ڕێگا لەمە بگرن و لە چەند ساڵی دواتریشدا هەوڵەكانیان ئاشكرا بوو.

پ.ك.ك'ش ڕێك لە ١ی حوزەیرانی ٢٠٠٤دا جارێكی دیكە دەستی بەشەڕی چەكداری كردەوە كە عەبدوڵا ئۆجەلان لەدوای دەستگیركرانی لە ١٩٩٩دا كۆتاییهاتنی ڕاگەیاندبوو. ساڵی ٢٠٠٤ ساڵێكی گرنگ و سەرنجڕاكێش بوو. ساڵی ٢٠٠٤ هەم بۆ توركیا و هەم بۆ عێراقیش كە ڕووداوەكان نزیكەی ساڵێك دوای

روخانی سەدام حسێن و داگیرکاری ئەمریکا روویاندابوو، گرنگ و سەرنجڕاکێش بوو...

ئەو چیرۆك و بوختانەی کە گۆڤارەکە لەسەر من هەڵیبەستبوو، هەوڵێکی تێکدەرانە و جۆرێکی دیکە لە بڵاوکردنەوەی دژە زانیاری و پڕوپاگەندەکان لە دژی من بوو. پێویستبوو چی بکەم؟ سوئمەز کوێکساڵ هات بەبیرمدا. هەر لەوکاتەوە کە دیپلۆماتێکی گەنج بوو لەوەزارەتی دەرەوە، دەمناسی. دواتر ئەو کاتانەش کە بوو بە باڵیۆزی تورکیا لە بەغدا و پاریس، پێکەوە مابوینەوە.

سوئمەز کوێکساڵ لە نێوان ساڵانی ١٩٩٢-١٩٩٨دا راوێژکاریی میت'ی کردبوو. دوای ئەوەی کە لە پۆستی باڵیۆزی تورکیا لە فەرەنسا کە دوایین ئەرکی بوو، خانەنشین بوو، لەگەڵ ئەو و ئۆزدەم سانبەرگ راوێژکاری پێشووی وەزارەتی دەرەوە و ئەمرە گونەنسای وەزیری پێشووی دەرەوە، هەر چوارمان پێکەوە لەدوای ماوەیەکی دورودرێژ، لەبەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا یەکمان بینی.

پرسیارم لە سوئمەز کوێکساڵ کرد. وتی:" پێویست ناکات بە جدی وەریبگریت، بەڵام بۆ ئەوەی تەدبیر وەربگریت ئەگەر وەزیری ناوخۆ دەناسیت باشتر وایە قسەی لەگەڵ بکەی."عەبدولقادر ئاکسۆی وەزیری ناوخۆم لەکاتی کۆلێژی زانستە سیاسیەکانەوە دەناسی. پێکەوە لەوێ دەمانخوێند. دوو پۆل لە پێشی منەوە بوو. جگە لەوە لە سەردەمی تۆرگوت ئۆزالیشدا وەزیری ناوخۆ بوو. لە رۆژی یەکشەممە ٢ی ئابی ٢٠٠٤دا بۆ ئەوەی کە قسەی لەگەڵدا بکەم تا رێوشوێنی پێویست سەبارەت بە پاراستنی خۆم بگرمەبەر، سەردانیم کرد.

کۆبوونەوەی ئەنجومەنی باڵای سەربازی کە بە خانەنشینکردنی بەشێك لە فەرماندەکانی سوپا کە دواتر بە سەرکردەکانی ئەرگەنەکۆن'ی کودەتاچی دەناسران، لە بینایەکی نزیك ئەو شوێنەی کە من لەگەڵ وەزیری ناوخۆ دیدارم کردبوو، بەسەرۆکایەتی سەرۆك وەزیر رەجەب تایب ئەردۆغان ئەنجام دەدرا. هەر لەو رۆژەدا عەبدولقادر ئاکسۆی منی نارد بۆ لای بەرپرسێکی پایەبەرزی ئاسایش و لەویشەوە زانیم کە ئەو کەسانەی ساڵانێکە دژە زانیاری بۆ تیرۆری کەسایەتی من بڵاودەکەنەوە چ کەسانێکن.

کاتێك پرسیارم کرد کە ئەوانە کێن، لە وەڵامدا وتی:" ئەو کارمەندانەی دەزگای ژیتەم کە بە گرێبەست کاردەکەن." ئەو شتانەی کە ساڵانێك بوو سەبارەت بە دەزگای هەواڵگری سەربازی دەوڵەتی شاراوە و شتی لەو بابەتە لە مێشکمدا هەبوون، خەریك بوون راست دەردەچوون. بۆ پشتڕاستکردنەوە، جارێکی دیکە وتم کێ؟ چ کەسانێکن؟ ئەویش هەر هەمان وەڵامی دایەوە و وتی:" ئەو کارمەندانی ژیتەم کە بە گرێبەست کاردەکەن."

دەزگایەکی وەکو ژیتەم لە ساڵانی ١٩٩٠کاندا سەبارەت بە کوشتنی ژمارەیەکی زۆر هاوڵاتی کورد لە تورکیا بە شێوەی رەشەکوژی و رووداوی بکوژ نادیار تۆمەتبار دەکرا، پەیوەندی بەو هەڕەشە و کەمپینانەوە هەبوو

کە لە دژی من دەکران و ئەمەش بەلامەوە شتێکی لۆژیکی بوو. سنوری نێوان ژیتەم و هێزە تایبەتەکان... شتێك نەبوو کە ئەقڵی کەسانێکی مەدەنی وەکو ئێمە پێی بگات. خاڵی هاوبەشی هەردووکیشیان لە ئەرگەنەکۆن‌دا ئاشکرا بوو.

کاتێك لە ساڵی ۲۰۰۷دا ئاشکرابوو کە میکانیزمێك بە ناوی ئەرگەنەکۆن بە ئامانجی رەخساندنی هەلومەرجی ئەنجامدانی کودەتایەکی سەربازی لە تورکیا کاردەکات، ئەو کات بۆ ئێمەش دەرکەوت کە رێکخراوەکانی وەکو ژیتەم و هێزی تایبەت وەکو بڕیارگەی ئایدۆلۆژی و سیاسی ئەو هەڕەشانە بوون کە لەسەر گیان و ژیانی ئێمەمانان هەبوون.

ئەگەر پەیوەندیتان بە کێشەی کوردەوە هەبوایە و گرنگیتان بە کێشەی کورد بدایە و قسەیەکتان بوتبایە کە کەس نەیدەگوت یاخود تابۆکانتان بشکاندایە، ئەو کاتە زۆر پێویستبوو سەرتان سوورنەمێنێ لەوەی ببنە ئامانجی ژیتەم یان هێزە تایبەتەکان.

کاتێك کە دێڕەکانی ئەم کتێبەم دەنوسی (۲۸ی تەموزی ۲۰۱۰) هەر بە رێکەوت نەشە دوزەل لە رۆژنامەی تەرەف لە ماوەی سێ رۆژدا چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ پارێزەر حسێن یلدرم کردبوو کە ماوەیەك وەك نوێنەری پ.ك.ك لە ئەورووپا ناوبانگی دەرکردبوو، بەڵام دواتر نەك هەر لەبەرچاوی ئۆجەلان کەوتبوو، بەڵکو هەوڵی کوشتنیشی درابوو. من بەشی کۆتایی ریپۆرتاژەکەیم خوێندەوە کە زۆر سەرنجڕاکێش بوو.

حسێن یلدرم کە بۆ ماوەیەك پەیوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ ئۆجەلان‌دا هەبوو، ساڵانێك دواتر لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا باسی لەوەدەکرد کە چۆن ئەو سەرکردەیەی پ.ك.ك کەسانی ناڕازی و دژ بە خۆی لەناو دەبرد:"... لە دۆڵی بیقاع چەندین کەسیان بە تۆمەتی سیخوڕیکردن گوللە باران کرد. بڕۆن دۆڵی بیقاع هەڵدەنەوە سەدان تەرم دەدۆزنەوە. لەو رووداوانەدا کە کەسەکان بە سیخوڕیکردن تۆمەتبار دەکران، دۆغو پەرینچەك رۆڵی هەبوو. پەرینچەك سەردانی کەمپی بیقاعی کرد و لەگەڵ ئۆجەلان پەیوەندیەکی نزیکی بەرقەرار کرد و دواتر گەڕایەوە و لە گۆڤاری بەرەو ۲۰۰۰دا نوسی"لە کەمپی بیقاع‌دا سیخوڕ هەن" بەو هۆیەشەوە ۱۲ کەس لە کەمپەکەدا گوللەباران کران..."

با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی سلێمانی. لە ئێوارەی رۆژی ۹ی تەموزی ۲۰۰٤دا ماڵئاواییمان لە "بین باشی ئایدن" کرد و بەرەو لای بەرهەم ساڵح بە ڕێ کەوتین. بەرهەم ساڵح سەری سووڕمابوو لەوەی کە نەیتوانیوە بۆ ماوەی چەند کاتژمێر لە سلێمانی شوێن پێی ئێمە بدۆزێتەوە و پەیدامان بکات.

کاتێك پرسیاری رووداوی "تووەرەکەکە"م لە سەرۆك وەزیرەکەی سلێمانی کرد، پێی گوتم کە:"ئەو رۆژە من لە دەرەوەی سلێمانی بووم. هەینی، واتە رۆژی پشوو بوو. بۆ رۆژێك چووبووم بۆ دوکان. درەنگانێکی شەو لە دوکانەوە گەڕامەوە بۆ سلێمانی. کاتێك کە گەڕامەوە ژمارەیەکی زۆری ئۆتۆمبیلی سەربازی ئەمریکاییەکان

سەرنجیان راکێشام. دەمزانی هەندێك شت روویداوە، بەڵام نەمدەزانی چییە. دواتر زانیم رووداوەکە چی بووە."

لەو رونکردنەوانەی بەرهەم، ئەوە دەردەکەوت کە سەربازەکانی ئەمریکا لە رۆژە سەرەتاییەکانی داگیرکردنی عێراق'دا تەنانەت پرسیان بە هاوپەیمانە کوردەکان'ی خۆشیان نەدەکرد. چەند مانگ دواتر کاتێك لە جەلال تاڵەبانی'م پرسی و وتم:" ماوەیەکی زۆر بە سەر رووداوی توورەکەکەی سلێمانی تێپەڕ بووە، بە راستی چی لە پشت ئەو رووداوەوە هەبوو؟" ئەویش زۆر بە کورتی وەڵامی دایەوە و وتی:"ئەمریکاییەکان تۆڵەی رێگەنەدانی١ی مارتیان لە ئێوە کردەوە کە تێیدا (رێگە نەدرا بەوەی ئەمریکا لە تورکیا'وە هێرش بکاتە سەر خاکی عێراق) جگە لەوە هیچی دیکە نیە."

بیروبۆچوونەکانی پاڵەوانە تورکەکەی رووداوی "توورەکەکەی سلێمانی"م سەبارەت بە تاڵەبانی، بۆ ئەو نەگێڕایەوە. هەروەها باسی ئەوەم نەدەکرد کە قوربانیە تورکەکانی رووداوەکە پێیانوابووە تاڵەبانی راپۆرتی لەسەر ئەوان داوە بە ئەمریکییەکان و ئەوانیش دوابەدوای ئەوە کەوتونەتە جوڵە. هیچ کاتێك تەمومژی سەر رووداوی "توورەکەکەی سلێمانی" کە لە فەرهەنگی سیاسی تورك'دا جێگەی خۆی کردۆتەوە، لا نەچوو.

بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی کە سەرچاوە ئەمریکییەکان لەبارەی رووداوەکە دزەیان پێکردبوو، هۆکاری سەرەکی پشت رووداوی توورەکەکەی سلێمانی کە تێیدا ئەندامەکانی هێزی تایبەتی تورکیا لە دەستگیرکران و توورەکە کرایە سەریان و دواتر برانە کەرکوك و لەوێشەوە رەوانەی بەغدا کران، لەسەر ئەوە بووە کە گوایە ئەو ئەندامانەی هێزە تایبەتەکان بە نیازبوون عەبدوڕەحمان مستەفا پارێزگارە کوردە نوێیەکەی کەرکوك تیرۆر بکەن.

سێ ساڵ دوای ئەو رووداوە لە کۆنفرانسێکی دە رۆژەدا لە دورگەی لیدۆی ڤەنەدیك سەبارەت بە فیدڕاڵیزمی عێراق کە منیش تێیدا بەشدار بووم و لەهەر مەزهەب و گروپێکی سیاسیەوە ژمارەیەکی زۆر لە پەرلەمانتار و بەرپرسانی عێراق'ی هاتبوون، لەگەڵ عەبدوڕەحمان مستەفا پارێزگاری کەرکوك ئاشنا بووم. پیاوێکی چەلەبی و خوێنەوار بوو. لە پەرستگایەکدا لە لیدۆ لە بەیانی هەتا ئێوارە پێکەوە کۆدەبووینەوە و سێ ژەمە پێکەوە نانمان دەخوارد و پێکەوە بەشداریمان لە گەشتەکانی دەوروبەری ڤەنەدیك دەکرد. بەو هەستەی کە دۆستایەتیەکەم لەگەڵیدا باش پێشکەوتووە، پرسیاری رووداوەکەی سێ ساڵ بەر لەوکاتەم لێکرد و ئەویش لەوەڵامدا وتی:" ئەمریکاییەکان پێیان وتم زانیاریان پێگەیشتووە سەبارەت بەوەی کە هەوڵێك بۆ تیرۆر کردنت لە ئارادابووە و رێگایان لەمە گرتووە و جگە لەمەش هیچ شتێکیان پێنەگوتوم و هیچ زانیاریەکی دیکەشم نیە."

لەدوای ئەوەی کە لە سلێمانی و کەرکوك'ەوە بەرەو بەغداد رۆیشتین، دروستترین زانیاریمان سەبارەت

بە ڕووداوی توورەکەکەی سلێمانی لە کامەران قەرەداغی وەرگرت و هەر لەو شەوەشدا زانیاریەکەمان لەلایەن مەسعود بارزانی پشتڕاستکردەوە. لەو یەکەم سەردانەماندا بۆ بەغدا کە لەدوای جەنگ ئەنجاممان دابوو، بینینی کامەران بۆ ئێمە ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراوی خۆش بوو.

ئێمە لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستان'ەوە دەپارێزراین. پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ ئەوەی کە سەرنجڕانەکێشێت تویۆتایەکی کلۆستۆری بۆ دابینکردبووین. لە ڕێگەی کەرکوك'ەوە گەیشتینە بەغداد و لە یەکێك لەو دوو هۆتێلەی گەڕەکی کەڕادە کە ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەوێ سەنگەریان گرتبوو، لە هۆتێلی بورجلحەیات نیشتەجێ بووین.

ناوەندە نوێیەکانی هێز لە عێراق، لەدوای جەنگ هێشتا بە بەغداد نامۆ بوون و بەتەواوەتی خۆیان لەوێ جێگیر نەکردبوو. دوو هۆتێلی گەڕەکی کەڕادە واتا بورجلحەیات و سیندباد وەکو بڕیارگەی پارتی دیموکراتی کوردستان'یان لێکرابوو. کامەران قەرەداغی کە ساڵانێك لە لەندەن دەژیا تازە هاتبووە بەغدا. لە هۆتێلەکەدا یەکترمان بینی، یەکسەر دەستمان بە قسەوباسی سیاسی کرد و کاتێك گفتوگۆکەمان هاتە سەر ڕووداوی توورەکەکەی سلێمانی، کامەران قەرەداغی زانیارییەکی سەیری پێگوتین:" ڕۆژنامەنوسێکی ئینگلیز لەگەڵ کۆلۆنێل مایڤیل دیداری کردووە و ئەویش زانیاری زۆر گرنگی سەبارەت بەو ڕووداوە بە ڕۆژنامەنوسە ئینگلیزەکە وتووە. بەگوێرەی قسەکانی ئەو، ئەو بەرپرسە ئەمریکییە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو ڕەخنە و تۆمەتانەی کە لە تورکیا لێی دەگیران، ئامادەکاری کردووە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی سازبکات. بڕیاربووە لەو کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەدا بەڵگەکانی تاوانبارکردنی هێزە تایبەتەکانی تورك ئاشکرا بکات، بەڵام لە واشنتن'ەوە فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی کۆنگرە ڕۆژنامەوانیەکەی پێدراوە و ئەویش زۆر لەوە بێزار بووە. بەگوێرەی کۆلۆنێل مایڤیل ڕووداوەکەی سلێمانی واتە هەوڵی تیرۆرکردنی پارێزگارە کوردەکەی کەرکوك، سێیەم ڕووداوێك بووە کە هێزە تایبەتەکانی تورك دەستیان تێدا هەبووە. یەکێك لە دوو ڕووداوەکەیتر لە ڕاگەیاندنەکانەوە باسکرابوو. هەواڵی ڕاگیرانی ژمارەیەك لە ئەفسەرەکانی هێزە تایبەتەکانی تورك لە دەروازەی کەرکوك کە لە سندوقی دواوەی ئۆتۆمبیلەکانیاندا چەکیان پێبووە بۆ ئەوەی کە بیگەیەننە دەستی تورکمانەکان، لە میدیاکانەوە بڵاوکرایەوە و هەروەها باسی ئەوەش کرابوو کە دەست بەسەر ئەو چەکانەدا گیرابوو. هەروەها ڕووداوێکی دیکە کە هەوڵی تیرۆرکردنێك بووە، بە پاساوی ئەوەی کە"پەیوەندییەکان لەگەڵ تورکیا تێکدەدات." لەسەر داوای مەسعود بارزانی لەلایەن کۆلۆنێل مایڤیل'ەوە ئاشکرا نەکراوە و سەری داپۆشراوە.

بەگوێرەی ئەو قسانەی کامەران، ئەگەر واشنتن فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی کۆنگرە ڕۆژنامەوانیەکەی دەرنەکردایە ئەوا کۆلۆنێل مایڤیل هەموو ئەو شتانەی ئاشکرا دەکرد و ئەم قسانەشی بۆ ڕۆژنامەنوسە

ئینگلیزەکە کردووە کە لە کەرکوک دیداری لەگەڵ ئەنجامداوە.

پرسیارمان لە کامەران قەرەداغی کرد کە ئەم شتانە لە کوێوە دەزانێت و ئەویش پێیگووتین کە ڕۆژنامەنوسە ئینگلیزەکە بۆی باسکردووم. تەنانەت ئەوەشی وت کە ئەگەر بمانەوێ دەتوانێت ئەو ڕۆژنامەنوسە ئینگلیزەمان پێ بناسێنێت کە ئەو کاتە لە بەغدا بوو. بەڵام پێویستی بەوە نەدەکرد چونکە ئەو کەسەی کە هەموو ئەو زانیاری و ئیدیعایانەی دەزانی، واتە مەسعود بارزانی بەرەو بەغداد دەهات.

بەرپرسانی پارتی دیموکراتی کوردستان پێیان ڕاگەیاندین کە مەسعود بارزانی لە ١٣ی تەموزی ٢٠٠٣دا بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەی مەجلیسی حوکم کە لە ٢٥ کەس پێکهاتبوو سەردانی بەغداد دەکات و گرنگە کە لەو ڕۆژە مێژوویەدا لە بەغدا بین. ڕۆژانێك بوو کە هەموو کەس چاوەڕوانی ئەو کۆبوونەوەیەی دەکرد و دەیزانی کە ئەندامانی مەجلیسی حوکم کۆدەبنەوە، بەڵام ڕۆژی کۆبوونەوەکە ئاشکرا نەکرابوو.

هەموو مەزهەب و گرووپە ئەتنیەکان و هەموو پارتە سیاسیەکانی عێراق و ئەوانەی کە پێشتر بە نهێنی کاریان دەکرد، لەگەڵ پیاوانی ئایینی و سەرۆك خێڵەکان، لە مێژوودا بۆ یەکەمجار دەستەیەکیان پێکهێنابوو کە لە ٢٥ کەس پێکهاتبوو و مەسعود بارزانیش لەنێو ئەو ٢٥ کەسەدا بوو.

لە ڕاستیشدا دەمەوئێوارە مەسعود بارزانی هات و لەو هۆتێلەی کە ئێمەی لێبوو نیشتەجێ بوو. ئەمەش دوای ئەو دیدارەمان کە لە سەڵاحەدین ئەنجاممان دابوو، لەماوەی هەفتەیەکدا دووەمجار بوو کە پێکەوە بووین. گرنگییەکی زۆری بە من و ئیلنور چەڤیك دا. کاتێك کە لەگەڵ سەرکردەکانی عێراق‌ی نوێدا کۆبوونەوەی کرد ئێمەش لە تەنیشت خۆی دانیشاند.

لە دەرفەتێکدا سەرم لار کردەوە و بە چپە پرسیاری ئەو کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەم لێکرد کە کۆلۆنێل مایڤیل ویستبووی سەبارەت بە هێزە تایبەتەکانی تورك ئەنجامیبدات، ئەمە ڕاست بوو؟ ئایا ئەوە ڕاستبوو کە گوایە لەسەر داوای ئەو، مایڤیل لە کەرکوك سەری ڕووداوێکی داپۆشتووە کە هێزە تایبەتەکانی تورك دەستیان تێدا هەبووە؟

مەسعود بارزانی پێکەنی و وتی:" پرسیاری کامیان دەکەن؟" و بەوجۆرە پرسیارەکەمانی بە پرسیار وەڵامدایەوە و وتی:" تەنها یەك ڕووداو نیە، دوو ڕووداوی وەها هەیە..." لەوکاتانەدا بەرەی تورکمانی عێراق کە ناوەندەکەی لە هەولێر بوو لەژێر کۆنترۆڵی هێزە تایبەتەکانی تورك‌دا بوو و سەرکردەکانیشی زوو زوو دەگۆڕان. سەرکردەکەیان لەو ڕۆژانەدا کەسێك بوو بە ناوی سانان ئاگا (سەنعان ئاغا) یان سەنعان قەساب کە دەگوترا کاتی خۆی سیخوڕی حیزبی بەعس بووە.

جیاوازییەك لە نێوان کەرکوك و هەولێر‌دا هەبوو، نەدەکرا وەك ئەو جیاوازییەی کە لە نێوان تورکمانەکان‌ی کەرکوك و کوردەکان‌دا هەیە، درك بە هەمان جیاوازی لە نێوان کوردەکان و تورکمانەکان‌ی هەولێر بکرێت.

بەشێکی تورکمانەکان'ی هەولێر ببوون بە کورد و لەبەر ئەوەش کوردەکان بە ئاسانی دەیانتوانی دزە بکەنە نێو ڕێکخراوی تورکمانی و لەوێ جێی خۆیان بکەنەوە.

مەسعود بارزانی گوتی:" دوو کەس لە ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی بەرەی تورکمانی سەر بە دەزگای پاراستنی پارتی دیموکراتی کوردستان'ن و ئەوان ئەو زانیاریانەیان پێداوین کە بەرەی تورکمانی لە کەرکوك هەوڵێکی تێکدەرانەی بەدەستەوەیە و بەوەۆیەشەوە توانیویانە ڕێ لە ڕووداوەکە بگرن."

داخۆ کۆلۆنێل مایڤیل'یش مەبەستی هەر ئەو ڕووداوە بوو؟دیارە لەمجۆرە بارودۆخانەدا زەحمەت بوو بتوانیت بەرەی تورکمانی عێراق لە هێزە تایبەتەکانی تورك جیا بکەیتەوە. لە قسە و هەڵوێستەکانی مەسعود بارزانی'یەوە دەردەکەوت کە لەو ڕۆژانەدا ئەو ئەمریکاییەکانی لە هەندێك لە کاروچالاکیەکانی سەربازەکانی تورکیا لەنێو خاکەکانی خۆیدا ئاگادارکردۆتەوە و بەشێك لەو ڕووداوانەشیان بۆ رای گشتی ئاشکرا نەکردووە.

لەو دیدارەماندا باسی نیگەرانی خۆی لە هەبوونی هێزەکانی تورکیا لەنێو خاکەکانی کوردستان'ی عێراق نەکرد، بەڵام ماوەیەکی زۆر دواتر، بەهۆی دزەکردنی بەڵگە و نوسراوە دیپلۆماتییەکانی ئەمریکا کە لە ڕێگەی ویکیلیکس'ەوە بڵاوکرانەوە، ئەو نیگەرانیانەی ئەویش دەرکەوتن.

یاداشتێکی ڕۆبەرت دۆسچ سەرۆکی ڕاوێژکارانی بالیۆزخانەی ئەمریکا لە ئەنقەرە کە دوای دیدارێکی خۆی لەگەڵ مەسعود بارزانی لە ٧-٨ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٣دا کە لە ئەنقەرە ئەنجامیدابوو، بۆ واشنتن'ی ناردووە، زانیاری و هەڵسەنگاندنی سەیری تێدایە:

" بارزانی وتی ئەگەر تورکەکان تەنانەت وەك بەشێك لەو هاوپەیمانییەی کە لەژێر فەرماندەیی ئەمریکا'دایە بێنە ناو خاکی باکووری عێراق، ئەوا گیرگرفت دروست دەبێت و زیانی دەبێت. بارزانی ئەو هۆکارانەی ئاشکراکرد کە بۆچی نایانەوێت سەربازی تورکیا بێتە ناوچەکە و نمونەی هێزی چاودێری ئاشتیپارێزی تورکەکانی هێنایەوە. (هێزی ئاشتیپارێزی تورکیا ساڵی ١٩٩٧ بۆ چاودێریکردنی ئاگربەستی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە ناوی PMF دامەزرابوو) ئەو وتی: بە ئاشکرا بۆتان باس دەکەم کە PMF چی کردووە. جگە لە ناوبژیوانی ئێمە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەموو کارێکی کرد. بەرەی تورکمانی عێراق'یان پڕچەك کرد و ڕاهێنانی سەربازییان پێکردن و ئاسەوارە مێژووییەکانیان برد و قاچاغچێتی مادە هۆشبەرەکانیان کرد و تەنانەت هەوڵی تیرۆرکردنیشیان دەدا. بۆ هیچ شوێنێکیش ناچن هەر لەوێ دایانکوتاوە. ژمارەیان زیاتر لە چەن سەد کەسێکە...

بارزانی کلینیکسەکەی دەستی گرمۆڵە کرد و بە هەستێکی سۆزاویەوە بەردەوام بوو. وتی: هەڵوێستی من ڕوون و ئاشکرایە، هێزەکانی تورکیا بە تەنها بێن یاخود بەشێك بن لەو هاوپەیمانییەی کەوا دروستدەکرێت،

وەك هێزێكی داگیركار سەیر دەكرێن. چونكە توركیا بەنیاز نیە ئەو ناوچەیە جێبهێڵێت و بڕوات. هەڵوێست و نیازی سەربازانی تورك لە مانەوەیان لە ناوچەكە زۆر جیاوزترە لە نیاز و هەڵوێستی ئەو رزگاركەرانەی كە لە ئەمریكا و بەریتانیا دێن...

بارزانی وتی: بەرپرسانی ئەمریكا چەندینجار بەڵێنیان پێداوە هیچ هێزێكی توركیا دەربازی باكووری عێراق نابێت. ئێمە بە هیچ جۆرێك حەز بە هەبوونی ئەوان لێرە ناكەین..." (تەرەف، هەینی ٢٦ی ئابی ٢٠١١، بەڵگەكانی توركیا لە ویكیلیكس، ل١٣)

ئەمریكا و بەریتانیا بۆ روخاندنی رژێمەكەی سەدام لە بەغداد بەرنامەیان دانابوو كە هێزی سەربازی رەوانەی عێراق بكەن. توركیا'ش بۆ رێگرتن لە قەوارەیەكی كوردی لە عێراق و دروستكردنی سەنگەری جەنگ دژی پ.ك.ك لە باكووری عێراق و رێگرتن لەوەی كەركوك بكەوێتە ژێر دەستی كوردەكان، دەیویست بچێتە ناوخاكی عێراق'ەوە... وەكو دەبینرێت هەڵوێست و نزیكایەتی هاوپەیمانەكانی ناتۆ سەبارەت بە عێراق لەگەڵ یەكدا یەكی نەدەگرتەوە. لە ئەنجامیشدا لە رۆژانی دوای جەنگی عێراق كە لە مانگەكانی مارت و نیسانی ٢٠٠٣دا ئەنجامدرا و بە روخانی رژێمی سەدام كۆتاییپێهات، هێزە تایبەتەكانی توركیا كە لەگەڵ بەرەی توركمانیدا لەنێو خاكی عێراق'دا تێكەڵاوی یەكتر ببوون، دەستی بە بەكارهێنانی كارتی توركمان لە دژی كوردەكان كردبوو و ئەولەویەتی بەمە دەدا.

پارامێترەكانی سیاسەتی توركیا سەبارەت بە عێراق كە رانەگەیەنرابوون و بەدەستی سوپا بە رێوەدەبرا و بە واتایەكی دیكەش سیاسەتی كورد ئەمە بوو كە باسكرا. ئەمەش لەگەڵ ئەو سیاسەتەی ئەمریكا یەكی نەدەگرت و كە دەیویست سەقامگیری تاقە ناوچەی ئارامی عێراق كە باكوور بوو بپارێزێت.

ئەم سیاسەتە لە هەمانكاتدا رێك پێچەوانەی ئەو سیاسەتە بوو كە تۆرگوت ئۆزال دەیویست سەبارەت بە عێراق و كوردەكان پیادەی بكات. هەرجۆرە هەڵوێست و رەفتارێكی سیاسی بەرەی توركمانی عێراق وەكو ئامرازی سیاسەتی عێراق'ی سەربازەكانی لێهاتبوو كە لەلایەن فەرماندەی گشتی سوپای توركیا'وە دادەنرا و راگەیاندنی توركیا'ش پێگەی بەرەی توركمان'یان بەشێوەیەكی گەورەكراو نیشاندەدا و هەواڵەكانیشیان بەشێوەیەك كە دوژمنایەتی كوردی تێدابكرێت، بڵاو دەكردەوە.

توركمانەكان دژایەتی فیدراڵیزمیان لە عێراق كرد و جەختیان لەوەكردەوە كە پێویستە توركمان و عەرەب و كوردەكان وەكو پێكهاتەی سەرەكی عێراق قبوڵ بكرێن و دەستورێكی نوێ بۆ ئەو وڵاتە بنوسرێتەوە و ژمارەی توركمانەكان'یش بە ژمارەیەكی نزیك لە كوردەكان باس دەكرا.

تۆ وەرە دوای هەموو ئەو قسانەش، لە یەكەم هەڵبژاردنی عێراق لەساڵی ٢٠٠٥دا بەرەی توركمانی شكستێكی زۆر گەورەی هێنا و لە ژێرەوەی لە ١٪ی دەنگەكان دەنگی بەدەستهێنا. ئەم ئەنجامەش گومانی

زۆر گەورە و جیدی سەبارەت بە ژمارەی تورکمانەکان'ی عێراق و توانای بەرەی تورکمانی بۆ نوێنەرایەتی کردنی تورکمانەکان هێنایە گۆڕێ.

لە راپۆرتێکدا کە لەسەر داوای دکتۆر موزەفەر ئارسڵان کە لەساڵی ٢٠٠٦دا ببوو بە راوێژکاری کاروباری تورکمانی سەرکۆماری عێراق، زیانەکانی شکستەکەی بەرەی تورکمانی لە هەڵبژاردن و کاریگەرییەکانیم لەسەر کێشەی تورکمان بەمجۆرە باسکردبوو:

" بەگوێرەی چرووتفایلی ئەو رێکخستنەی کە تورکمانەکانی عێراق ئێستا هەیانە دەتوانین دیمەنێکی دابەشکراوی سێ لایەنە و چوارلایەنە تەنانەت پارچە پارچە تریش ببینین. دابەشبوونی تورکمانەکان بەسەر شیعە و سوننەکاندا لە هەڵبژاردنی ٣٠ کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ و ١٥ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥دا بەشێوەیەکی سەرنجراکێش دەرکەوتوون.

دەرکەوت کە تورکمانە شیعەکان کە نزیکەی نیوەی تورکمانەکان پێکدەهێنن زیاتر لەبەرەی تورکمانی کە وەك پلاتفۆرمێکی نەتەوەیی خۆی نیشاندەدا، دەنگیان بە هاوپەیمانی عێراق'ی یەکگرتوو وەك پلاتفۆرمێکی مەزهەبی و رێکخراوە شیعیەکان'ی دیکە داوە. لەگەڵ ئەمەشدا دەرکـەوت کە بەشێك لە دەنگی تورکمانەکان بە تایبەتی لە هەولێر و بەشێکی دیکەشیان لە کەرکوك کە ناوەندی نەتەوەیی تورکمانەکان'ە بۆ هاوپەیمانی کوردەکان رۆیشتووە. دەنگەکانی ئەو بەرەی تورکمانی'یەی کە تورکیا پشتگیری لێکردووە و لە دنیای دەرەوە و لەناو عێراق'یشدا قبوڵ دەکرێت، تورکمانەکانی بێ هیوا کرد.

بەرەی تورکمانی لە هەڵبژاردنەکانی ٣٠ کانوونی دووەمدا لەهەموو عێراق ٩٣٤٨٠ دەنگی هێنا و لە ١٥ی کانوونی یەکەم لەدوایین هەڵبژاردنیشدا ٨٧٩٩٣ دەنگی هێنا کە بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ٨٨٠٠٠ دەنگ بووە و ئاستی دەنگەکانی دابەزیوە. رێژەی سەدی دەنگەکانی بەرەی تورکمانی لەئاستی عێراق'دا ٠,٧٢٪ بووە کە تەنانەت لە ژێرەوەی ١٪ی دەنگەکانیش بووە. لە هەڵبژاردنی ٣٠ی کانوونی دووەمدا دەنگەکانی بەرەی تورکمانی لە کەرکوك کە هەبوونی تورکمان بەشێوەیەکی زەق دەردەکەوێت، ٦٥٦١١ دەنگ بووە و لەدوایین هەڵبژاردنیشدا بۆ ٦٣٦٥٨ دەنگ دابەزیوە. بە مانایەکیتر بەرەی تورکمانی لە پارێزگای کەرکوك لەدەوروبەری ١٠٪ی دەنگەکانی بەدەستهێناوە.

نزیکەی ١١ ملیۆن کەس یاخود ٧٠٪ی خەڵك بەشدارییان لەدوایین هەڵبژاردنی عێراق کردووە کە لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥دا ئەنجامدرا. بەگوێرەی ئەو ئەنجامانەی هەڵبژاردن و رێژەی بەشداریکردن و هەروەها ئەگەر ئاراستەی دەنگدەرەکانیش لەبەرچاو بگیرێت، ئەو کاتە سەبارەت بە نەتەوەکانی ناو عێراق و چۆنیەتی دابەشبوونیان بەرچاوڕوونیەکمان دەست دەکەوێت. ئەو دەنگەی کە بەرەی تورکمانی بەدەستیهێناوە کە رێژەیەکی لە دەوروبـەری ٠,٧٢٪ بووە دیمەنێکی ناڕاست سەبارەت بە ژمارەی

تورکمانەکانی عێراق بەدەستەوە دەدات و لەوەش خراپتر ئەوەیە کە قەناعەتێکی نیگەتیڤ سەبارەت بەوان دروستدەکات. لەم روانگەیەشەوە ئەگەر بانگەوازی بکرێت بۆ ئەوەی تورکمانەکان لەژێر چەتری بەرەی تورکمانی کۆبکرێنەوە یاخود بەرەی تورکمانی وەك نوێنەری سیاسی تورکمانەکانی عێراق لە قەڵەم بدرێت، زیان بە مافی تورکمانەکان دەگەیەنرێت و دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەوڵەکانی جێگیرکردنی مافی تورکمانەکان لە دەستوردا بێ ئەنجام و لاواز بمێننەوە."

هەڵبژاردنەکانی سەرەتا و کۆتایی ساڵی ٢٠٠٥ لە عێراق، لە واتایەکی دیکەدا ئیفلاس کردن و شکستهێنانی سیاسەتی دژە کوردی تورکیا بوو کە لە رێگەی سەربازەکان و بەرەی تورکمانی‌یەوە پیادەی دەکرد. لەبنەڕەتدائەم سیاسەتە نەك هەر نەیتوانی کوردەکان‌ی عێراق شکست بدات، بەڵکو زیانی بە بەرژەوەندیە بنەڕەتیەکانی تورکمانەکانی عێراق‌یش گەیاندووە.

پارتی دادوگەشەپێدان کە بەتەنها لە دەسەڵاتدا بوو، وردە وردە سوکانی سیاسەتی دەرەوەی گرتە دەست و تا ئەندازەیەك رەواییەکیشی لەو بارەیەوە بەدەستهێنا.

لەکۆتایی ساڵی ٢٠٠٨دا کۆنترۆڵی بەرەی تورکمانی لە فەرماندەیی گشتی سوپا وەرگیرا و رادەستی وەزارەتی دەرەوە کرا کە ئەو کاتە لەژێر دەستی عەبدوڵا گویل دابوو. پارتی دادوگەشەپێدان دەستی بە گۆڕینی ئەو سیاسەتە کرد کە لە ساڵی ١٩٩٣ەوە جێبەجێ کرابوو و لە بنەڕەتدابۆ ئەوە بوو کە رێگا لە دامەزراندنی قەوارەیەکی کوردی لە عێراق بگیرێت. بە جۆرێکیتر دەتوانرێت بوترێت کە ئەو دینامیکە مێژووییانەی کە لەدوای ٢٠٠٣ لە عێراق کەوتبوونە جوڵە، تورکیا‌یان ناچارکرد کە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ کوردەکان‌دا بگۆڕێت.

کێ دەزانێت لەوانەیە رۆحی تۆرگوت ئۆزال بەسەر سیاسەتی دەرەوەی تورکیا‌وە هاتوچۆی کردبێت.

**مرۆڤ نەک بەهۆی بیروبۆچوونیەکانی بەڵکو لە رێی هەستەکانی پێناسە دەکرێت. دیدگای مرۆڤ دەتوانێت لە پێوەرێکی گەورەدا گۆڕانکاری بەسەردا بێت بەڵام مرۆڤەکە وەک خۆی دەمێنێتەوە. بۆیە تەنها لەکاتێکدا کە هەستەکانی مرۆڤ بگۆڕێت دەتوانین باسی دروستبوونی گۆڕانکاری لە مرۆڤدا بکەین. دەتوانرێت بگوترێت کە ئێمە تەنها بۆ پشتیوانیکردن لە سەرخستنی ئەو شتانەی کە بەڵێنی جێبەجێکردنمان داوە یاخود لەبەر ئەوەی کە پەیوەستە بە هەستەکانمانەوە، هەندێک بیروبۆچوون پەسەند دەکەین و لایەنگرییان لێدەکەین.**

**ئالیژا عیزەت بەگۆڤیچ**

لە روانگەیەکی دیتێرمینیستیەوە(حەتمییەت)، جەنگی ٢٠٠٣ی عێراق تەواوکردنی ئەو جەنگە بوو کە لە ١٩٩١دا بە نیوەچڵی مابووەوە. منیش لەو دیدگایەوە سەیری ئەو پرسیەم دەکرد و تێڕوانینەکانم بەو ئاراستەیەدا بوون.

تۆرگوت ئۆزال لە ساڵی ١٩٩١دا تا ئەندازەیەك هەموو سەرمایەگوزارییەکی خۆی لەسەر روخاندنی رژێمی سەدام حسێن کردبوو. لەگەڵ تۆرگوت ئۆزال'دا چاومان بڕیبووە ئەوە کە لە ساڵی ١٩٩١دا رژێمی سەدام حسێن لە عێراق بڕوخێت. رژێمەکەی سەدام لەو ساڵەدا شکستی خوارد بەڵام بەتەواوی لەناو نەچوو، بەڵکو لە ٢٠٠٣دا کۆتاییپێهات.

"رەهەندی کوردی" بە بیروبۆچوون و دیدگاکەی من سەبارەت بە جەنگی دووەم زیاد کرابوو، بەڵام ئایا ئەو رەهەندە لە ساڵی ١٩٩١یشدا نەبوو؟ هەبوو، بەڵام وەك ٢٠٠٣ نەبوو... زۆر بە روونتر پێشبینی ئەوەم کردبوو کە ئەنجامەکانی جەنگی ساڵی ٢٠٠٣ بەشێوەیەکی مێژوویی رێگا لەبەردەم کوردەکان دەکاتەوە و ئەگەری ئەوە هەیە کە هاوپەیمانییەکی ستراتیژی لە نێوان تورکیا و کوردەکان دروست بێت. ئایا جگە لە جەنگ هیچ رێگایەکی دیکە نەبوو بۆ ئەوەی رێ لەبەردەم کوردەکان لە عێراق'دا بکرێتەوە؟ نەدەبوو رێگایەکیتر هەبێت؟ نەبوو. هەتا ئەو کاتەی کە رژێمی سەدام لەسەر کار بوو رێگایەك بۆ ئەمە نەبوو و هیچ رێگایەکی بۆ نەدۆزرایەوە.

لە ساڵی ٢٠٠٥دا ئەو بۆچوونەی خۆم لە ئیستانبوڵ لە گفتوگۆیەکدا بۆ تاڵەبانی باسکرد:" هۆکاری سەرەکی لایەنگری کردنی من لە جەنگ ئێوەن: کوردەکان.

ئێوە پێتانوابوو کە ئەگەر بەهۆی ئەم جەنگەوە سەدام بڕوخێت بارودۆخی کوردەکان باش دەبێت. منیش پێموابوو کە دەبێ پشتگیری لەم جەنگە بکرێت. چونکە ئەو شتەی بۆ کوردەکان'ی عێراق باش بێت بۆ کوردەکان'ی تورکیا'ش باش دەبێت و ئەو شتەش بۆ کوردەکان'ی تورکیا باش بێت لە ئەنجامدا بۆ تورکیا'ش باش دەبێت."

تاڵه‌بانی به‌ بێئه‌وه‌ی هیچ کاردانه‌وه‌یه‌کی هه‌بێت و ته‌نانه‌ت جوڵه‌یه‌کیش له‌ ده‌موچاویدا دیار بێت، گوێی له‌ قسه‌کانم گرتبوو. خۆی له‌ راستیدا ئه‌گه‌ر سه‌یر بکرێت هه‌سته‌ خراپه‌کانی من، یان هه‌ستی دژایه‌تیکردنم بۆ به‌ڕێوه‌بردنی زاڵمی به‌عسی که‌ سه‌دام سه‌رۆکایه‌تی ده‌کرد، له‌به‌ر ئه‌وه‌ نه‌بوو که‌ عێراق زوڵمی له‌ کورده‌کان کردبوو. خاڵی سه‌ره‌تای ئه‌و هه‌ستانه‌ی من په‌یوه‌ندی به‌ کورده‌کان نه‌بوو. گرنگی پێدانی من بۆ عێراق به‌هۆی ئه‌و گفتوگۆ سیاسی و مێژووییانه‌م بوو که‌ بۆ یه‌که‌مجار له‌ به‌یروت له‌گه‌ڵ عادل عه‌بدولمه‌هدی دا کردبووم و دواتریش به‌هۆی جه‌نگی ئێران- عێراق زیاتر بوو.

له‌ دڵه‌وه‌ پشتیوانیم له‌ شۆڕشی ساڵی ١٩٧٩ی ئێران کردبوو. هه‌وڵه‌کانی سه‌دام بۆ خنکاندنی ئه‌و شۆڕشه‌ که‌ هێشتا له‌ ته‌مه‌نی یه‌ك ساڵیدا بوو و ده‌ستپێکردنی جه‌نگێکی هه‌شت ساڵه‌ له‌ دژی ئێران که‌ بووه‌ هۆی کوژرانی هه‌زاران مرۆڤ، بته‌وێ و نه‌ته‌وێ سه‌رنجی منی به‌لای عێراق'دا راکێشا و هه‌ستی دژایه‌تی منیشی له‌به‌رامبه‌ر خودی سه‌دام زیاتر کرد. شۆڕشی ئێران له‌ ته‌مه‌نی که‌سانی وه‌کو مندا، یه‌کێك له‌ پڕجۆش و خرۆشترین رووداوه‌ مێژووییه‌کان بوو. شای ئێران له‌به‌ر چاوی جیلی ئێمه‌ نوێنه‌رایه‌تی رژێمێکی سته‌مکاری ده‌کرد که‌ واده‌زانرا هه‌تاهه‌تایه‌ ده‌مێنێته‌وه‌.

له‌ ساڵه‌کانی ١٩٦٠کاندا به‌هۆی ئه‌و هه‌سته‌ دژه‌ ئه‌مریکایی و دژه‌ ئیمپریالیستییه‌ی که‌ به‌هۆی جه‌نگی ڤێتنام'ه‌وه‌ له‌لای که‌سانی وه‌کو من دروست ببوو، هه‌رکاتێك که‌ باسی ئێران ده‌کرا له‌ زه‌ینی مندا دیکتاتۆرییه‌ك ده‌هاته‌ پێش چاو که‌ له‌ رێی رێکخستنێکی بێ ئامانی پۆلیسییه‌وه‌ به‌ناوی ساواك، وه‌ك جه‌ندرمه‌ی ئه‌مریکا له‌ ناوچه‌که‌ کاری ده‌کرد. له‌ ساڵی ١٩٧٨دا هاتنی ملیۆنان مرۆڤی بێ چه‌ك بۆ ناو کۆڵانه‌کان و رووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی سوپایه‌کی گه‌وره‌ و گرانی وه‌ك سوپای ئێران و هێزه‌ ئه‌منیه‌کانی ئه‌و وڵاته‌، رووداوێکی پڕ له‌ هه‌یه‌جان و جۆش و خرۆش بوو.

رژێمی پادشایی ئێران له‌لای که‌سانی وه‌ك ئێمه‌، ئه‌وه‌نده‌ گوزارشتی له‌ رژێمێکی سته‌مکار و داپڵۆسێنه‌ر ده‌کرد که‌ له‌ سه‌ره‌تای ساڵی ١٩٧٩دا هیچ که‌س له‌و جیله‌ی ئێمه‌ لێپرسینه‌وه‌ی له‌ شوناسی ئیسلامی شۆڕشی ئێران و ئایه‌تولڵا خومه‌ینی سه‌رکرده‌ی شۆڕشه‌که‌ نه‌ده‌کرد، بگره‌ به‌شێوه‌یه‌کی پڕ له‌ رێز و خۆشه‌ویستی سه‌یرمان ده‌کرد.

دوای ئه‌وه‌ی که‌ربه‌لا'م له‌ عێراق بینیبوو، شۆڕشی ئێران بۆ که‌سێکی وه‌کو من وه‌ك پشتڕاستکردنه‌وه‌ی ئه‌و شتانه‌ بوون که‌ له‌ مێشکمدا دروست ببوون. له‌ مارتی ١٩٧٨دا یه‌که‌م جار چوومه‌ عێراق و به‌ سه‌ردانێکی یه‌ك رۆژه‌ چوومه‌ که‌ربه‌لا و بابل (حیلله‌). له‌به‌ر ئه‌وه‌ی که‌ له‌ رابردوویه‌کی نزیکدا بۆ ماوه‌ی دوو ساڵ له‌ وڵاتێکی وه‌کو لوبنان به‌ تایبه‌ت ناوچه‌کانی باشووری ئه‌و وڵاته‌دا که‌ شیعه‌'ی زۆری تێدایه‌، ژیابووم، زانیاری زۆرم سه‌باره‌ت به‌ شیعه‌کان هه‌بوو. به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ئه‌و دیمه‌نه‌ پڕ کاریگه‌رییه‌ی که‌ له‌سه‌ر

مەزاری حەزرەتی حسێن و مزگەوتی حەزرەتی حسێن لە کەربەلا کە منارەیەکی ئاڵتونی هەبوو، بینیم، لە هیچ شوێنێکی دیکە نەمبینیبوو. هەزاران مرۆڤ بە مناڵ و گەورە، وەك مێرووله لەنێو مزگەوتەکەدا بەرەو مەزاری حەزرەتی حسێن دەڕۆیشتن و دەگریان و نزایان دەکرد و نوێژیان دەکرد. لە هەموو گۆشەیەکی کەربەلادا هەست بە وزەیەکی گەورەی مەعنەوی دەکرا. لەبەر خۆمەوە وتم:"ئەگەر ئەم وزە زۆرە ئاراستەی ئامانجێکی سیاسی بکرێت کەس ناتوانێت ڕووبەڕووی بێتەوە."

دوای ساڵێك، ئەو شۆڕشەی کە لە کەربەلا بینیبووم، ئەمجارەیان لە ئێران و لە کۆڵانەکانی تاران ڕوویدەدا. لە ڕوانگەی منەوە ئەو جوڵانەوە گەورەیەیەی کە لە ئێران ڕوویدەدا، بەردەوام لە بەرزبوونەوەدا بوو و بە تەواوەتی دەگەیشتە ئامانجەکەی خۆی و هیچ گومانێکم لەوە نەبوو. بڕوای تەواوم هەبوو بەوەی کە شۆڕشی ئێران سەرکەوتن بە دەست دەهێنێت. وەکو هەموو کەسێك کە ساڵانی گەنجێتی خۆی بە کاردانەوە پیشاندان لە دژی ڕژێمی شا و ڕێکخراوە پۆلیسییەکەی (ساواك) تێپەڕ کردووە، منیش بەناوی گەلی ئێران و ناوچەکەمانەوە بەخۆشحاڵیەوە پێشوازیم لە شۆڕشی ئەو وڵاتە دەکرد.

لەدوای کودەتای سەربازی١٢ی مارتی١٩٧١، ماوەی نێوان ١٩٧١-١٩٧٣م کە وەك" ساڵانی بنیادنانی کەسایەتیم" بوون لەنێو جوڵانەوەی فەلەستین٘دا تێپەڕ کرد و بەو هۆیەشەوە لە لوبنان زۆر کەسی ئێرانی٘م ناسی کە وڵاتەکەی خۆیان جێهێشتبوو. لە ساڵانی ١٩٧٠کاندا جوڵانەوەی فەلەستین شوێنی بەیەکگەیشتنی شۆڕشگێڕان و نەیارانی ڕژێمەکانی وڵاتانی ناوچەکە و لە مانایەکی گشتیشدا شوێنی یەکگرتنی ئەنتەرناسیۆلیستەکان بوو. بەشێوەیەکی سروشتی منیش لەنێو جوڵانەوەی فەلەستین٘دا هەندێك هاوڕێی ئێرانی٘م پەیدا کرد و لە ڕێی ئەوانیشەوە زانیاری زۆرم سەبارەت بە ڕژێمی شا و ڕێکخراوی نهێنی ستەمکاری ساواك و جوڵانەوە چەپەکانی ئێران وەك حزبی تودە، تودەی ئینقلابی، توفان، فیداییەکانی خەڵق (موجاهیدینی خەڵق) و... تاد، پەیداکرد و لەسەر هەڵوێستی ئایدۆلۆژی و ڕێبازی سیاسییان زانیاریم کۆکردەوە.

شۆڕشی ئێران لە قۆناغی دووەمی ژیانی بەردەوامی ڕۆژنامەنوسی مندا ڕوویدا. دوای دوو ساڵ کارکردن لە ڕۆژنامەی وەتەن و ئاژانسی هەواڵەکانی تورك٘دا بێ ئیش مامەوە و دووبارە خۆم ئامادەکرد بۆئەوەی کە بەشداری لە تاقیکردنەوەیەکدا بکەم سەبارەت بە کورسییەکی تایبەت بە مێژووی سیاسی لە کۆلیژی زانستە سیاسییەکان کە خۆم دەرچووی ئەوێ بووم، تا لەوێ وەك ڕاهێنەر دەستبەکار بم و بەوجۆرەش خۆم تێکەڵ بە ژیانی ئەکادیمی بکەمەوە. لە ئەنقەرە لە ماڵی عومەر مەردا هاوڕێی کۆنی کاتی مەکتەب و هاوڕێی تێکۆشانی سیاسیم دەمامەوە. عومەر لەو کاتانەدا لە کۆلیژی زانستە سیاسیەکان ڕاهێنەری کورسیی یاسای دەوڵەتان بوو. بەهۆی ئەو بەڵێنەی کە بە هاوسەرەکەی دابوو کە لەدەستیدابوو و هەروەها لەبەر ئەو

بەڵێنەی کە بە پرۆفیسۆر دکتۆر سەحا مەرای مامۆستای کورسییەکەی خۆی دابووی کە بەهۆی شێرپەنجەوە کۆچی دوایی کردبوو، نامەی دکتۆراکەی خۆی دەنوسی. نامەی دکتۆراکەی عومەر مەردا لەو کاتانەدا بۆ زۆرێك لە تورکەکان وەك شتێکی فەنتازی دەهاتە پێش چاو:"مافی تۆمارکردنی سکاڵای تاکەکەسی لە دادگای مافەکانی مرۆڤی ئەورووپا..."

ئەو رۆژانە تورکیا وردە وردە لە کودەتای ١٩٨٠ نزیك دەبووەوە و هەموو رۆژێك پێکداداني خوێندکارانی راستگەرا و چەپگەرا روویدەدا و لە چروم و مەرعەش عەلەوییەکان دەکوژران و رووداوی ناخۆش و پڕ لە ئاڵۆزی روویاندەدا. هەردووکمان لە ماڵ دەرنەدەکەوتین و زۆر مەشق و راهێنانمان دەکرد. ئەوەی کە هەردووکمانی بە دنیای دەرەوە دەبەست و هیوای پێدەبەخشین رۆژانی شۆڕشی ئێران بوو کە بەرەو روخاندنی رژێمی شا نزیك دەبووەوە. لە شوباتی ١٩٧٩دا ئایەتوڵا خومەینی گەڕایەوە بۆ تاران. ناوبراو لە ١٩٦٣وە لە ژیانی دوورخراوەییدا بوو. کاتێك کە ناسرا، ئیتر زانیاری سەبارەت بە ساڵانی دوورخراوەییەکەیشی بڵاوبوونەوە. نزیکەی ساڵێك لە بورسا واتا لە تورکیا ژیابوو و دوابەدوای ئەوەش دەربازی نەجەف ببوو. هەتا ئەو کاتەی کە سەدام لەبەر ئەوەی تووڕەیی و بێزاری شا لەبەرامبەر خۆی نەوروژێنێت، خومەینی سنورداش کرد، ناوبراو بۆ ماوەی ١٥ ساڵ لە نەجەف مایەوە و دواتر لە شوێنێکی نزیك لە پاریس نیشتەجێ بوو. ئێمەش لەنێو ئەو کەسانەدا بووین کە بە جۆش و خرۆشەوە لە تەلەفزیۆنەوە سەیری گەڕانەوەی خومەینی'مان لە پاریس بۆ تاران دەکرد کە بە فڕۆکەیەکی بۆینگی ٧٤٧ دەگەڕایەوە.

زیاتر لە ملیۆنێك مرۆڤ لە جۆش و خرۆشێکی سەیروسەمەرەدا لە مەیدانی شەهیاد کە دوای شۆڕش ناوەکەی گۆڕا بۆ ئازادی، لە نزیك فڕۆکەخانەی تاران پێشوازییان لە خومەینی کرد. لەو رۆژەدا بە هەواڵی کوژرانی عەبدی ئیپەکچی‌سەرنوسەری‌رۆژنامەی میللیەت تووشی شۆك بووین. ئەگەر لەو رۆژانەشدا بەتەواوەتی نەمانزانیبێت کە رۆژی کودەتای ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ نزیك دەبێتەوە، ئەوا درکمان بەوە کردبوو کە وڵات بەرەو داهاتوویەکی تاریك هەنگاو دەنێت. لەبەر ئەوەش لەو رۆژانەدا ئێران تاکە بابەتێك بوو کە بۆ کەسانێکی وەکو ئێمە مایەی گەشبینی بوو و خاڵێکی هیوای تێدابوو.

لەگەڵ کوژرانی عەبدی ئیپەکچی'دا هەستەکانمان تێکەڵ و پێکەڵ بوو. تورکیا لە خاڵی وەرچەرخانێك بە ئاراستەی کودەتایەکی سەربازی نزیکببووەوە و لە ئێران'یش شۆڕش سەرکەوتبوو. زۆری پێنەچوو کە دووبارە لە جیاتی ژیانی ئەکادیمی، خۆم لەنێو کاری رۆژنامەوانیدا بینییەوە. ئەویش لە رۆژنامەیەکی وەکو رۆژنامەی جمهوریەت'دا کە هەر لە سەرەتاوە دەمویست لەوێ کاربکەم. کۆنترین و ریشەدارترین رۆژنامەی تورکیا کە وەك قەڵای ئایدۆلۆژیای کەمالیستەکان لە قەڵەم دەدرا خەریکبوو خۆی نوێ دەکردەوە. هەر لەو رۆژانەوە کە لە رۆژنامەی جمهوریەت'دا دەستبەکاربووم، لە نزیکەوە چاودێری و بەدواداچوونی گۆڕانکارییەکانی

ئێران'م دەکرد. هەوڵمدا کە هەموو وردەکارییەکانی ڕووداوەکانی ناو ئێران و پێکهاتەی دەسەڵاتی نوێی ئەو وڵاتە بە وردی بزانم. لە تەنیشت ئێمەدا شۆڕشێك کە پێموابوو بە ئەندازەی شۆڕشی ١٧٨٩ی فەڕەنسا و ١٩١٧ی بۆلشەڤیك لە ڕوسیا گەورەبوو، ڕوویدابوو. خەریکبوو گیانم دەربێت بۆ ئەوەی‌سەردانی ئێران بکەم، بەڵام بەڕێوەبەرانی ڕۆژنامەی جمهورییەت زۆر حەزیان لەمە نەدەکرد و لەگەڵ ئەوەشدا توانای دارایی ڕۆژنامەکە بەئەندازەیەك نەبوو کە بتوانێت من ڕەوانەی ئێران بکات.

لە نوسینگەی عەبدولحەسەن بەنی سەدر سەرکۆماری ئێران'ەوە تەلەفۆنم بۆ کرا و بانگهێشتی ئێران کرابووم. ئەگەر بمتوانیبایە پارەی ڕێگا و هاتوچۆ دابینبکەم، لە فڕۆکەخانەی میهرابادی تاران پێشوازیم لێدەکرا و وەك میوانی نوسینگەی سەرۆکایەتی کۆماری ئێران دەمتوانی دیدار و چاوپێکەوتنەکانم بکەم. لە خۆشیدا چەند خولەکێك لەنێوماڵەکەمدا هەڵپەڕیم و ڕانەدەوەستام و لەبەرخۆمەوە گۆرانیم دەوت. بەڵام ڕاوێژکارەکانی سەرکۆماری ئێران ژمارەی تەلەفۆنی ماڵەکەی منیان لە کوێوە زانیبوو؟ هەروا لە خۆمەوە هەستێکم کرد و یەکسەر تەلەفۆنم بۆ میشێل نۆفڵ لە بەیروت کرد. بەهەڵەدا نەچووبووم، ئەو هاوڕێ لوبنانی'یەم کە لە چەندین وێستگەی ژیانمدا ڕۆڵی گێڕابوو جارێکی دیکە دەرکەوتبووە مەیدان.

میشێل نۆفڵ یەکێك لەو ڕۆژنامەنوسانە بوو کە لەنێو ئەو فڕۆکەیەدا بوو کە لە گەشتێکی مێژوویدا خومەینی‌لە پاریس'ەوە بۆ تاران هێنابووەوە و ڕاگەیاندنی لوبنان لە ڕێگەی قەڵەمەکەی ئەوەوە ڕۆژانی شۆڕشی ئێران'ی لە تاران خوێندبووەوە و بەوەش ناوبانگی پەیداکردبوو. میشێل وتی:" من ژمارە تەلەفۆنەکەی تۆم پێداون." کەسانی نزیك لە بەنی سەدر پێیانگوتبوو کە ئەوان گرنگی زۆر بە تورکیا دەدەن و پێویستیان بە ڕۆژنامەنوسێك هەیە کە لەوان تێبگات، بەڵام لە تورکیا کەس ناناسن. ئەویش ناوی منی پێدابوون و باشترین گرەنتی پێدابوون سەبارەت بەوەی کە من لە ڕژێمی نوێی ئێران تێدەگەم و درکی دەکەم. پێیگوتبوون وەکو زۆرێك لەو کەسانەی کە ئێستا لە بەڕێوەبەرایەتی ئێران'دان منیش لە ١٩٧٠کاندا لەنێو جوڵانەوەی فەلەستین بووم و "لە بەیروت'ەوە پێگەیشتووم." ئەم گرەنتیەش بۆ کەسانی دەوروبەری بەنی سەدر بەس بوو، لەبەر ئەوەش یەکسەر دەستیان بۆ تەلەفۆن بردبوو و منیان بانگهێشت کردبوو.

کاتێك کە بانگهێشتەکەی تاران'م ئەویش لە ئاستی بەنی سەدر'دا وەرگرت، ڕۆژی دواتر یەکسەر چووم بۆ لای ئۆکتای کوردبوکە سەرنوسەری ڕۆژنامەی جمهورییەت و لێی پاڕامەوە تا من ڕەوانەی تاران بکات. ئەویش خۆی ڕانەگرت و بە قسەی کردم. ڕۆژنامەی جمهورییەت لەبەرامبەر وەرگرتنی بلیتی فڕۆکەدا بەمەرجی بڵاوکردنەوەی ریکلامی کۆمپانیای گەشتی ئاسمانی AEROFLOTی سۆڤیەت ڕێککەوتنێکی کردبوو. لە ڕێگەی AEROFLOTەوە دەچوومە مۆسکۆ و لەوێشەوە دەربازی تاران دەبووم. بەجۆش و خرۆشێکی زۆرەوە لە ١ی مایسی ١٩٨٠دا پێم نایە مەیدانی سوور و لەوێشەوە بەسەر مۆسکۆ'دا بەرەو

تاران فڕیم. هیچ کەسێك نەبوو کە پێشوازی لە من بکات. ئەو ناو و ژمارە تەلەفۆنەی کە پێم بوون، بردمە لای پۆلیسی فڕۆکەخانە و پرسیارم لەوان کرد. ژمارەکە هی نوسینگەی سەرۆك کۆمار بوو و ناوەکەش ناوی یەکێك لە نزیکترین راوێژکارەکانی سەرکۆمار بوو. پەیوەندیم لەگەڵ سەرۆکایەتی کۆماری ئێران بەرقەرارکرد و ئەوانیش کەسێکی عێراقی'یان بەناوی محەمەد ساڵح حسێنی نارد تا لە فڕۆکەخانەکە من هەڵبگرێت.

محەمەد ساڵح یەکێك لەو کەسایەتییە سیاسییانەی شیعە بوو کە پێیەکیان لە بەیروت و پێیەکیان لە تاران بوو و نەیاندەتوانی لە عێراق بمێننەوە. لە هەمووشی گرنگتر ئەوەبوو کە پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ ماڵی خومەینی هەبوو. رۆژێك دوای ئەوەی کە گەیشتمە تاران، لەگەڵ حسێن خومەینی نەوەی خومەینی هاتن بەدوای مندا و لە هۆتێلەکە هەڵیانگرتم و منیان بەرەو ماڵی خومەینی برد. لە هۆڵە فراوانەکەی نێو ماڵەکەدا چەندین کاتژمێر بەیەکەوە گفتوگۆمان کرد. لەگەڵ پورزا و خاڵۆزاکانی حسێن و نەوە بچووکەکانی سەرکردەی شۆڕشی ئێران'دا یاریم کرد و کاتم تێپەڕ کرد.

ئایەتوڵا روحوڵا خومەینی کە ئیدی نازناوی "ئیمام"ی پێدرابوو، هیچ لە نهۆمی سەرەوە نەهاتە خوارەوە. دەمەو ئێوارە بۆ ئەنجامدانی رێوڕەسمێکی تێپەڕ بوون لەبەردەم ماڵەکەیدا، چووینە دەرەوە. پیاوانی ئایینی ئێرانی بە جلوبەرگی ئایینی خۆیانەوە واتا بە جوبە و عەمامە رەش و سپییەکانی خۆیانەوە (ئەو کەسانەی کە بە نەوەکانی پێغەمبەر لەقەڵەم دەدران بە سەید ناو دەبران و عەمامەی رەشیان لەسەر دەبەست و ئەو زانا ئایینیانەی دیکەش کە لە نەوەی پێغەمبەر نەبوون، شێخ'یان پێدەگوترا و عەمامەی سپییان دەبەستەوە) بۆ یەکەمجار لەبەردەم سەرکردەدا تێپەڕدەبوون. لەگەڵ محەمەد ساڵح و حسێن خومەینی'دا لەبەردەم خانووەکەدا راوەستابووم و کاتێك سەرم هەڵبڕی لە باڵکۆنەکەیەوە کە دوو تا سێ مەتر لە سەرەوەی منەوە بوو، بۆ یەکەمجار ئیمام خومەینی'م بینی.

محەمەد ساڵح دوای ئەوەی کە لە یەکەم سەردانی مندا بۆ ئێران یەکترمان ناسی و پاش ئەو میوانداریيەی کە بۆ من کردی، لە بەیروت بە دەستی دەزگای هەواڵگری عێراق تیرۆر کرا.

بەیروت جگە لەوەی کە مەیدانێك بۆ ململانێ و یەکلاییکردنەوەی حیسابی نێوان وڵاتانی عەرەبی و ئیسرائیلی و فەلەستینیەکان بوو، لەدوای شۆڕشی ئێران'یشەوە تایبەتمەندیەکی دیکەی پەیدا کردبوو. ببوو بە شوێنێك بۆ ئەوەی کە رژێمی عێراق لەوێ ئەو نەیارانەی خۆی لەناو بەرێت کە پەیوەندییان لەگەڵ ئێران هەبوو. لە ئێران لەگەڵ عێراقی'یەك بە ناوی محەمەد ساڵح چاوم کرایەوە و دواتریش لەگەل برایەکیدا بەناوی محەمەد سادق حسێنی درێژەم بە رێگای خۆم دا.

محەمەد سادق لە ئەڵمانیا ئەندازیاریی خوێندبوو. دوابەدوای ئەوەش هاتبوو خزمەتی کۆماری ئیسلامی ئێران بکات. بەپێی تێپەڕبوونی کاتیش ببوو بە یەکێك لە نزیکترین راوێژکارەکانی رەفسەنجانی. ئەو یەکێك

لەو کەسانە بوو کە هەرکاتێك سەردانی ئێران'م دەکرد وادەی دیداری لەگەڵ بەرپرسان بۆ رێکدەخستم و یەکێك لەو سەرچاوانەش بوو کە سەبارەت بە رووداوەکانی ناوخۆی ئێران سوودم لێ وەردەگرت. بەهۆی ئەوەی کە لە یەکەم سەردانمدا بۆ ئێران، لە ئاستی سەرەوە پەیوەندیم بەرقەرار کردبوو، سەرەڕای ئەوەی کە هێشتا ٢٤ کاتژمێر لەو سەردانەشم تێپەڕ نەبوو، خۆم لە ماڵی خومەینی'دا بینییەوە و بە رۆژیش لە نوسینگەی سەرۆکایەتی کۆمار کاتم تێپەڕ دەکرد. لەو رۆژە سەرەتاییانەی شۆڕشدا بە چەندین هەفتە لە تاران بووم. ئەمانەش هەمووی بوونە هۆی ئەوەی کە لەگەڵ ژمارەیەك لە کەسایەتیە ئێرانیەکان'دا پەیوەندی نزیك بەرقەرار بکەم. لە پیاوانی ئایینییەوە بگرە هەتاوەکو ئەو کەسایەتیە سیکۆلارانەی کە لە دەرەوە بەتایبەتی ئەمریکا خوێندبوویان و زیاتر لە دەوری بەنی سەدر یەکەم سەرکۆماری هەڵبژێردراوی کۆماری ئیسلامی کۆببوونەوە. جگە لەوە کەسانێکم ناسی کە لەنێو جوڵانەوەی فەلەستین لە لوبنان یان لەنێو هێزی چەکداری رێکخراوی ئەمەلی شیعەکان'دا جێیان گرتبوو و سەبارەت بە سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست خاوەنی ئەزمونێك بوون و لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر کەسدا توانیم پەیوەندی دۆستانە بەرقەرار بکەم.

رۆژ بە رۆژ و لەنێو رووداوەکانەوە توانیم رووداوە سەرسوڕهێنەرەکانی سیاسەتی ناوخۆی ئێران چاودێری بکەم. بەدەر لە رەهەندی بەیروت یان لوبنان رەهەندی تاران و ئێران'یش بە ژیانم زیاد ببوو. بەئەندازەی ئەو ماوەیەی کە لە تورکیا بووم کاتم لە تاران و بەیروت یاخود رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و شارە جیاوازەکانی ئێران تێپەڕکرد. لەبەر ئەمەش لەدوای کودەتای ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ بەشێکی زۆری ژیانی خۆم لە دەرەوەی تورکیا بەزۆری لە ئێران و لوبنان تێپەڕکرد. لە روانگەیەکیتریشەوە دەتوانم بڵێم کە تاریکترین رۆژانی دوای ١٢ی ئەیلول نەژیام یاخود زیاتر لە تورکیا خۆم بە پرسی ئێران و فەلەستین سەرقاڵ کرد.

هیچ گومانی تێدا نیە کە جەنگی ئێران - عێراق مۆری خۆی لەم قۆناغە داوە. دە رۆژ دوای کودەتای سەربازی تورکیا لە ١٢ی ئەیلول'دا لە رۆژی ٢٢ی ئەیلول بەهۆی بۆردومانی عێراق بەسەر تاران و شارە جۆراوجۆرەکانی دیکەی ئێران'ەوە، جەنگ بەشێوەیەکی بروسکە ئاسا دەستیپێکرد. لە رۆژی ٢٣ی ئەیلول'دا هێزەکانی عێراق لە رێگەی وشکانییەوە لە باشووری ناوچەی شەتولعەرەب چوونە ناو پارێزگای خوزستان لە ئێران. زۆربەی دانیشتوانی خوزستان عەرەب بوون و عێراق'یش ئەو ناوچەیەی بە" عەرەبستان" ناودەبرد و ئەو ناوچەیەش ناوچەیەکی نەوتاوی ئێران بوو. شاری ئابادان کە گەورەترین پاڵاوگەی نەوتی دنیای لێبوو، لەدوای هێرشەکە لەنێو ئاگردا مابووەوە. عێراقییەکان ئەوەندە دڵنیا بوون لەوەی کە لە جەنگەکەدا پیرۆز دەبن و شۆڕشی ئێران و کۆماری ئیسلامی دەڕوخێنن کە باڵیۆزخانەی عێراق لە ئەنقەرە لەهەریەك لە رۆژنامە بەناوبانگەکانی تورکیا کەسێکی بانگهێشت کرد و بە فڕۆکە رەوانەی عێراق'ی کردن تا رەوانەی بەرەی جەنگ بکرێن.

عێراق لە سێ قۆڵەوە چووبووە ناو خاکی ئێران و پێشڕەوی دەکرد. پێویستبوو لە بەرەی ئێران'یشەوە چاودێری جەنگەکە بکرێت. بۆیە لەگەڵ چەند هاوڕێیەك بە ڕێ کەوتین و ئەمەش لەدوای شۆڕش، دووەم سەردانێك بوو کە من بۆ ئێران ئەنجامم دەدا. بەڵام ئێمە بە ئەندازەی هاوکارەکانیترمان کە عێراقییەکان بردبوونیان بۆ بەغدا بەخت یاوەرمان نەبوو.

فڕۆکەخانەی تاران داخرابوو. لە ئیستانبوڵ چووینە ئەرزڕۆم و لەوێشەوە چووینە دۆغوبایەزید. کاتێك گەیشتینە دۆغوبایەزید دەروازەی سنوری گوربولاك لەلای ئێران'ەوە داخرابوو، چونکە لە نزیك سنوورەکاندا پاسدارەکانی ئێران و سەرهەڵداوەکان لە گوندە کوردییەکانی ئێران لەشەڕ و پێکداداندا بوون. لە دۆغوبایەزید'ەوە چاومان بەو ئاگرە دەکەوت کە لەودیو سنوورەکانەوە کەوتبووەوە.

درەنگیش بێت دەربازی ناو خاکی ئێران بووین و بە پاسێکەوە خۆمان گەیاندە تەبریز. لە تەبریز دۆخ و ئاڵۆزی جەنگ زاڵ بوو و هێرشی ئاسمانی بۆ دەکرا. هەموو وڵات لە ژێر هێرش و هەڕەشەدا بوو. لەدوای تەبریزە'وە بەرەو تاران بە ڕێ کەوتین. لە تاران'یش لەدوای ئەوەی لە هۆتێل نیشتەجێ بووین، زەنگی مەترسی لێیدا و دەنگی تەقەی دۆشکا دەهات و تاران بە دەنگی بۆردومان دەلەرزایەوە. هەموو کەس بەرەو سەنگەرەکان رایان دەکرد و ڕێگاکان چۆڵ دەکران. من و هاوڕێی خۆشەویستم خوالێخۆشبوو ئارهان ئاك یلدز کە ئەو کاتە بۆ رۆژنامەی میللیەت کاری دەکرد، لەسەر بانی هۆتێلەکەوە سەیری بۆردومانەکەمان دەکرد.

لەدوای ساڵانی ١٩٧٠کانی بەیروت'ەوە ئەمە یەکەمجاربوو لەنێو ئاگری جەنگێکدا بمێنمەوە. هیچ پەیوەندییەکم لەگەڵ ئەو ئەنجامانەدا نەمابوو کە بەهۆی کودەتای ١٢ی ئەیلول'ەوە لە تورکیا دروست ببوون. عەقڵ و فیکرم لەسەر بەرەی جەنگ لە باشووری ئێران لە هێڵی ئابادان - خوڕەم شەهردا بوو و دەمویست سەردانی ئەوێ بکەم.

گەورەترین شەڕ و پێکدادانەکان لەوێ روویاندەدا. کاری رۆنامەوانیش پێویستی بەوە هەبوو کە لەوێ بیت. خۆی لەخۆیدا دەیان رۆژنامەنوس لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی دنیاوە بۆ ئەوەی کە بتوانن سەردانی ئابادان - خوڕەم شەهر بکەن سەردانی وەزارەتی ئیرشادی ئێران'یان کردبوو. بەڵام ئەوێ وەك ناوچەی سەربازی راگەیەندرا و بۆ ئەوەی کە سەردانی ئەوێ بکەین دەبوو سەربازمان لەگەڵدا بنێرن. بۆیە چاوەڕوانی وەڵامی سوپای ئێران بوون. هەموو رۆژێك سەردانی وەزارەتی ئیرشاد'مان دەکرد و چاوەڕوانی مۆڵەت بووین بۆ ئەوەی بەرەو بەرەی جەنگ بڕۆین. مۆڵەتی ئەوە درا کە رۆژنامەنوسەکان بچنە بەرەی جەنگ لە بەشی ناوەڕاست و باکووری سنوری ئێران - عێراق کە گرنگیەکی سەربازی کەمتری هەبوو. بەشێکی زۆر لەو هاوڕێیانەی کە پێکەوە لە تورکیا هاتبووین وتیان " لە هیچ باشترە، دەچین یەکی سەر و وێنەیەك

دەگرین و دواتر دەگەڕێینەوە بۆ تورکیا"و رۆیشتن. بەڵام من پێداگریم کرد لەوەی کە بچم بۆ ناوچەی نەوت و سەردانی ئابادان بکەم. بۆیە ئەوە لە تاران مامەوە.

دواتر بۆ ئەوەی شتێکم دەسکەوێت سەردانی وەزارەتی ئیرشادٌم کرد. بەڵام لەوێ پێیانگوتم کە چەند کاتژمێرێك بەر لە ئێستا پاش ئەوەی کە مۆڵەتێکی کتوپڕ دراوە، پاسەکە رۆیشتووە. منیش زۆر تووڕە بووم. فۆتۆجۆرنالیستێك بەناوی جۆشقون ئاراڵ کە تازە هاتبووە تاران و هەر بە رێکەوت سەردانی وەزارەتی ئیرشادی کردبوو، لەو کاتەدا ناوی منی لە لیستەکە سڕیبووەوە و سواری پاسەکە ببوو و رۆیشتبوو. شێت و هار ببووم. پێویستبوو هەر جۆرێك بێت ئەو پاسە بدۆزمەوە کە رۆژنامەنوسەکانی بۆ بەرەی جەنگ دەبرد. بەڵام بە بێئەوەی کە یاوەرێکی سەربازیت لەگەڵدا بێت نەدەبوو سەردانی ناوچەی ئابادان و خورەم شەهر بکەیت. دواتر زانیم کە ئەوان لە رێگەدا پشوو دەدەن و شەو دەمێننەوە و لە ناوەندی پارێزگای لوڕستان لە خورەم ئاباد کە تا ئەندازەیەك تا ئەوێ نیوەی رێگاکە دەبێت، دەتوانم پێیان بگەم.

زانیم کە ئەگەر چانسم هەبێت بەرلەوەی بەرەو ئابادان بە رێکەوون دەتوانم پێیان بگەم. یەکسەر بەرەو گەراجی پاسەکانی تاران رۆیشتم. چانسم هەبوو. سواری پاسێك بووم کە بە بێئەوەی لە رێگا راوەستێت بۆ ئەهواز کە ناوەندی پارێزگای خوزستان بوو دەڕۆیشت. لە قوم تێپەڕ بووین و ئەراكٌمان دەرباز کرد و تا خورەم ئاباد رانەوەستاین. کاتێك گەیشتینە دزفول و لەوێوە دەربازی دەشتاییەکانی خوزستان بووین، چاومان بە ئاگری تۆپخانەکانی عێراق دەکەوت کە لە خۆرئاوا٘مانەوە دەیانهاوێشت.

تۆپخانەی عێراق خاکی ئێرانٌی دەلەرزاند. شوفێرەکە لە خاڵێکدا راوەستا و وتی:" لەمەوبەدوا مەترسیدارە، ناڕۆم." لێی پاڕامەوە و رێبوارەکانم هاندا کە پشتگیریم بکەن و قەناعەتم پێکردن کە مانەوەمان مەترسی زیاتری هەیە، بۆیە ئەوانیش گوشاریان خستە سەر شوفێرەکە و دواتر دەنگی سەڵاوات لەنێو رێبوارەکاندا هات و بەوجۆرەش بە رێ کەوتین.

گەیشتینە ئەهواز. بەهۆی بۆردومانەوە ئەهواز ئاڵۆز ببوو، تێکدرابوو. ئەو هۆتێلەم دۆزیەوە کە رۆژنامەنوسەکان لەوێ دەمانەوە. تازە گەیشتبوون. منیش خۆم پێ گەیاندبوون. بەوجۆرەش ئیدی دەمتوانی پێ بنێمە ناوچەیەکی سەختی جەنگ کە ئەویش ئابادان و خورەم شەهر بوو. دەربازی ئابادان بووین و چووینە خورەم شەهر. بی بی سی رایگەیاندبوو کە خورەم شەهر کەوتۆتە دەستی هێزەکانی عێراق. خورەم شەهر لەلای ئێرانی رووباری شەتولعەرەبٌەوە تەنها ١٠ کیلۆمەتر لە بەسرەٌوە دوور بوو. شارەکە نەکەوتبووە دەستی هێزەکانی عێراق، بەڵام هێزەکانی عێراق لەبەر دەروازەی شارەکەدا بوون و هاتنیان لە ئان و ساتدا بوو. کاتێك لەنێو خورەم شەهردا دەگەڕاین رۆکێتی کاتیۆشا بەسەرماندا دەباری. بۆیە خۆمان خست بەسەر زەویەکەدا. لەنێو کەمپی ئەو بەسیجییانەی ئێران کە بۆ بەشداریکردن لە جەنگی ئەهواز

بە حەزی خۆیان هاتبوون، لەگەڵ ئاگری کاتیۆشای هێزەکانی عێراق‌دا ئاشنا بووین. ئەو ڕۆکێتانەی کە لە ئەهواز چەند سەد مەترێك لەولامانەوە دەکەوتن، ئەمجارەیان لە چەپ و ڕاست و بەردەمماندا دەکەوتنە سەر زەوی. لەوانەیە ئەو سەربازانەی سوپای عێراق کە ڕۆکێتی کاتیۆشیان بۆ ئێمە دەنارد، ئێمەیان بینی بووبێت. ماوەیەکی زۆر لەسەر زەویەکەدا بە بێئەوەی جوڵە بکەینماینەوە. دوای ئەوەی کە بۆردومانی کاتیۆشاکان ڕاگیرا، ڕامانکرد بۆ ناو پاسەکە و شاری خوڕەم شەهر‌مان بەجێهێشت کە لەژێر هێرشدا بوو. تەنانەت لەنێو ئەو ساڵە دوورودرێژانەی تەمەنیشم کە لەنێو جوڵانەوەی فەلەستینی‌دا بووم، هیچ کاتێك بە ئەندازەی ئەوەی خوڕەم شەهر لە مردنەوە نزیك نەببووم. ٤٨ کاتژمێر دوای دەرکەوتن لە خوڕەم شەهر ئەو شارە کەوتە دەستی هێزەکانی عێراق و لەماوەی ئەو جەنگی هەشت ساڵەدا تا ئەو کاتەی کە کەوتەوە دەستی ئێرانییەکان، زیاترین کەس لەو ناوچەیە کوژران. بۆیە ئێرانییەکان ناوی ئەو شارەیان گۆڕی بە خونین شەهر واتا شاری خوێناوی.

ساڵانێك لەوەوپێش لە بۆردومانەکانی ئیسرائیل‌دا لە لوبنان، بەسەلامەتی ڕزگارم ببوو. ئەمجارەیان کاتێك نزیکەی هەزار کیلۆمەتر لەولای تاران‌ەوە لە ناوچەی شەتولعەرەب لە دزفول، ئەهواز، ئابادان و خوڕەم شەهر، لەدەست گوللەی هاوەن و ڕۆکێتەکانی سوپای عێراق ڕزگارم بوو، ئیدی بڕوام بەوە کرد کە حەوت ڕۆحم هەیە و بە ئاسانی نامرم.

بەهۆی ئەو شتانەی کە لەبەرەی جەنگی عێراق- ئێران‌دا بینیم تووڕەیی و بێزاریم لە سەدام حسێن زیاتر بوو. ئەو جەنگەی کە لە ٢٢ی ئەیلولی ١٩٨٠دا بەهۆی هێرشی عێراق بۆ سەر ئێران دەستپێکرد و بوو بە درێژخایەنترین جەنگی تەقلیدی سەدەی بیستەم لە مێژوودا تۆمارکرا، ئێران هەم هێرشی کرابووە سەر، هەم بە تەنها هێڵرابووەوە. بۆیە ساڵانێکی درێژ لە دڵەوە پشتگیریم لە ئێران دەکرد. لایەنگری کردنم بۆ ئێران تەنها پەیوەندی بە جەنگێکی ناڕەوا و نادادپەروەرانەوە نەبوو کە بەرۆکی ئەو وڵاتەی گرتبوو، بەڵکو پەیوەندی بەوەشەوە هەبوو کە شۆڕشی ئێران کاریگەری لەسەر کەسانێکی وەکو من دانابوو کە ریشەیەکی ئایدۆلۆژی چەپیان هەبوو. کاراکتەری ئیسلامی شۆڕشەکە منی هاندا بۆ ئەوەی کە زیاتر گرنگی بە بیروبۆچوونی ئیسلامی بدەم. خۆیشم کەسێکی سەر بە کۆمەڵگایەکی ئیسلامی بووم. فۆڕم و قاڵبی کەسایەتی خۆم لەنێو کۆمەڵگایەکی موسوڵمانی وەکو فەلەستینیەکان‌دا بەدەستهێنابوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زانیاریەکانم سەبارەت بە مێژووی ئیسلام و مەزهەب و ڕەوتە فیکریەکانی زۆر لە ڕادەی پێویست کەمتر بوون. لەلایەک لە هەلومەرجی شۆڕشگێرانەی ئێران دەژیام و لەلایەکی دیکەشەوە زۆرم دەخوێندەوە. ماوەیەکی زۆری نەخایاند کە بەرهەمەکانی عەلی شەریعەتی‌م خوێندەوە کە ئەستەم بوو بە ئاسانی کەسێکی وەکو من بخاتە ژێر کاریگەری خۆی کە بەشێوەیەکی ئیسلامی پەروەردە نەکرابووم.

ماوەیەکی کورت بەر لە تەقینەوەی شۆڕشی ئێران، عەلی شەریعەتی لە دەرەوەی ئێران لەلایەن سیخوڕەکانی شا کوژرابوو. حەز و سەمپاتیەکی زۆرم بەرامبەر بە ئایەتوڵا تاڵەقانی هەبوو کە یەکێك لە گرنگترین پیاوانی ئایینی تاران و کەسێك بوو کە لەگەڵ عەلی شەریعەتی'دا لەنێو سەرکردەکانی شۆڕشدا جێی خۆی دەگرت و بە ئایەتوڵای پێشکەوتنخواز ناوبانگی پەیدا کردبوو.

زۆربەی ئەو کاتانەی کە لە ساڵە سەرەتاییەکانی ۱۹۸۰کاندا لە بەیروت تێپەڕم دەکردن، بە گفتوگۆکردن سەبارەت بە ئێران دەرباز دەبوون. لەگەڵ گەڕانەوەی خومەینی بۆ تاران، ئێران پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئیسرائیل پچڕاند و ڕێکخراوی رزگاری فەلەستینی بە رەسمی ناسی و دوای ئەوەش یاسر عەرەفات یەکسەر سەردانی تارانی کرد و لەوێ لە جێی باڵیۆزخانەی پێشووی ئیسرائیل'دا باڵیۆزخانەی ڕێکخراوی رزگاری فەلەستینی کردەوە و لەبەردەم جەماوەرێکی زۆردا وتارێکی پێشکەش کرد. لەگەڵ شۆڕشدا ئێران لە ڕێگەی لوبنان'ەوە تێکەڵاوی هاوسەنگی تێکۆشانی فەلەستینیەکان ببوو. شیعەکانی لوبنان کە پڕ جەماوەرترین و هەژارترین خەڵکی ئەو وڵاتە بوون لە ڕێکخراوی رزگاری فەلەستین کە ناوەندەکەی لە بەیروت بوو زیاتر خۆیان بە بابەتەکانی ئێران'ەوە سەرقاڵ دەکرد و بە ئێران'ەوە شەو و رۆژیان دەکردەوە.

هاوڕێ نزیکەکانی من بەشێوەی ئۆتۆماتیکی سەرنجیان چووبووە سەر ڕووداو و پێشهاتەکانی ئێران و گرنگی زۆریان پێدەدا و کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئایدۆلۆژی شۆڕشی ئێران. لە لوبنانێکی وەهادا کە شەو و رۆژی بە ئێران دەکردەوە و گرنگی بە پرسکانی ئێران دەدا مومکین نەبوو کە لەگەڵ سەید هانی فەحس'دا یەکتر نەبینین و ئاشنا نەبین.

سەید هانی فەحس لە تەمەنی مندا بوو، لە گوندی جەبشید لە نەباتیە کە ناوەندی میلیشیا شیعەکان بوو لە باشووری لوبنان دەژیا و بەشێکی زۆری کاتەکانی خۆی لە بەیروت تێپەڕ دەکرد کە نزیکەی کاتژمێر و نیوێك لە نەباتیە دوور بوو.

سەید هانی ئەو پیاوە ئایینیە عەمامە ڕەشە بوو کە لەکاتی پێشکەشکردنی وتارە مێژووییە بەناوبانگەکەی عەرەفات کە لە بالکۆنی بینای باڵیۆزخانەی ڕێکخراوی رزگاری فەلەستین لە تاران لە پشت عەرەفات راوەستابوو. ئەو، پەیوەندی نێوان عەرەفات و پیاوە ئایینیە بەڕێوەبەرەکانی ئێرانی بەرقەرار کردبوو. ئەو دۆستایەتی و پەیوەندییەی‌کە لە بەیروت لەگەڵ سەید هانی'دا هەمبوو، لە تاران'یش ڕەنگیدایەوە و درێژەی کێشا. ئەو کاتانەی کە پێکەوە لە تاران بووین لە بینای باڵیۆزخانەی رزگاری فەلەستین دەماینەوە. دوای ماوەیەك سەید هانی فەحس لە تاران بوو بە خاوەنی خانوویەك و ماڵێکی پەیداکرد و منیش هەرکاتێك کە سەردانی تاران'م دەکرد لە جیاتی ئەوەی‌لە هۆتێل بمێنمەوە، لەماڵی سەید هانی دەمامەوە. وەکو زۆربەی پیاوانی ئایینی شیعە سەید هانی فەحس لە حەوزەی نەجەف کە وەك قوتابخانەیەکی باڵای شیعەکان بوو

پێگەیشتبوو. لەبەرئەوەش زۆرێك لەو پیاوە ئایینیانەی ئێرانی دەناسی کە لە هەمان حەوزەوە پێگەیشتبوون. چەندین پیاوی ئایینی ئێرانی هەبوون کە لەگەڵ سەید هانی'دا پێکەوە لەیەك قوتابخانە و یەك پۆلدا بوون و لە حەوزەی نەجەف'ەوە پێگەیشتبوون کە خومەینی ماوەی ١٥ ساڵ یەکێك لە گرنگترین مامۆستاکانی بوو. یەکێك لەوانە سەید هادی مودەریسی بوو.

سەید هادی خەڵکی شاری کەربەلای عێراق بوو. سەید تەقی مودەریسی کە برای ئەو بوو سەرکردەی یەکێك لە گرنگترین رێکخراوەکانی شیعەکانی عێراق بوو. سەید هادی هەر کاتێك سەردانی شوێنێکی بکردایە نزیکەی ٥ - ١٠ کەسی گەنج لە موریدەکانی لەگەڵیدا بوون کە هیچ قسەیان نەدەکرد. ئەویش وەکو سەید هانی خۆش قسە و نوکتەزان و کەسێکی زیرەك و بەتوانا بوو. لەگەڵ ئەودا لەلایەك باسمان لە کێشمەکێش و ململانێ ناوخۆییەکانی دەسەڵات لە ئێران دەکرد و هەروەها رەهەندە ئایدۆلۆژییەکانی شۆڕشی ئێران'مان تاووتوێ دەکرد، لەلایەکی دیکەشەوە باسی پێکهاتەی ناوخۆیی عێراق و بارودۆخی ئۆپۆزیسیۆنی ئەو وڵاتەمان دەکرد.

سەید هادی مودەریسی لەو کەسانە بوو کە لە شوێنی خۆی رانەدەوەستا و بەردەوام لە جوڵەدا بوو. ئەو تایبەتمەندییەش کە شۆڕشە گەورەکانی جیهانی دەکردەوە، توانای رەوانەکردنی شۆڕش بۆ دەرەوەی سنورەکان و قبوڵکرانی لە ناوچەکانی دەرەوە بوو. واتا پێویستە شۆڕشەکان هەنارده بکرێن. شۆڕشی گەورەی فەرەنسا لەساڵی ١٧٨٩ لە رێی جەنگەکانی ناپلیۆن بەهەموو ئەورووپا'دا بڵاوبوویەوە. هەروەها شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ش کۆمۆنیست ئەنتەرناسیۆنالیست یاخود کۆمێنترێنی بەرهەم هێنا.

ئەو شۆڕشانەی کە لەنێو سنوری وڵاتانی خۆیاندا ماونەتەوە و هەناردەی دەرەوە نەکراون، ناوبانگی خۆیان لەدەستداوە و ئەو گوڕ و تینە زۆرەی کە هەیانبووە وردە وردە کوژاوەتەوە و خۆڵەمێشی لێ بەجێماوە. شۆڕشی ئێران هەر لە سەرەتاکانی خۆیەوە لە رووی توانای هەناردەکردنی شۆڕشەوە گرنگییەکی تایبەتی هەبوو. خۆی لەخۆیدا هێرشەکەی عێراق'یش بۆ سەر ئێران بۆ رێگرتن لە پەرەسەندن و بڵاوبوونەوەی ئەو شۆڕشە بوو.

سەید هادی مودەریسی وا خۆی پێشاندەدا کە لە بەشی هەناردەکردنی شۆڕشی ئێران کاردەکات. لە وڵاتێکی وەکو بەحرەین'دا کە زۆربەی دانیشتوانەکەی شیعەن، ئەو هەندێك پێکهاتەی خستبووە جوڵە کە خەریکبوو دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرن، بەڵام سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. لەدوای رووداوەکانی بەحرەین، دەستەی هاوکاری کەنداو بە ئامانجی پاراستنی رژێمەکانی کەنداو کە دوو لەسەر سێی یەدەگی نەوتی جیهانی تێدایە دامەزرا. منیش سەرم دەنایە سەر سەید هادی مودەریسی و "بە دامەزرێنەری راستەقینەی ئەو دەستەیە" بانگم دەکرد. ئەو کاتەی کە لە تاران بووم لەگەڵ دامەزراندانی ئەنجومەنی

باڵای شۆڕشی ئیسلامی عێراق هاوکات بوو.

ڕێکخراوی SCIRI کە دواتر لە عێراق بووە یەکێك لە گرنگترین ڕێکخراوەکانی ئۆپۆزیسیۆنی شیعی، کورتکراوەی ناوە ئینگلیزییەکەی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی عێراق بوو. SCIRI لەدوای ۲۰۰۳ لە عێراق ناوەکەی خۆی گۆڕی و وشەی "شۆڕش"ی لابرد. لەوەبەدوا ئیتر لە عێراق بە ئەنجومەنی باڵا (مەجلیسی ئەعلا) ناوبانگی پەیدا کرد. کاتێك هەواڵی دامەزراندنی SCIRIم لە تاران بیست، ئەدرێسەکەیم پەیدا کرد و سەردانی ناوەندە گشتیەکەیم کرد کە لە مەیدانی فیردەوسی لە نزیك باڵیۆزخانەی تورکیا بوو. دەمویست لەگەڵ حوجەتولئیسلام (دواتر بوو بە ئایەتوڵا) محەمەد باقر ئەلحەکیم دامەزرێنەری ڕێکخراوەکە چاوپێکەوتنێك بکەم.

محەمەد باقر ئەلحەکیم (۱۹۳۹-۲۰۰۳) سەر بە یەکێك لە دوو بنەماڵە بەناوبانگەکەی پیاوانی ئایینی شیعەی عێراق بوو. لەدوای جەنگی ۲۰۰۳ لە تاران گەڕایەوە بۆ عێراق و دوای مانگی ئابی ۲۰۰۳ لە هێرشێك بە ئۆتۆمبیلێکی بۆمبڕێژکراودا کە دەگوترێت ئەلقاعیدە لە پشتی بووە لە نەجەف لە مزگەوتی حەزرەتی عەلی دوای نوێژی هەینی کوژرا.

ئەو کاتەی کە سەردانی بارەگای SCIRIم کرد لە تاران، تاکە شتێك کە سەبارەت بە سەرۆکی ئەو ڕێکخراوە دەمزانی کە بە پشتگیری ئێران دامەزرابوو، ئەوەبوو کە کوڕی ئایەتوڵای گەورە موحسین ئەلحەکیم'ە و لەکاتێکدا من لە چاوەڕوانی دیدار لەگەڵ ئەودا بووم، لەگەڵ پیاوێکی ئایینی مێزەرە سپیدا کە بە تورکی قسەی دەکرد ئاشنا بووم. پرسیارم لێکرد" لەکوێوە فێری ئەوە بووە کە ئاوا بە ڕەوانی بە تورکی قسە بکات؟" وتی:" تورکمانێکی خەڵکی تەلەعفەر'م" بەوجۆرەش لە ڕێگەی شێخ تەقی ئەلمەولا و لەساڵی ۱۹۸۲دا زانیم کە تورکمانی شیعە'ش هەن و تەنانەت نزیکەی زیاتر لە نیوەی تورکمانەکانی عێراقیش شیعە مەزهەبن. هاوڵاتییەکانم دواتر لە ساڵانی ۲۰۰۰ەکاندا ئەو کاتانەی کە سیاسەتی دژە کوردی تورکیا کە لە ڕێگەی بەرەی تورکمانی لە عێراق پەیڕەوی دەکرد و سەری نەگرت، توانیان بەم زانیاریانە ئاشنابن و ئەو شتانە بزانن.

دواتر هەرجارێك کە شێخ تەقی ئەلمەولام لە عێراق دەبینی ئەو یەکەم دیدارەی خۆمانی بیردەخستمەوە. شێخ مەولا لەداوی دامەزرانی ڕێکخراوی SCIRI، ببووە فەرماندەی سوپای بەدر کە هێزی چەکداری ئەو ڕێکخراوە بوو. ئەوکاتەی کە SCIRI دامەزرا عادل عەبدولمەهدی هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەو ڕێکخراوەدا نەبوو. دواتر زانیم کە ئەو کاتانەی لە فەرەنسا لە دوورخراوەییدا دەژیا، ڕوویکردۆتە ڕێکخراوی SCIRI و هاتوچۆی تارانی کردووە و لە ماوەیەکی کورتدا لە لوتکەی هەڕەمی دەسەڵاتی ئەو ڕێکخراوەدا جێی گرتووە. بگرە ناوەکەشی وەك ئایدۆلۆگی ڕێکخراوی SCIRI بڵاوبۆتەوە.

عادل عەبدولمەهدی یەکەم کەسێك بوو لەنێو ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی'دا کە من ناسیبێتم. هەر ئەویش بوو

کە منی رەوانەی شام کرد تا لەوێ لەگەڵ ئەندامانی دیکەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق دیدار بکەم. پەیوەندیەکانم لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لەکۆتاییەکانی ١٩٧٠ لە بەیروت'ەوە دەستیپێکرد و لە سەرەتاکانی ١٩٨٠ لە شام و دواتریش لە تاران درێژەی کێشا.

لەو بەینەشدا کارێکم کرد کە هەرکەسێك ئاگای لە یاسا و رێسا نەنوسراوەکانی سیاسەتکردن لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بێت، ئەو کارەی نەدەکرد. لەساڵی ١٩٨١دا لە یەکێك لە گەشتەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'مدا لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق'ی کە بە شێوەی نهێنی کاریان دەکرد، لە شام پەیوەندیم بەرقەرار کردبوو. لەوەش زیاتر هەرچەندە کە ناوی کەسانی سەر بە ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی'م بە ئاشکرا لە رۆژنامە نەدرکاند، بەڵام لە زنجیرە نوسینێکمدا بە ناوی "راپۆرتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست" لە رۆژنامەی جمهورییەت'دا، باسی ئەو کەسایەتیانەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق'ی و دیدارەکانیشیانم کردبوو.

دەستم بە پلاکی کارەبادا کردبوو. بەشێوەیەکی زانایانە یاسا و رێساکانی گەمە و یارییەکەم لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست پێشێل کردبوو. لەئەنجامی ئەوەشدا ناوم چووبووە نێو تۆمارەکانی دەزگای هەواڵگری عێراق و هەتا ئەوکاتەی کە رژێمی بەعسی سەدام لەسەر پێ بمابایەتەوە مومکین نەبوو کە نێوانمان خۆش بێت. هەر لەخۆیەوە وەك ئەندامێکی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق'م لێهاتبوو و ئەمەش بۆ من واتای کێشەیەکی ئەمنی بەردەوامی دەدا.

ئەو شەپۆلەی کە لەساڵی ١٩٨٠ بەهۆی جەنگی ئێران - عێراق دەستیپێکردبوو، دوای دوو ساڵ پێچەوانەوە بووەوە. حیسابەکەی عێراق بۆ ئەوەی لە ماوەی چەند رۆژێکدا ئێران شکست بدا و شۆڕشەکەی داپڵۆسێنێت سەری نەگرت و بە پێچەوانەوە ئێرانییەکان بە تێپەڕبوونی کات دەستپێشخەرییان گرتە دەست و ئاراستەی جەنگەکەیان بەرەو خاکەکانی عێراق گۆڕی.

منیش چوومە نێو ریزی ئەو کەسانەی کە پێیانوابوو گۆڕینی ئاراستەی جەنگەکە و هاتنی بۆ نێو خاکی عێراق دەبێتە هۆی گۆڕینی هاوسەنگییەکانی سیاسەتی ناوخۆیی عێراق و ئەمەش رووخانی سەدام حسێن'ی لێدەکەوێتەوە.

لەدوای حوزەیرانی ١٩٨٢، ئیدی جەنگەکان لەنێو خاکی عێراق درێژەیان کێشا. ئەمجارەیان ئێرانییەکان لەنێو خاکی عێراق'دا پێشڕەوییان دەکرد و کاتێکیش کە پشتیوانی گەورەی نیودەوڵەتی فریای عیراق نەکەوت، ئەمجارەیان سەدام پەنای بۆ بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و بایۆلۆژی برد. ئێران لەژێر گەمارۆی چەکدا بوو و عێراق'یش لە چوار لاوە یارمەتی و کۆمەکی دارایی بۆ دەهات. کارتی ئێران لەبەرامبەر عێراق ئەو نفوس و جەماوەرە زۆرە بوو کە سێ بەرامبەری نفوسی دراوسێکەی بوو.

ئێرانییەکان ویستیان پرسی چەك و هێزی مرۆیی پێکەوە هاوسەنگ بکەن. واتا هاوسەنگی لە نێوان

چەك لەگەڵ هێزی مرۆییدا رابگرن. ئێران هێرشەکانی خۆی نەك بە چەك بەڵکو بە شەڕی تەن بە تەن ئەنجامدەدا. ئەو کاتەش کە عێراق بۆ رێگرتن لەمانە گازی ژەهراوی بەکارهێنا، ژمارەی کوژراوەکان لەهەردوولا گەیشتە ئاستێکی مەترسیدار.

جیان دۆمینیکۆ پیکۆ ئەو دیپلۆماتە ئیتاڵی'یەی کە بەناوی نەتەوەیەکگرتووەکان'ەوە دانوستانەکانی بۆ کۆتاییهێنان بە جەنگی ئێران - عێراق بەڕێوەبردبوو، ئەوەی بۆ باسکردم کە چۆن سەدام حسێن بەشێوەیەکی بێباکانە چەکە کۆکوژەکانی لە دژی ئێرانییەکان بەکارهێناوە.

جیان دۆمینیکۆ پیکۆ لە ساڵی ١٩٨٨دا جێگری سکرتێری گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو. وەکو کەسێك کە چاودێری رووداوەکانم دەکرد هەڵبەت ئاگادار بووم لەوەی کە جیان دۆمینیکۆ پیکۆ بەهۆی پەیوەندییەکانی لەگەڵ عەلی ئەکبەر ویلایەتی وەزیری دەرەوەی ئێران و دانوستانە دیپلۆماتییە زۆرەکانی لەگەڵ تارق عەزیز وەزیری دەرەوەی عێراق رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە راگەیاندنی ئەو ئاگربەستەی کە لەنێوان هەردوو وڵاتدا بەرقەرار کرا. لەمانگی یەکەمی ٢٠٠٢دا لە کۆبوونەوەیەکدا لە واشنتن کە منیش لەوێ وتارم هەبوو، لەگەڵ پیکۆ یەکترمان ناسی. ساڵێك بە دوای ئەوەشدا تێپەڕ نەبوو کە لە نیسانی ٢٠٠٣دا لە کۆبوونەوەیەکدا سەبارەت بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە قەتەر لە کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتیدا یەکترمان بینی. لە رۆژانی کۆتایی جەنگی عێراق'دا بووین. هێزەکانی سوپای ئەمریکا دوای گرتنی بەغدا لە شوێنی لە دایکبوونی سەدام حسێن لە تکریت نزیك ببوونەوە. لە شەوێکی دەوحە'دا کە بەردەوام چاودێری و ئاگاداری هەواڵەکانی سەبارەت بە عێراق'مان دەکرد، جیان دۆمینیکۆ پیکۆ لە ئێوارەخوانێکدا باسی پەیوەندییە دیپلۆماسیەکانی خۆی بۆ کۆتاییهێنانی جەنگی ئێران و عێراق لە ساڵی ١٩٨٨دا کرد. ئەو باسی لەوەکرد کە هۆکاری راستەقینەی قایلبوونی ئێرانییەکان بە ئاگربەست، ئەوە بوو کە عێراق بۆ وەرگرتنەوەی نیمچەدوورگەی فاو کە کەوتبووە دەستی هێزەکانی ئێران، هەموو جۆرە چەکێکی بەردەستی بایەلۆژی و کیمیاوی بەکاردەهێنا. پیکۆ پێیوابوو کە بەهۆی بەکارهێنانی ئەو جۆرە چەکانەوە تەنانەت ژینگەی نیمچە دوورگەی فاو گۆڕانی بەسەردا هاتبوو.

بیرم لە ١٥ ساڵ بەر لەو کاتە کردەوە. قایلبوونی ئێران بۆ ئاگربەست لەگەڵ عێراق'ی هێرشبەر و شەڕخواز منی هیوابڕاو کردبوو. دڵنیابووم لەوەی کە خومەینی هیچ کات ئامادە نابێت لەگەڵ عێراق سازش بکات. پێموابوو هەڵوێستی سەرکردەی شۆڕش ئەوەندە بە بنەما ئایینە پتەوەکانەوە پەرژین کراوە کە رێگە نادات هەڵوێستێکی نەرمی پراگماتیکانە وەربگرێت. هەرچەندە محەمەد سادق حسێنی لەو رۆژانەدا پێگوتبووم کە لەوانەیە ئێران ئاگربەستەکە قبوڵ بکات، بەڵام من ناڕەزاییم لەبەرامبەر ئەو دەربڕی و فەتوایەکی پێچەوانەی خومەینی'یم بەبیری ئەو هێنابووەوە. محەمەد سادق ئەو کاتانە پێکەنی و وتی:"

مەگەر چی دەبێت ئەو ئیمام نیە؟ فەتوایەکی دیکە دەردەکات سەبارەت بەم بابەتە و دەڵێت لە فەتواکانی پێشووم پەشیمان بوومەتەوە و ئەم فەتوا تازەیەم دەرکردووە و هەموو شتێك کۆتایی پێدێت." وەکو ئەوەی کە بڵێت گۆڕینی فەتوا لەلای ئیمامە شیعەکان کارێکی زۆر ئاسان بێت، باسی ئەوبابەتەی بۆ کردم و لەزاری خومەینی'ەوە بە فارسی گوتی:"باید میکردیم" دەبوایە ۿانکردایە و بە پیکەنینەوە درێژەی بە قسەکانی دا.

لەکاتێکدا کە ئێران بەهۆی ئەو چەکە کیمیاوی و بایەلۆژییانەی کە سەدام بەکاری دەهێنان زیانێکی گیانی زۆری دەدا، خومەینی رایگەیاند:" ژەهرەکەم نۆشی" و بەوجۆرەش فەتوایەکی پێچەوانەی ویستی خۆی دەرکرد و ئاگربەستەکەی قبوڵکرد. بەو شێوەیەش بڕیاری ٥٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتییان سەبارەت بە ئێران- عێراق قبوڵکرد. بەوجۆرەش ئەو جەنگەی کە هەشت ساڵی خایاند و نزیکەی نیو ملیۆن مرۆڤی کردە قوربانی، کۆتاییپێهات.

راگیرانی شەڕێکی خوێناوی لەمجۆرە پێویستە وەك رووداوێك لەقەڵەم بدرێت کە مایەی خۆشحاڵیە. هیچ گومانێکی تێدانیە کە لە رووی ویژدانی و مرۆییەوە ئەمە هەر بەوجۆرە بوو، بەڵام لە رووی سیاسییەوە لەچاوی مندا ئەوە کۆتاییهاتنی شۆڕشی ئێران بوو. شۆڕشی ئێران ئیدی لە ریزی ئەو زنجیرە شۆڕشە بەناوبانگانەی وەك شۆڕشی ١٧٨٩ی فەڕەنسا و ١٩١٧ی رووسەکان نەمابوو و لەو بازنەیە دەرکەوتبوو. هەموو ئەو ئەنجامەی کە درەنگ یان زوو بەسەر هەموو شۆڕشەکاندا دێت، لەساڵی ١٩٨٨دا لەگەڵ ئیمزا کردنی ئاگربەست لەگەڵ عێراق بەسەر شۆڕشی ئێران'یشدا هاتبوو. ئێران ئیدی "شۆڕش" نەبوو، بەڵکو "دەوڵەت" بوو. پۆشاکی شۆڕشگێڕانە لەبەر ئێران داکەندرابوو و ئیدی روخساری دەوڵەتێکی تیۆکراتی یاخود دەوڵەتێك بە مۆرکی تیۆکراتی بەڵام لە بنەڕەتدا دەوڵەتێکی نەتەوەیی فارس یاخود دەوڵەتێکی شیعە'ی لە خۆی پیشان دەدا.

ئیدی ئەوە دەرکەوت کە لە ئەنجامدا ئێران نەك سیاسەتەکانی لە پێناو ئامانجی شۆڕشگێڕانەی پاك پەیڕەو دەکات، بەڵکو لەسەر بنەمای بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی خۆی سیاسەت دەکات. بەوجۆرەش سیاسەتی واقعگەرایانە سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو.

ئێرانیش یەکێك بوو لەو دەوڵەتە نەتەوەییانەی کە ئیدی ۿونەی زۆرمان لەوانە بینیبوو و هەر بەردەوام بوون. وڵاتێك کە خاوەنی قوڵاییەکی مێژوویی گەورەیی ٢٥٠٠ ساڵە بێت، کێ حوکمی بەسەرەوە بکات با بیکات، هەر وەك چۆن لە مێژوودا بینراوە بەشێوەیەکی سروشتی بەگوێرەی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی خۆی رەفتار دەکات. ئێرانی دوای ١٩٨٨ ئیدی ئەو ئێران'ە نەبوو کە لە نێوان ١٩٧٩- ١٩٨٨دا جۆش و خرۆشی لە مندا دروستدەکرد.

ساڵانێك دواتر لە ساڵی ٢٠٠٥دا لە ئیستانبوڵ لەگەڵ بیرمەندی گەورەی ئیسلامی ئێران، عەبدولکەریم سروش

یەکترمان بینی و لەوبارەیەوە گفتوگۆیەکی سەیرمان کرد. لە ساڵەکانی ١٩٨٠کانەوە ناوی عەبدولکەریم سروش،م زۆر بەباشی دەزانی. رژێمی ئێران خەریکبوو وردە وردە دەچووە ژێر کۆنترۆڵی ئایدۆلۆژیای ژمارەیەك کادر کە بە پارێزگاری دینی لەقەڵەم دەدران. ئەم کادرانەش پێویستیان بە بیرمەندێك هەبوو کە بتوانێت کاریگەری گەورەی عەلی شەریعەتی لەسەر نەوەی تازە بشکێنێت. بەوجۆرەش عەبدولکەریم سرووش دەرکەوتە مەیدان، بەڵام دوای ماوەیەك ئەو ئایدۆلۆگە متمانەپێکراوەی رژێم پێچەوانەی رژێم جوڵایەوە و وای لێهات کە ئیدی نەتوانێت لە ئێران بمێنێتەوە.

سروش دواتر لە ئێران لەسەر جەماوەری فراوانی ریفۆرمخوازەکان کاریگەری و نفوزێکی نائاسایی پەیدا کرد. سەرەڕای ئەوەی کە یەکێك لە درەوشاوەترین و پڕجەماوەرترین بیرمەندەکانی ئێران بوو، بەڵام ناچارما لە دەرەوەی ئەو وڵاتە بژی.

جارێك لە ٢٠٠٥دا بەهۆیەك سەردانی ئیستانبوڵ،ی کردبوو. منیش ئەو کاتانە بە تازەیی لە تاران گەڕابوومەوە. لە نیوەڕۆخوانێکیشدا بە یەکتر گەیەنراین و یەکترمان بینی. لە گفتوگۆکانیشمدا پێمگوت کە "ماوەیەك هیچ چارەی ئێوەم نەدەویست. ئێوە وەك ئایدۆلۆگی ئەو پێکهاتە و رەگەزانەی رژێم دەرکەوتبوونە مەیدان کە من خۆشم لێیان نەدەهات، هیچ کات ئەوەم بیرنەدەهات کە ئەم عەبدولکەریم سرووش،ەی ئەمڕۆتان لێ دەربکەوێت..." سرووش کاتێك پرسیاری ئەوەی لێکردم کە چی بووە هۆی ئەوەی بیروبۆچوون و هەستەکانم سەبارەت بە ئێران بگۆڕێت؟ لەوەڵامدا وتم:"ئاگربەستی ١٩٨٨. ئێران لەو رۆژە بۆ من بوو بە دەوڵەتێکی نەتەوەیی و لەگەڵ سەدام رێککەوت و لەوکاتەشەوە بۆ من کۆتاییپێهات." ئەو زانا ئێرانی،یە پێکەنی و وتی:" تۆ لەبەر ئەوەی کە ئێران کەمتر شۆڕشگێڕ بووە لێی بێزار بوویت، بەڵام من لەبەر ئەوەی کە زۆر شۆڕشگێڕ بوو نەمتوانی لەوێ بمێنمەوە."

هەرچی دەبێت با ببێت ئێران مۆرێکی گەورەی لە ١٠ساڵی ژیانم داوە. هەر پەیوەندییەك لەگەڵ ئێران و هەر رووداوێك سەبارەت بە ئێران، دەسووڕایەوە و خل خل بە عێراق،ەوە دەبەسترایەوە. دوابەدوای جەنگی ئێران و عێراق ١٩٨٠-١٩٨٨ (جەنگی یەکەمی کەنداو) جەنگی ١٩٩٠ی کوەیت و داگیرکردنی ئەو وڵاتە لەلایەن عێراق، دووەمین جەنگی کەنداو لە ١٩٩١ بەرپابوو. هەموو ئەو رووداوانەی کە عێراق لە ناوەندیدا بوون، منیان لە تۆرگوت ئۆزال سەرکۆماری تورکیا نزیك کردەوە و وردە وردە وایانکرد کە ببمە راوێژکاری. سەرەڕای ئەوەی‌کە لە ئەنجامی جەنگی ١٩٩١دا سەدام پەلوپۆی شکابوو بەڵام هێشتا هەر لە دەسەڵاتدا بوو. ئەو کەسەی بەو دیدگایەوە سەیری پێشبینیەکانی تۆرگوت ئۆزال،ی بکردایە، وایدەزانی کە بۆچوونەکانی ئۆزال لە جێگەی خۆیدا نەبوون. بەڵام لە راستیدا هەرچەندە بە درەنگیشەوە بێت، جەنگی ٢٠٠٣ بەهەموو ئەنجامەکانیەوە دیدگا و بیروبۆچوونەکانی تۆرگوت ئۆزال،یان بەهەق دەرخست. ئەو

شتەی کە ئەو بەچاوی خۆی نەیبینی، من بیبینم. سەرەڕای هەموو هەوڵەکانی تۆرگوت ئۆزال، لەساڵی ١٩٩١دا سەدام دەسەڵاتی خۆی لە بەغدا هەتا ٢٠٠٣ درێژەپێدا، بەڵام لە ٢٠٠٣دا رووخا. لەگەڵ ئەویشدا دەستە بژێری بەڕێوەبەری عەرەبی سوننەی عێراق ئیمتیازە نەریتیەکانی خۆی لەدەستدا و عێراق لە پێکهاتەیەکی ناوەندگەرای وشکەوە گۆڕا بۆ وڵاتێکی فیدراڵی.

چانس یان رێکەوت، منی خستە نێو رووداوەکانی پۆڵۆنیا و ئەڵمانیای خۆرهەڵات و چیکۆسلۆفاکیا و مەجارستان کە رووداوی سەیروسەمەرەی مێژوویی بوون. لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٧دا دوای هەشت ساڵ کارکردن لە رۆژنامەی جمهورییەت خۆمم لە رۆژنامەی حورییەت'دا بینییەوە. چەتین ئەمەج سەرنوسەری رۆژنامەکە ئاراستەی ئەورووپای خۆرهەڵات'ی کردم. بەشێکی گرنگی کاتی خۆمم لەکاتی گونجاو و شوێنی گونجاودا لە ئەورووپای خۆرهەڵات و ئەورووپای ناوەڕاست و دواتریش لە یەکێتی سۆڤیەت'دا تێپەڕکرد. بەتایبەتی رووخانی دیواری بەرلین لە ساڵی ١٩٨٩ و رووخانی یەکێتی سۆڤیەت لە ١٩٩١ و کۆتاییهاتنی جەنگی سارد لە ریزی ئەو رووداوە گرنگانەدا بوون کە من لە نزیکەوە چاودێری و بەدواداچوونم دەکردن.

لە ساڵی ١٩٨٨دا و دوای کۆتاییهاتنی جەنگی ئێران - عێراق و دوابەدوای نزیکبوونەوە لە جەنگی ناوخۆیی لوبنان ( لە ساڵی ١٩٨٩دا بەهۆی رێککەوتننامەی تایف جەنگی ناوخۆیی لوبنان کۆتاییهات کە نزیکەی ١٤ ساڵی خایاندبوو.) گەشتەکانی منیش بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کەمیان کردبوو. چەتین ئەمەج داوای لێکردم کە گەشت بە وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵات'دا بکەم و لە نزیکەوە چاودێری ئەو رووداوانە بکەم کە حکومەتەکانیان کۆمۆنیستی بوون. لەسەرەتادا لەبەر ئەوەی کە پێموابوو کە گەشتەکانم بۆ وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵات من لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دووردەکەنەوە نەمدەویست سەردانی وڵاتانی سۆسیالیستی ئەورووپای خۆرهەڵات بکەم، بەڵام دواتر لەگەڵیدا راهاتم و زۆر چێژم وەرگرت لەوەی کە لەو کاتانەدا لەو وڵاتانە بووم.

وەك چالاکێکی مارکسی کە حەزی لە خوێندنەوەی مێژوو دەکرد ئەو زانیاریانە مێژووییانەم کە لە ساڵانی ١٩٦٠کاندا سەبارەت بەو وڵاتانە لە یادگەی خۆمدا کۆم کردبوونەوە، وردە وردە کەوتنەوە بیرم و بەهۆی ئەو گەشتانەوە دەرکەوتنە مەیدانەوە. رۆیشتنم بۆ بوداپۆست، پراگ، بەرلینی خۆرهەڵات، وارشۆ، مۆسکۆ و تەنانەت تیران منی زۆر خۆشحاڵ کرد. لەو کاتانەدا هەندێك رووداو و پێشهات روویاندەدا کە رەوتی مێژوویان دەگۆڕی. ئەو کاتەی کە دیواری بەرلین رووخا و مرۆڤەکان چێژیان لە ئازادی وەرگرت و بەو شەوە هەتا بەیانی سەردانی هەردوولای بەرلین'یان دەکرد، من لە بەرلینی خۆرهەڵات لەنێو ئەو هەزاران کەسانەدا بووم کە لەهەر خاڵێکی تێپەڕبوونەوە دەرباز دەبوون و دواتر دەگەڕانەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان.

لە سەرەتاکانی شۆڕشی مەخمەلینی چیکۆسلۆفاکیا سەردانی پراگ'م کرد. یەکێك بووم لەو کەسانەی

کە حەزم لە نمایشەکانی لاتێرنا ماگیکا دەکرد کە وەك بڕیارگەی شۆڕش بەکاردەهات و هەموو ڕۆژێك ڤاکلاڤ هاڤێڵ سەردانی دەکرد و یەکێك لە خۆپیشاندەرەکانی مەیدانی ڤانکێسلاس (ڤاسلاڤسکا) بووم. یەکێك بووم لەو کەسانەی کە دوای رووخانی حکومەتی کۆمۆنیستی لە پۆلۆنیا، لە پەرلەمانی ئەو وڵاتەدا بۆ یەکەمجار لە دانیشتنێکی مێژووییدا گوێم لە سەرۆك وەزیر مازۆڤیسکی گرت. لە هۆتێلی مەزدهۆ نەرۆدنایا کە تۆزێك لەولای بینای پەرلەمانی فیدراسیۆنی روسیا بوو کە بۆریس یەڵتسین وەکو ناوەندێك بۆ ڕێگرتن لەو کودەتایەی کە گۆرباچۆف ی لە یەکێتی سۆڤیەت لەسەرکار لابرد، بەکاری هێنابوو و بە ماڵی سپی ناوبانگی دەرکردبوو، نیشتەجێ ببووم. ڕۆژی دوای ئەوەش یەکێتی سۆڤیەت کۆتاییپێهاتبوو و پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت قەدەغە کرابوو. لە مۆسکۆ خۆپیشاندانێکی گەورە سازکرابوو. لە مانێژ کە لە تەنیشت مەیدانی سووردا بوو دەستپێکردبوو. لەنێو ئەو خۆپیشاندەر و ڕێپێوانە جەماوەرییە فراوانەدا بووم کە لە هەموو ڕەنگێکەوە لە کەسانی دەستوریخوازە دیموکراتەکان و ئانارکۆسەندیکالیستەکان و پیاوانی ئایینی ئۆرتۆدوکسی تێدا بوو. وەکو ئەوە وابوو کە لە قۆناغی بەر لە ١٩١٧ەوە دەرکەوتبێتنە مەیدان و بەشدارییان لە یەکەم خۆپیشاندانی گەورەی پۆست کۆمۆنیستدا کردبێت.

یەکەم ڕۆژنامەنوسێکی تورك بووم کە دوای ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئازەربایجان، گورجستان، قرغیزستان، کازاخستان، ئۆزبەکستان و تورکمانستان سەردانی ئەو وڵاتانەم کرد. لەنێوان ساڵانی ١٩٨٨-١٩٩١ لە نزیکەوە چاودێری ئەو ڕووداوانەم دەکرد کە بوونە هۆی لە ناوچوونی یەکێتی سۆڤیەتی جاران و چاودێری و ئاگاداری ڕووداوەکانی وڵاتانی بلۆکی سۆسیالیستیم دەکرد و ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری لەسەر من دانا. لەدوای ناسینی ڕژێمە بەعسیەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، هاوپەیمانە ئەوروپاییەکانی ئەوانیشم ناسی. لە ژیانی خۆمەوە بە ئەزموون فێربووم کە ڕژێمە ئایدۆلۆژیە تاك حیزبیە تۆتالیتەرەکان هەرجۆرێك خۆیان پێناسە بکەن و چ دروشمێکی بریقەدار بۆ خۆیان بەرزبکەنەوە و لە پشت چ بانگەواز و دروشمێکدا خۆیان بشارنەوە، ئازار بە خەڵکەکانیان دەگەیەنن و دەمزانی لە ڕوانگەی خەڵکەکانیەوە چۆن سەیر دەکرێن. توانایەکی بەهێزی ناسینی ڕژێمە پۆلیسیەکان و ڕێگای خۆپاراستن لەوانەم بەدەست هێنا و بڕیارمدا کە لەگەڵ هیچ ئایدۆلۆژیایەکی فراوانخواز و پاوانکاردا سازش نەکەم.

لەدوای کۆتاییهاتنی جەنگی سارد گۆڕان و شکستێکم لە بۆچوونە سیاسیەکانمدا تووش نەبوو. شوناسی کەلتووری خۆمم بە موسڵمان و شوناسی ئایدۆلۆژیی سیاسی خۆشم بە ئازادیخواز و دیموکرات پێناسە کرد.

هەڵوێستی ڕوون و ئاشکرام لەبەرامبەر تۆتالیتاریزم کاریگەری بەرچاوی هەبوو لەوەی کە لەگەڵ تۆرگۆت ئۆزال لە ڕۆژانی جەنگی عێراق دا لە ساڵی ١٩٩١ بەیەك بگەین و بیروبۆچوون و پێشبینیە ستراتیژییەکانمان بەیەك بگەن. هەروەها ئەو هەڵوێستەم بەرامبەر بە تۆتالیتاریزم کاریگەری هەبوو لەسەر بۆچوونەکانم

سەبارەت بە کرانەوە بەڕووی کوردەکان'ی عێراق و کێشەی کورد لە تورکیا و هەڵوێستەکانم سەبارەت بە پێویستی رووخانی رژێمی سەدام لە عێراق.

خۆی لەخۆیدا ساڵانێك بوو پەیوەندیم لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق'دا هەبوو، بەڵام بەر لە هەموو شتێك گرنگیم بەوەدەدا کە دەرفەتێکی گرنگ رەخساوە بۆئەوەی رژێمێکی تۆتالیتار لە تەنیشت تورکیا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەناو بچێت یان بڕووخێت. پێموابوو کە رووخانی رژێمە پۆلیسیەکانی وەك سوریا و عێراق لە ناوچەکە و رژێمەکانی دیکەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، دەبێتە هۆی ئەوەی کە رێگا لەبەردەم مێژووی ئەم ناوچەیەدا بکرێتەوە.

لە سەدەی بیستەمدا هەر زەمین لەرزەیەکی گەورەی مێژوویی بەناوەندێتی ئەورووپا کاریگەری لەسەر خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دانابوو و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'ی شکڵ پێدابوو. جەنگی جیهانی یەکەم لەنێوان دەوڵەتە گەورەکانی ئەورووپا روویدابوو و نەخشەی ئەورووپا'ش لەدوای ئەو جەنگە سەرلەنوێ کێشرابووەوە و نەخشەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'یش لەدوای ئەو جەنگە دەستنیشانکرا. ئەو خاکانەی کە ٤٠٠ ساڵ بە خاکی عوسمانی ناسرابوون، بەسەر ناوەکانی وەك عێراق، سوریا، لوبنان، ئوردن، فەلەستین، عەرەبستانی سعودی و کوەیت دابەشبوو و شکڵێکی تازەیان بەخۆوە گرت. جەنگی دووەمی جیهانیش لە نێوان هێزە گەورەکانی ئەورووپا روویدا و دوای ئەوەش نەخشەی ئەورووپا جارێکی دیکە کێشرایەوە و دوابەدوای ئەوەش وڵاتی ئیسرائیل لەسەر بەشێك لە خاکەکانی فەلەستین لەدوای جەنگ لەسەر نەخشەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست زیادکرا. جەنگی سارد'یش هاوشێوەی جەنگی یەکەم و جەنگی دووەمی جیهانی، جەنگێکی نێودەوڵەتی بوو. لەدوای کۆتاییهاتنی ئەو جەنگە جارێکی دیکە نەخشەی ئەورووپا گۆڕانی بەسەردا هات. ئەو ئەڵمانیا'یەی کە دوای جەنگی جیهانی دووەم دابەشببوو یەکیگرتەوە. لەو یەکێتی سۆڤیەتەی کە ئیدی نەمابوو، لە روسیا و بگرە تا ئۆکرانیا، بیلاروس، مولداڤیا، لیتوانیا و ئێستۆنیا، وڵاتانی دیکە لەسەر نەخشەی ئەورووپا زیادکران. چیکۆسلۆڤیاکیا'ش بۆ دوو کۆماری چیك و سلۆڤاکیا دابەشکرا. یۆگسلاڤیا'ش بووە چەند بەشێکی سربستان، مەقدۆنیا، بۆسنا، کرواتیا و قەرەداغ و لە سەدەی بیست و یەکەمیشدا کۆسۆڤۆ لەدایك بوو.

بەپێی ئەو نمونە مێژووییانەی کە لەبەردەستدا بوون زەحمەت نەبوو درك بەوە بکرێت کە لەکاتێکدا لەدوای جەنگی سارد نەخشەی ئەورووپا دەکێشرێتەوە، خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'یش بەوجۆرەی کە هەیە نەمێنێتەوە. لەگەڵ گۆڕینی پێگەی ئەورووپا، هاوتەریب لەگەڵ ئەوەدا گۆڕینی بارودۆخ و پێگەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'یش کەوتە بەرباس. عێراق نوێنەرایەتی ئەو دەوڵەت و دامەزراوانەی دەکرد کە لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست پەیدابوون. هەوڵەکانی رووخاندنی سەدام

لەو کاتەوە دەستیانپێکرد کە عێراق لە ساڵی ١٩٩١دا کوەیتی داگیرکرد. بەمجۆرەش دیاربوو کە مومکین نییە دەسەڵاتی عێراق لەسەر پێ بمێنێتەوە. لەوەش گرنگتر ئەوەبوو کە دەسەڵاتێکی ناپێویستبوو.ئەو دیدگایەشم ڕێپیشاندەری من بوو، تا لەگەڵ تۆرگۆت ئۆزال پرسی کرانەوەی تورکیا بە ڕووی کوردەکانی عێراق فۆرمولە بکەین.

ئەی ٢٠٠٣؟ لە ٢٠٠٣شدا بەوجۆرە بوو. لەوەش زیاتر ئەوەبوو کە لە ٢٠٠٣دا چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد کوردەکان دەرفەتیان بۆ بڕەخسێت و دەرکەونە پێشەوە. ئەمەش بەجۆرێك بوو کە پێشتر لە مێژوودا نمونەی نەبوو. کوردەکان لەگەڵ ٢٠٠٣دا بەجۆرێك دەرکەوتنە مەیدانی مێژوو کە پێشتر لە مێژوودا شتی وا ڕووی نەدابوو.

**لە پرێمێتێئۆس کە زنجیرکراوە ئەم سرووودە بەرز دەبێتەوە:" هەموو ئەو شتانەی کە هەن، لەیەک کاتدا هەم عادیلانەن هەم نادادپەروەرانەن." لەکاتێکدا کە راستی و دادپــەروەری یەکیان نەگرتەوە، ئیڤان کارامـازۆف بڕیاریدا سـوور بێت لەسەر دژایەتیکردنی راستی و پاڵپشتی کردن لە دادپـەروەری، بەڵام ئایا کەسێک هەیە کە بەشێوەیەکی ناخۆش و زیاتر لەو، بت دروستبکات؟ ئەمەش ئەو بڕیارە بێ رەوشتانەیە کە قارەمانە تراژیدییەکان ناچارنین بەگوێرەی بجوڵێنەوە. تراژیدیا لەپێناو راستیەکاندا دادپەروەری و بە پێچەوانەشەوە لە پێناو دادپەرەوەریدا راستییەکان پشتگوێ ناخات، چونکە لە تراژیدیادا هەموو ئەو هێزانەی کە لە پێکدادانداں، بەیەک ئەندازە رەوان و لە واتایەکی قوڵ و بەرفراوانیشدا بەیەک ئەندازە رەوشتین...**

کارلوس فیونتس (ئەو شتەی کە من بڕوام پێیەتی: لە ئەلفەوە تا یای ژیانی نوسەر، ٢٠٠٢)

جەنگی ٢٠٠٣ی عێراق لە ئاستی جیهاندا کاردانەوەیەکی زۆری بەدواوە بوو. ئەم کاردانەوەیەش بە ئەندازەیەك گەورە و بەهێزبوون بوو کە نەدەکرا لەگەڵ کاردانەوەکانی دژی جەنگی کەنداو لە ساڵی١٩٩١دا بەراورد بکرێن.

جەنگەکە لە قۆناغێکدا کە هاوکات بوو لەگەڵ هێرشەکانی ١١ی ئەیلولی ٢٠٠١ی ئەمریکا کە لە مێژووی ئەو وڵاتەدا هێرشی تیرۆریستی لەو شێوازە نەبینرابوو روویدا. ئەمریکا لەدوای هێرشەکەی ١١ی ئەیلول کە مۆر و ئیمزای ئەلقاعیدە'ی پێوەبوو، ئەفغانستان و دوابەدوای ئەوەش عێراق'ی داگیرکرد.

حکومەتی ئەمریکا بە سەرۆکایەتی جۆرج دەبلیو بوش بۆ ئەوەی کە بڕیاری جەنگ لەدژی عێراق لە دەسەڵاتی یاساداناني وڵاتەکەی وەربگرێت، تۆمەتی هەبوونی چەکی کۆمەڵکوژی بۆ عێراق هێنایە سەرزمان کە دواتر مایەپووچ دەرچوو و لە ئاستێکی نێودەوڵەتیشدا زیاتر لە دۆست، دوژمنی بۆ وڵاتەکەی زیادکرد. بەدەر لەمەش، چەندین فاکتەری دیکە بوونە هۆی ئەوەی کە هەر لە سەرەتاوە سێبەری گومان بکەوێتە سەر جەنگی عێراق. لێپرسینەوەکان و ناڕەزاییەکان لەبەرامبەر ئەم جەنگە بە ئەندازەیەك زۆر بوون کە نموونەیان لە جەنگی ئەفغانستان و تەنانەت لە جەنگی ١٩٩١ی کەنداو'یشدا نەدەبینران.

سەرەڕای دەیان کتێب و وتار کە سەبارەت بە هۆکارەکانی جەنگی ٢٠٠٣ی عێراق و ئامانجەکانی ئەو جەنگە نوسران، هێشتا هۆکارە راستەقینەکان و نهێنیەکانی پشتی ئەو جەنگە بە تەواوەتی دەرنەکەوتوون. قەبارە و ژمارەی ئەو کتێب و وتارانەی کە سەبارەت بەم جەنگە نوسراون بۆ کەم جەنگی دیکە نوسراون. بەشێکی زۆر لەو کتێب و وتارانە گەیشتنە بەردەستم کە بەشێك لەبەرپرسانی ئەمریکی کە رۆڵیان لەو جەنگەدا گێڕابوو، لەچوارچێوەی وتار و بیرەوەرییەکانیاندا بڵاویان کردبووەوە و هەروەها نوسراوی ئەو میدیاکارە ئەمریکا'ییانەشم خوێندەوە کە لەکاتی جەنگ و دوای جەنگ لە عێراق'دا مابوونەوە. جگە لەوە

نوسین و بابەتی هاوشێوەی ئینگلیزەکان'یش گەیشتنە بەردەستم و هەزاران لاپەڕەم لەبارەی ئەو جەنگە خوێندەوە. سەرەڕای ئەو هەزاران لاپەڕەیەی کە خوێندبوومەوە، لەگەڵ ئەزمونی شەخسی‌خۆم سەبارەت بە عێراق، دەتوانم بڵێم ئەو بابەتەی‌کە لەمبارەیەوە بەشێوەیەکی باش نوسراوە و لە ریزی سەرەوەی هەموو ئەو وتار و کتێبانەدایە، کتێبی کەسێکە بەناوی عەلی عەلاوی سەبارەت بە عێراق کە بەناوی (داگیرکردنی عێراق- سەرکەوتن لە جەنگ و دۆڕاندن لە ئاشتی) بڵاویکردۆتەوە.

عەلی عەلاوی کەسێکی شیعەی عێراقی'یە و خوێندنی ناوەندی لەبەریتانیا تەواوکردووە و زانکۆشی لە ئەمریکا خوێندووە. لەدوای ١١ی ئەیلولی ٢٠٠٣ گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی و لەو حکومەتەی کە عێراقییەکان لەدوای جەنگ دروستیان کرد پۆستی وەزیری بەرگری وەرگرت و دواتریش پۆستی وەزیری دارایی بەڕێوەبرد. کتێبەکەی عەلی عەلاوی سەبارەت بە هۆکارەکان و چۆنیەتی دەرکەوتنی جەنگ و هەروەها لەبارەی ئەوەی کە میکانیزمی بڕیاروەرگرتنی ئەمریکا سەبارەت بەو جەنگە لە چ کەسانێك و چ بەشێك پێکهاتووە، یەکێکە لەو گرنگترین و باشترین کتێبانەیە کە سەبارەت بە جەنگی ٢٠٠٣ی عێراق نوسراون. من ئاگاداری هەموو ئەو هۆکار و فاکتەرانە بووم کە ببوونە هۆی دەرکەوتنی جەنگ. بە رای هەندێك کەس و بەگوێرەی هەندێك بۆچوون، ئەم جەنگە بەرهەمی نیاز و نیەتێکی ئیمپریالیستانە بوو کە بۆ ئەوەبوو دەست بەسەر دەوڵەمەندییەکانی نەوتی عێراق'دا بگرێت کە لەگەڵ عەرەبستانی سعودی گەورەترین یەدەگی نەوتی جیهانیان تێدایە.

ئەم هۆکارەش لەلایەن چەندین کەسایەتی زاناوە بە بێ هیچ دوودڵییەك باسکراوە و هێشتاش هەر باس دەکرێت. لەگەڵ تەیمور گەبدان کە لەدوای جەنگ پۆستی وەزیری نەوتی وەرگرتبوو، جارێك یەکترمان بینی و سەبارەت بەو بۆچوونە کە دەڵێت جەنگەکە لەبەر نەوت کراوە پرسیارم لێکرد. قسەیەکی زۆری لەسەر نەکرد، بەڵام وتی:" ئەو هۆکارانەی کە بوونەتە هۆی جەنگ، زۆر تێکەڵ و ئاڵۆزن و لە دینامیکی زۆر ئاڵۆز و فرەڕەهەند پێك دێن."عەلی عەلاوی'ش لە کتێبەکەی خۆیدا هەمان هەڵوێست و بیروبۆچوونی هەیە.

تۆنی بلێر سەرۆك وەزیری پێشووی بەریتانیا کە بە حیساب یەکێك بووە لەو "ئیمپریالیستانەی" چاویان لە نەوتی عێراق بووە، لە کتێبێکی خۆیدا کە لەدوای جەنگ بەناوی (گەشتێکی ژیانی سیاسی من) لە ئۆتۆبیۆگرافیەکەی خۆیدا بە لۆژیکێکی زۆر سادە وەڵامی ئەو ئیدیعایە دەداتەوە و دەڵێت:"پرسی نەوت رێگای بۆ دەرکەوتنی ئیدیعایەك کردۆتەوە کە گوایە جەنگ هەمووی لەبەر نەوت کراوە. ئەمە لەگەڵ ئەوەی کە روونکردنەوەیەکی بێ بیرکردنەوە و نادروستە، بەشێوەیەکی فراوان بڵاوبووەتەوە و لە رۆژی ئەمڕۆشدا هێشتا کەسانێك هەن کە بڕوا بەم ئیدیعایە دەکەن. لەراستیدا ئەگەر کێشە و نیگەرانی سەرەکی ئێمە نەوت بوایە، دەمانتوانی لە یەکەم ساتەکانەوە لەگەڵ سەدام سازش بکەین و رێکبکەوین. سەدام

لەبەرامبەر لابردنی گەمارۆکان و هەڵگرتنی هەڕەشەی لێکۆڵەرەکانی چەکە کۆکوژەکان ئامادەبوو ئیمتیازی زۆر گەورەتر بدات. لەدوای ٢٠٠٣، بە گوێرەی بەشێك لە بڕیارەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان لەبەرێوەبەرایەتی ئەو رێکخراوەدا میکانیزمێکمان دروستکرد بۆ ئەوەی پارەی عێراقییەکان لە داهاتی نەوت پارێزراو بێت. ماوەی دەیان ساڵ بوو، ئەوە یەکەمجار بوو کە ئەو پارەیە بۆ دروستکردنی قوتابخانە و نەخۆشخانە و گەشەپێدانی ژێرخانی عێراق خەرج بکرێت. داهاتی ناپوختەی تاك لە ماوەی یەك ساڵدا بۆ هەر تاکێکی عێراق‌ی لە داهاتی نەتەوەیی، لە ماوەی نێوان ٢٠٠٣-٢٠١٠ سێ بەرامبەر زیادی کردووە کە هەڵگرتنی پارەکە و دانانی میکانیزمەکەی هۆکاری ئەمە بووە." (ل.٣٨٢، ٣٨٣ )

بەدەر لەو قسەوباسانەی کە سەبارەت بە ئیشتیها و ویستی ئیمپریالیستەکان بۆ بەدەستهێنانی نەوتی عێراق کە بۆ روونکردنەوەی هۆکارەکانی جەنگ باس دەکران، هەندێك تێز و بیروبۆچوونی دیکەش هەبوون کە لە نێویاندا ئەوەی کە زیاتر لە هەموویان برەوی هەبوو، ئەوەبوو کە گوایە ئەمریکا لە رێگەی ئەو جەنگەوە دەیەوێت"پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە"ی خۆی جێبەجێ بکات.

بە گوێرەی ئەم تێزە، جەنگ لە ناوچەکەدا بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیل و رووخاندنی عێراق بەرپاکرابوو. ئەمەش بە ماریفەت و بەرهەمی نیۆکۆنسێرڤاتیڤەکانی ئەمریکا لە قەڵەم دەدرا کە لایەنگری ئیسرائیل بوون.

جگە لەوە، نیۆکۆنسێرڤاتیڤەکان دەیانویست لە رێگەی پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی گەورەوە گۆڕانکاری لە رژێمەکانی ناوچەکەدا بکەن و هەژموونی ئەمریکا لە ناوچەکەدا زیاتر پەرەپێبدەن. لەنێو هەموو شوێنێکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست‌دا، لە ئیسلامیەکانەوە بگرە هەتا نەتەوەگەرا و رەگەزپەرستەکان و تەنانەت چەپەکان‌یش، لایەنگرانی ئەم بیروبۆچوونانە زۆربوون. بەڵام لە راستیدا هەموو ئەو شتانەی کە سەبارەت بە جەنگی عێراق هەبوون، بەوجۆرە تێزانە روون نەدەکرانەوە. لەوانەیە جەنگی ٢٠٠٣ لەکاتی نوسینی مێژوودا وەك یەکێك لە گەورەترین مەتەڵەکان بمێنێتەوە. بەم هۆیەشەوە ئەم رستانەی خوارەوە کە لە سەرەتای کتێبەکەی عەلی عەلاوی‌دا هاتوون، زۆر بەنرخن:

" لە مێژووی پێکدادان و جەنگەکاندا، لە روانگەی هۆکارەکانی بەرپا بوون و ناڕوونی ئامانجەکانی جەنگەوە نمونەی کەم هەیە کە لەگەڵ داگیرکاری و جەنگەکەی عێراق‌دا بەراورد بکرێت. سەردەمی هاوچەرخ بۆ روونکردنەوەی ئەم کاتە و ئەو قۆناغە نائاساییە زنجیرەیەك هۆکار و ئەنجامی جۆراوجۆری ریز کردووە، بەڵام هیچ یەك لەوانە نەیانتوانیوە بەشێوەیەکی فراوان وەڵامێکی رازیکەر بە دەستەوە بدەن. بۆچی تاکە سوپەر دەوڵەتی دنیا هەموو هێزی سەربازی و دارایی گەورە و زەبەلاحی خۆی ئاراستەی ئەم ئامانجە کردووە و ئۆقیانوسەکانی تێپەڕاندووە و دژایەتییەکی گەورەی نێودەوڵەتی لەبەرامبەر خۆی

وروژاندووە و بڕیاریداوە ئەم دیکتاتۆرە زاڵم و ئیدارە وەحشییە و سیستەمەکەی بڕوخێنێت؟ ئەو راوەی کە بۆ دۆزینەوەی چەکە کۆکوژەکانی سەدام دەستپێکرابوو، لەسەرەتاوە روون بوو. بەڵام دوای ئەوەی کە هێزە هاوپەیمانەکان هیچ شتێکیان نەدۆزییەوە ئەم بابەتەش یەکسەر فەرامۆش کرا. هیچ نیشانەیەکیش نەبوو بۆ ئەوەی کە ئەم گەلە (گەلی عێراق) برسیی ئازادییە بنەڕەتیەکان و ئازادییەکانی خۆرئاوا بێت...

لە دنیادا چاوەڕوانی ئەوە دەکرا کە لەگەڵ جەنگەکەدا لە عێراق، نەك تەنها کاریگەری لەسەر بەغدا دابنرێت، بەڵکو لە دامەزراوە نەوتییە دووردەستیەکانیش و لە هێڵەکانی گواستنەوەی وزە و هەروەها لە بنکە سەربازیەکانیشدا بەشێوەیەکی فراوان تاڵان و دزی بکرێت. روخساری ئەو خەڵکەی کە بەشێوەیەکی نارێك و شپرزە هێرشیان دەکردە سەر موڵکی دەوڵەت و بانك و کتێبخانە و تەنانەت یانە وەرزشیەکان، کاتێك کە لە تەلەفزیۆن پیشاندەدرا، روخساری گەلێکی پیشان نەدەدا کە رازی بێت بەوەی تازە لە زوڵم و ستەم رزگارکراوە. واتە ئەمە رەفتاری گەلێکی ستەملێکراو نەبوو کە ئازاد کرابێت. ئەمەش دابڕانێکی گەورەبوو لە نێوان ئەو عەقڵەی کە سەبارەت بە عێراق هەبوو لەگەڵ خەڵکی ئەو وڵاتە کە زەحمەت بوو بڕوای پێبکرێت. ئەو تاڵان و فەرهوودە لەدوای رووخانی رژێمەکەی سەدام'یش بە مانگان و ساڵان درێژەی کێشا...

کاتێك کە رۆژانە گۆڕێکی بەکۆمەڵی دیکە دەدۆزرایەوە، ئەوانەی کە بەرگرییان لە سەدام و رژێمەکەی دەکرد، جگە لە شەرمەزاری هیچیان بۆ نەدەمایەوە. ئەمەش بەربەریەت و وەحشیگەری دەوڵەتی بەعس'ی بەهەموو لایەنێکی خۆیەوە ئاشکرا دەکرد و عێراق بۆ جارێکی دیکەش مێشکی شیکار و موحەلیلەکانی تێکەڵ و پێکەڵ دەکرد..." ( عەلی عەلاوی- ٢٠٠٧، پێشەکی: ل١-٢)

ئەو شیکردنەوە سایکۆلۆژییانەی عەلی عەلاوی سەبارەت بە چۆنیەتی دەرکەوتنی خەڵکی عێراق و دیدگاکانیان سەبارەت بە داگیرکردنی وڵاتەکەیان، لە بیروبۆچوونەکانی ئەدۆنیس، ئەدیبی بەناوبانگی عەرەب'دا دەبینرێن کە بە رەچەڵەك عەلەوی سوریا'یە و لە ٥ی ئەیلولی ٢٠٠٣دا لە یەکەم مانگەکانی داگیرکردنی عێراق لە رۆژنامەی ئەلحەیات لە لەندەن بڵاوی کردۆتەوە:" لە روانگەیەکی مێژووییەوە توانایی و لێهاتوویی ئەو کەسەی کە حوکمی عێراق'ی کردووە (سەدام حسێن) لەوەدا بوو کە توانیبووی پەیوەندی خەڵکەکەی لەگەڵ ئازادی بپچڕێنێت یاخود هێزی ئازادکردنی خەڵك بێ کاریگەر بهێڵێتەوە. لەو کاتەی کە دیسپۆتیزم یاخود ملهوڕی سەدام حسێن هاتە ناو سیاسەتی عێراق، ئیدی ژیانی مرۆڤەکان بێ کاریگەر هێڵرایەوە و لەوڕووەشەوە هونەرێکی مەترسیداری لەخۆی نیشاندا... لەو قۆناغی ملهوڕییەدا کە لە عێراق زاڵ ببوو، عێراقییەکان نە ژیانی تایبەتیان مابوو و نە بیروبۆچوونێکی تایبەت و کارێکی تایبەتیان بۆ مابووەوە. هەموو شتێك موڵکی تایبەتی کەسی ملهوڕ بوو. مرۆڤی عێراق'ی لە جیاتی ئەوەی کە ناچاربێت

بیربکاتەوە کە پێویستە بە ئازادی بژی و بیربکاتەوە و کاربکات، بیری دەکردەوە کە ناچارە کۆیلە بێت و بەهەمان شێوەش کاری دەکرد و دەژیا...

هیچ کەسێك داگیرکارییەکەی قبوڵ نەدەکرد، نە عێراقییەکان، نە کەسانی دیکە و نە عەرەبەکان و نە غەیرە عەرەبەکان. ڕەتکردنەوەی داگیرکاری شتێکی زۆر سروشتیە و داگیرکاریش ئیمتیازێك نیە کە بخرێتە سەر ئیمتیازە نەتەوەییەکانی مرۆڤ. لەبەرئەوەش عێراقییەکان ناتوانن بەخۆیاندا بنازن کە ئازایەتیان کردووە کاتێ داگیرکارییان ڕەتکردۆتەوە. پێویستە ئەوان بیر لەوە بکەنەوە کە ئەو ڕەتکردنەوەیەی ئەوان نیشانەی هەبوونی هەندێك کەموکوڕییە کە لە ڕووی نەتەوەیی و مرۆیی و کەلتووریدا هەیانە. ئەو کەسانەی کە لەبەرامبەر داگیرکاری ناوخۆییدا بێدەنگ ماونەتەوە، دوایین کەسانێکن کە مافیان هەیە پەسنی خۆیان بدەن کە دژ بە داگیرکاری دەرەکی ڕاوەستاون. داگیرکاری دەرەکی بۆ عێراق ی ئەمڕۆ هەموو نەخۆشیەکەی عێراق نیە، بەڵکو تەنها بەشێکی ئۆرگانیکی ئەو نەخۆشیەیە. ئەو داگیرکارییە ئەگەر بە ڕواڵەتیش کۆتایی پێبێت هەتا ئەو کاتەی کە نەخۆشیەکەی عێراق بەردەوام بێت هەر دەمێنێتەوە... داگیرکاری ناوخۆیی عێراق واتە ئەو ملهوڕییەی کە سەدام لە ناوخۆدا بەرپای کردبوو تەنانەت شتێکی تایبەت بە سیستم و دامودەزگاکان نەبوو، بەڵکو هەموو کاتێك داگیرکردنی جەستە و ڕۆح و ئەقڵی مرۆڤەکانیش بوو. داگیرکردنی هەموو ماڵ و پیاو و ژن و منداڵێکیش بوو. عێراق بە هەموو تواناکانی خۆیەوە موڵکی تایبەتی سەدام حسێن ی ملهوڕ بوو. پێویستە ئەو کەسانەی کە داگیرکاری دەرەکی ڕەتدەکەنەوە ئەم ڕاستیانە فەرامۆش نەکەن. ئەو کەسانەی کە فەرامۆشی دەکەن یان ئەو کەسانەی کە ئەوە قبوڵ دەکەن یاخود ئەوانەی کە کەڵك لەوە وەردەگرن، کەسانێکن کە زۆر بە کەمی شایستەی چالاکی ڕەتکردنەوەی داگیرکارین." (ئەدۆنیس، ئەلحەیات، ٦ی ئەیلولی٢٠٠٣)

حکومەتی ئەمریکا کە بە وتەی ئەدۆنیس "داگیرکاری دەرەکی" بڕیاردەر و جێبەجێکاری ئەو داگیرکارییە بوو، چۆن و بە چ شێوەیەك بڕیاری جەنگی لە دژی عێراق دا و چ شتێکی نەدەزانی و چی لەبەرچاو نەگرت؟ لەمبارەیەشەوە بەرچاوترین زانیاری و تێبینی و شیکردنەوە هەر لە دێڕەکانی عەلی عەلاوی دا شاراوەن:

"لەم جەنگەدا... لە کەش و هەوای بەدەستهێنانی سەرکەوتندا و بە لێدانی ترۆمپێت و زوڕنا ڕێگاکەیان پێوا. هیچ گومانێك نەبوو سەبارەت بەوەی کە کێ جەنگەکە دەباتەوە. ویستی جەنگ نەك تەنها لە واشنتن بەڵکو لە بەشێکی گەورەی ڕای گشتی ئەمریکا هەستی پێدەکرا. هەموو بژاردەکانی دەرەوەی جەنگ بەشێوەیەکی سیستماتیك یان داخران یاخود پەراوێز خران ... لە ڕوانگەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاوە کە بۆ ماوەیەکی درێژ لە دیدگایەکی تایبەتەوە سەیری عێراق دەکرا. جەنگی ١٩٨٠ - ١٩٨٨ی عێراق و ئێران چەندەی پەیوەندی بە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆرئاوا و گەشەپێدانی بەرژەوەندیەکانی ئەوانەوە

هەبوو، بەو ئەندازەیەش پەیوەندی بە تێبینیە ناوچەیی و لۆکاڵیەکانەوە هەبوو. ئەمریکا وەك سەنگەرێکی بەهێزی بەنرخ سەیری عێراق'ی سەدامی دەکرد بۆ ئەوەی رێگا لە پەرەسەندنی ئیسلامی شۆڕشگێڕ بۆ ناوچەی کەنداو بگرێت و لە هەمانکاتیشدا سەنگەرێکی ناڕاستەوخۆی ئەو وڵاتە بوو لەبەرامبەر گەشەکردنی ئەو هێزەدا. لەدوای کۆتاییهاتنی جەنگی عێراق – ئێران، ئەمریکا بۆ جارێکی دیکە سیاسەتە پڕ ئیدیعاکانی خۆی سەبارەت بە عێراق واز لێهێنا و ئەو وڵاتەی بە سوپایەکی باڵۆنی و قەرزێکی زۆری نێودەوڵەتی و سەرکردەیەك کە تووڕە بوو لەوەی کە بەناوی کەسانی دیکەوە فیداکاری کردووە، بە تەنها هێشتەوە.

لەنێوان ساڵانی ١٩٨٨-١٩٩٠دا، لەو قۆناغە تاریکەدا ئەمریکا عێراق'ی بەشێوەیەکی مەترسیدار لەنێو ئازار و نەهامەتیدا هێشتەوە تا ئەو کاتەی کە سەدام کوەیت'ی داگیرکرد کە یەکێك لە وڵاتە بەرهەمهێنەرەکانی نەوتی کەنداو بوو کە بە لای ئەمریکا'وە گرنگبوو. سەدام تاوانێکی زۆری ئەنجامدا بۆئەوەی ئەو وڵاتە بخاتە سەر عێراق. راستەوخۆ هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و بەرژەوەندییە ژیانییەکانی خۆرئاوا کرابوو، ئەگەر کارێك لە دژی ئەوە نەکرابایە ئەو کاتە کاریگەرییەکی زۆر گەورەی دادەنا، بۆیە ئەمریکا دەستی بە جوڵە کرد.

ئامانجی سەرەکی بە دەرکردنی هێزەکانی عێراق لە کوەیت و دوابەدوای ئەوەش جێبەجێکردنی ستراتیژی گەمارۆدانی عێراق ناوزەد کرا. بەگوێرەی ئەم ستراتیژە، دەبوو رژێمی عێراق بێ چەك بکرێت و پەراوێز بخرێت و لە هەمانکاتیشدا بەجۆرێك لاواز بکرێت کە نەبێتە هەڕەشەیەك بۆ سەر ئاسایشی ناوچەیی و لە رووی سیاسیشەوە هاوسەنگییەکەی تێکبدرێت و بەوجۆرە بهێڵرێتەوە. لەگەڵ ئەوەی کە حکومەتی ناوەندی ئەمریکا پشتیوانی لە ئۆتۆنۆمی کوردی کرد و رێکخراوە جۆراوجۆرەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق'ی بەرەسمی دەناسی، بەڵام رژێمی بەعسی لەنێو نیگەرانیەکی گەورەدا لەسەر پێ هێشتەوە...

لە سەرەتای ٢٠٠١دا، بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە راوێژکارەکانی نێوکۆنسێرڤاتیڤەکان و بەرپرسەکانیان، لەگەڵ ئوڵترا - نەتەوەگەراکانی ئەمریکا هاتنە سەرکار و پۆستی گرنگیان بەدەستهێنا و هەروەها بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە واقعی دینی کاریگەری لەسەر کەسایەتی جۆرج بۆش دادەنا، پێشبینی ئەوە دەکرا کە سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر بە عێراق لە ریشەوە گۆڕانکاری بەسەردا بێت. سەرەڕای ئەوەی کە سووکایەتی زۆر بە رژێمی سەدام دەکرا، بەڵام لە سەرەتاکاندا گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر بە عێراق روونەدا. بۆ ئەوەی کە درزێك بخرێتە نێو سیاسیەکان و لایەنگرانی گوتاری ئەڵتەرناتیڤ و بتوانن لەو کەلێنەدا جێی خۆیان بکەنەوە، پێویستبوو رووداوی هێرش کردنە سەر وەزارەتی دەرەوە و بینای بازرگانی نێودەوڵەتی لە ١١ی ئەیلولی ٢٠٠١دا رووبدات. لەو کاتەش بەدواوە، سیاسەتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەت سەبارەت بە عێراق بەشێوەیەکی درێژخایەن لە بنەڕەتەوە گۆڕانکاری بەسەردا هات.

هەندێك لەو لایەنانەی کە لە ١٩٨٠ و ١٩٩٠ کاندا لە واشنتن سەبارەت بە ئیسلام و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە میکانیزمەکانی بڕیاروەرگرتنی سیاسی ئەمریکا پەراوێز خرابوون، وردە وردە وەکو بازنەیەك دەوروبەری کۆشکی سپی'یان چنییەوە. سەبارەت بە کاریگەری نیۆکۆنسێرڤاتیڤەکان شتی زۆر نوسرا، بەڵام ئەوەی کە لە راستیدا روویدەدا زۆر لێك جیاواز بوون. نیۆکۆنسێرڤاتیڤەکان یەکێك بوون لەو چەند رەوتە جیاوازەی بەشێوەیەکی توند لەگەڵ یەکتریدا ململانێیان دەکرد. دەکرێت لەنێو ئەوانەشدا ئاماژە بە ئەنتەرناسیۆنالیستە ڤیلسۆنچییەکان بکرێت کە خوازیاری ئەوەبوون ئەمریکا بۆ گەشەپێدانی دیموکراسی و ئازادی لە جیهان، بەشێوەیەکی چالاك بجوڵێتەوە. هەروەها راستە مەسیحیەکان هەبوون کە لە دیدگاکانی خۆیاندا سەبارەت بە قیامەت بە ناوبانگ بوون. جگە لەوانەش لایەنگرە بەهێزەکانی نەتەوەگەراکانی ئەمریکا هەبوون کە پێیانوابوو پێویستە وڵاتەکەیان بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی خۆی، هێزی گەورەی نێودەوڵەتی خۆی بەکاربهێنێت و لەوەدا درێخی نەکات. هەموو ئەو هێز و رەوتانە، شەپۆلێکی هێز و رەوتێکیان دروستکرد کە بەرەو بەرزبوونەوە دەڕۆیشت و لە هەناوی خۆیدا نەفرەت و تووڕەییەکی تێدابوو. سەبارەت بە هەموو بەها و سیمبولەکانی لیبراڵیزمی نەرمی ئەمریکایی کە لە ١٩٦٠ و ١٩٧٠ کاندا کەلتوور و کۆمەڵگای ئەمریکا'ی پڕ کردبووەوە، بەرەیەکی دژی ریفۆرمیان پێکهێنا. هەموو ئەو لایەنانە لەدوای ١١ی ئەیلولەوە زانییان کە دەتوانن دنیای تەسك و بیروبۆچوونەکانی خۆیان بخەنە جوڵە و بەوجۆرەش هەموو بڕیار بەدەستە سیاسیەکانی ئەو رەوتانە تەرکیزیان خستە سەر عێراق و لە ناوەندی پلانەکانی تایبەت بە عێراق جێیان گرت و کاریگەریان لەسەر دانا.

هەندێك لەلایەنەکان بەجدی نیگەران بوون لەوەی کە عێراق ببێتە خاوەنی چەکی کۆکوژ و لە رواڵەتدا ئەمەش وەك تاکە هۆکارێکی رەوا بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی هێرشبەر بۆ گۆڕینی رژێمی عێراق پشتی پێدەبەسترا. لەگەڵ ئەو جۆرە بیروبۆچوونانەی کە سەبارەت بە بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی ئەمریکا هەبوون، هەمان ئەو بیروبۆچوونانەش سەبارەت بە مەترسییەکانی رژێمی عێراق لەسەر بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی ئیسرائیل'یش هەبوون و ئەمەش رۆڵی لە دروستکردنی بیرۆکەی داگیرکردنی عێراق'دا هەبوو. لایەن و گروپە بچووکەکانی دیکەش بیروبۆچوون و ئایدیایەکی جیاوازی وەك داکوتاندنی کۆڵەکەی دیموکراسی و لیبراڵییان لە دنیای عەرەبی'دا لەبەرامبەر توندڕەوی ئیسلامی هەبوو. بۆ ئەوەی کە بتوانی هۆکارەکانی پشتی بڕیاری نائاسایی ئەمریکا بۆ داگیرکردنی عێراق کە سیاسەتی دەرەوەی ئەو وڵاتەی ژێراوژوور کرد ببینرێن، پێویستە هەریەك لەو هۆکارانە بخرێتە تەنیشت یەك و بە هێزێکی خەیاڵی گەورەوە بەیەکەوە ببەسترێنەوە..." (عەلی عەلاوی – هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢-٤)

لە هیچ یەك لەو لێکۆڵینەوە و شیکردنەوانەی کە ٢٠٠٣ بەر لە جەنگ و دوای جەنگ سەبارەت بە

هۆکارەکانی داگیرکردنی عێراق نوسرابوون، بە وردی بیروبۆچوون و شیکردنەوەیەکەی وەك ئەمەم نەبیستبوو کە هەلومەرج و بارودۆخی ئاڵۆز و پێکهاتەی ناوخۆیی واشنتنی بە پوختی باسکردبێت. عەلی عەلاوی لەدوای ئەمە ئاماژە بە کاریگەری دکتۆرینەکەی لیۆستراوس لەسەر موریدەکانی خۆی دەکات لەسەر بڕیاری جەنگ و ئاماژە بە رۆڵی بێرنارد لویس دەکات کە وەکو دەنگی دەستە بژێری جەنگخوازی بەڕێوەبردنی ئەمریکای لێهاتبوو. دوابەدوای ئەوەش لەم دێڕانەی خوارەوەدا باس لە رۆڵی ئەمریکا لەو قەیرانە دەکات کە دوای جەنگ دروستبوو:

"لە واشنتنی رەسمیدا نەزانییەك هەبوو سەبارەت بەوەی کە بەر لە جەنگ لە عێراق چی روویداوە. تەنانەت لەنێو لایەنگرانی جەنگدا بە نێو کۆنسرڤاتیڤەکانیشەوە، لەنێو ئەو رۆشنبیر و ئەنیستیتۆ و ناوەندانەی لێکۆڵینەوەیەدا هیچ کەس و لایەنێك نەبوو کە زانیاری وردی سەبارەت بەو وڵاتە هەبێت کە داگیری دەکەن. ئەو ناوەندانەی‌لێکۆڵینەوەیەی واشنتن کە لە دەوروبەری نوسینگەی جێگری سەرۆك کۆببوونەوە و ئەو ئەکادیمی و لێکۆڵەرانەش کە سەبارەت بە عێراق تێز و نامەی خوێندنیان نوسیبوو، هەموویان پێکەوە دیدگا و بیروبۆچوونی تەسك و وشکی خۆیانیان باس دەکرد و شەیدای ئەو بیروبۆچوونانەی خۆیان ببوون. سەبارەت بە سروشتی کۆمەڵگەی عێراق و ئەو دیکتاتۆریەتەی کە دەیان ساڵ بەسەر ئەو کۆمەڵگایەوە حوکمی کردووە، دیدگایەك هەبوو کە لە بنەڕەتدا هەڵەی تێدا بوو. هەموو ئەو لایەنانەی لە ئەمریکا پاڵپشتییان لە بیرۆکەی داگیرکردنی عێراق دەکرد و لە دەوری یەك کۆببوونەوە، بەشێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندییان لەگەڵ عێراق‌دا نەبوو. وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کە وەك قەڵای بیرۆکەی ریالیستی سەیر دەکرا، زانیاریەکی کەمی لەسەر عێراق هەبوو و وای پێشبینی دەکرد کە دوای جەنگ لە رێگەی نمونەگیرییەوە هەوڵبدات سەبارەت بە ئەنجامەکانی جەنگ بیرۆکەیەکی دەستکەوێت. تاکە لایەنێك کە زانیاری راستەوخۆ و دروستی بەدەست دەهێنا، سوپای ئەمریکا بوو کە دەیزانی لەو شێوازی جەنگەی ئەوان پەیڕەوی دەکەن سوپای عێراق ناتوانێت بەرگە بگرێت و هەروەها ئاگاداربوو کە رووبەڕووی سوپایەکی بێ ورە و بێ کاریگەر دەبێتەوە. ئەم بارودۆخە کە جێگەی بەزەیی پێداهاتنەوە بوو، تەنها پەیوەندی بەوەوە نەبوو کە ئەو وڵاتە زانیاریەکی زۆر و زەبەن و شیکردنەوەیەکی سیستماتیکی سەبارەت بە عێراق نیە، بەڵکو زیاتر پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە بەدەستی ئەنقەست هەموو ئەو شتانەی سەبارەت بە عێراق هەیە پشتگوێ دەخران و چێژ لەوەش وەردەگیرا...

ئۆپۆزیسیۆنی عێراق و ئەو لایەنانەش کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندی رەسمییان لەگەڵ واشنتن هەبوو، پێگە و بارودۆخێکی زۆر باشتر لەمەیان نەبوو. ئەو گروپانەی کە لە دەرەوە بوون و

لە دوورخراوەیی بوون، هەر یەکەو بۆخۆی ئامانجێکی تایبەت و دیاریکراوی هەبوو و بۆ ئەمەش نەیاندەتوانی سەبارەت بە بارودۆخی عێراق بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا زانیاری بە ئەمریکا بدەن یان نەیاندەویست زانیاری پێبدەن. لەوانەیە لە نیگەرانییەکانی خۆیاندا نوقم بووبێتن یان زۆر حەزیان دەکرد کە دوای روخاندنی سەدام لەلایەن ئەمریکا'وە دەسەڵات بگرنە دەست. ئەم جۆرە گروپانە کێشە و لاوازیەکانیان دەخستە پێش و هیچ بەرژەوەندیەکیشان لەوەدا نەبوو کە ئەمریکا لە هێرشکردنە سەر عێراق پەشیمان ببێتەوە.

لە هاوپەیمانی ئەنگلۆ- ئەمریکایی'دا، ئینگلیزەکان'یش کە پێشبینی دەکرا هاوپەیمانی زیرەك و ژیرتر بێت، نەیانتوانی رۆڵی ئەسینا لە رۆمای ئەمریکا ببینن. هەردولا بۆ جولاندنی هێز و نیشاندانی هێزەکانی خۆیان، پشتی یەکیان گرتبوو و سووربوون لەسەر ئەوەی کە هەلومەرج و پێگەی مەوجوود لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بگۆڕن. سەرۆك وەزیر تۆنی بلێر پێیوابوو کە دەبێ بەریتانیا هاوپەیمانێکی پشت ئەستوور و مەحکەمی ئەمریکا بێت و بەشێوەیەکی بەردەوام لە دەستەڕاستی سەرۆکێکدا وەستا کە دەهۆڵ و زوڕنای جەنگی لێدەدا و پشتگیری لێکرد و گرنگی بە هەلومەرج و بارودۆخی واقع و ئەو شتانەی کە پێویستبوون بکرێن نەدەدا. خۆی وەك هەوساری ئەسپی وەحشی بوش دەزانی، بەڵام بەرەو ئەو جێگایە رۆیشت کە ئەسپەکە دەیویست بڕوات. هەموو ئەو ناڕەحەتی و نیگەرانیانەی کە ئینگلیزەکان هەیانبوو بەشێوەیەکی بێدەنگ پشتگوێ خران... نەزانینی هەلومەرجی ناوخۆیی عێراق وەکو شەپۆلێکی بەهێز زنجیرەیەك لەو ئەنجامانەی بەدوای خۆیدا هێنا کە پێشتر پێشبینی روودانیان نەدەکرا..." ( عەلی عەلاوی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.٧-٨)

لەنێو ئەو کەسانەشدا کە عەلی عەلاوی بە رستە سەرنجراکێشەکانی خۆیەوە باسیان دەکات و دەڵێت سەبارەت بە پێکهاتەی ناوخۆیی عێراق نەزان بوون، منیش هەبووم. پێویستە دان بەوەدابنێم، بۆ کەسێکی وەکو من کە ناوی "پسپۆڕی یەکەمی تورکیا بۆ کاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست"ی پێوە لکێنرابوو و هەروەها نزیکەی چارەکە سەدەیەك بەر لەوەی جەنگی عێراق لە ٢٠٠٣ دەستپێبکات، پەیوەندی لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی عێراق'دا هەبوو، ئەم جۆرە نەزانی و جەهالەتە هیچ هۆکار و پاساوێکی دروستی نەبوو. لەوەش زیاتر ماوەیەکی کەم بەر لەوەی جەنگی ٢٠٠٣ی عێراق دەستپێبکات، لەنێو ئەو ناوەندانەی لێکۆڵینەوەی ئەمریکا کە عەلی عەلاوی باسیان دەکات کارم کردبوو و سەبارەت بەو دیمەنەی کە عەلاوی لە عێراق وێنای کردبوو، نەمتوانیبوو تێبینیەکی وەها بدەم.

لەسەرەتاکانی ١٩٩٠ەکاندا، وەرگرتنی زەمالەیەك بۆ ئەوەی لە یەکێك لە ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەی ئەمریکا کاربکەم و بخوێنم یەکێك لە ئامانجە سەرەکیەکانی من بوو. پێموابوو لە بواری رۆژنامەنوسیدا

کە ١٥ ساڵ کارم تێداکردبوو، ئەوەی کە توانیبووم بیکەم کردبووم و گەیشتبوومە ئەو شوێنەی کە دەمویست پێی بگەم. جەنگی سارد کۆتاییپێهاتبوو و ئەمریکا'ش وەك تاکە دەوڵەتی زلهێزی جیهان مابووەوە. ماوەی ٢ ساڵ لەو ناوەندانەی لیکۆڵینەوەی پایتەختی ئەمریکا کارم کرد و مەودایەکەم خستە نێوان خۆم و دنیا و تورکیا و بەوجۆرەش لە ناوەندی رۆشنبیرانی "رۆمای نوێ"دا دەستم بە لیکۆڵینەوە و خوێندن کرد و لەوبارەیەوە داوای هاوکاریم لە سەرۆك کۆمار تۆرگوت ئۆزال کرد و ئەمەش تاقە شتێك بوو کە داوام لێکردبوو لەبارەیەوە هاوکاریم بکات.

لەو رۆژانەی کە نزیکەی نیو ملیۆن کوردی پەنابەر لە عێراق هاتبوونە سەر سنورەکانی تورکیا (١٩٩١)، لە نیوەشەوێکدا تۆرگوت ئۆزال داوای لێکردم سەردانی کۆشکی چانقایا بکەم. تازە لە رۆژنامەی گوینەش دەستم لەکار کێشابووەوە. ئەسیل نادر خاوەنی رۆژنامەکە لە بۆرسەی لەندەن ئیفلاسی کردبوو و خەریکبوو رۆژنامەکە دادەخرا. کاتێك گەیشتمە لای، سەرۆك کۆمار تۆرگوت ئۆزال پرسیاری لێکردم کە ئایا هەواڵی دەستلەکارکێشانەوەکەم راستە یان نا؟ کاتێك پشتڕاستم کردەوە وتی:" بەرنامەیەکت هەیە؟"

-"نا. بیرم دەکردەوە بۆ ئێوەی باس بکەم، دەمەوێت بچمە یەکێك لە ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە لە واشنتن و بۆ ماوەیەك لەوێوە سەیری دنیا و وڵاتەکەم بکەم و لەوێ ئیش بکەم. ئەگەر ئێوە بە گونجاوی بزانن، دەمویست تکاتان لێ بکەم کە یارمەیتم بدەن تا لە یەکێك لەو ناوەندانەی لێکۆڵینەوە زەمالە وەربگرم و بۆ ئەوەش نامەیەکی پشتیوانی کردنم بۆ بنوسن." وشەی زەمالەم بە ئینگلیزی هێنایە سەر زمان و ئەویش رێك سەیری ناوچاوانی منی کرد و وتی:" منیش دەمویست پێشنیارت پێ بکەم تا لەگەڵ من کار بکەیت."

-"وەك چی؟"

-"وەك راوێژکار."

-"من دەتوانم چیتان بۆ بکەم؟"

ئۆزال لە ناوەڕاستی ژوورەکەی خۆیدا نەخشەیەکی گەورەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'ی پیشاندام کە تورکیا'شی تێدابوو و وتی:" کەس لە تۆ باشتر ئەم ناوچەیە ناناسێت. تا ئەمڕۆ چیت کردووە دەمەوێ لەمەودوا وەك راوێژکارێك بۆ منی بکەیت. راستەوخۆش پەیوەندیت بەخۆمەوە دەبێت. دەمەوێت ئەو کارەم بۆ بکەی." بەوجۆرەش وەڵامی پرسیارەکەی دامەوە.

لە نزیکەوە کارکردن لەگەڵ تۆرگوت ئۆزال وەك شتێکی سەرنجڕاکێش هاتە پێش چاوم، بەڵام ئەم رستانە لە دەمم دەرکەوتن:"شانازی بەوە دەکەم کە لەگەڵ ئێوەدا کاربکەم، بەڵام کارکردن لە ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەدا بۆ من گرنگترە. ئەمە وەك کۆچکردنێکیش وایە. کۆچیش لەمجۆرە تەمەنانەدا

دەکرێت. لە نیوەی یەکەمی چلەکانی تەمەنی خۆمدام و زانیاری و ئەزموونێکی کەڵەکە بووی زۆرم هەیە و ئەگەر تەمەن باقی بێت و ماوەی دیکەشم بەدەستەوە بێت، دەمەوێت بڕۆم و کەڵك لەو ئیمکان و دەرفەتانەی ئەمریکا وەربگرم و بە توانایەکی زۆرترەوە بگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەم. ئێوە خۆتان بخەنە شوێنی من. ئەو کاتەی چوون بۆ واشنتن بۆ بانکی نێودەوڵەتی لەم تەمەنانەی مندا بوون، کاتێکیش کە گەڕانەوە چی روویدا... ئێستاش تکاتان لێدەکەم کە خۆتان بخەنە شوێنی من و وەك کەسێك کە منی خۆش دەوێت کامەیتان بەلاوە باشترە ئەوەم بۆ هەڵبژێرن و ئێوە بڵێن کە پێویستە چی بکەم؟"

تۆرگوت ئۆزال جارێکی دیکە رووی کردە نەخشەکە و پەنجەی ئاماژەی بەرەو ئەمریکا درێژ کردەوە و وتی:" زەماڵە لەوێیە و چالاکی لێرەیە، بڕیاریش بەدەست خۆتە."

لەبەر دەرگای ژووری سەرۆك کۆماردا بە پێوە وەستابووین. لەدوای چەند چرکەیەك راوەستان بە بێئەوەی هیچ بڵێم، دەستی راستم درێژ کردەوە و ئەویش دەستمی گوشی و وتی:" پیرۆزە گیانەکەم. لەدوای جەژن ئەوەی کە پێویست بێت من دەیکەم." رۆژی دواتر پشووی جەژن دەستیپێدەکرد. بەر لەوەی لە ژوورەکە دەرکەوم، بە لاچاوێکەوە سەیری کاتژمێری سەر دیوارەکەم کرد. نیوەشەو بوو، کاتژمێر ۱۲:۰۰ پیشاندەدا. من کە گەریلایەکی پێشووی فەلەستین بووم، ئیتر ببووم بە راوێژکاری سەرۆك کۆماری تورکیا.

ساڵانێك دواتر لە ۲۷ی شوباتی ۱۹۹۷دا دوای دەستوەردانی سەربازی کە بەهۆی وتەیەکی منەوە لەنێو خەڵکدا وەك کودەتای پۆست مۆدێرن بڵاوبووەوە، جگە لەوە، دوای "یاداشت"کەی ۱۹۹۸ی فەرماندەی گشتی سوپا کە وەك تاریکییەك بەسەرمدا هات، ئەو بیرۆکەیەی کە ساڵانێك لەوەوپێش هەمبوو جارێکی دیکە لە زەینمدا زیندوو بووەوە. دەمویست لە تورکیا دووركەومەوە و لە واشنتن لە ناوەندێکی لێکۆڵینەوە کاربکەم. لە ساڵی ۱۹۹۸ بانگهێشت کرام بۆ ئەوەی لە کۆنفرانسێکدا لە واشنتن سەبارەت بە رووداو و پێشهاتەکانی تورکیا وتارێك پێشکەش بکەم. ئەوکاتەش کە لەوێ مامەوە، زانیاریم بەدەستهێنا کە چۆن و بە چ شێوەیەك داوا لەو شوێنانە بکەم تا زەماڵە وەربگرم و زانیم کە بۆ ئەوە پێویستە چرووتژەیەك پێشکەش بکەم.

چوومە نیۆیۆرك و لە ژوورێکی بچوکی کچەکەمدا کە ئەو کاتانە لەوێ دەیخوێند مامەوە. بە رۆژان خەریکی نوسینی چرووتژەکەم بووم. دوابەدوای ئەوەش سەردانی ماڵی پرۆفیسۆر کەمال کارپات'م کرد کە لە هاوینەهەواری لۆنگ ئیسلاند لە دەوروبەری نیۆیۆرك بوو. مامۆستا کەمال پرۆژەکەی وەرگرتم و بەشێوەیەکی گونجاو ناوەڕۆکەکەی بە ئینگلیزیەکی زۆر باش رێکخستەوە. بەگوێرەی ئەو هەلومەرجەی کە لەو کاتانەدا هەبوو، قبوڵکردنی پرۆژەکەم لەبەر ناونیشانەکەی زۆر مومکین بوو:" بەرەو ئیسلام و

دیموکراسی، تورکیا لەسەدەی بیست و یەکەمدا" لەو کاتانەدا پارتی رەفا داخرابوو و تایب ئەردۆغان لە زیندان بوو. لەگەڵ کەمال کاریات پانتۆڵەکەمان هەڵکردبوو و لە کەنارەکانی لۆنگ ئیسلاند'دا بەپێی پەتی لەنێو ملی کەناری ئۆقیانوسدا چەندین خولەك رێمان کرد و سەبارەت بە دەرکەوتنی جوڵانەوە و پارتێکی ئیسلامی نوێ لە تورکیا و هاتنە سەر دەسەڵاتی پارتێکی ئیسلامی لە تورکیا بە سەرۆکایەتی تایب ئەردۆغان قسەمان کرد.

لەتەموزی ١٩٩٨دا، لەکاتێکدا کە پارتی داد و گەشەپێدان هێشتا دانەمەزرابوو، ئێمە وەك دوو کەسی خەیاڵپەرست کە درك بە شتەکان دەکات یاخود وەك دوو کەس کە پێشبینی بەهێزمان هەبوو، پێشبینیمان دەکرد کە پارتی داد و گەشەپێدان بێتە سەردەسەڵات و ئەوەش لە ٢٠٠٢ دا روویدا.

لە راستیدا چرووتژەکەی من لەسەر تورکیا'ی سەدەی بیست و یەکەم بوو کە تێیدا مومکین بوو لایەنێکی وەکو پارتی داد و گەشەپێدان بێتە سەر دەسەڵات. چرووتژەکەم رەوانەی ئەنیستیتۆی ئاشتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا USIP کرد. بەر لەوەی چرووتژەکەم قبوڵ بکرێت، لەلایەن سەنتەری ویلسۆن'ەوە کە یەکێك لە بەناوبانگترین ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەی ئەمریکا بوو بانگهێشت کرام تا بۆ ماوەی ٦ مانگ لەسەر ناونیشانی چرووتژەکەم لەوێ کاربکەم. دوابەدوای ئەوەش یەکسەر لە USIPەوە نامەیەکم پێگەیشت سەبارەت بەوەی کە چرووتژەکەم قبوڵ کراوە و لە ماوەی ١٠ مانگدا چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کە من لە واشنتن بم. بەوجۆرەش لە دوو ناوەندی لێکۆڵینەوە زەمالەم وەرگرتبوو.

لە سەرەتای نیسانی ١٩٩٩وە تا ئابی ٢٠٠٠ لە پایتەختی ئەمریکا مامەوە. ئەو کاتەش سەردەمی دەسەڵاتداریی کلینتۆن بوو. ئەو کاتەی کە پێم نایە واشنتن، ئەمریکا لە رێگەی بۆردومانی ئاسمانییەوە لە کۆسۆڤا شەڕێکی بێ ئامانی لە دژی میلۆسۆڤیچ، دیکتاتۆری سرب دەستپێکردبوو. لەکاتێکدا کە لە واشنتن لەسەر چرووتژەکەی خۆم کارم دەکرد، خۆم لەنێو بابەتەکانی تایبەت بە عێراق'دا دەبینییەوە. تا ئەندازەیەك لە هەموو کۆبوونەوەیەکدا کە ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەی ئەمریکا سەبارەت بە عێراق یاخود پرسی کورد رێکیان دەخست بانگهێشتم بۆ دەهات. هاوکات لەگەڵ پرۆفیسۆر Phebe Marr کە یەکێك لە بەناوبانگترین ئەکادیمییەکانی ئەمریکا بوو، سەبارەت بە عێراق لە ناوەندی ویڵسن پێکەوە مابووینەوە. لەماوەیەکی کورتیشدا وەکو دۆستێکی ٤٠ ساڵە و دۆستی زۆر نزیکمان لێهات. ئەو، یەکێك لە گرنگترین سەرچاوەکانی تایبەت بە مێژووی مۆدێرنی عێراق بوو لەوڵاتەکەی خۆیدا و لەوبارەیەشەوە چەندین کتێبی هەبوو. Phebe دژی ئەو پاساو و بیروبۆچوونانە بوو کە پێیانوابوو پێویستە وڵاتەکەی دژی عێراق بجەنگێت. زۆر گرنگیم بەو دەدا و نێوانمان زۆر خۆش بوو، بەڵام سەبارەت بەوەی کە پێویستە لە عێراق چی بکرێت بۆچوونەکانمان لێك جیاواز بوون. ساڵانێك دواتر کاتێك سەیری رابردووم

دەکرد، دەمزانی بەشێکی بۆچوونەکانی ئەو ڕاست بوون و بەشێکی بۆچوونەکانی منیش ڕاست دەرچووبوون و هەندێك لە بۆچوونەکانی من و ئەویش هەڵە دەرچووبوون.

زەحمەتە بیر لەوەبکرێتەوە کە بەر لە جەنگ، لە واشنتن زانیاری سەبارەت بە عێراق کەم بووبێت. ئەو کاتەی لە واشنتن بووم، هیچ یەك لە کۆنفراسەکانی هانس بلیکس و جێمس بۆڵتەر'م تێپەڕ نەدەکرد کە وك چاودێرەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان لە عێراق لە واشنتن بۆ ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە ئەنجامیان دەدا. چەندینجار گوێم لە ئەنتۆنی کۆردیسمان گرت کە یەکێك لە پسپۆڕە کاریگەرەکانی ناوەندی لێکۆڵینەوەی SIS بوو سەبارەت بە عێراق. فرانسیس ریکاردۆنە کە دواتر لە ٢٠١١دا بوو بە باڵیۆزی ئەمریکا لە تورکیا، ئەو کاتە ڕێکخەری کاروباری ئۆپۆزیسیۆنی عێراق بوو و چەندینجاریش لەگەڵ ئەودا کۆبووینەوە. لەوکاتانەدا بەرهەم ساڵح نوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە واشنتن بوو. لەگەڵ بەرهەم دا زوو زوو یەکترمان دەبینی. ئەو کاتانەی کە جەلال تاڵەبانی دەهات بۆ واشنتن، لە ماڵی بەرهەم ساڵح لە ماریلاند کە تۆزێك لە دەرەوەی شار بوو دەمایەوە. ئەو کاتانەی کە تاڵەبانی دەهات، ئێمەی دۆستەکانیشی لە ماڵی بەرهەم کۆدەبووینەوە. هەر لەوێش گوێم لە بیرەوەریەکانی جەلال تاڵەبانی گرت سەبارەت بە هەوڵەکانی بۆ قەناعەت پێکردنی عەبدوڵا ئۆجەلان بۆ ڕاگەیاندنی ئاگربەست کە لەدوای دیداری لەگەڵ تۆرگوت ئۆزال و ئەشرەف بتلیسی فەرماندەی جەندرمە لە ساڵی١٩٩١ ئەنجامیدابوو.

لەو ڕۆژانەی لە واشنتن بووم لەگەڵ کەسانی وەك پرۆفیسۆر هێنری بارکەی کە لە ئیستانبول لەدایکبووە و هەروەها ئێلن لایپسۆن'ی خێزانی کە ئەو کاتە جێگری سەرۆکی دەستەی هەواڵگری نیشتمانی بوو، هەروەها گراهام فۆرلەر سەرۆکی پێشووی دەستەی هەواڵگری نیشتمانی کە ئەوکاتە لە میریلاند دەژیا زوو زوو یەکترمان دەبینی و ئەوانە لە ریزی ئاشناکانمدا بوون. زۆرجاریش بابەتی قسە و گفتوگۆکانیشمان لەسەر عێراق دەبوو، ئەوکاتانەی کە لە ماڵی هێنری بارکەی و ئێلن لایپسۆن'دا کۆدەبووینەوە کەسانی وەك ئەحمەد چەلەبی و پسپۆڕی وەکو جودیت کیپر کە زۆر گرنگی بە عێراق دەدا وە هەروەها ڕۆبین ڕایت کە یەکێك لە ڕۆژنامەنوسە پسپۆڕەکانی تایبەت بە ئێران بوو لە ئەمریکا و جگە لەوانەش، لەگەڵ فیلیپ گۆردن جێگری وەزیری دەرەوەی بەڕێوەبردنی ئۆباما کە پێشتریش لە ڕاوێژکارەکانی سەرۆك کلینتۆن بووە و لەو قۆناغەدا لە مێزی ئەورووپا'ی دەستەی ئاسایشی نیشتمانیدا کاری دەکرد یەکترمان دەبینی.

جودیت کیپر یەکێك لە کاریگەرترین چاودێرانی نەتەوەیەکگرتوەکانی لە عێراق کە ناوی چارلس دۆڵفۆر بوو بەمن ناساند. لەگەڵ چارلس دۆڵفۆر'دا کە وەك چاودێری لەناوبردنی چەکە کۆکوژەکان

هاتوچۆی عیراقی دەکرد دوو جار لە ئیستانبوڵ یەکترمان بینی و بەدوورودرێژی قسە و گفتوگۆمان کرد. پرۆفیسۆر فوئاد عەجمی بۆ وتنەوەی وانە لەبەشی ماستەر لە SAIS لە زانکۆی جۆس هۆبکینز هەفتەی دووجار سەردانی نیویۆرکی دەکرد. فوئاد چەند جار منی بانگهێشتی وانەکانی خۆی کرد و داوای لێکردم کە سەبارەت بە تورکیا وانە بڵێمەوە. فوئاد عەجمی لەکاتی جەنگی عێراق‌دا کاریگەرییەکی تایبەتی لەسەر دیك چێنی جێگری سەرۆك هەبوو و لانی کەم هەفتەی دووجار بەیەکەوە دەبووین.

لە ئەنجامدا لەنێوان ساڵانی ١٩٩٩-٢٠٠٠ لە واشنتن، تەنانەت بۆ رۆژێکیش لە عێراق بەدوور نەمامەوە. بگرە زیاتریش سەبارەت بەپرسەکانی ئەو وڵاتە قاڵبوومەوە. لەگەڵ ئەوەی کە پەیوەندییەکانم لەگەڵ عێراق هیچ نەپچڕان لە ماوەیەکی کەم بەر لە جەنگی ٢٠٠٣شدا ئەم پەیوەندییانەم زۆر زیاتر و پتەوتر بوون. بەواتایەکی تر من یەکێك لەو کەسانە بووم کە پاساوی جەهالەت و نەزانی سەبارەت بە ئەنجامەکانی جەنگ و ئەو رێگایەنەی کە بەجەنگ کۆتایی دەهات نەبوو، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو سەرنج پێدان و زانیاریانەی کە کەڵەکەم کردبوون لە مێشکی خۆمدا منیش لە راستیدا نەمدەزانی کە چ جۆرە پەردەیەك لەسەر نهێنیەکانی ئەنجامەکانی دوای جەنگی عێراق هەیە و دوای جەنگ ئەو راستیانەم دەزانی.

من پێموایە بەشێوەیەکی سەرەکی لە دوو خاڵدا یان بەهەڵەداچووم یاخود ئەو چاوەڕوانییانەی کە من هەمبوون جیاواز دەرکەوتوون:

١. بە هیچ شێوەیەك تەسەوری ئەوەم نەدەکرد کە پلانەکانی ئەمریکا بۆ قۆناغەکانی دوای جەنگ ئەوەندە مایەپووچ و بێ ناوەڕۆك بن. پێموابوو ئەمریکا بۆ قۆناغی دوای جەنگ پلانێکی بنەڕەتی داناوە. ئەمریکا تاکە زلهێز و دەوڵەتێکی سۆپەر بوو لە جیهاندا و بە گوێرەی ئەو دەرفەتانەی کە لە دەستی دابوون و ئەو هێزەی کە کەس نەیدەتوانی بەرگەی بگرێت، چاوەڕوانیکردنی ئەوەی کە بۆ قۆناغی دوای جەنگ پلانێکی گشتگیر و بنەڕەتی هەبێت چاوەڕوانیەکی زۆر سروشتی بوو. بە واتایەکی دیکە من چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد کە ئەمریکا لە قۆناغی دوای جەنگی عێراق ئەگەر گوزارشتەکەم دروست بێت بەمجۆرە بڕوخێت. لەکاتی جەنگ و لە قۆناغی دوای جەنگەکەشدا، بە ئەندازەی پێویست ئەو رووخانەی ئەمریکا بە روونی دەرکەوت.

پرسی جەنگی عێراق لەنێو دامودەزگاکانی بەڕێوەبردنی ئەمریکا وەك پرسیەکی "جەنگی ناوخۆیی واشنتن"ی لێهاتبوو. جەنگی راستەقینە لە واشنتن ئەو جەنگە بوو کە لەنێو دامودەزگاکاندا دەکرا و ئەم جەنگەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەمریکا لە جەنگی عێراق‌دا بێچارە بمێنێتەوە.

هاوپەیمانیەکی دیکە لەبەرامبەر هاوپەیمانیەك کە لە نێوان وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و سی ئای

ئەی و سەربازەکانی پنتاگۆن و کۆشکی سپی'دا پێکهاتبوو، دروست ببوو. ئەو هاوپەیمانیەکەی دیکە زیاتر لە مەدەنیەکانی پێنتاگۆن و بەشێکی گرنگی دەستەی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا و بەشێك لەو کەسانەی کە لە کۆشکی سپی لە دەوری دیك چینی جێگری سەرۆك کۆببوونەوە پێکهاتبوون. هەردوولایان بە ئەندازەی دوژمنایەتی کردنی یەکتر رووبەڕووی یەك دەبوونەوە. ئەم جەمسەربەندیەی کە لە واشنتن دروست ببوو، تەشەنەی کردبووە نێو ئەندامانی کۆنگرێس کە دەسەڵاتی یاسادانان بوو، هەروەها لەنێو ئەنجومەنی نوێنەران و سیناتۆرەکان و مێشکەکانی ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەشدا بڵاوبووەوە لەنێو هەر دەزگایەکیشدا بە ئەندازەیەکی وەك خۆی ئەم ناکۆکی و ململانێیانە روویدەدا. من بیرم لەوە نەکردبۆوە کە جەنگی ناوخۆیی واشنتن بە ئەندازەیەك بێت کە سێبەر بخاتە سەر جەنگی ئەمریکا لە عێراق و لەمبارەیەشەوە بەهەڵەدا چووبووم.

٢. بچوکترین گومانم نەبوو سەبارەت بەوەی کە سەدام و پاسەوانەکانی گاردی کۆماری کە لە جەنگدا بوون لە ماوەیەکی کەمدا شکست دەخۆن. سوپای عێراق هەر لەکاتی دامەزراندنیەوە وەکو باڵۆنێك فووی تێکرابوو و گەورە کرابووەوە. زۆر بە باشی ئاگام لەوەبوو کە هێزە چەکدارەکانی رژێمی زاڵمی بەعسی بە ئاسانی لەبەردەم هێزەکانی دوژمنی بیانیدا شکست دەخۆن و ئەو هێزانەشی کە هەیانبووە بۆ هێرشە بێ ئامانەکانیان بۆ سەر خەڵکی بێچەکی خۆیان لێیان دەسەندرێتەوە لە جەنگێکی راستەقینەدا بە ئاسانی نەیدەتوانی لەسەرپێ بمێنێتەوە. نزیکەی ٢٠ ساڵ لەوەو پێشیش تۆرگوت ئۆزال هەمان بیروبۆچوونی سەبارەت بە رژێمی عێراق و سوپاکەی هەبوو. لەمبارەیەوە بەهەڵەدا نەچووبووم. جەنگ هەتا ئەوکاتەی یەکەکانی سوپای ئەمریکا گەیشتنە دەروازەی بەغدا نزیکەی سێ هەفتەی خایاند. هێزەکانی پاسەوانی گاردی کۆماری کە سوپای عێراق و ئەندامە سەرسووڕماوەکانی کە میدیای عێراق بەردەوام پەسنی دەدان، نەیانتوانی بەرگرییەکی ئەوتۆ بکەن و لە دژی سوپای ئەمریکا راوەستن. لە ماوەیەکی کەمدا جەنگ بەشکستهێنان و رووخانی رژێم کۆتاییپێهات. ئەو خاڵەی کە تێیدا بە هەڵەدا چووبووم بەرگری سوننەکانی عێراق بوو کە چەند مانگ لەدوای کۆتاییهاتنی جەنگ دەستیپێکرد. بە وتەی ئەو کەسانەی کە دژایەتی ئەمریکا دەکەن هێزەکانی مقاوەمە یاخود بەرگری کە لەلایەن ئەمریکاییەکان و هاوپەیمانەکانی و هەروەها شیعەکانی عێراق'ەوە بە تیرۆریست ناوزەد دەکران. ئەمەش ناوەکەی دەتەوێت بەرگری بێت یاخود تیرۆریزم، هەرکامێکیان بێت لە حەقیقەتدا من پێشبینی ئەوەم نەدەکرد کە بەمجۆرە و بە ئاستێکی فراوان خۆی رابگرێت و دژایەتی هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بکات.

دیارە کۆتاییە بێ هاوتا و دەگمەنەکەی عیراق'یشم حیساب نەکردبوو. ئەمەش بە ئاسانی حیساب

نەدەکرا. رژێم رووخابوو و ببوو بە هەڵم، بەڵام هێشتا خۆی تەسلیم نەکردبوو. لە جەنگەکەدا، وەکو جەنگی جیهانی دووەم کە لە ئەنجامیدا لەگەڵ ئەڵمانیا و ژاپۆن یان تەنانەت وەکو جەنگی ١٩٩١ لە گەڵ عێراق'یشدا، شتێك یان رێککەوتننامەیەك لە نێوان هێزی سەرکەوتوو و هێزی شکستخواردوو ئیمزا نەکرابوو. بەغدا'ی پایتەخت کەوتبوو بەڵام سەرکردەکانی رژێم و ئەو سوپایەی کەوا جەنگیان نەدەکرد و ئەو چەکانەشی کەوا دەست نەکەوتبوون هەمووی دیار نەمابوون. ئەمەش لە کاتەکانی دواتردا بۆ بەرگری لەبەرامبەر داگیرکاریدا سەرچاوەیەکی زۆرگرنگی دابین دەکرد.

هەرچی بێت من حیسابی ئەوەم نەکردبوو و چاوەڕوانیی ئەوەم نەدەکرد کە ئەو بەرگرییەی لەدوای جەنگ لەبەرامبەر داگیرکاری دروست دەبێت، بەوجۆرە بەهێز و خۆڕاگر دەبێت. ئەمەش خاڵی دووەمی بە هەڵەداچوونەکەی من بوو.

نەدۆزرانەوەی چەکەکۆکوژەکانی عێراق کە پاساوی دەسەڵاتی یاساداناني ئەمریکا بوو بۆ وەرگرتنی بڕیاری جەنگ، لە راستیدا زۆر جێگەی سەرنج و گرنگی من نەبوو و هیچ کاتێکیش جێگەی بایەخی من نەبوو. ئەم بابەتەشم وەك کایەیەکی تەکنیکی و یاسایی ئەمریکا سەیر دەکرد. من لە ریزی ئەو کەسانەدا نەبووم کە لە راستیدا لە ساڵی ٢٠٠٣دا پرسی رەوایی جەنگ بە هەبوونی چەکە کۆکوژەکانی عێراق ببەستمەوە و هیچ کاتێکیش بەوجۆرە بیرم نەکردبۆوە.

لەکاتی جەنگی ئێران و عێراق'ەوە دەمزانی کە سەدام بە چ شێوەیەك چەکە کۆکوژەکان بەکاردەهێنێت، لەوەش گرنگتر ئەوبوو کە لە هەوڵەکانی پاکتاوکردنی نەژادی کوردەکان لەساڵی ١٩٨٨دا کە بە ئەنفال ناسرابوو، سەدام چەکی کۆکوژی بەکارهێنابوو و ئەمەش هیچ کات لە مێشك و یادگەی مندا نەدەسڕایەوە. بەتایبەتی نەمدەتوانی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە فەرامۆش بکەم کە لە سەدەی بیستەمدا هەتا رووداوی بۆسنا و سەرایيڤۆ لە ساڵی ١٩٩٥دا، لەدوای رووداوەکەی هیرۆشیما و ناکازاکی گەورەترین قەتڵوعام و کوشتارێك بوو کە لە چەند کاتژمێرێکدا بەهۆی بەکارهێنانی چەکە کیمیاوی و بایەلۆژیەکانەوە ببووە هۆی کوژرانی ٥٠٠٠ کەس و ئەمەش شتێك نەبوو کە بە ئاسانی فەرامۆشی بکەم.

لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٠دا بە درەنگ وەختیشەوە سەردانی هەڵەبجە'م کرد و لەوێ سەیری ئەو درندەییانەم کرد کە سەدام لەوێ کردبوونی و لە رێگەی گوێگرتن لەو کەسانەی کە شاهید عەیانی رووداوەکە بوون و لەنێو رووداوەکەدا بوون، هەروەها بە بینینی مۆزەی قەتڵوعامەکە و مەزارەکانەوە ئاگاداری ئەو درندەییانە بووم کە سەدام لە دژی هەڵەبجە ئەنجامی دابوون. لەبەرئەوەش هەبوونی چەکی کۆکوژ لە تۆمارەکانی عێراق'دا لەساڵی ٢٠٠٣ بۆمن گرنگ نەبوو. چونکە لە راستیدا لەوبارەیەوە

پاشەڵی رژێمی عێراق بەشێوەیەکی ئاشکرا لەبەر چاوم بوو. لەم روانگەیەشەوە دۆزینەوەی چەکە کۆکوژەکانی عێراق لە ساڵی ۲۰۰۳دا لە رووی رەوایی پێدان بە جەنگەکەوە واتایەکی ئەوتۆی نەبوو.

جگە لەوەش، تۆنی بلێر لە کتێبەکەی خۆیدا (جۆرنی) لەبەشی تایبەت بە عێراق'دا هەندێك زانیاری باس دەکات کە شایەنی ئەوەن گرنگییان پێ بدرێت:" زانیارییە هەواڵگریەکان سەبارەت بە سەدام و چەکە کۆکوژەکانی هەڵە دەرچوون. باس لەوەکرا کە پرسیار کردن سەبارەت بەوەی کە ئەمە چۆن دەبێت وابێت وەك نهێنیەك ماوەتەوە. منیش وتم مادام سەدام هیچ شتێکی بۆ شاردنەوە نەبوو بۆچی رێگەی نەدەدا چاودێرەکان سەردانی ئەوێ بکەن؟ بۆچی رێگری لە چاودێرەکان کردبوو؟ بۆچی تەنها لەبەر شاردنەوەی نهێنیەك وڵاتەکەی بەرەو جەنگ برد؟ وا دیارە راستیەکان لە قسەکانی چارلس دۆلفەر چاودێری پێشووی چەکی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بوو کە بەمجۆرەی ناکۆکییەکی هێنابووە سەرزمان:ئەو کاتەی کە وەك ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی هەڕەشەمان لێکرد سەدام وایدەزانی تەنها قسەیە و هەڕەشەی لێدەکەین. بەڵام لەراستیدا لەمەیاندا نیازپاك بووین و تەنها قسە نەبوو. کاتێك کە ئێمە ئەو قسانەمان دەکرد لە راستیدا بڕوامان وابوو کە ئەو چەکی کۆکوژی هەیە'

کاتێك کە بۆ وەرگیرانی قسە و بیروبۆچوونەکانم لە لیژنەی لێکۆڵینەوەدا بانگ کرام بۆ جارێکی دیکە لێکۆڵینەوەم لە هەموو راستیەکان کرد و ئەو راپۆرتەم خوێندەوە کە گروپی لێکۆڵینەوەی عێراق لە ساڵی ۲۰۰٤دا ئامادەی کردبوو. کاتێکی زۆریشم لەبەردەستدابوو بۆ ئەوەی سەبارەت بە ئەنجامەکان زیاتر بیربکەمەوە. چارلس دۆلفەر و هاوڕێکانی کە لە گروپی لێکۆڵینەوەی عێراق'دا کاریان دەکرد لەگەڵ بە ڕێوەبەرایەنی باڵای رژێمی عێراق و هاورێ نزیکەکانی سەدام'دا چاوپێکەوتنیان کردبوو. لە ماوەی ئەو قۆناغە نائاساییەی کە چەند مانگی خایاند، سیخوڕێکی ئێف بی ئای بەناوی جۆرج پیتۆل لەگەڵ سەدام دیداری کردبوو. ئەو تیمەش دەستیان گەیشتبوو بە هەندێك تۆماری تایبەت بە سەدام کە لەگەڵ دامودەزگاکانی خۆیدا سەبارەت بە چەکە کۆکوژەکان باس و گفتوگۆی کردبوو و بەوجۆرەش رووی راستەقینەی رووداوەکان دەرکەوتن ئەمەش چیرۆکێك بوو کە شایەنی خوێندنەوە بێت." (تۆنی بلێر، جۆرنی، ل ۳۷٤، ۳۷٥)

بەگوێرەی ئەم "چیرۆکە" ئەو گەمارۆیەی کە لە ساڵی ۱۹۹۱دا خرابووە سەر رژێمی سەدام، ئەو رژێمەی تووشی ئاستەنگی زۆر و زەحمەتی کردبوو. ئەم تەنگەتاوی و بارودۆخە خراپەش بووە هۆی ئەوەی کە زاواکانی سەدام کە بەرپرسیاری پڕۆگرامی چەکەکۆکوژەکان بن هەڵبێن و لە ساڵی ۱۹۹۸دا هەندێك لە نهێنیەکان ئاشکرا بکرێن و بەوەۆیەشەوە رژێم رووبەڕووی زەحمەتی زۆری دیکە بێتەوە.

"لەدوای ئەمە سەدام بڕیارێکی تەکتیکی وەرگرت. لە نیوەکانی ۱۹۹۰کانەوە سەدام سیاسەتی خۆی

لەسەر ئەو بنەمایە دانا کە بە هەر بەهایەك بێت گەمارۆکانی سەر عێراق لابرێت بەو هۆیەشەوە پرۆگرامی چالاکی چەکەکۆکوژەکانی خۆی راگرت.

سەدام درکی بەوەکردبوو کە درێژەدان بە بەرهەمهێنانی چەکە کۆکوژەکان و شاردنەوەی ئەو پرۆگرامانە شتێك نیە کە بتوانێت بارەکەی هەڵبگرێت و زۆر مەترسیدار دەبێت بۆی...

ئەو ئەنجامەی کە گروپی لێکۆڵینەوەی عێراق دەری خستبوو بریتی بوو لەوەی کە سەدام تەنها بەشێوەیەکی تەکتیکی بڕیاریداوە واز لە پرۆگرامی گەشەپێدانی چەکە کۆمەلکوژەکانی بهێنێت و بڕیارێکی ستراتیژی نیە. گروپی لێکۆڵینەوەی عێراق بەم ئەنجامە گەیشتبوو: سەدام بەنیاز بوو لەدوای باشبوونی بارودۆخی ئابووری عێراق و سەقامگیر بوونی باری ئابووری و هەڵگیرانی گەمارۆ ئابووریەکانی سەر وڵاتەکەی، جارێکی دیکە تواناکانی خۆی بۆ گەشەپێدانی چەکەکۆژەکان کە لە ساڵی ١٩٩١دا لەناوبرابوون دەستپێبکاتەوە.

بە ئەگەرێکی زۆر دەبوو بەشێوەیەکی جیاواز لە جاران هەوڵی بەدەستهێنانی چەکە کۆکوژەکان بدات. ئەوەش بە جۆرێك دەبوو کە تێکەڵاوێك لەوەی جاران و بە دەستهێنانی توانای بەرهەمهێنانی ئەو جۆرە چەکانە بێت

سەدام دەیویست توانای ئەتۆمی خۆی گەشە پێبدات و بەبێ گوێدانە گوشارە نێودەوڵەتیەکان و ئەنجامەکان و هەروەها بە بێ لەبەرچاو گرتنی مەترسیە ئابووریەکانی، وورده وورده دەیویست ئەو کارەی خۆی گەشە پێبدات. بەوجۆرەش لەسەر مووشەکی بالیستیك و چەکی کیمیاوی تەکتیکیدا تەرکیزی کرد و دەیویست توانا جەنگیەکانی خۆی لەو بوارانەوە گەشە پێبدات..." (تۆنی بلێر، جۆرنەی، ل٣٧٥-٣٧٦)

تۆنی بلێر بۆ ئەوەی کە ئاماژە بەو ئامانجە ستراتیژیانە بدات کە لە سەرەوە باسکران بە وردی و بە نموونە و زانیاری بەرچاوەوە باس لەوە دەکات کە سەدام زانا و تەکنیك کارەکانی (لە بواری چەکەکۆکوژەکان) لەلای خۆی هێشتۆتەوە و ئەو تاقیگایانەش کە نەتەوەیەکگرتووەکان ئاشکرایان کردووە هیچ کاتێك دای نەخستوون. ئەمانەش بە ئەندازەیەك بەهێزن کە دەتوانن هەندێك قسەی مایەپووچ دەربخەن سەبارەت بەوەی سەدام کە پێشتر چەندینجار چەکی کۆکوژی بەکارهێناوە خاوەنی چەکی کۆکوژ نیە. پروپاگەندەکانی وەك ئەوەی کە هیچ کاتێکیش نەیدەتوانی ببێتە خاوەنی ئەو جۆرە چەکانە رەتدەکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا با جارێکی دیکە ئەوە دووبارە نەکەمەوە کە پرسی چەکە کۆکوژەکانی سەدام بۆ کەسێکی وەکو من شتێك نەبوو کە لە رووی رەوایی پێدان بە جەنگی عێراقەوە گرنگیەکی ئەوتۆی هەبێت. هەروەها ئەو گفتوگۆیانەش کە دەکران سەبارەت بەوەی کە لەبەر ئەوەی جەنگەکە

بە بێ بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی کراوە و لە رووی یاسای نێودەوڵەتیەوە گرفتی تێدایە زۆر سەرنجی منیان رانەدەکێشا. لەنێو ئەو هەزاران لاپەڕەیەی کە لە قۆناغی جەنگدا خوێندبوومەوە، ئەوەی کە زیاتر لە هەموویان بەشێوەیەکی گرنگ سەرنجی راکێشابووە سەر ناکۆکی جەنگی ئەمریکا لە دژی عێراق لەگەڵ یاسا نێودەوڵەتیەکان، بیروبۆچوونەکانی بیرمەندی بەناوبانگی ئەڵمانیا ژۆرگن هابرماس بوو.

پاساوی سەرەکی هابرماس لەوبارەیەوە بەمجۆرە بوو:" لە پرسی رەواییدا چەمکە ئایدیالیستانەکان هیچ پاساوێکی واقع گەرایانەیان نیە. پێوەر و ئامانجەکانی جۆرج بوش بۆ لەناو بردنی سیستمێکی نادادپەوەر و ویستەکانی بۆ دیموکراتیزەکردنی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەگەڵ پڕۆگرامی نەتەوەیەکگرتووەکاندا ناکۆکییان نەبو. بەڵکو ئەو شتەی کە جێگەی مشتومڕبوو ئەوەبوو کە لە راستیدا ئایا بەرقەرارکردنی دادپەروەری راستەقینە لەنێو نەتەوەکاندا شتێکی لەوانەبە یان نا. باسەکە لەسەر ئەوەیە کە ئەگەر مومکین بێت، بەچ ئامراز و پێوەرێك جێبەجێ دەکرێت.

بەڕێوەبردنی بوش بە بنەما ئەخلاقی و رەوشتیەکانی خۆیەوە هەموو چرووتژەکەی کانت ٰی پشتگوێ خستووە کە مێژوویەکی دووسەد ساڵەی هەیە و لەسەر بنەمای رەوایی پەیداکردن لە پەیوەندییە نێونەتەوەیی و نێودەوڵەتیەکان دامەرزاوە.

رەفتارەکانی بەڕێوەبردنی ئەمریکا وەکو خۆیشیان دەیبینن تەنها یەك ئەنجامی لێدەکەوێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە یاسای نێودەوڵەتیەکان لەوە دەربخرێن کە ببنە هۆکارێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوان دەوڵەتەکان و گەشەپێدانی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ.

ئەو هێزە جیهانییەی کە ئەو ئامانجەی لە سیاسەتەکانی خۆی داناوە، پشت بە یاسا نابەستێت و لە جێگای ئەوەشدا بەها رەوشتیەکانی خۆی جێگیرکردووە و پێوەرە واقیعیەکانی خۆی پێناسە کردووە و بەشێوەیەکی یاسایی ئەوەشی جێگیرکردووە. بەڵام لە راستیدا یەکێکیان ناتوانێت شوێنی ئەوی دیکەیان بگرێتەوە."(Jürgen Habermas, America and the World, A Conversation with Jürgen (Habermas withEduardo Mendieta

ئەو پاساوەی هابرماس کە لەراستیدا زۆر بەهێز بوو، نەبووە هۆی ئەوەی کە لە بنەڕەتەوە بیروبۆچوونەکانی من سەبارەت بە جەنگ گۆڕانکارییان بەسەردا بێت. ئێمە لە نیوەی یەکەمی ساڵەکانی ١٩٩٠کاندا لە نمونەی بۆسنا و هەرسك ٰدا بەچاوی خۆمان ئەوەمان بینیبوو کە لەوانەیە هەندێکجار وەرگرتنی پێوەرەکانی یاسای نێودەوڵەتی لە رێگەی دەستەی ئاسایشی نێودەوڵەتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لە جێی خۆیدا نەبێت و ئەنجامی مرۆییانەی لێ دەست نەکەوێت.

بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بۆ گەمارۆدانی یۆگۆسلافیا لە رووی چەك و تەقەمەنی لەگەڵ نەبوونی توانای خەڵکی بۆسنا بۆ پاراستنی خۆیان و زنجیرە قەتڵوعامەکانی چەتەکانی سرب و هەندێك جاریش کرواتەکان لە دژی ئەوان، بوونە هۆی ئەوەی کە رووداوی کارەساتبار بێنە ئاراوە. بڕیارەکەی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لە رواڵەتدا بڕیارێکی رەوشتی بوو بۆ ئەوەی گەمارۆی چەك بخرێتە سەر یۆگۆسلافیا تا رێگەی لە قەتڵوعام کردنی خەڵکی بۆسنا بگیرێت، بەڵام رێگای بۆ پاکتاوکردنی نەژادی کردبووەوە.

لەدوای قەتڵوعامەکەی سرێبینیتسا لە ساڵی ١٩٩٥دا، فڕۆکە جەنگیەکانی ئەمریکا و فەرەنسا سەنگەری سربەکان'یان بۆردومان کرد و ئەو کاتە ئیتر هاوسەنگیەکانی جەنگ گۆڕانکارییان بەسەردا هات و خەڵکی بۆسنا لە پاکتاوکردنی نەژادی رزگاریان بوو. بۆردومانیە ئاسمانیەکانی دوو وڵاتی ئەندامی ناتۆ کە ببووە هۆی راگرتنی سربەکان بڕیارێکی نەتەوە یەکگرتووەکانی لە پشتەوە نەبوو. بە هەمانشێوە لە ساڵی ١٩٩٩دا ئەگەر ئۆپەراسیۆنی ئاسمانی هێزەکانی ئەمریکا لە کۆسۆڤۆ نەبوایە، ئەو کاتە بەشێکی زۆری خەڵکی موسڵمانی ئەلبانی دەخرانە بەر رەحمی سوپای سربی میلۆسۆڤیچ. بە ئەگەرێکی زۆر ئەلبانیەکان لە کۆسۆڤۆ، هاوشێوەی ئەوەی کە لە ١٩١٥دا لە خاکەکانی ئەنادۆڵ بەسەر ئەرمەنەکان'دا هات لەوێ دەسڕانەوە و لە ناو دەچوون. ئەو ئۆپەراسیۆنە ئاسمانیەی کە پشتی میلۆسۆڤیچ'ی لە کۆسۆڤۆ شکاند، دیسان بڕیارێکی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی یان رێکخراوی نەتەوەیەکرتووەکانی لە پشت نەبوو.

بەدەر لەوەی نەتەوەیەکگرتووەکان لە هەندێك بارودۆخدا بۆ جەنگ کردن دژی زاڵمەکان چرای سەوز هەڵناکات، لەوانەیە هەندێك جاریش کاتێك کە چرای سەوز هەڵدەکات بۆ پاراستنی گیانی مرۆڤەکان دەرمان نەبێت و ئەنجامێکی پۆزەتیڤی لێ نەکەوێتەوە. بە تایبەت ئەمە هیچ بە کەڵکی بۆ کوردەکان نەهات کە ساڵانێك لە عێراق'دا بوونەتە ئامانجی قەتڵوعام و کوشتاری دەستەجەمعی. ئێمە لە ژیانی خۆماندا ئەو شتانەمان بینی بوو. لەبەر ئەوەش سەرەڕای پاساوە بە هێزەکەی هابرماس کە دەتوانێت قەناعەت بە مرۆڤ بکات، هەر جۆرە بڕیارێکی نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بە رەوایی پێدان یان رەوایی پێنەدانی جەنگ کە لەوانەیە گرەنتی مانەوەی رژێمەکەی سەدام بوایە، لە روانگەی منەوە واتا و گرنگیەکی ئەوتۆی نەبوو.

چەندەی رەهەندی مرۆیی و رەوشتی بۆ نەیارانی جەنگی عێراق لە پێشەوە بوو، بە هەمان ئەندازە بۆ هەڵوێستی منیش لە پێشەوە بوون.

ئەولەویەتی من، رووخانی رژێمی زاڵم و دیکتاتۆری و کۆتاییهاتن بە ستەمکاری بوو..

**هیچ کەسێک ئەوەندە گێل و نەزان نییە لە جیاتی ئاشتی جەنگێک هەڵبژێرێت کە تێیدا لە باتی ئەوەی کوڕەکان باوکەکان بنێژن، باوکەکان منداڵەکانی خۆیان ئەسپاردە بکەن**
هێرۆدۆتۆس(٤٢٤-٤٨٤ی پ.ز)

**واتای ڕووداوەکان، زیاتر لە خودی ڕووداوەکان لەو تێگەیشتنەدا شاراوەیە کە ئێمە سەبارەت بەوان هەمانە.**

**ئانتۆنیۆ دی ساینت - ئێگزیوپێری**

لەگەڵ تیپەڕبوونی کات، جەنگی عێراق تەنانەت مێشکی ئەو کەسانەشی تێکەڵ و پێکەڵ کرد کە بە گەرمی لایەنگرییان لێ دەکرد. دوابەدوای ئەوەش پەشیمانی و پاکانەکردن بۆ خۆ دەستیپێکرد. هیچ کات ئەوەم بە مێشکدا نەدەهات کەسانێکی وەکوو کەنعان مەکییە و میشێل ئیگناتیڤ بەهۆی پێگەی تایبەتی خۆیان سەبارەت بە جەنگی عێراق، وایان لی بێت کە ڕەخنە لە خۆیان بگرن. ڕەخنە لەخۆگرتنی ئەو دوو کەسە، زیاتر لەو هۆکار و سەبەبانەی کە یۆرگن هابرماس لەسەر دژایەتیکردنی جەنگ باسی کردبوون کاریگەر بوو. ڕەخنەکانی ئەو دوو کەسە بوونە هۆی ئەوەی کە سەبارەت بە ڕەوایی جەنگی عێراق بکەومە گومان. بەدەر لەو ڕەخنانەی کە مەکییە و ئیگناتیڤ لە خۆیان گرتبوویان، کەسایەتی هەردووکیشیان لەلای من گرنگ بوو. لە نزیکەوە کەنعان مەکییەم ناسی، بەڵام هیچ کات لەگەڵ میشێل ئیگناتیڤ ئاشنا نەبووم. هەردووکیشیان بەتایبەت لەسەرەتای ساڵانی ١٩٩٠کانەوە لەو کەسانە بوون کە سەبارەت بە عێراق گرنگیم بە بیروبۆچوونەکانیان دەدا و دیدگاکانیان لە لای من جێگەی نرخ و بایەخ بوون. کەنعان مەکییە بەناوی خوازراوی سەمیر خەلیل'ەوە کتێبێکی بەناوی"کۆماری ترس"سەبارەت بە کاراکتەری ڕژێمی عێراق نووسی کە ساڵانێك یەکێك بوو لەو کتێبە گرنگە فەرامۆش نەکراوانەی سەبارەت بە ڕژێمەکەی سەدام نووسرابوو. هەر کەسێك کە بە هەرجۆرێک گرنگی بە عێراق دەدا، مومکین نەبوو ئاگای لەو کتێبە نەبێت و نەکەوتبێتە ژێر کاریگەرییەوە. کەنعان مەکییە ڕۆشنبیرێکی دیار و هەڵکەوتووی عێراق بوو کە بە ڕەچەڵەك شیعە بوو. ڕاوێژکاری مەجلیسی حوکم یان دەستەی بەڕێوەبردنی عێراق بوو کە دوای جەنگ دامەزرا. هەرکاتێک دەچوومە بەغدا دەمویست دیدارێکی لەگەڵ بکەم، بەڵام هیچ کات ئەوە سەری نەگرت. لەسەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٤دا لە زانکۆی بیلکەنتی ئەنقەرە، بۆ کۆبوونەوەیەکی تایبەت بە سیاسەتی تورکیا بەرامبەر بە تورکمانەکان، بانگهێشت کرام. کۆبوونەوەکە لە پشتەوە دەستی پرۆفیسۆر ئیحسان دۆغراماجی تێدا بوو. لە ڕاستیدا نە کۆبوونەوەکە و نە بەشداربووەکانی، هیچیان سەرنجی منیان ڕانەکێشا تا ئەوکاتەی کە باڵیۆز عوسمان قوروتورك ڕێکخەری گشتیی کاروباری عێراق لە تورکیا پێی وتم کەنعان مەکییە بەشداری لە کۆبوونەوەکەدا دەکات. ئیتر منیش نەمتوانی خۆم بگرم و بڕیاری بەشداریکردنم دا. هیچ کات بیرم لەوە

نەدەکردەوە کە رۆژێك دادێت کەنعان مەکییە نووسەری کتێبی کۆماری ترس سەبارەت بە رژێمەکەی سەدام حسێن، لەو رووداوانەی ناو عێراق بێزار بێت و والاتا ئەلسەراف عەشقەکەی کاتی لاوی خۆی هەڵبگرێت و بچێت لە ویلایەتی ماساچۆسێتی ئەمریکا وەك ئەندامی دەستەی زانستی لە زانکۆی براندیس کار بکات و دوابەدوای ئەوە، منیش لە ساڵی٢٠٠٤دا لەگەڵیدا سەبارەت بە عێراق گفتوگۆ و موناقەشەیەکی گەرم و گوڕ بکەم.

کەنعان مەکییە دوای لە سێدارەدرانی سەدام حسێن لەسەرەتای ٢٠٠٧دا عێراق‌ی جێهێشت و لە ئەمریکا نیشتەجێ بوو. لە ژمارەی رۆژی ٢٣ی مارتی ٢٠٠٧دا، ئینتەرناشناڵ هێراڵد تریبۆن چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵ کەنعان مەکییە ساز کردبوو کە بە حەیرەت و سەرسووڕمانەوە دەمخوێندەوە. چاوپێکەوتنەکە دەیخستمە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە؛

"... بەر لە داگیرکردنی عێراق لە مارتی ٢٠٠٣، لەلایەن ئەو هێزەی کە ئەمریکا پێشەنگایەتی دەکرد، کەنعان مەکییە هاووڵاتی ئەمریکی بە رەگەز عێراقی کە ساڵی ١٩٤٩ لە بەغدا لە دایك بووە، یەکێك بوو لەو بەناوبانگترین رۆشنبیرانەی کە لە دنیای خۆرئاوا و دنیای عەرەبی‌دا داکۆکی لە پێویستیی رووخاندنی رژێمەکەی سەدام دەکرد... لە راستیدا ئەو رۆژانە، یانی رۆژانی بەر لە دەستپێکردنی قەیران لە عێراق، بە واتایەکی دیکە بەر لەوەی کە ئۆتۆمبیلە بۆمبڕێژکراوە بێکۆتاییەکان بتەقێنرێنەوە و هەزاران عێراقی و ئەمریکایی گیانی خۆیان لە دەست بدەن، رۆژانێکی زۆر سادە بوون. لەو رۆژانە بەدواوە کە قەیرانی عێراق دەستیپێکرد، بۆ کەسانێکی لیبراڵ و ئایدیالیستی وەك مەکییە ئەم پرسیارە سەرەکییە دەرکەوتە پێشەوە؛ هەڵە لە کوێدا بوو؟ ئەم پرسیارەش ئێمە بەرەو کتێبە نوێیەکەی ئەو ئاراستە دەکات. مەکییە وتی دەمەوێ بگەڕێمە دواوە و لێپرسینەوە لەو وادانان و بۆچوونانە بکەم کە بەر لە جەنگ هەمبوون.

ئێستاش وا دەردەکەوێ پێویستە بیرکردنەوەیەکی زیاتر هەبێت سەبارەت بەو کۆمەڵگایەی کە خۆی خستۆتە نێو ئاژاوە و پشێوییەکی بەمجۆرە و پرسیارێك هەیە کە رۆژ بە رۆژ زیاتر لەبەردەمماندا زەق دەبێتەوە و ئەویش ئەوەیە کە ئەم دیکتاتۆرییە، سی ساڵە چی بەسەر خەڵکێکی سی و پێنج ملیۆنیدا هێناوە؟ مەکییە لە وەڵامدا وتی؛ وانەبێ کە هیچ بیرم لەمە نەکردبێتەوە، بەڵام ئەوەم هەڵبژارد کە وەك چالاکوانێك بیر بکەمەوە و دواییش بۆچوونەکەم وابوو کە بەر لەوەی بگەینە رۆژانێکی وەك ئێستا کە بەمجۆرە توندوتیژی و هەلومەرجێکی نالەباری تێدایە، کێشەکان چارەسەر دەکرێن و هیوام بەوە هەبوو کە قەیرانەکە بەڕێوە ببرێت، بۆیە ئەو بیرکردنەوانەم خستە لایەك. بەڵام وا دەرنەچوو...، ئەو لە درێژەدا وتی لە ئاستی بەڕێوەبەراندا هەڵە و کەموکووڕی زۆر گەورە هەبوون و بەشێکی زۆری ئەو هەڵە و کەموکووڕییانەش پەیوەندی بە عێراقییەکان‌ەوە هەبوو. بەگوێرەی مەکییە سەرەکیترین بەرپرسیارەکانی ئەم رووداوانە ئەو

عێراقی'یانەن کە پێشتر لە دوورخراوەییدا ژیاون و دواتر لە ساڵی۲۰۰۳ لەلایەن ئەمریکییەکان'ەوە کراونەتە ئەندامی ئەنجومەنی حوکم و زۆربەشیان لەسەر بنەمای جیاوازیی مەزهەبی و ئەتنی جەماوەریان بۆ خۆیان درووستکردووە. باسی ئەوەشی کرد کە تایفەگەری لەوێوە دەستیپێکردووە. هەرچەندە مەکییە بۆ خۆی ئاماژەی پێنەدا، بەڵام دەزانرێت کە ناکۆکیی لەگەڵ چەلەبی هەیە و ئەویش لەبەر ئەوە بووە کە چەلەبی لە یەکەم هەڵبژاردنەکانی عێراق'دا بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانیی جەماوەری خۆی لە کەسایەتییەکی توندڕەوی شیعی وەك موقتەدا سەدر نزیك کردۆتەوە. ساڵانێك بەر لە جەنگ، مەکییە سەرەڕای ئەوەی کە ئایدیۆلۆژیای جیاوازیشی هەبوو، لەگەڵ چەلەبی'دا بۆ رێکخستنی ئەو عێراقی'یانەی کە لە دوورخراوەییدا دەژین و دژایەتی سەدام دەکەن، کاری کردبوو.

لایەنێکی دیکەی پرسەکەش لە روانگەی مەکییە'وە پەیوەندی بە سیاسەتەکانی ئەمریکا هەبوو. مەکییە وتی؛ هەموو ئەو هەڵانەی کە دەیانتوانی بیکەن، کردیان. یەکەمین و گەورەترین هەڵەی ئەمریکییەکان ئەوە بوو کە بە مەبەستی داگیرکردن چوونە ناو خاکی عێراق....

لە ژووری دانیشتنەکەیدا، لە ریزێکی سەرەوەی لاپتۆپەکەی نزیکی هەشت دیسکی کۆمپیوتەر هەبوون کە زیاتر لە ۱۱ ملیۆن بەڵگەی دەوڵەتی عێراق'ی تێدا بوو. لەدوای داگیرکارییەکە، مەکییە گەڕابووەوە بەغدا و لەنێو بیناکانی دەوڵەتدا کۆی کردبوونەوە. ئەمەش ۱۱ ملیۆن لاپەڕەی دەکرد کە لە بەڵگەی لە دایکبوونی ئەندامانی بەعس'ەوە بگرە تا بەڵگە سەربازییەکان، شتی جۆراوجۆری تێدا بوو. وەقفی ئەم ساتەی عێراق کە کەنعان مەکییە دایمەزراندووە، بەشێك لەو بەڵگانەی داوە بەو دادگایەی کە ئەمریکاییەکان بۆ دادگاییکردنی سەدام و کەسانی نزیك لەو لە عێراق دروستیان کردبوو. لەگەڵ ئەمەشدا مەکییە رۆژی ۲۰۰۶/۱۲/۳۰ کە رۆژی لە سێدارەدانی سەدام حسێن بوو، وەك یەکێك لە خراپترین رۆژەکانی ژیانی خۆی لە قەڵەم داوە. کەنعان مەکییە وتی ئەمە بە هەموو واتایەکەوە کارەسات بوو. دەنگی بەرز کردەوە و وتی؛ ئەوەندە لە ناخەوە هەژام کە خەریکبوو چاوەکانم پڕ بن لە فرمێسك. ئەمە رێك پێچەوانەی ئەو شتە بوو کە من ئیشم بۆ دەکرد و هیوام پێی بوو....

قسە و باسەکان چوونە سەر هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمریکا. میوانێك لەنێو ماڵەکەدا وتی پێویستە هیلاری رۆدهام کلینتۆن کە لە ئەنجومەنی پیراندا پشتیوانی لە بڕیاری جەنگی جۆرج بوش کردووە، داوای لیبوردن بکات. مەکییە سەیری پێکی شەرابە سوورەکەی بەردەمی خۆی کرد و وتی ئەمە زۆر مائۆئیستانەیە. دەبێ مرۆڤەکان هەست بەوە نەکەن کە پێویستە داوای لیبوردن بکەن. چ شتێك هەیە بۆ ئەوەی مرۆڤ لەبەر ئەوە داوای لێبوردن بکات؟"

ئەو چاوپێکەوتنەکە بە ناونیشانی"لە عێراق'دا چ هەڵەیەك کرا؟"لە رۆژنامەی ئینتەرناشناڵ هێراڵد

تریبۆن بە ئاماژەدان بە وتەیەکی خودی مەکییە کە وتبووی؛"دەمەوێ بگەڕێمەوە دواوە و لەو بۆچوونانەم وردببمەوە کە بەر لە جەنگ هەمبوون."بڵاوکرایەوە و هیشتا شەش مانگ بەسەر ئەو چاوپێکەوتنەکەی کەنعان مەکییە تێپەڕ نەببوو کە ئەمجارەیان خۆ رەخنەگرتنێکی جدی دیکە لە ٦ی ئابی٢٠٠٧دا لە گۆڤاری ز نیۆیۆرك تایمز مەگەزین بڵاوکرایەوە کە ئەویش ئیمزای میشل ئیگناتیڤ'ی پێوە بوو. سەردێڕی بابەتەکەش ئەمە بوو؛"هەڵەکردن لە عێراق"

لەسەرەتای ساڵانی ١٩٩٠کاندا، میشل ئیگناتیڤ یەکێك بوو لەو بیرمەندانەی کە سەبارەت بە دەرکەوتنی رەوتە نەتەوەگەرا تازەکان لەدوای جەنگی سارد و هەروەها کێشەکانی شوناس و چۆنێتی چارەسەرکردنی پێکدادانەکان، نووسینەکانی هەمیشە سەرنجیان رادەکێشا. کتێبی خوێن و ئینتیما کە ساڵی١٩٩٣ بڵاوی کردبووەوە، بوو بە یەکێك لەو کتێبەسەرەکییانەی کە هەمیشە لەبەر دەستمدا بوون. لە ساڵی١٩٩٧دا نووسینێکی بەناوی"هەڵەکردن لە عێراق"بڵاوکردەوە کە سەرەڕای ئەوەی رەخنەگرتنێکی موحتەرەمانە بوو لە خۆی، لە هەمانکاتیشدا دەقێکی سیاسیی بەنرخە کە لە جیاوازییەکانی نێوان کەسێکی رۆشنبیر و سیاسەتمەدار لە پرۆسەکانی بڕیارەوەرگرتنی سیاسی دەکۆڵێتەوە. بەشێکی ئەو وتارە کە زۆریش درێژە بەمجۆرەیە؛

"ئەو کارەساتەی کە لە عێراق دەرکەوت، بووە هۆی ئەوەی ئیرادەی بڕیاری سیاسیی سەرۆکێك مایەپووچ دەرچێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بە منیشەوە بیروبۆچوونەکانی هەموو ئەو شیکارانەشی مایەپووچ دەرخست کە پشتیوانییان لە داگیرکردنەکە کردبوو. زۆربەمان وەك ئەوەی کە دۆستێکی دوورخراوەی عێراقی'م لە شەوی بەر لە جەنگی عێراق'دا پێی گوتم، ئەم جەنگەمان وەکوو دەرفەتێك دەزانی بۆ ئەوەی ئەو جیلەی ئەوان بتوانن بە ئازادی لە وڵاتەکەی خۆیاندا بژین. بەڵام ئێستا ئەمە وەك خەون و خەیاڵێکی دوور دەبینرێت. لەو کاتەی کە لە ٢٠٠٥وە وازم لە ژیانی ئەکادیمی لە هاروارد هێنا و گەڕامەوە بۆ کەنەدا بۆ ئەوەی بەشداریی سیاسەت بکەم... دەستم کردووە بەو پرسیارانەی کە پێشتر لە گۆشە و کەناری سیاسەتەوە دەمکردن و شیکردنەوەی رووداوەکانم دەکرد و بەوجۆرەش چاودێریی رووخانی عێراق'م کرد. لەوەشەوە تێگەیشتم کە بۆ ئەوەی بتوانی شیکردنەوەیەکی گونجاو و لە جیی خۆی لە سیاسەتدا بکەی، پێویستە بزانی کە دان بە هەڵەکانیشدا بنێی. جارێك ئیسایا بەرلین'ی فەیلەسووف باسی لەوە کردبوو کە کێشەی ئەکادیمی و شیکارەکان لەوەدایە کە زۆرجار بیر لەوە دەکەنەوە دیدگاکانیان زیاتر لەوەی کە راست بێت سەرنجڕاکێش بێت. زۆرجار سیاسییەکانیش بە ئەندازەی کەسانی پسپۆڕ و بیرمەند لەگەڵ بیروبۆچوونەکاندا سەروکاریان هەیە، بەڵام ئەوان هەرگیز ریسکی ئەوە ناکەن کە تەنها لەبەر سەرنجڕاکێش بوون بیروبۆچوونێك قبووڵ بکەن. ئەوان ناچارن لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەو بیروبۆچوونانەدا کە راست بن و بتوانرێت لە ژیاندا جێبەجی

بکرێت، سەروکاریان هەبێت. لە ژیانی ئەکادیمیدا بیروبۆچوونە هەڵەکان تەنها هەڵەن و یاری کردن بە شتە زیادەکان وەك گەمە و کات بەسەربردن وایە، بەڵام لە ژیانی سیاسیدا بیروبۆچوونە هەڵەکان دەتوانن ژیان ملیۆنان کەس نابووت بکەن و ئەوانەشی کە بەکەڵك نایەن دەتوانن چەندین سەرچاوەی بەنرخ بە هەدەر بدەن. بەرپرسیاریی بیروبۆچوونەکانی کەسێکی رۆشنبیر تەنها تا ئەو ئاستەیە کە ئەنجامەکانی بەرەو کوێی دەگەیەنێت، بەڵام بەرپرسیاریی دیدگاکانی سیاسەتمەدارێك لەوەدایە کە نەتوانێ ئەنجامەکانی جڵەو بکات و نەتوانێ رێگا لە زیانەکانی بگرێت. من دەرکم بەوە کرد کە شیکردنەوەیەکی باش لە ناو سیاسەتدا جیاوازە لەو شیکردنەوەیەی کە لە دنیای رۆشنبیریدا بە باش لە قەڵەم دەدرێت. لە دنیای رۆشنبیریدا هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەکان زیاتر پەیوەندی بە گشتاندن و وەرگرتنی بیرۆکەیەك بە نموونە لە شیکردنەوەیەکی گشتی سەرچاوە دەگرێت، بەڵام لە سیاسەتدا هەر شتیك هەر ئەو شتەیە کە خۆی هەیە و لەوەش زیاتر هیچی دیکە نییە. شتە تایبەتەکان لە شتە گشتییەکان گرنگترن و تیۆری ریگاکان دادەخات. ئەوەی کە لەنێو سیاسییەکاندا وەك پیوەری هەڵسەنگاندنێکی باش سەیر دەکرێت زیاتر هەستکردنە بە راستبوونەکەی... سیاسییەکان ناتوانن ئەوە لەبەرچاو بگرن کە خەیاڵەکانی دنیای دەروونی خۆیان ئەوان داپۆشێت. ئەوان ناتوانن ئەو دونیایەی کە دەیانەوێ ببینن، لەگەڵ دونیای واقیعدا تێکەڵ بکەن. ئەوان ناچارن عێراق یان هە شوینێکی دیکە وەك چۆن هەیە ببینن.

من وەکوو کەسێك کە لە هاروارد بووم، ئەوەم زانیبوو کە لەنێو هەموو دامودەزگا دەستە بژێرییەکاندا لەوانەبە هەستکردن بە راستیی شتێك لە ئارادا نەبێت. ئەمە بە هەموو واتایەکی خۆیەوە توانا و بەهرەیەکی بازاڕییە. شۆفێری پاسەکان دەتوانن بەشێوەیەکی زۆر زیاتر لەوانەی خاوەنی خەڵاتی نۆبڵن، راستیی بیروبۆچوونی خۆیان سەبارەت بە شتەکان بخەنەڕوو. تاقە رێگەی پێشخستنی تێگەشتنمان لە راستییەکان ئەوەیە کە هەموو رۆژێك رووبەڕووی دنیا ببینەوە و بزانین کە لەوانەیە چی ببێت یان چی نەبێت و بەوجۆرە لە هەڵەکانی خۆمانەوە فێر ببین. لەگەڵ ئەمەشدا سەرەڕای هەبوونی ئەزموونێکی زۆر، لەوانەبە لە ژیان و سیاسەتدا تووشی هەڵە بین. ئەزموون دەتوانێت بڕیاربەدەستان مەحکوومی ئەو رێگەچارانە بکات کە رزاون و کۆن بوون و چاویان لەبەرامبەر ئەو رێگەچارانە کوێر بکات کە تا ئەوکاتە تاقی نەکراونەتەوە. وەکوو کەسێك کە زانستی سیاسیم فێرکردووە، دەتوانم بڵێم ئەو دیسیپلینە شتی زیاتری پێیە. لە سیاسەتی پراکتیکیدا زانستێك بۆ بڕیاردان نییە. هەڵسەنگاندنەکانی رۆژانەی سیاسەتمەدارێك پەیوەندیی بە مرۆڤەکانەوە هەیە. پێویستە متمانە بە کێ بکات یان پێویستە گوێ لە کێ بگرێت؟ کێشەی وەفاداری هەموو رۆژێك سەر هەڵدەدات؛ کێ خیانەت دەکات و کێ لە تەنیشتماندا رادەوەستێت. بۆ ئەوەی بتوانی هەڵسەنگاندنێکی باشت لەم روانەوە هەبێت، پێویستە خاوەنی هەستێکی راستیی بەهێز

بیت و سەبارەت بە مرۆڤەکان خاوەنی هەندێك هەست و درك بیت کە زۆریش زانستییانە نین. ئەم هەستکردن بە راستییە تەنها ئەو هەستە نییە کە سەبارەت بەوە بێت کە دنیا چییە بەڵکوو پەیوەندیی بەوەشەوە هەیە کە دەکرێت دنیا چۆن بێت. سیاسەتمەدارە گەورەکانیش وەکوو هونەرمەندە گەورەکان ئەو دەرفەت و ئیمکانانە دەبینن کە کەسانی دیکە نایانبینن و لەدوای ئەوەش هەوڵدەدەن ئەوانە بۆ راستی بگۆڕن. پێویستە سیاسییەك خاوەنی ئەو هەستە بێت کە بزانێت چ کاتێك خۆی دەردەخاتە پێش و چ کاتێك لە شوینی خۆیدا دەوەستێت. بیسمارك وتبووی ئیرادەی بڕیاری سیاسی لەوەدایە کە مرۆڤ بەر لە هەموو کەسێك گوێ لە ناڵی ئەسپی مێژوو بگرێت. کەم کەسمان دەتوانین گوێمان لە هاتنی دەنگی ئەسپەکان بێت. سەرۆك وەزیرێکی ئینگلیز لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە چ شتێك ئەرکەکەی قورستر کردووە، بە نیگەرانییەوە وتوویەتی؛ رووداوەکان رۆڵە!

پێویستە کەسی سیاسی بتوانێت توانای دەستپێشخەری خۆی لەبەرامبەر رووداوە چاوەڕواننەکراوەکان دەربخات و تا ئەو جێگایەی کە دەکرێت خوێنسارد بێت... لەوانەیە دەستپێشخەری نەتوانێت رێگا لە شکست بگرێت. زۆرجار یارییەکە بە فرمێسك رژان کۆتایی پێدێت. زۆرجار بەهۆی ئەوەی کە سیاسییەکان دوورن لە هەستیکی ئاسایی لەبارەی مرۆڤەکان و زانیاریی هەڵەیان لایە، پێگەی خۆیان لە دەست دەدەن و ژیانی سیاسییان بە شیوەیەکی خراپ کۆتایی پێدێت...

لە سیاسەتدا فێربوونی شکست بە ئەندازەی بەکارهێنانی سەرکەوتن گرنگە. سامۆئێل بەکت لە رێگەی وتەکانی خۆیەوە کە دەڵێت؛ شکست بخۆ و زیاتر شکست بخۆ، دەیەوێت ئاماژە بەو پێداگرییە بکات کە پێویستە لە ناو هونەری سیاسەتدا هەبێت. چرچل و دی گۆڵ... بیروبڕوای خۆیان سەبارەت بە بڕیارەکانیان لە دەستنەدا. لەبەر ئەوەی کە دەیانویست چاوەڕوانی هەڵسەنگاندنی مێژوو بن سەبارەت بە بڕیارەکانی خۆیان، ئێستا وەك کەسانێکی گەورە سەیر دەکرێن. وا دیارە جۆرج دەبلیۆ بوش، سەرۆکەکەی ئێستاش هەمان بیروبڕوای هەیە سەبارەت بەوەی کە رۆژێك مێژوو بڕیارەکانی ئەو بە هەق دەردەخات... لە سیاسەتدا هیچ شتیك تاکەکەسی نییە، چونکە سیاسەت بۆ خۆی نمایشێکە. رەفتارکردن بەو شێوەیەی خۆت وا دەرخەیت کە هەستێکت هەیە، سەرەڕای ئەوەی کە لە راستیشدا ئەو هەستەشت نەبیت بەشێکی ئەرکەکەیە. نوێنەرانی ئەنجومەنی یاسادانان لە دانیشتنێکدا سووکایەتی بە یەك دەکەن، بەڵام دوابەدوای دانیشتنەکە پێکەوە لە بارێکدا دەخۆنەوە و ئەمەش بووە بە دیمەنێکی ئاسایی. ئەم دیمەنە دووڕووەی کە ژیانی گشتی درووستی کردووە، لە ژیانی تایبەتدا مومکین نییە... لەنێو هاوڕێکان و لەنێو بنەماڵەدا... دەتەوێ چی بڵێی زۆر گرنگترە لەوەی کە چیت گوتووە. بەڵام لێبوردنێکی وەها لە سیاسەتدا جێگەی نابێتەوە. لە ژیانی گشتیدا زمان چەکێکی جەنگە و لە هەلومەرجە توندەکانی نەبوونی متمانەدا بەکار

دەهێنرێت. تاقە شتی گرنگ لێرەدا ئەوە نییە کە دەتانەوێ چی بڵێن، بەڵکوو ئەوەیە کە دەیڵێن. مەیدانی سیاسەت دنیایەکی گوتاری شێتانەیە. لەوانەیە لە ڕێی جیاوازی نێوان ئەو شتەی کە دەتانەوێ بیڵێن و ئەو شتەی کە گوتووتانە، درزێکی بچووك لە زرێکەتاندا درووست بێت و ئەو درزەش گەورەتر بێت و شمشێرەکە بگاتە جەستە و ئێسقان. لە ژیانی تایبەتدا باجی تاوانەکامان دەدەین، بەڵام لە ژیانی گشتیدا باجی هەڵە و کەموکوڕییەکانی سیاسییەك بەر لەخۆی لەلایەن کەسانی دیکەوە دەدرێت. هەڵسەنگاندنی باش واتای ئەوەیە کە بزانیت چۆن ئەو کەسانەی کە باجی بڕیارەکانتان دەدەن، بە بەرپرسیار لە قەڵەم بدەی... پرەنسیپە جێگیرەکان گرنگن. هەندێك ماڵ و موڵك هەن کە مامەڵەیان پێوە ناکرێت و هەندێك سنوور و هێڵیش هەن کە نابەزێنرێن. پێویستە هەندێك لە مرۆڤەکانیش بەهیچ جۆرێك خیانەت نەکەن. بەڵام بیروبۆچوونە جێگیر و دوگماتیکەکان بەگشتی دوژمنی هەڵسەنگاندنێکی باشن. بڕواکردن بەوەی کە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا خزمەتی پلانی خوداوەند بۆ فراوانکردنی ئازادیی مرۆڤەکان دەکات، ڕێگا لە بیری کراوە دەگرێت... هەڵسەنگاندنی باش لەنێو سیاسەتدا کارێکی تێکەڵ و پێکەڵ و ئاڵۆزە و ئەمەش واتای هاوسەنگ کردنی سیاسەتە لە ڕێگای هەندێك ڕێکەوتنەوە کە زۆرجار تەواو نین و کەسانێك، لەسەرووی هەموویشیانەوە خۆتان بێ هیوا دەکات... ئەو کەسانەی کە دەتوانن سەبارەت بە عێراق هەڵسەنگاندنی باش بکەن... لە ڕاستیدا لە ئێمە زیاتر زانیارییان سەبارەت بە عێراق نییە. ئەوانیش وەکوو هەموو کەس بە پشتبەستن بە زانیاریی هەواڵگری هەڵە و هەروەها بە زانیاری کەم سەبارەت بە مێژووی دابەشبوونی مەزهەبی عێراق ڕەفتاریان کرد. ئەوەی کە نەیانکرد ئەمە بوو؛ نەیانتوانی ئارەزوو و ویستەکانی خۆیان بخەنە شوێنی ڕاستییەکان. سەرۆك بوش لەبەر ئەوەی بڕوای بە بۆچوونەکانی خۆی هەبوو، پێیوابوو هەموو ئەو کەسانەی کە لە ناوچەکەدا هەن، بڕوا بەو بۆچوونانەی ئەو دەکەن. بەڵام ئەوان پێیان وانەبوو. ئەوان بڕوایان بەوە نەکرد کە دەوڵەتێکی ئازاد لەسەر بنەمای تیرۆرێکی پۆلیسی کە ٣٥ ساڵی خایاندووە، بونیاد بنرێت. ئەوان بڕوایان بەوە نەکرد کە دەوڵەتی ئەمریکا بتوانێت ئاراستە بە سیاسەتی وڵاتێکی دوور بدات کە زۆربەی ئەمریکییەکان زانیاری کەمیان لەسەری هەیە. ئەوان بڕوایان بەوە نەکرد کە ئەمریکا چۆن لە بۆسنا و کۆسۆڤۆ بەرگری لە مافی مرۆڤ کرد، لە عێراق‌یش بە هەمانشێوە بجوڵێتەوە و خۆیان لە هەموو هەڵە و کەموکوڕییەکان دزییەوە. منیش بەشێك لەو هەڵانەم کردبوو و هەندێك هەڵەی تایبەتیی خۆشم بەوانە زیادکردبوو. ئەو وانەیەی کە بۆ داهاتوو دەرمخست ئەوە بوو کە کەمتر بکەومە ژێر کاریگەریی ئەو مرۆڤانەی کە پێیان سەرسامم و هەروەها کەمتر بکەومە ژێر کاریگەریی ئارەزوو و ویستی ئەو عێراقی‌یانەی کە لە دەرەوە دەژین.

لە ساڵی ١٩٩٢دا چوومە باکووری عێراق. ئەوەم بە چاوی خۆم بینی کە سەدام حسێن چی بە کوردەکان

کردووە. لەو رۆژەش بەدواوە بڕوام بەوە کرد کە پێویستە سەدام حسێن بڕوات. متمانەی تەواوم بە ئەزموونی شەخسیی خۆم هەبوو. هەر لەبەر ئەوە، هەستەکانم پرسیارە سەرەکییەکانیانی خستە لایەك و منیان بەرەو ئاراستەیەکیتر برد. دەکرا ئەو کورد و سوننە و شیعانەی کە سەدام حسێن بە زۆری تیرۆر پێکەوە هێشتبوونییەوە، لە هەلومەرجێکی ئاشتیدا پێکەوە بهێڵرێنەوە؟... ئەوەی کە دەردەکەوێت ئەوەیە کە لە سیاسەتدا هەڵسەنگاندنی راست پەیوەندی بەوەوە هەیە کە مرۆڤ خۆی ببێتە دادوەری رەخنەگری خۆی. سەرۆك بوش نەك تەنها زەحمەتی نەدا بە خۆی کە لە عێراق تیبگات، بەڵکوو هەوڵی تیگەیشتن لە خۆیشی نەدا. دەبوو زەنگەکانی ئەو هەستکردن بە راستییەی هەبێت کە لە کارەسات رزگاری بکات و پێی بڵێت کە پێویستە چی بکات. بەڵام گومان هەیە لەسەر ئەوەی کە تەنها بۆ یەك جاریش ئەو زەنگە ئاگادارکەرەوانە لە لای ئەو لێدرابن. ژیانێکی پڕشکۆی هەبوو و لەو جۆرە ژیانانەشدا زەنگە ئاگادارکەرەوەکان دەنگیان لێوە نایەت..."

دەبێ دان بەوەدا بنێم کە رەخنەکانی کەنعان مەکییە و میشل ئیگناتیڤ لە خۆیان، زیاتر لە پاساوەکانی هابرماس کاریگەرییان لەسەر من دانا. هەندێك شتیان باسکردبوو کە نەمدەتوانی هیچ نارەزاییەکم لێیان هەبێت، بەڵام ئەوان لە روانگەی بیروبۆچوونی لیبراڵی خۆرئاوایی یاخود لە روانگەی کەسایەتییەکی عەلمانی و لیبراڵی عێراقی'یەوە سەیری رووداوەکانیان دەکرد. هەرچەندە خاڵێکی کەم هەیە لە بوچوونەکانیاندا کە بتوانی رەخنەی لێ بگری، بەڵام ئەو روانگەیەی کە من لەوێوە سەیری عێراق'م دەکرد لەبنەڕەتدا پەیوەندی بە تێگەیشتنم سەبارەت بە مێژوو و داهاتووی کوردەکان و تورکیا هەبوو. ئەم پێوەرانەی کە لە خوارەوە باسیان دەکەم لە بیروبۆچوونەکانمدا نەمگۆڕین و نەگۆڕان؛

١. لەگەڵ رووخانی سەدام بەربەستێکی گەورە لەبەردەم رەوتی مێژوو لادەبرێت و بەوجۆرەش مێژوو بە رەوتی ئاسایی خۆیدا دەڕوات.

٢. جەنگی عێراق دەیتوانی رزگاریی تەواوەتیی کوردەکان لە دەسەڵاتێکی توندی ناوەندی نەتەوەگەرای عەرەبی لە بەغدا بەدی بهێنێت و ئەو شتەش کە بۆ کوردەکان باش بێت لە پلانێکی ستراتیژیدا پێویستبوو بۆ تورکیا'ش باش بێت.

٣. لەگەڵ جەنگدا، لەبەردەم تورکیا ئاسۆی گونجاو و نوێ دەکرێتەوە بەمەرجێك کە بتوانێ بەشێوەیەکی باش هەڵسەنگاندنیان بۆ بکات.

من بڕوام وابوو کە لە روانگەیەکی رەوشتی و مرۆییەوە جەنگی عێراق هیچ لایەنێکی نیە کە بتوانی پاساوی بۆ بێنیتەوە و بەرگری لێ بکەیت، بەڵام نابێ ئەوەش فەرامۆش بکرێت کە سەدام لەکاتی خۆیدا ١٨٢هەزار کورد و دەیان هەزار شیعەی کوشتبوو. بۆیە پێموابوو لە ناوبردنی رژێمێکی وەك رژێمی سەدام

کە هیچ باکی لە قەتڵوعام و کوشتوبڕ نیە و هیچ سنوورێك بۆ سیاسەتە ستەمکارانەکانی خۆی دانانێت، پێویستییەکی ئەخلاقی و مرۆییانەیە و بەرگریم لەو بۆچوونەش دەکرد. هەرچەندە کە بتوانیت پاساوی بەهەق و بەواتا بهێنیتە سەرزمان، بەڵام کارێکی ئاسان نەبوو کە بەرگری لە جەنگی عێراق بکەیت.

ساڵانێك دوای جەنگ، تەنانەت تووبا'ی هاوسەریشم کە زۆر بە باشی دەیزانی چی بە چییە و ئاگای لە هەموو رووداوەکان بوو و لە زۆربەی بابەتەکاندا پشتیوانی سەرەکیی من بوو، سەبارەت بە جەنگی عێراق بەپێچەوانەی من بیری دەکردەوە. لەدوایین رۆژەکانی٢٠١١ و رۆژە سەرەتاییەکانی٢٠١٢دا پێکەوە لە ڤێتنام بووین. لە شاری سایگۆن پایتەختی ڤێتنام'ی باشوور کە بەر لە یەکگرتنەوەی ڤێتنام، لەدوای رزگاریی ١٩٧٥وە ناوی هۆچی مین'ی لێ نرابوو، پێکەوە دەربازی ساڵی نوێ بووین. لەدوایین رۆژەکانی ساڵی٢٠١١دا چووینە ڤێتکۆن لە٧٠ کیلۆمەتری باکووری خۆرئاوای سایگۆن و ئەو شوێنانەمان بینی کە تێیدا گورزی گورچکبڕ لە ئەمریکاییەکان درابوو و هەروەها ئاسەوارە دەگمەنەکانی جەنگی رزگاری گەلێکمان بینی کە بریتیبوون لەو تونێلانەی سێ ریز بەسەر یەکەوە لە ژێر عەرزدا هەڵکۆڵرابوون و بە توونێلەکانی چووچی ناو دەبران. دواتر سەردانی مۆزەخانەی ئاسەوارەکانی جەنگی سایگۆن'مان کرد. یەکەم رۆژی ساڵی٢٠١٠شمان لە گەرووی مەکاگۆن بەسەر برد کە تێیدا جەنگیکی بێئامان روویدابوو. ئەو جەنگە ئەفسانەییەی ڤێتنام کە سێ ملیۆن کەسی کردبووە قوربانی کە دوو ملیۆنیان خەڵکی مەدەنی بوون و لەسەردەمی گەنجێتی ئێمە روویدابوو، وەك بەشێك لە ژیانی ئێمەی لێهاتبوو. لە راستیدا لە ڤێتنام'دا بەنێو مێژووی شەخسیی خۆماندا دەگەڕاین. لە ماوەی ئەو ٣٥-٣٦ ساڵەی کە لەدوای جەنگ تێپەڕ ببوو، ڤێتنام'یش هاوشێوەی پارتی کۆمۆنیستیی چین گەشەی بە ئابووری بازاڕدا و بەو هۆیە و هەروەها لەبەر ئەوەی کە زیاتر لە ٦٥٪ی دانیشتووانەکەیشی گەنج بوون، تا ئەندازەیەك هیچ ئاسەوارێك لە جەنگ لەو وڵاتە نەمابووەوە. بەڵام ئێمە لە ڤێتنام لەنێو ئەو جەنگە دەژیاین کە بیرەوەرییە فەرامۆش نەکراوەکانی کاتی گەنجیی خۆمانی تیدا بوو، بۆیە پرسی عێراق کەوتە بەرباس. کاتێك لە مۆزەخانەی جەنگ لە سایگۆن سەیری ئەو ستەمە زۆرانەمان دەکرد کە ئەمریکییەکان دەرهەق بە ڤێتنامییەکان کردبوویان، تووبا چاوی پڕ بوو لە فرمێسك و باسی جەنگی عێراقی کرد و رەخنەی لە من گرت و وتی:"سەیری ئەو وێنانە بکە و بیر لە هەڵوێستەکانی خۆت لەکاتی جەنگی عێراق'دا بکەرەوە. هیچ نەبێ لەمەودوا بەرگری لە جەنگی عێراق مەکە ئیتر!"قسەکانی بەم رەخنانە دەستی پێکرد و نەیبڕینەوە.

جەنگی ڤێتنام، بۆ جیلی ئێمە لە دنیا و لە تورکیا پێگەیەکی تایبەتی هەبوو و بۆ کەسێکی وەك منیش زۆر تایبەتتر بوو. لە ساڵی ١٩٧٠ بە کەسایەتیی هۆچی مین سەرکردەی ڤێتنامی باکوور زۆر سەرسام بووم و دوای ئەوەی کە مرد، من وەك سەرۆکی کۆمەڵەی خوێندکارانی زانستە سیاسییەکان لە ئەنقەرە مەراسیمێکی

بیرهێنانەوەم بۆ ڕێکخست. هەر لەو ڕۆژانەدا لەنێو دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی دۆستایەتی ڤیتنام - تورکیا جێی خۆم گرت و لەبەر ئەوەش بەپێی یاسای سزای تورکیا بە تۆمەتی دامەزراندنی کۆمەڵەیەك لە دەرەوەی ئامانجە نەتەوەییەکان دادگایی کرام. ئەو ساڵانەش کە لەنێو جووڵانەوەی رزگاریی فەلەستین'دا بووم (١٩٧-١٩٧٣) رادیۆیەکی بچووکم دەخستە پاڵ گوێی خۆم و ئاگام لە هەموو هەواڵەکانی تایبەت بە جەنگی ڤێتنام و ورد و درشتی رووداوەکانی ئەو وڵاتە دەبوو. لەو کاتانەدا تا ئەندازەیەك هەموو ئەو بڵاوکراوانەی شام و بەیروت کە باسی ڤێتنام'یان تێدا بوو، دەستم دەکەوتن و بەوجۆرەش سەرەڕای ئەوەی کە ڤێتنام'م نەدیبوو، تا ئەندازەیەك بست بە بستی ئەو وڵاتەم دەزانی. ئەو شتانەی کە لە ڕۆژانی یەکەمی ساڵی ٢٠١٢ لە ڤێتنام بینیم، منیان بردەوە بۆ ڕۆژانی شۆڕشگێڕی لەسەردەمی لاوی و تووڕەیی و نەفرەتی منی لە ئەمریکا زیاتر کرد. هەر لەبەر ئەوەش، ئەو رەخنەیەی کە تووبای هاوسەرم سەبارەت بە جەنگی عێراق لە منی گرت، بەلامەوە زۆر قورس بوو.

لە ڤێتنام تووڕەیی و بێزاریی منیش لە ئەمریکییەکان زیاتر بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پاشەکشەم لە بۆچوونەکانی خۆم سەبارەت بە عێراق نەکرد. لەکاتی گەڕانەوەماندا بۆ هانۆی پایتەخت کە کاتی خۆی لەلایەن ئەمریکییەکان'ەوە بە خەستی بۆردومان کرابوو، ئەو مشتومڕەی کە لەگەڵ هاوسەرەکەم سەبارەت بە جەنگی عێراق کردبوومان کپ بووەوە. بەڵام کاتێك کە لە هانۆی یاخود لە ڤێتنام بەرەو کەمبۆدیارۆیشتین، جارێکی دیکە مشتومڕەکە سەری هەڵدایەوە. تاوانەکانی ئەمریکا لە هێندوچین تەنها بە ڤێتنام'ەوە سنووردار نەبوون. بەئەندازەیەک کە بتوانێ هاوسەنگیی ژینگەیی کەمبۆدیابگۆڕێت، ئەو وڵاتەشی بۆردومان کردبوو. بەڵام گەورەترین تاوانێك کە لە کەمبۆدیائەنجامی دابێت ئەوە بوو کە پشتیوانیی لە خمرە سوورەکان بەسەرۆکایەتیی پۆل پووت کردبوو کە نوێنەرایەتیی ئەندازیارییەکی وەحشیانەی کۆمەڵگایان دەکرد. لەنێوان ساڵانی ١٩٧٥-١٩٧٩دا لە کۆی ٧ملیۆن خەڵکی کەمبۆدیانزیکەی یەك ملیۆن و حەوتسەد هەزار کەس لە ئەنجامی سیاسەتی برسی هێشتنەوە و قەتڵوعام کردنی پۆل پووت و خمرە سوورەکان'دا گیانیان لە دەست دابوو. پۆل پووت لە ساڵی١٩٧٩ لە ئەنجامی داگیرکاریی ڤێتنام لەسەر کار لابرا. بەشێك لە ئەندامەکانی خمرە سوورەکان لە دژی پۆل پووت دەرکەوتن و چوونە ریزی ڤێتنامییەکان و ئەوانیش دەسەڵاتیان رادەستی ئەو ئەندامانەی خمرە سوورەکان کرد کە پشتگیرییان لەوان دەکرد. ئەو خمرە سوورانەش کە لە ژێر سەرکردایەتیی پۆل پووت'دا بوون و دەسەڵاتیان لە کیس چووبوو، کشانەوە بۆ ناوچەی جانگلایا لە بەینی کەمبۆدیاو تایلەند و بە پشتیوانیی ئەمریکا و چین و تایلەند، تا کۆتایی ساڵەکانی١٩٩٠ەکان درێژەیان بە جەنگ دا. ئەوکاتەی کە ڤێتنام لە ساڵی١٩٧٩ دا کۆتایی بە رژێمی پۆل پووت هێنا، لەلایەن یەکێتی سۆڤیەت'ەوە پشتیوانی لێدەکرا. ئەمریکا'ش لەبەر ئەوەی کە رکابەریی یەکێتی

سۆڤیەتی دەکرد، بەجۆرێك کە لە مێژوودا نموونەی نەبینرابوو کارێکی شێتانەی کرد و پشتیوانیی لە پۆل پووت و خمرە سوورەکان کرد.

کەمبۆدیالە مێژوودا هەندێك قۆناغی پڕ شان و شکۆی هەبوو. ئاند کۆڕ لەنێوان سەدەکانی٩-١٥دا یەکێك بووە لە ناوەندە پرشنگدارەکانی شارستانی لە دنیا. بۆ ئەوەی هەست بە رۆژانی پڕ شان و شکۆی کامبۆجیای کۆن بکەم، سەردانی ئاند کۆڕ'م کرد. چەند کیلۆمەترێك لە دەرەوەی شاری سییام رێد لە نزیك پەرستگاکانی ئاند کۆڕ'دا لە قاوەخانەیەکی کراوە کەل و پەلی جۆراوجۆریان دەفرۆشت و لە ناو ئەوانەشدا کتێبێکی تایبەت بە کەمبۆدیا هەبوو. کاتێك لەوێ بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کتێبێکی هێنری کام بەناوی"کەمبۆدیا؛ راپۆرتی وڵاتیکی بریندار″م بینی، سەرم سووڕما. بە بێ هێچ دوودڵییەك کتێبەکەم کڕی. هێنری کام هەر شتێکی سەبارەت بە کەمبۆدیا بنووسیبایە، کەفالەتیم دەکرد. چونکە ئەو لە دنیای خۆرئاوادا بە ناوبانگترین پسپۆڕی کەمبۆدیابوو. لە مانگی یەکی ساڵی ١٩٨٨، لەدوایین رۆژەکانی بلۆکی سۆسیالیزمدا بۆ نووسینی زنجیرە بابەتێك سەردانی یەکێك لە وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵات'م کرد بەناوی مەجارستان و لە بووداپێشتی پایەختی ئەو وڵاتە لەگەڵ هێنری کام ئاشنا بووم. رێنیشاندەرە مەجاری'یەکەم ویستبووی هۆتێلی هیلتۆن کە لە یەکێك لە پڕ شان و شکۆترین شوێنەکانی بوودایێشت بینا کرابوو، پیشانی من بدات. لەنێو قەڵای بوودینی عوسمانییەکان'دا بووین. ئاماژەی بۆ کەسێکی بەتەمەن کرد کە لە لۆبیی هۆتێلەکە دانیشتبوو و بە جۆش و خرۆشێکەوە وتی ئەوە هێنری کامە. ناوی ئەو کەسە هیچ گوزارشتێکی بۆ من نەبوو. رێنیشاندەرە مەجاری'یەکەم سەری سووڕما و وتی؛"چۆن ایناسیت؟ ئەو رۆژنامەنووسێکی گەورەیە کە خەڵاتی پۆلیتزەری بردۆتەوە. فیلمی کیڵینگ فێڵدزت سەبارەت بە کەمبۆدیانەبینیوە؟ لە فیلمەکەدا زوو بە زوو ناوی هێنری کام دەهێنرێت...″رۆیشتم و خۆم بە هێنری کام ناساند. بەئەندازەیەک کە چاوەڕوانیم نەدەکرد کەسێکی خاکی بوو. پێشنیاری پێ کردم کە ئەگەر ئیشم نەبێ، ئێوارە پێکەوە خواردن بخۆین. بۆیە ئێوارەیە جارێکی دیکە سەردانی هۆتێل هیلتۆن'م کرد تا لەگەڵ هێنری کام خواردن بخۆم. لەو ئێوارە فەرامۆشنەکراوەی بۆداپێشت باسی توونا و پردی مێژوویی لانچیدی'مان کرد کە بوودا و پێشت بەیەکەوە دەبەستێتەوە. هەورووەها لەکاتی قسە و باسەکانیشماندا سەیری دیمەنی دەگمەن و جوانی مەجارستان و بینای پەرلەمانی ئەو وڵاتەمان دەکرد و لەسەر زۆر بابەت پێکەوە قسەمان دەکرد. هێنری کام جوولەکەیەکی ئەڵمانی بوو کە ساڵی ١٩٢٥ لە پۆلۆنیا لە شاری بێرسلاو لە دایك ببوو. لەکاتی یەکەمین دەسەڵاتداریی هیتلەر'دا لەوێ ژیابوو و لەسەردەمی نەوجەوانیدا توانیبووی بەرەو ئەمریکا هەڵبێت. وەك پەیامنێریك لە رۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز سەرکەوتنی گەورەی بە دەست هێنابوو و بەهۆی هەواڵەکانی سەبارەت بە کەمبۆدیالە ساڵی ١٩٧٨دا گەورەترین خەڵاتی رۆژنامەوانیی ئەمریکا'ی بەدەستهێنا کە خەڵاتی پۆلیتزەر بوو. دیارە

ناسینی هێنری کام و قسە کردن لەگەڵ ئەو، بە بێئەوەی قسە و باس بچێتە سەر کەمبۆدیاشتێکی نامومکین بوو. بە دوورودرێژی باسی کامبۆجیای بۆ کردم. لەو شەوەش بەدواوە جارێکی دیکە هێنری کام م نەبینی و نەمزانی لە کوێ دەمێنێتەوە. نزیکەی چارەکە سەدەیەکیش دواتر کتیبەکەیم لە کەمبۆدیادەستکەوت. ئەو کتێبەی هێنری کام یش یەکەم کتیبێك بوو کە لە ساڵی ٢٠١٢دا دەستم بۆ برد کە بیخوێنمەوە. لە یەك شەوی کامبۆجیا شدا نزیکەی ٢٨٢ لاپەڕەیم بە ئاسانی خوێندەوە. بە جەستە لە کەمبۆدیابووم بەڵام ئەم دێڕانە بیروبۆچوون و سەرنجەکانی راکێشایەوە سەر جەنگی عێراق:"دنیای خۆرئاوا بە پێشەنگایەتی ئەمریکا پشتیوانی لە ئیدیعاکانی رژێمی پۆل پووت دەکەن کە پێیانوایە بەهۆی پێشێلکردنی یاسا و رێسا نێودەوڵەتییەکانەوە لەسەر کار لابراوە. ئەمریکا لەنێو دووڕییانەی پشتگیری کردن لە یەکێك لە ستەمکارترین و خوێنڕێژترین رژێمەکان لەدوای هیتلەر و ستالین لەگەڵ رژێیمێکی کارتۆنی کە لەلایەن داگیرکارێکەوە دانراوە، ماوەتەوە و دواجار پشتیوانیی لە رەوایی رژێمە زاڵمەکە کردووە. بۆ دیموکراسی خۆرئاوا کە بەردەوام باس لەبەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤ دەکات، گرنگیدان بەسەروەری لە جیاتی رەوشتبەرزی لە ئاستی نێودەوڵەتیدا مایەی شەرمەزارییە. ڤێتنام بۆ رزگارکردنی کەمبۆدیانەجوڵابووە و لەبەر ئەوەش شایانی هیچ جۆرە پەسندانێك نەبوو. بەڵام ئەوجۆرەداگیرکارییە دەرفەتێکی گەورەی رەخساند تا کامبۆجییەکان تۆزێك لە ئازادی و مافەکانی خۆیانیان دەست بکەوێت کە پێشتر بە بەردەوامی پێشێل دەکران. بەشێکی زۆر لەو کامبۆجییانەی کە وا بیریان دەکردەوە ژیانیان بەرەو کۆتایی دەچوو، دەرفەتێکیان بۆ پەیدابوو کە لە ژیاندا بمێننەوە. هەرکەسێك لەدوای داگیرکارییەکەی ڤێتنام سەردانی کامبۆجیای بکردایە نەیدەتوانی چاوپۆشی لەو راستییە بکات. ئەمە واتای ئەوە نادات کە کامبۆجییەکان سوپاسگوزاری ڤێتنام بن و پەشیمان ببنەوە لەو بیرۆکەیە کە ڤێتنام وەك دوژمنی مێژووی خۆیان سەیر بکەن. ئەوان بە ئازارەوە هەستیان بەوە دەکرد کە بە ناچاری لەنێو هەڵبژاردنی ئەو ئازادییەی لێی بێبەش کراون لەگەڵ رزگارکەرەکانیاندا ماونەتەوە. دەمتوانی بە ئاسانی خۆم بخەمە شوێنی ئەوان. لە وڵاتەکەی خۆمدا لە ئەڵمانیا، ساڵانێك چاوەڕوانی ئەوە بووم وڵاتێکی دیکە بێت و من لە دەستی بەڕێوەبەرێکی ستەمکار رزگار بکات. بەڵام بۆ رزگاربوون و کۆتاییهاتن بە دیکتاتۆرییەکەی هیتلەر، پێویستبوو جەنگی جیهانیی دووەم روویدات. ئیدی ئەمین دیکتاتۆری ئۆگاندا لە ئەنجامی داگیرکارییەکی تانزانیا لەسەر کار لابرا و کەم لایەن هەبوو کە دژ بەمە کاردانەوەی پیشاندابێت. یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٥٦دا مەجارستان و لە ساڵی ١٩٦٨دا چیکۆسلۆڤاکیای داگیرکرد و لە جیاتی حکوومەتە پڕ جەماوەرەکانی ئەو وڵاتانە، حکومەتی کارتۆنی و لایەنگری خۆی دانا. دیمۆکراسییەکانی خۆرئاوا بۆڵەبۆڵیان کرد، بەڵام دواتر ئەنجامەکانیان قبووڵ کرد. سیاسەتی بابەتییانە، پراگماتیزم یاخود هەر ناویکی دیکەی لێ دەنێن بینێن، لە راستیدا پێویستی ناچاربوون بە ژیان لەگەڵ یەکێتییەکی سۆڤیەت ی

بەهێز بووە هۆی ئەوەی کە بەشێوەیەکی ئاشکرا پرەنسیپی سەروەی پێشێل بکرێت. لە رابردووی نزیکیشدا وەك ئەوەی کە حکومەتەکانی ئەمریکا و ڤێتنام'یش دەریانخستووە، مافی هەبوونی کامبۆجییەکان لەوە گرنگتر نەبوو کە پرەنسیپێك پشتگوێ بخرێت.″(ل۱٥۲-۱٥۳)

باسکردن لە مافەکانی عێراق و پرسی سەروەریی ئەو وڵاتە جگە لە رەوایی پێدان بە تاوانەکانی رژێمی سەدام شتێکی دیکە نەبوو. سەدام زیاتر لە هەر رژێمێکی ستەماکاری دیکە سیاسەتیکی پەیڕەو دەکرد کە تەنانەت بە نیسبەت کوردەکان'هوە خۆی لە قەرەی پاکتاوکردنی نەژادی دەدا. پاش ئەوەی کە شای ئێران و کسینجەری ئەمریکا پشتیان لە راپەڕینی کوردەکانی عێراق بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا'ی بارزانی کرد، رژێمی بەغدا سەدان هەزار کوردی لە خاکەکانی خۆیان وەدەرنا و هەزاران کەسیشی لێ دەستگیرکردن. لەکاتی جەنگی ئێران - عێراق'دا، بەتایبەتی لە ساڵی ۱۹۸۸دا، لە چوارچێوەی پرۆسەکانی ئەنفالدا ۱۸۲هەزار کورد کوژران و ۳۸۰۰ گوند چۆڵ و خاپوور کران. لە ۱۹۸۸/۳/۱٦دا هەڵەبجە بە گازی ژەهراوی بۆردومان کرا و بەوجۆرەش بووە سیمبولی ئەو سیاسەتە پاکتاوکردنە نەژادییەی کە سەدام دژ بە کوردەکان پێرەوی دەکرد. لەدوای قەتڵوعامەکەی هەڵەبجە، منیش بەشداریی سەردانێکی ئۆزال'م بۆ بەغدا کردبوو. دانوستانەکەی زۆر بە گرژی و ناکۆکی تێپەڕ ببوو. هیچ زانیارییەك سەبارەت بە دانووستانەکانی ئۆزال- سەدام ئاشکرا نەدەکران، بەڵام نوزهەت قاندەمیر باڵیۆزی گەورە و راوێژکاری وەزارەتی دەرەوە، لە هۆتێل رەشید'دا بە مەرجێك قسەکانی نەنووسمەوە و بڵاویان نەکەمەوە، هەموو وردەکارییەکانی تایبەت بە دانووستانەکانی بۆ باسکردبووم. بە وتەی قاندەمیر لە بەشێکی دانووستانەکاندا ئۆزال قسەی هێناوەتە سەر قەتڵوعامەکەی هەڵەبجە کە هێشتا دووکەڵەکەی بە ئاسمانەوە دیاربوو و سەدام'یش لە وەڵامدا وتبووی؛″خیانەتکارانی نیشتمانمان سزا دا″و بەوجۆرەش سەری بابەتەکەی داخستبو.

لە راستیدا رووداوەکانی بۆسنا و هەرسك، کۆسۆڤۆ و عێراق، هەرسێکیان ئەنجامی کۆتاییهاتنی جەنگی سارد بوون کە لەنێوان ساڵانی ۱۹٤٥-۱۹۸۹دا درێژەی کێشابوو. هەرسێکیان ئاماژەیان بە سیستەمی ڤێستفاڵیا دەکرد کە لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا لە ۱٦٤۸وە بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە زاڵ بوو. ئەو ئاشتییەی کە دوای جەنگیکی سی ساڵە بەناوی ئاشتیی ڤێستفاڵیا بەرقەرار بوو، بوو بەهۆی دامەزراندنی سیستەمی ڤێستفاڵیا کە لەسەر بنەمای سەروەریی دەوڵەت - نەتەوە بونیاد نرابوو. ئەویش لەسەر دوو کۆڵەکەی سەرەکی وەك یەکپارچەیی خاك و دەستوەرنەدانی وڵاتان و رەگەزە دەرەکییەکان لە کاروباری ناوخۆیی وڵاتان دامەزرابوو. سیستەمی ڤێستفاڵیا لە ماوەی زیاتر لە سێسەد ساڵدا لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا وەك پرەنسیپی بەڕێوەبردن قبووڵ کرابوو. دوای ئەوەی کە دەوڵەت - نەتەوەکانی ئەورووپا بە رەزامەندیی خۆیان سەروەرییان رادەستی یەکێتی ئەورووپا کرد، ئیدی ماوەی بەکارهێنانی

ئەو سیستەمە بەسەر چوبوو کە لە ناوەندی ئەورووپا'وە دەرکەوتبوو. لەوانەیە کۆتایی ڤیستفالیا بەهۆی لە دایکبوونی یەکێتی ئەورووپا'شەوە نەبووبێت، بەڵام کێشەکانی بۆسنا و هەرسك و کۆسۆڤۆ و عێراق، پرسی کۆتاییهاتنی ڤێستفالیا'ی خستە بەرباس. چونکە بەتایبەتی لە پرسی بۆسنا و هەرسك'دا، پرسی پەیوەندی لەسەر بنەمای پاراستنی یەکپارچەیی و دەستوەرنەدان لە کاروباری ناوخۆیی گۆڕابوو بە پرەنسیپی دەستوەردان لەبەر ئامانجی مرۆیی و ئەمەش لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا جێی خۆی کردبووەوە. پێویستبوو عێراق'یش لەم روانگەوە شتێکی جیاواز و هەڵاوردە نەبێت. هەر خودی رزگارکەرەکانی عێراق، بە شیوەیەکی ناکۆك جەختیان لەوە دەکرد کە جەنگی عێراق دەتوانێ دەستوەردانێك بە ئامانجی مرۆیی بێت. لەبەر ئەوەی کەسیکی وەك جۆرج دەبلیۆ بوش پێیوابوو ئەمریکا ئەرکێکی ئیلاهی لە ئەستۆدایە و کۆمەڵێك بیروبۆچوونی میتافیزیکییانەی هەبوو و هەروەها لەبەر ئەوەی کەسێکی وەکوو دیك چێنی کە نوێنەرایەتیی راستڕەوەکانی ئەمریکا و نەتەوەگەرا توندڕەوەکانی ئەو وڵاتەی دەکرد، پشتگیری لە جەنگ دەکرد و کەسێکی وەك دۆناڵد رامسفێڵد'ی وەزیری بەرگری و بەشێکی دیکە لەنێو موحافزکارەکان کە پشتیوانییان لە جەنگی عێراق دەکرد، کەس نەیدەتوانی بیر لەوە بکاتەوە کە جەنگی عێراق دەستوەردانێکە کە بە ئامانجی مرۆیی دەکرێت. لەوەش زیاتر بەو هۆیەی کە کۆنگرەی ئەمریکا بۆ ئەوەی بتوانێ بڕیاری جەنگ وەربگری، پەنای بۆ فێڵ و تەڵەکە برد، ئیدی سێبەری گومانەکان لەسەر ئەوەی کە لەوانەیە جەنگی عێراق دەستوەردانێك بە ئامانجی مرۆیی بێت زیاتر بوو. سەرەڕای هەموو ئەو ئاماژە نێگەتیڤانەی کە سەبارەت بە جەنگ هەبوون، ژمارەیەکی زۆر لە بیرمەندانی لیبراڵ و چەپ لە ئاستی نێودەوڵەتیدا کە هەموو تەمەنی خۆیان بۆ دژایەتیکردنی تۆتالیتاریزم تەرخان کردبوو جەختیان لەوە دەکردەوە کە دەکرێت لەبەر هەندێك تێبینیی مرۆیی بەرگری لەو جەنگە بکرێت.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا کاراکتەری جەنگی عێراق گۆڕانی بەسەردا نەهات. نموونەی رووداوی وەك جەنگی ساڵی٢٠٠٣ عێراق کەمە کە تیایدا هەموو لایەنەکان لەسەری رێك بووبێتن. بیرۆکەی جەنگی عێراق لەنێو ئەو کەسانەدا کە بیروبۆچوونیان لێك نزیك بوو پەرەی سەند و تەنانەت لە نیو ئەو کەسانەشدا کە سەر بە رەوت و جوڵانەوەی سیاسی جیاواز بوون لایەنگرانی جەنگ پەیدا بوون و بەشێوەیەکی سەیر رێگاکانیان یەکی گرتەوە. بەڵام لە تورکیا ئەو کەسانەی کە بەرگرییان لە جەنگ دەکرد، بە پەنجەکانی دەست دەژمێردران. دەرکەوتن وەك ئەوەی کە بیربۆچوونەکانت لە رەوتی راستگەرای ئەورووپا و ئەمریکا نزیکە یاخود کەسانێك وا پیشانبدەن کە تۆ لەوانەوە نزیکی، شتێکی خۆش نەبوو. لە تورکیا کەسانێکی زۆر لە ئیسلامییەکان'ەوە بگرە تا چەپەکانی تورکیا دژایەتی بیروبۆچوونەکانی منیان دەکرد. ئەمە لەلایەك و لەلایەکی دیکەش، جێگرتنی من لە بەرەیەکی دژ بە هاوڕێ کۆنەکانی خۆم لە لوبنان کە لە

جوولانەوەی فەلەستین٘دا پێکەوە بووین، شتێك بوو کە ئازاری زۆری پێ دەدام. لەنێو ئەو دۆستانەشمدا کەسێکی وەك میشل نۆفڵ هەبوو کە نزیکەی چل ساڵ بوو هاورێ بووین. لەبەرامبەر ئەمەشدا لەگەل کوردەکانی عێراق و کەسانێکی وەکوو عادل عبدالمهدی کە لەنێو جوولانەوەی فەلەستینی٘دا پیکەوە بووین و هەروەها لەگەل دۆستە شیعەکان٘مدا لە عێراق و بەدەر لەوانیش لەگەڵ وسلاڤ هاڤل، سەرکردەی شۆرشی مەخمەلی لە چیکۆسلۆڤاکیا و کەسانێکی وەکوو ئەو کە لە ئەوروپا٘ی خۆرهەلات و ئەوروپا٘ی ناوەراست تێکۆشانیان کردبوو، لە یەك بەرەدا بووین و وەك یەك بیرمان دەکردەوە. لەکاتی جەنگی عێراق٘دا ستیڤان کینزەر پەیامنێری پێشووی نیۆیۆرك تایمز لە تورکیا و عوسمان کاڤالا بۆ ئامادەکردنی وتارێکی درێژ سەبارەت بە کوردەکان بۆ گۆڤارێك بەناوی نیۆیۆرك ریڤییۆ ئاف بووکس سەردانی تورکیا٘یان کردبوو و لە نیوەرۆیەکدا لە ئیستانبوڵ یەکمان بینی. عوسمان کاڤالا بۆ ماوەیەکی کورت ئێمەی بەجێهێشت و ستیڤان کینزەر ئەوەی بە دەرفەت زانی و وتی؛"چەنگیز! بۆچی هاورێکانت ئەوەندە نەفرەتت لێ دەکەن؟"لەگەڵ کێدا قسەی کردبوو و سەبارەت بە جەنگی عێراق هەر شتیکی لەگەڵ هەر کەسێکدا باس کردبوو، لەنێو"هاورێکانمدا"بەشێوەیەکی خراپ باسی منیان کردبوو. بە ستیڤان کینزەرم گوت؛"سەیر کە! ئەگەر ئەوانە نەفرەت لە من بکەن، کەواتە هاورێیم نین. هاورێکان دەتوانن بە شیوەیەکی جیاواز لە یەکتری بیر بکەنەوە، بەلام نەفرەت لە یەك ناکەن. بەدەر لەوە من هەموو تەمەنی خۆم لە خۆرهەلاتی ناوەراست تێپەر کردووە و سەبارەت بە رژێمی سەدام هەموو کات هەلوێستیکی روون و ئاشکرام هەبووە. ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی دەناسم و لەگەڵ کەسانی نێو ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی ئاشناییم هەیە. من لەو کەسانە نیم کە لە رێی رۆژنامەکانەوە بەدواداچوون بۆ رووداوەکانی عێراق بکەم. لەنێو خودی رووداوەکاندا ژیاوم و لەوەش گرنگتر، من کەسێکم کە هەموو کات هەلوێستم هەبووە. کێ سەبارەت بە من چی دەلێ با بیلێ من لەبەر خاتری ئەوان، ئەو بیروبۆچوون و هەستانەی خۆم ناگۆرم کە لە ماوەی سالانێکدا بە دەستم هێناون."

زەردەخەنەیەکی واتادار لە روومەتی ستێڤان کینزەر دەرکەوت و ئیتر درێژەی بەو باسە نەدا. بەلام بەو هۆیەوە جارێکیتر زانیم کە چۆن لە تورکیا سەبارەت بە جەنگی عێراق بە رەوتێکی پێچەوانەدا دەرۆم. رووداوی هاوشیوەی ئەمە بەسەر زۆربەی ئەو کەسانەدا هاتووە کە پشتیوانییان لە جەنگی عێراق کردووە. تۆنی بلێر لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا نموونەیەکی بەرچاوی ئەمە ئاشکرا دەکات؛"هۆکاری سەرەکیی مشتومرەکانی سەبارەت بە عێراق ئەوە بوو کە مرۆڤەکان وازیان لەوە هێنابوو گوێ لە یەکتری بگرن. لەوانەیە لەنێو خەلکدا ژمارەی ئەو کەسانەی کە بێلایەن بوون، زیاتر لەوە بوون کە پێشبینی دەکران... ئەو کەسانەی کە دژ بە جەنگ بوون پێشتر بریاری خۆیانیان دابوو... و ئەقلی پێشکەوتنخوازەکان٘یش وەك

گرانیتێك رەق و وشك ببوو. ئەمەش شتێکی نێگەتیڤ و هەڵە بوو. لە هەمانکاتدا هەموو هاوڕێکانم دژ بەو بڕیارانە بوون کە من وەرم دەگرتن. بەدەر لەوەی کە بە شیوەیەکی جیاواز بیریان دەکردەوە، بە ئاسانی تێ نەدەگەیشتن. یەکێك لە هاوڕێ کۆنە سیاسییەکانی خۆم بەناوی گالۆف بەوەوە نەوەستا کە چەندینجار جیاوازیی بیروبۆچوونەکانی خۆی لەگەڵ من باس بکات، بەڵکو دەیگوت نازانم بۆچی ئەمە دەکەی تۆنی؟ پشتیوانەکان و لایەنگرەکانی من جەختیان لەوە دەکردەوە کە من لەبەر هۆکاری رەوا بڕیاری وەهام داوە، بەڵام دیسان ئەمەیان وەك پەڵەیەکی رەش دەبینی کە لە کارنامەی مندا تۆمار دەکرێت. ئەو کەسانەش کە دژایەتی منیان دەکرد، ئەمەیان وەك دوایین و ئاشکراترین بەڵگەی خیانەتی من لە قەڵەم دەدا..."(تۆنی بلێر- ل٣٧٣-٣٧٤)

لە ساڵی ٢٠١٠دا کاتێك کە ئەو دێڕانەم دەخوێندەوە، بارودۆخی خۆم لە ساڵی٢٠٠٣ لە تورکیا هاتەوە پێش چاو. دیارە وەرگرتنی بڕیاری جەنگ کاری کەسێکی وەکوو من نەبوو و من بچووکترین رۆڵیشم لەو بڕیارەدا نەبوو. بەڵام پشتیوانیکردنی من لە جەنگ بەس بوو بۆ ئەوەی کە وەك بڕیاربەدەستانی جەنگ و ئەو کەسانەی کە جەنگیان کردووە مامەڵەم لەگەڵدا بکرێت. لەدوای جەنگ، بەردەوام باسی زیانە گیانییەکانی جەنگ دەکرا و بەردەوام پرسیاری رەوشتی و مرۆیی دەکرا و دەگوترا کە؛"عێراقی ئێستا لەسەردەمی سەدام باشترە؟"ئەم پرسیارە لە ناوەڕۆکی خۆیدا ئاماژەی بەوە دەکرد کە سەرەڕای هەموو شتێك سەردەمی سەدام لەو قۆناغەی کە ئێستا هەیە باشتر بووە. وەڵامی منیش بۆ ئەم پرسیارە زۆر سادە و رەوان بوو؛"بەڵێ"دیارە ئەو پرسیارەی کە دەکرا بە زۆری پشتی بە درۆیەکی گەورە دەبەست کە گوایە لەدوای جەنگی عێراقەوە تا ئێستا نزیکەی نیو ملیۆن مرۆڤ گیانیان لە دەست داوە. ئەم ژمارەیە بە مانشێتیکی وەك"لە ماوەی ساڵانی ٢٠٠٣-٢٠٠٩دا نزیکەی٥٠٠-٦٠٠ هەزار کەس کوژراون"لە رۆژنامەکاندا بڵاودەکرایەوە و دەگوترا کە ملیۆنێك مرۆڤ گیانی لە دەستداوە. هیچ کەسێك زەحمەتی ئەوەی بە خۆی نەدەدا کە لەو ژمارانە بکۆڵێتەوە و زانیاریی وەك ئەوە کە گوایە لە جەنگی عێراقدا نزیکەی نیو ملیۆن کەس گیانی لە دەستداوە وەك بەڵگەی راست لە زەین و مێشکی مرۆڤەکاندا جێگیر دەکرا. سەرچاوەی ئەم زانیارییە ناڕاست و نادرووستە لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی مردنەکانی ناو عێراق بوو لە کە گۆڤارێکی پزیشکیدا بەناوی لان سێت لە مانگی١٠ی ساڵی ٢٠٠٤دا بڵاو کرایەوە. لە نووسینەکەدا ژمارەی کوژراوەکانی عێراق بە ٦٠٠هەزار کەس لە قەڵەم درابوو. دواتر هەڵە و نادرووستیی شێوازی راپۆرتەکەی لان سێت ئاشکرا بوو، بەڵام کەش و هەوای دژایەتیکردنی بوش و هەلومەرجی ئەمریکا بوونە هۆی ئەوەی کە زۆر تیشك نەخرێتە سەر هەڵە و کەموکووڕییەکانی ئەو راپۆرتەی کە پێشتر بڵاو کرابووەوە. بەپێی ئامارەکانی خاچی سووری نێودەوڵەتی کە پشتی بە زانیارییەکانی رێکخراوی ژماردنی تەرمەکانی عێراق دەبەست و ئەویش لەبنەڕەتدا رێکخراوێکی

دژی جەنگ بوو، ژمارەی کوژراوەکانی عێراق لەو کاتانەدا ۱۰۰-۱۱۲هەزار کەس بوون. ئەو ژمارەیەی کە یەکێك لە جدیترین ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەی ئەمریکا بەناوی ئەنستیتۆی برۆکینگز هەر لە رێی داتاکانی رێکخراوی ژماردنی تەرمەکانی عێراق'ەوە دەستی کەوتبوون، لەم ژمارەیەوە نزیکبوون. دەکرێت لەم جەنگی ژمارانەدا، وتەیەکی ژۆزێف ستالین بهێنینەوە کە دەڵێت؛"مردنی کەسێك تراژێدییە، بەڵام مردنی ملیۆنێك مرۆڤ ئامارێکە."و بگوترێت ئەو مشتومڕەی لە روانگەی رەوشتی و مرۆییەوە لەسەر جەنگەکە دەکرێت شتێکی بێ واتایە. بەڵام لە هەمانکاتیشدا هیچ گومانێك نییە کە جیاوازییەکی زۆر لەنێوان یەك ملیۆن مرۆڤ و سەد هەزار کەسدا هەیە. دەستڕاگەیشتن بە ژمارە راستەقینەکانی کوژراوانی جەنگی عێراق پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە رووداوێکی سیاسی و مێژوویی بە چ جۆرێك تۆمار بکرێت. چونکە ژمارەی ئەو کوژراوانەی کە خۆی لە سەد هەزار کەس نزیك دەکردەوە، هەمووی بەهۆی هێزە داگیرکارەکانەوە نەکوژرابوون، بەڵکوو بەهۆی شەڕی تایفی و شەڕی نێوان مەزهەبەکانەوە لە عێراق، گیانیان بەخت کردبوو. جەنگی تایفی لەنێوان شیعە و سوننە لە ۲۰۰۵-۲۰۰۷ گەیشتە ئاستێکی شێتانە و ئەمەش بوو بەهۆی ئەوە کە حەفتا هەزار عێراقی گیانیان لە دەستبدەن و ئەوانەی کە لەم لافاوە گەورەی خوێندا خەتابار بوون، بەئەندازەیەکی زۆر ئەلقاعیدە'ی مێزۆپۆتامیا یاخود ئەلقاعیدە'ی رافیدەین و ئەو میلیشیا شیعانە بوون کە لەلایەن سوپای پاسدارانی ئێران پشتیوانی دەکران. ئەلقاعیدە و میلیشیا سوننەکان بەئەندازەیەکی زۆر سوودیان لە پشتیوانیی دارایی عەرەبستانی سعوودی و وڵاتانی عەرەبی کەنداو وەردەگرت.

ئامارەکانی تایبەت بە ژمارەی کوژراوەکانی جەنگی عێراق جارێکی دیکە لە شوێنێکدا کە هیچ کات بە مێشکمدا نەدەهات رووبەڕووم بوونەوە. رۆژی ۲۰۱۲/۱/۳ لە ژوورێکی هۆتێلدا لە هانۆی پایتەختی ڤێتنام لە رۆژنامەی ڤێتنام نیوزدا لە نووسینێکیدا سەبارەت بە کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق ئەوەم خوێندەوە کە؛"رێکخراوێکی کۆمەڵگەی مەدەنیی بەریتانیا رایگەیاندووە لە جەنگی داگیرکاریی ۲۰۰۳دا کە بە پێشەنگایەتیی ئەمریکا ئەنجامدرا هەتا ئێستا نزیکەی ۱٦۲هەزار کەس لە عێراق کوژراون کە ۸۰٪یان کەسی مەدەنین. رێکخراوی ژماردنی تەرمەکانی عێراق... توندتیژی لە عێراق لە ناوەڕاستەکانی۲۰۰۹دا گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێرشەکان زیاتر لەساڵی ۲۰۰٦ و۲۰۰۷ بوون کە تێیدا جەنگێکی مەزهەبی لەو وڵاتەدا بەرقەرار بووە. نزیکەی ۷۹٪ی کوژراوەکان کەسی مەدەنین و ئەوانەی دیکەش سەربازانی سوپای ئەمریکا و ئەندامانی هێزە ئەمنییەکانی عێراق و کەسانی سەر بە گرووپەکانی بەرگرین. بەگوێرەی روونکردنەوەی رێکخراوەکە، توندوتیژییەکان لە کۆتایی ۲۰۰٦دا گەیشتوونەتە لووتکە و تا ناوەڕاستی ۲۰۰۸ لە ئاستێکی بەرزدا ماونەتەوە..."

ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەسەردەمی دیکتاتۆری سەدام حسێن'دا بەهۆی جۆراوجۆرەوە گیانیان

لە دەستدابوو، زۆر زیاتر بوو لە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەکاتی جەنگی٢٠٠٣ و لە قۆناغی دوای ئەو جەنگە گیانیان لە دەست دابوو. تۆنی بلێر کە هەموو جارێك کە ئەو پرسیارەیان رووبەڕوو دەکردەوە ئایا عێراقی ئێستا لە عێراقی سەردەمی سەدام حسێن باشترە یان نا؟ بە"هەڵبەتە عێراقی ئێستا باشترە."وەڵامی داوەتەوە، پاساوی ئەم وەڵامەی خۆیشی بە کۆمەڵێك ئامار هێناوەتەوە کە تایبەتە بە ژمارەی کوژراوەکان و ئەو کەسانەی لەسەردەمی سەدام حسێن گیانیان لە دەستداوە کە بەمجۆرە بوون؛"لە ماوەی نێوان ساڵانی١٩٨٠-١٩٨٨ لەکاتی جەنگی ئێران – عێراق؛

ژمارەی کوژراوان لە بەینی٦٠٠هەزار- یەك ملیۆن و١٠٠هەزار کەسدایە. (Anthoni kordisman, Lessons of Modern War,p.٣)

پرۆسەکانی ئەنفال کە دژ بە کوردەکان پێڕەوکران؛ لە ١٩٨٨دا نزیکەی١٠٠ هەزار کوردی کوشت و ژمارەیەکی زۆر زیاتر لەوەش بریندار بوون و ئاوارە کران. (رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ، پاکتاوکردنی رەگەزی لە عێراق٢٠٠٣)

داگیرکردنی کوەیت یاخود جەنگی کەنداو؛ لە ساڵی١٩٩١ حەفتا هەزار کەس گیانیان لە دەست دا. (میلتۆن لێتنبیرگ، جەنگ و پێکدادانەکانی سەدەی بیستەم و قوربانییەکانی)

پرۆسەکانی تۆڵەکردنەوە دژ بە شیعەکان لە١٩٩١ ؛ ٥٠هەزار کەس کوژراون. (لێیتنبێرگ)

ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە ساڵانی دیکەدا بەهۆی سیاسییەوە کوژراون، زیاتر لە ١٠٠ هەزار کەسن. (رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ، دادپەروەیی بۆ تاوانەکانی حکومەتی عێراق پێویستە، مانگی١٢ی ساڵی٢٠١٢، ل.٣٧٨)"

ماوەیەکی زۆر کورت دوای ئەوەی کە ئەو بەشەی کتێبەکەی تۆنی بلێر'م لەنێو یاداشتەکانی خۆمدا جێگیر کرد، لەگەڵ تۆنی بلێر ئاشنا بووم. لە پانێلێکدا لە ئیستانبوڵ من وتارم هەبوو و ئەویش بەڕێوەبەری پانێلەکە بوو. لەدوای کۆبوونەوەکە پێی گوتم وتارەکەی تۆ لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی مندا یەك دەگرێتەوە. منیش پێم وت ئەو کتیبەی کە ئەو سەبارەت بە ئۆتۆبیۆگرافیای خۆی و ئەو شتانەی کە سەبارەت بە جەنگی عێراق نووسیویەتی، لەنێو کتێبەکەی مندا جێگەیەکی فراوانی گرتووە. لەگەڵ تۆنی بلێر سەبارەت بە جەنگی عێراق کە لەوبارەیەوە رەخنەی توندی لێ دەگیرا، بەئەندازەیەکی فراوان یەکمان دەگرتەوە. زۆر روون و ئاشکرا بوو کە رژێمی سەدام لە ناوخۆ و دەرەوەی عێراق وەك ماکینەیەکی مەرگ کاری دەکرد و ئەگەر بەوجۆرە بهێڵرابایەتەوە، هەروا بەردەوام دەبوو. مومکین نەبوو بیروبۆچوونەکان و متمانەی تەواوم بە پێویستیی مرۆیی و رەوشتی بوونی لەناوبردنی رژێمێکی ستەمکاری وەك رژێمی سەدام بە هێچ پاساوێکی ئایدۆلۆژی و یاسایی لە ناو ببرێت. ژۆسێ رامۆس- هۆرتا، سەرکردەی جووڵانەوەی سەربەخۆخواز

و بەرگریکاری تیمووری خۆرهەڵات کە خەڵاتی نۆبڵی ئاشتیی ساڵی١٩٩٦ی بردۆتەوە، سەبارەت بە جەنگی عێراق وتبووی؛"ئەگەر جووڵانەوەی دژ بە جەنگ بتوانێت ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە جەنگی عێراق پەشیمان بکاتەوە، ئەوا دەبنە هۆکارێك بۆ ئاشتیی مردووەکان."بەڵام نەتوانرا رێ لە جەنگ بگیرێت و دوای جەنگیش هاونەژادەکانی کوردەکانی تورکیا کە نزیکەی یەك لەسەر پێنجی دانیشتووانی تورکیا پێك دەهێنن، لە عێراق لە دەستی هەڵمەتەکانی پاکتاوکردنی نەژادی سەدام رزگاریان بوو و عێراق بوو بە وڵاتێکی فیدراڵ و کوردەکان'یش بە شوناسی نەتەوەیی خۆیانەوە لە مەیدانی مێژوودا جێگای خۆیان گرت و لە باکووری عێراق'یشدا تا ئەندازەیەك حکومەتێکی سەربەخۆی کوردی دامەزرا و بەگوێرەی دەستووری عێراق'یش زمانی کوردی وەك زمانێکی رەسمیی وڵات قبووڵ کرا. ئەو رووداوانەی کە بەهۆی جەنگی عێراق'ەوە درووست بوون، بوونە هۆی ئەوەی کە تورکیا'ش بە ناچاری رووبەڕووی کێشەی کورد لەنێوخۆی وڵاتەکەی بێتەوە و بەناچاری مل بدات بۆ ئەوەی کە ئەو کێشەیە چارەسەر بکات. چارەسەر کردنی کێشەی کورد بۆ تورکیا'یەکی دیموکراتیك کە دەیەوێ ببێتە هێزێکی ناچەیی و ئەکتەرێکی نێودەوڵەتی، شتێك بوو کە نەدەتوانرا حاشای لێبکرێت. ئەگەر حکومەتی سەدام یاخود رژێمێکی هاوشێوەی لەسەر کار بووایە، هیچ کات پێگەی تورکیا لە عێراق هاوشێوەی ئەو پێگەیە نەدەبوو کە لەدوای سەدام لەوێ بەدەستی هێنا.

**یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی نیۆپارێزگارەکان ئەوە بوو کە پێیانوابوو رووداوەکان بەگوێرەی مۆدێلێک کە پێشتر ئامادەکراوە روودەدن. لەوانەیە بەشێکی ئەمەش پەیوەندیی بە کاریگەری دیدگایەکی مارکسیستی‌یەوە هەبێت کە بە تەواوەتی نەسڕاوەتەوە. نیۆپارێزگارەکان وەک رۆشنبیرە میراتگرەکانی ترۆتێسکیستەکان، بیرۆکەی رۆڵی بیروبۆچوون و رۆشنبیران لە ئاستی سەرەوەی شۆڕش بە شتێکی گونجاو دەزانن. زۆرێک لە نیۆپارێزگارەکان، بەئەندازەیەکی زۆر بەلای ئەوەدا دەچن کە تێزە مێژووییەکانی هێگلچییەکان قبووڵ بکەن کە زۆر دێتیرمینیستانەیە.(سەیری فرانسیس فۆکۆیاما بکەن) لەو روانگەیەشەوە ئەو گوتارەی کە پێیوابوو بە تۆزێک پاڵنانی ئەمریکاوە چارەنووسی عێراق ئەوەیە کە ببێتە وڵاتیکی لیبراڵ و دیموکراتی، هاوشێوەی ئەو بۆچوونەی جینا کێرک پاتریکە کە لە بۆچوونەکانی هانا ئارێنت ئیلهامی وەرگرتووە و دەڵێت بەهیچ جۆرێک کۆمەڵگا کۆمۆنیستییە تۆتالیتەرەکان لە ناوخۆوە ریفۆرمیزە ناکرێن.**

**جاکۆب ڤینبەرگ (سەرنووسەری سلەیت)**

دوای نزیکەی دوو ساڵ دابڕان، لە ئێوارەیەکدا لە حوزەیرانی ٢٠١٠ چاوم بە پۆل ڤۆلفۆویتز کەوت. خواستە یان ناخواستە، قسە و باسەکانیشمان هاتە سەر پرسی عێراق. داخۆ مێشکی جەنگی٢٠٠٣ی عێراق کە سیفەتێکی حاشاهەڵنەگری وەکو باوکی رۆشنبیریی جەنگەکە یاخود سیفەتیکی دیکەی وەك ئەندازیاری رۆشنبیریی جەنگەکە هەبوو کە بە هەمان ئەندازە حاشاهەڵنەگر بوو، لەو ماوەیەدا کە تێپەڕیبوو هیچ گۆڕانێك لە بیروبۆچوونەکانیدا دروست ببوو؟ پەشیمان بوو لەو رۆڵەی کە گێڕابووی؟ ئەویش کاتێك کە دەگەڕایەوە دواوە و سەیری روخساری ئێستای عێراق‌ی دەکرد، ئایا وەکوو کەنعان مەکییە و میشڵ ئیگناتیڤ بیری دەکردەوە؟ ئایا ئەویش لەنێو کاروانی بەهەڵەچووەکاندا جێی دەگرت؟

پرسیاری لێکردم و وتی"باڵیۆز رایان کرۆکەر دەناسی؟"باسی دیپلۆماتێکی بەناوبانگی دەکرد کە ماوەیەك باڵیۆزی ئەمریکا لە بەغدا بوو... دواتر لە درێژەی قسەکانیدا وتی؛"دژی جەنگ بوو. لە ماوی رابردوودا یەکترمان بینی، پێمگوت چۆن بیر دەکەیتەوە رایان؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی هێشتا زووە بۆ ئەوەی وەڵام بدەمەوە..."دوابەدوای ئەوەش بە پێکەنینێکی منالانەی تایبەت بە خۆی، قاقایەکی لێدا و وتی؛"هێشتا زووە بۆ ئەوەی وەڵام بدەمەوە."دیارە ئەم بەشەی باسەکەشمان رابردوویەکی هەبوو. لە کۆتایی مایسی ٢٠٠٢ و سەرەتای مانگی حوزەیراندا لە هۆتێلی ریتز کارڵتۆن لە ئیستانبوڵ لە کۆبوونەوەی بیلدێربێرگ‌دا کە پۆڵ ڤۆڵفۆویتز‌یش تێیدا بەشدار بوو، لەگەڵ کسینجەر قسەم کردبوو کە چەند خولەکێك بەر لەو قسانەی کە لەم دیدارەی دواییماندا کردبووی، بۆ پۆڵ‌م گێڕابووەوە. لەبەر ئەوەی لە یەکێك لەکاتی پشووەکانی کۆبوونەوەکاندا بۆ قاوە خواردنەوە و هەروەها لە دوو ئێوارەخواندا بەدوای یەك و جگە لەوە لەکاتی

نانخواردنێکی بەیانی و لە نیوەڕۆخوانێکیشدا کە شاژنی هۆڵەندا ڕێکیخستبوو (لە هەموو ئەوانەشدا ڕێچارد هۆڵبرووك ئامادە بوو) لەگەڵ هێنری کسینجەر'دا بووم، بەو هەستەی کە بە یەك ئاشناین لێی نزیك بوومەوە و پرسیارێکم لێکرد؛"دکتۆر کسینجەر ئەتوانم پرسیارێکتان لێ بکەم؟"ئەویش لە پشت چاویلکە ئەستوورەکانیەوە چاوی تێبڕیم و بەوجۆرەش یەکێك لەو دەوڵەتمەدارە گرنگانەی کە مۆری خۆیان لە سەدەی بیستەم دابوو، چاوەڕوانی من بوو تا پرسیارەکەی لێبکەم؛"هەموو کاتێك باسی گفتوگۆ و دیالۆگێکی ئێوە لەگەڵ زوو ئێن لای سەرۆك وەزیری چین دەکرێت کە ئێستا کۆچی دوایی کردووە. ئێوە پرسیارتان لێکردووە سەبارەت بە شۆڕشی١٧٨٩ی فەرەنسا چۆن بیر دەکاتەوە؟"بەر لەوەی پرسیارەکەم تەواو بکەم هێنری کسینجەر قسەکەی پێبڕیم و وتی؛"ئەویش لە وەڵامدا وتوویەتی هێشتا زووە وەڵام بدەمەوە..."

-"بەڵێ."

-"باشە پرسیارەکەت چییە؟"

-"دیالۆگێکی وا لەنێوانتاندا کراوە یان نا؟"

-"نەخێر!"

-"بەڵام هەموو دنیا وا دەزانێ..."

-"بەڵی دەزانم، تەنانەت منیش هەندێك جار لە قسەکانی خۆمدا ئاماژە بەوە دەکەم!"

دەستەواژەی Too early to tell لەنێو فەرهەنگی نێودەوڵەتیدا جێی خۆی کردۆتەوە، بەڵام کاتێك لە زاری یەکێك لە پاڵەوانەکانی ڕووداوەکەوە ئەوەم بیست کە دەستەواژەی"هێشتا زووە بۆ ئەوەی وەڵام بدەمەوە"لەنێوان کسینجەر و زوو ئێن لای'دا بەهیچ جۆرێك باس نەکراوە، ئەو وەختە بیرم لەوە کردەوە کە پێویستە سێبەری گومان بخرێتەسەر بەشێك لەو ڕووداوانەی کە لە مێژوودا هەن و پێویستە مرۆڤ بەگومان بێت لەوەی کە لە مێژوودا چی ڕاستە و چی ناڕاستە. ئەم بیرەوەرییەی بووە هۆی ئەوەی کە مێشکی مرۆڤ تێکەڵ و پێکەڵ بکات سەبارەت بەوەی کە چ شتیك لە مێژوودا هەڵەیە یان ڕاستە، تەنها وەك بیرەوەرییەك نەمایەوە. جارێکی دیکە لە ٢٠١١/١٠/١٣دا لە ئیستانبوڵ چاوم بە کسینجەر کەوت. بۆ پێشەکەشکردنی وتارێك سەبارەت بە شوناسی تورك و سیاسەتی نوێی دەرەوەی تورکیا، لە کۆبوونەوەیەکی داخراودا کە لەلایەن جەی پی مۆرگانەوە ڕێکخرابوو، بانگهێشت کرابووم. تۆنی بلێر کۆبوونەوەکەی بەڕێوە دەبرد. کاتێك چوومە ناو هۆڵی کۆبوونەوەکە سەرم سووڕما. بەشێك لە بەشداربووان سیاسەتمەدارە بەناوبانگەکانی جیهان بوون. لە چواردەوری مێزیکی لاکێشەییدا کە لە ناوەڕاستی هۆڵەکە دانرابوو، چاوم بە هێنری کسینجەر، کۆفی ئەنان، لی کووان یوو ئەندازیاری موعجیزەکەی سەنگافۆرە، ئەلڤارۆ یۆربی کە لەنێوان ٢٠٠٢-٢٠١٠ سەرۆك کۆماری کۆلۆمبیا بوو و هەورووەها کەسانی بەناوبانگی ئەمریکی وەك ریچارد هاس، پرۆفیسۆر

شیبلی تێلهام کەوت. لە دەرفەتێکدا ئەو بیرەوەرییەی چوار ساڵ پێش ئەوکاتەم سەبارەت بە"هێشتا زووە بۆ ئەوەی وەڵام بدەمەوە"بە بیر کسینجەر هێنایەوە و پێمگوت ئەو بیرەوەرییەم لەنێو کتێبەکەمدا نووسیوە، ئایا دیسان زانیارییەکەم بۆ پشتڕاست دەکەیتەوە یان نا؟ کسینجەر راستکردنەوەیەکی پێویستی بۆ کتێبەکەی من کرد و وتی؛"لە ماوەی رابردوودا بۆ وەرگرتنی زانیاری لەسەر کتێبێك دیدارم لەگەڵ ئەو وەرگێڕەدا کرد کە کۆنووسی ئەو دیدارەی ئێمەی وەرگرتبوو. لە راستیدا دیالۆگێکی وەها لەنێوماندا کراوە..."

-"یانی کاتێك ئێوە سەبارەت بە شۆڕشی فەڕەنسا پرسیارتان کرد، زوو ئین لای لە وەڵامدا وتی هێشتا زووە بۆ وەڵامدانەوە؟"

-"بەڵی ئەو وەڵامەی داوەتەوە، بەڵام بەمجۆرە بووە؛ ئەو دیدارەی ئێمە لە ساڵی ١٩٧١دا بووە و ئەوەش کە من پرسیارم لەسەری کردبوو شۆڕشی ١٧٨٩ی فەرەنسا نەبووە. ئەگەر لە بیرتان بێتەوە لە ساڵی ١٩٦٨دا لە فەرەنسا رووداوی گەورە روویاندابوو. من مەبەستم رووداوەکانی ١٧٨٩ نەبوو، بەڵکوو پرسیاری ١٩٦٨م کردبوو و ئەویش بەوجۆرە وەڵامی دابووەوە. بە لەبەرچاو گرتنی ئەو هەلومەرجەی کە لەو رۆژانەدا کە دیالۆگەکەی تێدا ئەنجامدراوە، ناتوانین بڵێین ئەو وا تێگەیشتووە کە مەبەستی من شۆڕشەکەی ١٧٨٩ی فەرەنسا بووە."

راستکردنەوەکەی کسینجەر بۆ ئەم کتێبەی من زۆر بەسوود بوو، بەڵام ئەمە نەبووە هۆی ئەوەی کە ئەو تێگەیشتنەی لە دنیا سەبارەت بە دیالۆگەکەی کسینجەر و زوو ئین لای سەبارەت بە شۆڕشی١٧٨٩ی فەرەنسا هەیە بگۆڕێت. هێشتا هەر بەوجۆرەی جاران سەیری رووداوەکە دەکرێت. ئەمەش لە ئاستێکدا بوو کە تەنانەت ڤۆلفۆویتز یەکێك لە ئەندازیارە سەرەکییەکانی جەنگی عێراق کاتێك کە پرسیارم لێکرد ئایا رەخنەیەك لە خۆی دەگرێت سەبارەت بە جەنگ و ئاخۆ هەست بە پەشیمانی دەکات یان نا؟ وەك ئەوەی کە ئاماژە بە وتەکەی زوو ئین لای سەبارەت بە شۆڕشەکەی ١٧٨٩ی فەرەنسا بدات، بە گاڵتەوە وتی هێشتا زووە بۆ ئەوەی وەڵام بدەمەوە.

پۆل ڤۆلفۆویتز تا ئەندازەیەك لە هیچ بابەتێکدا لەگەڵ پۆل برێمەر کە لەدوای جەنگی بوو بە حاکمی مەدەنی عێراق کۆك نەبوو. برێمەر بژاردەی دۆناڵد رامسفێڵد وەزیری بەرگری بوو کە وەك بەڕێوەبەری ڤۆڵفۆویتز وا بوو. برێمەر بەرپرسی بەڕێوەبردنی کاتیی هاوپەیمانەکان بوو کە بە کورتکراویCPA پێ دەگوترا. لەوانەیە ئەمریکا وەك دەوڵەتێکی داگیرکاری کلاسیکی سەدەی نۆزدەیەم رەفتاری کردبێت بۆیە بە زمانی ئینگلیزی ئاوەڵناوی چرووتکۆنسوڵی بۆ برێمەر هەڵبژاردبوو کە لە میدیاکانیشدا بەکار دەهێنرا. پۆل برێمەر سیمبۆلی گۆڕانی ئەمریکا لە هێزیکی رزگارکەرەوە بۆ هێزیکی داگیرکەر بوو و لەلای بەشێکی زۆر لە عێراقییەکان و چاودێرەکانی کاروباری عێراق‌یش گەورەترین هەڵەیەك کە ئەمریکا کردی ئەوە بوو

کە خۆی وەك هێزێکی داگیرکار دەرخست. ئۆپەراسیۆنی جەنگ لە نۆزدەی مارتی ٢٠٠٣دا دەستیپێکرد و لە ٩ی نیسانی٢٠٠٣دا هیزەکانی ئەمریکا چوونە ناو پایتەختی عێراق و لە مەیدانی فیردەوس پەیکەری سەدام حسێن رووخا و ئەمەش بوو بە سیمبۆلی گۆڕانی رژێم لەو وڵاتەدا. ئەگەر ئەمریکاییەکان دەسەڵاتی وڵاتیان رادەستی عێراقییەکان بکردایە، ئەوکاتە لەوانەیە مێژووی عێراق بەجۆرێکی دیکە بنووسرابایەتەوە. بیروبۆچوونی پۆڵ ڤۆڵفۆویتز ٰیش بەمجۆرە بوو. هەرچەندە لەدوای سەدام حسێن یەکەم هەوڵدانی دامەزراندنی بەڕێوەبردنیەکی عێراقی لە رێگای مەجلیسی حوکمەوە درا کە لە ٢٥ کەس لە نوێنەرانی گرووپە ئەتنی و مەزهەبییەکانی عێراق پێکهاتبوو و ئەمەش لەکاتی بەڕێوەبەرییەکەی پۆڵ برێمەر ٰدا کرابوو، بەڵام لە راستیدا CPA یاخود دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانەکان بەسەرۆکایەتی پۆڵ برێمەر دەسەڵاتداری راستەقینەی عێراق بوو. مەجلیسی حوکم تەنها پەردەیەك یان روخسارێك بۆ شیرینکردنی داگیرکاری ئەمریکا لە عێراق بوو. یەکێك لەو ٢٥ کەسە ئەحمەد چەلەبی بوو کە لە ساڵی ٢٠٠٦دا بە دێکستێر فڵینکس، پەیامنێری رۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز لە بەغداٰی راگەیاندبوو؛"خراپترین شت کە دەیتوانی لە دنیادا رووبدات، روویدا. ئێمە دەسەڵاتدار بووین بەڵام هیچ دەسەڵاتێکمان نەبوو. سەبارەت بە هەموو شتێك، هەموو ئەو کردەوە و رەفتارانەی کە ئەمریکاییەکان دەیانکرد، ئێمە تاوانبار دەکراین بەڵام نەمادەتوانی هچ شتێك بگۆڕین."چەلەبی، پۆڵ ڤۆڵفۆویتز ٰی بە بەرپرسیاری هەموو ئەو رووداوانە دەزانی کە زەمانێك هاوڕێی نزیکی خۆی بوو و تەنانەت ئاو بە بەینیاندا تێپەڕ نەدەبوو. ئەوەندە لێك نزیکبوون کە وەکو ئەوە وابوو تا ئەندازەیەك ئۆپەراسیۆنی ئەمریکا ٰیان لە عێراق پێکەوە ئەنجام دابێت.

چەلەبی گوتبووی؛"تاوانباری سەرەکی هەموو رووداوەکان پۆڵ ڤۆڵفۆویتز ٰە. تیمی پنتاگۆن هیچیان پێناکرێ، کلکیان خستۆتە ژێر خۆیان و دەستەپاچە بوون."لەگەڵ دەسەڵاتی پۆڵ برێمەر ٰدا بەرگریی لەبەرامبەر داگیرکاریی عێراق و پێکدادانی مەزهەبی شیعە - سوننە گەیشتبووە ئاستێکی بەرز و عێراق وای لێهاتبوو کە نەدەتوانرا بەڕێوە ببرێت. پۆڵ ڤۆڵفۆویتز رێك لەو خاڵەوە کە ئەحمەد چەلەبی رەخنەی لێ دەگرت دەجووڵایەوە و بیروبۆچوونێکی جیاوازی لەگەڵ برێمەر ٰدا هەبوو. پۆڵ برێمەر لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی"ساڵەکەم لە عێراق"باس لەوە دەکات کە لە ئەیلوولی ٢٠٠٣ لە واشنتن سەردانی پنتاگۆن ٰی کردووە و لەمبارەیەوە لەگەل پۆڵ ڤۆلفۆویتز ٰدا گفتوگۆی کردووە؛"ڤۆلفۆویتز وتی پێویستە لەبەرەی سیاسیدا بەخێرایی بجووڵێینەوە. ئەگەر ئەنجومەنی حوکم بۆ نزیکەی سەد یان دووسەد کەس فراوانتر بکەین و دواتر دەسەڵات رادەستی ئەوان بکەین چی دەبێت؟ منیش لە وەڵامدا وتم؛ لەوانەیە لانیکەم لە رووی تیۆرییەوە بتوانین ئەم کارە بکەین بەڵام ئەمە کاتێکی زۆری دەوێت... و تەنها کات بەفیڕۆ دەدەین. دواتر ئەوەم بیرهێنایەوە کە تیمێکی بەڕێوەبردنی ئەمریکا و بەریتانیا کە لە پەنجا کەس پێکهاتبوون لە ماوەی زیاتر

لە دوو مانگدا، ڕۆژانە ٢٤ کاتژمێر ئیشیان کردووە ئەوسا توانیویانە ٢٥ کەس بدۆزنەوە تا لە ئەنجومەنی حوکم'دا بەشدار بن. وتم ئەگەر ئەمە فراوان بکەین، خوا دەزانێ چەنێ کاتی دەوێ. ئەو دواتر وتی باشە ئەگەر ئێمە فراوانکردنەکە رابسپێرینە ئەنجومەنی حوکم خۆی، ئەوکاتە چی دەبێت؟ منیش لە وەڵامدا وتم؛ پۆل! ئەم پیاوانە تا ئێستا هێچ بەهرە و توانایەکیان لە خۆیان پیشاننەداوە بۆ ئەوەی نوێنەرایەتیی خۆیان فراوانتر بکەن... وا دیاربوو کە ڤۆڵفۆویتز قەناعەتی بە قسەکانی من نەکردبوو و بابەتەکەی بردە سەر پرس ئەمنییەکان. وتی باشە ناتوانین مەشق و راهێنانی عێراقییەکان خێراتر بکەین و بۆ ئەوەی شوێنی سەربازەکانی ئەمریکا بگرنەوە..."(پۆل برێمەر، ساڵەکەم لە عێراق، ٢٠٠٦، ل١٧١)

قۆناغی پۆل برێمەر لە بەغدا بە شیوەیەکی سەرنجراکێش قۆناغی دەسەڵاتداری ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٩١٨-١٩٢١ و تەنانەت ١٩١٨-١٩٢٣ بەدەستی سێر ئارنۆلد ویلسن و دواتریش سێر پێرسی کۆکس'ی بە بیری مرۆڤ دەهێنایەوە. بەتایبەتی شۆڕشی ١٩٢٠کە هێشتا لە مێژووی عێراق باس دەکرێت و تێیدا سوننە و شیعەکان و تا ئەندازەیەك هەموو عەرەبەکان و کوردەکان'یش لە باکوور دژ بە دەسەڵاتی ئینگلیزەکان ڕاپەڕین... ئەوکاتەی کە ڕاپەڕینەکان سەرکوت دەکران، بۆ یەکەمجار بەشێوەیکی ڕێژەیی دژ بە کوردەکان گازی ژەهراوی بەکار هێنرا. پۆل ڤۆڵفۆویتز خاوەنی بیرۆکەی گۆڕینی ڕژێم لە عێراق و باوکی ڕۆشنبیریی جەنگی عێراق نەك تەنها لەگەڵ پۆل برێمەر'دا جیاواز بیری دەکردەوە، بەڵکوو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەگەل دۆناڵد رامسفێڵد'یشدا لە ڕەوتێکی جیاواز و پێچەوانەدا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەو ئەندازەیەی کە بەپێچەوانەی کۆڵین پاوڵ کە لە چوار ساڵی یەکەمی سەرۆکایەتیی جۆرج دەبلیۆ بوش'دا وەزیری دەرەوە بوو، بیری دەکردەوە، لەگەڵ هیچ کەسی دیکەدا جیاواز بیری نەدەکردەوە. ناکۆکی ڤۆڵفۆویتز - پاوڵ دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ١٩٩٣ و لە ٢٠٠٣دا جارێکی دیکە سەری هەڵدابووەوە. پۆل ڤۆلفۆویتز لە ساڵی ١٩٩٣دا ڕاوێژکاری سیاسی وەزارەتی بەرگری یاخود پنتاگۆن بوو و لە هەرەمی دەسەڵاتیشدا سێیەم کەسی نێو ئەو وەزارەتە بوو. ئەوکاتەی کە هێزە داگیرکارەکانی سەدام لە کوەیت دەرکران و بەشێوەیەکی شکست خواردوو بەرەو بەغدا هەڵدەهاتن، یان بە واتایەکی دیکە، ئەو کاتانەی کە ڕێگای بەغدا کراوەبوو، ڤۆلفۆویتز تاقە بەرپرسێکی باڵای بەڕێوەبردنی ئەمریکا بوو کە داوای دەکرد هێزەکانیان بەرەو بەغدا بچن. ئەو کاتانە کۆڵین پاوڵ فەرماندەی گشتی سوپای ئەمریکا بوو. ئەویش وەك ژەنراڵ برێنتس سکۆکرۆفت سەردەستەی ڕاوێژکارانی ئاسایشی نیشتیمانی سەرۆك بوش و ژەنراڵ نۆرمان چوارتزکۆف فەرماندەی هێزەکانی ئەمریکا لەبەرەی جەنگ لایەنگری ئەوە بوون کە لە ماوەیەکی کورتدا ئاگربەست ڕابگەیەنرێت و هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق بکشێنەوە. سەرۆك جۆرج ئێچ دەبلیۆ بوش لەگەڵ ژەنراڵ برێنتس سکۆکرۆفت سەردەستەی ڕاوێژکارانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە ٢ی مارتی ١٩٩٨دا وتاوێکی هاوبەشیان لە گۆڤاری تایم'دا

لە ژێر ناوی"بۆچی ئێمە سەدام'مان نەڕووخاند؟"نووسی کە تێیدا هۆکارەکانی لەشکرکێشی نەکردنی سوپاکەیان بۆ بەغدا لە جەنگی ١٩٩١ی کەنداو روونکردبووەوە. لەو کاتانەدا عێراق لە کوەیت کشابووەوە و شکستێکی گەورەی سەربازی خواردبوو و ڕێگای بەغدا'ش بۆ ئەوان کراوەبوو؛

"کۆتایی بەرگرییە کاریگەرەکەی عێراق ئەوەندە خێرا بوو کە بۆ هەموومان مایەی سەرسووڕمان بوو. ئامادە نەبووین بۆ ئەوەی کتوپڕ لە جەنگەوە دەست بە ئاشتی بکەین. ئەوکاتەی گەیشتینە ئامانجە گونجاوەکانی خۆمان و ئامانجە ستراتیژییەکانمان پێکا (دەرکردنی هێزەکانی عێراق لە کوەیت و پەراوێزخستنی سەدام لە ناوچەکە) جەنگمان ڕاگرت. بەڵام بەهۆی هەندێك سنووردارکردنی ناچاریی ئامانجەکانمان و هەروەها نەبوونی ڕێکەوتننامەیەك سەبارەت بە خۆبەدەستەوەدان و بەهۆی تەمومژی جەنگەوە، بەداخەوە لەدوای ئەو رووداوە، چەندین کێشە بە چارەسەرنەکراوی مانەوە و بگرە کێشەی تازەش پەیدا بوون. وەك ئەوەی کە ئێمە و زۆرێك لە هاوپەیمانە عەرەبەکان'مان چاوەڕوانیمان دەکرد، شکستی سەدام نەبووە هۆی ئەوەی کە دەسەڵاتەکەی لە کیس بچێت و لەو رووەوە هیوابڕاو بووین. سەرۆك بوش چەندینجار باسی لەوە کردبوو کە چارەنووسی سەدام حسێن لە دەستی خەڵکی عێراق'دایە. هەندێکجار باسی لەوە کرد کە رووخانی رژێمەکەی سەدام زۆر باش دەبێت، بەڵام هەرگیز بەڵێنی نەدا بە کردەوە پشتگیری لە راپەڕین بکات. سەرەڕای ئەوەی کە هیوایان بەوە هەبوو کە لە ڕێی راپەڕینی خەڵکەوە یاخود لە ڕێگەی کودەتایەکەوە سەدام حسێن لە ناو بچێت، بەڵام نە ئەمریکا و نە هیچ یەك لە وڵاتانی ناوچەکە نەیاندەویست عێراق دابەش بێت. سەبارەت بە هاوسەنگیی هێزەکان لە باکووری ناوچەی کەنداو لە ماوەی درێژخایەندا، نیگەرانیمان هەبوو. هەوڵدان بۆ لەناو بردنی سەدام و گۆڕینی ئۆپەراسیۆنی وشکانی بۆ داگیرکردنی عێراق، پێچەوانەی پرەنسیپەکەمان بوو کە پرەنسیپی نیوەوناتەواو نەهێشتنی ئامانجەکانمان بوو. هەوەها دەبووە هۆی ئەوەی کە زیانێکی مرۆیی و سیاسیی لە رادەبەدەر بێتە ئاراوە. بەئەگەرێکی زۆر گرتنی سەدام حسێن'یش کارێکی نامومکین دەبوو. لە شوێنێکی وەکوو پاناما کە زۆریش شارەزای بووین، نەمانتوانی نۆریەگا بدۆزینەوە. ئێمە ناچار دەبووین بەغدا داگیربکەین و عێراق'یش بەڕێوە بەرین. بەوجۆرەش یەکسەر هاوپەیمانییەکە دەڕووخا و عەرەبەکان بە تووڕەییەوە وازیان لەو هاوپەیمانییە دەهێنا و هاوپەیمانەکانی دیکەشمان دەکشانەوە... داگیرکردنی عێراق واتای ئەوەی دەدا کە ئێمە بەشێوەیەکی تاکلایەنە دەسەڵاتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان پێشێل بکەین و ئەمەش کاردانەوەیەکی نێودەوڵەتی بەدوای خۆیدا دەهێنا. ئەگەر ئێمە ڕێگای داگیرکردنمان هەڵبژاردایە، ئەوکاتە ئەمریکا ناچار دەما لە وڵاتیکدا کە زۆر بەتوندی دوژمنایەتی دەکرێت، وەك هێزیکی داگیرکار بمێنێتەوە..."

ئەگەر بگەڕێینە دواوە - بەتایبەتی لەماوەی نێوان داگیرکردنی عێراق لە ٢٠٠٣-٢٠١١ لەلایەن ئەمریکا-

ئەوکاتە ئەو پاساوانەی سەرەوە کە زۆر بە پاساوی لۆژیکی دێنە بەرچاو، واتای ئەوە دەدەن کە لە راستیدا جەنگی کەنداو بە نیوەوناچڵی ماوەتەوە و نەگەیشتووەتە ئامانجەکانی خۆی و لە هەمانکاتدا هۆکاری سەرەکیی جەنگی ٢٠٠٣ و بیانووی داگیرکردنی ئەو وڵاتەش بوون. لە ساڵی ١٩٩١دا کاتێك کە دەرکەوتبوو واشنتن سەدام لەسەر پێ دەهێڵێتەوە، ڤۆلفۆویتز پێداگری کردبوو کە هیچ نەبێت بۆ ئەوەی سەدام بە لاوازی بهێڵرێتەوە، ناوچەیەکی پارێزراو لە باشوور بۆ شیعەکان دروستبکرێت و بەوجۆرەش دەسەڵاتداری و دەرفەتی جوڵەی حکومەتی بەغدا سنووردار بکرێتەوە و لەوبارەیەوە لەگەڵ کۆڵین پاوڵ ناکۆکی هەبوو. لەو قۆناغەدا کۆڵین پاوڵ پێداگریی لەوە دەکرد کە ئەمریکا هەرچی زووتر لە عێراق بکشێتەوە. ڤۆلفۆویتز باسی ئەوەی بۆ کردبووم کە لەو قۆناغەدا، لە کۆبوونەوە داخراوەکانیاندا لە واشنتن، مشتومڕی زۆری لەگەڵ کۆڵین پاوڵ کردووە و جارێك بە زمانی گاڵتە پێکردنەوە پێیگوتووە؛"پۆل! ئاگات لێ نییە وا بزانم، ئێمە شەڕەکەمان بردۆتەوە."ئەویش لە وەڵامدا وتوویەتی"نەخێر ئێمە سەرنەکەوتووین."بۆ پۆل ڤۆلفۆویتز جەنگی عێراق کۆتایی پێ نەهاتبوو و لەبەر ئەوەش یەکێك بوو لە داهێنەرانی بیرۆکەی جەنگ کە لە ٢٠٠٣دا دەستی پێکردەوە. بەڵام لەو رۆژانەی ٢٠٠٣دا کە بەرەو جەنگ دەڕۆیشت، جارێکی دیکە رووبەڕووی کۆڵین پاوڵ ببوەوە. ئەوکاتانە پاوڵ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا و پۆل ڤۆلفۆویتز'یش کەسی دووەمی وەزارەتی بەرگری ئەو وڵاتە بوو.

پۆڵ ڤۆڵفۆویتز یەکێك بوو لەو بەرپرسانەی ئەمریکا کە زۆر لە تورکیا نزیك بوو و تێڕوانینی لەسەری باش بوو. لەنێو بەڕێوەبەرایەتیدا وەك کەسێك قبووڵ دەکرا کە زیاتر لە هەمووان دەتوانێ تورکیا هەڵبسەنگێنێ، بەڵام دیارترین کەسایەتیی نەیاری ئەو کە کۆڵین پاوڵ بوو. بەر لە جەنگی عێراق هەڵسەنگاندنێکی سەیری سەبارەت بە تورکیا کردبوو؛"... فرانکس (فەرماندەی گشتی سوپای ئەمریکا لەو کاتەدا) هەموو کات لایەنگری لەوە دەکرد کە بژارەی بەرەی باکوور لەبەر دەستدا هەبێت و بەریتانییەکان'یش باسیان لەوە دەکرد کە لە رێی تورکیا'وە هێزەکانیان رەوانەی عێراق بکەن. پاوڵ بە زمانێکی گاڵتەپێکردنەوە لە کۆبوونەوەی دەستەی ئاسایشی نیشتیمانیدا پرسیاری کرد و وتی لە رێگەی گەلیی بۆڵوو دەربازی وشکانی دەبن؟ ئەو مەبەستی لە پیکدادانێك بوو کە لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا بە کارەساتێکی گەورە بۆ هێزەکانی بەریتانیا و ئۆستراليا کۆتایی پێهات و تیایدا ١٠٠ هەزار کەسیان لە دەست دابوو و لە ساڵی ١٩٨١یشدا فیلمێکی لەبارەوە دروستکرابوو. پاوڵ وتی ئێمە سەیری ئەو فیلمەمان کردووە. شتی وا روونادات و بەوجۆرەش پێشنیارەکەی بە شتێکی پڕوپووچ و بێ واتا لە قەڵەم دا. ماوەیەك دواتر، پلانەکە لەسەر ئەوە دانرا کە هێزەکانی ئەمریکا خاکی تورکیا بەکار بهێنن. فرانکس باسی لەوە کرد کە هەموو هێزە پشتیوانەکان و یەکەکانی کەرەستە و پێداویستییەکان و هێزێکی سی تا هەشتا هەزار کەسی لە رێگەی تورکیا'وە دەرباز

بکرێن. رامسفێڵد ئەو کەشتییە بارهەڵگرانەی کە فیرقە چواری هێزی وشکانی هەڵگرتبوو، رەوانەی دەریای سپی کرد تا لە تورکیا پیادە بکرێن. پاوڵ وتی گواستنەوەی هێزێك بەم قەبارە زۆرەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەموو ئەو رێکەوتننانەی لەگەڵ تورکیا کراون بگۆڕدرێن. ئەو وتی؛ هاوڕێیان! ئێوە هێزێکی نزیکەی هەشتا هەزار کەس لە تورکیا تێپەڕ دەکەن؟ ئێستا حکومەتیکی ئیسلامی لەو وڵاتە لەسەر کارە و ئەمە قبوڵ ناکات.'

ژمارەی هێزەکان کەمکرایەوە بۆ چل هەزار کەس و دواتریش بەرز کرایەوە بۆ حەفتا هەزار کەس. پاوڵ دواتر بە دەستەی ئاسایشی نەتەوەیی راگەیاند کە پێمواية تورکەکان دەتوانن مۆڵەتی بەکارهێنانی مەیدانی ئاسمانیی وڵاتەکەیان بدەن و دەتوانن ئەو لایەنەی کارەکە چارەسەر بکەن. بەڵام ئەوەی کە ئێوە باسی دەکەن واتای ئەوە دەدات کاروانی فیرقەیەکی زرێپۆش لە خاکی ئەنادۆڵ'ەوە (پاوڵ حەزی لە بەکارهێنانی ناوە مێژووییەکان بوو و ئەم جارەشیان ناوی پارچەیەکی ئاسیای بۆ تورکیا'ی مۆدێرن بەکار هێنا) بە شەمەندۆفێرێکی دوورودرێژ تێپەڕ ببێت بۆ ئەوەی وڵاتێکی موسڵمانی دیکە داگیر بکات. لەوانەیە من لایەنگری لەمە بکەم، بەڵام ئەمە شتێك نییە کە تەرازووی تورکەکان هەڵیبگرێت. پێموانییە بتوانین ئەمە بەدەست بهێنین و لەوانەیە بۆ بەدەست هێنانی ئەمەش هەموو شتێکمان لەکیس بچێت. ئایا لە راستیدا پێویستمان بەمە هەیە؟'

رامسفێڵد و فرانکس پێیانوابوو ئەمە شتێکی ناچارییە. لە یەکی مارت'دا پەرلەمانی تورکیا داواکارییەکی ئەمریکا'ی بۆ گواستنەوەی یەکە سەربازییەکانی لە رێگەی خاکی ئەو وڵاتەوە رەتکردەوە. فرانکس دواتر باسی لەوە کرد کە فیرقەی چواری پیادە کە لە کەنارەکانی دەریای سپی لە نزیك تورکیا ماتەڵ بوون، ئۆپەراسیۆنێکی هەڵخەڵەتاندن بووە. لە رێگەی بەکارهێنانی سەرچاوە پەیوەندیدارەکان بە سی ئای ئەی، زانیاریی ئەوەیان بە کەسانی نزیك لە سەدام حسێن دابوو کە تورکیا بە نهێنی قبوڵی کردووە هێزەکانی ئەمریکا خاکی وڵاتەکەی بەکاربهێنن و ئەو دەنگدانەش کە لە پەرلەمان کراوە، تەنها فێڵە و هیچیتر نییە. فرانکس پێیوابوو ئەو هەڵخەڵەتاندنە بۆوەتە هۆی ئەوەی کە سەدام ١١ فیرقەی سوپا و سێ فیرقەی پاسەوانەکانی گاردی کۆماری لەبەرەی باکوور بهێڵێتەوە و ئەو فیرقانە لەکاتی خۆیدا نەیانتوانیوە بە هانای بەرەی جەنگەوە لە بەغدا بێن. بەگوێرەی پاوڵ، ئەمەش هەر قسەیەکی پڕوپووچ و بێ واتا بوو."(Bob Woodward, Plan of attack, Simon & Schuster, New York, p.٣٢٤-٣٢٥)

کۆڵین پاوڵ لە ساڵی٢٠٠٣دا سەبارەت بە هەڵوێستی تورکیا پێشبینییەکی راستی کردبوو، بەڵام مێژوو پێشبینییەکانی پۆل ڤۆلفۆویتز'ی بە هەق دەرخست.

ساڵی١٩٩٥لەگەڵ پۆل ڤۆلفۆویتز ئاشنا بووم. ئەوەی کە ئێمەی بە یەکتری ناساند شاها عەلیڕەزا بوو کە دواتر لەگەل پۆل ڤۆلفۆویتز بە یەکەوە بوون و ساڵی ٢٠٠٧ یش بووە هۆی ئەوەی کە ڤۆلفۆویتز واز

لە پۆستی سەرۆکایەتی بانکی نێودەوڵەتی بهێنێت. ساڵی ۱۹۸۵، ئەوکاتەی کە شاها هاوسەری بولەند عەلیڕەزا بوو کە وەك نوێنەری قوبرسی باکوور لە ئەمریکا کاری دەکرد، لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتدا یەکترمان ناسی. ئەوکاتەش یەکەم جارێك بوو کە من پێ بخەمە ناو خاکی ئەمریکا. ئەو وەختەی کە شاها لەدوای تەواوکردنی سکووڵی ئابووری زانکۆی لەندەن لە کۆلێژی ئانتۆنی ئۆکسفۆرد'دا دکتۆراکەی دەخوێند و لەگەڵ بولەند عەلیڕەزا ژیانی هاوسەری پێکهێنابوو و ئەوکاتەش کە لە یەك جیا بوونەوە، من پەیوەندیم لەگەڵ هەردووکیان درێژە پێدا. هەر کاتێ لە واشنتن لە هۆتێل نەدەمامەوە، دەرگای ماڵی هەردووکیان بە رووی مندا کراوە بوو. هەر ئەو دووانەش بوون کە پەیوەندیی منیان لەگەڵ ناوەندەکانی لێکۆڵینەوەی واشنتن بەرقەرار کرد. بولەند دوای ئەوەی کە وازی لە نوێنەرایەتیکردنی قوبرسی باکوور هێنا، لە Carnegie Endowmemt کە مۆرتۆن ئابرامۆڤیتز دوای وازهێنان لە پۆستی باڵیۆزی ئەمریکا لە ئەنقەرە سەرۆکایەتی دەکرد، دەستبەکار ببوو. دوای ئەوەش لە ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی گرنگی دیکە بەناوی CSIS دەست بەکار بوو.

شاهاش لە ناوەندێکی دیکەدا بەناوی National Endowmemt For Democracy کاری دەکرد. شاها لەم دەزگایەدا کە تا ئەندازەیەك رۆڵی هەناردەکردنی دیموکراسی بۆ ئەو وڵاتانە هەبوو کە دیمۆکراسییان تێدا نەبوو، بەرپرسی کاروباری وڵاتانی عەرەبی بوو. بەهۆی ئەو پەیوەندییانەی کە شاها دروستی کردبوو، چەند جارێك لەگەڵ کارڵ گرێشمان رێکخەری NED سەبارەت بە تورکیا و کێشەی سوپا قسەم کردبوو و لەوەش بەدواوە بۆ پێشەکەشکردنی وتار لە کۆنفرانسەکانی NEDبانگهێشت دەکرام. شاها جارێك پێیگوتم پۆل ڤۆلفۆویتز لەنێو وەفدێکی NEDدایە و ئەگەر بمەوێ دەتوانێت دیدارێکم بۆ رێکبخات. ناو و پێگەی گرنگی پۆل ڤۆلفۆویتز'م لەسەردەمی جەنگی کەنداو'دا بە باشی دەزانی و بە خۆشحاڵییەوە پێشوازیم لە پێشنیارەکەی شاها کرد. ڤۆلفۆویتز'یش کاتێك زانیبووی لە رۆژانی جەنگی کەنداودا من راوێژکاری تۆرگۆت ئۆزاڵ بووم، حەزی کردبوو دیدارم لەگەڵ بکات. نیوەڕۆیەك لە کۆنێکتیکۆت ئاڤێنیو، لە رێستۆرانتێکی مالیزی - ئەندۆنیزی کە پۆل ڤۆلفۆویتز هەڵیبژاردبوو، هەرسێکمان بە یەك گەیشتین. قسە و باسەکان هاتە سەر جەنگی کەنداو. پۆڵ ڤۆڵفویتز حەزی دەکرد بزانێت تۆرگۆت ئۆزاڵ لەکاتی جەنگ و قۆناغە گرنگەکانی دوای جەنگدا چۆن بیری کردۆتەوە و چ کاردانەوەیەکی پیشانداوە و دەیویست پشتی پەردەی رووداوەکان لەبەرەی تورکیا بزانێت. من بەشێك لەو رووداوانەی کە خۆم شاهیدی بووم، بۆم باس کرد و ئەویش بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو و بە روونی باسی هەندێك لە مشتومڕەکانی ئەو رۆژانەی نێو بەڕێوەبەرایەتی ئەمریکا'ی بۆ کردم. من هەرچی باسم دەکرد، ئەویش تۆزێك بەسەرسووڕمانەوە ئاگای لە بیروبۆچوونەکانی تۆرگۆت ئۆزاڵ دەبوو و خۆشحاڵ دەبوو بەوەی کە پێشبینییەکانی سەبارەت بە بیروبۆچوونەکانی

خوالێخۆشبوو سەرۆك کۆمار راست دەرچوون. هەرچی ئەویش باسی رووداوەکانی دەکرد، ئەوکاتە من تێدەگەیشتم کە لەگەل بەرپرسێکی ئەمریکایی'دا سەبارەت بە رۆژانی جەنگی کەنداو، سەرەڕای ئەوەی کە ئاگامان لە یەکتری نەبووە، بە یەك رەوتدا رۆیشتووین و بۆچوونەکانمان لە یەکەوە نزیکبوون. قسە و باسەکان ئەوەندە گەرم ببوون و تامی ئەو خواردنە بەلەزەتەی مالیزیا کە تا ئەوکاتە نەمخواردبوو ئەوەندە خۆش بوو کە خەریکبوو ئەو فرۆکەیە لە کیس بدەم کە بڕیار بوو بەوە بۆ تورکیا بگەڕێمەوە.

دیدارێکی نێوان من و پۆڵ ڤۆلڤۆویتز بۆ قسەکردن لەسەر عێراق لەکاتی خواردنی نیوەڕۆی رۆژێکی ساڵی ١٩٩٥، بەهۆی هاتوچۆی من بۆ واشنتن و سەردانەکانی ئەو بۆ تورکیا، گۆڕا بۆ پەیوەندییەکی دۆستانە. ڤۆلفۆویتز لە ساڵانی دەسەڵاتداریی کلینتۆنی دیمۆکراتدا، راگری ناوەندی لێکۆڵینەوەی SAIS سەر بە زانکۆی ژۆن هاتکینگزی واشنتن بوو کە ناوەندێکی گرنگ بوو بۆ وەرگرتنی ماجستێر و دکتۆرا. هەرچەندە پێشتر لە وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی بەرگریدا لە ئاستێکی باڵادا پۆستی وەرگرتبوو و لەو کاتانەشدا دەسەڵات لە دەستی دیمۆکراتەکاندا بوو، بەڵام بەپێی ئەو نەریتە باوەی کە لە ئەمریکا هەیە، ئەو یەکێك بوو لە کەسایەتییە بەناوبانگەکانی ناوەندی SAIS و وەکوو راگری ئەو ناوەندە لەنێو دەستە بژێری سیاسیی ئەمریکا'دا پێگەیەکی گرنگی هەبوو.

ئەو پەیوەندییەی من کە بەتایبەتی لە ساڵانی ١٩٩٠کانەوە لەگەڵ پۆل ڤۆلفۆویتز'دا گەشەی کردبوو، هیچ پەیوەندییەکی بەو روخسارەی ناوبراو نەبوو کە لەکاتی جەنگی عێراق لە ساڵانی ٢٠٠٠کاندا لە جیهان دەرکەوتبوو. کەسێك بوو کە بە روونی و راشکاوی بیروبۆچوونەکانی خۆی دەهێنایە سەرزمان و هەندێك جاریش بە زمانێکی تەنزئامێز و رەخنەگرانە باسی بەڕێوەبەرە بەناوبانگەکانی ئەمریکا و تەنانەت بەرپرسانی CIAی دەکرد. ئەو تەنانەت بیروبۆچوونەکانی خۆیشی سەبارەت بەو کەس وداموودەزگایانە، لە کەسێکی بیانیی وەکوو من کە پیشەکەیشی رۆژنامەوان بوو نەدەشاردەوە. ئەوکاتەی کە وەك ئەندازیاری رۆشنبیریی جەنگی عێراق و کەسی دووەمی پنتاگۆن ناوبانگی دەرکردبوو، لە واشنتن بەسەرهاتی جۆراوجۆرم لەبارەی ئەو دەبیست سەبارەت بەوەی کە بەشێوەیەکی لووتبەرزانە کارمەندەکانی خۆی شکاندووە. ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە من بە تایبەتمەندییەکی زۆر پێچەوانەوە کە بەئەندازەیەکی سەرنجڕاکێش خاکیبوونی پێوە دیاربوو، پۆل ڤۆلفۆویتز'م ناسیبوو.

لە مایسی ساڵی ١٩٩٨کە من کرابوومە ئامانجی بەیاننامەیەکی فەرماندەیی گشتی سوپا، پۆل ڤۆلفۆویتز بۆ کۆبوونەوەیەکی نێودەوڵەتی سەردانی ئیستانبوڵی کرد و لەوێش وەکوو یەکەم کاری خۆی، تەلەفۆنی بۆ من کرد:"بیستوومە کە تووشی بەڵا بووی. با پێکەوە قسە بکەین بزانین دەتوانین چی بکەین."و لەکاتیکدا کە تەنانەت کەسانی زۆر نزیك لە من لە ترسی سوپا، لە رۆژانی دوای ٢٨ی شوبات'دا وەکوو ئەوەی کە

نەخۆشیی وەبام هەبێت لە من دوور دەکەوتنەوە، ئەو دەستی هاوکاریی بۆ من درێژ کردبووەوە. لە کۆبوونەوەکەی کۆشکی چراخانی ئیستانبوڵ لەبەر چاوی چەویك بیر، فەرماندەی دووەمی سوپای تورکیا کە وەکوو سیمبۆڵی قۆناغی ٢٨ی شوباتی لێهاتبوو، هەستایە سەر پێ و هاتە سەر مێزەکەی من و باوەشی پێدا کردم و بەجۆرێک کە ئەو گوێی لێ بیت پێی وتم؛"حەتمەن لەدوای خواردن با یەکتری ببینین"و بەوجۆرەش پشتیوانیی خۆی بۆ من ئاشکرا کرد. ڤۆلفۆویتز پابەندی سوپا نەبوو، بەڵکوو پشتیوانی لە چەمکی دیموکراسی دەکرد. ئەوکاتەش کە پیاوی دووەمی پنتاگۆن بوو، ژەنراڵەکان حەزیان لە چارەی نەدەکرد. لەکاتی جەنگی کەنداویشدا هیچ کات خۆشیان نەبویستبوو. ژەنراڵ نۆرمان چوارتزکۆف کە لەکاتی جەنگی کەنداودا یەکێك لە فەرماندە مەیدانییەکانی ئەمریکا بوو، لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا باسی ئەوە دەکات کە بەهۆی ئەوەی شتێکی کردەیی نەبووە، دژایەتیی پلانێکی ڤۆلفۆویتز'ی کردووە و دەڵێت؛"ئەوکاتەی کەسێکی مەدەنی دەکەن بە بەرپرسیاری سەربازە پرۆفشناڵەکان، زۆر تێناپەڕێت کە ئەو نەك تەنها سیاسەت دەستنیشان دەکات، بەڵکوو وەك ژەنراڵی ژەنراڵەکانیش دەجوڵێتەوە."

ساڵی ١٩٩٨ بەئەندازەیەک کە هەستە تایبەتەکانی خۆمان بۆ یەکتری باسبکەین، لە یەك نزیك بووینەوە. لەو ژنەی کە سی ساڵ هاوسەری بوو جیا دەبووەوە و لە قۆناغێکی پڕ لە ئاڵۆزی و دژواریدا دەژیا. لە نووسینەکانیدا بۆ من بە دڵکراوەیی و بە ئاشکرا هەموو کێشە و گیروگرفتەکانی باس دەکرد. لەو کاتانەدا منیشدا باوکم لە دەسدابوو. لە مانگی ١٠ی ١٩٩٨دا، لەو رۆژە پڕ ئازار و مەینەتییانەی من لە ئیستانبوڵ بوو. باسی ئەوەی بۆ کردم کە باوکەکان چ واتایەکیان بۆ کوڕەکانیان هەیە و هەروەها باسی هەستەکانی خۆی لەدوای مەرگی باوکی بۆ من کرد. لەو رۆژانە یەکێك لەو گەرمترین سەرەخۆشییانەی کە لێم کرا، ئەو سەرەخۆشییە بوو کە ڤۆلفۆویتز لە منی کرد. پرۆفیسۆر جاکۆپ ڤۆلفۆویتزی باوکی ڤۆلفۆویتز لە تەمەنی نۆ ساڵیدا وەك پەنابەرێکی جوولەکەی پۆڵۆنی لە نیۆیۆرك نیشتەجێ بووە. ئەو یەکێك لە زانا بەناوبانگەکانی بواری بیرکاری جیهان بوو. سەرەڕای ئەوەی کە دەزانرێت جاکۆپ ڤۆلفۆویتز کەسێکی زایۆنی بووە، بەڵام بە بیرم نایەتەوە هیچ جارێك لەگەڵ پۆل ڤۆلفۆویتز باسی زایۆنیزم و ئیسرائیل'مان بەیەکەوە کردبێت. ئەویش هیچ کاتێك پرسیاری رۆژانی منی لەنێو جووڵانەوەی بەرگریی فەلەستین لە ساڵانی ١٩٧٠کاندا نەکرد و هیچ کات پرسیاری رابردووی لە من نەکرد. وەك ئەوەی گرێبەستێکی رانەگەیەنراو لەنێوانماندا هەبێت، لە گفتوگۆکانماندا کە چەندین سەعاتی خایاندووە، لە ماوەی پانزە ساڵدا هیچ کات باسی پەیوەندییەکانی ئەو لەگەڵ ئیسرائیل و پەیوەندییەکانی من لەگەڵ فەلەستین نەکرا. من دەمزانی لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا بەشێك لە بنەماڵەکەی لە رووداوی هۆلۆکۆست لە دەستداوە، بەڵام هیچ تەوەرێکی گفتوگۆکانی نێوان من و پۆل ڤۆلفۆویتز تایبەت بۆ هۆلۆکۆست تەرخان نەکرا. بابەتێکم لەسەر ژیاننامەی ئەو خوێندەوە

کە بەمجۆرە باسی دەکرد؛

"دەکرێ چوار هێڵی باریك لە ڕەوتی گەشەکردنی ڕۆشنبیریی پۆل ڤۆلفۆویتز'دا دەستنیشانبکرێن؛ ریشەی پۆڵۆنی-جوولەکە، مانەوەی لە زانکۆی شیکاگۆ کە وەك بازاڕێکی کراوەی بیرۆکە گەورەکان وایە، دوو ژنی گرنگ؛ یەکیان کارلا سێنگین کە ماوەی سی ساڵ هاوسەری بووە و ئەنترۆپۆلۆگێکی بە ناوبانگ بووە و ئەوی دیکەشیان فێمینیستێکی عەرەب واتە شاها عەلیڕەزا'یە کە تا ماوەیەك بەر لە ئێستاش هاوڕێی بووە و لەگەڵی ژیاوە و وەك خاڵی کۆتایی، دۆستایەتیی لەگەڵ ئەو عێراقی'یانەی کە لە دوورخراوەییدا ژیاون بە تایبەت ئەحمەد چەلەبی."(Karl E. Meyer, Shareen Blair Brysac, Kingmarkers- The Invention of the Moden Middle East, New York, ٢٠٠٨, p. ٣٨٨)

لە ماوەی چەندین سەعاتدا لە ئیستانبوڵ لە ماڵەکەی خۆم بە حەز و سەرنجەوە، گوێم لە وتەکانی ڤۆلفۆویتز دەگرت سەبارەت بەوەی کە بەرامبەر بە ڕژێمە سەرکوتکارەکان هەستناکە و حەزیان لێ ناکات و لە مێژووی نزیکیشدا ڕۆڵی هەبووە لەوەی کە ئەو ڕژیمانە بڕووخێنرێن. ڕووخانی ڕژێمی مارکۆس لە فیلیپین لە سەردەمی سەرۆکایەتیی ڕۆناڵد ڕێگان، کە ساڵی١٩٨١ هاوپەیمانی ئەمریکا بوو، لەگەڵ ڕۆڵی ڤۆلفۆویتز لە گوزەری ئەو وڵاتە بەرەو دیموکراسی، ڕێخۆشکەر بووون تا ناوبراو ببێتە باڵیۆزی ئەمریکا لە ئەندۆنیزیا. ڤۆلفۆویتز لە ئەندۆنیزیا قەناعەتێکی بەهێزی بەوە کردبوو کە ئیسلام و دیموکراسی دژی یەك نین و لەوانەبە ئەو دووانە پێکەوە هەڵبکەن. ئەندۆنیزیا جەنجاڵترین و قەرەباڵغترین وڵاتی موسوڵمان بوو لە جیهاندا و ئەو ئۆپۆزیسیۆنە سەرەکییەی کە لەو وڵاتەدا مەیلێکی دیمۆکراتیکانەی بەهێزی هەبوو، زیاتر لە ئیسلامییەکان پێك دەهات. زۆری پێنەچوبوو کە ڤۆلفۆویتز توانیبووی لەگەڵ ئەوانەدا پەیوەندی بەرقەرار بکات. ئیسلامیەکانی ئەندۆنیزیا'ش لەگەڵ ئەم ئەمریکییە جوولەکەیەدا پەیوەندییەکی پتەو و متمانەپێکراویان دروستکردبوو. دواتر لە وتارێکدا ئەم دێڕانەم سەبارەت بە پۆل ڤۆلفۆویتز خوێندبۆوە؛

"... بە پێتەر ژی بوێر لە نیویۆرکەر'ی وتبوو؛ من چاوەڕوانیی ئەوەم نەدەکرد کە عاشقی ئێرە بم، بەڵام ئەوە ڕوویدا. لە ئەندۆنیزیا شتێك هەبوو کە رووی دەمی لە من دەکرد..."ڤۆلفۆویتز لەگەڵ عەبدوڕەحمان وەحید سەرۆکی ئۆپۆزیسیۆن ئاشنا بوو کە کەسێکی موسوڵمان و دیندار و شارنشین بوو و لایەنگریی لە جیاکردنەوەی مزگەوت و دەوڵەتی لە یەکتری دەکرد و پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ وەحید بەرقەرار کرد. ڤۆلفۆویتز وەك پیاوێکی سەرنجڕاکێش باسی وەحید'ی کرد."دەمەوێ بڵێم ئەو سەرکردەی یەکێك لە گەورەترین ڕێکخراوە ئیسلامییەکانە و حەوارییەکی سینگ فراوانی و لێبوردەییە. چۆن دەتوانن حەیرانی ئەم مرۆڤ نەبن؟"دوایین جارێك کە وەك باڵیۆز لەگەڵ ژەنراڵ سۆهارتۆ دیداری کردبوو، پێداگری لەسەر گۆڕانکاری دیموکراتی کردبوو. ئەمەش ئەو ئۆتۆکراتە پیرەی تووڕە کردبوو. ماوەیەك دواتر ئەو ڕێکخراوە

ئیسلامییه گۆڕا بۆ پارتێکی سیاسی و له یەکەم هەڵبژاردنی ئازادی ئەندۆنیزیا سەرکەوتنی به دەستهێنا و عەبدوڕەحمان وەحید وەك سەرۆك كۆماری وڵات هەڵبژێردرا.”(هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە، ٣٩٨-٣٩٩)

بۆ ماوەی چەندین سەعات باسی عەبدوڕەحمان وەحید'م له ڤۆلفۆویتز'ەوە بیستبوو که به گوزارشتێکی منالانه و پڕ جۆش و خرۆشەوە باسی دەکرد. هەر له هەمان گفتوگۆدا باسی ئەوەشی بۆ کردم که حەز له سوپا و بەتایبەتی رژێمه دیکتاتۆرەکان ناکات. بیروبۆچوونەکانیشی سەبارەت بەوەی که بۆ بەرقەراربوونی دیموکراسی له عێراق پێویسته رژێمی سەدام بڕووخێت، چەند ساڵێك بەر لەو کاته شکڵی گرتبوو. گەشەکردنی بیرۆکەی گۆڕینی رژێمی عێراق له مێشکی پۆل ڤۆلفۆویتز'دا دەگەڕایەوە بۆ مێژوویەکی کۆنتر. هەر لەو کاتەی که زۆرکەس نەیدەناسی و ئەمریکا ستراتیژی خۆی له ناوچەکەدا لەدوای شۆڕشی ئیسلامی ئێران سەبارەت به ئەمنی وڵاتانی کەنداو لەسەر بنەمای"هەڕەشەی ئێران”دانابوو. ئەو له ساڵی ١٩٧٩دا راپۆرتێکی سەبارەت به رۆڵی عێراق له هەڕەشەکردنی ئێران له ئاسایشی وڵاتانی کەنداو بۆ پنتاگۆن ئامادە کردبوو. لەو کاتانەدا که ئەمریکا دەیویست بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئێران، پشتیوانی له رژێمی سەدام له عێراق بکات، ئەو راپۆرتەی ئەو له ریزە تۆزگرتووەکانی بەڕێوەبردنی ئەمریکا هەڵگیرا. لەوبارەیەوە ئەم دێڕانەی راپۆرتەکە سەرنجراکێش بوون؛

”عێراق بووەته هێزێکی سەربازی گەورە له کەنداو و ئەمەش رووداوێکی جێی نیگەرانییه. ئەگەری ئەوە زۆرە که عێراق له داهاتوودا هێزە سەربازییەکانی خۆی دژی وڵاتانی ناوچەکە و بەتایبەتی کوەیت و عەرەبستانی سعوودی بەکار بهێنێت. (وەك چۆن له ساڵی ١٩٦١دا له رێی دەستوەردانی بەریتانییەکان لەکاتی خۆیدا، قەیرانی کوەیت چارەسەرکرا) ناکرێت تەنها بەوەوە راوەستین که رێگا له داگیرکارییەکی عێراق یان نمایشکردنی هێزی ئەو وڵاته بگرین و بەرژەوەندییەکانی خۆمان و عەرەبستانی سعوودی بپارێزین، بەڵکوو دەبێ له هەمانکاتدا توانا و بەرپرسیاری خۆمان بۆ هاوسەنگکردنی هێزی عێراق پیشانبدەین. ئەمەش لەوانەیە پێویست بەوە بکات که ئەمریکا هێزی خۆی بەشێوەیەکی روون و ئاشکراتر پیشان بدات...”(وتارێکی تیمۆتی نۆواه که له ڤێبلاگێکی ئینتەرنێتیدا بەناوی Chatterbox بڵاوکراوەتەوە و بەشێکی زانیارییەکانی له خودی راپۆرتەکەی ڤۆلفوویتز بەناوی, Capabilities for Limited Contingencies in the Persian Gulf٢٩ی مارتی ٢٠٠٤ وەرگرتووە.)

دوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق'ەوە له ساڵی ١٩٩٠دا ئەو راپۆرتەی ڤۆلفۆویتز که له ساڵی ١٩٧٩ ئامادەی کردبوو، له ئەرشیڤەکانی پنتاگۆن دۆزرایەوە و توانای پێشبینیکردنی پۆل ڤۆلفۆویتز بوونه هۆی ئەوەی که متمانه به ناوبراو له سیستەمی ئەمریکا زیاتر بێت. هەرچەنده عێراق بۆ پۆل ڤۆلفۆویتز

وەك تاقیگەیەك وابوو بۆ ئەوەی كە وڵاتێكی موسوڵمان بەرەو دیموكراسی (بە ئیلهام وەرگرتن لە توركیا و ئەندۆنیزیا) گوزەر بكات، بەڵام هەڵسەنگاندنی هەڵوێست و نزیكایەتییەكانی ئەو بەوەی كە تەنها لە روانگەیەكی ئایدۆلۆژیكییەوە جوڵاوەتەوە، هەموو راستییەكان دەرناخات.

پۆل ڤۆلفۆویتز لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا دەركەوتووە و بەر لە هەموو شتێك تیۆریسیەنێكی ئەمریكیی بواری ئاسایشە. ئەو بیروبۆچوونانەی پۆل ڤۆلفۆویتز كە لە ساڵانی جەنگی سارد'دا دژی سیاسەتی DETELTE بوو، لەگەڵ دیپلۆماسیی كیسنجەر'دا یەكی نەدەگرتەوە. ئەو لە ژێر كاریگەری بۆچوونەكانی پرۆفیسۆر ئاڵبێرت هووس تێتێر، ستراتیژیستی ئەتۆمی و زانای سیاسیدا بوو كە لە زانكۆی شیكاگۆ مامۆستای بوو.

ڤۆلفۆویتز خۆی باسی ئەمەی بۆ من كردبوو. لە گەشتێكمدا لەنێو فڕۆكە كە لە نیۆیۆرك'ەوە بۆ واشنتن دەچوو، پاشكۆی رۆژی یەك شەممەی رۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز'م دەست كەوت كە لاپەڕەی یەكەمی بە تەواوەتی تەرخانكرابوو بۆ كاریكاتێرێك كە تێیدا پۆل ڤۆلفۆویتز بە جلوبەرگی سەربازی رۆماییەكان'ەوە پیشاندرابوو.

بابەتی سەرەكیی بەرگی پاشكۆی رۆژنامەكە، جەنگی عێراق و فەیلەسووف لیئۆ ستراوس (١٨٩٩-١٩٧٣) بوو كە وەك سەرچاوەی ئیلهامی نیۆكۆنسێرڤاتیڤەكان ناوبانگی دەركردبوو كە سیاسەتی بەڕێوەبردنی ئەمریكا'یان بە دەستەوە گرتبوو. نیۆكۆنسرڤاتیڤە بەناوبانەگەكانی ئەمریكا و لەسەرووی هەمووشیانەوە پۆل ڤۆلفۆویتز بە مورید و شاگردی لیئۆ ستراوس لە قەڵەم دەدران. ئەوە وەك شەجەرەنامەیەكی تایبەت بە نیۆكۆنسرڤاتیڤەكان دروست كرابوو كە لەسەروو هەموویانەوە لیئۆ ستراوس دانرابوو و لە خواریشەوە پۆل ڤۆلفۆویتز جێگیر كرابوو و دوابەدوای ئەویش كەسانی وەكوو ریچارد هێرلی، ئابراهام شووڵسكی، ویلیام كریستۆڵ، فرانسیس فۆكۆیاما و لووئیز سكۆتێر و كەسانی لەو جۆرەی پێ زیادكرابوو و بەشێوەیەكی فراوان باسی چیرۆك و بەسەرهاتی لێئۆ ستراوس و موریدەكانی كرابوو. هەر هەمان شەو لە ماڵی شاها لە واشنتن نووسینەكەی ناو رۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز'م پیشانی پۆل ڤۆلفۆویتز'دا و ئەویش شانی هەڵتەكاند و خۆی گرژ كرد و وەكوو ئەوەی كە هیچ گرنگییەك بە دەق و وێنەكان نەدات وتی؛"ئەوە هەڵەیە. من لە زانكۆی شیكاگۆ تەنها چەند وانەم لە لئیۆ ستراوس وەرگرتووە و ئەو مامۆستایەی كە كاریگەریی زۆری لەسەر من داناوە، ئالبێرت هوڵز تێترت'ە." لایەنی سەرنجڕاكێشی پرسەكەش ئەوە بوو كە پۆل ڤۆلفۆویتز خۆی بە كەسێكی نیۆكۆنسرڤاتیڤ نەدەزانی.

نزیكەی هەفتەیەك دوای ئەوەی كە جۆرج دەبلیۆ بووش لەسەر كەشتییەكی جەنگیی ئەمریكا بە رەسمی كۆتاییهاتنی جەنگی عێراقی راگەیاند، كتێبێكی ویلیان كریستۆڵ، كەسی ژمارە یەكی نیۆكۆنسڤاتیڤەكان و

لاورنس فریدمان بەناوی The War on Iraq لە واشنتن کەوتبووە بازار. ئەمە نوێترین هەڵسەنگاندنی لایەنی ئەمریکی سەبارەت بە جەنگ بوو. لە ماڵی شاها کتێبەکەم پیشانی پۆل ڤۆلفۆویتز دا و وتم کتێبی ئەوانەی لای تۆ چاپ بووە. چاوێکی بە کتێبەکەدا خشاند و وتی؛"مەبەستت لەوانەی لای تۆ چییە؟"

-"نیۆکۆنسێرڤاتیڤەکان"

-"خۆ من نیۆکۆنسێرڤاتیڤ نیم!"

ئاماژە جدییەکانی روخساری بەس بوون بۆ ئەوەی کە مرۆڤ بزانێت گاڵتە ناکات و درێژەی پێدا و وتی؛"لە راستیدا خاڵی هاوبەشم لەگەڵ نیۆکۆنسێرڤاتیڤەکان هەیە، بەڵام لەوان نیم..."

-"ئەی خۆت چۆن پێناسە ئەکەیت پۆڵ؟"

-"پرسیارێکی باشە. ماوەیەکی زۆر بیرم لە وەڵامی ئەم پرسیارە کردۆتەوە. گونجاوترین وەڵامێك کە دۆزیبێتمەوە ئەوەیە کە دەتوانم بڵێم کەسێکی ئایدیالیستی پراکتیکیم. هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە تا ئەندازەیەك نزیکەی هەموو هاوپەیمانە سیاسییەکانی پۆل ڤۆلفۆویتز و هاوڕێکانی ئیش و کاری لە کەسانی بەناوبانگی نیۆکۆنسرڤاتیڤەکانی ئەمریکا و لایەنگرە پڕ جۆش و خرۆشەکانی ئەو رەوتەن. لەبەر ئەوەی کەسانی نزیك لە ژینگەی سیاسی ئەو لەنێو ژیانی سیاسی ئەمریکا خاوەن قسە و دەستڕۆیشتوو بوون و هەروەها لە ئاستی دنیاشدا هاوڕێ نزیکەکانی ئەو کەسانێکی نیۆکۆنسرڤاتیڤ بوون و بە لایەنگری ئیسرائیل ناوبانگیان دەرکردبوو و هەروەها لەبەر ئەو رۆڵەی کە لە جەنگی عێراق'دا گێڕابووی، قەناعەتێکی باو لەسەر پۆل ڤۆڵڤۆویتز سەبارەت بە رۆڵە نێگەتیڤەکانی بەشێوەی جۆراوجۆرەوە بڵاو ببووەوە.

بەهۆی ئەو جیاوازییە قووڵانە و هەروەها ئەو جەمسەرگیرییانەی کە لەنێو دەستە بژێری سیاسی ئەمریکا بەتایبەتی لەگەڵ جەنگی عێراق'دا درووست ببوون، پۆل ڤۆلفۆویتز کرا بە ئامانجی رەخنەکان. بۆیە ئەو ناچار بوو کە بەرەو هاوپەیمانی بڕوات. ئەو جەنگە توندەی کە لەنێو دەسەڵاتدا لە واشنتن هەبوو و هەروەها نیگەرانییەکان سەبارەت بە مانەوەی سیاسی لەوانەیە بووبێتە هۆی ئەوەی کە بیرکردنەوەی تایبەتی ڤۆلفۆویتز و رێبازە سەربەخۆکەی لەگەڵ هاوپەیمانەکانیدا لێك جیا نەکرێتەوە. دێنیز رۆس لەو کاتانەدا کە ڤۆلفۆویتز بەڕێوەبەری نووسینگەی پلاندانانی سیاسی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بووە لەگەڵیدا کاری کردووە و دواتریش بووە بە یەکەم دیپلۆماتی ئەمریکا لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، ئاگای لە تایبەت بوونی کەسایەتیی ڤۆلفۆویتز هەبوو. ئەو لە لێدوانێکدا بۆ رۆژنامەی نیۆیۆرك تایمز سەبارەت بە ڤۆڵفۆویتز وتبووی؛"ڤۆلفۆویتز خاوەنی تایبەتمەندییەکە کە لەو رەوتە سیاسییە جیای دەکاتەوە کە لەگەڵیدا کار دەکات... هۆکارەکەی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە رووی رۆشنبیرییەوە زیاتر لە هەر کەسێکی ئەو رەوتەی کە تێیدا کاری دەکرد، بە رووی بیروبۆچوونی جیاوازدا کراوە بوو."(William Keller, The

(Sunshine warrior, New York times, Sunday magazine, ٢٠٠٢/١٠/٢٢)

لەوانەیە پۆڵ ڤۆڵفۆویتز گرنگی زۆری نەدابێت بەوەی کە بیروبۆچوونە جیاوازەکانی خۆی لەگەڵ کەسانی دیکە بەشێوەیەکی روون دەربخات و هێڵە جیاکەرەوەکانی بیروبۆچوونی خۆی ئاشکرا بکات. شتی گرنگ بۆ ئەو، هێزی ئەمریکا بوو کە لە ناوەندی دکتۆرینە ئەمنییەکاندا وەك هێڵێکی سەرەکی سەیری دەکرد و ئەمەش یەکێك لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی دیدی ستراتیژی ئەو پێکدەهێنێت. جارێك لە واشنتن سەبارەت بە هاوسەنگیی هێزە نێودەوڵەتییەکان لە سەدەی بیست و یەکەم و بەهێزبوونی چین گفتوگۆیەکی فەلسەفیمان کرد کە تێیدا وتی؛"لەوانەیە یەکێك لە هۆکارە فەلسەفییە شاراوەکانی پشتی جەنگی عێراق بەهێزبوونی چین بێت کە تۆزێك بەر لە ئێستا باسمان کرد. بۆ ریگرتن لە بەهێز بوونی چین کە توانای بوون بەدەوڵەتێکی گەورەی تێدایە، هەر لە ئێستاوە هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەی ستراتیژیی کەنداو، لەوانەیە یەکێك لەو هۆکارانە بێت کە بتوانێ جەنگی عێراق روونبکاتەوە."زۆر بەلامەوە سەرنجڕاکێش بوو کە شیکردنەوەیەکی ئاوەها لە زاری کەسێکی وەکوو پۆل ڤۆلفۆویتز'ەوە ببیستم کە بۆ خۆی ئەندازیاری جەنگی عێراق بووە و بەجۆرێک شیکردنەوەی بۆ رووداوەکان دەکرد کە وەکوو ئەوە وا بێت دەستی لەو جەنگەدا نەبووە و تەنها وەك مامۆستایەکی زانستی سیاسی لە روانگەیەکی مێژووییەوە شیکردنەوە بۆ رووداوەکان دەکات و مەودایەك لەنێوان خۆی و رووداوە مێژووییەکاندا دادەنێت. مانەوەی ئەمریکا وەك زلهێزێکی جیهان لە دنیای تاك جەمسەریدا لەدوای جەنگی سارد بۆ ڤۆڵفۆوتیز بۆ ئەوە پێویستبوو کە ئەمریکا هێزەکەی خۆی لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجە بەنرخ و رەواکاندا بەکار بهێنێت و ئەو بەهێز بوونەی ئەمریکا'ش لە روانگەی ئەوەوە ورەی ئەمریکا'ی بەرزتر دەکردووە.

هەر لەسەرەتای پێکدادانەکانی بۆسنا و هەرسك'ەوە، ڤۆلفۆویتز لایەنگری ئەوە بوو کە هێزی سەربازی ئەمریکا لە دژی سربەکان بەکار بهێنرێت و رێگا لە قەتڵوعامی بۆسنا بگیرێت. هەر بە هەمان بیرکردنەوە و بە هەمان لۆژیکەوە داوای ئەوەی دەکرد کە هێزی ئەمریکا لە کۆسۆڤۆ بۆ پاراستنی ئەلبانییە موسوڵمانەکان بەکار بهێنرێت و لە دژی سربەکان و سلۆبۆدان میلۆسۆویچ سەرۆکی دەوڵەتی یۆگۆسلاڤیا بەکار بهێنرێت. ئەو پێیوابوو بەکارهێنانی هێزی ئەمریکا لە عێراق لەوانەیە رێگا بکاتەوە بۆ ئەوەی کە رژێمی سیاسی لە عێراق بگۆڕێت و دیموکراسی لەوێ جێگیر بکرێت. تورکیا'ش دراوسێی عێراق بوو. تورکیا لە روانگەی ئەوەوە نموونەیەك بوو کە لە ئەندۆنیزیا سەرکەوتووتر بوو. تورکیا وڵاتێکی موسڵمانی عەلمانی دیموکراتیك بوو کە هاوشێوەی ئەندۆنیزیا نەك لە پەڕاوێزی هێڵە سەرەکییەکانی سیاسەتی نێودەوڵەتی بەڵکوو لە ناوەڕاستی ئەو هێڵانەدا بوو و بەشێکیشی لەنێو خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'دا بوو. لە ساڵەکانی ١٩٨٠کاندا، ئەوکاتەی ڤۆلفۆویتز لەنێو بەڕێوەبردنی ئەمریکا لە ئاستی بەرزدا پۆستی جۆراوجۆری وەردەگرت، لەنێو

بەڕێوەبەرانی ئەو وڵاتەدا یەکێك بوو لەو ژمارە کەمانەی کە خۆیان بە دۆستانی تورکیا دەناساند. بە تێپەڕبوونی کات، سەرنج و بایەخدانەکانی بە تورکیا زیاتر بوو. لە جەنگی کەنداویشدا بەهۆی تورگەت ئۆزال'ەوە ئەو سەرنجدانە بوو بەسەرسام بوون و حەیران مانەوە. لە ساڵی ٢٠٠٢دا ئەوکاتەی کە ئەمریکا بەرەو جەنگی عێراق دەڕۆیشت، بە سوود وەرگرتن لە پێگەی نوێ و کاریگەری خۆی، ڤۆلفۆویتز دەیویست کە تورکیا لەو پلانە سیاسییەی کە بۆ عێراق دایانابوو، نەك یەکێك لەبەردەکانی بناغە بەڵکوو بەردی بناغە بێت. لە پاییزی ٢٠٠٢دا پۆل ڤۆلفۆویتز ئاسوودە بوو بەوەی کە پارتی داد و گەشەپێدان توانیویەتی بە تەنها دەسەڵات بگرێتە دەست. سەرەڕای ئەوەی کە ئەو پارتە، پاشخانێکی ئیسلامی هەبوو، بەڵام پارتێك بوو کە ڕێگای دیموکراتیکی هەڵبژاردبوو و لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە هاتبووە سەر دەسەڵات و بۆ کەسێکی وەکوو ڤۆلفۆویتز'یش کە لە ئەندۆنیزیا عەبدوڕەحمان وحید'ی ناسیبوو و سینگ فراوانی و میانڕەوی و دیموکراتیك بوونی بزووتنەوەیەکی ئیسلامی و تەنانەت عەلمانی بوونیشی لەو جووڵانەوەیەدا بینیبوو، هاتنە سەرکاری پارتی داد و گەشەپێدان شتێك نەبوو کە نیگەرانی بکات. تەنانەت ئەمەشی وەك دەرفەتێکی دیکە بینی بۆ ئەوەی پرسی گونجانی ئیسلام و دیموکراسی لەگەڵ یەکتر باشتر ئاشکرا بکرێت. ئەو هیچ گومانێکی نەبوو لەوەی کە تورکیا'یەکی ژێر دەسەڵاتی پارتی داد و گەشەپێدان، بەپێچەوانەی ئەمریکا ناجوڵێتەوە کە هاوپەیمانی کۆنی بووە. تەنانەت بڕوای بەوە هەبوو کە پێویستە دەسەڵاتی پارتی داد و گەشەپێدان و شوناسە ئیسلامییەکەی لەنێو دەسەڵاتی تورکیا جێگیر بکرێت و پێیوابوو پشتیوانیی تورکیا'یەکی وەها لەلایەن ئەمریکا، دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەنجامەکانی جەنگی عێراق گەرەنتی بکرێت. لەبەر ئەوەش سەرەڕای ئەوەی کە تایب ئەردۆغان قەدەغەی سیاسیی لەسەر بوو، دەرگاکانی کۆشکی سپی بە ڕوویدا کردەوە. تایب ئەردۆغان لەو دەروازەیەوە کە بۆی کرایەوە و لە ڕێگەی ئەو ڕەواییەی کە لە یەکێك لە زلهێزترین وڵاتەکانی جیهانەوە بەدەستی هێنابوو، لە تورکیا ڕێگای وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیرانی بۆ خۆش بوو.

ڕێگا لەوە گیرابوو کە ڕەجەب تایب ئەردۆغان سەرۆکی گشتی پارتی داد و گەشەپێدان بەشداری لە هەڵبژاردنەکاندا بکات، بەڵام حیزبەکەی لە هەڵبژاردنی ٢٠٠٣/١/٢دا بردییەوە و هاتەسەر دەسەڵات و بەوجۆرەش پۆستی سەرۆکایەتی وەزیران لەلایەن عەبدوڵا گویل، کەسی ژمارەی دووی ئەو حیزبە لەدوای ئەردۆغان'ەوە وەرگیرا. سەرەڕای ئەوەی کە حکومەتی داد و گەشەپێدان بەسەرۆکایەتی عەبدوڵا گویل پێکهاتبوو، خودی تایب ئەردۆغان'یش بەر لە وادەی کۆبوونەوەی لووتکەی یەکێتی ئەورووپا لە کۆپنهاگن، کەمپینێکی بەهێزی بۆ قەناعەتپێکردنی وڵاتانی ئەندام لە یەکێتی ئەورووپا دەست پێکردبوو بۆ ئەوەی کە دانووستانەکانی ئەندامبوونی تەواویی تورکیا لەو یەکێتییە دەستپێبکات. لەو کارانەشیدا، بەتایبەتی لەلایەن

کەسانی وەك ژاك شیراك سەرۆکی فەرەنسا و سەرۆك وەزیرانی وڵاتانی دیکەوە پێشوازی لێدەکرا، بەڵام داواکاری گشتیی دادگای باڵای تورکیا لێکۆڵینەوەیەکی یاسایی لەسەر ئەردۆغان دەستپێکردبوو کە مومکین بوو بە دەستگیرکردنی کۆتایی پێبێت.

پۆل ڤۆلفۆویتز لە مانگی یەکی ٢٠٠٢دا بۆ جاری دووەم سەردانی تورکیای کرد و لەگەڵ عەبدوڵا گویل سەرۆك وەزیر کۆبووەوە و پێشنیاری کرد دەیان هەزار سەربازی ئەمریکا لە خاکی تورکیاوە بۆ جەنگ دەربازی عێراق ببن. لەو سەردانەشیدا لەگەڵ جونەید زاپسو کە خاوەنکارێکی راوێژکاری سیاسەتی دەرەوەی ئەردۆغان بوو، پەیوەندی بەرقەرار کرد. دیداری نێوان ڤۆلفۆویتز - زاپسو بووە هۆی ئەوەی کە تا ئەندازەیەك نزیکەی مانگێك دوای ئەو دیدارە، تایب ئەردۆغان لە کۆشکی سپی لەلایەن سەرۆك جۆرج دەبلیۆ بوشەوە قبوڵ بکرێت.

ڤۆلفۆویتز لە هەمان ساڵدا لە رۆژی یەکشەممە ١٤ی تەمووزی ٢٠٠٢دا بەر لەوەی سەردانی ئەفغانستان بکات، رێی خستبووە ئیستانبوڵ و لەکاتی گەڕانەوەشیدا سەردانی ئەنقەرەی کردبوو و ئەمجارەیان ژمارەیەك لەبەرپرسانی تورك‌ی لەبەرامبەر خۆیدا بینییەوە کە بەتوندی دژایەتی بیروبۆچوونەکانی ئەمریکایان سەبارەت بە عێراق دەکرد. لە رۆژی یەکشەممە ١٤ی تەمووزی ٢٠٠٢دا دەمزانی ئێوارە لە ماڵی موستەفا قۆچ کە خاوەنکارێکی دۆستی ئەو بوو لە تورکیا، دەیبینم. چونکە بۆ ئەو ئێوارەخوانە بانگهێشت کرابووم. لە ساڵانی ١٩٩٩-٢٠٠٠کاندا لە واشنتن، ئەوکاتەی سەرەتا لە سەنتەری ویڵسن و دواتریش لە ناوەندی ئەنیستیتۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ ئاشتی کارم دەکرد، هەرکاتێک مستەفا قۆچ سەردانی واشنتۆنی بکردایە، ئێوارەکەی من و ئەو پێکەوە لەگەڵ پۆل ڤۆلفۆویتز نانی ئێوارەمان دەخوارد و ئەمەش وەکوو عادەتێکی لێهاتبوو. سەردانی پۆل ڤۆلفۆویتز بۆ ئیستانبوڵ ببووە هۆکارێك تا مستەفا قۆچ ئەو عادەتەی خۆی دووبارە بکاتەوە، بەڵام ئەمجارەیان میوانەکانی زیاتر کردبوو. رۆژانێك پێشتر دەمزانی لە ئێوارەخوانێکدا لەگەڵ پۆل ڤۆلفۆویتزدا یەکتر دەبینین بەڵام ئەوەم نەدەزانی هەر لەو رۆژەدا، لەکاتی نیوەڕۆ تەلەفۆنم بۆ دەکات و دەڵی پێویستە بە خێرا یەکتر ببینین تا بە تەنها هەندێك قسە بکەین. چەندین هەفتە پێشتر پلان بۆ سەردانی ڤۆلفۆویتز بۆ تورکیا دانرابوو و ئەو کاتانەش کە دەیویست بەرەو تورکیا بەڕێ بکەوێت، بەهۆی دەست لە کار کێشانەوەی یەکێك لە گرنگترین وەزیرەکانی پارتی چەپی دیموکراتی کە هاوپەیمانی حکومەتەکەی بولەنت ئەجەوید بوو لە تورکیا، حکومەتە هاوپەیمانییەکە درزی تێکەوتبوو. سەرەتا لە ٨ی تەمووزدا حوسامەدین ئویزکان، جێگری سەرۆك وەزیر و کەسی دەستەڕاستی ئەجەوید دەستی لە کار کێشابووەوە و دواتریش لە ١٠ی تەمووزدا، ئیسماعیل جەم وەزیری دەرەوە کە ڤۆلفۆویتز دیداری لەگەڵ دەکرد، دەستی لەکار کێشابووەوە. لەوەش گرنگتر کەسێکی وەکوو کەمال دەرویش کە ساڵی

٢٠٠١ تورکیای لە قەیرانێکی گەورەی ئابووری و دارایی رزگار کردبوو و لە ئاستی دنیا وەکوو زامنی چارەسەرکردنی کێشە ئابوورییەکانی تورکیا سەیر دەکرا، لە ١٢ی تەمووزدا وازی لە پۆستەکەی لە ناو حکومەت هێنا. هەرچەندە کەمال دەوریش چەند کاتژمێر دواتر لە دەست لە کارکێشانەوەی خۆی پەشیمان بووەوە بەڵام حکومەت لە قەیرانێکی گەورەدا بوو و دەست لە کارکێشانەوەی پەیتا پەیتای وەزیرەکان بووە هۆی ئەوەی کە دەنگۆی ئەوە بڵاو بێتەوە کە ئەوان بەنیازن پارتێکی نوێ دروستبکەن و لە هەڵبژاردنی داهاتوودا ململانێی بەدەستهێنانی دەسەڵات بکەن. پۆستەکەی ئیسماعیل جەم لە وەزارەتی دەرەوە درا بە کەسێکی وەفادار و نزیك لە ئەجەوید کە بەناوی شوکری سینا گویرەل، کە بە بۆچوونەکانی خۆیەوە سەبارەت بە دژایەتیکردنی ئەمریکا و لایەنگری کردن لە وڵاتانی جیهانی سێیەم بە ناوبانگ بوو. پۆل ڤۆلفۆویتز ئەوکاتەی کە بەرەو تورکیا بەڕێ کەوتبوو، وای زانیبوو کە لەگەڵ ئیسماعیل جەم دیدار دەکات بەڵام ناچاربوو لەگەڵ کەسێکی دیکە بەناوی شوکری سینا گویرەل دیدار بکات کە بە ئەگەری زۆر ناوەکەشی نەبیستبوو و هیچی لەبارەیەوە نەدەزانی. بۆیە دەبوو دیدارێکی تایبەت بکات تا بزانێت ئایا دەتوانێ لەگەڵ ئەو حکومەتەی کە دیار نییە تا چەن بەرگە دەگرێت سەبارەت بە بابەتێکی هەستناك پێکەوە هاوکاری بکەن یان نا. ئەو کەسانەی کە ڤۆلفۆویتز لە تورکیا دیداری لەگەل دەکردن، چی ئەوانەی کە دەیناسین و چی ئەوانەی کە نەیدەناسین، هەموویان کەسانێك بوون کە من لە نزیکەوە دەمناسین. شوکری سینا گویرەل لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان دوو پۆل لەدوای منەوە بوو و ئەوکاتەی من دەمویست لە ساڵی ١٩٧٦ کورسییەکی راهێنەری لە کۆلێژی زانستە سیاسییەکان وەربگرم، ئەو کورسییەکی راهێنەری لە بەشی مێژووی سیاسی بەدەست هێنابوو. دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو ساڵانە سەرەڕای ئەوەی کە بیروبۆچوونەکانمان بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا لە یەك جیاواز بوون، بەڵام لەبەر خاتری رۆژانی رابردوو پەیوەندی دۆستانەمان وەك خۆی مابووەوە. ساڵانێك لەوەوپێش کەمال دەرویشیشم لە نزیکەوە دەناسی. هەردوکمان ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری بزووتنەوەی دیموکراسی نوێ بووین کە ساڵی ١٩٩٤ هەوڵماندا رێکیبخەین. ئەوکاتەی کە ئەو لە بانکی نێودەوڵەتی بوو لە واشنتن، لەکاتی گەڕانەوەکانیدا بۆ ئیستانبوڵ پێکەوە دەبووین و بەهۆی پەیوەندی دۆستانەی ساڵی بەریشا سەرۆك کۆماری ئەلبانیا لەگەڵ هەردووکماندا، پێکەوە بانگهێشتی تیرانا کراین و بەهۆی ئەو سەردانەشمانەوە پەیوەندی دۆستانەم لەگەڵ کەمال زیاتر گەشەی کرد. ئەو ساڵانەش کە لە ١٩٩٩-٢٠٠٠ لە ناوەندەکانی لێکۆڵینەوە لە واشنتن کارم دەکرد، پەیوەندی دۆستانەمان پتەوتر بوو. تەنانەت ئەو کاتانەی کەمال دەوریش جێگری سەرۆکی بانکی نێودەوڵەتی بوو و پۆل ڤۆلفۆویتز راگری ناوەندی SAIS بوو، بۆ یەکەمجار لە ماڵەکەی مندا یەکتریان ناسی. رۆژێك بەر لەوەی پۆل ڤۆلفۆویتز سەردانی ئیستانبوڵ بکات، من و کەمال دەرویش لە ماڵی دۆستێکی هاوبەشماندا لە

ئیستانبوڵ یەکترمان بینیبوو و ئەمەش دوای ئەوە بوو کە کەمال دەرویش وازی هێنابوو و دواتریش لە وازهێنانەکەی پەشیمان ببوەوە. کەمال دەرویش سەرەڕای ئەوەی کە لە دەستلەکارکێشانەوەکەی پەشیمان ببووەوە، سووربوو لەسەر ئەوەی کە لە ماوەیەکی نزیکدا واز لە پۆستەکەی لە ناو حکوومەتدا بهێنێت و لەگەڵ حوسامەدین ئویزکان و ئیسماعیل جەم، پارتێکی نوێ دابمەزرێنن. ئەو زۆر تووڕە دەبوو لە هۆشدارییەکانی هەندێك لە کەسانی دۆستی خۆی بە منیشەوە کە پێمانوابوو ئەم پێکهاتە نوێیە کە پشتیوانیی هەندێك هێز و گرووپێکی میدیایی هەیە، ناتوانێ سەرکەوتن بە دەستبهێنێت. لە فرسەتێکدا لیستێکی دەرهێنا کە ناوی هەموو ئەندامانی پەرلەمانی تورکیا ی تێدا بوو و وتی؛"یەك بە یەك سەیری ئەمانە بکە، لەنێو ئەم ناوانەدا جگە لە ئیسماعیل جەم کەسێك دەبینی کە شایستەی ئەوە بێت کە پۆستی سەرۆکایەتیی وەزیران وەربگرێت؟"و بەوجۆرەش ئاماژەی بە هەڵوێستە سیاسییەکەی خۆی دەکرد. منیش لە کاتێکیتردا کەماڵ دەرویش م راکێشایە سووچێك و پرسیارم لێکرد کە ئایا لەگەڵ دەنیز بایکاڵ دیداری کردووە یان نا؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی؛"جاربەجار کۆدەبووینەوە، بەڵام دەمێکە یەکترمان نەبینیوە."جەهەپە یان پارتی گەلی کۆماری ئەو کاتانە لە دەرەوەی پەرلەمان بوو، بەڵام تا ئەندازەیەك ئەوە ڕوون بوو کە لە هەڵبژاردنی داهاتوودا دەتوانێت بچێتەوە پەرلەمان. کەمال دەرویش لایەنگرێکی پێشووی پارتی گەلی کۆماری بوو. منیش پێمگوت؛"هەتا لەگەڵ دەنیز بایکاڵ دیدار نەکەی، هیچ بڕیارێك مەدە."ئەویش وەڵامێکی ناڕوونی دایەوە و وتی؛"با بزانین چۆن دەبێت، لەم رۆژانەی داهاتوودا یەکتر دەبینین."دوای ئەو گفتوگۆیەی ئێمە بە ماوەیەکی کورت، حوسامەدین ئویزکان تەلەفۆنی بۆ کەمال دەرویش کرد و هەموو ئەو کەسانەی کە لەوێ بوون ئاگایان لە قسە و باسەکانی نێوانیان بوو. ئویزکان داوای دەکرد کە رۆژی دواتر لەگەڵ دەروَش کۆ بێتەوە. ئەو دەیویست پەلە بکات لە درووستکردنی پارتی نوێ و بەشداریکردنی کەمال دەرویش ی لەو حیزبەدا بە شتێکی زۆر گرنگ دەزانی. کەمال دەرویش پێی گوت ناچارە لە ئیستانبوڵ بمێنێتەوە بۆ ئەوەی کە لە ئێوارەخوانێکدا لەگەڵ پۆل ڤۆلفۆویتز یەکتر ببینن. رۆژی دواتر، یانی بەیانیی ئەو رۆژەی کە پۆل ڤۆلفۆویتز سەردانی ئیستانبۆڵی دەکرد، شتێکم کرد کە تا ئەوکاتە نەمکردبوو و تەلەفۆنم بۆ ماڵی دەنیز بایکاڵ کرد و ئەوەم بۆ باس کرد کە شەوێك بەر لەو کاتە لەگەڵ کەمال دەرویش بووم و باشتروایە رەخنەی توندی لێ نەگرێت و بە پێچەوانەوە دیدارێکی راستەوخۆی لەگەڵدا بکات. بایکاڵ لە وەڵامدا پێی گوتم؛"دەزانی ئەو شتەی کە بە منت گوت چەندە گرنگە؟"منیش لە وەڵامدا وتم؛"تا ئێستا هیچ بە بیرتان دێتەوە کە من بەیانییەکی رۆژی یەکشەممەیەك تەلەفۆنم بۆ ئێوە کردبێت؟"دواتر بایکاڵ پرسیاری کرد کە ئایا لە ماوەیەکی کورتدا کەمال دەرویش دەبینم یان نا و منیش پێمگوت ئێوارە لە ئێوارەخوانێکدا لەگەڵ پۆل ڤۆلفۆویتز یەکتر دەبینن. دەنیز بایکاڵ وتی؛"زۆر باشە، بە کەمال بڵێ یان یەکسەر تەلەفۆنم بۆ

بکات یاخود ژمارە تەلەفۆنێك بدات بە تۆ تا من تەلەفۆنی بۆ بکەم."ئەو ئێوارەیە لە دەرفەتێکدا کەمال دەرویش'م بانگ کردە سووچێك و قسە و باسەکانی خۆم و دەنیز بایکاڵ'م بۆ گێڕایەوە... ئەویش وتی؛"من تەلەفۆنی بۆ دەکەم. ڕۆژی سێ شەممە دیدارم لەگەڵ سەرۆك کۆمار هەیە، دوای دەرکەوتن لەوێ سەردانی ناوەندی گشتی پارتی گەلی کۆماری دەکەم..."هەرواشی کرد. دیداری کەمال دەرویش و دەنیز بایکاڵ لە ئێوارەی ڕۆژی سێ شەممە، لەنێو ئەو گرووپەدا کە دەیانویست پارتێکی نوێ درووستبکەن، نیگەرانی دروستکرد. ماوەیەکی کورت دوای ئەوە، کەمال دەرویش بوو بە ئەندامی پارتی گەلی کۆماری و لەو حیزبەشەوە کاندید کرا تا ڕێگای پەرلەمانتاریی بۆ خۆش بێت.

لایەنی ئەمریکی لەو ئێوارەخوانەی مستەفا قوچ'دا، بەدەر لە ڤۆلفۆویتز ڕۆبەرت پێرسن باڵیۆزی ئەمریکا لە ئەنقەرە و ئۆربانکیك سەرقونسووڵی ئەو وڵاتە لە ئیستانبوڵ بوون. میوانە تورکەکان'یش بەدەر لە کەمال دەرویش، هەندێك کەسایەتیی خاوەنکار بوون کە بە لایەنە ڕۆشنبیرییەکەشیانەوە ناوبانگیان هەبوو. بەدەر لە جەم بۆینەر، جەم دووناکە دیپلۆماتێکی پێشوو و خاوەنکارێکی تازە بوو، شەریف ئەگەلی کە لەسەردەمی تۆرگوت ئۆزال'دا کاری زۆری لەسەر عێراق کردبوو و کەسانی دیکەی وەکوو محەمەد عەلی بایار کە ببوو بەسەرۆکی پارتێکی بچووکی ناوەندی ڕاستگەرا و دوایین پۆستەکەشی لە وەزارەتی دەرەوە ڕاوێژکاری باڵیۆزخانەی تورکیا لە ئەمریکا بوو، لە ئێوارەخوانەکەدا بوون. لەو ئێوارەخوانەدا کە میدیای تورکی زۆر مەراقی دەکرد بزانێت چی تێدا باس دەکرێت، هەڵبەتە ڕۆژنامەنوسان بەدوای ڤۆلفۆویتز'ەوە بوون. لە ئێوارەخوانەکەدا باسی عێراق و دوایین ئامادەکارییەکانی جەنگ و پەیوەندییەکانی تورکیا و ئەمریکا کرا. بەشداربووانی ئێوارەخوانەکە دەمی خۆیان قورس ڕاگرت و شتێکی زۆر دزەی نەکردە ناو میدیای تورکی. هەموو بەشداربووانی ئێوارەخوانەکە نا بەڵام بەشێکی گرنگیان نیگەران بوون لەوەی کە ئەمریکا دەیەوێت حکومەتی سەدام بڕوخێنێت و بەجۆرێك لە جۆرەکان تورکیا'ش لەوەدا بەشدار بکات. هەندێکیشیان درکیان بە جیدیەتی پرسکە نەکردبوو و نەیاندەزانی کە ئامادەکارییەکانی ئەمریکا و سووربوونی لەسەر ئەو جەنگە لە چ ئاستێکدایە. کەمال دەرویش یەکێك لەو کەسانە بوو کە دژایەتی سیاسەتی ئەمریکا و جەنگی عێراق'ی دەکرد. بەڵام ئەو لەبەر ئەوەی کە دەیزانی ئەمریکاییەکان سوورن لەسەر بڕیارەکەی خۆیان، بیری لەوە دەکردەوە کە بە چ جۆرێك زیانە ئابوورییەکانی ئەو جەنگە لەسەر تورکیا کەمبکاتەوە. بۆ کەسێکی وەکوو پۆل ڤۆلفۆویتز کە مێشکی بە باشی ئیشی دەکرد زۆر بەلایەوە گرنگ بوو کە بزانێت کەمال دەروێش کە تورکیا'ی لە یەکێك لە گەورەترین قەیرانە ئابوورییەکانی مێژووی کۆمار ڕزگار کردوە و ئێستا وەزیری ئابووریی ئەو وڵاتەیە، چۆن بیر دەکاتەوە و چی دەڵێت. لەو بارەیەشەوە دەرویش و ڤۆلفۆویتز کە ڕووبەڕووی یەکتر دانیشتبوون، قسە و باسێکی زۆریان کرد. هەرچەندە کەمال دەرویش خۆی دەدزییەوە

لەوەی کە شتێکی روون بڵێت بەڵام ژمارەیەکی زۆر گەورەی هێنایە سەرزمان. بەڵام ئەو برە پارەیەی کە ئەمریکا لەبەرامبەر هاوکاریکردنی تورکیا بۆ جەنگی عێراق پێشنیاری کردبوو و دواتر بەهۆی رەتکرانەوەی داواکاریی ئەمریکا بۆ بەکارهێنانی خاکی تورکیا بۆ جەنگی عێراق لە پارلەمان هیچ واتایەکی نەما، زۆر زیاتر بوو لەو ژمارەیەی کە کەمال دەرویش لەو شەوەدا هێنابوویە سەرزمان. لە ئێوارەخوانەدا خواستە یان ناخواستە قسە و باسەکان هاتە سەر ئەوەی کە تێکچوون یان رووخانی حکومەتی تورکیا ئەویش لەکاتێکدا کە ئەمریکا ئامادەکاریی بۆ جەنگ دەکات، دەبێتە هۆی ئەوەی کە واشنتن لەکاتی جەنگدا بەردەنگێکی روون و ئاشکرای نەبێت. پۆل ڤۆلفۆویتز درکی بەم نارۆونییە دەکرد بەڵام ئاماژەی بەوە کرد کە بەهۆی پرۆفیشناڵ بوون و شارەزایی دامودەزگاکانی دەوڵەتەوە، دەکرێ ئەم کێشەیە چارەسەر بکرێت. ئەمەش وا دەردەکەوت کە ئاماژە بە فەرماندەیی گشتی سوپای تورکیا دەکات. محمەد عەلی بایار گەنجترین کەسی سەر مێزەکە، روونکردنەوەیەکی زۆر روون و ئاشکرای دا سەبارەت بەوەی کە هەڵوێستی تورکیا لەوانەیە چی ببێت و ئاماژەی بەوە کرد کە فەرمانەدەی گشتی سوپای تورکیا گرنگی بەهیچ پلانێکی سەربازی نادات کە خۆی لە قۆناغی ئامادەکارییەکەیدا بەشداری نەکردبێت."... پلانەکەتان هەرچی دەبێت با ببێت، ئەگەر دەتانەوێ پشتیوانی تورکیا بە دەست بهێنن، پێویستە لەسەرەتاوە بۆ فەرماندەیی گشتی سوپا باسی بکەن."

نزیکەی نیوەشەو بوو کە ڤۆلفۆویتز بۆ ئەوەی بەرەو ئەفغانستان بچێت، لەسەر سفرە هەستا. لە گەڕانەوەیدا سەردانی ئەنقەرەی دەکرد و لەگەڵ کەسانێکدا دانوستانی دەکرد کە وەختێك لە ئەمریکا بەڕێ کەوتبوو قەت بیری لەوە نەکردبووەوە لەگەڵیان دانووستان دەکات. شیرازەی حکومەتەکەی ئەجەوید تێکچوو بوو و موخاتەبەکەی پۆل ڤۆلفۆویتز لە وەزارەتی دەرەوە گۆڕابوو. ئەو هەر کە گەیشتە ئیستانبوڵ دەیویست لەسەر ئەم بابەتە لەگەڵ من قسە بکات. دوای ئەوەی کە بەربەستە ئەمنییە نائاساییەکانم لە هۆتێل کۆنراد تێپەڕ کرد و چوومە ئەو نهۆمەی کە ڤۆلفۆویتز ی لێ بوو، رۆبەرت پێرسۆن باڵیۆزی ئەمریکا لە ئەنقەرە منی بینی و سەری سووڕما. دڵنیا بووم لەبەر ئەوەی کە بانگ نەکراوە بۆ دیدارەکەی من و ڤۆلفۆویتز لە ناو ژوورەکەدا، زیاتر سەری سووڕماوە. تەنها کەسێك بەناوی ویلیان لۆتیل لەلای ڤۆلفۆویتز بوو کە وەك"ئەو پیاوەی کە لەبارەی مەیدانێکی فراوان لە باکووری ئەفریقا تا ئەفغانستان راوێژی پێ دەکەن"بە منی ناساندبوو و بەو پرسیارەی کە لێرە چی روویداوە چووە ناو قسە و باسەکان. بەتایبەتی دەیویست ئاگای لە پێگە و هەڵوێستی کەمال دەرویش بێت. سەبارەت بە رووداوەکانی سیاسەتی ناوخۆی تورکیا هەندێك قسە و باسمان کرد و دوای ئەوە پۆل ڤۆڵفۆویتز پرسیارێکی زۆر سادەی لە من کرد و وتی؛"لەبارەی رووخاندنی سەدام لە عێراق چۆن بیر دەکەیتەوە؟"منیش لە وەڵامدا وتم؛"پۆل بە ئەگەری زۆر لەنێو حەفتا ملیۆن هاوڵاتی کۆماری تورکیا کەسێك نادۆزیتەوە لە من گەرم و گوڕتر بێت بۆ ئەوەی

حکومەتەکەی سەدام بڕوخێت بەڵام پێویستە ئەوەت پی بڵێم کە ئەم بۆچوونە لە تورکیا زۆر لایەنگری نییە. بەدەر لەوەش پرسیارێك لە مێشکمدایە. وادیارە ئەمجارە سەدام دەڕوخێنن، بەڵام ئایا بیرتان لەوە کردۆتەوە کە دوای سەدام عێراق دەبێتە مەیدانی نفوزی ئێران؟ سیاسەتێکتان هەیە بۆ ڕێگرتن لەمە؟ من ئەمە بە روونی نابینم..."پۆل ڤۆلفۆویتز بە زەردەخەنەیەکەوە کە زۆر لام ئاشنا بوو سەیری کردم و هەستایە سەر پێ. ماوەیەکی زۆر کەم مابوو بۆ ئەوەی بەشدار بێت لە کۆنفرانسێکی وەقفی گفتوگۆ کۆمەڵایەتی و ئابورییەکانی تورکیا TESEV کە تەنها ئەو تێیدا وتاری پێشکەش دەکرد. خۆی لە خۆیدا ئێوارەش یەکترمان دەبینییەوە بۆیە دیدارە تایبەتەکەمان کۆتایی پێهات. دەکرا مانای جۆراوجۆر لەو زەردەخەنەیە دەربخرێت وەك؛"خەمەت نەبێ پلانی هەموو شتێکمان داناوە"، "تۆ وادەزانی شتێك کە ئاوا بە سادەیی دێت بە مێشکی تۆدا ئێمە هیج بیرمان لی نەکردۆتەوە؟"، "تۆش چوویتە ریزی ئەو کەسانەی کە بەشێوەیەکی کلاسیکی بیر دەکەنەوە؟"ئەو رۆژە قەد بیرم لەوە نەکردەوە کە ئەمریکا لەدوای جەنگ ئەوەندە لە عێراق دەسەپاچە دەبێت و بەگوێرەی هەندێك بیروبۆچوون پلانێکی دروست و حیسابیی لەسەر قۆناغی دوای جەنگ لە عێراق نابێت. تەنانەت بۆ چەند ساتێکیش بیرم لەوە کردەوە کە پرسیارێکی بێواتام کردووە و لەبەر ئەوەش تۆزێك نیگەران بووم. تەسەوری ئەوە نەدەکرا کە تاقە وڵاتی زلهێزی جیهان کە ئەمریکا بوو، بیری لە شتێکی زۆر سادەی وەك ئەو پرسیارەی من نەکردبێتەوە. لەبەر ئەوە بۆ ساتیك پەشیمان بووم لەو پرسیارەی کە کردبووم، بەڵام دوای جەنگی عێراق بۆم دەرکەوت کە پرسیارێکی راستم لە پۆل ڤۆلفۆویتز کردبوو...

**ئەو کەسەی بەئەزموون و پراکتیک زانیارییەکانی ژیان بە دەست دەهێنێت، لەو کەسە گرنگترە کە لە رێی خوێندنەوە فێر دەبێت.**

**ئیبنی خەلدون، ۱۳۳۲-۱٤٠٦ (مقدمە)**

ئەوکاتەی پۆڵ ڤۆلفۆویتز بۆ یەکەمجار سەردانی ئەنقەرەی کرد، هەلومەرجەکانی تورکیا و بەردەنگ و موخاتەبەکانیشی گۆڕابوون. لەلایەکی دیکەشەوە بولەنت ئەجەوید سەرۆك وەزیر بەشێوەیەکی نەریتی هەستناك بوو بەرامبەر بەوەی کە لە رووخانی رژێمی سەدام حسێن لە عێراق هاوکاری ئەمریکا بکات و بەدەر لەوەش باری تەندرووستیی ئەجەوید تێکچوو بوو و تورکیا'ش لە قۆناغی هەڵبژاردندا بوو. لەبەر ئەو هۆیانەش، روون و ئاشکرایە کە لە روانگەی ئامانجەکانیەوە، سەردانەکەی ڤۆلفۆویتز بۆ تورکیا بێ ئەنجام بوو. لە دووەم سەردانیدا بۆ تورکیا لە تشرینی دووەم، حکومەتێك لەسەرکار بوو کە پۆڵ ڤۆلفۆویتز بەهۆی بیروبۆچوونە ئادیدۆلۆژییەکانییەوە لایەنگریی لێ دەکرد. یەك دوو رۆژ دوای دیداری لەگەڵ عەبدوڵا گویل، بۆ ئەوەی کە پیرۆزبایی پۆستە تازەکەی لەسەرۆك وەزیر بکەم، تەلەفۆنم بۆ کردبوو. ئەویش منی بۆ ئۆفیسی رەسمیی خۆی بانگهێشت کرد. کاتێك کە منیان بردە ژوورەکەی، عەبدوڵا گویل سەرۆك وەزیر بەشیوەیەکی دۆستانە پێشوازی لێکردم.

لە ساڵەکانی ۱۹۹۰کاندا، ئەوکاتەی کە بۆ یەکەمجار بوو بە پەرلەمانتار، لەگەڵ عەبدوڵا گویل ئاشنا بووم. هاورێیەکی نزیکی ئەو بەناوی فەهمی کۆروو، سەفەرێکی هاوبەشی بۆ هەر سێکمان بۆ بەشداریکردن لە سیمپۆزیۆمێك لە بروکسەل رێکخست. بەهۆی ئەو گەشتەوە، دواتر لە ساڵەکانی۱۹۹٦-۱۹۹۷دا ئەوکاتەی کە لە کابینەکەی نەجمەدین ئەربەکان'دا وەزیر بوو، دۆستایەتییەکەمان زیاتر گەشەی کرد. لە ساڵی۱۹۹۷دا ئەوکاتەی کە قۆناغی ۲۸ی شوبات لەنێو فەرهەنگی سیاسیدا جێی خۆی کردەوە و حکومەتەکەی ئەربەکان بەهۆی دەستوەردانی سەربازی رووخا، ئیدی ستەملێکراوییەکی هاوبەشیش بە دۆستایەتییەکەمان زیاد بوو. هەر لەسەرەتاکانی دەستوەردانی سەربازی کە بە ۲۸ی شوبات ناسرا، دژایەتی ئەو قۆناغەم کرد و بووم بە ئامانجی هێرشەکانی فەرماندەیی گشتی سوپا کە دواجار رێی لەوە گرت کە لە کار و پیشەکەم بەردەوام بم. عەبدوڵا گویل لە ۲۸ی شوبات'دا بەهۆی دەستوەردانی سەربازی کورسیی وەزیرییەکەی خۆی لە دەست دابوو. لەو رۆژانەدا لەگەڵ ئەو و تایب ئەردۆغان، زووزوو یەکترمان دەبینی. تایب ئەردۆغان'یش لە قۆناغی ۲۸ی شوبات'دا لە پۆستی سەرۆکی شارەوانی ئیستانبوڵ لادرابوو و چەند مانگێکیش زیندانی کرابوو. ئەوکاتەی کە عەبدوڵا گویل لەبەرامبەر نەجمەدین ئەربەکان دەرکەوتبوو و لە کێبڕکێی سەرۆکایەتیی پارتی فەزیلەت'دا بەشداریی کردبوو، من لە واشنتن بووم بەڵام لایەنگریم لە ریفۆرمخوازەکانی نێو ئەو پارتە

دەکرد. ئەو بزووتنەوەیەی کە عەبدوڵا گویل پێشەنگایەتی دەکرد، ساڵێك دواتر پارتی داد و گەشەپێدانی بەسەرۆکایەتی تایب ئەردۆغان دامەزراند و لە ساڵی ٢٠٠٠دا هاتە سەر دەسەڵات و عەبدوڵا گویل پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرت. ماوەیەك بەر لەوەی کە عەبدوڵا گویل لەنێو پارتی فەزیلەت جووڵانەوەی ریفۆرمخوازەکان دەستپێبکات، لە گەڕانەوەیەکمدا لە واشنتن'ەوە بۆ ئیستانبوڵ لە ماڵی نازلی ئڵیجاخ لەگەڵ ئەو و تایب ئەردۆغان یەکمان بینی. ئەوکاتە هەردووکیان دەیانویست گوێ لە تێبینییەکانی من سەبارەت بە ئەمریکا و سیاسەتەکانی ئەو وڵاتە بگرن و لەوبارەیەوە زانیارییان دەست بکەوێت. هەر لەو کاتانەدا رەجایی کووتان کە سەرۆکایەتی پارتی فەزیلەت'ی دەکرد، داوای هاوکاریی لە من کردبوو تا هەندێك دیداری لە واشنتن بۆ رێکبخەم. ئەو وەختە لە سەنتەری ویڵسن کارم دەکرد و یارمەتیم دا تا بتوانێت لەو ناوەندە وتارێك پێشکەش بکات. گویل'یش لە ناو ئەو وەفدەدا بوو کە بەسەرۆکایەتیی رەجایی کووتان سەردانی واشنتن'یان کردبوو. بەڵام خۆ دوورخستنەوەی لە وەفدەکە شتێك نەبوو کە بشاردرێتەوە. ماوەیەکی کەم لەدوای ئەوەش لە کێبڕکێی سەرۆکایەتیی حیزبەکەدا وەك رکابەرێك بەرامبەر بە رەجایی کووتان کە نەجمەددین ئەربەکان پشتگیریی لێ دەکرد دەرکەوت. لەنێو ئەو رەوتە سیاسییانەی تورکیا کە لە نەریتی "دیدگای نەتەوەیی"ەوە دەهاتن، نەجمەدین ئەربەکان چی بگوتبایە هەر ئەوە دەبوو. بەڵام ئەو مامەڵەکردنە لەگەڵ رەفتارەکەی عەبدوڵا گویل'دا گۆڕانی بەسەردا هات و کۆتایی پێهات. تێکۆشانەکەی عەبدوڵا گویل بناغەکانی دامەزراندنی پارتی داد و گەشەپێدان'ی دانا کە ساڵێك دوای ئەوە دادەمەزرا و دوو ساڵ دوای ئەوەش دەسەڵاتی دەگرتە دەست. سەرەڕای ئەوەی کە پێشبینیی ئەو رۆڵە گرنگەی عەبدوڵا گویل'م نەدەکرد، لە واشنتن'ەوە ئاگام لەوە هەبوو کە خۆی لە ئەندامانی دیکەی وەفدەکە دوور دەگرێت. بۆ ئەوەی پێکەوە بە تەنها بمێنینەوە و قسە بکەین، لەکاتی خواردنی بەیانی لە هۆتێلەکە یەکترمان بینی. پەیوەندی من لەگەڵ عەبدوڵا گویل مێژوویەکی تایبەت بە خۆی هەبوو و بەهۆی ئەو گەرمییەی کە ئەو مێژووە دروستی کردبوو، کاتێك چوومە ژووری عەبدوڵا گویل سەرۆك وەزیر، بە گەرمی پێشوازیی لێکردم. قسە و باسەکان هاتنە سەر دیدارەکەی لەگەڵ پۆڵ ڤۆلفۆویتز. لەو رۆژانەدا سەرەکیترین باس لە تورکیا ئەو دیدارە بوو. ئەمریکا داوای لە تورکیا دەکرد کە مۆڵەتی پێبدا، تا بۆ جەنگی عێراق خاکی تورکیا بە کار بهێنێت و بۆ ئەو مەبەستەش هەزاران سەربازی ئەمریکا لە تورکیا جێگیر بکرێن. چاوەڕوانی ئەمریکا لە تورکیا وەك وڵاتیکی ناوچەکە و هاوپەیمانێکی خۆی لە ناتۆ، لە ئاسێکی بەرزدا بوو. بەگوێرەی ئەمە ئەگەر هەردوو وڵات پەیوەندییەکی تایبەتیان هەبووایە و هاوپەیمان بایەن، تاقیکردنەوەی هاوپەیمانییەکە لەو داواکارییانەدا دەبوو. پێویستبوو تورکیا سەبارەت بە داواکارییەکانی ئەمریکا بە هەستیاری بجوڵێتەوە. پرسیاری داواکارییەکانی ڤۆڵفۆویتز'م لە گویل کرد. سەری لار کردەوە و خۆی نزیکی من کرد و دەستی

ڕاستی بەرز و نزم کرد و بە ڕوومەتێکی گرژ و زەردەخەنەیەکی تاڵەوە وتی؛"کارەساتە، کارەسات!"
منیش وتم؛"باسی ژمارەیەکی وەك هەشتا هەزار سەرباز دەکەن، ئەمە ڕاستە؟"
گویل بە هەمان حاڵ و حەرەکەتەوە وتی؛"بێدەنگ، بێدەنگ! کارەساتە کارەسات."
-"باشە ئەی چی دەبێت؟ چۆن وەڵامیان دەدەنەوە؟"
-"با بزانین چۆن دەبێت! بەڵام کارەساتە کارەسات."

لەوانەیە لەو کاتانەدا بیری لەوە کردبێتەوە کە چۆن دەتوانێت داواکارییە زۆرەکانی ئەمریکا ڕەتبکاتەوە. هەر کە بوو بەسەرۆك وەزیر، سەبارەت بە جەنگی عێراق ڕووبەڕووی داواکارییەکی زۆری ئەمریکا بووەوە کە دەیویست تورکیا لەو جەنگەدا بەشێوەیەکی فراوان هاوکاری بکات. عەبدوڵا گویل، ساڵانێکی زۆر سەر بە ڕەوتێکی سیاسیی بوو کە بەتوندی دژایەتیی ئۆپەراسیۆنی سەربازیی ئەمریکا'ی دژی وڵاتە موسڵمانەکان دەکرد، بەڵام لە یەکەم ڕۆژانی دەسەڵاتداریی خۆیدا ڕووبەڕووی داواکارییەکی وەهای وڵاتێکی هاوپەیمان ببووەوە کە لە هەمانکاتدا تاکە زلهێزی جیهانیش بوو. لەو ڕۆژانەشدا نەدەکرا لەگەڵ ئەو هێزەدا بکەوێتە ناکۆکی و ململانێ. هەرچەندە دوای زیاتر لە دەیان ساڵ پارتی داد و گەشەپێدان توانیبووی بە بێ هاوپەیمان و بە تەنها حکومەت پێك بهێنێت، بەڵام ژینگەی سیاسی بە چاوێکی گومانەوە سەیری ئەو حیزبەی دەکرد. هێزە چەکدارەکان، دەسەڵاتی داد و بیرۆکراسیی دەوڵەت، زانکۆکان و دنیای کار و میدیا، ئەو حیزبەیان بە هێزێکی ئیسلامی ناودەبرد و پێیان هەزم نەدەکرا کە ئەم هێزە تورکیا بەڕێوە ببات. حکومەتی پارتی داد و گەشەپێدان لە مەیدانێکی نەناسراودا کە پڕ بوو لە نەیار و دوژمن، دەیویست جێی خۆی بکاتەوە و جێگایەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە. بەڵام ئەو داواکارییەی کە ئەمریکا لە عەبدوڵا گویل'ی دەکرد، شتێك نەبوو کە بە بێ لەبەرچاو گرتنی بیروبۆچوونەکانی خۆی و بارودۆخی ناوخۆیی وڵات بە ئاسانی قبووڵی بکات.

لەوانەیە پۆڵ ڤۆلفۆویتز درکی بە دوودڵیی سەرۆك وەزیری نوێی تورکیا کردبێت کە لەو ڕۆژانەدا هەوڵی ئەوەی دەدا تایب ئەردۆغان سەرۆکی حیزبەکەی گویل کە قەدەغەی سیاسی لەسەر بوو، لە پلانەکانی جەنگی عێراق'دا بەشدار بکات. بۆیە ئەو ڕۆژانەی کە لە ئەنقەرە بوو لەگەڵ جونەید زاپسوو و کەسانی زۆر نزیك لە تایب ئەردۆغان کۆبووەوە. کاتێکیش کە گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی، لە ڕێگەی خاوەنکارێکی یەهوودی - ئەمریکی'یەوە کە ڤۆلفۆویتز و زاپسوو دەیانناسی، ئەو دانوستان و پەیوەندییانە بەردەوام بوون. ئەوکاتەی پۆڵ ڤۆلفۆویتز گەڕایەوە بۆ واشنتن، جۆرج بوش'ی ڕازی کرد کە لە کۆشکی سپی چاوی بە تایب ئەردۆغان بکەوێت. دیداری بەرپرسانی ئەمریکا لەگەڵ سەرکردەی وڵاتە هەوپەیمانەکانی خۆیان لە کۆشکی سپی، ئیمتیازێك بوو کە تەنها بەریتانی و ئیسرائیلی'یەکان سوودیان لێ وەردەگرت. قبووڵ کردنی تایب ئەردۆغان لەلایەن سەرۆکی ئەمریکا'وە لە کۆشکی سپی، ئەویش دوای نزیکەی یەك مانگ لە

هەڵبژاردنەکانی تورکیا، ئەو نەریتەی گۆڕی. جگە لەوەش، تایب ئەردۆغان سەرۆك وەزیری تورکیا'ش نەبوو و بەدەر لەسەرۆکی گشتیی پارتی داد و گەشەپێدان هیچ پۆستێکی رەسمیی دیکەی نەبوو و تەنانەت دواکاری گشتی واتە سەبیح کانادئۆغلوو بەدوای کەوتبوو و بەوهۆیەشەوە مەترسیی دەستگیرکردنی لەئارادا بوو. دیارە بۆ ئەمریکا'یەك کە خۆی بۆ جەنگی عێراق ئامادە دەکرد، بە دەستهێنانی پشتگیری تایب ئەردۆغان و لە رێگای ئەویشەوە پشتگیری تورکیا، ئەوەندە گرنگ بوو کە دەیتوانی ئەو نەریتە بشکێنێت. بەر لە کۆبوونەوەی لووتکەی یەکێتی ئەورووپا لە کۆپنهاگن کە بۆ دەسەڵاتی نوێی تورکیا زۆر گرنگ بوو، تایب ئەردۆغان بۆ دیدار لەگەڵ جۆرش بوش لە کۆشکی سپی، بەرەو ئەمریکا بە رێ کەوت. لەنێو ئەو کەسانەی کە لە رێگەی کۆپنهاگن، واشنتن و نیۆیۆرك و دواتر گەڕانەوە بۆ کۆپنهاگن لەگەڵ ئەردۆغان بوون، منیش هەبووم. ئەم سەردانە بۆ ئەوپەڕی ئاتلانتیك، یەکێك بوو لە پڕکارترین سەردانەکانی تایب ئەردۆغان کە دواتر وەك سەرۆك وەزیریش ئەنجامی دابوون. لە ٢٠٠٢/١٢/٩دا لە ئەنقەرەوە بەرەو دانیمارك بە رێ کەوتین کە ئەوکاتە سەرۆکایەتیی ئەو خولەی یەکێتی ئەورووپا'ی دەکرد. ئەردۆغان ویستبووی بەر لە کۆبوونەوەی لووتکەی یەکێتی ئەورووپا کە بڕیار بوو لە ١٢ - ١٣/ ١٢/ ٢٠٠٢ ئەنجام بدرێت، جارێکی دیکە لەگەڵ راسمۆسن سەرۆك وەزیری دانیمارك دیدار بکات. لەدوای دیدارەکە هەر لەو رۆژەدا بەرەو واشنتن بەڕێ کەوتین. ئەردۆغان پێشکەش کردنی وتارێکی لە ناوەندی CSIS و وەرگرتنی زانیاری لە پنتاگۆن سەبارەت بە عێراق کە ڤۆلفۆویتز رێکیخستبوو، لەنێو بەرنامەی سەفەرەکەی خۆیدا جێ کردەوە. رۆژی دواتریش لەلایەن سەرۆك جۆرج بوش'ەوە قبووڵ کرا و دیداری لەگەڵ ئەنجامدرا. لەدوای دیدارەکەی جۆرج دەبلیۆ بوش، ئەردۆغان هەمان شەو دەربازی نیۆیۆرك بوو و لەدوای دیدارێکیش لەگەڵ کۆفی ئەنان سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ بینینی عەبدوڵا گویل کە ئەویش بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەی لووتکەی یەکێتی ئەورووپا هاتبوو، گەڕاینەوە بۆ کۆپنهاگن.

لە ناوەندی لێکۆڵینەوەی CSIS لە واشنتن، کەسانێکی زۆر هاتبوون تا بەشداری لە کۆنفرانسەکەی ئەردۆغان'دا بکەن و لە دەسەڵاتی ئەمریکا'شەوە پۆڵ ڤۆلفۆویتز بەشداریی کردبوو. پۆڵ ڤۆلفۆویتز دەیزانی دواتر کاتێك نابێت تا یەکتر ببینین، بۆیە کاتێك لەدوای وتارەکەی ئەردۆغان لە بیناکە دەردەکەوتین، ئاماژەی کرد تا لەگەڵیدا بڕۆم. ئەو دەگەڕایەوە بۆ پنتاگۆن و لەوێ چاوەڕوانی تایب ئەردۆغان'ی دەکرد. ئەوکاتەی کە لەنێو ئۆتۆمبیلی تایبەتی جێگری وەزیری بەرگری ئەمریکا'دا بووم کە بە ئەندازەی پاسێك گەورە بوو و لەگەڵ کاروانێکی ئۆتۆمبیلە پاسەوانەکانیدا بەرەو پنتاگۆن دەڕۆیشت، هەتا وەختی دابەزین تەنها چەند خولەکێك توانیمان پێکەوە قسە بکەین. وەك ئەوەی کە هەست بە نزیکبوونی جەنگی عێراق بکەم، پرسیارێکی سەیری رۆژنامەوانیم کرد و وتم؛"کەی میوانداریی کۆکتێلەکە دەستپێدەکات؟" ڤۆلفۆویتز

پێکەنی و وتی؛"لەوانەیە بەم نزیکانە."لایەنی ئەمریکی پێیوابوو کە دیدارەکەی نێوان بوش و ئەردۆغان کاریگەری لەسەر کاتی دەستپێکردنی جەنگ دەبێت. ڤۆلفۆویتز لەسەردانەکەی سێ هەفتەی پێشووی خۆی بۆ ئەنقەرە، لە دیدارەکەی لەگەڵ عەبدولا گویل سەرۆك وەزیردا دڵنیا نەبیوو لەو هاوکاری و پشتیوانییەی کە تورکیا لە جەنگدا بۆ ئەمریکای دابینبکات. لەبەر ئەوەش گرنگیی بەوە دەدا کە تایب ئەردۆغان واتە سەرکردەی پارتی داد و گەشەپێدان و کەسایەتیی بەهێزی نوێی تورکیا ڕازی بکات. دەیویست لە ڕێگەی کردنەوەی دەرگاکانی کۆشکی سپی بە ڕووی ئەردۆغان'دا بناغەی ئیشەکەی خۆی پتەو بکات. ڤۆلفۆویتز لەو ماوە کورتەی کە تایب ئەردۆغان لە واشنتن مایەوە، کۆبوونەوەیەکی ڕێکخست کە تێیدا لە زاری پیتەر گالبرایت'هوە سەبارەت بە عێراق زانیاریی پێشکەش دەکرا. پیتەر گالبرایت کە لە ٩/ ١٢/ ٢٠٠٢دا لە بینای پنتاگۆن کۆبوونەوەیەکی پێدانی زانیاری بە تایب ئەردۆغان سازکردبوو و دواتر لە کتیبێکی خۆیدا بەناوی How War in Iraq Strenghened America›s Enemies(٢٠٠٨) بەمجۆرە تێبینییەکانی خۆی لەسەر ئەردۆغان باس کردبوو؛

"... زۆرینەی تورکەکان دژی جەنگی عێراق بوون. ئەوان دراوسێی عێراق بوون و درکیان بەو هەڕەشەیە نەدەکرد کە بەڕێوەبردنی بوش وەك مەترسییەك گەورەی دەکردەوە و بۆ خەڵکەکەی خۆی پیشانی دەدا. لەوانەیە ئەوان پێشبینیی ئەوەیان دەکرد کە دوای جەنگ چ جۆرە قەیرانێك ڕوودەدات. ئەوان و هاوپەیمانەکانی دیکەی ئەمریکا کە دژی جەنگ دەبوون، دەیانتوانی خۆیان دوورەپەرێز بگرن. بەڵام تێپەڕبوونی فیرقەی چواری پیادە لە ڕێگەی تورکیا'وە بۆ ئەوەی لە باکووری عێراق بەرەی دووەمی جەنگ بکاتەوە، بۆ پلانە جەنگییەکانی پنتاگۆن گرنگییەکی تایبەتی هەبوو... هەوڵ و دەستپێشخەرییە دیپلۆماسییەکانی بەڕێوەبردنی ئەمریکا بۆ ڕازیکردنی تورکیا بۆ بەشداریکردن لە جەنگ بێ کاریگەر و لاواز بوون. لەسەر تکای پۆڵ ڤۆلفۆویتز جێگری وەزیری بەرگری لە مانگی یەکی ٢٠٠٢دا (ج.چ؛ مانگەکەی بە هەڵە نوسیوە، مانگی ١٢بوو) بۆ تایب ئەردۆغان سەرکردەی تورك لە پنتاگۆن کۆبوونەوەیەکی پێدانی زانیاریم ئەنجامدا و تێگەیشتم کە ئەو نەکەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەو پاساوانەی کە نیۆکۆنسێرڤاتیڤەکان سەبارەت بە هەڕەشەی عێراق باسی دەکەن. بەڵام لەدواییدا ئەردۆغان درکی بەوە کرد کە هیچ چارەیەکی نییە جگە لەوی کە بەو ڕێگایەدا بڕوات."

تێبینییەکانی منیش بەوجۆرە بوون. بەرەی ئەمریکا دەیتوانی سووربوونی خۆی سەبارەت بە جەنگی عێراق پیشانی تایب ئەردۆغان بدات و لەوبارەیەشەوە داوای هاوکاری لە تورکیا بکات. لەبەرامبەر ئەوەشدا دەیانتوانی ئەردۆغان وەها تێبگەیەنن کە دەتوانن سەبارەت بە بەدەستهێنانی ڕەوایی کە زۆر پێویستی پێیەتی، یارمەتیی تایب ئەردۆغان بدەن. لە کەلتووری سیاسیی ئەمریکا شتێك هەیە کە پێی دەگوترێت"لێرە

خواردنی بەلاش نییە."بارودۆخی تایبەتیی سەردانەکەی تایب ئەردۆغان ئەمەی بە بیر دەهێنایەوە و ئەو بۆچوونەی خۆشم بۆ ئەندامانی وەفدەکە باس کرد.

رۆژی دواتر، یەعنی لە ١٠/ ١٢/ ٢٠٠٢دا جۆرج دەبلیۆ بوش سەرۆکی ئەمریکا لەگەڵ کۆندالیزا رایس راوێژکاری ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی (کە لە قۆناغی دووەمی سەرۆکایەتییەکەیدا بوو بە وەزیری دەرەوە) و پۆڵ ڤۆڵفۆویتز، تایب ئەردۆغان و یاشار یاکش وەزیری نوێی دەرەوەی تورکیا و عومەر چەلیك'ی راوێژکاری و هەروەها یەکێکی دیکە لە راوێژکارەکانی ئەردۆغان'یان بەناوی جونەید زاپسوو لە ژووری رۆزڤێڵت لە کۆشکی سپی دەبینی. ژووری رۆزڤێڵت لە کۆشکی سپی تاقە ژوورێکی کۆبوونەوەیە کە پەنجەرەی نییە و رێك لەبەرامبەر ژووری بەناوبانگی ئۆڤاڵ ئۆفیس دایە. لەبەر ئەوەی کە تایب ئەردۆغان پۆستی سەرۆك وەزیران یاخود سەرۆکی دەوڵەتی نەبوو، چرووتتۆکۆڵی کۆشکی سپی بەوجۆرە رێکخرابوو کە لە جیاتی ئۆڤاڵ ئۆفیس، لە ژووری رۆزڤێڵت دیداری لەگەڵدا بکرێت. بەڵام دواتر چەندینجار لە ژووری ئۆڤاڵ ئۆفیس'دا دیداری لەگەڵ سەرانی ئەمریکا کرد.

لە هەمان نیوەشەودا کاتێك کە لە نیۆیۆرك'ەوە بەرەو کۆپنهاگن دەفڕین، تایب ئەردۆغان تێبینییەکانی خۆی لەنێو فڕۆکەکەدا باس کرد. بوش باسی لە دینداربوونی هەردووکیانی کردبوو و بۆ بەرقەرارکردنی پەیوەندییەکی شەخسی دەستی بۆ ئەردۆغان درێژ کردبووەوە. دیارە بابەتی سەرەکی عێراق بوو و ئەردۆغان'یش لەوە تێگەیشتبوو کە ئەمریکاییەکان سوورن لەسەر ئەوەی کە جەنگی عێراق دەستپێبکەن و ئەو ناتوانێت بڕیارەکەیان پێ بگۆڕێت. دواجاریش بوش بەشێوەیەکی روون داوای لە تورکیا کردبوو هاوکارییان بکات. تایب ئەردۆغان'یش لە وەڵامدا وتبووی دوای گەڕانەوەم بۆ وڵاتەکەم وەڵام دەدەمەوە و پێویستە لەمبارەیەوە لەگەڵ پەرلەمان و چەندین دامودەزگای دیکەدا قسە بکرێت. بوش'یش لە وەڵامدا پێیگوتبوو کاتمان کەم بۆتەوە و بەوجۆرە جەختی لەوە کردبوو کە لە ماوەیەکی کورتدا چاوەڕوانی وەڵام دەکات. دواتریش نەیارەکانی ئەردۆغان لە تورکیا رەخنەیان دەگرت کە گوایە لەو دیدارەی کۆشکی سپی، ئەردۆغان تورکیا'ی خستۆتە ژێر بەرپرسیاریی. بەڵام لەو کاتانەدا ئەردۆغان پۆستێکی وای نەبوو کە بتوانێ تورکیا بخاتە ژێر بەرپرسیاری و بەدەر لەوەش لە قسە و دانوستانەکانی لەگەڵ بوش بەهیچ جۆرێك بەڵێنی نەدابوو و خۆی دزیبووەوە لەوەی کە شتێك بڵێت و هەوڵی بەدەستهێنانی کاتی دابوو. بەکورتی هیچ رەفتارێکی نەکردبوو کە شایانی ئەو رەخنانە بێت کەوا لێی دەگیران. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە روونی درکی بەوە کردبوو کە ئەمریکاییەکان سوورن لەسەر ئەوەی کە جەنگ بکەن. بەدەر لەوەش، زانیبووی کە پشتگیری کردن لەلایەنی براوەی جەنگ و یارمەتیدانی بە سوودی تورکیا دەبێت. هەچەندە ئەم بیروبۆچوونەی خۆی بۆ بوش باس نەکردبوو، بەڵام ئەگەر لە قسەکانی ورد ببایەیتەوە دەتزانی کە

بیروبۆچوونەکانی بەو ئاراستەیە دان. لەوانەیە بەڕێوەبردنی ئەمریکا'ش بەمەی زانیبێت، بۆیە دوای ئەوەی کە پەرلەمانی تورکیا لە ٢٠٠٣/٣/١دا ڕێگەی نەدا سوپای ئەمریکا خاکی وڵاتەی بۆ جەنگی عێراق بەکار بهێنێت، هۆکارەکانی تێکچوونی پەیوەندییەکانی هەردوو لای نەخستە ئەستۆی تایب ئەردۆغان و من خۆم بە شەخسی شایەتی ئەمە بووم. لەو ڕۆژەی کە داواکەی حکومەت لە ١ی مارتدا پێشکەش کرا و دواتر تا ئەوکاتەی کە جەنگی عێراق لە ١٩ی مارتی ٢٠٠٣دا دەستی پێکرد، بۆ بەشداری کردن لە کۆبوونەوەیەك، بۆ چەند ڕۆژێك سەردانی واشنتۆن'م کردبوو. لە ئێوارە خوانێکیشدا لەگەڵ پۆڵ ڤۆڵفۆویتز یەکترمان بینی. نیگەرانیی پۆڵ ڤۆڵفۆویتز لە کێشەی ڕەتکرانەوەی مۆڵەتنامەی ١ی مارت لە پەرلەمانی تورکیا بەشێوەیەکی روون دەردەکەوت. لەنێو ئەنجامەکانی مۆڵەتنامەی ١ی مارتدا وردەکارییەك هەبوو. لەدوای ڕەتکرانەوەی مۆڵەتنامەی ١ی مارت، پۆڵ ڤۆڵفۆویتز کە لە بەڕێوەبردنی ئەمریکا بە لایەنگری تورکیا ناوبانگی دەرکردبوو و تەنانەت لە واشنتن کەفالەتی ئەو حکومەتەی کردبوو کە لە تورکیا کە بە ئیسلامەگەرا ناوبانگی دەرکردبوو، سەنگ و قورسایی کەمتر بووەوە. بۆ پاراستنی تایب ئەردۆغان کە بە تازەیی لە تورکیا هاتبووە سەر دەسەڵات، وتم تایب ئەردۆغان بە تازەیی هاتوەتە سەرکار و لاپەڕەیەکی بەتاڵ و سپی هەڵداوەتەوە. ویستم ئەوە بە بیری ڤۆلفۆویتز بهێنمەوە کە ئەوکاتەی ئەمریکا دەیویست پەرلەمانی تورکیا مۆڵەتنامەی ١ی مارت قبوول بکات تا هێزەکانی لە ڕێی خاکی تورکیا'وە بەرەی دووەمی جەنگ لە عێراق بکەنەوە، تایب ئەردۆغان سەرۆك وەزیر نەبوو. بەهۆی ئەو زنجیرە ڕووداو و پێشهاتانەی کە دوابەدوای دیدارەکەی سەرۆك بوش لە مانگی کۆتایی٢٠٠٢دا لەگەڵ تایب ئەردۆغان ڕوویاندا، ناوبراو لە هەڵبژاردنێکی میانەیی لە ٩ی مارتدا لە سیرت وەك پەرلەمانتار هەلبژێردرا و دوابەدوای ئەوەش عەبدوڵا گویل پۆستی سەرۆك وەزیرانی بۆ ئەو بەجێهێشت. ئەردۆغان لە ١٢ی مارتدا ئەرکی پێکهێنانی کابینەی حکومەتی وەرگرت و لە ١٥ی مارتیشدا کابینەی حکومەتەکەی ئەردۆغان لە پەرلەمان متمانەی بە دەستهێنا. ئەوە شتێکی نهێنی نییە کە تایب ئەردۆغان لایەنگری پەسەندکردنی مۆڵەتنامەی ١ی مارت بوو لە پەرلەمان و لە کۆبوونەوەی نهێنی پارتی داد و گەشەپێدان'دا داوای کردبوو دەنگ بەو مۆڵەتنامەیە بدرێت و تەنانەت زۆر نیگەران بوو لەوەی کە ٩٧کەس لە ئەندامانی گروپی پارتی داد و گەشەپێدان دەنگیان بە پێشنیاری مۆڵەتنامەکە نەدابوو. لە ڕۆژنامەکانیشدا باسی ئەوە کرابوو کە دوابەدوای ڕەتکرانەوەی مۆڵەتنامەکە لە پەرلەمان، ئەردۆغان لە کۆبوونەوەی دەستەی بەڕێوەبەری و کۆبوونەوەی ناوەندی حیزبەکەی خۆیدا گلەیی لەو پەرلەمانتارانە کردبوو کە دەنگیان بە مۆڵەتنامەکە نەدابوو و وتبووی؛"چەندین ڕۆژ سەبارەت بە مۆڵەتنامەکە قسەمان کرد و ئەوەشمان دیاریی کردبوو کە چۆن بجووڵێینەوە. باسی بیروبۆچوونەکانی خۆیشمان کردبوو. پێویست نەبوو کە بەمجۆرە بێت."(رادیکاڵ، ٤ی مارتی ٢٠٠٣)

نەدەکرا هەمان شت سەبارەت بە بولەنت ئارنج بگوترێ کە وەکوو کەسی سێیەمی حیزبەکە ناوی دەرکردبوو. لەو کاتانەدا وا دەردەکەوت کە ئارنج دژی پەسەندکردنی مۆڵەتنامەکە لە پەرلەمان بێت. سەرەڕای ئەوەی کە حکومەت بۆ خۆی داوای ئەو مۆڵەتەی لە پەرلەمان کردبوو، دەزانرا کە لە وەختی دەنگدانی پەرلەمان لەسەر مۆڵەتنامەکە، عەبدوڵا گوپل'یش زۆر نەیویستووە پەسەند بکرێت. کاتێك کە هەموو ئەم زانیارییانەی پشتی پەردەی قبووڵ نەکرانی مۆڵەتنامەکەم بە پۆڵ ڤۆلفۆویتز دا، وتم؛"پەسەندنەکرانی مۆڵەتنامەکە لە پەرلەمان سووچی تایب ئەردۆغانی سەرۆك وەزیری تێدا نییە، ئەو لایەنگری پەسەندکردنی بوو."ڤۆڵفۆویتز لە وەڵامی مندا وتی؛"دەزانین. عەبدوڵا گوپل ئیشەکەی تێکدا. خەتای تایب نەبوو..."

پۆل ڤۆلفۆویتز درێژەی بەوە دا کە لەبەرامبەر هێزە چەکدارەکانی سوپای تورکیا'دا کە بەشێوەیەکی نەریتی کەناڵی پەیوەندیی تورکیا و پنتاگۆن بوو، تایب ئەردغان و دەسەڵاتی پارتی داد و گەشەپێدان بپارێزیت. لە دوانیوەڕۆی رۆژی پێنج شەممە ١ی مایسی ٢٠٠٣دا جۆرج دەبلیۆ بوش لە کەنارەکانی کالیفۆرنیا لە کەنارەکانی ئۆقیانوسی پاسیفیك، لە کەشتیی فڕۆکەهەڵگری یو ئێس ئێس ئابراهام لینکۆڵن دابەزی. لەسەر عەرشی پاپۆڕەکە لافیتەیەکی گەورەی Mission Accomplished هەڵواسرابوو. بوش لە وتارەکەی خۆیدا لەوێ رایگەیاند کە ئۆپەراسیۆنە سەرەکییەکانی جەنگی عێراق کۆتاییان پێهاتووە. چونکە لە جەنگی عێراق'دا سەرکەوتنیان بە دەست هێنابوو و رژێمی"ستەمکار"لەسەر کار لابرابوو و ئیدی عێراق"ئازاد"کرابوو... خۆی لە ٩ی نیسانەوە، ئەوکاتەی کە یەکەکانی سوپای ئەمریکا چوونە ناو بەغدا و لە بەشی خۆرهەڵاتی رووباری دیجلە یاخود لای چەپی رووبارەکەوە لە مەیدانی فیردەوس پەیکەرەکەی سەدام حسێن رووخێنرا، ئیتر چارەنووسی جەنگەکە ئاشکرا ببوو. ئەو کاتانە هەموو رۆژێك لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنی سی ئێن ئێن تورك شیکردنەوەم بۆ رووداوەکان دەکرد. محەمەد عەلی بیراند بە درکیکی بەهێزی رۆژنامەوانییەوە پێی گوتم ئەگەر ئێستا داوا بکەیت لەو پۆڵ ڤۆلفۆویتز'ە کە بۆ پرۆگرامی ٣٢هەمین رۆژ دیدارێکی تایبەتمان لەگەڵدا بکات، یەکسەر سواری فڕۆکە دەبین و بەرەو واشنتن دەچین. تەلەفۆنم بۆ شاها کرد و داواکارییەکەی خۆمانم پێ راگەیاند. زۆربەی کەناڵە راگەیاندنە نووسراو و بینراوەکان و نزیکەی تەواوی ئۆرگانە راگەیاندنییەکانی جیهان ریزیان گرتبوو بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەندازیاری یەکەمی جەنگی عێراق دیدار بکەن. بەڵام وا دیاربوو کە شاها خێراترین و قەدبڕترین و متمانەپیکراترین رێگایەك بوو بۆ ئەوەی کە بە ڤۆلفۆویتز بگەی.

لەو کاتانەدا کە هەواڵی کۆتاییهاتنی جەنگی عێراق، تەنها بە جیاوازی کاتەکانەوە لە هەموو شوێنێکی جیهان بڵاودەکرایەوە، لە رۆژی هەینی ٢ی مایس لە کەنارەکانی پاڵاس'دا بووم. ئەوکاتەی کە لە یەکێك لە کاتە نۆستالژییەکانی خۆم سەبارەت بە کۆبوونەوەی نەریتی ساڵانەی دەرچووانی کۆلێژی تاڵا دەژیام،

محەمەد عەلی بیراند هەواڵی پێدام کە پۆڵ ڤۆلفۆویتز ڕۆژی یەك شەممە ٥ی مایس لە ژوورەکەی خۆی لە پنتاگۆن چاوەڕوانیمان دەکات تا لەگەڵمان چاوپێکەوتن بکات. ئەوکاتەی گەیشتینە واشنتن جارێکی دیکە چاومان بەو پرسیارانەدا خشاندەوە کە لەکاتی فڕین لە تورکیاوە بۆ ئەمریکا ئامادەمان کردبوو. بۆ ئەو چاوپێکەتنەی کە ڕۆژی دواتر لە تورکیا قیامەتی بەرپا دەکرد و دەنگێکی زۆری دەدایەوە، بەیانی زوو بەرەو پنتاگۆن بەڕێ کەوتین. سەرۆکی ئەمریکا چەند ڕۆژ لەوە پێش کۆتایی جەنگەکەی ڕاگەیاندبوو و ئەندازیاری ئەو جەنگەش لەگەڵ دوو ڕۆژنامەنووسی ناسراوی تورکیا دیداری دەکرد. دیاربوو کە واشنتن دەیەوێت ڕەخنە لە تورکیا بگرێت. کەسی دووەمی پنتاگۆن سوپای لە تورکیا کردبووە ئامانجی خۆی و ڕەخنەی لێ دەگرت. محەمەد عەلی بیراند چاوپێکەوتنەکەی دەستپێکرد و پۆڵ ڤۆڵفۆویتز کاردانەوەی لەبەرامبەر پرسیارێکی بیراند پیشاندا کە وتی چۆن بیر دەکاتەوە سەبارەت بە پەسەند نەکردنی مۆڵەتنامەکەی ١ی مارت لە پەرلەمانی تورکیا. لەدوای ئەوەش پرسیاری ئەوەمان لێکرد کە مەبەستت کێیە و ئەویش لە وەڵامدا وتی ئێوە زۆر بە باشی دەزانن کە مەبەستم کێیە. لە ڕاستیدا ئێمە زۆر بە باشی لەوە تێگەیشتبووین کە مەبەستی کێیە و لەکاتێکدا کە دەترساین وەڵامەکەی ئەو بە تەواوەتی ڕوون نەکرێتەوە و نەگاتە ئەدرێسی ڕاستەقینە، ئەو بۆخۆی ڕوونکردنەوەی زیاتری دا و وتی مەبەستم سەربازەکان و سوپایە و بەجۆرێك کە ئێمە قەد چاوەڕوانیمان نەدەکرد، بە ڕوونی ئەدرێسی ڕەخنەکانی خۆی بۆ ئێمە دەرخست. تەنها ماوەیەکی کورت بەر لە چاوپێکەوتنەکە ئاگادار بووین کە پۆڵ ڤۆلفۆویتز بۆ ڕەخنە گرتن لە سوپا قبووڵی کردووە کە لەگەڵ ئێمە دیدار بکات. بەڵام ئێمە پێمانوابوو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕەخنە دەگرێت و بەهیچ جۆرێك بیرمان لەوە نەکردبووەوە کە بەو ئاشکراییە ڕەخنەکانی باس بکات. محەمەد عەلی بیراند دەیویست ئەو چاوپێکەوتنە بکاتە سەرکەوتنێکی دیکەی ڕۆژنامەوانی و ڕۆژنامەنووسان واتەنی بیکاتە Scoop سکووپێکی نێودەوڵەتی. بەڵام هەر خودی ئەو دیدارەی ئێمە لەو ڕۆژەدا لەگەڵ پۆڵ ڤۆلفۆویتز بۆ خۆی سکووپ بوو.

ڕەتکرانەوەی مۆڵەتنامەی ١ی مارت لە پەرلەمانی تورکیا بووە هۆی ئەوەی کە شیکردنەوەی جۆراوجۆر بکرێت سەبارەت بەوەی کە درز کەوتووەتە نێوان واشنتن و پارتی داد و گەشەپێدان لە تورکیا، بەڵام ڤۆلفۆویتز سەبارەت بە حکومەت چۆن بیری دەکردەوە؟ لەو بەینەدا بۆ ئەوەی کە بیروبۆچوونەکانی بە ئاشکرا بزانم، کاتێك کە وتی سوپا، قسەکەم پێبڕی و وتم لەلای ئێمە مۆڵەت لە پەرلەمان دەدرێت و سوپا دەنگ نادات. بەڵام ڤۆلفۆویتز سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بەردەوام بێت لە ڕەخنەکانی خۆی لە سوپا و حکومەت بپارێزێت و لە وەڵامداوتی؛"فەرماندەیی گشتی سوپای تورکیا بەشێوەیەکی باش ڕێنیشاندەر نەبوو لەوەی کە لە جەنگی عێراق'دا پشتیوانی لە ئەمریکا بکرێت."فەرماندەی گشتیی سوپای تورکیا دەیتوانی چی بکات؟ بەر لە دەنگدان لەسەر مۆڵەتنامەکە، بەیاننامەیەکی دەستەی ئاسایشی نەتەوەیی بڵاوکرایەوە.

ئەگەر سوپا بیتوانیبایە قورسایی خۆی پیشانبدات، ئەمە دەبووە ئاماژەیەك. بەڵام لە بەیاننامەکەی دەستەی ئاسایشی نەتەوەییدا تۆپەکە خرابووە مەیدانی دەسەڵاتی مەدەنی.

بەڵام ئەوەی کە پێویستبوو لە دیمۆکراسییەکاندا هەبێت، دەبوو بەمجۆرە بێت؟ ئایا ئەمریکا دەیویست سوپا قورسایی لە سیاسەتدا هەبێت؟ ئەمە بەگوێرەی پێوەرەکانی ئەمریکا رەفتارێکی دیموکراتی بوو؟ کاتێك ئەم پرسیارانەم فورموله کرد و هێنامە سەرزمان، پۆڵ ڤۆلفۆویتز پاشەکشەی نەکرد لەوەی کە رەخنە لە سوپا بگرێت و وازی نەهێنا و ئاماژەی بە بەیاننامەکانی سوپا دا کە لە هەمان قۆناغدا سەبارەت بە قوبرس بڵاوی کردبوونەوە. حکومەتی پارتی داد و گەشەپێدان دەیویست سیاسەتی"نەبوونی چارەسەری باشترین چارەسەرە"لە قوبرس بگۆڕێت. لەو کاتانەشدا کە دەیویست ئەو کارە بکات فەرماندەی هێزە وشکانییەکانی سوپای تورکیا ژەنراڵ ئایتاچ یاڵمان سەردانی رەووف دەنکتاش سیمبۆڵی سیاسیی چارەسەر نەکردنی کێشەی قوبرس'ی کرد و هەندێك لێدوانی دا کە وەك کاردانەوەیەکی توندی سوپا لەبەرامبەر حکومەتی پارتی داد و گەشەپێدان لێکدرانەوە. ئەوەی کە ڤۆلفۆویتز مەبەستی بوو ئەمە بوو. پیاوە بەهێزەکەی پنتاگۆن نیازی نەبوو واز لە رەخنەگرتن لە سوپای تورکیا بهێنێت. بەگوێرەی ڤۆلفۆویتز حکومەت هیچ سووچێکی لە رووداوەکەدا نەبوو، هەرچەندە لە دەنگدانەکاندا کەسانێك لەنێو پارتی داد و گەشەپێدان دژی مۆڵەتنامەکە دەرکەوتبوون بەڵام زۆربەیان پشتیوانییان لێکردبوو و بەدەر لەوەش ئەوەی کە مۆڵەتنامەکەی هێنابووە پەرلەمان، پارتی داد و گەشەپێدان بوو و ئەوەی کە دژایەتی دەکرد پارتی گەلی کۆماری بوو...

چاوپێکەوتنەکەی پۆل ڤۆلفۆویتز لە دوو روانگەوە گرنگیی هەبوو؛ یەکەمیان ئەوە بوو کە بێگومان سەرکەوتنێکی گەورەی رۆژنامەوانی بوو و دووەمیش ئەوە بوو کە قسەکانی ڤۆلفۆویتز واتای ئەوە بوون پنتاگۆن وازهێنانی خۆی لە پشتیوانی کردنی هێزە چەکدارەکانی تورکیا رادەگەیەنێت. وەك دەزانرێت پەیوەندیی نیو سەدەی نێوان تورکیا و ئەمریکا لە سایەی هاوپەیمانیی ناتۆ، پشتی بە پەیوەندییەکانی پنتاگۆن و فەرماندەیی گشتی سوپای تورکیا دەبەست. لەبەر ئەوەش ئەو کودەتا سەربازییانەی کە لە ١٩٦٠کانەوە لە تورکیا دووبارە دەبوونەوە و روویان دەدا، بەجۆرێك لە جۆرەکان دەستی ئەمریکا'یان تێدا بوو یاخود واتای ئەوەیان دەدا کە پنتاگۆن چرای سەوزی بۆ هەڵکردوون. لیدوانەکانی کەسی دووەمی پنتاگۆن بۆ رەخنەگرتن لە سوپای تورکیا، ئەویش رێك لەو کاتانەدا کە پێیانوابوو جەنگی عێراق'یان بردۆتەوە واتای ئەوەی دەدا کە"ئیدی لەمەودوا پنتاگۆن پشتگیری لە ئێوە ناکات."و ئەمەش بۆ کەسێکی وەکوو من کە زۆر دژایەتیی کودەتای سەربازی دەکرد، مایەی دڵخۆشی بوو. ئەو دیدارەی پۆڵ ڤۆلفۆویتز رێی بۆ دەسەڵاتی مەدەنی لە ژێر دەستی حکومەتی داد و گەشەپێدان دا کردەوە و پشتیوانی لێکرد.

کاریگەری چاوپێکەوتنەکە لە تورکیا زۆر گەورە بوو و بووە هۆکارێك بۆ ئەوەی کە هەندێك کەس

پێیانوابێت زماندرێژی بەرامبەر بە تورکیا کراوە و لەو ڕێگایەوە هەستە دژەئەمریکاییەکان پەرە پێبدەن. لەنێو ئەو لایەنانەشدا گرووپە چەپە ئەنتی ئەمپریالیستەکان'یش هەبوون کە سەرەڕای ئەوەی کە لە سیاسەتی تورکی'دا سنووردار کرابوونەوە، لە میدیاکاندا زیاتر لە سنووردارییەکەی خۆیان لە سیاسەتدا ڕۆڵیان هەبوو. لە تورکیا کاردانەوە لە دژی ئەندازیاری جەنگی عێراق پیشاندرا و بەهۆی ڕەخنەکانی لە تورکیا، ڕەخنەی توندی لێ دەگیرا. هەندێك دەیانگوت ئەو داوای کردووە تورکیا ڕەخنە لە خۆی بگرێت و ئەمەش شتێك نییە کە مایەی قبوولکردن بێت. ژمارەیەك لە سیاسییەکانیش کە هەندێك لە ئەندامانی پارتی داد و گەشەپێدان'یشیان تێدا بوو، پێیانوابوو وتەکانی ڤۆلفۆویتز نوێنەرایەتیی دەسەڵاتی ئەمریکا ناکات. بۆ ئەوان دید و بۆچوونەکانی سەرۆك بوش لە هەموو شتێك گرنگتر بوو. تا ئەوکاتەی کە وتەکانی ڤۆلفۆویتز'یان لە زاری سەرۆك بوش'ەوە نەبیستایە، لە ڕوانگەی ئەوانەوە هیچ کێشەیەك نەبوو. لایەنە سیاسییەکانی تورکیا نیگەران بوون لەوەی کە پەیوەندییەکانی تورکیا - ئەمریکا تێك بچێت، بەڵام وەکوو ئەوەی کە زۆرجار دەیانکرد، لە جیاتیی ئەوەی تێبگەن کە بۆچی ئەو شتانەی ئەوان حەز ناکەن دەگوترێن و لە جیاتی ئەوەی بزانن کە ئەو وتانە بە چ واتایەك باس کراون، زیاتر خۆیان بە شتە ڕواڵەتییەکانەوە مەشغووڵ دەکرد و کاردانەوەیان لەبەرامبەر ئەوانەدا پیشان دەدا. ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە پۆڵ ڤۆلفۆویتز داوای لە تورکیا نەکردبوو ڕەخنە لە خۆی بگرێت. ئەو تەنها پێشنیاری کردبوو کە ئەو کەسانەی کاریگەر بوون لە ڕەتکرانەوەی مۆڵەتنامەکە لە پەرلەمان، سەیری پەیوەندییەکانی ئەمریکا و تورکیا بکەن و بیرێك لەوە بکەنەوە کە داخۆ هەڵەیان کردووە یان نا؟

ئەمە داواکاریی بەرپرسێکی ئەمریکا نەبوو بۆ ئەوەی کە تورکیا بە ڕەسمی ڕەخنە لە خۆی بگرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە کۆد و شفرە کەلتورییەکانی تورکەکان لە هی ئەمریکییەکان جیاوازترە، ئەو شتانەی کە ڤۆلفۆویتز باسی دەکرد لەلای ئەوان بەو مانایە دەهات کە گوایە وتوویەتی تورکیا داوای لێبوردن بکات. ئەوەی کە جێگەی سەرسووڕمان بوو، ئەوە بوو کە ئەو لایەنەی وتەکانی پۆڵ ڤۆڵفۆویتز'ی وەکوو من بە ڕاستی وەرگێڕابوو، سوپا بوو. کەس نەیدەتوانی حاشا لە ڕۆڵی سوپا بۆ ئاراستەکردنی میدیا بکات. لە زۆرێك لە ئۆرگانە میدیاییەکاندا ژەنراڵە خانەنشینەکان دەیاننووسی و خۆیان دەردەخست. ئەوان قیامەتیان لەسەر ئەو وتانە بەرپا کردبوو. کاردانەوەکانیش تەنها بە ڤۆڵفۆویتز'ەوە سنووردار نەمانەوە و ئێمەش کە چاوپێکەوتنەکەمان ئەنجام دابوو نسیبمان بەرکەوت.

کەمال یاوز ژەنراڵی خانەنشین کە پێشتر فەرماندەی سوپای دوو و هەروەها فەرماندەی ئەکادیمیە سەربازییەکان بوو، لەو کاتانەدا لە ڕۆژنامەی ئاکشام'دا دەینووسی. لە بابەتێکدا نووسیبووی کە گوایە ئێمە کەسانێکین هەر لە منداڵییەوە لەلایەن ئەمریکاییەکان'ەوە بەخێوکراوین و ڕاهێنراوین بۆ ئەوەی لەکاتی

پێویستدا ئەرکێکی زۆر گرنگیان بۆ جێبەجێ بکەین و ئەو چاوپێکەوتنەش کە ئێمە لەو رۆژەدا لەگەڵ پۆڵ ڤۆڵفۆویتز ئەنجاممان دابوو، ئەو واتەنی، ئەو ئەرکە بوو کە ئەمریکاییەکان ئێمەیان بۆی ئامادە کردبوو. ژەنراڵ کەمال یاوز یەکێك بوو لەو کەسانەی کە دواتر لە دۆسیەی تایبەت بە لێکۆڵینەوەی ئەرگەنەکۆن'دا زۆر باسی دەکرا. وەك کەسێك کە لە بواری هەواڵگریدا کاری کردووە و وەك بڵێی هەر لە منداڵییەوە ئاگای لەوە بووە کە ئەمریکاییەکان چۆن ئێمەیان راهێناوە، بابەتەکەی خۆی نووسیبوو. ناوبراو کەسێك بوو کە لەکاتی جەنگی یەکەمی عێراق'دا دژی تورگۆت ئۆزال راوەستابوو و تورگۆت ئۆزال'یش ئەوی بەسەربازێکی ترسنۆك ناوبردبوو. بەمجۆرەش سوپا بە بیانووی پۆل ڤۆلفۆویتز'ەوە هەڵمەتیکی دیکەی بۆ لە ناوبردنی کەسایەتیی من دەستپێکرد. لەکاتیکدا کە چاوپێکەوتنەکە فەرتەنەیەکی گەورەی لە تورکیا نابووەوە، محەمەد عەلی بیراند گەڕایەوە بۆ تورکیا. منیش بۆ چەند رۆژێکی دیکە لە ئەمریکا مامەوە. بەر لەوەی لە واشنتن دەرکەوم، جارێکی دیکەش پۆل فۆلفۆویتز'م بینی. ئەوەش رۆژێك دوای ئەوە بوو کە چاوپێکەوتنکەی لە تورکیا بڵاو کرابووەوە. بە پێکەنینەوە وتی؛"بەڵایەکت بۆ دروست کردم. ئاگام لەو شتانە هەیە کە لە تورکیا دەنووسرێن و دەگوترێن."

-"تۆ بەڵات بۆ من درووستکردوە. تۆ جێگەت خۆشە، لێرە ئاسوودەی. پۆستی جێگری وەزیری بەرگری ئەمریکات هەیە، بەڵام من دەگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەم و هیچ پلە و پۆستێکم نییە و دڕندەکانیش چاوەڕوانن کە لەبەر تۆ من بخۆن..."

دیسان پێکەنی و وتی؛"هەرچی دەبێ با ببێ. زۆر ئیشێکی باشم کرد کە ئەو چاوپێکەوتنەم کرد. دەمویست ئەوانەی باسم کردووە بیڵێم، چونکە پێویستبوون..."

دواتریش پرسیاری کرد کە لە تورکیا رێك باسی چی دەکرێت. کاتێك وتم دەڵێن ئەو وتانە قسەی شەخسیی خۆتە و نوێنەرایەتیی بەڕێوەبردنی ئەمریکا ناکات، زۆر پێکەنی و لە وەڵامدا وتی؛"زۆر باشە کە ئاگایان لەوە نییە لە بەڕێوەبردنی ئەمریکا کێ بە چ شێوەیەك باسی تورکیا دەکات. سەرەڕای هەموو شتێك، زۆر زەحمەتە ئەوان بتوانن لەنێو بەڕێوەبەرایەتیی ئەمریکا جگە لە من دۆستێکی تورکیا پەیدا بکەن."لەوانەیە لەو کاتانەدا هێشتا بیری لەوە کردبێتەوە کە پردێکی پەیوەندی و هاوکاری لەگەڵ تورکیا درووستبکات و بەجۆرێک لە جۆرەکان تورکیا بخاتە نێو هاوسەنگیی عێراق'ەوە، بۆیە وتی؛"تورکیا دەتوانێت لە چوارچێوەی هێزێکی ئاشتیپارێزدا سەرباز رەوانەی باشووری عێراق بکات؟ بەمجۆرەش هەم لە عێراق'دا رۆڵی دەبێت، هەم پەیوەندییەکانیشی لەگەڵ ئێمە باش دەکاتەوە."بۆ تورکیا رەوانەکردنی هێز بۆ عێراق هیچ واتایەکی نەبوو جگە لەوەی کە لەشکرکێشی بۆ خاکی کوردستان بکات و هەموو کاتێکیش ئەمە بەمجۆرە بووە. دەردی تورکیا ئەوە بوو کە چۆن رێگا لە درووستبوونی کوردستان'ی سەربەخۆ بگرێت و یاخود بە چ

شیوەیەك ڕێ لە پێشهاتێکی هاوشێوە بگرێت. هەروەها دەیویست بۆ جەنگ و یەکلاکردنەوەی حیسابەکانی لەگەڵ پ.ك.ك لەو جوغرافیایەی کە هێزەکانی لەوێ کۆکردووەتەوە، لەشکرکێشی بۆ خاکی عێراق بکات. داوای مۆڵەتی ١ی مارت کە لە پەرلەمانی تورکیا قبووڵ نەکرا، جگە لەوەی داوای دەکرد کە ڕێگا بدرێت هێزەکانی ئەمریکا لە ڕێگای تورکیا'وە بچنە ناو خاکی عێراق، بە هەمانشێوە داوای مۆڵەتیشی دەکرد تا سەربازانی تورکیا'ش بچنە ناو خاکی باکووری عێراق. بەڕێوەبردنی سوپای ئەمریکا پلانی دانابوو کە بۆ ڕووخاندنی سەدام حسێن، لە ڕێگەی تورکیا'وە هێز ڕەوانەی عێراق بکات. تورکیا'ش دەیویست بە درێژایی ٢٥کیلۆمەتر لە ناو خاکی عێراق ناوچەیەکی قەدەغەکراو درووستبکات و کوردەکان لە ژێر کۆنترۆڵی خۆیدا بهێڵێتەوە. ڕەوانەکردنی هێزی تورکیا بۆ ناو عێراق هیچ پەیوەندییەکی بە پلانەکانی ڕووخاندنی سەدام'ەوە نەبوو، بەڵکوو پەیوەندی بەو حیسابانەوە هەبوو کە لەبارەی کوردەکان'ەوە لە ئەنقەرە دەکران. لەدوای ڕووخاندنی سەدام و ئەوکاتەی کە هێزەکانی ئەمریکا چوونە ناو خاکی عێراق و پەیوەندییەکی پتەویان لەگەڵ کوردەکان بەرقەرار کرد، ئیدی ڕەوانەکردنی هێزی تورکیا بۆ خاکی عێراق وەك هێڵێکی سووری لێهاتبوو کە واشنتن لەبەردەم تورکیا دایبنابوو. بۆب ڤوودوارد کە وەك نووسەری کۆنووسەکانی کۆشکی سپی وایە، لە کتێبی Plan of Attacck دا باس لەوە دەکات کە لەدوای مۆڵەتنامەی ١ی مارت کە لە پەرلەمانی تورکیا ڕەتکرایەوە، سەرۆك بوش وتوویەتی؛"تورکیا دواجار هەر لەگەڵ ئێمە دەبێت. ئەردۆغان خەریکە فێر دەبێت. ئێمە بە بێ تورکیا'ش دەیبەینەوە، بەڵام ئەگەر تورکیا لەگەڵ ئێمە بایە خۆشتر دەبوو. ئێستا ئیدی پرس ئەوەیە کە چۆن ڕێگا لەوە بگرین ئەوان دەربازی باکووری عێراق بن."( لاپەڕەی ٣٦٩)

پۆڵ ڤۆلفۆویتز کە لەنێو سیستەمی ئەمریکا'دا هەموو کاتێك بەرگری لە تورکیا دەکرد و لە هەمانکاتیشدا پێداگری دەکرد کە تورکیا داخڵی عێراق بێت، هێشتا قسەی لەسەر ئەوە دەکرد کە داخۆ دەکرێت تورکیا هێز ڕەوانەی باشووری عێراق بکات؟ و ڕێگای چاککردنەوەی پەیوەندییەکانی تورکیا و ئەمریکا'ی کە بە خراپترین قۆناغی خۆیدا تێپەڕ دەبوو، لەمەدا دەبینی. ماوەیەك دواتر دیسان پرسی جێگیرکردنی سوپای تورکیا لە خاکی عێراق هاتە بەر باس. ئەمجارەیان سەرۆك وەزیر تایب ئەردۆغان کاری خۆی قایم کردبوو. ڕۆژنامەکان باسیان لەوە دەکرد کە تایب ئەردۆغان قورسایی خۆی لەسەر ئەو پرسیە داناوە و ئەندامانی پارتی داد و گەشەپێدان کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی هۆشدارییەکانی ئەو. بەوجۆرەش پەرلەمانی تورکیا لە٢٠٠٣/١٠/٧دا بە ٣٥٨ دەنگی بەڵێ لەبەرامبەر ١٨٣ دەنگی نەخێر، مۆڵەتی دا بە حکومەت تا بۆ ماوەی یەك ساڵ هێز ڕەوانەی عێراق بکات. لە دانیشتنەکەدا دوو پەرلەمانتار دەنگیان نەدابوو. گرووپی پارتی داد و گەشەپێدان'یش کە لە ڕەتکرانەوەی مۆڵەتنامەی ١ی مارتدا پشکی شێری بەردەکەوت و ٩٧کەسیان دژی بوون، ئەمجارەیان تەنها ٧ کەسیان دژی مۆڵەتنامەکە دەنگیان دابوو. خۆی لە ڕاستیدا ئەمەش یەکەم

مۆڵەتنامەیەك نەبوو کە تایب ئەردۆغان سەرۆك وەزیری تورکیا بۆ پشتیوانی کردن لە ئۆپەراسیۆنی سەربازیی ئەمریکا لە عێراق، لە پەرلەمان بە پەسەندکردنی دابوو. دوابەدوای رەتکرانەوەی مۆڵەتنامەی ١ی مارت لە پەرلەمانی تورکیا، مۆڵەتنامەیەکی دیکە پەسندکرا کە پشتگوێ خرا یاخود کەسانێك دەیانویست پشتگوێ بخرێت و زۆر باس نەکرێت. یەك هەفتە دوای ئەوەی کە تایب ئەردۆغان لەسەر کورسیی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دانیشت، لە ٢٠ی مارتی ٢٠٠٣دا بە ٣٣٢ دەنگی بەڵێ لەبەرامبەر ٢٠٠دەنگی نەخێر، پەرلەمان مۆڵەتی دا بە هێزە چەکدارەکانی سوپای تورکیا تا دەربازی باکووری عێراق بن و هەرێمە ئاسمانییەکەی بۆ وڵاتانی بیانی بە کراوەیی بهێڵنەوە. لەو کاتانەشدا عەبدوڵا گویل کە وەزیری دەرەوەی تورکیا بوو، بەناوی حکومەتەوە وتاری پێشکەش کرد بۆ ئەوەی پەرلەمانتاران رازی بکات کە دەنگ بەو مۆڵەتنامەیە بدەن. ئەمجارەیان ٤٠ کەس لە ئەندامانی پارتی داد و گەشەپێدان دەنگیان بە مۆڵەتنامەکە نەدابوو، بەڵام بەپێچەوانەی مۆڵەتنامەکەی ١ی مارت، مۆڵەتنامەی ٢٠ی مارت لە پەرلەمان پەسەند کرا. هەرچەندە مۆڵەتنامەی ٢٠ی مارت داوای دەکرد هێزە چەکدارەکانی تورکیا دەربازی باکووری عێراق بن، بەڵام ئەمریکا چرای سووری بۆ ئەمە هەڵکردبوو. لەدوای رەتکرانەوەی مۆڵەتنامەی ١ی مارت لە پەرلەمانی تورکیا، لەشکرکێشی هێزە چەکدارەکانی تورکیا یان بە واتایەکیتر هێزە وشکانییەکانی سوپای تورکیا بۆ ناو خاکی عێراق رووبەڕووی قەدەغەی ئەمریکا ببووەوە و تورکیا'ش هێز و ئیرادەیەکی وای نەبوو کە گوێ بەو قەدەغەیە نەدات. لەگەڵ ئەمەشدا تەنها ٢٤ کاتژمێر دوای دەستپێکردنی جەنگی عێراق، مەیدانی ئاسمانیی تورکیا کراوە بوو بۆ ئەوەی فڕۆکە جەنگییەکانی ئەمریکا لەوێوە هێرش بۆ سەر عێراق بکەن.

هەرچەندە تاڵیش بێت بەڵام ئەو راستییەی کە زۆرێك لە مرۆڤەکان لە تورکیا دەیانویست چاوپۆشی لێ بکەن یاخود گرنگی پێ نەدەن ئەمە بوو؛ بۆ ئەوەی کە هێزە وشکانییەکانی سوپای ئەمریکا دەربازی خاکی عێراق بن، خاکی تورکیا لە ١ی مارتدا بە رووی ئەمریکا داخرابوو. بەڵام لە ٢٠ی مارت'دا هەرێمی ئاسمانیی تورکیا بە رووی هێزەکانی ئەمریکا کراوە بوو تا لەوێوە بچنە ناو عێراق. هەندێك لە ئەندامانی سەر بە پارتی دەسەڵات و لایەنگرەکانیان لە تورکیا و ژمارەیەکی زۆر کەسی دیکەش رەتکردنەوەی مۆڵەتنامەی ١ی مارت'یان بە نیشانەیەکی دژایەتیکردنی جەنگ لە قەڵەم دەدا. رەتکرانەوەی داوای مۆڵەتەکە وەك رەمزی سەربەخۆیی و رووبەڕووبوونەوەی تورکیا لەگەڵ ئەمریکا لە قەڵەمدەدرا و شانازیی پێوە دەکرا. لەو وڵاتەدا هاوپەیمانییەکی فراوان بۆ پشتگیری کردن لە رەتکردنەوەی مۆڵەتنامەکەی ١ی مارت درووستکرابوو. لایەنەکانی نێو ئەم هاوپەیمانییەش لە چەندین گرووپ و رەوتی جیاواز بوون کە بە هۆکاری جۆراوجۆرەوە پاڵپشتیی رەتکردنەوەی مۆڵەتنامەکەیان دەکرد. کوردەکانی عێراق و کوردەکانی تورکیا، ئەو چەپانەی کە دژی ئەمریکا بوون و هەروەها ئەو سەربازانەی کە دەیانویست پەیوەندییەکانی ئەمریکا

و پارتی داد و گەشەپێدان تێك بچێت، لەگەڵ ئەو لایەنگرە دیندارانەی پارتی داد و گەشەپێدان کە پێیان وابوو جەنگی عێراق شەڕێکی خاچپەرستانەیە لە دژی وڵاتێکی دراوسێی موسڵمان، هەموویان پێکەوە لەم هاوپەیمانییەی دژی جەنگدا جێیان گرتبوو. لەنێویشیاندا کەسانێك هەبوون کە تەنانەت پێیانوابوو، ئەگەر ئەمریکا نەتوانێت بەرەی دووەمی جەنگ لە باکوور بکاتەوە، شەڕ دەرناکەوێت. ئەم کەسانە پێیانوابوو کە ئەگەر تورکیا رێ لە ئەمریکا بگرێت دەتوانێ رێگا لە دەرکەوتنی جەنگیش بگرێت. هەموو ئەم لایەنانە بە هۆکار و پاساوی جیاوازیشەوە بێت، دژایەتیی جەنگیان دەکرد و ئەمەش هێزێکی فراوانی دژەجەنگی درووستکردبوو. دوابەدوای ئەوەش پەسەندنەکرانی داوای مۆڵەتی ١ی مارت لە پەرلەمانی تورکیا لە هەموو وڵاتدا شەپۆلێکی فراوانی خۆشحاڵیی درووستکرد و وەك شانازییەکی نەتەوەیی سەیر دەکرا.

هەڵوێستی کوردەکان‌ی عێراق رۆڵی هەبوو لەوەی کە داوای مۆڵەتی ١ی مارت لە پەرلەمانی تورکیا پەسەند نەکرێت. ئەو کوردانەی تورکیا کە لە ژێر کاریگەریی مەسعود بارزانی‌دا بوون دژی پەسەندکردنی مۆڵەتنامەکە بوون. ئەم دژایەتیکردنەی کوردەکان بۆ مۆڵەتنامەکە تەنانەت لەنێو پەرلەمانتارە کوردەکانی پارتی داد و گەشەپێدان‌یشدا رەنگی دابووەوە. بەشێکی زۆر لەو ٩٧ ئەندامەی پارتی دادو گەشەپێدان کە سەرەرای پێشنیاری حکومەت، دژی پەسەندکردنی مۆڵەتنامەکە دەنگیان دابوو پەرلەمانتارانی باشووری خۆرهەڵات بوون. لەو مۆڵەتنامەیەدا بەدەر لەوەی پێشنیار کرابوو کە رێگە بە هێزەکانی ئەمریکا بدرێت لە خاکی تورکیا‌وە بچنە نێو عێراق، لە هەمانکاتدا داوا کرابوو کە هێزە چەکدارەکانی سوپای تورکیا‌ش بچنە ناو عێراق و بە درێژایی ٢٠ کیلۆمەتر هەرێمێکی قەدەغەکراو دروستبکەن و هۆکاری سەرەکیی دژایەتیکردنی مەسعود بارزانی و کوردەکانی عێراق بۆ پەسەندکردنی ئەو مۆڵەتنامەیەش ئەمە بوو. کوردەکانی عێراق پێیانوابوو ئامانجی سەرەکی تورکیا روخاندنی حکومەتی سەدام نییە بەڵکوو دەیەوێت کوردەکان کۆنترۆڵ بکات و لەبەر ئەوەش هەبوونی سەربازیی تورکیا‌یان لە ناوچەکانی خۆیاندا قبوڵ نەدەکرد. بەجۆرێك کە لە مێژووی کوردستانی عێراق‌دا نەبینرابوو، لەو کاتانەدا لە هەولێر خۆپیشاندانێکی فراوان دروستکرا کە تێیدا یەك ملیۆن کورد لە هەموو ناوچەکانەوە هاتبوون و دژی رەوانەکردنی هێز یان سەربازی تورکیا بۆ خاکی عێراق خۆپیشاندانیان کردبوو.

جیاوازییەکی بنەڕەتی لەنێوان هەڵوێست و نزیکایەتیی پارتی داد و گەشەپێدان لە چارەکی یەکەمی ٢٠٠٣دا لەگەڵ نزیکایەتی و هەڵوێستی تورگۆت ئۆزاڵ لەکاتی سەرۆکایەتی کۆمار لە ساڵەکانی ١٩٩٠کاندا هەبوو. پارتی داد و گەشەپێدان ئامانجی رووخاندنی سەدام حسێن نەبوو، بەڵام ئەوەی دووەمیان رووخاندنی ئەو دەسەڵاتەی بە ئامانجی سەرەکی خۆی دانابوو. ئەم جیاوازییە بنەڕەتییەش لە هەڵوێستەکانی تورکیا سەبارەت بە کوردەکانی عێراق لەنێوان ساڵانی١٩٩١-٢٠٠٣دا دەردەکەوت. کوردەکانی عێراق لەسەردەمی

تورگۆت ئۆزال'دا هەستیان بە نزیکی تورکیا لە خۆیان دەکرد، بەڵام لە ٢٠٠٣دا کاردانەوەیان لە دژی پیشاندەدا. بەدەر لە کوردەکانی عێراق، کوردەکانی تورکیا'ش کە هاسنووری ئەوان لە باشووری خۆرهەڵاتی تورکیا دەژیان، کاردانەوەیان لە دژی مۆڵەتنامەی ١ی مارت پیشاندا. بەڕێوەبردنی باری نائاسایی کە ساڵانێك بوو لە باشووری خۆرهەڵاتی تورکیا پەیڕەو دەکرا، بە تازەیی لابرابوو. هەزاران سەربازی ئەمریکی لە ناوچەکەدا جێگیر دەکران و بەو هۆیەشەوە جارێکی دیکە باری ئەمنیی ناوچەکە گرنگیی زیاتری پێدەدرا. هیچ کەسێك لە ناوچەکەدا حەزی لەوە نەدەکرد جارێکی دیکە ژمارەیەکی زۆر هێزی سەربازی لەلای ئەوان جێگیر بکرێت. بەو هۆیەشەوە لە باشووری خۆرهەڵات و لەنێو کوردەکانی تورکیا'شدا مۆڵەتنامەکە شتێکی خوازراو نەبوو. ئەو سەربازانەی کە لەگەڵ ساڵی٢٠٠٧دا پلانەکەیان بۆ رووخاندنی پارتی داد و گەشەپێدان لە ڕێی کودەتاوە ئاشکرا کرا، لە کۆبوونەوەی دەستەی ئاسایشی نەتەوەییەدا کە بەر لە پەرلەمان سەبارەت بە مۆڵەتنامەکەی ١ی مارت سازکرابوو، قورسایی خۆیان پیشان نەدابوو تا مۆڵەتنامەکە لە پەرلەمان قبوڵ بکرێت. ئەمەش لەکاتیکدا بوو کە بیروبۆچوونی زاڵ لەنێو دەستەی ئاسایشی نەتەوەییدا دەیتوانی کاریگەریی لەسەر دانیشتنەکەی پەرلەمان دانێت. بەدەر لە ژەنراڵ حیلمی ئۆیزکۆك فەرماندەی گشتی سوپا، زۆربەی فەرماندە پلە باڵاکانی سوپای تورکیا نیگەران بوون لەوەی کە ئەگەر مۆڵەتنامەکە لەلایەن پەرلەمان'ەوە پەسند بکرێت، لەوانەیە پەیوەندییەکانی ئەمریکا و پارتی داد و گەشەپێدان پتەوتر بێت. ئەگەر ئەمریکا چرای سەوزی بۆ پارتی داد و گەشەپێدان هەڵبکردایە، کاری ئەوان سەخت و دژوارتر دەبوو. ئەوان هەر لەدوای هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٢وە دەستبەکار بوون بۆ ئەوەی پارتی داد و گەشەپێدان لە دەسەڵات دوور بخەنەوە.

سەربازەکان چاوەڕوان بوون تا لووتی ئەمریکا لە عێراق لە عەرز بدات، بەڵام هۆکاری سەرەکی دژایەتیکردنی جەنگی عێراق لەلایەن ئەوانەوە پەیوەندی بە کوردەکان'ەوە هەبوو. لەدوای جەنگی یەکەمی عێراق لە ساڵی١٩٩٠-١٩٩١ لە باکووری ئەو وڵاتە، بەدەر لە دەسەڵاتی بەغدا هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی کوردی دروستکرابوو. سەربازەکان دەترسان لەوەی کە لە جەنگی دووەمی عێراق'دا، دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی دابمەزرێت و ئەمەش بۆ ئەوان وەك دێوەزمەیەکی لێهاتبوو. لەکاتێکدا هەموو ئەمانە دژایەتی پەسەندکردنی مۆڵەتنامەی ١ی مارتیان دەکرد، زەحمەت بوو پێشبینی بکرێت کە پەرلەمان ئەو مۆڵەتنامەیە پەسەند ناکات. منیش یەکێك لەوانە بووم. هیچ گومانێکم نەبوو لەوەی کە جەنگ دەردەکەوێت. پێموابوو تورکیا ناتوانێت رێ لە جەنگی ئەمریکا بگرێت و تەنانەت ئەگەر مۆڵەتنامەکەش پەسەند نەکرێت، سیاسەتی ئەمریکا لەبەرانبەر عێراق بەشێوەیەکی بنەڕەتی گۆڕانکاری بەسەردا نایەت. ئەو جەنگەی کە گەیشتبووە بەر دەرگا، جارێکی دیکە جەمسەربەندیی لە تورکیا دروستکردبوو. جەمسەربەندییەکە بە

زەقی دەردەکەوت و نەدەکرا خاڵە جیاوازەکان بشاردرێنەوە. ناوی من وەك لایەنگرێکی پەسەندکردنی مۆڵەتنامەکە دەرچوبوو. پێشبینیکردنی دەرچوونی جەنگ جیاوازی هەبوو لەوەی کە تۆ لایەنگری پەسەندکردنی مۆڵەتنامەکە بیت، بەڵام کەم کەس گرنگی بەمە دەدات. مومکین نەبوو من لایەنگری لە پێشهات و رووداوێك بکەم کە ببێتە هۆی رووبەڕوو بوونەوەی تورکیا لەگەڵ کوردەکان. زۆر بە باشی ئاگام لەوە بوو کە تورکیا هیچ ئامانجێکی بۆ رووخاندنی سەدام نییە و ئامانجە سەرەکییەکەشی لە رەوانەکردنی سەرباز بۆ خاکی عێراق هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نییە. بەکورتی هیچ هۆکارێکی بنەڕەتی نەبوو تا من لایەنگری لە پەسەندکردنی مۆڵەتنامەی ١ی مارت بکەم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوون و هەڵوێستی من سەبارەت بە رووخاندنی سەدام لەگەڵ قەناعەتەکەم سەبارەت بە پەسەندکردنی مۆڵەتنامەکە یەکخرا و بەوجۆرەش ناوم وەك لایەنگری پەسەندکردنی مۆڵەتنامەکە دەرچوو. دوای ماوەیەکی دوورودرێژ لە دەسی کردن بە ئەمریکاییەکان پەرلەمانی تورکیا لە ١ی مارتی ٢٠٠٣دا لە دانیشتنێکی نهێنیدا مۆڵەتنامەی ١ی مارتی خستە دەنگدانەوە کە لەلایەن حکومەتی داد و گەشەپێدان بەسەرۆکایەتی عەبدوڵا گویل٘هوە پێشنیار کرابوو.٥٣٣ پەرلەمانتار بەشدارییان لە دانیشتنەکەدا کرد کە ٢٤٦ی دەنگیان پێدا و ٢٥٠ کەس رەتیان کردەوە و ١٩ کەسیش بە بێلایەن مانەوە. بەپێی پێڕەوی ناوخۆی پەرلەمان، بۆ ئەوەی کە مۆڵەتنامەکە پەسەند بکرێت پێویستبوو زیاتر لە نیوەی ئامادەبووانی دانیشتنەکە دەنگی پێبدەن تا بتوانرێ پەسەند بکرێت و لەبەر ئەوەی کە ژمارەی ئەو کەسانەی مۆڵەتنامەکەیان پەسەند کرد نەگەیشتە ٢٦٧ کەس، سەرەڕای ئەوەی ژمارەیان زیاتر بوو لەو کەسانەی کە رەتیان کردبووەوە، پەسەند نەکرا. ئەگەر لەو ١٩ کەسەی کە بە بێلایەن مابوونەوە، تەنها ٦ کەسیان لە دانیشتنەکەی پەرلەمان ئامادە نەبوایەن، ئەوکاتە ژمارەی ئەو کەسانەی کە مۆڵەتنامەکەیان قبووڵ دەکرد زیاتر دەبوو و بەوجۆرەش پەسەند دەکرا. خۆی لەبنەڕەتدا رەتنەکرایەوە، بەڵام پەسەندیش نەکرا و لەبەر ئەوەی کە پەسەند نەکرا، رەتکرایەوە. لەو دیدارەی رۆژی ٥ی مایس کە لەگەڵ پۆل ڤۆڵفۆویتز٘دا کردمان، پرسیارێکم کرد و وتم سەرتان سووڕما لەوەی کە پەرلەمانی تورکیا مۆڵەتنامەکەی رەتکردەوە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی؛"رەتیان نەکردەوە."

-"یەعنی پەسەند کرا؟"

-"نەخێر پەسەند نەکرا. نازانم چەند ئەمریکایی سەیری ئەم چرووتگرامە دەکات، بەڵام با لە خۆمانەوە نەڵێین پەرلەمانی تورکیا رەتیکردۆتەوە و زانیاری هەڵەیان پێبدەین. ئەوان تەنها نەیانتوانی دەنگی زۆرینە بە دەست بهێنن و ئێمەش لەوەدا پشتیوانیی پێویستمان بە دەستهێنا."

لەبەر ئەوەش هەڵسەنگاندنی رەتکردنەوە مۆڵەتنامەی ١ی مارتی ٢٠٠٣ وەك سیمبول و رۆژێکی نەتەوەیی لە تورکیا کە بە خاڵێکی وەرچەرخان لە مێژوودا لە قەڵەم دەدرێت شتێکی راست نییە و بە لارێ

بردنی مێژووە و هەوڵێکی دیماگۆژییانەیە بۆ باسکردنی مێژووی تورکیا بە شێوازێکی هەڵە. ئەگەر وەها بوایە زەحمەت بوو بە ئاسانی بتوانیت مۆڵەتنامەکەی ۲۰ مارت روون بکەیتەوە. یەك رۆژ دوای دەستپێکردنی جەنگ، مەیدانی ئاسمانیی تورکیا بە رووی فڕۆکە جەنگییەکانی ئەمریکادا کراوەبوو. ئەوکاتەش لە جیاتی عەبدوڵا گویل، تایب ئەردۆغان لەسەر کورسی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران دادەنیشت. رەفتار و جوڵەی هەستناکانەی ئەردۆغان سەبارەت بە هاوکاریکردن لەگەڵ ئەمریکا جارێکی دیکە ورەی دابوو بە ئەمریکاییەکان تا سەبارەت بە رەوانەکردنی هێزی تورکیا بۆ عێراق پێشنیار بکەن و دواجاریش حیسابەکانی پۆڵ ڤۆلفۆویتز راست دەرچوون. داوای مۆڵەتی رەوانەکردنی سەربازی تورکیا بۆ عێراق لە۷/۱۰/۲۰۰۳ لە پەرلەمان خرایە دەنگدان و قبووڵ کرا و بەوجۆرەش لە ماوەی یەك ساڵدا، سێ داوای مۆڵەت سەبارەت بە هاوکاریی سەربازی لەگەڵ ئەمریکا لە جەنگی عێراق'دا هێنرانە پەرلەمان. داوای مۆڵەت لە ۱ی مارت دەنگی پێویستی بە دەستنەهێنا، بەڵام لەبەرامبەر ئەوەدا داوای مۆڵەت لە ۲۰ و ۷ی مانگی ۱۰دا بە جیاوازییەکی زۆرەوە لە پەرلەمان پەسەند کرا. ئەمریکاییەکان دەیانویست هێزەکانی تورکیا لە سێگۆشەی سوننە کە ناوچەیەکی پڕ لە بەڵا و کێشە و گرفتی عێراق'ە، ئەرك وەربگرن. لەبەرامبەر هەبوونی هێزی سەربازیی ئەمریکا لە عێراق، راپەڕین و بەرگری بە تایبەت لە پارێزگای ئەنبار کە دەکەوێتە خۆرئاوای بەغدا چڕ ببووەوە و ئەو شوێنەش کە بڕیاربوو هێزەکانی تورکیا لەوێ جێگیر بکرێن، پارێزگای ئەنبار بوو کە لە سێگۆشەی سوننە'دا بوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەدا کوردەکان کە دژایەتیی پەسەندکردنی مۆڵەتنامەی ۱ی مارتیان کردبوو، سەبارەت بە مۆڵەتنامەکەی ۱۰/۷ش قیامەتیان بەرپا کرد. ئەوان بەهیچ جۆرێك سەربازانی تورك'یان نەك هەر لە پارێزگای ئەنبار، بەڵکو لە هیچ شوێنێکی خاکی عێراق'دا نەدەویست. چونکە ئەوان دەترسان لەوەی کە یەکەکانی سوپای تورکیا لەگەڵ ئەوەی لە دەروازەی سنووریی خابوور'ەوە تێپەڕبوون، ببن بە ئەمرێکی واقیع و لە ناوچە کوردنشینەکان'دا بمێننەوە. ئەو کاردانەوانەی کە کوردەکان لە دژی ئەگەری هاتنی هێزی سەربازی تورکیا پیشانیاندا، زۆری نەخایاند کە بۆ ناو هێز و گرووپ و لایەنە سیاسییەکانی عێراق و تەنانەت دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانەکان بەسەرۆکایەتیی پۆل برێمەر'یش تەشەنەی کرد. هێزەکانی سوپای تورکیا کە لەلایەن پەرلەمانەوە مۆڵەتیان پێدرابوو، بۆ ئەوەی کە بتوانن لە عێراق جێگیر ببن، پێویستبوو رەزامەندیی عێراقییەکان و ئەمریکاییەکانیش وەربگرن کە حوکمی ئەو وڵاتەیان دەکرد. پۆل ڤۆلفۆویتز کە خاوەنی بیرۆکەی جێگیرکردنی هێزی تورکیا بوو لە عێراق، پێیوابوو پۆل برێمەر ریگای لەو کارە گرتووە و بەوجۆرەش تاوانی رێگرتن لە رەوانەکردنی سەربازەکانی تورکیا'ی بۆ عێراق دەخستە ئەستۆی برێمەر. ساڵانێك دوای ئەو رووداوە، ڤۆلفۆویتز بەمجۆرە باسی دانووستانێکی خۆی لەگەڵ مەسعوود بارزانی لەوبارەیەوە کرد؛

"بۆ دانووستان سەبارەت بە جێگیرکردنی هێزەکانی تورکیا لە عێراق، چووم و لەگەڵ مەسعوود بارزانی

دیدارم کرد. پێمگوت ئەگەر ئێمە رێگە لەوە بگرین کە هێزەکانی تورکیا لە رێگەی خاکی کوردەکان‌ەوە بێنە عێراق، تۆ رازی دەبیت هێزەکانی تورکیا لە رێگەی کوەیت یاخود راستەوخۆ لە رێگەی ئاسمانییەوە بچنە عێراق و لەوێ جێگیر بکرێن؟"لە وەڵامدا پێی وتم؛"نەخێر. بەڵام بە یەك مەرج رازی دەبم. لەبەرامبەر جێگیرکردنی هێزەکانی سوپای ئەمریکا لە کوردستان بەوە رازی دەبم."

پۆل ڤۆڵفۆویتز لە ١٢ی حوزەیرانی٢٠١٠دا لە گفتوگۆیەکی دوورودرێژ لە ئیستانبوڵ ئەو زانیارییەی پێدام و دواتر قسەی بردەوە سەر پۆل برێمەر و وتی؛"خۆی لەبنەڕەتدا پۆل برێمەر دژی هاتنی تورکەکان بوو و لەو رووەشەوە کاریگەری لەسەر واشنتن دادەنا. هەرچەندە هۆکاری دژایەتییەکەشی دەبەستەوە بە ناڕەزایی ناوخۆیی عێراقییەکان، بەڵام ئەو لایەنگری لەو پان - عەرەبیستانە دەکرد کە لەنێو وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا‌دا بوون. هۆران لەوەدا رۆڵی هەیە و بە ئەگەری زۆر ئەو کاریگەری لەسەر برێمەر دانابوو. ئەو عەرەبییەکەی زۆر باش بوو و راوێژکارێکی باشیش بوو، بەڵام سەبارەت بە عێراق هیچ شتێکی نەدەزانی."ناوی هۆم هۆران‌م لە رێی ئەو کتێبەوە زانی کە پۆل برێمەر بەناوی"ساڵەکەم لە عێراق" کە دەگوترێت زیاتر بۆ پاکانەکردن بۆ خۆی نووسیویەتی زانی. زانیاریم سەبارەت بە بیروبۆچوونەکانی هۆم هۆران‌یش لە کتێبەکەی عەلی عەلاوی بە دەستهێنا؛

"...هۆم هۆران باڵیۆزیکی خانەنشین بوو و لەسەر داوای شەخسی مەلیك فەهد لە ساڵی١٩٨٨ بەشێوەیەك کە مشتومڕی زۆری لەسەر کرا، بوو بە باڵیۆزی گەورەی ئەمریکا لە عەرەبستانی سعودی. هۆران لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کارە دیپلۆماتییەکانی خۆی ئەنجام دابوو و عەرەبییەکی زۆر باشی دەزانی... دیدگای ئەو سەبارەت بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، راستەوخۆ پشتی بە بیروبۆچوونەکانی بێرنارد لوئی سەبارەت بەئەو شوناسانەی فرە رەنگانەی کە لە جووڵەدان، دەبەست. بەگوێرەی هۆران شوناسی عێراق بەشێوەی قەبە پارچە کرابوو و لە موزائیکێك پێکهاتبوو کە پێویستبوو بەشێوەیەکی پێداگرانە و بە وریایی لە دەوری یەك کۆ بکرێنەوە. ئەم دیدگایەش بیروبۆچوونەکانی برێمەر و لەگەڵ ئەویشدا دەسەڵاتی هاوپەیمانەکانی خستە ژێر کاریگەریی خۆی ... لەدوای جیابوونەوە لە دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانەکان لە عێراق، هۆران لە وتارێکی پڕ کاریگەردا باسی لە دیدگا و بیروبۆچوونێك کرد کە نیوکۆنسێرڤاتیڤەکان لە واشنتن زۆر پشتگیرییان لێ دەکرد. ئەویش ئەوە بوو کە جەختی لەسەر پێکهاتەیەکی دیموکراتی لە عێراق و ئیسرائیل و ئێران و تورکیا لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دەکردەوە. بەگوێرەی ئەو، ئەم پێکهاتەیە دەیتوانی ببێتە نموونەیەك بۆ وڵاتانی دیکەی عەرەبی و دەبووە هۆکارێك بۆ ئەوەی پرۆسەی رێفۆرمیزەکردنی دینەکان خێرا بکرێت و دنیای مودێرن لەوێ قبوڵ بکرێت. ئەم جۆرە شیکردنەوە مێژووییانە کە رەهەندێکی ئایدۆلۆژی تێدا بوو، لە رۆژە سەرەتاییەکانی دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانەکان لە بەغدا رەواجی هەبوو. ئەو جۆرە بۆچوونانەی کە

لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەو شیکردنەوەیە بوون و هەروەها ئەو ڕووداوانەش کە لە ڕاستیدا ڕوویان دەدا، بە ئاسانی لەم دیدگایەدا پشتگوێ خرابوون."

بەگوێرەی پۆڵ ڤۆلفۆویتز، ئەو کەسانەی کە ڕێگای تورکیا'یان لە عێراق'داخستبوو، تیمێك بوون کە کەسانی وەك پۆڵ برێمەر و هۆم هۆران'ی تێدا بوو کە لەنێو دەسەڵاتی ئەمریکا دژایەتی ئەویان دەکرد. پۆڵ ڤۆلفۆویتز کتوپڕ پرسیارێکی چاوەڕوان نەکراوی لێکردم و وتی؛"چی دەڵێی، ئەگەر سەربازەکانی تورکیا بەو مۆڵەتنامەیەی مانگی١٠وە لە عێراق جێگیر بکرابایەن، ئەمڕۆ هەموو شتێك جیاوازتر نەدەبوو؟"

ئەگەر دەسەڵاتی بوش لە ١٩٩١دا لە جیاتی لەسەر پێ هێشتنەوەی سەدام و پشت کردنە گەلی عێراق، پێشنیارەکەی پۆڵ ڤۆڵفۆویتز'ی بۆ ئەوەی کە هاوشێوەی هێڵی تەریبی ٣٦، هێڵێکی دژە فڕین لە باشووری بەغدا'ش دروستبکرێت لەبەرچاو بگرتایە، ئەوکاتە پێویست بەم داگیرکارییەی عێراق و جەنگی ٢٠٠٣ دەبوو؟ وا دیاربوو پۆڵ ڤۆلفۆویتز وەك چۆن لەنێوان ١٩٩٣- ٢٠٠٣دا وازی لە گەڕان بەدوای وەڵامی ئەم پرسیارە نەهێنابوو، لە ٢٠٠٣ش بەدواوە وەڵامی ئەو پرسیارە بەردەوام زەینی مەشغووڵ دەکرد.

هەرکاتێک ئەو جۆرە پرسیارانە لەلایەن کەسێکی وەك پۆڵ ڤۆلفۆویتز کە مێژوو دروستدەکەن و یاخود ڕۆڵی گرنگیان لە دروستکردنی مێژوودا هەیە، پرسیارێکی گرنگ سەبارەت بە مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دێ بە مێشکمدا کە زۆرجار لە تاقیکردنەوەکاندا بۆ خوێندکارەکانم دەهێنایەوە؛"ئایا پێویستبوو عەرەبەکان پلانی دابەشکردنی فەلەستین بەپێی بڕیاری ژمارە ١١٨ لە ٢٩ی تشرینی دووەمی١٩٤٧ کە لە دەستەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان قبوڵکرا، پەسەند بکەن؟ ئەگەر قبوڵیان بکردایە ئەمڕۆ چی دەبوو؟ کێشەی فەلەستین بەمجۆرەی ئێستا دەبوو؟"

بەگوێرەی پلانی دابەشکردنەکە خاکی فەلەستین کە لە ژێر دەسەڵاتی ماندای ئینگلیزەکان'دا بوو، دەکرا بە دوو بەش کە ٥٦'٤٧٪ی دەدرا بە زایۆنیستەکان بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی یەهوودی لەسەر دروستبکەن و ٤٢,٨٨٪یشی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەرەبی دەدرا بە عەرەبەکان و ٠,٦٥٪ی ئەو خاکەش دەکرا بە ناوچەیەکی نێودەوڵەتی کە قودس'یشی لە خۆ دەگرت. لەو بڕە خاکەی فەلەستین٥٦,٤٧٪کە پێشبینیی دەکرا دەوڵەتێکی یەهوودی لەسەر دابمەزرێ ٩٠٥هەزار کەس دەژیان کە٤٩٨ هەزار کەسیان یەهوودی بوون و ٤٠٧هەزاری دیکەیان عەرەب بوون. ئەو لێژنەیەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە پلانەکەی ئامادە کردبوو، دواتر باسی ئەوەشی کردبوو کە ١٠٥هەزار عەرەبی بەدەوی'ش لەو ناوچەیەدا دەژین و بەوجۆرەش یەهوودییەکان لەسەر ئەو خاکانە دەبوون بە کەمینە. لەبەرامبەر ئەوەشدا ئەو خاکانەی کە بۆ یەهوودییەکان تەرخان کرابوو و پێشبینیی کرابوو کە دەوڵەتی یەهوودی لەسەر دابمەزرێت، پێگەی کەمینە بە عەرەبەکان درابوو. لەسەر ئەو خاکانەش کە بڕیار بوو بەڕێوەبردنیەکی عەرەبی لەسەر دابمەزرێت،

٧٢٥ هەزار عەرەب دەژیان و دە هەزار یەهوودی وەك کەمینە دەژیان. لە قودس کە وەك ناوچەیەکی نێودەوڵەتی لێکرا، ١٠٠هەزار یەهوودی و ١٠٥هەزار عەرەب دەژیان. پلانەکە لەلایەن دەیڤید بن گۆرین سەرکردەی زایۆنیستەکانەوە کە ساڵێك دواتر دەوڵەتی ئیسرائیلی دامەزراند قبوڵکرا. عەرەبەکانیش بە پاساوی ئەوەی کە پلانەکە ناهەقییەکی زۆری بەرامبەر بەوان کردووە ڕەتیان کردەوە. لە ڕۆژی ئەمڕۆشدا گەیشتوونەتە ئەوەی کە ڕازی بن دەوڵەتێك لەسەر ٢٢٪ی خاکەکانی فەلەستین دابمەزرێت. بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو شەڕ و ئاژاوە و ئازارەی کە لە ماوەی نزیکەی نیو سەدەدا بەرپا بوو، هێشتا ئەم چارەسەرەش جێبەجێ نەکراوە. بە لەبەرچاو گرتنی هەموو ئەو ئازار و مەینەتییانەی کە لە ماوەی دەیان ساڵدا گەلی فەلەستین چێشتوویانە و ئەو خاڵەی کە ئێستا پێی گەیشتوون، پرسیارێك دەکرێ کە داخۆ ئایا باشتر نەبوو فەلەستینییەکان دامەزراندنی دەوڵەتی فەلەستینی لەسەر ٤٢٪ی خاکەکانی خۆیان قبوڵ بکەن؟ لەکاتیکدا کە زایۆنیستەکان پلانی ١٨١ی نەتەوە یەکگرتووەکانیان بۆ دابەشکردنی فەلەستین قبول کرد، ئایا ڕەتکردنەوەکەی فەلەستینییەکانیان بە هەلەیەکی میژوویی لە قەڵەم دەدرا؟ دەبوو بەوجۆرە سەیری بکەن؟ لە ساڵی ١٩٩٧ بەدواوە سەرەتا لە زانکۆی ئیستانبوڵ و دواتر لە زانکۆی کەلتوور وانەی مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستم دەگوتەوە و لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا بۆ خوێندکارەکانم ئەم پرسیارەم دەهێنایەوە و تێیدا داوام دەکرد تەنها بە ڕستەیەك وەڵامم بدەنەوە و ئەگەر بە ڕاستی وەڵامیان بدایەتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە وەڵامی پرسیارەکانی دیکەشیان بە هەڵە بدایەتەوە، نمرەی تەواوم پێدەدان. ئەو وەڵامە یەك ڕستەییەش ئەمە بوو؛"ئێوە مافی پرسیارێکی لەم جۆرەتان نییە، چونکە مێژوو وردبوونەوەی ڕووداوەکانە. بەدەر لە دەنگۆ و واتە وات هیچ شتێکی دیکە سەبارەت بەو ڕووداوانە ناگوترێ کە ڕوویان نەداوە."لەبەر ئەوەی کە لەسەرەتای هەر دەرسێکەوە بە درێژی باسی میتۆدۆلۆژیی مێژووم دەکرد، وەڵامی ڕاست بۆ ئەو پرسیارەشم هەبوو. تەنها بۆ یەك جاریش خوێندکارێکم نەدۆزییەوە کە وەڵامی ڕاستی ئەو پرسیارەی من بداتەوە و لەبەر ئەوەش نمرەم لێ نەشکاندن. من درکم بەوە دەکرد کە مرۆڤ زەینی خۆی نەك بەگوێرەی ڕێسا و یاساکانی میتۆدۆلۆژی مێژوو، بەڵکوو بەگوێرەی هەست و نەستەکانی خۆی کار پێ دەکات. مێشکی مرۆڤ بە شیوەیەك کە کۆنترۆڵ ناکرێت ئامادەیە بۆ ئەوەی پرسیاری لەو جۆرە بکات و بڵی ئەگەر بەمجۆرە بووایە یان ئەگەر بەمجۆرە نەبووایە چی دەبوو. پرسیارەکەی ڤۆلفۆویتزیش دەچووە ئەم خانەیەوە. لە وەڵامدا پێمگوت لە کوێ دەزانی چی دەبوو؟ ئەوە ڕووی نەدا و هێزەکانی تورکیا لە پاییزی ٢٠٠٣ لە ناوچەی ئەنباری عێراق جێگیر نەکران. ئەگەر جێگیر بکرایەن چی دەبوو؟ لەوانەیە دینامیکی زۆر جیاواز بکەوتایەتە جووڵە، ئەوانە چی دەبوون و چ ئەنجامیکیان لێ دەکەوتەوە؟ لەبەر ئەوەی کە ڕوویان نەداوە، نازانین، نازانین...

بیروبۆچوونەکانی خۆتان سەبارەت بە مرۆڤێك، نەك لە رێی وەڵامەکانی بەڵکو لەرێگەی پرسیارەکانیەوە بونیادبنێن.

فۆڵتێر

لە مانگی تشرینی یەکەمی ۲۰۰۳دا بە ماوەی نێوان سێ مانگ لەدوای رووخانی رژێمی سەدام، دووەم جاربوو کە لە بەغدا بووم. لەنێو دەستەی وەزیر و ئەندامانی ئەنجومەنی حوکمی عێراق کە لەگەڵ دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانەکان کاریاندەکرد، لە شیعەکان'هوە بگرە کە قسەیان لە عێراق دەیخوارد هەتا سوننە و کوردەکان زانیاریم وەرگرتبوو سەبارەت بەوەی کە بۆچی ئەوان نایانەوێت سوپای تورکیا لە هیچ شوێنێکی عێراق جێگیر بکرێت. بەڵێنیشم دابوو کە کاتی گەڕانەوەم بۆ تورکیا هەموو زانیارییەکان وەك خۆی بۆ سەرۆك وەزیر تایب ئەردۆغان بگێڕمەوە.

بەر لەوەی بەرەو بەغدا بە رێ بکەوم، لە سلێمانی میوانی بەرهەم ساڵح بووم. بەرهەم ساڵح سەرۆك وەزیری ئەو حکومەتە کوردی'یە بوو کە لە سلێمانی لەژێر دەسەڵاتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەسەرۆکایەتی تاڵەبانی دا بوو. لەوکاتانەدا لە باکووری عێراق دوو بەڕێوەبردنی کوردی هەبوو. ئیدارەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرکردایەتی مەسعود بارزانی، لەلایەن سەرۆك وەزیران نێچیرڤان بارزانی بەڕێوەدەبرا.

بەرهەم ساڵح کاتێك زانی لەگەڵ ئیلنور چەڤیك بۆ بەغدا دەچین، پرسیاری ئەوەی کرد کە"بۆ کوێ دەڕۆن؟"ئیلنۆر'یش لەوەڵامدا پێی وت کە دەزانین بەرەو کوێ دەڕۆین و شتێك نیە کە مایەی نیگەرانی بێت. ئەو شوێنەی ئیلنور لە مێشکی خۆیدا بۆ مانەوەمان دانابوو، هۆتێلی سندباد لەگەڕەکی کەرادەی شاری بەغدا بوو. مانگی تەمووزیش لە هۆتێلێکی نزیك لەوێ مابووینەوە. هەموو بەرپرسە باڵاکانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەو هۆتێلە دەمانەوە. ئامانجەکەی ئیلنور ئەوەبوو کە دیدارەکانمان لەگەڵ بەشی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان لە رێی دیدارەکەی بەرهەم ساڵح کۆتایی پێبێنین و دواتر لە بەغدا ببین بە میوانی هۆشیار زێباری. لە مانگی تەمووزدا هۆشیار زێباری لە هۆتێل سندباد بوو، لە تشرینی یەکەمیشدا هەر لەوێ دەمایەوە.

لەساڵی ۱۹۷۵دا لە چانەقەلە لەکاتی سەربازیدا لەگەڵ ئیلنور چەڤیك پێکەوە بووین و لەو ماوە کورتەی سەربازیمدا لەیەك تیمدا دەماینەوە. دوای سەربازیش پەیوەندییەکەمان درێژەی کێشا و دوای ئەوەی کە بوو بەسەرنوسەری رۆژنامەی تورکیش دەیلی نیوز کە رۆنامەیەکی سەرکەوتوو بوو لە تورکیا و باوك و دایکی ئەو دایانمەزراندبوو، منیش جاربەجار بۆ رۆژنامەکەیم دەنوسی. ئەوکاتەی کە من راوێژکاری تۆرگوت

ئۆزال بووم، ئیلنور راوێژکاری سولەیمان دەمیرەل بوو. لەدوایین قۆناغی ژیانی سیاسی ئۆزال'دا هەردووکمان راوێژکاری ئەم کەسایەتییە دژ بەیەکانە بووین، بەڵام ئەو بارودۆخە هیچ رەنگدانەوەیەکی لەسەر پەیوەندی دۆستانەی نێوانمان دانەنا.

لەساڵانی ١٩٩٩-٢٠٠٠دا ئەوکاتەی ئیلنور چەڤیك لەگەڵ سولەیمان دەمیرەل سەردانی پایتەختی ئەمریکا'ی کرد، دوای ماوەیەکی درێژ یەکترمان بینی. ئیلنور پێی گوتم کە بە ئاگاداری و رەزامەندی فەرماندەی گشتی سوپای تورکیا لەسەر داوای مەسعود بارزانی لە هەولێر سەرقاڵی دامەزراندنی تەلەفزیۆنی کوردستان تیڤی'یە.

ئیلنور لەگەڵ هەردوو سەرکردەکەی کورد، تاڵەبانی و بارزانی'دا پەیوەندییەکی باشی هەبوو و لە رۆژنامەکەشیدا بەشێوەیەکی جوامێرانە رێگەی بە بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونەکانی ئەوان دەدا. بەڵام لەنێو ئەو دووانەدا زیاتر لە مەسعود بارزانی نزیك بوو. لە دەرەوەی ئەو دوو سەرکردەیەش پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ نێچیرڤان بارزانی و هۆشیار زێباری هەبوو.

ئیلنور لە سایەی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان، توانی وەك تاقە تورکێك بەشداری دوایین کۆنفراسی مێژوویی عێراق بکات کە دوو سێ هەفتە بەر لە دەستپێکردنی جەنگ لە شاری سەلاحەدین لە کوردستانی عێراق بە بەشداری زاڵمای خەلیلزاد ئەنجامدرا. لەدوای جەنگ رۆژێك پێشنیاری پێکردم کە پێکەوە بچین بۆ عێراق. لەو رۆژانەدا منیش عەقڵ و فکرم بەوەوە مەشغوڵ بوو. بەر لە هەموو شتێك دەمویست کوردستانی عێراق ببینم کە تا ئەوکاتە نەمبینیبوو. لەساڵانی ١٩٩٠کاندا ژمارەیەکی زۆر لە رۆژنامەنوسانی تورك سەردانی ئەوێیان کردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی من لە ساڵی ١٩٩٠-١٩٩١دا لەو قۆناغەدا رۆڵم هەبوو لە دروستکردنی پەیوەندی تورکیا لەگەڵ سەرکردەکانی کوردی عێراق و پرسی کورد، دەترسام لەوەی کە لە هاتوچۆی کوردستانی عێراق'دا بەڵایەکەم بەسەر بێت، لەبەرئەوەش زۆرێك لەو دەرفەتانەم لە کیس دا کە هاوپیشەکانم بەکاریان دەهێنا.

لەدوای جەنگ مەراقەکەم زۆر زیاتر ببوو. دەمویست لە رێگەی کوەیت یان ئوردن'ەوە خۆم بگەیەنمە بەغدا. پێشنیارەکەی ئیلنور بۆمن زۆر سەرنجراکێش بوو، چونکە لە دەروازەی سنووریی خابور'ەوە راستەوخۆ دەچووینە باکووری عێراق و باسی ئەوەشی دەکرد کە لەوێوە سەردانی بەغدا دەکەین. ئەمە چۆن مومکین دەبوو؟ دەروازەی سنوری خابور لەژێر کۆنترۆڵی سەربازەکان یان بە واتایەکی دروستتر لەژێر دەستی هێزە تایبەتەکاندا بوو و رێگەیان نەدەدا کەسی مەدەنی لەوێوە هاتوچۆ بکات.

ئیلنور وتی:"ئەوە بۆ من جێ بهێڵە. من مۆڵەت وەردەگرم."لەراستیدا مۆڵەتیشی وەرگرت.

ئاسڵان گوینەر یاوەری تۆرگوت ئۆزال لەو کاتانەدا بە پلەی ژەنراڵی سکرتێری گشتی سوپای تورکیا بوو.

بەو مۆڵەتەی کە ئیلنور لە ئاسلان گوینەر وەریگرتبوو، بەڕێ کەوتین بەڵام لە خابور هێزە تایبەتەکان بەشێوەیەکی ناخۆش رایانگرتین. ئیلنور تەلەفۆنی بۆ ئاسلان گوینەر کرد و دوای چاوەڕوانییەك کە نیو کاتژمێری تێپەڕ نەدەکرد، دەروازە سنورییەکەیان بۆ ئێمە کردەوە و بەوجۆرەش لەدەروازەی سنوریی ئیبراهیم خەلیل کە لەسەری نوسراوبوو (Welcome to Kurdistan) بۆ یەکەمجار لە تەمووزی ۲۰۰۳ پێم نایە ئەودیو سنورەکان.

ئیلنور چەڤیك بەهۆی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان کارێکی کردبوو کە لە هەولێر'ەوە ئۆتۆمبیلێك بەدواماندا بنێرن. سەرەتا ئێمەیان برد بۆ دهۆك و دوای خواردنی نیوەڕۆ، لە رێگەی موسڵ بۆ هەولێر و دواتریش ئێمەیان بۆ سەلاحەدین برد. لە میوانخانەیەکی پارتی دیموکراتی کوردستان'دا کە تەسەور نەدەکرا لە وڵاتیکدا کە لە جەنگدا بێت ئەوەندە ئاسایش و خزمەتی تێدا هەبێت، جێگیر کراین.

شوێنی مانەوەمان لە مانگی تەموزدا لە عێراق میوانخانە بوو. لەوێشەوە بەرەو سلێمانی و دواتر هەولێر و کەرکوك و دواجاریش بەرەو بەغدا دەڕۆیشتین. هەموو کاروباری گەشتەکە و ئاسایشەکەمان لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستان'ەوە دابین دەکرا و لە بەغدا'یش هەر میوانی پارتی دیموکراتی کوردستان بووین. ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان زانیاری رۆژانەیان پێدەگەیاندین. تەنانەت جارێك کە دەمانویست لە بەغدا دەرکەوین و بگەڕێینەوە پێیان وتین مەسعود بارزانی ئەمشەو لە هۆتێلەکە دەمێنێتەوە و رۆژی دواتر بەشداری یەکەم کۆبوونەوەی مەجلیسی حوکم دەکات کە بە کۆبوونەوەیەکی مێژوویی یەکەم دەستەی بەڕێوەبەرایەتی نوێنەرانی عێراق لە قەڵەم دەدرا. لەبەرئەوە، ئێمەش لە رۆیشتن پەشیمان بووینەوە و لە بەغدا ماینەوە. بەوجۆرەش دەرفەتی ئەوەمان بەدەستهێنا کە شەوی بەر لەو رۆژە مێژووییە، لەگەڵ مەسعود بارزانی تێپەڕ بکەین. ئیلنور چەڤیك دەیویست لە مانگی تشرینی یەکەمدا دوای ماوەیەکی کورت دیسان بچێتەوە بەغدا بۆ لای ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان و لەوێ لەگەڵ هۆشیار زێباری و ئەندامانی دیکەی ئەو حزبەدا بمێنێتەوە. لەو قۆناغەدا هەرچەندە پەیوەندی نێوان یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان پەیوەندییەکی ئاڵۆز نەبوو، بەڵام پەیوەندییەکی دۆستانەشیان نەبوو. لەبەرئەوەش، بە بەرهەم ساڵح'مان نەگوت لە بەغدا دەچینە لای هۆشیار زێباری و میوانی پارتی دیموکراتی کوردستان دەبین. ئیلنور چەڤیك باسی ئەوەی نەکرد.

بەرهەم ساڵح کاتێك کە زانیارییەکی تەواوی وەرنەگرت کە ئێمە چۆن بۆ بەغدا دەچین و لەکوێ دەمێنینەوە، باسی بارودۆخی ئەمنی کرد و کاروباری گەشتەکەمانی بۆ بەغدا خستە دەستی خۆی. بەدەر لەوەش، بەرهەم بە تۆنێکی دەنگ کە لەنێوان میوانپەروەری و فەرمانپێکردندا بوو، باسی شتێکی کرد کە نەماندەتوانی هیچ نارەزاییمان هەبێت لەبەرامبەر ئەو گەشتەی کە بۆ بەغدا بۆی رێك خستبووین

و وتی؛"لە بەغدا لەلای نەوشیروان مستەفا دەمێننەوە. ئەو ئاگاداری بارودۆخی ئێوەیە. کاك نەوشیروان چاوەڕوانیتان دەکات و خوانێکی گەورەی بۆ ئامادە کردوون. یەکسەر بچن بۆ لای ئەو."

لە پاییزی ٢٠٠٣دا بارودۆخی ئەمنی ڕێگاوبانەکانی عێراق بە ئەندازەی بەغدا مایەی نیگەرانی بوو. لە مانگی تەمووزدا بارودۆخی ئەمنی بەغدا خراپتر لەوەبوو کە تەسەورمان دەکرد. بە تایبەتی ئەو شوێنانەی کە شوێنی مانەوەی بەڕێوەبەرانی نوێی عێراق و ئەمریکاییەکان بوون دەکرانە ئامانجی هێرشەکان. ئەو ڕووداوانەی کە لە ڕووی ئەمنییەوە بەغدایان کردە مەترسیدارترین شوێنی وڵات، یەکێکیان تەقاندنەوەی بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان بوو لە ١٩ی ئابدا کە بەهۆی ئەو هێرشەوە ڤیێرا دێمێلۆ دیپلۆماتی بەڕازیلی و نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان لە عیراق لەگەڵ ١٤ کەسی دیکە گیانی لە دەستدا و زیاتر لە ١٠٠ کەسی دیکەش بریندار بوون. دوابەدوای کوژرانی ڤیێرا دێمێلۆ نەتەوەیەکگرتووەکان بارەگای خۆی لە بەغدا داخست، بەڵام شۆکی گەورە لەو قۆناغەدا نزیکەی ١٠ ڕۆژ دواتر دروستبوو. ئەوەش ئەوەبوو کە ئایەتوڵا محەمەد باقر ئەلحەکیم سەرکردەی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی عێراق گەورەترین ڕێکخراوی شیعی لەکاتی دەرکەوتن لە مزگەوتی ئیمام عەلی لە نەجەف بەهۆی هێرشێکەوە کوژرا. لەو هێرشەدا لەگەڵ ئایەتوڵا محەمەد باقر ئەلحەکیم، ١٢٠ کەسی دیکەش گیانیان لە دەستدابوو. لە کۆتایی مانگی ئابدا لە عێراق هیچ کەسێك و هیچ شوێنێك پارێزراو نەبوو. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو بارودۆخەی کە ئەو ڕۆژەی عێراق هەیبوو، سووربوونی بەرهەم ساڵح بۆئەوەی بەشێوەیەکی پارێزراو ئێمە بگەیەنێتە بەغدا شتێك بوو کە مرۆڤ دەیتوانی بە ئاسانی لێی تێبگات. ئێمەیان سواری ئۆتۆمبیلێکی ٤×٤ ی تۆیۆتا کرد کە نازانم لەبەر چ هۆیەك بوو لەدوای جەنگ پێیان دەگوت مۆنیکا! لە داوی ئێمەشەوە بەهەمانشێوە مۆنیکایەکیتر کە پڕ بوو لە پێشمەرگەی چەکدار یاوەریی دەکردین.

لە کەرکوك'ەوە بەرەو دوزخورماتوو و داقوق بەڕێ کەوتین و لە ڕێی دوزخورماتوو'ەوە جەبەل حەمرین'مان تێپەڕکرد کە وەك سنوری جوگرافی نێوان کورد و عەرەبەکان لەقەڵەم دەدرێت و بەرەو ئەو دەشتاییەی عێراق ڕۆیشتین کە هەتا بەسرە درێژدەبووەوە و لە ماوەی سێ سەعات و نیودا گەیشتینە بەری خۆرئاوای ڕووباری دیجلە لە بەغدا و گەیشتینە بەر دەرگای ڤیلایەك کە ڕێوشوێنێکی ئەمنی توند لەبەر دەرگایەکەیدا گیرابووەبەر. لەبەردەم نەوشیروان مستەفا'دا بووین.

لە یەکەم سەردانماندا بۆ سلێمانی لە مانگی تەموزدا لە ماڵی بەرهەم ساڵح چاومان بە نەوشیروان مستەفا کەوتبوو. ئەو وەك کەسی دووەمی ناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان قبوڵ دەکرا. سەرکردەی ڕێکخراوێکی مارکسیستی چەپ بوو بەناوی کۆمەڵە کە وەك یەکێك لەلایەنە سەرەکییەکانی پێکهێنەری یەکێتی نیشتمانیی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٥دا قبوڵ دەکرا. لە ساڵی ٢٠٠٩دا بزوتنەوەی گۆڕانی دامەزراند

و لە یەکێتی نیشتمانیی کوردستان جیابووەوە و لە سلێمانی کە قەڵای ئەو حزبە بوو، لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتنی بەدەستهێنا و بوو بە یەکەم رکابەری سیاسی تاڵەبانی. لەو کاتانەدا نەوشیروان مستەفا لە بەغدا دەمایەوە و لە جێگەی تاڵەبانی بەشداری لە کۆبوونەوەکانی مەجلیسی حوکم دەکرد. تاڵەبانی ئەوکاتانە زۆر بەکەمیی لە بەغدا دەمایەوە و زۆرتر لە گەشتی دەرەوە بوو.

نەشیروان مستەفا دوای ئەوەی لەبەردەم ڤیلاکەیدا پێشوازی لە ئێمەکرد، یەکسەر داوای لێکردین بچین بۆ سەر مێزی نانخواردن. کەسایەتیە سیاسیەکانی کوردی سەر بە یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و شیعە و سوننە لەسەر مێزەکەبوون کە کەسانی وەك محەمەد تۆفیق وەزیری پیشەسازی و کەسی دووەمی بزوتنەوی گۆڕان، دکتۆر عەبدوللەتیف رەشید وەزیری ئاو کە هاوەڵزاوای تاڵەبانی بوو لەنێویاندا بوون.

بەبێ کات کوشتن، قسەوباسەکە هاتە سەر پرسی جێگیرکردنی سوپای تورکیا لە عێراق و عێراقیەکان باسی ئەوەیان کرد کە بۆچی سوپای تورك'یان ناوێت و بۆچی ناڕەزایی لەبەرامبەر هاتنی ئەو سوپایە پیشاندەدەن. ئەوکاتە تێگەیشتم کە بۆچی بەرهەم ساڵح لە سلێمانی'یەوە ئێمەی رەوانەی بەغدا کردووە تا ببینە میوانی نەوشیروان مستەفا. بەدەر لە هەوڵی دابینکردنی ئاسایش و پارێزراوبوونی ئێمە، دەیویست من و ئیلنور هەردووکمان ئاگاداربین لەوەی کە تەنها کوردەکان دژی جێگیرکردنی سوپای تورکیا لە عێراق نین، بەڵکو عەرەبەکان'یش هۆکاری بەجێیان بۆ دژایەتیکردنی ئەوە هەیە. دیارە چاوەڕوانی ئەوەشیان دەکرد ئەو بیروبۆچوونانەی کە ئێمە گوێمان لێدەگرت، لەکاتی گەڕانەوەماندا بۆ لایەنی پەیوەندیداری باس بکەین.

لەو ماوەیەی کە لە بەغدا ماینەوە، یەکێك لەو بیروبۆچوونە سەیرانەی سەبارەت بە دژایەتیکردنی جێگیرکردنی هێزەکانی تورکیا لە عێراق گوێم لێبوو، بۆچوونەکانی عادل عەبدولمەهدی بوو. عادل عەبدولمەهدی یان ئەبوئەمەل کە من لە بەیروت بەو ناوە دەمناسی، دەیگوت؛"تورکیا دراوسێیەکی عێراق'ە و ئەگەر هێزەکانی خۆی لە عێراق جێگیر بکات ئەوا وڵاتانی دراوسێیی دیکەش وەك ئێران داواکاری دیکە دەکەن و بەوجۆرەش گوشارەکانیان لەسەر ئەو گروپانەی کە لە خۆیانەوە نزیکن، زیاتر دەکەن"و نیگەرانییەکی وای هەبوو.

ئەبوئەمەل یەکێك بوو لەبەرپرسە باڵاکانی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی عێراق کە بە لایەنگری کردن لە ئێران ناسرابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەهێزتر بوون و زیاتربوونی نفوز و کاریگەری ئێران'ی لەسەر رێکخراوەکەی بە گونجاو نەدەزانی.

عەدنان پاچەچی یەکێك لە سیاسەتمەدارەکانی عەرەبی سوننە'ش بە هەمانشێوە باسی ئەوەی کرد کە لایەنگری لە جێگیرکردنی سوپای تورکیا لە خاکی عێراق ناکات. عەرەبە سوننەکان، نەتەوەگەرایی عەرەبی

یاخود عێراقچێتی'یان دەکرد، لەبەرئەوەش هەستێکی دژ بەو رێکخراوانەیان هەبوو کە بە لایەنگری ئێران لە قەڵەمیان دەدان. بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە ئەوان تورکیا'یان وەك ناوەندی هێزی سوننە دەبینی بۆ ئەوەی بتوانن لەبەرامبەر ئێران هاوسەنگی رابگرن و جگە لە تورکیا متمانەیان بەهیچ لایەنێکی دیکە نەدەکرد، بۆچی دژایەتی جێگیرکردنی سوپای تورك'یان لە خاکی عێراق دەکرد؟

نەتەوەگەرایی عێراق'ی یاخود عێراقچێتی کە سەر بە نەتەوەگەرایی عەرەبییە، هەر لە دێرزەمانەوە هەستێکی دژایەتیکردنیان لەگەڵ بەڕێوەبەرانی پێشووی ئەو وڵاتەدا هەبوو کە تورکیا بوو. بەڵام لەنێو هۆکار و پاساوەکانی عەرەبە سوننەکان بۆ دژایەتیکردنی جێگیرکردنی سوپای تورکیا لە عێراق، هۆکارێکی سەیری دیکە هەبوو؛ پارێزگای ئەنبار ئەو ناوچەیە بوو کە بە سێگۆشەی سوننە لە قەڵەم دەدرا و تێیدا بەرگرییەکی فراوان لە دژی داگیرکاری ئەمریکا دەستپێکردبوو. بەگوێرەی سوننەکان، ئەگەر سوپای تورکیا لەو ناوچەیە جێگیر بکرایە، ئەوکاتە وەك لایەنگری داگیرکاری ئەمریکا لە قەڵەم دەدرا و بەوجۆرەش هێرشی دەکرایە سەر. ئەمەش خزمەتی پلانی شیعەکان بۆ دابەشکرنی سوننەکانی دەکرد!

لەنێو ڤیلاکەدا جگە لە نەوشیروان مستەفا، لەگەڵ مەحمود عوسمان ئەندامی سەربەخۆی کورد لە مەجلیسی حوکمی عێراق دەمابنەوە کە لە تورکیا بە پاساوی ئەوەی لایەنگری"پ.ك.ك"یە کاردانەوەیەکی فراوانی لە دژ پیشاندەدرا. لەو ڤیلایەشدا گوێم لەو جۆرە بۆچوونانە دەگرت و لەو کۆبوونەوانەشدا کە رۆژانە نەوشیروان لە شوێنە جیاوازەکانی بەغدا بۆی رێك دەخستین هەر ئەو شتانەمان دەبیستەوە کە ئەو جۆرە حیسابانەیان تێدابوو.

مانەوە لەگەڵ نەوشیروان مستەفا و دکتۆر مەحمود عوسمان لە یەك شوێندا، دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخساندین کە لەگەڵ دوو ئەندامی مەجلیسی حوکمی عێراق تا بەرەبەیانیان لەسەر سیاسەتی رۆژانە و مێژوو قسەو باس بکەین.

مەحمود عوسمان کە یەکێك لە بە ئەزموونترین سەرکردەکانی جوڵانەوەی کورد لە عێراق بوو. دکتۆر و جێگری مەلا مستەفای بارزانی بوو. دکتۆر مەحمود عوسمان'یش وەکو من شەوان درەنگ دەخەوت. بەوجۆرەش لە گفتوگۆکانمان تا بەرەبەیانیان باسی نسکۆی راپەڕینی کورد لە ١٩٧٥ و گفتوگۆ شکێنەرەکانی رەزا شای پەهلەوی لە ئێران لەگەڵ خۆی و مەلا مستەفای بارزانی دەکرد و هەروەها باسی ئەو قسانەی دەکرد کە لە ١٩٩٩دا لەگەڵ ئۆجەلان لە رۆما کردوویەتی و چەندین لاپەڕەی رەنگاوڕەنگی مێژووی نزیکی تا بەرەبەیانیان بۆ من باس دەکرد.

مانەوەم لەگەڵ مەحمود عوسمان لەو ڤیلایەدا و ئەو قسەوباسە دوورودرێژانەی کە پێکەوە دەمانکرد، بوونە هۆکارێك بۆ ئەوەی من مێژووی سیاسی نزیکی کوردەکان شارەزا بم و زانیاری زیاتر وەربگرم و لەو

روانگەیەوە بۆ من بەسوود بێت.

هەر ئەو ڤیلایەش کە لێی دەماینەوە، لە رووی مێژووییەوە واتایەکی هەبوو. لە رۆژی یەکەمدا نەوشیروان مستەفا پێی گوتبووین؛"ئەم ژوورەی کە ئێستا تێیداین شوێنێکی مێژووییە. ئێرە لەسەردەمی سەدام وەك میوانخانەی دەزگای هەواڵگری بەکاردەهات. لەساڵی ۱۹۸٤دا وەکو یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ یەکەمجار لەگەڵ سەدام دانوستانی چارەسەرکردنی کێشەی کوردمان ئەنجامدابوو. ئەو کورسیەی کە تۆ ئێستا لەسەری دانیشتووی سەدام لەسەری دادەنیشت و ئەو دیدار و دانوستانانەش بەهۆی ئێوەوە برا. کەنعان ئەڤرەن رێگەی لە دانوستانەکان گرت. رۆژێك سەدام هات و لەسەر کورسیەکەی دانیشت و وتی؛ ناچارین دانوستانەکان رابگرین، چونکە تورکیا دژایەتی دەکات. ئەوان وتوویانە ئەگەر ئێمە رێکبکەوین ئەوا هێڵی بۆری نەوتی کەرکوك - یومورتاڵك دادەخەن. ناتوانم لە دژی تورکیا بوەستمەوە، داوای لێبوردن دەکەم.، دوابەدوای ئەوەش بۆ ئەوەی کە باری ئەمنیمان پارێزراو بێت بەچەند پاسەوانێکەوە ئێمەی بەرەو باکوور نارد و گەڕاینەوە بەرەو شاخەکان و دیسان دەستمان بە جەنگ کردەوە..."

دوابەدوای ئەو زانیاریەی کە لە زاری نەوشیروان مستەفاوە سەبارەت بە مێژووی نزیکی پەیوەندییەکانی عێراق و تورکیا وەرمگرت کە زۆر بڵاونەکرابوونەوە، لێکۆڵینەوەم لەسەر زانیارییەکان کرد و ئەوەم دەست کەوت کە لەکاتی دانوستانەکانی نێوان سەدام و تاڵەبانی'دا لە ساڵی ۱۹۸٤، فەرماندەی گشتی سوپای تورك سەردانی بەغدا'ی کردووە و دوابەدوای ئەو سەردانەش دانوستانەکان راگیراون. هەر لەوبارەیەشەوە زانیارییەکی دیکە لە کتێبەکەی دەیڤید مەکدۆڤاڵ بەناوی A Modern History Of The Kurdsدا هەیە. لە لاپەڕەکانی ۳٥٠ و ۳٥١ی کتێبەکەدا وەها نوسراوە؛"لە مانگی تشرینی یەکەمی ۱۹۸٤دا بۆ ساتێك یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان وا هەستی کرد کە لە رێککەوتن نزیك بۆتەوە، بەڵام لەو مانگەدا وەزیری دەرەوەی تورکیا سەردانی بەغدا'ی کرد و هۆشداری بە عێراق دا سەبارەت بەوەی کە هەرجۆرە رێککەوتنێکی نێوان بەغدا و یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەبێتە هۆی ئەوەی تاکە رێگەی گواستنەوەی نەوتی عێراق لە رێگەی تورکیا دابخرێت. لانیکەم یەکێتی وا بیردەکاتەوە کە هۆکاری راگرتنی دانوستانەکان ئەمە بووە. لە ئەنجامیشدا ئاگربەست کۆتاییپێهات و یەکێتی لە مانگی کانوونی دووەمی ۱۹۸٥دا دووبارە دەستی بە جەنگ کردەوە."

لەو دیدارەمدا کە لە شوباتی ۱۹۹۱دا لە لەندەن لەگەڵ تاڵەبانی کردم و بووە هۆی کرانەوەی دەرگاکانی تورکیا بە رووی ئەودا، جەلال تاڵەبانی گلەیی کرد و وتی؛"هاوکاری تورکیا و عێراق بۆ دژایەتی کردنی ئێمە بوو. ئێمە دەزانین لایەنە سەربازییەکان لەمەدا کاریگەر بوون. هاوکاری تورکیا و عێراق بووە هۆیەك کە ئێمە و پ.ك.ك لە یەك نزیك ببینەوە. ئەمەش پرسی کار و کاردانەوەیە."دواتر، کاتێ کە چیرۆکی

دانوستانەکانی نێوان سەدام و یەکێتی'م لەزاری نەوشیروان مستەفا'وە بیست، ئەوکاتە باشتر تێگەیشتم کە مەبەستی تاڵەبانی لەو دیدارەماندا چی بووە.

مێژووی جوڵانەوەی کورد لە عێراق تا چەند مێژووی پێکدادانێکی خوێناوی لەگەڵ رژێمی بەغدا بێت، ئەوەندەش مێژووی ململانێی ناوخۆیی گروپە کوردییەکان لەگەڵ یەکتری و لەقۆناغێکیشدا هەوڵدان بۆ رێککەوتن لەگەڵ بەغدا بۆ دژایەتیکردنی یەکتری بووە.

بەهۆی پێگەی جیۆپۆلەتیکی عێراق'ەوە، خواستە یان نەخواستە هەموو هەنگاوە سیاسیەکانی ئەو وڵاتە لە چوارچێوەیەکی فراوانی ناوچەیی و نێودەوڵەتی و هاوسەنگیە سیاسیەکاندا دەنرێن.

لە ساڵەکانی ١٩٨٣-١٩٨٤دا یەکێتی نیشتمانی کوردستانی تاڵەبانی، بەشێوەیەکی سەرەکی لەلایەن سوریا و لیبیا'وە پشتیوانی دەکرا. جەلال تاڵەبانی بە زۆری لە شام دەمایەوە لەو قۆناغەشدا جەنگی ئێران و عێراق بەهەموو خێراییەکی خۆی لەبەرەی باشووردا بەردەوام بوو. جەنگی ئێران و عێراق بووە هۆی زیندووبوونەوەی پەیوەندییەکانی کورد لەگەڵ ئێران کە لە ساڵی ١٩٧٥وە تێکچوو بوو.

سەدام حسێن بۆ دژایەتیکردنی نزیکبوونەوەی ئێران و کوردەکان بیری لە کارتی نزیکبوونەوەی تورکیا و عێراق کردبوو و بەوهۆیەشەوە رێککەوتننامەیەکی بەناوی رێککەوتننامەی راوەدونانی خێرا لەگەڵ تورکیا ئیمزا کرد کە رێگەی دەدا تورکیا بۆ سەرکوتکردنی چالاکە چەکدارەکانی کوردەکان'ی خۆی کە خەریکبوو گەشەیان دەکرد، هێزی سەربازی رەوانەی خاکی عێراق بکات. رێککەوتننامەی راوەدوونانی خێرا بەر لە دەستپێکردنی جەنگی ئێران و عێراق لە ساڵی ١٩٧٨دا ئیمزا کرابوو. تورکیا بە پشتبەستن بەو رێککەوتننامەیە و بە وەرگرتنی رەزامەندی بەغدا، ئۆپەراسیۆنی سەربازی لە دەرەوەی سنوورەکان ئەنجام دەدا.

لەو رۆژانەدا کە حوکمی سەربازی هەبوو و میدیاکان سانسۆر دەکران، زەحمەت بوو زانیاری دروستت دەستبکەوێت سەبارەت بەوەی کە لە تورکیا چی دەگوزەرێت. حەسەن جەمال سەرنوسەری رۆژنامەی جمهوریەت داوای لە من کرد کە بۆ وەرگرتنی زانیاری سەردانی تاران بکەم. لە تاران زۆرێك لە دەرگاکان و زۆرێك لەسەرچاوەکانی هەواڵ بۆ من کراوە بوون، بەڵام ئەو زانیاریانەی کە لە تاران دەستم دەکەوت سەبارەت بە ئۆپەراسیۆنی سەربازی تورکیا کە کوردەکان'ی لە باکووری عێراق دەکردە ئامانج، مومکین نەبوو لەو رۆژنامەیەدا بڵاو بکرێنەوە. ئەمەم بە بیر حەسەن هێنایەوە. وتی؛"دەزانم! قەیناکا، تۆ برۆ، چی هەیە با بزانین. ئەگەر بڵاویشی نەکەینەوە با هەر بیزانین و لێی ئاگادار بین."

لە تاران زانیارییەکی گرنگم لەوبارەیەوە بەدەست نەهێنا. زانیاری سەرنجراکێشم سەبارەت بە یەکەم ئۆپەراسیۆنی سەربازی تورکیا لە دەرەوەی سنور کە لە ساڵی ١٩٨٣ لە باکووری عێراق ئەنجامیدابوو، ساڵانێك دواتر لەم دێرانەی دەیڤید مەکدۆڤاڵ دا دەخوێندەوە؛"لەکۆتایی مایس'دا تورکیا لە رواڵەتدا بۆ

سەرکوتکردنی کوردە راپەڕیوەکانی خۆی ئۆپەراسیۆنێکی سەربازی فراوانی بە پشتبەستن بە بەندەکانی رێککەوتننامەی راوەدونانی خێرا ئەنجامدا کە لە ساڵی ١٩٧٨ بڕیاری لەسەر درابوو. هەروەها بە وەرگرتنی رەزامەندی بەغدا بەدەر لە هێزە وشکانییەکانی خۆی، لەو ئۆپەراسیۆنەدا هێزی ئاسمانیشی بەکارهێنا. لەو ئۆپەراسیۆنەدا تورکیا نزیکەیی ١٥٠٠ کەسی دەسگیرکرد کە بە ئەگەری زۆر زیاتر لەسەرهەڵداوەکان و جەنگاوەران کەسانی مەدەنی ناوچەکە بوون. لە هەمانکاتدا بنکە و بارەگاکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان وێران کران و ٥٠٠ پێشمەرگەش کوژران. بەوجۆرەش زیانێکی گەورە بەر دوژمنەکانی بەغدا کەوت. لە مانگی ئابدا، تورکیا ئۆپەراسیۆنێکی دیکەی لە دەرەوەی سنورەکان ئەنجامدا. بەڵام ئەمجارەیان رووبەڕووی پێکدادانێکی توندی پارتی دیموکراتی کوردستان بووەوە و لەبەر ئەوەش پاشەکشەی کرد. لەسەر ئەمەش ئێران کە هێزەکانی خۆی لە خاکی خۆیدا راگرتبوو، کەوتە دژە هێرش و لەگەڵ ئەوەی کە تەرکیزێکی زۆری دەکردە ناوچەی شیعەکان لە باشووری عێراق، لە هەمانکاتدا لەکوردستان بەرەیەکی دیکەی کردەوە. لە مانگی تەمووزدا لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان پێکەوە شاری سنوری حاجی ئۆمەران'یان گرت و کۆنترۆڵی شارەکە کەوتە دەست پارتی دیموکراتی کوردستان... نیەتی ئێران دیار نەبوو. لەلایەکەوە لە سنورەوە تێپەڕ دەبوو و دژایەتی بەغدا'ی دەکرد و لەلایەکی دیکەشەوە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و لایەنگرەکانی لەنێو کوردەکان'ی عێراق لەسەرووی هەمووشیانەوە یەکێتی نیشتمانیی کوردستانی دەکردە ئامانج. بەوجۆرەش بەغدا کە لە هێرشێکی هاوبەشی کوردەکان و ئێران دەترسا، زەنگی مەترسی لێدا. لەهەمانکاتدا ئێران بۆ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە هیچ حەزی لە کۆماری ئیسلامی نەدەکرد مەترسی بوو. پێشڕەوی هێزەکانی ئێران بەشێوەیەکی خێرا بووە هۆی ئەوەی کە بڕیارگەی یەکێتی لە سنورەکاندا لە شوێنی مانەوەی هێزەکانی عێراق نزیك بێتەوە... بەوجۆرەش یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەنێوان بەرداشی بەغدا و تاران'دا رووبەڕووی مەترسی لەناوچوون ببوەوە... بەخێرایی پێویستی بەوە هەبوو کە هەناسەیەك بدات و دەرگایەکی بۆ بکرێتەوە..."( هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤٧-٣٤٧)

ئەمەش ئەو هۆکارە مێژووییە بوو کە پاڵی بە تاڵەبانی نا هەتا لەگەڵ سەدام حسێن دانوستان بکات.

سەدام'یش لە روانگەی خۆیەوە بۆ دروستکردنی دووبەرەکی لەنێو کوردەکان و بەرەی بەرگری لە دژی ئێران لە باکوور قایم بکات، پشتی بە دانوستانەکانی رێککەوتن لەگەڵ تاڵەبانی دەبەست.

مەکدۆڤاڵ سەبارەت بە دانوستانەکانی نێوان لایەنەکان سەرنجی بۆ سەر ئەمانە راکێشابوو؛

"عەبدوڕەحمان قاسملۆ سەرکردەی حیزبی دیموکراتی کوردستان'ی ئێران کە لە تێکۆشانەکەی خۆیدا پشتی بە هاوکاری عێراق دەبەست، سەبارەت بە سوودەکانی رێککەوتن لەگەڵ بەغدا قەناعەتی بە تاڵەبانی

کردبوو. خۆی لە خۆیدا ی.ن.ك زیاتر لە پ.د.ك لە کوردستان'دا کاریگەری هەبوو. لە ڕێی دانوستانێکی سەرکەوتووەوە تاڵەبانی دەیتوانی وەك نوێنەری حاشاهەڵنەگری گەلی کورد دەرکەوێت."(هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.٣٤٩)

دوای ئەوەی کە ی.ن.ك و بەغدا ئاگربەستیان ڕاگەیاندبوو، دانوستانەکان لە کانونی یەکەمی ١٩٨٣دا دەستیان پێ کردبوو. ئەو ئامانجانەی کە ی.ن.ك دەیویست لە ڕێی دانوستانەکانەوە دەستیان بخات بەمجۆرە بوون؛

دامەزراندنی حکومەتێکی هاوپەیمانی نیشتمانی بەجۆرێک کە ی.ن.ك و پارتی کۆمۆنیستی عێراق'یش تێیدا بەشدار بن. ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئازاد و دیموکراتی ڕاستەقینە. لە قۆناغی دوای هەڵبژاردنیشدا پەسندکردنی ڕێککەوتنێکی تایبەت بە ئۆتۆنۆمی کوردەکان بەجۆرێک کە لەوەی ١٩٧٤ فراوانتر بێت. دامەزراندنی سوپایەکی کوردی کە لە چل هەزار کەس پێك بێت بۆ ئەوەی کوردستان لە هێزە دوژمنە بیانییەکان (مەبەست ئێران بوو) بپارێزێت. بڕی ٣٠٪ی بودجەی دەوڵەت بۆ ئاوەدانکردنەوەی ناوچە کوردییەکان تەرخان بکرێت.

ئەو مەرجانەی کە تاڵەبانی لە ساڵی ١٩٨٣دا بۆ ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی کوردی تەسەوری دەکردن، کەم و زیاد هەمان ئەو داواکارییانە بوون کە لە ٢٠٠٣ بەدواوە پێش دەخران. داوا دەکرا کەرکوك و چیای شنگال (جەبەل سنجار) و خانەقین و مەندەلی لەنێو ئەو ناوچە ئۆتۆنۆمییە فراوانکراوەدا جێگیر بکرێن.

سەدام تا ئەندازەیەك لەسەر هیچ یەك لەو بابەتانە، بە تایبەت لەسەر پرسی کەرکوك خۆی لە قەرەی سازش نەدەدا. تاڵەبانی ئەگەر بیتوانیبایە کەرکوك بە دەست بهێنێت، ئەوا دەیتوانی شتێك بکات کە مەلا مستەفای بارزانی'ش نەیتوانیبوو ئەنجامی بدات و بەوجۆرەش وەك تاقە سەرکردەی کوردەکان'ی عێراق ناوی لە مێژوودا تۆمار دەکرا. لە دانوستانێکدا کە نەوشیروان مستەفا'ش تێیدا بەشدار بووە، سەدام بە تاڵەبانی وتووە"پێداگری لە کوردستانی بوونی شاری کەکوك مەکە، تا ئێمەش باسی کوردستانی نەبوونی نەکەین."لە ڕێگەی ئەو قسانەشەوە چارەیەکی ناوەڕاستی سەبارەت بە کەرکوك پێشنیار کردبوو، بەڵام بەهیچ شێوەیەك خۆی لە قەرەی سازش و پێدانی ئیمتیاز نەدابوو.

ڕێك لەو ڤیلایەدا کە دانوستانەکانی تێدا کرابوون، گوێم لە نەوشیروان مستەفا دەگرت. قسە و باسەکانمان بەم ڕستانە کۆتاییان پێ هات؛"هەر لەسەرەتاوە هەموو تەمەنمان ئۆتۆنۆمی، ئۆتۆنۆمی، ئۆتۆنۆمی بوو. لەبەر ئەوەش چووینە سەر شاخەکان. کاتێ باسی ئۆتۆنۆمی دەکرا، مەبەست هەرێمێك بوو کە کەرکوك'یشی تێدا بێت. ساڵی ١٩٧٥، بەر لەوەی دووبارە بچینەوە شاخەکان، گەیشتبووینە ئەو خاڵەی کە سەدام پێشنیاری دابەشکردنی شارەکەی بۆ مەلا مستەفا کردبوو. بەجۆرێک کە بەشی خۆرهەڵاتی شارەکە یانی، لای

خۆرهەڵاتی رێگای بەغدا بۆ بەڕێوەبردنی کوردی بێت و بەشی خۆرئاواش لە دەستی حکومەتی ناوەندیدا بمێنێتەوە. بەڵام مەلا مستەفا قبوڵی نەکرد.″

ئەوانەی شارەزای کەرکوك بن دەزانن، لەسەرووی هەموویانەوە گەڕەکی ئیمام قاسم کە کوردەکان تێیدا نیشتەجێبوون، قەڵای مێژوویی کەرکوك و سیمبولی شوناسی تورکمانەکان و رووباری حاسە کە ئێستا وشکی کردووە، لە خۆرهەڵاتی رێگای بەغدا دان. ئەو پێشنیارەی کە سەدام بۆ مەلا مستەفای بارزانی کردبوو، شتێکی نامەنتقی نەبوو.

کاتێك پرسیاری ئەوەم لە نەوشیروان مستەفا کرد کە″بیرە نەوتییەکان دەکەوتنە کام لا؟″ئەو وەڵامی پێ دامەوە کە خۆیشم دەمزانی و وتی؛″لەبەشی خۆرئاوا!″

وەك هەموو جارێك، کەرکوك تەگەرەی لەبەردەم رێککەوتنی بەغدا لەگەڵ کوردەکان دروستکردبوو. بەڵام لەبەر ئەوەی هەردوولا و بە ئەگەرێك سەدام یش، زیاتر لە چارەسەرکردنی کێشەکە، بە هۆکاری تەکتیکی دانوستانیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، چاوەڕوانیی دۆزینەوەی رێگە چارەیەك شتێکی واقیعی نەدەبوو. نارەزایی تورکیا و راگرتنی دانوستانەکان، بیانوویەکی بە دەست سەدام دا کە دەمێك بوو بەدوایدا دەگەڕا.

-″باشە سەدام چۆن لەگەڵ ئێوە مامەڵەی دەکرد؟ هەرچەندە دانوستانیشتان دەکرد بەڵام لە روانگەی ئەوەوە ئێوە دوژمنی ئەو و خاینەکانی عێراق بوون؟″

-″لە رەفتاری شەخسیدا کەسێکی زۆر میهرەبان بوو. لەنێو رەفتارەکانیدا ئاسەوارێك لەو کەسایەتییە ملهوڕ و ستەمکارە نەبوو کە پێی دەناسرا.″

لە ساڵی ١٩٨٤دا دانوستانەکان راگیران و سەدام لەسەر ئەو کورسییەی کە من لەسەری دانیشتبووم هەستابوو و نەوشیروان مستەفا لەسەر ئەو کورسییەی کە ئێستا لەسەری دادەنیشت، هەستابووە سەر پێ. سەدام، نەوشیروان مستەفا و جەلال تاڵەبانی سەرکردەی ی.ن.ك ی هەتا بەر دەرگای ڤیلاکە رەوانە کردبوو و پاسەوانی بۆ دابین کردبوون تا بە سەلامەتی بچنەوە شاخەکان بۆ ئەوەی جارێکی دیکە دژ بەو دەست بە جەنگ بکەنەوە.

گرنگیدان بە میوان و پێدانی خورد و خۆراك و دابینکردنی هەموو جۆرە ئاسایشێکی، نەریتێکی کۆنی عەرەبە بەدەوییەکان و خێڵەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بوو. سەدام یش بەگوێرەی ئەو نەریتە جوڵابووەوە. کاتێکیش وەفدی کوردی بە سەلامەتی گەیشتبوونە جێگەی خۆیان، ئیدی هەموو جۆرە هەوڵێکی تیرۆر و کوشتن و جەنگ و بۆردومان و هەموو شتێك بە لای ئەوەوە رەوا بوو. ئێمە وەك ئەو ئەنادۆڵی یانەی کە بە ئەسڵ خەڵکی رۆمەلی ن زۆر ئاگامان لەم جۆرە پەیوەندییانە نییە.

لەو کاتانەدا کە لەگەڵ نەوشیروان مستەفا باسی سەدام مان دەکرد، دیکتاتۆرە لەسەر کار لابراوەکەی

عێراق هێشتا نەگیرابوو و کەس نەیدەزانی لە کوێیە. نزیکەی دوو مانگ دوای ئەو قسە باسانەی ئێمە لە ماڵە کۆنەکەی دەزگای هەواڵگری سەبارەت بەو، لە ١٤ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣دا، سەدام لە شوێنی لە دایکبوونی خۆی لە تکریت دەسگیر کرا.

لەوانەیە ئەو کاتانەی کە نەوشیروان مستەفا بیرەوەرییەکانی خۆی سەبارەت بە سەدام بۆ من دەگێڕایەوە، بەدوای ئەویشدا گەڕا بێت. چونکە بەپێی ئەو زانیارییانەی کە دوای دەسگیرکردنی سەدام دزەیان پێ کرا، ی.ن.ك شوێنە پێی سەدام'ی دۆزیبووەوە و زانیارییەکانی خۆی بە ئەمریکاییەکان دابوو و هەواڵی جۆراوجۆریش لەوبارەیەوە بڵاوکرانەوە. نەوشیروان مستەفا لەو گفتوگۆ دوورودرێژانەدا، زوو زوو قسە و باسی دەهێنایە سەر پۆل برێمەر و گلەیی لەوە دەکرد کە لە عێراق تێ ناگات و بەو هۆیەشەوە ناتوانێت ڕێگا لە کردەوە تیرۆرریستییەکان بگرێت. جارێك وتی؛"پێکهاتەی عێراق، پشت بە خێڵ دەبەستێت. ئەگەر تۆ سەرکردەی خێڵەکەت بە دەستهێنا دەتوانی زۆر شت چارەسەر بکەیت. چەندین ڕێگای جۆراوجۆر بۆ ئەمە هەیە و پارەش یەکێك لەوانەیە. پێویستە خێڵەکان و بە تایبەت پێکهاتەی ناوخۆییان بزانیت. ئێمە ئەمانە دەزانین، چونکە لەم وڵاتەدا دەژین. ڕێگرتن لە تیرۆر، لە ڕێی بەرقەرارکردنی پەیوەندی لەگەڵ خێڵەکانداده‌کرێت..."

-"باشە، ئێوە ئەمانە بۆ پۆل برێمەر باس ناکەن؟"

-"کێشەکە لەوەدا نییە کە بگەینە پۆل برێمەر و ئەم شتانەی بۆ باس بکەین. ئێمە لە یەك بینادا دەژین و دەتوانین هەرکاتێک ویستمان بە بێئەوەی لە دەرگاکەی بدەین بچینە ژوورەوە. چەندینجاریش ئەمەمان بۆ باسکردووە."

-"ئەی کێشە لە کوێدایە؟ گوێتان لێ ناگرێت؟"

-"گوێ دەگرێت. زۆر بە وردیش گوێ دەگرێت. بەڵام ئەو شتانەی ئێمە باسیان دەکەین، لە گوێیەکەوە دەیبیستێت و لە گوێیەکی دیکەشیەوە دەردەچێت. کێشە لە کۆد و شفرە کەلتوورییەکان دایە. ئەو قسانەی ئێمە باسیان دەکەین، لە کۆد و شفرە کەلتوورییەکانی ئەو پیاوەدا جێیان نابێتەوە. ئەمەش بەو هۆیەوە نییە کە نیازی پاك نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە لێیان تێناگات و درکیان پێ ناکات..."

ستراتیژی زیادکردنی کتوپڕ (Surge Strategy) کە لە ساڵی کۆتایی سەرۆکایەتییەکەی جۆرج دەبلیۆ بوش'دا ڕاگەیەنرا و لە ڕێگەی ژەنراڵ پترایۆس'ەوە جێبەجێ کرا، لەبنەڕەتدا پشتی بە بە دەستهێنانی پاڵپشتی خێڵەکانی عەرەبی سوننە دەبەست بۆ ئەوەی دژی ئەلقاعیدە شەڕی چەکداری بکەن و ئەمەش تا ئەندازەیەکی زۆر سەرکەوت و ڕێگای لە چالاکییە تیرۆریستییەکان بە تایبەتی لە شاری بەغدا گرت و بەشێوەیەکی ڕێژەیی باری ئەمنی سەقامگیر کرد. ئەوەی ئەنجامدرابوو، کەم و زیاد بەگوێرەی بۆچوونەکانی

نەوشیروان مستەفا بوون کە لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣دا لە گفتوگۆکانماندا بۆ من باسی کردبوون و بە پێنج ساڵ دواکەوتنەوە جێبەجێ کرابوو.

گفتوگۆ دوورودرێژەکانمان لە میوانخانەی دەزگا هەواڵگرییەکەی سەدام، سەبارەت بە بەغداش زۆر بە چێژ و سوودبەخش بوون. نەوشیروان زانکۆی لە بەغدا تەواو کردبوو، بۆیە گۆشە و کەنارەکانی پایتەختی عێراق‌ی دەزانی و بە باشی ئاگای لە تایبەتمەندییە کەلتوورییەکانی بوو. سەرەڕای ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٨ هەوە سێ جار سەردانی بەغدام کردبوو، لەسەردانی چوارەممدا لە زاری ئەوەوە زانیم کە بەری خۆرئاوای دیجلە لە خۆرئاوا کەرخ‌ی پێ دەگوترێت و بەری خۆرهەڵات‌یش بە ڕەسافە ناودەبرێت.

بەو پێیە، یەکەمجار کە لە ساڵی ١٩٧٨دا سەردانی بەغدام کردبوو لە ڕەسافە و جاری دووەمیش کە ساڵی ١٩٨٨ لەگەڵ تورگوت ئۆزال هاتبووم لە کەرخ و جاری سێیەمیش کە سێ مانگ بەر لەو کاتە بوو لە ڕەسافە و جاری چوارەمیش لە کەرخ‌دا بووم.

وادیاربوو ئێمە لە کەرخ لە گەڕەکی ئەلمەنسور کە زیاتر سوننەکان تێیدا نیشتەجێبوون و بە گەڕەکی دەستە بژێرکانی ڕژێمی بەعس ناوبانگی پەیدا کردبوو، دەماینەوە. ئەم شارە ئەفسانەییە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ماوەیەك ناوەندێکی بێ ڕکابەری زانست و شوێنی چیرۆکەکانی هەزار و یەك شەو بوو، ساڵی ٧٦٢-٧٦٧ لەلایەن مەنسوور خەلیفەی عەباسی، سەرەتا لە کەرخ بونیاتنرا و دواتر ئەو شوێنەی کە بەغدا لەوێوە دروستکرا بە گەڕەکی ئەلمەنسوور ناونرا. ئەو گەڕەکە لەسەردەمی دەسەڵاتداری بەعس‌دا یەکێك لە گەڕەکە باشەکانی بەغدای لێ هات.

نەوشیروان وتی"نەخێر، ئێرە حارسیە‌یە. مەنسوور لە بەرامبەر ئەو شەقامەوە دەست پێ دەکات. بەڵام ئەم شوێنەی کە ئێستا ئێمەی لێیە تایبەتمەندییەکی دیکەی هەیە. لە بەینی ئەو جادەیەی کە مەنسوور و حارسیە لە یەك جیا دەکاتەوە، لەگەڵ ئەو جادەیەی کە لەوبەری ئەم ڤیلایە دایە، کۆشك و حەوشەیەکی لێیە کە تا ساڵی ١٩٥٨ کۆشکی پادشایی بووە."

دەمیك بوو مەراقم دەکرد شوێنی کوژرانی پادشای بچووك، مەلیك فەیسەلی دووەم ببینم کە لە تەمەنی ٢٣ ساڵیدا لەکاتی شۆڕشی ١٩٥٨دا کە بەهۆیەوە مۆنارشی کۆتایی پێ هات، کوژرابوو. هەموو کاتێك ڕۆژی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨، لە بیرەوەرییەکانی کاتی منداڵیمدا شوێنێکی تایبەتی بۆ خۆی پەیدا کردبوو. ڕووخانی مۆنارشییەکەی عێراق کە بەهۆی ڕێککەوتنی بەغدا، بە هاوپەیمانی تورکیا لە قەڵەم دەدرا و کوژرانی مەلیك فەیسەلی دووەم کە دەزگیرانی شازادە خاتوون فازڵە، کچە جوانەکەی شازادە خانزادە لە بنەماڵەی عوسمانی بوو، لەگەڵ کوژرانی خاڵی مەلیك فەیسەڵ و شازادە عەبدوڵا‌ی جێگرەوەی پادشا و نوری سەعید پاشا‌ی سەرۆك وەزیر بەشێوەیەکی دڕندانە، لە تورکیا هەیەجانێکی گەورەی دروستکردبوو.

رۆژنامەکان و گۆڤارێکی مەگەزینی پڕ جەماوەری ئەو سەردەمە بەناوی "حەیات" دوایین وێنە تراژدییەکانی مەلیك فەیسەڵی دووەم و وێنە خەمبارەکانی فازڵ جوانەکەیان بڵاو کردبووەوە کە بەر لەوەی ببێتە شاژن، دەزگیرانەکەی لە دەست دابوو. کەواتە، مەلیك فەیسەڵی دووەم دوایین کاتەکانی خۆی لە کۆشکی ئەلڕیحاب'دا بەسەر بردووە کە لە پەنجەرەکەوە لەوبەری رێگاوە دیاربوو. لە کاتە بەتاڵەکانمدا، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە پەنجەرەوە سەیری کۆشکی ئەلڕیحاب'م دەکرد و هەوڵم دەدا رۆژی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە مێشکی خۆمدا وێنا بکەم.

پەنجەرەی ژووری نوستنەکەم لە ڤیلاکەدا، بە ئاراستەیەکی پێچەوانە، یانی بەرەو رووی گەڕەکی مەنسوور بوو. بەیانی زووی رۆژی ١٦ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣دا، دوای تەقەی تفەنگ و دەسڕێژی گوللە بە دەنگێك خەبەرم بووەوە. لە پەنجەرەی ژوورەکەوە کە خۆی کراوەبوو و پەردەکانیشی لادرا بوون، چەند کۆپتەرێکی ئەمریکیم بینی کە بە بەردەوامی دەسووڕانەوە. خەوم زڕا بوو، ئیدی نەمدەتوانی لەبەر دەنگە دەنگی ئەوان چاوەکانم بنووقێنم.

کاتێك رۆیشتنم بۆ نێو هۆڵەکە، بینیم نەوشیروان مستەفا و مەحمود عوسمان و ئیلنوور چەڤیك پێکەوە چا دەخۆنەوە و بەو بەیانییە زوو لەسەر سفرەی قاوەتی دانیشتوون. بڕوایان بەوە نەکرد کە من نەك لەبەر دەنگی تەقینەوە گەورەکە، بەڵکو بەهۆی دەنگی چەرخی کۆپتەرەکان خەبەرم بووەتەوە. هەموو بیناکە لەرزابووەوە و من کە بە تەقەی تۆپیش خەبەرم نابێتەوە گوێم هیچ نەببوو.

بە رۆکێت هێرش کرابووە هۆتێل رەشید کە لەو ژوورەی من تێیدا دەنووستم، دیاربوو. هێرشەکە لە دژی پۆل ڤۆلفۆویتز کرابوو کە لەو کاتانەدا لەوێ دەمایەوە و ئەمەش گەورەترین و جیدیترین هێرشێکی بەرگریکاران بوو کە تا ئەوکاتە لە دژی هەبوونی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق ئەنجامیان دابێت. ئەمەش نزیکەی بیست خولەك بەر لەوەی من بە دەنگی کۆپتەرەکان خەبەرم بێتەوە روویدابوو.

شەوێك بەر لەوە، نەوشیروان مستەفا و مەحمود عوسمان و ئەندامەکانی دیکەی مەجلیسی حوکمی عێراق، لەگەڵ پۆل ڤۆلفۆویتز لە هۆتێل رەشید کۆبوونەوەیان کردبوو. مەحموود عوسمان کە بە کەسێکی قسە سوور دەناسرێت و وتەکانی خۆی ناشارێتەوە، بەر لەوەی بچێتە کۆبوونەوەکە، وتبووی هەڵەی بەڕێوەبردنی ئەمریکاییەکان لە عێراق بۆ پۆل ڤۆلفۆویتز باس دەکات.

نەوشیروان مستەفا و مەحمود عوسمان بۆ ئاگاداربوون لە وردەکارییەکانی ئەو هێرشەی کە کرابووە شوێنی کۆبوونەوەکەی شەوی رابردوویان لەگەڵ پۆل ڤۆلفۆویتز، چاویان بڕیبووە تەلەفزیۆن و سەیری هەواڵە تازەکانیان دەکرد. هێرشەکە لە رێی هاوێشتنی چەند رۆکێتێك لە پارکی زەورا'وە ئەنجامدرا بوو و چەندین کوژراو و برینداری لێ کەوتبووەوە. پۆل ڤۆلفۆویتز کە بە حاڵ لە هێرشەکە رزگاری ببوو،

بەسەروچاوێکی شڵەژاوەوە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن دەرکەوت. ئەو هێرشەی کە تۆزێك مابوو گیانی بگرێت، بەرنامەی سەردانەکەی بۆ شارەکانی دیکەی عێراق نەدەگۆڕی.

ئێمەش لەو ڕۆژەدا، لە تەنیشت پارکی زەوراʼوە کە لەوێوە ڕۆکێتەکان تەقێنرابوون تێپەڕ بووین و بەرەو تورکیا گەڕاینەوە. هەندێك شت هەبوو کە پێویستبوو بۆ تایب ئەردۆغانʼی باس بکەین. بەڵێنمان دابوو لەکاتی گەڕانەوەدا، ئەو شتانەی لە بەغدا بۆیان باس کردبووین، بە بەرپرسانی تورکیاʼی ڕابگەیەنین.

هەر کە گەڕاینەوە بۆ تورکیا، داوای دیداری تایبەتی تایب ئەردۆغانʼمان کرد. ئیلنوور چەڤیك تەلەفۆنی بۆ جونەید زاپسوو کرد و منیش عومەر چەلیكʼم ئاگادار کردەوە. لە ماوەیەکی زۆر کورتدا لەسەرۆك وەزیرەوە هەواڵمان بۆ هات؛ دوای بەربانگی ڕۆژی پێنج شەممە ٦ی تشرینی دووەی ٢٠٠٣، لە ژووری ڕەسمی خۆیدا لە بینای سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران چاوەڕوانیی دەکردین.

دوای ئەوەی نزیکەی ساڵێك بەر لەو کاتە تایب ئەردۆغانʼم لە ژوورەکەی عەبدوڵا گویلʼدا بینیبوو کە بۆ پیرۆزبایی کردنی پۆستەکەی گویل وەك سەرۆك وەزیر سەردانم کردبوو، ئەوە یەکەمجار بوو کە ببینم. تا نزیکەی نیوە شەو پێکەوە قسەمان کرد. گوێگرتنی ئەو لە تێبینییەکانی ئێمە لەبارەی عێراق، یەك سەعاتی خایاند. لەوانەیە قسەکانی ئێمە بە لایەوە سەرنجڕاکێش بووبێت، بۆیە لەکاتی قسەکردن لەگەڵ ئێمەدا وەڵامی تەلەفۆنی نەدەدایەوە و ئەو وەزیر و کارمەندانەی قەڵەمی تایبەتی خۆیشی کە هاتبوون ببینن، ناچاربوون هەتا کاتی ڕۆیشتنی ئێمە لەدوای نیوە شەو، لەوێ بمێننەوە.

بە دوورودرێژی باسی ئەو هۆکار و پاساوانەمان کرد کە دژایەتی ڕەوانەکردنی سوپای تورکیا بۆ عێراق دەکەن. لەو بەینەشدا باسی ئەوەمان کرد کە لەبەر ریکلامی کۆمپانیا تورکییەکان لە باکووری عێراق بە کەرکوكʼیشەوە ناتوانیت ڕێ بکەیت و ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە تورکیا خەریکە بە هێزی ئابوورییەوە دەربازی عێراق دەبێت. لە بەغدا پێیان گوتین، ئێوە بە جلوبەرگی سەربازییەوە مەیەن، بەڵکو بە کۆمپانیا و ماددەی خۆراکی و کەرەستەی بیناسازییەوە وەرن تا باوەشتان بۆ بکەینەوە. ئەمەمان بۆ تایب ئەردۆغان باسکرد و لە دەرفەتێکدا پێم گوت؛

"بەهۆی ڕۆڵی ئێوە لە دەرچوونی ئەو مۆڵەتەی کە مانگی ڕابردوو پەرلەمانی تورکیا بەخێرایی بۆ ڕەوانەکردنی سوپای تورك بۆ عێراق دەری کرد، متمانەی سیاسی واشنتن بە ئێوە دروستبووە. ئێستا ئەگەر سەربازی تورك ڕەوانەی عێراق بکەن، ئەگەری شەهید کەوتنیان لە ئەنبار زۆرە و گەڕانەوەی سەربازەکانمان لە عێراقʼەوە بە تابووت، تورکیا ئاڵۆز دەکات و گرفتیش بۆ ئێوە دروستدەکات. مادام پۆل برێمەر و دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانەکان و عێراقییەکانʼیش نایانەوێت، بۆچی ریسك دەکەن. متمانەی سیاسی واشنتن لە گیرفانتان دایە، لەمەودوا هەرچی بکەن مەترسیدارە. بەو پێیەی کە خۆیان نایانەوێت، ئەگەر

دەسەڵاتی ڕەوانەکردنی سەربازی تورك بۆ عێراق بە کار نەهێنن و جێبەجێی نەکەن، زۆر باش دەبێت.”

تایب ئەردۆغان بێئەوەی هیچ بڵێت بە وردی گوێی دەگرت. لەو بەینەشدا باسی ئەوەم بۆ کرد کە لە بەغدا لەگەڵ د. مەحمود عوسمان‌دا پێکەوە ماوینەتەوە کە لە تورکیا وەك ئەندامی پ.ك.ك و تیرۆریست دەزانرا و ناویشی لە لیستێکی زیاتر لە سەد کەسیدا بوو کە تورکیا داوای ڕادەستکردنەوەی دەکردن.

”بەڕێز سەرۆك وەزیر! ئەم ناوە لە شوێنەکانی وەك نەتەوەیەکگرتووەکان و ئەمریکا گومان لەسەر جدییەتی تورکیا دروستدەکات. ئەو کەسێکی زۆر بە ناوبانگە. پێویست بە ڕاپۆرتە هەواڵگرییەکان ناکات. کاتێك لە لەندەن و نیۆیۆرك سەردانی کتێبخانەیەك دەکەیت و داوای کتێبێك لەبارەی عێراق و کوردەکان دەکەیت، ئەوسا دەزانیت مەحمود عوسمان کێیە. مەحمود عوسمان لەسەرەتای ۱۹٦۰کانەوە تا ئێستا یەکێك لەسەرکردەکانی جوڵانەوەی کورد لە عێراق بووە و لەو کاتانەشدا پ.ك.ك هەر لە دایك نەبووە. ئێستاش مایەی گاڵتە پێ کردنە کە بڵێیت مەحمود عوسمان ئەندامی پ.ك.ك‌یە و پێویستە یەکێك لە بیست و پێنج ئەندامەکەی مەجلیسی حوکمی عێراق بە تۆمەتی تیرۆریست بوون ڕادەستی تورکیا بکرێتەوە.”

تایب ئەردۆغان بە نیگایەکی پڕ لە مەراق و سەرسوورمانەوە گوێی لە قسەکانی من گرت و دواتر وتی؛”بەڵام ئایا ئەم کەسە کوردێکی نەتەوەگەرا نییە؟”

”بەڵێ وایە. بەڵام ئێرە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست‌ە و لێرە کێ بدۆزیتەوە یان تەوەگەرای کورد، تورك، عەرەب یان سۆسیالیست و کۆمۆنیست و ئیسلامگەرا و... یە. کەس نییە کە بڵێت مەحمود عوسمان نەتەوەگەرای کورد نییە. بەڵام ئەندامی پ.ك.ك نییە و تیرۆریست نییە...”

لە ماوەی گفتوگۆکەماندا، سەرۆك وەزیر تایب ئەردۆغان زۆر بە وردی گوێی لە باسەکانی تایبەت بە دەرفەتی ئابوری لە عێراق، بە تایبەتی ناوچە کوردییەکانی ئەو وڵاتە ڕادەگرت.

لە یەکەم سەعاتەکانی دوانیوەڕۆی ڕۆژی دواتردا، هەواڵێك وەك بۆمب لە ئەنقەرە تەقییەوە. ئەوەش ئەوە بوو کە حکومەت بەسەرۆکایەتی تایب ئەردۆغان بڕیاریدابوو مۆڵەتی پەرلەمان بۆ ناردنی هێز بۆ عێراق بەکار ناهێنێت. یانی تورکیا هێزی سەربازیی ڕەوانەی عێراق نەدەکرد!

دەمەو ئێوارە لە پەخشی ڕاستەوخۆی تەلەفزیۆنی سی ئێن ئێن تورك‌دا شیکردنەوەم بۆ بڕیارەکە دەکرد. لەکاتێکدا دەمویست شیکردنەوەکانی خۆم بە ڕستەیەکی وەك"ڕۆژی ڕابردوو لە بەرپرسێکی باڵاوە لەمبارەیەوە هەندێك شتم بیستبوو.”بەهێز دەکرد، بە پاساوی پەخشکردنی ڕاستەوخۆی وتەکانی سەرۆك وەزیر لەکاتی میوانییەکی بەربانگی حزبەکەیدا قسەکانی منیان بڕی. دوای وتەکانی سەرۆك وەزیر دەمتوانی درێژە بە شیکردنەوەکانم بدەم. سەرۆك وەزیر لە وتارەکەیدا قسەی هێنایە سەر بڕیارەکەی حکومەت بۆ ڕاگرتنی مۆڵەتەکەی پەرلەمان سەبارەت بە ڕەوانەکردنی هێزی سەربازی بە عێراق و وتی؛”دوێنێ شەو،

گوێم لە دوو هاوڕێی ڕۆژنامەنوسم گرت کە تازە لە عێراق گەڕاونەتەوە. عێراق لە رووی ئابورییەوە باوەشی بۆ ئێمە کردۆتەوە و چاوەڕوانیمان دەکات. هەموو شوێنێك پڕ بووە لە کاڵا تورکییەکان..."

پێموانەبوو کە سەرۆك وەزیر لەبەر ئەوەی گوێی لە قسەکانی ئێمە گرتووە ئەو بڕیارەی سەبارەت بە پرسی ناردنی سەربازی تورکیا بۆ عێراق داوە، بەڵکو وتەکانی ئێمە دوایین دڵۆپێك بوون لەنێو ئەو شەپۆلەی کە سەبارەت بە وەرگرتنی بڕیارێکی وەها لە ئارادا بوو. خۆی لە خۆیدا رۆژی دواتر، رۆژنامەی رادیکاڵ لە هەواڵێکدا بەسەردێڕی "ئەنقەرە دەفتەری عێراق ی داخست"باسی ئەوەی کردبوو کە بڕیارەکەی حکومەتی تورکیا دوای پەیوەندییەکی تەلەفۆنی عەبدوڵا گویل وەزیری دەرەوە لەگەڵ کۆلین پاوڵ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دراوە. پاوڵ رایگەیاندبوو کە ئەوان دەیانەوێت تورکیا لە رووی سەربازییەوە یارمەتییان بدات، بەڵام کێشەی زۆر جیدی هەیە و وتبووی"واز لە پێشنیاری ناردنی سەرباز بهێنن."هەروەها رستەکانی"پاوڵ وتوویەتی؛ مەجلیسی حوکمی عێراق یش نەیویستوە سەربازی تورك رەوانەی وڵاتەکەی بکرێت. نەناردنی سەربازی تورك بۆ هەموو کەس باشترە. بۆ هەموو شتێك سوپاس دەکەین."لە هەواڵەکەدا بڵاو کرابوونەوە.

لە راستیشدا نەناردنی سەربازی تورك بۆ عێراق لە ماوەی تشرینی یەکەم - تشرینی دووەمی ٢٠٠٣، بۆ هەموو لایەك باشتر بوو.

بەڵام لەوانەیە گومانەکانی پۆل ڤۆلفۆویتز سەبارەت بە دروستبوونی ئەو بڕیارە بەردەوام بووبێت، بۆیە لە حوزەیرانی ٢٠١٠دا لە ئیستانبوڵ پرسیاری کرد کە"ئەگەر لەو قۆناغەدا سەربازی تورك رەوانە بکرایە، ئەمڕۆ هەموو شتێك جیاواز دەبوو؟"

مومکین نەبوو کەسێکی وەك پۆل ڤۆلفۆویتز پێداچوونەوەیەکی شەخسی بەو سیاسەتەی ئەمریکا لە عێراق نەکات کە رۆڵی سەرەکی تێدا هەبوو. ئایا لەو ماوەیەدا کە تێپەڕ ببوو و دوای ئەوەی کە تیشکی سپۆت و چرووتجێکتۆرەکان لەسەری لاچوو بوون، ئیدی رستەی"لێرەدا هەڵەمان کردووە"ی بە زماندا دەهات؟

یەکێك لەو شتانەی کە زۆر مەراقم کرد بیزانم ئەمە بوو.

تەنانەت کەسانی وەك کەنعان مەکیە و میشل ئیگناتیف بابەتیان بۆ رەخنەگرتن لە خۆیان نوسیبوو. پۆل ڤۆلفۆویتز لەبارەی خۆیەوە چۆن بیری دەکردەوە؟

وادیاربوو کە بەهۆی رووداوەکانی تونس لە کۆتایی ٢٠١٠ و لەوەش گرنگتر، تەقینەوەی شۆڕشی عەرەبی لەسەرەتای ٢٠١١دا لە میسر و دواتریش پەرەسەندنی شەپۆلی شۆڕشەکە بۆ سوریا و پاش ئەوەش، رووخانی قەزافی لە لیبیا لە ئەیلوولی ٢٠١١دا، بوونە هۆی ئەوەی کە پۆل ڤۆلفۆویتز ئاسوودە بێت و هەناسەیەکی ئارام هەڵکێشێت. بۆیە ئەم لێدوانەی بۆ رۆژنامەی وال ستریت ژوورناڵ دابوو؛

"بەداخەوە دوای دەرکەوتنی بە هەڵەدا چوونمان سەبارەت بە هەبوونی چەکە کۆکوژەکانی عێراق، هەندێك کەس کاردانەوەی توندیان دژی سەرۆك بوش پیشاندا یان بەشێوەیەکی خراپتر بە درۆکردن تۆمەتباریان کرد. هەندێکی دیکەش باسی ئەوەیان کرد کە گوایە بە کاردانەوەی زۆرمانەوە ناوی دیموکراسیمان لەکەدار کردووە. هەموو ئەمانە شتی پڕوپووچ بوون. لەم رۆژانەدا هەزاران عەرەب لە سوریا و شوێنەکانی دیکەدا، نەك بۆ خەیاڵی ئەو بەهەشتەی کە بن لادن بەڵێنی پێ داون، بەڵکو لەبەر ئازادی و دیموکراسی ژیانی خۆیان دەخەنە مەترسی."(٩ی ئەیلوولی ٢٠١١)

لە ساڵی ٢٠١١دا ئەم وەڵامەی دابووە وە بەڵام داخۆ لە ٢٠٠٩، شەش ساڵ دوای جەنگ و چوار ساڵ دوای وازهێنان لە پۆستەکەی، لەمبارەیەوە چۆن بیری دەکردەوە؟

جەنگی عێراق هەڵە بوو؟

ئەگەر هەڵە بوو، هەڵەکە لە کوێدا بوو؟

لەبەرامبەر ئەم پرسیارەمدا، پۆل ڤۆلفۆویتز بە نیگایەکی رۆیشتوو سەری داخست و وەك ئەوەی کە مشتومڕێکی چەند ساڵەی دەروونی خۆیان بداتە دەرەوە، سێ هەڵەی ریز کرد؛

"هەڵەی سەرەکیمان ئەوە بوو کە هەر لەسەرەتاوە دەسەڵاتمان رادەستی عێراقییەکان نەکرد. برێمەر'یش وەك بەڕێوەبەری داگیرکەر، هەموو کارەکانی تێکدا. هێزی بەرگری رژێمی روخێنراویشمان بە باشی حیساب نەکردبوو!"

یەکەمینی ئەمانە بەهۆی رەتکردنەوەی داواکاری ڤۆلفۆویتز لەلایەن بەڕێوەبردنی ئەمریکا'وە روویدابوو. پۆل ڤۆلفۆویتز لایەنگری ئەوە بوو کە بە زووترین کات دەسەڵات رادەستی عێراقییەکان بکرێت. هەرچەندە ئەو ئەندازیاری رۆشنبیری جەنگی عێراق بوو و بەهۆی پۆستەکەی وەك جێگری وەزیری بەرگری کەسێکی گرنگ بوو، بەڵام ئەو ئەمریکا یان هەر شتێك نەبوو. ئەو درێژەی بە رەخنەکانی لە سوپا دا و وتی؛"(ژەنراڵ) سانچێز زۆر خراپ بوو. پێشنیاری پترایۆس'م بۆ رامسفێلد کرد. ئەگەر پترایۆس لەو کاتانەدا یان زووتر بهاتایە، جیاواز دەبوو."تەنانەت سەرۆك بوش'یش لە رەخنەکانی ئەو بێ نسیب نەبوو و ئەوەی پێ زیاد کرد کە"بوش بەتەواوی نەیتوانی تیمەکەی کۆبکاتەوە و کاریان پێ بکات. لە بەڕێوەبردنی تیمەکەیدا لاواز بوو."

رادەست نەکردنی دەسەڵات بە عێراقییەکان، هەوڵدان بۆ داگیرکردنی عێراق و لەسەرووی ئەوەشەوە دانانی کەسێکی وەك پۆل برێمەر – وەك بژارەی رامسفێلد – بۆ بەڕێوەبردنی بەڕێوەبردنی داگیرکاری و حیساب نەکردنی تەواوی توانای بەرگری رژێمی رووخێنراو، لە هاتوچۆکانمدا بۆ عێراق لە کۆتایی ٢٠٠٣دا، منیش هەموو ئەمانەم وەك"هەڵە سەرەکییەکانی"ئەمریکا لە عێراق لە زەینی خۆمدا تۆمار کردبوو. بەڵام

ئینگلیزەکان‌یش کە لە عێراق، دەوڵەتێکیان بەناوی عێراق دروستکردبوو هەڵەی هاوشێوەی ئەوانەیان کردبوو. لە راستیدا ئەزموونی ئینگلیز لە عێراق، وانەیەکی گەورەی تێدا بوو سەبارەت بەوەی کە پێویستە خۆ لە کام هەڵە بدزرێتەوە.

وتم؛"پۆل! بەر لە جەنگ لەبارەی مێژووی ئینگلیزەکان سەبارەت بە عێراق هیچ کتێبێکت خوێندبووەوە؟ ئاگات لە راپەڕینی ١٩٢٠ هەبوو؟"

بێئەوەی دوو دڵییەکی زۆر پیشانبدات، سەری بە نیشانەی بەڵێ لەقاند و وتی؛"خوێندبوومەوە. ئاگام لە راپەڕینی ١٩٢٠ هەبوو."

بە بێ زانینی چۆنییەتی دامەزراندنی عێراق و بە بێ ناسینی عێراق‌ی ئینگلیز، هیچ شتێك لەبارەی عێراق نازانرێت. بەڵام لەوانەیە زانینی ئەمەش بۆ تێبگەیشتن و شارەزابوون لەم وڵاتە بەس نەبێت.

بۆ ئەمریکا بەس نەبوو.

بەڵام ئەگەر چۆنییەتی دامەزراندنی عێراق و عێراق‌ی ئینگلیز نەزانن، دەکرێت لەبارەی عێراق‌ەوە قسە نەکەن. ئاگاداربوون لەو قۆناغە، واتای دەست بردن بۆ ریشە و دۆزینەوەی سەرەداوەکانی کێشەی کورد لە تورکیا دەدات.

**ئەگەر هێڵێک بە دەوری عێراق‌دا بکێشیت و باس لەوە بکەیت کە ئەمە یەکەیەکی سیاسی تەواوە، ئەوکاتە بەپێچەوانەی ئاراستەی مێژوویەکی ٤٠٠٠ ساڵەدا دەفڕیت. هەموو کاتێک ئاشوور رووی لە باکوور و خۆرهەڵات بووە و بابل‌یش رووی لە باشوور کردووە و هیچ کاتێک یەکەیەکی سەربەخۆ نەبوون. پێویست بە کات هەیە تا ئەوانە یەکبخرێن و ئەمەش بە هێواشی دەکرێت. ئەوان بۆ خۆیان هیچ کۆنسێپتێکیان نییە بۆ ئەوەی کە ببنە نەتەوەیەک.**

**(دەیڤید فرۆمکین، ئەو ئاشتییەی کۆتایی بە ئاشتی هێنا،١٩٨٧، ل٤٥١،٤٥٠)**

سەنتەری ویڵسن Woodrow Wilson International Center for Scholars لەسەر پێشنیاری پۆل ڤۆلفۆویتز منی بانگهێشتی واشنتن کردبوو تا ماوەیەك لەگەڵیان کار بکەم. لەو کاتانەدا لی هاملتن ببوو بەسەرۆکی سەنتەری ویڵسن. هاملتن کەسێك بوو کە بۆ ماوەیەکی پێوانەیی لەسەرۆکایەتی لیژنەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا‌دا مابووەوە و یەکێکیش بوو لە کۆنترین و رێزدارترین سیاسەتمەدارەکانی ئەو وڵاتە. لەگەڵ جەیمز بەیکەر وەزیری پێشووی دەرەوە هاوسەرۆکایەتی لیژنەیەکی کۆنگرێسی ئەمریکا‌یان کرد کە ساڵی ٢٠٠٦ بۆ لێکۆڵینەوە لە جەنگی عێراق لە ژێر ناوی گرووپی کاری عێراق دامەزرابوو. راپۆرتی بەیکەر- هاملتن کە یەکێك لە قورسترین رەخنەکانی ناو سیستەمی ئەمریکا‌ی دژی سیاسەتی جۆرج بوش پێشخست و رێپیشاندەری سیاسەتەکانی ئۆمابا بوو، راپۆرتێك بوو کە هاملتن مۆرێکی نەسڕاوەی لێدابوو. پۆل ڤۆلفۆویتز چەندە کۆماریخواز بوو، لی هاملتن‌یش ئەوەندە دیموکرات بوو. ڤۆلفۆویتز چەندەی وەك ئەندازیاری جەنگی عێراق دەناسرا، هاملتن‌یش بەو ئەندازەیە وەك کەسێك دەناسرا کە ئەو ئەندازیارییەی تێکدەدا. ئەوکاتەی ئەم دوو کەسایەتییە لەسەر ناوی من رێککەوتبوون، هێشتا چوار ساڵی مابوو بۆ ئەوەی جەنگی عێراق رووبدات و هێشتا بەتەواوی لە دژی یەك سەنگەریان نەگرتبوو. پۆل ڤۆلفۆویتز پێشنیاری کردبوو تا من لە سەنتەری ویڵسن وەربگیرێم و لی هاملتن قبوڵی کردبوو. بەوجۆرەش لە بەهاری ١٩٩٩دا پێم نایە ناو یەکێك لە ناوەندە گرنگە رۆشنبیرییەکانی ئەمریکا لە واشنتن. سەنتەری ویڵسن گۆڤارێکی وەرزانەی بەناوی The Wilson Quarterly دەردەخست کە توانا و ئاستی رۆشنبیری ناوەندەکەی دەردەخست.

ئەو گۆڤارە مۆری کەسانی وەك Walt W. Rostow, George F. Kennan, Rem Koolhas, Carlos Fuentes, Mario Vargas LIosa, Joseph Brodsky, John Updike پێوە بوو. منیش لە (ز ویلسن کوارتێرلی)دا نووسیم و دوای ئەوەی کە ئەمریکا‌شم بەجێهێشت، دیسان هەر چاودێری ئەو بڵاوکراوەیەم دەکرد و دەمخوێندەوە. (ز ویلسن کوارتێرلی) وەك پلاتفۆرمێك بوو کە دەتتوانی لە تورکیا‌وە لە شوێنی خۆتەوە ئاگاداری رووداوەکان و توانای رۆشنبیری ئەمریکا بیت کە لە راستیدا زۆر ئاگامان لێی نەبوو و هیچ

کاتێکیش ئەم تایبەتمەندییەی خۆی لە دەستنەدا. لەو گۆڤارەدا وتارێکی F.S. Naiden بەناوی"هێڵەکانی ناو لم"م سەبارەت بە عێراق خوێندەوە کە لە زستانی ۲۰۰۷دا بڵاوی کردبووەوە. پێموایە هەموو ئەو بابەتە ئینگلیزیانەی کە لەسەر دروستبوونی عێراق نوسراون هەموویم خوێندۆتەوە بەڵام هیچ کامیان بەئەندازەی"هێڵەکانی ناو لم"سەرنجڕاکێش نەبوون. بابەتەکە ئەوەندە بەشێوەیەکی واتادار و زمانزانانە نوسرابوو، زەحمەت بوو بابەتێکی هاوشێوەی بدۆزیتەوە کە بەسەرکەوتوویی پوختەیەکی قۆناغی مێژوویی ئەوکاتەت بۆ بخاتەڕوو. لایەنی سەرنجڕاکێشی بابەتەکەش ئەوەبوو کە نوسەرەکەی پرۆفیسۆری بواری مێژوو بوو بەڵام پسپۆڕی پێشووی کاروباری یۆنان بوو و بەدەر لەو وتارەش هیچ شتێکی لەسەر عێراق و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نەنوسیبوو. نایدن چیرۆکی دەرکەوتنی نەخشەی ئەمڕۆی عێراق باس دەکات کە لە ئەنجامی دروستکردنی چەندین نەخشەی جیاواز لەلایەن بەرپرسانی ئینگلیز لە عێراق پەیدا بووە. ئەو بەرپرسانە بە بەردەوامی لەگەڵ یەکدا لە ململانێ و مشتومڕدا بوون و ئەویش لە واتایەکی دیکەدا چیرۆکی جەنگی نەخشەکان لە بەینی ئینگلیزەکاندا دەگێڕێتەوە و بەمجۆرەش دەستپێدەکات؛

"لەجەنگی جیهانی یەکەمدا بەر لەوەی فۆتۆگرافی ئاسمانی ببێتە پیشەیەك بۆ دروستکردنی نەخشە، بینینی نەتەوەیەك بەتەواوی، بەئەندازەی سەیرکردنی وێنەیەك ئاسان نەبوو. نەتەوە بەرهەمێکی خەیاڵی بوو و کەم وڵاتیش هەبوو کە بە ئەندازەی عێراق بەرهەمی خەیاڵێکی زۆر و فراوان بێت. تورکەکانی عوسمانی وەك وێستگەیەك لە کەنداو، بە واتایەکی دیکە وێستگەیەك لەسەر ڕێگای هیندستان سەیری ئەوێیان دەکرد. پێشتر رۆمایی و مەکدۆنیەکان یش بە هەمانشێوە سەیری ئەوێیان کردبوو. ئەسکەندەری گەورە گەشتەکەی بۆ هیندستان دەستپێکردبوو، هەروەها تراژان ئیمپراتۆری رۆما، ٤٥٠ ساڵ دوای ئەو، واتە لە ۱۱۷ی زاینیدا بەشوێنە پێیدا رۆیشتبوو. دوای ئەوەی گەیشتبووە کەنداو، ناچارکرابوو کە بگەڕێتەوە. بەڵام لەدوای ئەوانیش کەسانی دیکە بەوێدا دەهاتن..."

ئیستاش تەسەوری ئەسکەندەر یاخود تراژانێکی مۆدێرن بکەن. دەزانێت هیندستان لە کوێیە و بەشێکی گەورەی ئەو وڵاتەی داگیرکردووە و ئیدی پێویستە ئەوێ بەڕێوەبەرێت. هیندستان هی بەریتانیایە و دەیەوێت عێراق وەك بەشێکی ئەوێ بەڕێوەببات. پاییزی ساڵی ۱۹۱٤یە و لە یەکەم رۆژەکانی جەنگی جیهانی یەکەمدا سوپای هیندستانی بەریتانیا دەربازی کەنارەکانی کەنداو لە باشووری عێراق بووە. پەنجا هەزار سەرباز بەنیاز نین ئەو وڵاتە داگیربکەن، ئەوان دەیانەوێت رێگا لەوە بگرن کە دوژمنەکانی بەریتانیا تەنانەت هاوپەیمانەکانیشی ئەو شوێنە وەکو دەرگای پشتەوە بۆ هیندستان بەکار بهێنن. لەلایەکی دیکەشەوە هێشتا وڵاتێك بەناوی عێراق لەسەر نەخشە نیە.

هیندستان ناوێکی بۆ هەڵبژارد. رێك لەوکاتانەدا ئەو بەڕێوەبەرانەی کە لە بینای ژمارە دەی شەقامی

دۆڤنینگ دادەنیشتن،دەستبەکاربوون. ئینگلیز[١٠] نایەوێت حکومەتی ئۆتۆنۆمی کۆلۆنیالی هیندستان نەخشە بکێشێت. ئەوان دەیانەوێت خۆیان نەخشەکە بکێشن، بەوهۆیەشەوە هەوڵ و تەقەلا دەست پێدەکات. حکومەتی هیندستان نەخشەکانی عێراق دەکێشێت و لەندەن'یش دووبارە دەیانکێشێتەوە. هیندستان بەشێوەیەکی بچوك بیردەکاتەوە چونکە عێراق بۆ ئەو شتێکی بچوکە، بەڵام لەندەن بەشێوەیەکی فراوانتر بیردەکاتەوە. هیندستان لەڕێگەی لەشکرکێشی سوپاکەی بۆ خاکی عێراق ئیدیعاکەی خۆی دەسەلمێنێت و لەندەن'یش لە ڕێگەی کیشانی نەخشەوە ئەو کارە دەکات. لە ئەنجامیشدا لەندەن دەیباتەوە بەڵام هەتا ئەوکاتەی دەیباتەوە چەندین نەخشە دەکێشێت."

لە چیرۆکەکەی نایدن'دا خواستە یان ناخواستە بەر لە هەموو کەسێك لەگەڵ ئارنۆڵد ویڵسن ئاشنا دەبین.

"ئەوکاتەی سوپای هیندستان (ئینگلیزەکان) لە ١٩١٤دا هات، ئەرکی کێشانی نەخشە درا بە کەسێك بەناوی ئارنۆڵد ویڵسن کە لەوکاتانەدا نەقیب بوو و دواتریش بوو بە رائید و دوای ئەوەش نازناوی سێر'ی وەرگرت. ویڵسن کەسێك بوو کە بەشێوەیەکی ژیرانە سەرسامی تورك و سیکەکان بوو. سیکەکان یاخود گروگاهاکان ئەو رەگەز و نەژادە بوون کە ئینگلیزەکان بە نەژادی جەنگاوەر ناوزەندیان دەکردن و ئەوانیش سوپای هیندستان'یان بەهێز کردبوو. تورکەکان'یش تا ساڵی ١٩١٤، بۆماوەی چوارسەد ساڵ عێراق'یان بەڕێوەبردبوو. سەرسامبونەکەی ویڵسن لە ترسەوە سەرچاوەی دەگرت. بەڵی، سوپای هیندستان دەیتوانی تورکەکان شکستبدات بەڵام ئایا دەیتوانی شوێنی ئەوان بگرێتەوە؟ لەدوای روخانی ئیمپراتۆریای چین لە ساڵی ١٩١٢دا خیلافەت (ج.چ؛ دەوڵەتی عوسمانی) لە ریزی کۆنترین دەوڵەتەکانی جیهاندا بوو. نەك تەنها عێراق بەڵکو تورکیا و سوریا و لوبنان و بەشێکی زۆری عەرەبستانی سعودی و دەوڵەتە بچوکەکانی کەنداو'یشی لەخۆدەگرت. لە رابردوویەکدا کە زۆر دوریش نیە، بەشێکی زۆر لە بەڵکانەکان و میسر و لیبیا و جەزائیر'یش سەر بە دەوڵەتی عوسمانلی بوون.

عێراقی تورك لە کەنداو'ەوە بەرەو باکوور لە سێ ویلایەت پێکدەهات. ویڵسن ئەو هەڵەیەی دووبارە نەکردەوە کە ئەو شوێنانە وەك ویلایەت ناو بەرێت. دەستەواژەی"چرووتڤێنس"یاخود ویلایەت دەستەواژەیەکی کەنەدایی و لەوەش خراپتر فەرەنسی بوو. لە هەر مەترێکی دووجای ویلایەتێکدا بەراز یاخود ژژویەك هەبوو و هەر ماڵێك ئەدرێسێك و هەر شوێنێکی نیشتەجێبوون پەنیرێکی تایبەت بە خۆی هەبوو. بەڵام ئەو عێراقەی کە بەشێکی زۆری زەلکاو و بیابان بوو بەمجۆرە نەبوو. هەرسێ ویلایەتەکە بەناوی شارە ناوەندیەکانیانەوە ناوزەد دەکران (بەغداد، بەسرە، موسڵ). بەسرە یەك لەسەر سێی باشووری وڵاتی لەخۆ دەگرت و بەغدا'ش یەك لەسەر سێی ناوەڕاست و موسڵ یەك لەسەر سێی بەشی باکووری

١٠-ج.چ: لەدەقە سەرەکییەکەدا بە بەردەوامی وشەیBritain و British بەکار هاتووە و لە بەرامبەر ئینگلتەرا، وشەی England و لە بەرامبەر وشەی ئینگلیزیشدا English بە کار نەهاتووە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە وشەکانی Britain و British مانایەکی فراوانتر لە وشەکانی ئینگلتەرا و ئینگلیز دەدەن، لێرەدا وشەکانی ئینگلتەرا و ئینگلیز بەکار هاتوون.

لەخۆ دەگرت و لەوانیتر فراوانتر بووو. دێرەزوور موتەسەڕیفلکێك بوو لە خۆرئاوای موسڵ کە ئەو شارەی لە ویلایەتەکانی ئەمڕۆی سوریا جیا دەکردەوە.

رووبارەکانی دیجلە و فرات لەهەر سێ ناوچەوە تێپەڕدەبوون، بەڵام نزیکەی ١٢٠ مایل لەسەرەوەی کەنداو، دەبوو بە رووبارێکی قوڕاوی بەناوی شەتولعەرەب کە پێویستبوو بەردەوام کەناڵی تێدا دروستبکرێت. ئەو کەناڵ و ئاوەڕۆیانەی کە بەشێوەیەکی ئاسۆیی لەنێو وڵاتەکەدا دروستکرابوون، زۆربەیان نزیکەی ٧٠٠ساڵ بەر لە ئێستا لەلایەن مەغۆلەکان'ەوە خراپ کرابوون و بەو هۆیەشەوە وشك ببوون. شاری سەرەکی لەکەناری رووباری دیجلە کە بیناکانی بە خشت دروستکرابوون و گەرماکەی لە گەرمای حەمام دەچوو، بەغدا بوو. کەشتیە گەورەکان نەیاندەتوانی بگەنە ئەم شارە. لە باکوور، رووبارەکان لەیەك دووردەکەوتنەوە و پارچە خاکێکی گەورەی بەناوی جزیرە لەخۆ دەگرت کە تا چیاکانی ئەرمەنستان درێژ دەبووەوە. لەم شوێنەدا کە بۆ بەدەستهێنانی بەرهەم زۆر وشك بوو، بە زۆری کۆچەرە کورد و عەرەبەکان دەژیان. ناوێکی هاوبەش لەسەر ئەم ناوچانەی کە زۆر لێك جیاوازن نرابوو، ئەویش (العراق) یاخود دەشتایی بوو کە ناوێکی سیاسی نەبوو بەڵکو گوزارشتێکی تۆپۆگرافیك بوو. نەدەکرا ئەو ناوە لەسەر شاخەکانی باکوور بنرێت. میزۆپۆتامیا (خاکی نێوان دوو رووبار)، ئەویش گوزارشتێکی دیکەی تۆپۆگرافی بوو بەڵام دەکرا هەم بۆ شاخەکان و هەم بۆ شەتولعەرەب بەکار بهێنرێت. میزۆپۆتامیا دەستەواژەیەکی یۆنانی بوو، ئەمەش بۆ کەسێکی وەك ویڵسن کە ئاشنایی لەگەڵ وشە یۆنانیەکان هەبوو دەرفەتێکی باشی دەڕەخساند. ئەو دەیزانی میزۆپۆتامیا هی سەردەمی هێلینستیکە و هیچ شتێکی ئەو قۆناغەش لە عێراق نەماوە.

ویڵسن دواتر لەکاتی نوسینی بیرەوەرییەکانی خۆیدا لە هەندێك شوێن باسی مێژووی دوورودرێژی ئەو ناوچەیەی کردبوو. بەسرە، زەمانێك کە دەگەڕێتەوە بۆ٣٠٠٠ ساڵ پ.ز، شارستانییەك بووە بەناوی سۆمەر کە لەنێو دۆڵی دیجلە و فرات'دا بووە. سۆمەرییەکان یەکەم کەناڵەکانی ئاویان دروستکرد و بابلیەکان'یش کە نزیکەی ٢٢٠٠ ساڵ پ.ز لە بەشەکانی ناوەڕاستی ئەو وڵاتەدا بوون، کەناڵی دیکەیان دروستکرد. دواتر ئاشوورییەکان لە ١٨٠٠ ساڵ پ.ز، لە بەشی باکوور نیشتەجێبوون. هیچ کەسێك نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی درێژ ئەو سێ ناوچەیە بەیەکەوە بەڕێوە بەرێت. تەنها فارسەکان توانیان بۆ درێژترین ماوە ئەو ناوچەیە بەڕێوەبەرن ئەویش لە ٣٣٠-٥٣٠ی پ.ز درێژەی کێشا. تەنانەت رۆماییەکان'یش نەیانتوانی هەموو میزۆپۆتامیا لە دەستی خۆیاندا رابگرن. لە سەدەی حەوتی دوای زایین تا ئەوکاتەی کە ئیسلام لە ناوچەکەدا جێگیربوو، فارسەکان بۆ جارێکی دیکە سۆمەر و بابل'یان خستە ژێردەستی خۆیان بەڵام نەیانتوانی ئاشوور کۆنترۆڵ بکەن. عەباسییەکان وەکو خانەدانێکی عەرەب هاوشێوەی ئەوەی کە گەورەترین خانەدانی فارسەکان کردی، عێراق'یان یەکخست بەڵام کردیان بە بەشێك لە شتێکیتر کە لە خۆی گەورەتر بوو. لە ساڵی

٧٦٢ی دوای زاییندا بەغدا'یان دروستکرد و ئەوەش بوو بە بابلێکی نوێ کە سنورەکانی دیجلە و فرات'ی تێپەڕ دەکرد. باشترین سەربازەکانی عەباسیەکان هەزاران مایل پێشڕەویان کردبوو و هەتا ئاسیای میانە ڕۆیشتبوون. بودیستە کۆنەکانی ئەفغانستان بوون بە میراتگری ئەوان و باشترین بەڕێوبەرەکانیان لەدوای خۆیان دوو هەیکەلی گەورەی بودایان لە بامیان بەجێهێشت کە ساڵی٢٠٠١ لەلایەن تالیبان'ەوە روخێنران. باشترین کەسی عەباسیەکان هارونە رەشید بوو کە لەنێو یەك ساڵدا هەم لە دژی بیزەنسیەکان جیهادی کرد هەم بۆ حەج سەردانی مەککەی کرد. هارون پاڵەوانی سەرەکی کتێبی چیرۆکەکانی هەزار و یەك شەو بوو کە بەغدای بە ناوبانگ کرد ...

فاتیحە تازەکان یاخود تورکەکانی عوسمانی لە سەدەی شانزدەدا هاتن و هەر ئەو سێ بەشەیان لەوێ دروستکرد. لە باشوور موسڵمانە شیعەکان'یان بینی کە لە ژێر کاریگەری ئەو ئیمامانەدا بوون لە ئێران خوێندبوویان. ویڵسن هێزی مەلاکانی قبوڵ کردبوو و ئەوانەی بە مەلاکانی فارس ناوزەد کردبوو. تورکەکان'یش لەرێگەی ئیمامەکان یاخود سەرکردەی خێڵە خۆجێیەکانەوە باشووریان بەڕێوەدەبرد. تورکەکان لە بەشی ناوەڕاستی ئەو وڵاتەدا هەندێك شیعەیان بە پەرتەوازەیی لەگەڵ ژمارەیەك لە یەهودییەکان و بەشێکی زۆر لە سوننەکان دۆزییەوە. سوننەکان روویان نەك لە ئێرانی شیعە بەڵکو لە دنیایەکی فراوانتری موسڵمانەکان کردبوو و لەبەر ئەوەش ملکەچ بوون. خاوەن زەوی و موڵکدارە سوننەکان یارمەتیاندا تا ناوچەکە بەڕێوەببرێت و ئەو سوننە خوێنەوارانەی کە بیرۆکرات بوون وەکو ئەفسەر خزمەتیان کرد. لێرەشدا تورکەکان بەپێچەوانەی باشوور، بۆ ئەوەی باج کۆبکەنەوە ناچاربوون تۆزێك هەوڵ و تەقەلای زیاتر بدەن. ئەو ناوچەیەی کە دەمایەوە ناوچەی باکوور بوو. ئەمەش دواکەوتوترین شوێن بوو. گرووپی سەرەکی لە وێدا کوردەکان بوون کە موسڵمان بوون بەڵام وەکو عەرەبەکان سامی نەبوون. ویڵسن وا بیری کردەوە کە لەوانەیە هۆکاری ویستی زۆری ئەوانە بۆ سەربەخۆیی و پابەندبوونی لە رادەبەدەریان بە پادشاکان و هەروەها ئەو هەژاری و نەهامەتیە دەگمەنەی کە لەنێو ئەوانەدا هەیە، پەیوەندی بەوەوە بێت کە ئەوان پاشماوەی مادەکانی کۆن بن کە خزمە سوارییەکانی فارسەکان بوون. لە هەندێك لە شوێنەکانی باکووردا بەشێك لە کەمینەی مەسیحیەکان کێشەیان هەبوو.

ویڵسن کە لە شوێنکی وەکو هیندستان'ەوە هاتبوو کە تێیدا لە شازادەکانیەوە بگرە تا وەکو دین و نەژاد هەمو شتێکیان جۆراوجۆرە، بۆیە نەیویست ئەو مەنجەڵەی کە هەیە تێکی بدات. ئەو تەنها ویستی بەسرە بکات بە بەشێك لە بەریتانیا. رێگاوبان دروستدەکران و کەناڵەکان پاك دەکرانەوە و باج وەردەگیرا و لە جیاتی دادگاکانی موسڵمانەکان، دادگاکانی بەریتانیا دادەمەزران. بورما یاخود میانمار سەر بە هیندستانی ئینگلیزەکان بوو، بۆچی بەسرە بەشێك لەوە نەبێت ...

له یەکەم ساڵی جەنگی جیهانی یەکەمدا ویلایەتی بەسرە تاقە شوێنێك بوو کە سێر ئارنۆڵد ویڵسن چاوی تێ بڕیبوو. ئەو نارەزایەتییەکی نەبوو لەوەی کە ویلایەتەکانی بەغداد و موسڵ لە دەستی تورکیا'ی عوسمانی'دا بمێنێتەوە. لە لەندەن'یش لیژنەیەکی سەر بە حکومەت بە سەرۆکایەتی سێر ماوریك دێ بونسن نەخشەیەکی کێشا کە تیایدا بەسرە خرابووە سەر بەریتانیا و بەشەکانی دیکەی عێراق بۆ تورکەکان بەجێ هێڵرابوون. لە قۆناغی دوای جەنگیشدا هەم نەخشەکان و هەم ئەو کەسانەی هەوڵیاندەدا نەخشەی عێراق بکێشن گۆڕانیان بەسەردا هات. بۆ ماوەیەك ناوی سێر مارك سایکس لە پێشەوەی هەموو ناوەکان بوو."

نایدن لە چیرۆکەکەی خۆیدا بەجۆرێک شێوازی بیرکردنەوەی سایکس وێنادەکات کە لە هیچ شوێنێکی دیکە دەستناکەوێت. لەم وێناکردنەشدا ئەو جیاوازییانەی کە لە دیدگای زەینیەتی داگیرکاری ئینگلیزەکان'دا سەبارەت بە مرۆڤەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هەبوو بەمجۆرە دەردەخات؛

"لە ساڵی ١٩١٦دا سێر ئێدوارد گرەی دوایین وەزیری دەرەوەی لیبراڵی بەریتانیا خانەنشین بوو. بەوجۆرەش کۆنترۆڵی سیاسەتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە وەزارەتی دەرەوە لە (وایت هاڵ) کەوتە دەستی گاردن سبورب کە لە ریزی بینا کۆنەکاندا بوو لە زەوی پشت بینای ژمارە ١٠ی شەقامی دۆڤنینگ کە ئەو کاتانە H.H. Asquith وەك سەرۆك وەزیر تێیدا دادەنیشت. بەپێچەوانەی ئارنۆڵد ویڵسن و ئێدوارد گرەی، ئەو کەسانەی لە گاردن سبورب دەمانەوە کەسانی رۆشنبیر بوون. لەنێو ئەوانەدا یەکەم کەسێك کە نەخشەی عێراق'ی کێشابوو سێر مارك سایکس پەرلەمانتاری پارێزگاربوو کە لەبارەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'ەوە گەشتنامەی دەنوسی. ئارنۆڵد ویڵسن حەزی لە تورکەکان دەکرد بەڵام مارك سایکس حەزی لێ نەدەکردن و ئەوانەی بۆ دوو گروپی کۆن و گەنج دابەش دەکرد. تورکە کۆنەکان تا ساڵی ١٩٠٨ خەلافەتیان بەڕێوەبرد. ئەوان هاوشێوەی فارسە کۆنەکان کە بە نەژادی باڵا لەقەڵەم دەدران، فێری سواربوونی ئەسپ و بەکارهێنانی چەك و لانەدان لە رێگەی راست کرابوون. بەڵام لە رێگەی کودەتایەکەوە خەلافەت کەوتە دەستی تورکە گەنجەکان کە لەوانتان بوون. لەوانتان بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی'یەك دەوترا کە کەلتوورێکی تێکەڵاوی هەبوو. رۆمەکان بە زۆری لەوانتان بوون و ئەرمەنەکان'یش بەوجۆرە بوون بەڵام یەهودییەکان بەشێوەیەکی سەسوڕهێنەر جیاواز بوون. وەکو دەبینرێت سایکس سەبارەت بە یەهودییەکان تیۆرێکی هەبوو. نەتەوەکەی هەرچی دەبێت بابێت لەوانتان لەبەر ئەوەی کە دوو رەگەزەیە نەیدەتوانی ئەوانەی دیکە بەڕێوەبەرێت. سایکس دەیگوت تورکە لەوانتەکان هەرگیز ناتوانن خەلافەت ریفۆرمیزە بکەن. ئەو دەیگوت دوای کودەتاکەی ١٩٠٨ سەیری تۆمارەکانیان بکەن و بەو هۆیەشەوە دەزانن کە ئەوان بۆچی ناتوانن ئەو کارە بکەن. سایکس حەزی لە عەرەبەکان'یش نەدەکرد کە وەکو ئەڵتەرناتیڤ و بەدیلی تورکەکان بوون. لە کتێبێکی خۆیدا بەناوی (دارالاسلام) لە ساڵی ١٩٠٤دا بەمجۆرە گوزارشتی لەوان کردووە؛

ئەوانە بەشێوەیەکی ڕەوان قسە دەکەن، فێڵبازن و لە مرۆڤدا هەیەجان دروستدەکەن بەڵام ترسنۆکیشن... بەهۆی ئەوەی کە ساڵانێکی دوورودرێژ بە خراپی ژیاون، لە کوولەکەیەکی گەورە و گەنیو دەچن و کەسانێکی لادێیین کە بێحەیایی و ناپاکی مناڵێکی هاروهاجیان تێدایە. قسەکردنی ئاساییان وەکو شیعر خوێندنەوە وایە... ئەوکاتەی کە ڕووبەڕووی ڕاپەڕین و مەترسی نەبنەوە ئامادەن لە ژێر ناوی فاناتیکبوون و پابەندبووندا گیانی خەڵك وەربگرن و خەڵك بکوژن و بەشێوەیەکی گێلانە و نالۆجیکییانە نەفرەت لە ئەوروپییەکان دەکەن... کەسانی بیانی بە کافر ناودەبەن و کاتێك ئەویش لادەکاتەوە و سەیریان دەکات، خۆیان ون دەکەن.

لەبارەی بەدەوییەکان'ی بیابانیش وای نوسیوە؛ ناتوانی وەحشییەك بدۆزیتەوە کە لەمانە زیاتر بەدخوو، مشەخۆر و چاوچنۆکتر بێت.

لەگەڵ ئەمەشدا عەرەبەکانی شار و لادێ لە تورکەکان باشتربوون. سایکس تەنانەت رازی بوو بەوەی کە بە مەرجی پشتیوانی و کۆنترۆڵی بەریتانیا، بەڕێوبەرانی عەرەب بۆ عێراق دەستنیشانبکات. بەڵام بەهیچ جۆرێك رازی نەدەبوو بەڕێوبەرانی عەرەب سەربەخۆبن، جا ئەوانەش چ عەرەبی شیعە بن یان سوننە، لەلای ئەو هیچ فەرقێکی نەدەکرد. چونکە بەگوێرەی ئەو، عەرەبەکان توانای ئەوەیان نەبوو خۆیان بەڕێوەبەرن و کوردەکان'یش بەو شێوەیە بوون. هەڵبەت بە رای ئەو، کوردەکان متمانەپێکراوتر بوون. سایکس پێیوابوو کوردەکان نیشانشکێن و سوارچاکی باشن. هەرچی بێت ئەوان لە مادەکان بوون و ئەگەر بەرتیلیان پێ بدرێت، دەتوانرێت متمانەیان پێبکرێت. لەبەر ئەمەش سایکس عێراقێکی لە زەینی خۆیدا وێنا کرد کە تێیدا بەریتانیا پارێزگاری لە بەسرە بکات و بەشەکانی دیکەشی بەدەستی کەسانێکی سەر بە وڵاتەکەی بسپێرێت. بیروبۆچوونەکانی ئەو زیاتر لە ساڵی ١٩١٦ و بەهۆی ڕووداوەکانی ساڵێك لەوەوپێش شکڵیان گرتبوو. لەدوای ڕووداوی گەلی بۆلوو، ئینگلیزەکان دەیانویست لە عەرەبستان و فەڵەستین و سوریا'وە هێرش بکەنە سەر خاکەکانی تورك. ئەوان دەیانزانی لەو شوێنانەدا عەرەبەکان یارمەتی ئەوان نادەن، چونکە بەشێك لە عەرەبەکان لە سوپای تورکیا ئەفسەر بوون وەکو ئەفسەرە سوننەکانی عێراق، بەڵام بەدەوییەکانی گۆشەکانی بیابانی دووردەست هیچ نەبێ کاتێك کە باس لە بەڕێوەبردنی تورك دەکرا وەکو ئەوەبوون کە مارك سایکس باسی دەکردن. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هێرشیان دەکردە سەر تورکەکان و ڕێگەیان لەو حاجیانە دەگرت کە سەردانی مەککە و مەدینە و شوێنە پیرۆزەکانیان دەکرد. ئەگەر یەکێك لە ئەریستۆکراتەکانی عەرەب کە بەدەوی نەبێت بکرێتە پادشای عەرەبەکان، دەیتوانی ئەمانە بەکاربهێنێت ... و دەیتوانی بەناوی ئیسلام هێرشی تورکە گەنجەکان و ئەو کەسانە بکات کە خەلافەتیان خستبووە ژێر دەستی خۆیان. پادشای تازە پێویستبوو کەسێکی ڕاستەقینە و ناسراوی عەرەب بێت ...

دواجار ئینگلیزەکان پادشایەکی وایان دۆزییەوە؛ حسێن ئیبنی عەلی. ئەو لە نەوەکانی پێغەمبەر بوو. شەریفی شوێنە پیرۆزەکانی مەککە و مەدینە بوو. دانوستانی نێوان حسێن و ئینگلیزەکان و دواتر دانوستانی نێوان کوڕەکانی حسێن لەگەڵ ئینگلیزەکان بوونە هۆی ئەوەی کە چارەنووسی فەلەستین و ئوردن و عەرەبستانی سعودی دیاری بکرێت و لە هەمانکاتدا چارەنوسی عێراق'یش دەستنیشانبکرێت. ئەوانە لەو رەگەزە بوون کە سایکس بە لەوانتان ناوی دەبردن و رەگەزێکی تێکەڵ بوون کە ئەسڵیان دیار نەبوو. بەڵام دووشت هەبوو کە روون بوون؛ حسێن عێراقی دەویست و ئینگلیزەکان نەیاندەویست ئەو ببێتە خاوەنی عێراق. گاردن سبورب'یش نەیدەزانی چی دەوێت بەڵام دەیزانی کە نایەوێت عێراقی نوێ بۆ حسێن بێت... ئینگلیزەکان باسیان لەوە دەکرد کە پێویستە دابەشکردنێکی ئیداری تایبەت لە میزۆپۆتامیا ئەنجام بدرێت. ئەوان دەیانزانی حسێن هێزێکی وای نییە بتوانێت ئەوان لە بەسرە دەربکات، ئەو تەنانەت نەیتوانیبوو تورکەکان'یش لە مەدینە دەربکات.

چی لە پشت دەستەواژەی دابەشکردنی بەڕێوەبردنی تایبەتەوە هەبوو؟ فەرەنسا'ی هاوپەیمانی بەریتانیا. مارك سایکس نوێنەری غەیرە رەسمی گاردن سبورب لەگەڵ هاوتا فەرەنسیەکەی خۆی بەناوی فرانچیس جۆرجێس پیکۆت لە دانوستاندا بوو. ئەوکاتەی کە هەردووکیان لەسەرەتای ساڵی ١٩١٦دا لەگەڵ یەك کۆبوونەوە، پیکۆت، ماوریك پالیۆ لۆگیۆ باڵیۆزی فەرەنسا'ی لە روسیا'ش لەگەڵ خۆی هێنابوو. هەرسێکیان پێکەوە لەسەر پەیماننامەی سایکس - پیکۆت رێککەوتن. روسیا نزیکترین ناوچەی بەخۆی کە چەناقەلە بوو وەردەگرت و ئیتالیا بەشێکی نزیك لەوێی وەردەگرت و فەرەنسی و ئینگلیزەکان'یش بەشە گەورەکانیان بەردەکەوت. فەرەنسیەکان لوبنان'یان وەردەگرت کە ماوەیەکی زۆر بە بیانووی مەسیحیە مارۆنیەکان'ەوە دەستیان تێوەردەدا و ئینگلیزەکان'یش بەسرە'یان لە دەستی خۆیاندا دەهێشتەوە ...

سایکس پێشنیاری وەرگرتنی چەند شارێکی لە سوریا بۆ عەرەبەکان کرد بەڵام عەرەبەکان لەکاتێکدا دەیانتوانی ئەو ناوچانە بەڕێوەبەرن کە فەرەنسا چاوپۆشییان لێبکات، چونکە سوریا بەر فەرەنسا کەوتبوو. هەمان شت سەبارەت بە بەغدا'ش راست بوو کە بەر عەرەبەکان کەوتبوو. واتا کاتێك دەیانتوانی بەغدا بەڕێوەبەرن کە ئینگلیزەکان چاوپۆشییان لێبکەن. قەزای موسڵ وەك قەرەبووکردنەوەیەك دەدرا بە فەرەنسا'ی هاوپەیمانی ئینگلیزەکان، بەڵام ئەمە تا ئەندازەیەك وەك قەرەبووکردنەوەیەك بۆ سوپای هیندستانی ئینگلیزەکان'یش بوو کە نەیدەویست لەو ناوچانەدا گەشتی سەربازی بکات. سایکس وا بیری دەکردەوە کە وازبێنین با فەرەنسیەکان بەوانەوە مەشغوڵ بن و ئەگەر لە بەرامبەر کوردستان'دا شکست بخۆن، تورکیا'ش لاوازتر دەبوو. نەخشەکەی سایکس دیپلۆماتیك بوو، بەڵام نەخشەکەی ویڵسن ئیداری بوو. هەردوو نەخشەکەش بەگوێرەی رای گشتی، واتە ئەو کەسانەی لەوێدا دەژیان نەبوو. خۆی لە راستیدا

هەردوو نەخشەکە نهێنی بوون. دواتر، نەخشەیەك کە دەکرا قبوڵ بکرێت نەك نەخشەکەی ویڵسن و سایکس بەڵکو نەخشەی دوو نوسەری دیکە بەناوەکانی T.E. Lawrence – Gertrude Bell بوون کە هیچ کات ئەندامی پەرلەمان نەبوون. بەتایبەتی لەو نێوانەشدا نەخشەکەی بێڵ نەخشەیەك بوو کە تواناى جێبەجێکردنی هەبوو. بەهۆی گۆڕانی هەلومەرجی سەربازی و دواتر مەرگی مارك سایکس بەهۆی ئەنفلۆنزاوە، ئەوان زیاتر دەرکەوتن و چانسیان زیاتر بوو."

دوابەدوای مەرگی چاوەڕواننەکراوی سێر مارك سایکس و دوورکەوتنەوەی لە کاروبارەکانی دروستکردنی نەخشە، کەسێك بەناوی تی ئی لاورنس کە دواتر بەهۆی فیلمێکی ئەمریکی بەناوی"لاورنسی عەرەبستان"ناوبانگی زیاتری پەیدا کرد، لەگەڵ کەسێکی دیکەدا بەناوی گێرترووود بێڵ کەوتنە مەیدان. هەردوکیشیان بە عەرەبەکان سەرسام بوون. ئەوان پێیانوابوو عەرەبەکان مافیان هەیە بەسەر خاکەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'ەوە پادشایی خۆیان بنیاد بنێن. لەنێو ئەو دوانەشدا گێرترووود بێڵ ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی لە دروستبوونی عێراق'دا هەبوو. گێرترووود بێڵ لە ژێر فەرمانی سێر ئاڕنۆڵد ویڵسن'دا وەك راوێژکار کاری کردبوو، بەڵام بیروبۆچوونەکانی ڕێك پێچەوانەی دیدگاکانی ویڵسن بوون. گێرترووود بێڵ هەوڵی دەدا عێراق بدرێتە دەست بەڕێوەبردنیەکی عەرەبی و دەیویست بۆ ئەوەش ئینگلیزەکان یارمەتی عەرەبەکان بدەن. دوای ئەو ڕاپەڕینەی لە عێراق دژی ئینگلیزەکان بەرپابوو، سێر ئاڕنۆڵد ویڵسن لە پێش چاوان کەوت و بەوجۆرەش گێرترووود بێڵ توانی ڕۆڵی مامانێك بۆ لە دایك بوونی عێراق بگێڕێت."

لە بەشی کۆتایی چیرۆکەکەی نایدن کە باسی گێرترووود بێڵ دەکات وەها نوسراوە؛

"سەرهەڵداوانی عەرەب، ئاڕنۆڵد ویڵسن و تی ئی لاورنس ژنێکیان لە بەرامبەر خۆیاندا بینییەوە کە دواتر سەلمێنرا دوایین کەسێك بووە کە هەوڵی کێشانی نەخشەی داوە. ئەمەش گێرترووود بێڵ نوسەر و بەڕێوبەرێکی ئینگلیز بوو. ئەو کەسانەی لەسەردەمی ئەودا دەژیان زۆر بە باشی دەیانناسی. یەکێك لەوانەش فێرجینیا وڵف بوو کە لێی دەترسا. وڵف لە نامەیەکدا بۆ هاوڕێیەکی کە گەشتی بۆ عێراق کردبوو وای نوسیبوو؛ ئێستا لە کوێی؟ وابزانم لەگەڵ بێڵ دای؟ خانمی بێڵ لوتێکی درێژی هەیە کە لە (تێریر- terrier) سەگی ڕاوچی ئەبێردین Aberdeen دەچێت. ژنێکی شارەزایە. هەموو کەسێك لەسەر پەنجەی خۆی دەخولێنێتەوە و یاری پێدەکات و وا لە مرۆڤ دەکات کە هەست بە بێکاریگەریی و دەستەپاچەیی خۆی بکات.

گێرترووە بێڵ لە هەرجۆرە سەگێکی ڕاوچی (تێریر) درێژتر بوو. بەڵام ئەوەی ئەو ژنەی مەترسیدار دەکرد تەنها لایەنی جەستەیی و درێژبوونی ملی نەبوو. بەسەر هەندێك لە گرد و شاخەکانی سویسرا سەرکەوتووە و ناویشی بە یەکێك لەو شاخانەوە نراوە. تەنانەت کەسێکی وەکو سایکس'یش نەیتوانی چاری بکات و

رووبەڕووی بێتەوە...

سایکس لەبارەی بێڵ وتبووی سنگێکی پانی هەیە و سمتی بەردەوام دەجوڵێتەوە و تێکەڵاوێکە لە سمتی ژن و پیاو. حەزی لە قسە و قسەڵۆکە. زۆر کەسیش وەك سایکس لەبارەی بێڵ بیریان کردۆتەوە بەڵام هیچ یەك لەوانە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبووە. ئەو یەکەم ژنێك بووە کە لە وانەی مێژوودا لە ئۆکسفۆرد پلەی یەکەمی بە دەستهێناوە و لە ماڵێکدا ژیاوە کە لەلایەن ویلیام مۆریس'ەوە دیکۆر کراوە. هەروەها نەوەی گەورەترین کەسێکی شارەزای بواری پیشەسازی کیمیای ئینگلتەرا بووە. بێڵ وەکو گەشتیارێکی ژن دەیزانی بە ئەندازەی پیاوەکان گومانی لەسەر دروستنابێت و دەتوانێت لە وڵاتە موسڵمانەکاندا ئازادانەتر بسوڕێتەوە. بەپێچەوانەی سایکس لەگەڵ سەرکردە ناوچەییەکاندا دیداری کرد و هەوڵی ئامۆژگاریکردنی لەندەن یاخود حکومەتە ناوچەییەکانی دیکەی نەدا. بەپێچەوانەی ویڵسن، عەرەبە سەرشێتەکانی لاورنسی پشتگوێ نەخست و بەپێچەوانەی لاورنس'یش ئەوانی زۆر گەورە نەکردەوە. لە جێی ئەوەی نەفرەت لە عەرەب و "لەوانتەکان" بکات، پێیان سەرسام بوو...

بێڵ سەبارەت بەعێراق تێگەیشتبوو لەوەی کە لاورنس شتێکی وەکو نەتەوەیەکی دەوێت. لاورنس بیرۆکەی دامەزراندنی سێ پادشایی بۆ عەرەبەکان لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست پێشخستبوو. ئینگلیزەکان دوای ئەوەی کە موسڵ'یان بە دەستهێنا، تەنها پشتگیرییان لە یەك پادشایی دەکرد. ئەم پاشگەزبوونەوەیەش بووە هۆی ئەوەی کە بێڵ پشتیوانی لاورنس بکات. پادشاییەك پێویستی بەناو و سنور بوو. واتای پادشاییەك بۆ عەرەبەکان بۆ لاورنس بەس نەبوو، بەڵکو پێویست بە عێراقێك هەبوو تا پادشا بەڕێوەی ببات و پێویستبوو ئەوانەش کە لەوێ دەمانەوە پادشا قبوڵ بکەن.

بۆ ئەوانەش، بێڵ دەیزانی لە کوێوە دەستپێبکات. ویڵسن ئەوی کردبووە بەرپرسی ئاسەوارە کۆنەکان و ئەویش لە عێراق مۆزەیەکی نەتەوەیی کردبووەوە و عێراق'یش تاکە وڵاتێکی جیهان بوو کە مۆزە نەتەوەییەکەی لە خودی نەتەوەکەی کۆنتربوو. بەگوێرەی بێڵ، دەبوو مۆزەکە زیاتر لەوەی کە شتێك بێت بۆ بەرزکردنەوەی مێژوو، ئیلهامبەخشی داهاتوو بێت. ئەو کەسانەش کە سەردانی مۆزەکەیان دەکرد، دەبوو نەك کەسانی شارەزا و زانا، بەڵکو هاوڵاتیانی ئاسایی بووایەن و بەرپرسانی مۆزەکەش نەك کەسانی زانا بەڵکو کەسانێك بن کە دیدگایەکیان هەبێت. وشە و دەستەواژە یۆنانی و لاتینیەکان بۆ ویڵسن چ واتایەکی هەبوو، بابیلۆن و ئەو گردانەی دیکە کە شارەکانیان شاردبووەوە هەمان واتایان بۆ بێڵ هەبوو. بەڵام ئاسەوارناسی کۆن بۆ لاورنس گوزارشتی لە هیچ شتێك نەدەکرد. کەسانی دیکە شتیان وەردەگرت و بێڵ دەیخولقاند و بەوئەندازەیەش کە وڵف پێشبینی کردبوو کەسێکی کاریگەر دەرچوو..."

لە حوزەیرانی ١٩٢٠ دا عەرەبەکان لە دژی ئینگلیزەکان راپەڕین. ئەو ڕاپەڕینە کە بە شۆڕشی ١٩٢٠

لە مێژووی عێراق'دا جێی خۆی گرتووە و شەش مانگی خایاند، سەری سێر ئارنۆڵد ویڵسن'ی خوارد و بەوجۆرەش ویڵسن شوێنی خۆی دا بە سێر پێرسی کۆکس'ی وەستای خۆی. سێر پێرسی کۆکس دەبوو بەو پیاوەی کە سنورەکانی عێراق، کوەیت و عەرەبستانی سعودی بە قەڵەمێکی سوور دیاری بکات. گێرتروود بێڵ لەژێر سایە و پشتیوانی سێر پێرسی کۆکس، دا مەلیك فەیسەڵی لەسەر تەختی پادشایی عێراق دانا. نایدن بەمجۆرە چیرۆکی رۆژی لە دایك بوونی عێراق دەگێڕێتەوە؛

"بێڵ لەژێر فەرمانی سێر پێرسی کۆکس کاری دەکرد کە شوێنی ویڵسن'ی گرتبووەوە... و یارمەتیدا تاوەکو راپرسیەکی جەماوەری رێکبخات بۆ ئەوەی فەیسەڵ قبوڵ بکرێت. ئەوشتەش کە کارەکەی بۆ بێڵ سەخت و ئاڵۆزتر دەکرد ئەوەبوو کە رێگایەکی رەسمی نەبوو تا دەسەڵات رادەستی عێراقیەکان بکرێت. ئینگلیزەکان هێشتا ئەو وڵاتەیان وەك بەشێك لە هیندستان بەڕێوە دەبرد. لەبەر ئەوەش بێڵ شەوان بەشێکی جۆراوجۆر لە عێراقیەکانی لەماڵی خۆی بانگهێشتی ئێوارەخوان دەکرد و بەڵێنی پێدەدان. ئەوکاتەی کە فەیسەڵ لە حوزەیرانی١٩٢١ لە مەدینە'وە هات، بێڵ و ئەوانی دیکە پشتیوانیان بۆ دابینکرد و لە هەموو شوێنێکی وڵاتدا یاوەریان کرد...

لەمەش بەدواوە ئینگلیزەکان بەشێوازێکی تازە ئەو وڵاتەیان کۆنترۆڵ دەکرد. لە شارە بەندەرییەکاندا بە مەودای چەند سەد مایلەوە لە یەکتری پیستی فڕۆکەیان دروستدەکرد و لە رێگەی ئاسمانەوە چاودێریی ئەو وڵاتەیان دەکرد. گروپێك لە فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی پادشایەتی کە بتوانێت گوندەکان و کاروانەکان بۆردومان بکات لە سوپایەك بەهێزتر و کاریگەرتر دەبوو. هەروەها تێچونەکەشی کەمتر بوو. بێڵ لە نامەیەکدا بۆ باوکی لەژێر ناونیشانی رووداوی سەرنجراکێشی هەفتەی رابردوو کە لە تەمووزی ١٩٢٤دا نوسیویەتی باسی لە نمایشێکی هێزە ئاسمانییەکانی پادشایی کردووە... زۆرکەوتمە ژێر کاریگەری. جەنگ لە رێی ئاسمانەوە بەئەندازەیەکی سەنجراکێش بێ ئامان و مەترسیدارە.

ئەگەر ئارنۆڵد ویڵسن لەوێ بوایە لەوانەیە هەمان قەناعەتی ئەوی هەبوایە. سێر ئارنۆڵد لە ١٩٤١دا لە جەنگێکدا لە ئاسمانی فەرەنسا بەهۆی بەریەك کەوتنی فڕۆکەکەی لەگەڵ فڕۆکەیەکی دیکە گیانی لە دەستدا. بێڵ ١٥ ساڵ بەر لەو مردبوو. لاورنس'یش لەنامەیەکدا بۆ باوکە خەفەتبارەکەی بێڵ نوسیبوی؛ لەوانەیە چەند ساڵیکی دیکەیش درێژە بکێشێت بەڵام دەوڵەتی عێراق بەرهەمێکی جوان دەبێت.

ئینگلیزەکان تۆوی عێراقی ئەمڕۆیان چاند و ئەوەش لەساڵی ١٩١٦-١٩٢٢دا چەکەرەی کرد و لەو سەردەمەشدا دیڤید لۆید - جۆرج لەسەر کورسی سەرۆکایەتی وەزیران لە لەندەن دادەنیشت. لۆید جۆرج لیبراڵێك بوو کە لە بینای ژمارە دەی شەقامی دۆڤنینگ دادەنیشت و ناوی بە دژبەرێکی سەرسەختی تورکیا تۆمار کراوە. ویلیام گلادستۆن وەك کەسایەتیەکی گەورەی لیبراڵەکان کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا چوارجار و

بۆ درێژترین ماوە سەرۆکایەتی وەزیرانی پادشایی بەریتانیای کردووە، بە هەمانشێوە دژی تورکیا بوو. خۆی لەخۆیدا دوورکەوتنەوەی عوسمانی لە ئینگلتەرە و نزیکبوونەوەی لە ئەڵمانیا رۆڵی زۆری هەبوو لەوەی کە گلادستۆن دژایەتی تورکیا بکات. لەوانەیە فەرمانی مەرگی ئیمپراتۆریای عوسمانیش هەر لەوکاتەوە، یەعنی لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا دەرکرابێت. لەوانەیە هۆکارێکی دیکەی دژایەتی جیل بە جیلی لیبراڵەکان بۆ تورکیا ئەوەبێت کە پێیانوابێت دێسپۆتیزمی خۆرهەڵاتی وەك دەوڵەت لەنێو تورکیای عوسمانیدا بەرجەستە بووە. رژێمی ملهوڕ لەلایەن لیبراڵەکانەوە تەحەمول نەدەکرا.

دیڤید لۆید ١٩٤٥-١٨٦٣ وەك دوایین نوێنەری لیبراڵەکان لە پۆستێکی دەسەڵاتداریدا لە"ئیمپراتۆریایەك کە تێیدا خۆر ئاوا نابێت"هەندێك تایبەتمەندی سەرنجڕاکێشی هەبوو. ئەو کەسێکی زۆر دیندار و بانگخواز بوو. هەروەها تاقە کەسێکی نیشتەجێی بینای ژمارە ١٠ی شەقامی دۆڤنینگ بوو کە زمانە زگماکییەکەی ئینگلیزی نەبوو. لۆید جۆرج خەڵکی گارلی بوو و زمانی دایکیشیی گارلی بوو. لەگەڵ مارگرێت ماکمیلان نەوە کەنەداییەکەی لوید جۆرجدا، ئەوکاتەی کە راگری کۆلێژی ئەنتۆنی زانکۆی ئۆکسفۆرد بوو ئاشنا بووم. کاتێك کە لە ١ی مایسی ٢٠١٠دا لەگەڵ ئەحمەد داود ئۆغلۆ سەردانی ئۆکسفۆردمان کرد، ئەو میوانداریی وەزیری دەرەوەی تورکیای کرد. لەسەرەتاکانی سالانی ٢٠٠٠کاندا بەهۆی کتێبێکی زۆرباش کە لەبارەی کۆتاییەکانی جەنگی جیهانی یەکەم بەناوی"پاریسی ١٩١٩"نوسیویەتی مارگرێت ماکمیلانم بەناو دەناسی. لەو کتێبەدا مارگرێت ماکمیلان باس لە ساختەبوونی عێراق و ئەو ناتەواوبوونەی دەکات کە لەکاتی پەیدابوونیەوە هەبووە؛

"ویلسن هەندێك بۆچوونی بەهێزی هەبوو سەبارەت بەوەی کە پێویستە ناوچەکە چۆن بەڕێوەببرێت. ئەو دەیگوت دەبێ خوێندنەوەیەك بکریت بۆ ئەوەی کە چۆن دەکرێت لە رووی ئیدارییەوە بەسرە و موسڵ و بەغدا وەکو یەکەیەك لەژێر چاودێرییەکی کاریگەری ئینگلیزەکاندابن و جگە لەوەش هیچ واتایەکی دیکەی بە یەکەیەکی ئیداری وەها نەدەدا. لە ساڵی ١٩١٩دا شتێك بەناوی گەلی عێراق نەبوو. واتا مێژوو و جوگرافیا خەڵکەکەی لە دەوری یەك کۆنەکردبووەوە، بەڵکو لەیەك جیای کردبوونەوە. بەسرە بەرەو هیندستان رووی لە باشوور و کەنداو دەکرد و بەغدا پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ ئێراندا هەبوو. موسڵ لەگەڵ تورکیا و سوریا پەیوەندی هەبوو. کۆکردنەوەی ئەم سێ ویلایەتەی عوسمانی لە دەوری یەك و دروستکردنی نەتەوەیەك بەگوێرەی پێوەرە ئەوروپییەکان، شتێکی وەك دروستکردنی وڵاتێك لە موسڵمانەکانی بۆسنا و ئەلبانی و سربەکان بوو. وەك ئەوەی لە باڵکانەکان روویدا، پێکدادانی ئیمپراتۆریا و شارستانییەکان کێشە و کەلێنی زۆری دروستکردبوو.

زیاتر لە نیوەی دانیشتوانەکەی موسڵمانی شیعە بوون و چارەکێکی ئەوانەش سونە بوون. جگە لەوانەش

کەمینەکانی یەهودی و مەسیحی هەبوون، بەڵام بەدەر لە دابەشبوونە دینییەکان دابەشبوونی دیکەش لە ئارادا هەبوو. نیوەی ئەوانەی لەوێ دەژیان عەرەب بوون و ئەوانەی کە دەمانەوە و بە زۆری لە ویلایەتی موسڵ بوون، لە کورد و فارس و ئاشورییەکان پێك دەهاتن. شارەکان بەشێوەیەکی رواڵەتی و رووکەشی گەشەیان کردبوو بەڵام زۆر تێکەڵ و پێکەڵ بوون و هێشتا سیمای لادێیان پێوە دیاربوو. خێڵ و سەرکردەی خێڵەکان کە هێشتا پەیوەندی خوێنیی لەنێوانیاندا باوبوو لەگەڵ سەرکردە دینییەکاندا حوکمیان دەکرد و شتێك بەناوی نەتەوەگەرایی عێراق نەبوو بەڵکو تەنها نەتەوەگەرایی عەرەب هەبوو.”(Margret MacMillan,
(p۳۹۷,۳۹۸ ۲۰۰۲ , Six Month That Changed the World, Random House, London

ئەو رووداوانەی کە تا ئەندازەیەك هەموو تەمەنی جیلی منی خستبووە ژێر کاریگەری خۆی و کەس نازانێت کە لەوانەیە کاریگەری لەسەر چەند جیلی دیکەش دابنێن، لە چەند ساڵی دوای جەنگی جیهانی یەکەمدا روویاندابوو. یەکێك لەو کتێبانەی کە ئەم بەشە سەیر و سەمەرەیەی مێژوو بەباشی باس دەکات، کتێبێکی دەیڤد فرۆمکین بەناوی ”ئەو ئاشتیەی کە کۆتایی بە ئاشتی هێنا - رووخانی ئیمپراتۆریای عوسمانی و دروستکردنی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی نوێ”یە. لەدوایین ساتەکانی جەنگی سارد'دا کتێبەکەی فرۆمکین'م لە کتێبخانەیەکدا لە نیۆیۆرك بینی و کڕیم. ماوەیەکی کورت دوای ئەوەش لە کتێبخانەیەکی لەندەن ئەو کتێبەم بینیەوە. لەبیرم چووبوو کە پێشتر کڕیومە، بۆیە جارێکی دیکەش کڕیم. یەکێکیانم برد بۆ تورگوت ئۆزال. پێموابوو پێویستە ئەویش بخوێنێتەوە. هەرکە چوومە ژوورەکەی، تورگوت بەگ کتێبەکەی دەستمی بینی و وتی ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە؟ لای منیش هەیە، بەشێکی زۆریم خوێندۆتەوە. لەگەڵ تورگوت ئۆزال رێککەوتبوین ئەو کتێبەی بۆ خۆمی دەکڕم بۆ ئەویشی بکڕم. ئەو داواکارییەی ئەوم جێبەجێ دەکرد بەڵام دڵنیا نەدەبوومەوە لەوەی کە ئەو کتێبانەی من بۆ ئەوی دەکڕم دەیانخوێنێتەوە یان نا. کتێبی ”ئەو ئاشتیەی کۆتایی بە ئاشتی هێنا”نیگەرانیەکانی منی لەوبارەیەوە رەواندەوە. هەر کتێبێك کە سەبارەت بە قۆناغەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم بخوێننەوە و ئەگەر کار لەسەر ئەوە بکەن کە بزانن عێراق چۆن پەیدا بووە، بۆتان دەردەکەوێت کە لە دایك بوونی عێراق لەسەر دەستی چەند کەسێکی ئینگلیز بووە؛

”عێراق بەرهەمێکی دەستی ئینگلیزەکان بوو. بەشێکی زۆری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'ی ئەمڕۆش بەرهەمی دەستی ئینگلیز بووە. بەڵام چارەنوسی هیچ یەك لە وڵاتەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە ئەندازەی عێراق بە دەست ژمارەیەك ئینگلیزی ماجەراپەرست و لێهاتووەوە دیاری نەکراوە.”

karl E.Meyer and Shareen Blair Brysac, Kingmakers, The Invention of the Midlle East,)
(۱۷۳. page

لەنێوان کەسانی وەکو سێر ئارنۆڵد ویڵسن و گێرتروود بێڵ و لاورنس و سێر مارك سایکس و هەروەها

بەرپرسانی حکومەتی لەندەن لە ئینگلتەرە لەسەروو هەمووشیانەوە وینستن چەرچڵ، ناکۆکی هەبووە لەسەر ئەوەی کە چۆن ئەو سێ ویلایەتەی عوسمانی لەژێر ناوی عێراق'دا کۆبکرێنەوە و لەبارەی چۆنییەتی بەڕێوەبردنی عێراق'یش بیروبۆچونەکانیان لێك جیاواز بووە. بەڵام ڕۆڵی گرنگیان لە دروستکردنی عێراق'دا گێڕاوە. هەڵبەت دەبێ فەرامۆش نەکرێت کە بەدەر لەوانیش یاریکەرێکی دیکە هەبووە کە ئەویش سێر پێرسی کۆکس'ە (١٨٦٤-١٩٣٧) و بە ئەندازەی ئەوان ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی لەو بابەتەدا گێڕاوە.

"دوای ڕاپەڕینەکەی ١٩٢٠ لە میزۆپۆتامیا، ئارنۆڵد ویڵسن لەسەرکار لابراو لەجێی ئەو سێر پێرسی کۆکس دانرا. ناوی ئەویش وەکو کەسێك کە سنورەکانی ئەمڕۆی عێراق'ی دیاریکرد لە مێژوودا تۆمار کرا. هەڵبەت نەك تەنها سنورەکانی عێراق، بەڵکو سنورەکانی بەشێکی گرنگی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'ی دیاریکرد. لە ساڵی ١٩٢٢دا لە ئۆقایەر لە خۆرهەڵاتی عەرەبستانی سعودی کۆنفرانسێکی ٥ ڕۆژە بەسترابوو. سێر پێرسی، ئیبنی سعود پادشای داهاتووی عەرەبستانی رازی کرد کە دان بە عێراق'دا بنێت و بە ڕەسمی بیناسێت. ئەو بەشێوەیەکی گشتی گوێی لە ئامۆژگارییەکانی گێرترووود بێڵ دەگرت و دواتر سنورەکانی عێراق و کوەیت و نەجدی لێك جیاکردەوە. دواتر نەجد بە عەرەبستانی سعودی ناسرا. بەگوێرەی بیرەوەریەکانی هارۆڵد دیکسن پاشکۆی سەربازی ئینگلیزەکان لە کوەیت، سەرەڕای ئەوەی کە ئیبنی سعود توانیبووی هەموو رکابەرەکانی خۆی لە نەجد شکست بدات، پێرسی کۆکس وەکو منداڵ ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرد. کۆکس بە تەنها بڕیاری لەبارەی سنورەکان دەدا و قەڵەم و نەخشەیەکی بە دەستەوە گرت و سنورەکانی عێراق و نەجدی دەستنیشانکرد."(Kingmakers, P.١٨٨,١٨٩)

دیپلۆماتێکی ئەمریکی'ش بەناوی دەیڤید کۆرن بە وردەکارییەکی زیاترەوە باس لە شێوازی نەخشەکێشانی سێر پێرسی کۆکس دەکات؛

"سێر پێرسی کۆکس کە لەگەڵ ئارنۆڵد ویڵسن'ی شاگردی خۆیدا زیاتر لە هەموو کەسێك لە دروستکردنی دەوڵەتی عێراق بەرپرسیارن، کاریکی کرد تا کوردەکان ببنە بەشێك لە عێراق و خۆیشی لە ساڵی ١٩٢٣دا عێراق'ی بەجێهێشت. بەر لەوەی کە بڕوات، لە باشوورەوە بەشە خاکێکی زۆر گەورەی لەو ناوچەیەی کە دەبوو بە خاکەکانی عەرەبستانی سعودی جیاکردەوە و پێشکەشی عێراقی کرد و بەوجۆرەش دوایین فڵچەی بەسەر هەموو نەخشەکانیدا هێنا. یەکێك لە ئەندامانی وەفدەکەی دواتر باسی ئەوەی کردبوو کە سێر پێرسی قەڵەمێکی سووری لە گیرفانی دەرهێنا و لە لێوارەکانی سنوری عەرەبستان لە کەنداوەوە هەتا جەبەل عەنایزەن لە نزیك سنوری ئوردن، بە وریاییەوە خەتێکی سنووریی کێشا. ئیبنی سعود پادشای داهاتووی عەرەبستان ئەوندە گریابوو کە هەنسکی دەدا و دەیناڵاند و دەیگوت نیوەی پادشایەتیەکەی منت لە دەستم وەرگرت و کۆکس'یش لە ڕێگەی پێدانی دوو لەسەر سێی خاکی کوەیت بە سعودیە هەوڵی

دڵدانەوەی ئیبنی سعودی دا." (David Korn, The Men Who Put The Kurds Into Iraq: Percy Cox and Arnold Wilson, KNC publications, ١٩٩٣, p.٣٥)

بەشی باشووری سنورەکانی عێراق کە بە قەڵەمە سوورەکەی سێر پێرسی کۆکس کێشرا، دواتر بوو بە هۆکاری ئاڵۆزی و ناکۆکییەکانی نێوان کوەیت و عێراق. یەکەم قەیرانی نێوان کوەیت و عێراق لە ساڵی ١٩٦١دا دوای راگەیاندنی سەربەخۆیی کوەیت دەرکـەوت. عەبدولکەریم قاسم سەرۆکی دەوڵەتی عێراق کوەیت'ی وەك بەشێك لە بەسرە راگەیاند. لە راستیشدا لەسەردەمی عوسمانییەکان'دا کوەیت موتەسەڕیفلکێکی سەر بە ویلایەتی بەسرە بوو. ئەو بڕیارەی عەبدولکەریم قاسم لە ماوەیەکی کورتدا قەیرانێکی نێودەوڵەتی لێکەوتەوە. داگیرکردنی کوەیت'یش لەلایەن سەدام لە ساڵی ١٩٩٠دا جەنگێکی نێودەوڵەتی لێکەوتەوە. سنوری درێژی خۆرئاوای عێراق لەگەڵ سوریا'ش بە هەمانشێوەی سنورەکانی باشوور کێشران. رێککەوتننامەی نهێنی سایکس - پیکۆت کە لە ساڵی ١٩١٦دا وەك چرووتژەیەکی نهێنی هێزە خۆرئاواییەکان بۆ دابەشکردنی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە مێژوودا تۆمارکراوە، ناڕوونییەکی تێدا بوو سەبارەت بەوەی کە ویلایەتی موسڵ بۆ فەرەنسا جێبهێڵرێت، بەڵام کاتێك کە کۆنفرانسی ئاشتی لە ساڵی ١٩١٩دا لە پاریس کرا ئەو ناڕوونییە چارەسەرکراو بەوجۆرەش دیاریکردنی سنوری عێراق - سوریا ئاسانتر بوو.

"بەگوێرەی سایکس - پیکۆت موسڵ بە فەرەنسا درابوو، بەڵام ئینگلیزەکان لە پاریس ئەوێیان لەو وڵاتە وەرگرت. ئەو گفتوگۆیانەی کە سەبارەت بە کێشەکانی ئەورووپا دەستیانپێکرد هاتنە سەر پرسی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست. کلیمینسو پرسیاری کرد کەئینگلتەرە چ کاردانەوەیەکی لە بەرامبەر داواکارییەکانی فەرەنسا دەبێت؟، لۆید جۆرج'یش وەڵامی دایەوە و وتی؛ موسڵ.، کلیمینسو لە وەڵامدا وتی؛ وەریدەگرن..." (Margret MacMillan, Six Month That Changed the World, Random House, London, ٢٠٠٢ p.٣٨٢)

دوای ئەوەی کە هێزەکانی فەرەنسا شام'یان گرت و بەرەو خۆرهەڵات پێشڕەوییان کرد و هەتا ئەبوکەمال لەسەرووی رووباری فرات هاتن. ئینگلیزەکانیش لە بەغدا بەرەو خۆرئاوا رۆیشتن و گەیشتنە فرات و لە بەرامبەر خۆیاندا فەرەنسیەکان'یان بینی. ئینگلیزەکان لە ئەبوکەمال'ەوە نەیەنتوانی بەرەو خۆرئاوا و فەرەنسیەکان'یش لەوێوە نەیانتوانی بەرەو خۆرهەڵات پێشڕەوی بکەن. ئەبوکەمال لە قۆناغێکی سەردەمی عوسمانی'دا بەشێك بوو لە ویلایەتی ئورفا و لەدوایین قۆناغیدا بەشێکی موتەسەڕیفلیکی دێرەزوور بوو.

موتەسەڕیفلیکی دێرەزووری عوسمانی کە ویلایەتی موسڵی عوسمانی جیا دەکردەوە، بەشێوەیەکی سروشتی دەبوو بە سنوری عێراق و سوریا. هێڵی سنورە باکوورییەکانی عێراق لەگەڵ تورکیا'ش لەوکاتەدا دەستنیشان نەکرابوو. کاتێ کە عێراق وەکو دەوڵەتێك پەیدا بوو، کێشەی موسڵ بەهۆی دەستنیشان

نەکردنی سنورە باکوورییەکانی لەگەڵ تورکیا دروستبوو. بەهۆی دەرکەوتنی کێشەی موسڵ، ئەو ئەتنیتەیەی کە عێراقی پێ دەگوترا، هەر لەکاتی لە دایك بوونی خۆیەوە کێشەی هەبوو. دواجار ویلایەتی موسڵ بە عێراق درا، بەڵام وەك چۆن لەسەردەمی ئاشوورییەکان'یشدا هیچ کاتێك رووی لە باشوور نەکردبوو، هیچ کاتێك رووی لە بەغدا نەکرد و بە بەردەوامی رووی لە باکوور و خۆرئاوا بوو.

حەلەب و دیاربەکر و موسڵ کە بۆ ماوەی سەدان ساڵ سێگۆشەیەکی بازرگانی و ئابوریان دروستکردبوو لێکترازان و موسڵ بە هەموو سنورەکانی خۆیەوە لە دەرەوەی تورکیا مایەوە و پەیوەندییە نەریتیە بازرگانی و ئابورییەکانی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا پچرا. بەهۆی پێکەوەلکانی موسڵ بەو وڵاتەوە، عێراق لە دایکبوو. بەڵام ئەوە لە دایکبوونێکی سەقەت بوو. بەوجۆرەش عێراق بوو بە دەوڵەتێکی ناتەواوی زگماکی. ناتەواویی زگماکی عێراق'یش بووە هۆی ئەوەی کە کێشەی هاوچەرخی کورد پەیدا بێت.

**ژ هەڤ جودا دکە دو دنیایان**
**ئالییەک قۆر ب قۆر، عاسێ**
**چیائێن کوردستانێ**
**ئالی دن فرە ئو بێ داوی**
**دەشتا میزۆپۆتامیایێ**

**کەمال بورکای (ل هەولێرێ دەما رۆژ دچە ئاڤان)**

بە نێچیرڤان بارزانی'م گوت؛"بۆ یەکەمجار ناوچەرگەی کوردستان'م بینی. ساڵانێکە هاتوچۆی ئەم خاکانە دەکەم و چەندینجار بە زۆرێك لە شوێنەکانیدا تێپەڕبووم، زۆر جێگایشی گەڕاوم، بەڵام دوێنێ تێگەیشتم کە کوردستانی قووڵ، یش هەیە. بە روونی تێگەیشتم لەوەی کە ئەم خاکە بە تۆپۆگرافیای خۆی و بەو مرۆڤانەی کە لەسەری دەژین، پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە بەشەکانی دیکەی عێراق'ەوە نییە. کاتێ ناوچەرگەی کوردستان'م بینی و تێیدا گەڕام، درکم بەوە کرد کە ئێوە تەنها لەبەر هەڵومەرجی واقع لەگەڵ عێراق ماونەتەوە و ناتوانن لەسەر پێچەوانەکەی ئەمە قەناعەت بە من بکەن."

بارزانی بەسەرسووڕمانەوە سەیری دەکردم. منیش درێژەم پێدا و وتم؛"سەردانی بارزان'م کرد. بڕواناکەن بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە چەندینجار هاتوچۆی ئێرەم کردووە، قەد سەردانی ئەوێم نەکردبوو. لەبەر ئەوەی سەردانیشم نەکردبوو، لەلام وەك گرێیەکی لێهاتبوو. دیارە سەردانی مەزاری باپیر و باوکی تۆشم کرد. مەراسیمێکیان سازکرد و منیش لە دەفتەرەکەدا هەندێ شتم نووسی. کامێرای کوردستان تی ڤی'ش هاتبوو، وتارێکی کورتیشم پێشکەش کرد."

پێکەنی. لەسەردانەکەی من ئاگاداربوو. خۆی لە راستیدا ئەوەی کە پێی بخستایەتە بارزان و سەردانی ئەوێی بکردایە، لە دەستی بنەماڵەی بارزانی دەرنەدەچوو.

درێژەم پێدا و وتم؛"قەد تەسەوری ئەوەم نەدەکرد بارزان ناوچەیەکی ئەوەندە جوان و دڵڕفێن بێت. هەموو ئەو جوغرافیایە پڕ شان و شکۆیە. لە زاپ تێپەڕبووم و لە رێی سپیلك و زێبار'ەوە چوومە بارزان. بۆ گەڕانەوە بۆ هەولێر، لە رێی خۆرهەڵات'ەوە هاتینەوە. لە مێرگەسوور'ەوە چووینە رەواندوز و بە بەری خۆرهەڵات'ەوە کەوانەیەکی پانمان کێشا. لە سایەی ئەمەش دەرفەتی ئەوەم پەیدا کرد تا دیانا (سۆران) و چیاکانی هەندرێن و حەسەن عەلی بەگ و تۆپۆگرافیای حاجی ئۆمەران لە رەواندوز و رانیە و خۆرهەڵاتی قەندیل بە چاوی خۆم ببینم. کاتێ لەو شوێنانە دەگەڕام، بۆ ساتێك فەرامۆشم کرد کە لە عێراق'دام. لە راستیشدا ئەو شوێنانەی کە تێیدا دەگەڕام کوردستان بوو... کاتێ لە هەولێر'ەوە لە رێگای چیای هەیبەت سوڵتان و دوکان دەچیتە سلێمانی، یان لە کۆیە و دهۆك و تەنانەت لە زاخۆ بەو ئەندازەیە لە کوردستان

تێناگەیت. ئەو شوێنانەی کە من بینم، واز لە هەولێر بێنە، هیچ خاڵێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەو بەشەی عێراق نییە کە لە باشووری کەرکوك دایە. لە رووی جوگرافیا و رەفتاری مرۆڤەکانیشەوە هیچ شتێکیان لە یەك ناچێ. کەس ناتوانێ بە ئاسانی قەناعەت بە من بکات کە ئەو شوێنانەی ئەمڕۆ بینیومن خاکی عێراق'ە. ئەمڕۆ درکم بەوە کرد کە خاڵی هاوبەش لەنێوان عێراق و ناوجەرگەی کوردستان کە ئەمڕۆ بینم، زۆر کەمە، بەڵام لەگەڵ هەککاری خاڵی هاوبەشیان زۆرە. لە روانگەیەشەوە جوگرافیایەکی ئاشنا بوو بۆ من.″

نێچیرڤان بە نیشانەی پەسندکردنی پێناسەکەی من لە وڵاتەکەی، سەری لەقاند و بە کەیفەوە گوێی لێگرتم. دواتر وتی؛″با بیرەوەرییەکت بۆ بێگرمەوە.″و دەستی بە قسە کرد.″رۆژێك لەگەڵ ئەمرە تانەر راوێژکاری پێشووی میت'بە رستەی ئێمە قەد سەربەخۆییمان ناوێت، دەستم بە قسەکرد. ئەمرە بەگ وتی؛ سەیری من بکە نێچیرڤان، ئەگەر جارێکی دیکە ئەم رستەیە بهێنیتە سەرزمان، متمانەم پێت نامێنێ و ناتوانین پێکەوە کار بکەین. من باپیرە و باوکی تۆش بە باشی دەناسم. جارێکی دیکە ئەو قسەیە مەکە!″

لەنێو ئەو کۆمەڵە کۆشکەی کە مەسعود بارزانی لەسەری رەش دروستی کردوون، لەو بەشەی کە بۆ نێچیرڤان بارزانی تەرخانکرابوو، لە مێزێکی نانخواردنی بەیانیان کە ناوبانگێکی زۆری هەیە پێکەوە قسەمان دەکرد. ئەو تەنها برازی مەسعود بارزانی نەبوو، بەڵکو زاوایشی بوو. لەسەر ئەوەی کە دوای مەسعود بارزانی کێ دەبێتە کەسی یەکەمی کوردستان، ململانێ و کێشمەکێشێکی رانەگەیەنراو لە بەینی ئەو و مەسرور بارزانی ئامۆزای دا هەیە کە وەك نهێنییەکی ئاشکرا سەیر دەکرێت. بەڵام شتێکی ئاشکرا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر کوردستان وەك پێکهاتەیەك دەرکەوتووە کە مافی سەبەرخۆیی لە عێراق هەیە و توانیویەتی لەسەر پێی خۆی بوەستێت، نێچیرڤان بارزانی رۆڵێکی گەورەی تێیدا هەبووە و توانا و لێهاتووییەکەی لەو بوارەدا شتێکی شاراوە نییە.

نێچیرڤان بارزانی بە کردەوە لەدوای مامی خۆی کەسی دووەمی کوردستانی عێراق'ە و بە ئەگەری زۆر شوێنیشی دەگرێتەوە. حەزی لەوەیە کە هەموو شتەکان باشترین بن و بەرزترین کوالیتییان هەبێت، ئەمەش وایکردووە کە دیزاینی ئەو شوێنەی تێیدا دەبێت زۆر باش بێت. ئەگەر لە کوردستانی عێراق و لەسەری رەش نەبین و سەیری دیکۆر و کوالیتی ژووری کارەکەی بکەی، وادەزانی لە واشنتن لە کۆشکی سپی دانیشتووی.

رۆژی ٧ی مایسی ٢٠١١یە و لەسەری رەش لە مەسیف کە نیو کاتژمێر لە باکووری هەولێر'ەوەیە دانیشتووین. هەرچەندە ئەربیل ناوەندی سیاسی کوردستانی عێراق'ە، بەڵام سەرۆك مەسعود بارزانی، زۆر بە کەمیی لەوێ دەمێنێتەوە کە کوردەکان بە هەولێر ناوی دەبەن. ئەو هەر لە مەسیف- سەری رەش بووە و لەوێش ناجووڵێت.

سەلاحەدین، بەو ناوەی کە لە نەخشە مودێرنەکان و لەسەر تابلۆکانی رێگاوبان دا هەیەتی، یان بەو

ناوەی کە خەڵك پێی دەڵێن؛ مەسیف، لە روانگەیەکەوە شوێنی دەستپێکردنی کوردستانی قووڵە، چونکە چیاکانی کوردستان لەوێوە دەستپێدەکەن.

ئەو دەشتە پان و پێکۆتاییانەی کە لە کەرکوك دەستپێدەکەن و لە باکوورەوە بە ماوەی یەك کاتژمێر دەگەن بە هەولێر و بەرەو باکووری ئەم شارە پان و تەختەدا درێژ دەبنەوە. لە نیوەی رێگای هەولێر - مەسیف کتوپڕ لەسەر گردێکی بچووك، هۆتێلێك بەناوی خانزاد وەك هەڵۆیەك کە دووباڵی کردبێتەوە دەردەکەوێت و لەوێشەوە دەتوانیت سەیری هەولێر و مەسیف بکەیت. لەدوای خانزاد، رێگا باریك دەبێتەوە و لە لۆفە و پێچە توندەکاندا وەك مار سەردەکەوێت. کۆتایی ئەو رێگایەش کە پێیدا سەردەکەویت، مەسیف یان بە ناوەکەیتری سەلاحەدین'ە.

ڤیلای دەستە بژێری کوردستانی نوێ لەسەرووی هەمووشیانەوە بەڕێوەبەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان و بینای مەکتەب سیاسی لەوێیە و بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە لە بەغدا و ناوەڕاست و خۆرئاوا و باشوور و خۆرهەڵاتی عێراق لافاوی خوێن جەستەی مرۆڤ دەبرد و لە هەموو خزمەتگوزارییەکان بێبەش بوون، ئاسانکاری بۆ دەستکەوتنی ئینتەرنێت و کارەبای بەردەوام لەگەڵ خوان و سفرەی جوانمێرانە، میوانخانە (داروزیافە)ی مەسیف لە چاوی میوانە بیانییەکاندا وەك دنیایەکی خەیاڵ و دیمەنێکی سوورڕیالیستانەی عێراق دەهاتە پێش چاو. کاتێ لەوێوە بەرەو خۆرهەڵات، رووەو موسڵ و هەروەها رووەو هەولێر و کەرکوك و بەرەو دەشتە فراوانەکانی باشوور سەیر دەکەیت، وەك ئەوە وایە کە لە منارەی مزگەوتێکەوە سەیری حەوشەکەی بکەیت.

لەدوای مەسیف، پاش چەند کیلۆمەترێك رۆیشتن بە شانی راست دا دەگەیتە سەری رەش. جگە لە رۆژانی پشوو کە دەچێتەوە بۆ بارزان بۆ شوێنی باوباپیرانی مەسعود بارزانی، پشت دەکاتە چیای سەفین کە یەکێك لە بەرزترین چیاکانی کوردستان و هەموو کاتێکی خۆی لەسەری رەش بەسەر دەبات کە ۲۰ کیلۆمەتر لە هەولێر دوورە و بەسەر ئەو شارەدا زاڵە.

سەفین بە هەموو شان و شکۆیەکی خۆیەوە سەرەتا لە مەسیف دیاردەبێت و دوای ئەویش هەم بە رووی باکوور و تورکیا و هەم بە بەرەو خۆرئاوا - خۆرهەڵات و ئێران ریز بە ریز چیا هەیە. لەو روانگەیەوە ئەگەر کوردەکان وەك مرۆڤەکانی شاخ ناوزەد بکرێن، هەڵە نابێت ئەگەر وابیربکەینەوە کە کوردستانی قووڵ، لە مەسیف'ەوە دەستپێدەکات.

چیای حەمرین کە دەکەوێتە باشووری ئەم ناوچەیە، وەك درێژکراوەی زاگرۆسەکان'ە کە هەرچی دەچێ نزمتر دەبێتەوە و زیاتر لەوەی وەك ریزە چیاکانی سنوری ئێران - عێراق هەتا دەورووبەری موسڵ و ئەلجزیرە بێت کە بەرەو باشووری خۆرهەڵات و باکووری خۆرئاوا درێژدەبنەوە، لە شتێکی هەڵتۆقیو لەنێو دەشتایی

دەچێت کە رووتە و زۆریش بەرز نییە. لە رووی جوگرافی وە چیای حەمرین بە سنوورە باشوورییەکەی کوردستان لە قەڵەم دەدرێت.

چەندینجار شایەتی ئەوە بووم کە ساڵانی دوای جەنگ لە عێراق، نەك هەر لە رووی جوگرافی بەڵکو لە رووی دەروونیشەوە ساڵانێکی قەیراناوی بوون. کاتێ لە بەغدا بەرەو تورکیا بە رێ دەکەویت، لەگەڵ تێپەڕبوون لە قەزای خاڵس کە شیعە و سوننە پێکەوە لەوێ دەژین و بە لای بەعقووبە'دا گوزەر دەکەیت کە رۆژانە هەواڵی کوژرانی دەیان کەس لەوێوە دەگەیشت. پاش کاتژمێر و نیوێك رێگا، ئەو دەشتە کۆتایی دێت کە بە شانی راستیدا روودەکاتە دەشتاییەکی وشك و بێ درەخت و دارستانەکانی خورما لای چەپی دەڕازێننەوە و لە باشوور'ەوە هەتا کەنداو و لە خۆرئاوا'شەوە تا شام درێژ دەبێتەوە. لە رێگایەکدا کە تۆزێك بەرزترە سەردەکەویت. کاتێ سەیری دواوەت کرد و دەشتاییت نەبینی، بزانە گەیشتوویتە چیای حەمرین. لە تازە و داقووق تێپەڕ دەبیت و دەگەیتە کەرکوك. مەسافەی نێوان خالس و چیای حەمرین و سەرەتای ئەو شوێنەی کە سەردەکەوێت لەو رێگایەدا زۆر مەترسیدار بوون. بەڵام کاتێك بۆ ماوەی ١٥-٢٠ خولەك چیای حەمرین تێپەڕ دەکەیت، هەستێکی سەیری وەك ئەوەی کە"ئیدی گەیشتینەماڵەوە"لای مرۆڤ پەیدا دەبێت. هەستی پارێزراوبوون و گەیشتن بە خاکی دۆستان دەروونی مرۆڤ دەگرێتەوە. ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە لە چیای حەمرین تا کەرکوك نزیکەی یەك کاتژمێر و هەتا هەولێر و سلێمانیش هیچ نەبێت دوو کاتژمێری دەخایاند. قەینا! هەرچی بێت هەستی گەیشتن بە ماڵ، ئەویش لەو کاتانەدا کە هەموو دنیا بە ترسەوە سەیری قۆناغێکی خوێناوی و بێ یاسای عێراق'ی دەکرد، هەستێکی باش بوو. چیای حەمرین بێ ئەملاوئەولا سنووری باشووری کوردستان - کوردستان هەر کوێ دەبێت با ببێت- بوو. کوردستان کوێ بوو؟

رائیدێکی ئینگلیز بەناوی میلینگن لە ساڵی ١٨٧٠دا ئەمەی نوسیوە؛"کوردستان ئەو بەشە بوو کە لە باکووری تورکیا'ی ئاسیا هەتا باشوور کە لەلایەکەوە چیای ئاگری و سنورەکانی گورجستان'ی دەگرتەوە و هەتا دەوروبەری بەغدا'ی لە خۆ دەگرت و لەلایەکی دیکەشەوە لە سنوورەکانی خۆیدا لە خۆرهەڵاتەوە هەتا خۆرئاوا ناوچەیەکی لە سنوورەکانی ئێران هەتا ئاسیای بچووك و لازستان لە خۆ دەگرت. ئەم سنوورانە بەتەواوی یەکلا نەکراونەتەوە و هۆکارەکەیشی زۆر سادەیە، چوونکە لە حوکمڕانیی تورکەکان'دا لە دابەشکردنی خاکدا هیچ شتێك بەردەوام و رەها نییە. هەموو ویلایەت و شارە ناوەندییەکان و سنوورەکانیان وابەستەی ئەوانن و ئەوانەش بەهۆی ئاڵۆزی ئیدارییەوە بەردەوام گۆڕانکارییان بەسەردا دێت. هەندێك جار ویلایەتێك ویلاتێکی دیکە لە خۆ دەگرێت و سنوورەکانیان تێکەڵ دەبێت. لەو نێوەندەشدا جاربەجار تورکیا ئەو بەشە گەورانە دەگرێت کە لە سنووری ئێران'دان یان فارسەکان ئەو شوێنانە دەگرنەوە کە دەڵێن هەقیان بەسەریانەوە هەیە. هیچ کات چارەسەرێکی کۆتایی بۆ ئەم سنوورانە ناکرێت."

ئەو سووچەی باشووری سنووری کوردستان کە رائد میلینگن بەشێوەیەکی گشتی باسی کردووە و بە"دەورووبەری بەغدا"ناوی بردووە، هەمان چیای حەمرینە و سەرەڕای هەموو ئاڵۆزییەکی ئیداری کە ئەو باسیکردووە، ئەو ناوچەیە سنووری باشووری ویلایەتی موسڵی عوسمانلی بووە. ئەو ناوچەیەی کە ئەمڕۆ کوردەکان وەك کوردستانی عێراق ناوی دەبەن، لە باشوورەوە هەتا باکوور یان لە باکوورەوە تا باشوور ناوچەیەك لە چیای حەمرین تا سنووری تورکیا - عێراق لەخۆ دەگرێت. جگە لەوە کوردستانی ئێران'یش هەیە. C.J.Edmonds کە لە ساڵی ۱۹۱۵وە تا کۆتایی بەڕێوەبردنی ماندای بەریتانیا لە عێراق بەرپرسی کاروباری سیاسیی هێزە سەرەبازییەکانی بەریتانیا لە خۆرئاوای ئێران و میزۆپۆتامیا بووە، بەمجۆرە باسی سنوورەکانی ئەو کوردستانە دەکات؛

"سەرەڕای سیاسەتە ناوەندگەراکانی حکومەتەکانی تورك و ئێران، میرنشینە نیمچە ئۆتۆنۆمەکانی کورد، لە تورکیا بۆتان، هەککاری، بادینان، سۆران و بابان، لە ئێران'یش موکری و ئەردەڵان هەتا سەدەیەك بەر لە ئێستاش درێژەیان کێشا. ئەوانەی کە لە تورکیا بوون لەنێوان ساڵانی ۱۸۳۷-۱۸۵۲دا یان سەرکوتکران یان راستەوخۆ خرانە ژێر کۆنترۆڵی عوسمانی. موکری و ئەردەڵان'یش هەر لە هەمان قۆناغدا تایبەتمەندییەکانی خۆیان لە دەستدا. لە ئێران ناوی کوردستان نەك بۆ هەموو ناوچە کوردنشینەکان بەڵکو تەنها بۆ ئەو پارێزگایە بەکار هات کە سنووری میرنشینی ئەردەڵان بوو."

C.J.Edmonds, Kurds, Turks and Arabs- Politics, Travel and Reaserch in Northern Iraq)
(۱۹۵۷ ,Oxford University Press ,۹-۸.p,۱۹۲۵-۱۹۱۹

ئەو شوێنەی کە لە کوردستانی عێراق'ی ئەمڕۆدا وەك"کوردستانی قووڵ"ناوم بردووە، ناوچەیەکە کە لە سەلاحەدین دەستپێدەکات لە باکوورەوە هەتا تورکیا و لە خۆرهەڵات'یشەوە هەتا ئێران ناوچەیەکی جوان و سەرنجڕاکێش لە خۆ دەگرێت.

دەکرێ سەلاحەدین یان مەسیف وەك هارتلاندی کورد ناوزەد بکرێت. دەشتەکان لەوێ کۆتاییان پێدێت و شاخەکان دەستپێدەکەن کە لە هەر واتایەکدا هەموو جۆرە تایبەتمەندییەکیان بە کوردستان بەخشیوە. کاتی چوویتە ئەودیو مەسیف، ئیدی چاوت بە هەولێر و دەشتی هەولێر ناکەوێت. دوای چوونە ناو دەروازەی ئەو جوگرافیایەش، زۆری پێناچێت کە دەگەیتە شەقڵاوە و رێگای بە ناوبانگی هامیلتۆن. رێگای هامیلتۆن رێگایەکی سەرەکییە کە لە جوگرافیایەکی سەخت و نالەباردا، لەسەر هێڵی خۆرهەڵات - خۆرئاوای کوردستان'ی عێراق دروستکراوە و هەتا سنورەکانی ئێران دەگات. ئەو رێگایە لە ئەنجامی تێکۆشانێکی سەیری ئەندازیارێکی نیوزلاندی بەناوی A.M.Hamilton لەنێوان ساڵانی ۱۹۲۸-۱۹۳۲دا کۆتاییپێهاتووە.

هامیلتۆن لە کتێبی Road Through Kurdistan – Travels in Northern Iraqدا کە بۆ یەکەمجار

لە ساڵی ١٩٣٧دا چاپکراوە نەك تەنها باسی بەسەرهاتەکانی خۆی دەکات، بەڵکو بەڵگەیەکی پڕبەهای سەبارەت بە جوگرافیا، پێکهاتەی خێڵ و پەیوەندییە مرۆییەکانی ناوچەکە دروستکردووە.

بەبێ دەربازبوون لە رێگای هامیلتۆن ناتوانرێت بە هارتلاندی کوردستان'دا گوزەر بکرێت. لە شەقڵاوا'وە لە بەینی دوو زنجیرە چیای هاوتەریبەوە دەربازی دەشتی حەریر دەبیت و بەرەو سپیلك سەردەکەویت. لەنێو باشوور - باکوور یان خۆرئاوا - خۆرهەڵاتی جوگرافیای کوردستان'دا بەرزایی و لێژی زۆر هەیە.

ئەو رێگایەی کە لە سپیلك بەرەو خۆرهەڵات دەچێت، دەگاتە رەواندوز کە یەکێك کە جوانترین دۆڵەکانی جیهانی تێدایە. من دەمویست سەردانی بارزان بکەم، بۆ ئەوەش پێویستبوو لەدوای سپیلك لە رێگای هامیلتۆن دەرکەوین. بۆ گەیشتن بە بارزان، دەبێ لەنێو زنجیرە چیا هاوتەریبەکانەوە، رێگایەکی پڕ لە هەیەجان بپێوی و لە زاپی گەورە بپەڕیتەوە. لە نزیك ئاکرێ لە بێخمە'وە و دەچیتە ناوچەی نیشتەجێبوونی خێڵی سوورچی و دوای ئەوەش لە زێبار'ەوە بەرەو بارزان دەڕۆی. ئەو جوگرافیایەی کە جێی دەهێڵن یان ئەوەی کە لە رووبەڕووتان دایە، بەئەندازەیەک جوان و سەرنجڕاکێشن کە دەتوانن جوانی گرد و دۆڵە بەناوبانگەکانی سویسرا و نەمسا بێ واتا بکەن. مەسعود تەك سکرتێری پارتی سوسیالیستی کوردستانی تورکیا کە لە دوورخراوەییدا لە هەولێر دەژی، رۆژێك بەر لەوەی سەردانی بارزان بکەم ئاگاداری سەفەرەکەم بوو. بۆیە بە وردی رێگاکەی بۆ تاریف کردبووم و پێشنیاری کردبوو کە لە گەڕانەوەمدا رێی خۆم بخەمە مێرگەسوور و لە رەواندوزەوە بگەڕێمەوە بۆ هەولێر. لەبەر ئەوەی کە ساڵانێکی زۆر لە ریزەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەسەرکردایەتی عەبدوڕەحمان قاسملو پێشمەرگایەتی کردبوو، وەك ناو لەپی خۆی جوگرافیای ناوچەکەی دەزانی. بە قسەی ئەوم کرد. لە باکووری گردە سەرسەوزەکانی بارزان کە هەرجۆرە گیایەکی لێ شین دەبێت، ریزی چیا بەرزەکان دەردەکەوێت. کاتێ لە بارزان رێگای مێرگەسوورم گرتەبەر، دۆڵەکان تەسك و باریکتر بوونەوە و پێچی نێوان شاخەکان زیاتر بوون و لەنێو ئەو جوانییە پڕ لە هەیەجانەدا کە دەستی مرۆڤ زۆر پێی نەگەیشتووە، درێژەم بە گەشتەکەم دا. کاتێ بەرەو باکوور سەیر دەکەیت، پارێزگای هەککاری لە تورکیا'دەستپێدەکات و ئەو جوگرافیایەی کە لێرە بینیم لەوێش درێژە دەکێشێت. دەمزانێ کە تۆزێك لە پێشتر، ئەندامانی چەکداری پ.ك.ك لە هەردوو دیوی سنوورەکەدا جێگیربوون، بەڵام تاقە شتێك کە لە مێشکمدا بوو ئەو جوگرافیا جوان و سەرنجڕاکێشە بوو کە بەرەو هەر چوار لای ناوچەکە درێژ دەبووەوە.

لەوانەیە سەد ساڵ بەر لە ئێستا سێر مارك سایکس هەستێکی وەك ئەوەی منی هەبووبێت بۆیە لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا(دارولئیسلام) ئەم رستانەی نوسیوە؛

"لە هابەدیانەوە رۆیشتن بۆ مێرگەسوور، گەشتێکی پێنج کاتژمێر و نیوی خۆشە بە نێو دارستانی مازوودا.

گوندی مێرگەسوور لە بان ڕێگای سەرووی ڕۆیشتن بە دۆڵێکدا بونیاتنراوە و ئەو چیا و شاخانەی کە چواردەوریان داوە دیمەنێکی زۆر جوان و سەرنجراکێشیان دروستکردووە کە نیگای مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا هەتا چیاکانی لای وان و چیاکانی نزیکی سلێمانی دەبات.″(Mark Saykes, Dar-ul-Islam- A Record of Journey Through Ten of the Asiatic Provinces of Turkey, Darf publishers Limited, London, ١٩٨٨,p.٢٢٢)

ئێدوارد جی براون پرۆفیسۆری زمانی عەرەبی لە زانکۆی کەمبریج کە لەساڵی ١٩٠٤دا پێشەکی بۆ چاپی یەکەمی کتێبەکە نوسیوە باسی ئەوەی کردووە کە ناوی دارولئیسلام'ی وەك ئاماژەیەك بۆ ئیمپراتۆریای تورك بۆ کتێبەکە داناوە. ئەو گۆشەیەی ئیمپراتۆریای تورك کە مارك سایکس وێنای کردووە، هەمان ئەو شوێنەیە کە من لە کوردستانی عێراق'ی ئەمڕۆدا بە″کوردستانی قووڵ″ناوزەدم کردووە. لەگەڵ ئەو ئۆتۆنۆمییە ڕێژەییەی کە کاتی بەعس'دا جێبەجێکرا، لە ساڵی ١٩٧٤ەوە هەولێر بوو بە ناوەندی سیاسی کوردستانی عێراق. لەدوای جەنگی ٢٠٠٣ و پاش ئەوەی کە عێراق بوو بە کۆمارێکی فیدراڵ، ئەم تایبەتمەندییەی هەولێر لە ڕێگەی بوونی بە پایتەختی هەرێمی نیمچە سەربەخۆی کوردستان زیاتر بەرجەستە بوو.

هامیڵتۆن کە لە جوگرافیای سەخت و نالەباری کوردستان دا ستراتیژیترین ڕێگای وشکانی بەهۆی سەرکەوتوویی ئەندازیاریی خۆیەوە بونیاتنا، لە کتێبەکەیدا بەناوی"ڕێگا لە هەموو کوردستان- گەشتەکانی باکووری عێراق″سەبارەت بە هەولێر و کوردستان کە لە ژێر دەستی تورکیا دەرهێنرا و کەوتە ژێر دەسەڵاتی ماندای ئینگلیز، تێبینی زۆر سەرنجڕاکێشی هەیە.

لە ساڵی ٢٠٠٤ەوە کتێبەکەی هامیڵتۆن'م لا بوو. زۆرجار لەو گەشتانەمدا کە زوو زوو بۆ کوردستانی عێراق'م دەکرد، لەگەڵ خۆمدا دەمبرد. بەڵام هەتا ئەوکاتەی بە چاوی خۆم کوردستانی قووڵ'م بینی کاریگەرییەکی زۆری لەسەر من دانەنابوو. دواتر کاتێ دووبارە کتێبەکەم خوێندەوە، لەبەرامبەر ئەو هاوشێوەییەی کە لە تێبینییەکانماندا سەبارەت بەو ناوچەیە هەبوو، سەرسام بووم.

هامیڵتۆن بەمجۆرە باسی هەولێر دەکات کە یەکێك بووە لە چوار شارە سەرەکییەکەی سەردەمی ئاشوور و ناوەکەیشی(ئەربیل) واتای چوار خوداوەند دەدات و لەبنەڕەتدا شکڵی گۆڕاوی وشەی ئەربائیلوویە؛

″ئەربیل ئەو شوێنەیە کە داریوش دوای شکستی خۆی لە ئەسکەندەری گەورە یەکەم فاتیحی ئەورووپایی لە ئاسیا، پەنای بۆ برد. جەنگی گەورە تەنها چەند مایلێك لەولای زاپی گەورە لە٣٣١ی پ.ز دا روویداوە. دوای ئەوەش ئەسکەندەر چیاکانی کوردستانی بڕی. ناوی ئەسکەندەر ئەمڕۆ لە خۆرهەڵات'دا بە ڕێزەوە باسدەکرێت و ناوەکەشیان لە زۆرێك لە ئەفسانە و شوێنەکان ناوە.

سوان نوسیویەتی؛ ئەو شتەی کە هەر لە یەکەم ڕۆژەکانەوە هەولێر'ی لەسەر پێ ڕاگرتووە جموجۆڵ و

زیندوویی ژیانە و هیچ کاتێکیش وازی لەوە نەهێناوە. لەکاتی فەرمانڕەوایی هەر یەك لەو نەتەوانەی کە ئەو شارەیان بەڕێوەبردووە، وەك ئاشوورییەکان، ماد و فارس و یۆنانی و پارت و ڕۆمایی و ئەرمەنی و دووبارە ڕۆماییەکان و فارس و عەرەبەکان'دا، لانیکەم جارێك بووەتە هۆی ئەوەی کە باسی بکرێت و ئەمەش لە سایەی ئەو جموجۆڵی ژیانەوە بووە.

دەگوترێت بۆ ماوەیەك ناوەندی سەلاحەدین بووە کە لە سەدەی ١٢دا خاچدارەکانی دەرکردووە. مەغۆلەکان کە هەموو شارەکانی میزۆپۆتا'یان لەناوبرد، ئەویشیان تاڵان کرد بەڵام نەیانتوانی نابووتی بکەن. تورکەکان بەهۆی پشتگوێ خستنەوە وازیان لەو شارە هێنا تا دابڕزێت، بەڵام هەولێر لەوان زیاتر ژیا. ئینگلیزەکان بە بێئەوەی بچنە ناوی وازیان لێ هێنا و سەربازەکانی ئینگلیز تاقە فیشەکێکیان لەوێ نەهاوێشت و بۆمبێکیش بە ئاسمانی هەولێر'دا نەخرایە خوارەوە.

هەولێر لە ڕۆژاندا وەك شاخ و پەیکەرێك بەرز دەبێتەوە و لە شەوانیشدا ڕووناکییەکەی وەك چرایەك لە دوورییەکی زۆرەوە پرشنگ دەداتەوە. بوونی بەسەرەتای ئەو ڕێگایەی کە دیواری چیاکانی کوردستانی دەبڕی مافی ئەم شارە مێژووییە بوو.″(هامیلتۆن، ل٤٨-٤٩)

بەوجۆرەش هامیلتۆن لە هەولێرەوە بەرەو دیوارە چیاییەکانی کوردستان بەڕێ دەکەوێت...

″...دواجار لە ڕێگایەکی بێکۆتایی پڕ لە بەردی تیژ و ڕوویەکی دەسکاری نەکراودا گەیشتینە لوتکەی زنجیرە چیایەکی بەرز کە شوێن بە شوێن داری نزمی مازووی تێدا بڵاوبووەتەوە و بەردی ئاهەکی(کلس-limestone) لێیە. شەش مایل دوای ئەوە، چەندسەد مەترێك بەرزبووینەوە و بە بایەکی سارد و فێنك کە لە لوتکەی چیاکانی دیکەوە دەهات پێشوازیمان لێکرا.

ئەمە کوردستانی ڕاستەقینە بوو. ئەمە چ جۆرە دیمەنێکی فراوان بوو کە لە بەرامبەرمان دەرکەوت! زنجیرە چیاکان لە ڕووبەڕوومدا بەرەو باکووری خۆرهەڵات درێژ دەبوونەوە. تا ئەو جێگایەی چاو بڕ دەکات دوورترین چیاکان هەر بەرز دەبوونەوە و هێشتا بەفری زستانیان پێوە مابوو. نەخشەکەم وای پیشاندەدا کە زۆرێك لەو شاخانە زیاتر لە سێ هەزار مەتر بەرز دەبنەوە و نزیکەی ١٠٠مایل لەولای دوورترین چیاکانەوە لە سنووری ئێران نزیك دەبێتەوە.

لە لای ڕاستەوە چیاکانی سەفین هەبوون کە لە گۆشەیەکی دووریدا گوندی شەقڵاوا هەیە... لە مەسافەیەکی مامناوەندیدا، نزیکەی ٤٠ مایل لەولاتر زنجیرە چیایەك هەیە... دۆڵێکی تاریك، لەو دۆڵە و ژێر تاشەبەردانەدا ڕێگای ڕەواندووز دەستپێدەکات کە وەحشیترین شوێنی کوردستان'ە.″(ل.٥٢)

هامیلتۆن بەمجۆرە باسی ئەوە دەکات کە لەو جوگرافیایەدا کە پڕە لە چیای سەخت و مەحکەم، چ جۆرە کەسانێك دەژین و بۆچی ئەو ڕێگایەی دروستکردووە کە بە وتەی خۆی″کوردستانی ڕاستەقینە″لە خۆرئاوا'وە

هەتا خۆرهەڵات دەبڕێ؟

"کاتێ پرسیار دەکرا کە ئەم ڕێگایە بۆچی دروستدەکرێت، وەڵامەکە ئەمە دەبوو؛ دوو هۆکاری هەیە، بازرگانی و بەڕێوەبردن. دەزانن کە هەموو نەتەوە گەورەکانی ئێستا و رابردووش، ڕێگاکانیان بۆ بەرقەرارکردنی سیستەم و جێبەجێکردنی یاسا بە پێویست زانیوە. تا ئەندازەیەکی زۆر ئەوە یەکلابووەتەوە کە هەرکاتێ ڕێگای وشکانی و جادە برایە ناوچەیەك، وەحشیترین مرۆڤەکان دەبنە ئاشتیخواز و بنەماکانی ژیانی شارستانی بۆ خۆیان کۆپی دەکەن. لەوەش زیاتر ئەو ئیمپراتۆرییانەی کە تەنها پشت بە فەتحی سەربازی دەبەستن، ناتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر ئەو خاکانە لە دەست خۆیاندا بهێڵنەوە کە داگیریان کردوون."(ل.٥٤)

سوان کە لەم سەدەیەدا زیاتر لە ئەورووپاییەکانی دیکە کوردەکان دەناسێت، لەبارەی ئەوانەوە ئەم پێناسەیە دەکات؛

" کەسانی خوێنرێژ، ئاژاوەگێڕ و شەڕفرۆشن کە بەدوای راپەڕینەوەن. کەسانی دز و جەردە و خراپەکارن کە هەمو جۆرە خراپەیەکیان لێ دەوەشێتەوە و عادەتی سووکیان هەیە و گاڵتە بە عەقڵی مرۆڤ دەکەن، بەڵام نەژادێکی ئازا و نەترسن. بەئەندازەیەک میوانپەروەرن کە رۆحی مرۆڤ نەوازش دەکات. لە شەرەف و دروستبووندا بێ نموونەن. روخساریان جوانە و لە هەموو جۆرێکی ناسکی و جوانی نسیبیان بەرکەوتووە."(ل.٥٦)

ئەو کەسانەی کە باسیان کراون، کوردەکان‌ی عوسمانی بوون. دەستەواژەکانی کوردەکان‌ی تورکیا و کوردەکان‌ی عێراق دواتر، پاش رووخانی ئیمپراتۆریای عوسمانی و لە دەرچوونی ویلایەتی موسڵی عوسمانلی لە ژێر دەسەڵاتی تورکیا پەیدا بوون.

دوایین ساتەکانی جەنگی جیهانی یەکەم لە مانگەکانی ٩و١٠ی ١٩١٨دا، لاپەڕەی رووداوە سەرسووڕهێنەرەکانی ساڵنامەیان بۆ خۆیان تەرخانکرد کە تا ساڵانی ٢٠٠٠کانیش کاریگەرییان بەردەوام بوو. ئەو واژۆیانەی کاریگەرییان لەسەر چارەنووسی کورد و تورك و عەرەبەکان و دانیشتوانی میزۆپۆتامیا‌ی کۆن و ئەنادۆڵ هەبوو، لەسەر کەشتییەکی جەنگی بەریتانیا لە بەندەرێکی بچووکی دوورگەی ئەگەی باکوور کران.

لە ئەیلوولی١٩١٨دا سوپای تورکیا نەیتوانیبوو بەرگەی هێرشەکانی سوپای بەریتانیا بگرێت. هەر زوو قودس چۆڵکرا و فەلەستین بەجێهێڵرا. سوپای بەریتانیا بەرەو باکوور پێشرەوی دەکرد. لە ١٩١٨/١٠/١دا"شام"یش گیرا. تەنها دوو رۆژ بەر لەو رووداوەش لە ٢٩ی ئەیلوول‌دا بولغاریا ئاگربەستی ئیمزاکرد و بەوجۆرەش ڕێگای ئیستانبوڵ بۆ سوپای هاوپەیمانەکان لەسەرووی هەموویانەوە فەرەنسییەکان خۆشکرا کە چووبوونە ناو بولغاریا. حکومەتی تەلعەت پاشا بەهۆی ئەو مەترسییەی کە نزیك دەبووەوە، کەوتە جموجۆڵ بۆ ئەوەی لەگەڵ بەریتانیا ئاگربەست ئیمزا بکات. لە رۆژی ١٩١٨/١٠/٥دا داوای لە ئەمریکا کرد کە ناوبژیوانی بکات و

سێ ڕۆژ دوای ئەوەش دەستی لە کار کێشایەوە. بەوجۆرەش دەسەڵاتی ئیتیحاد و تەرەقی تەواو بوو کە کۆتایی ئیمپراتۆریای عوسمانی لەگەڵ خۆی هێنابوو. لە ڕۆژی ١٠/١٤ی هەمان ساڵدا ئەحمەد عیزەت پاشا یەکێك لە فەرماندەکانی پێشووی سوپا، حکومەتی نوێی عوسمانی پێکهێنا و ڕەووف بەگ (ئۆربای) قارەمانی جەنگی دەریایی ١٩١٥ی چانەقەلە'ی کردە وەزیری دەریاوانی(نازری بەحرییە) کە تەسەوردەکرا لە ئینگلیزەکان'ەوە نزیك بێت و دژی سیاسەتی بەڕێوەبردنی ئیتیحاد و تەرەقی بۆ لایەنگری کردن لە ئەڵمانیا بوو.

مێژوو بەخێرایی گوزەری دەکرد. چوار ڕۆژ دوای ئەوەی کە ڕەووف ئۆربای بوو بە نازری بەحرییە، ژەنراڵێکی دیلکراوی بەریتانی بە نهێنی ڕەوانەی دوورگەی میدیلی کرد. ئەویش ژەنراڵ تاونسەند بوو کە لە شەڕی کوت'دا کە تاقە شوێنێکی میزۆپۆتامیا بوو تورکەکانی عوسمانی تێیدا سەرکەوتن، دیل کرابوو. ئەو ژەنراڵە دوای ئەوەی کە دیل کرابوو بۆ ماوەی سێ ساڵ لە بیوك ئادای ئیستانبوڵ و دواتر لەو ماڵەدا کە لیۆن ترۆتسکی یەکێك لە ناوە گەورەکانی شۆڕشی بەلشەڤیك و دامەزرێنەری سوپای سوور دەمایەوە، نیشتەجێ کرابوو. ژەنراڵ تاونسەند لە جانتاکەی خۆیدا مەرجەکانی حکومەتی عوسمانیی بۆ ئاگربەست لەگەڵ بەریتانییەکان پێ بوو. شەش ڕۆژ دوای ئەوەش دەریاسالار (ئامیرال) گالسۆرپ فەرماندەی هێزی دەریایی بەریتانیا لە دەریایی سپی کە ئەو کاتانە لە دوورگەی لیمینی بوو، فەرمانی دەستپێکردنی دانوستانەکانی ئاگربەستی دا. ڕۆژی دواتریش ڕەووف بەگ نازری بەحرییە، لەگەڵ ڕەشاد حیکمەت ڕاوێژکاری نەزارەتی خارجییە (وەزارەتی دەرەوە) و میرئالای سەعدوڵا بەگ لە فۆچە'وە بەرەو میدیلی بەڕێ کەوتن و لەوێشەوە بە کەشتی جەنگی بەریتانیاییەکان گەیشتە لیمینی.

دانوستانەکان ڕۆژی ١٠/٢٧ لە دوورگەی لیمینی لە بەندەری موندروس دەستیانپێکرد کە لەکاتی جەنگدا بۆ لەشکرکێشییەکانی چانەقەلە و گەلی بۆلوو وەك بنکەی هێزی دەریایی بەکار دەهات. دوای چوار ڕۆژ لە شەوی ١٩١٨/١٠/٣٠دا ئاگربەست لە گەمیی سەربازی ئاگامەمنۆن کە لە بەندەری مۆندروس'دا لەنگەری گرتبوو ئیمزاکرا. ڕۆژێك دوای دەستپێکردنی دانوستانەکان، فەرنسییەکان'یش ویستبوویان بەشداری بکەن، بەڵام ئینگلیزەکان ئەو داواکارییەیان پشتگوێ خستبوو. لەو کاتانەدا عوسمانییەکان بە کردەوە تەنها لەگەڵ بەریتانییەکان لە جەنگدا بوون.

دەریاسالارگالسۆرپ هەر لەسەرەتای دانوستانەکانەوە دەقێکی ئامادەکراوی بەریتانییەکانی بۆ ئەندامانی عوسمانی دانوستانەکان خوێندەوە و وتی حکومەتی عوسمانی هیچ چارەیەکی نییە جگە لە ئیمزاکردنی ئەم دەقە، چونکە لە حاڵەتی پێچەوانەوەدا لەشکرکێشییەکان درێژەیان دەبێت. بەرگری ڕەووف بەگ و وەفدی هاوڕێی چوار ڕۆژی خایاند لە شەوی ٣٠ی مانگدا ئاگربەستی مۆندروس لە پێوەرێکی فراواندا بەگوێرەی ویستی بەریتانییەکان مۆرکرا.

ئاگربەستی مۆندروس ٢٥ماددەی هەیە کە بەلای زۆرکەسەوە ماددەکانی ٧ و ٢٤ لە هەموویان گرنگترن. لە مادەی ٢٤دا باسی ئەوە کرابوو کە ئەگەر لە شەش پارێزگاکەدا (ویلایاتی ستە) کە لە ئەرزڕووم، وان، مامورەتولعەزیز (ئەلازیغ)، سیواس، بتلیس و دیاربەکر پێك دەهاتن، هەرجۆرە رووبەڕووبوونەوەیەك دروست ببێت، هێزەکانی هاوپەیمانەکان دەتوانن هەر بەشێك لەو پارێزگایانە بگرن. ئەو ماددەیە بۆ رووبەڕووبوونەوەی رێگریکردن لە گەڕانەوەی ئەرمەنەکان بۆ سەر ماڵ و حاڵی خۆیان دانرابوو کە لەکاتی کۆچی زۆرەملێی ساڵی ١٩١٥دا لەسەر خاکی خۆیان دەرکرابوون. لەبەر ئەوەی ئەرمەنییەکی وا نەمابوون کە بگەڕێنەوە، رێگری لە گەڕانەوەیان نەکرا و ئەو ماددەیەش جێبەجێ نەکرا.

بە تایبەتی مادەی ٧ زەمینەی یاسایی خۆشکرد بۆ ئەوەی هێزەکانی بەریتانیا بچنە ناو ویلایەتی موسڵ و لە هەموو پارێزگاکەدا جێگیر بن. لە ماددەکەدا وەها نوسرابوو؛"لەکاتی دروستبوونی مەترسی ئەمنی، هێزی هاوپەیمانەکان مافی ئەوەیان هەیە لەو ناوچە و شوێنە ستراتیژییانەدا کە خۆیان بە گونجاوی بزانن جێگیر بن."

رۆژی ١٠/٣٠ کە ئاگربەستی مۆندروس ئیمزا کرا، هێزی پێشەنگی سوپای ١٣ی "هێزی گەشتی میزۆپۆتامیا"ی سەر بە سوپای بەریتانیا لە هیندستان کە لەلایەن ژنەراڵ مارشاڵ فەرماندەیی دەکرا، گەیشتبوونە شەرقات کە شەست مایل لە باشووری شاری موسڵ دایە. شەرقات لە خوار نەینەوا، پایتەختی پڕ شان و شکۆی ئاشوورییەکانەوە بوو کە ئیدی جگە لە ئاسەوار و پاشماوە ئارکیۆلۆژییەکان هیچ گوزارشتێکی دیکەی نەمابوو. دەقی ئاگربەستەکە کە رۆژی ١٠/٣١ جێبەجێ دەکرا، باسی ئەوەی دەکرد کە پێویستە تا نیوەڕۆی ٣١ی مانگ هەموو جۆرە لەشکرکێشییەك رابگیرێت و هێزەکان لەو شوێنەکانی خۆیاندا بمێننەوە.

بەڵام ئەوە رووینەدا. هێزەکانی بەریتانیا ئۆلتیماتۆمیان دایە عەلی ئیحسان پاشا (سابیس) فەرماندەی سوپای شەشەمی عوسمانی تا شاری موسڵ چۆڵبکات و خۆیان بەرەو باکوور پێشڕەوییان کرد و لە رۆژی ١٩١٨/١١/٣دا چوونە ناو شاری موسڵ. بەوجۆرەش دەسەڵاتدارێی عوسمانییەکان کە لە ساڵی ١٥١٧وە لەکاتی یاوز سوڵتان سەلیم دەستیپێکردبوو، کۆتایی دەهات. دوایین سەربازەکانی هێزەکانی عەلی ئیحسان پاشا، رۆژی ١٩١٨/١١/١٠ لە موسڵ دەکەوتن و هەتا نوسەیبین پاشەکشەیان کرد.

موقەددەم دادایلی خالید بەگ کە یەکێك بووە لە ئەفسەکانی لای عەلی ئیحسان پاشا، لە راپۆرتێکدا بەرپرسیاری پاشەکشەی هێزەکانی لە موسڵ خستۆتە ئەستۆی عەلی ئیحسان سابیس. بەگوێرەی خالید بەگ، موسڵ رۆژێك بەر لە ئیمزاکردنی ئاگربەستی مۆندروس رادەستی بەریتانییەکان کرابوو. عەلی ئیحسان سابیس داوای لە ژەنراڵ مارشاڵ فەرماندەی بەریتانییەکان کردبوو کەرەستە و ئامراز و پاسەوانی پێویستی بۆ پاشەکشەکردن بەرەو نوسەیبین بۆ دابینبکات.

عەلی ئیحسان سابیس کە لە موسڵ دا گومانی کەوتەسەر و لەبەرەی خۆرئاوای تیکۆشانی نەتەوەیی دا ئەستێرەکەی لەگەڵ عیسمەت پاشا (ئینەنۆ)دا ئاشتی نەدەکرد و بوو بە نەیارێکی بێ ئامانی عیسمەت ئینەنۆ، لەبارەی رووداوەکە چیرۆکێکی دیکە دەگێڕێتەوە و باسی نوسراوەکانی نێوان خۆی و میرلیوا مستەفا کەمال کردووە کە لەکاتی کەوتنی موسڵ وەك فەرماندەی سوپای حەوتەم لە سوریا بوو.

"هەواڵی نزیکبوونەوەی ئینگلیزەکان بۆحەلەب بە من گەیشتبوو... تەلگرافێکی شفرەدارم بۆمیرلیوا مستەفا کەمال پاشا فەرماندەی سوپای حەوتەم نارد و پێمڕاگەیاند کە تۆپەکانی هاویتزری ١٥ی سوپاکەی خۆمم بۆ ناردووە تا بەرگری لە حەلەب بکات و ئێمەش موسڵ بپارێزین و بەوجۆرەش ئاگربەستەکە ئەنجامبدرێت... لە رۆژی ٢١ی ئەیلوولی ١٩١٨دا هێزەکانی بەریتانیا بە فەرماندەیی ژەنراڵ ئالێنبی بەرەو شام پێشڕەوییان کردبوو. هەموو هیواکەم ئەوەبوو کە وەك چۆن بۆ مستەفا کەمال پاشا'م نوسیبوو لەکاتی ئاگربەستەکەدا موسڵ لە دەستی خۆماندا بهێڵینەوە... رۆژی ٢٥ی ئەیلوول هەواڵی داگیرکرانی موسڵ گەیشت و شەو فەرمانی چۆڵکردنی کەرکوك'م دەرکرد. تەلگرافێکی شفرەدارم بۆ سەدری ئەعزەم موشیر ئەحمەد عیزەت پاشا نارد و تێیدا باسی ئەوەم کردبوو کە ئەگەر ئاگربەست دەکرێت بۆ ئەوەی موسڵ لە دەستی خۆماندا بهێڵینەوە، تەکتیکی دەسخەڕۆکردن و پاشەکشە بەکاردەهێنم و ئەمەش پەسندکرا. ئەوەشم راگەیاندبوو کە هەتا کاتی ئاگربەست هەوڵی راگرتنی موسڵ دەدەین و تا کاتی ئیمزاکردنی ئاگربەستەکەش وردە وردە دەگەڕێینەوە ئەوێ بۆ ئەوەی لە دەستی خۆماندا بێت.

پاشان راگەیەنرا کە ئاگربەست ئێمزاکراوە و لە رۆژی ١٩١٨/١٠/٣١وە جێبەجێ دەکرێت. بۆ ئەوەی هەواڵی ئیمزاکردنی ئاگربەستەکە بگەیەنمە ئینگلیزەکان یەکەیەکی سواریی شەش کەسیم نارد، بەڵام فەرماندەی ئینگلیزەکان وەك ئەوەی کە گوایە ئاگای لە ئاگربەست نییە فەرمانی گرتنی موسڵی دەرکردبوو. رۆژی ١١/٤، یەکە سوارییەکانی سوپای ئینگلیز بەرەو موسڵ بەڕێ کەوتن. دوو رۆژ دواتر ژەنراڵ مارشاڵ سەردانی بڕیارگەکەی منی کرد. پێمگوت ئاگربەستەکەتان پێشێل کردووە و چەند جارێك ماددەکانی دەقی ئاگربەستەکەم بۆ خوێندەوە. ئەویش لە وەڵامدا وتی بەپێی مادەی ٧ی ئاگربەستەکە... ئەو جێگایەی کە بە پێویستی بزانین دەیگرین... و بەپێی ئەوەش موسڵ دەگرین. دواجار لە١٩١٨/١١/١٠دا ئیدی نەمتوانی بەرامبەر گوشارەکانی ئیستانبوڵ خۆم رابگرم، بۆیە لە موسڵ بەرەو نوسەیبین پاشەکشەم کرد."

لەکاتێکدا کە ئەفسەرەکە تاوانی جێهێشتنی موسڵ دەخاتە ئەستۆی فەرماندەکەی خۆی، عەلی ئیحسان سابیس هەمان تاوان دەخاتە ملی حکومەتی عوسمانی لە ئیستانبوڵ. چیرۆکی ئینگلیزەکان'یش جیاوازە.

لە رۆژی ١٩١٨/١٠/٣٠دا کە ئاگربەستی مۆندروس ئیمزاکراوە، موسڵ وەك ناوچەیەك تۆمارکراوە کە بەپێی رێککەوتننامەی نهێنی سایکس- پیکۆت لە ساڵی ١٩١٦دا ئەگەر لە ژێر دەستی عوسمانییەکان دەرهێنرا،

پێویستە رادەستی فەرەنسییەکان بکرێت. بەڵام لە راستیدا بەر لەوەی کۆنفرانسی ١٩١٩ی پاریس بکرێت و لۆید - جۆرج داوای موسڵ لە کلێمێنسو بکات و وەریبگرێت، ئینگلیزەکان بڕیاریان دابوو ئەوێ وەربگرن. بە دەستهێنانی موسڵ و پارێزگای موسڵ لەلایەن ئینگلیزەکان'هوە، دەبووە هۆی ئەوەی کە لە قۆناخی دوای جەنگدا لە بەرامبەر فەرەنسییەکان'دا کارتێکی سەربازییان بەدەستەوە بێت. لەلایەکی دیکەشەوە ئەگەر پێویستبوو ویلایەتەکانی بەغدا و بەسرەی عوسمانی لە داهاتوودا پێگەیەکیان هەبێت، موسڵ بۆ ئەوانە واتای ناوچەیەکی ئابوری و ئەمنی پێویستی دەدا.

ئەگەر موسڵ نەبوایە، دەوڵەتێکی عێراق کە لە ژێر ماندای ئینگلیزەکان'دا بێت و لەوکاتانەدا ناویشی لێنەنرابوو، دروست نەدەبوو.

ئینگلیزەکان، چەند رۆژ دوای ئاگربەستی مۆندروس دەستیان بەسەر ویلایەتی موسڵ دا گرتبوو کە لە داهاتوودا لە رووی ئابووری و ئەمنییەوە رێگای بۆ ئەوە خۆشدەکرد عێراقێکی پێ بونیاد بنێن کە بتوانێت لەسەر پێ بمێنێتەوە، بەڵام ئەمە بەس نەبوو بۆ ئەوەی دیاریبکرێت کە سنوری عێراق - تورکیا کوێ بێت و لە چ شوێنێکەوە تێپەڕبێت.

هەم مەجلیسی عوسمانی لە ئیستانبوڵ و هەم پەرلەمانی تورکیا لە ئەنقەرە کە رێگای گەیشتن بە کۆماری تورکیا'ی خۆشکرد، بەپێی پرەنسیپی"میساقی میللی"داوای ویلایەتی موسڵی عوسمانلی'یان دەکرد.

دوای جەنگ، نزیکەی هەشت ساڵی خایاند هەتا سنووری عێراق - تورکیا بە رێککەوتنی هەردولا دەستنیشانکرا و ئەم هەشت ساڵەش زەمینەی دەرکەوتنی کێشەی کوردی لە عێراق و تورکیا فەراهەم کرد.

رۆژی ٥ی حوزەیرانی ١٩٢٦ بەپێی رێککەوتنێکی سێقۆڵی نێوان تورکیا و عێراق و بەریتانیا، سنور دیاریکرا و لە رووی یاساییەوە خاڵی کۆتایی لەسەر داواکارییەکانی تورکیا سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ دانرا.

سێ مانگ بەر لەو رێککەوتنە، ئەنقەرە لە ١٩٢٦/٣/٨دا لە دەزگای شاهانە بۆ جوگرافیا، کۆنفرانسێکی سەبارەت بە جوگرافیای سنوری موسڵ رێکخست. عەمید H.I.LIoyd لە کۆنفرانسەکەدا بەناوی حکومەتی عێراق وەك پسپۆڕ وتاری بووە و دوو کەسی ئاشنا و ناسراویش گفتوگۆکەرانی وتارەکەی لۆید بوون کە ئەوانیش سێر پێرسی کۆکس و سێر ئارنۆڵد ویلسۆن بوون.

عەمید لۆید وتارەکەی خۆی بە باسکردنی"دوو ئاستەنگ سەبارەت بە پێناسەکردنی دەستەواژەی موسڵ"دەستپێکردبوو؛

"لەکاتی ئاگربەستەکەی ١٩١٨دا هێزەکانی بەریتانیا تا خاڵێك لە باکووری شەرقات پێشڕەوییان کردبوو کە شەشت مایل لە باشووری موسڵ دایە. مەرجێکی ئاگربەستەکەش ئەوەبوو کە تورکەکان هەموو هێزەکانی خۆیان لە میزۆپۆتامیا کە بە سێ ویلایەتی تورکی بەسرە و بەغدا و موسڵ ناسراوە بکشێننەوە. لەو بەروارەش

بەدواوە حکومەتی بەریتانیا کێشەی داهاتووی ئەم سێ ویلایەتەی تورکی بە چارەسەرکراو لە قەڵەمدا و هیچ گومانێك نەبوو لەوەی کە لەکاتی دامەزراندنی پادشایەتی نوێی عێراق'دا ئەو سێ پارێزگایە دەوڵەتی عێراق پێکدەهێنن. لەگەڵ ئەمەشدا بەهۆی ئەوەی کە لەگەڵ تورکیا رێککەوتنی کۆتایی نەکرابوو، سنورەکان بە رەسمی نەناسێنرابوون. لەبەر ئەوەش لە روانگەی ئیدارییەوە ویسترا کە سنورەکانی عێراق بەجۆرێک کە قەزای هەککاری لە خۆ بگرێت فراوان بکرێت. هەککاری پێشتر نیشتمانی نەستوورییەکان بووە کە متمانەپێکراوترین یەکە سەربازییەکانی وڵات (عێراق) یان پێکهێنابوو، بەڵام ئەوێیان جێهێشتبوو. لە راستیدا بەشێك لەو ئاشووری'یانە بەشێوەی غەیرە رەسمی لە هەردووی بەری رووباری زاپ لەنێوان جۆلەمێرگ و ئامێدی دا نیشتەجێبوون و هەتا ئەوکاتەی لەلایەن تورکەکان'هوە لە ئەیلوولی ١٩٢٤دا دوورخرانەوە هەر لەوێ ژیاون."

عەمید لۆیدا باسی هەندێك زانیاری پشتی پەردە دەکات کە لەسەرەتا وەك وردەکارییەك دێتە بەرچاو، بەڵام پێویستە لە روانگەی چەکەرەکردن و گەشەکردنی کێشەی کورد'هوە فەرامۆش نەکرێن.

"لە کۆنفرانسی لۆزان، تورکیا'ی نوێ و زیندوو لە هەوڵەکانیدا بۆ باسکردنی هەموو ماددەکانی دەقی ئاگربەست سەرکەوتنی بەدەستهێنا و ئیدیعای خاوەنداریی هەموو ویلایەتی موسڵی کرد. وەکوو لە نەخشەدا دەردەکەوێت و هەموو ئەو کەسانەش کە لەو ناوچەیەدا گەشتیان کردووە باش دەزانن کە ویلایەتی موسڵ بەشێکی دانەبڕاوی عێراق'ه و سنورە باشوورییەکانی هەتا نزیکەی بەغدا درێژ دەبنەوە. کێشەی سنووری عێراق لەلایەن حکومەتەکانی بەریتانیا و تورکیا'وە لە دوو روانگەی جیاوازەوە سەیرکرا. حکومەتی تورك بانگەشەی ئەوەی کرد کە هەموو ویلایەتی موسڵ لە رووی وابەستەیی خوێن و هەستەوە تورك'ن و ئەگەر تورك'یش نەبن ئەوا لە سەداسەد عەرەب نین. هەروەها ئەوەشیان راگەیاند کە جگە لە گەڕاندنەوەی هەموو ویلایەتی موسڵ بەهیچ شتێکی دیکە رازی نابن. حکومەتی بەریتانیا کارکردی رێککەوتننامەکەی (لۆزان) وەك دیاری کردنی سنوری نێوان عێراق و تورکیا سەیرکرد. بەگوێرەی حکومەتی بەریتانیا ویلایەتی موسڵ لە رووی سروشتی، ئابوری و ئەتنۆگرافییەوە بەشێکی عێراق بوو. لە روانگەی ئەوانەوە (بەریتانییەکان) کێشەکە پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە کام زنجیرە چیا و دۆڵ و رووبار لە رووی بەرگرییەوە گونجاو بێت، پێویستە لەوێ هێڵی سنوری دیاریبکرێت و چۆن ئاشوورییە نەستوورییەکان کە لەکاتی جەنگە گەورەکەدا لە نیشتمانی٢٠٠٠ ساڵەی خۆیان دوورخراونەتەوە، ماڵ و حاڵی خۆیان وەربگرنەوە. کۆنفرانسی لۆزان بڕیاریدابوو کە ئەگەر دوای نۆ مانگ بەریتانیا و تورکیا سەبارەت بەو کێشەیە رێکنەکەون، ئەوا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە سەردانی دەستەی کۆمەڵەی گەلان بکرێت. ئەوکاتەی کە سێر پێرسی کۆکس لە ئیستانبوڵ بۆچوونی حکومەتی بەریتانیا'ی راگەیاند، حکومەتی تورك سووربوونی خۆی لە داواکارییەکانی سەبارەت بە هەموو ویلایەتی موسڵ

دووباره کردەوە و بەوجۆرەش کۆنفرانسەکە (ج.چ؛ کۆنفرانسێك لە خەلیجی ئیستانبوڵ کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی سنور رێکخرابوو) بڵاوەی کرد. لە ماوەی یەك مانگدا تورکەکان چوونە ناو خاکی عێراق و پاشماوەی نەستوورییەکانیان لە ناوچەی تیاری خواروو و سەروو دوورخستەوە. ناکۆکییەکان حەواڵەی دەستەی کۆمەڵە کرا و ئەویش کۆمیسیۆنێکی خوارووتری دروستکرد کە لەلایەن کۆچکردوو برانتینگ سەرۆکایەتی دەکرا. ئەویش لە مانگی ١٠ی ساڵی ١٩٢٤دا لە بروکسەل هێڵیStatus Quo ی کێشا کە بە هێڵی بروکسەل یان برانتینگ ناسرا. ئەو هێڵە هەندێك گۆڕانکاری بچووکی لە سنوورەکانی پێشووی ویلایەتی موسڵدا کردبوو. دوایین بڕیاری کۆمەڵەی گەلان ئەوە بوو کە هێڵەی بروکسەل‌ی وەك سنوری باکووری عێراق راگەیاند. ئەمە باشترین هێڵی سنوری نەبوو. هیچ گومانێك نییە کە ئەو هێڵەی حکومەتی شاهانە لە ساڵی ١٩٢٤دا لە ئیستانبوڵ و ساڵی ١٩٢٥ لە جنێف پێشنیاری کردووە ئەو زنجیرە چیا و شاخانە دەگرێتەوە کە تێپەڕبوون لێیان مومکین نییە و سنورێکی نمونەیی بوو. ئەو سنورە لەلایەن پادشایی لاوازی عێراق‌هوە دەپارێزراو و شاخە سەختەکان دەیانتوانی رێگا لە هێرش و پێکدادانی خێڵەکانی هەردوو دیوی سنور بگرن.”

ناوەندی کۆمەڵەی گەلان (لە تورکی کۆندا پێی دەگوترا جەمعییەتی ئەقوام) لە جنێف بوو، بەڵام کۆمەڵەی گەلان لە مانگی ١٠ی ١٩٢٤دا کۆبوونەوەی سەبارەت بەوەی کە رواندا - بروندی بخاتە ژێر دەسەڵاتی ماندای بەلجیکا، بەهۆی تەوەرەکەیەوە لە بروکسەل‌ی پایەختی ئەو وڵاتە ئەنجامدا. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا سەبارەت بە سنوری عێراق - تورکیا سەردانی کۆمەڵەی گەلان کرا و لەبەر ئەوەش ئەو سنورە کاتییەی کە کۆمیسیۆنی برانتینگ دایتابوو وەك هێڵی بروکسەل ناوبانگی دەرکرد. هژالمار برانتینگ، ئەو کەسەی کە سنوری عێراق - تورکیای دیاریکرد، سەرۆکی پارتی سۆسیال - دیموکراتی سوید و سەرۆك وەزیری ئەو وڵاتە بوو. ساڵی ١٩٢١ خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی بەدەستهێنا و چوار مانگ دوای دیاریکردنی هێڵی سنورەکە لە تەمەنی ٦٥ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

هێڵی برانتینگ یان هێڵی بروکسەل کە زیاتر بەکاردەبرێت، وردە وردە لەکاتیی بوون دەرچوو و بوو بە سنوری هەمیشەیی تورکیا - عێراق کە تا ئێستا ماوەتەوە. لە ساڵی ١٩٢٦دا لە رێککەوتنی سێقۆڵی عێراق – تورکیا - بەریتانیا گۆڕانکارییەکی بچووك لە هێڵی بروکسەل‌دا کرا. رێگای نێوان ئالاموون و ئاشووتا کە لەنێوان پارێزگای هەککاری و شرناخی ئێستادایە بۆ تورکیا بەجێهێڵرا.

ئەگەر کێشەکە بەگوێرەی تورکیا چارەسەر بکرایە، هەموو ویلایەتی موسڵ لە سنورەکانی تورکیا دەمایەوە و ئەوەش واتای ئەوەی دەدا کە موسڵ، کەرکوك، هەولێر، سلێمانی، دهۆك، زاخۆ و شارەکانی کوردستانی عێراق‌ی ئەمڕۆ و کوردەکان‌ی عێراق و تورکمانەکان و بەشێك لە ئەهلی مەسیحی هی تورکیا دەبوون. چیای قەندیل و ناوچەکانی وەك هەڵەبجە‌ش لە سنورەکانی تورکیا دەمانەوە و سنورەکانی تورکیا هەتا نزیکەی

بەغدا شۆڕ دەبوونەوە. چونکە لە پێکهاتەی ئیداریی عوسمانی'دا ویلایەتی موسڵ هەموو ئەم ناوچانەی دەگرتەوە.




تا ساڵی ١٩١٨، پێکهاتەی ئیداری ئیمپراتۆریای عوسمانی بۆ ویلایەت و سانجاق یا خود لیوا، قەزا و ناحیەکان دابەشکرابوو. ویلایەت لەلایەن والی و سانجاق لەلایەن موتەسەڕیف و قەزاکانیش لەلایەن قایمقام و ناحیەکانیش لەلایەن بەڕێوەبەری ناحیەوە بەڕێوەدەبران. کۆماری تورکیا'ش جگە لە سانجاق، ئەو پێکهاتە ئیدارییەی درێژەپێدا. لە واتایەکی دیکەدا بە سانجاقەکان گوترا ویلایەت و ویلایەتە کۆنەکانیش لابران. ناوی ئیلچە بۆ قەزا و بۆجاك'یش بۆ ناحیە بەکارهێنران. لە پێکهاتەی ئیداری عوسمانی'دا ویلایەتی موسڵ بۆ سێ سانجاقی موسڵ، کەرکوك و سلێمانی دابەشکرابوو. لە ساڵی ١٩١٨دا بەر لە ئاگربەست، سێ قەزای کەرکوك

لەسەرووی رووباری زاپی بچووك جیاكرانەوە و لەنێو ویلایەتی موسڵ دا سانجاقی هەولێر دروستكرا و سانجاقەكانی كەركوك و سلێمانی لە باشووری زاپی بچووكدا مانەوە.

ئەو بەشەی میرنشینە نیمچە سەربەخۆكانی كورد كە دەكەوتە ئەو سنورانەی كە عێراق ی ئەمڕۆ پێكدەهێنن و هەتا ناوەڕاستەكانی سەدەی١٩ درێژەیان هەبوو، لە میرنشینەكانی بادینان، سۆران و بابان پێك دەهاتن. لە پێوەرێكی فراواندا ئەو سنورەی كە ئێستا حكومەتی هەرێمی كوردستان یش تێیدا حوكمڕانی دەكات سنورەكانی ئەو سێ میرنشینە دەگرێتەوە. بادینان بەشی شاخاویی باكووری سانجاقی موسڵ و قەزاكانی زاخۆ، دهۆك، ئامێدی ئاكرێ و زێبار لە خۆ دەگرێت و سانجاقی هەولێر بەشێوەیەكی گشتی هەمان سنورەكانی میرنشینی سۆران دەگرێتەوە و سانجاقی سلێمانی لە رووی ئیدارییەوە هەموو ناوچەی بابان و بەشێك لە سانجاقی كەركوك ی لە خۆ دەگرت.

بە گشتی رووی سانجاقی موسڵ لە ئەنادۆڵ بوو. سۆران یش رووی دەكردە میرنشینی موكری كە لەنێو سنورەكانی ئێران لە مەهاباد بوو. میرنیشنی بابان بە هەمانشێوە لەگەڵ میرنشینی ئەردەڵان دا پەیوەندی نزیكی هەبوو كە لەنێو سنورەكانی ئێران لە سنە بوو.

ئەوكاتەی كە لەدوای ئاگربەست، ویلایەتی موسڵ بووە مایەی مشتومڕی نێوان حكومەتی توركیا و بەریتانیا، لە سانجاقەكانی موسڵ، كەركوك، هەولێر و سلێمانی پێك دەهات. ئەگەر ویلایەتی موسڵ بەو پێكهاتە ئیدارییەوە لەنێو سنورەكانی كۆماری توركیا بوایە، ناوچەیەكی فراوان لە خابور ەوە تا هەڵەبجە كە بە سنوری ئێران ەوە لكاوە و هەتا چیای حەمرین كە كاتژمێر و نیوێك لە بەغدا دوورە لەنێو سنورەكانی توركیا دەمانەوە. بەوجۆرەش رەوتی مێژوو و پێكهاتەی توركیا بەجۆرێک كە پێشبینی ناكرێن جیاواز دەبوون.

هێڵی بروكسەل بەگشتی جگە لە هەندێك خاڵی دەگمەن هەمان هێڵی سنوری نێوان ویلایەتی وان و موسڵی عوسمانی لەخۆ گرتبوو. هێڵی بروكسەل، لەسەر كاغەز شتێك نەبوو كە توركیا داوای دەكرد. بەڵام دەزانین هەموو ئەو سنورە نەبوو كە بەریتانیا ش داوای دەكرد. بەریتانیا داوایكردبوو هەككاری ش لەنێو سنورەكانی عێراق دا بمێنێتەوە. ئەمەش زیاتر لە كوردەكان، هەستێك بوو بۆ پاراستنی ئاشوورییە نەستوورییەكان.

لە كۆنفرانسی "جوگرافیای سنوری موسڵ" دا لە دەزگای شاهانە بۆ جوگرافیا (١٩٢٦/٣/٨) عەمید لۆید بە نەخشەوە وتارەكەی پێشكەشكرد و سێر پێرسی كۆكس ئەو و هەموو ئەو ئینگلیزانەی زۆر پەسن دا كە لە عێراق كاریان دەكرد و سەبارەت بە هەڵوێستی حكومەتی ئینگلیز لەبارەی سنوری عێراق بەمجۆرە قسەی كرد:

"لە دانوستانەكانی لۆزان دا جگە لە سنوری عێراق بە كردەوە هەموو شتێك چارەسەركرابوو. لەوبارەیەشەوە

هیچ خاڵێکی هاوبەش لەنێوان داواکاری ئیدیعای تورکەکان و ئەوانەی ئێمەدا بەدی نەدەکرا. لەبەر ئەوەش بڕیاری پەسندکردنی ڕێککەوتننامەکە درا و چارەسەرکردنی کێشەی سنوری عێراق ڕاستەوخۆ بۆ ئێمە و تورکەکان بەجێهێڵرا.

پێموایە لۆرد کورزۆن کە لە لۆزان نوێنەرایەتی ئێمەی دەکرد، بە هەمان هۆکار، یانی لەبەر ئەوەی کە زەمینەیەکی هاوبەش لە بەینی ئێمە و تورکەکان'دا نەبوو تا لەسەری دانوستان بکەین، وابیری دەکردەوە کە هەوڵی چارەسەکردنی ڕاستەوخۆی کێشەکە لەگەڵ تورکیا بێسوودە. بۆیە یەکسەر حەواڵەکردنی کێشەکەی بۆ کۆمەڵەی گەلان پەسندکرد. بەڵام تورکەکان پێداگرییەکی زۆریان کرد بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئێمەدا چارەسەرێك بدۆزنەوە. دوای ساڵێکیان کرد و ئێمەش شەش مانگمان دانا و دواجار لەسەر نۆ مانگ ڕێککەوتین. لە کۆتایی مانگی نۆیەمدا بۆ ئەوەی لەگەڵ تورکەکان چارەسەرێك بدۆزینەوە... ڕەوانەی ئیستانبوڵ کرام... بۆ ئەوەی سنورێکی باش دیاری بکرێت، هەموو لایەنەکان لەبەرچاو گیران و لە وڵاتێکدا کە فڕین بە ئاسمانەکەیدا زۆر مەترسیداربوو، کەشفێکی زۆر کرا...

فەرمانیان پێدام کە ئامادەیی خۆم ڕابگەیەنم بۆ ئەوەی باشترین سنوری مومکین پێشنیار بکەم... و دانوستان لەسەر گۆڕانکاری لە وردەکارییەکاندا بکەم. بەڵام خاڵێکی هاوبەشم نەدۆزییەوە تا بتوانین لەسەری دانوستان بکەین. وەڵامی ئەندامە تورکەکان بۆ پێشنیارەکەی من ئەوە بوو کە پێویستە ئێمە گەڕاندنەوەی ویلایەتی موسڵ وەك پرەنسیپ قبوڵ بکەین و دواتر ئەوانیش ئامادەن تا بەشێوەیەکی مومکین لەسەر قەرەبووکردنەوەی ئابووری گفتوگۆ بکەن. لە ڕاستیدا ئەوەی کە قسەمان لەسەری دەکرد خاکێك بوو کە ئێمە مافی ماندایەکەیمان وەرگرتبوو، بۆیە مومکین نەبوو بەوجۆرە بیر لە هیچ جۆرە ڕێککەوتنێك بکرێتەوە. لەبەر ئەوەش دوای شەش هەفتە لە گفتوگۆی بێ ئەنجام، پێم ڕاگەیەنرا کۆتایی بە دانوستانەکان بهێنم.

ئێستاش کۆمەڵەی گەلان بڕیارێکی لەبارەی سنور داوە. گۆمانی تیا نییە کە ئەو هێڵە سنورییە هێڵێکی لەوانەبە. هەرچەندە بەشێوەی سروشتی هێڵی گونجاوتر لەو سنورەش هەیە، بەڵام هەموو ئەو گرد و تەپۆڵکە و چیا بەرزانە، سنورێکی مومکین دروستدەکەن کە ئەگەر تورکەکان لەوڕووەوە هەڵوێستێکی گونجاویان هەبێت، ئەوکاتە داهاتوویەکی گەورە چاوەڕوانی عێراق دەکات. بەڵام بابەتی چارەنووسی ٨٠هەزار پیاو و ژن و مناڵی ئاشوورییە مەسیحییەکان من نیگەران دەکات. نیوەیان لەم دیو ئەو سنورەوەن کە ئێستا دیاریکراوە و نیوەکەیتریشیان لە دیوەکەیتردایە. لەبەر ئەوەی پێداگریم کرد، فەرمانم بۆ هات کە لە ئەگەری دیاریکردنی سنورەکەدا دەتوانین شوێنی پێویست بۆ کۆکردنەوەی هەموو مەسیحییەکان دابین بکەین. ئەم بیرۆکەیە ئێستا لەسەر مێز نییە و دەبێ دان بەوەشدا بنێم کە لەوبارەیەوە هیوابڕاو بووم. ئەو

نەتەوە مەسیحییە چەندە بچووك دەبێت با ببێت پێویستبوو بیر لە چارەونووسیان بکرێتەوە. دەبوو ئەمە خەمی هەموو دنیای مەسیحی بێت. وەك بەریتانیا ئەوەی لە دەستمان بێت کردمان بەڵام دنیای مەسیحی لەوبارەیەوە هیچ شتێکی نەکرد و چارەنووسی ئەو مرۆڤانەش ئێستا وابەستەی ئەو دانوستانانەیە کە لەگەڵ تورکەکان دەکرێت."

لە لۆزان، لۆرد کورزۆن لە بەرامبەر عیسمەت ئینەنۆ و لە ئیستانبوڵ دا لەبەرامبەر فەتحی ئۆکیار، سێر پێرسی کۆکس هەبوون. وەکوو کۆکس باسیدەکات تورکیا و بەریتانیا سەبارەت بە سنوری عێراق رێك نەکەوتبون.

لەو شەوەدا، دوای سێر پێرسی کۆکس وەك دوایین کەسێك کە وتاری هەبێت سێر ئارنۆڵد ویڵسن بە درێژی قسەی کرد و بە تایبەتی لەبارەی سنوری تورکیا - عێراق هەڵسەنگاندنی سەرنجراکێشی کرد. بە لە بەرچاو گرتنی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی سوپای تورك لە ساڵانی ١٩٩٠ەکان و ٢٠٠٠ەکاندا لە عێراق یان کوردستان'ی عێراق، ئەو هەڵسەنگاندنانە زۆر واتادار بوون. دیارە مومکین نییە سێر ئارنۆڵد ویڵسن لەکاتێکدا کە ئەو قسانەی کردووە، بیری لەوە کردبێتەوە سوپای تورکیا لە ١٩٩٠ و ٢٠٠٠ەکاندا دەتوانێت چی بکات، بەڵام لە وتەکانی خۆیدا سەرەداوەکانی قاچاخچێتی بێکۆتایی سنوری داوە بە دەستەوە کە ناکرێت رێگای لێ بگیرێت؛

"لە بەرامبەر هێڵەکەی ئێمەدا جەختێکی زۆر لە گرنگی ستراتیژی هێڵی بروکسەل کرایەوە. گومانی تیا نییە کە رەهەندی ستراتیژی هەیە بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە داوای سنورێکی باشترمان کردووە، پاڵنەری سەرەکی بۆ ئەوەی کە ئێمەی هێڵی بروکسەل قبوڵ بکەین، ئیداری بوو. لە رووی ئیدارییەوە هێڵێکی باشی سنوری گرنگی زۆری هەیە بۆ ئەوەی بتوانیت رێگە لە هێرش و پەلامار و نارەزاییەکان بگریت و خێڵەکانی هەردوو دیوی سنور کۆنترۆڵ بکەیت. دەکرێت زیاتر جەخت لە رووە ستراتیژییەکەی بکرێتەوە. ئەگەر یەکەکانی سوپای تورکیا بۆ گرتنی ویلایەتی موسڵ بەرێ بکەون، لەو ناوچەیەوە نایەن کە ئەمرۆ لەسەر شاشەکە دەیبینن. لە خۆرئاواوە دێن. بۆ ئەوان هاتن لە رێگا هێڵی ئاسنی بەغدا کارێکی ئاسانە... دەتوانن لە نوسەیبین یان هەر شوێنێکی گونجاوی دیکەوە هێز رەوانە بکەن...

بە قەناعەتی من هێڵی بروکسەل چارەسەری کۆتایی ناهێنێت. بەر لە چارەسەرکردنی کێشەکە پێویستە دانوستانی زیاتر بکەین. هێڵی بروکسەل کەم لایەنی هەیە کە بتوانیت لە رووی ئیدارییەوە بەرگری لێبکەیت. لەبەر ئەوەی کێشەی ئاشوورییە مەسحییەکان'یشی چارەسەرنەکردووە، لە روانگەیەکی فراواندا کێشەکەی چارەسەر نەکردووە. دیارە لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە دەرفەتی دۆزینەوەی بازاری لەو کەسانە وەرگرتووە کە لە باکوور دەژین. لە باکووری هێڵی بروکسەل ٢٠ یان ٣٠ هەزار مرۆڤی خێڵەکان هەن کە بە

ئاسانی ناتوانن بگەنە بازاڕی تورکەکان. هەروەها لەبەر ئەوەی لە دەرەوەی عێراق ماونەتەوە لە گەیشتن بە بازاڕی موسڵ یان قەزاکانی دەورووبەرییشدا تووشی زەحمەتی دەبن. پێویستە دانوستانەکان بەردەوام بن و ئێمە و خەڵکی عێراق'یش سەبرمان هەبێت و لە تورکیا و رای گشتی ئەو وڵاتەش چاوەڕوانی دەکرێت ئامادەگییان تێدا بێت بۆ ئەوەی کێشەکە بەشێوەیەکی دۆستانە چارەسەر بکرێت. پێموانییە ئەو قۆناغەش درێژە بکێشێت."

قسەکەی ئارنۆڵد ویڵسن راست دەرچوو. دوای وتارەکەی ئەو و سێر پێرسی کۆکس لە دەزگای شاهانەی جوگرافیا، تورکیا رێککەوتننامەکەی ئیمزاکرد. ئەو ئاشوورییانەی کە لەنێوان هەککاری - چوکورجا لە ناوچەی تیاری'دا بوون، لەوکاتانەدا یان دەربازی دیوی عێراق'ی سنورەکان ببوون یان دوورخرابوونەوە. هێڵی بروکسەل'یش بە هەندێك دەسکاری کەمەوە وەك سنوری عێراق - تورکیا مایەوە.

تورکیا ویلایەتی موسڵی لە کیس چووبوو. ئینگلیزەکان'یش نەیانتوانیبوو هەککاری بخەنە ناو سنورەکانی عێراق. ئەو "سنورە باشەی عێراق - تورکیا" کە ئەوان داوایان دەکرد، ئەمە نەبوو.

ساڵانێك دواتر دەوڵەتمەدارانی بەریتانیا تەنانەت باسیان لەوە کردووە کە پێویستە ئەو سنورەی کەسانی پێش خۆیان دەستنیشانیانکردبوو، وەك سنور حیساب نەکرێن؛

"لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی، ئامادەکارییەکان بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان دەوڵەتە هاوپەیمانە سەرکەوتووەکان و دەوڵەتە ناوەندییە شکستخواردووەکان دەستیانپێکرد. بەگوێرەی ماددەی ٢٢ی رێککەوتننامەی کۆنفرانسی ئاشتی ١٩١٩ی کۆمەڵەی گەلان لە پاریس، عێراق بە رەسمی وەك وڵاتێکی ماندای ریزبەندی A خرایە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا. ئەم خەڵاتە لە ١٨-٢٧ی نیسانی ١٩٢٠ لە کۆنفرانسی سانرێمۆ لە ئیتالیا خاڵی کۆتایی لەسەر دانرا. ئینگلیزەکان لەوێ ئەوەیان دەرخست کە پابەندی بەڵێنەکانی خۆیان بە ئاشوورییەکان دەبن کە لەکاتی جەنگی گەورەدا خزمەتێکی زۆریان کردبوو. لە ساڵی ١٩٢١ و چەند ساڵی دوای ئەوەشدا هەرچەندە هەندێك گۆڕانکاری بچووك کرا بەڵام سنورەکە تا ئەندازەیەك وەك ئەمەی ئێستا مایەوە و دەوڵەتێکی نوێی عەرەبی بەناوی عێراق دامەزرا. بەڵام ئەمە لەنێو ئاشوورییەکاندا ئەو بیرۆکەیەی نەورووژاند کە خیانەتیان لێکراوە. بەڵام لەدوای کۆتاییهاتنی ماندا، ئەوکاتەی کە عێراق لە ١٩٣٢دا لە کۆمەڵەی گەلان وەرگیرا، زۆرێك لەبەرپرسانی ئینگلیز دانیان بەوەنا کە سیاسەتی بەریتانیای کۆلۆنیال جگە لە سیاسەتێکی بەشەرەف و سەربەزرانە، هەموو شتێکی دیکە بووە. نزیکترینیان جاك ستراو وەزیری دەرەوەیە کە لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ گۆڤارێکی ئینگلیزی باسی ئەوەی کردووە کە بە تایبەتی لە دەیان ساڵەکانی کۆتایی ئیمپراتۆریدا هەڵەی گەورە کراون. ستراو تاوانی زۆرێك لەو ناکۆکییانەی ئێستا لەسەر خاك هەن، خستە ئەستۆی ئەو سنورە نامەنتیقییانەی کە هێزە داگیرکەرەکان دروستیان

کردووە. ئەوەشی پێ زیاد کرد کە ئەو سنورانەی عێراق کە لەلایەن ئینگلیزەکان'ەوە دیاری کراون سەیر و سەمەرەن."(ئیمپراتۆریای ئینگلیز لەبەر ناکۆکییە مۆدێرنەکان بە خەتابار زانرا،BBC News ١٥-١١-٢٠٠٢ , )

بەرپرسان و ستراتیژیستەکانی ئەمریکا کە ساڵی ٢٠٠٣ عێراقیان داگیرکرد و لە زەلکاوێکدا گیریان خوارد، زۆریان پێنەچوو تا"گوناحی"سنورەکانی عێراق بدۆزنەوە. ریچارد هۆلبرووك لە ٣١ی ئابی٢٠٠٣دا لە پەخشێکی راستەوخۆی فۆکس نیوزدا بە تۆنی سنۆ پەیامنێری کەناڵەکەی وت؛

"ئەو وڵاتەی کە بە عێراق ناودەبرێت هەشتا ساڵ بەر لە ئێستا لە ساڵی ١٩٢٢(ج.چ؛١٩٢١) بناخەکەی لە کۆنفرانسی قاهیرە لەلایەن وینستن چەرچڵ و ئەوانی دیکەوە دانرا. پێویستبوو لە چوارچێوەی سنورەکانی دنیای ئەمرۆدا هەرگیز بونیات نەنرایە. عوسمانییەکان ماوەی چوارسەد ساڵ ئەوێیان بە سێ ویلایەتی جیاوازی کوردەکان و سوننە و شیعەکان بەڕێوەبرد، موسڵ، بەغدا و بەسرە.

چارەسەری دروست ئەمە بوو. ئینگلیزەکان هەڵەیان کرد و ئێمەش ئێستا ئەو هەڵەیەمان بە میراتی بۆ ماوەتەوە، چونکە بەرپرسیاری بەرامبەر ئەو سنورانە هەیە کە لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی دروستکراون.

دەزانیت، شتێکی هاوشێوەی ئەمەش لە یۆگۆسلاڤیا روویدا. ئەویش لە هەمان قۆناغدا دروستکرابوو. دابەشکرا بەڵام هەتا ئەوە روویدا ٣٠٠ هەزار کەس کوژران... و ناچاربوون رێککەوتننامەی دایتۆن بکەین. لەبەر ئەوەش وتەکەی سیناتۆر لوگار راستە و پێموایە وتەکانی زۆر گرنگن. هەموو ئەو زانایانەی کە راوێژی پێکردوون باسیان لەوە کردووە کە عێراق وڵاتێکی نەریتی نییە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەمریکا و ئەوروپاییەکان پابەندی سنورەکانی ئێستان، ئەمەش ئەو شتەیە کە بە تایبەتی دەرچوون لەو بنبەستەی تێی کەوتووین دژوار دەکات."

تۆنی سنۆ لەوێدا قسەکەی هۆلبرووك دەبڕێت و دەڵێت؛"منیش رێك دەمویست بێمە سەر ئەو خاڵە. ئایا پێتوایە کە دەبێ بەڕێوەبەرایەتی و هاوپەیمانەکانی ئەو هەڵەیەی وینستن چەرچڵ راست بکەنەوە کە دواتر خۆیشی دانی پێدا ناوە؟"

هۆلبرووك دوای تۆزێك راوەستان دەڵێت ؛"با ئەمەت پێ بڵێم تۆنی"و درێژە بە قسەکانی دەدات؛

"زۆر بیرم لەمە کردۆتەوە و شتم لەبارەی نوسیوە. پێموایە لە قۆناغی بوش'ی یەکەمدا، دەکرا لە ساڵی١٩٩١ لە رێی هاوکاری تورکەکان'ەوە ئەو پرسیە چارەسەر بکرێت. لەم بارودۆخەی ئێستا ناتوانم قەناعەت بکەم بەوەی کە ئەوە دەکرێت. تورکە هاوپەیمانەکانمان لە ناتۆ و عەرەبستانی سعودی و ئێرانی'یە خراپەکان و سورییەکان و هەموو دراوسێکانی عێراق، گۆشت و ئێسقانی ئەو وڵاتە دەهاڕن. دواجاریش کۆتایی عێراق هاوشێوەی کۆنگۆ دەبێت. یانی تیرۆر تێیدا جێگیر دەبێت و دراوسێکانیش کەنار و گۆشەکانی بەتەواوی هەڵدەلووشن.

لەبەر ئەوەش بەداخەوە پێویستە دان بەوەدا بنێم کە دەرفەتی راستکردنەوەی هەڵەکەی وینستن چەرچڵ لە کیس چووە. ئەمەش واتای ئەوە دەدات کە لە قۆناغێکی زۆر سەخت و دژواردایین.″

تومەزە، من و تورگوت ئۆزال لە ساڵی ١٩٩١دا بە تەسەورێکی راستەوە لەبارەی داهاتووی عێراق کاری هاوبەشمان دەکرد.

## ٢١

# سنوره كێشراوه‌كان و گه‌لانی دابه‌شكراو

■ ■ ■



**مرۆڤایەتی بەڵام ئەزمون فێری ئەوەی کردووین کە دەوڵەتان و گەلان هیچ وانەیەک لە مێژوووە فێر نەبوون.**

**هێگڵ، فەلسەفەی مێژوو ١٨٠٧**

**رابردوو هیچ کات مردوو نییە، رابردوو تەنانەت رابردووش نییە.**

**ویلیام فاوڵکنەر**

ئەو پرسیارەی کە سنوری تورکیا - عێراق چۆن و لە چ هەلومەرجێکدا دیاری کراوە، لەگەڵ کێشەی کورد و رەهەندەکانی لە مێشکی مندا بەهێزتر بوون و منیان بە خۆیانەوە سەرقاڵ کرد. بۆ نوسینی ئەم کتێبە لە ئەرشیڤی ئینگلیزەکاندا، لە ژمارەی ئابی ساڵی ١٩٢٦ی The Geographical Journalدا (Vol.٦٨. No.٢) کۆنوسی کۆنفرانسێکم سەبارەت بە"جوگرافیای سنوری موسڵ"دۆزییەوە کە (The Royal Geographical society) لە ٨ی مارت ی ١٩٢٦دا رێکیخستبوو. لە هەندێك بەشی کتێبەکەمدا ئاماژە بەو کۆنووسە دەکەم. ئەو ئەندازیارە ئینگلیزەی کە ساڵی ١٩٢٧ یەکەم بیرە نەوتی لە کەرکوك دۆزییەوە، چەندە بەو کارەی خۆی خۆشحاڵ بووبێت، منیش بە دۆزینەوەی ئەو کۆنووسانە ئەوەندە خۆشحاڵ بووم. کاتێ کۆنووسی کۆنفرانسەکەم دەخوێندەوە، دیالۆگێکی خۆم و سێر جۆن گۆڵدن، باڵیۆزی بەریتانیا م لە ئەنقەرە(١٩٩٢-١٩٩٥) بیرکەوتەوە کە بەر لەوەی ببێتە نوێنەری وڵاتەکەی لە ناتۆ، لە ئەنقەرە وەك باڵیۆز کاری دەکرد. لە ساڵی ١٩٩٢دا، دوابەدوای یەکێك لە هێرشە بەناوبانگەکانی پ.ك.ك کە تێیدا ژمارەیەك سەرباز کوژرا بوون، لەگەڵ سەرۆك کۆمار تورگوت ئۆزال سەردانی بنکەیەکی سەربازی مان کرد لە نزیك چوکورجا کە لە سنوری عێراق -تورکیا دا بوو. لە هەککاری بە کۆپتەری سکۆرسکی بە رێ کەوتین. لە ژێرەوە چاومان بە رووباری زاپ دەکەوت کە وەك ماری پێچی دەخوارد و سەیری دۆڵی زاپمان دەکرد و بەرەو چوکورجا دەفڕین. تا ئەو جێگایەی چاو بڕ دەکات، لە ناو سنورەکانی عێراق یشدا چیا بەرزەکان ریز بە ریز دیاربوون. خاڵی سفری سنور لەسەر یەکێك لەبەرزترین گردەکان دانرابوو. هەر کە رووم بەرەو باکوور چەرخاند و رووەو هەککاری سەیرم کرد، چیا بەرزکانم بینی. کاتێ سەیری باشوور و عێراق یشم دەکرد دیسان هەر چیا بوون... چی دەبوو ئەگەر ئەو بەردە سنورییە دەیان کیلۆمەتر لە باشوور یان لە باکوور دابنرایە؟ ئەگەر ئەو بنکە سەربازییە لەوێ نەبایە چی دەبوو؟ بۆ تورکیا چ جۆرە ستراتیژێکی ئەمنی گونجاو دەبوو؟ ئەو سنورەی کە هەبوو، سنورێکی بێ واتا بوو.لەو کاتانەدا هەموو ئەو شتانەی کە لە دەروون و زەینی مندا تێپەڕ دەبوون، هەموویانم بۆ ئۆزال باسکرد. کاتێ هەمان بیربۆچوونی خۆیشم بە گاڵتە و تا ئەندازەیەکیش بەشێوەیەك کە تۆمەتباری بکەم بۆ سێر جۆن گوڵدن باسکرد، ئەو دیپلۆماتە بەریتانییە بە تەنزەوە وەڵامی دامەوە و وتی؛"ئێوە ویستتان تۆزێك لە خوارتر بێت

و ئێمەش هەوڵماندا تۆزێك لەسەرووترەوە بێت، ئیدی سنورەکەش لەو بەینەدا لە شوێنێکدا کێشرا..."

لەو کاتانەدا بەتەواوی تێنەگەیشتم کە مەبەستی لەو قسەیە چی بوو، چونکە ئەو کاتانە چیرۆکی دیاریکردنی سنورەکانم نەدەزانی. کاتێ خۆمم بە کێشەی کوردەوە سەرقاڵ کرد، ئەو زانیارییەشم دەسکەوت. ئەوەی کە سێر جۆن گۆڵدن دەیویست باسی بکات، هێڵی سنوریی برۆکسەل بوو. ئەو هێڵە سنورییەی کە بە هێڵی برۆکسەڵ ناسراو لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە قبوڵکرا، دواتر سەرەڕای هەندێك دەسکاری کەم بایەخ وەك سنوری تورکیا - عێراق دەستنیشانکرا. سەرەڕای ئەوەی کێشەی موسڵ لە لۆزان هەڵپەسێردرابوو، کێشەکەی چارەسەرنەکرا و دۆسییەکەشی دانەخرا. بەریتانیا هەرێمی شاخاوی باکووری بۆ دەوڵەتی نوێی عێراق وەك گەرەنتییەك لە بەرامبەر تورکیا سەیردەکرد و گرنگییەکی ژیانیی پێدەدا. ئینگلیز و تورکەکان بەشێوەیەکی جیاواز سەیری کێشەکەیان دەکرد.

"بۆ ئینگلیزەکان کێشەی سەرەکی ئەوە بوو کە سنوری باکووری عێراق لە کوێوە تێپەڕ دەبێت. بۆ تورکەکان'یش ئەوەی کە مایەی ناکۆکی بوو، ئەوە بوو کە ئەوان ئیدیعایان دەکرد ویلایەتی موسڵ بەشێکە لە خاکی تورکیا و کێشەیان لەسەر هەموو خاکەکەی هەبوو."(The Creation of Iraq ۱۹۱٤-۱۹۱۸, Susan Shieldes, Mosul Questions, p ٥٤.Columbia University Press, New York, ۲۰۰٤)

هەرچەندە مەسەلەی خاوەندارێتی ویلایەتی موسڵ بەتەواوی یەکلانەکرابووەوە، بەڵام لە راستیدا تورکیا لە لۆزان موسڵی لە کیس چووبوو.

"چارەنوسی موسڵ لە لۆزان دیارینەکرا. تورکەکان گوتیان کوردەکان کە بەشێکی گرنگی دانیشتوانی ناوچەکە پێکدەهێنن، تورکن. ئەنسیکلۆپیدیای بەریتانیکا'ش وەهای دەگوت. لەبەرامبەر ئەوەشدا کورزۆن گوتی دۆزینەوە و کەشفکردنی تورکبوونی کوردەکان، لە مێژوودا بۆ یەکەمجار بۆتە نسیبی ئەندامە تورکەکان و لەمەوپێش کەس رێی لە شتی وەها نەکەوتووە. دواجار کێشەی موسڵ حەواڵەی ئەو کۆمەڵەیە کرا کە رادەستی عێراق'ی دەکرد و کورزۆن'یش هەر ئەمەی دەویست."(Walter Reid, Empire of sand – How Britian Made The Middle East, Birlinn Ltd., Edinburgh, ۲۰۱۱, p. ۱۹۲-۱۹۳)

کتێبە مێژووییەکانی ئینگلیزەکان بەپێچەوانەی ئەو گوتارە رەسمییە مێژووییەی کە لە تورکیا فێر دەکرێن، رێککەوتننامەی لۆزان بەسەرکەوتنێکی سیاسی کورزۆن ناودەبەن. لەوجۆرە دەقانەدا باس لەوە کراوە کە لە لۆزان'دا چارەسەرکردنی کێشەی موسڵ وەك ئەوەی کە ئینگلیزەکان دەیانویست دواخرا و لەگەڵ ئەوەشدا رێگا لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی گیرا.

"شێوازی بەڕێوەبردنی دانوستانەکانی کورزۆن سەرکەوتنێکی سیاسی بوو...J.St. Loe Strachey سەرنوسەری بە ناوبانگ و کاریگەری Spectator سەبارەت بە رەفتارەکانی کورزۆن لە لۆزان ئەم شتانەی نوسیوە؛ ئەوانەی کە بەدەستتان هێناون یەکێکن لەو موعجیزانەی دەوڵەتمەدارەکان کە لە ئاستی دەسکەوتەکانی Talleyrandدایە کە لە کۆنگرەی ڤییەنا دەستی خستوون. بە بێئەوەی هیچ کارتێکتان لە دەستدا بێت چوونە ناو کۆنفرانسەکە و لەگەڵ ئەوەشدا تەنها لە رێگەی هێزی بەڕێوەبردن و کارێکی ژیرانە و لەبەرچاوگرتنی ئامانجەکان و هەبوونی و زانیاری سەبارەت بە کێشەکە توانیتان لە ماوەیەکی کورتدا سەرکەوتن بەدەستبهێنن و بەوجۆرەش ئەو ئاستە دیپلۆماتییەمان بەرز بکەنەوە کە پێشتر دابەزیبوو."(رەید، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٠)

کاتێك ئەم دێڕانەم دەخوێندەوە ئەوەم بیرهاتەوە کە جارێك تورگوت ئۆزال پێیگوتبوم عیسمەت ئینەنۆ لە لۆزان نەیتوانیوە دەستی لۆرد کورزۆن باش بخوێنێتەوە و نەیزانیوە ئەو سەبارەت بە موسڵ تەنها هەڕەشە دەکات. کاتێك منیش لێم پرسیبوو لە کوێوە گەیشتنە ئەم ئەنجامە؟ لە وەڵامدا پێیی گوتبووم؛"لە رێی خوێندنەوەی ئەرشیڤەکانی کۆشکی چانقایا."

بیروبۆچوونی مێژوونوسە ئینگلیزەکان لەگەڵ دیدگای تورگوت ئۆزال سەبارەت بە لۆزان یەکیاندەگرتەوە. دوابەدوای لۆزان، کۆمەڵەی گەلان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی موسڵ، بەواتایەکی دیکە بۆ دیاریکردنی چارەنوسی ویلایەتی موسڵی عوسمانلی، کۆمیسیۆنێکی پێکهێنا. دوای دیاریکردنی هێڵی بروکسەل وەك سنوری ویلایەتی موسڵ کە دواتر دەبووە سنوری عێراق - تورکیا، لە مانگی یانزەی ساڵی ١٩٢٤دا کۆمەڵەی گەلان کۆمیسیۆنێکی تایبەت بە موسڵ دروستکرد. ئەو کۆمیسیۆنە کە بە سەرۆکایەتی کارل ئەینار ویرسۆن پێکهێنرابوو، دو ئەندامی دیکەی هەبوو کە یەکیان کۆنت پاڵ تەلەکی سەرۆك وەزیرانی پێشووی مەجارستان بوو کە بەئەندازەیەک لایەنگری تورکەکان بوو خۆی وەك ئەندامی کۆمەڵەی توران ناونوس کردبوو. ئەوی دیکەشیان ئەفسەرێکی بەلجیکی بوو بەناوی عەقید ئالبیرێت پاولیس کە لە جەنگی جیهانی یەکەم و لەکاتی شەڕی داگیرکاری کۆنگۆ لە سوپای وڵاتەکەیدا کاری کردبوو. ئەو لیژنە سێ کەسییە سەردانی ناوچەکەیان کرد و لەنێوان مانگی یەکی ساڵی ١٩٢٥ تا مانگی سێی ئەو ساڵە، بست بە بستی خاکی ویلایەتی موسڵ گەڕان و لە مانگی تەمووزی هەمان ساڵیشدا راپۆرتی خۆیان پێشکەشی کۆمەڵەی گەلان کرد.

بیرۆکەی دروستکردنی لیژنەی موسڵ لە کۆمەڵەی گەلان، هی ڤوودرۆ ویڵسن سەرۆکی ئەمریکا بوو. بەپێی پرەنسیپی مافی دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەکان کە لەدوای جەنگی گەورەوە زۆر باوی هەبوو، دەبوو لیژنەکە سەردانی ویلایەتی موسڵ بکات تا بزانێت خەڵکی ئەوێ چی دەوێت و بەگوێرەی

ئەوەش راپۆرتێك پێشکەشی کۆمەڵەی گەلان بکات.

ویرسۆن و کۆنت تەلەکی و ئالبرێت پاولیس لەگەڵ جێگرەکانی خۆیاندا سەرەتا چوونە بەغدا و لە ۱۹۲۵/۱/۲۷دا دەربازی شاری موسڵ بوون. لە ماوەی ئەو سێ مانگەشدا کە لەنێو سنورەکانی پارێزگای موسڵ بوون، سەبارەت بە تۆپۆگرافیا و ئابووری و ئەو خاکانەی کە گونجاون بۆ کشتوکاڵ و رێگا بازرگانییەکان و پێکهاتەی ئەتنی پارێزگاکە لێکۆڵینەوەیان کرد. یەکێك لەو گرنگترین کارانەی کە لەو ماوەیەدا کردیان ئەوە بوو کە راستەوخۆ لەگەڵ سەدان کەسایەتی دانیشتووی پارێزگاکەدا کۆوبوونەوەیان کرد. لایەنی ئینگلیز و تورکەکان لیستی ئەو کەسانەیان پێدەدان کە دەبوو چاوپێکەوتنیان لەگەڵ بکەن. ئەندامانی کۆمیسیۆن جگە لە چاوپێکەوتنی رووبەڕوو لەگەڵ ئەوانەدا، لەگەڵ سەرۆك خێڵ و شێخەکانی کورد و پیاوانی ئایینی و بارزرگان و خاوەن و موڵك و پیشەوەران و خانەدانەکانی ناوچەکەشدا کۆبوونەوە و ویستیان بزانن کە ئایا دانیشتوانی پارێزگاکە خۆیان بە عێراق'ی دەزانن یان خۆیان بە تورك لە قەڵەم دەدەن. زانیاری سەبارەت بەوەی کە ئینگلیزەکان بۆ کاریگەری دانان لەسەر هەر سێ ئەندامەکەی لیژنەکە چ جۆرە هەوڵ و تەقەلایەکیان داوە و چۆن هەوڵیانداوە تایبەتمەندییەکانی هەریەك لەوانە بزانن، لەنێو دوو بەرهەمی پڕبایەخی دوو بەرپرسی ئینگلیزدا بە ناوەکانی C. J. Edmonds وWallace Lyon کە لەو کاتانەدا لە ویلایەتی موسڵ بوون بە ئاسانی دەسدەکەوێت. ئێدموندس زانیاری و تێبینییەکانی خۆی لە کتێبێکدا بەناوی کورد و تورك و عەرەبەکان، سیاسەت و گەشت و لێکۆڵینەوە لە باکووری خۆرهەڵاتی عێراق ۱۹۱۹-۱۹۲۵'دا کۆکردۆتەوە. بە هەمانشێوە والاس لیۆن لە کتێبێکدا بەناوی کورد و عەرەب و ئینگلیزەکان ۱۹۱۸-۱۹٤٤، کە بە ئیلهام وەرگرتن لە کتێبەکەی ئێدمۆندس نوسیویەتی، بیرەوەرییەکانی خۆی کۆکردۆتەوە.

لە ساڵانی ۲۰۰۰کاندا، لەدوای جەنگی عێراق ئەوکاتەی کە بەدوای کاریگەری کێشەی موسڵ لەسەر عێراق و تورکیا و کێشەی کورد دەگەڕام، ئەو کتێبانەم دۆزییەوە. هەرکە ئەوانەشم دەخوێندەوە زیاتر درکم بەوە دەکرد کە چەندە کار و لێکۆڵینەوە مێژووییەکان سەبارەت بە گرنگترین کێشەی تورکیا کەموکوڕییان هەیە و چۆن رای راگشتی تورکیا ساڵانێك بە نەزانی و بێئاگایی لەو کێشەیە مەحکووم کراوە. دەیان ساڵ بە بێ پرسیارکردن ئەوەمان قبوڵ کردبوو کە موسڵ بەشێوەیەکی ناهەق لە تورکەکان وەرگیراوە و دراوە بە ئینگلیزەکان، بەڵام بێئاگا بووین لەوەی کە ئەمە چۆن روویداوە. بەدەر لەوەش نەماندەزانی جیاوازی نێوان شار و سانجاقی موسڵ لەگەڵ پارێزگای موسڵ لە چیدایە. ئەوەشمان نەدەزانی کە ویلایەتی موسڵ چ شوێنێنك لە خۆ دەگرێت و ئەوەشمان نەدەزانی کە زۆربەی دانیشتوانی ئەو ویلایەتە کوردبوون.

با بگەڕێینەوە سەر کۆمیسیۆنەکە...

ئەنجامی کاری کۆمیسیۆنی موسڵ دەریخست کە خەڵکی پارێزگاکە زیاتر بە هۆکارە ئابورییەکانەوە دەجوڵێنەوە. ئەمەش لەکاتێکدابوو کە کۆمیسیۆنەکە پێیوابوو دانیشتوانی ویلایەتەکە لەبنەڕەتدا بەهۆی بنەما ئەتنییەکانەوە هەڵوێست وەردەگرن و چارەنوسی پارێزگاکەیان دیاریدەکەن. ئەنجامێکی دیکە کە کۆمیسیۆنەکە پێی گەیشتبوو ئەوەبوو کە پارێزگاکانی بەغدا و بەسرە بە بێ پارێزگای موسڵ ناژین. مانەوەی بەغدا و بەسرە لە رووی ئابورییەوە، وابەستەی ئەو دەغڵ و دانە بوو کە لە موسڵ بەرهەم دەهێنرا. کۆمیسیۆن لە راپۆرتەکەیدا ئاماژەی بەوە دابوو کە ئەو ناوچەیەی ناکۆکی لەسەرە، لە رووی یاساییەوە بەشێکە لە خاکی تورکیا و هیچ کێشەیەك نییە لەوەی کە وەك بەشێکی دانەبڕاوی خاکی ئەو وڵاتە سەیر بکرێت و سەرەڕای هەبوونی هەندێك تێبینی ئینگلیزەکان، هەتا ئەوکاتەی تورکیا واز لە مافەکانی خۆی سەبارەت بە موسڵ دەهێنێت، دەکرێت هێڵی سنوریی بروکسەل وەك ئەنجامێکی لۆجیکی سەیر بکرێت. بەگوێرەی گوزارشتە جیاوازەکانی کۆمیسیۆن، ئەگەر دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ تەنها خاك بە بنەما وەربگرن، ئەوان زیاتر لە تورکیا، دەیانەوێت لەگەڵ عێراق'دا بمێننەوە، بەڵام ئەم ویست و ئارەزووەیان بۆ ئەو عێراق'ەیە کە لە ژێر ماندای ئینگلیزەکان'دا بێت و لەمەشدا پاڵنەرەکەیان ئابورییە. ئەگەر ئەم دوو فاکتەرەش نەبێت، لەوانەیە زۆربەی دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ لە جیاتی عێراق، تورکیا هەڵبژێرن. بەو پێیە ئەگەر لە جیاتی یان عێراق یان تورکیا، بژارەی یان تورکیا یان عێراق'ی ژێر دەسەڵاتی ماندای ئینگلیز هەبێت، زۆربەی دانیشتوانی ویلایەتەکە عێراق'ی ژێر دەسەڵاتی ماندای ئینگلیز هەڵدەبژێرن. لە ئەنجامدا کۆمیسیۆنەکە پێشنیاری کرد موسڵ بە عێراق'ەوە بلکێنرێت، بەڵام بۆ ئەوەش هەندێك مەرجی دانا. بەو پێیە پێویستبوو ناوچەکە بۆ ماوەی ٢٥ساڵ لە ژێر دەسەڵاتی ماندای کۆمەڵەی گەلان دا بێت و کۆمەڵەی گەلانیش مافی ماندای خۆی بە ئینگلیزەکان دابوو. مەرجی لەوەش گرنگتر پەیوەندی بە کوردەکان'ەوە هەبوو. جگە لەوە مەرجێکی دیکەش هەبوو کە پەیوەندی بە کوردەکان'ەوە هەبوو. دەبوو کوردەکان لە بەڕێوەبردنی ناوچەکەدا جێ بگرن و لە دامودەزگا پەروەردەیی و دادپەروەرییەکانی ناوچەکەدا ئەرك'وەربگرن و زمانی کوردی لە هەموو خزمەتگوزارییەکاندا بەکار ببرێت. بەوەش جۆرە ئۆتۆنۆمییەك بۆ کوردەکان بە رەسمی ناسێنرابوو.

یەکێکی دیکە لە بەندەکانی راپۆرتەکەی کۆمیسیۆنەکە پەیوەندی بەوە هەبوو کە دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ دەتوانن لە هەندێك هەلومەرجی دیاریکراودا لە جیاتی سەروەری و دەسەڵاتداریی عەرەب، دەسەڵاتداریی تورك قبوڵ بکەن. بەگوێرەی ئەوە، ئەگەر لەگەڵ کۆتاییهاتنی رێککەوتننامەی عێراق و بەریتانیا، ماندای کۆمەڵەی گەلانیش کۆتاییپێهات و تا ئەوکاتەش مافە پەسندکراوەکانی کوردەکان

جێبەجێ نەکران، ئەگەر خەڵك ویستی، دەکرێت بەڕێوەبردنی ویلایەتی موسڵ رادەستی تورکەکان بکرێتەوە. لە ساڵی ١٩٣٢دا دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی ماندا کۆتایی هات و بە رواڵەت عێراق وەك یەکەم وڵاتی سەربەخۆی عەرەبی لە مەیدانی نێودەوڵەتیدا دەرکەوت و تا ئەوکاتەش مەرجەکانی کۆمیسیۆنی موسڵ جێبەجێ نەکران. هەوڵەکانی جەلال تاڵەبانی لە ساڵی ١٩٩١، بۆ ئەوەی بە بیری تورگوت ئۆزال بهێنێتەوە کە تورکیا مافی یاسایی بەسەر کوردستانی عێراق‌ەوە هەیە، هەروەها ئەو مافە یاساییانەی تورکیا لەسەر ویلایەتی موسڵ کە لە گۆڤاری نەشناڵ ریڤیوی ئەمریکایی‌دا باسکرابوون و بەر لەوەی من سەردانی لەندەن بکەم تا یەکەم دیداری تاڵەبانی - ئۆزال رێکبخەم و ئۆزال لە کۆشکی چانقایا بۆ من باسیکردبوون، پەیوەندییان بەو مەرجانەی کۆمیسیۆنی موسڵ هەبوو کە جێبەجێ نەکرابوون. کۆمەڵەی گەلان هەر لە هەمان ساڵدا لیژنەیەکی دیکەی رەوانەی پارێزگای موسڵ کرد. ئەم لیژنەیە کە بە ئەندازەی لیژنەی یەکەم سەرنجی رانەکێشابوو، لەلایەن کەسێکی ئەستۆنیایی بەناوی ژەنراڵ لایدۆنەر(Johan Laidoner) سەرۆکایەتی دەکرا. ژەنراڵ لایدۆنەر لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩٢٥دا لە موسڵ گەڕایەوە و راپۆرتەکەی خۆی پێشکەش کرد. راپۆرتەکەی لایدۆنەر بەئەندازەیەکی زۆر لەگەڵ راپۆرتەکەی ڤیرسۆن-تەلەکی- پاولیس دا یەکی دەگرتەوە و هەمان ئەنجامی دەستخستبوو. دواجار کۆمەڵەی گەلان لە١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥دا سەبارەت بە پێگەی پارێزگای موسڵ بڕیاری خۆی دا. تایبەتمەندی کاتیبوونی هێڵی سنوری بروکسەل هەڵگیرا و وەك سنوری هەمیشەیی عێراق - تورکیا دەستنیشانکرا و ویلایەتی موسڵ لە ژێر دەستی تورکیا دەرکەوت و بە پادشایی عێراق‌ەوە لکێنرا کە لە ژێر کۆنترۆڵی ئینگلیزەکان‌دا بوو. لەگەڵ ئەوەشدا هەککاری لەنێو سنورەکانی تورکیا مایەوە. لە ئەنجامدا لە کێشمەکێشی نێوان تورکیا و ئینگلتەرە سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ، ئینگلتەرە سەرکەوتنی بەدەستهێنا. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لە پشت ئەو سەرکەوتنەی کە بەریتانیا لە ویلایەتی موسڵ لەبەرامبەر تورکیا بەدەستیهێنا، گەڕان بەدوای فێڵبازی و لێزانینی سیاسیی بەریتانییەکان، لەوانەیە کارێکی لە جێی خۆیدا نەبێت و لەگەڵ راستییە مێژووییەکاندا یەکنەگرێتەوە. چونکە هەندێك رووداو پێشهاتی ناوخۆیی تورکیا و تەنانەت ئیرادە و ویستی بەڕێوەبەرانی تورکیا، دەوری گرنگیان هەبووە لەوەی کە تێکۆشانی تایبەت بە ویلایەتی موسڵ شکست بخوات.

یەکێك لەوانە پەیوەندی بە لابردنی خەلافەتەوە هەبوو لە ساڵی ١٩٢٤ کە هاوکات بوو لەگەڵ ئەوکاتەی تورکیا بەتوندی بەرگری لە خاوەندارێتی ویلایەتی موسڵ دەکرد. هەڵگرتنی خەلافەت بووە هۆی پچڕانی یەکێك لە گەورەترین پابەندییە مەعنەوییەکانی کوردەکان بە تورکیا کە زۆرینەی دانیشتوانی ویلایەتی موسڵیان پێکدەهێنا.

"لە ناوەڕاستی مارت'دا بەسەرسووڕمانەوە ئاگاداری ئەوە بووین کە پەرلەمانی تورکیا لە ٣ی مارت'دا لە ڕێگەی دەرکردنی یاسایەکەوە کۆتایی بە خەلافەت هێناوە. چونکە یەکێك لەو شتانەی کە بەردەوام دەمانبیست، پڕوپاگەندەیەك بوو کە وەك گرکانێك دەتەقییەوە و بۆ هاندانی کوردەکان بەکاردەهات، ئەویش وابەستەیی کوردەکان بە باڵاترین دەسەڵاتی دینی بوو کە تا ئاستێکی خورافی ڕۆیشتبوو. لە رواڵەتدا زۆر زەحمەت بوو بڕوا بەوە بکەیت تورکەکان خۆیان بەڕەکەیان لە ژێر پێی خۆیان راکێشاوە و هۆکاری وابەستەبوونی کوردەکانیان بە خۆیان لەناوبردووە. دیارە ئێمەش هەلی بەکارهێنانی قۆناخی تازەمان لە کیس نەدا. بەڵام زۆری پێچوو تا لە شوێنە لادێ نشینەکاندا بتوانیت لە زەینە بەستووەکاندا کاریگەی دابنێیت و گرنگی ئەم ڕووداوە دەربخەیت و باس لەوە بکەیت کە پەیوەندیی کۆنی ئەوان لەگەڵ مەقامی خەلافەتی تورکیا کۆتاییپێهاتووە."(ئێدمۆندس، هەمان سەرچاوەی پێشوو'ل٣٨٣،٨٤)

ئەگەر پێویست بە بیرهێنانەوە بکات، زیاتر لە ساڵێك دوای ئەوەی پەیوەندی مەعنەوی کوردەکان لەگەڵ تورکیا بەهۆی لابردنی خەلافەتەوە سست ببوو، کۆمیسیۆنی موسڵ لە تەمووزی ١٩٢٥دا راپۆرتەکەی خۆی پێشکەشی کۆمەڵەی گەلان کردبوو. ئامۆژگاریشی کردبوو تا کەم و زیاد سنورەکانی ویلایەتی موسڵ وەك خۆی بمێننەوە و ئەو پارێزگایە بە دەوڵەتی عێراق'ەوە بلکێنرێت. بەڵام دوو مەرجی تایبەتی بۆ ئەوە زیادکردبوو. بەو پێیە، دەبوو عێراق بۆ ماوەی ٢٥ساڵ لە ژێر دەسەڵاتی ماندای ئینگلیز'دا بێت و دەوڵەتی عێراق تایبەت بوونی پێکهاتەی ناوچە کوردییەکان بەجۆرێک قبوڵ بکات کە کوردەکان بتوانن خۆیان بەڕێوەببەن و و بەهۆی دامودەزگاکانی خۆیانەوە شوناسە کەلتوورییەکەی خۆیان گەشە پێبدەن.

"لە کانوونی یەکەمی ١٩٢٥دا کۆمەڵەی گەلان راپۆرتەکەی کۆمیسیۆنی قبوڵ کرد. لەو بەینەشدا هەتا ئەوکاتەی کە عێراق دەبووە ئەندامی تەواوی کۆمەڵەی گەلان (لە ساڵی ١٩٣٢دا ئەوە روویدا) دەبوو ئینگلتەرە کار بۆ رێککەوتنێکی نوێی ئینگلتەرە - عێراق بکات کە ٢٥ساڵ بخایەنێت و پێشنیار بۆ بەڕێوەبردنیەکی ئۆتۆنۆمی کوردی بکات. تورکیا لەم ئەنجامە نارازی بوو بەڵام چارەیەکی جگە لە قبوڵکردنیشی نەبوو."(Charles Tripp, A History of Iraq, p.٥٩, Cambridge University Press, ٢٠٠٠)

شەش مانگ دوای ئەوەش لە حوزەیرانی ١٩٢٦دا تورکیا بەپێی رێککەوتنێکی سێقۆڵی لەگەڵ بەریتانیا و عێراق بە بەڵگەوە جیابوونی پارێزگای موسڵی لە خۆی قبوڵ کرد.

"رازیبوونی تورکیا بەو رێککەوتنە سێقۆڵییە، لەبەرامبەر وەرگرتنی١٠٪ی داهاتی نەوتی عێراق بۆ ماوەی ٢٥ساڵ (تا ساڵی ١٩٥١) لەگەڵ وەرگرتنی ٥٠٠هەزار ستەرلینی ئینگلیزی، ئەوەی دەردەخست

که حکومەت تورك لەو کاتەدا لە چ بارودۆخێکی کارەساتباردا بووە." (Gorge E. Gruen, The Oil Resources of Iraq; Their Role in the Policies of the Great Power, The Creation of Iraq, Columbia University Press, New York, ٢٠٠٤, p.١٢٢)[11]

بەڵام ئەوەش هەڵەیە لەمەوە ئەو ئەنجامە دەربخرێت کە حکومەتی تورك بە پارە ویلایەتی موسڵی فرۆشتووە. یەکێك لەو خاڵانەی کە لە نوسینی مێژووی تورك'دا زۆر جەختی لەسەر نەکراوە ئەوەیە کە بەپێچەوانەی ئەو قەناعەتە باوەی گوتاری رەسمی دەیان ساڵە برەوی پێدەدات، رژێمی کەمالیستی نوێی تورکیا بە ئەنقەست و بە بێئەوەی دەربیخات، ویستوویەتی واز لە موسڵ بهێنێت.

"رژێمی تورك دەستی بە ئامادەکردنی رای گشتی بۆ قبوڵکردنی لە کیس چوونی موسڵ کردبوو کە شتێکی حاشاهەڵنەگر بوو. ئەو ئامادەکردنەی رای گشتی کە بەهۆی راگەیاندنی تورك'ەوە دەکرا، لەلایەن ئینگلیزەکان بە وردی چاودێری کرا... بەپێی لێکۆڵینەوەیەکی ئینگلیزەکان کە هەفتەیەك دوای رێککەوتنی موسڵ ئەنجامدرا، میدیای تورکی بە ئارامییەکی جێی سەرنجەوە لەگەڵ ئەو رووداوەدا جووڵاوەتەوە. جگە لەوەش گۆڕانکارییەکی سەیر لە دیدگای ئینگلیزەکان'دا سەبارەت بە تورکیا بەرچاودەکەوت. ليندسای باڵیۆزی بەریتانیا لە ئەنقەرە لە تەلگرافێکدا کە بۆ سێر ئاوستین چامبەرلین ناردوویەتی، نوسیویەتی؛ پێویستە ئەوە بە بیر بهێنمەوە کە بەڕێوەبەرانی ئێستای تورکیا تەنها کارەساتی گەورە و زنجیرەیەك هەڵەی کوشندەیان لە رژێمی پێشوو بە میرات وەرگرتووە. ئەرکی سەرەکی حکومەتی ئێستا دابینکردنی ئاسایشە.

تەوقیتی قبوڵکردنی بارودۆخەکە نیشانەی گۆڕانکارییەکی گەورە لە سیاسەتی دەرەوەی تورك'دا بوو. لە ماوەی ئەو ساڵانەدا تورکیا لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسا و بەئەندازەیەکی کەمتریش لەگەڵ ئەمریکا پەیوەندییەکی دۆستانەی بەرقەرارکردبوو. ئەمەش وایکردبوو تا لەبەرامبەر هەڕەشەی یەکێتی سۆڤییەتی هێرشکاردا هاوسەنگییەکی گرنگ دروستبکات. لە ساڵی ١٩٣٠دا حکومەتی تورك پاکێتێکی دۆستایەتی لەگەڵ بەریتانیا مۆرکرد و بەوەش لە رووی تیۆرییەوە ئەو دەوڵەتە گەنجە گەیشتە پێگەیەك کە بتوانێت لەگەڵ هەموو دەوڵەتە گەورەکاندا پەیوەندی دۆستانە بەرقەرار بکات. دۆستایەتی و هاوکاری بەریتانیا

١١-لە مارتی ١٩٢٥دا حکومەتی عێراق و کومپانیای نەوتی تورکی (تی پی سی) Turkish Petroleum Company (تی پی سی لە ساڵی ١٩٢٩دا ناوی کۆمپانیای نەوتی عێراقIraq Petroleum Company ی وەرگرت) رێککەوتننامەیەکی نوێیان مۆر کرد. تی پی سی دەستەیەکی هاوکاری کۆمپانیا نەوتییەکان بوو کە لەسەر بنەمای پێشبینییەکانی هەبوونی نەوت لە میزۆپۆتامیا بەر لە جەنگی جیهانی بە رەزامەندی حکومەتی عوسمانلی دروستکرابوو.
لە رێککەوتننامەکانی دوای جەنگ، پشکەکانی عوسمانلی و ئەڵمانیا لەو کۆمپانیایەدا کەوتە دەستی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان. لە کۆتاییەکانی ١٩٢٠کاندا، دوابەدوای گونجانی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا، Anglo-Persian Oil Company کە دواتر دەبوو بە BP بە رێژەی ٢٣,٧٥٪، و Shell بە رێژەی ٢٣,٧٥٪ و بە هەمان ئەندازەش کۆمپانیای ستاندارد ئۆیلی نیوجێرسی Standard Oil of New Jerseyلەو کۆمپانیایەدا پشکی بەرکەوت کە تێیدا گولبەنکیان بە رێژەی ٥٪ پشکی هەبوو. حکومەتی ئینگلیز لە سایەی Anglo-Persian Oil Companyبوو بە بەهێزترین شەریکی کۆمپانیاکە.
بۆ یەکەمجار نەوتی عێراق لە کەرکوك لە تشرینی یەکەمی ١٩٢٧دەرهێنرا، بەڵام بۆ ئەوەی رەوانەی بازاڕ بکرێت بۆ ماوەیەك چاوەڕوانی دروستکردنی هێڵی بۆری گواستنەوەی نەوت کرا.

بووە هۆی ئەوەی هەڕەشەی یۆنان لەسەر تراکیای خۆرئاوا کەم بێتەوە. سنورەکانی باشوور لە ژێر ماندای ئینگلیز و فەرەنسییەکان'دا بوون و ئەمەش بۆ ئەوان گرفتی دروستدەکرد. لە خۆرهەڵات و باکوور'یش، ئێران و یەکێتی سۆڤییەت هەبوون کە پاکێتی دۆستایەتییان مۆرکردبوو. بەهۆی تێکەڵکردنی کارتەکانەوە کێشەکان لەگەڵ بولغاریا'ش وەك جاران زەق نەبوون.

ڕووداوێکی گرنگی دیکە کە پشتگوێ خرا بەڵام کاریگەری لەسەر حیسابە نەتەوەییەکان دادەنا، ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید بوو. ئەم ڕاپەڕینە سەختە کە ماوەیەکی کورتی خایاند لە مانگی نیسانی ١٩٢٥دا لە دیاربەکر دەستپێکرد (ج.چ؛ لە شوبات دەستپێکرد و لە نیسان'دا سەرکوتکرا.) و چەند مانگێکی خایاند. بۆ سەرکوتکردنی ئەو ڕاپەڕینە پێویستی بە هێزێکی ٢٥ هەزار کەسی کرد. واتای ئەو ڕاپەڕینە بۆ حکومەت زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو. وەك خاڵی یەکەم کێشەیەکی ئەمنی ناوچەیی دروستدەکرد. تورکەکان زۆر بە باشی دەیانزانی ئەمە هەتا بەر لە حکومەتی عوسمانلی'ش هەر بەوجۆرە بووە. خاڵی دووەمیش ئەوە بوو کە هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵکردنی ویلایەتی موسڵ، لە ئاستێکی بەرزدا پێویستی بە تەواوکاریی سەربازی لەو خاکانەدا هەبوو کە تێیدا دوژمنایەتی (تورکیا) دەکرا. هەوڵدان بۆ دابینکردنی سەقامگیری ناوچەکە بۆ حکومەتی تورك کە خۆی لە کێشەدا بوو، واتای وشك کردنی سەرچاوەکانی دەدا. هەرچەندە کوردستانێکی دابەشکراو بۆ سەرکردەکانی ڕژێمی نوێ، لەسەرووی هەموشیانەوە ئینەنۆ مایەی نیگەرانی بوو، بەڵام لە کیس دانی موسڵ لە ڕووی جوگرافییەوە سنورێکی زۆر گونجاوی بۆ تورکەکان دروستدەکرد. تورکەکان لە ڕێی جێهێشتنی موسڵ، ڕێگایەکی سەرەکی گەیاندن و گواستنەوە و نەوتی کەرکوك'یان لە کیس چوو، بەڵام لە هەمانکاتدا لەسەرووبەندی بەردەوامبوونی جێگۆڕکێی دانیشتوان لە قۆناغی پاش لۆزان، وازهێنان لە بەشێکی زۆر لە کوردەکان بۆ ئەو نەتەوەگەرا تورکانەی کە چرووتگرامی بە تورك کردنیان دەستپێکردبوو، شتێکی سەرنجڕاکێش بوو..."(David Cuthell, A Kemalist Gambit – A View of the Pollitical Negotiation and the Determination of the Turkish-Iraqi Border, The Creation of Iraq١٩١٤-١٩٢١, Columbia University Press, ٢٠٠٤, p.٨٩,٩٠)

گرنگی ئەمنی ئەو جوغرافیایەی کە ویلایەتی موسڵی تێدابوو شتێك نەبوو کە تەنها لە ئەولەویەتی تورکەکان'دا بێت، بەڵکو لە مێژوودا بۆ هەرکەسێك کە حوکمڕانی ئەو ناوچەیەی کردبێت هەمان واتا و گرنگی هەبووە. خۆی لە خۆیدا لە ماوەی سەدان ساڵدا ویلایەتی موسڵ جگە لە حەوشەیەکی بێدەنگی پشتەوە، بەهایەکی ئەوتۆی بۆ ئیمپراتۆریای عوسمانلی نەبوو. جگە لە ئاسایشی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ گرنگییەکی دیکەی بۆ ئەوان نەبوو. بۆ ئینگلیزەکان'یش ویلایەتی موسڵ کە باشووری کوردستان یان کوردستان'ی عێراق'یشی پێدەوترێت، لە ڕووی یەدەگی نەوت و ئەو ڕۆڵەی کە وەك شوێنی

کۆکردنەوەی دانەوێڵە و دەغڵ و دانی پارێزگاکانی بەغدا و بەسرە هەیبوو، لەبنەڕەتدا وەك دیوارێکی ئەمنی و ناوچەیەکی قەدەخەکراو لەبەرامبەر تورکیا بۆ ئەو عێراق'ە گرنگی هەبوو کە پەرەستاریی لە دایکبوونیان دەکرد. ئەوکاتەی کە ئەوان بۆ پارێزگاریکردن لە مەسیحییە نەستوورییەکان هەوڵیاندا هەککاری لە سنورەکانی عێراق'دا بێت و ئەمەش سەری نەگرت، ئیدی سنوری تورکیا - عێراق'یان لە لوتکەی چیا بەرزەکانەوە کێشا و هۆکاری ئەمەش تەنها بۆ نیگەرانییە ئەمنییەکان دەگەڕایەوە. لەبەر ئەوەی کە سنورەکانی ویلایەتی موسڵ'یش لە پێکهاتەی ئیداری عوسمانلی'دا کەم و زیاد هەر بەوجۆرە بوو، کارەکەیان ئاسانتر سەری گرت.

بەکورتی دەتوانرێت بگوترێت کە ئامانجی سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا لەو ساڵانەدا خۆ نزیککردنەوە لە بەریتانیا بوو. جگە لەوە، تورکیا حیسابی کەمکردنەوەی ژمارەی دانیشتوانی کورد'ی نێو خۆیشی دەکرد کە کۆنترۆڵکردنیان کارێکی ئاسان نەبوو. لەم روانگەیەوە کوردستانێکی دابەشکراو بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی ئەو بوو. بەهۆیەشەوە رازیبوو ئەو ناوچەیەی کە لە مێژوودا هەمیشە وەك یەکەیەکی جیۆپۆلیتیکی دەرکەوتبوو، دابەشبکرێت و وازی لە ویلایەتی موسڵ هێنا... ئەمەش راستییەك بوو کە لە دەقە مێژووییە رەسمییەکانی تورك'دا نەنوسرابوو.

لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا دوورکەوتنەوەی ئیمپراتۆریای عوسمانی لە بەریتانیا کە هەتا ئەوکاتە گەورەترین گەرەنتی یەکپارچەیی خاکەکەی بوو، کۆتایی ئیمپراتۆریاکەی بەدوای خۆیدا هێنا. تورکیا'ی کەمالیست لایەنگری ئەوە بوو کە جارێکی دیکە روو لە بەریتانیا بکرێتەوە. ئەگەر ویلایەتی موسڵ باجی ئەمە دەبوو، مستەفا کەماڵ و هاورێکانی ئامادەبوون ئەو باجە بدەن. ئەو بەشەی کوردستانی دابەشکراو کە بەر تورکیا دەکەوت ناوەکەی دەگۆڕا بۆ خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ و باشووری خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ و دانیشتوانەکەیشی دەکرانە ئامانجی سیاسەتێکی بەهێزی تواندنەوەی نەوتەوەیی و بە تورك کردن.

چارەنوسی ویلایەتی موسڵ لە روانگەیەکەوە واتای دابەشکردنی جیۆپۆلەتیکی کوردستانی دەدا. لەگەڵ لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراق'ی وابەستەی بەریتانیا، لە تورکیا کورد نەدەما و بە تورك لە قەڵەم دەدران. ئەو کوردانەش کە لە سنوری ویلایەتی موسڵ مابوونەوە، سەرەڕای ئەوەی کە شوناسی کەلتوورییان قبوڵکرا بوو، هەتا وەرگیرانی عێراق لە کۆمەڵەی گەلان لە ساڵی ١٩٣٢، بەڵێنی پێدانی ئۆتۆنۆمیان بۆ جێبەجێ نەکرا و بەوهۆیەشەوە بەسەرکردایەتی شێخ ئەحمەد (مەحمود) بەرزنجی راپەڕینیان دەستپێکرد.

تا چەند ساڵ بەر لەو دابڕانەی کە لە ساڵانی ١٩٢٥و ١٩٢٦دا روویدا و لە یەکەم ساڵەکانی دوای

جەنگی گەورەشدا، چارەنووسی دانیشتوە کوردەکان'ی ویلایەتی موسڵ کە دواتر بە کوردەکان'ی عێراق ناودەبران، بە هاونەژادەکانی خۆیان لە تورکیا بەسترابووەوە. ئەو پەیوەندییەش لەسەر بنەمای رێککەوتننامەی سیڤەر بوو کە لەنێو هەموو ئەو رێککەوتننامانەدا کە دوای جەنگ بەسەر تورکیا فەرز کران، تەنها ئەوەیان جێبەجێ نەکرا.

لە کۆتایی کۆنفرانسی ئاشتی پاریس دا چەندین رێککەوتننامەی جۆراوجۆر بەسەر ئەڵمانیا، نەمسا-مەجارستان (هاسبورگ) و ئیمپراتۆریای عوسمانلی'دا سەپێنران کە لە جەنگی جیهانی یەکەمدا شکستیان خواردبوو. پرەنسیپی مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان کە لەلایەن ڤوودرۆ ویلسن سەرۆکی ئەمریکا وە پێشخرابوو، رێخۆشکەری هەندێك لە بەند و ماددەکانی ئەو رێککەوتننامانە بوو. لەنێو ئەوانەشدا ئەوەی کە پەیوەندی بە لەناوبردنی ئیمپراتۆریای عوسمانلی وە هەبوو، سیڤەر بوو.

پەیماننامەی سیڤەر لە ١٠ی ئابی ١٩٢٠ ئیمزاکرا. لە ماددەکانی ٦٢-٦٤ی بەشی سێیەمی رێککەوتننامەکەدا دەرفەتی ئەوە رەخسابوو تا کوردەکان لەسەر ئەو خاکانەی کە تێیدا دەژین دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێنن.

لە ماوەی یەك ساڵی دوای جێبەجێکردنی رێککەوتننامەکە، دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی کە وەك کوردستان لە نەخشەی ناو رێککەوتننامەکەدا دیاریکرابوو، بە رەچاوکردنی کۆمەڵێك مەرج و پێشکەشکردنی داوانامەیەك بە دەستەی کۆمەڵەی گەلان، دەیانتوانی قۆناخی جیابوونەوە لە تورکیا و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی دەستپێبکەن.

لە ماددەی ٦٤ی رێککەوتننامەی سیڤەردا باس لەوە کرابوو کە ئەگەر زۆربەی دانیشتوانی کوردی ئەو ناوچانەی کە لە ماددەی ٦٢دا ئاماژەیان پێدراوە، بیانەوێت لە تورکیا جیاببنەوە و لەوبارەیەوە داوایەك پێشکەشی دەستەی گەلان بکەن و ئەگەر دەستەکەش توانای ئەوان بۆ سەربەخۆیی بە گونجاو بزانێت، ئەوکاتە رێگایان پێدەدات و لەوبارەیەوە ئامۆژگارییان دەکات. لە بارودۆخێکی وەهاشدا پێویستبوو تورکیا بەپێی ئەو ئامۆژگارییە بجوڵێتەوە و بە رەسمی وازهێنانی خۆی لە مافەکانی بەسەر هەموو ئەو ناوچانە رابگەیەنێت کە باسیان لێوە کرابوو. وردەکارییەکانی ئەمەش لەنێوان و تورکیا و هێزە هاوپەیمانەکانیدا بڕیاری لەسەر دەدرا. بەندی هەرە گرنگی ماددەی ٦٤ی رێککەوتننامەی سیڤەر ئەوە بوو کە ئەگەر ئەو بەشەی کوردستان کە لە ویلایەتی موسڵ دایە بیەوێت لەگەڵ دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی'دا یەکبگرێتەوە کە لەسەر ئەو خاکانەی تورکیا وازیان لێ دەهێنێت دادەمەزرێت، ئەوا هێزە هاوپەیمانەکان رێگری لێ ناکەن. ئەو خاکانەی کە وادانرابوو دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی لەسەر بونیات بنرێت، بەشێکی زۆری ئەو ناوچەیەی کە لە تورکیا'ی ئەمڕۆدا بە باشووری خۆرهەڵات ناودەبرێت و بەشێکی

بچووکی خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵی ئەمڕۆی لە خۆدەگرت. بەشێکی بچووکی باشووری خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ و بەشێکی زۆری خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵی ئەمڕۆش بەپێی نەخشەی پەیماننامەی سیڤەر بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئەرمەنستان تەرخانکرابوو. ئەو خاکەش کە دەگوترا ئەگەر دانیشتوانەکەی بیانەوێت لەگەڵ دەوڵەتی کوردستان'دا یەکبگرێتەوە ئەوا هێزە هاوپەیمانەکان دژایەتی ناکەن، نزیکەی هەموو ویلایەتی موسڵ بوو کە کوردستان'ی عێراق'ی ئەمڕۆ لە خۆ دەگرێت.




تورکیا بەهۆی لۆزانەوە توانی سیڤەر لە ژێر خاك ئەسپەردە بکات و بەڵگەیەکی نێودەوڵەتی بۆ ڕەوایی دەوڵەت-نەتەوەی نوێی خۆی بەدەستبهێنێت کە شوێنی ئیمپراتۆریایەکی فرەنەتەوەی دەگرتەوە. لەگەڵ ئەوەی کە تێکۆشانی نەتەوەیی لە تورکیا بووە هۆی پووچەڵکردنەوەی ڕێککەوتننامەی سیڤەر و ڕێگرتن لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی، هەڵوێستی نیگەتیڤی دەوڵەتە زلهێزەکانیش لەوبارەیەوە

رۆڵی یەکلاکەرەوەی هەبوو. ئیدی بابەتێکی وەك سەربەخۆیی کوردستان بەلای ئەو دەوڵەتانەوە گرنگ نەبوو.

"کوردستان کۆتاییپێهاتبوو. لە مارتی ١٩٢١دا هاوپەیمانەکان خۆیان لەو بەڵێنە نارِوونانە دزییەوە کە لە چوارچێوەی رێککەوتننامەی سیڤەر'دا دابوویان. ئەوان ئامادەبوون بەپێی هەلومەرجی نوێ دەسکاری ئەو رێککەوتننامەیە بکەن کە سەبارەت بە کوردستان (سیڤەر) باسیان کردبوو. هەلومەرجی نوێش لەسەر ئەوە بونیاتنرابوو کە ئاتاتورك هەموو رێککەوتننامەکەی رەتدەکردەوە و سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو لەوەی کە خاکی ئەرمەنەکان لە دەستی وڵاتەکەیدا بهێڵێتەوە و ئەو بەشەیشی کە دەمێنێتەوە رادەستی یەکێتی سۆڤییەت بکرێت. لەوانەیە نەتەوەگەراکانی کورد دژایەتی ئەمەیان بکردایە، بەڵام ئیدی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان هیچ بەرژەوەندییەکیان لە دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیدا نەبوو." (Margret MacMillan, Six Month That Changed the World, Paris ١٩١٩, p٤٤٩)

بەپێچەوانەی ئەو تێزانەی کە لە مێژووی رەسمی تورکدا باون، لەم دێرانەی خوارەوە بەڵگەیەکی دیکە دەسدەکەوێت سەبارەت بەوەی کە ئینگلیزەکان خۆیان زۆر بە پرسی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردییەوە سەرقاڵ نەکردووە؛

"ئامانجی لۆزان ئەوەبوو کێشەی تورکیا چارەسەر بکرێت. ئەمە بۆ ئەرمەنەکان زۆر بە درەنگەوە هات و کوردەکان'یش پشتگوێ خران. عەمید نوێل یاخود لاورنسی کورد کە لە ساڵی ١٩١٩دا بۆ دامەزراندنی جوڵانەوەیەکی سەربەخۆ رەوانە کرابوو، لە راپۆرتێکدا بە جۆش و خرۆشەوە وەهای نوسیبوو؛ جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد ئەوەندە زیندووە کە هیچ زەحمەتییەك لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی بەسەرپەرشتی خۆمان نابینم. بەڵام ئارنۆڵد ویڵسن قەناعەتی بەمە نەکرد. ئەو پێیوانەبوو کە کوردەکان بتوانن لەژێر سەرکردایەتی یەك کەسدا کۆببنەوە. بۆیە نوێل'ی لەسەر کارەکەی لابرد و لە جیاتی ئەو ئێڵی سوان'ی دانا کە بەمجۆرە باسی کردبوو؛ یەکێکە لەو کەسایەتییە هەرە کاریگەرانەی کە چانسی ئەوەم هەبووە لە تەمەنمدا لەگەڵیان ئاشنا ببم. هیچ کەسێك نییە توانیبێتی بە ئەندازەی ئەو لە هێزی کەسایەتی خۆی بەهرەمەند بێت.، سوان بەوە ناوبانگی پەیداکردبوو کە بەر لە جەنگ بە نهێنی لە کوردستان گەشتی کردووە و دینی خۆی گۆڕیوە و مەزهەبی شیعەی ئیسلامی قبوڵ کردووە. سوان گەیشتە هەمان ئەو ئەنجامەی کە ویڵسن پێیگەیشتبوو...

ئینگلیزەکان زۆر لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دوور بوون. لۆید جۆرج گلەیی ئەوەی کردبوو کە تاقە کوردێك نادۆزرێتەوە هێزی نوێنەرایەتیکردنی کوردەکان'ی هەبێت و باسی ئەوەی کردبوو کە بۆ ئەوەی تورکیا دوچاری کێشە و هەلومەرجێکی دژوار بکرێتەوە، پێویستە ئۆپۆزیسیۆنی کوردی هانبدرێت. بەڵام

دوای ئەو هەموو کێشمەکێش و ڕووداوانە، بەپێچەوانەی بەندەکانی ڕێککەوتننامەی سیڤەر و ویست و داواکاری شەخسیی کەسانی وەك چەرچڵ و کورزۆن، بڕیاردرا خاکی کوردەکان بۆ بەهێزکردنی عێراق بەکاربهێنرێت."(Walter Reid, Empire of Sand, p.٢٠٠-٢٠١)

دەوڵەتێك بەناوی کوردستان لەنێو ئەو نەخشانەی کە سەرلەنوێ کێشرابوونەوە و لەنێو ئەو سنورە نێودەوڵەتییانەی کە دانیان پێدانرابوو، جێی نەبووەوە. بەڵام دانەمەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان ڕێگر نەبوو لە دەرکەوتن و گەورەبوونی کێشەی کورد بەجۆرێک کە نزیکەی یەك سەدەیە وەك کێشەیەکی خوێناوی و پڕئازاری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی لێهاتووە. بە پێچەوانەوە، لەوانەیە خوێناوی بوون و بەردەوامیی کێشەی کورد پەیوەندی بە دانەمەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی هەبێت. بە تێپەڕبوونی کات ئەم قەناعەتەم پەیداکرد و بۆ یەکەمجاریش لە ساڵی١٩٩٥دا لە دوو وتاری دوابەدوای یەکدا لە ڕۆژنامەی سەباح ئەو بۆچوونانەم بڵاوکردەوە. لە پانێلێکیشدا لە ئیستانبوڵ کە سەبارەت بە"کێشەی کورد و ڕێگاکانی چارەسەری"لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٦دا ڕێکخرابوو، لەوبارەیەوە دیدگاکانی خۆمم بۆ ڕای گشتی ئاشکرا کرد. لەگەڵ هرانت دینك لە تەنیشت یەك دانیشتبووین. ڕێك مانگێك بەر لەوەبوو کە بکوژرێت. مانگێك دواتر بە خەم و پەژارەوە زانیم کە ئەو ڕۆژە دوایین جارێك بووە کە لەگەڵ هرانت دینك پێکەوە بووین. لەدوای من، یەکسەر هرانت دەستی بە قسە کرد و وەك من بە ئیرتیجالی قسەی کرد. کەوتبووە ژێر کاریگەری بۆچوونەکانی من. وتەکانی من و بۆچوونەکانی ئەو سەبارەت بە کێشەی ئەرمەن و پەیوەندییەکانی تورکیا-ئەرمەنستان یەکیاندەگرتەوە. لەو شوێنەی کە من کۆتاییم بە قسەکانم هێنا، ئەو درێژەی پێدا. ئاماژەی بە وتەکانمدا و باسی لێکچوونی کێشەی کورد و ئەرمەن'ی کرد و جەختی لە بابەتی"بە دەوڵەتبوون"کرد و وتارێکی پێشکەش کرد. تێزەکەی من زۆر سادە بوو؛

"لەو نەخشەیەی کە لە ئەنجامی جەنگی جیهانی یەکەم لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کێشرا، بەدەر لە کوردەکان کە نەتەوەیەکی گەورەی ناوچەکەن کە هێشتا پرۆسەی نەتەوەسازییەکەیان تەواونەبووە، ئەوانی دیکە لە فۆرماتی دەوڵەتی نەتەوەییدا دەرکەوتوون."[١٢] تورکەکان دەوڵەتیان هەبوو، عەرەبەکان'یش زیاتر لە یەك دەوڵەتیان هەبوو. ئێران'یش بە کەلتووری فارسی و شوناسی شیعی، کەم تا زۆر لەسەر هەمان ئەو

١٢-سەنتەری جیرۆسلیم بۆ کاروباری گشتی(JCPA) لە قودس لە ٣٠ی ئابی ٢٠١٢دا کتێبێکی عەقید د. ژاکوێس نەریا ی بەناوی داهاتووی کوردستان: لە نێوان تورکیا، جەنگی عێراق و ڕاپەڕینەکەی سوریا بڵاوکردەوە. ژاکوێس نەریا ڕاوێژکاری سیاسەتی دەرەوەی ئیسحاق ڕابین سەرۆك وەزیری تیرۆرکراوی ئیسرائیل بووە و لە هەواڵگری سەربازی وڵاتەکەیشیدا جێگری سەرۆکی بەشی هەڵسەنگاندن بووە. د. نەریا لە پێشەکی کتێبەکەیدا بەمجۆرە باسی دابەشبوونی دیموگرافی کوردەکانی کردووە: کوردەکان وەك ئێرانییەکان لەو گەلە هیندوئەورووپییانەن کە بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کۆچیان کردووە. بە زۆری لە ناوچەی بەینی تورکیا، سوریا، عێراق و ئێران کە بە کوردستان دەناسرێت نیشتەجێبوون. کوردەکان ٧٪ی دانیشتوانی ئێران و ١٥٪-٢٠ی دانیشتوانی عێراق و لەوانەیە ٩٪ی دانیشتوانی سوریا و٢٠٪ی دانیشتوانی تورکیا پێکبهێنن. بەدەر لە ئێران، کوردەکان لە هەموو وڵاتانی دیکەدا دووەمین گرووپی گەورەی ئەتنی پێکدەهێنن. بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت بگوترێت کە ٥٥٪ی کوردەکان لە تورکیا دەژین. ئەو کوردانەش کە لە ئێران و عێراق دەژین١٨٪ی هەموو کوردەکان و کوردەکانی سوریاش تۆزێك زیاتر لە٥٪ی هەموو کوردەکانی دنیا پێك دەهێنن. پێشبینی دەکرێت ژمارەی کوردەکان کە لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا دەژین ٢٦-٣٤ملیۆن کەس بێت. نزیکەی یەك دوو ملیۆن کوردیش لە دیاسپۆرا دەژین. کوردەکان لەدوای عەرەب و فارس و تورکەکان گەورەترین گرووپی ئەتنی ناوچەکەن. دەزانرێت کە کوردەکان لە سەدەی ٦یان٧ی بەر لە زایین بەملاوە لەو ناوچانە نیشتەجێبوون کە ئەمڕۆ تێیدا دەژین.

سنورانەی کە ئێستا هەیەتی، زیاتر لە ٢٥٠٠ ساڵە دەوڵەتی هەبووە. یەهوودییەکان‌یش لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم دەوڵەتێکی نەتەوەییان بەناوی ئیسرائیل دروستکرد. کێشەی کورد لە روانگەیەکەوە کێشەی نەبوونی دەوڵەتی کوردەکان بوو. بەو پێیەش هەتا ئەوکاتەی کوردەکان دەبنە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان، یان هەتا ئەوکاتەی هەلومەرجی نوێ و بارودۆخی سیستەمی نوێ، فۆرماتی کلاسیکی دەوڵەتی نەتەوەیی بێ مانا دەکات یاخود هەتا ئەوکاتەی کە لەنێو یەکێك لەو دەوڵەتانەی کە ئێستا هەن بتوانن گوزارشت لە خۆیان بکەن و هەست بکەن کە شەریکی دەسەڵاتن، کێشەی کورد بە هەموو پارامێترەکانی خۆیەوە بەردەوام دەبێت. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە کوردەکان لە تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا وەك کۆمەڵگای گەورە گەورە دەژین، هەتا ئەوکاتەی دەبنە خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆ، کێشەی کورد وەك کێشەیەکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەردەوام دەبێت.

ساڵانی٢٠٠٠کان لەوبارەیەوە دوورنیگایەکیان دروستکرد. لەدوای جەنگی سارد نەخشەی ئەورووپا و ئاوراسیا دەکێشرایەوە و مومکین بوو ئەو نەخشەیەکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست‌یش کە لەدوای جەنگەکانی جیهانی یەکەم و دووەم کێشرابوو، دەسکاری بکرێتەوە. لەو مەیدانە جوگرافییەی کە لەنێوان دەریای سپی و رووباری ئوردن (شەریعە)دایە، لە تەنیشت دەوڵەتی ئیسرائیل کە لەکاتی ماندای ئینگلیزەکان لە خاکی فەلەستین دامەزرابوو، باسی دامەزراندنی دەوڵەتی فەلەستین دەکرێت و ئەگەری دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی‌ش هاتووەتە ئاراوە.

دەرکەوتنی عێراق‌ی فیدراڵ لەدوای جەنگی ٢٠٠٣، تا ئەندازەیەك وەك دژەژەهرێکی بێ دەوڵەتبوونی کوردەکان لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم بوو. هەرێمی کوردستانی عێراق بەدەر لە دانپێدانانی نێودەوڵەتی، بووە خاوەنی هەموو ئەو رەگەزانەی کە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێویستن. ئاڵا و پەرلەمان و حکومەت و هێزی ئەمنی و کۆنترۆڵی سنوریی تایبەت بە خۆی پەیداکرد و لە هەموو شوێنە دیپلۆماتییەکانی عێراق‌دا نوێنەری خۆی دانا و ئەمەش لە دەستووری عێراق‌دا چەسپا. زمانی کوردی هاوشێوەی زمانی عەرەبی بوو بە زمانی رەسمی لە عێراق. بەدەر لەوەش کوردێك بووە سەرۆکی دەسەڵاتی جێبەجێکردن لە بەغدا و ئەو کەسەش کە لە دەرەوە نوێنەرایەتی عێراق‌ی دەکرد کەسێکی کورد بوو. بەدەر لە کوردستانی عێراق، حکومەتی عێراقیش بووە دەوڵەتێك کە کوردەکان بە شوناسی خۆیانەوە تێیدا جێ بگرن و نوێنەرایەتی خۆیان بکەن و لە دەسەڵاتدا شەریك بن. ئەو تورکیایەش کە نزیکەی نیوەی کوردەکان‌ی دنیا لەوێ دەژین، چووبووە ناو قۆناغی تێکەڵاوبوون بە یەکێتی ئەورووپا. ئەگەر تورکیا هەموو پێوەرەکانی ئەورووپا جێبەجێ بکات، ئەوکاتە کوردەکان دەتوانن بە شوناسی خۆیانەوە درێژە بە مانەوە بدەن و لە تورکیایەکی دیموکراتی نوێدا دەتوانن وەك پێکهاتەیەك کە گوزراشت لە خۆی بکات، دەرکەون.

لە قۆناغێکی دوای ئەوەشدا دەکرا پەیوەندییەکانی تورکیا و عێراق لە ڕێی پردی کوردستان'ی عێراق'ەوە، هاوشێوەی ناوچەیەکی بێنلۆکسی نێوان بەلجیکا - هۆڵەندا و لوکزامبۆرگ'ی لێبێت. سنوری نێوان هەردوو وڵات یان هێڵی بروکسەل تەنها لەسەر نەخشە دیاربێت و تەنها بۆ ئاماژەکردن بە جیاکارییەکی ئیداری بەکاربێت و دەکرێ هەردوو دیوی سنورەکە لە رووی سیاسی، ئابوری و بازرگانی و کەلتوورییەوە یەکبخرێت."

ئەمە پوختەی تێزەکەی من بوو. لە ساڵی ١٩٩٥وە، یانی لە ساڵانێکی بەر لە جەنگی عێراق بەمجۆرە بیرم دەکردەوە. جەنگیش بووە هۆی ئەوەی کە ئەگەری جێبەجێکردنی تێز و بۆچوونەکەی من پەیدا بێت. بیرۆبۆچوونەکانم لە ١٩٩٥وە بەمجۆرە بوو، بەڵام بناخەکەی دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ١٩٩١، ئەوکاتەی کە لەکاتی جەنگی کەنداودا لەگەڵ ئۆزال هەوڵی دیاریکردنی سیاسەتی تورکیا'مان بەرامبەر کورد دەدا. ئۆزال زۆر حەزی لە قسەکردن سەبارەت بە مێژوو و دانانی چرووتژە بۆ داهاتوو دەکرد. لەبەر ئەوەی سیفەتی بت شکێنیشی هەبوو، لە قسە و باسەکانماندا هیچ بابەت و ناوچەیەکی قەدەخەکراو نەبوو. زۆر لەبارەی ئەم بابەتانەوە قسەمان کرد. تەنانەت باسی ئەوەشی کرد کە ئاتاتورك ماوەیەك بیری لە فیدراسیۆن یان کۆنفیدراسیۆن لەگەڵ عێراقیشدا کردۆتەوە. ئەو دەنگۆیانەش کە سەبارەت بە بۆچوونی ئۆزال لەبارەی چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە مۆدێلی فیدراسیۆن یاخود کونفیدراسیۆن بڵاودەکرانەوە، لە راستیدا پەیوەندی بە عێراقێکەوە هەبوو کە تێیدا سەدام لەسەرکار لابرێت و پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان بەرقەراربکرێت.

بەو سەرەداوەش کە ئۆزال دای بە دەستمەوە، دوای دۆزینەوەی بۆچوونەکانی ئاتاتورك سەبارەت بە فیدراسیۆن یان کۆنفیدراسیۆن لەگەڵ عێراق کەوتم. کۆنووسی کۆبوونەوە نهێنییەکانی پەرلەمانی تورکیا کە لە ساڵی ١٩٢٠ دامەزرابوو، لە ساڵی ١٩٨٠دا بڵاوکرانەوە و کەم کەس دەیزانی بۆچوونەکانی ئاتاتورك لەو کۆنووسانەدا هەن. کۆنووسە نهێنییەکانی پەرلەمانم خوێندەوە.

"رۆژی شەممە ٢٤ی نیسانی ١٩٢٠"ئەمەش رۆژێك دوای دامەزراندنی پەرلەمانی تورکیا بوو. لە کۆنووسە نهێنییەکاندا"رۆژی دووەم، دانیشتنی چوارەم، کاتژمێر ٠٥:٤خولەك، بەسەرۆکایەتی شەریف بەگ ئەفەندی"نوسرابوو.

سەرۆك دەڵێت؛"دانیشتنە نهێنییەکە دەستپێدەکەم."لە کۆنووسە نهێنییەکاندا وەك ماددەی یەکەم بەیانات و وتارەکان نوسرابوو. لە ژێر ئەوەشدا نوسرابوو؛"وتاری حەزرەتی مستەفا کەمال پاشا لەبارەی بارودۆخی ناوخۆ". دواتر سەرۆك دەڵێت؛"قسەکردن بۆ حەزرەتی مستەفا کەمال پاشا'یە."و دوای ئەوەش مەستەفا کەمال دەچێتە سەر کورسییەکە و لەبارەی"بارودۆخی ناوخۆ"زانیاری دەدات. کاتێکیش باسی

پەیوەندییەکانیان لەگەڵ بەجێهێڵراوەکان لە سوریا و عێراق دەکات، ئەمانە دەڵێت؛

"دەستپێشخەری ئێمە بۆ بەرقەرارکردنی پەیوەندی لەگەڵ سوریا لە روانگەیەکی ئیسلامییەوە، سەرنجی ئەمیر فەیسەڵی راکێشا کە لەوێ سەرقاڵی دامەزراندنی پادشایەتییەك بوو. هەروەها بووە مایەی تێڕامانی فەرەنسییەکان'یش کە پشتیوانی ئەمیر فەیسەڵ دەکەن. لە ئەنجامیشدا بەڕێوەبەر و کەسانی نزیك لە ئەمیر فەیسەڵ پەیوەندییان لەگەڵ ئێمە بەرقەرارکرد. دەمەوێ چەند خاڵێکی ئەو پەیوەندییەش کە بە رەسمی گەیشتووەتە ئێمە، روونبکەمەوە. وادیارە سورییەکان گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتەی کە پەیوەندی لەگەڵ هەر وڵاتێکی بیانیدا دواجار دیلی و بەخسیری ئەوانی لێدەکەوێتەوە بۆیە روویان لە ئێمە کرد.(١) ئەو وەڵامەی کە ئێمە پێماندانەوە بریتی بوو لەوەی کە ئیدی نامانەوێ سەرچاوە گشتی و مرۆییەکانی نێو سنورەکانی خۆمان بۆ دەرەوەی سنورەکانمان بەکاربهێنین. بەڵام ئێمە وەك چۆن دەزانین یەکێتی و یەکگرتوویی لەرووی مەعنەوی دەبێتە هۆی بەهێزبوونی دنیای ئیسلامی، بە هەمانشێوە لە رووی مادیشەوە زۆرمان پێ خۆشە کە هاوپەیمانمان هەبێت. بۆیە وەك چۆن ئێمە لە سنورەکانی خۆماندا سەربەخۆییمان وەرگرتووە، سورییەکان'یش دەتوانن لە سنورەکانی خۆیاندا لەسەر بنەمای سەروەری نەتەوەیی ئازادی بەدەستبهێنن. دواتریش بۆ ئەوەی کە لەسەرووی هاوپەیمانی و رێککەوتنێك لەگەڵ ئێمەدا بگەنە ئەنجام، دەتوانین لەسەر یەکێك لە شێوازەکانی پەیوەندی فیدراڵی یا خود کۆنفیدراڵی پێك بێنین...

سەبارەت بە عێراق'یش دەتوانین بڵێین کە رەفتاری ئینگلیزەکان موسڵمانەکانی دڵگران کردووە. بەر لەوەی کە ئێمە هەوڵی پەیوەندی لەگەڵ ئەوان بدەین، ئەوان بەدوای ئێمەدا گەڕان و داوایانکرد وەك جاران ببنەوە بەشێك لە مەملەکەتی عوسمانی. بەڵام ئێمە جگە لەوەی کە بە سورییەکان'مان گوت هیچی دیکەمان بەوان نەگوت و پێمانڕاگەیاندن کە دەتوانن لە سنورەکانی خۆتاندا هەبوونی خۆتان بپارێزن و ببنە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، ئێمە بەر لە هەموو شتێك هەوڵی دابینکردنی سەربەخۆیی خۆمان دەدەین. دوابەدوای ئەوەش هیچ ئاستەنگێك بۆ یەکگرتنمان نامێنێت."(TBMM Gizli Celse Zabıtları, TBMM Basımevi, Ankara ١٩٨٠)

مستەفا کەمال لە ٢٤ی نیسانی ١٩٢٠دا باسی ئەوەی کردبوو کە ئەو پێکهاتە و رەگەزە خۆجێیانەی کە لە سوریا لە فەرەنسییەکان و لە عێراق'یش لە بەریتانییەکان نیگەران بوون، پەیوەندییان لەگەڵ ئەوان بەرقەرارکردووە و داوایان کردووە لەگەڵ تورکیا یەکبگرن. سەرکردەی کەمالیست'یش لە وەڵامی ئەواندا وتوویەتی؛"ئێمە تێکۆشانی سەربەخۆیی دەکەین، ئێوەش ئەو کارە بکەن و سەربەخۆیی وەربگرن. دواتر وەرەن پێکەوە قسەی لەسەر دەکەین."

ئەو تەسەورەکەی کە مستەفا کەمال سەبارەت بە داهاتوو هەیبوو و بەوانی نەگوتبوو، رۆژێك دوای دامەزارندنی پەرلەمان، لە کۆبوونەوەیەکی نهێنیدا بۆ کادیرانی جەنگی سەربەخۆیی باسیکردبوو؛ تورکیا و سوریا و عێراق لە حاڵەتێکدا کە هەریەکەیان سەربەخۆیی هەبێت، دەیانتوانی لە چوارچێوەی فیدراسیۆن یان کۆنفیدراسیۆنێکدا لە دەوری یەك کۆببنەوە.

بەردەوام بڕوام بەوە کردووە کە تا ئەوکاتەی سنورە ناسروشتییەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم لادەبرێن، ئەم ئاسۆیە هەروا دەمێنێتەوە. ئەگەری چارەسەرکردنی کێشەی کورد'یش لە فۆرماتێکی وەهادا لە ئارادایە. پێدەچێت گەشتی دەیان ساڵەشم لە شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا کە تێیدا بە چەندین وێستگەی جۆراوجۆردا تێپەڕبووم بە هیوای گەیشتن بەو ئاسۆیە بێت کە نازانم کەی پێیدەگەم.

ئەو کاتانەی باسی چۆنییەتی دانانی سنوری عێراق و تورکیا'م بۆ کتێبەکەم دەنوسی، لە رۆژی ١٩ی تشرینی یەکەمی ٢٠١١دا، پ.ك.ك لە خاڵی سفری سنوریدا یەکێك لە کاریگەرترین و بەناوبانگترین چالاکییەکانی خۆی ئەنجامدا و لە هێرشێکدا بۆ سەنگەرەکانی سوپا لە شارۆچکەی چوقورجا لە پارێزگای هەککاری ٢٤ سەربازی کوشت. لایەنەکانی نزیك لە پ.ك.ك باسیان لەوە دەکرد کە ژمارەی کوژراوەکان لەوە زیاترە کە راگەیەنراوە. هێرشەکە شۆکێکی توندوتیژی لە تورکیا دروستکرد و ئەگەری لەشکرکێشی سوپای بۆ دەرەوەی سنورەکان زیادکرد. نەتەوەپەرستەکان داوای لەشکرکێشی سوپایان بۆ باکووری عێراق و مانەوە لەوێ و هەڵکردنی ئاڵای تورك'یان لە چیای قەندیل دەکرد کە بەڕێوەبەرانی پ.ك.ك لەوێ جێگیربوون. هەواڵی هێرشەکەم لە رێی رۆیشتن بۆ فڕۆکەخانە بیست کە بەنیازبووم لەوێوە لەگەڵ ئەحمەد داودئوغڵو وەزیری دەرەوە بۆ سربستان بڕۆم. کاتێ سواری تەکسی بووم، زانیم رێگا گیراوە. کاروانی ئۆتۆمبیلەکانی عەبدوڵا گویل سەرکۆمار لەبەردەممانەوە تێپەڕبوو. تۆزێك دواتریش لێدوانێکی گویل لەبارەی "تۆڵەکردنەوە" بڵاوکرا یەوە. ئەمەش یەکەمجار بوو عەبدوڵا گویل دەستەواژەی تۆڵەکردنەوە بەکاربهێنێت. لە رێگای فڕۆکەخانەدا هەواڵی هەڵوەشانەوەی گەشتەکەی سربستان'م پێگەیشت. سەرۆك وەزیر و وەزیری دەرەوە گەشتەکانی خۆیان بۆ دەرەوەی وڵات راگرتبوو، چونکە لە ئەنقەرە کۆبوونەوەیەکی نائاسایی ئەمنی سازدەکرا.

یاداشتەکانی خۆم سەبارەت بە چۆنییەتی دانانی سنوری عێراق و تورکیا و شوێنی تێپەڕبوونی سنورەکە لەگەڵ خۆمدا هێنابوو. بەنیازبووم شەو لە ژووری هۆتێل لە بەلگراد بنوسم. لاپتۆپەکەشم لەگەڵ خۆم هێنابوو. بەڵام ئەوە سەری نەگرت و گەڕامەوە بۆ ماڵ و لەوێ درێژەم بە نوسینەکانم دا.

رۆژی دواتر، لە ٢٠ی تشرینی یەکەمی ٢٠١١دا فەرماندەیی گشتی سوپا روونکردنەوەیەکی بڵاوکردەوە. بەو پێیە، ٢٢ بەتالیۆنی هێزە چەکدارەکانی تورك کە لە ١٠ هەزار سەرباز پێکدەهات، لە ٥ خاڵی سنوری هەککاری بە پشتیوانی هێزی ئاسمانی ئۆپەراسیۆنی دەرەوەی سنوریان لە باکووری عێراق دەستپێکردبوو.

نێچیرڤان بارزانی خێرا گەیشتبوو ئەنقەرە. تایب ئەردۆغان بەر لە دیدارەکەی خۆی لەگەڵ نێچیرڤان بارزانی باسی "خۆکوژیی" پارتی کرێکارانی کوردستانی کرد. هەروەها ئەوەشی ڕاگەیاند کە مەسعود بارزانی'یشی بانگهێشتی ئەنقەرە کردووە و داوا لە نێچیرڤان بارزانی دەکات پێشمەرگە لە ئۆپەراسیۆنی دژی پ.ك.ك'دا بەشداری پێبکات. ئەوەشی باسکرد کە شەوی ڕابردوو سەبارەت بە هاوکاری سێقۆڵی عێراق – تورکیا - ئەمریکا کە پێشتر لە ئارادابوو، لەگەڵ سەرۆك ئۆباما قسەی کردووە.

جارێکی دیکە ئەو خاکە جوانانەی هەردوو لای زاپ، بە درێژایی سنوری عێراق و تورکیا ببوونە مەیدانی جەنگی پ.ك.ك و هێزە چەکدارەکانی تورك. ئینگلیزەکان'یش بۆیە ئەو سنورەیان لەوێوە کێشابوو کە تورکیا لەوێوە هێزەکانی خۆی ڕەوانەی عێراق نەکات. لە چاوی ئینگلیزەکان'هوە، زنجیرە چیا بەرزەکانی سنور وەك دیوارێکی ئەمنی بوو. تورکیا'ش لە دیوی خۆیەوە، لەسەر تەپۆڵکە و چیا بەرزەکانی سنوردا بنکەی سەربازی دروستکردبوو. سەرەڕای دابڕاوبوونیان لە باقی شوێنەکانی دیکەی تورکیا، بنکە سەربازییەکان لەو جوگرافیا وەحشییەدا بە تەنها نەدەمانەوە و هێرشی جاربەجاری پ.ك.ك بۆسەر سەربازانی گەنجی تورك کە هەندێکجار ژمارەیەکی زۆری لێ دەکوشتن، دەیتوانی لە ساتێکدا هەموو وڵاتەکە ئیفلیج بکات.

لە ڕوانگەی تورکیا، ئەو سنورە خاڵێکی لاوازی ئەمنی بوو کە دەکرا لە باشوور'ەوە هێرش بکرێتە سەری و لە دیدگای پارتی کرێکارانی کوردستان'یشەوە، ئەو سنورە هیچ کات شوێنێك نەبوو کە دوو وڵات لێك جیا بکاتەوە. لە چاوی پ.ك.ك، هەردوو دیوی سنورەکە کوردستان بوو. سنورەکەش جگە لە دابەشکردنی کوردستان هیچ واتایەکی دیکەی نەبوو، بەڵکو تەنها بۆ دیاریکردنی ئاراستە بەکەڵك دەهات.

ئەندامانی پ.ك.ك و تەنانەت لە ساڵانی ٢٠٠٠کاندا زۆرێك لە کوردەکان'ی تورکیا'ش ئیدی دەستەواژەی کوردستان و تورکیا و عێراق'یان بەکارنەدەهێنا و لە جیاتی ئەوانەدا وشەکانی باکوور و باشووریان بەکاردەبرد. باکوور بۆ ئاماژەدان بە تورکیا یاخود کوردستانی تورکیا و باشووریش ڕاستەوخۆ بۆ ئاماژەدان بە کوردستانی عێراق بەکاردەهات.

دەستەواژە سیاسی، مێژوویی و جوگرافییەکانی وەك تورکیا، باشووری خۆرهەڵات، شڕناخ، هەککاری، بۆتان، بادینان، عێراق و کوردستانی عێراق بە هەندێك دەستەواژەی پیشاندانی ئاراستە جوگرافییەکانەوە سادەکرابوونەوە؛باکوور-باشوور.

وەك ئەوە وابوو سنوری عێراق و تورکیا کە دوای جەنگی جیهانی یەکەم لەنێوان ساڵانی ١٩١٩-١٩٢٥دا بە ماجەرایەکی زۆرەوە دیاریکرابوو، بە یەکجاری سڕابێتەوە و بووبێت بە ئاماژەی پیشاندانی ئاراستەکانی باشوور و باکوور.

**تۆ ڕێگای خۆت هەیە و منیش ڕێگای خۆم، ڕێگایەکیش نییە کە ناوی ڕێگای ڕاست، ڕێگای هەق یان تاکە ڕێگا بێت.**

**فردریش نیچە**

لەنیو سەعاتی یەکەمی سەرەتای قسەکانی خۆیدا، کاتێك موراد قەرەیڵان دەستەواژەی نیۆئیتیحادچییەکانی بۆ هەندێك لە گرووپە دیاریکراوەکانی ناو تورکیا بەکارهێنا، قسەکەیم پێ بڕی و وتم؛"مەبەستت کەمالیزمە؟"گوزراشتێکی جیدی لە ڕوومەتیدا پەیدابوو و وتی؛"نا، کەمالیزم و ئیتیحادچێتی یەك شت نین."و بەمجۆرە درێژەی بە وتەکانی دا؛"لەدوای دامەزراندنی کۆمارەوە گەورەترین گورز لە پەیوەندییەکانی کورد و تورك وەشێنرا. سەیری گشاندنی ئاماسیا و کۆنگرەی ۱۹۲۱ی سیواس بکەن. ئەو بڕیارەی کە لە۱۹۲۲دا سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی دەرکرابوو، دواتر لە کۆنووسەکاندا سڕایەوە. سەرۆك ئاپۆ لەوبارەیەوە شیکردنەوەی زۆر گرنگی هەیە. هیوادارم خوێندبێتتانەوە. چەتەیەکی ئیتیحادچی دەوری مستەفا کەمال'یان دابوو. تاوانەکانی ڕژێم هی ئەوان بوو. ئەو شتانەش کە ئەمڕۆ ڕوودەدەن، بەردەوامی ئەو ڕێبازەیە و لەبەر ئەوە من دەستەواژەی نیۆئیتیحادچیم بەکارهێنا."بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری قسەکانیشی وتی؛"ئینگلیزەکان لە لۆزان بابەتەکەیان بە ناڕوونی هێشتەوە. لەوبارەیەوە کەسانی وەك فەوزی چەکماك و عیسمەت ئینەنۆ کە ئێمە بە کەمالیست'یان نازانین بەڵکو لە هێڵی ئیتیحاد و تەرەقی دان، ڕۆڵی خراپیان گێڕا."

کاتێ کە بینیم سەرکردەی پ.ك.ك لە چیای قەندیل لە سنوری ئێران - عێراق'دا، هاوشێوەی خوێندکارەکانی زانکۆ لە تورکیا'ی ۱۹٦۰ و ۱۹۷۰کاندا بە وریاییەوە باسی مستەفا کەمال دەکات و کەمالیزم لە ئیتیحاچییەکان جیا دەکاتەوە، نەمتوانی خۆم ڕابگرم و بە گاڵتەوە وتم؛"ئێستا ئیدی بە باشی لە هەموو شتێك تێدەگەم."و گوزارشتێکی جیدیم لە ڕوومەتی خۆمدا پیشاندا. موراد قەرەیڵان بەسەرسامییەوە وتی؛"چی؟"منیش لە وەڵامدا وتم؛"بڕیاربوو دوێنی یەکتر ببینین، بەڵام کاتێ گەیشتمە سلێمانی وتیان کاتی دیدارەکەمان دواخراوە و ئەمڕۆ بە نسیب بوو. ئەمڕۆش ۱۱/۱۱یە و ئێستا تێدەگەم کە ئێوە دوێنی بە مەراسیمی بیرهێنانەوە و شتی وەهاوە سەرقاڵ بوون و دەرفەتتان نەبووە کەس ببینن..."

لە قسەکانمدا ناڕاستەوخۆ ئاماژەم دا بەوەی کە ڕۆژی ۲۰۱۱/۱۱/۱۰ وەك چۆن لە تورکیا و هەموو نوێنەرایەتییەکانی دەرەوەدا مەراسیمی بیرهێنانەوەی ئاتاتورك سازکراوە و ئاڵاکان تا نیوە داگیراون، لە قەندیل'یش بە هەمانشێوە یادی ئاتاتورك کراوەتەوە. ئەمەش ئاماژەیەك بوو بەوەی کە گوایە پ.ك.ك لە ژێر کاریگەری ئایدۆلۆژیای"کەمالیست"دایە. موراد قەرەیڵان لە نوکتەکەی من تێگەیشت و بە پێکەنینەوە دەربازی کرد.

وەقفی گفتوگۆ کۆمەڵایەتی و ئابورییەکانی تورکیا (TESEV)، چەند مانگ لەوەوپێش داوای لە من کردبوو کە راپۆرتێك سەبارەت بە دوورخستنەوەی توندوتیژی لە کێشەی کورد، بە واتایەکی دیکە چەکداماڵینی پ.ك.ك ئامادە بکەم. ئەو پێشنیارەم لەلایەن ئەیتەن مەحچوبیان'ەوە بۆ هات و یەکسەر قبوڵم کرد. جان پەکەر سەرۆکی تەسەڤ کە هاوڕێی نزیکم بوو، زۆر هانیدام تا ئەو کارە بکەم. بۆ راپۆرتێکی وەها کە بۆ تەسەڤ بشێت، دەبوو کارێکی زۆر گرنگ و تایبەت بکرێت و لێکۆڵینەوەی مەیدانی بۆ ئەنجامبدرێت و لەگەڵ کەسانێکی زۆر کە بەرپرسانی پ.ك.ك و دەوڵەت لە خۆ بگرێت، دیداری راستەوخۆ بکرێت. بۆ دەستپێکردنی ئەم کارەش پێویست بە قۆناغێکی ئاگربەست هەبوو. لە ئەیلوولی ٢٠١٠دا پ.ك.ك ئاگربەستی راگەیاند و لەگەڵ جێگیربوونیشیدا دەستم بە ئامادەکردنی راپۆرتەکەم کرد. لە مانگی ئابدا لە دیدارێکدا لەگەڵ سەرکۆمار عەبدوڵا گویل لە ئیستانبوڵ، پێمگوتبوو سەردانی چیای قەندیل دەکەم. ئەو رۆژەش کە لەگەڵ موراد قەرەیڵان دیدارم کردبوو، سەرۆکی تەسەڤ باسی دیدارەکەی منی بۆ تایب ئەردۆغان کردبوو.

راپۆرتی "دابەزین لە چیا- پ.ك.ك چۆن واز لە چەك دەهێنێت؟ دوورخستنەوەی توندوتیژی لە کێشەی کورد"[١٣] کە دوو هەفتە دوای هەڵبژاردنی ١٢ی حوزەیرانی ٢٠١١ لە تورکیا بڵاوکرایەوە، دەنگێکی زۆری دایەوە. شتێك کە تا ئەوکاتە نەکرابوو ئەنجامدرابوو. زانیاری و شیکردنەوە و پێشنیارەکانی ناو راپۆرتەکە پشتیان بە ئەزمونی چەندین ساڵەی خۆم و خوێندنەوەی هەزاران لاپەڕە و دیداری راستەوخۆ لەگەڵ ژمارەیەك کەسی زۆر دەبەست کە بەرپرسانی پ.ك.ك و دەوڵەت و فەرماندە سەربازییەکانی لە خۆ دەگرت و خۆی لە قەرەی چل کەسێك دەدا.

لە راپۆرتەکەدا شتی زۆر سەرنجراکێش هەبوون. یەکێك لەوانەش ئەوەبوو کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، پێویستە گۆڕانکاری لە"پارادیگما"ئەنجامبدرێت و لەگەڵ کێشەی پ.ك.ك'دا نەك وەك بابەتێکی تیرۆریزم، بەڵکو وەکو دوایین و گەورەترین و بەردەوامترین راپەڕینی کوردەکان لە مێژووی تورکیا مامەڵە بکرێت. هەروەها باسی ئەوەش کرابوو کە پ.ك.ك و کێشەی کورد لێك جیا ناکرێنەوە و ئەو رێکخراوە وەك بەشێکی دانەبڕاوی کێشەی کوردی لێهاتووە. بەشێوەیەکی سروشتی، راپۆرتەکە ئەولەویەت دانی بە رێکاری سەربازی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد رەتدەکردەوە. لەو قۆناغەدا چاوەڕوانییەکان سەبارەت بە چارەسەرکردنی سیاسییانەی کێشەی کورد لە رێگەی دانوستان لەگەڵ پ.ك.ك زیادیان کردبوو. حکومەتیش بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە دەیزانی چ شێوازێکم بۆ ئامادەکردنی راپۆرتەکە بەکارهێناوە، چاوەڕوان بوو تا لە ئەنجامدا راپۆرتەکە بەکەڵکی ئەویش بێت. بەشێکی زۆر لە ئەندامانی کابینەی حکومەت تەنانەت سەرۆك وەزیر تایب ئەردۆغان'یش بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ سەیری هەوڵەکانی منیان دەکرد، بەڵام دوو

١٣-جەنگیز چاندار، بڵاوکراوەکانی تەسەڤ، حوزەیران، ٢٠١١.

هەفتە دوای بڵاوکردنەوەی راپۆرتەکە هەموو شتێك پێچەوانە بووەوە.

حکومەتەکەی تایب ئەردۆغان سووربوو لەسەر ئەوەی کە سەبارەت بە کێشەی کورد، جارێکی دیکە روو لە سیاسەتە نەریتییەکان بکات و ئەولەویەت بە سیاسەتە ئەمنییەکان بدات. ئەو راپۆرتەی کە ئیمزای منی بەسەرەوە بوو رێك پێچەوانەی ئەو سیاسەتانە بوو کە حکومەت دەیویست جێبەجێیان بکات و وەك شتێکی زیانبەخش بۆ ئەوانە سەیر دەکرا. بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی هەموو کەناڵەکانی پەیوەندیم لەگەڵ سەرۆك وەزیر داخران. لەلایەکی دیکەشەوە خەریکبوو شەپۆڵەکانی ئۆپەراسیۆنەکانی "کەجەکە" بە منیش بگەن کە بۆ شکاندنی نفوزی پ.ك.ك لە مەیدانی سیاسەتی یاسایی تورکیا دەستپێکرابوون. ئەمەش لەکاتێکدابوو کە لە پاییزی ساڵی ٢٠١٠دا بارودۆخەکە زۆر جیاوازبوو و هەوڵەکان بۆ چارەسەری سیاسییانەی کێشەی کورد زیاتربوون. لەو هەلومەرجەشدا کە بەشێوەیەکی رێژەیی ئازادبوو، توانیبوم لەگەڵ موراد قەرەیڵان و ژمارەیەك لەسەرکردە جیابووەکانی پ.ك.ك دیدار بکەم.

من یەکەم کەسێك نەبووم کە لە تورکیا٘وە بچمە قەندیل و لەگەڵ موراد قەرەیڵان دیدار بکەم، بەڵام من یەکەم کەس بووم کە بە بێ بەکارهێنانی کەناڵەکانی پ.ك.ك و لە رێی پەیوەندی خۆم لەگەڵ جەلال تاڵەبانی سەرکۆماری عێراق٘دا توانیبوم موراد قەرەیڵان ببینم. لەبەر ئەوەش نەك لە رێگای هەولێر، بەڵکو لە رێی سلێمانی یەوە بەرەوە قەندیل بە رێ کەوتم. رێبەرەکەی من، ئەندامێکی پێشووی پارتی کۆمۆنیستی عێراق و کوردێکی ئەو وڵاتە بوو کە لایەنگری لە پ.ك.ك دەکرد و لە بەشی پەیوەندییەکانی تاڵەبانی٘دا کاری دەکرد. لە رانیە بە دواوە، یەکێك لەو کەسانەی کە ساڵانێك فەرماندەیی هێزەکانی پێشمەرگەی یەکێتی لە قەندیل کردبوو، شۆفێری ئەو جێبەی دەکرد کە منی هەڵگرتبوو. جێبێکی پڕ لە پاسەوان و پێشمەرگەکان٘یش بە دوامانەوە بوون. لەبەر ئەوەی هەموو خاڵەکانی پشکنینی نێوان رانیە و قەندیل بەدەستی هێزەکانی پێشمەرگەی ی.ن.ك وە بوون، بە ئاسانی و تەنها بە سڵاوکردن لە بازگەکانەوە تێپەڕبووین. لە هێڵی باشوور بەرەو باکوور هەتا پێدەشتەکانی چیای قەندیل رۆیشتین و ناوچەی قەدەخەکراوی کورتەك٘مان بەجێهێشت و گەیشتینە خاڵی پشکنینی پ.ك.ك. رێگای رانیە - دیانا (سۆران) بۆ هەموو کەسێك کراوەبوو، بەڵام بە شانی راستدا، کە لەدوای لوتکەی چیا بەرزەکانی خاکی ئێران بوو، لە ناوچەیەکی فراواندا لە باشوورەوە بەرەوە باکوور و لە خۆرئاواوە بەرەوە خۆرهەڵات خاڵەکانی پشکنینی پ.ك.ك هەبوون. لەسەر لاپاڵێك، بە بەردی رەش و سپی پۆرترەیەکی گەورەی عەبدوڵا ئۆجالان دروستکرابوو. لە خاڵی پشکنینیشدا دیسان وێنەی ئۆجالان و ئاڵای پ.ك.ك هەڵواسرابوون...

ئەوانەی کە منیان هێنابوو، چەند کیلۆمەترێك لەولاوە راوەستان. سواری ئۆتۆمبیلێك بووم کە تەنها ئەندامانی پ.ك.ك ی تێدا بوو. بە تەنیشت ئەو لاپاڵەی کە پۆرترەکەی ئۆجالانی لێ بوو، پێچمان خواردەوە

و لەیەك دوو زنجیرە چیا و چەند دۆڵێکی قووڵەوە نزیکەی بیست خولەك بەرەو قووڵاییەکانی قەندیل ڕێگامان گرتەبەر. لە شوێنێکدا کە دواتر زانیم کاتی خۆی بڕیارگەی د.عەبدوڕەحمان قاسملوو سەرکردەی ئەفسانەیی حیزبی دیموکراتی کوردستان ی ئێران بووە، دابەزین و بە تووله ڕێیەکدا ڕۆیشتن. موراد قەرەیڵان لەبەردەم چادرێکی بچووکدا بە پێکەنینەوە چاوەڕوانیی منی دەکرد. گفتوگۆی شەش سەعات و نیویی من لەگەڵ قەرەیڵان، گرنگییەکی زۆری بۆ ڕاپۆرتەکەم هەبوو. گفتوگۆیەکی درێژ بەڵام ڕوون و بێ پەردە بوو. بۆ تێگەیشتن لە مێژووی پە.ك.ك و تایبەتمەندییەکانی ئەو ڕێکخراوە و پێکهاتەی زەینی بەرپرسە یەکەمەکەی گرنگییەکی تایبەتی هەبوو. موراد قەرەیڵان لەکاتێکدا باسی گۆڕانکاری و وەرچەرخانەکانی حزبەکەی دەکرد وتی؛"لە حەفتاکاندا لەنێو کۆمەڵگەی چەپەکاندا بووین و لە ژێر کاریگەری ریاڵ سۆسیالیزمدا مافی دیاریکردنی چارەنوسی نەتەوەکانمان وەك مافی جیابوونەوە قبوڵکردبوو. ئەم تێگەیشتنەش هەتا ١٩٩٣ بەردەوام بوو. بەڵام لەگەڵ کۆتاییهاتنی جەنگی سارد و دابەشبوونی یەکێتی سۆڤییەت... سەرنجمان چووە سەر قۆناغی یاسایی لەنێو تورکیا."بەوجۆرەش باسی لەوەکرد کە بە تێپەڕبوونی کات، پ.ك.ك وازی لە"سەربەخۆیی"کوردستان هێناوە. کاتێك کە وتی ئێمە یەکێتی سۆڤییەتمان بە لادەر لە قەڵەم دەدا و رووخانەکەی کاریگەری ئەوتۆی لەسەر ئێمە دانەنا و دەرسی پشت بەستن بە هێزی خودیمان لێ دەرخست، وتم؛"کام هێزێکی خودی؟ خۆ ئێوە پشتتان بە سوریا دەبەست؟"قەرەیڵان لە وەڵامدا وتی؛"لە پەیوەندییەکانی ئێمە و سوریا بابەتی پارە لە ئارادا نەبوو. پەیوەندییەکی تایبەت بوو. حافز ئەسەد لەبەر کێشەی ئاو لەگەڵ تورکیا پشتیوانی لە ئێمە دەکرد. سەرۆکایەتی (عەبدوڵا ئۆجالان) پەیوەندییەکی دۆستانەی باشی لەگەڵ جەمیل ئەسەد (برای حافز ئەسەد) بەرقەرارکردبوو. جەمیل ئەسەد حەزی لە ئێمە دەکرد و بڕوای پێکردبووین. بەڵام بۆ نمونە سوریا هیچ کات پێناسێکیشی بۆ ئێمە دەرنەکرد."

موراد قەرەیڵان باسی یەکەم ئاگربەستی حزبەکەیشی کرد کە چەند مانگێك بەر لە مردنی تورگوت ئۆزال رایگەیاندبوو. وادیاربوو کە بەڕێوەربەرانی پ.ك.ك گرنگییەکی تایبەتیان بە ئاگربەستەکەی ساڵی ١٩٩٣ دابوو؛

"ئاگربەستی ١٩٩٣ دەرەفەتێکی زۆرگرنگی بۆ چارەسەکردنی کێشەکە رەخساند، بەڵام لەگەڵ مردنی تورگوت ئۆزال، ئەو دەرفەتە لە کیس چوو. سەرۆك ئاپۆ یەکێك بوو لەو یەکەم کەسانەی کە دەیانگوت تورگوت ئۆزال کوژراوە. لەو قۆناغەدا ئێمە گەیشتبووینە ئەو قەناعەتەی کە پێویستە کێشەی کورد لە ناو تورکیا و لەگەڵ خودی تورکیا چارەسەر بکرێت. ئەوەش وەرچەرخانێکی گرنگ بوو. هەژدە ساڵ بەسەر ئەوەدا تێپەڕبوو. کوا جیاخوازی؟ کێ جیاخوازە؟ سەرەڕای ئەوەی هەژدە ساڵە چەك وەکو ئامرازێك بەکاردێت، بەڵام ئێمە دەمانەوێت ئەم کێشەیە بە بێ چەك چارەسەر بکەین. ساڵی ١٩٩٥، کۆنگرەی گۆڕانکاری بوو.

لە ئامانجی جیابوونەوەوە بەرەو فیدراسیۆن رۆیشتن. لە قۆناغی ١٩٩٥هوە گۆڕانکاری ریشەیی پارادیگما دەستپێکرد."لە درێژەی وتەکانیشیدا وتی؛"تێگەیشتنی ئێمە لە توندوتیژی لە ژێر کاریگەری ریاڵ سۆسیالیزمدا تا ساڵی ١٩٩٩ بەردەوام بوو."سەبارەت بە چەمکی توندوتیژی روونکردنەوەی فەلسەفی زۆری دا و ئەوەشی پێ زیادکرد کە ئەوان تەنها لە چوارچێوەی"بەرگری رەوا"دا بەڵێ بۆ توندوتیژی دەکەن. بە قەرەیڵان'م گوت، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ئێستای پ.ک.ک پێویست بە شەڕی چەکداری ناکات و جەنگ هیچ واتایەکی نییە. بۆ ساتێك راوەستا و دواتر بە پێکەنینەوە وتی؛"ئێمە هێزێکن لە جوڵانەوەی چەکدارییەوە هاتووین و ئەمەش وەك هێزی بەرگری لە دەستی خۆماندا دەهێڵینەوە. ئێرە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'ە، هێشتا ناتوانین بژاردەی چەك لە دەرەوە بهێڵینەوە."دواتریش وتی ئەگەر دەوڵەتی تورکیا هەتا کۆتایی دەرگای تێکۆشانی سیاسی-دیموکراتیك بۆ خەڵکی کورد بکاتەوە و واز لە سیاسەتی نکۆڵیکردن بهێنێت، ئەوکاتە چەك واتای خۆی لە دەستدەدات و بەوجۆرەش ویستی ئەو هەلومەرجە ئاشکرا بکات کە تێیدا پ.ک.ك واز لە چەك دەهێنێت. قەرەیڵان زۆر بە راشکاوی جەختی لەوەش کرد کە پ.ک.ك تەنها بە فەرمانی ئۆجالان واز لە شەڕی چەکداری دەهێنێت. لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠١٠دا ئامانجی ستراتیژی حزبەکەی وەك"تورکیا'ی دیموکراتی و کوردستانی ئۆتۆنۆمی"هێنایە سەرزمان. هەروەها وتیشی؛"کێشەی دەستوری هەیە و دەکرێت شوناسی کوردی لە دەستوردا قبوڵ بکرێت. ئێمە جێگرتنی کەلتوورە جیاوازەکان لە تەنیشت یەکتریدا بە ئۆتۆنۆمی ناودەبەین. لە دنیای ئەمڕۆدا خەریکە دەسەڵاتە ناوەندییەکان لە ناودەچن و دەسەڵاتە خۆجێییەکان بەهێز دەبن. پێویستە دەستور تورکیا'ی دیموکراتی و کوردستانی ئۆتۆنۆمی لە خۆ بگرێت و دەهتوانین لەسەر ئەمەش دانوستان بکەین. مەبەستیشمان لە کۆمەڵگەی دیموکراتی کرانەوەی کۆمەڵگەی تورکیا'یە. ئێمە باس لە کۆمەڵگەیەك دەکەین کە بە رووی هەموو کەلتوورێکدا کراوە بێت. ئەگەر ئۆتۆنۆمی دیموکراتی جێبەجێ بکرێت، من، ئێمە، رازین لە دوورخراوەییدا بژین و دەتوانین لە چوارچێوەی لێبوردنێکدا قسە لەسەر ئەمەش بکەین. ئێمە بۆ ئامانجێك ئەم رێگایەمان گرتۆتەبەر، ئەگەر ئۆتۆنۆمی دیموکراتی جێبەجێ بکرێت، شتەکانی دیکە خۆی بەدوایدا دێن."و لە رێی ئەم قسانەشەوە سەرەداوی سنورەکانی دانوستانی لەگەڵ تورکیا ئاشکرا کرد. قەرەیڵان باسی ئەوەشی کرد کە ئۆتۆنۆمی دیموکراتی دژی ئەوە نییە سوپای تورکیا لە کوردستان جێگیر بکرێت و ئەمەشم وەك خاڵێکی سەرنجڕاکێش یادداشت کرد. لەگەڵ ئەوانەشدا حەزی لە بەکارهێنانی دەستەواژەی"لێبوردن"نەدەکرد و وتی؛"ئێمە وشەی لێبوردن بەکارناهێنین. دەوڵەت لە رێی نکۆڵیکردنەوە هەڵەی کردووە و ویستویەتی خەڵکێك لە ناوبەرێت کە ریشەی لە مێژوودا هەیە و ئەمەش رێخۆشکەری دەرکەوتنی کێشەکان بووە. بەدەر لەوەش رووداوی بکوژی نادیار و کوشتنی بێ دادگاییکردن روویانداوە. ئەگەر دەوڵەت لە ئێمە ببورێت، ئەی کێ

لە ڕووداوی بکوژ نادیارەکان دەبوورێت؟ ئێمەش لەبەرامبەر کەسانی مەدەنیدا هەڵە و تاوانمان کردووە و لەبەر ئەوەش داوای لێبوردن دەکەین و ئامادەکاریی بۆ دەرخستنی ڕاستییەکان دەکەین. دەکرێت وەك ئەوەی لە باشووری ئەفریقا هەیە، لیژنەی ڕاستی و دادپەروەری دروستبکرێت و لە کەسانێکی پیاوماقووڵ و یاسایی و ڕۆشنبیر پێك بێت کە ئێمەش قبوڵیان بکەین...”

لەو گفتوگۆ چەند کاتژمێرییەدا، موراد قەرەیڵان ئاماژەی بەو هەل و دەرفەتە لە کیس چووانەی چارەسەرکردنی کێشەکە دا کە لە مێژووی نزیکدا ڕوویانداوە و باسی دەربازبوونی گرووپێك ئەندامی پ.ك.ك ی لە دەروازەی سنوریی خابوورەوە بۆ تورکیا کرد و وتی؛”بۆ یەکەمجار ئەمە بۆ ئێوە باسدەکەم. خودی سەرۆك وەزیر (تایب ئەردۆغان) داوای لێکردن لە قەندیل'ەوە کەسانێك ڕەوانەی تورکیا بکەینەوە. منیش بۆ ئەوەی دەستی ئەو بەهێزتر بێت، ئەو کارەم کرد. من شوێن و کاتی گەڕانەوەی گرووپەکەم دەستنیشانکرد. ئەو، لە دوو ڕۆژی یەکەمدا خۆی قایم ڕاگرت و پێداگری لە هەڵوێستی خۆی دەکرد، بەڵام دوای ئەوە بە پێچەوانە جوڵایەوە. ئەوەی کە ڕوویدا پەیوەندی بە ئێمەوە نەبوو. بۆ یەکەمجاربوو خەڵك دەیبینی کە گەریلا بە زیندوویی دەگەڕێتەوە. ئەوەی کە ڕوویدا دەربڕینی خۆشیی ئەمە بوو، بەڵام ئەوان لێی تێنەگەیشتن.”دواتر قسەکانی خۆی بە وتەی”چارەسەکردن تۆزێك ریسکیشی دەوێت.”کۆتایی پێهێنا. موراد قەرەیڵان تورکیا'ی بە بازنەی ناوەندی چارەسەرکردنی کێشەی کورد وەك کێشەیەکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە ڕەهەندێکی نێودەوڵەتیشی هەیە لە قەڵەم دەدا و وتی؛”چارەسەرکردنی کێشەی کورد ئەستێرەی تورکیا دەدرەوشێنێتەوە و لە ناوچەکەدا دەیکاتە سەرکردە. و دوای ئەویش لە سوریا و ئێران'یش کێشەکە چارەسەر دەبێت. چارەسەری ڕاستەقینە لە تورکیادایە و چارەسەرکردن لە سوریا و ئێران'یش بەدوای ئەودا دێن. تەنها ئەوەندە بەسە کە لە تورکیا چارەسەر بکرێت.”

چەند مانگ دوای ئەوە لە کۆتایی شوباتی ٢٠١١دا، لەکاتی نانخواردن لە میوانخانەی سەرۆکایەتی کۆمار لە بەغدا، جەلال تاڵەبانی کتوپڕ پرسیاری کرد کە”جەماڵ'ت پێ چۆن بوو؟”جەمال ناوی نهێنی موراد قەرەیڵان بوو. بە تاڵەبانی'م گوت؛”بەدەر لەو کەسانەی لە پ.ك.ك جیابوونەتەوە، موراد قەرەیڵان دووەم بەرپرسێکی باڵای ئەو ڕێکخراوەیە کە ببینم. دیارە پێشتر عەبدوڵا ئۆجالان'یشم بینیوە. بە بیرم دێتەوە لەگەڵ ئەودا لە قەزای بارئەلیاسی لوبنان، لە مارتی ١٩٩٣دا دوای ڕایگەیاندنی یەکەم ئاگربەستی پ.ك.ك بۆ ماوەی چل تا چل و پێنج خولەك یەکترمان بینیبوو. لەگەڵ قەرەیڵان'یشدا شەش سەعات و نیو لە قەندیل یەکترمان بینی. دیدارەکەی قەندیل'یش، دوای حەفدە ساڵ، دووەم دیدارێکی ڕاستەوخۆیە کە من لەگەڵ بەرپرسێکی باڵای پ.ك.ك ئەنجامم دابێت. لەو ماوەیەشدا ئەوانی دیکەم نەناسیوە و لەگەڵیان دانەنیشتووم، بەڵام شتی زۆرم لەسەریان خوێندۆتەوە و شتی زۆرم لەسەریان بیستووە. بە لەبەرچاو گرتنی

ئەوانەش، لە دەرەوەی ئۆجالان کە ئێستا لە زیندان دایە، وادیارە موراد قەرەیڵان لە هەموویان گونجاوترە و دەکرێت قسەی لەگەڵدا بکرێت."جەلال تاڵەبانی وتی؛"ئێمەش وا بیر دەکەینەوە، پێمخۆشە کە تۆش هەمان بیروبۆچوونت هەیە."دواتریش بە هەمان نوکتەبازی و قسە خۆشییەکەی خۆیەوە وتی؛"ڕێبازە خراپەکە لە خۆتانە، لە ئێمە نییە."کاتێك هەڵسەنگاندنی بۆ موراد قەرەیڵان کرد وشەی"ئێمە"ی بەکارهێنا و مەبەستی لەوەش، سەرکردایەتی کوردی عێراق بوو، بەڵام کاتێ کە گوتی ڕێبازە خراپەکە واتا باڵی توندڕەوی پ.ك.ك لە"ئێمە"نییە، مەبەستی ئەوەبوو کە لە کوردەکان نییە و لە"خۆتانە"واتا لە تورکەکان'ە. دوران کاڵکان یەکێك لە دامەزرێنەران و سەرکردەکانی پ.ك.ك کە پێشەنگایەتی باڵی توندڕەوی ئەو ڕێکخراوە دەکات، کورد نییە بەڵکو تورکێکی عەلەوی'یە. لە نوکتە شفرەدارەکەی تاڵەبانی تێگەیشتم و بە پێکەنینەوە وتم؛"تەواوە، تاوانی ئەوەش کەوتە ئەستۆی ئێمەی تورك."لەگەڵ ئەمەشدا گومان زۆرە لەسەر دروستبوونی ئەو دیالۆگە کورت و پڕمانایەمان کە پارتی کرێکارانی کورستانی پێ پێناسەکرا.

پ.ك.ك لە چارەیەکی یەکەمی ٢٠١١شدا ، تەنانەت لەلای ئەو کەسانەش کە لە دەرەوە بە باشی دەیانناسی و لێی شارەزا بوون، هێشتا هەر وەك مەتەڵێك مابووەوە. دوای ئەو دیدار و چاوپێکەوتننانەی کە لە ماوەی ساڵ و نیوێکدا بۆ ئامادەکردنی راپۆرتێك، لەگەڵ سەرکۆمار و وەزیری ناوخۆ و وەزیری داد و راوێژکاری میت و چەندین بەرپرسی دیکە ئەنجاممداون و ناوەڕۆکەکەیانم بە نهێنی لای خۆم هێشتۆتەوە، جارێکی دیکە تێگەیشتم تەنانەت دەوڵەتی تورکیا'ش کە نزیکەی سی ساڵە لەگەڵ پ.ك.ك'دا شەڕ دەکات، هێشتا وەك پێویست ئەو ڕێکخراوە ناناسێت.

جێگەی سەرسووڕمانە کە سەرەڕای ئەوەی پ.ك.ك لایەنێکی سەرەکی کێشەی کوردە و لە ماوەی سی ساڵ شەڕی چەکداریدا زیاتر لە چل هەزار هاوڵاتی کۆماری تورکیا گیانیان لە دەسداوە، هێشتا لێکۆڵینەوەیەکی بەرچاوی ئەکادیمی سەبارەت بەو ڕێکخراوە ئەنجام نەدراوە. ئەمەش نیشانەیەکی ئاشکرای بێئاگایی و نەزانی رای گشتی و دەوڵەتی تورکیا سەبارەت بە ڕێکخراوێك بوو کە وەك دوژمنی ژمارە یەکەمی ئەوی لێهاتووە. سەرەڕای ئەوەی زیاتر لە چڵ ساڵە تێکەڵاوی کێشەی کورد بوون، تەنانەت رۆناکبیرانی تورکیا'ش کە بەجۆرێک لە جۆرەکان بیرهێنەرەوەی دەوڵەتن، لەو بێئاگایی و نەزانییە سەبارەت بە پ.ك.ك نسیبیان وەرگرتووە. لە روانگەیەکەوە، بەسەرهاتە جۆراوجۆرەکانی من کە لە قۆناغی جیاجیا روویانداوە، وەك ئاوێنەی ئەو رۆشنبیرانەی تورك وایە کە خۆیان بە کێشەی کوردەوە سەرقاڵ دەکرد. بیروبۆچوونەکانمان سەبارەت بە پ.ك.ك و عەبدوڵا ئۆجالان ی سەرکردەی ئەو ڕێکخراوە، وەکو یەك گەشەیان کرد و لە قۆناغی جیاجیاشدا ئەنجامی هاوشێوەمان دەسکەوت.

دوای لێبوردنێکی سیاسی، لە کۆتاییەکانی ١٩٧٤دا، پاش سێ ساڵ دوورخراوەیی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست

و ئەورووپا، گەڕامەوە بۆ تورکیا و لەوێش بۆ یەکەمجار ناوی عەبدوڵا ئۆجالان ( بەر لەوەی پاشناوەکەی بزانم ) م بیست. ڕێکخراوەکانی لاوانی چەپ کە دوای قۆناغی ١٢ی مارت لە تورکیا سەرکوتکرابوون، لە زانکۆکاندا خۆیان ڕێکدەخستەوە. لە ئەنقەرە، کۆمەڵەی باڵای خوێندکارانی دیموکراتیکی ئەنقەرە (ADYöD) بەسەرۆکایەتی عەبدوڵا ئۆجالان'دامەزرابوو. هەندێك لەو کەسانەی کە لە ژێر چەتری ئەو کۆمەڵەیەدا کۆببوونەوە، بە گاڵتەجاڕییەوە ناوی "پارتی کۆمۆنیستی عەبدوڵا"یان بۆ کۆمەڵەکەیان بەکاردەهێنا. دواتریش ئاگاداری ئەوە بووم کە لە کۆتاییەکانی ١٩٧٤دا، ژمارەیەك لەو خوێندکارە چەپانەی لە دەوری عەبدوڵا ئۆجالان کۆبببوونەوە، بنەماکانی دامەزراندنی پ.ك.ك'یان داناوە. لەنێو یەکەم کادیرە سەرەکییەکانی پ.ك.ك دا هەندێك خوێندکاری غەیرە کوردیش هەبوون. یەکێك لەو کەسانەی لە قۆناغەکانی دەرکەوتنی پ.ك.ك دا ڕۆڵی هەبووە و هەموو کاتێك کاریگەری لەسەری داناوە و بە باشی باسی تایبەتمەندییەکانی ئەو حزبە دەکات، مەحمەدجان یوجە'یە. ئەو لە یەکەمین بەڕێوەبەرەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان بوو، بەڵام ساڵی ١٩٩٩ ئەوکاتەی لە زیندان بوو، بەهۆی ئەو ڕەفتارانەی کە ئۆجالان لەدوای دەسگیرکرانی خۆی نواندنی، هیواکانی تێکشان و وازی لە پ.ك.ك هێنا. مەحمەدجان یوجە بەر لە دابڕان لە پ.ك.ك، کتێبێکی بەناوی "ئەو هەتاوەی لە خۆرهەڵات بەرزبۆتەوە"نوسی کە تێیدا زۆر بە شان و باڵی ئۆجالان هەڵدەدات و بەرزی دەکاتەوە. لەو کتێبەکەدا سەبارەت بە هەلومەرج و ڕیشە ئایدۆلۆژییەکانی دەرکەوتنی پ.ك.ك و تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەو ڕێکخراوە زانیاری گرنگ پێشکەش دەکات.

"لەسەرەتای ١٩٧٠کاندا هەندێك جموجوڵ لە باشووری کوردستان پەیدا دەبن کە ڕەنگدانەوەیان لەسەر باکوور دەبێت. بۆ نموونە سەعیدەکانی دامەزرێنەری پارتی دیموکراتی کوردستان، سەعید ئەلچی و سەعید کرمزی تۆپراك (د.شوان) لە باشووردا هەندێك ئامادەکاریی سیاسی و ڕێکخستنییان کردبوو. د.شوان تۆزێك رادیکاڵتر و توندتر دیاربووە و ویستوویەتی لە هەککاری دەست بە جموجوڵ بکات، بەڵام بارزانی ئەمە قبوڵ ناکات و ڕێگای لێ دەگرێت. دوای ئەوەش هەوڵێکی تێکدەرانە دەدرێت و تێیدا سەعید ئەلچی دەکوژرێت و لەدوای ئەوە، بارزانی د. شوان دەکوژێت. لە پاش هەموو ئەو ڕووداوانەش سیخوڕێکی میت بەناوی دەورێشی سەعدۆ دەکرێتە سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا. لەکاتێکدا ئەم ڕووداوانە لە دەورووبەری پارتی دیموکراتی کوردستان روویاندەدا، سەرۆك (عەبدوڵا ئۆجالان) تەنها لە دوورەوە چاودێری دەکردن و لە ژێر کاریگەری ئەو ڕووداوانەدا نەبوو. هەر لەو قۆناغەدا، سەرەڕای ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ (DDKO)دا هەبوو، بەڵام خۆی زۆر تێکەڵاوی نەدەکرد و ئەو ڕێکخراوە بۆ ئۆجالان شتێکی زۆر سەرنجڕاکێش نەبوو. لەبەر ئەمەش، نەتەوەگەرایی ریفۆرمیست یاخود نەتەوەگەرایی سەرەتایی کورد کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە دەرکەوتنی پ.ك.ك دا نەبووە، بەڵکو خاڵی دەرکەوتنی پ.ك.ك جوڵانەوەی

شۆڕشگێڕی تورکیا بوو. خۆی لە خۆیدا هەتا ساڵی ١٩٧٥، دیار نەبوو کە ئایا سەرۆك ئاپۆ سەرۆکایەتی گرووپێکی کوردی دەکات یان پێشەنگایەتی گرووپێکی چەپی تورکی دەکات. جیابوونەوە و پڕڕەنگ بوونی شوناسی نەتەوەیی کوردی لەدوای قۆناغی ١٩٧٥ەوە دەستپێدەکات...

دەرکەوتنی سەرۆك ئاپۆ لەنێو جوڵانەوەی شۆڕشگێڕی تورکی نەك لەنێو گرووپە کوردییەکان و دانانی یەکەم بنەما سیاسی و تیۆرییەکانی جوڵانەوەکەی لەوێوە، شتێکی زۆر گرنگ و تایبەت بوو. ئەمەش تایبەتمەندی لە دایك بوون بوو..."(M. Can Yüce, Zelal Yayınları, İstanbul, Ocak ١٩٩٩, s. ٢٠٦)

بەهۆی ئەو پێشوازییە گەرمەی کە موراد قەرەیڵان لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠١٠ دا لە چیای قەندیل لێیکردم، تێگەیشتم کە هێشتا ئەو تایبەتمەندی"لە دایك بوون"ە لەنێو پ.ك.ك'دا کاریگەری ماوە. ئەو پێیگوتم کە من وەك یەکێك لەسەرکردەکانی جوڵانەوەی لاوانی جیلی ١٩٦٨ دەناسێت و دەزانێت لە قۆناغی ١٢ی ئەیلوول'دا لەنێو ریزەکانی جوڵانەوەی رزگاریخوازی فەلەستین جێی خۆم گرتووە و وتی؛"ئێوە جیلی پێشەوەی ئێمە بوون و لەو کاتانەدا نموونە و سەرمەشقی ئێمە بوون."ئەو وتانەی موراد قەرەیڵان کارئاسانییەکی زۆریان کرد تا گفتوگۆ شەش سەعات و نیوییەکەمان لە کەش و هەوایەکی گونجاودا بەڕێوە بچێت.

پ.ك.ك لە ساڵی ١٩٧٨دا بە رەسمی راگەیەنرا و لە ساڵی ١٩٨٤یشدا شەڕی چەکداری دەستپێکرد. وادیارە لەو شەش ساڵەی نێوان ئەو دوو قۆناغەشدا توانیبوی ناوبانگێك بۆ خۆی پەیدا بکات بۆیە لەو وڵاتانەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە تێیاندا گەڕابووم، هەوڵی دۆزینەوەی شوێنە پێی ئەو رێکخراوەم دابوو. بۆنموونە لە ساڵی ١٩٨١دا لە رێگای پەیوەندییەکەوە کە کادیرانی فەلەستین لە بەیروت بۆیان دروستکردبووم، دەربازی شام بووم تا لەوێ لەگەڵ کەسایەتییەکی سیاسی کورد دیدار بکەم. بیرم نایەتەوە ئەو کەسایەتییە سیاسییەی کورد کە لە شام دەژیا و لە ناوەڕاستەکانی تەمەنیدا بوو، لە کوردەکان'ی سوریا بوو یان لە کوردەکان'ی عێراق! بەڵام دەیانگوت زۆر بە وردی شارەزای بارودۆخی سیاسی کوردەکانە و منیش پرسیاری پارتی کرێکارانی کوردستانم لێکرد. لەو قۆناغەشدا باسی ئەوە دەکرا کە پ.ك.ك لە سوریا جێگیر بووە و لە ناو تورکیاشدا ئەو رێکخراوە وەك مەتەڵێکی لێهاتبوو. ئەو کەسایەتییە سیاسییەی کورد کە گومان لە شارەزاییەکەی سەبارەت بە بارودۆخی سیاسی کورد نەدەکرا، وەڵامێکی تەواوی پێنەدام و شتێکی ئەوتۆی لەبارەی پ.ك.ك نەدەزانی. تێبینی ئەوەشم نەکرد کە دەیەوێت شتێك لە من بشارێتەوە. ناوی بیستبوو، بەڵام وەك رێکخراوێك سەیری نەدەکرد کە شایانی ئەوە بێت گرنگی بە کاروچالاکییەکانی بدرێت.

لەگەڵ یەکەم ئۆپەراسیۆنی سەربازی هێزە چەکدارەکانی تورك لە مایسی ١٩٨٣ لەنێو خاکی عێراق لە دژی پ.ك.ك، ئەو رێکخراوە سەرنجەکانی بۆ خۆی راکێشا. سوپا بۆ لەناوبردنی پ.ك.ك کە هێشتا دەستی بە

تێکۆشانی چەکداری نەکردبوو، لەشکرکێشی بۆ سەر خاکی کوردستانی عێراق کردبوو. دەسەڵاتی سەربازی ١٢ی ئەیلوول لە تورکیا حوکمی دەکرد و بە راستی دەرەفەتی ئەوە نەبوو کە بزانی چی روودەدات. بۆیە پێویستبوو تەنها بە روونکردنەوە سەربازییەکان بەس بکەیت. لەو قۆناغەدا لە رۆژنامەی جمهورییەت کارم دەکرد و نزیکەی نیوەی ساڵم لە لوبنان و ئێران و شوێنە جیاوازەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست تێپەڕ دەکرد. حەسەن جەمال سەرنوسەری رۆژنامەکە داوای لێکردم بۆ ئاگاداربوون لە نهێنییەکانی ئۆپەراسیۆنەکەی دەرەوەی سنور، سەردانی ئێران بکەم. لە تاران چوومە ماڵی هانی فەحس، پیاوی ئایینی شیعە کە دۆستی خۆم بوو. باسی هۆکاری سەردانەکەی خۆمم بۆ کرد و ئەویش وتی سەید هادی مودەڕیسی کە بە رەچەڵەك خەڵکی عێراق'ە و یەکێك لە کەسە کاریگەرەکانی ژرێمی ئێرانە، زانیاری هەواڵگری باشە و مودەڕیسی بانگهێشی ماڵی خۆی کرد. وەك جاری جاران، مودەڕیسی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە موریدەکانیدا هات و لەسەر عەرز چوارمشقیمان دا و گفتوگۆیەکی گەرممان دەستپێکرد. بەڵام سەید هادی مودەڕیسی زانیارییەکی ئەوتۆی لەسەر رووداوەکان نەبوو. دەزانرا کە مەسعود بارزانی و ئیدریس بارزانی، هەردوو برا سەرکردەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان لە شاری کەرەج لە نزیك تاران نیشتەجێن، ئەگەر ئەو کاتانە لە کەرج بایەن، دەمتوانی هەندێك زانیاریم دەستکەوێت. بەڵام بەدەستی بەتاڵ لە تاران گەڕامەوە.

نزیکەی سی‌ساڵ دواتر تێگەیشتم کە بۆچی تورکیا لەو کاتانەی هێشتا پ.ك.ك بەتەواوی دەرنەکەوتبوو، دەیویست لە خاکی عێراق'دا لەناوی بەرێت و ئەمەشم لە یەکێك لەو سەرچاوانە دەسکەوت کە بۆ نوسینی راپۆرتەکەی تەسەڤ بەکارم هێنابوون. سەلاحەدین چەلیك یەکێك لە یەکەمین کادیرە پێشکەوتووەکانی پ.ك.ك و فەرماندەکانی ئەو رێکخراوە، ساڵی ١٩٩٩ لە پ.ك.ك جیابووەوە و کتێبێکی بەناوی"گواستنەوەی چیای ئاگری؛ شیکردنەوەی ئەنجامە سیاسی، سەربازی و کۆمەڵایەتی و ئابورییەکانی راپەڕینی مودێرنی کورد"لەسەر ئەو رێکخراوە بڵاوکردەوە کە تێیدا هەندێك زانیاریم دەسکەوت کە بیست و هەشت ساڵ لەوەوپێش بەدوایاندا گەڕابووم و دەستم نەکەوتبوون؛

"...سوپای تورك سەرەڕای ئەوەی کە بەتەواوی نەیدەزانی پ.ك.ك چییە، بۆ رێگرتن لە گەورەبوونی ئەو رێکخراوە دەستی بە جموجۆڵ کرد. لە یەکەمین رۆژەکانی مایسی ١٩٨٣دا لە ئولودەرە، یوکسەك ئۆڤا، شەمزینان و چوقورجا هێزێکی گەورەی جێگیرکرد. سەربازەکان لە گوندی هەدریش لە بەشی باکووری هێڵی سنوریی ناوچەی ئولودەرە، بۆ ماوەی چەند کاتژمێر کەسانی بە تەمەنی گوندیان لە ناو چاڵی گەورەی بەفردا هێشتبووەوە. لەدوای ئەوە، گوندییەکانیش لە کەمینێکدا ئەفسەرێك و شەش سەربازی سوپای تورك'یان کوشتبوو. سوپای تورکیا ئەمەی کردە بیانوویەك و لە ١٠ی مایسدا بە درێژایی ١٠ کیلۆمەتر لەشکرکێشی بۆ ناو خاکی باشووری کوردستان کرد. فەرماندەکانی سوپا دڵنیا بوون لەوەی کە پ.د.ك لە

سنورەکان دەکشێتەوە و پ.ك.ك پەنا نادات. لەو پێکدادانانەی کە بەهۆی ئۆپەراسیۆنەکەوە روویاندا، سەربازێکی سوپای تورکیا و گەنجێکی شەمزینانی کە ئەو کاتانە لەنێو کەمپەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق'دا بوو کوژران...

ئۆپەراسیۆنەکە بە قازانجی پ.ك.ك کۆتاییپێهات و لە ئەنجامی کشانەوەی هێزەکانی باشوور لە ناوچە سنورییەکان، مەیدانێکی فراوانی بۆ چۆڵکرا کە رێگای جموجۆڵی بۆ زیاتر کرد. سوپای تورکیا بە هەندێك پێشداوەری و بڕیاری پێشوەختەوە سەبارەت بە پ.ك.ك دەجوڵایەوە و چاوەڕوانی دەکرد پێکدادانی گەورە رووبدات، بەڵام پ.ك.ك لەبەر ئەوەی بە تازەیی هاتبووە ئەو ناوچانە و هێزەکانی بۆ باکوور دابەشکردبوو، نەیدەویست شەڕی گەورە بکات. لە ئەنجامیشدا بە بێئەوەی هیچ زیانێك بدات، توانی سەرکەوتووانە هەموو هێزەکانی خۆی رەوانەی باکوور بکات...

پ.ك.ك لە هەککاری، چوقورجا، یوکسەك ئۆڤا، شەمزینان، ئوڵودەرە، بەیتوشەباب، شرناخ، سلۆپی، ئەروە، جزیرە، سیرت، پەرواری، چاتاك، شیروان، ساسۆن، موش، سیلڤان، میدیات، نوسەیبین، ئیدیل، دێرك، ویرانشەهیر، ماردین، دیاربەکر، چەرمیك، بینگول، دەرسیم، ئەلازیغ، ئەرزڕووم، قارس، ئاگری، وان و باشقەلە دا یەکەکانی ئامادەکاریی پڕوپاگەندەی چەکداری جێگیر کرد..."(Selahattın Çelik, A□rı Da□ı Taşımak, Temmuz ٢٠٠٠, Zambon Verlag, Frankfurt, s. ٦٩, ٧٠)

نزیکەی یەك ساڵ دوای ئەم رووداوەش پ.ك.ك لە ساڵی ١٩٨٤دا لە رێی هێرشەکانی ئەروە- شەمزینانەوە شەڕی چەکداری دەستپێکرد. ئەوەی کە دێڕەکانی سەرەوەی نوسیوە، یەکێك بووە لەو کەسانەی بڕیاری دەستپێکردنی شەڕی چەکدارییان داوە و لە هەمان کتێبدا ئەم دێڕە گرنگ و مێژووییانەشی نوسیووە؛

"ئەو بڕیارەی کە چاوەڕوانییەکی زۆری دەکرا، دواجار لە ٢٢ی تەمووزی ١٩٨٤دا دەرکرا. ئەو بڕیارە لە لۆلان لە سنوری باشوور و باکوور و خۆرهەڵاتی کوردستان، لەلایەن بەشداربووانی کۆبوونەوەکە، عەباس (دوران کاڵکان)، فوئاد (عەلی حەیدەر قایتان)، فاتمە (کەسیرە)، ئەبوبەکر (خەلیل ئاتاچ)، جومعە (جەمیل بایك)، و سەلیم (سەلاحەیدن چەلیك) بە کۆی دەنگ پەسندکرا. هەموو ئەو کەسانەش کە بەشدارییان لەو کۆبوونەوەی بڕیاردانەدا کرد ئێستا لە ژیاندا ماون."(چەلیك، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣)

کەس تێنەگەیشت کە لە راستیدا دەستپێکردنی شەڕی چەکداری پ.ك.ك بەهۆی هێرشەکانی ئەروە – شەمزینان'ەوە، پەیوەندی بە دەرکەوتنی درێژخایەنترین و قوڵترین و بەربڵاوترین راپەڕینی چەکداری کوردەکان لە مێژووی تورکیا هەیە. دوای ئەو دەسکەوتانەی کە راپەڕینی چەکداری بەدەستیهێنان، ئەگەری سەیری رابردوو بکەیت دەبینیت کەسانێك هەبوون کە تورگوت ئۆزال'یان بە نەرمی نواندن تۆمەتبار دەکرد. بەڵام بە رای من رەخنەکان زیاتر لە خوێندنەوەیەکی راست و دروستی مێژوویی، لە

هۆکاری سیاسییەوە سەرچاوەیان دەگرت. هەر لەکاتی دەرکەوتن و فراونبونی شەڕی چەکداریدا، تورکیا ڕووداوەکانی وەك"تیرۆریزم"ناوزەد کرد و دەستەواژەکانی"تیرۆریست"و"چەتە"بۆئەندامانی پ.ك.ك بە ڕەوا زانران و پە.ك.ك بە"ڕێکخراوی جیاخواز"لەقەڵەمدرا. ئامانجی دوارۆژی پ.ك.ك وئایدیالی پان - کوردی ئەو ڕێکخراوە بۆ دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ، ببوونە هۆی پشتڕاستکردنەوەی ئەو ئاوەڵناوانەی کە بۆی داتاشرابوون و ڕای گشتیش کە دەکەوتە ژێر کاریگەری ئامانجەکانی شەڕی پڕوپاگەندە، ئەو جۆرە سیفەتانەی بۆ پ.ك.ك بە ڕەوا دەزانی. جەنگی پڕوپاگەندەی دەوڵەت و پێکهاتەی زەینی بەڕێوەبەرانی میدیا کە بە بێ لێ وردبوونەوە ئەو سیفەت و دەستەواژانەی قبوڵ دەکرد و بەکاردەهێنا کە ئامڕازی جەنگی پڕوپاگەندەیی دەوڵەت بوون، وایانکرد وشەی کورد و چەمکی کێشەی کورد هاوواتای جیاخوازی بکرێن و مۆرکی"تیرۆریزم"و"ڕێکخراوی تیرۆریستی جیاخواز"و"تیرۆریست""چەتەکان"لە پ.ك.ك و ئەندامەکانی بدرێت و لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتیشدا، بەهۆی قوربانییەکانی جەنگەوە عەبدوڵا ئۆجالان بە کەسێکی وەك"بکوژی مناڵ"و"سەردەستەی تیرۆریستەکان"ناوزەد بکرێت. ئەم ناو و ناتۆرانەش بە ئاستێك بەربڵاون کە زەحمەتە بە ئاسانی لاببرێن. پێدەچێت بەهۆی کاریگەری ئەو پڕوپاگەندە زۆرە و تێگەیشتنی باو لە ڕای گشتیدا بووبێت کە منیش خۆم لە پە.ك.ك و ئەندامەکانی دوور دەگرت. زووزوو سەردانی لوبنان'م دەکرد بەڵام گەشتە بەردەوامەکانم بۆ ئەو وڵاتە بە تایبەتی ئەو ماوە زۆرانەی کە لە بەیروت دەربازم دەکردن، زیاتر لە کێشەی کورد، پەیوەندییان بە کێشەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەت فەلەستین هەبوو. پ.ك.ك بارەگاکانی خۆی لە دۆڵی بیقاع لە لێواری سنوری سوریا-لوبنان دانابوو، ئەو شوێنەش تەنها ماوەی کاتژمێر و نیوێك لە بەیروت دوور بوو. عەبدوڵا ئۆجاڵان'یش لە حەلوە لە خوار سنوری کاەشام دەمایەوە، بەڵام من هیچ کات دوای ئەوان نەکەوتم.

لە نیوەی دووەمی دەیەی ١٩٨٠دا، محەمەد عەلی بیراند بایەخنەدانی میدیای تورکی بە ئۆجالان و پ.ك.ك تێکشاند و دوای ئەویش زنجیرەیەك لە میدیاکارانی تورك لەگەڵ ئۆجالان'دا چاوپێکەوتنیان کرد. لەگەڵ ئەمەشدا دوورەپەرێزیی من درێژەی کێشا و هیچ کات پ.ك.ك و عەبدوڵا ئۆجالان لە ئامانجی گەشتە بەردەوامەکانی من بۆ لوبنان جێیان نەبووەوە. زۆرجار لە لوبنان لە ماڵی میشل نۆفڵ دەمامەوە. جارێك، لەسەرەتای مارتی ١٩٩١دا، میشل لە دیدارێکدا لەگەڵ گرووپێك ئەندامی پ.ك.ك لە نوسینگەی ئاژانسی فرانس پرێس وتبووی کە من لە ماڵەکەی ئەوم و ئەگەر بیانەوێت دەتوانن بۆ ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ ئۆجالان، لەگەڵ من قسە بکەن. بۆ ڕۆژی دواتریش ئەوانی بانگهێشتی ماڵەکەی خۆی کردبوو.

حەزم لەو ئەمری واقیعە نەکرد. لەو کاتانەدا ئۆجالان و پ.ك.ك جێگایەکی تایبەتیان لە مێشکی مندا نەبوو. تەنانەت ئەوکاتەش کە ڕۆڵی یەکلاکەرەوەم لە دروستکردنی میکانیزمی دیداری جەلال تاڵەبانی و

تورگوت ئۆزال'دا گێڕا، یەکێك لە ئامانجی سەرەکییەکانم ئەوەبوو پ.ك.ك لە بازنەی رووداوەکان بکرێتە دەر و کێشەی کورد چارەسەر بکرێت. لەگەڵ ئەمەشدا ناچار بووم بەپێی ئەو ئەمری واقیعەی کە خاوەن ماڵ بۆی دروستکردبووم بجوڵێمەوە. وامزانی دەتوانم جێبەجێی بکەم. رۆژی دواتر کاتێ گەڕامەوە بۆ ماڵی میشل نۆفل، بینیم سێ ئەندامی پ.ك.ك کە یەکیان ژن و دوانی دیکەشیان پیاو بوون چاوەڕوانیی منیان دەکرد. ئەوەش یەکەمجار بوو راستەوخۆ ئەندامانی پ.ك.ك ببینم. دوای هەواڵپرسینی یەکتر، هەموو لایەك کڕ و کپ بوون و نەماندەزانی باسی چی بکەین. ئەندامەکانی پ.ك.ك زۆر بە کەمیی قسەیان دەکرد بەڵام کاتێ من قسەم هێنایە سەر جەنگی کەنداو و باسی رۆڵی تاڵەبانی و بارزانی'م کرد، یەکسەر وتیان؛"ئەوانە سیخوڕی ئیمپریالیزمن. سەرکردەی دەرەبەگ ۆ کەمبایەخن و شایەنی ئەوە نین باسیشیان بکرێت."ئەم کاردانەوەیەم بەلاوە سەیر بوو، بەڵام لەو کاتەدا نەمویست درێژە بە گفتوگۆیەك بدەم کە بەلای منەوە هیچ واتایەکی نەبوو. گەڕامەوە سەر هۆکاری یەکتربینینەکەمان و وتم؛"ئەگەر ئۆجالان بیەوێت لەگەڵ من دیدار بکات، دەکرێت چاوپێکەوتنەکە بۆ بڵاوکردنەوە بێت یاخود تەنها دیدار و گفتوگۆیەکی بەینی خۆمان بێت و بۆ بڵاوکردنەوە نەبێت. ئەگەر ئەوەی دووەمیان بێت دەتوانین لە چوارچێوەیەکی فراواندا قسە بکەین. بڕیار لای خۆتانە، بەڵام پێویستە من رۆژی یەکشەممە بگەڕێمەوە بۆ تورکیا. نزیکەی دوو رۆژ تا دوو رۆژ و نیو کاتمان لەبەردەستدایە، بەڵام دەبێ زوو وەڵامم لێ بگێڕنەوە تا خۆم بەگوێرەی ئەوە رێکبخەم."

خۆم وادەرخست کە گوایە ئەو کەسەی پێویستە پێی بگەیت و کاتی کەمە، منم. ئەمەش هەڵوێستێك بوو کە لەوانەیە هەستکردن بە پۆستەکەم وەکو راوێژکاری سەرکۆماری تورکیا پێی دابێتم. ئەندامە گەنجەکانی پ.ك.ك وتیان قسەکانی تۆ بە"سەرۆکایەتی"رادەگەیەنین و منیش نەمدەزانی"سەرۆکایەتی"بۆ تاقە کەسێك و ئەویش بۆ خودی عەبدوڵا ئۆجالان بەکاردەبرێت. لە نیازپاکی خۆمەوە وامدەزانی دەستەواژەی سەرۆکایەتی بۆ ئاماژەدان بە دەستەیەکی بەڕێوەبەردن یان پۆلیت بیرۆ بەکاردەبەن، بۆیە وتم؛"پێویست ناکات شتەکە گەورە بکرێتەوە. بۆ شتێکی وەها پێویست بە بڕیاری سەرۆکایەتی ناکات. تەنها بە خۆی بڵێن و لە ماوەیەکی کورتیشدا وەڵامەکەم لێ بگێڕنەوە."بە رای من بۆ دیدارێکی دوو کەسی، بڕیاری دەستەیەك پێویست نەبوو.

لەبەر ئەوەی بەردەنگەکانی منیش هیچ واتایەکیان بە پێداگری من لەسەر قسەکانی خۆم نەدەدا، ئەوانیش پێداگرییان کرد و وتیان"بەسەرۆکایەتی رادەگەیەنین."دوای بیست ساڵ، کاتێك لەگەڵ موراد قەرەیڵان لەبارەی پێکهاتەی پ.ك.ك قسەمان دەکرد، ئەم بیرەوەرییەم بۆ گێڕایەوە و زۆر پێکەنین.

لە ئەنجامدا ئۆجالان هیچ هەواڵێکی نەنارد و منیش گەڕامەوە بۆ تورکیا، بەڵام دواتر لە روونکردنەوەکانی خۆیدا رایگەیاندبوو کە تورگوت ئۆزال ناوبژیوانی بۆ لای ئەو ناردووە و باسی دیدارەکەی لوبنان'ی کردبوو.

سەرم سووڕما، چونکە من داوای دیدارم لێ نەکردبوو، تورگوزت ئۆزال'یش دوور ونزیك هیچ پەیوەندییەکی بەو رووداوەوە نەبوو. لە ژیانی خۆمدا تەنها یەکجار ئۆجالان'م بینی، ئەویش دوو ساڵ دوای ئەو رووداوە، لە یەکێك لە قۆناغە گرنگەکانی مێژووی پ.ك.ك و کێشەی کورد لە تورکیا'دا بوو.

هاوڕێی نزیکم کامەران قەرەداخی نوسەری رۆژنامەی ئەلحەیاتی چاپی لەندەن کە لەگەڵ مندا رۆڵی گرنگی لەبەرقەرارکردنی پەیوەندی نێوان جەلال تاڵەبانی و سەرکۆمار ئۆزال'دا هەبوو، لە کۆتاییەکانی شوباتی ١٩٩٣دا لە شامەوە تەلەفۆنی بۆکردم و زانیارییەکی زۆر گرنگی پێدام بۆ ئەوەی بە تورگوت ئۆزال سەرکۆماری تورکیا'ی رابگەیەنم. (بۆ بیرهێنانەوە؛ کامەران قەرەداخی لەنێوان سالانی ٢٠٠٣-٢٠٠٧، سکرتێری گشتی جەلال تاڵەبانی سەرکۆماری عێراق بوو.)

زانیارییەکە لای جەلال تاڵەبانی دەهات و باسی ئەوەی دەکرد کە بەم نزیکانە ئۆجالان لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا ئاگربەستی پ.ك.ك رادەگەیەنێت و ئۆجالان'یش بۆ ئەو کۆنگرە رۆژنامەوانییە تەنها سێ کەسی بانگ دەکرد کە ئەوانیش محەمەد عەلی بیراند، جەنگیز چاندار و کامەران قەرەداخی بوون.

تاڵەبانی لەگەڵ ئەوەی کە دەیوست زانیارییەکە بگاتە تورگوت ئۆزال، خوازیاری ئەوەش بوو کە ئۆزال بزانێت ئەو کەفیلی عەبدوڵا ئۆجالان نییە و دڵنیا نییە کە بەڵێنەکەی دەباتە سەر یان نا. لەگەڵ ئەوەشدا وتبووی تا ئەوکاتە ئۆجالان خۆی نەخستۆتە ژێر بەرپرسیارییەکی وەها و تێبینی ئەوەشی کردبوو کە بە ئەگەری زۆر ئاگربەستەکە رادەگەیەنێت. ئەگەر ئەوەش سەری بگرتایە، دەبووە یەکەم ئاگربەستێك کە دوای دەستپێکردنی شەڕی چەکداری لە ساڵی ١٩٨٤، پ.ك.ك بەشێوەی تاکلایەنە رایبگەیەنێت و بەوجۆرەش لاپەڕەیەکی نوێ سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد هەڵدەدرایەوە. لە دیدارێکمدا لەگەڵ تورگوت ئۆزال لە شوێنی حەوانەوەی خۆی لە چانقایا، ئەو زانیارییەم پێدا. سەرم سووڕما لەوەی کە هیچ هەیەجانێکم تێدا بەدی نەکرد. تەنانەت پرسیاری وردەکارییەکانیشی نەکرد و تەنها وتی"با رایبگەیەنێت، دواتر بزانین چۆن دەبێت."

ئەو زانیارییە ئەوەندە نهێنی بوو کە نەدەکرا جگە لە ئۆزال بەهیچ کەسی دیکە بدرێت بەڵام بۆ ئامادەبوون لەو رۆژە مێژووییەشدا پێویستبوو خۆم حازر بکەم. بۆیە ئەو نهێنییەم بە زەفەر موتلو سەرنوسەری رۆژنامەی سەباح گوت، چونکە خەرجی رێگا و مانەوە لەسەر رۆژنامەکە بوو. بۆ ئەوەش پێویستبوو زەفەر رازی بێت. ئەو دەیتوانی بە بێئەوەی بە کەسانی دیکە بڵێت رەزامەندی لەسەر خەرجییەکانی گەشتەکەم پیشانبدات. دوای ماوەیەکی کورت لە وەرگرتنی زانیارییەکە، زەفەر گوشاری خستە سەرم تا بڵاوی بکاتەوە. دەردی ئەو، لەو کێبڕکێیەدا بوو کە لەگەڵ رۆژنامەی حورییەت'دا سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی هەواڵ دەیکرد. ئەو نیگەران بوو لەوەی کە مادام تورگوت ئۆزال ئاگای لە شتەکە هەیە، زانیارییەکان دزە بکات بۆ میدیا و

ئۆزال زانیارییەکان بە ئەرتوغروڵ ئویزکویك سەرنوسەری رۆژنامەی حوڕییەت بدات. دوای چەند رۆژ خۆی رانەگرت و لە ١١ی مارتی ١٩٩٣دا پێیوتم؛"ئێمە بڕیارمانداوە ئەم زانیارییانە بڵاوبکەینەوە. ئەگەر دەتەوێ هەڵەیەکی تێدا نەبێت وەرە خۆت بینوسە." هەواڵی راگەیاندنی ئاگربەستەکەی ئۆجالانʼم نوسی و رۆژی دواتر لە ١٢ی مارتʼدا لە مانشێتی رۆژنامەی سەباحʼدا وەك بۆمبێك تەقییەوە. هەواڵەکە ئەوەندە گرنگی پێدرابوو کە بەرەبەیان لەکاتی بڵاوکردنەوەدا بینرا و بۆ ئەوەی رۆژنامەی حوڕییەت پێی نەزانی، لە چاپی شوێنەکانی دەرەوەی شار دانەنرابوو، بەڵکو تەنها وەك بەرگێکی تایبەت بۆ چاپی ناوشار دانرابوو. کاتێ هەواڵی راگەیاندنی ئاگربەستەکەی ئۆجالان وەك بۆمبێك تەقییەوە، هەواڵی سەرنجڕاکێشی دیکەش بەدوای ئەودا بڵاوکرانەوە. رۆژنامەی حوڕییەت کە لەو هەواڵەدا دوای سەباح کەوتبوو، بۆ رۆژی دواتر هەواڵێکی بڵاوکردەوە کە گوایە تاڵەبانی لە نامەیەکدا زانیاری ئاگربەستەکەی بۆ سولەیمان دەمیرەل سەرۆك وەزیر ناردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی قەڵەمی تایبەتی دەمیرەل نامەکەی بە گرنگ نەزانیوە، سەرۆك وەزیری لێ ئاگادار نەکردۆتەوە!

بڵاوبوونەوەی هەواڵی ئاگربەستەکەی ئۆجالان لە رۆژنامەی سەباح، بۆ ماوەیەکی کورت بەینی من و کامەرانی تێکدا. کامەران ئەوەندە تووڕە بوو کە دەیگوت لەوانەیە ئۆجالان بەهۆی بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە لە راگەیاندنی ئاگربەست پەشیمان بێتەوە و دەیگوت لەدوای ئەو رووداوە، ئۆباڵی رژانی هەر دڵۆپە خوێنێك دەکەوێتە ئەستۆی من و پێویستە کەفارەتی ئەوەش بدەم. پشتی پەردەی رووداوەکەم بۆ باس کرد و ویستم پێی بڵێم بڵاوکردنەوەی هەواڵەکە لە ئەنجامی خودپەرستییەکی رۆژنامەوانی نەبووە، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو، ئارام نەدەبووەوە. یەك دوو رۆژ دواتر تەلەفۆنی کرد. تۆزێك ئارام ببوەوە. لە شام سەردانی ماڵی ئۆجالانʼی کردبوو. ئۆجالان رۆژنامە تورکیʼیەکانی لەبەردەم خۆی ریز کردبوو و وتبووی؛"سەیر کە! هەموو کەس باسی من دەکات."تۆ واز لەوە بێنە کە لە راگەیاندنی ئاگربەست پەشیمان بێتەوە، بەڵکو بڕیاریدابوو رۆژی سێشەممە ١٦ی مارت، لە کۆنفرانسێکی رۆژنامەوانی کراوەدا لە قەزای بارئەلیاس لە دۆڵی بیقاعی لوبنان ئاگربەستەکە رابگەیەنێت.

لە جزیرەʼوە تەلەفۆنێکم بۆ هات. ئەوەی قسەی دەکرد، دەیگوت یەکێك لەو کەسانەیە کە لە بەیروت منیان بینبوو. بەپێی قسەکانی ئەو، پێویستبوو لە بەیروت بچمە هۆتێل بریستۆڵ و بەیانیی رۆژی سێشەممە لەوێ ئێمەیان هەڵدەگرت و بەرەو بارئەلیاس دەڕۆیشتین. هێڵی ئاسمانی راستەوخۆ بۆ بەیروت نەبوو هەتا لەکاتی خۆیدا بگەینە بارئەلیاس، بۆیە شەوی یەکشەممە بە فڕۆکەیەکی تورکیا کە سەفەری کەراچی دەکرد و رێی خۆی دەخستە دوبەی بەڕێکەوتین. بەرەبەیانی رۆژی دواتر لە دوبەی، لەگەڵ گرووپێکی قەرەباڵغی رۆژنامەنوسی تورك بەرەو بەیروت بەڕێکەوتین و لەوێ لە هۆتێل بریستۆڵ جێگیربووین. دوانیوەڕۆی

ئەو رۆژەش ئەندامانی پ.ك.ك ئێمەیان لە لۆبی هۆتێلەكەدا دۆزییەوە و بە چەند ئۆتۆمبیلێك بەرەو بارئەلیاس بەڕێكەوتین. بەر لەوەش تەلەفۆنم بۆ جەلال تاڵەبانی كرد كە لەگەڵ كامەران قەرەداخی لە شام بوو. ئەویش بەشداری كۆنفرانسە رۆژنامەوانییەكەی دەكرد. داوام لە تاڵەبانی كرد دوای كۆنفرانسەكە دیدارێكی تایبەت لەگەڵ ئۆجالان بۆ من رێكبخات. وتی لەوانەیە بتوانم شتێك بكەم. بەپێچەوانەی ئەوەی كە ئۆجالان و كەسانی نزیك لە پ.ك.ك بڵاویان دەكردەوە، دیدارەكەی من و ئۆجالان كە دوای كۆنفرانسە رۆژنامەوانییەكە لە ئێوارەی رۆژی ١٦ی مارت ئەنجامدرا، بە فەرمان و ئاگاداریی ئۆزال نەبوو، بەڵكو لە خۆمەوە كردبووم.

لە كۆڵانێكی قەزای بارئەلیاس لە هۆڵی گەورەی بینایەكی سادەدا ژمارەیەكی زۆر لە رۆژنامەنوسانی تورك جێگیركرابوون. كامەران قەرەداخی'ش لەوێ بوو. لەبەر دەرگای ژوورەكەدا بە پێوە وەستابووم و لەكاتی چاوەڕوانیكردنی ئۆجالان'دا لەگەڵ ئەندامێكی پ.ك.ك قسەم دەكرد كە دوای چەند ساڵێك لە رێی وێنەكانییەوە زانیم رەزا ئاڵتون یەكێك لە دامەزرێنەران و بەڕێوەبەرانی پ.ك.ك بوو. دوای ماوەیەكی كورت ئۆجالان لەگەڵ تاڵەبانی'دا هاتنە ژوورەوە. لەسەر پێشنیاری كامەران قەردەاخی قات و بۆینباخی لەبەر كردبوو. دەیویست لە رێی جلوبەرگەكانیشیەوە پەیامی كۆتاییهاتنی قۆناغی شەڕی چەكداری بدات. لەدوای كۆنفرانسە رۆژنامەوانییەكە ئۆجالان دیارنەما. لە چێشتخانەكە خەریكی تێركردنی خۆمان بووین كە كتوپڕ جەلال تاڵەبانی هات و بە چپە وتی تۆزێكیتر دیدارەكە ئەنجامدەدرێت. كاتێ منیان بەرەو ژوورێكی گەورەتر برد، بینم كە عیسمەت عیسمەت لە رۆژنامەی توركیش دەیلی نیوزیش بەرەو هەمان ژوور دێت. عیسمەت بۆ ئەوە هاتبوو ناوەڕۆكی كۆبوونەوەكەی دوای راگەیاندنی ئاگربەست بۆ ئیلنور چەڤیك سەرنوسەری رۆژنامەی توركیش دەیلی نیوز بگێڕێتەوە كە لەو كاتانەدا راوێژكاری سولەیمان دەمیرەل بوو. عەبدوڵا ئۆجالان لە ناوەڕاستی ژوورەكەدا وەستابوو. وتی ئەگەر دەتانەوێ، دەتوانم بە جیا لەگەڵتان دیدار بكەم. كتوپڕ ئەوە هات بە مێشكمدا كە ئەگەر كۆبوونەوەكە شایەتێكی هەبێت زۆر باشترە، بۆیە وتم؛"كێشە نییە. لە ئەنجامدا من ناوەڕۆكی دیدارەكە بۆ تورگوت ئۆزال و عیسمەت'یش هەموو شتەكان بۆ سولەیمان دەمیرەل دەگێڕینەوە. شتی نهێنیشمان نییە، دەتوانین پێكەوە دیدار بكەین. بەڵام ئێوە لەگەڵ تورگوت ئۆزال و سولەیمان دەمیرەل دیدار ناكەن، من دەتوانم دڵنیاتان بكەمەوە كە هەموو ناوەڕۆكی دیدارەكە بگێڕمەوە بەڵام ئێوە لەگەڵ دەوڵەتی تورك كۆبوونەوە ناكەن و ئێمە تەنها دوو كەسی ئاساییین."

دیدارەكەمان لەگەڵ ئۆجالان نزیكەی چل خولەكی خایاند، بەڵام ناتوان بڵێم هەمووی دیالۆگ بوو. وادیارە ئۆجالان عادەتی نەكردبوو گوێ لە بەرامبەرەكەی بگرێت و بە زۆری هەر خۆی قسەی دەكرد. دواتر لەو كەسە بەناوبانگانەش كە پێی سەرسام بوون، ئەوەم دەبیست كە خاڵی لاوازی ئۆجالان ئەوەیە

کەم گوێ لە قسە دەگرێت. کەسانێکی دیکەش هەبوون کە بە راشکاوی ئۆجالان یان بە کەسێکی خۆپەرست و خۆ بە زلزان لە قەڵەم دەدا. لەو ماوەی ئەو چل خولەکەدا، لەنێو قسەکانی ئۆجالان'دا کە قسەکردنی بۆ بەرامبەرەکانی خۆی کردبوو بە عادەت، چەند شتێك هەبوون کە سەرنجیان راکێشام. یەکیان ئەوە بوو کە زووزوو وشەی"تەنقیل"ی بەکاردەهێنا و جەختی لەوە دەکردەوە ئەگەر واز لە سیاسەتی"تەنقیل"بهێنرێت زۆر شت دەگۆڕێت. زۆر باسی مەترسییەکانی ئەوەی کرد و لێی نیگەران بوو. مەبەستیشی لە وشەی"تەنقیل"سیاسەتی کۆچی زۆرە ملێ و گواستنەوە و دەرکردنی کوردەکان لە شوێنی خۆیان بوو. وتیشی ئەگەر پەنا بۆ ئەو سیاسەتە ببرێت، ئەوان بەتوندی بەرپەرچی دەدەنەوە و ئەمەش لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی سولەیمان دەمیرەل کورسی سەرۆکایەتی وەزیران لە دەستبدات و بە تەنزەوە ئاماژەی بەوەکرد کە لەوانەیە سوپا دەسەڵات بگرێتە دەست و وتی؛"سولەیمان بەگ دەڵێت سێ جار رۆیشتم و چوارجار هاتمەوە. من نامەوێ جارێکی دیکە بە کودەتا بڕوات، بەڵام ئەگەر دەست بۆ سیاسەتی تەنقیل ببات لەوانەیە ناچار بێت وازبهێنێت و سوپا خاڵی کۆتایی لەبەردەم دیموکراسی دابنێت."

بە بێئەوەی هەناسە بدات قسەی دەکرد. ئیلهامی لەو دوایین وشەیە وەردەگرت کە هێنابوویە سەرزمان و دەربازی وشەیەکی دیکە دەبوو. لە درێژەی قسەکانیشیدا وتی؛"لە راستیدا من دەتوانم ئاسانتر لەگەڵ سەربازەکان رێککەوم، چونکە ئەو دەسەڵاتەی لە هیچ رێگایەکی دیموکراتیك نەهاتووتە سەرکار، لەگەڵ من دانانیشێت و سوپا دەتوانێت بە ئاسانی مۆری خیانەتکاریی لێ بدات و رێگری لێ بکات. بەڵام دەتوانم لەگەڵ خودی سەربازەکان دانیشم. کێ دەتوانێ چی بەوان بڵێت؟ سوپای تورك زۆر بەهێزە، من ناتوانم شکستی بدەم. بەڵام دەتوانم لە تەنیشت گەریلاکان هێزی میلیشیا بخەمە گەڕ کە بە رۆژ هاوڵاتی ئاسایین و بە شەو دەبنە چەکدار و ژمارەیان ٥٠ هەزار کەس دەبێت. دەتوانم بەوەش ئەنجامی ئەوەندە قورس دەربخەم کە ئەگەریش نەتوانم سوپای تورك شکست بدەم ئەوا ناچاری بکەم دانوستانم لەگەڵ بکات."

پێویستە ئەوە فەرامۆش نەکرێت کە ئەو قسانەی لە مارتی ١٩٩٣دا کردبوو. هەستمکرد کە ئۆجالان کەوتۆتە ژێر کاریگەری قۆناغی ئاشتی مەدرید لە پاییزی ١٩٩١، کە تێیدا جوڵانەوەی رزگاریخوازی فەلەستین یاخود فەلەستینییەکان و ئیسرائیل و ئوردن و سوریا لەسەر مێزی دانوستان کۆببوونەوە. لە هەمان ساڵدا بە ئاگاداری شیمۆن پرێز، یاسر عەرەفات و ئیسحاق رابین راستەوخۆ قۆناغی ئاشتی ئۆسلۆی ئیسرائیل - فەلەستین'یان دەستپێکردبوو. کاتێك بەراوردی هێزی سەربازی و دەسەڵاتی مەدەنیم سەبارەت بە ئەگەری دانوستان لەگەڵ پ.ك.ك لە زاری ئۆجالان بیست، یەکسەر ئەوە هات بە زەینمدا کە نابێ عەقڵی سیاسی پشتگوێ بخرێت. بەڵام ئەو عەقڵەش بەجۆرێک بوو کە رێگای ماجەرایەکی مەترسیداری دەکردەوە. قسەکەم پێ بڕی وتم؛"تۆزێك بەر لە ئێستا ئاگربەستێکتان راگەیاند کە لەوانەیە دەرگای قۆناغێکی ئاشتی بکاتەوە،

ئێستا هیچ پێویست ناکات باسی ئەم جۆرە شتانە بکەن. خاڵی گرنگ ئەوەیە ئایا قسەتان لای ئەو هێزانەتان دەیخوات کە بەشێوەیەکی فراوان لە چیاکانی تورکیا بڵاوبوونەتەوە و سوورن لەسەر درێژەپێدانی جەنگ؟ ئایا دەتوانن لای خۆتانەوە پابەندی ئاگربەست بن و ئەکەرکانتان جێبەجێ بکەن؟"و ویستم بەو پرسیارانە ئاراستەی قسەکانی بگۆڕم. ئۆجالان بەشێوەیەکی روون کە چاوەڕوانیم لێ نەدەکرد وتی؛"ئەمە کارێکی ئاسان نییە، تەنانەت زۆریش زەحمەتە بەڵام پێموایە دەتوانم ئاگربەستەکە بپارێزم. ئەگەر ئۆپەراسیۆنەکان رابگیرێن و سیاسەتی تەنقیل جێبەجێ نەکرێت، ئێمە دەتوانین پابەندی ئاگربەستەکە بین."

تێبینم کرد کە ئۆجالان لەگفتوگۆکە یاخود بە واتایەکی راستتر، لە مۆنۆلۆگەکەی خۆیدا زووزوو باسی ناکۆکییەکانی تورگوت ئۆزال و سولەیمان دەمیرەل لە لوتکەی دەوڵەتی تورکدا دەکات و لەبەردەوامیی و پایەداریی ئاگربەستەکەش گومانی هەیە. جارێکی دیکە قسەم کرد و وتم؛"ئێوە زۆر گوێ مەدەنە ئەو بابەتە. لە ئەنجامدا ناکۆکی نێوان تورگوت بەگ و سولەیمان بەگ هەرچییەك بێت، دەوڵەتی تورکیا سەبارەت بە کێشەی کورد بڕیار وەردەگرێت. ئێوە لەسەر بنەمای ئەو ناکۆکییانە هەڵوێست و سیاسەتی خۆتان پێش مەخەن."نازانم هۆشدارییەکەی من چەنێ کاریگەری هەبوو، بەڵام ئیدی وازی لە جەختکردن لەو بابەتە هێنا.

لە دەرەوەی ئەوانەش ئۆجالان کاتی باسی(HEP)ی دەکرد کە لە تورکیا وەك درێژکراوەی پ.ك.ك سەیر دەکرا، بەجۆرێک قسەی دەکرد کە بایەخێکی ئەوتۆیان پێنادات و بەسەرسوورمانەوە ئەمەشم لای خۆم یادداشت کرد. کاتێ لە قسەکانی خۆمدا ناوی (HEP)م هێنا بە تووڕییەوە وتی واز لەوانە بهێنە، هیچ گرنگییەکیان نییە و پەرلەمانتارێکی ئەو حزبەشی بە گێل لە قەڵەمدا. لەدوای ئەوەش، ئیدی باسی ئەو رۆڵەی (HEP)م نەکرد کە تەسەوردەکرا لە ئاگربەستەکەدا بیگێڕێت.

لەسەرەتا و کۆتایی ئەو دیدارە چل خولەکییەمان لەگەڵ ئۆجالان‌دا هەندێك شتی سەیریش روویاندا. سەرەتا پاسەوانە چەکدارەکان نەیاندەویست بە تەنها جێمان بهێڵن، بۆیە خۆیان لە قسەیەکی ئۆجالان کەڕ کرد کە وتی بچنە دەرەوە. دواتر ئەویش پێداگری کرد کە بچنە دەر و وتی؛"خەمتان نەبی هیچ نابێت."لە کۆتایی قسەکانیشدا وتم ؛"دەڵێن یەکەم چالاکییەکی سیاسی کە بەشداریتان تێدا کردبێت، خۆپیشاندانێك بووە کە من رێکم خستووە. ئەمە راستە؟"ئۆجالان ئەوەی پشتڕاست کردەوە.

ساڵی ١٩٦٩ سەرۆکی کۆمەڵەی خوێندکارانی کۆلێژی زانستە سیاسییەکان بووم. لەگەڵ ئۆراڵ چاڵشلار سەرۆکی کلوبی بیرۆکەی سۆسیالیستی دا جەماوەرێکمان ئاراستەی خۆپیشاندان کرد کە بۆ بەشداریکردن لە پرسەی عیمران ئۆیتکەم سەرۆکی دادگای باڵا لە مزگەوتی ماڵتەپەی ئەنقەرە هاتبوون. پۆلیس کاردانەوەی لەبەرامبەر ئەو خۆپیشاندانە بێ مۆڵەتە پیشاندا و بەو هۆیەشەوە پێکدادان روویدا. بیستبووم کە ئۆجالان

وتبووی؛"ئەوکاتەی لە ماڵتەپە تێپەڕ دەبووم، جەماوەرێکی خۆپیشاندەرم بینی کە جەنگیز چاندار و ئۆراڵ چاڵشلار پێشەنگایەتییان دەکرد. بە روخسار ئەوانم دەناسی، کاتێ هەردووکیانم بینی بەشداریم لە خۆپیشاندانەکەدا کرد."ئەمەم بۆ ئۆجالان گێڕایەوە و ئەویش وتی وایە. دواتر سەرم نایە سەری و وتم؛"ئامانتان بم لە هەموو شوێنێك باسی ئەمە مەکەن، چونکە دواتر هەر شتێك بکەن دەیخەنە ئەستۆی من."و بەو هۆیەشەوە پێکەنین.

راگەیاندنی ئاگربەستەکە لەلایەن ئۆجالان، گەشبینییەکی گەورەی لە رای گشتی و لای ئێمە دروستکردبوو. لە یەك دوو سەعاتی دوای راگەیاندنی ئاگربەستەکە، ئەوەندە کەش و هەوایەکی ئارامی دروستکردبوو کە تەنانەت دەمانتوانی پێکەوە گاڵتە بکەین. دوای چل خولەك دەرگاکە کرایەوە و ئەو پاسەوانانەی کە خەمی گیانی سەرکردەکەیان دەخوارد هاتنە ژوورەوە. دوابەدوای ئەوانیش جەلال تاڵەبانی و کامەران قەرەداخی هاتن. بۆ ماوەی پێنج خولەکێکی دیکە لە ژوورەوە قسەمان کرد و دواتر ماڵئاواییمان لە یەك کرد.

دوای گەڕانەوەم بۆ ئیستانبوڵ، بانگهێشتێکی سەرۆکایەتی کۆمارم پێگەیشت تا بەشداری لەبەربانگێکی کۆشکی چانقایا بکەم کە بۆ نوێنەرانی بیانی رێکدەخرا. چووم بۆ ئەنقەرە و لە ئێوارە خوانەکەدا یەکێك لە کارمەندەکانی سەرۆکایەتی کۆمار پێیگوتم کە سەرکۆمار دوای خواردن لە شوێنی حەوانەوەی خۆی لە نهۆمی سەرەوە چاوەڕوانیتان دەکات. چوومە سەرەوە، بەڵام ئۆزال منی نەبینی و لە تەنیشت ئەو ژوورەدا کە من تێیدا چاوەڕوانیی ئەوم دەکرد، لەگەڵ یوسف بۆزکورت ئۆزال'ی برای و ئۆرهان گویڤەنەن راوێژکاری خۆی بۆ کاروباری پلاندانانی دەوڵەت، خەریکی خۆ فێرکردنی کۆمپیوتەرێك بوو کە سەمرا ئۆزال'ی هاوسەری لە تایوان بۆی هێنابوو. دوای رۆیشتنی براکەی و گویڤەنەن، ئۆزال هات بۆ لای من و وتی وەرە با پێکەوە پارشێو بکەین. لەسەر مێزەکە رووبەڕووی یەك دانیشتین. گرنگییەکی ئەوتۆی بە بارودۆخەکە نەدەدا و بە ئاسوودەییەکی سەیرەوە وتی؛"ئێ!بڵێ بزانم، ئەم کابرایە چۆن پیاوێکە؟"

وەکوو ئەوە وابوو کە ماندووبوونی چەند رۆژە و چاوەڕوانییەکی زۆر هەموو شتێکی لە بیرم بردبێتەوە. نەمزانی لە چی و لە کوێوە دەستپێبکەم. وتم؛"با شتێکتان پێ بڵێم. لە راستیدا کێشەکە بە ئاسانی چارەسەر دەبێت، بەڵام هاوسەنگییەکانی تورکیا رێگا بە جێبەجێکردنی ئەو شتە نادەن کە من باسی دەکەم."کاتێ ئەوەشم وت، یەکسەر دیالۆگێکی دوو ساڵ لەوەو پێشی خۆمانم سەبارەت بە پەخشی کوردی لە تەلەفزیۆنی دەوڵەت بیر کەوتەوە.

ئۆزال وتی؛"چۆن؟"

-"بەگوێرەی تێبینییەکانی خۆم، ئەم کابرایە دەیەوێت لە تورکیا ئەکتەرێکی سیاسی بێت. تا رۆژی ئەمڕۆ بەدەستی رژێمی سوریا و هەواڵگری ئەو وڵاتەوە بووە، بەڵام دەردی راستەقینەی ئەوەیە کە لە تورکیا ببێتە

ئەکتەرێکی سیاسی. من درکم بەوە کرد کە دەوێت لە رێگەی ئەم ئاگربەستەوە وردە وردە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ سوریا سست بکات و رێگا بۆ قۆناغێك بکاتەوە کە تێیدا لە تورکیا وەك ئەکتەرێکی سیاسی دەرکەوێت. بۆ نموونە ئەگەر لێبوردنێك رابگەیەنرێت و کارێك بکەن کە لە ماوەی هەفتەیەکدا لە رێی هەڵبژاردنی نێوان خولەکانەوە بێتە پەرلەمان، لەوانەیە لە کۆلیسەکانی پەرلەماندا لەکاتی چاخواردنەوە لەگەڵ پەرلەمانتارەکانی دیکەی ناوچەکەدا ببینن."

دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێك تێگەیشتم بەشێك لەو تێبینییانەی خۆم کە سەبارەت بە ئۆجالان بۆ تورگوت ئۆزال باسمکردبوو راستییەکی تێدابوو، بەڵام بەهەڵەدا چوونێکی گرنگیشی تێدا هەبوو. تورگوت ئۆزال قسەکەی پێ بڕیم و پلانی چارەسەرییەکی خۆی بۆ من باسکرد. ئەو دیدارەی من و ئۆزال'یش کە زۆر لایەن گرنگییان پێدەدا، تەنها پێنج خولەکی خایاند.

کاتێ لە کۆشك دەرکەوتم شەفەق دایدابوو. کەس لەوێ نەمابوو. تەنانەت کامێرای تەلەفزیۆنەکانیش کە پێشتر بۆ وەرگرتنی لێدوانێك لەبەر دەرگای کۆشك وەستابوون، لەوێ نەمابوون. نزیکەی دوو سەعات دواتر و سەعات و نیوێك بەر لە کۆبوونەوەی دەستەی ئاسایشی نەتەوەیی چووم بۆ کۆشکی خارجییە لەبەرامبەر کۆشکی چانقایا و لەوێ تێبینییەکانی خۆم سەبارەت بە دیدارە تایبەتەکەم لەگەڵ ئۆجالان بۆ حیکمەت چەتین وەزیری دەرەوە و ئویزدەم سانبەرك'ی راوێژکاری باسکرد. هەمان رۆژ، ئەوەشم زانی کە ئیلنور چەڤیك لەگەڵ عیسمەت عیسمەت، ناوەڕۆکی دیدارەکەی ئۆجالان'ی بۆ سولەیمان دەمیرەل و پێنج وەزیری دیکە باسکردووە. عیسمەت عیسمەت دواتر ئەوەشی وت کە باسی دیدارەکەی بۆ ئەحمەد چۆرەکچی سکرتێری گشتی دەستەی ئاسایشی نەتەوەیی باسکردووە. عیسمەت کارەکەی زۆر گەورەتر کرد و دواتر لەنێوان سکرتێری گشتی دەستەی ئاسایشی نەتەوەیی و عەبدوڵا ئۆجالان'دا هاتوچۆی دەکرد. لە ساڵی ١٩٩٣ بەدواوە ئیدی عیسمەت عیسمەت م نەبینی. ئەو ببوو بە یەکێك لەو کەسە بێشومارانەی کە لەنێوان سەربازەکان و ئەندامانی پ.ك.ك دا بێ رۆڵ مایەوە.

زۆری نەخایاند کە پەیوەندی ناڕاستەوخۆش لەگەڵ ئۆجالان'دا پچڕا. دوای مردنی تورگوت ئۆزال لە ١٧ی نیسانی ١٩٩٣ گومانی زۆرم سەبارەت بە بەردەوامی ئاگربەستەکە لەلا دروستبوو. درکم بەوە دەکرد کە لەنێو دەوڵەتی تورکیادا، جگە لە تورگوت ئۆزال کەسێکیتر نییە کە بیەوێت سەبارەت بە چارەسەکردنی کێشەی کورد شتێك بکات و چرووتژەیەك پێش بخات. بەدەر لەوەش ئازایی ئۆزال لە هیچ کەسێکی دیکەشدا نەبوو. دەنگی دەروونیم پێی دەگوتم  کە تەمەنی ئەو ئاگربەستە لەرزۆکە زۆر درێژ نابێت.

خۆی لە راستیشدا هێشتا چلەی مەرگی تورگوت ئۆزال تێپەڕنەببوو کە لە ٢٤ی مایسی ١٩٩٣دا، ئەو هەواڵە هات کە پ.ك.ك رێگای ئەلازیغ - بینگول ی بڕیوە و ٣٣ سەربازی بێ چەکی لە پاسێکدا گوللەباران

کردووە. کاتێ ئەمەم بیست وتم؛"تەواو، ئیشەکە کۆتاییپێهات."دەرگا بۆ ئەو پێشبینییەی تورگوت ئۆزال کرابووەوە کە وتبووی ئەگەر لە قۆناغی ئاگربەستدا دەستپێشخەرییەك نەکرێت و قۆناغەکە پێش نەخرێت، ئەوا تیرۆر دوو هێندەی جاران دەگەڕێتەوە.

٢٤ی مایسی ١٩٩٣ لە مێژووی تورکیا و کێشەی کورددا وەك خاڵێکی گرنگی وەرچەخانی لێهات. لەو بەروارەوە هەتا ١٥ی شوباتی ١٩٩٩ کە تێیدا عەبدوڵا ئۆجان لە کینیا دەسگیرکرا و هێنرایەوە بۆ تورکیا و لە دوورگەی ئیمرالی زیندانی کرا، لافاوی خوێن لاشەی هەزاران کەسی برد. ڕووداوەکانی بکوژی نادیار و ڕەشەکوژی و تیرۆری نادیار، دەوڵەتیان داڕزاند و لە تورکیا لەنێوان دەوڵەت و بەشێکی بەرچاوی خەڵکی کورد'دا شەڕێکی خوێناوی دەستپێکرد کە هەرچی دەکرا ڕێی لێ نەدەگیرا.

دەمزانی کە لەگەڵ مەرگی تورگوت ئۆزال'دا ڕۆڵی خۆم سەبارەت بە کێشەی کورد لە دەست دەدەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ هەواڵی کوژرانی ٣٣ سەربازەکەم پێگەیشت، تەلەفۆنم بۆ شام کرد. جەلال تاڵەبانی و کامەران قەرەداخی لەوێ بوون. کامەران پێیگوتم ئەوکاتەی هەواڵەکەیان بیستووە لە شام لە ماڵی ئۆجالان بوون و ئۆجالان لەو ڕووداوە سەری سووڕماوە و کاتێ جومعە (جەمیل بایك) هاتۆتە ژوورەوە پێی وتووە؛"ئەمە چۆن ڕوویداوە؟"و ئەویش لە وەڵامدا وتوویەتی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات. بەگوێرەی ئەو شتانەی کە ئەو دەیگوت، عەبدوڵا ئۆجالان ئاگاداری هێرشەکەی سەر ڕێگای ئەلازیغ - بینگول نەبوو. وتم؛"بڕوا ناکەم دوای ئەم هێرشە ئاگربەستەکە بەردەوام بێت، بەڵام ئەگەر ئۆجالان بەتوندی ڕووداوەکە سەرکۆنە بکات، لەوانەیە چانسێك بۆ درێژەپێدانی ئاگربەست هەبێت."کامەران وتی"پەیام"ەکەت بە جەلال تاڵەبانی رادەگەیەنم.

دوای چەندرۆژ بێدەنگ بوون، ئۆجالان بە پاساوی پابەندبوونی دەوڵەت بە ئاگربەستەکە، بەرپرسیاری ڕووداوە خوێناوییەکەی ڕێگای ئەلازیغ - بینگول ی گرتە ئەستۆ و پشتیوانی لێکرد. لەدوای ئەوەش، دیسان تەلەفۆنم بۆ شام کرد و پەیوەندیم لەگەڵ جەلال تاڵەبانی و کامەران قەرەداخی بەرقەرار کرد. پەیامەکەیان بە ئۆجالان گەیاندبوو، بەڵام ئەو بە تاڵەبانی گوتبوو کە ئەگەر بەرپرسیاری ڕووداوەکەم لە ئەستۆ نەگرتبایە، لەوانەیە کاریگەری خۆم لەسەر گەریلاکانی پ.ك.ك لە دەست بدایە.

ساڵانێك دواتر لە کۆنفرانسێکی کۆمکار ( کۆنفیدراسیۆنی کۆمەڵە کوردستانییەکان) دا لە ئەڵمانیا، کەمال بورکای پێیگوتم کە پێیوایە ئۆجالان ئاگای لە هێرشەکەی ٢٤ی مایسی ١٩٩٣ لەسەر ڕێگای ئەلازیغ - بینگول نەبوو. ئەو هێرشە کاری کێ بوو؟ لەوەش ڕاستتر بڕیاری کێ بوو؟

کەسانێکی زۆر لە جەلال تاڵەبانی وە بگرە تا کەمال بورکای پێیانوابوو لەوانەیە هەواڵگری سوریا کە لە ئاگربەستەکە ناڕازی بوو، دەستی لەو ڕووداوەدا هەبووبێت. هەندێکی دیکەش باسی ڕۆڵی هەواڵگری

ئێران‌یان لەو رووداوەدا دەکرد. لە تشرینی دووەمی ٢٠١٠شدا لە هەولێر، ئەو پرسیارەم لە نیزامەدین تاش (بۆتان) و خەلیل ئاتاچ (ئەبوبەکر) کرد کە دوو فەرمانده و بەرپرسی باڵای پێشووی پ.ك.ك بوون و لەدوای ساڵی ٢٠٠٤هوە کە لەو رێکخراوە دابڕابوون، لە کۆیە دەژیان. ئەوانیش لە وەڵامدا شەمدین ساکك و هەندێك لە هێزە خۆجێییەکانی پ.ك.ك‌یان لە دیاربەکر بە بەرپرسیار دەزانی. هەندێك لە کەسایەتییە بەناوبانگەکانی کوردیش کە لە دامودەزگاگانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە دیاربەکر کاریان دەکرد، دەستەی سەرۆکایەتی هێزە چەکدارەکانی تورك‌یان لە مەڵاتیە بە بەرپرسیاری رووداوەکە دەزانی. ئەوان دەیانگوت وەك چۆن لەنێو پ.ك.ك‌دا هەندێك کەس خوازیاری کۆتایی پێهێنانی ئاگربەستەکە بوون، لەنێو سوپاشدا کەسانێك هەبوون کە نەیاندەویست ئاگربەستەکە درێژە بکێشێت.

هەرچی بوو گوزەرا. مێژوو نهێنییەکانی تۆمار نەدەکرد. ئەو شتەی کە ئێستا دەیزانین ئەوەیە کە عەبدوڵا ئۆجالان پشتگیری لە چالاکییەکە کرد و لە ٢٤ی مایسی ١٩٩٣ بە دواوە، توندوتیژی لە کێشەی کورد‌دا بە دوو ئەندازەی جاران زیادی کرد. بەوجۆرەش قۆناغێکی خوێناوی کە کێشەکەی دەکردە برینێکی ناسۆر، لەدوای ٢٤ی مایسی ١٩٩٣ وە دەستیپێدەکرد.

٢٣

# هەوڵەکانی چارەسەریی و حاڵەتەکانی بێچارەیی



جوامێری ئو هیمەت و سەخوەت | مێرینی ئو خیرەت و جەلادەت
هیندی ژ شەجاعەتێ خەیورن | ئەوچەند ژ مینەتێ نەفوورن
ئەڤ خیرەت و ئەڤ ئولووەتێ هیمەت | بوو مانیعێ حەملێ بارێ مینەت
لەو پێکڤەوە هەمیشە بێ تفاقن | دائیما ب تەمەڕوود و شیقاقن

ئەحمەدێ خانی (١٦٥٠-١٧٠٦)، دەردێ مە - مەم و زین

لە قۆناغی دوای ٢٤ی مایسی ١٩٩٣ شدا بڕوای خۆم بە چارەسەری سیاسییانەی کێشەی کورد لە دەستنەدا، بەڵام کەوتبووینە ناو قۆناغی شەڕ و پێکدادانێکی بێ ئامان کە تێیدا من و ئەو کەسانەی وەك من بیریان دەکردەوە کاریگەرییەکی ئەوتۆمان نەبوو. لەو کاتانەی دوای مردنی تورگوت ئۆزال کە شەڕ گەرم ببوو، بەتوندی دژایەتی چارەسەری سەربازییانەی کێشەی کوردم دەکرد و لەسەرووی هەموو ئەو قەڵەمانەوە بووم کە بەرگرییان لە مافەکانی شوناسی کوردی دەکرد. لە ساڵانی ١٩٩٠ کاندا چەندینجار سەردانی باشووری خۆرهەڵاتم کرد و نەك لەگەڵ کادیرە سیاسییەکانی کورد، بەڵکو ڕاستەوخۆ لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا پەیوەندییم بەرقەرارکرد.

لەنێو کادیرە سەرەکییەکانی جوڵانەوەیەکی سیاسیدا جێی خۆم گرت کە ماوەیەك دوای مردنی تورگوت ئۆزال، لە کۆتاییەکانی ١٩٩٣دا لەلایەن گرووپێك خاوەنکار و ڕۆشنبیرەوە لە ئیستانبوڵ دامەزرا و دواتر ناوی جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ (YDH)ی لێنرا. یەکەم کۆبوونەوەی کادیرە سەرەکییەکانی ئەو جوڵانەوەیە کە منیش تێیدا بەشدار بووم، لە ئیستانبوڵ لە ماڵی مەمدوح حاجی ئوغلو کە ئەو کاتانە سەرۆکی ژووری پیشەسازی و خاوەنکارانی تورکیا - توسیاد (TÜSIAD) بوو سازکرا. جەم بۆینەر کە ماوەیەك سەرۆکایەتی توسیادی کردبوو وەك فیگەری سەرکردەی جوڵانەوەکە دەردەکەوت. لە کۆبوونەوەکەی ئەو ڕۆژەدا کەسانی وەك جەم پەکەر کە لەو کاتانەدا بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای تورك – هەنکەل بوو و ساڵانی دواتریش دەبووە سەرۆکی تەسەڤ، لەگەڵ پرۆفیسۆر ئاسف ساواش ئاکات و کەمال دەرویش جێگری سەرۆکی بانکی نێودەوڵەتی کە بۆ ماوەیەکی کورت سەردانی ئیستانبوڵی کردبوو ئامادەبوون. جگە لەوان، هالوك دینچەر کە ساڵانێك دواتر دەبوو جێگری سەرۆکی توسیاد و بەرپرسی پەیوەندییە دەرەکییەکانی، لەگەڵ هاوڕێکانی من مەحمەت ئاڵتان و حسێن ئەرگوین سەرۆکی لقی ئیستانبوڵی یەکێتی کارمەندانی مەدەنی دەوڵەت لە کۆبوونەوەکەدا بەشداربوون.

بەهۆی توانا و پێگەی بەشداربووانی کۆبوونەوەکە و لەبەر بیروبۆچوونەکانی سەبارەت بە گۆڕانکاری کە دەکرا بە ڕادیکاڵ لە قەڵەم بدرێن، جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ لای من، تەقەلایەکی سیاسی پڕ واتا بوو کە هیوای بۆ داهاتوو دەبەخشی.

لە ماوەی نێوان کۆتاییەکانی ١٩٩٣ تا مانگە یەکەمەکانی ١٩٩٥، بە تایبەتی ئەوکاتەی لە ٢١ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٤دا وەك پارتێکی سیاسی دامەزرا، نزیکەی هەموو کاتێکی خۆمم بۆ جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ تەرخانکردبوو. من بە ئەنقەست رۆژی ٢١ی کانوونی یەکەمم بۆ رۆژی دامەزراندنی ئەو پارتە دەستنیشانکردبوو، چونکە لەو رۆژەدا ماوەی شەو دەگاتە کورترین ئاستی و خۆی و ئەمەش وەك شتێکی رەمزی ئاماژەیەك بوو بەوەی کە لە رۆژی دامەزراندنی ئەو حزبەدا دەرفەتی تاریکایی کەم دەبێتەوە. هەوڵدان بۆ جوڵانەوەیەکی سیاسی نوێ لە سفرەوە کە خاوەنی ئیدیعا بێت، شتێکی پڕ هەیەجان و جۆش و خرۆش بوو. بە هەموو شوێنێکی وڵاتدا دەگەڕاین. جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ بەو شەپۆلی گۆڕانکارییەی تورگوت ئۆزال دەستپێکردبوو، باگری کەشتییەکەی خۆی کردەوە و بەوهۆیەشەوە لە هەموو لایەکی وڵاتەوە زۆرکەس کە بۆ یەکەمجار رووبان لە سیاسەتی ئەکتیڤ دەکرد بەرەو ئەو رێکخراوە دەهاتن.

جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ ئەزمونێکی سەیر بوو کە لە بەشێکی زۆر لەسەرمایەدار و خاوەنکارەکانی ئیستانبوڵ پێکدەهات کە بەشێوەیەکی کەم وێنە پشتگیرییان لە گۆڕانکاری دەکرد. هەروەها لەنێو بەڕێوەبەران و کادیرانی دامەزرێنەریشیدا کەسانێکی رۆشنبیریش هەبوون کە بە زۆری ریشەیەکی چەپگەراییان هەبوو. دینچ بیلگین خاوەنی رۆژنامەی سەباح کە لە ئیزمیرەوە هاتبووە ناو میدیای ئیستانبوڵ و رۆژنامەکەی کردبووە پڕفرۆشترین رۆژنامەی وڵات و کەناڵیATVیشی کردبوو یەکێك لە کاریگەرترین تەلەفزیۆنەکانی وڵات، بۆ پشتگیری کردن لە جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ کە پێیوابوو مۆری خۆی لە داهاتووی تورکیا دەدات، رۆژنامەیەکی تازەی بەناوی "سەدەی نوێ"دەرکرد.

جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ بەهۆی ئەو زمانە رادیکاڵ و ئازایانەی کە سەبارەت بە کێشەی کورد هەیبوو، ئەویش لەکاتێکدا کە کێشەکە بە قۆناغێکی خوێناویدا تێپەڕ دەبوو، سەرنجی بۆ خۆی رادەکێشا. جەم بۆینەر وتەبێژی جوڵانەوەکە وتاربێژێکی زۆر باش بوو. لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی وڵات و لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆندا بە گەرمی بەرگری لە بیروبۆچوونەکانی YDH سەبارەت بە کێشەی کورد دەکرد. ئەم گوتارە و هەبوونی کەسانی وەکوو من لە ریزی پێشەوەی ئەو رێکخراوە، بوونە هۆی ئەوەی کوردەکانی ناوچەکە و هەموو لایەکی وڵات بە حەزێکی گەورەوە پێشوازی لێبکەن.

لە یەکەم قۆناغەکانی دامەزراندنی YDHدا سەرۆکی دەستەی رێکخستن بووم. دەمانویست راستییە سۆسیۆلۆژییەکانی باشووری خۆرهەڵات و هاوسەنگییەکانی ئەوێ لەناو رێکخستنی YDHدا رەچاو بکەین. ئەو قۆناغەش قۆناغێکی خراپ بوو کە تێیدا سەرۆك وەزیر تانسۆ چیلەر، چارەسەرکردنی کێشەی کوردی بەتەواوی حەواڵەی سەربازەکان کردبوو، تاوانەکانی بکوژی نادیار پەرەیان سەندبوو و پێکدادانێکی خوێناویش لەنێوان پ.ك.ك و سوپا لە ئارادا بوو. بۆ ئەوەی رێگا بە پەیوەندی نێوان پ.ك.ك و جوڵانەوەی

دیموکراسی نوێ نەدرێت کە گوتارێکی رادیکاڵی سەبارەت بە کێشەی کورد پێشخستبوو، دەبوو لە رێکخستنەکانی ناوچەکەدا بە وریایی بجوڵێینەوە. ئەو رۆژانە، رۆژانێك بوون کە تێیاندا گومانی ئەندام بوون لە پ.ك.ك لە هەموو کوردێك دەکرا.

بۆ ئەوەی YDH خاوەنی پێشنیارێك بێت سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد، رەشنوسی چەند پێشنیارێکم بۆ ئامادەکرد، بەڵام لایەنی سەرنجراکێشی بابەتەکە ئەوەبوو کە سەرەڕای ئەوەی جوڵانەوەکە گوتارێکی رادیکاڵی لەبارەی کێشەی کوردەوە هەبوو، کەچی هەم جوڵانەوەکە و راستەوخۆ خودی جەم بۆینەر ێش، بە پاساوی رادیکاڵ بوونیانەوە، پێشنیارەکانی منیان قبوڵ نەکرد. لە ١٠ی تەمووزی ١٩٩٤دا دەقێکم لە ژێر ناونیشانی"هەڵوێستی YDH سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد و چوارچێوەیەك بۆ پێشنیاری دیاریکراو"ئامادەکرد بەڵام پشتگوێ خرا و تەنانەت لەنێو جوڵانەوەکەشدا نەخرایە بەرباس. لەو دەقە حەوت لاپەڕییەدا باسی ئەوەم کردبوو کە کێشەی کورد کێشەی ژمارە یەکی تورکیایە و چارەسەرکردنیشی دەبێتە هۆی ئەوەی دەوڵەتی تورکیا سەرلەنوێ بونیات بنرێتەوە و دەرفەتێکی باش بۆ سووککردنی باری دارایی گشتی دەڕەخسێنێت و پەیوەندی دەرەکی و ئاسایشی ناوخۆش گەشەپێدەدات. هەروەها دەبێتە هۆی گەیشتن بە ئامانجی رێککەوتنی کۆمەڵایەتی و گەیشتن بە کۆمەڵگایەکەی فرەڕەنگی دیموکراتی ئاشتیخواز کە لەنێو ئامانجەکانی YDHدا هەیە. جگە لەوە دەبێتە هۆی ئەوەی سێبەری سوپا بەسەر سیستەمی سیاسی لابچێت.

ئەو پێشنیارانەی چارەسەری کە بڕیاربوو دوای هەندێك گۆڕانکاری و دەسکاری لە چرووتگرامی YDHدا جێگیر بکرێن و لەکاتی وەرگرتنی دەسەڵاتیشدا هەوڵی جێبەجێکردنیان بدرێت بەمجۆرە بوون؛

"١. پێویستە لە دەستوری تورکیا ماددەیەك جێگیر بکرێت سەبارەت بەوەی کە تورکیا لە چەندین گرووپی ئەتنی جۆراوجۆر لەسەرووی هەمووشیانەوە لە گەلی کورد و گەلی تورك پێکهاتووە و وڵاتێکی فرە کەلتوور و موزائیکە و پێویستە هەموو ئەو رەگەزانەش کە موزائیکی تورکیا پێکدەهێنن بتوانن بە ئازادانە شوناس و کەلتووری خۆیان گەشە پێبدەن و ئەمەش لەلایەن دەوڵەتی دیموکراتییەوە گەرەنتی بکرێت.

بەپێی ئەم مادەیە، چەسپاندن و گەرەنتی کردن و قبوڵکردنی شوناسی تایبەتی کوردەکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە زیاتر تێکەڵاوی سیستەمی دەوڵەتی تورکیا بن و پێگەی بەشدار و شەریك لەنێو دەوڵەت پەیدا بکەن. بەدەر لەوەش وەڵامی داواکاری چەرکەز و لازەکان ێش دەداتەوە و مافی کەلتووری هاوشێوە بۆ ئەوانیش دابین دەکات.

٢. پێویستە لەسەرژمێریدا پرسیاری رەچەڵەك و ریشەی ئەتنی لە مرۆڤەکان بکرێت و چۆنییەتی هەستکردنی ئەوان بە خۆیان لە پێناسەکەیاندا رەنگ بداتەوە و شوناسە ئەتنی و کەلتوورییەکەیان لە

بەڵگەنامە رەسمییەکاندا تۆمار بکرێت. (دواتر بە پاساوی ئەوەی کە لەسەرژمێری ١٩٦٥ و لەوەوپێش رێگا بەوە دراوە و پێویست بە رەچەڵەك ناکات و تەنها زمانی زگماکی بەسە، ئەم پێشنیارە لابرا.)

ئەم پێشنیارە بۆ ئەوەبوو کە دەوڵەت نەتوانێت لەسەرەوە شوناسی مرۆڤەکان دیاری بکات...

٣. لەو شوێنانەدا کە کوردەکان بەپێی ئەنجامەکانی سەرژمێری زیاتر لە٥٠٪ی دانیشتوان پێکدەهێنن، (دەکرێت دابەشبوونی ئیداری نوێی ناوچەکان یاخود سنوری پارێزگاکان بە بنەما وەربگرێت.) پێویستە زمانی کوردی لە تەنیشت زمانی تورکی'دا ببێتە زمانی رەسمی و ئەمەش لە دەستوردا بچەسپێنرێت. جگە لەوە پێویستە ئاماژەکانی هاتوچۆ و تابلۆکانیش بە هەردوو زمانەکە بنوسرێن.

٤. دەبێ لە دەستور و یاسا جیاوازەکاندا، بە تایبەت لە مادەی ٨ی یاسای دژە تیرۆردا ئەو بەند و خاڵانەی کە ئازادی رادەربڕین سنوردار دەکەن و"تیرۆر"و"ئازادی رادەربڕین"تێکەڵاو دەکەن، لاببرێن و پاکسازی بکرێن.

٥. پێویستە یاسای پارتە سیاسییەکان بەجۆرێک کە رێگا بە دامەزراندنی پارتی سیاسی لەسەر بنەمای ئەتنی بدات، سەرلەنوێ رێکبخرێتەوە.

لابردنی ئەم ئاستەنگەش لەبەردەم بەشداریکردنی کوردەکان و گرووپەکانی دیکە لە سیاسەتی یاساییدا، لەلایەك دەبێتە هۆی سنوردارکردنەوەی ئەو رێکخراوانەی کە وەك پ.ك.ك پشت بە توندوتیژی دەبەستن و لەلایەکی دیکەش، بەو هۆیەی کە رێگا بۆ دروستبوونی زیاتر لە پارتێك لەسەر بنەمای ئەتنی بە هەرجۆرە بیروبۆچوونێك خۆشدەکات، وادەکات گرووپە ئەتنییەکان تێکەڵاو بە هەموو ژیانی سیاسی وڵات بن.

٦. پێویستە بەڕێوەبردنی باری نائاسایی لاببرێت. لە رێگەی ئەو بەڕێوەبردنی بارە یاساییە جیاوازەی کە لە ماوەی نزیکەی سێ لەسەر چواری هەموو تەمەنی کۆماردا لەسەر بەشێکی نزیکەی یەك لەسەر سێی خاکی وڵات جێبەجێ کراوە، مومکین نییە بتوانرێت یەکپارچەیی وڵات بپارێزرێت. لەم روانگەیەوە لە رووی دەروونییەوە لابردنی بەڕێوەبردنی باری نائاسایی، بۆ دەربازبوون بە قۆناغێکی دیموکراتی پێویستە.

٧. پێویستە سیستەمی پاسەوانی گوندەکان یاخود جاشایەتی هەڵبوەشێتەوە. ئەو سیستەمە بەشێوەیەکی مەترسیدار خەڵك بەسەر جەمسەرە دژبەیەکەکان دابەش دەکات و لۆبییەکی توندوتیژی دروستدەکات کە رێگا بۆ درێژکێشانی شەڕ خۆشدەکات.

٨. پێویستە هەموو سنورەکانی سەر زمان و کەلتووری کوردی لاببرێن. لەو چوارچێوەیەشدا دەوڵەت بۆ پەروەردە و پەخشی کوردی لە تەلەفزیۆن و رادیۆدا بەرپرسیاری وەربگرێت. تەنها لەو کاتەدا کە ئەمە بکرێت، کوردەکان وەك دەوڵەتی خۆیان تەماشای دەوڵەتی تورکیا دەکەن. کاتێ ئەمەش کرا، بەشێوەی ئۆتۆماتیکی ئاستەنگەکانی بەردەم دامەزراندنی دامودەزگا تایبەتەکانی پەروەردە و رادیۆ و تەلەفزیۆنی

کوردی نامێنن.

٩. پێویستە دامودەزگاکانی دەوڵەت وەك دەزگای زمان و مێژووی تورك، ڕێخۆشکەر بن بۆ دامەزراندنی ئەنیستیتۆی لێکۆڵینەوەی کوردی و بە مەرجی هەڵبژاردن، کورسیی تایبەت بە کوردۆلۆژی لە زانکۆکان دابین بکرێت.

١٠. پێویستە بەڕێوەبەر و فەرمانبەرەکانی ئەو ناوچانەی کە تێیدا کوردەکان زیاتر لە ٥٠٪ی دانیشتوانەکەی پێك دەهێنن، زمانی کوردی بزانن و قسەی پێ بکەن ئەمەش وەك مەرجێی لێبێت. ئەم مادەیە لەگەڵ پرەنسیپی بەڕێوەبردنی خۆجێیدا پەیوەندی هەیە.

ئەگەر جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ بەرگری لە سیستەمی سەرۆکایەتی بکات و لەگەڵ ئەوەدا بێت کە پارێزگار و بەڕێوەبەرەکانی ئاسایش بە هەڵبژاردن دیاری بکرێن، ئەو شێوازی بەڕێوەبردنە جێبەجێ دەکرێت. بەڵام ئەگەر ئەو مۆدێلی بەڕێوەبردنە سەری نەگرت یان بە ناڕوونی مایەوە، ئەوا مادەی ١٠ کە لەسەرەوە باسکراوە پێداوایستییەکان دابیندەکات...

١١. پێویستە نەورۆز وەك ڕۆژی جەژن لە کۆماری تورکیا رابگەیەنرێت و ڕۆژی ٢١ی ئادار بکرێتە پشووی ڕەسمی.

١٢. ئاڵای تورکیا وەك خۆی دەمێنێتەوە بەڵام ڕێگا بەو شوناسە ئەتنییانەی کە موزائیکی تورکیا پێکدەهێنن دەدرێت تا گوزارشت لە سیمبولە نەتەوەییەکانی خۆیان بکەن و لەو چوارچێوەیەشدا ڕێگا دەدرێت ڕەنگەکانی کورد کە بە سەوز و سوور و زەرد دیاری کراون، لە تەنیشت ئاڵای تورکیا بە ئازادی هەڵبکرێت (جێی وەبیرهێنانەوەیە کە لە ڕێوڕەسمی کردنەوە و داخستنی ئۆلۆمپیادی ١٩٩٠ی بەرشەلۆنەدا لە تەنیشت ئاڵای ئیسپانیا، ئاڵای یەکێتی ئەوروپا و شارەکانی کەتەلۆنیا و بەرشەلۆنەش هەڵکران)."

مادەکانی ١٣و١٤ پەیوەندییان بەوەوە هەبوو کە هێزە چەکدارەکان بە ئامانجی دابینکردنی ئاسایشی ناوخۆ بەکارنەهێنرێن و پێشنیاری قەرەبووکردنەوەی ئەو کەسانەش کرابوو کە شار و قەزا و گوندەکانی خۆیان جێهێشتبوو تا بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان. دوو مادەی کۆتایی پێشنیارەکانی چارەسەری بەمجۆرە بوون؛

"١٥. بە مەرجی جێبەجێکردنی هەموو ئەو پێشنیار و ڕێوشوێنانەی باسکران، داوا لە پ.ك.ك دەکرێت کە ڕۆڵی گەورەی لە توندوتیژی و جێگیربوونی تیرۆر لە ناو تورکیا هەبووە و پشکی گەورەی لە ڕژانی خوێنی هاوڵاتیانی ئەم وڵاتەدا بەرکەوتووە، تا چەکەکانی دابنێت و خۆی هەڵبوەشێنێتەوە. ئەو ئەندامانەی پ.ك.كش کە لە ڕووی یاساییەوە داواکراو نین دەتوانن لەگەڵ ڕادەستکردنەوەی چەکەکانیان ڕاستەوخۆ بەشداری پرۆسەی سیاسی وڵات بکەن و بۆئەو مەبەستەش، دەکرێت لێبوردنێکی گشتی بۆ دابینکردنی

ئاشتی سیاسی و کۆمەڵایەتی رابگەیەنرێت. ئەو ئەندامانەی پ.ك.ك'ش کە لە رووی یاساییەوە داواکراون دەتوانن سوود لە لێبوردنی گشتی وەربگرن بەڵام ناتوانن راستەوخۆ بەشداری پرۆسەی سیاسی بکەن و پێویستە بەشداریکردنیان لەو پرۆسەیەدا بەپێی خشتەیەکی کاتی، دوای ماوەیەکی دیاریکراو بێت.

١٦. لەبەر ئەوەی کە جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ لە رووی فیزیکی و مرۆییەوە، هاوڵاتیە کوردەکانمان بە بەشێکی دانەبڕاوەی جوگرافیای تورکیا لە قەڵەم دەدات، کوردەکان و تورکمانەکان'ی عێراق'یش وەك هاونەژادی هاوڵاتییەکانی خۆی سەیر دەکات و گرنگیدان بە کێشەی ئەوان وەك قەرزێکی مەعنەویی سەر شانی خۆی دەزانێت. لەو چوارچێوەیەشدا هەوڵدەدات بۆ ئەوەی مافەکانی کورد و تورکمان لە عێراقێکی دیموکراتیك'دا دابینبکرێت. بڕواشی وایە کە پێویستە بە هۆکاری ئابووری، جوگرافی و مێژوویی و کەلتوورییەوە پەیوەندییەکی تایبەت لەگەڵ کورد و تورکمانەکان بەرقەرار بکرێت کە نزیکەی هەموویان لە شوێنە سنورییەکانی نزیك تورکیا لە باکووری عێراق دەژین. بۆیە پێویستە سیاسەتی سنوری کراوە لە رووی سیاسی و دەروازەیەکی کراوە لەرووی ئابورییەوە بۆ ئەوان پێڕەو بکرێت."

ئەم پێشنیارانەی چارەسەری دەقێکی کۆتایی نەبوو، بەڵکو تەنها بۆ گفتوگۆکردن لەنێو جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ پێشکەشکرابوو. لە ئەنجامیشدا نەك هەر نەبووە دەقی کۆتایی بەڵکو تایبەتمەندی بەڵگەیەکی ئەو جوڵانەوەیەشی بە خۆوە نەگرت. بەڵام کاتێ دەگەڕێیتەوە و سەیری رابردوو دەکەیت، ئەو پێشنیارانە تەنانەت بەگوێرەی ساڵانی ٢٠٠٠کانیش پێشنیاری رادیکاڵ بوون ئەگەر ئەوکاتە جێبەجێ بکرایەن، لەوانەیە لە ٢٠٠٠کاندا کێشەی کورد چارەسەر بوایە.

سەرەڕای ئەوەی لەبەردەم رای گشتیدا بە راشکاوی باسی ئەو پێشنیارانەم نەکردبوو کە بۆ جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ ئامادەم کردبوون، بەڵام لەو قۆناغانەدا کە رووداوی خوێناوی روویـدەدا، لە وتە و نوسینەکانمدا بە ئەندازەی پێویست رادیکاڵ بووم و دیدگاکانم پێچەوانەی هەڵوێست و بۆچوونی رەسمی دەوڵەت بوون.

هەڵوێست و بۆچوونەکانم سەبارەت بە کێشەی کورد و لەوەش گرنگتر، رۆڵم لە دروستکردنی پەیوەندی جەلال تاڵەبانی و تورگوت ئۆزال، بوونە هۆی ئەوەی کە لە دەستێوەردانی سەربازی ٢٨ی شوباتی ١٩٩٨دا بوختانی "وەرگرتنی پارە لە پ.ك.ك"م بۆ بکرێت. ئەم بوختانەش لە چوارچێوەی ئۆپەراسیۆنێکی جەنگی دەروونی فەرماندەیی گشتی سوپای تورکیا بەناوی "یادداشت"دا هەڵواسرابوو کە دواتر لە ساڵی ٢٠٠٠دا ئاشکرا بوو. رۆژانێك پێشتر، رای گشتی بۆ ئەو ئۆپەراسیۆنە دەروونییە ئامادە کرابوو کە سووککردن و بەدناو کردنی ژمارەیەك کەسایەتی بوو کە من و محەمەد عەلی بیراند لەسەرووی هەموویانەوە بووین. یەکێك لە فەرماندە پلەبەرزەکانی پ.ك.ك بەناوی شەمدین ساکك وازی لەو رێکخراوە هێنابوو و پەنای

بۆ باکووری عێراق بردبوو. هێزە تایبەتەکانی سوپای تورکیا ش لە ئۆپەراسیۆنێکدا دەسگیریان کرد و دوای گەڕاندنەوەی لە دیاربەکر زیندانی کرا. چەند رۆژ دوای دەسگیرکردنەکەیشی ئەو هەواڵە بڵاوکرایەوە کە گوایە شەمدین ساکك نهێنی زۆری ئاشکرا کردووە و لەنێویشیاندا ئەوە هەبووە کە"هەندێك رۆژنامەنوس پارەیان لە پ.ك.ك وەرگرتووە."دوابەدوای ئەوە ئۆکتای ئەکشی نوسەری رۆژنامەی حوڕییەت بابەتێکی بەناوی"خاینەکانی نێو خۆمان بناسین"بڵاوکردەوە و چەند رۆژ دوای ئەوەش ئوغوور دوندار پێشکەشکاری هەواڵەکانی تەلەفزیۆنی کەناڵ دی، ناوی ئەو رۆژنامەنوسانەی ئاشکراکرد کە"بە وتەی شەمدین ساکك پارەیان لە پ.ك.ك وەرگرتووە."و رۆژی دواتریش لە رۆژنامەکانی سەباح و حوڕییەت کە پڕفرۆشترین رۆژنامەی وڵات بوون، هەواڵەکە بەجۆرێک کە هەموو لاپەڕەی یەکەم دابپۆشێت بڵاوکرایەوە.

دووان لەو بەناوبانگترین کەسانەی کە کرابوونە ئامانج، محەمەد عەلی بیراند و جەنگیز چاندار نوسەرانی رۆژنامەی سەباح بوون. پەیوەندی بیراند لەگەڵ رۆژنامەکە راگیرا و بۆ ماوەیەك نوسینەکانی منیش لەو رۆژنامەیە بڵاونەکرانەوە. دوای ئەو ماوەیەش، سەبارەت بەوەی کە ئیدی لەسەر سوپا و کێشەی کورد نەنوسم هۆشداریم پێدرا. بە پێچەوانەوە نوسینەکانم بڵاونەدەکرانەوە و سانسۆر دەکران.

ئێمە ببووینە قارەمانی گەورەترین سکانداڵی میژووی میدیای تورکی. بەگری کردن لە ئێمە لەلایەن بەڕێوەبەرانی رۆژنامەکانەوە قەدەخەکرابوو. نوسینی لەو بابەتە بڵاونەدەکرایەوە. هەوڵێکی تەواو بۆ لەکەدارکردنی ئێمە لە ئارادا بوو. ئەرتوغروول ئویزکویك کە ئەوکاتە سەرنوسەری رۆژنامەی حوڕییەت بوو، دواتر چەندینجار سەبارەت بەو رووداوە وتبووی شەمەزارترین رووداوی تەمەنی رۆژنامەوانیم بووە و داوای لێبوردنی لە ئێمە کردبوو.

لایەنی هەرە خراپی رووداوەکە ئەوە بوو کە سەرەڕای ئەوەی هەموو بەڕێوەبەرانی رۆژنامەکان دەیانزانی رووداوەکە درۆ و دەلەسەیە، لەبەر گوشاری سەربازەکان ئەو بوختانەیان بە تەنتەنەیەکی گەورەوە بڵاوکردەوە و رێگایان بە ئێمە یان هاوپیشەکانمان نەدا کە بەرگریمان لێبکەن.

پەتی درۆ کورتە و دواتر شەمدین ساکك لە رێگەی پارێزەرەکەی خۆیەوە وتبووی کە شتی وای لەبارەی ئێمەوە نەگوتووە. هەندێك بەش کە بوختانی بۆ ئێمە تێدا بوو، بە گوزارشت و ئیفادەکانی شەمدین ساکك زیادکرابوون و بە میدیا درابوون تا بڵاوی بکەنەوە. لە حوزەیرانی ١٩٩٨ لەلایەن دادگای ئاسایشی دەوڵەت بانگ کرام بۆ ئەوەی دۆسییەکەم بەتەواوی دابخرێت، زانیم کە شەمدین ساکك هیچ لەبارەی ئێمە نەگوتووە. داواکاری دادگا ئیفادەی رەسمی شەمدین ساکك ی بۆ من خوێندەوە و هیچ یەك لەو شتانەی کە چەند مانگێك لەوەو پێش لە میدیاکاندا بڵاوکرابوونەوە و رای گشتییان هەژاندبوو، لەو دەقە رەسمییەدا نەبوون.

لایەنی گرنگی رووداوەکە کە بە واتایەکی تەواو سکانداڵێکی گەورە بوو، ئەوە بوو کە فەرماندە پلەبەرزەکان

بوختانیان بۆ ئێمە بە قسە و گوزارشتەکانی شەمدین ساکك زیادکردبوو. دوو ساڵ دواتریش دەرکەوت کە هەموو ئەوانە بەشێك لە ئۆپەراسیۆنێکی دەروونی سوپا بەناوی"یادداشت"لە دژی ئێمە بووە کە لەلایەن فەرماندە پلەبەرزەکانی ئەو قۆناغەوە ئامادەکرابوو.

ئاکن بیرداڵ سەرۆکی کۆمەڵەی مافەکانی مرۆڤ، کە بەهۆی کارەکانی سەبارەت بە کێشەی کورد لە هەمان ئۆپەراسیۆنی"یادداشت"ی سوپادا کرابووە ئامانج، لەلایەن تۆڕێکی تاوانکاری بەناوی"تیمەکانی کوشتنی تۆڵەکردنەوەی تورك"دەسرێژی گوللەی لێ کرا و سەرەڕای ئەوەی دوو مەخزەن گوللەی لە جەستەی دەرهێنرا، بە موعجیزە رزگاری بوو.

پێویستە"یادداشت"وەك نمونەیەکی قێزەون سەبارەت بەوەی کە دەوڵەتێك چۆن دەتوانێت فێڵ و پیلانگێڕی لە هاوڵاتیانی خۆی بکات لە مێژوودا تۆمار بکرێت. ئەو پیلانگێڕییەی کە مومکین نەبوو لە هیچ دەوڵەتێکی مۆدێرندا بکرێت و لە حاڵەتێکیشدا کە بکرێت بکەرەکانی باجی گەورە دەدەن، لە پەیوەندی لەگەڵ کێشەی کورد، لە تورکیایەکدا کە بەرەو سەدەی ٢١ دەڕۆیشت ئەنجامدرا.

ئەو رووداوە، ئاسایشی کار و ئاسایشی گیانی منی خستبووە مەترسی. هاوینی ١٩٩٨م بەو کۆنفرانسانە تێپەڕکرد کە لە ناوەندە لێکۆڵینەوەکانی جۆراوجۆری واشنتن دژ بە دەستوەردانی سەربازی ئەنجامم دەدان. یەکێك لەوانەش"بەخششی نەتەوەیی بۆ دیموکراسی"(National Endowment for Democrasy -NED) بوو. کارل گریشمان سەرۆکی (NED) منی بۆ کۆنفرانسێکی دیموکراسی لە نیودەلهی بانگهێشت کرد کە بۆ جاری یەکەم لە ئاستێکی جیهانیدا سازدەکرا. هەواڵی دەسگیرکردنی عەبدوڵا ئۆجالانیشم لە نیودەلهی بیست.

لەگەڵ گویندووز ئاکتان باڵیۆزی خانەنشین کە وەك سەرۆکی تەسەڤ بەشداری کۆنفرانسی دیموکراسی جیهانی کردبوو، سەبارەت بە کێشەی کورد گفتوگۆیەکی گەرممان کرد. دەکرا بۆچوونەکانی گویندووز ئاکتان سەبارەت بە کوردەکان، لەبەرزترین ئاستی پڕوپاگەندەیی دیدگا رەگەزپەرستانەکان لە قەڵەم بدرێت. تەنانەت ئەوەی رەتدەکردەوە کە"کوردی"زمان بێت و بەتەواوی دژی پەروەردە بە زمانی کوردی بوو، بۆ ئەمەش پشتی بە لۆجیکێك دەبەست کە ناکرێ پشتگوێ بخرێت. دەیگوت؛"زمان نەتەوە دروستدەکات. ئەگەر رێگا بۆ زمانی کوردی بکرێتەوە ئەوا پرۆسەی نەتەوەسازی کوردەکان گەشە دەکات و نابێ منیش وەك دەوڵەتی تورکیا رێگا بۆ ئەوە خۆش بکەم."ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە گویندووز ئاکتان توانایەکی رۆشنبیری وای هەبوو کە لە ساڵی ١٩٨٨دا، ئەوکاتەی راوێژکاری تورگوت ئۆزال سەرۆك وەزیری تورکیا بوو، کتێبێکی فەرەنسی بەناوی (La Turquie en Europe) بە ئیمزای تورگوت ئۆزال بڵاوکردبووەوە. سەرم سووڕما لەوەی کە چۆن دەبێ بۆچوونەکانی ئەوەندە پێچەوانەی دیدگاکانی تورگوت ئۆزال بن و بەو

ڕاشکاوییە باسی بیرو بۆچوونە ڕەگەزپەرستانەکانی خۆی بکات.

ڕۆژی دواتر، گویندووز ئاکتان بە تانە و تەشەر گفتوگۆ گەرمەکەمانی گەیاندە ئاستێکی مەترسیدار. ئەوکاتەی دەمانویست بەشداری لە ئێوارەخوانێکی باڵیۆزخانەی تورکیا لە نیودەلهی بکەین، ڕووی کردە من و بە گاڵتەپێکردنەوە وتی؛"ئاگاداری؟ ئاپۆ دەسگیرکراوە. دڵنیام زۆر نیگەران بووی!"لەبەر ئەوەی کە تانەیەکی قێزەونی لێدابووم، هەروەها لەبەر ناوەڕۆکی ئەو ڕووداوەی کە ببوە مایەی دڵخۆشی گویندووز ئاکتان، زۆر نیگەران بووم.

هۆکاری ئەمەش زۆر سادە بوو؛ هیچ کاتێك کێشەی کورد و پ.ك.ك'م بە یەك چاو سەیر نەدەکرد، بەڵام پێشبینییەکەم وابوو دەوڵەتی تورکیا کە کێشەی کورد و پ.ك.ك'ی وەك یەك دەبینی، دوای دەسگیرکردنی عەبدوڵا ئۆجالان، ئیدی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد خۆی تەکان نادات.

هەر ئەوەش ڕوویدا. مانگ و نیوێك دوای گەڕانەوەم لە نیودەلهی، سەردانی واشنتۆنم کرد تا بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك لە ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی بە ناوبانگی ئەمریکی بەناوی سەنتەری ویڵسن و دواتریش لە ئەنیستیتۆی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ ئاشتی(USIP) کار بکەم. بۆیە لە دوورە چاودێری عەبدوڵا ئۆجالان و قۆناغی دادگاییکردنەکەیم کرد.

بەرگریکردن و گوزارشتەکانی عەبدوڵا ئۆجالان'م هیچ بە دڵ نەبوو.لە چاوی منەوە خۆی تەسلیمی دەوڵەتێك کردبوو کە لەبەرامبەری ڕاپەڕیبوو. ڕوخساری سەرکردەیەکی ملکەچبووی لە خۆی پیشاندابوو. گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە ئۆجالان و لەگەڵ ئەویشدا پ.ك.ك کۆتاییان پێهاتووە و ئیدی پ.ك.ك لە دەرەوەی هاوسەنگی کێشەی کورد دەمێنێتەوە. وامدەزانی کێشەی کورد چارەسەرنەبووە، بەڵام کێشەی ئۆجالان و پ.ك.ك لە ڕێگەی تەسلیم بوون و شکستەوە کۆتاییپێهاتووە. لەبەر ئەوەی بە یەك چاو سەیری چارەسەکردنی کێشەی کورد و پ.ك.ك و ئۆجالان'م نەکردبوو، ئەوانەش نەبوونە هۆی ئەوەی هیچ گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە دیدگاکانم سەبارەت بە کێشەی کورد ڕووبدات. بۆچوونەکانم سەبارەت بەوەی کە پێویستە تورکیا کوردەکان و مافەکانیان قبوڵ بکات و لە جیاتی ڕێکاری سەربازی، لە ڕێی سیاسییەوە کێشەی کورد چارەسەر بکات، نەگۆڕان.

بۆ ماوەیەکی درێژ نیگەران بووم لەوەی کە بەشێکی پڕ جوڵەی کوردەکان'ی تورکیا، هێشتا عەبدوڵا ئۆجالان وەك سەرکردەی خۆیان سەیر دەکەن و ئەمەشم بە بێ بەختی و بێ شانسی لە قەڵەم دەدا. ئەمەشم بە ڕاشکاوی بۆ ئەو کەسایەتییە کوردانە باس دەکرد کە لەنێو تورکیا بەشێوەی یاسایی کاریان دەکرد. سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٤ بوو. پ.ك.ك هێشتا ئەو شەڕە چەکدارییەی دەست پێنەکردبووەوە کە ساڵی ١٩٩٩ بە فەرمانی ئۆجالان کۆتایی پێهێنابوو. گرووپێك سەرۆك شارەوانی د.ت.پ (DTP) لە

باشووری خۆرهەڵات بە پێشەنگایەتی عوسمان بایدەمیر سەرۆکی شارەوانی گەورەی دیاربەکر، بۆ دەستپێشخەرییەکی ئاشتی، لەلای هەندێك ڕێکخراوی کۆمەڵگەی مەدەنی تورك لە ئەنقەرە و ئیستانبوڵ جموجۆڵیان دەستپێکردبوو. زەنگی مەترسییان سەبارەت بە خراپبوونی بارودۆخی ناوچەکە بەجۆرێک کە ڕێگای ئەندامبوونی تورکیا لە یەکێتی ئەورووپا دابخات، لێدەدا. لەدوایین کۆبوونەوەیاندا لە هۆتێلی ئارمادا لە ئیستانبوڵ، دوای ڕوونکردنەوەیەکی دوورودرێژی عوسمان بایدەمیر، من قسەم کرد و وتم؛"با شتێکتان بۆ باس بکەم کە لە عەقڵی هەمووتاندایە و هەموو کەسیش خۆی لێ دەدزێتەوە. ئێوە دەزانن کە من دۆستی کوردم، بۆیە گوێ لە قسەکانم بگرن. هەتا ئەوکاتەی سنورێکی ڕوون و ئاشکرا لە بەینی خۆتان و ئۆجالان دانەنێن، هەرجۆرە دەستپێشخەرییەکتان، لە خۆرئاوای فراتەوە وەك تەکتیکێکی نوێی ئیمرالی لە قەڵەم دەدرێت."سەرۆك شارەوانییەکانی کورد بێدەنگ بوون و چرکەیان لێوە نەدەهات. دوای تۆزێك راوەستان، عوسمان بایدەمیر وتی؛"سولەیمان دەمیرەل باسی بیست و نۆیەمن راپەڕینی کوردەکان دەکات. بتانەوێ و نەتانەوێ ئەم پیاوە (ئۆجالان) سەرکردەی بیست و نۆیەمین راپەڕینی کوردەکان'ە."منیش قسەکەیم پێ بڕی و وتم؛"ڕاستە، بەڵام سەرکردەیەکی خراپە. خراپییەکەیشی لەبەر ئەوە نییە کە راپەڕینی کردووە. راپەڕینەکان ڕووداوی مێژوویین و سەرکردەکانیان لەبەرامبەر ئەو دەوڵەتانەی کە لێیان راپەڕیون چۆك دانادەن، ئەگەر چۆك دابدەن لەناو دەچن. عەبدوڵا ئۆجالان چۆکی دادا. لەوانەیە دەوڵەت و سوپای تورك نەفرەتی لێ بکەن، بەڵام ڕێزی لێ ناگرن. ڕژێمی سپی لە باشووری ئەفریقا نەفرەتی لە نێلسۆن ماندێلا دەکرد و لە خوت و خۆڕایی نزیکەی سی ساڵ لە زینداندا نەیهێشتەوە، بەڵام ڕێزی لێ دەگرت. بارودۆخی عەبدوڵا ئۆجالان لە تورکیا وەها نییە. ئەگەر سنورێکی ڕوون لە بەینی خۆتان و ئۆجالان دیاری نەکەن، هیچ کەس لە خۆرئاوای تورکیا گوێتان لێ ناگرێت."

سەرۆکی شارەوانی ویرانشەهیر قسەکەی پێ بڕیم و وتی؛"جەنگیز بەگ! ئەگەر ئێمە نیوەی ئەو قسانەی ئێوە بکەین، کەسمان ناتوانین بگەڕێینەوە بۆ وڵاتەکەی خۆمان."و بەوجۆرەش کاریگەری و نفوزی عەبدوڵا ئۆجالان'ی لەسەر خەڵکی کورد هێنایە سەرزمان کە ئەوانەی لە خۆرئاوای فرات'ن بە منیشەوە نەماندەویست لێی تێبگەین و قبوڵی بکەین.

لە ساڵانی ١٩٩٠ و ٢٠٠٠کاندا چەندینجار سەردانی باشووری خۆرهەڵاتی تورکیا'م کردبوو. درکم بەو ڕاستییە کردبوو، بەڵام لە قبوڵ کردنیدا تووشی کێشە ببووم. لە کۆبوونەوەیەکی قەرەباڵغدا لە دیاربەکر، لە پاییزی ٢٠٠٧دا بۆ دوایین جار بیروبۆچوونی نیگەتیڤی خۆم سەبارەت بە پێگەی سەرۆکایەتی ئۆجالان هێنایە سەرزمان. بە ڕاشکاوی سەبارەت بە خەڵکی کورد قسەم کرد و بە ڕوونییەکی چاوەڕواننەکراویش باسی ڕەوایی پەیوەندی پ.ك.ك و د.ت.پ'م کرد. لە کۆتایی وتەکانیشدا وتم پێویستە کوردەکان دان بە

جەرگی خۆیاندا بنێن و لە جیاتی ئۆجالان، سەرکردیەکی دیکە بۆ خۆیان پەیدا بکەن و بەوجۆرەش رێگای چارەسەری بدۆزنەوە. دوای قسەکانم، گرووپێك لاوی کورد دەوریان دام و وتیان ئێوە چۆن وا قسە دەکەن، عەبدوڵا ئۆجالان ئیرادەی ئێمەیە و ئەوەیان بیرهێنایەوە کە دەیان هەزار ئیمزایان بۆ پشتیوانی کردن لە ئۆجالان کۆکردۆتەوە. ئەو گەنجە کوردانە لەبەر بیروبۆچوون و هەڵوێستەکانم سەبارەت بە کێشەی کورد منیان خۆش دەویست و لێم نزیك دەبوونەوە، بەڵام مومکین نەبوو واز لە ئۆجالان'یش بهێنن.

من تاقە کەسێك نەبووم کە لە تێگەیشتن لە پەیوەندی بەکۆمەڵی(سیمبیوتیکی)بەشێکی بەرچاوی کوردەکان'ی تورکیا لەگەڵ ئۆجالان خۆم رادەگرت. جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی، دوو سەرکردەی کوردەکان'ی عێراق کە زۆر بە باشی ئۆجالان'یان دەناسی، بەسەرسووڕمان و تۆزێکیش بە تێکشکانی هیوا و تووڕەییەوە، چەندینجار ئەو پرسیارەیان کردبوو"کوردەکان'ی تورکیا کە پێویستە لە هەموو کوردەکان دیکە پێشکەوتووتر بن، چی لەم پیاوەدا دەدۆزنەوە؟"دیارە رکابەریی سەبارەت بە سەکردایەتی کوردەکان لە دووتوێی ئەم پرسیارەیاندا شاراوە بوو. بە تایبەتی دوای رەفتارەکانی ئۆجالان لە دادگا، خۆیان رانەدەگرت و پرسیاری ئەوەیان دەکرد کە"چۆن دەبێ سەرکردە وا بێت؟"

ماوەیەکی کورت بەر لەوەی ببێتە سەرکۆماری عێراق، جەلال تاڵەبانی دوای چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ محەمەد عەلی بیراند، لە گفتوگۆیەکماندا لە باخچەی هۆتێل هیلتۆن'ی ئیستانبوڵ جەختی لەوە کردەوە کە رەفتاری ئۆجالان لە دادگا بۆ سەرکردەیەکی کورد مایەی قبوڵکردن نییە و پرسیاری لێکردم کە"من تێناگەم بۆچی کوردەکان'ی تورکیا هێشتا دوای ئەم پیاوە دەکەون، تۆ روونکردنەوەیەکت بۆ ئەمە هەیە؟"

لە نیوەڕۆخوانێکدا لە هۆتێل سویس'ی ئیستانبوڵ، لە یەکەم سەردانی رەسمی خۆی وەك سەرۆکی هەرێمی کوردستان بۆ تورکیا، لە کۆتایی مایسی ٢٠١٠دا لەگەڵ مەسعود بارزانی یەکترمان بینی. بارزانی قسەی هێنایە سەر وتەکانی عەبدوڵا ئۆجالان لە دادگا و وتی؛"سەرکردە چۆن وا دەبێت؟ پێویستە کوردەکان شەرم لەسەرکردەیەکی وەها بکەن."بەدەر لە من و ئەو، عەبدوسەلام'ی وەرگێڕ و هاشم هاشمی دۆستی نزیکی بارزانی و سەرۆکی پێشووی شارەوانی جزیرە لەسەر مێزی نیوەڕۆخوانەکە ئامادە بوون.

دوای خواردنەکە، هاشم هاشمی بیرەوەرییەکی سەیری بۆ گێڕامەوە. مەسعود بارزانی بە هاشمی وتبوو رەسەنایەتی زۆر گرنگە، دەوڵەتە گرنگەکانی ئەورووپا بەدەستی کەسانێك دامەزراون کە رەگ و ریشەیەکی رەسەنیان هەیە و بەبێ ئەوانەش دەوڵەت دانامەزرێت و دوای ئەوەش بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو پرسیاری کردبوو کە"ئۆجالان کێیە؟ رەگ و رەیشەی چییە و لە کوێوە هاتووە؟"

لەوانەیە ریشە و رەچەڵەکەی عەبدوڵا ئۆجالان کە ببووە مووی لووتی مەسعود بارزانی، ئەوە روونبکاتەوە کە بۆچی پ.ك.ك لە مێژووی نزیکدا بوەتە درێژخایەنترین و خۆڕاگرترین راپەڕینی کوردەکان.

روونکردنەوەیەکی سەرنجراکێشم سەبارەت بە توانا و بەهرەکانی عەبدوڵا ئۆجالان کە ئەوی گەیاندۆتە ئەو پێگەیەی کە ئێستا هەیەتی، لە عوسمان ئۆجالان'ی برای بیست کە یەکێك لەبەڕێوەبەرانی پێشووی پ.ك.ك بووە و لەو رێکخراوە دابڕاوە. عوسمان ئۆجالان لە ماڵەکەی خۆی لە کۆیە لە کوردستانی عێراق وتی؛"ئەگەر دەوڵەتی تورکیا لە جیاتی ئەو هەموو کاتەی کە بۆ لەکەدارکردنی کاکم بە دەستەواژەی وەك سەردەستەی تیرۆریستان و بکوژی مناڵ تەرخانی کردووە، هەوڵی تێگەیشتن لەوی بدایە، کێشەکە زووتر چارەسەردەبوو. عەبدوڵا ئۆجالان پیاوێکی گرنگە."کاتێ وتم؛"چۆن؟ وەکوو چی؟"عوسمان ئۆجالان لە وەڵامدا وتی؛"یەکەم شت ئەوەیە کە ئەو پیاوێکی بیرمەندە. زۆر دەخوێنێتەوە. لە سەدەی بیستەم لەنێو کوردەکان'دا سەعیدی نورسی و ئاپۆ دەرکەوتن. جگە لەو دووانەش کەسی دیکە نییە کە جەماوەرێکی زۆری کوردەکان دوای کەوتبێت. خاڵی دووەمیش ئەوەیە کە ئەو پیاوێکی زۆر زیرەکە. لە یەك کاتدا بیر لە دە رێگا دەکاتەوە و دەتوانێت هەر دە رێگاکەش پێکەوە تاقیبکاتەوە..."

ئەگەر توانا و بەهرە شەخسییەکانی عەبدوڵا ئۆجالان بخەینە لایەك، ئەوە راستییەکە کە لەدوای ساڵی ١٩٩٩وە بە بەراورد قۆناغی پێش ئەو ساڵە، روخسار و دیمەنی ناوبراو لای کوردەکان'ی تورکیا بەهێزتر بووە. بینینی ئەم راستییە و قبوڵ کردنی، لەگەڵ ئەوەشدا تێگەیشتن لە پ.ك.ك وەك بەشێکی یەکلاکەرەوە لە کێشەی کورد، دەتوانێت رێگا بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە لە تورکیا بکاتەوە.

وابیر دەکرایەوە کە دەسگیرکردنی ئۆجالان و راگرتنی شەڕی چەکداری پ.ك.ك لە ساڵی ١٩٩٩دا، دەرفەتێکی گەورەیان خوڵقاندووە، بەڵام رووداوەکانی ٢٠٠٠کان ئەوە بۆچوونەیان رەتکردەوە. کێشەی کورد و ناوی عەبدوڵا ئۆجالان و پ.ك.ك، بەشێوەیەکی دژیەك وەك یەکەیەکی دانەبڕاویان لێهات. لە قۆناغی ئامادەکردنی ئەو راپۆرتە گرنگەم دا کە بەناوی"دابەزین لە چیا، پ.ك.ك چۆن واز لە چەك دەهێنێت؟ رێگاکانی دوورخستنەوەی توندوتیژی لە کێشەی کورد"لەگەڵ فوئاد حسێن سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستانی عێراق لە بڕیارگەکەی مەسعود بارزانی لە مەسیف (سەلاحەدین) لە نزیك هەولێر قسەم دەکرد. ئەویش هاوشێوەی نێچیرڤان بارزانی و بەرپرسانی دیکەی کورد کە لە هەمان شوێن دیدارم لەگەڵ کردبوون، سەبارەت بەوەی کە پێویستە تورکیا چی بکات، بە زمانێکی جیاوازتر لەوەی کە قسەی بۆ رای گشتی پێ دەکرد قسەی دەکرد.

هەموو بەرپرسانی کوردی عێراق جەختیان لەوە دەکرد کە بۆ چارەسەکردنی کێشەکە پێویستە لەگەڵ عەبدوڵا ئۆجالان و پ.ك.ك'دا دانوستان بکرێت. کاتێ ئەوەت بە بیریان دەهێنایەوە کە خۆی لە خۆیدا میت لەگەڵ عەبدوڵا ئۆجالان و پ.ك.ك دانوستان دەکات و خۆتانیش لەوەدا رۆڵتان هەیە، هەموویان یەك کاردانەوەیان پیشاندەدا و دەیانگوت؛"ئەو دانوستان نییە. دیداری میت واتای ئەوەیە کە لە روانگەیەکی

ئەمنییەوە سەیری کێشەکە دەکرێت، ئەمەش لەکاتێکدایە کە ناوەڕۆکی کێشەکە سیاسییە. ئەگەر سەرۆك وەزیر وەفدێکی سیاسی بۆ دانوستان پێکبهێنێت، دەکرێ راوێژکاری میت'ی تێدا بێت، بەڵام ئەم ئیشە لە رێگەی وەفدێکی سیاسی کە لە کەسانی خاوەن رێز و کاریگەر پێکهاتبێت سەر دەگرێت."نێچیرڤان بارزانی وتی؛"رێگای قەدبڕی چارەسەرکردنی کێشەکە ئەوەیە کە شۆرتێك دروست بکەیت، یانی لەگەڵ پ.ك.ك دانوستان بکەیت. بۆ ئەوەی شۆرت بە پ.ك.ك'ش بکەیت لەگەڵ ئۆجالان دیدار بکەیت..."

ئایا چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە بێ دانوستان لەگەڵ عەبدوڵا ئۆجالان و پ.ك.ك مومکین بوو؟

فوئاد حسێن بێ هیچ دوودڵییەك لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا وتی؛"لەوانەیە دە ساڵ بەر لە ئێستا جیاکردنەوەی ئاپۆ و پ.ك.ك لە کێشەی کورد شتێکی مومکین بوایە، بەڵام ئێستا مومکین نییە.

منیش لە نیوەی دەووەمی دەیەی یەکەمی ٢٠٠٠کاندا هەمان قەناعەتم پەیدا کرد و کەم و زیاد، حەسەن جەمال'یش لە هەمان قۆناغدا ئەو بۆچوونەی لا دروستبوو.

لەگەڵ حەسەن جەمال، وەك دوو کەس دەناسرێین کە لە ئاست و شێوازی جۆراوجۆردا نزیکترین پەیوەندیمان لەگەڵ کوردەکان'ی تورکیا هەیە و بەردەوام ئەو پەیوەندییانەشمان تازە دەکەینەوە. دەکرێت وەرچەرخانی فیکری ئێمە سەبارەت بە کێشەی کورد، وەك ئاوێنەیەکی وەرچەرخانی فیکری رۆشنبیرانی تورك لەوبارەیەوە سەیر بکرێت. بەڵام ئەمە لە هەمانکاتدا نیشانەی ئەوەیە کە تێگەیشتن لە کێشەی کورد لە رێگەی عەبدوڵا ئۆجالان و پ.ك.ك زۆر ئاڵۆزە.

پیتەکانی پ.ك.ك'ش بە ئەندازەی وشەی ئۆجالان، دەرفەتی چارەسەرکردنی کێشەی کوردیان وەك گرنگترین کێشەی تورکیا گەیاندۆتە رێگایەکی بنبەست کە دەرچوون لێی ئاسان نییە. لە زمانی رەسمی تورکیا'دا پیتەکانی پ.ك.ك واتایەکی زۆر سادەیان پەیدا کردبوو؛"رێکخراوی تیرۆریستی"،"رێکخراوی جیاخواز"یان تێکەڵاوێك لە هەردووکیان کە ئەویش"رێکخراوی تیرۆریستی جیاخواز"بوو.

ئەو زمانەی کە دەوڵەتی تورکیا بۆ ناساندنی پ.ك.ك بەکاری دەهێنا، لەگەڵ بڕیارەکانی ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا سەبارەت بە دانانی ئەو رێکخراوە لە لیستی رێکخراوە تیرۆریستییەکان، زیاتر برەوی پەیدا کرد. ئەمەش وای لێهات کە لێکردنەوەی مۆرکی"تیرۆیست"لە پ.ك.ك کارێکی ئاسان نەبێت.

ئەمەش لەکاتێکدایە کە پ.ك.ك لە دیدگای لایەنگرەکانیدا پێناسەیەکی زۆر جیاوازی هەیە و وەکوو جوڵانەوەی رزگاریخوازی کورد سەیر دەکرێت. جگە لەوەش، پ.ك.ك بڕبڕەی پشتی جوڵانەوەی سیاسی کوردیشی پێکدەهێنا ئەو پارتە سیاسییانەی لە خۆ دەگرت کە دوای هەر داخستنێك، بەناوی دیکە دادەمەزرانەوە و سەرۆکایەتی بەشێکی زۆر لە شارەوانییەکانی باشووری خۆرهەڵات'یان دەبردەوە و لە پەرلەمانی تورکیا'شدا نوێنەری خۆیان هەبوو.

وەك چۆن لە نمونە مێژوویەکانیشدا بینراوە، نەیارانی پ.ك.ك، هێزی نوێنەرایەتی کردنی ئەو رێکخراوەیان خستۆتە بەرباس. بە واتایەکی دیکە پرسیار و مشتومڕ کراوە سەبارەت بەوەی کە پ.ك.ك نوێنەرایەتی هەموو کوردەکان ناکات و تەنها نوێنەرایەتی بەشێکی بچووکی کوردەکان دەکات و بەوجۆرەش گومان لەسەر رەواییەکەی دانراوە. ئەمانە خاڵی گرنگن بۆ ئەوەی گفتوگۆیان لەسەر بکرێت، بەڵام ئەگەر نەك رووی چەندایەتی بەڵکو لە رووی چۆنایەتی سەیر بکرێت، پ.ك.ك وەك هێزێکی چەکدار، راستەوخۆ لایەنی سەرەکی کێشەی کوردە لە تورکیا و ناکرێ حاشای لێ بکرێت.

لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم، دابەشبوونی جوگرافیای کوردی لە بەینی ئێران و عێراق و تورکیا و سوریا، لە روانگەی تێکۆشانی سیاسی و چەکداری کوردەکانەوە قۆناغی جیاجیای لێکەوتۆتەوە. لە ناوخۆ و دەرەوەی تورکیا ژمارەیەکی زۆر رێکخراو وەك رکابەری پ.ك.ك دەرکەوتوون. ئەمە لەنێو فیگەرەکانی سەرۆکایەتی کردنیشدا هەر بەوجۆرە بووە.

مەسعود تەك سەرۆکی پارتی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیا کە شوێنی کەمال بورکای گرتۆتەوە و ساڵانێکی درێژ لەنێو حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران'دا کاری کردووە، لە دیدارێکماندا لە هەولێر، لە رووی ئەزموونەکانی خۆیەوە وتی؛"پەندێکی کوردی هەیە کە دەڵێت دوو سەر لە مەنجەڵێکدا ناکوڵێن، بەڵام لای ئێمە سێ سەر هەیە. کاك (مەسعود بارزانی)، مام (جەلال تاڵەبانی) و ئاپۆ."

بەدەر لەو"سێ سەرە"ی کە لە ئاستی نەتەوەییدا هەیە، لەدوای رووخانی رژێمی سەدام لە عێراق، چەندین رێکخراو وەك رکابەری پ.ك.ك دەرکەوتن و لە هەرێمی کوردستانی عێراق'دا دەسەڵاتێکی کوردی پەیدا بوو کە خەریکە هەموو دامودەزگاکانی پێویست بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دروستدەکات. یەکێك لە ئەنجامەکانی ئەمەش ئەوە بوو پ.ك.ك لە تورکیا کە هەم رووی ژمارە و هەم لە رووی جوگرافیا بەشی هەرە زۆری کوردەکان'ی لێیە، بە تەنها بمێنێتەوە. ئەمە پ.ك.ك و عەبدوڵا ئۆجالان'ی ناچارکرد تا ئاستێك هێز پەیدابکەن کە بتوانن لەگەڵ دوو رکابەری سەرسەختدا کە یەکیان سەرکۆماری عێراق و ئەوی دیکەشیان سەرۆکی هەرێمی کوردستان بوو، دەست و پەنجە نەرم بکەن.

دەرکەوتنی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەدوای جەنگی ۲۰۰۳ی عێراق، خواستە یان ناخواستە پەیوەندییەکانی تورکیا - پ.ك.ك و پ.ك.ك و کەسایەتی و رێکخراوە کوردییەکانی عێراق و رێکخراوە کوردییەکانی ناو تورکیا'ی تێکەڵ و پێکەڵ کرد. مەتەڵی پ.ك.ك'ش لەنێو هاوسەنگی کێشەی کوردی تورکیا قووڵتر بووەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا، تورکیا بە تایبەت بەسەرۆکایەتی تایب ئەردۆغان بە نهێنی پ.ك.ك و عەبدوڵا ئۆجالان'ی تێکەڵاو بە قۆناغەکە کرد و بەوجۆرەش هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکەی دا. دوابەدوای ئەوەش کە هەوڵە

پلان بۆدانراوەکان سەریان نەگرت، ئەو دەنگۆ و ئیدیعایانەی کە لە مێژە لەنێو کەسایەتییە بەناوبانگەکانی کوردی تورکیا بەربڵاون، بڵاوکرانەوە و باس لەوە کرا کە پ.ك.ك ڕێکخراوێکی چەکدارییە کە جگە لە بەکرێگیراوی ئەم و ئەو هیچ واتایەکی دیکەی نییە.

پاڵچن ئاکدۆغان کە وەك یەکێك لە نزیکترین راوێژکارەکانی ئەردۆغان دەناسرێت، لەم رستانەی خوارەوەدا ئەو جۆرە ئیدیعایانەی سەبارەت بە پ.ك.ك هێناوەتە سەرزمان؛

"پ.ك.ك لە روویەکەوە رێکخراوێکی تیرۆریستی نێودەوڵەتییە و فیگەرێکی هێزە نێودەوڵەتییەکانە... باڵێکی ئەو رێکخراوە، بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ ئیسرائیل جاربەجار دژی ئێران دەجەنگێت و باڵێکی دیکەیشی پشتیوانی لە رژێمی ئەسەد دەکات کە ئێران نایەوێت بڕووخێت." (Yalçın Akdo□an, Kandilin Suriye Hesapları, Star, ٩ Mart ٢٠١٢) سەبارەت بەو"بەکرێگیراوییە"ی وەك ئاوەڵناوێك بۆ پ.ك.ك زیادکرابوو، دەگوترا کە ئەو رێکخراوە کار بۆ چەندین لایەنی جۆراوجۆر دەکات کە لە سوریا، ئێران و تەنانەت دامودەزگا ئەمنی و سەربازییەکانی ئیسرائیل'ەوە بگرە هەتا فەرماندەیی گشتی سوپای تورکیا'ی لە خۆ دەگرت. لەوەش زیاتر تەنانەت بە دەنگی بەرز باسی ئەوەش دەکرا کە پ.ك.ك لە ساڵانی ١٩٧٠کاندا لەلایەن میت'ەوە دروستکراوە.

کەمال بورکای یەکێك لە بەناوبانگترین کەسایەتییە سیاسییەکانی کورد لە تورکیا کە لە پ.ك.ك نارازییە، لە پاییزی ٢٠١١دا دوای سی و یەك ساڵ دوورکەوتنەوە گەڕایەوە بۆ تورکیا و دوای ئەوەش رایگەیاند کە پ.ك.ك هەر لەسەرەتای دامەزراندنییەوە دەسکردی دەوڵەتی تورکیا بووە.

کەمال بورکای ساڵێك لەوەو پێش لە ئەڵمانیا بەشێکی زۆری ئەو بیروبۆچوونانەی خۆی بۆ من باسکردبوو کە بۆی رای گشتی ئاشکرای کردن. ئەو لەکاتێکدا جەختی دەکردەوە کە پێویستە جوڵانەوەی کوردی بێ چەك بکرێت و لە رێگەی یاساییەوە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی کورد بدرێت، باسی ئەوەشی دەکرد کە عەبدوڵا ئۆجالان دەتوانێت پ.ك.ك بێ چەك بکات، بەڵام کاتێك ئەو کارە دەکات کە فەرماندەیی گشتی سوپا داوای لێ بکات. بورکای ئەوکاتە پێی وتبووم کە ئۆجالان دوای دەسگیرکردنی لە ساڵی ١٩٩٩دا کەوتۆتە دەستی دەوڵەتی شاراوە.

بورکای سەبارەت بە یەکەم ئاگربەستی پ.ك.ك لە ساڵی ١٩٩٣شدا هەندێك تێبینی سەرنجراکێشی پێدام. لەدوای ئەو ئاگربەستە، لە شام لەگەڵ عەبدوڵا ئۆجالان یەکتریان بۆ ئیمزاکردنی چرووتتۆکۆڵێك لە بەینی پ.ك.ك و پ.س.ك (پارتی سۆسیالیستی کوردستانی تورکیا) بینیبوو کە هیوایەکی زۆری بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد دروستکردبوو. کەمال بورکای وتی؛"سوریا لە یەکەم ئاگربەستی ساڵی ١٩٩٣ نیگەران بوو، بەڵام عەبدوڵا ئۆجالان بە راستیی ئەو ئاگربەستەی دەویست. ئۆجالان لە ژێر کاریگەری سوریا بوو، بەڵام

کراوە بوو بۆ ئەوەی لەگەڵ تورکیا ڕێکبکەوێت."کاتێ ئەو قسانەشی کرد زۆر خۆشحاڵ بووم کە تێبینییەکانم لەسەر ئۆجالان کە دوای دیدارەکەی بارئەلیاس بۆ تورگوت ئۆزال'م گێرابوونەوە، ڕاست دەرچوون.

کەمال بورکای دوای باسکردنی ئەوەی کە عەبدوڵا ئۆجالان لە ١٩٩٣دا نزیك بووە لەوەی کە لەگەڵ تورکیا ڕێبکەوێت، وتی؛"لەو چرووتتۆکۆلەدا کە لەگەڵ ئێمە ئیمزای کرد، وازی لە ئامانجی سەربەخۆیی هێنا و ڕووی لە فیدراسیۆن کرد."دواتریش جەختی لەسەر گرنگی چرووتتۆکۆلەکە کرد. وتەکانی موراد قەرەیڵان'یش لە تشرینی دووەمی ٢٠١١دا، قسەکانی ئەویان ڕاست دەڕدەخست. موراد قەرەیڵان هێڵکی ئەستووری بە ژێر ئاگربەستەکەی ١٩٩٣دا کێشا و کۆنگرەی ١٩٩٥ی پ.ك.ك'ی بە کۆنگرەی گۆڕانکاری لە قەڵەم دابوو. لەو کۆنگرەیەدا پ.ك.ك وازی لە ئامانجی سەربەخۆیی هێنابوو و لە جیاتی ئەوە ئامانجی"چارەسەرکردنی کێشەکەی لەگەڵ تورکیا و لە چوارچێوەی یەکپارچەیی خاکی تورکیا"پەسندکردبوو.

کەمال بورکای دوای ئاماژەکردن بە کراوەبوونی عەبدوڵا ئۆجالان بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ تورکیا، وتی؛"کراوەبوونی بۆ ڕێککەوتن، دوای دەسگیرکردنیشی شتێکی حاشاهەڵنەگر بوو. لەدوای دەسگیرکردنی ساڵی ١٩٩٩دا، وازی لە هەموو داواکارییەکانی خۆی لە چرووتگرامی پ.ك.ك هێنا و تەنانەت ناوی ئەو ڕێکخراوەشی گۆڕی. بەڵام بەرای من لایەنە ملیتاریستییەکان نەیاندەویست پ.ك.ك بێ چەك بکرێت. دەیانویست ئەو ڕێکخراوە وەك ئامڕازێك لە دژی باشوور (کوردستان'ی عێراق) بەکار بهێنن. کشانەوەی هێزە چەکدارەکانی پ.ك.ك بۆ باشوور، چرووتژەی دەوڵەتی تورکیا (بە واتای سوپا) بوو. ئەگەر ئەمریکا عێراق'ی داگیرنەکردایە، پ.ك.ك'ی لە دژی باشوور بەکار دەهێنا. سوپا وایکرد کە ئاپۆ فەرمانی هێشتنەوەی پێنج سەد ئەندامی چەکداری پ.ك.ك لەنێو خاکی تورکیا بدات. ئەمەش بۆ ئەوەبوو کە ئەگەر پێویست بکات بۆ هێرش کردنە سەر بنکە سەربازییەکان و شتی وا بەکار بهێنرێن. لەدوای ١٩٩٩، عەبدوڵا ئۆجالان وەك ئامڕازێك لە دەستی سوپا بوو تا لە دژی پارتی دادو گەشە پێدان و یەکێتی ئەورووپا بەکاری بهێنرێت."

جگە لەوە، کەمال بورکای پێیوابوو پەیوەندییە پ.ك.ك و دەوڵەتی تورکیا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی دامەزراندنی ئەو ڕێکخراوە. دوای باسکردنی پرۆسەی گەشەکردنی پ.ك.ك وتی؛"میت پ.ك.ك'ی دامەزراند، بەڵام دواتر کەوتە ژێر کۆنترۆڵی سوریا و لەدوای ١٩٩٩، کەوتە دەستی فەرماندەی گشتی سوپای تورك."ئەم ڕستانەی کەمال بورکای سەرنجڕاکێش بوون، بەڵام بەدەر لەوە هەندێك ڕوونکردنەوەی سەبارەت بە پێکهاتەی ناوخۆیی پ.ك.ك'دا و ناوی هەندێك لەبەرپرسانی ئەو ڕێکخراوەی هێنایە سەرزمان کە بە وتەی خۆی پەیوەندییان لەگەڵ فەرماندەیی گشتی سوپای تورکیا هەیە.

ئەو وتانەی کەمال بورکای سەبارەت بە پەیوەندی هەندێك لەبەرپرسانی پ.ك.ك لەگەڵ فەرماندەیی گشتی سوپای تورکیا، بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش لەگەڵ وتەکانی عوسمان ئۆجالان، نیزامەدین تاش، خەلیل

ئاتاچ لە کۆیە و هەولێر یەکیان دەگرتەوە. هەروەها وتەی بەرپرسانی ئەمنی تورکیا'ش کە بۆ ئامادەکردنی راپۆرتەکەی تەسەڤ بەناوی"دابەزین لە چیا"قسەم لەگەڵ کردبوون بە هەمان ئاراستەدا بوون.

زانیاری من لەسەر پ.ك.ك زۆر زیاتر بوو لە تەسەوری ئەو کەسانەی کە بەهۆی هەڵوێستی من سەبارەت بە کێشەی کورد و پ.ك.ك رەخنەیان لێ دەگرتم و تەنانەت کاردانەوەیان لە دژ پیشاندەدام. تێگەیشتنی من لە پ.ك.ك لە نەناسین و بێئاگایی من لەو رێکخراوەوە سەرچاوەی نەدەگرت، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە تێگەیشتنی زیاتر و راسترەوە دەهات.

زۆر نەکەوتمە ژێر کاریگەری ئەو بۆچوونانەش کە دەیانگوت پ.ك.ك رێکخراوێکی"ستالینیستی"یە و دیموکراتیك نییە. دەمزانی ئەوە چ واتایەك دەدات، چونکە لەکاتی گەنجیدا لەنێو رێکخراوێکی ژێرزەمینی ستالینیستی فەلەستین'دا کارم کردبوو. بۆیە ناکرێ بگوترێ کە سەبارەت بە چۆنییەتی کارکردن و پەیڕەوی ناوخۆی پ.ك.ك بە هەڵەدا چووم.

شتی زۆرم سەبارەت بە پ.ك.ك خوێندۆتەوە. بە تایبەتی بیرەوەری و نوسینەکانی ئەو کەسانەی کە زەمانێك خۆیان لەنێو ئەو رێکخراوەدا لە ئاستێکی بەرزدا پۆستیان هەبووە و دواتر لەبەر ناکۆکی لەگەڵ عەبدوڵا ئۆجالان و بەرپرسانی دیکە، رێگای خۆیان لەو رێکخراوە جیاکردۆتەوە. کاتێ ئەوانەشم دەخوێندەوە، لە زاری ئەو پاڵەوانانەوە جارێکی دیکە ئەزمونی خۆمم لەنێوان ساڵانی ١٩٦٩-١٩٧٢ دەخوێندەوە و سەبارەت بە راستی ئەو شتانەی کە نوسرابوون، هیچ گومانێکم لا دروستنەبوو.

بەڵام هەموو ئەمانەش نەبوونە هۆی ئەوەی کە بیروبۆچوونەکەی من سەبارەت بە کاراکتەری بنەڕەتی پ.ك.ك وەکوو گەورەترین و درێژخایەنترین و خۆڕاگرترین و جدیترین راپەڕینی کوردەکان لە مێژووی کۆماری تورکیا، گۆڕانی بەسەردا بێت.

لەم خاڵەشدا بەکارهێنانی وشەیinsurgency لەبەرامبەر ئەو"راپەڕین"ەی پ.ك.ك باسیدەکات سوودی خۆی هەیە. لە زمانی ئینگلیزی دا وشەکانیrevolt, rebellion  بە واتای راپەڕین دێن، بەڵام پ.ك.ك، بە زمانی ئینگلیزی Kurdish revolt یان Kurdish rebellion نییە، بەڵکو بە هەموو واتایەکی خۆیەوە Kurdish insurgencyیـە. وشەی insurgency، جیاواز لە وشەکانی revolt, rebellion ، راپەڕینێك دەگرێتەوە کە درێژخایەنە و هەوراز و نشێوی تێدایە، بۆیە بەکارهێنانی ئەم وشەیە بۆ پێناساندنی پ.ك.ك لە تورکیا کە سیمبولی"راپەڕینی کورد"ە، لە جێی خۆیدا دەبێت.

بەهۆی ئەو بیروبۆچوونانەشەوە، سەرەڕای ئەوەی هەندێك لە چالاکییەکانی پ.ك.ك مۆری کردەوەی تیرۆریستییان پێوە بووە، هیچ کات لە وتە و نوسینەکانمدا ئەو رێکخراوەم بە رێکخراوێکی تیرۆریستی وەسف نەکردووە. لەنێوان ساڵانی ١٩٧١-١٩٧٣دا لەنێو جوڵانەوەی فەلەستین'دا بە چاوی خۆم ئەوەم

بینیبوو کە ڕێکخراوەکانی ڕاپەڕین و بەرگری جاربەجار پەنا بۆ کردەوەی تیرۆریستی دەبەن و بە ئەزموون ئەوەشم بۆ دەرکەوتبوو کە پەنابردنی ڕێکخراوێکی ڕاپەڕین و بەرگری بۆ چەکی کردەوەی تیرۆریستی واتای ئەوە ناگەیەنێت کە مۆرکی "ڕێکخراوێکی تیرۆریست"ی پێوە بلکێنرێت.

لەو ڕاپۆرتەدا کە سەبارەت بە"دابەزین لە چیا"ئامادەم کردبوو، باسی ئەوەم کردبوو کە بەدەر لە پەیوەندی ڕێکخراوەکانی ڕاپەڕین لەگەڵ تیرۆر، وەك ئەو ئیدیعایانەی کە دەربارەی پ.ك.ك دەکرێن، لەوانەبە ئەو ڕێکخراوانە پەیوەندییان بە ئاڵوگۆڕ و بازرگانی کردن بە مادە هۆشبەرەکانیشەوە هەبێت و بۆ ئەمەش سەرچاوەی ئەکادیمی پێویستم لە ڕاپۆرتەکەدا بەکار هێنابوو.

پ.ك.ك هەرچی دەبێت با ببێت، ڕێکخراوێك بێت کە میت دایمەزراندبێت یاخود دەستی هەواڵگری وڵاتانی وەك سوریا و ئێران و یونان و قوبرسی ڕۆم و هەندێك وڵاتی هاوپەیمانی تورکیا‌ی لە ئەورووپا لە پشت بێت کە دوای دەسگیرکرانی عەبدوڵا ئۆجالان بە ئاشکرا دەرکەوتن، تەنانەت ڕێکخراوێك بێت کە پەیوەندی نهێنی و ناڕوونی لەگەڵ فەرماندەیی گشتی سوپای تورك‌دا هەبێت و بەهۆی ڕووداوەکانی کوشتنی ناوخۆیی خۆیەوە ناوی لەکەدار بووبێت، دیسان لە چاوی منەوە تایبەتمەندی خۆی وەك ڕاپەڕینێکی کوردی لە دەستنەدا.

بڕوام بەوە کردبوو کە ئەگەر تورکیا بە دەوڵەت و حکومەتەکان و ڕای گشتی خۆیەوە، گۆڕانکارییەکی پارادیگما‌ی سەبارەت بە کێشەی کورد و پ.ك.ك کە بەشێکی دانەبڕاوی کێشەکەیە بکردایە، چارەیەکی یەکەمی سەدەی بیست و یەکەم زۆر جیاواز دەبوو.

هیچ کات پ.ك.ك وەك ڕێکخراوێك خاڵی ڕاکێشەری بۆ من تێدا نەبوو. بەڵام ئەمە نەبووە ڕێگر لەوەی کە تێبگەم بۆچی کوردەکان بە تایبەتی لاوان بەرەو خۆی ڕادەکێشێت. هەرکەسێك بیەوێت لە نزیکەوە خەڵکی کورد بناسێت و حەزیان لێ بکات، دەزانێت پ.ك.ك زیاتر لە ڕێکخراوێك، گوزارشت لە"باری دەروونی"کوردەکان دەکات. ئەو پ.ك.ك‌یەی کە"باری دەروونی"یە لەو پ.ك.ك‌یە گرنگترە کە ڕێکخراوێکە و هەر ئەو"باری دەروونی"یەش هێزی پاڵنەری ڕاپەڕین دابیندەکات.

**تورکەکان ناتوانن ئەو دەرسە تاڵانەی کە لە ویلایەتە عەرەبەکان و روومەلی بە ئەزموون فێریان کراوە، بەتەواوی لە کوردستان جێبەجێ بکەن، بۆیە لەوانەیە قورس بەسەریاندا بشکێتەوە و باجی گەورە بدەن.**
**ئارنۆڵد تۆینبی و کنێس کرکفوود، تورکیا، لەندەن، ١٩٢٦، ل.٢٧٢**

پ.ك.ك باری دەروونی بەشێکی گرنگی کوردەکان‌ی تورکیا‌یە و ئەم تایبەتمەندییەشی لە خودی پ.ك.ك وەکوو رێکخراوێك گرنگترە. زۆر زوو ئەم تێگەیشتنەم لا دروستبوو و لە گەشتێکدا کە ساڵی ١٩٩٢ بۆ دیاربەکر و وان ئەنجاممان دابوو، ئەم بۆچوونەی خۆم بۆ سەرکۆمار تورگوت ئۆزال باس کردبوو. "رووبەڕووبوونەوەی پ.ك.ك وەك رێکخراوێك، کێشەیەکی گەورە بۆ دەوڵەت دروستناکات. ئەوەی کە هێزی سەرەکی پ.ك.ك دابین دەکات پشتیوانی گەلی کوردە و ئەو سایکۆلۆژیایەیە کە بەسەریاندا زاڵە. لە راستیدا پێویستە ئەمە چارەسەر بکرێت. دەبێ باری دەروونی خەڵك بگۆڕدرێت. ئەگەر ئەو سایکۆلۆژیایەی کە بەسەر کوردەکان زاڵە بگۆڕدرێت، ئەوکاتە پ.ك.ك تەنها وەك رێکخراوێك دەمێنێتەوە و چاری دەکرێت." کاتێ ئەمانەم هێنابووە سەرزمان، تورگوت ئۆزال بە وردی گوێی لێ گرتبووم. هیچ نارەزاییەکی بەرامبەر وتەکانم پیشان نەدا و دواتر لە هەندێك وتە و روونکردنەوەیدا تێگەیشتم کە ئەویش وەك من بیردەکاتەوە.

لەو قۆناغەدا باسی ئەوەم دەکرد کە پ.ك.ك هۆکاری دەرکەوتنی کێشەی کورد نییە بەڵکو ئەنجام و بەرهەمێکی هەبوونی کێشەی کوردە و بیروبۆچوونەکانی خۆم لەوبارەیەوە بڵاودەکردەوە. جەوهەری بۆچوونەکانم هەڵە نەبوون. بڕوام وابوو کە ئەگەر تورکیا هەنگاو بۆ بە رەسمی ناسینی مافەکانی شوناسی کوردەکان بنێت و ریفۆرم بکات، ئەوا پ.ك.ك سنوردار دەبێت و دەتوانرێت چاری بکرێت. لە ساڵانی ٢٠٠٠کاندا لایەنگری ئەم تێزە زۆر زۆر بوون، بەڵام ئەوەش راستییەکی حاشا هەڵنەگر بوو کە لەو ساڵانەشدا ئیدی کارلەکار ترازا بوو.

ئەو تێزە کە لە جەوهەری خۆیدا هەڵە نەبوو، لەدوای دەیەی یەکەمی ٢٠٠٠کاندا ئیدی رێگای چارەسەری نەبوو. ئەو دەرفەتە لە کیس چووبوو کە تورکیا بتوانێت لە رێی هەنگاونان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، پ.ك.ك سنوردار بکات و کێشەکەی کۆتایی پێ بهێنێت. چونکە تورکیا لە دە ساڵی یەکەمی دەسەڵاتداریی پارتی داد و گەشەپێدان بەسەرۆکایەتی تایب ئەردۆغان، سەرەڕای ئەوەی بە بەراورد لەگەڵ رابردوو هەنگاوی گرنگی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد نابوو، بەڵام خۆی لە جەوهەری راستەقینەی کێشەکە نەدابوو و ئامادە نەبوو خۆی لە قەرەی بدات. هەرچەندە بەگوێرەی رابردوو، پێشکەوتنی گەورە روویاندابوو، بەڵام رووداوە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکان بەجۆرێک کە کاریگەری لەسەر داهاتووی کوردەکان دابنێن، بەخێرایی پێشدەکەوتن.

لە راستیدا لەسەرەتای سەدەی نوێدا توانای پێشبینی کردنی ئەو گرفتانەی کە لە ساڵانی ٢٠٠٠کاندا بەهۆی دانەبەزینی تورکیا بۆ ناوەڕۆکی کێشەی کورد روویاندا، لە ئارادابوو.ساڵی ١٩٩٩، ئەوکاتەی لە سەنتەری ویلسن لە واشنتن کارم دەکرد، ناوەندێکی لێکۆڵینەوە بەناوی دامەزراوەی سەدە (Century Foundation) کە مۆرتۆن ئابرامۆڤیتز باڵیۆزی پێشووی ئەمریکا لە ئەنقەرە تێیدا کاری دەکرد، پێشنیاری نوسینی کتێبێکی سەبارەت بە پەیوەندییەکانی تورکیا - ئەمریکای کرد کە خودی ئابرامۆڤیتز هەڵەبڕی و پێداچوونەوەی بۆ دەکرد. هەر بەشێکی کتێبەکە لەلایەن کەسێکی جیاوازەوە دەنوسرا و لە دەرەوەی من و مۆرتۆن ئابرامۆڤیتز کەسانی وەك فیلیپ رۆبینس، هەیس لاوری، ئالان ماکۆڤسکی، زیا ئۆینیش و جەیمس ویلکینسۆن تێیدا بەشدار دەبوون. کتێبەکە لە ساڵی٢٠٠١دا بەناوی"وەرچەرخانی تورکیا و سیاسەتی ئەمریکا"لە نیۆیۆرك بڵاوکرایەوە و لەدوای ١١ی ئەیلول (٢٠٠١)، کتێبەکە دەسکاری کرا و بەناوی"تورکیا و ئەمریکا، ئەو هاوپەیمانانەی کە پێویستیان بە یەکتر هەیە"جارێکی دیکە بڵاوکرایەوە. نوسەرانی چاپی دووەمی کتێبەکە، بەدەر لە من و مۆرتۆن ئابرامۆڤیتز، فیلیپ رۆبینس، هێنری بارکلی، جەیمس ویلکینسۆن، ئەرجان کومجوو، یاڵم ئەرئالپ و لەسەر پێشنیاری من، عومەر چەلیك بوون. چەلیك بابەتێکی بەناوی"داهاتووی تورکیا و ئیسلامی سیاسی"بە زمانی تورکی نوسی کە وەرگێڕدرایە سەرزمانی ئینگلیزی و لە کتێبەکەدا بڵاوکرایەوە. لەو کاتانەدا پارتی داد و گەشە پێدان دانەمەزرابوو و نەدەزانرا کە عومەر چەلێك یەکێك لە کەسە نزیکەکانی رەجەب تایب ئەردۆغان دەردەچێت.

لە هەردوو کتێبەکەدا فیلیپ رۆبینس پسپۆڕی ناسراوی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و تورکیا لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، بەشەکانی تایبەت بە کێشەی کوردی نوسیبوون. فیلیپ رۆبینس لە چاپی یەکەمی کتێبەکەدا بابەتێکی بەناوی"تورکیا و کوردەکان، ئایا دەرفەتێکی دیکە لە کیس دەچێت؟"کە وەك لە دێڕەکانی خوارەوە دەردەکەوێت، لەگەڵ خستنە رووی جەوهەری کێشەکە، لە حاڵەتی چارەسەرنەکردنیدا، پێشبینی دەرکەوتنی گرفتەکانی ساڵانی ٢٠٠٠کانی کردبوو؛

"کۆماری تورکیا لە تەمەنی کورتی خۆیدا پەیوەندییەکی زۆر سەختی لەگەڵ دانیشتوانی کورددا هەبووە. دەوڵەتی تورکیا لە هەموو چرووتژە گەورەکانیدا ( بونیاتنانی دەوڵەت، دروستکردنی ئایدۆلۆژیایەکی سیاسی، بونیاتنانی کۆمەڵگەیەکی مۆدێرن و گەشە پێدانی ئابووری)، رووبەڕووی هەڵوێستی جۆراوجۆر و خوڕاگری کوردەکان بووەوە. ئەم کێشانە، لە روانگەیەکەوە داخراوی و سنورداریی ناوچە کوردییەکانی تورکیایان پیشان دەدا؛ وەك جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتانەی کە ئەولەویەتی بە بەرژەوەندی خێڵەکان دەدا، بڵاوبوونەوەی پارێزگاری کۆمەڵایەتی و ملکەچبوونی تاکەکان بۆ خێڵ، نزمبوونی ئاستی پەروەردە و کەمیی داهاتی نەتەوەیی تاك لەو ناوچانە. لە روویەکی دیکەشەوە، ئەم بارودۆخە ئاوێنەی بوچوون و تەسەورە

دژیەکەکان سەبارەت بە دەوڵەت و نەتەوە بوو. هۆکارەکانی هەرچی دەبن با ببن، سەرەڕای ئەوەی حەفتا و پێنج ساڵە دامەزراوە، دەوڵەتی تورکیا سەرکەوتوو نەبووە لەوەی کە دانیشتوانی کورد تێکەڵاوی خۆی بکات...

لەبەر سرووشتە قووڵ و درێژخایەنەکەی، نابێ کەس ئەوە فەرامۆش بکات کە پێویستە ئەو کێشەیە بە قۆناغێکی ئاشتیخوازانەدا گوزەر بکات. لەگەڵ ئەمەشدا لەساڵی ۱۹۹۹دا بارودۆخێکی سیاسی بگۆڕ هاتە ئاراوە. لەدوای یەکەم ئاگربەستی تاکلایەنەی پ.ك.ك لە ساڵی ۱۹۹۳ و دوای هەوڵەکانی ئۆزال، هیچ کات هەلومەرجەکان بۆ بەرقەرارکردنی ئاشتی بەو ئەو ئەندازەیە گونجاو نەبوون. لە ئەنجامی چالاکییەکانی لایەنی تورکی، لایەنی کوردی هیوایەکی نوێی دروستکرد. لەدوای دەسگیرکردن و گەڕاندنەوەی بۆ تورکیا و پاش دەرچوونی سزای لە سێدارەدان بۆی، عەبدوڵا ئۆجالان سەرکردەی پ.ك.ك لەبەر ئازایەتی بێت یان لەبەر ترسنۆکی، بڕیاریدا لە جیاتی تێکۆشانی چەکداری ڕێگای سازش و هاوکاری بگرێتەبەر. لەوەش گرنگتر، لە ۲ی ئابی۱۹۹۹دا کۆتایی بە تێکۆشانی چەکداری پ.ك.ك هێنا و فەرمانی پاشەکشەی هێزەکانی ئەو ڕێکخراوەی لە خاکی تورکیا دەرکرد.

هیچ گومانی تێدا نییە کە گۆڕانکارییەکی وەها لە کێشەی کورد بە ناچاری ئەو پرسیارە لەگەڵ خۆیدا دەورووژێنێ کە بارودۆخەکە چەندە گونجاوە بۆ ئەوەی لە جیاتی شەڕ و پێکدادان، دانوستان بۆ چارەسەرێکی هەمیشەیی بکرێت؟ ئەم بابەتەش کە گرنگییەکی ناوەندی هەیە، سێ پرسیار لە خۆ دەگرێت. یەکەمیان ئەوەیە کە چەندە لەوانەبە لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد و پ.ك.ك'دا عەبدوڵا ئۆجالان بەشدار بکرێت؟ دووەمیان ئەوەیە کە سیناریۆ ئیحیتمالییەکانی داهاتوو چین تا قۆناغێکی سەرکەوتووی ئاشتی لە خۆ بگرن و بە چارەسەری کۆتاییان پێبێت؟ سێیەمیش ئەوەیە کە تێچوونەکانی گرتنەبەری ڕێگایەکی وەها چین؟

...ناوەڕۆکی کێشەی کورد - تورك لە جیاوازی دیدگا و بیروبۆچوونی بنەڕەتی ئەو کەسانەی کە لەسەرخاکی تورکیا خۆیان بە کورد دەزانن لەگەڵ بەڕێوەبەرانی دەوڵەت دایە سەبارەت بەو مافانەی کە هەیانە... لەم قۆناغەدا، جیاوازی بیروبۆچوونەکان بەرلە هەموو شتێك ئایدۆلۆژین. زۆربەی کوردەکان لە پێوەرێکدا کە ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر دەبێت، وەك کورد داوای مافی سیاسی و کەلتووری و ڕێکخستنی دەکەن. لەبەرامبەر ئەوەشدا، دەوڵەتی تورك پێداگری لەوە دەکات کە پێویستە هەموو ئەوانە لە ژێر سایەی تێگەیشتن شوناسی تورك بێت کە هەموو شتێك لە خۆ دەگرێت. ئەمە کێشەیەکی کاتی نییە و ریشەکەی لە تەمەنی کۆماری تورکیا درێژترە و بۆ جوڵانەوەی ژۆن تورکەکان لە کۆتایی سەدەی ڕابردوو دەگەڕێتەوە. هێشتا چەمکەکانی نەتەوەگەرایی و مافی دیاریکردنی چارەنووس، لە ئاستی ناوچەیی و نێودەوڵەتیدا گرنگییان و هەیە و ناکۆکییان لەسەرە. لەم قۆناغەدا بەڵگە لەبەردەستدایە کە لانیکەم جیاوازی بنەڕەتی بیروبۆچوونەکان لەبارەی

ئەو شتانە لە داهاتوودا لە خوت و خۆڕایی لەناو ناچن." (Philip Robins, Turkeys Transformation and American Polisy, A Century Foundation Book, ٢٠٠٠, p.٦١,٦٢,٦٥)

ئەو هەڵسەنگاندنە کە هی ساڵی٢٠٠٠ بوو، سەرەڕای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ هێشتا برەوی مابوو. لەوەش زیاتر، عێراقێکی فیدراڵ کە وەك بەرهەمی جەنگی ٢٠٠٣ پەیدابوو، رەگەزێکی قورستری خستە سەر چارەسەکردنی کێشەی کورد لە تورکیا کە هێشتا جیاوازی بنەڕەتی دیدگاکانی خۆی لەگەڵ کوردەکان ی تورکیا چارەسەرنەکردبوو. فیدرالیزم، فرمۆلی سیحراوی و پێویستبوو بۆ ئەوەی کوردەکان لەنێو یەکپارچەیی خاکی عێراق دا بهێڵرێنەوە. ئەمەش نەك تەنها بە کردەوە سەربەخۆیی حکومەتی هەرێمی کوردستانی لە سێ پارێزگای باکووردا یاسایی کردەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی ئەو پێکهاتەیە گەرەنتی بکرێت، لە دەسەڵاتی ناوەندیدا سەرۆکایەتی کۆمار( جەلال تاڵەبانی) و وەزیری دەرەوە کە نوێنەرایەتی کەسایەتی عێراق ی لە ئاستی دەرەوە دەکرد (هۆشیار زێباری) بە کوردەکان دران. لەلایەکی دیکەوە مەسعود بارزانی پۆستی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان ی بە هەڵبژاردن بەرکەوت.

کوردەکان بەو پێگەیەی لە عێراق بەدەستیان هێنابوو، هێزێکی یەکلاکەرەوەیان لە ئاستی ناوچەیی و تەنانەت لە ئاستی نێودەوڵەتیشدا پەیداکرد. ئیدی رازیکردنی کوردەکان ی تورکیا کە جوگرافیای بەردەوامیان لەگەڵ کوردەکان ی عێراق دا هەیە و لانیکەم نزیکەی نیوەی هەموو کوردەکان پێکدەهێنن، بە شتێکی کەمتر لە دەسکەوت و پێگەی هاونەژادەکانیان لە عێراق مومکین نەبوو. ئەمەش لەکاتێکدابوو کە هیچ کات مۆدێلێکی وەها بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تورکیا لەبەرچاو نەگیرابوو. ئەو پێگەیەی کوردەکان دوای جەنگی ٢٠٠٣ی عێراق بەدەستهێنا، رۆڵی گرنگ و یەکلاکەرەوەی لە چارەسەکردنی کێشەی کورد لە تورکیا دەگێڕا. لە دوو بابەتیشدا کە ساڵی ١٩٩٥ دوابەدوای یەك لە رۆژنامەی سەباح دا بڵاوم کردبوونەوە باسی ئەم جۆرە شتانەم کردبوو. خاڵی هاوبەشی هەردوو بابەتەکەش بریتی بوو؛

کێشەی کورد ئیدی فرە جۆرە و هەر کێشەیەکیش لەنێو خۆیدا پێناسەی جیاوازی هەیە. یەکێك لەوانە کە پێشتیریش ئاماژەم پێکردووە ئەوەیە کە کوردەکان نەبوونەتە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان.(دیسان وەك چۆن پێشتر باسکرابوو) لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم سیستەمی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەسەر بنەمای فۆرماتی دەوڵەتی نەتەوەیی رێکخرایەوە و تا ئەندازەیەك هەموو گرووپە نەتەوەییەکان بوونە خاوەنی دەوڵەت و عەرەبەکان یش زیاتر لە پێویستی خۆیان، چەندین دەوڵەتیان دامەزراند. دەوڵەتی یەهوودی ئیسرائیل یش بەم ژێر سیستەمەی سیستەمی ناوچەیی یاخود نێودەوڵەتییە زیادکرا. کوردەکانیش کە گەلێکی گەورە و نیشتەجێی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بوون لە دروستکردنی دەوڵەتی تایبەت بە خۆیان بێبەش بوون و لەوەش زیاتر لە بەینی پێکهاتەی دەوڵەتە نەتەوەییە جیاوازەکاندا دابەشکران. کاتێ کوردەکان ببنە خاوەنی دەوڵەت

یان وەکوو بەشداری دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتانە بکەن کە تێیاندا جێ دەگرن و خۆیان وەك بەشێکی دانەبڕاو لەوانە بزانن، یاخود کاتێك بێت کە ئیدی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی بە پێویست نەزانن، کێشەی کورد چارەسەر دەکرێت. بۆ جێبەجێکردنی بژارەی دووەم و بۆ ئەوەی کوردەکان بۆ مانەوەی خۆیان دامەزراندنی دەوڵەتێکی جیاواز بە پێویست نەزانن، دەبێ لەنێو ئەو دەوڵەت یان دەوڵەتانەدا کە تێیاندا دەژین وەرچەرخانێکی ریشەیی و بنەڕەتی ئەنجام بدرێت.

دەکرێ بگوترێت ساڵی ٢٠٠٣ و قۆناغی دوای ئەو، لە دەوڵەتی عێراق'دا کە تێیدا سەرۆکایەتی کۆمار و وەزارەتی دەرەوە بەر کوردەکان کەوت و کوردەکان توانییان قەوارەیەکی سەربەخۆی گەورە بۆ خۆیان دروستبکەن، بژارەی دووەم جێبەجێ کراوە. بەڵام ئەوەی کە من سەبارەت بە بژارەی دووەم پێشبینیم دەکرد، تورکیایەکی ئەندامی یەکێتی ئەورووپا بوو کە خۆی لەگەڵ هەموو پێوەرەکانی ئەو یەکێتییەدا بگونجێنێ. لەو رووەوە تورکیا لە قۆناغی یەکەمی ساڵانی ٢٠٠٠کاندا پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی، بەڵام نەگەیشتە ئەو ئاستەی کە کوردەکان بە رەزای خۆیانەوە تێیدا بمێننەوە.

کاریگەری جینەکانی ژۆن تورك – ئیتیحاد و تەرەقی لەسەر دەوڵەتی تورك کە ریشەیان دەگەڕایەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، رێگر بوو لەوەی کە لە هەموو روانگەیەکەوە بە چاوی یەکسان سەیری کوردەکان'ی تورکیا بکرێت.

هەڵسەنگاندنێکی سەیری ئەو جینانەم لە دەقێکدا بینی کە لە ساڵی ١٩١١دا نوسراوە. گویرجان باڵك کە بەڕێوەبەریی قەڵەمی تایبەتی ئەحمەد داودئوغلو وەزیری دەرەوەی کردووە و دیپلۆماتێکە کە لە رووی ئەکادیمییەوە سەرنجی راکێشاوەتە سەر خۆی، ئەوکاتەی کە لە لەندەن کاری دەکرد، وتارێکی سەرنجڕاکێشی بۆ ناردم کە خۆی لە ئەرشیفەکانەوە دەریهێنابوو. لە ژمارەی تەمووز - کانوونی یەکەمی ١٩١١ی گۆڤاری Contemporary Review (هەڵسەنگاندنی سەردەم) کەسێك بەناوی Dr. E. J. Dillon بابەتێکی بەناویTurkey Still The Sick Man of Europe (تورکیا هێشتا پیاوە نەخۆشەکەی ئەورووپایە) نوسیوە کە تێیدا ریشەکانی نەخۆشی پێکهاتەی زەینییەتی دەوڵەتی تورکیا'ی دەرخستووە.

دوای قۆناغی مەشرووتییەتی ١٩٠٨ کە کاتی خۆی وەك"شۆڕش"سەیر دەکرا و لەو رۆژانەدا کە ئیتیحاد و تەرەقی لە پشتی پەردەوە وڵاتی بەڕێوە دەبرد، د. دیلۆن ماوەیەکی زۆر لە ئیستانبوڵ ماوەتەوە و دیداری راستەوخۆی لەگەڵ بەڕێوەبەرانی دەوڵەت ئەنجام داوە و دوای ئەوەش لە وتارێکی دوورودرێژدا باسی ئەوەی کردووە کە تورکیا ناگۆڕێت و پاش ریزکردنی هۆکارەکانی ئەوەش، پێشبینی کردووە کە ئیمپراتۆریای عوسمانی بۆ ماوەیەکی درێژ لەسەر پێ نامێنێتەوە.

نزیکەی ساڵێك دوای بڵاوبوونەوەی ئەو وتارە، جەنگی باڵکان لە ٨ی تشرینی یەکەمی ١٩١٢دا دەرکەوت

و حەوت مانگ دوای ئەو جەنگەش ئیمپراتۆریای عوسمانی رووماەلی لە دەست دەرچوو کە بە ناوجەرگەی دەوڵەتەکەی لە قەڵەم دەدرا. لە راستیشدا ئیدی کۆتایی بە تەمەنی هاتبوو و ماوەیەکی کورت لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵانی ١٩١٤-١٩١٨دا تێکەڵاوی مێژوو بوو.

لەو وتارەدا بە راشکاوی باسی ئەوە کرابوو کە ئەو نەخۆشییانەی کۆتایی دەوڵەتی ئیمپراتۆریایان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، بە میراتی بۆ کۆماری گەنج دەمێننەوە و لە ژێر سەردێری "نەتەوەگەرایی هێرشکەری تورکیای گەنج"دا چەندین دێڕی سەرنجڕاکێش نوسرابوون. نوسەر باسی ئەوەی کردبوو کە هەندێك لە بیرمەندان و سیاسییەکانی ئەورووپا کە خۆیان لە تورکیا بە نزیك دەزانن، لە دیدگای بەرتەسك و نەتەوەگەریانەی رژێمی نوێ و رەفتاری شێتانە و پەلەپەلی بەڕێوەبەرانی نوێی ئەو وڵاتە نیگەران بوون و هەوڵەکانی بەڕێوەبەرانی نوێی ئەو وڵاتەیان بۆ بە تورك کردنی رۆمەکان بە شتێکی نامومکین دەزانی. هەروەها باسی ئەوەشی کردبوو کە "ئامۆژکاری ئەو دۆستانە دەیتوانی بە ئەندازەی پێویست بۆ تورکیا بە سوود بێت."

سەبارەت بە ئامۆژگارییەکانیش ئەمانەی نوسیبوو؛ "هەوڵ مەدەن لە ماوەی یەك ساڵدا شوناسی نەتەوەیی ئەو گەلانە بسڕنەوە کە لەنێو دانیشتوانی وڵاتەکەتاندان. وردە وردە ئەو کارە بکەن. دەکرێ ئامانجی تواندنەوەی نەتەوەییتان هەبێت، بەڵام نابێ بیخەنە ئەولەویەتی کارەکانتان و نابێ بەخێرایی ئەنجامی بدەن. لەوانەیە لەگەڵ تێپەڕبوونی کات و لە رێی قەناعەتپێکردن و رەفتاری باشەوە بتوانن رۆم و عەرەب و بولغار و ئەلبانییەکان بکەن بە تورك و ناوی بە عوسمانی بوون لەوە بنێن. بەڵام ئەمە پێویستی بە کات و بەکارهێنانی ئامڕازی کاریگەر هەیە. توندوتیژی حەز و خۆشەویستییتان بۆ دابین ناکات. ناتوانن تەنها لە رێگەی دەرکردنی بڕیارنامەوە ئامانجەکانتان بەدی بهێنن. لەو بەینەشدا پێویستە خۆتان بپارێزن لەوەی بە هەڕەشە و گوڕەشە ئەو گەلانە لە دژی خۆتان بورووژێنن...

وەکوو ئەوەی ئێستا دەیکەن، هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی شتی نامومکین دەبێتە هۆی سەرنەکەوتنی ئامانجەکانتان و دۆزێکی باشیش لەناو دەبات و داهاتووی وڵات دەخاتە مەترسی. ئەوەشتان لە بیر نەچێت کە سیاسەت هونەری ئەنجامدانی شتی لەوانەبە."

لەو نوسینەدا دوای ئامۆژگارییەکانی "دۆستەکانی تورکیای نوێ" ئەم دێڕانە نوسراون؛

"دەستەیەکی سێیەم لە سیاسەتمەدارەکان هەن کە هەڵەی گەورەی تورکیای گەنج، لە ویستی زۆر بۆ ناوەندگەراییدا دەبینن. بەڕێوەبەرانی وڵات دەیانەوێ شتی زۆر بکەن و بێگومان لەوەشدا زیادەڕۆیی دەکەن. هەتا ئەوکاتەی سەرکێشەکان ملکەچ دەکەن، ئارام ناگرن و بێ ئۆقرە دەبن. ئێستا ئیدی ناتوانن لە ئیستانبوڵ هەموو بەشەکانی ئیمپراتۆریا بەڕێوەبەرن، و ئەگەر ئەو کارەش بکەن باجی بێ عەقڵی خۆیان دەدەن سەبارەت بەوەی کە ناهێڵن نەتەوەکانی دیکە خۆیان بەڕێوەبەرن. لە قۆناغی عەبدولحەمید'دا

ناوەندگەرایی تەنها بە ڕواڵەت بوو. لە ڕاستیشدا نەتەوەکان خۆیان کاروبارەکانی خۆیان بەڕێوەدەبرد و سوودیان لە خۆبەڕێوەبەری دەبینی... هەتا ئەوکاتەی دەبنە خاوەنی کەس و پارە و کەلتووری پێویست بۆ هەڵگرتنی ئەو بارە لەسەر شانتان، وازبێنن با نەتەوەکان خۆیان کاروبارەکانی خۆیان بەڕێوەبەرن. تەنانەت لە بارودۆخێکدا کە ئەوان بۆ پاراستنی ئیمپراتۆریا هەوڵبدەن و ئێوەش ڕێگایان پێبدەن کە بەشێوەی خۆیان کار بکەن، ئەوکاتە ئیشەکە بە باشی ئەنجام دەدەن."

نوسینەکە لەبەرامبەر ئەو مەترسییانەی کە نەتەوەگەرایی و ناوەندگەرایی ژۆن تورک (ئیتیحادچی) ڕێیان بۆ خۆش دەکەن، لە ڕێگەی ئامۆژگاری"دۆستانی تورکیا"وە، لە هەندێك جێگا ڕاستەوخۆ و لە هەندێك شوێندا بە ماناوە جەخت لەوە دەکات کە پێویستە کۆمەڵە ئەتنیکییەکانی ئیمپراتۆریای عوسمانلی ئۆتۆنۆمی و دەسەڵاتی خۆبەڕێوەبەرییان هەبێت یان بە گوزارشتێکی دیکە لامەرکەزی لە ئیمپراتۆرییەکەدا پێڕەو بکرێت. بەڵام دواجار نوسینەکە بە درێژەکێشانی تەمەنی ئیمپراتۆریا و گوێگرتنی ئیتیحادچییەکان لەو ئامۆژگارییانە گەشبین نییە.

لە ڕوانگەیەشەوە لە ژێر سەردێڕی"بۆچی تورکیای گەنج دروست نابێت؟"دا هەڵسەنگاندنێکی زۆر سەرنجڕاکێش و پڕ واتا دەکات کە بەکەڵکی ڕۆژگاری ئەمڕۆش دێت؛

"بیربۆچوونەکانم سەبارەت بە ئەگەری مانەوەی ئەو دەوڵەتە نوێیەی کە لە شوێنی دەوڵەتەکەی جاران و شۆڕشی تورك دامەزراوە، نەگۆڕن. لە نزیکەوە لێکۆڵینەوەم لە کێشەکە کرد و لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردەی گرووپ و پارتە سیاسییەکان دیدار و گفتوگۆم کرد کە دید و بۆچوونی کەسانی وەك کامیل پاشا، شەریف پاشا، هەقی پاشا و شازادە سەلاحەدین دەردەبڕن. هەروەها سەردانی پەتریکی جیهانی و پەتریکی ئەرمەن‌یشم کرد و لەوبارەیەوە بە وردی گفتوگۆم کرد. لەو شتانەی کە لەوێ و لە گەشتەکانی دواتردا بیستم و بینیم ئەوەبوو کە شۆڕشەکە دوو ناکۆکی و بابەتی دژیەکی لە خۆ گرتووە و بۆ خۆیشم هەر لەسەرەتاوە هەمان بیروبۆچوونم هەبوو. بەیەك گەیاندنی ئەو بەڵێ و نەخێرە، وەك تەقەلای لێك نزیککردنی بەفر و ئاگر بوو. لەبەر ئەوەش شۆڕشەکە، زیاتر لە چانسی چۆڵکردنی ئاوی ئۆقیانوسێك بە چەتاڵ، چانسی سەرکەوتنی نەبوو. لەم بارودۆخەدا ڕژێم دەیتوانی بەسەر ئاستەنگەکانی بەردەم خۆی زاڵ بێت یان بە پێچەوانەوە بەسەریاندا زاڵ نەبێت، بەڵام ئەنجامەکە فەرقێکی ئەوتۆی نەدەکرد...

بەپێی ئەو زانیارییانەی لەبەردەستدان و بەگوێرەی بیروبۆچوونی من، تورکیای گەنج لەنێو خۆیدا ناکۆکی هەیە و بەرهەمێکی خەیاڵە کە چانسی مانەوەی نییە. دەتەوێ پیاوانی کۆمیتە (ئیتیحاد و تەرەقی) واز لە یاری خۆشاردنەوەکەیان بهێنن و بە ئاشکرا جڵەوی دەسەڵات بگرنە دەست و بەپێی دەستوور وڵات بەڕێوەبەرن، یان لە پلانەکانیان بۆ ناوەندگەرایی پەشیمان ببنەوە و تووڕەییەکانی خۆیان بەرامبەر

نەتەوەکانی دیکە هەوسار بکەن و واز لە سزادانی ئەلبانییەکان لەبەر بەکارهێنانی ئەلف و بێی لاتین بهێنن، یان وەکوو پشت لە ئەڵمانیا بکەن و روو لە فەرەنسا و ئینگلتەرە بکەن، بارودۆخ و ئەنجامی کۆتایی ناگۆڕێت.

ژۆن تورکەکان خەلیفەیان لابرد و وازیان لە بنەماکانی قورئان هێنا و ویستیان ئیسلام بۆ کۆمەڵگەیەکی سیاسی بگۆڕن و هەوڵیاندا مافی هاوڵاتیبوون بدەنە ئەو گاورانەی کە موسڵمانە دیندارەکان وا فێرکراون لەوناویان بەرن. ئەمەش چرووتژەیەکە کە ئاستەنگی زۆری لەبەردەمدا دەبێت، چونکە موسڵمانێتی هیچ کات نەبووەتە کۆمەڵگەیەکی نەتەوەیی، بەڵکو کۆمەڵگەیەکی دینییە و وەك کاسۆلیکی و بودایی دینێکی نێودەوڵەتی بووە. لەودا (لەو شوێنانەی ئیسلام حوکمی تێدا دەکات) تاکەکان نەك بە نەتەوەکانی خۆیان بەڵکو بەهۆی بیروباوەڕە دینییەکانیانەوە لێك جیا دەکرێنەوە و هیچ کاتێکیش یەکەیەکی سیاسی یەکگرتووە نەبووە. تورکیا‌ی هەموو سوڵتانەکان هەتا عەبدوڵحەمید، کۆمەڵگەیەکی دینی بوو کە کۆمەڵگە دینییەکانی دیکەی بەڕێوە دەبرد. رۆم و ئەرمەن و بولغارەکانی نەك لە رووی نەتەوەکانیان بەڵکو بەهۆی بیروباوەڕەکانیانەوە پێناسە کردبوو. ئاشکرایە کە پێکهاتەیەکی دینی وەها لە ساتێکدا نابێتە دەڵەوتێکی سیاسی. لەگەڵ ئەمەشدا ژۆن تورکەکان بەو گریمانەیەی کە لەوانەیە لەوبارەیەوە وەرچەرخانێك هەبێت و ئەوان ئەنجامیان دابێت دەجوڵێنەوە.

بە رای من کێشەکە چارەسەر ناکرێت.″

د. دیلۆن لەو وتارەی خۆیدا کە ساڵی ۱۹۱۱دا بڵاوی کردۆتەوە، لە بەشی تایبەت بە ئەلبانی‌دا سەرەداوی هەمان شیکردنەوەکەی ساڵی ۱۹۲٦ی ئارنۆڵد تۆینبی داوە بە دەستەوە کە وتوویەتی"تورکەکان ناتوانن ئەو دەرسە تاڵانەی کە لە ویلایەتە عەرەبەکان و روومەلی بە ئەزمون فێریان کراوە، بەتەواوی لە کوردستان جێبەجێ بکەن، بۆیە لەوانەیە قورس بەسەریاندا بشکێتەوە و باجی گەورە بدەن.″راپەڕینی ئەلبانییەکان بەهۆی رەتکردنەوەی داواکارییەکانیان کە بە ئاسانی دەتوانرا جێبەجێ بکرێن، دەستیپێکرد و دوای ئەوەش سربستان کە بەدوای هەلێك بۆ دەستبەسەرداگرتنی دەوڵەتی عوسمانی دەگەڕا، بە پشتیوانی روسیا لەگەڵ بولغاریا و یۆنان هاوپەیمانییەکی دروستکرد و بەو هۆیەشەوە جەنگی باڵکان دەستیپێکرد کە تێیدا دەوڵەتی عوسمانی روومەلی لە کیس چوو.

دیلۆن لە ساڵی۱۹۱۱دا وەهای نوسیوە؛

″رەفتاری تورکیا‌ی گەنج لە ئەلبانی نەك تەنها شایانی بەرگری لێکردن نەبوو، بەڵکو هیچ روونکردنەوە و پاساوێکیشی بۆ نەدەدرا. ئەلبانییەکان لەسەردەمی عەبدولحەمید‌دا دۆستی نزیکی تورکەکان بوون و پاسەوانە متمانەپێکراوانی سوڵتان لە مرۆڤەکانی ئەم نەتەوەیە بوون. ئەو پادشا پیر و فێڵبازە دەیزانی

چۆن رازییان بکات، بەڵام ئەوانەی شوێنی ئەویان گرتەوە لاپەڕەیەکی دیکەیان هەڵدایەوە. دەرمانی هەر دەدرێك لای ئەوان دروستکردنی گوشار بوو. بەکارهێنانی ئەلف و بێی لاتینیان بۆ زمانی ئەلبانی قەدەخە کرد و گوشاریان دروستکرد تا ئەلف و بێی تورکی (ج.چ؛ ئەلف و بێی تورکی کۆن کە بە پیتی عەرەبی دەنوسرا) بەکاربهێنن کە بۆ دەنگەکانی زمانی ئەلبانی گونجاو نەبوو. هەروەها رێوشوێنی بێزارکەریان گرتەبەر بۆ ئەوەی ئەلبانییەکان فێری تورکی بن... ئەلبانییەکان'یش لەم دەستوەردانەی کاروباری ناوخۆییان نیگەران بوون و بەوهۆیەشەوە گرژی لە پەیوەندییەکانی تورك-ئەلبانی'دا دروستبوو. لەبەر گەرمای ئەو بەریەك کەوتنەی کە روویدابوو، لە ماوەیەکی کورتدا ئاگری ناکۆکی نێوان ئەو دوو لایەنە دەرکەوت و توگورت پاشا و یەکە سەربازییەکانی بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینی ئەلبانییەکان رەوانە کران. ئەو ستەم و زوڵمە دڕندانەش کە ئەو ئەنجامیدان، تا چەند جیلی دوای خۆی وەك ئاوەڵناوێکی خراپ مایەوە. لە روانگەی ئەوەوە، بە بێ جیاکاری دۆست و دوژمن، تەنها ئەلبانی بوون بەس بوو بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بکوژرێن. لەو بەینەشدا، دەوڵەتی شاراوە، ئەلبانی'یە موسڵمان و مەسیحییەکان'ی دا بەگژی یەکتریدا و کەسانێکی نارد تا شەڕێکی خوێناوی لە بەینیاندا دروستبکەن. ئەمەش ئەنجامێکی سروشتیی سیاسەتی نەتەوەگەرایی هێرشکار بوو. بەڵام ئەلبانییەکان بە یەکڕیزی مانەوە، چونکە هەموویان سووربوون لەسەر ئەوەی زمان و نەریتە نەتەوەییەکانی خۆیان بپارێزن."

ئەلبانییەکان جگە لە بەکارهێنانی ئەلف و بێی لاتین و پەروەردە بە زمانی زگماکی، هەندێك داواکاری ئیداریشیان هەبوو. ئەوان دەیانویست ئەلبانیای ئەمڕۆ و کۆسۆڤۆ و مەکدۆنیا لە یەکەیەکی ئیداریدا کۆبکرێنەوە و بەوجۆرەش کۆتایی بە دابەشبوونی ئەلبانییەکان بهێنن. تەنانەت پێویست ناکات کە بگوترێت ئەم داواکارییەش لەلایەن زەینییەتی ئیتیحادچییەکانەوە رەتکرا.

کاتێك ئینگلیزێك رەخنە لە ئیتیحادچییەکان دەگرێت، لەوانەیە پێشداوەریی ئینگلیز بەرامبەر بە تورك تێکەڵ بە رەخنەکەی بکات، بەڵام وەختێك رەفتاری تورکیا'ی عوسمانلی لە ژێر دەسەڵاتی ئیتیحادچییەکان بەرامبەر داواکاریی نەتەوەیی ئەلبانییەکان کە لە باڵکانەکاندا نزیکترین لایەن بە ئیستانبوڵ بوون بینرا و تورکیای کۆماری لە ژێر دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی کەمالیست'ی هەمان رەفتاری بەرامبەر کوردەکان کرد، ئەوکاتە دەتوانین بڵێین کە بۆچوونەکانی دیلۆن لە ساڵی ١٩١١ و توێنبی لە ساڵی ١٩٢٦، لە پێوەرێکی گەورەدا لە جێی خۆیان بوون.

ئەو تورکیا'ی کۆمارییەی کە دیلۆن بە"تورکیا'ی گەنج"ناوی دەبات و لە قۆناغی کۆتایی عوسمانی'دا هەبووە، بە بەراورد لەگەڵ ئیمپراتۆریا، لە جوگرافیایەکی بچوك و بەرتەسکتردا بەرپا بووە و بە هەمان زەینییەتەوە کە بە میراتی وەریگرتووە دەوڵەتی نوێی دامەزراندووە. لەو دەوڵەتە نوێیەدا کە ئەرمەنەکانی

پاکسازی کراو و ڕۆمەکان کەم کراونەوە و بێ کاریگەر کران بولغارەکانیشی نەمان، لە بەشێکی جوگرافیای بچووککراوی وڵاتدا، کوردەکان وەك ئاستەنگێکی گەورەی جەماوەری لەبەردەم جێبەجێکردنی زەینییەتی"تورکیا‌ی گەنج"ی قۆناغی کۆتایی دەوڵەتی عوسمانلی دەرکەوتن.

لە ڕاستیشدا"تورکیا‌ی گەنج"دروستنەکرا و لەگەڵ خۆیشیدا کۆتایی دەوڵەتی عوسمانلی هێنا. خواستە یان ناخواستە کێشەی کورد بوو بە کێشەیەکی هەبوونیی بۆ کۆماری گەنج کە هەمان زەینییەتی جارانی بە میرات وەرگرتبوو. لەم ڕوانگەیەشەوە، جیاوازی بنەڕەتی بیروبۆچوونی کوردەکان سەبارەت بە پێگەی خۆیان لەنێو تورکیا چەندە شتێکی ئایدۆلۆژیك بێت، بەهەمان ئەندازە داواکاری کوردەکان‌ی تورکیا لە دیدگای دەوڵەتی تورك‌ەوە شتێکی ئۆنتۆلۆژیك (هەبوونی)ە. هەتا ئەوکاتەی پێداچوونەوە بەسەرتاپای بنەماکانی دامەزراندنی کۆماری تورکیا نەکرێت و بەگوێرەی دینامیکەکانی سەدەی بیست و یەکەم تازە نەکرێنەوە، نە کێشەی کورد چارەسەر دەکرێت نە دەتوانرێت ڕێگا لەو گرفتانە بگیرێت کە بەو هۆیەوە دروست دەبن.

ساڵی ٢٠٠٩، بەهۆی ئەو شتەی کە پێی دەگوترا"کرانەوە"، دواجار هیوایەك بۆ چارەسەکردنی کێشەی کورد پەیدابوو، بەڵام زۆری پێنەچوو کە ئەویش بە هەمان هۆکار نەما و هەوڵەکانیش گەیشتنە بنبەست.

لە ئەیلوولی ٢٠٠٨دا لەنێو ڕۆژنامەنوسانەکانی یاوەری عەبدوڵا گویل سەرکۆماری تورکیا بووم کە بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەی ساڵانەی نەتەوەیەکگرتووەکان، بۆ نیۆیۆرك دەچوو. دوای پشوویەکی کورت لە ریکافیك پایتەختی ئایسلەندا، گەیشتینە نیۆیۆرك و لە هۆتێلی مێژوویی پلازا لەسەرەتای شەقامی پێنجەمی"سەنتەراڵ پارك"دا جێگیربووین. لە پێشوازی هۆتێلەکەدا، ڕوخسارێکی ئاشنا، بەهەرۆز گەلاڵی کە چەندین ساڵ لە ئەنقەرە نوێنەرایەتی جەلال تاڵەبانی کردبوو، هاتبوو تا لەگەڵ خۆیدا من بۆ لای جەلال تاڵەبانی بەرێت.

تاڵەبانی لە سووچی خوارەوەی باشووری نیۆیۆرك، لە هۆتێلێکدا لە"باتەری پارك"شوێنی گرتبوو. لە ژوورەوەکەیەوە دیمەنێکی بێ کۆتایی دەریا دیاربوو. لەوێوە پەیکەری ئازادی ئەوەندە نزیك دەهاتە بەرچاو کە پێتوابوو ئەگەر دەستت درێژ کەیتەوە پێی دەگات. لەنێو ژوورەکەدا زۆرێك لەو وەزیرانەی عێراق هەبوون کە نەفرەتیان لە تاڵەبانی دەکرد. دوای ئەوەی گفتوگۆیەکی گەرممان لەسەر قۆناغی کۆتایی ئیمپراتۆریای عوسمانی کرد، وەزیرەکان ڕۆیشتن و کاتێ من و ئەو بە تەنها ماینەوە، تاڵەبانی بابەتێکی"نهێنی"بۆباس کردم.

وتی؛"دیسان لەنێوانیان دام. بۆ دیداری چارەسەری کەوتوومەتە بەینی پ.ك.ك و حکومەتەکەی ئێوە."دواتر ئاماژەی بە قۆناغەکەی کاتی تورگوت ئۆزال کرد کە هەردووکمان تێیدا بەشدار بووین و

وتی؛"نامەوێ وەك جاری پێشوو بێت. لەبەر ئەوەی جاری پێشوو دەمم سووتا، ئەمجارەیان فوو لە ماست دەکەم ئەوسا دەیخۆم. بە بیرت دێتەوە، کاتێ ئیشەکان گەیشتنە بنبەست، وەك ئەوەی کە من بەرپرسیار بم زۆر شتیان پێ گوتم و سوکایەتییان پێ کردم. پێیانگوتم ئەمە کەسێکی بێ بنەمایە و هەرساتێك بەلایەکدا دەیشکێنێتەوە... بەس ئەمجارەیان لە رێگەی سەرۆك وەزیر تایب ئەردۆغان'ەوە هەموو ئەو هەنگاوانە کۆنترۆڵ دەکەم کە دەنرێن. کاتێك گفتی ئەوەم لەسەرۆك وەزیر تایب ئەردۆغان وەرگرت کە ئاگای لە هەموو شتێك هەیە، دەجوڵێمەوە. کاری خۆم قایم کردووە. ئەمجارەیان ناتوانم تەحەموولی سووکایەتی بکەم."

هەرچی بێت ئەو جیاواز لە جاری پێشوو، ئیدی سەرکۆمارێك بوو.

بەپێی ئەو زانیارییانەی کە جەلال تاڵەبانی دای، ئەمرە تانەر راوێژکاری میت بە ئاگاداری تایب ئەردۆغان، لەگەڵ خۆی و دواتریش لەگەڵ مەسعود بارزانی'دا قۆناغێکی دەستپێکردبوو. بۆ ئەوەی ئەوەی دیدار و پەیوەندی لەنێوان بەرپرسانی پ.ك.ك و دەوڵەتی تورکیا ساز بکرێت، تاڵەبانی ناوبژیوانیی دەستپێکردبوو و لە ئەورووپا'ش لە بەینی لایەنەکاندا دیدار و چاوپێکەوتن دەکرا.

دوای لێکردم ئەو زانیارییە لای خۆم بە نهێنی بهێڵمەوە. منیش وتم؛"پێموانییە گرفت لە دروستکردنی پەیوەندی پ.ك.ك و دەوڵەتی تورکیا هەبێت. لەنێو پ.ك.ك'دا کەسێك لە عەبدوڵا ئۆجالان بڕیاربەدەست و کاربەدەستتر نییە. ئەویش ئێستا لە ئیمرالی'دایە. قەد بیرم لەوە نەکردۆتەوە کە سەربازەکان و بەرپرسانی دەوڵەتی تورك دیداری لەگەڵ ناکەن. لەوانەیە کێشەکە لە پچڕانی پەیوەندییەکاندا بێت..."

لەگەڵ ئەوەشدا تاڵەبانی جەختی کرد کە ئەو رووداوانەی خۆی تێیدا رۆڵی هەیە، قۆناغێکی تازەیە. دواتر پرسیاری بۆچوونی منی کرد سەبارەت بەوەی کە تەوەرەکانی دیداری خۆی و عەبدوڵا گویل چی بێت کە دوو رۆژی دواتر لە نیۆیۆرك ئەنجام دەدرا. بۆ یەکەمجار سەرکۆماری تورکیا و یەکەم سەرکۆماری عێراق'ی دوای سەدام لە نیۆیۆرك لەگەڵ یەك کۆ دەبوونەوە.

تاڵەبانی دەیویست عەبدوڵا گویل بانگهێشتی بەغدا بکات و لەوێوە بیبات بۆ کوردستانی عێراق و تەنانەت لەگەڵیدا سەردانی کەرکوك بکات. لەوەش زیاتر، بۆ ئەوەی تەنها روخساری پەیوەندییەکی تایبەتی کورد – تورك دروست نەکەن، دەیویست عەبدوڵا گویل ببات بۆ نەجەف شاری پیرۆزی شیعەکان کە ئایەتوڵا ئەلعوزما سیستانی مەرجەعی باڵای دینی لەوێ بوو. بەڵام نیەتی راستەقینەی تاڵەبانی ئەوە بوو کە سەرکۆماری تورکیا بۆ کوردستانی عێراق ببات.

نزیکەی شەش مانگ دوای ئەوە، لە ١٠ی مارتی ٢٠٠٩دا لەگەڵ عەبدوڵا گویل سەرکۆماری تورکیا بەرەو تاران دەفڕین. سەرکۆمار وەك ئەوەی کە هەموو جارێ دەیکرد، لەکاتی فڕیندا لەگەڵ سێ رۆژنامەنوسدا

قسەی دەکرد کە یەکیان من بووم. ئامانجی سەردانەکەی تاران، کۆبوونەوەی لوتکەی ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری بوو، بەڵام لایەنە دیپلۆماتییە نێودەوڵەتییەکان مەراقیان دەکرد کە بزانن ئایا عەبدوڵا گویل لە پەراوێزی ئەو سەردانەدا هەوڵی ناوبژیوانی ئێران - ئەمریکا سەبارەت بە کێشە ئەتۆمییەی ئێران دەدات یان نا. ئەوکاتەی وەزیری دەرەوە بوو، عەبدوڵا گویل لەم ڕووەوە هەندێك دەستپێشخەریی کردبوو. گفتوگۆی نێو فڕۆکەکە لەسەر ئەو بابەتە گەرم ببوو کە سەرکۆمار قسەی هێنایە سەر کێشەی کورد و وتی؛"بەمزووانە شتی باش ڕوودەدەن."

ئەو چوار وشەییەی ئەو، تورکیای هەژاند و ڕۆژی دواتریش لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ تورکیا داوام لێکرد کە تۆزێك زیاتر ئەو ڕستەیەی خۆی ڕوونبکاتەوە. ئەویش لە وەڵامدا وتی؛"با وەك خۆی بمێنێتەوە. ئەگەر زیاتر ڕوونی بکەمەوە، لەوانەیە زیان بەو شتە باشانە بگەیەنین کە وتم ڕوودەدەن..."

لە کۆتایی تەمووزی ٢٠٠٩دا، لە باخچەسەرای (موکوس) وان لە بن ئەو چیایانە بووم کە ڕێگایەکی سەختیان هەیە و هەشت مانگی ساڵ پەیوەندی لەگەڵ دنیای دەرەوە نامێنێت. شەوی ٢٩ی تەمووز گەڕامەوە بۆ وان. باسی کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانی بەشیر ئاتاڵای وەزیری ناوخۆ لەوێ گەرم بوو. بەتەواوی نەمزانی کە چی وتووە، بەڵام لە چوارچێوەی قسەکەی عەبدوڵا گویل کە وتبوی شتی باش ڕوودەدەن، دیاربوو کە شتی باش ڕوویدەدا.

بەیانیی زووی ڕۆژی ٣٠ی تەمووز لە وان بەرەوە دۆغوبایەزید لە تەنیشت چیای ئاگری بە ڕێکەوتم و چاوێکم بەو ڕۆژنامانەدا خشاندەوە کە لە مورادیە دەستم کەوتبوون. بەشیر ئاتاڵای باسی ئەوەی کردبوو کە حزبەکەی پابەندی ڕوونکردنەوەکەی سەرۆك وەزیر ئەردۆغانە کە ساڵی ٢٠٠٥ لە دیاربەکر سەبارەت بە کێشەی کورد دابووی و وتبووی حزبەکەیان هەموو کاتێك کێشەی کوردی بەلاوە گرنگە. باسی"کرانەوەی"کردبوو و جەختی لەوە کردبوو کە"دەرفەتی گەورە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەبەردەمدایە و لەنێو حکومەت و دامودەزگاکانی دەوڵەتدا ڕێککەوتنێك هەیە بۆ ئەوەی وردەکارییەکانی ئەم بابەتە دەستنیشان بکرێن."

جگە لەوە، بەشیر ئاتاڵای وتبووی؛"دەمانەوێت چارەسەرێکی تایبەت بە تورکیا کە لە دنیادا ببێت بە نموونە پێشبخەین."و باسی ئەوەشی کردبوو کە لە ماوەیەکی نزیکدا لەگەڵ ئەوە کەسانەی لەو بوارەدا بیرکردنەوەیان هەیە و کاریان کردووە کۆبوونەوەی جۆراوجۆر ئەنجام دەدەن.

زۆرێك لە ناسیاوەکانم لە دۆغوبایەزید سەبارەت بە ڕوونکردنەوەکانی ڕۆژی پێشووی ئاتاڵای پرسیاری بیروبۆچوونی منیان کرد. قسەکانی دە مانگ لەوەو بەری جەلال تاڵەبانی لە نیۆیۆرك و قسەکانی چوار مانگ بەر لەو کاتەی عەبدوڵا گویل لە ڕێگای تاران هەبوون، بەڵام بەو ئەندازەیەی کە نەزانم دەیانەوێت

چی بکەن، لە کۆلیسەکانی ئەنقەرە دوور بووم.

لە دۆغوبایەزید'ەوە بە سەیرکردنی کەناری خۆرئاوای دەریاچەکەی بەرەو وان گەڕامەوە. بەرەو تاتوان دەڕۆیشتین کە لە ئەنقەرە'وە تەلەفۆنم بۆ کرا. بانگهێشتی کۆبوونەوەیەك دەکرام کە لە١ی ئاب لەلایەن بەشیر ئاتالای وەزیری ناوخۆ سەبارەت بە"کرانەوە"سازدەکرا.

ئەوکاتەی لە زانکۆی ئەرزڕووم مامۆستای یاریدەر بووم، بەشیر ئاتالای'م دەناسی. هەروەها لە ساڵی ١٩٨٢دا لەنێو وەفدی تورکیا بۆ بەشداریکردن لە سێیەمین ساڵیادی شۆڕشی ئیسلامی ئێران، پێکەوە سەردانی ئەو وڵاتەمان کردبوو.

بەیانیی ڕۆژی ١ی ئاب، کاتێ گەیشتمە ئەکادیمیای پۆلیس لە ئەنقەرە، پێیان ڕاگەیاندم کە بەشیر ئاتالای لە وەزارەتی ناوخۆ چاوەڕوانیی من دەکات. چووم بۆ ئەوێ. ئاتالای پێی گوتم؛"وتوومە لەوانەیە بابەتێك هەبێت کە حەز نەکەی لە کۆبوونەوەکەدا باسی بکەیت و بتەوێت بە تایبەتی پێم بڵێی، بۆیە ویستم یەکتر ببینین."بۆ ماوەی سەعاتێك قسەمان کرد. بەڵام لەبەر ئەوەی شتێك نەما بوو کە لەسەر کێشەی کورد نەینوسم و باسی نەکەم، هیچی تایبەتم پێ نەگوت. بەڵام وتم تەنها هۆشدارییەکی بچووکم هەیە؛"ئەم هاوینە لە زۆرێك لە شوێنەکانی ناوچەکە بووم. ئەوکاتەی بانگهێشتەکەی ئێوەم پێگەیشت لە دەوروبەری وان بووم. چاوەڕوانییەکی زۆر گەورەتان لەنێو خەڵکی کورددا دروستکردووە، پێویستە جێبەجێی بکەن. ئاستی چاوەڕوانییەکانتان بەرزکردۆتەوە ناتوانن پاشەکشەي لێبکەن. چونکە ئەو چاوەڕوانییە گەورەیەی کە ئێوە ڕێگاتان بۆ کردۆتەوە، نەیەتە دی و ببێتە هۆی تێکشانی هیواکان، ئەوکاتە ئەنجامەکانی زۆر قورس دەبن."

ئەویش پێی وتم؛"سەرۆك وەزیر سیاسەتمەدارێکی زۆر جیاوازە و حیسابی سیاسیی هەیە و سەبارەت بەکرانەوە'ش ریسکی وەرگرتووە. دەبێ کەسانی وەك ئێمە وەرەی پێ بدەین."

منیش لە وەڵامدا وتم؛"پێویستە دڵنیا بێت لەوەی کە پشتیوانی هەموو هەنگاوێکی بوێرانەی سەبارەت کێشەی کورد دەکەین."

کۆبوونەوەکەی ئەکادیمیای پۆلیس، کاردانەوەی زۆری نەتەوەگەراکانی تورك'ی لێکەوتەوە. دەوڵەت باخچەلی سەرۆکی پارتی بزووتنەوەی نەتەوەپەرست، هەر لەو ڕۆژەدا بەشداربووانی کۆبوونەوەکەی بە"دوانزە پیاوە خراپەکە"ناوزەد کرد. نزیکەی ١٥-١٦ کەس بەشداری کۆبوونەوەکەیان کردبوو و ناکرێت بگوترێت کە بۆ ئەو کۆبوونەوەیە، هەموویان کەسانی لە جێی خۆیاندا بوون. کەسانێك هەبوون کە هیچ پەیوەندییەکیان بە کێشەی کوردەوە نەبوو، کارێکی ئەوتۆیان لەوبارەیەوە نەکردبوو. هەندێك نوسەر و ئەکادیمی و نوێنەرانی ئەنقەرە'ی ژمارەیەك لە ڕۆژنامە دیارەکانی تێدا بوون. لەبەر ئەوە، گومانم نەبوو

لەوەی کە یەکێك لەو کەسانەی باخچەلی بە"دوانزە پیاوە خراپەکە"ناوی بردبوون، من بووم.

زۆربەی بەشداربووان زیاتر لە جارێك قسەیان کرد و منیش دووجار قسەم کرد. بە رای خۆم ئەو شتە گرنگەی لە کۆبوونەوەکەدا باسم کرد، ئەوە بوو کە"پێویستە رێککەوتنی مێژوویی کورد - تورك نوێ بکرێتەوە و رێککەوتنێکی کۆمەڵایەتی بکرێت."ئەوەشم وت کە تەنانەت دەکرێت"ئەو رێککەوتنەی لەگەڵ ئیدریسی بتلیسی کرابوو، نوێ بکرێتەوە."

بەڵام درکم بەوە کرد کە بەتەواوی لە مەبەستی قسەکانم تێنەگەیشتوون.

سیاسەتی تورکیا سەبارەت بە کێشەی کورد، لەسەر ئەو سیاسەتانە بونیاتنرابوو کە لە قۆناغی کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی پێڕەو کرابوون. لەبەر ئەوە، بۆ تێگەیشتن لەو سیاسەتانەی کە ئەمڕۆ جێبەجێ دەکرێن، پێویستە چاوپێداخشانێك بە رووداوەکانی سەردەمی عوسمانی تا رۆژی ئەمڕۆ بکرێت.

ئیمپراتۆریای عوسمانی لەسەرەتاکاندا خۆی بەسەر ئەو خاکانەدا زاڵ نەکرد کە کوردەکان تێیدا دەژیان و خێڵەکانی خۆیان لەوێ رێکخستبوو. بە مەرجێك کە باج بدەن و لەکاتی جەنگ، یارمەتیی سەربازی بدەن، سەربەخۆیی بە میرنشینە کوردییەکان دابوو. سوڵتانەکانی عوسمانی، لەو شوێنەی کە لە خۆرهەڵات بە کوردستان ناو دەبرێت، رێگای رێککەوتن لەگەڵ خێڵ و بەگەکانی کورددا گرتبووە بەر و وا بیریان کردبووەوە کە دەتوانن بەوجۆرە لە کوردستان زاڵ بن. هەروەها وایان دانابوو کە لەو رێگایەوە دەتوانن کوردەکان کە زۆربەیان سوننە مەزهەبن، لەبەرامبەر دەوڵەتی سەفەوی بەکاربهێنن کە مەزهەبی شیعەی وەك دینی رەسمی ئێران دانابوو. دروستکردنی ناکۆکی و رێگرتن لە دروستکردنی یەکەیەکی سیاسی و بەگژ یەکترەدانی خێڵەکان، سیاسەتی بنەڕەتی دەوڵەتی عوسمانی بوو.

سیاسەتی"پەرت کە و زاڵ بە"ی عوسمانی بۆ رێگرتن لە یەکێتی سیاسی کوردەکان، لەنێو ئەو میراتانەدا بوو کە لە دەوڵەتی عوسمانی‌وە بۆ کۆماری تورکیا بە جێ مابوو.

لەگەڵ ئەمەشدا سیاسەتی زاڵبوون بەسەر کوردستان لە رێگەی سوننەگەرایی و بەکارهێنانی کوردستان وەك ناوچەیەکی قەدەخەکراو لە دژی ئێران، وایکردبوو کە سازش و رێککەوتن لەگەڵ کوردەکان‌دا بکرێت. ئەو رێککەوتنەش لە سەدەی شانزەدا لە رێگەی ئیدریسی بتلیسی کە لە کۆشکی عوسمانی کاری دەکرد، لەنێوان دەوڵەت و بیست و پێنج میرنشینی کوردی‌دا کرا کە پابەندبوونی خۆیان بە دەوڵەت راگەیاندبوو. سوڵتان سەلیم ( یاوز) لەبەرامبەر بەڵینی میرەکان بۆ ئەوەی دژی دەوڵەت رانەپەڕن و سنوری میرنشینی خۆیان فراوان نەکەن، مافی پێ دابوون کە پارە لێ بدەن و بەناوی ئەوانەوە خوتبەی نوێژی هەینی بدرێت.

بەڵگەیەکی مێژوویی کە لە سەدەی شانزەدا تیشکی خستۆتە سەر پەیوەندی کورد و عوسمانی، فەرمانێکی سوڵتان سولەیمانی عوسمانی( قانوونی) یە کە بە"حوکمی شەریف"ناوزەد دەکرێت. ئەوکاتەی لەنێو

جوڵانەوەی دیموکراسی نوێ بووم و لە ساڵی ١٩٩٤دا کارم لەسەر دروستکردنی هەڵوێستێکی جوڵانەوەکە لەبارەی کێشەی کورد دەکرد، راپۆرتێکم پێگەیشت کە"حوکمی شەریف"ی تێدا بوو کە دوابەدوای رێککەوتنی ئیدریسی بتلیسی و دەوڵەتی عوسمانی دەرکرابوو. بەوجۆرەش"حوکمی شەریف"م لەنێو ئەرشیفە شەخسییەکانی خۆمدا هەڵگرت.

"حوکمی شەریف"کە ئەسڵەکەی لە مۆزخانەی تۆپ کاپی دایە، لە هەندێك شوێندا وەرگێڕدراوەتە سەر تورکیی ئەمڕۆیی و بەمجۆرەی خوارەوەیە؛

"... بەهۆی ئەوەی بەگەکانی کورد کە لەکاتی یاوز سوڵتان سەلیم لە دژی قزڵباشەکان خزمەتی باشیان کردووە و ئێستاش راستەوخۆ خزمەتی دەوڵەت دەکەن، بە تایبەت... و ئەمجارەش بەشداری ئەو لەشکرکێشیەیان کرد کە بۆ ئێران کرا و لە شکستدانی قزڵباشەکان'دا سوودێکی زۆریان گەیاندووە و دلاوەری و خزمەتێکی باڵایان بە دەوڵەت کردووە، هەورەها لەبەر ویست و داواکاری خۆیان، ئەو ویلایەت و قەڵایانەی لە زووەوە لە ژێر دەستیاندایە و وەك وڵات و شوێنی خۆیان بووە، بە جیا جیا پێیان دەبەخشرێت و ئەو ویلایەت و قەڵا و شار و گوند و مەزارانەی کە لە دەستیاندایە بە هەموو داهاتەکانیانەوە، بەجۆرێک کە لە باوکەوە بۆ کوڕ بمێنێتەوە لەسەریان تەملیك دەکرێت و پێیان دەبەخشرێت. بۆیە پێویستە ناکۆکی و گرژی لە بەینیاندا نەبێت و لە دەرەوە دەسدرێژی نەکرێتە سەریان. ئەم فەرمانە پیرۆزە شاهانەیەش بەهیچ جۆرێك دەسکاری ناکرێت.

کاتێك کە بەگ دەمرێت ویلایەتەکەی لەناو ناچێت و بە هەموو سنورەکانی خۆیەوە، بەپێی موڵکنامەی شاهانە بۆ کوڕەکەی دەمێنێتەوە و ئەگەر زیاتر لە کوڕێکیشی هەبێت، قەڵا و شوێنەکان لە بەینیان دابەش دەکرێت. ئەگەر کوڕەکان لە بەینی خۆیان رێك نەکەوتن، بەگەکانی کوردستان چۆن بە گونجاوی بزانن وا دەبێت و بە هەمانشێوە خاوەندارێی موڵکەکە هەتاهەتایی دەبێت. ئەگەر بەگ، کەسێکی میراتگری نەبێت و بە بێ خزم و کەس و کار مردبێت، ویلایەتەکە نادرێت بە کەسێکی بیانی یان کەسێکی دەرەوەی ویلایەتەکە، بەڵکو لەگەڵ بەگەکانی کوردستان گفتوگۆ دەکرێت و لەنێو بەگ یان بەگزادەکانی ناوچەکەدا کێ بە گونجاو بزانن، ویلایەتەکە بەو دەدرێت."

دەکرێت ئەم فەرمانە وەك بەڵگەیەکی ئۆتۆنۆمی کوردستان لەو قۆناغەدا لە قەڵەم بدرێت. لە ماوەی سێ سەدەی نێوان سەدەی شانزە تا سەدەی نۆزدەدا، کوردەکان ئۆتۆنۆمییەکی وایان لەنێو ئیمپراتۆریای عوسمانی دا هەبووە. ئەو ماف و ئیمتیازانەی کە بەهۆی"حوکمی شەریف"ی قانوونی بەدەستیان هێنابوو، لەگەڵ هاتنی قۆناغی تەنزیمات یان سنوردارکران یان هەڵوەشێنرانەوە و بەوهۆیەشەوە لە رێگەی راپەڕینی بەدرخانییەکانەوە، سەرهەڵدانی کوردەکان دەستپێکرد.

کۆمار'یش لەبەر ئەوەی لە جەوهەری خۆیدا چرووتژەی دەوڵەت - نەتەوە'ی تورك بوو، ئەو ڕێککەوتنە نارەسمییەی بەتەواوی هەڵوەشاندەوە کە مێژووەکەی بۆ سەدەی شانزە دەگەڕایەوە. لە ئەنجامی ئەمەشدا لە ماوەی تەمەنی کۆماردا ڕاپەڕینی کوردەکان لە شێوەی جۆراوجۆردا دەرکەوتووە.

لە ساڵانی ۲۰۰۰کانیشدا کە کوردەکان ڕێگایەکی زۆریان لە پرۆسەی نەتەوەسازی خۆیاندا بڕیبوو، پێویستی بە ڕێککەوتنێکی نوێی کورد - تورك هەبوو. ئەوەی لە یەکەم کۆبوونەوەی"کرانەوە"دا دەمویست باسی بکەم ئەمە بوو.

هەڵبەت پێویستبوو ڕێککەوتنی نوێ، جیاواز لەو ڕێککەوتنەی کە لە سەدەی شانزەدا بە هۆکاری مەزهەبی کرابوو، شتێکی سیکۆلار بێت. تورکیا ئەگەر نایەوێت بچوك ببێتەوە و ئەگەر نایەوێت لە رووی جوگرافی و مرۆییەوە دابەش بێت و ئەگەر خوازیارە خۆی گەورە و فراوان بکات، پێویستە گۆڕانکاری پێکهاتەیی و وەرچەرخانی ریشەیی ئەنجامبدات.

لە واتایەکی دیکەدا پێویستە چەمکی کۆماری تورکیا، لەسەر بنەمایەك کە تێدا کوردەکان بە یەکسانی هەبن و بژین، نوێ بکرێتەوە.

## ٢٥

# خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەرەو کوێ دەڕوات؟

■ ■ ■



**لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست شوێنی هەموو کەس دەبێتەوە، بەڵام جێی فرەخوازییەکانیان نابێتەوە.**

**کەمال جونبەڵات**

تەنها چەند خولەکێك بوو کە هەتاو دەرکەوتبوو. یەکەم پرشنگەکانی بەیانیی رۆژی ٦ی نیسانی ٢٠١١ بەسەر شام'دا کەوتبوون. کاتێك لە فڕۆکەخانەوە بەرەو ناو شار دەڕۆیشتین، وەك ئەوە وابوو کە ژیان بە تازەیی گیانی بگرێت. من لەلای چەپی بەشی دواوەی ئۆتۆمبیلەکەوە رووم لە جامەکە کردبوو و لە بێدەنگی رازداری بەیانیی ئەو رۆژە بەهارییەدا بەرەو ئاسۆی باشووری خۆرئاوا، سەیری سێبەر و دیمەنی خەیاڵاوی جەبەل شێخ'م دەکرد. خۆشحاڵییەکی نائاسایی و ئارام دەروونمی داگرتبوو.

هەموو کات چیاکان لە مندا هەیەجان و جۆش و خرۆشیان دروستکردووە. ئەو وەختەی مناڵێکی بچووك بووم، لەکاتی خوێندنی ناوەندیدا چوار ساڵی تەمەنم لە ناوچەیەکی بناری چیای ئەرجیەس تێپەڕ کردبوو. ئەرجیەس سێ لوتکەی هەبوو کە وەك ددانی تیژ بوون و هەموو کاتێ بەفریان پێوە بوو. لەسەرهەڵدانی دەشتاییەکانی ئەنادۆڵی خۆرهەڵات بەرەو ئاسمان دەچوو. لەوانەیە شان و شکۆی ئەو چیایە سەرسامییەکی وای لە مندا دروستکردووە کە هەرکاتێك چیایەکی بەرز دەبینم، عەشقی چیا لای من تازە دەبێتەوە.

لە دۆغوبایەزید چیای ئاگری'م بینی. دواتر لە ئێران لەلای ماکۆ سەیریم کرد و پاشان لە ئیغدر و دواتریش کاتێك بەرەوە ئازەربایجان دەفڕیم، لە ئاسمانەوە تەماشای ئەو چیایەم کرد. جگە لەوانەش لە نەخجەوان'ەوە سەیریم کرد و پاشان، کاتێك بە کۆپتەر بە ئاسمانی ئەرمەنستان'دا دەفڕیم، لە ئێریڤان'ەوە سەیری ئاگری'م کرد. لە هەموو لایەکەوە سەیریم کرد و لە ژێر کاریگەری ئەفسوناوی ئەو چیایەدا مامەوە.

لە هەموو لایەکی دەریاچەی وان'ەوە سەیری چیای سوبحان'م کرد و چێژێکی تایبەتم لە بینینی وەرگرت. هەموو رۆژێکی نوێ لە وان - ئەدرەمیت، لە یەکەم ساتەکانی بێداربوونمدا چاوەکانم سۆراخی ئەویان دەگرت. کاتێك بەرزاییەکانیشیم دەبینی نەمدەتوانی نیگای خۆمیان لێ دوور بخەمەوە.

چیاکانی هەککاری. چراڤ کە ئەروە پاڵی پێوە داوە. جودی لە تەنیشت سلۆپی. گابار لە خۆرئاوای شڕناخ. چیا جوانەکانی کوردستانی عێراق. چیاکان...

بەدەر لەوانەش جەبەل شێخ. لە ساڵانی گەنجی، چی ئەو کاتانەی لەنێو جوڵانەوەی فەلەستین بووم، چی ئەو وەختانەی لەبەرزاییەکانی گۆلان لە سوریا بووم، یان لەو رۆژانەدا کە لە باشووری لوبنان لەنێو کەمپی فیداییەکان بووم، هەر کاتێ چاوم دەبڕییە ئەم چیا سیحراوییەی کتێبی پیرۆز، بەجۆرێک خۆشحاڵ دەبووم کە مومکین نییە بتوانم گوزارشتی لێ بکەم. هەرجارێك پێم نابێتە ئەو خاکانەی کە ئێستا ئیسرائیل'ی پێ

دەگوترێت، هەرچیم کردبێت رووم کردۆتە باکووری فەلەستین و چوومەتە سەر گردەکانی گۆلان و لەوێوە سەیرکردنی چیای جەبەل شێخ'م وەك مەراسیمێك بۆ خۆم جێبەجێ کردووە. جەبەل شێخ لای من، هەمان خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بوو.

رۆژێك بەر لەوە، لەگەڵ ئەحمەد داودئوغڵو وەزیری دەرەوە، لە هەمان سەعاتدا بە فڕۆکەیەکی بچووك لە تورکیا بەرەوە بەحرەین رۆیشتبووین. لە بەیانیی زووی ئەو رۆژەدا کە بە رێکەوتین، کەسمان نەماندەزانی رۆژی دواتر سەردانی شام دەکەین. بڕیاربوو هەر ئەو شەوە بگەڕێینەوە. بەڵام هێشتا تایەی فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی ئەسەنبۆغا دەخولایەوە و ئێمەش بەتەواوی شوێنی خۆمان نەگرتبوو کە داودئوغڵو فەرمانی بە بیرۆکراتێکی وەزارەتەکەی دا و گوتی؛"هەر ئێستا تەلەفۆن بۆ باڵیۆزخانەی خۆمان لە شام بکەن، ئەگەر بەشار لەوێیە با بەیانی دیداری لەگەڵ بکەم. دیدارێك وەربگرن. با ئەمشەو لە بەحرەین'ەوە بێینە شام و لەوێ بمێنینەوە."ئەو شەوە لە جیاتی ئەوەی بچینە شام، بە بڕیارێکی کتوپڕ بەرەو دۆحەی پایتەختی قەتەر رۆیشتین. داودئوغڵو بڕیاریدابوو لە دۆحە لەگەڵ شازادەی جێنشینی قەتەر و مەحمود جبریل کەسی دووەمی ئۆپۆزیسیۆنی لیبیا دیدار بکات.

ئاگری جەستەی دەسفرۆشێکی تونسی بەناوی محەمەد بوعەزیزی کە چەند مانگ پێشتر خۆی سووتاندبوو، وەك بڵێسەی شۆڕشی عەرەبی سەرەتا باکووری ئەفریقا و دواتریش خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی گرتەوە. لە ماوەیەکی کورتدا دیکتاتۆرییەکانی تونس و میسر کە بە"دایکی دنیا"دەناسرا رووخێنران. ئەو خۆپیشاندانە گەورە جەماوەرییانەی کە لە ٢٠١١/١/٢٥ دا لە مەیدانی تەحریر دەستیانپێکرد، لە ٧ی شوباتدا میسر'یان گۆڕی و دواتر بەرەو لیبیا پەلیان هاوێشت. شۆڕشی عەرەبی گەیشتبووە یەمەن لە خوارترین شوێنی نیمچە دوورگەی عەرەبستان و دەربازی بەحرەین ببوو و لە دەرگای سوریا'یشی دەدا.

تورکیا کە لەگەڵ ساڵانی ٢٠٠٠کان و هاوکات لەگەڵ رووداوەکانی دوای جەنگی عێراق وەك هێزێکی ناوچەیی لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا جێی خۆی دەگرت، لە جوغرافیای عوسمانلی دا جموجۆڵێکی زۆری دەستپێکردبوو. هاوشێوەی ناسر لە میسر کە ساڵانی ١٩٥٠-١٩٧٠کان مۆری خۆی لە دنیای عەرەبی دابوو، ئەستێرەی بەختی تایب ئەردۆغان بەجۆرێک کە نسیبی کەسی دیکە نەببوو دەدرەوشایەوە. لە تونس و لەوەش گرنگتر لە میسر پشتیوانی لە شۆڕی عەرەبی کرد کە سەرکەوتنی بە دەستهێنا.

ئەحمەد داودئوغڵو کە وەك ئەندازیاری گەڕانەوەی تورکیا بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەجۆرێک کە پێکەوەبوونی سەدان ساڵەی عوسمانلی بەبیربهێنێتەوە سەیر دەکرا، لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕشی عەرەبی جموجۆڵەکانی خۆی زیاتر کردبوو و بەشێکی زۆر کاتەکانی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەسەر دەبرد. سەردانەکەمان بۆ قەتەر کە پەیوەندی بە لیبیا و بەحرەین هەبوو، هەروەها رۆیشتنمان بۆ سوریا ئەویش

لەکاتێکدا کە هێشتا ٢٤کاتژمێر بەسەر دەرکەوتنمان لە تورکیا تێپەڕ نەببوو، نمونەیەکی ئەو جموجۆڵە بوو. سوریا وەك دەروازەی سەرەکی کرانەوەی تورکیا بە رووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست گرنگییەکی تایبەتی هەبوو.

شۆڕشی عەرەبی بە تازەیی لە دەرگای سوریا'ی دابوو. ئەوکاتەی لە بەیانیی ٦ی نیساندا ڕێگای شام'مان گرتەبەر، هێشتا مانگێك بەسەر تەقینەوەی ڕووداوەکانی سوریا تێپەڕ نەببوو. ئاڵۆزییەکان لە ١٥ی مارت بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لە شاری دەرعا لە سنوری ئوردن سەریانهەڵدا. ئەو خۆپیشاندانەش کە لە ناوەڕاستی شام لە دەوروبەری مزگەوتی ئەمەوی ئەنجامدرابوو، بەزوویی ڕێی لێ گیرا و بڵاوەی پێکرا.

بەپێی ئەزموونی چل ساڵەی خۆم، دەمتوانی درك بەو ئەنجامانە بکەم کە گەیشتنی دینامیکی شۆڕشی عەرەبی بە سوریا ڕێگای بۆ خۆش دەکردن.

هێشتا دوو هەفتە بەسەر ڕووداوەکانی دەرعا تێپەڕ نەببوو کە لەگەڵ تایب ئەردۆغان سەردانی عێراق'مان کرد. دوای سەردانی بەغدای پایتەخت دەربازی نەجەف شاری پیرۆزی شیعەکان بووین و لەوێ سەردانی مەزاری حەزرەتی عەلی'مان کرد و دوابەدوای بینینی ئایەتوڵا ئەلعوزما عەلی سیستانی، دەمەو ئێوارە بەرەو هەولێر ناوەندی حکومەتی هەرێمی کوردستان'ی عێراق فڕین. ئەمەش یەکەمجار بوو کە سەرۆك وەزیرێکی تورکیا پێ بنێتە ناو خاکی کوردستان'ی عێراق و بەوهۆیەشەوە لە ڕوانگەی پەیوەندییەکانی کورد و تورکیا کاتێکی مێژوویی بوو.

مەراسیمی‌کردنەوەی فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی هەولێر کە لەلایەن کۆمپانیایەکی تورکی دروستکرابوو بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش ئەنجامدرا و دوای ئەوەش دیداری مەسعودبارزانی - تایب ئەردۆغان لە میوانخانەی پڕشکۆی دەوڵەت کە ئەویش لەلایەن کۆمپانیایەکی تورکی دروستکرابوو، دەستپێکردبوو. دوای دیدارەکە، وەفدە ڕەسمییەکان پێکەوە نانی ئێوارەیان دەخوارد. کاتێ دەربازی خواردن دەبوون، نێچیرڤان بارزانی قۆڵی منیشی ڕاکێشا و لەسەر مێزی خواردن داینیشاندم.

دوای خواردن، لەگەڵ تایب ئەردۆغان و مەسعود بارزانی بە سازی ئیبراهیم کالن ڕاوێژکاری سەرۆك وەزیر چەندین گۆرانی جۆراوجۆر بە تایبەتی گۆرانی یەمەن کە مەسعود بارزانی لە ساڵانی شاخەوە لە بیری مابوو، گوترا. سەکردەی تورکیا و بەرپرسانی کوردستانی عێراق وەك مرۆڤەکانی وڵاتێك کە ئەرکەکانی خۆیان دابەش کردبێت، لە کەس و هەوایەکی سۆزاویدا بوون. بەو هەستەی کە ئەو درختەی بیست ساڵ لەوەوبەر لەگەڵ تورگوت ئۆزال تۆوەکەیمان چاندبوو چەکەرەی کردووە و خەریکە گەورە دەبێت، لە پشت ئەو قەنەفەیەی کە مەسعود بارزانی و تایب ئەردۆغان لەسەری دانیشتبوون، لەگەڵ ئەوان گۆرانییەکانم دەگوتەوە. هەرچیمان دەکرد نەماندەتوانی لە هەولێر جیا ببینەوە.

نیوەشەو لەکاتی گەڕانەوە لە هەولێر، لە ڕێگای تورکیا لەنێو فڕۆکە لەگەڵ تایب ئەردۆغان گفتوگۆمان دەکرد.

سەرۆك وەزیر سەبارەت بە واتای مێژوویی سەردانەکەی خۆی بۆ عێراق و هەولێر تێبینی و سەرنجەکانی خۆی باس کرد. منیش قسەم کرد و وتم؛"با تۆزێك باسی سوریا بکەین. ئەگەر پێشگیری لە رووداوەکانی سوریا نەکرێت و بڵاوببنەوە، کێشەی گەورە بۆ تورکیا و بە تایبەتی بۆ خودی ئێوە دروستدەبێت. سوریا وەك خاڵی دەرکەوتنی سیاسەتی نوێی تورکیا بەرامبەر خۆرهەڵاتی ناوەڕاست سەیر دەکرێت. ئێوە لەگەڵ بەشار ئەسەد پەیوەندی شەخسیتان هەیە و لەلایەکی دیکەشەوە وەك خۆشەویستی شەقامی عەرەبی دەرکەوتوون و ئەو وتەیەی خۆتان کە دەڵێن من کەسی بێ کەسان و دەنگی بێ دەنگەکانم، سنورەکانی تورکیای تێپەڕ کردووە. ئێستاش شەقامی عەرەبی بە راستیی رژاوەتە سەر شەقام. دەگەڕێنەوە و سەری ئێوە دەکەن و لە کەسیی ئێوەدا بەدوای دەنگەکانی خۆیان دەگەڕێن..."

روخساری ئەردۆغان گرژی تێکەوت. نیگاکانی راوەستابوون. روویکردە ئەو چەند رۆژنامەنوسەی کە لەبەرامبەری دانیشتبوون و وتی؛"قەڵەم و کاغەزەکانتان لابەرن گیرفان تا بە ئاسوودەیی قسە بکەم. پێویستە ئەو شتانەی کە دەیڵێم لە بەینی خۆماندا بمێننەوە."دواتر وتی؛

"لەگەڵ بەشار تەنها پەیوەندی شەخسیم نییە، بەڵکو پەیوەندی خێزانیشمان هەیە. هاوسەرەکانیشمان دۆستی نزیکی یەکن. بەڵام سێ ساڵ بەر لە ئێستا بە بەشارم گوت بەشار! سەیرکە، من تۆم زۆر خۆش دەوێ و دەزانم تۆش منت خۆش دەوێ. هەروەها دەزانم خەڵکەکەشت تۆی خۆش دەوێ، بەڵام ئەگەر ریفۆرم نەکەیت شەو دەخەویت و بەیانی لەکاتی هەستاندا دەبینی کە ئەو خەڵکەی تۆی خۆش دەویست نەماوە و بەوجۆرەش خەڵکت لە کیس دەچێت. جوڵەیەك بکە. سێ ساڵە ئەمەم پێ گوتووە. راستە من پەیوەندی شەخسیم لەگەڵ بەشار زۆر باشە بەڵام من سەرۆك وەزیری تورکیام، ئەگەر بەرژەوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ دۆستایەتی من لەگەڵ بەشار بەریەك بکەون، ئەوا من یەکەمیان هەڵدەبژێرم و لە تەنیشت خەڵکی سوریا دەبم. سوریا واتای حەلەب دەدات و حەلەبیش واتای هاتای دەدات. بەدەر لەوە سوریا قامشلۆیە و پێویست بەوەش ناکات کە بڵێم قامشلۆ چ واتایەکی هەیە."

ئەمە وەڵامێکی چاوەڕواننەکراو بوو بۆمن و وتم؛"یانی؟"

ئەویش لە وەڵامدا وتی؛"یانی ئێمە ناتوانین رێگا بدەین ئەو شەپۆلی کۆچکردنەی کە ساڵی ١٩٩١ لە باکووری عێراقەوە رووی کردە وڵاتەکەمان، ئەمجارەیان لە سوریاوە روومان تێ بکات و ناتوانین هێڵەکانی بەرگری لەنێو خاکەکانی خۆماندا دروستبکەین..."

تایب ئەردۆغان لەوێ کۆتایی بە قسەکانی هێنا بەڵام من بڕایی و وردیی تێبینی و بۆچوونەکانی ئەوم سەبارەت بە جیۆپۆلەتیکی ناوچەکە و پێشبینییەکانی لەبارەی چۆنییەتی پێشکەوتنی رووداوەکانی سوریا لە زەینی خۆمدا یاداشت کرد.

نزیکەی هەفتەیەك دوای ئەم گفتوگۆیەش لەگەڵ ئەحمەد داود ئوغلو وەزیری بەرەو شام ڕۆیشتین و ئەم سەردانەش یەکەم هەنگاوی هەوڵە نائومێدانەکانی تورکیا بۆ رازی کردنی رژێمی سوریا بۆ ئەنجامدانی ریفۆرم بوو، ئەویش لەکاتێکدا کە پاڵپشتی لە دینامیکی گۆڕان لە دنیای عەرەبی'دا دەکرد.

بەدەر لەوانەش تورکیا بە ئاگاداری لە کێشمەکێش و ململانێی سەفەوی - عوسمانی لە مێژوودا، وەکە ئەوەی کە مێژوو خۆی دووبارە بکاتەوە لە هەر سانتیمەترێکی خاکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'دا لەگەڵ ئێران رکابەریی دەکرد و بەو هەستەی کە نابێ سوریا بۆ ئێران بەجێبهێڵێت دەجووڵایەوە.

دوای پشوویەکی‌کورت لە هۆتێل شیراتۆن'ی شام بەرەو کۆشکی تشرین ڕێکەوتین کە بەشار لەوێ چاوەڕوانیی داودئوغلو'ی دەکرد. لە ڕێگای ڕۆیشتن بۆ کۆشکەکە ئەو شوقەیەم بینی کە عەبدوڵا ئۆجالان ساڵانێك لەوێ ژیابوو. شوقەکەم پیشانی کەسانی دەوروبەری خۆم دا. تەنها ٥- ١٠ خولەك لە دووریی سەرۆکی دەوڵەتی سوریا ژیابوو و بە تایبەتی سوودی لە پەیوەندی دۆستانەی خۆی لەگەڵ جەمیل ئەسەد مامی بەشار ئەسەد وەرگرتبوو.

داودئوغلو بۆ ماوەی سێ سەعات بەتەنها لەگەڵ بەشار دیداری کرد. ئەو کاتانەش ئێمە لەگەڵ خالید چەڤیك باڵیۆزی تورکیا لە شام و عومەر ئۆنهون باڵیۆزی ئەوکاتەی تورکیا لە شام (ساڵێك لەوەو پێش لە شام میوانی بووم) و ئەندامە سورییەکانی باڵیۆزخانەی تورکیا لە ژوورێکی تەنیشت ئەو ژوورەی کە ئەو لەگەڵ بەشار ئەسەد دیداری دەکرد، سەیری ڕێگای شام - بەیروت و گەڕەکی مەزە'مان دەکرد و سەبارەت بە داهاتووی گفتوگۆمان دەکرد.

لەدوای دیدارەکە ئەحمەد داوئوغلو منی بە بەشار ئەسەد ناساند. کاتێك بە عەرەبی هەوڵپرسیم لێکرد، بەسەرسووڕمانەوە سەیری کردم. عەقڵی نەیدەگرت کە چۆن ڕۆژنامەنوسێك هەتا بەر دەرگای ژووری سەرۆك لە کۆشکی سەرۆکایەتی بگات. چونکە واز لە کۆشکی سەرۆکایەتی بهێنە تەنانەت هاتنی ڕۆژنامەنوسان بۆ ناو سوریا'ش قەدەخە کرابوو.

دوای ئەوەی لەبەر دەرگای کۆشکی سەرۆکایەتی بە ڕێیان کردین، وەلید موعەلیم وەزیری دەرەوەی سوریا و بوسەینا شەعبان راوێژکاری تایبەتی بەشار ئەسەد ئێمەیان بۆ کەبابخانەیەکی زۆر باش بەناوی نارنج برد کە لەدوایین سەردانمدا بۆ شام پێی فێر ببووم. نارنج لەبەر دەرگای خۆرهەڵاتی"شارع موستەقیم"بوو کە لە ڕۆمایەکانەوە بۆ شام'ی کۆن مابووەوە.

لە روانگەی بەردەوامیی نشیتەجێبوونەوە، شام وەك کۆنترین شاری جیهان لە قەڵەم دەدرێت."شەقامی موستەقیم"یان ڕێگای ڕاست کە بە ئینگلیزی Street Called Straightی پێ دەگوترێت و کاتی خۆی ئەولیا پاولۆس لەوێ ماوەتەوە و کاری کردووە، لەسەرووی شوێنە ئەفسوناوییەکانی شام'ی کۆن دێت.

لە دڵی خۆمدا وتم لەبەر ئەوەی ماجەراکانی من لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە شام دەستیان پێکردووە، کۆتاییهێنانیان لانیکەم بۆ ماوەیەکی درێژ بە"دوایین خواردنم"لە شام"وەك دوایین خواردنی عیسا"بۆ مێژووی شەخسی خۆم کۆتاییەکی لە جێی خۆی دەبێت. لە شام دڵنیا بووم لەوەی کە سەرەتای کۆتاییهاتنی ڕژێم دەستپێکردووە و دەمانتوانی لە نارنج بە بێئەوەی خاوەنماڵەکانمان درکی پێبکەن و بیانەوێت شتی وا بکەن پیرۆزبایی ئەمە بکەین.

هەموو کاتێك شام لە دەروونی مندا هەستی دژبەیەکی دروستکردووە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٧١دا ئەوکاتەی کە بۆ هەڵهاتن لە دەستی ڕژێمی سەربازی دەربازی دەشتی حەڕان بووم، ئامانجم گەیشتن بە شام بوو. لەوێ بەشداری جوڵانەوەی فەلەستین'م دەکرد و لە جیاتی ئەوەی لە تورکیا داواکراوبم لە سوریا ئازادیم بە دەست دەهێنا. بەڵام زۆری نەخایاند کە ڕژێمێکی پۆلیسیم لە شام بینی کە تەحەمول نەکراوترین جۆری ڕژێمە لە جیهاندا و سوکایەتی بە تاك دەکات. ناوی خۆم گۆڕی و جۆرە ژیانێکی ژێرزەمینیم دەستپێکرد. پێموایە نەفرەتی من لە ڕژێمە نەتەوەگەراکانی عەرەب و هەموو جۆرە تۆتالیتارییەك لە شام پەیدا بوو. بە بێئەوەی لەنێو ڕژێمی عێراق بژیم لە شام فێری ئەوە بووم کە نەفرەت لە سەدام و ڕژێمی بەعسی عێراق بکەم.

هاوکات لەگەڵ ئەوانەشدا، شام بەشێوەیەکی سەیر گوزارشتی لە ڕزگاری بۆ من دەکرد. دوای داگیرکارییەکەی ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٨٢، بۆگەڕانەوە بۆ تورکیا خەریکی دەرکەوت لە بەیروت بووم کە لەلایەن میلیشیاکانی مەسیحییە فالانژیستەکان'ەوە دەسگیرکرام. تۆزێك مابوو گوللەبارانم بکەن کە فەرماندەکەیان ڕای خۆی گۆڕی و بەری دام. دوای ئەوەش شام یەکەم جێگایەك بوو کە بۆ ئازادی و ڕزگابوون پێم نایە ناو خاکەکەی.

یەکەم شوێنێکیش کە لەوێوە خۆم تێکەڵاوی کێشەی کورد بەرقەرارکرد، هەر شام بوو.

لەو هەڵبەز و دابەزەدا بە بارێکی دەروونی سەیرەوە پەیوەندیم لەگەڵ شام دروستکردبوو. سەرەڕای مانەوەی ڕژێمی پۆلیسی، هەموو کاتێك خۆشییەکی شاراوەم لە مانەوە لە شام وەرگرتووە.

لەدوایین سەردانمدا بۆ ئەو شارە، لە"باب شەرق"ی کۆن لەسەر مێزی نان خوارن لە نارنج، لە گۆشەیەکی زۆر دوور لە وەلید موعەلیم'ەوە دانیشتبووم و بە زانیارییەکی دەروونی خۆم سەبارەت بەوەی کە ئیدی سەرەڕای ڕووداوی خوێناوی دوورودرێژ، شام لە دەستی ڕژێمی پۆلیسی ڕزگاری دەبێت، دەروونم ئاسوودە بوو.

لە ڕێگای گەڕانەوە لە شام بۆ تورکیا ئەحمەد داودئوغڵو باسی وردەکارییەکانی دانوستانی خۆی لەگەڵ بەشار ئەسەد کرد کە زیاتر لە سێ سەعاتی خایاندبوو. بە درێژی باسی چۆنییەتی دەربازبوونی تورکیا'ی بۆ سیستەمی پەرلەمانیی فرەحیزبی کردبوو و پێشنیاری کردبوو کە سوریا'ش بە ڕێگایەکی هاوشێوەی

ئەوەدا بڕوات و بۆ ئەوەش ئامادەیی هەموجۆرە هاوکارییەکی پیشاندابوو. وەك هەنگاوی یەکەمیش پێشنیاری کردبوو بنکەی حکومەتی سوریا فراوان بکرێت. لەنێو ئەوەشدا پێشنیاری کردبوو سێ کەس لە گرووپی"اخوان المسلمین"کە بەشار ئەسەد'یش بە گونجاویان بزانێت لە کابینەی حکومەتدا ببنە وەزیر. بەشار'یش جەختی لەوەکردبوو کە ئەگەر ئەو سیستەمەی پشت بە دیموکراسی دەبەستێت لە سوریا جێبەجێ بکرێت، لە ئەنجامدا دەسەڵاتی کەمینەی مەزهەبی نەسیری - عەلەوی کە دەسەڵاتەکەی ئەو پشتی پێ دەبەستێت لە ناو دەچێت و دواجاریش نیگەرانی پیشاندابوو لەوەی دوجار زۆرینەی سوننە مەزهەب، تۆڵەی خۆیان لە کەمینە مەزهەبییەکەی ئەو بکەنەوە. داودئوغلۆ'ش بە بەشار'ی گوتبوو کە دژەژەهری ئەو نیگەرانییە بە جێیەی تۆ خودی دیموکراسییە کە تێیدا بە باشترین شێوە مافی کەمینەکان گەرەنتی دەکرێت.

گوێم لە داودئوغلو گرت و دواتر وتم؛"بەڕێز وەزیر! ئێوە بە هەموویەوە سێ سەعات دیدارتان کرد. دوای ئێوە ماهیر'ی برای بەشار دەچێتە ئەو ژوورە و بەرگری لەو پێشنیارانە دەکات کە پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئێوەن. لەو بەینەشدا ئێرانییەکان دێن و دەڵێن گوێ بە پێشنیاری تورکەکان مەدە. ئەوان دەیانەوێت کۆتایی بە تۆ بهێنن. لە خاڵی مان و نەمانی دەسەڵاتەکەت دای. ئێمە لە ئێران چیمان کرد، ئێوەش ئەوە بکەن. بەر لەوەی ئۆپۆزیسیۆن گەورە بێت، بەهێز سەرکوتی بکەن. ئێمە هەموو جۆرە پشتیوانییەکتان دەکەین. لەولاتانەوە حیزبوڵا هەیە و دەتوانن سوود لە پشتیوانییەکانی ئەویش وەربگرن،، ئەم جۆرە رژێمانە بەپێی سروشتی خۆیان ریفۆرمیزە ناکرێن. ئەگەر برغویەك شل ببێت هەموو پێکهاتەکە تێك دەچێت."

خۆی لە شیکردنەوەی کۆتاییدا ئەحمەد داودئوغلۆ'ش زۆر گەشبین نەبوو بەوەی کە بەشار ئەسەد گوێ لە پێشنیارەکانی تورکیا بۆ ریفۆرم بگرێت. لە روویەکەوە، سوریا هەنگاو بە هەنگاو دەبوو بە مەیدانی کێشمەکێش و ململانێی رانەگەیەنراوی تورکیا و ئێران.

مانگێك تێپەڕیبوو. لەناوەڕاستەکانی مایس'دا بەنیازبووم بۆگەڕانەوە بۆ ئیستانبوڵ بچم بۆ فڕۆکەخانەی هەولێر و لەسەر مێزی قاوەتی لەگەڵ نێچیرڤان بارزانی لە کۆشکی سەرۆکایەتی کوردستان لە سەلاحەدین هەستامە سەر پێ. نێچیرڤان وتی؛"مام جەلال دێت. بەر لەوەی بڕۆی سڵاوێکی لێ بکە."تاڵەبانی داوای دیدارێکی کتوپڕی لە مەسعود بارزانی و نێچیرڤان بارزانی کردبوو و بەرەو سەلاحەدین دەهات.

سواری ئۆتۆمبیلەکەی نێچیرڤان بارزانی بووین و بەرەو میوانخانەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان رۆیشتین کە شایەتی دەیان ساتی مێژوویی بووە. هێشتا دانەزیبووین کە ئۆتۆمبیلێك لەبەردەمماندا راوەستا و جەلال و تاڵەبانی و مەسعود بارزانی لێی دابەزین.

مەسعود بارزانی لەو دیدارە چاوەڕواننەکراوەی من خۆشحاڵ بوو و سڵاوی لێکردم. جەلال تاڵەبانی'ش

داوای لێکردم بەر لەوەی کۆبوونەوەکەیان دەستپێبکات، پێکەوە چایەك بخۆینەوە و دوای ئەوە من بۆ هەولێر بچم.

هەمووما‌ن پێکەوە دەربازی ئەو هۆڵی پێشوازییە ئاشنایە بووین. چا خواردنەکە درێژەی کێشا و هەردوو سەرکردەکەی کورد بابەتی سوریا'یان کردەوە. مەسعود بارزانی شیکردنەوەیەکی کرد سەبارەت بەوەی کە هەتا ئەوکاتەی رووخانی رژێمی سوریا یەکلا دەبێتەوە، نابێت کوردەکان بەشداری چالاکییەکی دژ بە رژێم بکەن کە رێگا بۆ پێکدادانی کورد و عەرەب بکاتەوە. رۆژی رابردوو د. فوئاد حسێن سەرۆکی دیوانی بارزانی، کەم و زیاد هەمان شیکردنەوەی کردبوو.

بەوجۆرەش هەڵوێستی رانەگەیەنراوی حکومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق'م سەبارەت بە رووداوەکانی سوریا زانی کە بۆ رای گشتی ئاشکرا نەکرابوو.

جەلال تاڵەبانی راشکاوانە قسەی کرد و وتی؛"رژێمی سوریا رژێمێکی کەمینەیە، بەڵام وەك هاوپەیمانییەکی هەموو ئەو کەمینانەش وایە کە لە دەسەڵاتی ئیسلامی سوننە نیگەرانن و هەموو شتێك دەکات بۆ ئەوەی لەسەر پێ بمێنێتەوە. زۆر بەتوندی هێز بەکار دەهێنێت. دەتوانێت عەلەوی، مەسیحی و دورزی و ئیسماعیلی'یەکان بەرەو لای خۆی راکێشێت و کوردەکانیش بێ کاریگەر بکات. بۆیە نابێت پشتیوانییەکی جەماوەری وەها نادیدە بگیرێت. زۆر بەهێزتر لەوەی چاوەڕوان دەکرێت دەردەکەوێت و وردە وردە سوریا بەرەو جەنگی ناوخۆیی دەچێت..."

لەو بەینەدا پرسیارێکم کرد و وتم؛"پێکهاتە و تۆپۆگرافیای سوریا بۆ جەنگی ناوخۆیی گونجاو نییە، ئەمە چۆن دەبێت؟"

جەلال تاڵەبانی وتی؛"باسی جەنگێکی ناوخۆیی درێژخایەن دەکەم کە دەتوانێت لە رێگای کەمین دانان بۆ هێزە ئەمنییەکان، بۆردومان، تەقینەوە و ئۆتۆمبیلی بۆمبڕێژکراو و تیرۆر و توندوتیژی پەرەبسێنێت."دوای ئەوە یەکسەر رووی کردە من و وتی؛"ئێران چی دەکات؟ چ سیاسەتێك دەگرێتەبەر؟ چی دەڵێی؟"

پێکەنیم و وتم؛"مام جەلال! کە تۆ لێرە بیت کەی وەڵامدانەوەی پرسیاری ئێران بۆ من دەبێت؟"بەڵام گوزارشتە جیدی و بیرکەرانەکەی روخساری تاڵەبانی ون نەبوو.

لەوانەیە پێشهات و رووداوەکانی سوریا لە هەموو روویەکەوە داهاتووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و داهاتووی شۆڕشی عەرەبی یەکلا بکاتەوە. وەك ئەوە وابوو کە ئیدی شۆڕشی عەرەبی وەك ناونیشانێکی لاوەکی شۆڕشی سوریا'ی لێ هاتبێت.

ئەگەر رۆژێك شۆڕشی سوریا لە کتێبە مێژووییەکاندا بنوسرێتەوە، پێدەچێت رۆژی ٢٠١١/٣/١٥ وەك سەرەتای شۆڕشەکە تۆمار بکرێت. وەلید جونبەلات سەرکردەی بەناوبانگی دورزییەکانی لوبنان لە

دیدارێکماندا لە ئێوارەی ۲۲ی مارتی ۲۰۱۲دا لە ئیستانبوڵ، دیسان نیگەرانییەکانی خۆی سەبارەت بە سوریا و ناوچەکە هێنایە سەرزمان. بۆچوونەکانی سەبارەت بەوەی کە ئەو رژێمە لەگەڵ خۆیدا هەموو ناوچەکە تووشی کارەسات دەکات نەگۆڕابوون. وتەکانی پێشتری خۆی لە دیدارێکماندا لە کانوونی یەکەمی۲۰۱۱ لە ماڵەکەی خۆیدا لە بەیروت و هەروەها دیدگاکانی خۆی کە لە مانگی یەکەمی ۲۰۱۲دا بە نامەیەکی ئەلکترۆنی دووروودرێژ ناردبووی، بە بیرهێنایەوە.

وەلید جونبەڵات لە قۆناغێکدا یەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی رژێمی سوریا بوو. کەمال جونبەڵات ی باوکی کە لەکاتی جەنگی ناوخۆی لوبنان لە ساڵی ۱۹۷۷، هاوشانی هێزەکانی فەلەستین بە رێبەریی یاسر عەرەفات ریزی گرت و سەرۆکایەتی هاوپەیمانی چەپ و موسڵمانەکانی لوبنان ی دەکرد و لە هەمانکاتیشدا سەرۆکی پارتی پێشکەوتنخوازی سۆسیالیست بوو، تیرۆرکرا و لای هەموو کەسیش ئەوە"نهێنییەکی ئاشکرا"بوو کە بەدەستی رژێمی سوریا کوژراوە.

وەلید، یان بەوجۆرەی لە لوبنان بانگی دەکەن و منیش بە گاڵتەوە پێم دەگوت؛ وەلید بەگ، هاوتەمەنی من بوو. بە جیاوازی چەند مانگێکەوە من لەو گەورەتر بووم. وەکوو هەر کەسێك کە لەگەڵ خۆرهەڵاتی ناوەڕسات تێکەڵ دەبوو، منیش ساڵانێکی درێژ چاودێری وەلید جونبەڵات م دەکرد. لە رۆژێکی مانگی ئابی ۱۹۸۲دا، ئەو کاتانەی یاسر عەرەفات بە چاوی گریانەوە لوبنان ی جێ دەهێشت، پێکەوە لەبەرزاییەکی بەندەری بەیروت رێیان دەکرد و ئەو دیمەنەش هیچ کات لە زەینی مندا نەسڕایەوە.

لەدوای دەسدانی باوکی، جێگرتن لەنێو کەوانەی سوریا و ئیسرائیل و مانەوە لەنێو شەپۆلی رووداوە قورسەکانی لوبنان بۆ ماوەی سی و پێنج ساڵ و پاراستنی رۆڵە سیاسییەکەی خۆی، لە موعجیزە دەچوو. لەوانەیە لەلایەك رۆیشتن لە رێگای باوك و لەلایەکی دیکەش ئەنجامدانی وەرچەرخانی کتوپڕ و سەیری سیاسی سەخت بە بێ لادانی بنەڕەتی لەو رێگایە، فورمۆلی مانەوەی ئەو لە ژیان و درێژەدان بە هەبوونە سیاسییەکەی بووبێت.

لە ساڵانی ۲۰۰۰کاندا یەکترمان ناسی. چەندجارێك لە کۆشکەکەی لە ناوەندی بەیروت و دیواخانە گەورەکەی لە موختارا لە ناوچەی شاخاوی شوف لەلای باشووری لوبنان، کە لە بنەماڵەکەیەوە بۆی ماوەتەوە، یەکترمان بینیوە. وەلید بەگ، بەهۆی ئەوەی لەسەری دایکەوە نەوەی ئەمیر شەکیب ئارسڵان یەکێك لەبەرێوەبەرە عەرەب - دورزی یەکانی ئیتیحاد و تەرەقی بوو، سۆزی بۆ تورکیا و ئیستانبوڵ هەبوو. زوو زوو دەهات بۆ ئیستانبوڵ و هەموو جارێ لەوێ یەکترمان دەبینی.

وەلید جونبەڵات لە رێی گۆڕینی پەیتا پەیتای هاوپەیمانەکانی، ئاسایشی کەسیی خۆی گەرەنتی دەکرد و دەکرێت ئەو رەفتارەیشی وەك ئاماژەی گۆڕانی ئاراستەکان و هاوسەنگییەکانی هێز لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست

سەیر بکرێت. مانەوەی جونبەڵات لەسەر پێ لە جوگرافیایەکی سەخت و نامومکیندا، بەئەندازەیەکی گرنگ پەیوەندیی بە بڕایی و وردیی تێبینی و هەستە بەهێزەکانی ئەوەوە هەبوو. لەبەر ئەوە بە گاڵتە سەرم دەنایە سەری و دەمگوت؛"وەلید بەگ تۆ ئاماژەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی بۆ من. هەر کاتێ هەڵوێستێك وەردەگرێت، ئەوسا دەزانم ڕووداوەکان بەو ئاراستەیە پێشدەکەون."ئەمە لایەنی ڕاستیشی تێدا هەبوو.

لە ساڵی ٢٠٠٠ەوە وەك پیاوی نەخوازراو ڕاگەیەنرا و دەروازەکانی شام بە ڕوویدا داخرابوون. دوای ئەوە، کاتێك بە منی ڕاگەیاندبوو کە بۆ کرانەوەی دەرگاکانی شام دەیەوێت خۆی لە حکومەتی تورکیا نزیك بکاتەوە، ئەمەم وەك کەمبوونەوەی قورسایی ئەمریکا لە ناوچەکە لێکدابووەوە. خۆی لە خۆیدا دوای ماوەیەك وەلید جونبەڵات لە هاوپەیمانی ناسراو بە"جوڵانەوەی ١٤ی مارت"لە لوبنان کشایەوە و کۆتایی بە حکومەتەکەی سەعد حەریری هێنا و ڕێگای بۆ پێکهاتنی حکومەتێکی نوێ کردەوە کە ئاراستەی لوبنان'ی بەرەو سوریا سووڕاندەوە. دوای ئەوەش دەروازەکانی شام بە ڕووی ئەودا کرابوونەوە و لە ساڵی ٢٠١٠دا دووجار سەردانی شام'ی کردبوو و وەك میوانی بەشار ئەسەد لە کۆشکی سەرۆکایەتیدا مابووەوە. ڤیلایەکیشی بۆ تەرخانکرابوو تا هەرکاتێک سەردانی شام بکات لەوێ بمێنێتەوە.

ماوەیەك دوای تەقینەوەی ڕووداوەکانی ١٥ی مارتی ٢٠١١ لە سوریا، هەرچی دەچوو وەلید جونبەڵات دەنگی خۆی لەبەرامبەر ڕژێمی سوریا بەرزتر دەکردەوە و داوای لە دورزییەکانی سوریا دەکرد بەشداری لە ئۆپۆزیسیۆندا بکەن و بەوجۆرەش هەموو پردەکانی پەیوەندی خۆی لەگەڵ ڕژێمی ئەسەد تێکدا و منیش ئەمەم وەك"دەرکەوتنی کۆتایی ڕژێمی سوریا"لێکدابووەوە و ئەم تێبینییەی خۆیشم بۆ ئەو باس کردبوو.

لێدوانی وای لە دژی ڕژێمی سوریا دەدا کە هیچ سەرکردەیەکی لوبنان'ی نەدەوێرا و ناوێرێت قسەی وەها بکات. مومکین نەبوو وەلید جونبەڵات درك بەوە نەکات کە قسە سوورەکانی لەبەرامبەر سوریا، ژیانی دەخەنە مەترسی. ئەو بە باشی دەیزانی کە ئەگەری ئەوە زۆرە وەك چۆن حافز ئەسەد، باوکی کوشت، بەشار ئەسەد'یش گیانی ئەو بگرێت و لەناوی بەرێت. دەکرێت ئەمانەش لە دێڕەکانی کتێبێکی سەرنجڕاکێشی نیکۆلاس بلانفۆرد پەیامنێری کریستیان ساینس مۆنیتۆر لە لوبنان سەبارەت بە تیرۆری ڕەفیق حەریری'دابخوێنرێنەوە؛

"... حیکمەت شەهابی فەرماندەی پێشووی سوپای سوریا کە پەراوێزخرابوو و پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەسەڵات پچڕابوو، بۆ جێهێشتنی وڵاتەکەی و نیشتەجێبوون لە ئەمریکا لە سوریا دەرکەوتبوو. (دوایین دیداری شەهابی) وەلید جونبەڵات ئەوەی بیردێتەوە کە لە ڕێگای ڕۆیشتن بۆ فڕۆکەخانەی بەیروت، شەهابی سێ جار پێی وتووە ئاگاداری خۆت بە. ئاگاداری خۆت بە..'

سەرەڕای ئەو ناوبانگەی کە لەبارەی توانای مانۆڕدانی سیاسی پەیدای کردووە، وادیاربوو ئەویش

هاوشێوەی سی ساڵ لەوەوبەری کەمال'ی باوکی، لەگەڵ شام'دا لە رووبەڕووبوونەوەیەکی مەترسیداردا بوو. رووبەڕووبوونەوەکەی پێشتر بە مەرگی کەمال جونبەلات بە دەسرێژی گوللە کۆتاییپێهاتبوو...

ئایا لەم قۆناغە پر ئاڵۆزییەدا قەد بیری لە چارەنووسی باوکی کردبووەوە؟ بۆ یەکەمجار جونبەلات کەوتە هەیەجان. هەستایە سەرپێ، سەیری عەرزی کرد و لە ژوورەکەدا هانوچۆی کرد و دواجار وتی هەلومەرجەکان جیاواز بوون، هێشتا لەنێو ئەو جەنگە مەترسیدارە ناوخۆییەدا بووین. لەو قۆناغەدا بڕیاری لێبوردنم دا. فەرامۆشکردن ئاسان نییە، بەڵام لێبوردن لەوانەبە.'

لە ساڵی ١٩٧٧دا دوای چلەی ماتەمینی باوکی، جونبەلات بۆ راگەیاندنی پابەندبوونی خۆی بە حافز ئەسەد سەردانی شام'ی کرد. سەرۆکی سوریا بە گوزارشتێکی نارِوون و بێزارکەرەوە سڵاوی لەو پیاوە گەنجە کرد و وتی چەنێ لە باوکت' دەچی،. لەو بەرواره بەدواوە ئیدی جونبەلات دۆستایەتی و پابەندبوونی خۆی بە سوریا دەسەلماند و بۆچوونە شەخسییەکانی خۆی سەبارەت بە سوریا و سەرۆکایەتییەکی بۆ خۆی هەڵدەگرت."(Nicholas Blanford, Killing Mr. Lebanon, ١. B. Tauris, London-New York, ٢٠٠٦, p. ١١٢, ١١٣)

دوای ئەوەی حافز ئەسەد لە ساڵی ٢٠٠٠دا مرد و بەشار ئەسەد لە شوێنی ئەو مەیدانە چۆڵەکەی پڕ کردەوە، پەیوەندییەکانی وەلید جونبەلات'یش لەگەڵ شام گۆڕان. بەر لە تیرۆرە مەترسیدارەکەی ١٤ی شوباتی ٢٠٠٥ کە بوەوە بایسی گیانی رەفیق حەریری، وەلید جونبەلات و رەفیق حەریری لەنێو ئامانجە سەرەکییەکانی رژێمی سوریا بوون. بلانفۆرد لەو کتێبەدا کە باسی تیرۆرەکەی کردووە وەهای نوسیوە؛

"لەسەرەتای شوباتی(٢٠٠٥)دا حەریری جونبەلات'ی راکێشایە سووچێك و وتی لە ماوەی دوو هەفتەدا یان من یان تۆ دەبیت. ئەگەر (سورییەکان) ئاڵۆزییان بوێت یا من یان تۆ دەکوژن،. وەلید جونبەلات لە درێژەی قسەکانیدا ئەوەشی بە نوسەر گوت کە دیاربوو دەیزانی شتێك روودەدات..."(هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل.١٢٣)

بەم هۆیەشەوە هەڵوێستی وەلید جونبەلات سەبارەت بە رووداوەکانی سوریا، بۆ من وەك پێوەرێك بوو.

لە کانوونی یەکەمی ٢٠١١ لە ماڵەکەیدا لە بەیروت، لەسەر مێزی خواردن وتم؛"وەلید بەگ! بە ئاشکرا ئاڵاتان لە دژی رژێمی سوریا هەڵکردووە. پردەکانی پەیوەندیتان رووخاند کە لە ماوەی دەیان ساڵدا بە زۆری و زەحمەتی بونیاتنرابوون. لەوانەیە درکت بەوە کردبێت کە بەمزووانە رژێم کۆتایی پێبێت. چەنێ تەمەنی ماوە؟ بەشار کەی دەڕوات؟"

وەلید جونبەلات بەجۆرێک کە گوزارشتێکی رەشبینانە لە روخساری دیاربوو وەڵامی پرسیارەکەمی دایەوە و بە ئاماژە کردن بە بەشار ئەسەد وتی؛"ئەم کابرایە شێت بووە. هیچ دوودڵ نابێت لەوەی کە

لەگەڵ خۆی، سوریا و ناوچەکەش تووشی کارەسات بکات. من ئەو هەڵوێستەم لەبەر ئەوە دەرنەبڕی کە پێموابێ بەمزووانە تەمەنی رژێمی سوریا کۆتایی پێدێت. بەڵکو قسە بۆ مێژوو دەکەم. ناتوانم چاوپۆشی لە زوڵم و ستەم بکەم. پێویستە دژایەتی بکەم..."

وەکوو کەسێکیش کە لە نزیکەوە بنەماڵەی ئەسەدی دەناسی، ئەم وتانەی مایەی تێڕامان بوون:"ئێران لە پشتی ئەم رژێمە وەستاوە و تا کۆتایی پشتیوانی لێدەکات. بەگوێرەی ئاراستە و نییەتی چالاکییە سەربازییەکانی‌بەشار ئەسەد، لەوانەیە ئەگەر نەتوانێت حوکمی هەموو سوریا بکات، بەرەو ناوچە کەنارییەکان پاشەکشە بکات و هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی عەلەوی بدات کە شام و حەلەب‌یشی تێدا بێت. لە تەرتووس بنکەی سەربازی روسیا هەیە. ئەگەر بتوانێت ناوچەی عەلەوی لەگەڵ دەروبەری بەعلبەك بە یەك ببەستێتەوە کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی شیعەن و حزبولا لەوێ باڵادەستە، بەوجۆرە هەتا باشووری لوبنان پەیوەندییەکی بێ پچڕان لەگەڵ شیعەکان دروستدەکات و ناوچەی نفوزی ئێران لە رێگەی ناوچەی عەلەوی سوریا‌وە دەربازی لوبنان دەبێت و لە دۆڵی بیقاع‌ەوە هەتا باشووری لوبنان درێژ دەبێتەوە. حیسابەکە ئەمەیە."

وەلید جونبەڵات دوای ئەو"روونکردنەوە نەخشەییە"ی خۆی قسەی هێنایە سەر پلانی هێزە خۆرئاواییەکان لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەم بۆ ئەوەی ناوچەکە لەسەر بنەمای مەزهەبی بەسەر دەوڵەتی بچووك بچووکدا دابەش بکەن. دواتریش ئەوەی بیرهێنایەوە کە پێشتر رێککەوتننامەی سیڤەر بەسەر تورکیا سەپێنرا و لەوانەیە لە هەلومەرجی نوێدا شتێکی هاوشێوەی ئەوە جێبەجێ بکرێت.

دوای ماوەیەکیش لە نامەیەکی ئەلکترۆنی دوورودرێژدا بۆ من، باسی ئەوەی کردبوو کە شوێنی سەرەکی بۆ جێبەجێکردنی ئەو شتانەی لە بەیروت باسی کردبوون، شاری حومس‌ە. ناوی"ستالینگراد‌ی سوریا"بە حومس سێیەمین شاری گەورەی ئەو وڵاتە درابوو کە بە بەردەوامی لەژێر گەمارۆ و بۆردوومانداا بوو. لەوێ راپەڕینێکی زۆر توند لەبەرامبەر رژێم دەکرا. بەگوێرەی جونبەڵات کۆنترۆڵ کردنی حومس گرنگییەکی ژیانیی بۆ پلانی ئێران - سوریا هەبوو. ئەو بیرو بۆچوونانەی خۆیشی بۆ ئەحمەد ئوغڵو باسکردبوو کە حەزی لە بیرکردنەوە و قسەکردن سەبارەت بە تەسەورە جیۆپۆلەتیکییەکان هەیە.

رۆژی پێنج شەممە ٢٠١٢/٣/٢٢ وەلید جونبەڵات لە ئیستانبوڵ بوو. زیاتر لە سێ سەد کەسایەتی ئۆپۆزیسیۆنی سوریا لە رەوت و بیروبۆچوونە جیاوازەکان هاتبوون تا بەشداری لە کۆنگرەی دەستەی نەتەوەیی سوریا بکەن کە بە هاوکاری تورکیا و قەتەر لە ئیستانبوڵ ساز دەکرا. ئەو شەوە وەلید جونبەڵات کە ژمارەیەك لەبەرپرسانی پارتی پێشکەوتنخوازی سۆسیالیست‌ی لەگەڵ خۆی هێنابوو لە گفتوگۆکردندا لە کەناری گەرووی ئیستانبوڵ وتی وڵاتانی گەورەی خۆرئاوا لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەمریکا، گەلی

سوریایان لەبەردەم قەتڵوعامی دیکتاتۆریدا بە تەنها هێشتۆتەوە و خۆیان لە پڕچەك کردنی ئۆپۆزیسیۆن دزیوەتەوە یان لانیکەم لەوبارەیەوە کاری پێویستیان نەکردووە. دواتریش قسەی هێنایە سەر روسیا و باسی ئەوەی کرد کە بۆچی ئەو وڵاتە لەگەڵ دابەشبوونی سوریا دایە. بە پشتبەستن بە رووداوە مێژووییەکان هەندێك شیکردنەوەی کرد و دووبارە گەڕایەوە سەر جەنگی جیهانی یەکەم و دیسان سیڤەری بە بیرهێنایەوە.

وتم؛"وەلید بەگ! پێشبینی دابەشکردنێکی نوێی هاوشێوەی سایکس - پیکۆت دەکەن؟"

تۆزێك راوەستا و دواتر وتی؛"لەوانەیە."

-"کێ؟ ئەو هێزانە کامانەن؟"

-"نازانم. ناتوانم بڵێم ئەمەیە، بەڵام لەوانەیە هەندێك ناوەندی هێزی وەها لە خۆرئاوا هەبن..."

لەوانەیە ئەزموونی دابەشکردنی سوریا لە ساڵی١٩٢٠ ئەوکاتەی لە ژێر دەستی فەرەنسا بوو، لە زەینی وەلید جونبەڵات'دا بووبێت.

"هێزی فەرەنسا لە لوتکەدا نەبوو، ئەو سیاسەتەش کە لەبارەی کەمینەکانەوە پێڕەوی دەکرد، لاوازییەکانی ئەوی دەردەخست. ئەمەش سیاسەتی پەرت کە و زاڵ بە، بوو. سوریا'ی گەورە بەسەر چوار یەکەی سیاسیدا دابەشکرابوو؛ کۆماری لوبنان، کۆماری سوریا، دەوڵەتی عەلەوییەکان کە دواتر ناوی حکومەتی لازقیە'ی لێ نرا و حکومەتی جەبەل دورزی.

زنجیرە چیای جەبەل ئەنسارییە کە وەك وڵاتی عەلەوییەکان لە قەڵەم دەدرا، لەگەڵ پێدەشتەکانی - کە شارە ناوەندییەکەی لازقیە بوو - بەشێکی سروشتیی دەوڵەتی عەلەوییەکان بوون. ئالبێرت هورانی مێژوونوس لە کتێبی Syria and Lebanon؛ A Political Essayدا ژمارەی دانیشتوانی ئەم دەوڵەتەی بە نزیکەی ٣٧٠٠٠٠ کەس لە قەڵەمداوە کە ٦٠٪یان عەلەوی و ٢٠٪یان سوننە و ئەوانی دیکەش لە ئیسماعیلی و گرووپە جیاوازەکانی مەسیحی بوون. عەلەوییەکان چێژیان لەو ئۆتۆنۆمییە وەردەگرت و دەیانویستیان نەتەوەپەرەستەکانی سوریا لە شام لە خۆیان بە دوور بگرن. هورانی بەشێوەیەکی گونجاو باسی ئەوە دەکات و دەڵێت؛ فەرەنسا خودئاگایی گشتی کەمینەکانی دەرخست. ئەو ئەمەی دروست نەکرد، بەڵام لە رێگەی رێکخستنی ئیدارییەوە رێگای بۆ ئەوە خۆش کرد."(Fouad Ajami, The Syrian Rebellion, Hoover Institution Press, Stanford, C alifornia, ٢٠١٢, p.١٩, ٢٠)

لەبەر ئەوەی دامەزراندنی سوریا هاوکات بوو لەگەڵ دروستبوونی عێراق، لانیکەم بە ئەندازەی ئەو ساختەبوو. بەو هۆیەشەوە ئەو گۆڕانکارییانەی پاش هەردوو جەنگی جیهانی روویاندا و بوونە هۆی تێکچوونی بارودۆخی جێگیری ناوچەکە، ئەگەری دابەشبوونی سوریا'شیان لە هەناودابوو.

"ئەوکاتەی گۆراود لە ١٩٢٠دا شام'ی گرت، کایکس'ی سکرتێری هەندێك لە بژارەکانی لە بەردەمیدا ریز کرد. فەرەنسا یان ئەو درزە گەورانەی پڕ دەکردەوە کە خەریکبوو سوریا'یان دابەش دەکرد و هەوڵی دروستکردنی نەتەوەی سوریا'ی دەدا کە هێشتا لە ئارادا نەبوو، یان بەپێی پێشنیارەکەی کایکس دەبوو پاریزگاری لە دەرهاوێشتەکانی ئەو داوەرییە بکات کە ئەو دابەشبوونە بە فەرەنسا'ی دابوو و (ئەو دابەشبوونانە) قووڵتر بکرێنەوە.، دێ کایکس وتی‌پێویستە بڵێم کە بژارەی دووەمیان زیاتر سەرنجی من رادەکێشێت.، و گۆراود'یش قبوڵی کرد. لە مانگی ئابی ١٩٢٠دا بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی بەشێك زۆر لە مەسیحییەکانی ئەوێ، لوبنان'ی جیا کردەوە و سوریا و شام و حەلەب'ی دابەش کرد و مەزهەبەکانی عەلەوی و دورزی بە رەسمی ناساند و بەسەر چوار ویلایەتدا دابەشی کردن.

کاتێك ئەوانەش لەبەر چاو دەگیرێن، بە روونی دەردەکەوێت کە بۆچی دەوڵەتی سوریا کە لە کۆتایی ١٩٢٠دا لەلایەن فەرنسییەکان'ەوە لەسەر میراتی بیلادی شام دامەزرابوو، چۆن پێکهاتەیەکی ساختە بووە کە ئەو هارمۆنییە سروشتییەی تێکداوە. دەوڵەتی سوریا بەپێی ویست و داواکاری ئەو کەسانەی لەوێ دەژیان دانەمەزرابوو. لانیکەم ئەمە بەپێچەوانەی ویست و داواکاری زۆرێك لەو کەسانە بوو کە دەیانویست دەوڵەتێکی عەرەبی لە جوغرافیای سوریا دابمەزرێت کە تەنانەت ئەگەر مومکین بێت عێراق و نیمچە دوورگەی عەرەبستان'یش لە خۆ بگرێت. بەدەر لەوە، خودی فەرەنسییەکان'یش جگە لە لوبنان، دەوڵەتی سوریا'یان وەك ئامانجێکی مانەوەی کۆلۆنیالیستی خۆیان لە ناوچەکە سەیر نەکردبوو. خۆ ئەگەر لە پەیوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ بیلادی شام ئامانجێکی واشیان هەبووبێت، زۆری پێنەچوو کە لەبەرامبەر ئەو راستییانەی کە بەسەر سوریا زاڵ بوون وازیان لەو ئامانجەی خۆیان هێنا. لە راستیدا هەر لەدوای ئەوکاتەی کە فەرەنسییەکان لە ساڵی ١٩٢٠دا بیلادی شام یان سوریای گەورە'یان گرت، دەستیان بە دابەشکردنی ناوچەکە کرد.

ناوچەی ناوەوەی سوریا (لەسەر بنەمای ویلایەتەکانی عوسمانلی) بۆ ئەوەی لە ساڵی ١٩٢٤دا یەك بگرن، بەسەر دوو دەوڵەتی حەلەب و شام'دا دابەشکران. لەوەش زیاتر، فەرەنسییەکان بۆ کەمینە ئەتنی و دینییەکانیش دەوڵەتیان دروستکرد. لە جەبەل دورزی دەوڵەتێکی دورزی'یان دروستکرد کە پایتەختەکەی سوەیدا بوو. هەروەها لە کەناری عەلەوی'یشدا دەوڵەتێکی عەلەوی'یان دامەزراند کە پایتەختەکەی لازقیە بوو. لە جزیرە ( لەو قۆناغەدا زیاتر کورد و تورکمان تێیدا نیشتەجێبوون) و ئەسکەندەروون کە دانیشتوە تورکەکانی زۆر بوو، ناوچەی ئۆتۆنۆمی دامەزراند. دەکرێت ئەمانە و دامەزراندنی دەوڵەتی لوبنان وەك بەشێك لە هەوڵەکانی دابەشکردنی سوریا سەیر بکرێت. ئامانجی فەرەنسا ئەوەبوو کە کۆنترۆڵی خۆی لەسەر ئەو خاکانە گەرەنتی بکات کە بە دەستیهێنابوون. فەرەنسییەکان لە کۆتایی ١٩٢٠دا، دامودەزگاکا و

کارەکانی دەوڵەتی سوریایان بەشێوەیەکی ناتەواو هێشتەوە. ناکۆکی و دابەشبوونی پێکهاتە و ڕەگەزەکانی کۆمەڵگەی سوریا، لەسەرووی هەمووشیانەوە ناکۆکی مەزهەبی و رکابەربی ناوچەیی و درزی نێوان شار و لادێ نشینەکانیان قووڵتر کرد. میراتی دەسەڵاتی ماندای فەرەنسا، لەدوای سەربەخۆیی خەندەقێکی بۆ رژێمی سوریا دروست دەکرد.″(James Barr, A line in the Sand – Britain, France and the Struggle that Shaped The Middle East, Simon and Schuster, London, ٢٠١١, p. ١٢٩, ١٣٠)

چرووتژەی دابەشکردنی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بۆ دەوڵەتی بچووك بچووك، بە چرووتژەیەکی خۆرئاواوە نەوەستاوەتەوە کە ساڵی ١٩٢٠ بۆ دابەشکردنی خاکەکانی کورد و عەرەب لە ئیمپراتۆریای عوسمانلی - تەنانەت ئەگەر سەیری سیڤەر بکرێت بۆ دابەشکردنی خاکەکانی تورك'یش - هەوڵی جێبەجێکردنی دراوە. بەڵکو لە ساڵانی ١٩٨٠کاندا ئیسرائیل'یش میشکی خۆی بە″سیناریۆی ناوچەکە″بۆ دابەشکردنی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەسەر دەوڵەتی بچووك بچووکدا ماندوو کردووە.

دیپلۆماتێکی ئسیرائیل بەناوی ئـۆدد ینوون وتارێکی بەناوی″ستراتیژێك بۆ ئیسرائیل لە ١٩٨٠کاندا″بڵاوکردبووەوە. ئەو وتارە کە لە ژمارەی شوباتی ١٩٨٢ی گۆڤاری کیڤۆنیم (ئاراستەکان) ئۆرگانی راگەیاندنی رێکخراوی زایۆنیستی جیهانی کە لە قودس بڵاودەکرایەوە، چاپکرا و لەو رۆژانەدا دەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو، بەڵام دواتر باسێکی ئەوتۆی لێ نەکرا.

دەنگدانەوەی وتاری″ستراتیژێك بۆ ئیسرائیل لە ١٩٨٠کاندا″لە پێوەرێکی دیاریکراودا قەرزاری ئیسرائیل شاهاك بوو. ئیسرائیل شاهاك یەهوودییەکی پۆڵۆنی بوو کە ١٩٣٣-٢٠٠١ لە زانکۆی عیبرانی لە قودس پرۆفیسۆری کیمیا بوو. لە ساڵانی مناڵی خۆیدا راپەڕینی ئەفسانەیی گەڕەکی جولەکەنشینی ڤارشۆ بینیبوو و دوای ئەوەش لە کەمپی کۆکردنەوەی بێرگن - بێلسن'دا مابووەوە. دوای ئەوەش کە بوو بەسەرۆکی کۆمەڵەی مافەکانی مرۆڤی ئیسرائیل، ریز و پێگەیەکی تایبەتی بە دەستهێنابوو. ئەو نەیارێکی بێ ئامانی سیاسەتەکانی ئیسرائیل بوو. کتێبێکی رەخنەگرانەشی بەناوی″مێژووی جوولەکە، دینی یەهوودی - قورسایی سێ هەزار ساڵەی″بڵاوکردەوە و بەوهۆیەشەوە لە دنیای جوولەکەدا بە ئەندازەی پێویست دوژمنی بۆ خۆی پەیدا کردبوو. بەڵام مێژووی شەخسی ئیسرائیل شاهاك رێگربوو لەوەی کە بە ئاسانی مۆرکی دژە جوولەکەی لێ بدرێت. بەهۆی وتارێکەوە کە لە حوزەیرانی ١٩٨٢دا بڵاوی کردەوە و رەخنەی زۆر توندی لێ گیرا، وتاری″ستراتیژێك بۆ ئیسرائیل لە ١٩٨٠کاندا″ناوبانگێکی زۆری پەیدا کرد.

بەگوێرەی ئیسرائیل شاهاك، پلانەکەی ئۆدد ینوون بۆ ئەوەی ئیسرائیل درێژە بە مانەوەی خۆی بدات پشتی بە دوو پێشنیار دەبەست؛ ١. پێویستبوو ببێتە هێزێکی ئیمپریالی ناوچەیی. ٢. ناچاربوو رێگا بۆ دابەشبوونی هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان و دەوڵەتەکانی دیکەی ناوچەکە بۆ دەوڵەتی بچووك بچووك

خۆش بکات. هەر دەوڵەتێکی بچووکیش لەسەر بنەمای پێکهاتەی ئەتنی و مەزهەبی دادەمەزرا و لە ئەنجامیشدا ئەو دەوڵەتانەی کە لەسەر بنەمای ئەتنی یان مەزهەبی دادەمەزران، بەشێوەیەکی تەنزئامێز ڕەوایی مەعنەوی دەوڵەتی ئیسرائیل'یان دەستەبەر دەکرد.

یانی، هیوای زایۆنیزم ئەوە بوو کە بۆ مانەوەی ئیسرائیل، هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکانی ناوچەکە و هەموو ناوچەکە بەسەر دەوڵەتی بچووك بچووکدا دابەش بکرێن.

لە ڕاستیدا کاتێك کە وتاری "ستراتیژێك بۆ ئیسرائیل لە ۱۹۸۰کاندا"ی ئۆدد ینوون لە ئەرشیڤ دەربهێنرێت و بخوێنرێتەوە، دەکرێت ئەو ئەنجامەی لێ دەربکرێت کە پێشبینی و درکێکی بەهێزی سەبارەت بە ڕوخساری وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە ساڵانی ۲۰۱۰کاندا تێدا بووە. ئەو دیپلۆماتەی ئیسرائیل ئەمانەی نوسیبوو؛

"لە دنیای عەرەبی ئیسلامی... لە لوبنان، لە ئێران کە عەرەبی نییە، وەك ئەوەی لە سوریا'ی ئێستا دەیبینین، بەهۆی هەبوونی کەمینەی نەتەوەیی و فراکسیۆنی جیاوازەوە، قەیرانێکی وایان تێدایە کە لە پێوەرێکی سەرەنجڕاکێشدا دەتوانێت لە ناویان بەرێت. بەهۆی ئەوەی کە (دنیای عەرەبی ئیسلامی) ناتوانێت کێشە بنەڕەتییەکانی خۆی بەسەرکەوتوویی چارەسەر بکات، لەماوەی درێژخایەندا هەڕەشە بۆ ئیسرائیل دروستناکات. تەنها لە ماوەی کورت خایەندا، هێزی سەربازی دەستی (وڵاتانی عەرەبی ئیسلامی) واتایەکی هەیە. لە ماوەی درێژخایەندا کاتێك ئەو دنیایە (دنیای عەرەبی ئیسلامی) بە گۆڕانکارییەکی شۆڕشگێڕانەدا تێپەڕ ببێت، ناتوانێت بەم پێکهاتەیەی ئێستای خۆیەوە بەردەوام بێت. دنیای (دنیای عەرەبی ئیسلامی) بەپێچەوانەی ویست و ئارەزووی ئەو مرۆڤانەی لەوێ ژیاون، لەلایەن بیانییەکانەوە (لە ۱۹۲۰کاندا لەلایەن فەرەنسی و ئینگلیزەکانەوە) بە فێڵێکی کاتیی دروستکراوە و بەسەر نۆزدە دەوڵەتدا دابەشکراوە کە هەر کەمینە و گروپێکی ئەتنی دوژمنایەتی لەگەڵ ئەوی دیکەدا هەیە. بۆیە لەم ڕۆژانەدا لە هەر دەوڵەتێکی عەرەبی موسڵماندا یان لە ناوخۆ رووخانێکی ئەتنی کۆمەڵایەتی دروستبوو یان جەنگێکی ناوخۆیی بەرپا بووە..."

ئۆدد ینوون لە ڕوانگەی ستراتیژی ئیسرائیل'ەوە میسر و مەغریب وەك "بەرەی باکوور" ناودەبات و دوای باسکردنی خولیای دابەشکردنی میسر بە چەند دەوڵەتێکی بچووك و لاواز لەسەرووی هەمووشیانەوە دەوڵەتێکی مەسیحی قوبتی، دەچێتە سەر "بەرەی خۆرهەڵات" یانی بیلادی شام و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە میزۆپۆتامیا'ی تێدایە؛

"هاوشێوەی لوبنان، دابەشکردنی سوریا و دواتریش عێراق بەسەر ناوچەی تایبەتی ئەتنی و دینی... لە ماوەی درێژخایەندا لە ئامانجی سەرەکی ئیسرائیل دایە. سوریا بەپێی پێکهاتەی ئەتنی و دینی خۆی،

هاوشێوەی لوبنان'ی ئەمڕۆ دابەش دەکرێت. بەوجۆرەش لە کەرتی کەناریدا دەوڵەتێکی شیعەی عەلەوی و لە ناوچەی حەلەب دەوڵەتێکی سوننە و لە شام'یش دەوڵەتێکی دیکەی سوننە پەیدا دەبێت کە دوژمنی دراوسێ باکوورییەکەی خۆی دەبێت. دورزییەکان لە هاوران و باکووری ئوردن و تەنانەت لە گۆلان'ی ئێمەشدا دەوڵەتی خۆیان دادەمەزرێنن. ئەگەر رووداوەکان بەمجۆرە بچنە پێشەوە، لە ماوەی درێژخایەندا ئاشتی و ئاسایشی ناوچەکە گەرەنتی دەکەن و ئەگەری جێبەجێکردنی ئەمەش لە توانا و دەرفەتەکانی ئەمڕۆماندا هەیە.

عێراق لە رووی نەوتەوە دەوڵەمەندە بەڵام لە ناوخۆدا تێکچووە و لە ئامانجی ئیسرائیل دایە. بۆ ئێمە، دابەشبوونی ئەو وڵاتە لە دابەشبوونی سوریا گرنگترە. عێراق لە سوریا بەهێزترە و لە ماوەی کورتخایەندا هێزی ئەو وڵاتە گەورەترین هەڕەشە لەسەر ئیسرائیل دروستدەکات. جەنگێکی ئێران - عێراق دەتوانێت ئەو وڵاتە دابەشبکات و بە بێئەوەی دەرفەتی رێکخستنی تێکۆشانێکی فراوانی لە دژی ئێمە پێ بدات لە ناوخۆوە بەرەو رووخانی دەبات. لەماوەی کورتخایەندا، هەرجۆرە پێکدادانێکی ناوخۆیی عەرەبەکان سوودی بۆ ئیسرائیل هەیە و رێگای دابەشبوونی سوریا و عێراق وەك لوبنان، کورت دەکاتەوە. دابەشکردنی عێراق لەسەر هێڵە ئەتنی و دینییەکانی سوریا، هاوشێوەی دابەشکردنی ویلایەتەکان لەکاتی عوسمانلی شتێکی لەوانەبە. کەوابوو لە چوارچێوەی سێ شاری گەورەدا، سێ (یان زیاتر) دەوڵەت دادەمەزرێت؛ بەسرە، بەغدا، موسڵ و شیعەکانی باشوور لە سوننە و کوردەکان لە باکوور جیا دەبنەوە. ئەو پێکدادانەی ئێستا لە بەینی ئێران - عێراق'دا هەیە، دەرفەتی قووڵکردنەوەی ئەم جەمسەربەندییانە فەراهەم دەکات."

ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٨وە سنورەکانی خۆی فراوانتر کرد و گەورەتر بوو. ئەمەش بە ئەندازەی دیدگای ئەو وڵاتە کە ئاسایشی خۆی لە دابەشکردنی ناوچەکەدا بەسەر دەوڵەتی بچووك بچووك لەسەر بنەمای ئەتنی و مەزهەبی دەبینی، رۆڵی لە پەیدابوونی چەمکی فراوانخوازی ئیسرائیل'دا هەبوو.

ئەو بۆچوونەی کە گوایە ئیسرائیل دەیەوێت لەنێوان رووبارەکانی نیل و فرات'دا دەوڵەتێکی یەهوودی دابمەزرێنێت و لەبەر ئەوەش زۆرێك لە وڵاتانی بە تورکیا'شەوە کردۆتە ئامانجی فراوانخوازییەکانی خۆی، بە تایبەتی لەنێو هەندێك لایەنی ئیسلامیدا رەواجی هەبوو.

دوو هێڵە شینەکەی ئاڵای ئیسرائیل وەك بەڵگەیەکی ویستی ئەو وڵاتە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی یەهوودی لە بەینی نیل و فرات دەهێنرایەوە و باسی ئەوە دەکرا کە گوایە ئەو دوو هێڵە وەك ئاماژەیەك بە رووبارەکانی نیل و فرات دانراون. بەڵام ئەوە شتێکی خەیاڵی بوو. چونکە ئەو دوو هێڵە لەسەرپۆشی دۆعای تالیت'ی دینی یەهوود'ەوە وەرگیرابوون.

بەشبەحاڵی خۆم، ئەو بۆچوونانەم قبوڵ نەکرد کە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەپێی چرووتژەیەکی خۆرئاوایی

یان پلانەکانی ئیسرائیل دابەش دەکرێت و نیگەرانییەکی وام لا دروستنەبوو. بڕواشم بە پایەداربوون و مانەوەی ئەو سنورە دەسکرادانە نەکرد کە دوای جەنگی جیهانی یەکەم دانران و لە ساڵی ١٩٤٨دا ئیسرائیل'یشی پێ زیادکرا.

ئەگەری دابەشبوونی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە ئارادابوو، بەڵام ئەمە لەسەر بنەمای ئەتنی و مەزهەبی ناوچەکە نەدەبوو. تەنانەت جەنگی ناوخۆیی لوبنان کە ١٤ ساڵی خایاند و تا ئەندازەیەك هەموو قۆناغەکانی ژیاوم، نەیتوانی لوبنان دابەشبکات. هەروەها جەنگی ٢٠٠٣ی عێراق'یش ئەنجامی دابەشکردنی ئەو وڵاتە و سەرلەنوێ کێشانەوەی سنورەکانی لێ نەکەوتەوە.

ئەوکاتەی پ.ك.ك بە ئامانجی"کوردستانێکی سەربەخۆ و یەکگرتوو"جەنگێکی"جیاخوازانە"ی دەست پێکردبوو، تووشی ئەو نائارامی و بێ ئۆقرەییەی دابەشبوون نەبووم کە تورکیا'ی گرتبووەوە. لە قۆناغی جەنگی سارد'دا دڵنیا بووم لەوەی کە سیستەمی نێودەوڵەتی ڕێگا بە گۆڕینی سنورەکان و دابەشبوونی وڵاتێکی ئەندام لە سیستەمی ئەمنی ترانس ئەتلانتیك (ئەودیوی ئوقیانوسی ئەتڵەس) نادات. بیرم بۆ ئەوەش نەچوو کە ئەو پێکدادانانەی لەسەر بنەمای شوناس لەدوای جەنگی سارد دەرکەوتن، دابەشبوونی ئەتنی یان مەزهەبی ناوچەکەی لێ دەکەوێتەوە.

سەرەڕای ئەوەی هەموو کات و لە هەموو وەرچەرخانێکی مێژووییدا ئەم ئەگەرانە لە ئارادا بوون، بەڵام پێموابوو، ئەگەر شتی وەهاش رووبدات وەك نموونەیەك بۆ داهاتووی ناوچەکە جێگیر نابێت. لە رووی مێژووییەوە پێویستبوو هەموو ئەو وادانانە"کاتیی"بن.

کۆتایی جەنگی سارد لەگەڵ جیهانیبوون'دا هاوکات بوو. هەرچەندە جیهانیبوون ڕێگای بێ واتابوونی دەوڵەت - نەتەوەکان دەکاتەوە، بەڵام ئەمە بەجۆرێک نابێت کە بەهۆی دابەشبوونی ئەتنی و مەزهەبی و دامەزراندنی دەوڵەتی دیکەوە، دەوڵەتە نەتەوەییەکانی پێکهاتەی نوێ کۆتاییان پێبێت. بە پێچەوانەوە، دەوڵەتە نەتەوەییەکان لە ڕێی ناسینی مافەکانی شوناسە ئەتنی و مەزهەبییەکانەوە واتای خۆیان لە دەست دەدەن.

لەو چوارچێوەیەدا تەسەورم کرد کە تورکیا لە ڕێی ناسینی مافەکانی کورد و ئەنجامدانی پێویستییەکانی ئەوە، لە جیاتی دابەشبوون گەورەتر دەبێت. لە هەموو قۆناغەکانی بیرکردنەوە و هەڵوێستی سیاسی و هەڵسەنگاندنەکانمدا، ئەم بۆچوونە ڕێپیشاندەرم بووە.

گەورەبوونی تورکیا، لە ڕێی هەڵوەشاندنەوەی سنورەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم و لەو چوارچێوەیەشدا لە ڕێی کۆتاییهێنان بە نکۆڵیکردن لە شوناسی کوردەکان و لابردنی باری دابەشبوونی ئەوان لە بەینی سێ دەوڵەتی جیاوازدا مومکین دەبوو. هەر بەو هۆیەشەوە بەرگریم لە فیدراڵیزمی عێراق و

دروستبوونی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان و رۆیشتنی تورکیا بە ئاراستەی تێکەڵاوبوون لەگەڵ کوردستان ی عێراق کرد.

بە هەمانشێوە، لەو هیوایەی کە شۆڕشی عەرەبی سنورەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم دەسڕێتەوە و لەگەڵ کۆتاییهاتنی رژێمە دیکتاتۆرییەکاندا، کۆمەڵگەی عەرەبی ئازاد دەبێت و بەو هۆیەشەوە، خواستە یان ناخواستە، کوردەکان ی سوریا دەبنە خاوەنی پێگەیەك، هەیەجان و جۆش و خرۆش دایدەگرتم.

بە رای من بۆ ئەوەی هەموو ئەوانە واتایەك پەیدا بکەن، پێویست بوو تورکیا کێشەی کوردی خۆی چارەسەر بکات. خەیاڵی دروستبوونی بارودۆخێکی هاوشێوەی سنورەکانی بەلژیکا - هۆڵەندا - لۆکزامبۆرگ م لەنێو سنورەکانی تورکیا - عێراق - سوریا لای خۆم دروستکرد.

سەرەڕای ئەوەی کە ژیان بە هەڵبەز و دابەز و لادانەوە رەوتی خۆی دەدۆزێتەوە، خۆشحاڵ بووم کاتێ کە بینیم بەو ئاراستەیەدا گوزەر دەکات.

ئێوارەی رۆژی هەینی ٢٣ی مارتی ٢٠١٢ لە ماردین، لەبەرزاییەکی هەزار مەتر لەسەرووی ئاستی دەریا، رێك لە خوار ئەو قەڵا پایەدارەی کە لە کاتەکانی بەر لە مێژوو مابووەوە و لە تەراسی"مەدرەسەی زنجیرییە"کە لە ساڵی ١٣٨٥هوە مابووەوە، بەرەو خوار سەیری دەشتی پان و بێ کۆتایی میزۆپۆتامیا م دەکرد. هێشتا گەرمای هاوین دای نەدابوو و شێوەی دەریایەکی زەردی نەگرتبوو. لەو رۆژە یەکەمانەی بەهار، لەدوای نەورۆز، بەسەرسەوزییەکی بێ کۆتاییەوە وەك دەریاکەی ئیستانبوڵ، جوانییەکی رازداری هەبوو.

لە رێگای گەشتە بێشومارەکانمدا بۆ کوردستان ی عێراق، ماردین بۆ من وەك وێستگەیەکی ناچاری بوو. هەرچەندە بە دیمەنە نائاساییەکەی میزۆپۆتامیا لەوێ، ئاشنا بووم، بەڵام دیسان لە ژێر کاریگەریدا مامەوە.

کاتێ لە ماردین هوە سەیری دەشتاییەکانی میزۆپۆتامیا ی سەروو دەکەیت، سنورەکانی سوریا دەرناکەون. تەنها ئەوکاتە نەبێت کە لە وەختی داهاتنی تاریکاییدا، لە رێگەی ئەو رووناکییانەی کە شەو دەڕازێننەوە و بە چاوێکی وردەوە دەبینرێن، دەتوانیت هەست بە سوریا بکەیت.

عامودێ رێك لەبەرامبەردایە. تۆزێك بە لای راستیشدا، دەرباسیە ی لێیە. بەرەو خوار، کاتێ بەرەو دەشت دادەبەزیت و بە لای چەپدا بڕۆیت، دوای ٤٠-٤٥ خولەك دەگەیتە نوسەیبین. لایەکی ئەو رێگای ئاسنەش کە بە ناو نوسەیبین دا دەڕوات، لە قامشلۆ، گەورەترین شاری کوردنشینی سوریا دایە.

خۆی لە خۆیدا ئەو دەشتانەی میزۆپۆتامیا کە لە ماردین هوە دیارن و لە ئاسۆی نیگای مرۆڤدا درێژ دەبنەوە، ئەو ناوچانەی سوریا ن کە کورد زۆرینەی دانیشتوانەکانی پێك دەهێنن. ماوەی ٤٠-٤٥ خولەك لەدوای نوسەیبین، جزیرە دێت. لەوێدا دیجلە بەجۆرێک پێچ دەخواتەوە کە دیار نییە کام لای لە سوریا و

کام لای لە تورکیا دایە. تۆزێك لەولاتریش، سلۆپی و خابوور، یانی کوردستان'ی عێراق دێت. خاڵەکانی بە یەك گەیشتنی سنورەکانی تورکیا، عێراق و سوریا...

ئەو مرۆڤانەی لەم خاکانەدا دەژین، لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا بەشێوەی رۆحی بە ناوەندە نەریتییەکانی ژیان لە سوریا، یانی شام و حەلەب'ەوە نەبەسترانەوە. هەبێ و نەبێ، تەنها لە رووی ئیدارییەوە بەو شوێنانەوە گرێدران و بەو سنورە دەسکردانەی کە براوەکانی جەنگی جیهانی یەکەم دایاننان، لە برا نەتەوەییەکانیان لە تورکیا و عێراق جیا کرانەوە.

سنورەکانی تورکیا - سوریا لە پانتاییەکانی دەشتی میزۆپۆتامیای سەروو، هەروەها سنورەکانی تورکیا - عێراق لە لوتکەی سەخت و نەبڕی چیا بەرزەکاندا دەسڕێنەوە و لەناو دەچن.

خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ناوچەی ئەو سنورە بێ واتا و ناپێویستانەیە کە هێزەکانی دەرەوەی ناوچەکە دایانناون.

بەیانیی رۆژی چوارشەممە ٢٨ی مارت، لەگەڵ فەرەیدوون سینرلی ئوغلو باڵیۆز و راوێژکاری وەزارەتی دەرەوە، لەبەرامبەر دیمەنێکی جوان و سەرنجراکێشی دیکەدا بووین. لەکاتێکدا کە سەیری بەری ئاسیا'ی ئیستانبوڵ، لەسەرووی ئەوەشەوە تەماشای ئەیاسۆفیا و نیمچە دوورگەی مێژووییمان دەکرد کە سوڵتان ئەحمەد و کۆشکی تۆپ کاپی تێدایە و هەروەها سەیری ئەو دوورگانەمان دەکرد کە لە نیگای مرۆڤدا وەك دەنکی تەزبیح ریز دەبوون و تەماشای دەریای مارمارا'مان دەکرد کە وەك نوستوویەك خۆی راکێشابوو، لەبارەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست قسەمان دەکرد.

زۆرجار لەگەڵ فەرەیدوون سینرلی ئوغلو'دا لە پایتەختە جیاوازەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست پێکەوە بووین. تەنانەت جارێکیشیان، لە پایتەختێکی ناوچەکەدا پێکەوە دەربازی ساڵێکی نوێ ببووین. لە زاری خۆیەوە، باسی رۆڵی ئەوم لە شکڵگرتنی سیاسەتی نوێی تورکیا لە ساڵانی ٢٠٠٠ هکان بەرامبەر بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و دیدگاکانیم لەبارەی ناوچەکە بیستبوو.

لەو رۆژەدا سەبارەت بە ئەگەری دابەشبوونی عێراق گفتوگۆمان دەکرد و لەگەڵ عێراق'دا سەبارەت بە داهاتووی سوریا'ش پێشبینیمان دەکرد و وادانانەکانی خۆمان باس دەکرد. کتوپڕ وتم؛"فەرەیدوون! لەدوای رووخانی سوریا، سنورەکانی ناوچەکە دەگۆڕێن؟ چی دەڵێی؟"

-"دوای رووخانی رژێمی سوریا خۆ سنورەکان واتایەکیان نامێنێت! تورکیا و ناوچەکە لە رووی ئابورییەوە بەجۆرێک تێکەڵاو دەبن کە سنورەکان بێ واتا دەبن..."

باشە ئەی پێگەی کوردەکان'ی سوریا چی دەبێت؟ ئایا دوای رووخانی رژێم، کوردەکان'ی سوریا بە پێگەیەکی کەمتر لەوەی کوردەکان'ی عێراق لە تەنیشت خۆیانەوە رازی دەبن؟ بۆچی رازی بن؟ لەوەش

زیاتر، ئەگەر پێگەی کوردەکان‌ی سوریا و عێراق هاوشێوەی یەك بێت، کوردەکان‌ی تورکیا کە لە باکووری هەردوو سنورەکەدان و نیوەی هەموو کوردەکان پێکدەهێنن و لە رووی دەزگامەندی و ئەزموونی سیاسی لە هەموو پارچەکانی دیکە پێشکەوتووترن، بە پێگەیەکی کەمتر لە پێگەی کوردەکان‌ی دیکە رازی دەبن؟ لەکاتێکدا گۆڕانکاری گەورە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست روودەدات، تورکیا دەتوانێت بە بێ گونجان لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە و بە بێ دەسکاریکردنی ریشەیی پێگەی کوردەکان وەك خۆی بمێنێتەوە؟

دوای ئەوەی کوردەکان لە ١٩ی تەمووزی ٢٠١٢دا دەسەڵاتیان سەرەتا لە کۆبانێ، دواتر لە عەفرین و عامودێ و دێرك لە رژێمی بەعسی سوریا وەرگرت و دەرباسیە و قامشلۆ، گەورەترین شار و ناوەندی سیاسی کوردەکان‌ی سوریا لە ریزدا بوون تا دەسەڵاتەکانیان بگۆڕدرێت، زۆری پێنەچوو لە هەموو تورکیا دەست بەو پرسیارانە کرا.

کاتێ باسی ئۆتۆنۆمی یان"پێگەیەکی نوێ"بۆ کوردەکان کرا، جاریکی دیکە نیگەرانییەکانی تورکیا زیادیان کرد. میدیای تورك بە ئاماژەدان بە کوردستان‌ی عێراق، مانشێتی"کوردستان‌ی دووەم" لە تەنیشت تورکیا"یان لێدا و دەستەواژەکانی "کوردستان‌ی سوریا"و"رۆژئاوای کوردستان"نیگەرانییەکانی رای گشتی تورکیا‌یان زیاد کرد. دەوڵەتی تورك‌یش بە بێئەوەی کات بەفیرۆ بدات، کاردانەوەی باوی دژە کوردی پیشاندا.

لە زاری سەرۆك وەزیر تایب ئەردۆغان – وەك ئەوەی کە وتەکانی شانزە مانگ بەر لەو کاتەی خۆی وەبیر بهێنێتەوە کە لە رێگای هەولێر – ئەنقەرە‌دا بە مەرجی بڵاونەکردنەوە بۆ تیمەی باسکردبوو- رێك وشە و رستەکانی"کاتێ بەشێوەی ئاسۆیی لەوێ دەڕوانیت، بارودۆخێکی سەیر لە ئارادایە، بە تایبەتی لە قامشلۆ هەتا ئەو ناوچەیەی کە دەگاتە عەفرین... ناوچەی کۆبانی و فلان، دیارە ئەم شوێنانە هەستیارن..."دەرکەوتن.

رۆژی ١١ی تەمووز گرووپەکانی کورد لە سوریا، لەبەردەم مەسعود بارزانی‌دا سازشیان کردبوو و رێککەوتننامەیەکی حەوت خاڵییان ئیمزا کردبوو."ئەنجومەنی نیشتمانی کورد"کە لە ژێر کاریگەری و نفوزی مەسعود بارزانی دایە، لەگەڵ"ئەنجومەنی گەل"کە لە ژێر کاریگەری پ.ی.د‌دایە و ئەویش وەك باڵی پ.ك.ك لە سوریا سەیر دەکرێت، بڕیاریان دابوو هێزەکانیان یەك بخەن و بەو ئامانجەش"ئەنجومەنی باڵای کورد"یان دروستکردبوو کە هەر لایەك پێنج ئەندامی تێدا هەبوو.

رێککەوتننامەی هەولێر، لە روانگەیەکەوە سازشێکی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان‌ی عێراق و پ.ك.ك‌ی تورکیا بوو کە کاریگەری خۆی لەسەر کوردەکان‌ی سوریا دادەنا. هەفتەیەکیش دوای ئەوە، دەسەڵاتی شارە کوردییەکانی سوریا دەست ئەنجومەنی باڵای کورد کەوتبوو.

لەبەر ئەو ترس و دڵەڕاوکێیەی کە رووداوەکان لە تورکیا دروستیان کردبوو، تایب ئەردۆغان وتی؛"ئەو پێکهاتەیەی لەوێ (باکووری سوریا) دروستبووە هی کوردەکان نییە. بەڵکو هی پ.ك.ك و پ.ی.د‌یە و

ئەمەش لە هاوسەنگییە هەستناکەکانی ئێمەدا جێی نابێتەوە. ئێمە ناتوانین بەڵێ بۆ ئەو پێکهاتەیە بکەین.״

ئەحمەد داودئوغڵو وەزیری دەرەوەش ئەوەی پێ زیاد کرد کە پێکهاتەیەکی کوردی لە سوریا، ڕێگای دابەشبوونی گەورەتر لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست خۆش دەکات و کاردانەوەیەکی توندتری پیشاندا و وتی؛״ئەگەری شتی دیفاکتۆی وەها دروست بکرێت، عەرەبەکانی ئەوێ و تۆزێك لەولاتریش تورکمانەکان و نەسیری و دورزییەکان'یش بەڕێوەبردنی دیفاکتۆی وەها دروست دەکەن و سوریا وەك لوبنان'ی لێ دێت.״

بەوجۆرەش تورکیا رایدەگەیاند کە ڕێگا بە دروستبوونی پێکهاتەیەکی کوردی لە سوریا نادات و״هێڵە سوورەکانی تورکیا״کە زەمانێك بۆ باکووری عێراق'دانرا بوون، ئەمجارەیان بۆ کوردەکان'ی سوریا دەکێشران.

وادیاربوو ئەزموونی عێراق و سڕانەوەوی״هێڵە سوورەکانی تورکیا״کە زەمانێك زۆر پێیان هەستناك بوو، فەرامۆش کرابوون...

لەو کاتانەدا، چەندینجار جەختم لەوە کردبوو کە هەڵوێستی تورکیا بەرامبەر کێشەی کورد هەڵەیە و سیاسەتەکانی بەرامبەر عێراق جێبەجێ ناکرێن. بەو هۆیەشەوە درۆ و دەلەسە و بوختانی گەورەم بۆ هەڵبەسترا، بەڵام هەرچەندە بە نرخی لە کیس چوونی ساڵانێکیش بووبێت، دواجار هەڵوێستی تورکیا بۆ کوردەکان'ی عێراق لەسەر خاڵی پێویستی خۆیدا بوو.

فەرمانەکەی ئەنقەرە بۆ دانانی"هێڵی سوور״بۆ کوردەکان'ی سوریا'ش بڕی هیچ کوێ ناکات. چونکە ئەو جۆرە هەڵوێستانەی حکومەتی تورکیا، بەرهەمی سیاسەتە نادروستەکانی بەرامبەر کێشەی کورد لە ناوخۆی وڵاتەکەی دایە.

دەبێ فرمۆلەکە ئەمە بێت؛ ئەوەی بۆ کوردەکان باش بێت بۆ تورکیا'ش باشە...

مێژوو لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'دا ئیدی بەخێرایی دەڕوات و بۆ ئەوەی تورکیا پێی بگات، یان کێشەی کورد چارەسەر دەکات یان کێشەی کورد تورکیا چارە دەکات.

# سەفەر بەرەو بێ سنوری

**ئەگەر ناتاوێت فەرامۆش بکرێن، ئەو شتانە بنوسن کە بخوێنرێنەوە، یان هەندێک شت بکەن کە بنوسرێنەوە.**

**بنجامین فرانکلین**

**نوسینی مێژوو، رێگایەکی رزگاربوون لە باری قورسی رابردووە. نوسینی مێژوو، لە مێژوو رزگارمان دەکات.**

**بێندیتۆ کرۆک**

ئاراستەی مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەسەرەتاکانی ٢٠١١دا گۆڕا.

ئەو دینامیکانەی لەو ساڵەدا دەرکەوتن، دەریانخست ئەو سەرکردانەی کە وادەزانرا هەتاهەتایە حوکمی ئەو وڵاتانە دەکەن کە ناوەکانیان لەگەڵیاندا یەکیانگرتبوو، چۆن وەك ستوونێکی لەرزۆك لەبەرامبەر جەماوەرێکی بێ ناونیشاندا رووخان.

کۆمەڵگە"قارەمانەکان"و تاکە"ئاساییەکان"ی سەدەی ٢١، شوێنی"قارەمانەکان"و"مێژووسازەکان"ی سەدەی ٢٠یان دەگرنەوە. هیچ کەسێك وەك سەرکردە یان قارەمانی پێشەنگ بۆ گۆڕانی شۆڕشگێڕانە و بەڕێوەبردنی جوڵانەوەی جەماوەری گەورە لە میسر و سوریا دەرنەکەوت. وادیارە سەدەی ٢١، هەموو شتەکانی سەدەی رابردوو پێچەوانە دەکاتەوە و سیستەمەکان و یاساکانی گەمەکردنیان دەگۆڕێت.

ئەوکاتەی بڵێسەکانی ئاگری گۆڕانکارییەکی گەورە لە تونس کەوتنەوە و لە ٢٠١١/١/٢٥دا میسر'یان گرتەوە، درکم بەوە کرد کە لەسەرووی هەموویەوە ناوچەکە و دواتریش جیهان دەخاتە ژێر کاریگەری خۆی و لاپەڕەیەکی نوێ و درێژی مێژوو دەکرێتەوە.

بە خۆشی و هەیەجانی درکی پێشوەختەی خۆم بەو گۆڕانکارییە، نوسینەکانی خۆم لەبارەی رووداوەکان بڵاوکردەوە و لە سێیەم رۆژی خۆپیشاندانەکانی مەیدانی تەحریر'دا یانی لە ٢٨ی مانگدا، قوباد تاڵەبانی کوڕی جەلال تاڵەبانی و نوێنەری حکومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق لە واشنتن، لە دووری هەزاران کیلۆمەترەوە پەیامێکی بۆ ناردم.

قوباد وەهای نوسیبوو؛"دەتوانیت کەسێك لە دەرەوەی شۆڕش بهێڵیتەوە، بەڵام ناتوانی شۆڕشگێڕییەکەی ناخی لابەریت. تۆ کەسێکی وەهای."

ئایا ئەمە تەنها پیاهەڵدان بوو یان هەڵسەنگاندنێکی میهرەبانانەی خەیاڵپەرستیی من بوو؟

شۆڕشی عەرەبی گەیشتە میسر و زۆری پێنەچوو کە زووتر لەوەی من تەسەورم دەکرد لە دەرگای سوریا'شی دا و ئەوەش جۆش و خرۆشێکی گەورەی لە مندا دروستکرد. دیارە پابەندبوونم بە ناوچەکە و حەز و خۆشەویستی و نزیکیم لە خەڵکەکەی و نائارامی ویژدانم بەرامبەر بەو زوڵم و ستەم و جەورەی کە دەیانکێشا و جگە لەوانەش، قوباد تاڵەبانی واتەنی"شۆڕشگێڕییەکەی ناخم کە لانەدەبرا"لە دروستبوونی ئەو جۆش و خرۆشەمدا رۆڵیان هەبوو.

جگە لە هەمو ئەوانە، شتێکی دیکەش هەبوو. درکم بەوە دەکرد کە شۆڕشی عەرەبی ئاسۆیەکی گەورە و فراوان لەبەردەم کوردەکان و لە رێی ئەوانیشەوە لەبەردەم تورکیا دەکاتەوە.

لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم، سیستەمی ناوچەیی کورەکان'ی لەسەر نەخشەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست سڕیبووەوە. بەڵام لە قۆناغی دوای جەنگی سارد، بە تایبەتی لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی لە عێراق روویاندابوو، کوردەکان لە سەکۆی مێژووەوە دەرکەوتن.

ئەگەری ئەوە هەبوو شۆڕشی عەرەبی کە لە ٢٠١١دا دەستپێکردبوو، رێگای یەکگرتنەوە و دەربازبوونی کوردەکان لەو سنورانەی کە دابەشی کردبوون بکاتەوە. تورکیا'ش دەیتوانی لە رێی پەیوەندییەکی"فیدرال"یان"کۆنفیدراڵ"لەگەڵ کوردەکان، لە واتایەکدا وەك"رۆمای خۆرهەڵاتی دیموکراتی"جارێکی دیکە لە مێژوودا دەرکەوێتەوە.

ئەم لاپەڕە نوێیەی مێژوو، دەتوانێ کۆتایی بەو دابەشکارییە بهێنێت کە لەکاتی سایکس - پیکۆت و قۆناغی دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە لە ناوچەکەدا دروستکرابوو. هەروەها دەتوانێت سنورەکان بسڕێتەوە و زەمینەی یەکگرتنەوەی ناوچەکە فەراهەم بکات. ئەمە، تەنانەت ئەگەر ساڵانێکی درێژ و قۆناغێکی خوێناوی و پڕ ئازاریش بخایەنێت، دیسان شتێکی لەوانەبە.

لەوانەیە من جارێکی دیکە خەیاڵم کردبێت.

لەوانەیە دەیان ساڵە بەدوای خەیاڵێك کەوتووم کە پۆختەکەی ئەوەیە سنورەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم هەڵبوەشێنەوە و تورکیا لە لەگەڵ کوردەکان'دا لە ئاشتی و یەکگرتوویيدا بێت و بەشێوەیەکی بەهێز و تەندروست، وەك کۆمەڵگەیەکی دیموکراتی و مۆدێرن لە دنیا دەرکەوێت.

لە راستیدا دەیان ساڵ لە خۆرهەڵاتی ناوەڕست'دا بەدوای ئەو خەیاڵە گەڕاوم. ئەمەش گەشتێك بوو بۆ دۆزینەوەی خۆرهەڵاتێکی ناوەڕاست کە لە داهاتوودا، هاوشێوەی رابردوو، فرە دین، فرە مەزهەب، فرە کەلتوور و فرە نەتەوە بێت و بە سنورەکانی ئێستایەوە بە یەکگرتوویی بمێنێتەوە...

ئانتۆنی شادید'ی هاوڕێم کە بیست ساڵ لە من مناڵتر بوو، لە ١٦ی شوباتی ٢٠١٢دا کاتێك ویستبووی بە نهێنی لە سنوری سوریا'وە دەربازی تورکیا بێت، بەهۆی تەنگەنەفەسی گیانی لە دەسدا و بەو هۆیەشەوە

لە تەنیشت خاکی تورکیا، کۆتایی بە گەشتەکەی لە بیلادی شام و میزۆپۆتامیا و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هات کە بە هەزار و یەك مەترسی و گرفتەوە ئەنجامی دابوو.

ئانتۆنی ماوەیەکی کورت بەر لە مەرگی خۆی لە چاوپێکەوتنێکدا وتبووی؛"مێژووی سەد ساڵی رابردووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، لە روانگەیەکەوە مێژووی سنورەکان بووە کە بە زۆری بە ویست و ئارەزووی ئیمپریالییەوە دانراون. بەڵام لە هەمانکات، ئەوانە سنورەکانی زەینەکانیشمانە کە لەبەر جیاوازی شوناسەکانمان بەرتەسك بوونەتەوە.

دە رۆژ دوای مردنی، کتێبێکی ئۆتۆبیۆگرافی ئانتۆنی شادید بەناوی"ماڵی بەردین؛ ماڵێك، بنەماڵە و خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی دۆڕاو"کەوتە بەر دیدەی خوێنەرانی.

لەدوایین وتەکانیدا کە بۆ بڵاوکەرەوەی کتێبەکەی ناردووە، باسی مارژایۆن لە باشووری لوبنان'ی کردووە کە رەچەڵەکی بنەماڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوێ و قسەی لەسەر سەلانیك کردووە کە من لەسەری دایکەمەوە خەڵکی ئەوێم و بەوجۆرەش جارێکی دیکە باسی"سنور"ی کردۆتەوە؛

"دانانی سنورەکانی سەدەی بیستەم، رێگای بۆ هەژانی گەورە و بچووك لە ناوچەکەدا کردەوە. پاکسازییە دینی و ئەتنییەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم، بەشێکی گەورەی فرە رەنگی و فرە جۆریی تورکیا و یۆنان'یان لەناو برد. کارەساتی نەتەوەگەرایی و هۆلۆکۆست لە شێوەی مۆدێرنی خۆیدا، روخساری سەلانیك'ی گۆڕی کە بە فرە نەتەوەیی و تێکەڵاوبوونی خۆیەوە بە ناوبانگ بوو. پێموایە مارژایۆن وەك پەراوێزێکی سەلانیك بوو. وا بیرم دەکردەوە کە ئەوانەی لە مارژایۆن دەژین، هیچ کات بیری سەردەمی عوسمانی ناکەنەوە. چونکە، لەو سەردەمەدا قەتڵوعام و کوشتاری روویداوە و لە رووی بازرگانی و باجەوە دەرهەق بە یەهوودی و مەسیحییەکان جیاکاری دەکرا. لەو رۆژانەدا شتێك بەناوی یەکسانی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا کەوتمە ژێر کاریگەری ئەو نۆستالژیایەی کە زۆر کەس بەرامبەر کات و شوێنی ئیمپراتۆریای عوسمانی هەیبوو. هەرچی بێت، بازرگانەکانی مارژایۆن لە رێی فەلەستین'ەوە دەچوونە ئەلعریش لە کەناری نیمچە دوورگەی سینا و لەوێشەوە لە رێگای نیل، بەرەو خوار، بەرەو سودان دەڕۆیشتن کە کارێکی ئاسان نەبوو. مارژایۆن، وێستگەیەکی نێوان هاوران، عەمباری گەنمی باشووری سوریا و کەناری فەلەستین لەگەڵ عەکا گەورەترین بەندەری بیلادی شام بوو. ئەو سنورانەی لەگەڵ جەنگی جیهانی یەکەم و دوای ئەو دروستکران، بارودۆخی پێشووی مارژایۆن'یان تێکدا و مەرگی شوناسی ئەویان لەگەڵ خۆیان هێنا. ئایدۆلۆژییەکانی ئەو سەردەمە – نەتەوەگەرایی عەرەبی، نەتەوەگەرایی پان سوری و کۆمۆنیزم – خەیاڵی کۆمەڵگەیەکی فراوانتریان دروست دەکرد. بەڵام، لەدوای جەنگەکانی ١٩٤٨ و ١٩٦٧ لە دژی ئیسرائیل، ئەو ئایدۆلۆژییانە لەبەرامبەر سنورە تازەکاندا شکستیان خوارد. لەگەڵ سنورە تازەکاندا، واتای کەسایەتیش

بچووک بووەوە. کاتێك جەنگی ناوخۆی لوبنان لە ١٩٧٥دا بەرپا بوو، شوناسەکان شوێنی ئایدۆلۆژییەکانیان گرتەوە و زۆرێك لەوانەی لە مارژایۆن بوون، خۆیان تەنها وەك مەسیحی و تەنانەت ئۆرتۆدۆکسی رۆمی لە قەڵەم دەدا..."

بڵاوکەرەوەی کتێبەکەی، پرسیاری "هەموو ئەمانە لە کوێی راپەرینەکانی ئێستای عەرەب دان؟" لە ئانتۆنی شادید کردووە و ئەویش لە وەڵامدا وتوویەتی؛

"... یەکێك لەلایەنە سەرنجڕاکێشەکانی ئەو ئاڵۆزییەی کە لە ناوچەکەدا لە تونس هەتا بەحرەین دەبینرێت، هێزی دەرخستنی بیروبۆچوونی نوێیە سەبارەت بە کۆمەڵگە و تاك و هاوڵاتیبوون کە لە جەوهەری خۆیدا پێویستی بە هێزی خەیاڵ هەیە... ئەمەش هێزی خەیاڵێکە کە پەیوەندی بە توانای تێگەیشتن لە کۆمەڵگەیەکی فراوان هەیە کە لەوەی سەدان ساڵی رابردوو جیاوازتر بێت و شوێنی تێگەیشتنێکی رووت لە ماڵەکەمان (لە واتای نیشتمانەکەماندا) بگرێتەوە..."

دوای ئەو روونکردنەوەیە، بڵاوکەرەوەی کتێبەکەی، پرسیارێکی دیکەی لە ئانتۆنی شادید کردووە و وتوویەتی؛ "لە کتێبەکەدا زوو زوو باسی لەوانت دەکەیت، ئەمە چ جۆرە چەمکێکە و لە پێناسەی شوناسەکاندا لە چ شوێنێکدا جێی دەبێتەوە؟"

وەڵامی هاوڕێکەی من، پۆختەی ئەو وەڵامە بووە کە من ماوەی چل ساڵە لە گەشتەکەمدا بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، لە تورکیا'وە بۆ میزۆپۆتامیا و بیلادی شام بەدوایدا گەڕابووم.

"من هەموو کات وەك شکڵێکی کۆنتر و سینگ فراوانتر و واتادارتری خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی ئێستا بیرم لە لەوانت کردۆتەوە. ئەوەش بەر لە هەموو شتێك جموجۆڵێك بوو و ئەنتی تێزی ئەو سنورانە بوو کە پێشتر باسم کردن. جیاوازییەکان تێکەڵاوی یەکتر بوون و سەرەڕای ئەوەی سەردەمی عوسمانی پڕاوپڕ بووە لە ئاڵۆزی و خوێنڕشتن و کوشتار، بەڵام وڵاتەکەی من مەیدانی بە یەك گەیشتنی زمان و کەلتوور و دین و نەریتەکان بوو. لانیکەم، لە بیرکردنەوەدا دیدگایەکی روون و کەلتوورێکی تێکەڵاوی هەبوو..."

منیش هیچ کات لەگەڵ سنورەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کە تێیدا میراتی عوسمانی دابەشکرا، لە ئاشتیدا نەبووم. لە شەوێکی کۆتایی حوزەیرانێکی گەرمدا، لە ساڵی ١٩٧١، بە بێ پاسپۆرت بە نهێنی لە تورکیا'وە دەربازی سوریا بووم. لە ماوەی سێ ساڵیشدا بەردەوام بە بێ پاسپۆرت هاتوچۆی نێوان سوریا و لوبنان'م کرد. لەو کاتانەشدا، هەرکاتێک سەیری گۆلان'ی سوریا و لە باشووری لوبنان'هوە سەیری سەنگەرەکانی ئیسرائیل'م دەکرد، دەمزانی ئەوێ خاکی فەلەستین'ە و سنورێکی بەناوی ئیسرائیل تێدا کێشراوە و فیدایییەکان بە بێ پاسپۆرت دەچنە ئەوێ و بە هیوای وەرگرتنەوەی نیشتمانە لە دەست چووەکەیان گیانی خۆیان بەخت دەکەن.

ماوەیەك دواتریش دەمزانی کە لە راستیدا تێکۆشانی رزگاری فەلەستین، لە واتایەکدا تێکۆشانی سڕینەوەی سنورەکان بووە.

سنوری تورکیا – سوریا کە من لەوێوە تێپەڕ ببووم، ڕێگایەکی ئاسن بوو کە لەسەردەمی عوسمانی دا بۆ بە یەك بەستنەوەی مرۆڤەکان دروستکرابوو. بەڵام، دواتر وەك سنورێك بۆ دروستکردنی وڵاتان و لێك دابڕانی مرۆڤەکان بەکارهاتبوو کە دەربازبوون لێی ئاسان نەبوو.

بە پێدانی بەرتیل بە ژەندرمەی تورك، لەگەڵ قاچاخچییە کوردەکان کە ڕێبەرمان بوون، لە خاکە مینرێژکراوەکانی سنور تێپەڕ بووین و دوای ئەوەش، بۆ پشوویەکی کورت لە ماڵێکی گوندێکی عەرەب لاماندا. لە ماڵی کابرای عەرەب کە جلوبەرگی ناوچەکەی خۆیانی لەبەر کردبوو، یەکەم شتێك کە سەرنجی راکێشام، وێنەیەکی گەورەی جەمال عەبدولناسر بوو. نەغمەکانی مۆسیقای عەرەبی لە رادیۆی کابرا بەرز دەبوونەوە. لەوە دەچوو سنورەکان لە روویەکەوە راست بن. کتوپڕ دنیامان گۆڕا بوو.

دوای دەرکەوتن لە تورکیا و دوو هەفتە دوای گەیشتن بە شام، بۆ مەشقی سەربازی رەوانەی کەمپێك کراین لە نزیك گوندی مەعلوولە کە ماوەی یەك کاتژمێر لە باکووری خۆرهەڵاتی پایتەختی سوریا دوور بوو. مەعلوولە لە کاپادۆکیا'ی تورکیا دەچوو. گوندێکی مەسیحی بوو کە هەموو دانیشتوانەکەی دەیانتوانی بە"ئارامی"، ئەو زمانەی کە حەزرەتی عیسا قسەی پێ کردووە قسە بکەن.

دوای مانگ و نیوێك مانەوە لە مەعلوولە، رەوانەی گۆلان کراین. کەمپی فیداییەکانی فەلەستین کە ئێمەیان تێدا جێگیر کرد، بە گوندەکانی دورزییەکان'ەوە دەورە درابوو. بۆ یەکەمجار لەوێ بە هەبوونی دورزییەکان'م زانی.

دوای ماوەیەکی کورت دەربازی لوبنان بووین و لەوێش، لە کەمپی پەنابەراندا لە باشوور کە بە شیعەکان'ەوە دەورە درابوو، لەگەڵ مۆزائیکی مەزهەبی لوبنان و پەنابەرانی فەلەستین ئاشنا بووم کە لە ساڵی ١٩٤٨هەوە ماڵ و حاڵی خۆیان جێهێشتبوو و لە مەینەتی و چەرمەسەریدا دەژیان. لە رەشیدیە'وە کە دەکەوتە باشووری شاری دیواریی مێژوویی فینیقییەکان، رەئس ناکورا دیاربوو کە ماوەی ٥-١٠ خولەك لەوێوە دوور بوو. ئەوێ سنوری ئیسرائیل بوو، نەدەکرا بە پاسپۆرتیش دەربازی ببیت. لەدوای ئەو شوێنەوە یەهوودییەکان دەژیان.

لە ماوەی مانەوەمدا لە بەیروت، هەموو مەزهەبەکانی ئیسلام و مەسیحی'م لە شارێ و هەموو شوێنەکانی لوبنان'دا وەك خاڵەکانی پێستی پڵنگێك بینی. ماوەی یەك ساڵ بە بەردەوامی لەکەمپی بورج ئەلبارجنی گەورەترین کەمپی پەنابەرانی فەلەستین کە دەکەوتە خوار فڕۆکەخانەی بەیروت مامەوە و لەوێ پیرەمێردێکی فەلەستینی بەمجۆرە دەردی دڵی بۆ کردبووم؛

"لەسەردەمی عوسمانی'دا قودس هی ئێوە بوو، ئیستانبوڵ هی ئێمە بوو. سنور نەبوو. ئێستا نەك هەر ناتوانین بگەڕێینەوە بۆ فەلەستین، تەنانەت ناتوانین سەردانی شام'یش بکەین. ناتوانی بە ئاسانی لە شام'هوە دەربای بەغدا'ش بیت. هەموو لایەك سنورە. کامیان باشترە، ئەو رۆژانە یان ئەم رۆژانە؟"

ساڵی ۱۹۷۲ بوو. سێ ساڵ دوای ئەوە، لە ۱۹۷۵دا جەنگی ناوخۆیی لوبنان دەرکەوت. لەو وڵاتەی کە لە باشوورەوە لە سنورەکانی ئیسرائیل لە فەلەستین'هوە گیرابوو و لە خۆرهەڵات و باکوور'یشەوە بە سنورەکانی سوریا دەورە درابوو، بەپێی سەنگەربەندییەکانی جەنگی ناوخۆیی، سنوری سەربازی نوێ دروستکرابوون کە بە بێ شەڕ ئاسان نەبوو لێیان تێپەڕ بیت. وەك ئەوە وابوو کە لوبنان بەپێی ئەو شوناسانەی کە لە هەناویدا هەن، بەسەر بەشی بچووك بچووكدا دابەشکرا بێت.

ئەو قۆناغە تێپەڕ بوو. شوناسەکان مانەوە و لوبنان'یش لەناو نەچوو. مایەوە، بەڵام ئیدی لوبنان'ی جاران نەبوو.

دەکرێ بگوترێت لە لوبنان، یانی لە بەیروت سواری شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا بووم کە تێیدا گەشتێکم لە رابردوو بۆ داهاتوو ئەنجامدا. جەلال تاڵەبانی سەرکردەی کوردی عێراق کە دواتر بووە یەکەم سەرکۆماری هەڵبژێردراوی مێژووی عێراق، لە بەیروت منی بە کوردەکان'ی سوریا ناساند. منیش ساڵانێك دواتر، ئەو سەرکردەیەی کوردی عێراق'م بەسەرکۆماری تورکیا ناساند. تورکیا، دەستی بە فێربوونی ئەوە کرد کە بە بێ کوردەکان و بە بێ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مێژووی خۆی، ناتوانێت بە رووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'دا بکرێتەوە و ناتوانێت سنورەکان تێپەڕ بکات.

نزیکەی سەد ساڵ بەر لە ئێستا مومکین نەبوو دەوڵەتێکی نەتەوەیی لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دامەزرێت کە بەپێی دۆگماکانی کاتی دامەزراندن، درێژە بە مانەوەی خۆی بدات. یان بچووك دەبێتەوە یان گەورەتر دەبێت. وەك خۆی نامێنێتەوە.

هەرچەندە تورکیا بەتەواوی وڵاتێکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نییە، بەڵام لەگەڵ سنورەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەمدا، سنورەکانی لەگەڵ وڵاتانی ئەو ناوچەیە دیاریکرا. خۆی لە خۆیدا لەگەڵ شکستی جەنگی ۱۹۱۲ی باڵکان، سنورەکانی خۆرئاوای دیاریکران. کەوابوو، وادیارە شکڵگرتنی جوگرافی و زەینی نوێی تورکیا، وابەستەی رووداوەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی ئەو فۆرمەی کە کێشەی کورد پەیدا دەکات دەبێت.

بۆ رێگرتن لە دابەشبوونی، ماوەی تەمەنێك لە هەوڵی گەورەکردنی تورکیا'دا بووین. لای ئێمە، ئەوە واتایەی لە گەورەبوون دەردەکەوت، فراوانکردنی سنورەکان و بەدەستهێنانی خاکی زیاتر نەبوو، بەڵکو گەورەبوونی زەینی و لابردنی ئاستەنگەکانی ئەو رێگایە بوو کە ئەویش لە رێی چارەسەرکردنی کێشەی

کورد و یەکگرتوویی نێوان تورکیا و کوردەکان‌ی ناوچەکەوە تێپەڕ دەبوو.

مەرجی سەرەکی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تورکیا ئەوەیە کە یەکسانی کورد - تورك لە رووی زەینی و ئیدارییەوە جێبەجێ بکرێت. ئەو تورکیا‌یەی کە سنورە زەینییەکان تێپەڕ بکات، دەتوانێت ئەو سنورانە بێ واتا بکات کە خۆرئاوا لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا بۆ دابەشکردنی ناوچەکە دایناون.

مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، بەو ئەندازەیەی کە قۆناغی ئیمپراتۆریا گەورەکان دەگرێتەوە کە دوایین ئیمپراتۆرییان هی عوسمانی بووە و تێیاندا ناوچەکە وەك یەکەیەك هەبووە، بەو ئەندازەیەش قۆناغی دابەشبوونی ناوچەکە بۆ یەکە و بەشی بچووکتریش لە خۆ دەگرێت. ئایا لەدوای ٢٠١١، بەرەو دابەشبوون و بچووکبوونی زیاتر دەچین، یان بەرەو کۆتایی هێنان بەو دابەشبوونەی کە نزیکەی سەد ساڵ بەر ئێستا روویداوە هەنگاو دەنێین؟

نازانم.

وەك ئەوەی کە هێشتا پێشبینییەکم بۆ ئەمە نییە، ئەوەش نازانم کە ئایا بە چاوی خۆم دەیبینم یان نا؟

رێك لەم خاڵەشدا وتەیەکی رەسەنی ئەمریکییەکان دەکەوێتە مێشکم کە دەڵێت؛"خودی گەشتەکە لە گەیشتن بە خاڵی کۆتایی گرنگترە."

پەندێکی پێشینەی چینییەکان‌یش دەڵێت؛"خەڵات، خودی گەشتەکەیە."

گەشتەکەی منیش لە شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا، خەڵاتێك بوو کە ژیان پێشکەشی کردم.

# وێنەکان

١- لە تورگوت ئوزال'ەوە بۆ تایب ئەردۆغان؛ لەگەڵ تایب ئەردۆغان'دا، ٢٨ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٥ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

٢- قسەکردن لەسەر کێشەی کورد لە بارەگای فەرماندەیی گشتی سوپادا؛ پۆل ڤۆلفۆویتز – ئیلکەر باشبوغ، ٢٠ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٣ (ئەرشیڤی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا)

٣- وێستگەکانی خۆرهەڵات؛ لوبنان ١٩٧٣، (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

٤- یەکتربڕی چانقایا؛ میوانداربیەکی کۆشکی چانقایا، سەرەتای ١٩٩٣ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

٥- بت شکێنەکەی کۆشك؛ لەگەڵ واسلاڤ هاڤەل سەرکردەی شۆڕشی مەخمەڵین و تورگوت ئۆزال، کۆشکی هرادکنا'ی پراگ، ئەیلولی ١٩٩١ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

٦- کرانەوەی کورد لەگەڵ رۆژنامەنوساندا؛ لەگەڵ کامەران قەرداغی'دا لە کۆنفرانسی رۆژنامەوانی راگەیاندنی ئاگربەست لەلایەن عەبدولڵا ئۆجالان لە قەزای بارئەلیاسی لوبنان (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

٧- قوماری ئەودیو سنور؛ ئۆزال، تاڵەبانی، مەسعود بارزانی، محەمەد بەحرەلعلووم و د. موزەفەر ئارسڵان، کۆشکی چانقایا،٢ی ئەیلوولی ١٩٩٢.

٨- بەیروت بەیروت؛ کەمپی بورج ئەلبارجنی، بەیروت ١٩٧٣ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

٩- وەك خەون و خەیاڵ؛ لەگەڵ یاسر عەرەفات'دا، لەکاتی کردنەوەی نوێنەرایەتی فەتح، ئەنقەرە ١٩٧٩ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

١٠- هەزار و یەك چیرۆك لەبارەی دیجلە؛ ناوەندی بەغدا، تەمووزی ٢٠٠٣ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

١١- هاوڕێ و هاوڕێی یەکان؛ لەگەڵ جەلال تاڵەبانی'دا لە ژووری سەرۆکایەتی کۆمار، بەغدا، سەرەتای ٢٠٠٦ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

١٢-ئەرگەنەکۆن‌لەباکووری‌عێراق؛ئەوناوەندی‌هێزی‌تایبەتی‌تورکیاکەرووداوی"توورەکە"ئەمریکاییەکان لەوێ روویدابوو، سەرەتای ٢٠٠٤ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

١٣- لە دراوسێ وە بۆ دراوسێ؛ لەگەڵ عەلی ئەکبەر ویلایەتی وەزیری دەرەوەی ئێران، تاران ١٩٨٧ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

١٤- مەتەڵی گەورە؛ سارنات، مارتی ١٩٩٩ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

١٥- قورسایی تاقەت پڕوکێنی لایەنگری کردن لە جەنگ؛ هێزە داگیرکەرەکانی ئەمریکا لە عێراق، سەرەتای ٢٠٠٤ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

١٦- ئەندازیاری خەیاڵ پەرست؛ پۆل ڤۆلفۆویتز (ئەرشیڤی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا)

١٧- نوسینەوەی مێژوو بەشێوەیەکی راست؛ لەگەڵ سەرۆك کۆمار عەبدوڵا گویل لە مەیدانی ئیسفەهان نەقشی جیهان، شوباتی ٢٠١١ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

١٨- یاداشتەکانی کاروانسەرا؛ لە ماڵی بەرهەم سالح، تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

١٩- ناتەواوی زگماکی؛ ئەمیر فەیسەڵ و لۆید جۆرج، ز سیەر، ٢٧ی ئەیلوولی ١٩١٩ (Susan Meiselas, Kurdistan; In the Shadaw of History, Random House, ١٩٩٧)

٢٠- ناوجەرگەی کوردستان؛ لەگەڵ مەسعود بارزانی‌دا لە میوانخانەی سەلاحەدین، تەمووزی ٢٠٠٣ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

٢١- سنورە کێشراوەکان و گەلانی دابەشکراو؛ لە یەکەم کۆبوونەوەی مەجلیسی حوکم کە دوای سەدام دروستکرا و نوێنەرایەتی هەموو عێراقییەکانی دەکرد، بەغدا، تەمووزی ٢٠٠٣ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

٢٢- تاقیکردنەوەی کورد لەگەڵ ئاگر؛ چاوپێکەوتن لە گەل موراد قەرەیڵان، قەندیل، تشرینی دووەمی ٢٠١٠ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

٢٣- هەوڵەکانی چارەسەریی و حاڵەتەکانی بێچارەیی؛ لەگەڵ جەم بۆینەر‌دا لە رێگاکانی خۆرهەڵات، ١٩٩٤ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

٢٤- یان یەکسانی یان یەکسانی؛ مستەفا کەمال و دیاپ ئاغای دەرسیمی (Susan Meiselas, Kurdistan; In the Shadaw of History, Random House, ١٩٩٧)

٢٥- خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەرەو کوێ دەڕوات؟ دیدار لەگەڵ وەلید جونبەڵات، ئیستانبول، ٢٠١٠ (ئەرشیڤی جەنگیز چاندار)

له بەیروت سواری شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا بووم کە تێیدا لە رابردووەوە بۆ ئاینده گەشتم کرد. جەلال تاڵەبانی سەرکردەی کورد کە دواتر بووە یەکەم سەرکۆماری هەڵبژێردراوی مێژووی عێراق، لە بەیروت منی بە کوردەکانی سوریا ناساند. منیش ساڵانێك دواتر ئەو سەرکردەیەی کورد'م بە سەرکۆماری تورکیا ناساند. تورکیا وردە وردە فێری ئەوەبوو کە بە بێ کوردەکان و بە بێ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ رابردوو ناتوانێت بە رووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست'دا بکرێتەوە و سنورەکان تێپەڕ ناکات. ئەو وڵاتەی کە نزیکەی سەد ساڵ بەر لە ئێستا لە شێوەی دەوڵەت - نەتەوە دامەزرا، ناتوانێت ئیدی بە گوێرەی بنەماکانی دامەزراندنی خۆی لەسەر پێ بمێنێتەوە. یان بچووك دەبێتەوە یان گەورەتر دەبێت، بەڵام وەك خۆی نامێنێتەوە.

شەمەندۆفێری مێزۆپۆتامیا وەك ئاو رێگای خۆی دەگرێت و دەڕوا. هەر وێستگەیەکی ئەم گەشتە مێژووییە، کلیلێکی دەرگاکانی عەقڵ و دڵمان پێدەبەخشێت. جەنگیز چاندار کاتێك باسی راستییەکان دەکات هەستناکییەکانی خۆیشی بەجۆرێك دەخاتەڕوو کە چاو ی مرۆڤ پڕ ئاو دەکات. تا لە دڵەوە هەستی پێ نەکەن، لە کێشەی کورد تێناگەن و ناتوانن رێگای ئاشتی خۆش بکەن. لە کۆتاییەکانی گەشتەکەدا هێڵێکی ئەستوور بە ژێر رستەی ئەوەی بۆ کوردەکان باش بێت بۆ تورکەکانیش باشە'دا دەکێشم. کتێبەکەی چاندار، کلیلی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەیە کە تورکیا چۆن دەتوانێت بە ئاشتی و دیموکراسی گەورە بێت؟

حەسەن جەمال